ناوی کتێب: «قامووسی رستە»

دانراوی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (      ) ساڵی (٢١٠)ی دراوەتێ.

تایپ و دیزاینی: (روبار حسین)

ساڵی چاپ: ١٤٣١ ك - ٢٠١٠ ز

# رستە

## بەرگی سێهەم

## ص • ض • ط • ظ • ع • غ • ف • ق

نوسینی:



## مەلا مەحموودی گەلاڵەیی



دار المعرفة

بەیرووت

١٤٣١ك

الـصَّادُ: پيتـى چواردەهەمى پيتـەكانى هيجايــە، شــوێنى هاتنــە دەرەوەى كــەنارى زوبــانو لاى ژوورى ددانــى پێــشەوەى ســەرو وە، بەتــەواوەتى پێشەوەى مەلاشو دادەگرێ ٥ نـاوى سورەتێـكى قورئانيشە.

صَئِبَ صَأباً: زۆرى ئـاوخواردەوە ٥ شـەرابى زۆرى خــواردەوە ٥ بەتــەواويى تێــراو بوو.

صَـئِبَ الـرأسُ: سـەرى رشـكى زۆرى هـەڵ هێنا ٥ سەرى رشكاويى بوو.

أصابَ الرأسُ: بەمانا (صَئِبَ) دێ.

صَأصَـأ الجِـروُ: توتكـە سـەگەكە هـەوڵى چاو هـەڵێنانى داو هێـشتا چاوى بۆ هەڵنەهاتوون.

صَأصَـأ الرجـلُ: پياوەكـە ترسـنۆك بـوو دەگــوترێ: (صَأصَــأ مــن فــلان) لەفلانكەس ترساو گەردنكەچى بوو.

تصَأصَأ منه: بەمانا (صَأصَأ) دێ.

صَئِكَ الشَيئ صأكاً: شـتەكە بۆگـەنى كـرد بـەهۆى عـەرەق كردنـەوە يـان بـەهۆى تەڕەشــوحو تەڕبوونــەوە ٥ دەگــوترێ: (صَئِكَ الرَّجُلُ وصَئِكَت الخشبة).

صَئِكَ الدمُ: خوێنەكە خەست بۆوە.

صَـئِكَ الـشيّئُ بغـيره: شـتەكە بەغـەيرى خۆيەوە نووسا.

صَاءكَهُ: شەتەكى دا.

الصَّأكة: بۆنى كەرِوى دارە كە بە هۆى تەڕبوونـەوە بـرِزێو كـەرِو بێنـێ ٥ بۆگەنى عەرەق.

صَؤُلَ البَعيرُ صَآلةً: حوشترەكە جەو جۆڵەو رەوينــەوەو راپــەڕينى زۆر بــوو (فهــو صَؤول).

صَأي الفرخُ ونحوه صَئياً: بێچووەكە هاوارى كـرد ٥ بەكەسێـك كـە سـتەميش بكـاو شكواى هەبێ، دەگوترێ (تلدغ العَقـربُ وتـصأى) دووپـشك پێـوەش دەداو دەش قيژێنێ.

تَصَأى: زێدە رەوى كرد لە هاواركردنو دادو فيغان دا.

الـصَّأةُ: ئـەو ئـاوەى لەگـەڵ منـداڵبون دا دێتە دەرەوەو هەندێكى دەمێنێتەوە.

صَبَأَ النابُ ونحوهُ صُبوءاً: ددانەكە سەرى دەرهێنا ٥ كەڵبەكە دەركەوت.

صَـبَأ مـن شـيئ الى شـيئ: لـە شتێـكەوە گواستيەوە بۆ شتێـكى تـر ٥ دەگوترێ: (صَبَأ الرجُلُ) پياوەكە لـە ئـاييني خـۆى وەرگەڕاو چووە سەر ئاينێكى تر.

**صَبَّا عليه**: لە فەرمانو کۆنترۆڵی ئەو دەرچوو ٥ هێرشی کردە سەری، لێی ڕاپەڕی.

**أصبَأ النابُ ونحوهُ**: ددانەکە سەری دەرهێنا ٥ کەڵبەکە دەرکەوت.

**أصبَأ على القوم**: هێرشی کردە سەر خەڵکەکەو پەلاماری دانو بەباشی شوێنەکەیان نازانیّ.

**الصابئون**: کەسانێکن واز لە ئایینی خۆیان دێننو ئایینێکی تر وەردەگرن ٥ ئاقمو پێڕێکن ئەستێرە دەپەرستنو پێیان وایە ئەوان لەسەر ئایینی حەزرەتی (نوح)ن، ڕۆگەو قیبلەیان شوێنی هەڵکردنی بای شەماڵە لەکاتی نیوەڕۆدا.

**صَبَّ الرجلُ في الوادي صبيباً**: پیاوەکە بە دۆڵو شیوەکەدا سەرو ژێر بۆوە.

**صبَّ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا.

**صَبَّ الماء ونحوه**: ئاوەکەی هەڵڕژاند ٥ دەگوتریّ: (صَبَّ عليه العذاب) سزای بەسەردا باراند ٥ قورئان دەفەرمویّ ﴿فصَبَّ عليهم ربُّك سَوط عذاب﴾.

**صَبَّ الرَّجُلَ**: في القيد: پیاوەکەی لەزنجیردا پێوەند کرد.

**صَبَّ عليه درعَه**: زرێیەکەی لەبەرکرد.

**صَبَّ فلاناً على الأمر**: فلانکەسی بۆ کارەکە هەڵنا.

**صَبَّ الكلبَ على اللّصِّ**: سەگەکەی لە دزەکان بەردا.

**صَبَّ رَأسَهُ**: سەری دانەواند، سەری شۆڕکردەوە.

**صَبَّ اليه صَبابَةً**: حەزی لیّ کرد عاشقی بوو ٥ (فهو صَبٌّ وهي صَبَّة).

**أصَبَّ القومُ**: خەڵکەکە سەرەو ژێر بوونەوە.

**إنصَبَّ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا ٥ دەشگوتریّ (إنصَبَّ الناس على الماء): خەڵکەکە هەڵڕژانە سەرئاوەکە، لەویّ کۆبوونەوە.

**إنصَبَّ البازي على الصيد**: هەڵۆکە پەلاماری نێچیرەکەی دا.

**إصطَبَّ**: هەڵڕژا.

**إصطَبَّ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵڕژاند.

**إصطَبَّ الصبابة**: بەرماوەی بنکی پەرداخەکەی خواردەوە ٥ بنکڕی پیاڵەکەی هەڵقوڕاند.

**تَصابَّ الماءَ**: ئاوەکەی هەڵڕشت ٥ دەگوتریّ: (تصابَبتُ الشّيء): کەم کەم شتەکەم وەدەست هێنا.

**تَصَبَّب الماء من فوق**: ئاوەکە لەسەرەوە هەڵڕژایە خوار.

**تَصَبَّب وجهُهُ عرقاً**: ڕوخساری چین چین ئارەقی ڕشت ٥ دەمو چاوی

ئارەقی زۆریان دەردا.

**تَصَبُّب الصبَابَة**: جۆڕی بنکی پیاڵەکەی خواردەوە ٥ هەڵی چۆڕاند.

**الصُّبَابَة**: شەوق‌و ئارەزوو ٥ دڵنەرمی‌و سۆزو بەزەیی ٥ عیشقی گەرم کە عاشق بتوێنێتەوە.

**الصُّبابة**: بەرماوەی کەم لە بنکی پیاڵەدا جا ئاو بێ یان شلەمەنی تر.

**الصَّبُّ** (ماءٌ صَبٌّ): ئاوێکە ڕژاو، هەڵڕژاو ٥ دەشگوترێ (أخَذ مائةً فصَباً): سەدو کەمتری هەڵگرت.

**صُبَّ عليه**: بەڵاو کارەساتی بەسەردا بارین.

**الصَّبَبُ**: زەوی سەرەوخوار ٥ (ك: اصْبَاب).

**الصُّبَّةُ**: عەشق‌و خۆشەویستی ٥ کۆمەڵ‌و پێرو تاقم ٥ خۆراک‌و تێشوی ڕێبوار.

**صُبَّةٌ من الناس**: کۆمەڵێک لە ئادەمیزاد.

**صُبَّة من الليل**: بە شێک لە شەو ٥ (ك: صُبَب).

**الصَّبيبُ**: هەر شتێک هەڵڕژێندرێ.

**صَبيب السيف**: کەناری شمشێر.

**المَصَبُّ**: شوێنی لێ هەڵڕژان.

**مَصَبّ النهر**: ئەو شوێنەی ئاوی ڕووبار تێکەڵ بە ئاوی دەریا دەبێ ٥ (ك: مصاب).

**صَبَح صَبحاً**: بەیانی هات بۆلای ٥ بەیانی پەلاماری دا ٥ پیاڵەکەی بەیانی پێشکەش کرد.

**صَبَّحَ القومَ**: دەمەو بەیان هێرشی کردە سەر گەلەکە ٥ بەیانی بردنی بۆ سەرئاو خواردنەوە.

**صَبَّحَهُم**: بەیانی توشی خێری کردن یان توشی شەڕ.

**صَبِحَ الشَّعرُ صَبحاً وصُبحةً**: سورایی تێکەڵ سپیایی قژەکانی بوو ٥ قژی ماش‌و برنج بوون.

**صَبِحَ الحديدُ**: ئاسنەکە بریسکەی لێوەهات ٥ (فهو أصبح وهي صبحاءُ) (ك: صُبُحٌ).

**صَبُحَ الوجه صباحة**: ڕوخساری گەشایەوە، جوان بوو ٥ دەگوترێ: (صَبُحَ الغلامُ) ٥ (فهو صبيحٌ) ٥ (ك: صِباحٌ).

**أصبَحَ**: کەوتە بەیانییەوە.

**أصبحَ الحقُّ**: حەق‌و ڕاستی دەرکەوت ٥ گۆڕا لە حاڵەتێکەوە چووە سەر حاڵەتێکی تر قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا﴾.

**أصبح المِصباحُ**: چراکەی هەڵکرد.

**صَبَّحَ القومُ**: لەبەرەبەیان دا هێرشی کردە سەر قەومەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ﴾.

**صَبَّحَ فلاناً**: بەیانی باشی لە فلانکەس

کرد ٥ لەدوعاو نزاش دا دەگوترێ: (صَبَّحكم الله بخير).

**إصطَبَحَ فلان**: پیاڵەمەی بەیانی خواردەوە پیاڵە شەرابی بەشەو ئامادەکراو بۆ بەیانی ٥ چراکەی خۆش کردو روناکی خستە ناو ماڵەکەوە.

**تَصَابَحَ**: روخۆشی بەسەرخۆیدا هێناو خۆی وا نیشان دا کەیفخۆش و بێ خەمو خەیاڵە.

**تَصَبَّحَ**: بەیانی نوست ٥ بەرکوڵی ژەمە خواردنی خوارد واتە: زەڵاتەو تەوابیل و شتی لەو جۆرە.

**إستَصبَحَ**: چراکەی خۆشکرد، ڕوناکی بڵاوکردەوە.

**إستَصبَحَ بالزيت ونحوه**: بەهۆی زەیتەوە رووناکی چراکەی درێژە پێدا.

**الإصبَاحُ**: سەرەتای رۆژ ٥ بەیانیو کازیوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَالِقُ الإِصْبَاحِ﴾.

**الصَّابِحُ** ٥ دەگوترێ: (حقّ صابحٌ) حەقو مافێکی ئاشکرایە.

**الصابح من الطعام**: خواردنی تازە.

**الصَّباحُ**: سەرەتای رۆژ، بەیانیو کازیوە ٥ دەشگوترێ: (أتاه صَباحَ مَساءَ) هەمیشە دەهاتە لای.

**الصُّباحُ**: گڕی چراو قەندیل.

**الصُّباحي من الدم**: خوێنی زۆر سوور.

**الصَّباحية**: بەیانی شەوی یەکەمی بووك و زاوایی.

**الصُّبحُ**: سەرەتای رۆژ، کازیوەی بەیانی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ ٥ (ك: أصباح).

**الصَّبحانُ**: روکراوەو رووخۆش و روناك ٥ مەیخۆرەوەی بەیانیان ئەو کەسەی بەیانی پیاڵەی شلەمەنی دەخواتەوە ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ (صَبحي) ٥ (فعلان، فعلى).

**الصُّبحة**: نووستنی بەیانیان، بەرکوڵو خواردنی ئەو شتانەی پێش نان خواردن ئیشتیها دەکەنەوە.

**الصَّبُوحُ**: شەرابی بەیانی ٥ مەیخواردنەوەی بەیانیان ٥ ئەو شلەمەنیو خواردنەی بەیانیان دەخورێ ٥ ژەمی ئێواران پێی دەگوترێ (غَبُوق).

**الصَّبيحة**: بەیانی، کازیوە.

**المِصباحُ**: چراو گڵۆپو هەرشتێك لەو جۆرە ٥ (ك: مصابيح).

**مصابيح السماء**: ئەستێرەی ئاسمان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾.

**المِصبَحُ**: بەمانا (المصابيح) دێ ٥ (ك: مصابح).

**صَبَرَ صبراً**: دانی بەخۆی داگرتو ورەبەرزو دڵ قایم بوو ٥ پشوو درێژ بوو، بەئارامی چاوەڕوانی کرد ٥ دەگوترێ
**صَبَرَ علی الامر**: لەسەر ئیشەکە خۆی گرتو پشوو درێژ بوو ٥ هاتو هاواری نەکرد.
**صَبَرَ عنه نفسه**: خۆی لێ مەنع کرد، نەفسی خۆی لێ گرتەوە ٥ نەفسی خۆی کۆنترۆڵ کرد.
**صَبَرَ البُرَّ**: گەنمەکەی کۆمەڵ کرد، خڕی هەڵدا.
**صَبَرَ فلاناً**: فلانکەسی حەبس کرد، لەگەڵی کەوت.
**أصبَرَ الطعام**: خواردنەکە تاڵ بوو.
**أصبَرَ فلاناً**: فلانکەسی وا لێ کرد خۆگرو بەغیرەت بێ ٥ ورە بەرزو لەسەر خۆبێ.
**صابَرَهُ مُصَابَرةً وصِباراً**: لە خۆڕاگرتنو پشوو درێژیدا بەسەریدا بالادەست بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ﴾.
**صَبَّرَهُ**: داوای لێ کرد خۆڕاگرو پشوودرێژ بێ.
**صَبَّرَ البُرَّ**: گەنمەکەی کۆمەڵ کۆمەڵ کرد.
**صَبَّرَ الجُثَّةَ**: جەستەکەی مۆمیاکرد بۆئەوەی بۆماوەیەك نەرزێ ٥ لەکۆن دا ئادەمیزاد بەهۆی جەوتو تاڵو تفتەوە کاری مۆمیاو دەباغو شتی وایان ئەنجام داوە.
**إصطَبَرَ**: بەمانا (صَبَرَ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ﴾.
**تَصَبَّرَ**: نەفسی خۆی هەڵنا بۆ خۆڕاگریو پشو درێژی ٥ خۆڕاگریو ئارامگرتنی بەسەر خۆیدا هێنا.
**إستَصبَرَ**: گەنمی کۆمەڵ کۆمەڵ کرد ٥ دەگوترێ (استصبر الطعام) خۆراکەکە گرد بۆوە ٥ تاڵ بوو.
**التَّصبيرُ**: بەرکوڵو ئەو جۆرە خواردنەیە کە کابرای برسی خۆی پێوە دەخافڵێنێ تا خواردنە سەرەکیەکەی بۆ ئامادە دەبێ.
**الصَّابورة**: ئەو قورساییەیە دەخرێتە ناو کەشتییەوە بۆ ئەوەی لەرە لەر نەکات.
**الصُّبارة**: قفڵو بەلوعەو سەرقاپو تۆپەوانەی گۆزەو کەندوو تەنکی و شتی وەها.
**الصَّبارة**: سەرمای کوشندە.
**الصَّبَّار**: کەسێك زۆر خۆگرو ورە بەرزو پشوو درێژ بێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ ٥ هەرواناوە بۆ

روەكێكی دەشتەكی، گوشراوەكەی زۆر تاڵەو گەڵاكەی پانو ئەستوورە، هەمیشە سەوزو ئاودارەو چەقڵی هەیە.

**اَلصَّبْرُ**: ورە بەرزیو دامەزراویو خۆگر لەبەرامبەر كارەسات دا ٥ خۆگریی لەسەر دووركەوتنەوەی خۆشەویستو لەدەست دانی، یان خۆگریی لەسەر ئەزیەت دانو ئازار بەبێ ئاخو ئۆف كردن ٥ دەگوترێ: (قتله صبراً) بەندی كرد تا مرد.

(شهرالصبر) مانگی رۆژوو، مانگی رەمەزان.

**الصُّبْرُ من الشيئ**: لای ژوروی شت ٥ پەنا شتەكە ٥ (ك: أصبار) ٥ دەگوترێ (ملأ الكأس الى أصبارها) پیاڵەكەی تا لای سەروی پڕكردووە ٥ لێوان لێوی كردووە ٥ (أخذ الشيئ بأصباره) شتەكەی هەموو هەڵگرت.

**الصُّبْرُ**: گوشراوی درەختی تاڵ تاكەكەی (صَبِرَةٌ) ٥ (ك: صُبُرٌ).

**الصَّبِرَةُ**: بەمانا (اَلصَّبارة) دێ.

**الصُّبْرَةُ**: كۆمەڵە دانەوێڵە ٥ كۆمەڵە خواردەمەنی ٥ دەگوترێ: (اشترى الطعام صُبْرَةً) خواردەمەنییەكەی بە گۆترەو بە كۆمەڵ كڕی ٥ بەبێ پێوانو كێشان خۆراكەكەی كڕی ٥ (ك: صُبَرٌ و صِبارٌ).

**اَلصَّبُور**: كەسێك بەسروشت خۆڕاگرو ورە بەرزو دامەزراو بێ ٥ ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا ٥ ماناكەشی ئەوەیە: پەلە ناكا لە تۆڵەسەندنەوە لە تاوانبار.

**الصَّبِيرُ**: هەوری سپیو پڕ ٥ كێو ٥ (ك: صُبُرٌ) ٥ بەمانا گەورەو سەركردەی گەلو ئەتەوەش دێ (ك: صُبَراء).

**المَصْبُور**: كەسێك بەهۆی تاوانی كوشتنەوە بەندكرابێ.

**صَبْصَبَ الشيئ**: شتەكەی بڵاو كردەوە، لێكی جیاكردەوە.

**تَصَبْصَبَ الشيئ**: شتەكە بڵاو بۆوە ٥ كەمێكی لێ مایەوە ٥ دەگوترێ: (تَصَبْصَبَ ما في السقاء) كەمێك ئاو لە كوندەو كوپەو شتی وا ماوە ٥ (تَصَبْصَبَ الليلُ) شەو كەمێكی ماوە.

**الصُّبْصابُ**: مانەوەی كەمێك لە ئاو و شەراب لە بنكی پیاڵەدا.

**صَبَعَ بِهِ و صَبَعَ عليه صَبعاً**: بەقامك و بەشێوەی گاڵتە پێكردن ئاماژەی بۆ كرد ٥ بەشێوەی گاڵتە ئامێز قامكی بۆرا داشت.

**صَبِعَ في الشيئ**: قامكی خستە ناو شتەكەوە ٥ دەشگوترێ: (ما صَبَعَ في الطعام): قامكی نەخستۆتە ناو خواردنەكەوە.

**صَبَعَ فلاناً**: ئامکی فلانکەسی هەنگاوت.

**صَبَعَ فلاناً على الشيء**: بەقامك فلانکەسی شارەزا کرد بۆ شتەکە، قامکی بۆ ڕاداشت بۆلای شتەکە.

**صَبَعَ الاناءَ**: ئەوەی لەناو قاپەکەدا بوو لەنێوان دوو پەنجەوە ڕژاندی بۆ شوێنی پێویست بۆ ئەوەی نە پرژێ و بڵاو نەبێتەوە.

**الإصبَعُ و الأُصبُعُ**: یەکێك لە پەنجەی دەست یان پەنجەی قاچ ٥ (ك: أصابع) ٥ هەروا ناوە بۆ شوێن دەستو ئاسار ٥ دەگوترێ: (عليه من الله إصبَع حسنة) (وهو حسن الإصبَع في ماله) ٥ (وله في هذا الامر اصبع) ٥ لەبواری کیمادا بەمادەیەك دەگوترێ بە شێوەی کۆڵەکەو ستوون قەبارە ببەستێ.

**الأُصبوعُ**: بەمانا (الإصبَع) دێ ٥ (ك: أصابيع).

**صَبَغَ الثوبَ ونحوه صَبغاً**: قوماشەکەی ڕەنگ کرد.

**صَبَغَ الشيءَ**: شتەکەی نوقم کرد ٥ لە شلەمەنیەکەی هەڵکێشا ٥ دەگوترێ: (صَبَغَ يده في الماء) دەستی خستە ناو ئاوەکەوە نوقمی کرد (صَبَغَ اللقمة في الإدام) پارووەکەی لە پێخۆرەکەدا نقوم کرد.

**صَبَغَ الحديث**: قسەکەی تێکەڵ بە درۆو دەلەسە کرد ٥ دەگوترێ (صَبغوني في عينك) سەرنجو ڕای تۆیان بەرامبەر بە من بەشێوەی خراپ گۆڕی.

**صَبَغَ النصراني ولده**: کابرای نەصرانی منداڵەکەی خۆی لە ئاودا نقوم کرد لە ناو ئاوی (معمودية)دا.

**أصبغت النخلةُ**: خورماکە ئاڵو بۆڵی تێ کەوت، گەیینی لێ دیاریی دا.

**صَبَّغت البُسرَةُ**: پێگەیینو گەیشتنی خورماکە دەرکەوت ٥ دەشگوترێ (صَبَّغت النخلة) بەهەمان مانا.

**صَبَّغ الثوبَ**: قوماشەکەی بۆیە کرد.

**إصطبَغ بكذا**: بەوشتە ڕەنگی کرد.

**إصطبغ بالأدام**: بە پێخۆرەکە نانەکەی چەور کرد ٥ پێخۆرەکەی لە نانەکە هەڵسوو.

**تَصَبَّغ في دينه وبدينه**: لە ئایینی خۆیدا دامەزراو بوو.

**الصَّباغ**: ئەو شتەی قوماشی پێ بۆیە دەکرێ یان شتی تر ٥ هەروا ناوە بۆ پێخۆری شل.

**صِباغ الدم**: لەبواری پزیشکی دا مادەیەکە دەبێتە هۆکاری پەیدابوونی ڕەنگی خوێن ٥ (ك: أصبغة).

**الصَّباغة**: بۆیەچییەتی، خەمچیەتی.

**الصَّبَّاغ**: کەسێك ئیشی بۆیەکردن بێ پیشەی بۆیە چییەتیو رەنگ کردنی قوماش ٥ درۆزن.

**الصِّبغُ**: بۆیەو رەنگ ٥ پێخۆر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاء تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ شتی رەنگ کراو ٥ (ك: أصباغ).

**الصِّبغة**: ئەوەی شتی پی رەنگ دەکرێ ٥ شێوەی شت دوای رەنگ کردنی.

**صِبغة الله**: ئەو فیترەتو سروشتەی خودا ئادەمیزادی لەسەر دروست کردووە ٥ ئەو ئایینەی خودا دایناوە بۆ ئادەمیزاد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿صِبْغَةَ اللّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ صِبْغَةً﴾.

**المَصبَغةُ**: خمخانە ٥ شوێنی بۆیە کردن ٥ (ك: مصابغ).

**الصِّبغي**: شێوەیەك لەمادە لەناوکی خانەدا لەکاتی دابەش بوونی دا وەری دەگرێ ٥ واتە: (کروموسوم).

**صَبَنَ عنه الهدیة**: دیارییەکەی نەدایە، لەوی بوارد بۆ یەکێکی تر.

**صَبَنَ المقامِرُ**: الکعبین: قومارکەرەکە هەر دوو کەعبەکەی خستە ناو دەستییەوە بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی هەڵخەڵەتێنێ ٥ هاوەڵەکەی پێی دەڵێ: (لا تَصبن) فێڵم لێ مەکەو ئاگام لێیە چی دەکەی.

**الصَّابون**: صابون، پێکهاتەیەکە لە ترشەڵۆکە چەورییەکانو بڕێ قەلەویات ٥ بۆ تاك و پارچەیەکی دەگوترێ: (صابونة).

**الصَّبَّان**: صابونکەر، صابون فرۆش.

**الصَّبَّانة**: ئامێرێکە، دەفرێکە صابونەکەی تێ دەخرێ بۆنەوەی لەئاوەکەدا نەتوێتەوە.

**المَصبَنة**: کارگەی صابون ٥ (ك: مصابن).

**صَبَا فلان صَبواً، وصبوةً**: روی کردە رابواردنو لەهو لەعب حەزی لە مێبازیو رابواردن بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِلاَّ تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ﴾.

**صبت الریح**: بایەکە هەڵی کرد ٥ بای صەبا هەڵبوو.

**الصِّبا**: تەمەنی منداڵیو پێگەیشتن ٥ عەشقو سۆزو خۆشەویستی.

**الصَّبِيُّ**: منداڵ تادەگاتە تەمەنی لاوی ٥ یان منداڵی شیرە خۆر ٥ تیژایی شمشێر ٥ بیلبیلەی چاو ٥ لاشەویلە ٥ (ك: صِبيَةٌ ٥ و صِبيان).

**صِبیان المطر**: دڵۆپە بارانی بچوك.

**صبیان الجلید**: دەنکە تەرزە ٥ شاگرد کە فێری پیشەو خوێندن دەکرێو وردە وردە و بە قۆناغ.

**اَلـصَّبِيَّة**: مێینـەی (الـصبي)یـە ٥ (ك: صبايا)یە.

**صَبِيَ صباً**: کاری منداڵانەی کرد.

**صَبِيَ اليها**: بۆی کورکاندو حەزی لێ کرد، مەیلی لێ بوو.

**أصبَتِ المرأة**: ئافرەتەکە منداڵی بوو چ نێـر چ مـێ ٥ منـداڵی زۆر بـوون ٥ (فهي مصبٍ و مصبية).

**أصبَتِ الفتاة فلاناً**: کچەکە دڵی فلانـی بردو سەراسیمەی کرد.

**صَابى الـشيئ**: شتـەکەی خـوارکردەوە، لاری کرد ٥ وای لێ کرد ناراست بێ.

**صـــابى ســـيفه**: بـــە پێـــچەوانەوە شمشێرەکەی خستە کالانەوە.

**صابى الـسكينَ**: کێردەکـەی سـەرەو بـن کـرد ٥ دەگـوترێ: (صـابِ الـسكينَ) دەسکی شمشێرەکە بخەرە لای من.

**صـابى الكـلام**: قـسەکەی بـە شێوەی ڕاستو درووست نەگێڕایەوە.

**صَبّى رأسه**: سەری خۆی دانەواند بۆلای زەوی.

**تَصابى**: خۆی منداڵ کردەوە.

**تَصابى المرأةَ**: دڵـی ئافرەتەکـەی بـۆ لای خـۆی کـێش کـرد، ئافرەتەکـەی هێنایە سەر ڕێبازی دڵداریو کەوی کرد.

**الـصَّبا**: کزە بایەکە لـە خۆرهەڵاتـەوە هەڵـدەبێ لـەکاتی یەکـسان بـوونی شەو و ڕۆژدا.

**صَحِبَهُ صَحابَةً وصُحبَة**: هاوڕێیەتی کـرد ٥ لـە دوعـاو پاڕانـەوەدا دەگـوترێ (صَـــحِبَكَ الله) خـــودا بتپـــارێزێ ٥ چاودێری خودات بەسەرەوە بێ.

**أصـحَبَ فـلانٌ**: فـلان کـەس هـاوڕێی بـۆ خـۆی پەیـدا کـردن ٥ منداڵـەکانی گـەورە بـوون لەگـەڵی کـەوتونو هاوڕێیـــەتی دەکـــەن ٥ شـــێوە شێتییەکی بەسـەردا هـاتووە لەبـەر خۆیەوە ویتە ویتیەتی.

**أصحَبَ له**: ملکەچی بوو شوێنی کەوت.

**أصحَبَ فلاناً**: فلانکەسی کـردە هـاوڕێی خۆی.

**أصحَبَ فلاناً الـشيئ**: فلانکەسـی کـردە هاوشانی فلان شت.

**صَاحَبَه مُصاحبةً وصِحاباً**: هاوڕێیـەتی کرد.

**إصطَحَبَ فلاناً**: فلانکەسی کردە هاوڕێی خۆی ٥ دەگـوترێ: (إصطَحَبَ القوم): خەڵـکەکە هەندێـکیان بـوون بـە هاوڕێی یەکتری.

**تصاحَبا**: بوون بە هاوڕێی یەکتری.

**استَصحَبَ الـشيئ**: هۆگری بـوو پێوەی گیرۆدە بوو پێوەی نووسا.

**استَـصحَبَه الـشيئ**: داوای لێ کـرد ئـەو شتە لەگەڵی بکەوێ.

**استَصحَبَ فلاناً**: بانگی فلانکەسی کرد داوای لێ کرد ببێتە هاوڕێی.

**الصاحِبُ**: هاوڕێی‌و لەگەڵبوو (مرافق) ٥ خاوەن شت ٥ چاودێری شت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ کەسانێك پەیڕەوی ڕێبازو پرۆگرامێك دەکەن ٥ وەکوو دەگوترێ: (أصحاب ابي حنيفة وأصحاب الشافعي) ٥ (ك: صَحبٌ وأصحاب وصِحاب) دەشگوترێ: (یا صاحِ) لەجیاتی (یا صاحبي).

**الصَّاحبة**: هاوسەر (ژن) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾.

**الصّحابي**: کەسێکە پێغەمبەری دیبێ‌و بەخزمەتی گەیشتبێ‌و ئیمانی پێ هێنابێ‌و بە موسوڵمانیش مردبێ ٥ (ك: صَحَابة)

**المِصحَابُ**: ملکەچ‌و ژێربار ٥ دەگوترێ: (هو مصحاب لنا بما نحب) ئەو ژێربارو ملکەچ‌و پابەندی فەرمانی ئێمەیە.

**المُصحَب**: لقە دار کە توێکڵەکەی لێ نەکرابێتەوە ٥ چەرم تووکەکەی لێ نەکرابێتەوە ٥ دەنکە خورما بە ناوکەوە.

**صحَّ الشيئ صُحّاً و صِحة وصِحاحاً**: شتەکە بێ عەیب‌و لەکەیە.

**صَحَّ المريض**: نەخۆشەکە چاك بۆوە.

**صحَّ الخبرُ**: هەواڵەکە ڕاست بوو (صَحَّت الشهادة) و (صحَّت الصلاة)، (صحَّ العقد)، (فهو صحيح) (ك: صِحاح) بۆ عاقڵمەند ٥ (أصحاء) بۆ ناعاقڵ ٥ و(هي صحيحة): (ك: صِحاح، صَحاحٌ).

**صَحَّ له على فلان كذا**: ئەوەی لەسەر فلانکەس بۆ چەسپا.

**أصَحَّ الرجلُ**: پیاوەکە ئەو عەیب‌و نەخۆشی‌و کەم‌و کوڕییەی هەیبوو نەماو باری خواری ڕاست بۆوە.

**أصحَّ الله فلاناً**: خودا نەخۆشی‌و ناڕەحەتی فلانکەسی لابرد.

**صَحَّحَه**: هەڵە بڕی کرد لەکەو عەیب‌و خەوشی لێ لابرد ٥ دەگوترێ: (صَحَّحَ الخبر وصَحَّحَ الكتاب والحساب، وصحّحَ الله المريض).

**تَصَحَّحَ**: چاك بۆوە ٥ دەگوترێ: (تَصَحَّحَ بالدواء) بە دەرمانەکە چاك بۆوە، بە دەرمانەکە چاکسازی لە خۆی دا کرد.

**إستَصَحَّ من علته**: لە نەخۆشییەکەی چاك بۆوە.

**إستَصَحَّ الشيئ**: شتەکەی بە ساغی کەوتە دەست.

**الصِّحاح**: بەمانا (ألصَّحيحُ) دێ.

**الــصِّحة في البــدن**: لــەش ســاغی ٥ حاڵەتێکی سروشتییە لە جەستەدا ئەندامــەکانی هەریەکــەو بەڕێــكو پێــکی ڕۆڵــی خــۆی ببینــێ ٥ لەشــەرعدا بریتیــە لــەوەی ئــەو عیبادەتــەی ئــەنجامی دەدا پەســەند بــێو قەزاکردنــەوەی نــەوێ ٥ یــان هۆکارو سەبەب بێ بۆ ئەوەی ئاکامو ئامانجی پێویستی لەسەر پەیدا ببن وەکو لە مامەڵەدا ئەگەر مامەڵەکە پلــەی (صــیحەتی)ی هــەبوو ئــەوە ئەنجامو ئاکامەکەی لێ پەیدا دەبن ٥ وەکو موڵــکیەتو تەصــەروفو ئــەو شتانە.

**ألــصَّحيحُ**: ســاغو بــێ عــەیب ٥ قــسەی پــشت پــێ بەســتراو ٥ فــەرموودەی پێغەمبــەر (د.خ) کــە بگاتــەوە ســەر پێغەمبــەرو هاوەڵــەکانی لێیــەوە ڕیوایــەت بکــەنو ڕاویــەکانی عــادلو بــەئاگاو زیــرەكو وردبــینو هۆشــیار بن.

**المَـصَحَّةُ**: ئــەو شــتەی دەبێتــە ســەبەبی بــوونی شــت ٥ دەگــوترێ: (الــصوم مَصَحَّةٌ والسفر مَصَحَّةٌ وأرض مَصَحَّةٌ) هــیچ نەخۆشــیو تــاعونو دەردێــکی تێدا نییە ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنێــك چارەســەری نەخۆشــی تێــدا دەکــرێ (نەخۆشخانە).

**صَحَرَ الطعام صَحراً**: خواردنەکەی لێنا، کوڵاندی.

**صَــحَرَت الــشمسُ فلانــاً**: خــۆر ئــازاری دەماغی فلانکەسی دا.

**صَحِرَ صَحراً وصُحرةً**: ڕەنگــی سوراییەکی کــەمی تــێ کــەوت. (فهــو أصــحَرُ وهــي صحراء)

**أصــحَرَ القــومُ**: قەومەکــە لــە ســارادا دەرکەوتن.

**أصحَرَ المكانُ**: شوێنەکە فراوان بوو.

**أصحَرَ الامر بـالأمر**: نیـشەکەی ئاشکرا کرد.

**صــاحَرَ قِرنــهُ**: فــێڵو تەڵەکــەی لــە بەرامبەرو ڕقەبەرەکەی نەکرد.

**إصحَرَّ**: بە مانا (صَحِرَ)دێ.

**الـصِّحارُ**: دەگـوترێ: (أبــرز لــە الأمــر صحاراً) کارەکەی بە ئاشکرا ڕوبەڕو کردەوە.

**الصَّحراء**: ساراو دەشت کەفراوان بێ، کەم ئاوبێ ٥ (ك: الصَّحارى).

**الــصَّحيرةُ**: خۆراکێــکە لــە شــیرو ڕۆن دروســت دەکــرێ، وا دەبــێ ئاردیــشی پێ وەردەگرێ.

**صَحصَحَ الأمر**: کارەکە ئاشکرا بوو.

**الصَّحـصاحُ و الصَّحـصَحُ**: زەوی دەشــتو فراوان ٥ (ك: صحاصح).

**الصُّحصُحُ و الصُّحصوحُ**: لێکۆڵەوەیەکی وەها کە وردەکاری کارو رووداوەکان بکاو هەژماریان بکاو بیانزانێ.

**أصحَف الكتاب**: کتێبەکەی پەڕە پەڕە کۆکردەوە.

**صَحَّفَ الكلمة**: وشەکەی نووسی یان خوێندیەوە بەهەڵە ٥ وەکو پێویست نەیخوێندەوە یان نەینووسی، بەهۆی لێ تێکچوونی پیتەکان لێی.

**تَصَحَّفت الكلمة أو الصّحيفة**: وشەکە یان لاپەڕەکە لە ڕاستییەوە بوو بە هەڵە.

**الصِّحافة**: ڕۆژنامەوانی، ئەو کەسەی هەواڵو ڕاو بۆچوون کۆدەکاتەوەو لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا بڵاوی دەکاتەوە.

**الصَّحاف**: ئەوکەسەی صەحافی دەکا ٥ یان خەریکی فرۆشتنی ڕۆژنامەو شتی وایە.

**الصَّحفةُ**: قاپێکە لەقاپی خواردەمەنی وەکو دەوریو لەگەنو کاشیو ئەو جۆرە شتانە (ك: صِحاف).

**الصَّحفي**: ئەو کەسەیە زانیاری لە ڕۆژنامە وەربگرێ ٥ کەسێك کاری ڕۆژنامەوانی ئەنجام بدا ئەوەی کردبێتە پیشەی خۆی.

**الصحيفة**: لاپەڕەی نووسراو یان ئەوەی تێیدا نووسراوە ٥ (ك: صحف) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ، صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾ ٥ لاپەڕەیەکی تایبەتیە لە ڕۆژنامەیەك ڕۆژانە یان لەکاتێکی دیاریکراودا دەردەچێو تایبەت دەبێ بەلایەنی سیاسی یان کۆمەڵایەتی، یان ئابوری یان ڕۆشنبیری. (ك: صُحف و صَحائف).

**صحيفة الوجه**: پێستی دەمو چاو ٥ (ك: صحيف).

**المُصحفُ**: کۆمەڵە لاپەڕەیەك کە پێکەوە لکێنرابنو تەجلید کرابن ٥ بەزۆری ئەم وشەیە بۆ قورئانی پیرۆز بەکاردەهێنرێ ٥ (ك: مصاحف).

**صَحِلَ فلان صحلاً**: لەدەنگی دا گرییەك هەبوو ٥ دەگوترێ: (صَحِلَ صوته) (فهو صَحِلٌ وهي صَحِلَةٌ: وهو أصحَل وهي صحلاء).

**صَحَنَهُ صَحناً**: لێی دا ٥ دەگوترێ: (صَحَنَه برجله) قاچی پیانا.

**الصَّحنُ**: پیاڵە شەرابی گەورە ٥ قاپێکی گەورە کە خۆراکی تێ بکرێ ٥ وەکوو لەگەنو سەعەندو ئەو جۆرە دەفرانە ٥ (ك: أصحُن وصحان وصحون) گۆڕەپانێکە لەناو مزگەوت

يان لەماڵدا ٥ زەوی دەشتو فراوان كە درەختی تێدا نەبێ ٥ (ك: صُحُونٌ)

صَحنُ الأذن: ناو گوێچكە (ك: أصحان).

الصَّحنان: دوو تەشتی بچوكن بە یەكتر دەكێشرێن بۆ وەدیهێنانی دەنگێكی تایبەتی لە بواری مۆسیقاو گۆرانیدا.

الصَّحناء: جۆرە پێخۆرێكە لە گۆشتی ماسی بچوك دروست دەكرێ.

الصَّحونُ: ئەسپی راهێنراو و رام كراو.

الِصحَنة: قاپێكە وەكو لەگەن خواردنی تێدەكرێ.

صحا النائم صَحواً: نووستووەكە بە خەبەر هات.

صحا السكران: سەرخۆشەكە بەری دا، ئاسایی بۆوە.

صحا القلب: دڵ وەئاگا هاتەوە لە خەوی غەفڵەتو عیشق بازی بەخەبەر هات.

صحت السماء: ئاسمان ساو بوو هەوری پێوە نەما.

صحا الیوم: ئەمرۆ خۆرەتاو فێنك بوو، ئەمرۆ خۆرەتاو بوو، سەرمای كەم بوو.

أصحی: بەمانا (صحا) دێ ٥ كەوتە ناو حاڵەتی بەخەبەری‌و بە ئاگاییەوە ٥ كەوتە ناو ولاتێكەوە هەساو و خۆرەتاوە.

أصحی فلاناً: فلانكەسی بەخەبەر هێنا ٥ وای لێ كرد خەو یان بێهۆشی یان سەرخۆشی بەری بدا.

الصَّحوُ: دەگوترێ: (سماء صحو ویوم صحو) واتە بێ هەورەو ساڤو بێ گەردە.

الِمصحاة: پیاڵەو سوراحی شەراب كە لەزیو دروست كرابن ٥ (ك: مصاحٍ).

الَمصحاةُ: هەر شتێك خەم برەوێنێ، سەرخۆشی لابەرێ.

صَخِبَ الجمع صَخَباً: كۆمەڵەكە بوو بە زاوە زاو و قیرەو هەرایان.

صَخِبَ فلان: فلانكەس هاواری كرد قیڕاندی.

صَخِبَ البحرُ: دەریا كەوتە جونبوش‌و شەپۆل هاویشتن ٥ (فهو صاخِبٌ وهي صاخِبَةٌ) ٥ (وهو وهي صَخوبٌ).

صَاخَبَهُ: لە قیرەو هەراو هۆریادا پێشبڕكێیان كرد.

إصطَخَبَ القومُ: خەڵكەكە كردیانە هەراو هۆریاو لێكدان‌و پێكدادان ٥ (إصطَخَبَ الموجُ) شەپۆلەكان پێكیاندادا.

تَصاخَبَ: بەمانا (إصطَخَبَ)دێ.

صَخَّ الحجر صخّاً و صخیخاً: بەردەكان لەكاتی پێك كێشاندا دەنگیان لێوەهات.

صَخَّ فلاناً صخّاً: لە گوێچكەی فلانكەسی

داو كەڕی كرد ٥ دەشگوترێ: (صَخَّ سمعَهُ) و (صَخَّ الصوت أذنَهُ) دەنگەكە گوێچكەی كەڕكرد.

صَخَّ الصُّلب على الصُّلب: رەقی بە ڕەق كێشا دەنگی لێ هات.

أصَخَّ سمعه: گوێچكەی كەڕ كرد.

الـصَّاخة: گرمـەو دەنگـی گـەورە كـە ئەوەندە بە هێزبێ گوێچكە كەڕ بكا ٥ دەنگی كـەڕەنای هـاتنی قیامـەتو دونیا وێرانبوون.

الـصَّخَّةُ: دەنگـی بـەرد كەبـەر شتێـك بكەوێ.

صَخَدَ اليـوم صَـخَدَاناً: ڕۆژەكە گەرماكـەی بەهێز بوو.

صَخَدَت الشمسُ الشيئَ والأنسان صَخْداً: خۆر لەشتەكەی داو نەخۆشی خست هـەڵی پڕوكانـد ٥ دەشـگوترێ: (صَخَدَهُ الحرُّ) گەرمابردی نەخۆشی خست.

صَـخِدَ اليـوم صَـخَداً: ئـەمڕۆ گەرماكـەی بەهێز بوو (فهو صاخِد).

أصْخَدَ فلان: فلانكەس گەرمای لێ هات، كەوتە جەنگەی گەرما.

إصطَخَدَ الحِرباءُ: حیرباو جرپوجانـەوەر بـە گەرمای خـۆر بووژانـەوە گـەرم بوونەوە.

الصَّاخِدَةُ: گەرمای نیوەڕۆ.

الـمَـصْخَدَةُ: گـەرمای نیـوەڕۆ (ك: مَصاخِد).

الصَّيْخودُ: بەردی زۆر ڕەق ٥ دەگوترێ: (صَخدٌ وصَيخودٌ) شاخو ڕەقەنێـكە قولینگو پاچ كاری لێ ناكەن.

صَخِرَ المكان صَخَراً: شوێنەكە بەردەلانـەو شاخو ڕەقـەنی زۆرە ٥ (فهو صَخِرٌ وهـي صَخِرَة)

أصخَرَ المكـان: شـوێنەكە شاخو بـەردی زۆر بوو.

الـصَّاخِرُ: زرینگـەی ئاسـن كـە بەیـەك دەكەون.

الصَّاخِرَةُ: قاپی ئاو تێدا خواردنە كە لە سواڵەت درووست كرابێ ٥ گۆزیلكەی ئاو.

الـصَّخرَة: بـەردی گـەورەو ڕەق ٥ لـە زاراوەی جیۆلۆجیـادا بریتییـە لـە مادەیـەكی سروشـتی زەوی بـە زۆری لـە یـەك گـرتنو تێـكەڵ بـوونی دو (مەعـدەن) كانو زیـاتر پێـك دێ ٥ (ك: صَـخَرٌ و صُـخورٌ) ٥ (علـم الصّخر): زانیارییەكە لە شاخو بـەرد دەكۆڵێتـەوە لەچی درووست بووەو تایبەت مەندی چییەو چ جۆرێكە.

صَدِئَ الحديـد: ئاسـنەكە ژەنـگ دایپۆشی ٥ دەشگوترێ:

صَـدِأَت يـده مـن الحديـد: دەسـتی بـە

ئاسنەکە ژەنگاوی بوو.

**صَدِئَ فلان**: فلانکەس خەمۆكو سیس بوو ٥ دەشگوترێ:

**صَدِئَ القلب**: دڵ ژەنگی گرت.

**صَدِئَ اللونُ**: ڕەنگەکە ڕەشی تێکەڕا (فهو أصدأُ وهي صَداء) (ك: صُدءٌ).

**أصدأَ الحديدَ**: ئاسنەکەی واڵێ کرد ژەنگ بێنێ.

**الصَّدأ**: توێیەکی فشو کون کونە دەکەوێتە سەر ئاسنو مەعدەنی تر، بەهۆی وێکەوتنی پێکهاتەی هەوا پێی پەیدا دەبێ، بەزاراوەی کیمیا بەو پێکهاتەیە دەگوترێ: ئۆکسید ٥ هەروا (الصَّدأ) ناوە بۆ تەڵخو بەڵخێك دەکەوێتە سەر ڕوی شت.

**صَدَحَ الطائرُ صَدحاً و صِداحاً**: مەلەکە خوێندیو دەنگی بەرز کردوە ٥ دەگوترێ: (صَدَحت المُغنيةُ) ئافرەتە گۆرانی بێژەکە دەنگی لێ هەڵبڕیو کەوتە گۆرانی وتن ٥ (فهو صادِح وصداح وهي صادِحة وهي وهو صَدوح، ومِصدح).

**الصَّدحُ**: تەپۆڵکەی بچوكو ڕەقەڵان ٥ درکە شاخ ٥ (ك: صِدحان).

**الصَّيداحُ**: خاوەنی دەنگی بەهێزو ئاوازی گۆرانی.

**الصَّيدحُ**: بەمانا (الصَّيداحُ)دێ.

**صَدَّ عنه صَداً وصُدوداً**: ڕوی لێ وەرگێڕا.

**صَدَّ صداً**: نارِحەت بوو ڕوی وەرگێڕا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبيلِ﴾ ٥ (فهو صادّ وهي صادّةٌ).

**أصَدَّ الجرح**: برینەکە کێمو زوخاوی کرد.

**أصدّ فلاناً عن كذا**: فلانکەسی لەو شتە مەنع کرد.

**صَدَّدَ الجرح**: برینەکە کێمی کرد.

**الصَّدُّ**: واز لێ هێنانو خۆ گومکردنی دولبەر لە عاشقەکەی ٥ لایەنی شت ٥ ڕێڕەوی ئاو لەناو شیو و دۆڵدا.

**الصَّدَدُ**: لایەنو نزیك ٥ ئامانجو مەبەست ٥ بەرامبەر ٥ دەگوترێ (هذا الدار صَدَدَ هذه) ٥ (بصددها) بەرامبەری ٥ لە میانەی قسەکردندا دەگوترێ (لاحدد لي دونه ولا صَدَدَ) هیچ مانیعێکم نییە ٥ (هو بصَدَد كذا) ئەو خەریکی ئەو شتەیە سەرگەرمی ئەو شتەیە.

**الصَّديد**: کێمو زوخاو.

**صَدَرَ الأمر صدراً وصُدوراً**: ئەمرەکە مۆرکراو دەرچوو.

**صَدَرَ الشيئ عن غيره**: شتەکە وەدی هات، پەیدا بوو ٥ دەگوترێ (فلان يصدر عن كذا) فلانکەس هێزو دەسەڵات لە فلان شتەوە وەردەگرێ.

**صَدَرَ عن المكان والوِرد صَدراً:** لەشوێنەکە گەڕایەوە، پاشگەزبۆوە.

**صدر الی المکان:** گەیشتە ئەو شوێنە.

**صَدَرَ فلاناً:** فلانکەسی گێڕایەوە ٥ سنگی فلانکەسی هەنگاوت.

**صُدِرَ صَدراً:** سنگی ئازاری پەیداکرد.

**أصدَرَ الأمر:** فەرمانەکەی بلاوکردەوەو جێ بەجێ‌ی کرد.

**أصدَرَ فلاناً عن الشيئ:** فلانکەسی لەو شتە گێڕایەوە، مەنعی کرد.

**أصدَرَ القومَ:** خەڵکەکەی تێرکرد ٥ دەگوترێ: (أطعَمَهم حتی أصدَرَهم).

**أصدَرَ الرُّعاء دوابهم:** شوانەکان ئاژەڵەکانی خۆیان ئاوداو لەسەرئاوەکە گێڕایانەوە دواوە، قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان يُرِدُ ولا يُصدِرُ) دەست بە کارەکە دەکا بەڵام تەواوی ناکا.

**صَادَرَهُ علی کذا:** بە جەختو ئیلحاحەوە داوای لێ کرد.

**صادرت الدولة الأموالَ:** حوکومەت ماڵو سامانەکەی داگیر کرد ٥ دەستی بەسەردا گرت بەمەبەستی سزادانی خاوەنەکەی.

**صَدَّرَ الفرسُ:** ئەسپەکە لە غاردانو پێشبڕکێدا پێش ئەوانی تر کەوت.

**صَدَّر فلاناً:** فلانکەسی گێڕایەوە ٥ خستییە پێشەوەی مەجلیسەکە ٥ لە پێشەوەی مەجلیسدا داینیشاند.

**صَدَّرَ الکتابَ:** پێشەکی بۆ کتێبەکە نووسی.

**صَدَّرَ البضاعة:** کاڵاکەی لە وڵاتێکەوە نارد بۆ وڵاتێکی تر.

**تَصَدَّرَ الفرسُ:** بەمانا (صَدَّرَ) دێ.

**تَصَدَّرَ فلان:** فلانکەس لە پێشەوەی مەجلیس دانیشت ٥ پێش ئەتەوەکەی کەوت.

**أستَصدَرَ الأمرُ:** داوای دەرچوونی فەرمانەکەی کرد.

**الأصدَرُ:** سنگ پانو گەورە.

**الصَّادِرُ:** دەگوترێ: (ما لە صادر ولا وارد) نە دەرچوو نەهاتوو هیچی نییە ٥ (طریق صادر وارد): ڕێگای قەرەباڵغو ئاوەدان.

**الصادرات:** کاڵای وڵات کە ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێ.

**ألصِّدار:** پۆشاکێکە سنگ دادەپۆشێ (سوخمەی یەخە داخراو).

**ألصَّدارة:** پێشکەوتن، پێشەنگو پێشەوا، دەگوترێ: (فلان له الصَّدارة في القوم) ٥ لەلای زانایانی (نەحو) تایبەتمەندی وشەیەکە بەوەی کە

لەسەرەتای ڕستەوە بێ ٥ وەکو (أسماء الإستفهام).

**اَلـصَّدْرُ**: پێـشەوەی شـت ٥ دەگـوترێ: (صَـدْرُ الكتـاب) پێـشەکی کتێـب ٥ (صدر النهار) سەرەتای ڕۆژ ٥ (صـدر الأمر): سەرەتای کار.

**صدر القوم**: سەرۆکی نەتەوە.

**صدر الأنسان**: سنگی ئادەمیزاد.

(ذات الصدر) نەخۆشی سنگ (سیل).

(ذات الصدور) نهێنی ناودڵو دەروون.

**الصَّدَرُ**: گەڕانـەوە لـە نـاو خواردنـەوە ٥ یان گەڕانەوە لەکاری تر.

(یـوم الـصَّدرِ) ڕۆژی چوارەمی جـەژنی قوربـان ٥ چـونکە حاجییـەکان لـە مەککـەوە دەگەڕێنـەوە بـۆ وڵاتو شوێنی خۆیان.

**الصُّدرَةُ**: بەمانا (الصُّدرُ)دێ ٥ سوخمە ٥ چاکەتی بێ قۆڵ کە سنگ داپۆشێ ٥ زرێی کورت (ك: صُدَر).

**الصَّدِیرةُ**: لای سەروی شیو ٥ پێشەوەی دۆڵو شیو.

**المصدر**: چاوكو كانی شت ٥ ئەوەی شتی لێ وەدی دێ ٥ لـــــەلای زانــــا زمانەوانییەکان بریتییە لە ئیسمێك ماناکەی زەمانی لەخۆ نەگرتبێ.

**اَلْـمُصَدَّرُ**: دەگـوترێ: (رجـل مُـصَدَّرٌ) پیاوێکی سنگ پتەوی قایمو قۆڵە.

**صَدصَـدَ المنخـلَ**: بێژنێـكو کـەوگیرو گڵگیرەکـەی بەدەسـت هێنـاو بـردو لەرزاندی بۆ بەکارهێنانی.

**صَدَعَ النبات الأرض**: ڕوەکەکە سەری لە زەوی دەرهێناو دەرکەوت.

**صَدَعَ الزُّجاج ونحوه**: شوشەکەی شکاند.

**صَـدَعَ المـسافر الفـلاة**: ڕێبوارەکـە چۆڵەوانییەکەی بڕی.

**صَدَعَ القومَ**: خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد.

**صَـدَعَ الأمـر بـه**: کارەکـەی ئاشکراکردو ڕونـی کـردەوە قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾ ئـەوەی فـەرمانت پێ دەکرێ بیگەیەنەو بڵاوی بکەرەوە.

**صُدِعَ**: سەرئێشەی تووش بوو.

**صَدَّعَه تـصدیعاً وتـصداعاً**: زێـدە ڕەوی کرد لە گەیانـدنو ڕونکردنـەوەدا لـە شـکاندنو سـارا بـڕین دا ٥ توشـی سەرئێشەی کرد.

**صُـدِّعَ**: بـەمانا (صُـدِعَ)دێ ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾.

**تَصَدَّعَ**: شەق بـوو قەڵشا ٥ درزی بـرد ٥ دەگوترێ:

**تـصَدَّعت الأرض بالنبـات**: زەوی شـەق بوو بەسەر دەرهێنانی ڕوەك لێی.

**تـصَدَّعَ القـومُ**: خەڵـکەکە پەرتـەوازە بوون.

إنصَدَعَ: شەق بوو ە درزی برد.

إنصَدَعَ الصُبحُ: بەیانی شەبەقی دا ە کازیوەی بەیان دەرکەوت.

التَصَدُّع: لە (جیۆلۆجی)دا بریتییە لە تێکشکانی شاخو بەرد بەهۆی هێزی زۆرەوە.

الصّادِعُ: دادوەر لەنێوان قەوم دا.

الصُداعُ: سەرئێشە، ئازاری سەر کە هۆکارەکانی زۆرن.

الصَّدعُ: درزو شەق بوون لە شتی رەقدا ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ ە (ك: صدوع).

الصَّدعَةُ: نیوەی شتی شەق بوو، درز تێ بوو بۆ دووکرەت ە جەڵەبە ئاژەڵ.

الصَّدیعُ: شەق کراو ە نیوەی شتی دوولەت کراو.

صَدَغَ الی الشیئ صُدوغاً: مەیلی بۆلای شتەکە کرد.

صَدَغَ عن طریقه: لە رێبازی خۆی لایدا.

صَدَغَ فلاناً صَدغاً: لە لاجانگی فلانکەسی دا ە خواریەکەی راست کردەوە.

صَدَغَ البَعیرَ وغیرَه: لاجانگی حوشترەکەی داغ کرد ە نیشانەی کرد.

صَدَغَ فلاناً عن الأمر: فلانکەسی لە کارەکە لادا.

صَدَغَ صَداغَةً: لاواز بوو ە (فهو صدیغ وهي صدیغة).

صادَغَهُ: بەرامبەری کرد شان بەشانی یەکتر رۆیشتن.

تَصَدَّغَ: سەرینی بۆ لاجانگی خۆی دانا.

الأصدَغان: دوو رەگن لە خوار لاجانگەوەن.

الصِّداغُ: نیشانەیەکە بە درێژی لەسەر لاجانگ دروست دەکرێ.

الصُّدغُ: نێوان قولینچکی چاو و گوێچکە ە زوڵفو لاجانگ ە (ك: أصداغ وأصدُغ).

المِصدَغَةُ: سەرین ە (ك: مصادِغ).

صَدَفَ عنهُ صَدفاً وصُدوفاً: روی وەرگێرا مەیلی کرد.

صَدَفَ فلاناً عن الشیئ صَدفاً: فلانکەسی لە شتەکە لادا.

صَدِفَ صَدفاً: لە رۆیشتن دا ئەژنۆکانی رویان لەیەك بوو لێك دەدران ە (فهو أصدف وهي صدفاء) (ك: صُدف).

أصدَفَهُ عن الشیئ: لە شتەکەی لادا، لە شتەکەی گێرایەوە.

صادَفَهُ مصادفةً: روبەروی بۆوە بە رێکەوت تووشی یەکتر بوون بەبێ ئەوەی هیچ وادەیەکیان لە بەینا هەبێ.

تصادفا: بە رێکەوت بەیەکتر گەیشتن.

**تَصَدَّفَ له:** پێشی پی گرت ◦ بەرپەرچی دایەوە.

**تَصَدَّفَ عنه:** ڕوی لێ وەرگێڕا.

**الصُّدَف:** روتێکردنی ئەژنۆکانە بۆلای یەکتر لەکاتی ڕۆیشتندا ◦ هەرشتێک گەورەو بەرزو مەبەست بێ، وەکوو نیشانە، دیوار، کێو ◦ لایەنو پەناو قەراخ.

**صَدفا الجَبَلَ:** ئەملاو ئەولای کێوە بەرامبەر بە یەکتر بن ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا﴾ ◦ پەردەو توێکڵو سەدەفی مرواری ◦ تاکەکەی (صدفة) (ك: أصداف).

**الصَّدَفَةُ:** کرکراگەی گوێ.

**الصَّدفتان:** دوو حەوزی کلۆت کەسەری ئێسقانی ڕانی تێدایە.

**الصَّدوفُ:** ئافرەتێک ڕوی خۆی نیشان بینەر بداو خێرا ڕوی وەرگێڕێ ◦ دەم بۆگەن.

**صَدَقَ فلان في الحديث:** فلانکەس ڕاستی وت ◦ ڕاستگۆ بوو ◦ واقیعی روون کردەوە.

**صَدَقَ في القتال ونحوه:** بە هێزو تواناو وەرەبەرزییەوە ڕوی کردە گۆڕەپانی شەڕ.

**صَدَقَ فلاناً:** هەواڵی ڕاستی بە فلان گوت ◦ دەشگوترێ (صَدَقَه الحديثَ) بۆ هەمان مانا.

**صَدَق فلاناً النصيحة والأخاءَ:** بەڕاستیو دڵسۆزی ئامۆژگاری فلانی کردو برادەرایەتیو دۆستایەتی ڕاستەقینەی لەگەڵدا بەست.

**صدَق فلاناً الوعدَ:** پابەندی وادەو بەڵێنی خۆی بوو بۆ فلانکەس ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ ◦ (فهو صادِق) ئەو ڕاستگۆیە (فهو صَدوق) زۆر ڕاستگۆیە ◦ (ك: صُدقٌ).

**أصدق فلاناً:** فلانکەسی بە ڕاستگۆ لە قەڵەم دا.

**أصدَقَ المرأة:** مارەیی دا بەئافرەتەکە ◦ مارەیی بۆ بڕیار دا.

**صادَقَه مصادقةً وصِداقاً:** کردیە دۆستو برادەری خۆی.

**صادق فلاناً المودة والنصيحة:** بە دڵسۆزی خۆشەویستیو ئامۆژگاری خۆی بۆ فلانکەس دەربڕی.

**صَدَّقَه وصدّق به تَصديقاً وتَصداقاً:** دانی نا بەڕاستگۆیی ئەو ◦ قسەی خۆی بردە سەرو ئاواتی خۆی هێنایە دی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ﴾.

**صَدَّقَ على الأمر:** فەرمانەکەی تەصدیق کرد، واژوی کرد.

تَصادَقَا: بوون به هاوڕێی یەکتری‌و یەکتریان خۆش ویست.
تَصادَقَا الحدیث: هەریەك لەو دوانە قسەی ڕاستیان بۆ یەکتر کردو ڕاستگۆ بوون لەگەڵ یەکتر.
تصادقا علی الأمر: هەردوکیان فەرمانەکەیان پەسەند کردو پێی ڕازی بوون ٥ دانیان نا بە واقیعەکەدا.
تَصَدَّق علیه: خێری پێ کرد، یارمەتی دا بە ماڵ‌و سامان، زەکاتی دایە.
التَّصدیق: لەلای مەنطیقەکان بریتییە لە دەرك کردنی حوکم‌و نیسبەت لەنێوان دوولایەی قضیەدا ٥ لەبواری یاسای نێودەوڵەتیدا بریتییە لە ڕازی بوون‌و واژو کردنی سەرۆکی دەوڵەت بۆ پەیمان نامەیەك کە لە نێوان وڵاتەکەی‌و وڵاتێکی تردا بەستراوە یان هەرشتێکی لەو جۆرە.
الصَّادِقُ: دەگوترێ: (تمر صادق الحلاوة) خورمایەکی شیرینە ٥ (هو صادق الحكم) ئەو دڵسۆزە لە بڕیارەکەی داو هیچ شتێك ڕاستیی پێ ناگۆڕێ ٥ دەگوترێ: (فجر صادق) سپیایی کەناری ئاسمان کە بڵاو دەبێتەوەو سەرەتای ڕۆژێکی تری تازە دەست پێ دەکا، لە پێش ئەوە فەجری کازیب هەیە کە بەدرێژی بەرەو خۆرئاوا ستونی دیاریی دەدا.
الصَّادِقَة: مێینەی (الصادق).
الصَّدَاق: مارەیی ژن (ك: أصدِقَة، وصُدَق)
الصَّدَاقَة: دۆستایەتی‌و پەیوەندی نێوان برادەرو خۆشەویستان.
الصِّدِّیق: ئەوکەسەی هەمیشە پشتگیریی حەق‌و ڕاستی دەکا ٥ زێدە ڕەوی دەکا لە ڕاستگۆییدا ٥ ئەو کەسەی کردەوەکانی پشتگیریی لە قسەکانی دەکا ٥ قسەو کردەوەی وەکو یەك وان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا﴾ ٥ هەروا وشەی (الصّدیق) نازناوی حەزرەتی ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ).
الصِّدْقُ: تەواو لە هەموو شتێك دا ٥ دەگوترێ: (رمح صدق) ڕمێکی ڕاست‌و ڕەقە ٥ (رجلٌ صَدقُ اللقاء) پیاوێکی خۆڕاگرە لەکاتی ڕوو بە ڕووبوونەوەی دوژمن.
الصِّدْقُ: ڕاستگۆیی، ڕێکهاتنەوەی قسە بۆ واقیع، خۆڕاگری‌و ورە بەرزی ٥ دەگوترێ: (رجل صِدقٌ) (وإمرأة صِدقٍ) ٥ کاروباری ڕاست‌و بێ

عەیبو دوور لە کەمو کوڕیو درۆو پێچو پەنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ﴾.

الصَّدُقَةُ: مارەیی ئافرەت ٥ (ك: صَدُقات) قورئان دەفەرموێ: ﴿وَآتُواْ النِّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً﴾.

الصَّدَقَةُ: خێرو خێرات، ئەوەی کە خاوەنی دارایی دەیدا بە هەژاران بۆ رەزامەندی خوداو بەنیازی خێر.

الصَّدِيقُ: هاوەڵی دڵسۆزی راستەقینە ٥ (ك: أصدِقاء وصُدَقاء) جاری وا هەیە بەو شێوە بۆ تاكو كۆو بۆ نێرو بۆ مێ بەکاردەهێندرێ دەگوترێ: (هو صديق وهم صديق وهي صديق وهن صديق).

الماصَدَق: لە زاراوە مەنتیقیەکان دا ئەو تاکانەن کە مانای کولییەکەیان تێدا بەرجەستە دەبێ وەکوو (ئازادو وریاو حسنو حسین رسول و مامەند....) دەبنە (ماصَدَق)ی ئادەمیزاد کە مەفهومێی کولییە.

مِصداق الأمر: بەڵگە لەسەر راستی شتەکە ٥ (صَدَمَ الشيءُ الشيءَ صَدماً) شتەکە لە شتەکەی دا پێکیان کێشا ٥ پاڵی پێوەنا ٥ دەگوترێ: (صَدَمَ الرجل غيره) پیاوەکە پاڵەپەستۆی غەیری خۆی دا.

صَدَمت النازلة فلاناً: بەڵاو کارەسات ناگەهان یەخەی فلانکەسی گرت.

صَدَمَهُ بالقول: بەقسە بۆڕی داو بێ دەنگی کرد.

صادَمَهُ مُصادَمَةً وصِداماً: بەرگری کردو پاڵی پێوەناو بەرەنگاری بووە.

إصطَدَما: ئەو دوانە هەریەکەیان بەرەنگاری ئەوی تریان بۆوە.

تَصادما: بەمانا (اصطدما) دێ ٥ دەشگوترێ:

تصادمت الآراء: بیرو ڕایەکان جوداوازو دژبەیەك بوون.

الصَّدمَةُ: پاڵنانی لەناکاو بە شێوەی تەکان ٥ دەگوترێ: (صَرَعَهُ بِصدمة) بە راتەکاندن و پاڵنانی گوزوگوممەت خستی.

صَدِيَ صَدىً: تینوایەتی پەرەی سەند ٥ (فهو صادٍ) ٥ (ك: صُداة) ٥ (وهي صادية) ٥ (ك: صوادٍ) ٥ (وهو صدٍ وهي صدية) ٥ (هو صديان وهي صَديا).

أصدى الجبلُ: کێوەکە دەنگەکەی دووبارە کردەوە.

صاداه: بەرهەڵستی کرد، لەگەڵیدا هەڵی کردو مەدارای کرد.

صدّى فلان بيديه تصدية: فلانکەس بەهەردوو دەستی چەپڵەی لێ دا ٥

قورئـان دهفـهرموێ: ﴿وَمَـا كَـانَ صَـلاتُهُمْ عِنـدَ الْبَيْـتِ إِلاَّ مُكَـاء وَتَصْدِيَةً﴾.

تَـصَدّى للأمـر: سـهری بـهرزكردهوهو بۆكارهكـهى ڕوانـى بزانـێ چـيهو چۆنه.

تـصَدّى لفـلان: بهرپهرچى فلاَنكهسى دايـهوه ٥ ڕوى لـه فلاَنكـهس كـردو ويستى قسهى لهگهڵ بكا ٥ قورئـان دهفهرموێ: ﴿أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى، فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى﴾.

الـصَّدى: تينوايـهتى زۆرو كوشـنده ٥ گێڕانهوهى دهنگ كه شاخ دووبـارهى دهكاتـهوه، دهگـوترێ: (صَـمَّ صَـداه) خپ بوو دهنگى نهما فهوتا ٥ (أصَـمَّ الله صداه) خودا لهناوى برد ٥ ههروا وشـهى (الـصَّدى) بـهمانا پـاش بهڕێوهبردنو پهروهردهكردنى ماڵو سامانه ٥ دهگوترێ: (هو صَدى مـال) ٥ باڵندهيهكى ئهفسانهييه لـه كۆنـدا پێيان وابووه لهسـهرى كوژراو دێتـه دهرهوه هـهر هـاوار دهكـا تينوومـهو ئاوم بدهنێ هـهتا تۆڵهى كوژراوهكه دهكرێتهوه ئهوجا بێدهنگ دهبێ.

صَرَبَ اللَّبَنَ صَـرباً: ماستهكهى كرده نـاو مهشكهوه بۆ ئهوهى تـرش بـێ بترشێ.

صَـرَبَ اللـبن في الـضرع: شـيرهكهى لـه گوانهكـهدا هێـشتهوهو نهيدۆشـى ٥ دهشگوترێ: (صَرَب البولَ).

صَرِبَ اللبنُ صَرِباً: شيرهكهى لـه گوانهكـهدا كۆبۆوه.

إصطَرَبَ اللبنَ: ماستهكهى لـه مهشكهدا ورده ورده كـۆكردهوهو لێـى گـهڕا ترشاو بوو به تۆڕاخ.

الصَّرَبُ: شيرى ترشاو ماستى ترش.

الـصَّرِيبُ: صـهمغى سـوور ٥ ماسـتى ترش.

المِصرَبُ: قاپى گـهوره، مهنجـهڵ ديـزهى گهوره، ماستيان تـێ بكـرێو وازى لێ بێنن تا دهترشێ ٥ (ك: مصارب).

صَرَّجَ البناءَ: باڵه خانهكهى بـه صـاروج بۆيه كرد.

الصَّاروج: تێكهڵهيهكه بهكاردههێنـرێ بـۆ بۆيـهكردنى ديـوارى باڵهخانـهو شتى وا.

صَـرَّحَ الأمـر صَـرحاً: كارهكـهى ئاشكراكردو ڕوونى كردهوه.

صَرُحَ الـشيئ صراحةً وصُرُحةً: شتهكه لـه خهوشو توێـكڵو پوشو پـهلاَش پـاك بۆوه (فهو صريح) (ك: صُرحاء وصِراح) بۆ عاقڵمهند ٥ (صرائح) بۆ ناعاقڵ.

صَارَحَ بما في نفسه: ئـهوهى لـه دهروونيا بوو دهرى خست.

صارحَ فلاناً بالأمر: ڕاستهوخۆ دهربارهى

کارەکە قسەی لەگەڵ فلاندا کردو بەرەو روی ئەوی کردەوە.

صَرَّحَ الشيئ: شتەکە دەرکەوت و ئاشکرا بوو ◦ دەگوترێ:

صَرَّحَ الحق: حەق و ڕاستی دەرکەوت و ئاشکرا بوو.

صَرَّحت الخمر: شەرابەکە کەفەکەی هەڵداو خاڵص بوو هیچی پێوە نەماو صاف و بێگەرد بوو.

صَرَّحَ النهارُ: ڕۆژەکەی خۆش کرد هەوری نەماو خۆر دەرکەوت و دونیا گەرمی بووە.

صَرَّحَ الأمرَ: کارەکەی دەرخست ◦ (صَرَّحَ بالأمر) لەبارەی کارەکەوە دواو قسەی لەسەر کرد.

تَصَرَّحَ: بەمانا (إنصَرَحَ) دێ ◦ دەشگوترێ (تَصَرَّحَ الزَّبد عن الخمر) کەف و بەڵغەکە لە شەرابەکە جیا بۆوە.

التَّصريح: ڕونکردنەوەو ڕا دەربڕینی حوکومەت یان وتە بێژی فەرمی حوکومەت و دامەزراوەو پرۆژەو شتی وا بە بەیاننامەیەك دەربارەی کارێکی ئیداری یان سیاسی یان سەربازی ...هتد ◦ یان ئیزن وەرگرتن بەکارێك لە کەسێك خاوەنی دەسەڵاتی ئیزن دان بێ.

الصَّراحُ: پاك و بێ خەوش لە کەف و بەڵغ و پل و پوش ◦ دەگوترێ: (نسب صُراح) نژادو بنیچەیەکی خاوێن ◦ (خمر صُراح) شەرابی خاڵص و بێ غەش ◦ (تکلم به صُراحاً) بە ئاشکرا قسەی دەربارەی کردو رونی کردەوەو پەردەی لەسەر لادا.

الصَّراحة في الخبر: ئاشکراو بێ چەندو چوون و بێ پێچ و پەنا.

الصَّرْحُ: باڵەخانەی بەرز، بینای هەڵچوو بەئاسماندا ◦ بەزاراوەی تازە (ناطحة السحاب) ئەو باڵەخانەی ئەوەندە بەرزە شەڕ لەگەڵ هەور دەکا ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ﴾.

الصَّرْحَةُ: گۆڕەپانی خانوو حەوشەی ماڵ.

الصَّريحُ: خاڵص و پاڵفتە لە تلپ و کەف و بەڵغ و پل و پوش ◦ ئاشکراو نمایان.

صَرَخَ صُراخاً وصريخاً: نەڕاندی، بە هەموو هێزی هاواری کرد ◦ داوای یارمەتیدان و بە هانەوە چوونی کرد.

أصرَخَهُ: بە هانەیەوە چوو.

تَصَرَّخَ: لە هاوارکردنەکەیدا تەکەللوفی بەکار هێنا، بە نابەدڵی هاواری کرد.

**إصطَرَخ**: هاواری کرد، داوای یارمەتیو بە هاناوە چوونی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا﴾.

**تصارخوا**: هاواریان کرد ٥ دەق بەمانا (إصطرخوا)دێ.

**إستَصرَخَهُ**: هاواری بۆ بردو داوای یارمەتی لێ کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ﴾.

**الصَّارِخُ**: هاوار کەرو پەنا هێن ٥ بە هاناهاتوو یارمەتیدەر.

**الصَّارِخَةُ**: دەنگی هاوار کەرو پەناهێنەر.

**الصَّاروخ**: صاروخ: هاوێژراوێکی ئاگراوییە ٥ درێژو لای سەرەوەی باریك، هەڵدەدرێ بۆ شوێنی دوورو بۆشایی دوور بڕییەکەی بەهۆی تەقینەوەی ئەو گازانەیە کە لە بنکی صاروخەکەدا بۆ قۆناغەکانی ڕۆیشتنەکەو بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو دادەنرێ.

**الصَّرِيخ**: هاوارکردن بۆ ئەوەی فریای بکەون ٥ ئەو کەسەی کەوتۆتە تەنگانەو هاواری فریاکەوتن دەکا ٥ ئەوکەسەی فریای دەکەوێو بە هانایەوە دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾.

**صَرِدَ صَرَداً**: سارد بوو ٥ دەگوترێ: (صَرِدَ اليوم) ئەمڕۆ ساردبوو (وصَرِدَت الريح) بایەکە (هەواکە) سارد بوو.

**صَرِدَ السَّهم**: تیرەکە هەڵەی کرد نەی پێکا.

**صَرِدَ عن الشيئ**: لێی لاداو بۆی نەچوو، نەی ویست.

**أصرَدَ السَّهمُ**: تیرەکە نەی پێکا.

**صَرَّدَ الشيئ**: شتەکەی کەم کردەوە ٥ دەگوترێ: (صَرَّدَ عطاءه) بەخشینەکەی کەم کردەوە.

**صَرَّدَ الأناء**: ئەوەندەی ئاو کردە سوراحیەکەوە کە بەشی تێر ئاو بوون نەکا.

**صَرَّدَ فلاناً**: ئەوەندەی ئاودا بە فلانکەس کە تینوایەتی نەشکێ.

**صَرَّدَ شربه**: قوم قوم ئاوی دایە، چۆڕ چۆڕ ئاوی دایە.

**الصَّاردة**: هەوای ساردو سەرما، (ك: صَوارِد).

**الصِّرْدُ**: پاڵفتە کراوو کاکڵەی شت ٥ دەگوترێ: (ذهب صِرْدٌ) زێڕی خاڵصو پوخت (نبيذٌ صِرْدٌ) سرکەی پاڵفتە ٥ (حُبٌّ صِرْدٌ) خۆشەویستی بێ غەلو غەش ٥ (جاء معه جيش صُرْدٌ) هێزێکی لەگەڵ هات

هەموویان خزمو کەسو کاری یەکتر بوون، کەسی بێگانەیان لەگەڵ نەبوو ٥ هەروا وشەی (الصَّرد) بەمانا سەرمای زۆرە ٥ ساردییەکی زۆر بەهێز ٥ (ك: صرود).

**الصُّرَد**: باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە، سەر گەورەو دەندووك گەورەیە جرو جانەوەری بچووك ڕاو دەکا ٥ وادەبێ چۆلەکەش نێچیر دەکا ٥ عەرەبەکان بە باڵندەیەکی شومیان داناوە.

**الصُّردان**: دوو ڕەگن لەناو زماندان.

**الصُّرَادُ**: بای سارد کە تەڕایی لەگەڵدا بێ.

**الصَّريدة**: مەڕێك سەرما کاری لێ کردبێ (ك: صَرائد).

**المِصرَادُ** (أرض مِصراد): زەوییەکی بێ بەرو بووم بەهۆی ساردو سەرماوە ٥ (رجل مِصراد) پیاوێکی سەرما بردە کە زوو سەرمای ببێ ٥ (ريح مِصراد) بای زۆر سارد (ك: مَصَاريد).

**صَرَّ صريراً**: دەنگی لێ هات ٥ سیڕەی لێ هات، جریوەی هات ٥ جیڕەی هات ٥ دەگوترێ: (صَرَّ العصفورُ والجُندُبُ وصَرَّ القلم وصَرَّ البابُ).

**وصَرَّت الأذنُ**: گوێچکەی کرە کرِی لێ هات.

**صَرَّ الناقةَ صراً**: گوانی حوشترەکەی بەست بۆ ئەوەی بێچووەکەی شیری بۆ لێ نەخورێ.

**صَرَّ الدراهم**: دیرهەمەکانی خستنە ناو کیسەی تایبەتییەوەو دەمی کیسەکەی بەست.

**صرَّ الصُّرَّةَ**: کیسە پارەکەی توند بەست.

**صَرَّ وجهه**: ناوچەوانی لێك ناو روی گرژ کرد.

**صَرَّ الفرسُ أو الحمارُ أو الكلبُ**: ئەسپەکە یان گوێدرێژەکە یان سەگەکە گوێچکەی جووت کردن ٥ گوێی قوڵاغ بوو.

**صُرَّ النبات**: ڕووەکەکە سەرما لێی دا.

**صُرَّ فلان**: فڵانکەس رژدو چرۆك بوو.

**أصَرَّ على الأمر**: لەسەر کارەکە سوور بوو وازی لێ نەهێنا ٥ بەزۆری بۆ تاوان بەکاردەهێنرێ ٥ دەگوترێ: (أصرَّ على الذنب) ٥ (أصَرَّ على شرب الخمر ٥ أصرَّ على الكفر).

**أصرَّ السنبلُ**: گوڵە دانەوێڵەکە نە کامڵ بوو دەنکەکەی هەڵنەپێچابوو.

**أصرَّ الناقة**: حوشترەکە شیری تێدا نەماو وشکی کرد.

**صارَّه على الشيئ**: تویزی لێ کرد بۆ کردنی کارەکەی.

١ تصوير زيتي ◆ ٢ تصوير مائي ◆ ٣ تصوير بالقلم الفحمي ◆ ٤ تصوير بالأقلام الملوّنة ◆ ٥ مطرقة ◆ ٦ منقش أو إزميل ◆ ٧ مسطار ◆ ٨ مبرد ◆ ٩ لوحة الألوان ◆ ١٠ فرشاة ◆ ١١ قلم الفحم ◆ ١٢ أقلام ملوّنة ◆ ١٣ أنبوب الألوان الزيتية ◆ ١٤ علبة الألوان المائية ◆ ١٥ نقش على الخشب ◆ ١٦ نحت ◆ ١٧ نقش على الجص ◆ ١٨ نقش بارز

صَـــرَّرَ الناقـــةَ: زۆر تونـــد گـــوانی حوشترەکەی شەتەك دا بـۆ ئـەوەی بێچووەکە نەتوانێ شیری لێ بخوا.

إصطَرَّ الحافرُ: سمەکە ڕەق‌و پتەو بـوو ٥ دەگـوترێ: (جـــاء فـــلان يَـــصطَرُّ) فلانکـەس هـات بـە تـوڕەیی‌و هـاوار هاوارەوە.

الصّارُ: درەختی پـڕ گـەڵاو لق‌و پۆپو چڕو پڕو سێبەرخۆش.

الصَّارة: پێویستی (ك: صوارٌ).

الصَّارور: ئەو کەسەی ژنـی نـەهێنابێ ٥ حەجی نەکردبێ.

الصَّارورة: بەمانا (الصَّارور)دێ.

الـصِّرارُ: دەزوو بەنێـکە لـە بنـی گـوان دەبەسترێ بۆ ئەوەی بێچووەکە شیر نەخوا ٥ پەردەو لەمپەرو بەربەست ٥ (ك: أصِرَّةٌ).

الـصِّرُّ: سـەرمای کوشـندە، هـەوای زۆر سارد ٥ دەگـوترێ: (ريح صِـرٌّ و ريـح فيهـــا صِـــرٌّ) قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾.

الصُّرَرُ: گوڵی دانەوێڵە کە دانەوێڵەکەی هەڵنەپێچابێ کامڵ نەبووبێ.

الصّرّاء: بەردی لووس.

الصِّرّة: کۆمـەڵ‌و تـاقم ٥ هـات‌و هـاوارو قیـــژو هـــوڕ ٥ کوشـــندەی بـــەڵاو ناخۆشیی‌و شەڕو گەرما ٥ دەم‌و چاو گـرژ بـوون بـەهۆی نارەزامەنـدیی‌و پـێ نـــاخۆش بوونـــەوە ٥ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿فأقبلت إمرأته في صَرَّةٍ﴾

الـــصُّرَّةُ: نـــەڕەو هـــاواری بـــەهێز ٥ کوشندەی سەرما.

الصُّرَّةُ: ئەوەی شتی تێ دەکرێ‌و دەمـی دەبەسـترێ وەکـو کیـسەو تورەکـەو هەمبانەو جانتا ٥ (ك: صُرَرٌ).

الـصَّريدة: دیرهـەم‌و پـارەی نـیکڵ کـە بەسترابن.

المَصارُ: ڕیخۆڵە، دەگوترێ: (شَرِب حتـى ملأ مَصارّه) ئەومنـدەی خـواردەوە تـا ڕیخۆڵەکانی پڕ بوون.

صَرصَرَ: بـە دەنگـی گـەورەو پـچڕ پـچڕ هـاواری کـرد ٥ دەگـوترێ: (صَرصَـرَ فلان و صَرصَرَ البازي).

صَرصَرَ الدّوابّ: ئاژەڵەکانی خڕ کردەوە ئـــەملاو ئـــەو لای مـــەڕو بزنـــە زۆرەکـانی بەسـەریەکدا دادایـەوەو ئاژەڵـــە تـــەرەبوو و بڵاوەکـــانی خستەوە گەڵ جەڵەبەکە.

هەروا بەمانا: سەرمای کوشندەو دەنگی گـەورەش دێ، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ﴾.

الـــصُّرصور: سیـــسرە، حەشـــەرەیەکی

زیانبەخشەو بە زۆری لە تەوالێتو شوێنی ئاوادا دەژی، شاخی درێژی لە تاڵە موو هەن ٥ زۆربەی کات دەنگی سیرە سیری هەیە (ك: صَراصیر).

الصِّراط: رێگا.

صَرَعَهُ صَرعاً ومَصرعاً: خستییە سەر زەوی، خپی کرد ٥ دەگوترێ: (صرعته المنية) مردن فلانکەسی خپ کرد ٥ تارومارى كرد.

صَرَعت الريح الزرع: رەشەباكە كشتو كاڵەكەی لاڵ پاڵ خست ٥ (فهو مصروع وصريع).

صَرَّعَ الباب: دەرگاكەی كردە دوو تاكی.

صُرِعَ فلان: فلانكە تووشی پەركەمو فێ لێ هاتن بوو ٥ شەپلەی لێ هات.

صارعَه مُصارعةً وصِراعاً: لە زۆرانبازیو پاڵەوانێتیدا بەسەریدا زاڵ بوو، بۆری دا.

صَرَّعَهُ: زۆر بەهێز بە زەویدا دا.

صَرَّعَ الباب: دەرگاكەی كرد بە دوو تاكی.

صَرَّعَ البيت: هەردوو تاكی شیعرەكەی واڵێ كردن سەروایان یەك بێ.

إصطرعَ القوم: خەڵكەكە كەوتنە كێشەو زۆرانبازیو یەكتر هێنانو بردن.

تصارع الرجلان: ئەو دوو پیاوە هەریەكەیان هەوڵی دا ئەوی تر بە زەویدا بدا ٥ خپی بكا.

الصَّرْعُ: نەخۆشییەكە لە كۆئەندامی دەماردا پەیدا دەبێ لەگەڵیدا بێ هۆشیو گرژبوونی ماسولكە پەیدا دەبن بەكوردی پێی دەگوترێ فێ، پەركەم.

الصِّرعان: دوو لایەنی شت ٥ دەگوترێ: (للأمر صِرعان) ئیشەكە دووسەرەو دوولایەنە ٥ (جئته صَرعَي النهار) بەیانیو ئێوارە هاتم بۆ لای ٥ (هو ذو صِرعين) ئەو دوو ڕەنگە.

الصِّرْعُ: هاوشێوە ٥ جۆرو فەنی شت ٥ دەگوترێ (ما أدرى على أي صِرعي أمره هو) نازانم ئەو لەسەر چ ڕێو شوێنو بابەتێكە ٥ هەروا بەمانا (المصارع)دێ ٥ دەگوترێ: (هما صِرعان) ئەو دوانە دوو پاڵەوانی زۆرانبازی گۆڕەپانن.

الصُّرعةُ: پاڵەوانێكە زۆر كەس بیخەنو بەزویدا بدەن.

الصُّرَعَةُ: پاڵەوانی سەركەوتوو لە زۆرانبازیدا ٥ دەگوترێ: (رجلٌ صُرَعَةٌ وقوم صُرَعَةٌ).

الصَّريعُ: تێشكاو و بۆڕدراو لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا ٥ لاڵو پاڵ كەوتو، خپ بوو، داهێزاو شپرێو ٥ شێتو

وێت.(ك:صرعى)

**المصارعَة**: وەرزشێكی جەستەییە هێزو توانای تێدا بەكار دەهێنرێ، لە نێوان دوو پاڵەواندا ئەنجام دەدرێ و لە گۆڕەپانداو لە ژێر چاودێری حەكەم و بە پێی بڕی یاسای تایبەت بەو وەرزشە ئەنجام دەدرێ ٥ هەریەكە لە دوو پاڵەوانەكە هەوڵ دەدا بەرامبەرەكەی بۆڕ بدا.

**المِصراع**: تاكی دەرگا ٥ یەكێ لە دوو تاكی دەرگا كە یەكیان بەلای چەپەو ئەوی تریان بەلای ڕاستدا دەكرێنەوە ٥ هەروا ناوە بۆ نیو دێڕ شیعر ٥ شیعریش دوو تاكی هەیە یەكیان پێی دەگوترێ (صدر) ئەوی تریان (عجز).

**صَرَفَ البابُ أو القلمُ**: دەرگاكە جیڕەی كرد، قەڵەمەكە سیڕەی هات.

**صَرَفَ نابُهُ وصرَفَ بنابه**: ددانی جیڕەیان هات ددانی لە جیڕەوە بردن.

**صَرَفَ الشيئ صَرفاً**: شتەكەی لە ڕێڕەوی خۆی گێڕایەوە، دەگوترێ: (صَرَفَ الأجيرَ من العمل) كرێكارەكەی لە ئیشەكە گێڕایەوە نەیهێشت بیكا ٥ (صرف الغلام عن المكتب) منداڵەكەی لە مەكتەب گەڕاندەوە.

**صَرَفَ المال**: ماڵەكەی بەخشی بەسەر ئاتاجاندا.

**صَرَفَ النقدَ**: پارەكەی گۆڕییەوە بە پارەی تر یان بەپارەی وردە.

**صَرَفَ الكلام**: قسەكانی ڕازاندەوە.

**صَرَفَ الشرابَ**: شەرابەكەی تێكەڵ شتی تر نەكرد.

**اصرَفَ الشَّراب**: بەخاڵصی شەرابەكەی پێشكەش كرد، هیچی تری تێكەڵ نەكرد.

**صارَفَ نفسه عن الشيئ**: بە زۆر لە خۆكردن نەفسی خۆی لە شتەكە گێڕایەوە.

**صَرَّفَ الأمر**: كارەكەی جێبەجێ كردو خستیە سەر ڕێڕەوی خۆی ٥ دەشگوترێ: (صرف الله الرياحَ) خودا بایەكەی لادا بۆ شوێنێكی تر ٥ هەروا وشەی (صَرَّفَ) بەمانا ڕونكردنەوەش دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾.

**صَرَّفَ الألفاظ**: هەندێ وشە لە هەندێكی تریان دەرهێنراون.

**صَرَّفَ الشرابَ**: شەرابەكەی بە خاڵصی هێشتەوە هیچی تری تێكەڵ نەكرد ٥ زێدە ڕۆیی كرد لە گێڕانەوەی شتەكە لە شوێنی خۆی.

**إصطَرَفَ**: گەڕا بەشوێن كاسبی دا،

هەوڵی کاسبی کردنی دا.

**إنصَرَفَ عنه**: لێی لاداو وازی لێ هێنا، بەجێی هێشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ انصَرَفُواْ صَرَفَ اللّهُ قُلُوبَهُم﴾.

**تَصَرَّفَ فلان في الأمر**: فلانکەس لە کارەکەدا فرتو فێڵو پلانی ئەنجامدان بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێ، یان لە شتێك ڕزگاری بێ.

**تَصَرَّفَ لعياله**: کاسبی بۆ ماڵو منداڵەکەی کرد.

**تَصَرَّفَ به الأحوال**: حاڵو وەزعی جۆراو جۆری بەسەردا هاتن ٥ بارو دۆخی ژیانی گۆڕان.

**إستَصرَفَ الله المكاره**: داوای لە خودا کرد ناخۆشییەکانی لەسەر لابەرێ.

**تصاريف الأمور**: گۆڕانکاریی ڕوداوەکانی ژیانی کە بەسەریدا هاتوون.

**تصاريف الرياح**: هەڵکردنی با لەچەند لایەکەوە.

**الصّارِف**: کەڵبە، ددان ٥ دەگوترێ: (ما في فمه صارف).

**الصَّرّافُ**: پارە گۆڕەرەوە ٥ ئەو کەسەی پارە دەگۆڕێتەوە بە پارەی وردە یان بە پارەی تر ٥ ژمێریارو بەرپرس لەسەر قاصەو خەزێنە بۆ وەرگرتنو صەرف کردنی پارە.

**الصِّرافة**: پیشەی پارە گۆڕینەوە.

**الصَّرف** (صَرف الدهر): بەڵاو کارەساتی ڕۆژگار (ك: صُروفٌ) ٥ لە بواری ئابووریدا بریتییە لە گۆڕینەوەی پارەی وڵات بە پارەی وڵاتێکی تر ٥ هەروا بە نرخی گۆڕینەوەکەش دەگوترێ ٥ لە بواری زمانەوانیدا زانیارییەکە بە هۆیەوە چۆنیەتی بینای کەلیمەو شێوەی دروستکردنی دەزاندرێ، واتە: (زانیاری صەرف) لە زاراوەی نەحوییاندا بریتییە لە لکانی تەنوین (دوو سەر یان دوو بۆر یان دوو ژێر) لە کۆتایی وشەوەو دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەو وشەیە لە جۆری (اسم)ە و تێیدا قاڵبۆتەوە.

**الصَّرَفان**: ڕەصاص.

**الصَّرفان**: شەو و ڕۆژ.

**الصِّرف**: شتی خاڵصو پوختەو بێ خەوش ٥ دەگوترێ: (شراب صِرف) شەرابێکی خاڵصو بێ خەوشە هیچی لەگەڵ تێکەڵاو نەکراوە.

**الصَّريف**: زیوی خالص ٥ شەرابی خالصو بێ خەوش ٥ شیر کە تازە دۆشرابێ.

**الصَّيِّرَف**: ئەو کەسەی دیرهەمی زیو

ئـاڵوگۆڕ دەكـا ٥ كاروبـار ڕێـكخەرو خـاوەن ئـەزموون لـە ئیشدا ٥ (ك: صیارِف وصیارِفة).

**اَلصَّیْرَفِيُّ:** بەمانا (اَلصَّیْرَفُ)دێ.

**اَلْـــصرِفُ:** گەڕانـــەوەو ئینـــصیراف ٥ شـوێنی پـارە گۆڕینـەوە ٥ جۆگـاو ڕێـڕەوی ئاوە بۆ ڕەوانبـوونی ئـاوی زیـادە لـە زەوی ئـاو دراوو تێـر ئـاو كراو.

**صَـرَمَهُ صـرماً:** بڕییـەوە ٥ دەگـوترێ: (صَـــرَمَ الحَبـــلَ) حەبلەكـەی بـڕی ٥ (صَرَمَ النّخل والشجر) دار خورماكـە یان درەختەكەی بڕییەوە.

**صَرَمَ فلاناً:** دەنگی لـە فلانكـەس دابـڕیو هـامو شـۆی ناكـا ٥ دەشـگوترێ: (صَـرَمَ وصـلَه) سـیلەی ڕەحمـی بـڕی ٥ (هـو مصروم وصریم).

**صَرُمَ السّیفُ صَرامَةً وصَرُمَةً:** شمشێرەكە بڕندەو تیژ بوو.

**صَرُمَ فلان:** فلانكـەس ئـازاو بەجـەرگـو ورە بـەرز بـوو، سـوور بـوو لەسـەر گەیـشتن بـە ئامـانجو تـەواوكردنی كارەكانی (هو صارم وصروم).

**اصرَمَ النخل والشجر:** دارخورماكـە یـان درەختەكـە كـاتی ئـەوەیان هـاتووە ببڕدرێنەوە.

**صارَمَهُ:** بڕییەوە.

**صَرَّمَهُ:** پارچە پارچەی كرد.

**إنصَرَمَ:** بڕایەوە، دابڕا ٥ ڕۆیشتو تەواو بوو ٥ دەگـوترێ: (إنصَرَمَ اللیلُ) شـەو ڕۆیشت، (إنصَرَمَ الشتاءُ) زستان تەواو بوو.

**تَصارمَا:** یەكتریان بڕیەوە ٥ بڕانەوە.

**تَـــصَرَّمَ:** پارچـــە پارچـــە بـــوو ڕۆیـــی بەسەرچـوو ٥ دەگـوترێ: (تَـــصَرَّمَ اللیلُ) شەو ڕۆیشت.

**تَصَرَّمَ الرجلُ:** فلانكەس ئازاو بەجەرگـو خۆڕاگر بوو.

**الـــصّارِمُ:** دەگـــوترێ: (ســـیف صـــارم) شمـشێری بڕنـدە ٥ (رجـل صـارم): پیاوی ئازاو بەجـەرگ ٥ یـان سـوورە لەسەر كارەكانی دەیـەوێ ئـەنجامیان بدا.

**الـصَّرّامُ:** پێـست فـرۆش: پـێڵاو فـرۆش خوف فرۆش.

**الصَّرمُ:** پێست.

**الـــصِّرمُ:** پارچـە لەهـەر شتێـك بـێ ٥ تاقمـێ خەڵـكی گۆشـەگیر ٥ خوففی شێوە نەعل ٥ (ك: أصرام وصرمان).

**الـــصِّرمَةُ:** كۆمەڵــە دارخورمــا ٥ یــان جەڵەبە حوشتر ٥ پەڵە هەور.

**الـــصَّریم:** ئــەوەی بــەرو بوومەكــەی كۆكرابێتــەوە ٥ دەگــوترێ: (شـــجر

صريم وأرض صريم) ⚬ ميوەی بەسەر يەكدا كەوتوو ⚬ بەشێك لە شەو يان لە ڕۆژ ⚬ كۆمەڵە لمبی تاقەوە بوو لە لمبەلان.

**الصَّرِيمَة**: بەمانا (الصّريم) دێ ⚬ كار قايم كردنو ڕێكخستنو وره بەرزی تێيدا ⚬ دابڕان ⚬ جەڵەبو پۆل.

**صَرِيَ الرجل صَرياً**: نەيهێشت پياوەكە بە ويستی خۆی بكا ⚬ مەنعی كرد لەوەی دەيەويست.

**صَرِيَ الماء واللبن والدمع**: ئاوەكە يان شيرەكە يان فرمێسكەكەی لە شوێنی خۆيدا قەتيس كرد.

**صَرَتِ الناقة عُنُقَها**: حوشترەكە لەبەر گرانی بارەكەی ملی بەرز كردەوە.

**صَرِيَتِ الناقة صَرياً**: حوشترەكە گوانی پڕ بوو لە شير.

**صَرِيَ الماء واللَّبَنُ**: ئاوەكە يان شيرەكە لە شوێنی خۆی مايەوە و بۆگەن بوو، گۆڕا.

**صَرِيَ الدمعُ**: فرمێسكەكە لە چاودا قەتيس ماو نەهاتە خوار.

**صَرِيَ فلان في يد فلان**: فلانكەس لای فلانكەس مايەوە بە حەبس كراويی.

**أصرَتِ النَّاقة**: حوشترەكە شيرەكەی لە گواندا مايەوە.

**صرى الناقة**: شيری حوشترەكەی لە گوانيدا حەبس كرد.

**الصَّاري**: كۆڵەكەيەكە لە كەشتيدا حەبلەكانی پێوە دەبەسترێ ⚬ (ك: صورِ) هەروا ناوە بۆ كەشتييەوانەكە ⚬ (ك: صُرَّاء).

**ألصَّارية**: بيری ئاو ⚬ كۆڵەكەيەكە حەبلەكانی دۆڵچەی پێوە دەبەسترێ.

**ألصَّرى**: هەرشتێ زۆر بمێنێتەوەو بۆگەن بكا ⚬ دەگوترێ: (لبن صَرّى) شيرێكە تامو بۆنی گۆڕاوە.

**المُصراة**: ئاژەڵێك شيردەربێو شيری لە گواندا هێڵدرابێتەوە.

**الأُصطُبَّةُ**: (مشاقه الكتان) واتە ئەو وردەو خشتو خۆڵەی لە كەتان هەڵدەوەرێ لەكاتی گێرەكردنو پاككردن دا.

**المِصطَبُ**: سندانی ئاسنگەر (ك: مصاطب).

**المِصطَبَة**: سەكۆی لەسەر دانيشتن ⚬ (ك: مَصاطِب).

**صَعُبَ صُعوبَةً**: قورسو گران بوو ⚬ دەگوترێ: (صَعُبَ الأمر) (وصَعُبَ الرجل) (وصَعُبَت الدابةُ).

**أصعَبَ الأمْرَ**: بەمانا (صَعُبَ)دێ.

**اصعَبَ الرجلُ**: پياوەكە تووشی كاری قورس بوو.

أصعبَ الشيئَ: شتەکەی بە قورس هاتە بەردەست.

صَعَّبَهُ: شتەکەی قورس کرد.

تَصَعَّبَ: بەمانا (صَعَبَ)دێ.

تَصَعَّبَ الأمر: کارەکەی بە قورسو گران لە قەڵەم دا.

إستَصعَبَ الأمرُ: بەمانا (صَعَبَ)دێ.

استَصعَبَ الأمرَ: کارەکەی بە گران بینی پێی وابوو قورسە.

ألصَّعبُ: ناخۆشو گران ٥ داکۆکیکار ٥ دەگوترێ: (عقبة صعبة) و(حیاة صَعبة).

الصَّعبَةُ: پارەی گرانبەها ٥ وەکوو زێڕو زیو و دۆلارو یۆرۆ.

ألمُصعَبُ من الرجال: (پیاوی کراو بەگەورە) ٥ لە حوشتریشدا بە حوشترێک دەگوترێ بۆ تۆو بەکاربێو کەس بۆی نەبێ سواری بێو باری لێ بنێ.

صَعِدَ صُعُداً: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (صَعِدَ الجبلَ) چووە سەر کێوەکە ٥ (وصَعِدَ السُّلَّمَ) چووە سەر پەیژەکە ٥ دەشگوترێ: (صَعِدَ فیه وعلیه والیه) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾ بۆلای خودا وشەی خاوێنو پیرۆز بەرزدەبێتەوە.

أصعَدَ: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (أصعَدَ في الأرض) بەرزبۆوە بۆسەر بەرزاییەک.

اصعَدَ في العدوِ: بەهێزو خێرایی بازی دا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَى أَحَدٍ﴾.

اصعَدَ في الوادي: بە شیوەکەدا سەرەو ژێر بۆوە.

اصعَدَتِ السَّفینة: شیراعو حەبلی کەشتییەکە درێژ کرایەوەو ڕەشەبا بردی.

صَعَّدَ في الجبل وعلیه وعلى الدرجة: چووە سەر کێوەکە.

وصَعَّدَ فیه النظر: بە وردی لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەیری کرد.

صَعَّدَ الشَّرابَ: شەرابەکەی بەئاگر کوڵاند بۆئەوەی ڕەنگو تامەکەی بگۆڕێ.

صَعَّدَ السائلَ: شلەمەنییەکەی گۆڕی بۆ بوخار بەهۆی کاریگەریی گەرمی.

صَعَّدَ الحربَ: توندو تیژیی شەڕەکەی پەرەپێ داو وای لێ کرد زیاتر توندو تیژ ببێ.

تَصاعَدَ، یَتَصاعَدُ ویَصّاعَدُ: بەمانا (صَعِدَ)دێ.

تَصاعَدَهُ الأمرُ: کارەکەی لەسەر شان قورس بوو.

**تَصَعَّدَ يَتَصَعَّدُ يَصَّعَّدُ**: بەمانا (تصاعَدَ)دێ.

**تَصَعَّدَ فِي الشيئِ**: بەناخۆشیو زەحمەت لەگەڵ کارەکە ڕۆیشت بەئەرکێکی زۆر شتەکەی جێ بەجێ کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ﴾.

**تَصَعَّدَ النَّفَسُ**: بەناخۆشی هەناسەی هەڵێنا.

**تَصَعَّدَ الشيئُ الرجلَ**: شتەکە پیاوەکەی ماندو کردو تینی بۆ هێنا.

**الصَّعِدُ**: دەگوترێ: (بلَغَ كذا فصاعِداً): گەیشتە ئەوەو زیاتریش.

**الصَّعَدُ**: نارەحەتیو شەکەتی ٥ (عذاب صَعَدٌ): سزای زۆرو توند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا﴾.

**الصُّعُدُ**: گەشەکردن بەرەو بەرزی، دەگوترێ: (هذا النبات ينمو صُعُداً): ئەم ڕوەکە لەباری درێژیو بەرزی زیاد دەکا.

**الصُّعَدَاءُ**: نارەحەتیو شەکەتی ٥ (تنفس الصُّعَداء): هەناسەی قوڵو ئازاراوی.

**الصَّعُودُ**: نارەحەتیو مەینەتی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا﴾ ٥ کۆسپو تەگەری ناخۆش.

**الصَّعِيدُ**: ڕوی زەوی ٥ گڵو خۆڵ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنی بەرز لەزەوی وەکوو بانی مقان یان صەعیدی میصر ٥ شوێنی بەرفراوان ٥ (ك: صُعْدان وصُعُدٌ).

**المِصْعَادُ**: ئامێری بەرزکردنەوە ٥ مەصعەد کەبەهۆی هێزی کارەباوە بەرز دەبێتەوەو دێتەوە خوار بۆ باڵەخانەی بەرز بەکاردەهێندرێ.

**المِصْعَدُ**: بەمانا (المِصْعاد)دێ ٥ (ك: مَصَاعِد).

**صَعِرَ صَعَراً**: ملی یان دەمو چاوی بەلایەك دا خوارکردەوە ٥ جاری وادەبێ بەهۆی نەخۆشییەوە دەمو چاوی یان ملی خواردەبێ.

**صَعِرَ فلان**: فلانکەس بەهۆی لوتبەرزیو خۆبەزلزانییەوە ڕوی وەرگێڕا.

**صَعِرَ رأسُهُ**: سەری بچوك بوو ٥ (فهو أصْعَرُ وهي صَعْراء) ٥ (ك: صُعْرٌ).

**أصْعَرَ خدَّهُ**: ڕوی خۆی بەهۆی خۆ بەزلزانیو بەخۆ نازینەوە وەرگێڕا.

**صاعَرَ**: بەمانا (أصْعَرَ)دێ.

**صَعَّرَ خدَّهُ**: ڕوی خۆی وەرگێڕا لەبەر تەکەببورو خۆ بەزلزانی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾.

**تَصَاعَرَ**: بەمانا (صَعَّرَ)دێ.

**تَصَعَّرَ**: بەمانا (تصاعَرَ)دێ.

**إصْعَرَّت الدابة**: ولاخەكەی ڕۆیشتنی خۆی خێرا كردو كەوتە مەیەلانو خۆبادان.

**الصَّعَرُ**: دەردێكە توشی مل دەبێ (ملە ڕەقە).

**صَعْصَعَ الرجلُ صَعْصَعَة وصَعْصاعاً**: پیاوەكە ترساو كەوتە لەرزینو شەقەتۆڵەی پێ كەوت، كەوتە هاتوو چۆو هاواری كرد.

**صَعْصَعَ القومَ**: قەومەكەی ترساندنو لێكی بڵاو كردن پەرتەوازەی كردن.

**صَعْصَعَ رأسَهُ بالدهن**: ڕۆنی لەسەری دا، بەتەواویی چەوری كرد.

**تَصَعْصَعَ القومُ**: قەومەكە ترسانو پەرتەوازە بوون، دەشگوتری: (تَصَعْصَعَتْ صفوفهم): ڕیزەكانیان پەرتەوازە بوونو لەشوێنی خۆیان هەڵكەندران.

**تَصَعْصَعَ بهم الدهر**: ڕۆژگار گەلو هۆزەكەی تەفرو توناكرد.

**الصَّعْصَعُ**: پەرتەوازەو بڵاوە بوو.

**صَعْفَقَ**: جەستەی لاوازو سیس بوو.

**الصَّعْفَق**: كەسێك بچێتە بازاڕ بۆ مامەڵەو پارەی پێ نەبێ، كە بازرگانێك بێ شتێك بكڕێ خۆی پێوە هەڵواسێو خۆی بخاتە گەڵی بۆئەوەی شتێكی دەست بكەوێ ٥ (ك: صَعَافِقَة وصعافيق).

**الصَّعْفُوقُ**: بەمانا (الصَّعْفَقُ)دێ ٥ (ك: صعافيق).

**صَعَقَتهم السماءُ صَعْقاً**: ئاسمان بروسكەی لی دان.

**صَعَقَت الصَّاعِقَةُ القومَ**: هەورە بروسكە لەوقەومەی دا، سوتاندنی لەناوی بردن.

**صَعَقَ التيار الكهربي الرجلَ**: كارەبا لەوپیاوەی دا، كارەبا گرتی.

**صَعِقَ الحيوانُ صَعَقاً وصَعْقاً وصُعَاقاً**: گیانلەبەرەكە دەنگی بەهێز بوو، زیڕاندی باڕاندی نەڕاندی زەڕاندی، دەگوتری: (صَعَقَ الحمارُ وصَعَقَ الثور).

**صَعِقَ الرجلُ**: پیاوەكە هەورە بروسكە لیی دا، بێ هۆش بوو، خەپ بوو، گیانی دەرچوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ﴾ ٥ (فهو صَعِقٌ وهي صَعِقة).

**صُعِقَ**: هەورە بروسكە لیی دا ٥ (فهو مَصْعوق).

**أصْعَقَهُ**: بەمانا (صَعَقَهُ)دێ.

**الصَّاعِقَةُ**: هەورە بروسكە؛ ئاگرێكە لەئاسمانەوە دێتە خوار ٥ بەلاو كارەساتی كوشندەو فەوتێنەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَاءُ﴾ ٥

(مانِعة الصواعق): کۆڵەکەو عەمودی ئاسنو شتی وایە لەسەر باڵەخانەی بەرز دەچەقێندرێن بۆ پارێزگاری لەبروسکە.

**الصَّعِقُ**: دەنگی بەشیدەتو بەهێز ٥ کەسێك لەهۆش خۆ چوبێ ٥ پیاوێك چاوەڕوانی هەورە بروسکە بکا.

**صعِلَ صَعَلاً**: سەرباریكو مل باریك بوو ٥ (فهو أصعل وهي صعلاء) ٥ (ك: صُعْلٌ).

**إصْعَالٌ**: بەمانا (صَعِلَ)دێ.

**الصَّعْلُ**: درێژ ٥ مل باریكو سەرباریك.

**الصَّعْلَةُ**: باریکیو لاوازیو کێش سوکی لەجەستەدا ٥ درەختی دارخورما کە قەدی خوارو لقو پرژی روتبن.

**صَعْلَك فلاناً**: فلانکەسی هەژار خست.

**صَعْلَك البقلُ الدوابُ**: گیاو گژەکە ئاژەڵەکەی قەڵەو کرد.

**تَصَعْلَكت الإبلُ**: حوشترەکە کوڵکەکەی روتایەوە، بەربوو.

**تَصَعْلَك الرجلُ**: پیاوەکە هەژار بوو.

**الصُّعْلُوك**: هەژار ٥ (ك: صعالیك).

**المُصَعْلَك**: (رأس مصعلك): سەری خڕی بچوك.

**صَغَرهُ صَغْراً**: تەمەنی لەتەمەنی ئەو کەمتر بوو، دەگوترێ: (هو یصغرني بسنة واحدة).

**صَغُرَ صِغَراً**: قەبارەی بچوك بوو یان تەمەنی کەم بوو ٥ (فهو صغیر) ٥ (ك: صِغار).

**صَغُرَ صَغاراً**: بەژێر دەستەییو زەلیلی رازییە ٥ (فهو صاغِر) ٥ (ك: صَغَرَةٌ).

**اصْغَرَ**: کاری بچوکی ئەنجام دا.

**أصْغَرَت الأرضُ**: زەوییەکە روەکەکەی درێژ نەبوو.

**أصْغَرَ فلاناً**: فلانکەسی زەلیلو ریسوا کرد.

**صَغَّرَهُ**: بچوکی کردەوە، زەلیلو ریسوای کرد.

**تَصَاغَرَ فلان**: فلانکەس لاسایی منداڵی کردەوە، هەڵسو کەوتی منداڵانەی نواند.

**تَصَاغَرَ الیه نفسهُ**: لەپێش چاوی خۆی خۆی بەکەم زانیو بەچاوی سوك سەیری خۆی کرد.

**اسْتَصْغَرَ**: داوای شتی بچوکی کردو پێی رازی بوو.

**اسْتَصْغَرَ الشيءَ**: شتەکەی بەبچوك دانا، بەبچوکی لەقەڵەم دا.

**الأصْغَرُ**: بچوکتر ٥ (اسم تفضیل) ٥ (ك: أصَاغِر وأصغرون) ٥ (وهي صُغرى) ٥ (ك: صُغَرُ وصُغْرَیات).

**الأصْغران**: دڵو زوبان.

**التَّصْغيرُ**: لەزاراوەی عیلمی صەرف دا

بریتییە لەوەی یایەکی ساکن لەدوای دووەم پیتی ئیسمەکەوە زیاد بکرێو شێوەی وشەکەش گۆڕانکاری تێدا بکرێ، بۆمەبەستی بەدیهێنانی مانای بچوککرنەوەو پڕو پوچ کردنی شتەکە وەکوو (حَسَن حُسَيْن، قمر قُمَيْر، كتاب كُتَيْب).

**الصُّغَارُ**: بەمانا (الصَّغير)دێ.

**الصَّغيرة**: تاوانی بچوك ٥ (ك: صَغَائِر).

**صَغَا صَغْواً**: مەیلی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللّٰهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾.

**صَغَتِ الشمسُ والنجوم**: خۆر یان ئەستێرە بەلای خۆرئاوادا مەیلی کرد خەریك بوو ئاوابێ.

**صَغَا فلان**: فلانکەس بەلایەك دا خوار بۆوە کەوتە سەر لاتەنیشتی.

**صَغَا الی القوم**: بەدڵ لەگەڵ قەومەکە بوو مەیلی ئەوانی هەبوو.

**صَغَا علی القوم**: بەدڵ لەگەڵ غەیری قەومەکە بوو ٥ لاخوار بوو.

**صَغِيَ**: مەیلی کرد.

**أصْغى الی فلان**: جوان گوێی لەفلانکەس گرت.

**أصْغى الإناءَ**: قاپەکەی خوارکردەوە بۆئەوەی ئەوەی تێیدایە بیرێژێ.

**صاغية الرّجل**: دارو دەستەو دەربار، ئەوانەی حەزیان لەڕێبازی ئەوە.

**الصَّفْوُ**: ناوەوەی لوێچ.

**صَفَحَ عنه صَفْحاً**: روی وەرگێڕا.

**صَفَحَ عن ذنبه**: لێی خۆش بوو لەتاوانی بوری.

**صَفَحَ فلاناً عن حاجته**: فلانکەسی لەئیشەکەی گێڕایەوە، نەیهێشت بگاتە مەبەستی خۆی.

**صَفَحَ القومَ**: خەڵکەکەی یەك یەك رانواند.

**صَفَحَ ورق الكتاب**: پەڕە پەڕە کتێبەکەی هەڵدایەوە.

**صَفَحَ الشيءَ**: شتەکەی پان کرد.

**صَفَحَ فلاناً بالسيف**: شمشێرەکەی لەباری پانی بەفلانکەس کێشا، شمێرەکەی پانەو پان لەفلان کەس دا.

**صَفِحَتْ جبهته صَفحاً**: ناوچاوانی زۆر گوشاد بوو ٥ (فهو أصْفَحُ وهي صَفْحاءُ) ٥ (ك: صُفْحٌ).

**أصْفَحَ الشيءَ**: شتەکەی هەڵگێڕایەوە.

**أصْفَحَ فلاناً عن الحاجة**: فلانکەسی لەپێویستو مەبەستی خۆی گێڕایەوە.

**صَافَحَهُ**: تۆقەی لەگەڵ دا کرد، دەستی خستە ناو دەستیەوە.

**صَفَّحَ الشيءَ**: شتەکەی پان کرد.

آلة تصوير
الصلع
صنّارة الصيّاد
صالب
صولجان
صنج
صفّارة
الصدغ
صور
قطر الصوفان
صمّة
صندوق
الصوّة البحريّة
صندل
أصابع اليد
صنوبر
صبرة
صابونيّة
صلّور
صحراويّة
صبّار
صفاريّة
صرّارة أو أبو صوي
صرّار الليل
صلّ
صقر
صرد
صرصور
الصقر صائد الحيّات
صعوة
صوص
صدى

**صَفَّحَ بيديه**: بەهەردوو دەستی چەپڵەی لـی دا.

**صَفَّحَ الشيئَ**: شتەكەی بەپارچە لـەوحو پارچە تەنەكە داپۆشی، یان بە پـۆڵا داپپۆشی.

**تَصَفَّحَ الشيئَ**: لەشتەكە ورد بۆوە، زۆر سـەیری كـرد، دەگـوترێ: (تَـصَفَّحَ الكتـابَ): كتێبەكـەی پـەڕە پـەڕە كردو لێی ڕوانی.

**تَـصَفَّحَ القـومَ**: لەخەڵكەكـە ورد بـۆوە بۆئەوەی بزانێ چـی دەكـەنو كـێنو بەتـەمای چـین، یـان بۆئـەوەی یەكێكیان لـێ بناسێ.

**اسْتَـصْفَحَ فلانـاً**: داوای لێبـوردنی لەفلانكەس كرد.

**اسْتَصْفَحَ فلاناً ذنبـه**: داوای لەفلانكـەس كرد لەتاوانی خۆش ببێ.

**الـصِّفاحُ**: دەگـوترێ: (لقیـه صِـفاحاً): ڕوبـەڕو توشـی بـوو یـان لـەناكاوو كۆزو گوممەت توشی بوو.

**الصَّفْحُ**: عەفوو لێبوردن ○ تەنیشتو لا، دەگـوترێ: (صَـفْحُ الجبـل): پانتـایی كێو، بناری كێو ○ (صَّـفْحُ الـسیف): پانـایی شمـشێر ○ (صَّـفْحُ الوجـه): پانتـایی ڕوخـسار ○ (ك: صِـفاح وأصفاح).

**ضَرَبَ عنه صَفحاً**: ڕوی لـێ وەرگێڕا.

**صَـفْحَةُ الـشيئ**: ڕوی شـتو لای شـت ○ (صَفْحَةُ الورقة): ڕویەكی لاپەڕە.

**صَفْحَةُ الرجل**: تـەختی سنگی پیاوەكە، پـەنای سـنگی، دەگـوترێ: (أبـدی صَفْحَتَهُ): نهێنییـەكانی ئاشكرا كـرد، یـان بەئاشـكرا تـاوانی ئـەنجام داو سنوری شەرعو یاسای بەزاند.

**الصَّفحتان**: دوو كوڵم، دوو لاڕومەت.

**الصُّفّاحُ**: بەردی پانو تەنك.

**الـصَّفُوحُ**: دڵفـراوانو لێبـوردە ○ (امـرأة صَـفوح): ئافرەتێـكی ڕو وەرگێـڕو چەموشو كەللە ڕەقە.

**الـصَّفیحُ**: تـەختی ڕوی هەرشتێـك پـان بێ ○ لە پلێتی ئاسنو تەنەكەو شتی لەو جۆرە كەلەبواری پیشەسازیی دا بەكاردێن.

**الصَّفیحةُ**: هەرشتێـك پـان بـێ لەبـەردو لەوحـەو شـتی لـەوجۆرە ○ ڕوبـەری هەرشتێـك پـان بـێ ○ وەكـوو پانـایی شمـشێر، پانـایی لەوحـەی ئاسـنو تەنەكەو بەرد.

**صـفیحة الوجـه**: پێـستی ڕوخـسار ○ دەبەیەكـە لەئاسـنو تەنەكـەو شـتی لەو جۆرە بەنزینو زەیتی تێدەكرێ ○ (ك: صفائح وصفاح وصفیح).

**صَفائح الباب**: لەوحەی دەرگا.

**المُـصَفَّحُ**: (أنـفٌ مُـصَفَّحٌ): لوتێـك

کونەکانی ڕێک بن، هەرشتێک بەلەوحەو شتی وا داپۆشرابێ.

**المُصَفَّحَةُ**: دەگوترێ: (سيارة مُصَفَّحَةٌ): سەیارەیەکە بە لەوحەی پۆڵا داپۆشراوە بۆئەوەی ببێتە دیرعو پارێزەر بۆی.

**صَفَدَهُ صَفْداً**: بەستیو شەتەکی دا پێوەندی کرد.

**أَصْفَدَهُ**: بەمانا (صَفَدَهُ)دێ ٥ ئەوەندەی پێ بەخشیو دەسنەخۆری کرد تا بەبەخشین پێوەندی کرد.

**صَفَّدَهُ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (صَفَدَهُ)دێ.

**الصِّفادُ**: پێوەندو کەلەبچە.

**الصَّفَدُ**: بەمانا (الصِّفَادُ)دێ ٥ (ك: أصفاد) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ ٥ هەروا بەمانا بەخشش دێ.

**صَفَرَ صفيراً**: فیتوی لێ دا ٥ بەدەمو لێوی فیتە فیتی کرد.

**صَفَرَ به**: بەدەنگی فیتو بانگی لێ کرد.

**صُفِرَ**: برسی بوو ٥ توشی نەخۆشی زەردویی بوو ٥ کرمی گەدەی تێدا پەیدا بوو ٥ (فهو مصفور).

**صَفِرَ صَفَراً وصُفُوراً**: خاڵی بوو، هیچی تێدا نەما، دەگوترێ: (صَفِرَ البيتُ من المتاع): ماڵەکە لەکاڵاو شتو مەك خاڵی بوو.

**صَفِرَ الإناءُ من الشراب**: پەرداخو سوراحییەکە شەرابی تێدا نەما.

**صَفِرَت يده من المال**: هیچ پارەو ماڵو سامانی لەدەست دا نەما ٥ (فهو صَفِرٌ).

**أَصْفَرَ الشيءُ**: بەمانا (صَفِرَ )دێ.

**أَصْفَرَ فلانٌ**: فلانکەس هەژار کەوت.

**أَصْفَرَ الشيءَ**: شتەکەی خاڵی کرد لەوەی تێیدا بوو.

**صَفَّرَ**: بەمانا (صَفَرَ)دێ، دەگوترێ: (صَفَّر لە): بەفیتو بانگی کرد، فیتوی بۆ لێ دا.

**صَفَّرَ الشيءَ**: شتەکەی زەرد کرد ٥ بەرەنگی زەرد ڕەنگی کرد.

**صَفَّرَ الثوبَ**: قوماشەکەی بەڕەنگی زەرد ڕەنگ کرد ٥ یان ئەو شتانەی لەقوماشەکە دا بوون دەری هێنان، دەگوترێ: (صَفَّرَ البيتَ من المتاع): خانوەکەی لەناو ماڵ خاڵی کردو هیچی تێدا نەهێشت.

**إصْفَرَّ**: ڕەنگی زەرد بوو.

**إصْفَرَّ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە وشك بوو، کاتی دروێنەو بەرو بوم کۆکردنەوەی هات ٥ (هو أصفر وهي صفراء).

**الأصْفَرُ**: زێڕ ٥ (بنو الأصفر): نازناوی ڕۆمەکانی دانیشتوی کیشوەری

ئاسـيای بـچوكه لەگـەڵ قوستەنتینیەو دەورو بەری.

الأصفران: زێڕو زەعفەران.

الصِّفَارُ: ئەو پاشماوە خۆراكو ئالفەی لە ددانی ئاژەڵ دا دەمێنێتەوە.

الصُّفَارُ: فیتو، دەشكوتری: (في كلامه صُـفَارٌ): لەقـسەكانی دا جـۆرە دەنگێكی فیتـو ئاسا هەیە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ كرمـی ناوسـك ٥ ئـاوێكی زەردە لـەورگا كۆدەبێتـەوە ٥ نەخۆشـی زەردوویـی، جـۆرە زەردییەكـە لەسـەر پێـست پەیـدا دەبـێ بـەهۆی كـزی یـان نەخۆشییەوە.

الـصُّفَارَةُ: روەكـی پـەڕیوو زەرد هەڵگەڕاو.

صَفَرٌ: مانگی دووەمی ساڵی قەمەرییە.

الـصُّفْرُ: مـسی زەرد ٥ زەرفـی خـاڵیو بەتاڵ ٥ (ك: أصفار).

الصَّفَرُ: برسێیەتی ٥ كرمی ناو ریخۆڵەو گەدە ٥ نەخۆشییەكە روخسار پێی زەرد دەبێ.

الصَّفْراءُ: زێـڕ، پێـكهاتەو تێـكەڵەیەكە لەپێـكهاتەكانی جەسـتە ٥ شـلەمەنییەكی زۆر تاڵـە لـەزراودا خـەزن دەبـێ ڕەنگـی زەردی مەیلەو سوورە.

الـصَّفَّارُ: مـس دروسـتكەر، مزگـەر، دروستكەری مسی زەرد.

الصَّفَّارَةُ: فیتفیتۆكە (شاور) ئامێرێـكە فوی پێدا دەكرێو دەنگی دێ.

الـصُّفْرِيَّةُ: پێرپێـكن لەخەواریجـە سـەرەتاییەكان لـەعێراق بـوون لەسـەردەمی ئەمەوییـەكان دا مابوون.

الـصَّفِير: دەنگێـكە زۆر خـاویی تێدایـە وەكوو (س،ز،ص).

صَفْـصَفَ: بەتـەنیا كەوتـە چۆڵەوانیو سارا.

صَفْـصَفَ العُـصفور: چـۆلەكەكە جریواندی.

الصَّفْـصَاف: درەختێـكە درەختـی خیلافی ناوە.

الصَّفْصَفُ: زەوی دەشتی روتـەنو هـیچ لـێ نـەڕواو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَيَـذَرُهَا قَاعًـا صَفْـصَفًا﴾ ٥ دەشـتی كاكی بەكاكیو چۆڵەوانی.

الصُّفْصُفُ: چۆلەكە ٥ (ك: صفاصِف).

صَفَعَهُ صَفْعاً: شەپلاغەی لـێ دا.

صَـفَّ القـومُ صـفّاً: خەڵـكەكە ریزبـوون ٥ بەیەك ڕیز وەستان.

صَفَّ الطيرُ في الـسَّماءِ: باڵنـدەكە لەحـەوا باڵەكانی راست كردنو جوڵە جوڵی پـێ

نەكردن ٥ (فهي صافة) ٥ (ك: صافّات وصَوّاف) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ﴾.

**صَفَّ الشيءَ**: شتەكەی ریز كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ﴾.

**صَفَّ القومَ**: خەلْكەكەی لە شەڕو شتی تردا ریز كردن.

**صَفَّ اللحمَ**: گۆشتەكەی توێ توێ كردو بەرخۆری دا یان لەسەر بەردی گەرم برژاندی ٥ (فهو صفیف).

**أصَفَّهُ**: سێبەری بۆ دروست كرد، دەگوترێ: (أصَفَّ الأريكة): بەرگی بۆ كورسیو قەنەفەكە كرد.

**أصَفَّ السَّرْجَ**: زینەكەی داپۆشی ٥ (أصَفَّ البیت): خانوەكەی سەرگرت.

**صَافَّ الجيشُ عَدوهُ**: سوپا لەگەڵ دوژمن دا ریز ریز شەڕی كرد، دەگوترێ: (صَافَّ القائدُ جندَه): سەركردەكە سەربازەكانی ریزكردن بۆ شەڕ.

**صَفَّفَهُ**: زۆر رێكی خستن، دەگوترێ: (صَفَّفتِ المرأة شعرها): ئافرەتەكە زۆر بەریكوپێكی قژەكانی داهێنانو رێكی كردن.

**إصْطَفَّ**: بۆ موطاوعەی (صَفَّهُ)دێ.

**تَصَافُّوا**: ریز ریز وەستان بەرامبەر بەیەك.

**تَصَافُّوا على كذا**: لەسەر ئەو شتە یەك راو هەڵوێست بوون.

**الصَّفُّ**: هێڵی راست لە هەرشتێك ٥ خەڵكی ریز بەستو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾ ٥ پۆلی قوتابخانە، بەشێك لەقوتابیانی قوتابخانە ٥ (ك: صفوف).

**الصُّفَفُ**: پۆشاكێكە لەژێر زرێوە لەبەر دەكرێ.

**الصُّفَّةُ**: سێبەر بەربێلا ٥ هۆڵی بەرزو بەرفراوان ٥ شوێنێكی سێبەرو سەرگیراو لەمزگەوتی مەدینە، لەسەردەمی پێغەمبەردا هەژارەكان تێیدا دەحەوانەوەو پێغەمبەر (د.خ) چاودێری دەكردن پێیان دەگوتن (أصحاب الصفّة).

**الصَّفِيفُ**: گۆشتی تەنكو توێ توێ كراو، كوتكوت كراو.

**صَفَقَ الشيءَ صَفْقاً وصَفْقَةً**: وای لێ دا دەنگی لێدانەكەی بیسترا.

**صَفَقَتِ الريحُ الثوبَ والشجر والماءَ**: رەشەباكە لەقوماشەكەی داو جوڵاندیەوە، لەدرەختەكەی داو لقەكانی هەژاندن، لەئاوەكەی داو

شەپۆلی پێ پەیدا کردن.

**صَفَقَ الطائر جناحیه وبهما**: باڵندەکە باڵەکانی لێك دانو فڕی، لەشەقەی باڵی دا.

**صَفَقَ العُودَ**: لەوەتەری کەمانەکەی دا، لەژێی کەمانەکەی دا.

**صَفَقَ البابَ**: دەرگاکەی پێوەدایەوە ◊ (صَفَقَ الشرابَ): شەرابەکەی تێکەڵاو کرد.

**صَفَقَ القدَحَ**: پیاڵەکەی پڕکرد.

**صَفَقَ البَیْعَ**: مامەڵەکەی مۆرکردو ڕۆیاندی ◊ دەستی خستە ناو دەستییەوەو لەقەبەڵی یەکتریان کرد ◊ دابو نەریتی عەرەب وابوو کە بیانویستایە مامەڵەیەك بڕۆیەنن یەکێکیان دەستی دەخستە ناو دەستی ئەوی تریانەوە، واتە دەستیان بەیەکتر دەکێشا وەکوو چەپڵە لێدان، ئیتر لەم ڕووەوە ئەم مانایە هاتووە.

**صَفُقَ الثوبُ صَفَاقَةً**: کراسەکە تێوەدانو چنینەکەی ئەستور بوو.

**صَفُقَ الوجهُ**: ڕوخساری ناشیرین بوو ◊ (فهو صفیق).

**أصْفَقَ القومُ علی كذا**: خەڵکەکە لەسەر ئەوشتەی یەکیان گرتو بڕیاریان دا لەسەری ◊ کۆك بوون لەسەری.

**أصْفَقَ عنه**: ڕوی لێ وەرگێڕا.

**أصْفَقَ فلان الشیئَ والبابَ والقدحَ والشرابَ**: فلانکەس لەشتەکەی دا دەنگی لێ هات ◊ دەرگاکەی پێوەدایەوە ◊ پیاڵەکەی پڕکرد ◊ شەرابەکەی تێکەڵاو کرد.

**أصْفَقَ النَّاسِجُ الثوبَ**: جۆڵاکە قوماشەکەی ئەستور چنی.

**صَافَقَ**: لەسەر تەنیشت نووست.

**صَفَّقَ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (صَفَقَ)دا هاتووە.

**صَفَّقَ بیدیه**: بەهەردوو دەستی چەپڵەی لێ دا، بەری دەستی ڕاستی بەبەری دەستی چەپی کێشا ◊ هەردو بەری دەستی بەیەکتر کێشان.

**إصْطَفَقَ**: بۆ موطاوەعەی (صَفَقَه)دێ.

**إصْطَفَقَ الشیئُ**: شتەکە کەوتە جوڵەو پەلە پەل، دەگوترێ: (إصْطَفَقَت الأشجارُ وإصْطَفَقَ العودُ): درەختەکان جوڵانەوە، ژێی کەوانەکەی لەرییەوە.

**إصْطَفَقَ البحرُ**: دەریا کەوتە جونبوش‌و شەپۆلدان.

**إصْطَفَقَ الناسُ**: خەڵکەکە کەوتنە هاتو چوو جمو جۆڵ.

**إصْطَفَقَ المجلسُ بالقوم**: مەجلیسەکە جمەی هات.

**إنْصَفَقَ**: بۆ موطاوەعەی (صَفَقَهُ)دێ.

**إنْصَفَقَ القومُ**: خەڵـكەكە هاتن‌و رویـان تێ كرد.

**تَـصافَقَ البـائع والمـشتري**: كڕیـارو فرۆشـیارەكە مامەڵەكـەیان ڕویانـدو ڕەزامەندییان لەسەر ئەنجامدانی دا.

**تَصَفَّقَ**: تلاوتلی كـرد، ئەمـدیواو دیـوی كرد.

**تـصَفَّقَتِ الدابـةُ**: ئاژەڵەكـە سـەر پـشت گەڕا.

**تَصَفَّقَ للأمر**: خۆی لەكارەكە داو چووە ناو ئیشەكەوە.

**الصِّفاق**: پێستی ژێر پێـستی سـەرەوە ٥ پەردەیەكــە لــە نێــوان پێــست‌و ڕیخۆڵەدا ٥ (ك: صفق).

**الصَّفَّاقُ**: بۆمانای زێدە هاتووە لەمادەی (صفق)دا.

**الـدِّیك الـصَّفَّاق**: ئـەو كەڵەشـێرەیە لەكاتی خوێندن دا باڵی لێـك دەدا ٥ هەروا ناوە بـۆ كەسێـك زۆر مامەڵـە بكـاو هەمیـشە خـەریكی سـەوداو مامەڵەبێ.

**الـصَّفْقُ**: كـڕین‌و فرۆشـتن ٥ تەنیـشت، دەگـوترێ: (صَــفْقا الإنــسان): دوو تەنیشت‌و دوولای ئادەمیزاد.

**صَــفْقا الفــرس**: دوو لاچـاوی ئەسـپ ٥ (صــفقا البــاب): دوو تـاكی دەرگـا ٥ (ك: صَفوق).

**الـصِّفْقُ**: (صِـفْقُ البـاب): تـاكی دەرگـا ٥ (ك: صفوق وأصفاق).

**الصِّفْقَةُ**: تۆقەكردن‌و دەست خستنە ناو دەستی یەك لەكاتی مامەڵەدا وەكوو ئامــــاژەكردن بەڕەزامەنــــدیی‌و دامــەزرانی مامەڵــەو سـەوداكە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ خـودی سـەوداكە ٥ فرۆشـتن، دەگـوترێ: (صَـفْقة رابحـة وصفقة خاسرة).

**المَـصْفَقُ**: بـازاڕ كەمامەڵـەی زۆری تێـدا بكرێ ٥ (بۆرصە) ٥ (ك: مَصَافِقُ).

**صَفَنَ الفرسُ صُفُوناً**: ئەسپەكە لەسەر سێ قاچ وەستاو نوكی سمی قاچی چوارەمی لەزەوی چەقاند.

**صَفَنَ الرجلُ**: پیاوەكە قاچی جووت كردن.

**صَـفَنَ الطـائِرُ**: باڵندەكـە هێلانـەی خـۆش كرد بۆ بێچووەكانی، پوش‌و پەڵاشی بۆ ڕاخستن ٥ (فهو صافن) ٥ (ك: صُفون).

**صَفَنَ به الأرض**: بەزەوی دادا، خستیە سەر زەوی.

**صَفَنَ فلاناً**: پەردەی گونی فلانكەسی دڕی.

**صافَنَ القـومَ**: هـاوڕای خەڵـكەكە بـوو ٥ پــشتگیری كــردن ٥ دەســتەو نــەزەر لەبەر دەمیان ڕاوەستا.

**صَفَّنَ الطائِرُ**: باڵندەكە هێلانـەی خـۆش كرد بۆ بێـچووەكانی، پـوش‌و پەڵاشـی بۆ تێدا ڕاخستن.

**تَصَافَنَ القومُ**: خەڵکەکە ئاو یان بەش بەش کرد لەناو خۆیان دا.

**الصَّافِنُ**: رەگێکی گەورەیە لەقاچ دایە ئەم شادەمارە لەبەری قاچەوە درێژ دەبێتەوە تادەگاتە شادەماری ڕان ٥ (ك: صُفون وصوافِن).

**الصُّفْنُ**: هەمبانە، تورەکەیەکە لەپێست دروست دەکرێ، گوند نشینەکان تێشووی تێ دەکەن، زۆر جاری وادەبێ دەیکەنە دۆڵچەو ئاوی پێ هەڵدەهێنجن ٥ (ك: أصفان).

**الصَّفَنُ**: پەردەی گون ٥ زەمبیلەی پوشین ٥ ئەو پوش‌و پەلاشەیە کە باڵندە بۆ بێچوەکانی رادەخا بۆ تێدا بەخێوکردن ٥ (ك: أصْفان وصُفْنان).

**صَفَا صفواً صَفاءً**: صاف بوو رون بوو لێڵی نەما، دەگوترێ: (صفا الماءُ ونحوهُ): ئاوەکە رون‌و جوان بوو.

**صفا الجوُّ واليومُ**: هەوا صاف بوو، رۆژەکە رۆژێکی صاف‌و رون بوو، هەورو هەلای نەبوو.

**صفا اليومُ**: ئەمڕۆ رۆژێکی خۆش بوو ناخۆشی تێدا نەبوو ٥ (فهو صاف وصفوان).

**أصْفى الحافِرُ**: بیر هەڵکەنەکە گەیشتە بەردو شاخ‌و شوێنی ڕەق‌و نەیتوانی چی دی بیرەکە هەڵکەنێ.

**أصفى الشاعِرُ**: شاعیرەکە شیعری نەما، شیعری دوایی هات.

**أصفت الدجاجةُ**: مریشکەکە لەهێلکە چۆوە.

**أصفى فلاناً**: بەڕاستی دۆستایەتی فلانی کردو دڵسۆزانە برایەتی لەگەڵ دا بردەسەر، دەگوترێ: (أصفاه الودُّ): دڵسۆزانە خۆشەویستی لەگەڵ کرد.

**أصْفى فلاناً بكذا**: فلانکەسی تایبەت کرد بەوشتەو بۆئەوی دانا.

**أصفى الحاكم ونحوه دار فلان ومالَه**: دادوەر ماڵ‌و سامانی فلانکەسی هەموو دەست بەسەراگرت‌و تەصفیەی کرد.

**صافاه**: راستالانە برادەری‌و دۆستایەتی لەگەڵ کرد.

**صَفّاهُ**: چڵک‌و پیسی‌و پۆخڵەواتی لێ داماڵی‌و پاکی کردەوە ٥ پاکی کردەوە لەوشتانەی تێکەڵاوی بوو بون، هەموو پڵ‌و پوش‌و مرۆڕو زریزانەو شتی تری لێ هەڵاواردو پاکی کردەوە.

**صَفّى مابينهما**: هەموو گرژی‌و ناخۆشی نێوانیانی لابردو ئاشتی کردنەوە.

**صَفّا الحِسابَ**: کۆتایی بەحیسابەکە

هێناو تەصفیەی کرد.

**صَفَّا الشَّرکة**: حیسابی کۆمپانیاکەی تەصفیە کردو کۆتایی پێ هێنا.

**إصْطَفَاهُ**: هەڵی بژاردو بەچاکی لەقەڵەم دا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾.

**تـصافیا**: لەخۆشویستنی یەکتر دا دڵسۆزو راستاڵ بوون.

**استَصْفَاهُ**: بەمانا (إصطفاه)دێ ٥ بەدۆستو خۆشەویستی خۆی لەقەڵەم دا.

**استَصْفَى الشيئَ**: پوختەی شتەکەی برد.

**استَصْفَى مالَ فلان**: ماڵی فلانکەسی هەموو برد.

**الصَّفَاةُ**: بەردی لووس رەقو پان، دەگوترێ: (ماتقرع له صَفاةٌ): کەس بەخراپە دەستی بۆ درێژ ناکا، دەشگوترێ: (ما تندى صفاتُهُ): رژدو چروکەو هیچی لەدەست هەڵناوەرێ.

**الصَّفْوُ**: صافیو لووسی ٥ رونیو ئاشکرایی ٥ بێ گەردی.

**الصَّفْوان**: بەردی گەورەی لوس ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ﴾.

**الصَّفْوَةُ من کل شیئ**: کاکڵەو پوختەی هەموو شتێك.

**الصَّفِيُّ من کل شیئ**: کاکڵەو پوختەی شتەکە لەهەرشتێك بێ دۆستو برادەری هەڵبژاردەن دەگوترێ: (هو صَفِيُّ) ٥ (ك: أصفیاء) ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو غەنیمەتو دەسکەوتەی فەرمانڕەوای موسوڵمان جیای دەکاتەوە بۆ خۆی پێش دابەشکردن ٥ (ك:صفایا).

**الصوافي**: مڵكو زەویو سامان خاوەنی مردبێو کەس میراتگری نەبێ ٥ ئەو زەویو زارەی پاشاو فەرمانڕەوا دایدەنێ بۆ دەستو پێوەندەکانی خۆی ٥ تاکەکەی (صافیة)یە.

**المِصْفَاةُ**: شت پاڵێو، هەرشتێك شتی پێ تەصفیە بکرێ ٥ هەرئامێرێك شیرو شەرابو شلەمەنی تری پێ بپاڵێورێ ٥ (ك: مصاف).

**صَقَبَ الطائِرُ صَقْباً**: باڵندەکە قیڕاندی، جریواندی، قیژاندی، خوێندی، گارەگاری کرد.

**صَقَبَ الجسمَ المُصْمَتَ**: بەبەری دەستی لەقەباره بێ دەنگەکەی داو تەپە تەپی لێ هێنا.

**صَقَبَ الشيئَ**: شتەکەی کۆکردەوە.

**صَقَبَ البناءَ**: بیناکەی بەرز کردەوە.

**صَقِبَ صَقَباً**: نزیك بوو.

أَصْقَبَ الشيءَ: شتەکەی نزیك کردەوە.
صاقَبَهُ مُصاقَبَةً وصِقاباً: نزیکی بۆوە، بەرامبەری بوو، دەگوترێ: (جار مصاقب): جیرانی بەرامبەر.
تصاقبت البیوت: خانووەکان لێك نزیك بوون.
الصَّقْبُ: کۆڵەکەی هەرە بەرز لەناو کۆڵەکەکانی ژێر ڕەشماڵ دا ٥ مستە کۆڵە ٥ کۆڵە مستە ٥ (ك: صُقوب وصِقاب).
الصَّقَبُ: تەنیشت ٥ ماڵ بەماڵەوە، جیرانی پەناو ماڵ بە ماڵەوە.
صَقَرَت الشمس صَقْراً: خۆر گەرماییەکەی توند بوو.
صَقَرَت الشمسُ فلاناً: خۆر گەرمیەکەی ئازاری فلانکەسی دا.
صَقَرَ فلان النار: فلانکەس ئاگرەکەی هەڵگیرساند.
صَقَرَ فلاناً: بەناحەق جنێوی بەفلانکەس دا ٥ (فهو صَقّار).
صَقَرَ فلاناً بالعصا: بەگۆچان لەسەری فلانکەسی دا.
صَقَرَ به الأرضَ: بەزەوی کێشا، لەعەردی دا ٥ خستیە سەرزەوی.
صَقَرَ الحجرَ: بەپاچی دووسەر بەردەکەی شکاند.
صَقَّرَ: بەهەڵۆو باز راوی کرد، باڵندەی تری پێگرتن.
تَصَقَّرَ: بەبازو هەڵۆ راوی کرد.
الصاقِرُ: چاو تیژ، دەگوترێ: (صَقْرٌ صاقِرٌ): بازێکی چاو تیژە.
الصاقِرَةُ: بەڵاو کارەسات ٥ (ك: صواقر).
الصاقورُ: پاچی دووسەرو نوك تیژ بەردی پێ بشکێندرێ ٥ دیوی ناوەوەی ئێسقانی سەر کە دەورەی مێشکی داوە ٥ (ك: صواقِر).
الصَّقْرُ: بازو هەڵۆ ٥ (ك: أصقر وصقور).
الصَّقْرَة: لێدانی خۆرو گەرمایی تیشکی.
الصِّقْرَةُ: ئاوی کەمی راوەستاو.
الصَّقّار: بازو هەڵۆ بەخێو کەر، ئەوکەسەی خەریکی راهێنانی بازو هەڵۆیە بۆ راو پێکردن ٥ ئەوکەسەی راو بە بازو هەڵۆ دەکا.
صَعَقَ في البلاد صَعْقاً: بەناو وڵات دا رۆیی، دەشگوترێ: (صَعَقَ في القول): لەقسەکردن دا فەننی نواندو بارو شێوازی گۆڕینو جۆرەکانی ڕەوانبێژی بەتاقی کردنەوە.
صَقَعَ صُقْعَ کذا: چو بۆی قەصدی ئەوی کرد، دەگوترێ: (ما أدري أين صَقَعَ).
صَقَعَ الديكُ ونحوه صقيعاً وصُقاعاً: کەڵەشێرەکە خوێندی.

**صَقَعَ فلاناً وغيره صَقْعاً**: لەفلانکەسی دا یان لەفلان شتی دا.

**صَقَعَ بِه الأرض**: بەزەوی دادا، خستی بەزەوی کێشا.

**صَقَعَ فلاناً بكيٍّ**: فلانکەسی بەداخکردن نیشانە کرد.

**صَقِعَ صَقَعاً**: سەرمای سیخوارو سەهۆڵبەندان لی‌ی دا.

**صَقِعَتِ الأرضُ**: زەوی سیخواری لەسەر باری.

**أصْقَعَ**: چووە ناو سیخوارو سەهۆڵبەندانەوە.

**الصِّقاع**: حەبلێکە بەسەر رەشماڵو خێمەدا رایەڵ دەکرێو هەردو سەری لەمدیوەو دیوی خێمەو رەشماڵەکە بەسنگی داکوتراو بەزەوی دا قایم دەکرێن بۆ ئەوەی رەشەبا نەیبا ٥ ئاسنێکە دەکرێتە دەمی ئەسپو وڵاخی ترەوە بۆ لغاو کردنی ٥ (ك: صُقُعٌ وأصقعة).

**الصُّقْعُ**: لایەنو لای شت ٥ (ك: أصقاع).

**الصَّقَعُ**: ئازاری سەرماو سەهۆڵبەندان.

**الصَّقْعَةُ**: کوشندەی ساردو سەرماو سەهۆڵبەندان.

**الصَّقيعُ**: سیخوارو سەهۆڵبەندان (سیخوار شەونمێکە لەئاسمانەوە دەبارێتە سەر زەویو دەبێتە سەهۆڵ).

**المِصْقَعُ**: زمانپاراوو رەوان بێژ، دەگوترێ: (خطيب مِصْقعٌ).

**صَقَلَهُ صَقْلاً وصِقالاً**: مشتو ماڵی کرد، دەگوترێ: (صَقَلَ السيفَ والمرآة ونحوهما): شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد ٥ ئاوێنەکەی پاك کردەوە، سرپیەوە.

**صَقَلَ كلامَهُ**: قسەکانی خۆی هەڵبژاردن پاڵفتەو پوختەی کردن.

**صَقَلَ الدابَّة**: وڵاخەکەی گرتە ئەستۆی خۆی بۆ بەخێوکردن.

**صَقِلَ صَقَلاً**: شتەکە مشتو ماڵ کراو بوو ژەنگو چڵکی لی کرابوەوە.

**صَقِلَ الفرسُ**: ئەسپەکە قەدباریك بوو.

**الصِّقالُ**: مشتو ماڵ کردن.

**الصَّقّالُ**: کەسێك پیشەی مشتو ماڵ کردن بێ.

**الصُّقْلُ**: لاکەلەکە ٥ (صِقلان): هەردو کەلەکە.

**الصُّقْلَةُ**: کزو لاوازیی.

**الصَّقيلُ**: مشتو ماڵ کراو ٥ دەگوترێ: (سيف صقيل ومعدن صقيلٌ) ٥ (ك: صِقالٌ).

**الصَّيْقَلُ**: بەمانا (الصَّقّالُ)دێ ٥ (ك:صَياقِلُ وصَياقِلَة).

**المِصْقَلَةُ**: ئامێری مشتو ماڵ کردن ○ (ك: مَصاقِل).

**الصَّقالِبَةُ**: پێرێکن لەئادەمیزاد زێدو نیشتمانیان لەبنەڕەتا باکوری ولاتی بولغارياو دەورو بەری بوو، ئێستا لە زۆر ولاتــی خۆرهــەلاتی ئــەوروپا نیــشتەجێ بــوونو بــلاو بوونــەوەو پێیان دەگوترێ رەگەزی سلاڤ یان سولاڤ.

**صَكَّهُ صَكّاً**: بەتەوژم پالی پێوەنا، یان بەهــەموو هێــزی خــۆی شــەپلاخەی لــــی دا ○ قورئــــان دەفــــەرموێ: ﴿فَصَكَّتْ بها﴾: بەسەر سورمانەوە بەرومەتی خۆی کێشا.

**صَكَّ البابَ**: دەرگاکەی داخست.

**إصْطَكَّ الشيئان**: ئـەو دووشـتە پێـك کێـــشران لێــــکیان دا، دەگــــوترێ: (إصْطَكّت ركبتاه وقـدماه): فـەیزەن بوو ئەژنۆی لێك دەدران، یان قاچی لێك دەدران.

**الأصَكُّ**: ئەو کەسە ددانی پڕو جوت بن بۆشاییان تێدانەبێ ○ (ك: صُكٌّ).

**الصَّكُّ**: شێـك، چـەکی پـارە وەرگـرتن لەبانق.

**المِصَكُّ**: ئـامێری پێــکەوە نوسـاندن ○ قفــڵو کێلــون ○ ددانــی پــڕو بــێ بۆشایی.

**صَكَمَ الفرسُ**: ئەسپەکە لغاوەکەی جوو.

**صَــكَمَ الــشيءَ**: شــتەکەی پــاڵ پێوەنـا، بەرانبــەری کــردو لەگــەلی داکەوتــە زۆرانبازیو هێنانو بردن.

**صَلَبَتِ الحُمّى على فلان صُلْباً**: لەرزو تاکە لەسەر فلانکەس درێژەی کێشاو تاوی سەند.

**صَلَبَه الحَرُّ**: گـەرما سـووری کـردەوە کولاندی تینی بۆهێنا.

**صَلَبَته الـشمس**: خۆرەتـاو گەسـتیو هەتاو بردی.

**صَلَبَ الجِسْمَ**: ئـەملاو ئـەولای جەستەی شــەتەك داو هەلیواســی، دەگــوترێ: (صَلَبَ الجاني): تاوانبارەکەی هەلواسی.

**صَـــلَبَ اللحـــمَ**: گۆشـــتەکەی برژانـــدو چەورییەکەی لـی تکاند.

**صَـلُبَ صـلابةً**: تونـدو پتـەو بـوو، خـۆی گرتو رەق بوو.

**صَلُبَ علـى المـال وغيره**: دەستی بەسەر ماڵەکەوە گرتو رژدو چروك بوو دلـی نەهات لێی ببەخشێ.

**صَلُبَ الـشيءُ**: زۆر تونـدو پتـەو بـوو، دەگـوترێ: (صَـلُبَ فَـرْعُ الـشجرة): لقەدارەکە پتەو بوو خۆی گرت.

**صَلَّبَ النصرانيّ**: مەسیحییەکە صەلیبی هەڵگرت ○ لەسەر سینگو روخساری وێنــەی صــەلیبی دروســت کــرد.

**صَلَّبَ الجسمَ**: جەستەکەی شەتەك داو هەڵیواسی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾: بەلقی دارخورماوە هەڵتان دەواسم.

**صَلَّبَ الشيءَ**: شتەکەی پتەو کرد.

**صَلَّبَ السّلاحَ**: چەکەکەی تیزکردو مشتو ماڵی کرد.

**اصطلب العظمَ او اللحمَ**: بەئاگر چەورایی گۆشتو ئێسقانەکەی چۆڕاندەوە، دەری هێنا.

**تَصَلَّبَ**: گرژو رەق بوو، نەرمی تێدانەما، دەگوترێ: (تصلب العودُ): لقەدارەکە پتەوو ڕەق بوو.

**تَصَلَّبَ الشريانُ**: دەمارە خوێنبەرەکانی دڵ گرژ بوون.

**تَصَلَّبَ في الرأي**: لەڕاو بۆچونەکانی دا توندو تیژ بوو، سور بوو لەسەر ڕای خۆی.

**الصّالِبُ**: لەرزو تای بەشیدەت ◦ کەپلەی گەرمی زۆر بێ.

**الصَّلابَةُ**: روقایمی، چاو قایمی، دەگوترێ: (في وجهه صلابة): لەڕوخساری دا خۆگرێو پتەوییەك هەیە ◦ بۆ جەستەیەك بەکاردێ لەسەر شێوەو شێوازی خۆی زۆر بمێنێتەوە ◦ زۆر گۆڕانکاری بەسەردا نەیە.

**الصُّلْبُ**: پتەوو ڕەقو بەهێز ◦ زەوی رەقو وشكو پتەو ◦ هەرمادەیەك شکڵو قەبارەو شێوازی لەحاڵەتی ئاسایی دا گۆڕانکاریی بەسەر دا نەیە ◦ بەپێچەوانەی غازو شلەمەنی ترەوە ◦ قاڵبە ئاسنێکە یان لەعونصوری تری وەکوو سلیکۆنو مەنگەنیزو شتی وا ◦ هەروا مادەی (الصُّلْبُ): بەمانا فەقەرەی پشت دێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ دەشگوترێ: (هو من صلب فلان): واتە لەوەچەو زورپییەتی ئەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾ ◦ (ك: أصْلُبٌ وأصلابٌ).

**الصَّلَبُ**: بەهێزو بەشیدەت ◦ سورێنچك ◦ (ك: أصلاب).

**الصُّلَّبُ**: بەهێزو بەشیدەت ◦ بەردی هەسان ◦ تێغی تیژکراوی مشتو ماڵ کراو.

**الصَّلِيبُ**: بەهێزو توانا ◦ نەژاد خاوێنو رەسەن، دەگوترێ: (هو عربي صليب): ئەو عەرەبێکی پاك نەژادو رەسەنە ◦ هەروا وشەی (الصّليب): ئاوە بۆ سورێنچك ◦ هەرشتێك لەسەر شێوەی دو هێڵی یەکتر بڕ

دروستکرابێ جا ئاسن بێ یان لەدارو شتی تربێ ◦ قەنارە ئەوەی لەسەری لەخاچ دەدرێ ◦ ئەو دارەی بەلای مەسیحیەکانەوە حەزرەتی عیسای لەسەر لەخاچ دراوە ◦ (ك: صُلُبٌ وصُلْبان).

**الصَّليب الأحمرُ**: دامەزراوەیەکی نێو دەوڵەتیە، کاری سەرەکی پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری مرۆییە لەکاتی رودانی بومەلەرزەو لافاوو شتی وا، ئا لەم کاتانەدا خزمەتگوزارییەکانی پێشکەشی لێقەوماوان دەکا.

**الصَّلِيبيُّون**: سوپای مەسیحییەکانی ئەوروپایە چەند جارێك پەلاماری جیهانی ئیسلامییان داوە لە چاخەکانی یانزەو دوانزەو سیانزەی زایین بەبیانووی رزگار کردنی بەیتولموقەدیس لەچنگی موسوڵمانەکان.

**صَلَتَ اللبنُ ونحوه صَلْتاً**: شیرەکە چەوری کەم بوو.

**صَلَتَ فلاناً وغيره**: غاری بەئەسپەکە دا.

**صَلَتَ ماني القدح**: ئەوەی لەپیاڵەکەدا بوو رشتی.

**صَلُتَ الجَبينُ صُلُوتةً**: ناوچەوانی دەرکەوتو بریسکەی دا ◦ دەشگوترێ: (صَلُتَ الرجلُ).

**أصْلَتَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دەرخست ◦ دەگوترێ: (أصْلَتَ السَّيْفَ): شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**إنْصَلَتَ**: دەرکەوتو ئاشکرا بوو.

**إنْصَلَتَ في سيره أو أمره**: لە رۆیشتن و ئیش و کاری خۆی دا دڵسۆزو بەخەمەوە بوو، جیدی بو ◦ پێش کەوت.

**الإصْلِيتُ**: ئیش لەدەست هاتوو.

**الصَّلْتُ**: دەرچوو بەدەرەوە ◦ لوس و پوس.

**جَبِينٌ صَلْتٌ**: ناوچەوانی پان و گوشادو نورانی ◦ (سیف صَلت): شمشێری بریقەدار ◦ (سكين صَلْت): کێردی تیژو برندە ◦ (أصلات).

**الصَّلَتان**: بەهێزو تواناو چوست و چالاك ◦ (ك: صِلْتانٌ).

**صَلِجَ صَلَجاً**: کەڕ بوو ◦ (فهو أصْلج وهي صَلْجاءُ) ◦ (ك: صُلْجٌ).

**تَصَالَجَ فلان**: فلانکەس خۆی بەکەڕ نیشان دا.

**الصَّلَجَةُ**: پەردەیەکی پارێزەری ئاوریشمییە.

**الصَّليجَةُ**: قاڵبە زیوی پوختە کراو.

**الصَّوْلَجُ**: صاف و بێ غەل و غەش ◦ عەصایەکە لایەکی وەکوو گۆچان

چـەمێندراوەتەوە، سوارچـاك پێـی لەگۆیەکە دەدا ٥ (ك: صَوالِج).

**الصَّوْلَجَةُ:** بەمانا (الصَّوْلَجُ)دێ.

**الصَّوْلَجانُ:** بەمانا (الصَّوْلَجُ)دێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو گۆچانو عەصایەی پاشا بەدەسـتییەوە دەگـرێ وەکـوو نیشانەی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی.

**الصَّوْلَجانَةُ:** بەمانا (الصَّوْلَجانُ)دێ.

**صَلَحَ صَلاحاً وصُلُوحاً:** گەنـدەڵیو پیسی تێدا نەماو پاك بۆوە.

**صَلَحَ الشَّيْئُ:** شتەکە گونجاو بـوو، بەسـود بـوو ٥ دەگـوترێ: (هـذا الـشَّيْئُ يـصلح لك): ئـەم شتـە بـۆ تـۆ گونجـاوە سودی هەیە.

**صَلُحَ صَلاَحاً وصُلُوحاً:** بەمانا (صَلَحَ)دێ.

**أَصْـلَحَ الـشَّيْئَ:** گەنـدەڵیو خراپـی شتەکەی نەهێشت لای برد.

**أَصْلَحَ بينهمـا:** دوژمنایـەتیو دژایـەتی نێوانی لابردن.

**أَصْلَحَ اللهُ لفلان في ذريته أو ماله:** خودا مـاڵو منـداڵی فلاَنکەسـی صـالحو گونجاوو بەخۆچاراوکردن.

**صَـالَحَهُ مُـصَالَحَةً وصِـلاحاً:** ئاشـتەوایی لەگەڵ دا کرد ٥ لەگەڵی ڕێك کەوت.

**إصْـطَلَحَ القَـومُ:** خەڵکەکـە کێـشەو ناخۆشییان لەناودا نەما.

**أصْلَحُوا على الأمر:** لەسەر کارەکە ڕێك کەوتنو ڕازی بوون.

**تَصَالَحوا:** بەمانا (إصْطَلَحوا)دێ.

**اسْتَـصْلَحَ الـشَّيْئُ:** شـتەکە خـەریکی چاکسازیو باشبون بوو.

**استَصْلَحَ الشَّيْئَ:** شتەکەی چاك کردەوە ٥ داوای چـاکبونو چاکـسازی تێـدا کرد بەباشو گونجاوی دانا.

**الإصْـطلاح:** چـاوگی (إصْـطلح)ەیـە ٥ یەکـدیگیربوونی کۆمـەڵێك خەڵکـە لەسـەر شـتێکی تایبـەتیو هـەموو زانـستو زانیارییـەکیش زاراوەی ئیصطلاحی خۆی هەیە.

**الصَّالِحُ:** ڕاستاڵو گوێ ڕادێرو پابەنـد بەئەنجامـدانی ئـەرکی سەرشـانی ٥ (ك: صَلَحاء) ٥ واش دەبێ بـەکاردێ بـۆ شـتی زۆرو گونجـاو ٥ دەگـوترێ: (عنده قدر صـالح مـن المـال): هـەروا دەگـوترێ: (واتَتْنِي صالحة من فـلان): لەفلاَنکەسەوە نیعمـەتێکی زۆرم پـێ گەیی ٥ (ك: صوالِحٌ).

**الـصَّلاحُ:** بـەردەوامبوون لەسـەر کـاری چاکە ٥ بێ عەیبو خەوش.

**الـصَّلاحِية:** دەسـت ڕۆیـشتوییو کارئەنجامدەر بەڕێكو پێکی.

**الصَّلاحية للعمل:** بـاش خۆئامـادەکردن بۆ ئیش.

**الصَّلاحية لذي السلطان:** ئەو دەسەڵاتەی

قـانون دەیـدا بـە کەسـێك بـۆ ڕەهاکردنی ئیش‌و کار.

الـصُّلْحُ: ئاشـتەوایی ٥ کۆتـایی هێنـان بەکێـشەو نیـزاع ٥ کۆتـایی هێنـان بەشەڕو کوشتار.

الصَّلِح: گونجاوو لەبار ٥ (ك: صُلَحاء).

المَصْلَحَة: بەمانا (الصَّلاح) دێ ٥ سوودو بەرژەوەنـــدی ٥ دەســـتەیەکی کارگێڕییـــە لـــەبوارێکی گـشتی دا کاردەکـەن بـۆ بەرژەوەنـدیی گـشتی وەکوو (مصلحة الضرائب).

صَلِخَ صَلَخاً: بیستنی نەما، کەڕ بوو ٥ (هو أصلخ وهي صلخاء).

تَـصَالَخَ: خـۆی بەکـەڕو گـوێ گـران لەقەڵەم دا.

صَلَدَ صَلْداً وصُلوداً: ڕەق‌و پتەو بوو.

صَـلَدَت الأرض: زەوییەکـە هیـچی لـێ نەڕوا، ڕوتەن بوو.

صَـلَدَ فـلان: فلانکـەس رژدو چـروك بـوو دەستی ناچێتە مـاڵی خـۆی ٥ دڵ ڕەق بوو.

صَـلَدَتِ الدَّابَـةُ: وڵاخەکـە لـەڕاکردن‌و غـاردان دا بەتونـدی قـاچی بـەزەوی کێشان.

صَلَدَ الزَّنْدُ: بەردو ئەستێکە دەنگـی هـات‌و ئاگری لـێ نەبۆوە.

صَلَدَ فلان بیدیە: فلانکـەس چـەپڵەی لـێ دا.

صَلَدَت أنیابە: ددانـەکانی (کەڵبـەکانی) سیرە سیرو جیرە جیریان هات.

صَلَدَ الشَّیْئُ: بروسکەی لـێ دا.

صَـلُدَ صُـلُوداً وصَـلادَةً: ڕەق‌و پتـەو بـوو، رژدو چروك بوو.

أصْلَدَ: ڕەق‌و پتەو بوو.

أصْلَدَ الشَّیْئَ: توشـی شتی ڕەق‌و پتـەو بوو.

الأصْلَدُ: شتی زۆر ڕەق‌و پتـەو ٥ پیـاوی زۆر ڕژدو چروك.

الـصَّلْدُ: ڕەق‌و لـووس ٥ بـەردی زۆر لـووس ٥ زەوی ڕەقـەن‌و چـەقەن کـە هیـچی لـێ نـەڕوێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا﴾.

رأس صَـلْدٌ: سـەری لـوس‌و بـێ تـوك ٥ (جلد صَلْدٌ) ٥ پێستی لوس‌و بێ توك ٥ هـەروا وشـەی (صَـلْد) نـاوە بـۆ چەرخ‌و شخارتەیەك دەنگی لـێ بێ‌و ئـاگری لـێ پەیـدا نـەبێ ٥ (ك: أصلاد).

الـصَّلودُ: بـۆ زێـدە ڕەوی لـەمانای (صَـلَدَ)دێ ٥ مەنجـەڵ‌و دیـزە کـە درەنـگ شـتیان تێـدا بکوڵـێ ٥ (ك: صُلُدٌ).

المِـصْلادُ: دەگـوترێ: (ناقـة مِـصلاد):

حوشترێکه بێچوی بووەو شیری تێدا نییه ٥ (ك: مصاليد).

**المِصْلادَةُ**: بەمانا (المِصْلادُ)دێ ٥ (ك: مَصَاليد).

**الصِّلْدِمُ**: ڕەق‌و قایم‌و پتەو ٥ ولاخی سم گەورە ٥ (ك: صَلادِم).

**صَلْصَلَ الشَّيْئُ**: شتەکە زرینگەی لێ هات، دەنگی دایەوە ٥ دەگوترێ: (صَلْصَلَ الجرسُ وصَلْصَلَ الحَلْيُ وصَلْصَلَ الرعدُ).

**صَلْصَلَ فلان**: فلانکەس هەڕەشەی کرد.

**صَلْصَلَ بكلامه**: قسەکانی پچڕ پچڕ دەرپەڕاندن.

**تَصَلْصَلَ الغديرُ**: زەلکاوەکەی وشك بوو.

**الصُّلاصِلُ**: شتێك دەنگ بداتەوە ٥ ترینگەی لێ بێ.

**الصُّلْصُلُ**: ناوچەوانی ئەسپ ٥ (ك: صَلاصِل).

**الصُّلْصُلُ**: باقی ماندەی ئاو لەبنکی زەلکاو دا یان لەبنکی تەنکی‌و بەرمیل‌و شتی وا دا ٥ ئەو شوێنەی لەپشتی ئەسپ سپی دەبێ بەهۆی روتانەوەی توکەکەی ٥ (ك: صَلاصِلُ).

**صَلْطَحَهُ**: بلاوی کردەوەو رایخست.

**الصِّلْطَحُ**: پان‌و پۆڕ ٥ کەتەو زەبەلاح.

**المُصَلْطَحُ**: راخراوی پان.

**صَلَعَ فلان صَلَعاً**: قژی پێشە سەری یان تۆقەسەری روتانەوە ٥ موی پێوە نەما.

**صَلَعَتِ الشجرةُ ونحوها**: بڕژو سەرە لقی درەختەکە هەلوەرین یان ئاژەڵ خواردنی.

**صَلَّعت الشمسُ**: خۆر لەژێر هەور هاتە دەرو دەرکەوت.

**تَصَلَّعت الشمسُ**: بەمانا (صَلَّعت)دێ.

**الأَصْلَعُ**: کەسێك سەری روتابێتەوە، پێشەسەری یان تۆقەسەری روتابێتەوە ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (صَلْعاءُ) ٥ نۆکە شمشێری مشت‌و ماڵ کراو، نووکە ڕمبی مشت‌و ماڵ کراو ٥ هەرشتێك بدرەوشێتەوەو لووس بێ ٥ (ك: صُلْعٌ وصُلْعانٌ).

**الصِّلاع (صِلاع الشمس)**: گەرمایی خۆر.

**الصَّلَعُ**: روتانەوەی مووی پێشەسەر یان تۆقە سەر.

**الصُّلْعَةُ**: پێستی سەر کە تووکی پێوە نەمابێ.

**الصَّلَعَةُ**: بەمانا (الصُّلْعَةُ)دێ.

**الصُّلاَّعَةُ**: بەردی ڕەقی پتەوو پان ٥ (ك: صُلاَّع).

**الصَّلِيعُ**: بەمانا (الأَصْلَعُ) دێ ٥ شتێك لەزەوی جیابووبێتەوە ٥ (ك: صُلَعاء) ٥ بۆ مێینە (صليعة) بەکاردێ ٥ (ك: صلائع).

**صَلَفَهُ صَلْفاً**: رقی لێ بوو، ناخۆشی ویست.

**صَلِفَ الشَّيْئُ صَلَفاً**: خێرو بێری کەم بوو ٥ دەگوترێ: (صَلِفَ النبات): رووەکەکە قەدو بالآی کەم بوو، دانەوێڵەی کەم بوو ٥ (صَلِفَ الطعامُ): خۆراکەکە ڤیتامیناتی کەم بوو ٥ (صَلِفَ السحابُ): هەورەکە بارانی کەم بوو، بروسکەی کەم بوو.

**صَلِفَ فلان**: فلانکەس بێ بەختو چارە ڕەشە خەڵك خۆشیان ناوێ ٥ (فهو صَلِفٌ وهي صَلِفَةٌ).

**أصْلَفَ**: بەمانا (صَلِفَ)دێ ٥ ڕەزاگران بوو، چارە قورس بوو.

**أصْلَفَ فلاناً وغيره**: رقی لەفلان بۆوە.

**أصْلَفَه الله**: خودا وای لێ کردوە خەڵکی رقیان لێ بێ.

**تَصَلَّفَ**: چارە ڕەشیو بێ خێری دیارکەوت ٥ چووە ناو زەوییەکی ڕەقەنو پتەو.

**الأصلف من الأرض**: زەوی ڕەقو پتەو کە هیچی لێ نەڕوێ ٥ (ك: أصالف وصُلْفٌ).

**الصَّلِفُ**: دەگوترێ: (سحاب صَلِفٌ): هەورێکە بروسکەو گۆڵە گۆڵی زۆرە بەلاّم بارانی نییە ٥ هەروا ناوە بۆ خۆراکێك تامی کەم بێ یان هەر بێ تام بێ.

**الصَّلْفاءُ**: بەردی لەگەڵ زەوی تەخت بوو ٥ (ك: الصَّلافي).

**الصِّلْفُ**: بەمانا (الصَلِفُ)دێ ٥ لامل، خوار گوێچکە بۆسەر شان.

**الصِّليفان**: هەردو لامل ٥ دو دارن لەم دیوو ئەو دیوی کورتانی ولاّخ دەبەسترێن باریان پێ قایم دەکرێ.

**صَلَقَ القومَ**: زەرەرو زیانی زۆری لەقەومەکە داو کارەساتی بەسەر هێنان ٥ دەشگوترێ: (صَلَقَ فيهم).

**صَلَقَ اللَّحْمَ ونحوه**: گۆشتەکەی کولاندو کردی بە چێشت.

**صَلَقَ الشاةَ ونحوها**: مەڕەکەی ئەم دیو ئەو دیو برژاند.

**صَلَقَتِ الشَّمْسُ فلاناً وغيره**: خۆر بەگەرمییەکەی زیانی بەفلانکەس گەیاند.

**صَلَقَ فلاناً بالعَصَا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**أصْلَقَ النابُ**: ددانەکە (کەڵبەکە) سیرەی هات چونکە لەددانێکی دەخشا.

**تَصَلَّقَ**: تلاوتلی کرد، ئەمدیواو دیوی کرد.

**تَصَلَّقَتِ الدَّابَّةُ**: ولاّخەکە خۆی گەوزاند، تلاوتلی کرد.

**إصْطَلَقَ**: بەمانا (أصْلَقَ)دێ.
**الصُّلاقة**: ئاوێك زۆر مابێتەوەو بۆگەنی کردبێ ٥ ئاوی گەڕاوە.
**الصَّلْقُ**: هاوارو لۆرە لۆر ٥ دەنگو جیڕەی ددانی حوشتر کە لێکیان دەدا.
**الصَّلَقُ**: دەشتی کاکی بەکاکی ٥ (ك: أصلاق).
**الصَّلاَّقُ**: بۆ موبالەغەو زێدە ڕەوی لەمانای (صَلَقَ)دا دێ ٥ هەروا بەوتار بێژی زمانڕەوانو دەنگ گەورە دەگوترێ.
**الصَّليق**: گۆشتی کولاو ٥ گۆشتی برژاو ٥ نانی تیری ٥ (ك: صلائق).
**المِصْلَقُ**: بەمانا (الصَّلاّق)دێ ٥ (ك: مَصَالِق و مصاليق).
**صَلَّ الشَّيْءُ صَليلاً**: شتەکە دەنگی شێوە لەرینەوەو زرینگانەوەی لێ هات.
**صَلَّ بيضُ الحديد**: ئاسنەکە دەنگی لێ هات بەهۆی پێك كێشانەوە.
**صَلَّ المِسْمارُ**: بزمارەکە لەکاتی داکوتان دا دەنگی لێ هات.
**صَلَّ الإناءُ الفارغ**: قاپە بەتاڵەکە لەکاتی پێکێشانی شتێکی تر پێی دەنگی لێ هات زرینگەی لێ هات.
**صَلَّ اللَّحْمُ صلولاً**: گۆشتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد.

**صَلَّ الشَّرابَ صَلاًّ**: شەرابەکەی تەصفیە کرد.
**صَلَّ الحبُّ المختلط بالتراب**: ئاوی پێداکردو قوڕەکەی لەدانەوێڵەکە کردەوەو دای شۆرد.
**أصَلَّ اللَّحْمَ أو الماءَ ونحوه**: گۆشتەکە بۆگەنی کردو تامو ڕەنگی گۆڕا.
**صَلَّلَ**: بۆ زێدە لەمانای (صَلَّ)دێ.
**الصَّالُّ**: کەرەکێوی زەڕە تیژو ناخۆش.
**الصَّالَّةُ**: بۆ مێینەی (الصَّال)دێ ٥ بەڵاو کارەسات.
**الصُّلُّ**: گۆشتی بۆگەن کردو گۆڕاو یان هەرشتێکی تر کە گۆڕابێو بۆنی کردبێ.
**الصِّلُّ**: ماری پێسو ژەهراوی پیسترین ماری ژەهراوی ٥ دەگوترێ: (صِلُّ أصلال): بەڵاو نەخۆشی پیس.
**الصُّلَّةُ**: پێستی وشکەوە بووی بۆگەن ٥ (ك: صِلال).
**الصُّلَّةُ**: بای بۆگەن.
**صَلَمَهُ صَلماً**: بڕیەوە ٥ لەڕیشە دەری هێنا ٥ بەزۆری بۆ گوێچکەو لووت بەکاردەهێندرێ دەگوترێ: (صَلَمَ أذنه، أنفه).
**صَلَّمَهُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕۆیی لەمانای (صَلَمَ)دا بەکار دێ.
**إصْطَلَمَهُ**: بەمانا (صَلَمَهُ)دێ ٥ دەگوترێ:

(إصطَلَمهم الدَّهْرُ أو الموتُ أو العدوّ): زمانــه يــان مــەرگ يــان دوژمــن لــه بێخی دەرهێنانو لەناوی بردن.

**الأَصْلَمُ:** گوێ بـڕاو ◦ گوێ بـچوك كـه بەسروشـت گوێی بـچوك بـن ◦ (ك: صُلْمٌ).

**الـصَّلْماءُ:** مێینــەی (الأصــلم) ◦ (ك: صلمٌ).

**الصُّلْمَةُ:** زرێيه دەچـندرێ بەئەنـدازەی كڵاو لەژێر كڵاوو قەلەنـسوه لەسـەر دەكرێ ◦ (ك: صُلَمٌ وصِلامٌ).

**الصَّيْلَمُ:** بەڵاو كارەساتی وا شـت لـەبێخ بێنێ ◦ شمشێر.

**المُصَلَّمُ:** بەمانا (الأَصْلَمُ)دێ ◦ بۆ تـەعبیر دانــەوه لــەزەلیلیو بــێ دەســەڵاتی دەگــوترێ: (مَــشوا بــآذان النعــام المُصَلّم).

**صَلِيت الناقة أو الحامِلُ:** حوشترەكه يـان ئافرەته دووگیانەكه وانێكی شل بوو چونكه نزیكه بزێ.

**أَصْـلَت الحامِـلُ:** بـەمانا (صـليت)دێ ◦ نزیكه منداڵەكەی ببێ.

**صَلَّيَ الفرسُ:** ئەسپەكه لـه پێشبڕكێ دا بەدووەم گەیشت.

**صَلَّى فـلان:** فلانكـەس نـزاو پاڕانـەوەی كــرد ◦ دەگــوترێ: (صَــلّى عليــه): دوعای خێری بۆكرد ◦ لە قورئـان دا هاتووه: ﴿وَصَـلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَـلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ ◦ نوێژی كرد.

**صَلَّى الله على رسوله:** خودا ڕەحمـەتو سۆزی خۆی ڕژاند بەسەر پێغەمبـەر دا.

**الـصَّلاَ:** ئـەم لاو ئـەولای كلك، ڕاسـتو چەپی كلك ◦ بۆشایی نێوان قـنگو كلك ◦ ناوقەدی پشت بۆ ئـادەمیزادو ئاژەڵ ◦ (ك: أصلاء).

**الـصَّلاَةُ:** دوعـاو پاڕانـەوه ◦ دەگـوترێ: (صـلّى صـلاةً): دوعـای كـرد ◦ نوێـژ عیبــادەتێكی تایبەتییــەو كــاتی دیـاریكراوی هەیـەو لەشـەریعەت دا بـەدوورو درێـژی باسـی لێـوه كـراوه ◦ ڕەحمـەتو بـەزەیی ◦ خانـەی خـودا پەرسـتی لای جولەكــه ◦ قورئــان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْـعُ اللَّـهِ النَّـاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُـدِّمَتْ صَـوَامِعُ وَبِيَـعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا﴾ مەبەست بەوشـەی (صـلوات) لەئایەتەكــــەدا شــــوێنەكانی عیبادەتكردنی جولەكەكانه.

**المُصَلِّي من خيل السباق:** ئەو ئەسـپەیه كــه لــه دوا ئەســپی یەكــەم دێ لــه گۆڕەپــانی پێــشبڕكێ دا ◦ بــۆ ئــادەمیزایش بەكاردەهێنــدرێ كەلەدوا یەكەمەوه بێ لەهەر ئیشو كارێك دا بێ.

**المُصَلّى**: شوێنی نوێژکردن، بەرماڵو تاتەبەردی نوێژکردن.

**صَلَّى الشَيْءَ صَلْياً**: شتەکەی خستە ناو ئاگرەوە ٥ دەگوترێ: (صَلاه النار وفيها وعليها): هەروا دەگوترێ: (صلاّة العذابَ أو الذلّ أو الهوانَ).

**صَلَّى اللّحْمَ**: گۆشتەکەی برژاند ٥ دەگوترێ: (صَلَّى الصيدَ): داوی بۆ نێچیرەکە نایەوە ٥ (صَلَّى فلاناً): فلانکەسی خستە ناو چورتمو نەگبەتییەوە.

**صَلِيَ في النار وبها صَلىً وصِلياً**: لەئاگردا سوتا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى﴾.

**صَلِيَ الأمْرَ وبه**: چورتمو ناخۆشی لەکارەکە توش هات ٥ دەگوترێ: (صَلِيَ بفلان وصَلِيَ بشر فلان): گرفتاری فلانکەس بوو، گرفتاری شەڕی فلان بوو ٥ (فهو صالٍ) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾.

**أصْلاهُ النار وبها وعليها**: خستییە ناو ئاگرەوە.

**أصْلَى اللحمَ**: گۆشتەکەی برژاند.

**صَلاَّ النارَ**: خستیە ناو ئاگرەوە.

**صَلّى الماءَ**: ئاوەکەی گەرم کرد.

**صَلَّى القَناةَ أو العصا بالنار**: رمبەکە یان عەصاکەی بەسەر ئاگردا راداشت بۆئەوەی گەرم بیێو نەرم بیێ راستی بکاتەوە.

**إصْطَلَى النارَ وبها**: خۆی بەئاگر گەرم کردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان لايصطلى بناره): فلانکەس کەس خۆ بەئاگری گەرم ناکاتەوە، واتە: ئەوەندە ئازاو چاو نەترسە.

**تَصَلَّى النار وبها**: خۆی بەئاگر گەرم کردەوە.

**تَصَلَّى القناةَ**: رمبەکەی بەئاگر راداشت بۆئەوەی گەرمو نەرم بیێو راستی بکاتەوە.

**الصَّلَى**: ئاگر ٥ سوتەمەنی.

**الصَّلاَيَةُ الصَّلاءَةُ**: دەسکەوانی کوتانی ئەوشتانەی بۆنی خۆشیان لێ دروست دەکرێ.

**الصِّلِيُّ**: چوونە ناو ئاگر.

**المِصْلاةُ**: داوێکە دەنرێتەوە بۆ نێچیرکردن ٥ فرتو فێڵو تەڵەکەبازیی ٥ (ك: مصال).

**إصْمَأَلَّ**: پتەو بوو ٥ (إصْمَأَلَّ النباتُ): ڕووەکەکە راساو تێک چڕژاو گەشەی کرد.

**إصْمَأَلَّ فلان**: فلانکەس رقی هەڵساو

ڕەگی لاملی فش بوون ○ (فهو مُصْمَئِلٌ).

**صَمَتَ صَمْتاً وصُمُوتاً وصُماتاً:** بێدەنگ بوو قسەی نەکرد ○ بۆ جگە لەئادەمیزاد دەگوترێ: (صامت) ناگوترێ (ساکت).

**أصْمَتَ العليلُ:** نەخۆشەکە زمانی شکاو لەقسەکردن کەوت.

**أصْمَتَ فلاناً:** فلانکەسی بێدەنگ کرد.

**صَمَّتَ:** بەمانا (صَمَتَ)دێ.

**صَمَّتَ فلاناً:** فلانکەسی بێدەنگ کرد.

**صَمَّتَ الشَيْئَ:** شتەکەی والێ کرد بۆشایی تێدا نەما.

**الصَّامِتُ:** بێدەنگ ○ هەرشتێك نوتقی نەبێ.

**الصَّامِتُ مِن المالِ:** زێرو زیو ○ دەگوترێ: (ما له صامِت ولا ناطق): خاوەنی هیچ نییە ○ هیچی نییە ○ (ك: صُمُوت وصوامت).

**الصُّمَاتُ:** بێدەنگی ○ لەبواری مارەکردنی کچ دا گوتراوە (إذنها صُماتها): بێدەنگی کچ نیشانەی ڕازیبوونییەتی ○ هەروا دەگوترێ: (رماه الله بصُماتها): خودا زەبرێکی ئاڕاستە کرد بێدەنگی کرد.

**الصِّمَاتُ:** شت ○ چت ○ هەردەبێ لەگەڵ ئامرازی نەفی دا بەکار بهێندرێ ○ دەگوترێ: (ما ذقت صَماتاً): هیچم نەچەشتووە.

**الصِّمَاتُ:** مەبەست ○ دەگوترێ: (بات على صِمات أمره): وازی نەهێناو سوور بوو لەسەر کارەکەی‌و دەیەوێ ئەنجامی بدا.

**الصُّمْتَةُ:** ئەو شەقشەقەو حەتحەتۆکەو گەڵوازەو شتی تر کەمنداڵی بچوك دەخافڵێنێ‌و خواردن‌و گریانی لەبیردەباتەوە.

**الصُّمُوتُ:** بێدەنگ ○ دەگوترێ: (ضَرْبَة صُمُوت): زەبرێکی خەپ کەر بەبێ ئەوەی دەنگی لێ بێ ○ (مُسَدَّسٌ صموت): دەمانچەی بێدەنگ ○ هەروا ناوە بۆ شمشێر ○ زرێی مشت‌و ماڵ کراوی نەرمەلیقە ○ هەروا دەگوترێ: (خلخال صموت وجارية صموت الخلخال): دەنگی خەڵخاڵی لێ نایە چونکە قاچی گۆشتنەو پڕی کردوە.

**المُصْمَتُ:** شتی بێ گیان‌و گەشەو نما کەناوی کلۆر نەبێ وەکوو بەردو شتی وا ○ قفڵێك کە بەناڕەحەتی بکرێتەوەو شوێنی کلیلەکەی چەواشەکاریی تێدابێ ○ ڕەنگی خاڵص‌و بێ غەش کەهیچی تری تێکەڵ نەکرابێ ○ نووستنی قوڵ‌و

گران کەبەئاسانی بەخەبەر نەیە.

**المُصْمِتُ**: دەگوترێ: (هو یشکو الی غیر مُصِمتٍ): دادو فیغانی لەلای کەسێك دەکا کەهیچ شلوێ نابێ ٥ شکاتەکە هەستی ناجولێنێ.

**صَمَخَ الیومُ صَمْخاً**: گەرماکەی بەهێز بوو.

**صَمَخَ الحَرُّ فلاناً**: گەرما مێشکی فلانی ئازار دا.

**صَــمَخَ فلانــاً بالســوط**: بەقەمــچی لەفلانکەسی دا.

**صَــمَخَ في المــسألة**: زۆر لەباســەکەی کۆلییەوەو وردبینی تێدا کرد.

**الصُّمَاخُ**: داخکردن ٥ بۆگەن.

**صَمَخَهُ صَمْخاً**: لەکرکراگەی گوێچکەی دا ئـازاری زەبـری گەیانـدە پـەردەی گوێی.

**الأُصْمُوخ**: بەمانا (الصُّماخ)دێ.

**الـصِّمَاخُ**: بـۆری ناوگوێـچکەکە دەگاتـە کرکراگـەی گـوێ ٥ (ضـرب الله علـى صماخه): خـودا خـەوی لـێ خـست ٥ (ك: أصمِخة).

**الصِّمِخَةُ مـن النـساء**: ئـافرەتی ناسكو تازە پێگەیشتوو.

**الـصِّمَاخَةُ**: ئـەو کـەلوو لوانـەی لـەورگی ئاژەلی کاوێژکاردایە.

**صَـمَدَ صَـمْداً وصُـموداً**: خـۆگرو دامـەزراو بوو.

**صَمَدَ الشَيْءَ وله والیه صمداً**: قەصدی شتەکەی کرد.

**صَمَدَتْ الـشمسُ وجْهَـهُ**: گـرەی گـەرمای خۆر دەمو چاوی داخ کرد.

**صَمَدَ القـارورةَ ونحوهـا**: تۆپەوانـەی خـستە دەمی دیزەکەوە.

**أصْــمَدَالأمْرَ الیــه**: ئیــشەکەی خــستە ئەستۆی ئەو.

**أصْمَدَ فلاناً الی کـذا**: فلانکەسی ناچار کرد بۆ ئەو شتە.

**صَامَدَهُ مُـصَامدةً وصِـماداً**: بەسـەری دا زاڵ بوو لەخۆراگری‌و بەرگری کردن دا.

**صَمَّدَهُ**: بۆ زێدە ڕەوی لـەمانای (صَـمَدَ) دا دێ.

**صَمَّدَ رأسَهُ**: چەفتەیەکی بچوکی لەسەر بەست.

**تَصَامَدا**: کێ برکێیان لەگەڵ یەکتر کرد لەبواری بەرگری‌و خۆگری دا.

**الصِّمَادُ**: دەگـوترێ: (بـات علـى صـماد الماء): شەوی بـەرۆژ کـردەوە بەتـەما ئاوو هەوڵدان بۆ ئاو ٥ ئەو چەفتەو دەســرە بـچوکەیە کـەپێش مێـزەر لەســەر دەبەســترێ ٥ تۆپەوانــەی گۆزەو دیزە ٥ (ك: أصمدة).

**الصِّمادَةُ**: تۆپەوانەی دیزەو گۆزە ٥ (ك: صمائد).

الصَّمْدُ: شوێنی بەرز، تەپۆڵکەی بەرز ◦ (ك: أصْمَاد وصِماد).

الصَّمَدُ: ئەوکەسەی بۆ بەهانا هاتنو جێ بەجێ کردنی پێویستیات قەصد دەکرێو لەوداوا دەکرێ پێویستیاتی مەخلوقات دابین بکا ◦ هەوا ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ◦ هەروا بەشتێك دەگوترێ کە کلۆر نەبێ ◦ دەگوترێ: (شـيء صَـمَدٌ): شتێکی پتەوو پڕو بێ کلۆراییە.

الصَّمْدَةُ: بەردی چەقیوو دامەزراوو رۆچوو بەزەوی داو کەمێکی بەدەرەوەبێ.

المِصْمَادُ: دەگوترێ: (ناقـة مِـصْمَادٌ): حوشترێکە خۆگرە لەسەر برسییەتیو تینوایەتی ◦ (ك: مَصَامِيد).

المُصَمَّدُ: مەقصودو مەبەست ◦ شتێکی رەقو پتەو کە کلۆرایی تێدا نەبێ.

صَمَرَ الماءُ صَمْراً وصُموراً: ئاوەکە لەبەرزاییەوە هەڵڕژایە شوێنی تێدا راوەستانی خۆی.

صَمَرَت الريحُ: رەشەباکە کەوتو نەما.

صَمَرَ الرجلُ: پیاوەکە رژدو چروك بوو.

صَمَرَ الشيْءَ: شتەکەی مەنع کرد.

صَمِرَ اللَّبَنُ صَمَراً: ماستەکە مزر بوو.

صَمِرَ الماءُ: ئاوەکە بۆگەن بوو، بۆنی ناخۆشی لێ پەیدا بوو ◦ دەشگوترێ: (يَدی صَمِرَةٌ مِن السَّمَك): دەستم بەماسی بۆنی ناخۆشی لێ پەیدا بوو.

أصْمَرَ اللَّبَنُ: ماستەکە زۆر مزر بوو.

أصْمَرَ فلان: فلانکەس کەوتە کاتی خۆرئاوابوون.

أصْمَرَ المتاعَ: کاڵاو شتو مەکەکەی کۆکردەوە.

صَمَّرَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (صَمَرَ)دا دێ.

صَمَّرَ المتاعَ: کاڵاو شتو مەکەکانی کۆکردەوە.

الصّامورة: ماستی زۆر مزرو ترش.

الصِّمْرُ: زەلکاوو شوێنی ئاوی بۆگەن ◦ (ك: أصمار).

الصَّمَرُ: بۆگەن ◦ دەگوترێ: (أصابه صَمَرُ البحر): بۆگەنی ئاوی دەریا کاری لێ کردووە.

الصَّمِيرُ: گۆشتی وشکەوە بوو بەسەر ئێسقانەوە کەبۆگەنی عەرەقی لێ دێ ◦ (ك: صُمَراء) بۆئافرەت ◦ دەگوترێ: (هُنَّ صمائرُ).

الصُّمَيْرُ: کاتی ئاوا بوونی خۆر ◦ دەگوترێ: (دخلنا المدينة في الصُّمَيْرِ).

صَمْصَمَ في كذا: بەمانا سووربوون لەسەر شت، پێگیری کردن لەداوا.

**صَمْصَمَت القُنْفُذَةُ:** ژیشكەكە دەنگی لێوەهات ◦ قیزاندی.

**الصَّمْصَامُ:** سوور بوو لەسەر داوا ◦ شمشێری بڕندەو تیژ كە نەنوشتێتەوە ◦ (ك: صُمَاصِمَة).

**الصَّمْصَامَةُ:** بەمانا (الصَّمْصَامُ)دێ.

**الصَّمْصَمُ:** زۆر رژدو چرۆك.

**الصَّمْصِمَةُ:** كۆمەڵو تاقم ◦ تەپۆڵكەی پتەو بەردەڵان ◦ (ك: صِمْصِمٌ وصَماصِمُ).

**الصِّمْصَمُ:** زۆر رژدو چرۆك.

**الصِّمْصِمَةُ:** كۆمەڵو تاقم ◦ تەپۆڵكەی پتەوو بەردەڵان ◦ (ك: صِمْصِمٌ وصَماصِمُ).

**صَمِعَ صَمَعاً:** گوێچكەی بچوك بوو، پاژنە پێی بچوك‌و باریك بوو.

**صَمِعت القناة:** رمبەكە گرێكەی بچوك بوو.

**صَمِعَ فلان:** فلانكەس ئازاو بەجەرگ بوو، ملی لێ نابۆ ناو كارەسات‌و گوێی بەهیچ نەدا ◦ (هو أصْمَعُ وهي صَمْعَاءُ).

**صَمَّعَ الشَيْئَ:** شتەكەی تیژ كرد.

**صَمَّعَ الحيوانَ:** گیانلەبەرەكەی كزو كۆڵەوار كرد.

**صَمَّعَ اللهُ الظبيَ:** خودا شاخی پچوك‌و تیژی بۆ ئاسكەكە خوڵقاند.

**إنْصَمَعَ في غضبه:** لەرِق هەڵسانەكەی دا بەردەوام بوو.

**تَصَمَّعَ:** ڕقی لەگەڵ رق تێكەڵاو كرد ◦ رقی سوار رق بوو.

**تَصَمَّعَ ريش السَّهْم:** پەڕو پۆڵی پێكەوە نووسا چونكە خوێناوی بوو ◦ دەشگوترێ: (تَصَمَّعَ السهمُ).

**الأصْمَعُ:** بێچوو ◦ ئەم ناوەی لەوەوە بۆ هاتووە كە گوێچكەی بچوكن‌و بەسەریەوە نووساون ◦ پێشی دەگوترێ: (الأصْلَمُ) ◦ هەروا بەمانا سەرباریك‌و تیژ دێ ◦ دەگوترێ: (نبات أصمعُ): ڕوەكێكە چرووەكەی دەركەوت‌و هێشتا نەگەشاوەتەوە ◦ (قلب أصمع) دڵێكی زیرەك‌و قایم‌و پتەو.

**الصَّمِعُ:** دڵ قاییم ◦ ئازاو ورە بەرز.

**الصَّمْعَاءُ:** دەگوترێ: (أذن صَمْعَاءُ): گوێچكەی پچوك‌و نوساو بەسەرەوە ◦ (قدم صَمْعَاءُ): قاچێكە پاژنەی رێك‌و پێك‌و ناسكە ◦ (برعومة صَمْعَاءُ): چوزەرەیەكە هێشتا نەگەشاوەتەوەو نەكراوەتەوە ◦ (قناة صَمْعَاءُ): سەر رەمبێكە ئاسنەكەی پتەوو بێ كلۆراییە.

**صَوْمَعَ الشَيْئَ:** شتەكەی گرد كردەوە.

صَوْمَعَ البناءَ: باڵەخانەکەی بەرز کردەوە.
الصَّوْمَعُ: کەنیشتە، خانووی خودا پەرستی مەسیحییەکان ٥ خەڵوەی خودا پەرستی و گۆشەگیری.
الصَّوْمِعة: بەمانا (الصَّوْمَعُ) دێ ٥ سایلۆی دانەوێڵە ٥ کەندوو عەمباری دانەوێڵە تێدا هەڵگرتن ٥ (ك: صوامع).
أصْمَغت الشجرةُ: درەختەکە صەمغی تازەی دەردا.
أصْمَغَ شِدْقُهُ: لاشەویلەی کەفی پێوە بوو.
صَمَّغَهُ: صەمغی لێ دا، صەمغی تێ کرد ٥ بەصەمغ پێکیەوە نووساند.
استَصْمَغَ الشجرَ: صەمغی لەدرەختەکە دەرهێنا.
التَّصَمُّغُ: نەخۆشییەکە توشی برێ شتی سوێرو شیرین دەبێ.
الصَّامِغان: ئەملاو ئەولای دەم بۆلای شەویلە.
الصَّمْغُ: مادەیەکی لینجە وەکوو غەرە وایە لەبرێ درەخت دەردەهێندرێ و وشك دەکرێتەوەو ئامادە توانەوەی تێدایە دەکرێتە کەرەسەی شت پێکەوە نووسان.
الصِّمْغانُ: بەکەسێك دەگوترێ کە شتێکی وەکوو صەمغ لەگوێچکەی یان لە لوتییەوە بێتە دەر.
الصَّمْغَةُ: لەبواری پزیشکی دا هەوکردن و هاوسانێکە لەقۆناغی سێیەمی نەخۆشی زوهری بۆماوەیی پەیدا دەبێ و کێم دەکا ئەگەر لەپێست دا بێ.
الصَّمَّاغَةُ: سەتڵەو قاپێکە صەمغی تێدایە، کاغەزو شتی وای پێ بەیەکەوە دەنوسێنرێ.
صَمَلَ صَمْلاً وصُمولاً: خۆی داپشت و خۆی پرکردەوەو پتەو بوو ٥ دەگوترێ: (صَمَلَ البَدَنُ وصَمَلَ العود وصَمَلَتْ الشجرة).
صَمَلَ عن الطعام: وازی لەخواردن هێنا.
صَمَلَ للعمل وفيه: خۆی بۆ کارەکە ڕاگرت و پشوو درێژ بوو ٥ (فهو صامِلُ وصميل).
أصْمَلَهُ: وای لێ کرد پشوو درێژو خۆگر بێ ٥ دەگوترێ: (أصْمَلَهُ الصِّيامُ): ڕۆژو لاوازی کرد کزو کۆڵەواری کرد.
أصْمَلَ الشَجَرَةَ العَطَشُ: تینوایەتی و بێ ئاوی درەختەکەی لاوازو زەرد کرد.
الصُّمُولَةُ: پارچە ئاسنێکە بازنەیی

یان سوچداره برغوو بزماری پێ قایم دەکرێ.

الصِّملاخ (صِملاخ الأذن): كرکراگەی گـوێ ٥ یـان ئـەو مـادە زەردەی گوێـچكە ئیفـرازی دەكـا وەكـوو صەمغ وایە.

الصُّملوخ: بەمانا (الصِّملاخ)دێ.

صَمَّ القارورةَ ونحوها صَمّاً: دەمی گۆزەكەی گرت، تۆپەوانەی تێ هاخنی.

صَـــمَّ الجُـــرْحَ: برینەكـەی دەرمـانكردو دەمەكەی بەست.

صَـمَّ الحـديث: فەرمودەكـەی لەبـەركرد، خستییە مێشكی خۆیەوە.

صَمَّ فلاناً: بەشیدەتو هێز لەفلانكەسی دا.

صَـمَّ صَـمّاً وصَـمَماً: كـەڕبوو ٥ دەگـوترێ: (صَمَّتْ أذنهُ): گوێچكەی گیرا ٥ كـەڕبوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَحَـسِبوا الاّ تكون فِتْنَةٌ فعمّوا وَصَمّوا﴾.

صَمَّ عن حديثه: روی لەقسەكانی وەرگێـڕا، گوێی خۆی لە قسەكانی كەڕكرد نەی ویست گوێی لێ بێ.

صَمَّ الجِسْمُ: قەبارەكە پتـەوو بـێ كلۆرایی بوو.

صَمَّ الأمْرُ: كارەكە گیربوو، كێشەی تێكەوت ٥ (فهو أصَمُّ وهي صمّاء).

أصَمَّ: كەڕبوو.

أصَمَّ فلاناً: فلانكەسی كەڕكرد ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿أولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾.

أصَمَّ القـارورةَ: تۆپەوانـەی بـۆ گۆزەكـە دروست كرد.

صَمَّمَ في كذا أو عليه: سوور بوو لەسەر ئەوشتەو دەستبەرداری نەبوو.

صَـــمَّمَ الـــسيفُ: شمـــشێرەكە تاســـەر ئێسقانی بڕی.

صَمَّمَ فلاناً: فلانكەسی كەڕكرد.

صَـمَّمَ صـاحِبَهُ الحـديث: فەرموودەكـەی بەهاوەڵەكەی لەبەركرد.

تَصَامَّ الحديث وعنه: وای خۆنیشان دا كە كەڕەو قسە نابیستێ.

الأصَمُّ: كـەڕ ٥ گوێ گران ٥ كەسێك هـیچ هیوایـەكی لـێ نـەكرێ ٥ كەسـێك ئامۆژگـاری كـاری تـێ نـەكا ٥ دەشـــگوترێ: (حِلْـــمٌ أصَـــمٌّ): لەســـەرەخۆیی‌و بـارقوڵی زۆرو بـێ ئەنـدازە ٥ (خَطْـــبٌ أصَـــمُّ): بـەڵای بـەهێزو كوشـندە ٥ (مكـان أصَـــمُّ): شـوێنی روتـەن‌و سوتەمەڕۆ كەهیـچی لـێ نـەڕوێ ٥ (الـشهر الأصَـمُّ): مـانگی ڕەجـەب، عارەبـەكان دابو نـەریتییان وا بـوو لـەم مانگـەدا بانگـەوازییان نەدەكرد بۆ شەڕ ٥ (ك: صُمّ وصُمّان).

الـصَّمَّاءُ: (الغُـدَّةُ الـصَّمَّاءُ): لوێكـە، غودەیەكـــە بـــۆ ئیفرازاتەكـــەی

مەنفەزی نەبێ بۆدەرەوەی جەستە، وەکوو غودەی دەرەقی.

صَمَامِ: ناوە بۆ بەڵاو کارەساتی ناخۆش ٥ هەروا بەمانا فەرمانکردنە بەبێ دەنگ بوون ٥ (صُمَامِ): واتە بێدەنگ بە.

الصِّمَامُ: بەربەستو تۆپەوانە ٥ قفڵێکە ئۆتۆماتیکی لەکاتی زەخت لێ کردن دا بۆخۆی دەکرێتەوە.

الصِّمَامَةُ: بەمانا (الصِمَام)دێ ٥ (ك: صمائم).

الصَّمَمُ: نەمانی هەستی بیستن ٥ کەربوون ٥ دەگوترێ: (بە صَمَمٌ): بەکەسێك دەگوترێ ببیسێ بەڵام هیدایەت نەدرێ بەگوێرەی ئەوەی دەیبیستێ.

الصِمَّةُ: ئازاو بەجەرگ ٥ دەگوترێ: (رجل صِمَّةٌ): پیاوێکی ئازایە.

الصِّمَامُ: ژیشکی مێ ٥ (ك: صِمَمٌ).

الصَّميم: ناوەڕۆكو پوختەو کاکڵە ٥ ناوەڕاستی دڵ ٥ گەرماو سەرمای بەشیدەت.

صميم العضو: ئەو ئێسقانەی جەستە ڕادەگرێ ٥ دەگوترێ: (ضربە فأصاب منە صميمە): لێی داو شوێنی کاریگەری گرت.

المُصَمِّمُ: ئەوکەسەی سوورە لەسەر کاروباری خۆیو نایەوێ کۆڵ بدا ٥ شمشێری تیژی بڕندە کە ئێسقانیش دەبڕێ ٥ کەسێك بەردەوام بێ لەسەر ڕۆیشتنو شتی وا.

الصُّمَّانُ: زەوی پتەوو بەردەڵان کەلەگەڵ لەب دا تێکەڵ بێ.

الصُّمَّانَةُ: بەمانا (الصُّمَّانُ)دێ.

صَمَى الصيدُ ونحوه صمياً وصَمَياناً: نێچیرەکە پێکراو لەبەردەستی نێچیرەوانەکەی دا گیانی لەدەست دا.

صَمَى الرجلُ: پیاوەکە بازی داو پەلەی کرد.

أصْمَى الصَّيدُ والرجلُ: بەمانا (صَمَى)دێ.

أصْمَى الصَّيْدُ: نێچیرەکەی پێکاو کەوتە ژێر دەستی ٥ لەحەدیس دا هاتووە: (كل ما أصْمَيْت ودع ما أنميت): گۆشتی ئەو نێچیرە بخۆ کەلەبەر دەستت دا گیان لەدەست دەدا ٥ ئەو نێچیرە مەخۆ برینداری دەکەی‌و دوور لەتۆ مندار دەبێتەوە.

أصمى الرَّمْيَةَ: باش نیشانەکەی پێکاو تیرەکەی تێ چەقاند.

الصِّناب: خۆراکێکە دەکرێتە پێخۆر لەخەردەل‌و مێوژ دروست دەکرێ.

الصِّنابِي: ئەوەی ڕەنگی لەنێوان سوورو زەرد دا بێ.

صَنبَرَتِ النَّخلةُ: نەمامی درەختی خورماکە لەسەر قەدی درەختە خورمایەکی تر روا بۆخۆی سەربەخۆ لەزەوی دا نەرِوا ٥ دەشگوترێ: (صَنبَرَ أسفل النخلة): لای خواروی قەدە دارخورماکە باریك بوو.

الصَّنبَرُ: باریكو تەنك لەهەرشتێك بێ ٥ (ك: صنابر).

الصُّنبُورُ: لقە دارخورمایەکە لەقەدی درەختە خورمایەکی تر سەرهەڵدەداو دەروێ، بەبێ ئەوەی خۆی بەنەمام لەزەوی بروێ ٥ هەروا ناوە بۆ بنکی دارخورمایەك لای خواروی قەدەکەی باریكو بنکی لقەکانی روتو بەری کەم بێ ٥ درەختە خورمای بەتەنیاو دوور لەدارخورمای تر ٥ بەلوعەی ئاو ٥ کونی بەلوعەی ناو.

الصِّنَّبْرُ: بای سارد کاتێ دونیا هەورو هەڵابێ ٥ دەگوترێ: (غداةٌ صِنَّبْرٌ وليلة صِنَّبْرَةٌ) ٥ (ك: صنابر).

صَنَابر الشتاء: کاتە زۆر ساردەکانی زستان.

الصَّنَوبَرُ: درەختی سنەوبەر، زۆر جۆری هەیە برێ لەجۆرەکانی بەرێکی بچوکی تام خۆشی هەیە.

صَنَجَ صَنْجاً وصنوجاً: سازی لێ دا، سازو سەمتوری لێ دا.

صَنَّجَ الناسَ: خەڵکەکەی بردەوە سەر بنەچەی خۆیان.

الصَّنْجُ: پلێتێکی بازنەییە لەمسو مەعدەنی تر بەیەك دەکێشرێنو دەنگیان لێ دێ بۆ شاییو سەماکردن بەکاردێن ٥ هەروا چەند پارچە صەفیحەیەکی زەردن بەقەراخی دەفەوە دا دەکوترێن یان لەپەنجەی راقیصەدا دەبن لەکاتی شاییو زەماوەند دا پێکیان دەکێشیو دەنگیان لێ دێ ٥ (ك: صِنَجٌ).

الصَّنَّاجُ: خاوەنی سەنج یان ئەوکەسەی یاری پێ دەکا.

الصَّنَّاجَةُ: بۆمانای زێدە رۆیی لەمادەی (الصَّنَّاج)دا دێ.

صنَّاجَة العرب: ناز ناوی شاعیر (أعشی قیس)٥ چونکە شیعرەکانی بۆ گۆرانی زۆر لەباربوون.

الصِّنْدِدُ: شەریفو ئازا.

الصِّنْديد من الناس: ئادەمیزادی ئازا ٥ دەشگوترێ: (برد صِنديد): سەرمای بەتەوژم ٥ (ريح صِنديد): بای بەهێز ٥ (يوم حامي الصناديد): رۆژی زۆر گەرم.

صناديد القدر: بەڵای رۆژگار.
الـصّندوق: سـندوق بـۆ تێداهـەلگرتنی کتێبو پۆشاكو شتی تر.
صـــندوق البريـــد: صـــندوقی پۆســـتە؛ صـندوقێکە لـەبرێ شـوێنی تایبـەت لەسەرشەقام دادەنـرێ بـۆ تێکردنـی نامەو شتـی وا رۆژانـە یـان هەفتانـە کارمەنـــدی پۆســـتە دەیانکاتـــەوەو نامـــەکان کۆدەکاتـــەوە بۆئـــەوەی بگەیەنرێنە شوێنی خۆیان.
صندوق التوفير: بەشێکە لەفەرمانگەی بەریـد موچـەخۆرو خـاوەن پـارەو پـول هەڵدەنێ بـۆ پەزمەنـدەکردنی ماڵو سامانو وەبەرهێنانی بۆ سودو قازانج.
صـندوق الطـرد: ئـەو تەنکییـە ئاوەیـە کەلەتـــەوالێت دا دادەمەزرێنـــدرێ بۆئـــەوەی کـــاتی پێویـــست بـــۆ پاکردنـــەوەی ســـیفۆنی ئاودەســـت بەکاربهێنرێت.
تَـــصَنْدَلَ الرجـــلُ: پیاوەکـــە بـــەبۆنی صـــەندەل خـــۆی بۆنخـــۆش کـــرد ٥ صەندەلی پۆشی.
الصّنادِلُ من الدّوَاب: ئاژەڵی سەرگەورە ٥ جەستە گەورەو تۆکمەو بەهێز.
الـصَّنْدَلُ: درەختـی صـەندەل، دارەکـەی بـۆنێکی خۆشـی لـێ دێ بۆنەکـەی بەدەست پێداهێنانو سوتاندن بڵاو دەبێتەوە ٥ دارەکەی چەند جۆرێکی هەیە (سورو سپیو زەرد) ٥ خوفێکە ژێرەکەی نەعلێکی پتەوەو بەتیلمـە چەرمی باریك لەقاچ شەتەك دەدرێ ٥ بەلەمێکـە ژێرەکـەی کەوانەییـە لەرووبارو شتی وادا بەکاردەهێنرێ.
الصَّندلاني: صەیدەلانی ٥ عەترفرۆشو ئەوانەی دەرمـانی پزیـشکی دروست دەکەن ٥ (ك: صنادلة).
الـــصُّنَّارَةُ: شیـــشە ئاســـنی باریـــكو سەرگۆچـانی لفکـەو گـۆرەوی پـێ دەچـندرێ ٥ ئاسـنێکی سەرگۆچـانی قولاپـــە پێیـــە پـــەتێك لەســـەرێکی دەخـــرێو هەڵدەدرێتـــە نـــاو ئـــاوەوە بۆماسـی گـرتن ٥ پێـشی دەگـوترێ: (الشّصُ).
صَنَعَ الشَيْءَ صُنعاً: شتەکەی دروست کرد.
صَنَعَ به صُنْعاً قبيحاً: خراپەی لەگەڵ کرد، ئازاری دا.
صَنَعَ له أو اليـه معروفـاً: بەخششی خۆی بەسەردا رشت.
صَنَعَ فَرَسَهُ: جوان ئەسپەکەی بۆ ڕام کـردو چاودێری بوو، دەگـوترێ: (صَنَعَهُ علی عینه): لەژێر چاودێری ئەودا ئەوشتەی هێنایـــە دی ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿وَلِتُصنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ بـۆ ئـەوە لـەژێر

چاودێری ئێمەدا پەروەردە ببێو پێ بگەی ٥ هەروا دەگوترێ: (صنعه بعين فلان): لەژێر چاودێری فلان دا ئەوشتەی هێنایە دی.

صَنِعَ صَنَعاً: لەدروستکردن دا دەست ڕەنگین بوو ٥ (فهو صَنِعٌ).

أصْنَعَ الأخْرَقُ: حوشترەکەی باش ڕام بوو.

أصْنَعَ الفرَسَ ونحوه: جوان ئەسپەکەی پەروەردە کردو ڕای هێنا بۆ سواریی.

صانَعَهُ: لەگەڵی دا هەڵی کرد، لەگەڵی گونجا.

صانَعَ عن الشَيْئ: لەشتەکەدا فێڵی لێ کرد.

صَنَّعَهُ: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (صَنَعَهُ)دێ.

صَنَّعَ الجارية: کیژەکەی باش پەروەردە کردو قەڵەوی کرد.

صَنَّعَ الأمَةَ: گەلەکەی کردە گەلێکی پیشەوەرو دەست ڕەنگین.

إصْطَنَعَ: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (صَنَعَ)دێ.

إصْطَنَعَ فلانٌ: فلانکەس خواردنی ئامادەکرد بۆخێر بەهاناوە چوونی ئاتاجان.

اِصْطَنَعَ عند فلان صَنيعَة: چاکەی لەگەڵ فلانکەس کرد.

إصْطَنَعَ فلاناً لنفسه: فلانکەسی بۆخۆی هەڵبژارد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾.

تَصَنَّعَ: لافی شتێکی لێ دا کەنەیبوو.

اِسْتَصْنَعَ فلاناً كذا: داوای لەفلان کرد ئەوشتەی بۆ دروست بکا.

التصنيع: پیشەسازی ڕەچاو کردن ٥ گۆڕینی گەل بۆ گەلێکی پیشەوەرو شت دروستکەر ٥ بڵاوکردنەوەی گیانی پیشەسازی لەناو گەل دا.

الصَّانِعُ: وەستاو دەست ڕەنگین ٥ پیشەوەر ٥ (ك: صُنّاع) ٥ دەگوترێ: (امرأة صانعة اليدين): ئافرەتێکە دەست ڕەنگینو کاراماو کەیبانوو.

الصِّناعة: پیشەسازی ٥ هەرکارو کردەوەیەك ئادەمیزاد بیکاو تێیدا دەست ڕەنگین بێ.

الصَّناعية: دەگوترێ: (قوم صناعية): نەتەوەیەکن باش دەزانن ماڵو سامان بخەنە گەڕ.

الصِّناعي: کەسێك بەخوێندنو فێربوون فێری پیشەسازیی ببێ ٥ هەروا ناوە بۆ شتێك خۆڕسكو سروشتی نەبێ دروست کرابێ ٥ وەکوو دەڵێ: (حرير صناعي) ٥ هەروا بەچاوگی صەناعیش

دەگـوترێ وەکـوو (الخـصوصية، الفروسـية والطفولية) ٥ (الـصخريّة الخَشَبية القابليّة المسؤلية الحريّة).

**الـصُّنعُ**: کردەوەی ئادەمیزاد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَهُـمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُـمْ يُحْسِنُونَ صُـنْعًا﴾ ٥ دروسـتکراو ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ تاوەو ئامێری گۆشت برژاندن ٥ شیشی گۆشت برژانـدن ٥ تـەنکیو عـەمباراو کـەنـاوی بـارانی تێـدا پەزمەنـدە بکـرێو کـاتی پێویست لێی بەکاربێ ٥ (ك: أصناع وصنوع) ٥ دەشگوترێ: (رجـل صِنع اليدين): پیاوی دەست ڕەنگین ٥ یان دەگـوترێ: (الـصَّناعُ اليـدين) ٥ (ك: أصْناع).

**الـصَّنَعُ**: زمانڕەوانو پاراو، دەگـوترێ: (لسان صَنَعٌ ورجـل صنع اللـسان): قسەرەوانو کاراما ٥ (صَنَعَ اليـدين): دەسـت ڕەنگـینو شـارەزا لەپیـشەوەریی دا ٥ (ك: أصـناع وصُنُع).

**الـصِّنْعَةُ**: کـردەوەی پیـشەساز، دەروسـتکراوو بەرهـەمی پیشەساز ٥ پیـشەی پیـشەوەر ٥ لـەزاراوەی فەلـسەفەدا ڕێبـازی ڕێـكو پێـكو تایبەتی بۆ ئەنجامدانی کاری دەستی یان زیهنی.

**الصَّنيعُ**: کردارو بەرهەم ٥ (ك: صنائع).

**المُـصَانَعَةُ**: بـەرتیل ٥ شـتێك بۆیـەکێك ئـەنجام بـدەی بۆئـەوەی ئـەویش شتێکت بۆ بکا.

**المَصْنَعُ**: کارگە ٥ شوێنی دروست کـردنو بەرهەمهێنانی شتو مـەك ٥ عـەمباراو کـەنـاوی بـارانو شـتی وای تێـدا کۆدەکرێتـەوە بۆئـەوەی لـەکاتی پێویست بەکاری بێنی ٥ (ك: مصانع).

**المَصَانِعُ**: باڵەخانـە بـۆ نیـشتەجێبوونو قـەڵاو ئـەو جـۆرە شـتانە ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾.

**المَـصْنَعة**: کارگـە ٥ ئـان دروسـتکردنو زیبافـەت کـە دۆسـتو ئاسـیاوی بـۆ بـانگ بکـرێن ٥ هەنگـەڵان (شـوێنی هەنگ بەخێو کردن لەدووری گوندو شـوێنی نیـشتەجێ بـوون) ٥ (ك: مَصانِع).

**المـصنوع**: پێـچەوانەی شـتی خۆرسك ٥ بەدی هێنراو بەدەسـتی ئادەمیزاد ٥ هـەروا ئـاوە بـۆ شـیعرێك عاتیفـەو خـەیاڵ ڕۆڵـی نـەبووبێ لـە لەدایکبوونی دا.

**صَـنَّفَ الـشَّجَرُ**: درەختەکـە چـەند

جۆرێـك بـوو ٥ يـان گـەڵای كـردو گـەڵاكانی جـۆر جـۆر بـوون ٥ يـان گەڵای دەركرد.

صَـنَّفَ الثمــرُ: ميوەكــە هەنــدێكی پێگەيیو هەندێكی نا.

صَـــنَّفَ الأشـــياءَ: كاڵاكـــانی لێــك هــەڵاواردنو هــەرجۆرەی بــەجيا ريزكردن.

صَنَّفَ الكتابَ: كتێبەكەی تەئليف كرد (دای نا).

تَصَنَّفَ الشَّجَرُ: درەختەكە گەڵای كـردو گەڵاكانی جۆراو جۆر بوون.

تَصَنَّفَ الأشياءُ: شتەكانی لێك بونـەوە هــەرجۆرەی بــەجيا ريــز بەنــدو كۆبەند بوون.

تَصَنَّفَت شَفَتُهُ: لێوی قەڵشی، باری گرت، قەتماغە لەسەری دروست بوو.

الـصِّنْفُ مـن الـشَّيْءِ: جـۆری شـت كـە بەڕواڵەت لەشتی تـر جيابـێ ٥ (ك: أصناف وصنوف).

الـصُّنْفَرَةُ: جـۆرە وەرەقێكـی زبـرە داری پێ سفت دەكرێ.

أَصْنَقَ: لەبەر خەفەتو تـوڕەيی هيـچی نەخواردو نەخواردەوە.

صَنِمت الرائحةُ صَنماً: بۆنەكە نـاخۆش بــوو، دەگــوترێ: (صَـــنَمَ الجـــسم): بۆگەنی جەستە.

صَنَّمَ فـلان: فلانكـەس بتێكی دروست كرد.

صَـنَّمَ الـشَّيْءَ: شـتەكەی هێنايـە سـەر شێوەی بت.

الـصَّنَمُ: پەيكەرێكـە لەبـەرد يـان لـەدار يان لەكانزای تر پەرستـشی بۆكراوە لای عەرەب بـاو بـووە پێيـان وابـووە پەرســـتنيان لـــەخوادايان نزيـــك دەكاتــەوە ٥ (ك: أصــنام) ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿فَأَتَوْاْ عَلَى قَوْمٍ يَعْكُفُـونَ عَلَى أَصْنَامٍ لَّهُمْ﴾.

الصَّنَمَةُ: بەمانا (الصَّنَم)دێ.

صَـنَّ صَـنّاً وصُنوناً: بۆگـەنی كـرد، بۆنی ناخۆشـی لـێ پەيـدا بـوو، دەگـوترێ: (صَنَّ اللحمُ وصَنَّ الماءُ).

أَصَنَّ: بەمانا (صَنَّ)دێ.

أَصَنَّ فلان: فلانكـەس بـێ دەنـگ بـوو ٥ لوتبـەرزيی نوانـدو تـڕو فيـزی كـرد جـا يـان لەبــەر رقو تــوڕەيی يــان بەهۆی تەكەببورو خۆ بەزلزانی.

الصُّنَانُ: بۆگەن، بۆنی ناخۆش.

أَصْنَى فلانٌ: فلانكەس خۆڵەكەوە پيسی كرد.

أَصْنَتِ الشَّجَرَةُ: درەختەكە پەلێكی لـێ جيـا بـۆوە، درەختەكـە بـەدوو پـەل يان زياتر ڕوا.

تَــصَنَّى فــلانٌ: بــەمانا (أَصْـــنَى)دێ.

**الصِّنَاءُ**: خۆڵەکەوە ٥ ئەوەی دەکەوێتە سەرجەستە لە خۆڵەمێش‌و دوکەڵ.

**الصِّنْوُ**: هاوشان‌و بەرامبەر ٥ ئەمام‌و شلکە دار کەلەسەربنکی درەختێکی تر دەڕوێ ٥ برای باوك‌و دایکی ٥ دەگوترێ: (هو صنو أخيه وهما صنوان) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ﴾.

**الصِّنْوَةُ**: مێینەی (الصِّنْو).

**الصَّنَوْبَرُ**: سنەوبەر؛ درەختێکە دەروێندرێ یان بۆ جوانی‌و رازاندنەوەی شوێن یان بۆ سود وەرگرتن لەدارەکەی هەندێ جۆری هەیە بەردەگرێ تامێکی خۆشی هەیە.

**صَهِبَ اللون صَهَباً وصُهْبَةً**: ڕەنگی زەردی سورباوی سپی واشە.

**صَهُبَ صُهُوبَةً وَصَهَباً**: بەمانا (صَهِبَ)دێ.

**صَهَّبَهُ**: وای لێ کرد ڕەنگێکی زەردی سورباوی سپی واشەی هەبێ.

**إصْهَبَّ الشَّعْرُ**: قژی زەردی سورباوی سپی واشە بوو.

**الأَصْهَبُ**: ڕەنگی زەردی سورباوی سپی واشە ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (الصَّهْبَاءُ) ٥ (ك: صُهْبٌ).

**الصَّهْبَاءُ**: شەراب.

**الصُّهْبَةُ**: زەردییەکی سورباوی مەیلەو سپی.

**صَهَدَهُ الحَرُّ صَهْدَةً وَصَهَدَاناً**: گەرماکە بەهێز بوو.

**الصَّيْهَدُ**: گەرمای بەهێزو تەوژم.

**صَهَرَ الشَّيْئَ بالنار ونحوها صَهْراً**: شتەکەی تواندەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ﴾.

**صَهَرَهُ الحَرُّ**: گەرمی تینی بۆهێناو تەنگی پێ هەڵچنی.

**صَهَرَهُ الخبز ونحوه**: پیوی تواوە یان مۆخی کردە پێخۆر.

**صَهَرَ شَعْرَهُ**: قژی خۆی بەپیو چەور کرد.

**صَهَرَ جِسْمَهُ**: جەستەی خۆی هەنو، چەوری کرد.

**صَهَرَ الشَّيْئَ اليه**: شتەکەی لەخۆی نزیك کردەوە.

**أَصْهَرَ اليه**: لێی نزیك بۆوە.

**أَصْهَرَ الى القوم وبهم**: بوو بەزاوای قەومەکە، ئافرەتی لێ خواستن.

**صَاهَرَ القومَ وفيهم واليهم**: بەمانا (أصْهَرَ)دێ.

**إصْطَهَرَ الشَّحْمَ**: پیوەکەی تواندەوەو خواردی.

**إنْصَهَرَ**: توایەوە.

**تصاهَرَا**: ئەو بنەماڵە ژن‌و ژنخوازییان

بەیەکەوە کرد ٥ بوون بەزاواو خەزوری یەکتریی.
**الإنصِهَارُ:** گۆڕانی مادەی ڕەقو پتەو بۆ حاڵەتی شلەمەنی.
**الصُّهَارَةُ:** تواوە ٥ پیوو بەز ٥ مۆخ.
**الصَّهْرُ:** گۆڕاندنی مادە لەحاڵەتی ڕەقی پتەوییەوە بۆ حاڵەتی شلەمەنی.
**الصِّهْرُ:** خەزور، خزمایەتی بەهۆی ژن خواستنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاء بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا﴾.
**الصُّهُورُ:** گۆشت برژێن ٥ بەزو پیو توێنەرەوە ٥ (ك: صُهُرٌ).
**الصُّهَيْرُ:** تواوە ٥ هەرشتێك لەحاڵەتی ڕەقییەوە گۆڕابێ بۆ شلەمەنی.
**المَصْهَرُ:** شوێنی توانەوە ٥ (ك: مصاهر).
**صَهْرَجَ صِهرِجاً:** حەوزی ئاوی دروست کرد ٥ عەمباراوی بنیات نا.
**صَهْرَجَ الحَوْضَ:** حەوزەکەی بەقیرو زفت کونبڕ کرد، قیرو زفتی لەحەوزەکە هەڵسو.
**الصِّهْرِيجُ:** حەوزێکی گەورەی ئاوە، عەمباراو، تەنکی ئاو.
**صَهْ:** بێ دەنگ بە، قسە مەکە.
**صَهْصَهَ بالقوم:** لەخەڵکەکە تووڕەبوو بۆئەوەی بێدەنگیان بکا ٥ بێدەنگ بن.
**صَهَلَ الفَرَسُ صَهِيلاً وصُهالاً:** ئەسپەکە حیلاندی.
**تصاهلت الخَيلُ:** ئەسپەکان بۆیەکتریان حیلکاند.
**الصَّاهِلُ:** ئەسپ ٥ (ك: صواهل).
**صَهِيَ صهاً:** برینداربوو، دوایی برینەکەی تەڕ بوو (ئاوی کرد) ٥ دەشگوترێ: (صَهِيَ الجرحُ وصَهِيت يده).
**أصْهى الفَرَسُ ونحوه:** ئەسپەکە جەدەوی یان ناوقەدی موراغەی پشتی ئازاری بوو.
**أصْهى المريضَ:** نەخۆشەکەی بەڕۆن هەنوو خستییە بەرخۆر.
**صاهَى الفَرَسَ:** چووە سەر قەپوچکی زین سواری پشتی ئەسپەکە بوو.
**الصَّهْوَةُ:** شوێنی زین لەسەر پشتی ئەسپ ٥ هەروا ناوە بۆ تۆپەڵاکو لای ژورووی هەموو شتێك ٥ بورجو باڵەخانە کە لەسەر تەپوڵکە دروست بکرێن ٥ شوێنی پەناو پاسار کە حوشتری تەڕبوو تێیدا دەحەوێنەوە ٥ سەرچاوەی ئاو لەکێودا ٥ (ك: صِهاء وصُهاً).
**الصِّهيونية:** جمو جوڵو تێکۆشانێکە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگاو قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ بۆ

نەتەوەی جولەکە لەفەلەستین دا ٥ ئەم ناوە لەوەوە دانراوە کەلەنزیك شاری ئورشەلیم کێوێك هەیە پێی دەگوترێ: (صِهیون)و پاڵ ئەو دراوە.

**صابَ المَطَرُ صَوْباً وصَیْبُوبةً:** بارانەکە هەڵڕژا.

**صابَ السَّحابُ بالمطر:** هەورەکە لەکاتی پێویست دا بارانی پێویستی باراند.

**صَابَ المَطَرُ الأرضَ:** بارانەکە زەوییەکەی ئاوداو تێراوی کرد ٥ لەکاتی پێویست دا بارانەکە باری.

**صابَ السَّهمُ:** تیرەکە نیشانەکەی پێکاو هەنگاوتی.

**صابَ بە:** کەوتە شوێنی خۆی، شوێنی خۆی گرت.

**أصَابَ الشَيْئَ:** گەیشتە شتەکە.

**أصابَ الخَطْبُ فلاناً:** بەڵاکە سواری شانی فلان بوو.

**أصابَ بعینه:** حەسوودی پێ برد، چاوی حەسودی برپە ماڵو سامانیو بەخیلی پێ برد.

**أصابَ السَّهْمُ الرَّمِیَّة:** تیرەکە لەنیشانەکەی دا، نیشانەکەی پێکا ٥ دەشگوترێ: (أصاب الرامي): تیرهاوێژەکە تفەنگچیەکە نیشانەکەی هەنگاوت.

**أصاب من المال:** لەماڵو سامانەکەی برد.

**صَوَّبَ السَّهمَ:** تیرەکەی ئاراستەکردو لێی دا، هەنگاوتی.

**صَوَّبَ الفَرَسَ:** ئەسپەکەی هەلینگ دا بەرەو ئامانجی تایبەتی لەپێشبرکێکەدا.

**صَوَّبَ فعلە أو قولَە:** کردارەکەی یان گوفتارەکەی بەڕاست دانا و پەسەندی کرد.

**صَوَّبَ الخطأ:** هەڵەکەی راست کردەوە.

**صَوَّبَ فلاناً:** بەفلانکەسی گوت باشت کرد، دەست خۆش.

**صَوَّبَ الشَيْئَ:** شتەکەی شۆڕکردەوە، خواری کردەوە.

**صَوَّبَ الطعامَ أو الحب:** خۆراکە یان دانەوێڵەکەی کردە کۆمەڵ.

**إنصاب الماءُ:** ئاوەکە هەڵڕژا.

**تَصَوَّبَ:** بۆ موطاوەعەی (صَوَّبَ) هاتووە ٥ هەروا بەمانا سەرەو ژێر بوونەوەیە.

**استصابَ رأیە او قولە أو فعلە:** راوو بۆچوونەکەی بەڕاست دانا پەسەندی کرد پشتگیری قسەو کردەوەکەی کرد.

**إسْتَصْوَبَهُ:** بەمانا (استصاب)دێ.

**الصَّابُ:** درەختێکە تاڵ، گوشراوێکی

سپی هەیە وەکوو شیر وایە زۆر تاڵە، بەرچاو بکەوێ یەکسەر لەناوی دەبا.

**الصَّوابُ:** بەربەست ٥ حەق‌و ڕاستی.

**الصَّوْبُ:** لای شت ٥ دەگوترێ: (إتّجهَ صَوْبَهُ) روی کردە لای ئەو ٥ مەبەست‌و ئامانج ٥ دەگوترێ: (فلان مستقیم الصَّوْب): فلانکەس لەمەبەست‌و ئامانجی خۆی لانەداو بەرەو هەدەف هەنگاو دەنێ ٥ هەروا نا بۆ بارانێك کەبەئەندازەی پێویست بباری‌و زیان نەگەیەنێ.

**الصَّوبَةُ:** خواردەمەنی کۆبوەوە یان دانەوێڵەی خڕکراوە ٥ هەروا ناوە بۆ ژورێکی لەشوشە دروستکراوو پلەی گەرمی تێدا ڕەچاوبکرێ‌و بڕێ جۆری روەکی تێدا پەروەردە دەکرێ.

**الصُّوابَة (صُوَابَة القوم):** هەڵبژاردەی گەل‌و هۆز.

**الصَّوِیبُ:** هەنگێو، ئامانج پێك، را دروست.

**الصَّیِّبُ:** هەوری بارانـاوی کە بەئەندازەی پێویست باران ببارێنێ ٥ خودی باران.

**الصَّیُّوبُ:** بەمانا (الصَّیب)دێ.

**المُصَابُ:** هەنگاوتن‌و پێکان ٥ بەلای گەورەو سامناك ٥ هەنگێوراو؛ کەسێك زیانێکی پێ بکەوێ.

**المُصِیبَةُ:** بەلاو کارەسات، کەتوشی ئادەمیزاد دەبێ.

**الصَّوْبَجُ:** تیرۆك ٥ ئەوشتەی هەویری پێ یان پان دەکرێتەوە ٥ (ك: صَوابِجَ).

**الصُّوبَجُ:** بەمانا (الصَّوْبَجُ)دێ.

**صَاتَ صَوْتاً وصُواتاً:** دەنگی لێ هات، قیڕاندی، قیژاندی.

**أصَاتَ:** بەمانا (صَات)دێ.

**أصاتَ بفلان:** ناوی فلانکەسی زڕاند.

**أصات فلاناً:** وای لەفلانکەس کرد هاوار بکا دەنگی لێ بێ.

**صَوَّتَ:** بۆ زێدە رۆیی لەمانای (صات) دا دێ.

**صَوَّتَ به:** بانگی کرد.

**صَوَّتَ له:** لەهەڵبژاردن دا دەنگی بۆدا.

**صَوَّت الطَّسْتَ:** وای لەتەشتەکە کرد دەنگی لێ بێ.

**إنْصَاتَ:** وەڵامی دایەوە ٥ دەگوترێ: (إنصات فلان للأمر): فلانکەس گوێ ڕادیری فەرمانەکە بوو ٥ دوای خوارو خێچی راست بۆوە ٥ دەگوترێ: (إنصات المعوج).

**إنصات بـه الزمـان:** رۆژگار ناوبانگی دایە.

**الصَّاتُ**: ناوبانگی باش کە بەناو خەڵك دا بڵاو بێتەوە ◦ دەنگ تیژو گەورە دەنگ زڕ.

**الـصَّوْت**: دەنـگ ◦ دەنگـدان بەنووسین یـان بـەئاماژەو دەسـت هـەڵبڕین یـان بەقسە بۆ پەسەند کردنی شتێك.

**الـصِّيْتُ**: ناوبـانگی بـاش ◦ دەگـوترێ: (ذهب صـيته بـين النـاس): ناوبـانگی باشی بەناو خەڵك دا بڵاو بۆوە.

**الصِّيْتَةُ**: بەمانا (الصِّيْتُ)دێ.

**الصَّيِّتُ**: دەنگ گڕو دەنگ تیژ ◦ دەنگی گەورە.

**صاحَهُ صَوْحاً**: قەڵاشتی.

**صَـوَّحَ النَّبْـتُ ونحوه**: روەکـە وشـك بـوو شەقار شەقار بوو.

**صَوَّح النخـلُ**: خورماکـە بـاش‌و خراپـی لێك جیابوونەوە.

**صَـوَّحَ الـريحُ الـشَيْئَ**: رەشـەبایەکە شتەکەی وشك کـردەوە هـەتا شـەقار شـەقار بـوو وردو هـاڕبوو ◦ هـەروا دەگوترێ: (صَوَّحَ الحَرُّ الشَيْئَ).

**إنْصَاحَ**: شـەق بـوو ◦ قەڵشا ◦ دوو لـەت بوو.

**إنْصَاحَ النَّبْتُ ونحوه**: بەمانا (صَوَّح)دێ ◦ هـەروا بـەمانا ئـەوە دێ گوڵەکـەی دەرکەوت.

**إنْصاحَ الفَجْرُ أو البرقُ أو القمـرُ**: بـەیانی یان بروسکە یان مانگ روناکی دا.

**تَـصَوَّحَ النبـت**: بـەمانا (صَـوَّحَ)دێ ◦ دەگـوترێ: (تـصوحت الأرضُ): زەوییەکە وشك بۆوەو شەقار شەقار بوو.

**تَصَوَّحَ الشَّعْرُ**: قژی پرژو بڵاو بوو.

**الـصَّاحَةُ**: زەوی سـوتەمەڕۆو هـیچ لـێ نەڕواو ◦ (ك: صاح وصوح).

**الصَّوَاحُ**: سەرە تەرزی دارخورماو پرژو پاڵی کە وشك دەبێ‌و بڵاو دەبێتـەوە ◦ کەچ.

**الصُّوحَانُ**: وشك‌و برینگ.

**الصُّوحَةُ**: ئـەو تیسکە خوریيانـەی بەر دەبنەوەو بڵاو دەبنەوە.

**أصاخ له واليه**: گوێی بۆگرت.

**أصاخ عن الأمر**: لەکارەکە ژێوان بـۆوە، گەڕایەوە.

**أصَـاخَ علـى حـق فـلان**: لـەمافی فـڵان بێدەنگ بوو ◦ چاوی لـێ پۆشی.

**الـصَّاخَةُ**: بـەڵاو کارەسـات ◦ لـەبواری پزیـــــشکی دا هـــــــەوکردن‌و ئەسـتوربوونی ئێـسقانە بـەهۆی لێکدان‌و ئازار پێگەیشتنەوە.

**الصوديوم**: کانزایەکی فلزی ورشە داری سپی زیوییە، زۆر بـەپێزو چاپوکەو زوو لەهەوادا بڵاو دەبێتەوە.

**صَارَ صَوْراً**: دەنگی هات.

**صار الشَيْءَ اليه:** شتەکەی بۆلای خۆی کێش کردو نزیکی کردەوە ◊ زوربەی راڤەکەرانی قورئان وشەی (صار)ی ناو ئایەتی ﴿فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ یان بەم مانایە تەفسیر کردووە.

**صَوِرَ صَوَراً:** خوار بۆوە، مەیلی ئەوی کرد ◊ (فهو أصور وهي صَوْرَاءُ) ◊ (ك: صُوَر).

**أصَارَه اليه:** مەیلی پێ کرد، بۆلای ئەوی خوار کردەوە.

**صَوَّرَهُ:** وێنەی کێشا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾.

**صَوَّرَ الشَيْءَ أو الشَّخْصَ:** بەقەڵەم وێنەی شتەکەی یان فلانکەسی لەسەر کاغەز یان لەسەر شتی تر کێشا یان بەئامێری وێنەگرتن وێنەی گرتووە.

**صَوَّرَ الأَمْرَ:** وەصفێکی کرد، کە هەموو پێکهاتەکانی رون بکاتەوە.

**تَصَوَّرَ:** وێنەو شکڵی بۆ پەیدا بوو.

**تَصَوَّرَ:** لەزانستی دەرونزانی دا ئامادەکردنی وێنەی شتێکی هەست پێکراوە لەعەقڵ دا بەبێ ئەوەی کاریگەری تێدا بکا ◊ لەلای زانایانی مەنتیق ئامادەکردنی تاکە یان ماهییەتی شتە لەزەین دا بەبێ ئەوەی حوکمی نەبوون یان بوونی بەسەر دا بدرێ.

**التَّصَوُّرِيَّة:** لەفەلسەفەدا بریتییە لەو رێبازو بیرو بۆچوونەی کەدەڵێ: کوللیات هەر لەزەین دا هەیەو لەدەرەوەی زەین دا وجودیان نییە.

**التَّصْوِير:** وێنەگرتن، وێنە کێشان ◊ وێنەکێشانی شت یان شەخص لەسەر دیوار یان لەسەر شتی تر بەقەڵەم یان بەشتی تر.

**التَّصْوِيرُ الشمسي:** وێنەگرتنی شت بەکامێرای شەمسی.

**الصَّارَةُ من الجبل ونحوه:** تۆقەسەرو تۆپەڵاك.

**الصُّوارُ:** جەڵەبە رەشە وڵاخ (گاگەل) ◊ (ك: أصورة وصيران).

**الصَّوْرَ:** لامل ◊ لێواری روبار ◊ (ك: صيران).

**الصُّورُ:** کەرەنا ◊ شتێکە وەکوو شاخەگا وایە فوی پێدا دەکرێو دەنگی لێ دێ.

**الصُّورَةُ:** وێنە، سەرو شکڵو روخسار ◊ جۆری شت ◊ دەگوترێ: (هذا الأمر على ثلاث صور): ئەو شتە سێ جۆری هەیە ◊ ماهییەتو وێنەی شت لەزەین دا ◊ سێبەری شت لە زەین دا یان لەعەقڵ دا.

**صورة الحكم التنفيذية:** وێنەی فەرمی بڕیار کەبەپێی ئەو نوسخە بڕیارەکە جێبەجێ دەکرێ، کەبەمۆری دادگا مۆرکرابێو واژۆ کرابێو شێوازی جێ بەجێکردنی تێدا رون کرابێتەوە.

**الصَّیِّرُ:** جوان روخسار.

**الْمُصَوِّرُ:** وێنەگر؛ کەسێك پیشەی وێنەگرتن بێ.

**الْمُصَوِّرَةُ:** مێینەی (الْمُصَوِّر) کامێرای وێنە گرتن.

**صَاعَت النَّخْلُ صَوْعاً:** هەنگەکان هەلاَیزانو پەرتو بلاو بوونەوە هەندێکیان شوێن هەندێکیان کەوتن.

**صَوَّعَ الأشياءَ:** بەمانا (صَاعَهَا)دێ.

**صَوَّعَ الموضِعَ:** شوێنەکەی تەخت کردو ئامادەی کرد بۆ پێدا رۆیشتن.

**إنْصَاعَ:** بۆ موطاوەعەی (صاعَه)دێ ٥ گەڕایەوە، یان بەخێرایی رۆیشت.

**تَصَوَّعَ القومُ:** خەلکەکە بلاوەیان لێ کردو پەرتەوازە بوون.

**الصَّاعُ:** ربەو قسناغی دانەوێلە پێوان ٥ دانیشتوانی حیجاز ئامێری (صاع)یان بەچوار مود مەزندە کردوە ٥ دانیشتوانی عێراق بەهەشت (ربطل) مەزندەیان کردوە ٥ هەروا ناوە بۆ جامیلکەی ئاوخواردنەوە ٥ گۆچانو عەصا ٥ عەصای پاشا ٥ (ك: أصوع وصوعان وصيعان).

**الصَّاعة:** زەوی تەخت کراو، ئامادەکراو بۆ پێداڕۆیشتن ٥ شوێنێك ئامادەبکرێ بۆشیکردنەوەی لۆکە تێیدا.

**الصُّواعُ:** بەمانا (الصّاعُ) دێ واتە: ربە قسناغی دانەوێلە پێوان ٥ یان جامیلکەی ئاو تێدا خواردنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ﴾ ٥ (ك: صيعان).

**صَاغَهُ صَوْغاً وصِياغةً:** بەشێوەیەکی جوانو رێكو پێك دروستی کرد.

**صَاغَ المعدَنَ:** کانزایەکی کردە قالبو شتی وا.

**صاغَ الكلمةَ:** وشەکەی لەسەر شێوەی قیاسو یاسا دروست کرد.

**صَاغَ الكلامُ:** رستەکەی ئامادەکردو رێکی خست.

**إنصاغَ الشَيْئُ:** بۆ موطاوەعەی (صَاغَهُ)دێ.

**الصَّائغ:** ئالتونچی؛ کەسێك پیشەی ئەوە بێ ئالتونو زیوو شتی وا بکاتە خشڵ ٥ (ك: صاغةٌ وصواغ وصُيّاغ) ٥ دەگوترێ: (فلان من صاغة الكلام)

فلآنكەس قسەزانو دارێژەری ڕستەیە ٥ لەوكەسانەیە باش قسەكەرێك دەخەن ٥ بۆ كۆێ مێینە دەگوترێ (صَوائغ).

**الصَّوّاغ**: بۆ زێدەرەوی لەماناى (الصائغ)دێ ٥ بەزۆری بۆ ئەوكەسە بەكاردێ كە قسەكانی برازێنێتەوەو رێكیان بخاو هەڵیان بەستێ ٥ دەگوترێ: (هذه كلمة صاغها صَوّاغ).

**الصِّیاغَةُ**: ئاڵتونچیەتی ٥ پیشەی بەخشڵ كردنی زێڕو زیو ٥ دەشگوترێ: (كلام حسن الصِّیاغة): ڕستەو وتارێكە زۆر بەپێزەو جوان دارێژراوە.

**الصِّیغَة**: خشڵ ٥ كانزای دارێژراوو بەخشڵ كراو ٥ ئەصڵو بنەما ٥ دەگوترێ: (هو من صیغة كریمة): ئەو وەجاخزادەیەو لەئەصڵو بنەمایەكی ڕەسەنە.

**صیغة الامر**: ئەو شێوەیەی وشەكەی لەسەر بنیات نراوە.

**صیغة الكلمة**: شێوەی وشەكەو ڕیزكردنی پیتەكانیو بزوێنەكانی ٥ (ك: صِیَغ) ٥ گوتراوە (اختلفت صِیَغ الكلام): واتە لێكدانو شێوازی ڕستەكان جوداوازییان هەیە.

**الصِّیغة التنفیذیة**: ڕستەیەكی تایبەتیە كارمەندی تایبەتی لەسەر ڕوپەڕی بڕیارەكە دەینوسێ بۆئەوەی بەزۆرە ملێ بڕیارەكە جێبەجێ بكرێ.

**الصُّیَّاغ**: بەمانا (الصَّوّاغ)دێ.

**الصَّیِّغ**: قسە ڕازێنەرەوە ٥ قسە زان ٥ (صیفەتی موشەبەهە) ٥ یان بەمانا قسە هەڵبەستو درۆزن دێ.

**الصَّیِّغَةُ**: مێینەی (الصَّیِّغ) ٥ بەهێزو توانا.

**المَصاغُ**: دارشتن ٥ خشڵی دارێژراو لەزێڕو زیو یان لەشتی تر.

**المَصُوغ**: خشڵی دروستكراو.

**صاف الكبشُ صَوْفاً**: خوری لەسەر پشتی مەڕو بەرانەكە دەركەوتەوە، توكیان هاتەوە ٥ یان خوری سەر پشتیان زۆر بوو، (فهو أصوف وهي صَوْفاء).

**صَوَّفَ النباتُ**: لەسەر ڕوەكەكە شتێك پەیدا بوو وەكوو گەنمەموو وابوو، وەكوو خوری دەچوو.

**صَوَّفَ فلاناً**: فلآنكەس بوو بەصوّفی.

**تَصَوَّفَ فلان**: فلآنكەس بوو بەصوّفی.

**التَّصَوُّفُ**: ڕێبازێكی ئەخلاقییە بنەماكەی دونیانەویستیو خۆ ئارایشت دانە بەرەو شتی بەرز بۆ پاككردنەوەی دەروونو بەرز كردنەوەی گیان.

**علم التصوّف**: کۆمەڵێك یاساو ڕێسان کە صۆفییەکان پابەندی دەبن‌و جێ بەجێیان دەکەن لەناو کۆڕو کۆبونەوەو گۆشەگیرییەکانیان دا.

**الصُّوفُ**: خوری کەپێستی مەڕو بەران دادەپۆشێ.

**صوف البحر**: شتێکە لەسەر شێوەی خوری مەڕ، سەرئاو دەکەوێ ٥ (ك: أصواف).

**الصُّوفان**: ڕوەکێکە پرژو پاڵێك دەردەدا دەشوبهێتە خوری.

**الصُّوفاني**: شتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (صوف - خوری) بەشێوەی ناقیاس‌و قاعیدە.

**الصُّوفَةُ**: پارچە خوری، تیسکە خوری.

**الصُّوفيُّ**: کەسێك صۆفی بێو پابەندی ڕێبازی صوفینزمی بێ ٥ شارەزا لەزانیاری صوفیەتی دا ٥ ناوەکەش لەوەوە هاتووە گوایە بەهۆی دونیا نەویستیانەوە پۆشاکی خوری دەپۆشن.

**الصُّفية**: بەمانا (التّصوّف)دێ.

**الصَّوّاف**: خوری فرۆش.

**الصَّيِّفُ**: هەر قوماشێك زۆری پێکهاتەکەی خوری بێ.

**صَاكَ به المِسْكُ**: میسکەکەی پێوە نوسا.

**صاكَ الطيبُ**: بۆ نەخۆشەکە بلاّو بۆوە.

**تَصَوَّكَ المسك ونحوه**: خۆی بەمیسك بۆنخۆش کرد.

**صالَ عليه صَوْلاً وصَوَلاناً**: هەڵمەتی بۆبرد ٥ پەلاماری دا بۆئەوەی تێکی بشکێنێ.

**صَالَ الجملُ**: حوشترەکە گەستی.

**صَاوَلَهُ مُصاولةً وصِيالاً**: بەسەری دا زاڵ بوو، بەرانبەری کرد لەهەڵمەت بردن دا.

**صَوَّلَ البيدر ونحوه**: دەوروپشتی خەرمانەکەی ماڵی.

**صَوَّلَ الحِنطة ونحوها**: گەنمەکەی بەئاو پاك کردەوە هیچی پێوە نەهێشت.

**تَصَاوَلا**: کێ برکێیان کرد لەهەڵمەت بردن دا.

**الصَّوّولُ**: هەڵمەت بەری بەزەبرو زەنگ ٥ جەربەزە لەهەڵمەت بردن دا.

**الصَّوْلَة**: پەلاماردان، پرکێش کردن.

**الصُّولَةُ**: ئەو گەنمەی پاك کرابێ‌و شۆرابێتەوە بەئاو.

**المِصْوَلُ**: شەنەی خەرمان سورکردن ٥ خەرمان دوای گێرەکردنی بەشەنە بەهۆی بای شەماڵەوە گەنم‌و کاکەی لێك جیادەکرێتەوە ٥ مەولەوی دەڵێ:

**خەرمانی خەمان ها وەبەر باوە**
**شەنکەر یەکێکەو دووشەن وەلاوە**

ئەو بێژینگ‌و ئامێرەی مرۆرو زیزانەی پێ لەگەنمەکە جیادەکرێتەوە ٥ (ك: مَصَاوِل).

**المِصْوَلَةُ**: گەسك كەدەورو بەری خەرمانی پێ دەماڵدرێ ◊ (ك: مَصاوِلَ).

**الصَّوْلَجُ والصَّوْلَجَةُ، الصولجان والصولجانة**: بڕوانە مادەی (صَلَجَ).

**صَامَ صَوْماً وصياماً**: بەڕۆژو بوو، نیەتی هێناو خۆی لەخواردنو خواردنەوە گرتەوە لەسەرەتای ڕۆژەوە تا خۆرئاوا بوون.

**صَامَ الفرسُ**: ئەسپەکە ڕاست بۆوەو ئالیکی نەخوارد.

**صَامَ الماءُ والريحُ**: ئاوەکە یان بایەکە بۆگەن بوو.

**صامَتْ الشمسُ**: خۆر گەیشتە ناو قەدی ئاسمان.

**صَامَ النُعامُ**: نوعامەکە چیقنەی خۆی فڕێ دا.

**صَوَّمَهُ**: وای لێ کرد بەڕۆژو بێ.

**إصْطامَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (صام)دێ.

**الصَّائِمُ**: ڕۆژووەوان ◊ کەسێك بەڕۆژوو بێ ◊ (ك: صُوَّم وصُيَّم وصُوَّام وصُيَّام).

**الصَّوَّامُ من الأرض**: زەوی بیرونو بێ ئاو.

**الصَّوْمُ**: خۆگرتنەوە لەکردارو گوفتار ◊ لەشەرع دا خۆگرتنەوە لەهەرشتێك ڕۆژوی پێ بشکێ، لەبەرە بەیانەوە هەتا خۆرئاوابوون ◊ قسەنەکردن، قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا﴾.

**الصَّوَّامُ**: کەسێك زۆر بەڕۆژو بێ.

**الصِّيَامُ**: بەمانا (الصَّوْم)دێ ◊ هەروا کۆی وشەی (صائم)یشە.

**المُصَامُ**: (مَصَام الفرس): شوێنی ڕاوەستانی ئەسپ.

**مَصَام النجم**: شوێنی ئەستێرە، ڕێڕەوی ئەستێرە ◊ دەگوترێ: (جِئْتُهُ والشمس في مَصَامِها): هاتم بۆلای لەکاتێك دا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دا بوو ◊ (الصَّوْمَع والصَّوْمَعة): بڕوانە مادەی (صَمَعَ).

**صَانَ الفرسُ صوناً**: ئەسپەکە ڕاوەستاو نوکی سمی لەزەوی چەقاند بوو ◊ حەزی لەڕۆیشتن نەبوو لەبەرئەوەی سمی نالی پێوە نەمابوو ◊ سوابوو ◊ یان سمی دەهێشا.

**صَانَ الشَيْءَ صَوناً وصِيانَةً**: شتەکەی لەشوێنێکی باشو ئەمین دا پاراست ◊ دەگوترێ: (صانَ عِرضَهُ): ناموسو حەیای خۆی پاراستو نەیهێشت لەکەدار بێ.

**إصْطانَهُ**: بۆزێدەڕەوی لەمانای (صان)دێ.

**تَصَاوَنَ**: خۆپارێزی کرد.

تَصَاوَنَ من المعايب: خۆی لەعەیبو عار پاراست.
تَصَوَّنَ: بەمانا (تَصَاوَنَ)دێ.
الصِّوَانُ: هەرشتێك كتێبی تێدا بپارێزرێ، یان پۆشاكی تێدا هەڵبگیرێ ٥ (ك: أصْوِنة).
الصَّوَانُ: بەردەستێ، جۆرە بەردێكە زۆر رەقە كە بەنەستێو ئاسن لێی دەدرێ پزیشكی ئاگری لێ دەبنەوە.
الصَّوَانَةُ: ناوە بۆ پارچەیەك لەبەردەستێ.
الصِّينَةُ: بەمانا (الصُّوْنُ) دێ ٥ دەگوترێ: (هذا ثوب صينة) ئەوە پۆشاكی هەراج نیە بەڵكوو پۆشاكێكە لەناو صندوق دا هەڵدەگیرێ.
صَوِيَ صَوىً: وشك بوو كرزو لاواز بوو ٥ دەگوترێ: (صَوِيَ الضَرْعُ): گوانەكە شیری تێدانەما وشكی كرد.
أصْوَى القَوْمُ: خەڵكەكە دابەزینە سەر تەپۆڵكەی بەردەڵانو پتەو لەوێ جێی خۆیان خۆش كرد.
أصْوَى فلان: فلانكەس ئاژەڵەكانی كرزو لاواز بوون.
صَوَّى الصُّوى في الطريق: لەسەر رێگاو بۆ شارەزایی نەشارەزایان بەردی خستنە سەریەك تا بزاندرێ رێگاكە چۆن دەڕوا.
صَوَّى النَّاقَةَ: حوشترەكەی نەدۆشی بۆئەوەی شیر وشك بكاو قەڵەو بێ.
صَوَّى الدابَّةَ: وڵاخەكەی بەرەڵاكرد بۆئەوەی قەڵەوبێو نیشات پەیدا بكا.
الصُّوَّةُ: تەپۆڵكەی رەقو پتەو ٥ كۆمەڵە بەردی سەر یەك نراو بۆ نیشانەی كوێرە رێگا ٥ (ك: صُوّىً وأصْواء) ٥ لەحەدیسی پێغەمبەر دا هاتووە فەرموویەتی: (إن للدين صوءً ومناراً كمنار الطريق).
صَيَّأَ النَّخْلَ: خورماكە رەنگی خورما نەگەییوییەكانی دەركەوت.
صَيَّأَ رأسه: سەری خۆی شتو چاك پاكی نەكردەوە.
الصَّاءُ: ئەو ئاوەیە لەناو پزدان دایە ٥ ئەو خوێنو خورەیە دوای منداڵ بوون دێتە دەر.
الصَّيَأَةُ: بەمانا (الصَّاءُ)دێ.
الصَّيُوبُ: هەنگێو ٥ دەست راست ٥ یان زۆر هەنگێو.
الصُّيَابَةُ: بەمانا (الصُّوابة)دێ ٥ دەشگوترێ: (هو صُيابَةُ قومه): ئەو پیاوە ریش سپیو پیاو ماقوڵی قەومەكەیەتی.
صَاحَ صَيْحاً وصِياحاً: هاواری كرد،

بەهەموو هێزی قیراندی ٥ قیژاندی، نەڕاندی...

**صَاحَ به**: بانگی کرد.

**صَاحَ عليه**: بەسەریا هەڵشاخی، لێی توڕە بوو.

**صَاحَتْ الشَجَرَةُ**: درەختەکە درێژ بوو.

**صَاحَ العنقود**: هێشووەکە یان گوڵەکە دەرکەوتو درێژ بوو، لەتوێکڵی خۆی هاتەدەر ٥ (فهو صائح).

**صِيحَ به**: ترسا.

**صِيحَ بهم**: فەوتان تێدا چون، خپ بوون دەتکوت بومەلەرزەو گرمەو ناڵەی فەوتێنەر لێی داون.

**صَايَحَ القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان بانگی هەندێکیان کرد.

**صاحَ فلاناً**: بانگی فلانکەسی کرد.

**صَيَّحَ**: بۆ موبالەغە لە مانای (صاح)دا دێ.

**صَيَّحَ الشيْئَ**: شتەکەی قەڵاشتو دەنگی لێوەهات.

**إنصاحَ**: قەڵشاو دەنگی لێ هات.

**إنصاحت الأرضُ**: زەوییەکە هەندێکی بەرووەك داپۆشراو هەندێکی بەروتەنی مایەوە هیچی لێ نەڕوا.

**الصَّائحةُ**: گریانو هاواری کۆستکەوتوو مردو لێ مردو ٥ ترسانو خورپە پێکەوتن ٥ (ك: صَوائح).

**الصَّيْحَةُ**: هاوارو دەنگی تۆقێنەر ٥ فوکردن بە کەڕەنای دونیا وێرانبوونا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾ ٥ هەڵمەتی لەناکاو غافلگیرو زەندەقبەر کە خەڵکەکە بتاسێنێ ٥ سزاو عەزابی فەوتێنەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ﴾.

**الصَّيَّاحُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕەوی لەمانای (الصائح)دا دێ.

**صَادَ الطيرَ والوحش صَيْداً**: باڵندەکە یان ئاژەڵە کێوییەکەی بەداوو تەڵە گرت ٥ هەروا بەمانا کێش کردنو وەگری کردنیش دێ ٥ دەگوترێ: (صادَ الناسَ بالمعروف): بەچاکەو پیاوەتی خەڵکی بۆلای خۆی کێش کرد وەگری خۆیی کرد.

**صَادَ فلاناً طيراً**: باڵندەکەی بۆ فلانکەس گرت.

**صَيِدَ صَيْداً**: ملی خوارە یان ملی خوار بوو ناتوانی ملی بادا.

**أصَادَ فلاناً ونحوه**: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند بەنێچیر بۆگرتن ٥ داخی کرد بۆ ئەوەی ملە خڕەو نەخۆشی مل خواربوونی نەمێنێ.

**إصْطَادَهُ**: زۆر بە ناخۆشی راوی کرد ٥

تابۆی گیرا تەواو شەپرزە بوو.

تَصَيُّدُ: فێڵو پیلانی بەکارهێنا بۆ نێچیر کردنی ٥ دەشگوترێ: (خرج يتصيد) چووە دەرەوە بەهیوای ئەوەی نێچیر بگرێ.

إصْيَدَّ: ملی خوار بوو مله خڕەی توش بوو.

الأصْيَدُ: ملخوار کەنەتوانێ بەهۆی نەخۆشی ملیەوە ئاوڕ بداتەوە ٥ لوتبەرزو فیزکەر ٥ هەرکەسێك لەپاشاو فەرمانڕەواوە دەسەڵاتێکی پێ درابێ ٥ بۆ ئافرەتیش دەگوترێ: (صَيْداء) ٥ (ك: صيد).

الصَّاد: پیتێکە لەپیتەکانی هیجا ٥ دەردەمل، مله خڕە، مل خوار بوون.

الصَّيْدُ: ئەو ئاژەڵەی راو بکرێ ٥ گیانلەبەری دەریا وەکوو ماسیو شتی وا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ﴾.

الصَّيَدُ: نەخۆشییەکە توشی مل دەبێ ناتوانێ مل بسوڕێنێ ٥ خۆبەزلزانو لوتبەرز.

الصَّيُودُ: راوچی کاراماو لێزان لەبواری راوکردن دا ٥ هەروا دەشگوترێ: (كلب صيود وصقر صيود).

الصَّيَّادُ: راوچی؛ ئەوکەسەی پیشەی راوکردن بێ.

الصَّيُودُ: تیری پێکاو، تیرێك باش هەدەفی پێکا بێ.

المَصَادُ: شوێنی راوکردن ٥ تۆقەسەری کێو ٥ (ك: مَصَايِدَ).

المُصْطَادُ: نێچیرەوان، راوکەر ٥ راوکراو، نێچیر.

المِصْيَدُ والمِصْيَدَةُ: تەڵەو داوو ئامێری راورکردن ٥ (ك: مَصَايد).

صَيْدَلَ: دەرمانسازیی کردە پیشەی خۆی.

الصَّيْدَلُ: بەردە زیو ٥ بەردە سیخرو.

الصَّيْدَلَةُ: پیشەی دەرمانسازیی.

علم الصَّيْدَلَة: زانیارییەکە تێیدا باسی داوو دەرمانو تایبەتمەندیو شێوەی تێکەڵ کردنو گرتنەوەی دەرمانەکانی تێدا دەکرێ ٥ (ك: صيادلة)یە.

الصيدلي: بەمانا (الصيدلاني)دێ.

الصَّيدلِيّة: دەرمانخانە ٥ شوێنی دەرمانسازیو فرۆشتنی.

الصَّيدلاني: دەرمانساز ئەوکەسەی دەرمان دروست دەکاو دەیفرۆشێ ٥ زاناو کاراما لەبواری دەرمانسازی دا.

الصَّيْدان: بەردێکە دیزەو گلێنەی لێ دروست دەکرێن ٥ مس.

الصَّيْدانة: دێوو درنج ٥ بەدڕەوشت ٥ زۆر بلێ.

**الـصَّيْدَن:** بـەمانا (الـصَّيْدَلُ)دێ ٥ دەعبایەکە لە ژێر زەوی دا شوێن بۆخۆی دروست دەکا ٥ چەند ڕێگایەکی چەواشەکاریو دەرباز بوونی دروست دەکا بۆئەوەی ڕاوکەر نەتوانێ نێچیری بکا ٥ باڵەخانەی تۆکمەو قایم ٥ پۆشاکی خزو ئەستور چندراو.

**صارَ الشَيْئُ كذا صَيْراً وصيرورةً ومَصيراً:** لەحاڵێکەوە چووە سەر حاڵێکی تر.

**صار اليه:** بۆی گەڕایەوە ٥ هاتەوە.

**أصاره كذا أو الى كذا:** گۆڕی، گۆڕانی بەسەردا هێنا، کردی بەئەو شتە.

**صَيَّرَهُ كذا أو الى كذا:** بەمانا (أصاره)دێ.

**تَصَيَّرَ أباه:** وەکوو باوکی چو، لەشێوەو ڕوخساردا لەباوکی چوو.

**الصَّائرة:** لەوەڕی وشکەوە بوو کەدوای قۆناغی سەوزبوونی زۆر مابێتەوە.

**الـصَّيَّارَةُ:** تەویلەو ئاغەڵو گەوڕی ئاژەڵو وڵاخ.

**الـصَّيْرُ:** کۆتایی کارو سەرەنجامی ٥ لایەنو ئەملاو ئەولای شت ٥ دەگوترێ: (هو على صِيرِ حاجة أخيه) ئەو کابرایە زۆر گرنگی دەدا بەئیشو کاری براکەیو دەیەوێ بەباشی ئەنجامی بدا ٥ ئاوێک خەڵك لەدەوری کۆببنەوەو بیکەنە شوێن هەواری خۆیان ٥ درزی دەرگاو کونی دەرگا لای ئەڵقەو شوێنی کلیلو کێلون ٥ لەحەدیس دا هاتووە: (من نظر من صِيرباب فَفُقِئَتْ عينه، فهي هدر) ٥ هەروا ناوە بۆ کەشیشی مەسیحییەکان.

**الـصِّيَرَةُ:** بـەمانا (الـصِّيارة)دێ ٥ (ك: صِيَرٌ).

**الصَّيُّورُ:** کۆتاییو سەرەنجامی شت ٥ ڕای پەسەندو دروست.

**الْمَصير:** سەرەنجامو دوا قۆناغ ٥ دەگوترێ: (مصير المياه): کۆتایی ڕێڕەوی ئاو ٥ (مصير الخلق): گەڕانەوەو دوا قۆناغی ئادەمیزادو سەرەنجامیان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾.

**صَاصَت النخلةُ صَيْصاً:** درەختە خورماکە خورماکانی بێزۆكو خراپ بوون، باش دەنکە خورماکانی هەڵنەپێچان بەهۆی خراپ بەخێوکردنەوە یان بەهۆی دەردی تر.

**أصاصت النخلةُ:** بەمانا (صَاصَتْ)دێ.

**صَيَّصَت النخلة:** بەمانا (صَاصَتْ)دێ.

**الصِّيصُ:** بەمانا خورمایەکە باش هەڵی نەپێچابێو دەنکەکانی بێزۆكو

وشــــكەڵ بـــــن ٥ دەق بـــــەمانا (الشّيص)دێ.

**الصِّيصَاءُ**: لۆغەتێکە لە (الشّيصاء).

**الصِّيـــصَةُ**: ئـــەو تەلـــەخوارەوەبووەی بەســـــەری سەرەتەشـــییەوەیە داوە بەنەکـــەی تـــێ دەکـــرێ ٥ مـــەکۆكو شـــانەو چـــۆکی جـــۆلا کـــە ڕایـــەڵو پۆیەکەی پێ ڕێك دەخا ٥ شاخە گا ٥ (ك: صَياصِ).

**الصِّيصِيَّةُ**: بەمانا (الصّيصة)دێ ٥ چنگو نینۆکی کەڵەشێر کە بەقاچیەوەن ٥ شـــــوانێك بەباشـــــی ئاژەڵـــەکانی چـــاودێری بکـــاو بـــەخێویان بکـــا ٥ قـــەڵاو دژو ســـەنگەری قـــایم ٥ (ك: صَـــــياصٍ) ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿وَأَنـزَلَ الَّـذِينَ ظَـاهَرُوهُم مِّنْ أَهْـلِ الْكِتَابِ مِن صَيَاصِيهِمْ﴾.

**صَاعَ الغَنَمَ ونَحوها صَيْعاً**: مـەڕو بزنـەکانی بڵاو کردنەوە ٥ پەرتەوازەی کردن.

**صَـاعَ القَومَ**: خەڵکەکـەی پێکـەوە نـانو پێکی هەڵپژاندن بۆ ئـەوەی دژی یـەك بـــنو ئـــاژاوە بکەوێتـــە ناویانـــەوەو پەرتەوازە بن.

**أَصاعَهُ**: بەمانا (صَاعَهُ)دێ.

**انصاع فلان**: فلانکەس خێرا گەڕایەوە.

**صَيَّعَ الطعامَ**: خواردنەکەی لەپێخۆرەکە هەڵکێشا تـا بەتـەواوی پێخۆرەکـەی هەڵمژی.

**صَافَ اليومُ صَيْفاً**: ڕۆژەکە زۆر گەرم بـوو، پلەی گەرمای بەرز بۆوە.

**صَافَ بالمكان**: هاوین لەوشوێنە مایەوە.

**صَافَ عنه**: لای دا، وازی لـێ هێنا.

**صَــافَ الـسَّهمُ عــن الهـدفِ**: تیرەکـە لەنیشانەکە لای دا نەیهەنگاوت.

**صاف المطرُ الأرضَ أو الناسَ**: زەوییەکە یان خەڵکەکە بەهاوین بارانیان لـێ باری.

**أَصَــافَ**: کەوتـە هاوینــەوە ٥ بـەپیری منداڵی بوو.

**أَصــافت الناقَــةُ**: حوشـترەکە بـەهاوین بێچوی بوو.

**أَصَافَ الرجلُ النساءَ**: پیاوەکە بەگەنجی ئافرەتەکەی مارنـەکرد، کـەپیر بـوو ئەمجار مارەی کرد.

**أَصــافَ الـشَّيْءَ عنــه**: شـتەکەی خـوار کردەوە.

**أَصَافَ اللهُ الشَّرَّ عنـه**: خـودا شـەڕەکەی لـێ لادا.

**صــايَفَهُ مــصايفة وصِــيافاً**: مامەڵـەی لەگەڵ کرد هاوین بۆ هاوین.

**صَــيَّفَ بالمكــان**: بــەهاوین لەوشــوێنە مایەوە.

**صَــيَّفَ الــشَّيْءُ فلانــاً**: شـتەکە بەشـی ماوەی هاوینی فلانکەسی کرد.

**صَيَّفَ المطرُ الأرضَ أو النـاسَ:** بارانەكە بـــەهاوین لەزەوییەكـــە یـــان لەخەڵكەكە باریٚ.

**اصـطاف بالمكـان:** بـەهاوین لەوشـویٚنە مایەوە.

**تَـصَيَّفَ بالمكـان:** بـەهاوین لەوشـویٚنە مایەوە.

**الصَّائف:** گەرم.

**الـصَّائفة:** كـاتی هـاوین ٥ غـەزاكردن لەوەرزی هاوین دا بۆیە غـەزاكردنی موسـوڵمانەكان بـۆ وڵاتـی روم بـەو ناوە ناونراوە.

**صائِفة القوم:** بژیٚوی خەڵك لـەهاوین دا ٥ (ك: صوائف).

**الصَّافُ:** گەرم ٥ دەگوتریٚ: (یوم صـاف) رۆژیٚكی گەرمە.

**الـصَّيْفُ:** هـاوین؛ یەكیٚكـە لەچـوار وەرزەكـانی سـاڵ ٥ (ك: أصـــیاف وصیوف).

**الـصَّيْفِيّ:** هـاوین؛ شـتی هـاوینی جلـی هـاوینی، میـوەی هـاوینی هەرشـتیٚك لـەهاوین دا پەیـدا ببـیٚ ٥ دەگـوتریٚ: (مطر صیفي ونبت صیفي): رووەكیٚـك لەهاوین دا بڕویٚ.

**الصَّيِّفُ:** هەرشتیٚك لەهاوین دابیٚ.

**المِصْيَافُ مِن النـاس:** پیاویٚكە تـا تـەواو كـاملٚ نـەبیٚ ژن نـەهیٚنیٚ ٥ هـەروا وشەی (المِصْیاف) ناوە بـۆ حوشـتریٚك هاوینـان بیٚـچوی ببـیٚ ٥ زەوییـەك تەنها لـەهاوین دا شـتی لـیٚ بـڕویٚ ٥ (ك: مصاییف).

**المُصْطَاف:** هاوینە هەوار.

**المَـصِيفُ:** شـویٚنی مانـەوەی هـاوین، هاوینە هەوار ٥ (ك: مصایف).

**صاق به كذا صَيْقاً:** پیٚوەی نووسا.

**الصِّيق:** تەپو تۆزی چڕو پڕی بەرزەوە بوو لەحەوادا ٥ عـەرەق ٥ (ك: صـیق وصیقان).

**صَاكَ به كذا صَيْكاً:** پیٚوەی نووسا.

**صَاكَ الـدَّمُ ونحـوه:** خویٚنەكـە وشـك بـۆوە، رەق هەڵهات.

**صَالَ علیه صَيْلاً وصیالاً وصَـيَلاناً:** بڕوانـە مادەی (صَوَلَ).

**صِـيلَ لـه كـذا:** ئـەوەی بۆڕیٚكـەوت، بـۆی گونجا ٥ بۆی ڕەخسا.

**الصِّينِيّ:** شتو مەكو كاڵای صینی.

**الصِّينية:** دەوری قـاپو بەلـەمی چینی كـــە بەكاردەهیٚمـــدریٚن بۆنـــان تیٚداخواردن ٥ (ك: صینیات).

**الضّادُ**: پیتی پانزەهەمە لە پیتەکانی هیجا ٥ هەندێ عەرەب ئەوەندە بەگوشراوی‌و کۆکراوەیی دەیڵێن وەکوو دالی قەڵەوی لێ دێ ٥ (پیتی (ضاد) تایبەتمەندییەکی تەواوی هەیە لەزمانی عەرەبی دا تەنانەت هەندێ جار لەجیاتی (لغة العرب) دەگوترێ (لغة الضاد) کەم کەسیش وەکوو عەرەب دەتوانن ئەو پیتە وەکوو خۆی دەربڕن، هەندێ گەل‌و نەتەوە هەر ناتوانن تەلەفوظی پێ بکەن، وەندەی من بزانم دوا عەرەب کەس بەئەندازەی کورد لێزان نییە بۆ وتنی ئەو پیتەو تەلەفوظ پێکردنی.

**الضِّئْبُ**: گیانلەبەرێکی دەریاییەو لەناو ئاودا دەژی ٥ دەنکی مرواری.

**الضُّوْبان من الجمال**: حوشتری قەڵەوی بەهێز.

**ضَأَزَهُ ضَأْزاً**: ستەمی لێ کرد، دەگوترێ: (ضَأَزَهُ حَقَّهُ): مافی ژێر پێ دا، کەمی کردەوە، مافی خۆی نەدایە.

**الضِّئْزى** (قسمة ضِئزى): دابەشکردنی ستەمکارانەو ناعەدالەت.

**ضَأْضَأَ ضَأْضَأةً وضَأْضاءً**: غاڵەو بوغلی کرد، هاواری کرد.

**الضَّأْضاءُ**: دەنگە دەنگ‌و هاوار هاوار.

**الضِّئْضِئُ**: ئەصل‌و بنەما، دەگوترێ: (هو من ضِئْضِئِي كريم) ٥ (ك: ضآضِئ).

**ضَئِطَ ضَأَطاً**: لەرۆیشتن دا شان‌و جەستەی هەڵدە تەکێنێ.

**ضَؤُلَ الرجلُ ضآلَةً وضُؤولةً**: جەستەو قەبارەی بچوك بوو، کزو لاواز بوو، هیچ‌و پوچ‌و بێ نمود بوو، دەگوترێ: (ضَؤُلَ رأيه): راوو بۆچونێکی هیچ‌و پوچی هەبوو ٥ (فهو ضَئيلٌ) ٥ (ك: ضُؤلاء وضِئال) ٥ (وهي ضئيلة) ٥ (ك:ضِئال)، دەگوترێ: (ما عليك في ذلك ضُؤولة): لەوەدا تۆ هیچ کەم‌و کورییەکت نییە.

**ضاءَلَ شخصهُ**: کەسایەتی ئەوی بچوك کردەوە.

**تضاءَلَ**: بەمانا (ضَؤُلَ)دێ ٥ وێك هاتەوەو هەندێکی کەوتە سەر هەندێکی‌و پاڵیان لێك دا ٥ کەسایەتی خۆی شاردەوەو خۆی بچوك کردەوە.

**الضُّؤلان**: ماندوو بون‌و بارگرانی، دەگوترێ: (هو عليه ضُؤلانٌ): ئەو

لەسەر فلان بارگرانیو ئەرکە.

**أضأن فلان**: فلانکەس مەڕی زۆر بوو.

**الضائن**: مەڕ ٥ کەم شیر ٥ جەستە جوانو ڕێکو پێک ٥ (ك: ضأن وضئين وهن ضوائن).

**الضأنُ**: مەڕ، مەڕە سپی، مەڕی خوریدار، دەگوترێ: (لحم ضأن): گۆشتی مەڕ.

**الضِئْنِيُّ**: مەشکەی دۆ تێدا ژاندن.

**ضَأى ضَأياً**: بەمانا (ضَوُلَ)دێ ٥ جەستەی زەعیفو لاواز بوو.

**ضَبَأ بالأرض وفيها ضُبُوءاً**: بەزەوییەوە نووسا، خۆی شاردەوە، دەگوترێ: (ضَبَأ الصائد): نێچیرەوان خۆی مەلاس دا بۆئەوەی نێچیرەکە بخاتە داوی خۆیەوە.

**ضَبَأ منه**: شەرمی لێ کرد.

**ضَبَأ عليه**: پەنای بۆ برد.

**ضَبَأ به الأرض**: بەزەوییەوەی نوساندو ناهێڵێ هەڵسێتەوە ٥ (فهو ضَابِئٌ وضَبِئٌ).

**أضبأ على الشيئ**: لەشتەکە بێ دەنگ بوو لێی نەدوا، دەگوترێ: (أضبأ على ما في نفسه): ئەوەی لەدڵی دا بوو شاردیەوە نەی درکاند ٥ (أضبأ على ما في يديه): ئەوەی لەدەستی دا بوو بەفیڕۆی نەداو دەستی بەسەرا گرتو پاراستی.

**الضَّابِئُ**: خۆڵ، خۆڵە پەتە.

**الضَّابِئةُ**: کۆڵی قورس، باری گران، کە کۆڵبەرەکە نەتوانێ لەزەوی بەرزی بکاتەوە، دەگوترێ: (غِرارة ضابئة): کۆڵێکی قورسو گرانە کۆڵبەرەکە لەژێریا دیار نییە ٥ (ك: ضوابئ).

**المَضبأ**: حەشارگە ٥ (ك: مَضابئ).

**ضَبَّ الماء ونحوه ضَبّاً وضُبوباً**: ئاوەکە بەکەمی داچۆڕا کەمی لێ ڕەوان بوو، دەگوترێ: (ضَبَّ الدَّمُ والعَرَقُ والرِّيقُ): خوێنی کەم لێ ڕۆیی، عەرەقی کەم کرد، تفو لیکی کەم بوو.

**ضَبَّ بكذا أو عليه**: هەوڵی بۆدا ویستی بەدەستی بێنێ.

**ضَبَّ**: ڕقو کینەی پەیدا کرد ٥ ڕقی لێ هەڵسا.

**ضَبَّ على ما في نفسه**: ئەوەی لەناخی دا بوو نەی درکاند، شاردیەوە.

**أضَبَّ اليومُ**: ڕۆژەکە ڕۆژێکی تەمو مژاوی بوو.

**أضبَّ المكان**: شوێنەکە تەمو مژی هەبوو.

**أضَبَّتِ الأرض**: گزوگیا زەوییەکەی داپۆشی ٥ زەوییەکە تەمو مژی زۆر بوو.

**أضَبَّ القومُ**: خەڵکەکە تێکڕا بەکارەکە

هەڵسان‌و خەریکی بوون.

أضبَّ فلان: فلانکەس زانیاری خۆی شاردەوە نەیویست، سود لەقسەکانی ببیندرێ.

أضبَّ على ما في نفسه: ئەوەی لەدڵی دا بوو بەرق‌و قینەوە شاردیەوە.

أضبَّ على ما في يديه: ئەوەی لەدەستی دا بوو بەتوندی پارێزگاری کردو گرنگی پێ دا.

ضَبَّبَ الخشبَ: پارچە ئاسنی لەدارەکە شەتەك دا، تەختە دارەکەی بەپینەی لەوحە ئاسا قایم‌و پتەو کرد.

ضَبَّبَ الباب: پینەی ئاسنی لەدەرگاکە قایم کرد بەمەبەستی رەختە کردن‌و پتەو کردنی ٥ دەرگاکەی وا دروست کرد بەسەر یەك دا بشکێتەوە، بچێتە ناو یەکەوە.

ضَبَّبَ الضَّبَّ: سوسەمارەکە (بزن مژەکە)ی دەنە دەنە دا بۆئەوەی لەکونەکەی بێتە دەرێ‌و نێچیری بکا.

ضَبَّ الشيءَ: توند شتەکەی گرت بۆئەوەی لەکیسی نەچێ.

تَضَبَّبَ: دەستی کرد بەقەڵەو بوون.

الضَّبابُ: تەم‌و مژ، وەکوو هەور وایە زەوی دادەپۆشێ.

الضَّبُّ: بزن مژە، سوسەمار، قۆڕی ٥ گیانلەبەرێکی خشۆکە، پێستی زبرە کلکی درێژە ٥ لەدەشت‌و بیابانەکانی وڵاتی عەرەب زۆرە ٥ رق‌و کینە کەلە ناخ دا شاراوە بێ، دەگوترێ: (رجل خبّ ضبٌّ): پیاوێکی فێڵاوی‌و تەڵەکە بازە ٥ (ك: أضُبٌّ، ضباب، ضُبّاب).

الضَّبيب: شوێنی تەم‌و مژاوی.

الضَّبَّةُ: سوسەماری مێینە، دەشگوترێ: (إمرأة خَبَّة ضَبَّة): ئافرەتێکی مەکر بازو فێڵاوی‌و بەچاوو راوە ٥ پێستی سوسەمار دەباغ بکرێ‌و رۆنی تێ بکرێ ٥ پارچە ئاسنێکە دەرگای پێ پتەو دەکرێ ٥ سورگی دەرگا ٥ شمشێرو کلیل دارینە دەرگای پێ دادەخرێ ٥ (ك: ضَباب).

الضُّبُوبُ: ولاغێك لەکاتی بازدان‌و رۆیشتن میز بکا.

الضَّبيب من السيف: تیژایی‌و تیژیی شمشێر.

الضَّبيبة: خۆراکێکە لەرۆن‌و خورما دروست دەکرێ لەتورەکەو زەرفی چەرمین دا هەڵدەگیرێ بۆئەوەی وردە وردە بدرێ بەمناڵ بیخوا.

ضَبَثَ الشيءَ وبه وعليه ضبثاً: شتەکەی لەناو قولە مشتی دا بە توندی

گرتو گوشی ◦ (ضَبَثَ به): هەڵمەتی بۆ برد، (ضَبَثَ فلاناً): لەفلانکەسی دا.

**الـضُبَاثُ:** شـێر ◦ چـنگی شـێر ◦ (ك: أضبثة).

**ضَبَجَ ضَبْجاً:** خۆی دا بەزەوی دا بەهۆی ماندو بونو نارەحەتی.

**ضَبَحَ الثعلبُ ضَبحاً وضُبَاحاً:** ڕێوییەکە واقاندی، دەشگوترێ: (ضَبَحَ الإنسانُ والبومُ والخيلُ): ئادەمیزاد کوندەبو ئەسپ هانکە هانکی کرد لە کاتی هەناسەدان دا ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا﴾.

**ضَبَحَت النارُ أو الشمسُ الشيئَ:** ئاگرەکە یان خۆرەکە شتەکەی رەش هەڵگێرا، کەمێك ڕەنگی گۆڕی.

**ضَبَحَ العود بالنار:** سەری دارەکەی کەمێك سوتاند ◦ کردی بەسەرە بزوت ◦ (فهو مضبوح وضبيح).

**إنْضَبَحَ:** بۆ موطاوعەی (ضَبَحَه)دێ.

**انـضَبَحَ لونُـهُ:** رەنگی کەمێك بەلای رەشی دا رۆیی کەمێك رەش هەڵگەرا.

**الـضُبَاحُ:** حیلەی ئەسپ ◦ واقەواقی ڕێوی.

**الضَبْحُ:** خۆڵ، خۆڵە پەتە.

**الضَّبْحَاءُ:** کەوان کەبەئاگر داهێندرابێ ◦ بەئاگر گەرم کرابێو چەمێندرابێتەوە.

**الـمَضَابِحُ:** ئاگردانو مەقەڵی کە کەوانەکەی تێدا گەرم کرابێ ◦ تاوە کە شتی تێدا سور بکرێتەوە.

**المضبوحة:** بەردی ئەستێ، چەرخ.

**ضَـبَرَ ضَـبْراً وضَـبَراناً:** بازی دا ◦ (ضَـبَرَ الفـرسُ): ئەسـپەکە قاچـەکانی کۆکردنەوە بۆئەوەی باز بدا، دەگوترێ: (ضَبَرَ المقيَّدُ): ئەسپە پێوەند کراوەکە بازی دا.

**ضَبَرَ الوجهُ:** روخسارەکە گۆڕا.

**ضَبَرَ الشيئَ ضَبْراً:** شتەکەی خڕکردەوەو شەتەکی دا، دەشگوترێ: (ضَبَرَ الکتب): کتێبەکانی کۆکردنەوەو توند شەتەکی دانو کردنی بەگورزەو شەدەو دۆسیە.

**أضْبَرَ:** بەمانا (ضَبَرَ)دێ.

**ضَبَّرَ اللحمَ:** گۆشتی هەڵپەچنیو قەڵەو بوو.

**ضَبَّرَ الشيَ:** شتەکەی کۆکردەوە.

**الإضْـبارة:** کۆمەڵە کتێبێك بەیەکەوە ببەسترێنو بکرێنە شەددەو گورزە ◦ (ك: أضابير).

**الـضُبَارة:** کۆبونـەوەی خەڵـك پەیماندانیان بەیەکتری.

**الـضُبَارَةُ:** بـەمانا (الإضـبارة)دێ ◦ هەرشوێنێـك کۆکەرەوەی هێزەکان

بـــێ ٥ کۆمـــەڵی ئـــادەمیزاد ٥ (ك: ضبائر).

**الـضُّبَارِمُ**: دەگـوترێ: (أسـد ضُـبارم): شێرێــکی دامــەزراوە ٥ جەســتە تێکسمڕاوو پتەوە.

**الضُّبَارِيَةُ**: بەمانا (الضُّبارم)دێ.

**الـضُّبَارُ**: درەختێـکە برمدارەکـانی بـۆ سوتاندن باشن وەکوو دار بەڕو وایە.

**الـضَّبْرُ**: پتـەوی ئێـسقانو کۆبونـەوەی گۆشـت لەئەندامـەکان دا، دەگـوترێ: (فـرس ضَـبْرٌ): ئەسپێـکی جەسـتە تێکسمڕاوە ٥ جۆرە دەبابەیـەك بـوو لەتەختەدار دروست دەکراو بەچەرم دادەپۆشراو دەخرایە گەڕ بۆ گرتنـی قـــەڵاو ســـەنگەرو روخانـــدنی دیوارەکـــانی ٥ کـــۆڕو کۆمـــەڵ ٥ درەختـی گـوێزی کێـوی ٥ جـۆرە دار گوێزێکە گوڵ دەکاو گـوێز نـاگرێ ٥ (ك: ضُبُور).

**الضَّبْرَةُ**: دەبابە.

**الضَّبِرُ**: توندو پتـەوو بـەهێز ٥ ئەسپی باز هاوێژ، ئادەمیزادی بازدەر.

**الضَّبِيُّ**: بەهێز ٥ توندو پتەو.

**المُـضَبَّرُ**: دەگـوترێ: (فـرس مُـضَبَّرٌ): ئەسپێکی بەهێزو تێکسمڕاوە.

**المَضْبُورُ**: بەمانا (المُضَبَّر) دێ ٥ داس.

**ضَبَـسَهُ ضَبْـساً**: پێکێـشی لـێ کـرد ٥ زۆری داوا لـێ کرد.

**ضَبِسَ الرجلُ ضَبَساً**: پیاوەکە بەدڕەوشت بـوو، دەشـگوترێ: (ضَبِـسَتْ نفـسُهُ): رەوشـتی خـۆی گـۆڕی خـۆی ناشـیرین کرد ٥ رژدو چروك بوو.

**الضَّبْسُ**: رژدو بەخیل.

**الضِّبْسُ**: ئەحمەقو کـەودەن ٥ جەسـتە لاوازو بێ هێز، دەگوترێ: (هو ضِبْسُ شرٍّ): شەڕەنگێزو پیاو خراپ.

**ضَبَطَهُ ضَبْطاً**: شـتەکەی کـۆنتڕۆڵ کـردو بەهێزو توانا دەستی بەسەرا گـرت ٥ بـاش پارێزگـاری کـرد، دەگـوترێ: (ضـبط الـبلاد وغيرهـا): بەرێـكو پێـکی وڵاتی کۆنتڕۆڵ کردو بەڕێوەی بـردو کـەمو کـوڕی تێـدا نەهێـشت ٥ (ضَـــبَطَ الكتـــابَ): کـــەمو کـــوڕی لەکتێبەکـەدا نەهێـشتو هەڵـەکانی چاك کرد ٥ هەڵە بـڕی کـردو سەرو ژێرو بۆری بۆ وشەکان دانا.

**ضَبَطَ المُتَهَّمَ**: تاوانبارەکەی گرت.

**ضَـبِطَ ضَـبَطاً**: بەدەسـتی چـەپی وەکـوو دەستی راستی کاری کرد ٥ (هـو أضْـبَطُ وهي ضَبْطاء) ٥ (ك: ضُبْطٌ).

**إنْضَبَطَ**: بۆ موطاوەعەی (ضَبَطَ)دێ.

**تَضَبَّطَ فلاناً**: بەرقو قینەوە فلانکەسی گرت.

**الـضَّابِطُ**: بـەلای زانایانــەوە یاسـایەکی

گشتییه بەسەرتاکی رەگەزەکەدا خورد دەبێتەوە ○ (ك: ضَوابِطُ) ○ نازناوو پلەیەکە لەناو پۆلیس و سەرباز دا واتە: (ئەفسەر) ○ (ك: ضُبّاط).

**الضّابِطة**: لەزگە ○ هەرشتێك بەشتێکی ترەوە بنووسیّ و شت بگریّ.

**المَضْبَطَةُ**: سجل و دەفتەرێکە بڕیارو ئامۆژگارییەکانی دانیشتنە فەرمییەکان وەکوو سجلی پەرلەمان و دادگای باری کەسیەتی تێدا تۆمارە ○ (ك: مضابط).

**ضَبَعَ الفرسُ ضَبْعاً وضُبُوعاً وضبعاناً**: ئەسپەکە دەستەکانی هاویشتن و خێرا رۆیی.

**ضَبَعَ فلان ضَبْعاً**: فلانکەس ستەمی کرد.

**ضَبَعَ فلاناً**: قۆلی بۆ فلانکەس درێژ کرد بۆئەوەی لێی بدا، دەگوتریّ: (ضَبَعَ اليه يده بالسيف ونحوه): شمشێری بۆ راداشت، لێی راسا، دەستی بۆ درێژکرد.

**ضَبَعَ على فلان وغيره**: دەستی بەرز کردەوە بۆ دوعا کردن لەفلانکەس.

**ضَبَعَ الضَّبُعُ الحيوانَ**: سوسە مارەکە گیانلەبەرەکەی خوارد.

**ضَبِعت الدابةُ ضَبَعاً**: گیانلەبەرە مێینەکە حەزی لە نێرینەکەی بوو بۆئەوەی کەلّی بدا، حەزی لەجوتبوون بوو ○ (فهي ضَبِعَةٌ وضَبْعى) ○ (ك: ضِباع وَضَبَعى).

**أضْبَعَتِ الدابةُ**: بەمانا (ضَبِعَت)دیّ.

**ضَابَعَهُ بالسيف مُضَابَعَة وضِباعاً**: بەشمشێر لێك راسان و بەشمشێر دەستیان بۆ یەکدی درێژ کرد.

**ضَبِّعَ فلان**: فلانکەس ترسا ○ رەوشتی بزن مژەی گرت.

**إضْطَبَعَ بالثوب**: قوماشەکەی بن هەنگڵ دا.

**إسْتَضْبَعَتِ الدابةُ**: بەمانا (ضَبِعَت)دیّ.

**الضَّبْعُ**: قۆڵ؛ لەبن هەنگڵەوە تا ئانیشك ○ (ضَبْعَان): هەردوو قۆڵ.

**الضَّبُعُ**: کەمتیار؛ گیانلەبەرێکی دڕندەیەو لەسەگ گەورە ترەو بەهێز تریشە، سەری گەورەو شەویلەی پانە ○ (ك: أضْبُعٌ) ○ هەروا وشەی (الضَّبُعُ): بەسالّی بیّ باران و قات و قڕیش دەگوتریّ.

**الضُّبُعُ**: پەناو پاسارو قوژبن.

**الضِّبْعَان**: کەمتیارە نێرە ○ نێرە کەمتیار ○ (ك: ضَبَاعِين).

**المَضْبَعَةُ**: کۆی وشەی (الضّبع)ە ○ گۆشتی لاپەراسوو بن هەنگڵ.

**ضَبَنَهُ ضَبْناً**: بەلاکەلەکەی هەڵی گرت.

**ضَبَنَ الشيءَ عنه**: شتەکەی مەنع کرد، گێڕایەوە.

**ضَبِنَ ضَبَناً**: گۆج بوو ◦ (ضَبِنَ المكان): شوێنەکە تەنگ بوو، دەگوترێ: (ماء ضَبْنٌ): ئاوی رونو بێ خڵتەو پڵتە.

**أضبَنَ الشيئَ**: شتەکەی خستە سەر لاکەلەکەیو هەڵی گرت.

**أضبَنَ الداءُ فلاناً وغيره**: دەردەکە فلانی گۆج کرد.

**إضْطَبَنَ الشيئَ**: شتەکەی بەلاکەلەکەی هەڵگرت ◦ یان لەباوەشی گرت، لەئامێزی گرت ◦ بەدەستی هەڵی گرت.

**الضَّبانَةُ**: گۆجیو ئیفلیجی، ناخۆشی.

**الضِّبْنُ**: کەمو کوڕیو زەرەر ◦ کێووکەژو شوێنێك کە دڕەندەی زۆر بێ ◦ (ك: أضبَانٌ).

**الضُّبْنَةُ**: گۆجیو ئیفلیجی.

**الضُّبْنَةُ من الرجلُ**: دارو دەستەی پیاو، کەسو کارو خێزان، دۆستو ناسیاو دەستو پێوەند.

**الضَّبِينةُ**: دەگوترێ: (هو في ضبينة فلان): ئەوە لەژێر سایەی فلانکەس دایەو ئەو پەنای داوە.

**ضَبَا اليه ضَبْواً وضُبُواً**: خۆی خستە پەنایەوە.

**ضَبَتِ النارُ أو الشمسُ الشيئَ ضَبْواً**: ئاگر یان تیشکی خۆر شتەکەی گەست، هەڵی پروزاند، سوتاندی، سوری کردەوە، برژاندی.

**أضبَى**: کز بوو، قەڵەوی نەما ◦ توایەوە.

**أضبَى السَّفَرُ بالقوم**: سەفەرەکە بێ سود بوو بۆ قەومەکە هیچیان دەستگیر نەبوو.

**الضَّابي**: خۆڵ ◦ گڵو خۆڵ.

**ضَجَّ ضَجّاً وضَجيجاً**: کردیە هاتو هاوارو قیڕەو هەرا بەهۆی نەخۆشیو ماندوو بونەوە یان بەهۆی شتی ترەوە.

**أضجَّ القومُ**: خەڵکەکە ناڕەحەت بوون.

**ضَاجَّهُ مُضَاجَّةً وضِجَاجاً**: دەمە دەمێی لەگەڵ کرد، کێشەی لەگەڵ دا کرد.

**الضَّجَاجُ**: چەماندنو پڕواندنو ژێر بارکردن.

**الضَّجَّةُ**: هەراو هۆریا، دەنگە دەنگو ژاوەژاو.

**الضَّجُوجُ**: جاڕز کەرو ئیزعاج.

**ضَجِرَ بالأمر ومنه ضَجَراً**: بەکارەکە ناڕەحەت بوو لەکارەکە ناڕازی بوو.

**ضَجِرَ المكانُ**: شوێنەکە تەنگە بەر بوو جێگای ئەوانە نەبوەوە کەتێیدا بوون.

**أضجَرَهُ**: جاڕزی کرد، وای لێ کرد ناڕەحەت بێ.

**تَضجَّرَ**: بەمانا (ضَجِرَ)دێ.

**الضَّجُورُ**: کەسێك زۆر ئیزعاج بێو خەڵك جاڕز بکا بۆ نێرو مێ بەکاردێ ◦ (ك: ضُجُرٌ).

**ضَجَعَ ضَجْعاً وضجوعاً**: لاتەنیشتی خستە سەر زەوی، لەسەر لاکەلەکە راکشا.

**ضَجَعَ الیه**: ئارەزوی ئەوی کرد.

**ضَجعت الشمس أو النجم**: خۆر یان ئەستێرەکە بەرەو ئاوا بوون رۆیی.

**ضَجَعَ في الأمر**: سستی لەکارەکەدا کردو باش ئەنجامی نەدا.

**أضْجَعَ**: بەمانا (ضَجَعَ)دێ.

**أضْجَعَ في القوافي**: سەرەوای شیعرەکانی باش هێنان.

**أضْجَعَ في الحركات**: بزوێنەکانی بەخواریی درکاندن وەکوو لەگوتنی پیتی (ألف)دا بەشێوەی (ی)بیڵێ.

**أضجَعَ فلاناً**: فلانکەسی لەسەر لاتەنیشت راکێشا.

**أضْجَعَ المرضُ فلاناً**: نەخۆشی فلانکەسی خستە سەر جێگا.

**أضْجَعَ الشيئَ**: شتەکەی نزم کردەوە، خواری کرد.

**ضاجَعَهُ مضاجَعَة وضجاعاً**: لەسەر لاکەلەکە لەگەڵی راکشا.

**أضجَعَ الهمُّ**: غەمو خەفەت یەخەی گرت.

**ضَجَّعَ في الأمر**: کەمتەر خەمی لەکارەکەدا کرد.

**ضَجَّعَتِ الشمسُ**: خۆر بەرەو ئاوا بوون رۆیی.

**إضْطَجَعَ**: بەمانا (ضَجَعَ)دێ، دەشگوترێ: (إضَّجَعَ).

**إنضَجَعَ**: بۆ موطاوەعەی (أضْجَعَهُ)دێ.

**تضاجَعَ عن كذا**: خۆی لەوشتە بێ ئاگاکرد.

**تضَجَّعَ**: بەمانا (ضَجَعَ)دێ.

**تضَجَّعَ في الأمر**: وازی لەکارەکە هێناو ئەنجامی نەدا.

**الأضْجَعُ**: خوار، چەماوە، دەگوترێ: (هو أضجع الثنايا): ددانی پێشەوەی خوارو شاش‌و پاشن ٥ (ك: ضُجْعٌ).

**الضَّاجِعُ**: تەمبەڵ‌و قونگ گران ٥ کەسێك کاری باش‌و پیاوانەی لەدەس نەیە ٥ ئەحمەق‌و هەتیو مچە ٥ قولایی شیوو دۆڵ ٥ (ك: ضَواجِعُ).

**الضَّجْعَة**: گوزەرانی تەنگ ٥ دەسکورتی ٥ رای پرو پوچ.

**الضُّجْعَةُ**: شێوەی راکشان ٥ تەمبەڵی ٥ کەسێك لەماڵ دەرنەچێ، بێ کارو تەمبەڵ‌و تەوەزەل.

**الضُّجَعی**: بەمانا (الضَّجْعَة)دێ.

**الضُّجُوعُ**: کەسێك بیرو رای لاوازی هەبێ ٥ حوشتر کە لەلاڕێ لەوەڕ بخوا ٥ کوندە ئاو کەزۆر قورس بێ‌و هەڵگرەکەی بچەمێنێتەوە ٥ هەوری پرباران کەبەهێواشی بڕوا.

**الـضَّجِيعُ**: بـهمانا (المـضاجعُ)دێ ○ دهگوترێ: (بئس الضّجيع الجوع): برسـيايهتى خـراپترين هـاوهڵو هاونشينه.

**المَضْجَعُ**: شوێنى راكشان ○ (مضاجع الغيث): شوێنى باران بارين.

**المَضْجُوعُ**: كهسێك راى پرو پوچ بێ.

**ضَجَمَ الشيءُ ضَجَماً**: شتهكه خوار بوو ○ (وهو أضجم وهي ضَجْماءُ) ○ (ك: ضُجْمٌ).

**تَضَاجَمَ**: بهمانا (ضَجِمَ)دێ.

**تضاجَمَ الأمرُ بينهم**: كارهكه لهنێوانيان دا بوو بهكێشه.

**الضَّجِمُ**: زۆر خۆر.

**الضَّحُّ**: خۆر، يان تيشكى خۆر كاتێك راستهو خۆ له زهوى بدا، دهگوترێ: (جاء بالضِّحِّ والريح): زۆرى شت هێنا.

**ضَحْضَحَ السرابُ**: تراويلكهكه درهوشايهوه.

**ضَحْضَحَ الأمر**: كارهكه ئاشكرابوو.

**تَضَحْضَحَ السرابُ**: بهمانا (ضَحْضَحَ)دێ.

**الضَّحْضَاحُ**: دهگوترێ: (ماء ضحضاح): تهنكه ئاو كهقولايى نهبێ ○ ئاوى كهم.

**الضَّحْضَحُ من الماء**: بهمانا (الضّحضاحُ)دێ ○ لهبوارى جوگرافى دا بريتييه له لمبهلاّنو بهردهلاّن كهنزيكى روبهرى دهريا بێ ○ بهترسهوه بهلهمو كهشتى پێدا تێپهڕێ.

**ضَحِكَ ضَحْكاً وضَحِكاً**: پێكهنى لهخۆشى دا تا ددانى دهركهوتن.

**ضَحِكَ منه**: گاڵتهى پێ كرد ○ سهرى لێ سوڕما ○ لێى ترسا.

**ضَحِكَ طلعُ النخلةُ**: گلۆكى دارخورماكه كرايهوه پشكوت.

**ضَحِكَت النخلة**: دارخورماكه گوڵى پشكوت.

**ضَحِكَتِ الأرضُ عن النبات**: زهوى گژوگياى رواند.

**ضَحِكَ السحابُ**: هەورهكه بروسكهى دا، چهخماخهى دا.

**ضَحِكَ الطريق**: ڕێگاكه ئاشكرا بوو ○ (فهو ضاحك).

**أضْحَكَت النخلةُ**: بهمانا (ضَحِكت)دێ.

**أضْحَكَ الشيءُ الإنسانَ**: شتهكه ئادهميزادى خسته پێكهنين.

**أضْحَكَ الحوضَ**: حهوزهكهى پڕكرد لهئاو تا لهسهريهوه ڕژا.

**ضَاحَكَهُ**: لهگهڵى پێكهنى، دهگوترێ: (رأيك يُضاحك المشكلات): راو بۆچونت چورتم تهنگژهكان يهكالاّ دهكاتهوه.

ضَحَّكَهُ: بەپێکەنینی هێنا.
تضاحك: پێکەنی، پێکەنینی هێنایە خۆی.
تَضَحَّكَ: بەمانا (ضَحِكَ)دێ.
اسْتَضْحَكَ: بەمانا (تضاحك)دێ.
الأُضْحُوكَة: هەرشتێك پێکەنین دروست بکا ببێتە هۆی پێکەنین ٥ (ك: أضاحيك).
الضَّاحِكَة: ئەو ددانانەی لەکاتی پێکەنین دا دەردەکەون ٥ خرێی تەنیشت کەڵبە ٥ (ك: ضواحك).
الضَّحَّاك: کەسێك زۆر پێکەنێ ٥ گوڵۆکی دارخورما کە دەکرێتەوە ٥ رێگای ئاشکرا.
الضَّحْك: سەر سوڕمان ٥ گوڵوکی دارخورما کە دەم دەکاتەوە ٥ خونچە.
الضُّحْكَةُ: کەسێك خەڵك زۆر پێی پێ بکەنێ، گاڵتە جاری خەڵك بێ.
الضُّحَكَةُ: کەسێك زۆر پێبکەنێ.
الضَّحوك: کەسێك زۆر پێبکەنێ ٥ رێگای ئاشکراو ڕون.
المُضْحِكَةُ: عەنتیکەو شتی وا کە ناوازە بێو پێکەنین دروست بکا ٥ (ك: مُضْحِكات).
ضَحَلَ الغدير ضَحْلاً: زۆنگاوەکە ئاوی کەم بوو.

الضَّحْلُ: ئاوی کەم لەسەر زەوی، تەنکاو بێو قوڵ نەبێ ٥ (ك: أضحال وضِحال وضُحول) ٥ (أتان الضَّحْل): ئەو بەردەیە دەخرێتە سەر زارکی بیرو قەوز دەگرێو لوس دەبێ.
ضَحَا ضَحْواً وضُحُواً وضُحِياً: خۆی بەرخۆردا ٥ (ضَحا الطريق): رێگاکە ئاشکرا بوو، دەرکەوت، دەشگوترێ: (ضَحا ظل فلان): فلانکەس مرد ٥ سێبەری نەما ٥ هەروا وشەی (ضَحَا): بەمانا (تاوبردە)دێ، واتە گەرمای خۆر کاری تێکرد.
ضَحِيَ ضَحْواً: گەرمای خۆر لێی داو هەڵی قرچاند ٥ عەرەقی کرد، لەچێشتەنگاودا نانی خوارد ٥ (فهو ضَحٍ وضَحيان وهو أضحى وهي ضَحْياء) ٥ (ك: ضُحيٌّ).
أضحى: کەوتە چێشتەنگاو ٥ نوێژی چێشتەنگاوی کرد، دەشگوترێ: (أضحى يفعل كذا): لەچێشتەنگاودا دەستی کرد بە ...
أضحى عنه: لێی دورکەوتەوە.
أضحى الشيئ: شتەکەی دەرخست ٥ لەدوعاو پارانەوەدا دەگوترێ (لا أضحى الله لنا ظِلَّكَ): خودا پایەدارت بکاو سێبەرت لەسەرمان بێو لەناو نەچێ.

**ضَاحَتْ البِلادُ**: ولاتەکە خۆرە تاو لێی داو گژوگیاکەی وشك بوو.
**ضَاحَ فلاناً**: لەچێشتەنگاودا هاتە لای فلان.
**ضَحيَّ بالشاة ونحوها**: لەچێشتەنگاوی جەژنی قوربان دا مەڕەکەی کردە قوربانی.
**ضَحَّى الحاجُ**: حاجی لەڕۆژانی جەژنی قوربان دا قوربانی سەربڕی.
**ضَحَّى بنفسه**: خۆی بەخت کرد ٥ (ضَحّى بمالـه): ماڵو سامانی خۆی بەبێ بەرامبەر خەرج کرد.
**ضَحَّى الأضحاةَ**: قوربانییەکەی سەربڕی.
**ضَحَّى عن الشيئ**: لەشتەکە بەکاڵۆخۆ بوو، پەلەی لەکارەکەدا نەکرد.
**ضَحَّ الحيوانَ**: حەیوانەکەی ئالف دا لەچێشتەنگاودا.
**ضَحيَّ الماشية**: لەچێشتەنگاودا چاودێری ئاژەڵەکانی کرد.
**تَضَحَّى**: لەچێشتەنگاودا خواردنی خوارد، قاوەڵتی کرد.
**الأضحى من الخيل**: ئەسپی شێ، رەشی مەیلەو بۆر.
**الأضحاةُ**: ئاژەڵی قوربانی، کەلەڕۆژانی جەژنی قوربان دا سەردەبڕێ.
**الإضْحَيَانُ من الأيام**: رۆژانی هەساوو بێ هەورو تەمو مژ.
**الأُضحِيَةُ**: بەمانا (الأضحاة)دێ ٥ (ك: أضاحي).
**الضَّاحية**: ئاشکرا، دەگوترێ: (فعلـه ضاحية) بەئاشکرا کارەکەی ئەنجام دا ٥ (مغازة ضاحية الظلال): سارایەکی بێ درەخت ٥ هەروا وشەی (ضاحية) بەو ئاژەڵە دەگوترێ چێشتەنگاو ئاو بخواتەوە ٥ شوێنی ئاشکرا لەقەراخ شار ٥ درەختی خورما کە لەدەرەوەی باخ دا ڕوابێ.
**الضَواحي**: ئاسمانەکان.
**ضَواحي الروم**: ئەو ناوچەو هەرێمانەی لەولاتی رۆم دیارن ٥ (قريش الضواحي): ئەو قورەیشیيانەی لە دەورو بەری مەککەدا نیشتەجی بوون.
**الضُحى**: تیشکی خۆر، روناکیی خۆر ٥ کاتی چێشتەنگاو، دەگوترێ: (مالكلامه ضُحىً): قسەکەی بێ مانایەو مانای ئاشکرا نییە.
**الضَحَاءُ**: بەمانا (الضُحَى)دێ ٥ یان کاتی پێش نیوەڕۆ.
**الضَّحْوُ**: بەمانا (الضُحَى)دێ.
**الضَّحْوَةُ**: بەمانا (الضَحَاءُ)دێ.
**الضَّحِيَةُ**: بەمانا (الضُحى)دێ ٥ (ك: ضحايا).

**المَضْحَاةُ من الأرض**: ئەو شوێنە بەرزانەی زەوی کە بەکەمی خۆری لێ ئاوا دەبێ.

**ضَخَّ الماءُ ضَخّاً**: ئاوەکە چۆڕایەوە، هەڵڕژا.

**ضَخَّتِ العينُ**: چاو فرمێسکی کرد.

**ضَخّا الماءَ ونحوه ضَخّاً**: ئاوەکەی پرژاند، هەڵی هێنجا.

**إنْضَخَّ**: بۆ موطاوعەی (ضَخَّهُ)دێ ٥ هەڵڕژا، پرژا.

**المِضَخّةُ**: ئامێری ئاو بەرزکردنەوە، ئامێری ئاو پرژێن، ئامێری ئاو هەڵمژین و ئاو هەڵێنجان، ئاو فرێدەر ٥ (ك: مَضاخّ).

**ضَخَمَ ضَخَامةً**: قەبەو گەورە بوو ٥ (فهو ضَخْمٌ وضَخِمٌ) ٥ (ك: ضخام).

**ضَخَّمَهُ**: قەبارەی شتەکەی گەورە کرد.

**الأُضْخُومَةُ**: ئەو ئیسفنج و سەرینۆکەیە ئافرەت سمت و کەفەلی خۆی پێ والێ دەکا زل و گەورە بنوێنن ٥ (ك: أضاخِم).

**التَّضَخُّمُ**: لەبواری ئابوری دا پارە زۆرییە.

**الضُّخام**: گەورەو کەتەو زەبەلاح ٥ رێگەی پان و پۆڕ ٥ ئاوی قورس ٥ (ك: ضخام).

**ضَدَّهُ ضَدّاً**: بەسەری دا زاڵ بوو ٥ (ضَدَّ عنه): لەسەرە خۆو بەهێواشی گێڕایەوە.

**أضَدَّ**: رقی هەڵسا.

**أضَدَّ فلاناً وغيره**: دژو رکەبەری بۆ فلان دانا.

**أضَدَّ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**ضادَّهُ**: دژی جولایەوە، رکەبەرایەتی کرد.

**تضادَّ الأمران**: ئەو دوشتە هەریەکەیان دژی ئەوی تریان بوو.

**الضِدّ**: دژ، دوژمن، ناحەز ٥ پێچەوانە ٥ هاوشان ٥ (ألفاظ الأضداد): ئەو وشانەن دوماناى دژ بەیەکیان هەیە وەکوو (الجَوْن) کەبەمانا سپی و هەروا بەمانا رەشیش دێ.

**الضَّديد**: بەمانا (الضِّدّ)دێ ٥ (ك: أضداد).

**المتضادان**: لەزاراوەی (مەنطیق)دا ئەو دوشتەن بەیەکەوە کۆنابنەوە، بەڵام وادەبێ هەردوکیان نابن ٥ وەکوو رەش و سپی، بۆ نمونە ناگونجێ قەبارەیەك هەبێ لەیەك کات دا هەم سپی بێ هەم رەش بێ ٥ بەڵام رێ دەکەوێ شتێك هەبێ نەرەش بێ نەسپی بێ بەڵکوو سور بێ.

**ضَدِيَ ضَدىً**: رقی هەڵسا پڕبوو لەقارو قین.

**أضْدىَ الإناءَ ونحوه**: قاپەکە یان کیسەکەی پڕکرد.

**الضَّوادي من الكلام:** قسەی پڕو پوچ‌و ناشایستە ٥ قسەی بێ کردار.
**ضَرَبَ الشيءُ ضَرْباً وَضَرباناً:** شتەکە جم‌و جوڵی کرد.
**ضَرَبَ القلبُ:** دڵەکە لێی دا.
**ضَرَبَ العِرقُ:** ڕەگەکە خوێنی وروژا.
**ضَرَبَ الضِرسُ:** ددانەکە ئازاری زۆر بوو.
**ضَـرَبَ الرجـلُ في الأرض:** پیاوەکـە بـەناو وڵاتان دا گەڕاو گەشت‌و گوزاری کـرد، لـــەماڵ دورکەوتـــەوە ٥ ڕاپـــەڕی‌و لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.
**ضَرَبَ في الماء:** لەئاو دا مەلەی کرد.
**ضَرَبَ في الأمر بسهم:** لەکارەکەدا هاوبەشی کرد.
**ضَـرَبَ عـن الأمـر:** وازی لەکارەکـە هێنـاو پشتی لـێ هەڵکرد.
**ضَـــرَبَ اللـــون الى اللـــون:** ڕەنگەکـــە لەڕەنگەکەی تر چوو.
**ضَرَبَ بيـده الى كـذا:** حـەزی لـەفلان شت بوو.
**ضَرَبَ اليه:** ئامازەی بۆ کرد.
**ضَرَبَ على المكتـوب وغـيره:** نوسـراوەکەی مۆر کرد، واژۆی کرد ٥ زەرفی نامەکەی داخست.
**ضَرَبَ النوم علـى أذنـه:** خـەو بەسـەری دا زاڵ بوو.
**ضَرَبَ فلان على يد فلان:** فلانکەس دەستی فلانی گوشی‌و دەست خۆشی لـێ کـرد یـان بەپێـچەوانەوە دەسـتی گـرت‌و نەیهێشت هیچ بکاو کارەکەی لـێ تێـک دا، دەگوترێ: (ضَرَبَ القاضـي علـى يـد فلان): دادوەر فورمتێنەی خستە سـەر فـلان‌و نەیهێـشت هـیچ مامەڵـەو گۆڕینەوە بەماڵ‌و سامانی خۆیەوە بکا.
**ضَـرَبَ بالـسيف وغـيره:** بەشمـشێر لاڵ‌و پاڵی خست.
**ضَرَبَ الـدهر بـين القـوم:** زەمانـەو ڕۆژگار خەڵکەکەی لێـک بڵاو کردن لەیـەکتری جیاکردنـەوە، لێـکی دوور خـستنەوە، ئاژاوەی خستە ناویانەوە.
**ضَرَبَ الشيءَ ضرْباً وتضراباً:** لەشتەکەی دا، هـەنگاوتی ٥ لێـک کـەوتن، دەگـوترێ: (ضَرَبَ به الأرض): بەزەوی کێشا.
**ضَرَبَ به عرض الحائط:** وازی لەشـتەکە هێناو ڕوی لـێ وەرگێڕا، گرنگی پـێ نەدا.
**ضَرَبَ فلانـاً وغـيره بكـذا:** لەفلانکەسـی دا، بەوشتە لـەفلانی دا ٥ داری حـەدی لـێ دا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَخُـذْ بِيَـدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ﴾.
**ضَرَبَت العقربُ فلاناً بابرتها:** دوپشکەکە بەچـــزوەکەی بەفلانیـــەوە دا ٥ دوپشك پێوەی دا.
**ضَـرَبَ الخـاتم ونحـوه مـن الحلـي والمعـادن:** هەنگوستیلەکەی دروست کرد.

**ضَرَبَ الدرهمَ**: پارەی زیوی لێ دا، سکەی زیوی لێ دا.

**ضَرَبَ لە مثلاً**: پەندی بۆ هێنایەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ﴾.

**ضَرَبَ الحاسبُ عدداً في آخر**: ژمێریارەکە ژمارەکانی لێك دان.

**ضَرَبَ لە أجلاً أو موعداً**: کاتێکی دیاری کراوی بۆ دانا.

**ضَرَبَ لە في مالە أو غيرە نصيباً**: لەماڵی خۆی بەشێکی دیاریکراوی بۆ دانا.

**ضَرَبَ الخيمة ونحوها**: چادرەکەی هەڵدا، بڵاوی کردەوەو کۆڵەکەکانی بۆ چەقاند.

**ضَرَبَ الليلُ بظلامە**: شەو داهاتو تاریکی هێناو جیهانی داپۆشی.

**ضَرَبَ عليە الذلةَ**: زەلیلی کرد، زەلیلی دایپۆشیوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ﴾.

**ضَرَبَ الشيءَ عليە**: شتەکەی لەسەر پێویست کرد، دەگوترێ: (ضَرَبَ عليە خراجاً): دەیەكو خەراجی خستە سەر.

**ضَرَبَ الشيءَ بالشي**: شتەکەی تێکەڵی شتەکەی تر کرد.

**ضَرَبَ الرَزّ**: چەڵتوکەی سپی کرد توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**ضَرَبَ بذقنە الأرض**: سەری داخستو شەرمی کرد ٥ یان لەترسا سەری خۆی شۆڕ کرد.

**ضَرَبَ لە الأرض**: لەهەموو شوێنێك بۆی گەڕا.

**ضَرَبَ الرقم القياسي**: لەژمارەی ناسایی تێی پەڕاندو زۆر پێش کەوت.

**ضَرِبَ ضَرَباً**: سەرمای بوو، سەرما کاری لێ کرد.

**ضَرِبَتْ الأرضُ**: زەوی توشی بەستەڵەك بوو.

**ضَرِبَ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە گەدەی گەورە بوو، سکی داچۆڕا.

**ضَرُبت يدە ضرابةً**: دەست ڕاستو باش هەنگێو بوو.

**أضْرَبَ في المكان**: لەشوێنەکە مایەوەو جێی نەهێڵا، ڕاوەستاو نەجوڵا ٥ بێدەنگ بوو.

**أضربَ العمالُ**: کرێکارەکان وازیان لەکار هێناو مانیان گرت تاداوا کارییەکانیان جێ بەجێ دەکرێ.

**أضْرَبَ عنە**: ڕوی لێ وەرگێڕا.

**أضْرَبَ الخُبْزُ**: نانەکە برژاو پێگەیی.

**أضْرَبَ القومُ وغيرهم**: خەڵکەکە توشی ساردو سەرما بونو سەهۆڵبەندان گرتنیەوە.

**أضْرَبَ الريحُ أو البرد النباتَ**: ڕەشە باو زریانو ساردی لەگژوگیاکەی داو خراپی کرد.

ضاربه مضاربة وضِراباً: زەلامەكان لەیەكتریان دا هەریەكەیان زەبری لەوی تر یان دا ◦ لەلێدان دا بەسەریا زاڵ بوو زۆرتری لی دا.

ضارب لفلان في ماله: بەماڵو سامانی فلان بازرگانی دەكا بەرێژەیەكی تایبەتی لەقازانجو زیان دا.

ضارب في السوق: لەبازاڕدا شتی بەهەرزانی كڕیو چاوەڕوانی كرد تا نرخ بەرز بێتەوە بۆئەوەی بەنرخی بەرز بیفرۆشێتەوە، وادەبێ نرخ دادەبەزیو زەرەر دەكا.

ضَرَّبَ: زۆری لی دا، بۆ زێدە رۆیی لەمانای (ضَرَبَ)دێ.

ضَرَّبَ فلان: فلانكەس شیری تێكەڵاو لەچەن شیرە حوشترێكی خواردەوە ◦ فلانكەس توشی ساردو سەرماو سەهۆڵبەندان بوو.

ضَرَّبت عینه: چاوی بەقوڵ دا چون.

ضَرَّبَ الشيءَ بالشيءِ: شتەكەی تێكەڵ بەشتەكەی تر كرد ◦ تێكی هەڵدان.

ضَرَّبَ بین القوم: خەڵكەكەی هەڵنا بۆئەوەی بەگژیەك دا بچن.

ضَرَّبَ المُضرّبة: لێفەكەی دووری، تەریبی دا.

إضطرب: بەنارێكو پێكی جوڵایەوەو كەوتە هەڵبەزو دابەزو جنداڵ حۆو پەلە قاژە.

اضطربَ البحرُ: دەریا شەپۆلی دا.

اضطرب الأمرُ: كارەكە شێوا، لەگرێژەنە چوو.

اضطرب الشيءُ: شتەكە درێژ بوو، نەرم بوو لەرزەی كرد، دەگوترێ: (إضطرب الحبلُ بینهم): پەتی نێوانیان شل بوو ناكۆكیو كێشەیان تێكەوت.

اضطرب القومُ: خەڵكەكە لێكیان دا تێك وروژانو پێكدا هەڵپژان.

تضاربا: ئەو دوكەسە لەیەكتریان دا، دەشگوترێ: (تضاربا بكذا): بەفلان شت لەیەكتریان دا.

تضارب الآراءُ: راو بۆچونەكانیان دژ بەیەك بوو.

تَضَرَّبَ: كەوتە جمو جۆڵو سەرو خوار.

استَضرَبَ العَسَلُ: شانە هەنگوێنەكە ئەستور بوو.

الإضراب: مانگرتن، وازهێنان لەكارو پیشە.

الضَّرْبُ: هاوشانو هاوشێوە، جۆرو رەگەز ◦ لەزاراوەی عوروزدا كۆتایی تەفعیلەیە لەبەشی دووەمی نیوە شیعر ◦ (ك: أضراب وضروب وأضرُب)، دەگوترێ: (رجل ضَرْبٌ):

پیاوێــکی داڵ گۆشــتو قــەدو بــاڵا رێــکو پێــکە، کارکــەرو دەســت بــەکارە، قاڵب سـوکە لـەجێ بـەجێ کردنـی ئیشو کارەکانی دا ٥ (مطـر ضَرْبٌ): بارانی سوكو کەم ٥ (درهـم ضَـرْبٌ): دیرهـەمی سکە لـێ دراو، زیوی سکە لـێ دراو.

الضَّرَبُ: شانە هەنگوینی سپی ئەستور.

الضَّرَبَةُ: پارچەی شانە هەنگوینی سپی.

الـضَّرِبُ: شـارەزا لەلێـدان دا، راسـت هەنگێو، دەست راست.

الــضَّرِبَةُ: یــەك لێــدان، زەبرێــك پێکێشانێك ٥ تاوەگازو هەتاو بـردو نەخۆشییەکە بەهۆی لێدانی تیشکی خـۆر لەجەسـتە دا پەیـدا دەبـێ، ئەگــــەر زو فریــــای نەکــــەوی کوشندەیە.

الـضَّرُوبُ: زۆر لێـدەر، کەسێــك زۆر لێبداو لێدانەکەشی بەئێش بێ.

الضَّرِيبُ: بـەمانا (الـضَّرُوب)دێ، هـەروا بـە کەسێـکیش دەگـوترێ بـەماڵو سـامانی یەکێـکی تـرەوە بازرگـانی بکاو بەشێکی دیاریکراوی لـەقازانج دا بـدرێتێ ٥ بەوکەسـەش دەگـوترێ لـــەیاری قورمـــاردا پــــشك (قـداح)بهاوێـژێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ هاوشـانو رکەبـەر ٥ (ك: ضُـــرَباء وأضــراب) ٥ شیرێــك لەکۆمەڵێــك حوشــتر بدۆشــرێو تێـکەڵ بکـرێ لەمەنجەڵێــکدا ٥ یــان بەوشــیرە دەگــــوترێ: بەســـــەریەکدا لەحوشترەکان بدۆشرێو راستەو خۆ بکرێتــە قاپەکــەوە ٥ ســەهۆڵ، سیخوار.

الضَّرِيبَة: مێینەی (الضَّرِيب) ٥ کەسێك شمشێری لـێ درابـێ ٥ پارچـە مـو، پارچە خوری، پارچە لۆکە کە شی بکرێتـــەوەو پاشـــان بەپەتێـــك ببەســـترێو ئـــەمجار برێـــسرێ ٥ سروشـــــتو تەبیعـــــەت ٥ بــــاج کەدەخرێتـە سـەرملكو زەویو زارو داهات بۆ حیسابی میری، بەگوێرەی پاساو شوێنو کات ئەو باجە گۆڕانی بەســــەردا دێ ٥ ئەندازەیەکــــە لەبرنجو چەڵتوك ٥ (ك: ضرائب).

المضاربة: جۆرە گرێبەستو عەقدێـکە لــــەنێوان دوکــــەسو زیــــاتر دا دەبەسـترێ لایەنێـك مـاڵو سـامانی هەبێو لایەنەکەی تر کاری تێدا بکا هـەردولا هاوبـەش بـن لـەقازانج دا بەرێژەی تایبەتی ٥ لەبواری ئـابوری دا بریتییـە لـەکڕینو فرۆشـتن کـە کۆمەڵێکی پسپۆڕ لەبازاڕدا ئەنجامی دەدەن بۆ ئەوەی سود لەجودا وازیـی نرخەکان دا بکەن.

المِضرابُ: ئامێری لێدان ◦ زۆر لێدەر، یان زەبر وەشێنی کاریگەر ◦ (ك: المَضراب).

المَضْرَبُ: بەمانا (المِضراب)دێ ◦ گەورە ◦ (ك: مضارب).

المَضْرِبُ: شوێنی لێدان یان کاتی لێدان.

مَضْرِب السیف: تیزایی شمشێر ◦ (مَضرِب الرز): شوێنی کوتانی چەڵتوك ◦ شوێنی سپی کردنی چەڵتوك.

المُضَرَّبَةُ: هەر لێفەو چەرچەفێك زۆر تەریبی دورمانی تێدا ئەنجام درابێ، لێفەو پێخەفێکە دوو توێ‌و لۆکەی تێدا فەرش کرابێ‌و ئەمجار تەریبی دورومانی پێدا هاتبن‌و چوبن.

ضَرَجَهُ ضَرجاً: قەڵاشتی، دایدڕی.

ضَرَجَ النارَ: دوکەڵکێشی بۆ ئاگرەکە کرد.

ضَرَّجَ الثوبَ ونحوه: بەرەنگی سور قوماشەکەی رەنگ کرد، بەتۆخی نا بەڵکوو بەرەنگی سوری کاڵ، دەشگوترێ: (ضَرَّجَه بکذا): رەنگەکەی تێ هەڵسوو.

ضَرَّجَهُ: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (ضَرَجَهُ)دێ، دەشگوترێ: (ضَرَّجَ الکلامَ): قسەکانی رازاندنەوەو جوانی کردن.

ضَرَّجَ الدابة: وڵاخەکەی هەلینگ دا، غاری پێ کرد.

إنْضَرَجَ: دادڕا، شەقی برد، دەگوترێ: (إنضرج النور): خونچەکە پشکوت، دەمی کردەوە.

إنْضَرَجَ الشجر: درەختەکە پشکوت، چرۆی درەختەکە کرایەوە ◦ گەڵاکەی دەرکەوت.

إنْضَرَجَ الطریق: رێگاکە پان‌و پۆڕ بوو، دەشگوترێ: (إنْضَرَجَ مابینهم): نێوانیان زۆر فراوان بو.

تَضَرَّجَ: بۆ موطاوەعەی (ضَرَّجَهُ)دێ.

تَضَرَّجَ الخدُ: کوڵمەکە سور بوو، دەشگوترێ: (تَضَرَّجت المرأة): ئافرەتەکە خۆی رازاندەوە، خۆی ئارایش دا یان خۆی سفوور کردو خۆی نیشانی پیاوی بێگانە دا.

تَضَرَّجَ بالدم: بەخوێن رەنگاو رەنگ بوو.

تَضَرَّجَ الشیئ: شتەکە شەق بوو، دادڕا.

تَضَرَّجَ الزهرُ: خونچەکە پشکوت، کرایەوە.

الإضریج: رەنگی سور، قوماشی رەنگ کراوە بەرەنگی سور ◦ قوماشێکە لەئاوریشمی سور ◦ ئەسپی رەسەن‌و خۆشڕۆ ◦ (ك: أضاریج).

الضَّریجُ: رەنگ کراو، دەشگوترێ: (عَدْوٌ ضریج): بازی بەهێز.

**المِضَرَّجُ**: (ثوب مِضَرَج): قوماشی رزیوو بێ نرخ ٥ (ك: مَضَارِج).

**المَضْروجة**: دەگوترێ: (عـين مـضروجة): چاوی گەورەو کراوە.

**ضَرَحَتْ السّوقُ ضُرُوحاً**: بازاڕەکە تەپیو مامەڵەی کەم تێدا ئەنجام دەدرێ.

**ضَـرَحَ الـشيئَ ضَـرْحاً**: شـتەکەی دادڕی، شەقی کرد.

**ضَرَحَ القَبْرَ**: گۆڕی هەڵکەند.

**ضَرَحَ الشيئَ**: پاڵی بەشتەکەوە ناو دووری خستەوە.

**ضَـــرَحَ شـهادة فــلان**: شـایەتی فلاّنـــی ڕەتکردەوە، قبوڵی نەکرد.

**أضْـرَحَهُ**: دوری خـستەوە ٥ دایوەشـاندو تێکی داو خراپی کرد.

**أضْـرَحَ الـسوقَ**: بـازاڕی خـست، جـمو جوڵی تێدا کەم بوو.

**ضَارَحَهُ**: جنێوی پێ دا، تانوتی لـێ دا ٥ بەرەنگاری بۆوە، هاوشانی کرد.

**إضْطَرَحَهُ**: فرێی دایە قوژبنێکەوە.

**إنْضَرَحَ**: بۆ موطاوەعەی (ضَرَحَه)دێ.

**ضَـراحِ**: اسـم فعـل، بـەمانا فـەرمان دێ، واتە بەمانا (إضرح)دێ.

**الـضَّرَحُ**: دەگـوترێ: (نیــة ضَــرَح): مەبەستی دوور.

**الـضَّروحُ**: بـۆ زێـدە ڕۆیـی لـەمانای (ضَــارِح)دێ، دەشـگوترێ: (قــوْسٌ ضروح): کەوانێـکی تونـدو بـەهێزە بەتـەوژم تیرەکە فـڕێ دەدا ٥ (فـرس ضروح): ئەسپی سەرکەش.

**الضَّريحُ**: بەمانا (المضروح): دێ، واتـە دورکەوتە ٥ گۆڕو ئارامگا ٥ گۆڕیـچە ٥ (ك: ضرائح).

**الـضَّريحة**: بـەمانا (الـضريح)دێ ٥ (ك: ضرائح).

**المَضْرَحُ**: هەڵۆ، بازی باڵ درێژ.

**المَضرِحيُّ**: بەمانا (المَضْرَح) دێ ٥ گـەورە پیــاوو خانــەدانو پیــاو مــاقوڵو وەجاخزادە.

**ضَرَّهُ وبه ضراً وضَرَراً**: زیانی پێ گەیانـد، خراپەی لەگەڵ کرد.

**ضَـرَّ فلانــاً الى كـذا**: پـاڵی بەفلاّنـەوە نـاو ناچاری کرد بۆئەوە.

**أضَرَّت المرأةُ**: ژنی بەسەر ژنەکەی هێنا.

**أضَـرَّ فـلان علـى الـسير الـشديد ونحوه**: فلاّنکەس بەصەبر بـوو پشوو درێـژ بوو.

**أضَرَّ على فلان وبه**: زیـانی بەفلاّنکـەس گەیاند.

**أضَرَّ فلاناً على الأمر**: فلاّنکەسی ناچار کردو بەزۆر ئەوەی پێ کرد.

**ضَارَّهُ مَضَارَّةً وضراراً**: زیانی پێ گەیاند، تـەنگی پـێ هەڵـچنی ٥ سەرپێـچی کرد.

اضطره اليه: ناچاری کرد بۆئەوە ٥ شێخ
رەزای تاڵەبانی دەڵێ:
ئەو قەحبە ژنە موحتاجی کردم
موحتاجی رەشی رەشیدی کردم
قورئان دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾.

تضارّا: یەکێك لەدووەکان زیانی بەوی تر گەیاند ٥ هەردوکیان زیانیان پێ گەیی.

تَضَرَّرَ به أو منه: بەهۆی ئەوەوە توشی زیان بوو یان لەوەوە زیانی پێ گەیی.

إستضرّ به: بەهۆی ئەوەوە توشی زیان بوو.

الضَّارة: زیان؛ کەمکردن لەماڵو سامان دا، یان کەمکردنی کۆمەڵ ٥ کوێری.

الضُّرُّ: حاڵو وەزعی خراپ، هەژاری نەداریی ٥ نەخۆشی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مَسَّنَا وَأَهْلَنَا الضُّرُّ﴾، دەشگوترێ: (تزوج فلان على ضرٍّ): فلانکەس هەوێی بۆ ژنەکەی پەیدا کرد ٥ زیانی بەژنەکەی گەیاند بەوە کە ژنی بەسەر هێنا.

الضِّرُّ: بەمانا (الضُّر)دێ، دەشگوترێ: (هو ضِرُّ اضرار): ئەو بەڵای بەڵایانە، ناخۆشی ناخۆشییانە ٥ یان بەڵایەکی زیرەکە باش نێچیری خۆی دەدۆزێتەوە.

الضَّرَرُ: تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی ٥ نەخۆشییەك ببێتە بیانوو عوزر بۆ نەچون بۆ جیهاد ٥ ئیفلیجی ٥ هەر حاڵەتێك زیانبەخش بێ.

الضَّرَّةُ: بەمانا (الضَّرَّاء): دێ ٥ هەوێسار ٥ یەکێك لەژنەکانی پیاوێك زیاد لەژنێکی هەبێ ٥ (ك: ضرائر)، دەگوترێ: (بینهم داء الضّرائر) ٥ نەخۆشی هەوێساریی کەوتۆتە ناویانەوە ٥ حەسودیو رقو کینە کەوتۆتە ناویانەوە ٥ بنکی گۆی مەمك ٥ ماڵی زۆر ٥ سنگی بەرەپێ ٥ زەقایی بەرەپێ.

الضَّرورة: پێویستیو ناچاری ٥ تەنگانەیەك چاری نەبێ ٥ نارەحەتیو تەنگژە ٥ لەبواری شیعردا ئەو حاڵەتەیە کەشاعیر بۆی رەوایە هەندێ وشە بەشێوەیەکی نایاسایی بەکاربێنێ بەجۆرێك کە بۆ پەخشان نووس رەوانییە ٥ (ك: ضرائر).

الضَّروريّ: شتی پێویست ٥ هەرشتێك بونی پێویست بێو نەبوونی نەگونجێ.

الضَّرير: زیان لێ کەوتوو ٥ کوێرو نابینا ٥ غیرەتو ناموس، دەگوترێ:

(ما أشدّ ضريره على زوجه): زۆر چاودێری ژنەکەی دەکا، دڵی لەژنەکەی پیسە ○ (ك: أضِراء).

**المِضْرَارُ**: سرك، چەموش ○ تەڕ دەماخ و دڵ تەڕ.

**المَضَرَّةُ**: زیان، زەرەر ○ (ك: مضار).

**ضَرَسَ الشيءَ ضَرْساً**: گازی لەشتەکە گرت ○ قەپاڵی لێ گرت، دەگوترێ: (ضَرَسَ العودَ): بەددان دارەکەی گرتووە.

**ضَرَسَ الزمانُ فلاناً**: رۆژگار بۆ فلانکەس خراپ بوو، ستەمی لێ کرد.

**ضَرَسَ البئر**: بەبەرد بیرەکەی هەڵچنی.

**ضَرِسَ الدابةَ**: لوتەوانە یان (دەمبێن)ی لەدەمی ئاژەڵەکە شەتەك دا بۆئەوەی ژێرباری بکا.

**ضَرِسَت أسنانه ضَرَساً**: ددانی بەخواردنی شتی ترش و مزر ئاڵ بوون ○ کول بوون.

**ضَرِسَ فلان**: فلانکەس سەر ڕەق و چەموش و شەڕانی بوو.

**أضرسه الحامض**: شتی ترش و مزر ددانی ئاڵ کردنەوە ○ ددانی کرموڵ کردن.

**أضْرَسَ بالكلام**: بەقسە بێ دەنگی کرد.

**أضْرَسَ الأمر فلاناً**: کارەکە فلانی خستە دڵە ڕاوکێوە.

**ضارسَ الأمور مضارسة وضِراساً**: کارەکانی پشکنین و بەتاقی کردنەوە، فێری ئیشەکان بوو.

**ضَرَّسَه**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (ضَرَسَ)دێ، چرچ و لۆچی لەشتەکە پەیدا کرد.

**ضَرَّسَ الشوبَ**: وێنەی ددانی لەقوماشەکەدا دروست کرد ○ بەوێنەی ددان قوماشەکەی رازاندەوە.

**ضَرَّسَته الحروب**: شەڕو جەنگی هەمە جۆر فلانکەسی لەبوتەداو قاڵی کرد.

**تضارس البناءُ ونحوه**: باڵەخانەکە رێك و پێك دروست نەکراوە ○ دیوارو شێوەکەی لەبارو ئەندازیاری دروست نەکراون ○ خوارو خێچ و بەرزی و نزمی تێدایە.

**تضارس القومُ**: خەڵکەکە کێشەو هەرایان تێکەوت و بوو بەهەرایان، دوژمنایەتییان کەوتە ناوەوە.

**تضرّس البناءُ**: بەمانا (تضارس)دێ.

**التضريسُ**: پەیداکردنی قۆرت و پێچ و بەرزی و نزمی لەقەبارەدا ○ لەشێوەی بەرزی و نزمی ددان ○ (ك: تضاريس).

**تضاريس الأرض**: تەپۆلکەو بەرزی و نزمی سەر ڕوی زەوی.

**الضِرْسُ**: ددانی هاڕەر ○ خرێ ○ هەروا ناوە بۆ ئامێری ئاو دابەشکردن و ئاو دەرهێنان ○ (ك: أضراس وضروس).

**ضرس العقل**: یەکێك لەو چوار ددانەی دەکەونە کۆتایی ریزی ددانەکان، لەپەندی پێشینان دا هاتووە (هو لایعض في العلم بضرس قاطع): زانیارییەکانی باش کۆنترۆڵ نەکردووەو ئیشو کاری رێكو پێك نەکردوە ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو جۆرە بەردەی بیری پێ هەڵدەچندرێ ٥ درکە شاخو بەرزو نزمی سەرو بەری زەوی کەوەکوو ددان بەرزو نزمییان تێدا بەدی بکرێ، دەگوترێ: (رجل ضرس): پیاوێکی رەقو زبرە، تەبیات توندو تورەیە ٥ بارانی وردو کەم، تاوە بارانی نەرم.

**الضَّروسُ**: گازندە، سەرکەش، رەوشت بەد، دەگوترێ: (ناقة ضروسة): حوشترێکی بەد خووە گاز لەشیر دۆشەکەی دەگرێ، یان هەرکەسێ لەبێچووەکەی نزیك بێتەوە پەلاماری دەدا ٥ (حرب ضروس): شەڕی کاولکارو خوێناوی.

**الضَّریسُ**: تەرزەو سەرماو بەفر ٥ جۆرە درەختێکە لەزەوی شێدارو تەڕدا دەروێ تەمەنی درێژە، لەئەورووپاو هەندێ وڵاتی تری هەواسازو موعتەدیل دەروێ ٥ بیری هەڵچنراو بەبەرد ٥ هەر باڵەخانەیەك بە بەرد دروستکرابێ ٥ بەردی سوچدارو تورکە تورکە.

**المضروسة**: زەوییەك بەردی تورکە تورکەو سوچداری وەکوو ددان تێدابن.

**ضَرَطَ ضَرْطاً**: تری کەند ٥ (فهو ضروط وضرّاط).

**ضَرِطَ ضَرَطاً**: بەمانا (ضَرَطَ)دێ.

**أضْرَطَهُ**: تری پێ کەند ٥ یان کاری قورسی پێ ئەنجام دا تاوای لێ کرد تر بکەنێ.

**أضرَطَ بە**: بەگاڵتە جرتی بۆ لێ دا، جرتی بۆ داکوتا ٥ گاڵتەی بە ئیشەکەی یان بەقسەکەی کرد.

**ضَرَّطَ**: بەمانا (ضَرَطَ)دێ.

**ضَرَّطَ فلاناً وغیه**: تری بەفلانکەس کەند ٥ تری پێ لێ دا.

**ضَرَّطَ بە**: بەمانا (أضْرَطَ)دێ ٥ عەرەبەکان بەعەمری کوڕی هیندیان گوتوە (مُضرِّط الحجارة): چونکە ئەوەندە ئازاو چاونەترسو بەهێز بووە ٥ بەکوردی خۆمان دەڵێین فلانکەس ئەوەندە وایەو وایە بەرد دەکا بەئاو.

**الضُّرّاطُ**: تر ٥ (الضِرَوْطُ): بەمانا (الضُّرّاط)دێ.

**ضَرَعَ الرضیع ضُروعاً**: شیرە خۆرەکە مەمکی دایکی مژی.

رضعت الشمسُ ونحوها: خۆر لەئاوابوون نزیك بۆوە.

رَضَعَ الحیـوانُ: گیانلەبەرەكە كـزو لاواز بوو.

رَضَعَ الیه وله: گەردنكەچی بوو ٥ داوای لـێ كرد شتێكی بداتێ.

رَضِعَ ضَرَعاً وضـراعة: كـزو لاواز بـوو ٥ (فهـو ضَـرِعٌ وأضْـرَعٌ وهـي ضَـرِعة وضرعاء).

أضـــرعَت الأنثـى: مێینەكـە مـەمكی خڕكرد، گوانی دەركەوت.

أضرعت الحاملُ: سكپڕەكە پێش ئـەوەی بێچوەكەی لـێ بێتەوە گوانی گـەورە بوون، ئافرەتەكە پێش منـداڵ بـوون مەمكی زل بوون.

أضرع فلاناً:وای لە فلان كرد ژێرباری بێ.

أضْـرَعَ الله خـدهُ: خـودا زەلیـلو بـێ دەسەلاتی كرد.

أضْرَعَ لفلان مـالاً ونحوه: مـاڵی بەخشی بەفلان، یان شتی تری دایە.

تـضرع الیـه ولـه: گەردنكەچـی بـوو، ژێرباری بوو.

تـــضرع الی الله: لـــەخودا پاڕایـــەوە، لالایـــەوە ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا﴾.

الـضَّارِعُ: تەمـەن بـچوك ٥ دەگـوترێ: (خـد ضـارِع وجنـب ضـارِع) نـزاو پاڕانەوەكار، لەخودا تـرس ٥ (جـسم ضارِع): جەستەی لاواز.

الضَّرْعُ: گۆی مـەمك، گۆی گـوان ٥ (ك: ضــروع)، دەشـگوترێ: (مالــه زرع ولاضـرع): هیـچی نیـە، بـێ كـشتو كاڵو مەڕو ماڵاتە.

الضِّرْعُ: هاوشان ٥ (ك: ضُرُوعٌ).

الـضَّرْعاءُ: مـەمك زل ٥ گـوان گـەورە ٥ (ك: ضُرْعٌ).

الـضُّرُوعُ: بـەمانا (الـضَّرْعاء) دێ ٥ (ك: ضُرُوعٌ).

الـضَّرِیعُ: دەگـوترێ: (شــاة ضــریع): مەڕێكە گەڵو گوانی جوانو رێـكو پێكــە ٥ گیــاو گــژی وردكـــراو هەنجنـدراو ٥ پـزدان ٥ (عەوسـەجی تـەڕ): جـۆرە ڕوەكێـكی دڕكاوییـە بەڕێــكی هەیــە وەكــوو شــیلان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾.

الُمــضَارِعُ: بــەلای نەحوییەكانـــەوە بریتییە لـە فیعلێـك لـەپێش فیعلە (ماضییەكەوە)یەكێ لەپیتە زێدەكان (أن،ی،ت)هـــەبێ ٥ بەحرێـــكە لەبــەحرەكانی شــیعر كێــشەكەی ئەوەیە دوجار (مفاعیلن فاعلاتن).

ضرغمت الأبطالُ: پاڵەوانەكانی شێرئاسا

جولانەوە، کاری شێرانەیان ئەنجام دا، هەڵمەتو پەلاماردانیان شێرانە بون.

**تـــضرغمت الأبطـــال:** بـــەمانا (ضرغمت)دێ.

**الـضِّرْغام:** شـێری بەهەڵمـەتو تێـك شکێنەر ◦ ئازاو چاونەترس.

**الضِّرْغَمُ:** بەمانا (الضِّرْغام)دێ.

**ضَـرُك ضَـراكةً:** هـەژارو داماو بـوو، خۆی دارِشـتو دەسـتو مەچـەکی قـەویو چوارشانە بوو ◦ ئەحمەقو گێل.

**الضُّراك:** چوار پەل قەویو چوارشانەو دامەزراوو دەمار گشت ◦ (ك: ضراكاء وضرائك).

**ضَرِمت النار ضَـرَماً:** ئاگرەکە بڵێسەی لـێ هەڵسا.

**ضَـرِمَ فـلان:** فلانکەس زۆر رقـی هەڵسا، زۆری برسی بو.

**ضَرِمَ الشيئُ:** گەرماکەی بەهێز بوو.

**ضَرِمَ فلان في الأمر:** کۆششی کردو پەلەی کرد.

**ضَرِمَ في عـدوه:** لەبازدان دا پەلـەی کـرد ◦ (فهو ضرِم وضارم).

**أضْرَمَ النار:** ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

**أضْـرَمَ الـشيئَ:** شـتەکەی والـێ کـرد گڕبگرێ.

**ضَـرَّمَ النـار ونحوهـا:** زێـدە ڕەوی کـرد لەئاگر هەڵگیرسان دا.

**اضـطرمت النـارُ:** بـەمانا (ضَـرِمت)دێ، دەگـوترێ: (اضـطرم الـشرُّ والحـرب بيـنهم): شـەڕو ئـاژاوە لـەناویان دا هەڵگیرسا.

**اضطرم الـشيبُ في الـرأس:** مـوی سپیو پیری بەسەری دا بڵاو بۆوە.

**تَـضَرَّمت النـار:** ئاگرەکـە هەڵـگیرسا، دەشگوترێ: (تضرّم عليه غضباً): رقی لـێ هەڵسا.

**استَـضْرَمَ الحـبُّ ونحـوه:** دانەوێڵەکـە پێگەییو کاتی ئەوەی هات بەئاگر ببرژێندرێ.

**الضِّرام:** هەڵگیرسانی ئـاگر، هەرشتێـك لەچـیلکەو چـەوێڵو شـتی وا کـە ئاگری پێ خۆش بکرێو زو بسوتێ.

**الـضُّرْمُ:** روەکێـکە دەشـتەکی، بەرێـکی هەیـە وەکـوو بـەڕو وایـە سـوری مەیلەو رەشـە، گوڵێـکی سپی وردی هەیە، بـۆنی خۆشـە، دوکەڵەکەشـی بـۆنی خۆشـە، لـەزۆر شـوێنی وڵاتـی لوبنان دەڕوێ.

**الضَّرَمُ:** بەمانا (الضِّرامُ)دێ، خودی ئاگر ◦ لقـە دارخورمـاو شـتی تـر کـە پرژەکانی ئاگریان پێوە بێ.

**الضَّريم:** حەریق، سوتێنەر ◦ سوتاو.

**ضَرَّ العرق أو الجرح ضَرْواً وضُرُوراً:** دەمارەکە یـان برینەکـە خـوێنی لـێ هـاتو ناوەستێ.

**ضَـوَّ الإنـاءَ**: قاپەكـە شـلەمەنیەكەی تـێ نەوەستاو هەمووی لـی هاتە خوار.
**ضَـرَا فـلان وغـیره**: فلان خـۆی شـاردەوە ٥ (فهو ضارٍ).
**ضَرِيَ العرق ونحوه**: بەمانا (ضَرَا)دێ.
**ضَرِيَ ضَرَاً وضراءً وضراوةً**: پـەرەی سـەند، توند بوو.
**ضَرِيَ به او علیه**: وەگری بوو، خوی پێوە گـرت ٥ سـامی لـێ شـكاو هەڵیكوتایـە سەری.
**أضـرَّاه**: وای لــێ كـرد وەگـری بـێ ٥ لەخشتەی برد.
**ضَرَّه**: زێدە ڕەوی كرد لـەوەگری بـوونی دا، لەخلیسكانی دا.
**إستَـضْرى الـصيدَ ونحـوه**: نێـچیرەكەی هەڵخەڵەتانـــد بـــەخۆی نـــەزانی تافرسەتی لـێ هێنا.
**الضاري**: سەگی ڕاهێندراو لەسـەر ڕاو ٥ دڕندەیـەك زۆر گۆشـت خۆربـێ ٥ ئاژەڵی ناسایی كە لە لەوەڕگای خۆی دا بلەوەڕێ ٥ (ك: ضوارٍ).
**الضَّراءُ**: دەشتی بێ درەخـت و ئـاوەدانی ٥ زەوییەك درەختی تێدابێ و دڕندە خۆیـانی تێـدا حەشـار بـدەن ٥ هـەر درەخـــت و گـــزو گیایـــەك زەوی داپۆشێ.
**الـضِّرْوُ**: بـەمانا (الـضاري)دێ ٥ توتكـە سەگ و شتی وا.
**الضِّريُ**: دڕندەو سەگ.
**ضَزَنَه ضَزناً**: دەسـتی گـرت بەسـەر ئـەو شتەی كەلەژێر دەستی دایە.
**تـضازنا**: شـتیان دا بەیـەكترو بەسـەر یەك دا زاڵ بوون.
**الـــضَّيْزَنُ**: هەركەسێـــك لەكارێـــك دا تەنگ بەیەكی تـر هەڵبچنێ، ببێتـە پـــواز بـــۆی ٥ كـــونی خولخولۆكـــە گەورەبێ، ئەمجار پوازی لـێ بـدرێ ٥ حەدیث گێڕەوەی بتمانە پێـكراوو زەبین رون.
**ضَعْضَعَ البنـاءَ**: باڵەخانەكەی روخانـد تالەگەڵ زەوی تەختی كرد.
**ضَعْضَعَ الرجلَ**: پیاوەكەی بێ هێـز كـرد ٥ زەلیل و ژێر باری كرد.
**تَضَعْـضَعَ جـسمهُ**: جەسـتەی بـەهۆی نەخۆشی و خەم و خەفەت لاواز بوو.
**تَضَعْضَعَ ماله**: ماڵ و سامانی كەم بوو.
**تَضَعْـضَعَ بـه الـدهرُ**: ڕۆژگـار زەلیـل و داماوی كرد.
**الضَعْضَاعُ**: كەسێك لەهەموو شتێك دا زەعیف و لاواز بێ ٥ پیـاوی بـێ بیرو بۆچـون، گێـل و نـەفام ٥ بـێ ورەو ترساو لەشت.
**الضَعْضَعُ**: بەمانا (الضَعْضَاع)دێ.
**ضَعَّ الجملَ ونحوه ضَعّاً**: حوشـترەكەی ژێـر

باركرد ◦ یان دەنگی حوشترەكەی دا پێی گوت (ضَـعْ)بۆ ئـەوەی ئـارام بگرێ.

ضَعَفَ الشيءَ ضَعْفاً: شتەكەی كرد بەدوو چەندانە.

ضَعَفَ القومَ: ژمارەی خەڵكەكەی زۆر كرد.

ضَعُفَ ضَعْفاً: كزو لاواز بوو ◦ نەخۆش كەوت ◦ هێزی نەما ◦ تەندروستی فەوتا.

ضَعَفَ الشيءُ: شتەكە زیادی كرد.

أضْعَفَ الرجلُ: پیاوەكە ماڵو سامانی زیادی كرد ◦ وڵاخەكانی كزو لاواز بوون.

أضعَفَ الشيءَ: شتەكەی زیاد كرد، دەشگوترێ: (أضعَفَ له الودّ).

أضعَفَ القومَ: بەخششو عەتای بۆ خەڵكەكە زیاد كرد.

أضعَفَ الرجلَ: پیاوەكەی زەعیف كرد.

ضَاعَفَهُ: بەخششو عەتای بۆ زیاد كرد.

ضَعَّفَهُ: بەمانا (أضعَفَ)دێ.

ضَعَّفَ الحديثَ أو الرأيَ: حەدیثەكە یان رایەكەی بەلاواز دانا.

ضَعَّفَ الشيءَ: شتەكەی دوو توێ یان دولۆ كردەوە.

تضاعَفَ: بۆ موطاوەعەی (ضاعف)دێ ◦ بوو بەدوو چەندانەی خۆی.

استَضعَفَهُ: بەزەعیفو لاوازی دانا ◦ زەلیلی كرد.

التضاعیف: (تضاعیف الشيء): ئەوەی لەشتەكە دو لۆ بۆتەوە.

تضاعیف الكتاب: پەراوێزو نێوان دێرەكانی كتێب.

الضِّعْفُ: دوچەندانە لەقەبارە یان لەژمارە، یان ئەوشتەی كە دو توێ یان دولۆ دەكرێتەوە.

أضعاف الكتاب: پەراوێزو نێوان دێڕی كتێب.

أضعاف الجسد: ئەندامی جەستە، یان ئێسقانی جەستە.

الضُّعفانُ: لاواز ◦ (ك: ضعافی).

الضَّعْفَةُ: دڵ كزی، كەودەنی ◦ نازیرەكی.

الضَّعوف: زۆر كزو لاوازبێ ◦ دڵی زۆر بێ هێز بێ ◦ (ك: ضُعفٌ).

الضَّعیف: نافرەتو كۆیلە ◦ (ك: ضِعاف وضُعَفاء).

المُضَاعف: وشەیەكە ئەگەر سێ پیتی بوو دووەمو سێیەمی لەیەك جۆربن وەكوو (شَدَّ، مَدَّ) ئەگەر چوار پیتی بوو ئەوەیە پیتی یەكەمو سێیەمیو دووەمیو چوارەمی لەیەك جۆربن وەكوو (زلزل، قهقه).

المضاعَفَةُ من الدروع: زرێیەكە حەلقەكانی دوو دوو چەندرابن.

**المُضَعَّفُ**: بەمانا (المضاعيف)دێ.
**المُضَعَّفَةُ**: (أرض مُضَعَّفَةٌ): زەوییەك بارانی کەمی لێ درابێ.
**الضُّغْبُوسُ**: خەیاری ورد ◦ بێچوه ڕێوی ◦ (ك: ضَغَابِيسَ).
**ضَغَثَ الحشيش وغيره**: چیلکەو چەوێڵەکەی کردە گورزەو باقە.
**ضَغَثَ الأشياءَ**: شتەکانی تێکەڵ کردن ◦ تێکەڵو پێکەڵی کردن، دەگوترێ: (ضَغَثَ الحديثَ): قسەکەی تێکەڵو پێکەڵ کرد.
**ضَغَثَتِ المرأةُ شعرها**: ئافرەتەکە بەدەستی قژەکانی شتو پاکی کردنەوە، هەوڵی دا ئاو بگاتە بنکی قژەکانی.
**ضَغَثَ الشيءَ**: دەستی لەشتەکە داو بەدەست پشکنی.
**أضْغَثَ الحالمُ الرؤيا**: خەو بینەکە خەوەکەی گێڕایەوە بەشێوەی تێکەڵو پێکەڵ.
**ضِغْثُهُ**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای (ضَغَثَ)دێ.
**الضُّغَاثَةُ**: کاڵای پەرپوتو بێ نرخ.
**الضِّغْثُ**: گورزە شۆڕكو چیلکە ◦ هەرشتێك چنگی پیا کرابێ ◦ گورزە شۆڕك کەپڕ بەدەست بێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ﴾ ◦ (ك: أضغاث) ◦ دەگوترێ: (أتانا بأضغاث من أخبار): هەواڵی تێکەڵو پێکەڵی هێنانە پێشەوە.
**أضغاث أحلام**: خەونی پڕو پووچ، کەمانای بۆ نەکرێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ﴾ ◦ لەپەنددا هاتووە (ضِغْثٌ على إبالة): بەلا لەسەر بەلا.
**ضَغْضَغَ الأدردُ اللقمةَ**: بێ ددان پاروەکەی جوو ملچە ملچی لێ هێنا.
**ضَغْضَغَ اللحمَ في فيه**: بەباشی گۆشتەکەی نەجوی.
**ضَغْضَغَ الكلامَ**: قسەکەی جوان دەرنەخست.
**ضَغَطَهُ ضَغْطاً**: پاڵەپەستۆی دا، پەستاوتی.
**ضَغَطَ الكلام**: قسەکەی زۆر گوشیو کورتی کردەوە.
**ضَغَطَ عليه في غرم**: تەنگی پێ هەڵچنی ◦ زێرباری کرد، زۆری لێ کرد.
**ضاغَطَه مضاغَطةً وضِغاطاً**: پەستاوتی، تەنگی پێ هەڵچنی.
**تَضَاغَطَا**: هەریەکە لەو دوانە تەنگی بەوی تر هەڵچنی.
**الضاغط**: چاودێرو پارێزەری شت ◦ (ك: ضواغط).

**الضّاغطةُ**: ئامێرێکە لۆکەو شتی وای پێ دەپەستێو ترێ.

**الـضَّغْط**: (ضَـغْط الـدم): ئـەو پاڵـە پەستۆی خوێنەیـە کە شەپۆلەکانی خـــوێن لەســـــەر دیوارەکـــــانی خوێنبـــەرەکان پەیـــدای دەکـــەن ٥ لـەزانیاریی مەسـاحەدا ئـەو هێـزە پەســـــتاوتنەیە کـــــە بەشـــێوەی عـەموودی دەکەوێتـە سـەر بەشێـك لەمەساحەکە.

**الـــضَّغْط الجــوي**: ئــەو پەســـتاوتنە هەواییەیـــە کەلەســـــەر خاڵێـــکی دیـاریکراو بـەهۆی ئـەو قورساییەی کۆڵەکەی هـەوایی لەسـەر ئـەو خاڵە پەیدای دەکا.

**الـــضُّغْطَةُ**: تەنگـــە بـــەری، تەنگانــــە ٥ جەڕاندن ٥ ژێربارکردن.

**الـــضُّغْطَةُ**: تونـــدو تیـــژیو ناخۆشـــی ٥ ئینکـاریو کێـشەو نیزاعـی نێـوان قـەرزارو خـاوەن قـەرز کـە قـەرزدار هـــەوڵ دەدا هەنـــدێ لەقەرزەکـــەی لەسەر دابشکێ.

**الضّغيط**: پیاوی بێ بیرو راو بۆچون ٥ بیرێـــك ئاوەکـــەی گۆڕابـــێو دزەی کردبێ بۆ بیرێکی جیرانی ٥ یان بـە بیرێـــــك دەگـــوترێ لەنزیکیـــــەوە بیرێـــکی تـــر لـــێ درابـــێو کـــاری کردبێتـە سـەر نـاوی ئـەوو کـەمی کردبێ ٥ (ك: ضَغطى).

**المَــضْغط**: زەوی چـاڵ کـەئاوی تێـدا بومستێ ٥ (ك: مضاغط).

**ضَـغَمه وبـه ضَـغْماً**: بـەدەم بەتونـدی گەستی، دەشگوترێ: (ضَغَمَهُ الفقـرُ): هەژاری چەوساندویەتیەوە.

**أضْغَمَ الفمُ**: دەم لیکی زۆر بوو.

**الضّغامَةُ**: ئـەو پاروە جوراوەیـە لـەدەم فڕێی دەدەیە دەر.

**الـــضَّيغم**: شـــێری شـــەویلەپان ٥ (ك: ضياغم وضياغمة).

**ضَغِنَ العود ضَغْناً**: دارەکە خوار بوو.

**ضَـغِنَ الدابـة**: وڵاخەکـە چـەموشو سـەر ڕەق بوو نەهاتە ژێربار.

**ضَغِنَ اليه**: حەزی لێ کرد.

**ضَغِنَ عليه**: رقـی لـێ بـوو، زۆری نـاخۆش ویست.

**ضَغِنَ صدرُهُ**: دڵـی پـڕ بـوو لـەقارو کینـە ٥ (فهو ضَغِن وضاغِنٌ).

**ضَـاغَنَه**: بـە حیقـدو کینـە بەرامبـەری کرد ئەویش وەکوو لـەدڵدا ناخۆشی ویست.

**إضطَغَنَ القوم**: خەڵکەکە دڵیان لەیەکتر کرمێ بوو، یەکتریان ناخۆش ویست.

**إضْـطَغَنَ فـلان علـى فـلان**: فـلان رقـی لەفلان بوو.

**إضْطَغَنَ بالثوب**: بەقوماشەکە دایپۆشی.

تضاغنا: ئەو دووە هەریەکەیان رقی لەوی تر بوو.

الضَّاغِنُ من الخيل ونحوها: ئەسپێك بەلێدان نەبێ غار نەدا.

الضِّغْنُ: حیقدو کینەی تەواو پەرە سەندوو، دەگوترێ: (سَلّ ضِغن فلان): فلانکەس رازی بکە ٥ مەیل‌و حەزو ئارەزو، دەگوترێ: (ناقة ذات ضغن): حوشترێکە بۆ کونە زای خۆی دەکورکێنێ ٥ (ك: أضغان) ٥ (مجمع الأضغان): دڵ‌و دەروون.

الضَّغون: ئەو ولاخەیە کەدەڕوا دەڵێی پاشەو پاش دەکشێتەوە ٥ (ك: ضُغُنٌ).

الضَّغينة: قین‌و قاری زۆر، رقی لەرادەبەردەر ٥ (ك: ضغائن).

ضَغَا القِطُّ ونحوه: پشیلە یان سەگ‌و رێوی‌و گورگ‌و مار لەبەر ئازاری جەستەیان دەنگیان لێ دی.

أضغاه: وای لێ کرد بفیشکێنێ، بقورسکێنێ، بلورێنێ، بواقێنێ.

ضَغَاهُ: بەمانا (أضغاه)دێ.

تضاغى القِطُّ: پشیلەکە میاواندی.

تضاغت الثريدة: کەشکەکەکە لەبەر چەوری‌و تێکەڵی بەچەوری کەبەکەوچك تێکی هەڵدەدەی دەنگی لێوەهات.

الضاغية: هەرگیاندارێك بەهۆی ئازارێك دەنگی بێ ٥ بقۆڕێنێ، بناڵێنێ، بفیشکێنێ، بقورسکێنێ، بلورێنێ، ..هتد.

ضفدع الماءُ أو المكان: ئاوەکە یان شوێنەکە بۆقی زۆربوون.

الضُّفْدَعُ: بۆق ٥ (الضِّفْدِع): بەمانا (الضُّفدع)دێ.

ضَفَرَ ضَفْراً: بازی دا، خۆی هاویشت.

ضَفَرَ الشعرَ: قژەکانی بەسەریەك دا هۆنینەوە یان کردنیە سێ پرچ.

ضَفَرَ الحبل أو الخيطَ: حەبلەکە یان دەزوەکەی بادا.

ضَفَرَ البناء: دیوارەکەی بەوشکە کەڵەك هەڵچنی یان بەردەکانی تێك هەڵکێش کردن.

ضافَرَهُ عليه: یارمەتی دا بۆئەوەی بەسەری دا زاڵ ببێ.

ضَفَّرَهُ: بۆ زێدەرۆیی لەمانای (ضَفَرَهُ)دێ.

إنضفر الحبلان: حەبلەکان تێك هاڵان.

تضافَروا عليه: یارمەتی یەکتریان دا ٥ لەدژی ئەو یەکتریان گرت ٥ هەریەکەیان یارمەتی ئەوی تری دا.

الضِّفارُ: گوریسی موو کەحوشتری پێ ببەسترێتەوە ٥ پەتکە حوشتر ٥ (ك: ضُفُرٌ).

الضِّفْرُ: بەمانا (الضّفار)دێ ٥ پشتێن ٥ هەرپارچە مویەك بە جیا بادرابێو هۆنـدرابێ ٥ كۆمەڵە لمبی گـەورە ٥ (ك: ضفور وأضفار).

الضَّفِيُ: موی بادراو، پرچی هۆنراوە.

ضَفِيرُ البحر: قەراخی دەریا.

الضَّفِيرَةُ: هەر كۆمەڵە مویەك بادرابێ یـان هۆنـدرابێ ٥ دیـوار كەلەسـەر رۆخی دەریا یان چۆم دروستكرابێ ٥ (ك: ضفائر وضُفُر).

ضَفَزَ ضَفْزاً: بازی دا، خۆی هەڵدا.

ضَفَزَ الشيءَ: شتەكەی بەدەست یان بـەقاچ هاویشت، دەشكوترێ: (ضَـفَزَ اللجـام أو العلـف في فـم الفـرس): لغاوەكـە یـان ئالیكەكـەی هەڵدایـە نـاو دەمـی ئەسپەكەوە.

ضَـفَزَ الحیـوانَ: ئـالفی دا بـە ولاغەكـە ٥ ئالیكو جۆی دایە ٥ زەختـی لـێ كـرد ئالیكەكە قوت بدا.

اضْطَفَزَ الشيءَ: بەزۆر شتەكەی قوت دا.

الضَّفَزُ: جۆ یان هەرشتێكی تر بكرێتـە ئالیـكو وردبكـرێ یـان بهـاڕدرێ ئەمجار بخوسێندرێ بۆئـەوەی بـدرێ بەولاغەكە.

الضَّفَّازُ: فیتنەو ئاژاوە گێڕ.

الضَفِيزَةُ: جۆی وردكراوو خوسێنراو بۆ ئالیك، یان هەرشتێكی تر لەو جۆرە ٥ پاروی گەورە.

ضَفَّ القومُ علی الشَّیْءِ ضَـفّاً: خەڵـكەكە كۆبونەوەو پاڵە پەستۆیان كرد.

ضَـــفَّ المـــصطلي: خۆگـەرم كەرەوەكـە پەنجـەكانی جـوت كـردنو لەئاگرەكـە نزیكی كردنەوە.

ضَفَّ الشيءَ: شتەكەی كۆكردەوە.

تـضافّوا علـی الـشَّیْءِ: لەسـەر شـتەكە كۆبونـەوەو پاڵەپەسـتۆیان كـرد یـان زۆر كۆبونەوە ٥ ماڵو سامانیان كـەم بوو.

الضَّفُّ: دەگوترێ: (رجل ضَـفّ الحـال): پیاوێـكە وەزعو حاڵی سادەیە.

الـضُّفُّ: تەتڵە میرە؛ پێڕۆیـەكی فـرە قاچـە، رەنگـی خـۆڵینی هەیـە كەپێـست دەگـەزێ خوروەكـەی دەتەنێتەوە ٥ (ك: ضَفَفَةٌ).

الضِّفَفُ: تەنگانەو گوزەرانی نـاخۆش ٥ خواردنێك نەگاتە رێژەی تێربـوون ٥ بخـۆری زۆرو خـواردنی كـەم ٥ خێزانـی زۆرو دەسـتو پێوەنـدی قـەرەباڵغ ٥ گردبوونـەوەی خەڵـك یان حـەیوانی تـر لەسـەر ئـاوو شـتی تر ٥ هەرشتێك پێوەرەكە پڕنـەكا ٥ هەرشتێـك پڕنـەبێ ٥ پەلـەكردن لـەئیشو كـاردا ٥ لاوازیـی لـەڕاو بۆچون دا ٥ پەلەكردن لەئیش دا.

**الضَّفَّةُ**: قەراخی دەریا یان هی چۆم، یان قەراخی شیو ٥ سەرەتای ئاو، پێشەتای ئاو ٥ کۆمەڵی ئادەمیزاد ٥ (ك: ضِفاف).

**الضِّفَّةُ**: بەمانا (الضَّفَّةُ)دێ ٥ (ك: ضِفَفٌ).

**الضَّفُوف**: چاو؛ کە فرمێسکی زۆربێ، پڕئاو بێ ٥ هەروا ناوە بۆ حوشتری بەشیر، یان مەڕی گوان پڕ لەشیر ٥ (ك: ضُفَفٌ).

**الضَّفِيف**: پێڕو تاقم، دەگوترێ: (فلان لفيفنا وضفيفنا): فلانکەس لەپێڕی ئێمەیە کەتوشی ناخۆشی بوو لەخۆمانی دەگرین ٥ پەنای دەدەین.

**الضَّفِيفَةُ من النبت**: روەکی لاواز، باخی سەوزو تەڕو تازەو پڕگژو گیا.

**المضفوف**: شتێك کەلەکۆمەکی لەسەر کرابێ ٥ کەسێك شتێکی لا بوو بێو نەمابێ.

**ضَفَنَ بالشيئ**: شتەکەی هاویشت.

**ضَفَنَت الدابةُ برجلها**: وڵاخەکە بەقاچی سمکۆڵی کرد، دەشگوترێ: (ضفنته برجلها): بەقاچی سویەوە، پانی کردەوە.

**ضَفَنَ اليه**: هات بۆلای بۆئەوەی لەلای دابنیشێ ٥ لەگەڵی دابنیشێ.

**ضَفَنَ مع الضيف**: شوێن میوانەکەی کەوت.

**ضَفَنَ الشيئَ على الدابة**: شتەکەی لەوڵاخەکە بارکرد.

**ضَفَنَ ضَرْعَ الناقة**: گوانی حوشترەکەی گوشی بۆئەوەی بیدۆشێ.

**ضَفَنَ فلاناً**: شەقی لەسمتی فلانکەس هەڵدا.

**ضافنته عليه**: یارمەتی دا.

**تضافنوا عليه**: یارمەتی یەکتریان دا لە دژی ئەو.

**الضَّفَنُ**: کورتە بالا ٥ ئەحمەق و گێلی قەڵەو.

**ضَفَا الشيئُ ضَفْواً وضُفُواً**: شتەکە گەشەی کردو زۆر بوو.

**ضَفَا الثوبُ**: قوماشەکە ڕەنگەکەی وەرگرت هەڵی چنی.

**ضَفَا رأسه**: قژی سەری زۆرو پڕ بوو.

**ضَفَا الحوضُ**: حەوزەکە سەر ڕێژی کرد، دەشگوترێ: (فلان ضافي الفضل): فلانکەس ڕێزی لێ دەتکێ.

**الضَّفَا**: تەنیشتو قەراخ، هەموو شتێك ئەم لاو ئەولای هەیە ٥ لایەکی شتەکە.

**الضَّفوةُ**: (ضفوة العيش): خۆشگوزەرانی ٥ ژیانی خۆش.

**ضَكضَكَ**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد.

**ضَكضَكَ الشيئ**: شتەکەی پەستاوت.

**ضَكْضَكَ المطرُ الأرض**: بارانەكە زەوییەكەی شتەوە.

**تَضَكْضَكَ**: بۆ موطاوعەی (ضكضكە)دێ ٥ كرایەوەو رۆخۆش‌و دەم بەپێكەنین بوو.

**الضكاضِكُ**: خەپەتۆڵە ٥ كورتەبالاو گۆشت‌و پتەو.

**الضّكضاك**: بەمانا (الضكاضك)دێ.

**ضَكَّهُ ضكاً**: پەستاوتی، شێلای، هەڵیپشكنی.

**ضَكَّ الأمرُ فلاناً**: ئیشەكە فلانكەسی تەنگەتاو كرد ٥ چەواشەی كرد.

**ضَكَّ فلاناً بالحجة**: بەبەڵگە فلانی بۆڕدا.

**ضَلَعَ ضَلعاً**: خواری كردەوە وەكوو پەراسوو.

**ضَلَعَ عن الحق**: لەحەق لای دا.

**ضَلَعَ عليه**: دەستدرێژی كردە سەری‌و ئەزیەتی دا.

**ضَلَعَ الحيوانَ**: پەراسوی ئاژەڵەكەی شكاند.

**ضَلِعَ ضَلَعاً**: خوار بوو، دەشگوترێ: (ضَلِعَ مع فلان): مەیلی فلانكەسی كردو وەگری بوو، یارمەتی دا ٥ تێربوو ٥ تێراو بوو.

**ضَلُعَ ضَلاعةً**: بەهێز بوو، پەراسوی ئەستورو پتەو بوون.

**ضَلُعَ فَمُهُ**: دەمی گەورە بوو ٥ ددانەكانی جوت بوون.

**أضلعت الدابةُ**: وڵاخەكەی بارەكەی بۆهەڵنەگیرا.

**أضلع للشيئ وعليه**: توانای شتەكەی بوو، دەسەڵاتی بەسەر شتەكەدا شكا.

**أضلع الشيئَ**: شتەكەی خواركردەوە دایهێنا.

**أضْلَعَ الحِملُ الدابةَ**: بارەكە گران بوو وڵاخەكەی ماندو كرد.

**أضلعته الخطوبُ**: بەڵاو كارەسات تەنگیان پێ هەڵچنی.

**ضَلَّعَهُ**: وێنەی سوچ‌و زاویەی لەسەر دروست كردن.

**أضْلَعَ للأمر**: بەكارەكە هەڵساو باش ئەنجامی دا.

**إضْطَلَعَ بِهِ**: توانای بەسەردا شكا ٥ كارەكەی ئەنجام دا.

**تَضَلَّعَ**: تێری خوارد ٥ مڕبوو ٥ تێراو بوو، دەشگوترێ: (تَضَلَّعَ من العلوم): لەزانیاری دا مەست بوو.

**إسْتَضْلَعَ**: بەمانا (تضلّع)دێ.

**الأضلَعُ**: بەهێزو پەراسوو ئەستور ٥ ئەوكەسەی ددانی وەكوو پەراسوو كەوانەیی بن.

**الضَالِع**: خوار، چەماوە ٥ (ك: ضَوالِع).

**الضِلَعُ**: پەراسوو ٥ دارێك خوار بوبێتەوە.

**الضَلوع**: زەوی چاڵ.

أضراس
مضيق
أضلاع
مضخّة
مضرب
ضرّابة الناقوس
ضبّة
مضلّع منتظم
ضماد
ضفيرة
مضلّع
ضبّة
مضخّة ماصّة
ضرم
ضفدعة
ضبع
مضلّع منتظم
ضبّ

**الـضّليع**: بـەهێز ٥ پەراسـوو پتـەو ٥ سینگ پان ٥ شانو مل قەوی ٥ تیری خوار ٥ (ك: ضُلُعٌ).

**ضَلَّ ضلاًّ ضلالاً وضلالة**: گوم بـوو، دیـار نەما، دەگوترێ: (ضَلَّ الشيءُ في الشيء): شتەکە لەناو شتەکەی تـر دا گوم بـوو، فەوتا، تێداچوو، پوچ بـوو، دەگـوترێ: (ضَلَّ سعيُهُ): کارێکی بێ سودی ئـەنجام دا یان دەسخەڕۆو مایە پوچ بوو.

**ضَـلَّ الميت في الأرض**: مردووەکـە لـەناو زەوییەکـە پۆڵـکاو گـوم بـوو هیـچی بەسەر هیچەوە نەما.

**ضَـلَّ**: ڕێـگای لـێ گـوم بـوو، شـتەکەی نەدۆزییەوە.

**ضَلَّ النّاسي**: لەبیرچووەکە هیچی لەبـەر نەماو هیچ نازانێ.

**ضَـلَّ الـشيءَ وعنـه وفيـه**: شـتەکەی لـەبیر چۆوە یـان لـەبیری برایـەوە ٥ شـتەکەی لەکیس چوو.

**ضَلَّ الطريقَ**: ڕێگاکەی نەدۆزییەوە.

**ضَلَّ الـشيءُ فلانـاً**: شـتەکە لەدەست فلان چوو، دەسەڵاتی بەسەردا نەشکا.

**أضلَّه**: وای لـێ کرد ڕێـگای لـێ گوم بـێ ٥ شـاردیەوە، پـەنهانی کـرد ٥ ژێـر خـاکی کـرد ٥ لـەناوی بـردو فەوتاندی.

**أضلَّ الشيءُ فلاناً**: شتەکە فلانی گومڕا کردو ڕێگای لێ تێك دا.

**أضلَّ اللهُ أعمالهم**: خودا پاداشی باشی کردەوەکانی نەدانەوە.

**ضَلَّلَه تضليلاً**: گومڕای کرد، سـەری لـێ شێواند ٥ بەگومڕای حسێب کرد.

**ضَلَّل الماءَ**: ئاوەکـەی بەردایـە نـاو دارو بەردەوە.

**تـضال فـلان**: فلانکـەس لافـی گـومڕایی لـێ دا، خـۆی بـەگومڕا خـستە بەرچاو.

**تَـضَلَّلَ المـاءُ مـن تحـت الـشجر**: ئاوەکـە لـەژێر درەختەکـە دا نغـرۆ بـوو، ڕۆچوو.

**استُضِلَّ ضَلاَلُهُ**: داوای لـێ کرا خۆ گوم بکا، خۆ گومڕابکا.

**الأضلولة**: گومڕایی، سـەر لـێ شێوان ٥ (ك: أضاليل).

**الـضالّ**: هەرکەسێـك لـەئایینی وەرگەڕێ، دەشگوترێ: (هـو ضـالّ تالّ) ٥ (ك: ضُلال).

**الضالة**: هەرشتێك گوم بووبێ، هـەوڵی دۆزینـەوەی بـدرێ، دەشـگوترێ: (الحكمـة ضـالّة المـؤمن): حیکمـەتو چاکسازییو کاری باش شتێکە دەبێ هەمیشە مرۆڤی موسوڵمان هـەوڵی بەدەسـتهێنانیان بـداو، بـەدوایانا بگەڕێ ٥ (ك: ضَوال).

**الضِّلال**: گوم بوون ٥ فەوتانو تێداچون

٥ پوچو بێ نرخ ٥ لەبیر چوونەوە ٥ لادان لەرێگای راست بەئەنقەست یان بەهەڵە زۆر بێ یان کەم بێ، دەگوترێ: (هو الضلال ابن التلال): کەس نایناسێ، کەس نازانێ کوڕی کێیە.

**الـضَّلالةُ**: بەمانا (الضّلال)دێ ٥ گرتنەبەری رێبازێک نەتگەیەنێتە ئامانج.

**ضلالة العمل**: کردەوەی بەتاڵو پوچو بێ سود.

**الضُّلُّ**: بەمانا (الضّلال)دێ.

**الضِّلُّ**: دەگوترێ: (هو ضِلّ بن ضِلّ): کەس نازانێ کوڕی کێیە ٥ بەڵاو کارەساتی گەورە.

**الـضِّلَلُ**: ئاوێک بەبن بەردو شاخ دا رەوان ببێو خۆر لێی نەدا یان ئاوێک بەناو درەختو چروستان دا بڕوا.

**الـضُّلَّةُ**: سەرسام بونو سەر لێ تێکچون.

**الضُّلَّةُ**: لێزانیو شارەزایی لەسەفەردا.

**الضِّلَّةُ**: دەگوترێ: (ذهب دمه ضِلّةً): خوێنی بەفیڕۆ چوو، تۆڵەی نەسەندرایەوە.

**الـضِّلِّيلُ**: کەسێک زۆر گومڕا بووبێ، زۆر هۆکاری گومڕابونو رێگا لێ تێکدان بزانێ، بۆیە بە (إمرؤ القیس)یان گوتووە (الملك الضّلیل).

**الـضُّلول**: بەمانا (الضِّلیل)دێ ٥ یان بەمانا (الضّال)دێ.

**المُضِلّ**: تراویلکە، بەردە سیخرۆ چونکە ئادەمیزادی پێ هەڵدەخەڵەتێ.

**المَـضِلّةُ**: دەگوترێ: (فتنة مَضِلّة): ئاشوبێکی گومڕاکەرە.

**إضـمَحَلّ**: لاوازبوو ٥ وردە وردە لێک هەڵوەشا هیچی نەما، دەگوترێ: (إضمَحَلّ السَّحابُ): هەورەکە رەوییەوە.

**ضَـمَخَ جسده وغيره بالطيب**: زۆری بۆنی خۆش لەخۆ هەڵسوو.

**ضَمَخَ فلاناً**: شوێن فلان کەس کەوت.

**ضَمَّخَهُ بالطيب**: زێدەرۆیی کرد لە خۆ بۆنخۆشکردن دا، زۆری بۆنی خۆش لەخۆدا.

**تـضمَّخَ بالطيب**: بۆنی خۆشی لەخۆی هەڵسو، دەشگوترێ: (إضطمخ وإضّمَخَ).

**الـضَّمْخَةُ**: بەمانا (التضمُّخُ) دێ ٥ ئافرەتی قەڵەوی زۆر گۆشتن ٥ حوشتری قەڵەوی خەپە تۆڵە.

**ضَـمَدَ الجرحَ ضَمداً وضماداً**: برینەکەی بەقوماشی تایبەتی پێچا.

**ضَمَدَ الجرحَ بالدواء**: برینەکەی بەدەرمان

هەنو، چەوری کرد یان دەرمانی خستە سەر برینەکە.

ضَمَّدَ فلاناً: هاریکاری فلانکەسی کردو رێکی خست.

ضَمِنَت المرأةُ فلاناً: ئافرەتەکە دڵداری لەگەڵ فلان دا کرد.

ضَمَدَ ضَمَداً: وشك بوو، بنبڕ بوو، دەگوترێ: (ضَمِدَ الدمُ علی الذبیحة): خوێنەکە بەکوشتییەکەوە وشك بۆوە.

ضَمِدَ علیه: زۆری رق لێ هەڵسا.

أضمَدَ القومُ: خەڵکەکەی گردکردەوەو یەکی خستن.

ضَمِدَةٌ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (ضَمَدَ)دێ.

تَضَمَّدَ: بۆ موطاوعەی مانای (ضَمَدَهُ)دێ.

الضِّمادُ: بەئافرەتێك دەگوترێ: کەلە کاتی گرانیو پێداویستی دا دۆستایەتی لەگەڵ زیاد لەپیاوێك بگرێ بۆئەوەی لای هەموویان بژێوی خۆی دابین بکا ٥ هەرپارچە قوماشێك برین یان شکاوی پێ ببەسترێ ٥ ئەو دەرمانەی دەخرێتە سەر برین ٥ (ك: أضمدە وضمائد).

الضِّمادَةُ: هەرشتێك برینی پێ ببێچرێت.

الضِّمْدُ: دۆستو دڵدار ٥ (أضماد).

الضَّمَدُ: قینو کینەی زۆر ٥ ستەمو زۆرداری.

المِضمَدَةُ: نیر؛ دارێکە تایبەتییە دەخرێتە سەر ملی دووگاجوت بەکەڵەمەو بەنکەڵەمە لەملی گاجوتەکان شەتەك دەدرێ، ئەمجار هەوجارو مزان کەبەهۆی دوو هەپەڵێك بەستراون لەناوەڕاستی نیرەکە قاییم دەکرێو هەوجارەکە گاسنی ئاسنی بەنوکەوەیە لەزەوی دەچەقێ، جوتیار دەسکەدووی هەوجارەکە دەگرێو بەنەقیزە گاجوتەکان لێ دەخوڕێو زەوی دەکێڵێ ٥ (ك: مَضامِد).

ضَمَرَ ضُموراً: کزو لاواز بوو ٥ گۆشتی کەم بوو ٥ چووە ناو یەکەوەو پوکایەوە.

ضَمَرَ العودُ: دارەکە تەڕایی لێ بڕاو وشك بوو.

أضمرت المرأة: ئافرەتەکە سکی پڕبوو، منداڵی لەسکی کەوت.

أضمر الشاعرُ: شاعیرەکە لەشیعرەکەی دا یاسای ئیضماری بەکارهێنا.

أضْمَرَ الحیوانَ: ئاژەڵەکەی لاواز کرد، وای لێ کرد گۆشتی پێوە نەمێنێ.

أضمر الشیئَ: شتەکەی شاردەوە، دەگوترێ: (أضمر في نفسه أمراً):

لەدڵی خۆی دا بڕیاری ئەنجامدانی کارەکەی دا.

ضَمَّرَهُ: وای لێ کرد کزو لاواز بێ، زەلیلو ژێر باری کرد.

ضَمَّرَ الفرس للسباق: ئەسپەکەی بەستەوە ئالیکی باشی پێدا، ئاوی زۆری دایە، ئەمجار لەگۆڕەپان دا تاوی دا بۆئەوەی خواردنەکەی هەزم بکاو توندو تۆڵ ببێ بۆ پێشبڕکێ، ماوەی ئەم جۆرە بەخێوکردنە لای عەرەبەکان چل ڕۆژە.

إضطمر: بەمانا (ضَمُرَ)دێ.

اضطمر اللؤلؤ: مروارییەکان پاڵیان لەیەك دا.

إنضمر: بەمانا (ضَمُرَ)دێ.

ضَمَّرَ: بۆ موطاوەعەی (ضمره)دێ.

تضمَّرت الوجه: پێستی دەمو چاوی چرچ بوونو نیشانەی لاوازیی لێ دەرکەوت.

الإضمار: یاسایەکی زانستی عروزە پیتی دووەمی تەفعیلەکە ساکن دەکەی وەکوو بڵێی (مُتْفاعلن).

الضامر: وڵاخی داڵگۆشت ٥ حوشتری کزو لاواز بەهۆی ماندوویی ٥ (ك: ضُمَّرٌ وضوامر).

الضِّمارُ: نادیار ٥ کارێك پیاو بتمانەی پێ نەبێ، دەگوترێ: (مال ضمار): ماڵو سامانێکە دەسکەوتنەوەی ئەستەمە، کاتێکی دیاری کراو نییە بۆ وەرگرتنەوەی ٥ (دین ضمار): قەرزێکە کاتی وەرگرتنەوەی نادیارە.

الضَّمْرُ: تەنگو چەڵمە، تەنگژە، دەشگوترێ: (رجل ضمر): پیاوێکی قەدباریکە.

الضّمور: پوکانەوە ٥ (الضمور العَضَلي): نەخۆشییەکی ماسولکەیەو بۆماوەو ویرانییە لەدوای تەمەنی چل ساڵی توشی ئادەمیزاد دەبێ، بەزۆری توشی ماسولکەی قاچ دەبێ.

الضمیر: ویژدان ٥ شاراوە ٥ ئەو رازو نیازەی لەدڵی خۆت دا هەڵی دەگریو ناهێڵی کەس بیزانێ ٥ ئامادەباشیو خۆسازدانی نەفسو دەروونە بۆ هەست کردن بەکارو گوفتاری باشو خراپ ٥ هەروا بیرو بۆچونی پەسەندو ناپەسەندو لێك جیاکردنەوەیان لەزاراوە نەحوییەکاندا بە (ڕاناو) دەگوترێ وەکوو (أنا، أنت، هو، هي، .....) لقو پۆپەکانیشیان.

الضُّوْمَرانُ والضَّیمرانُ: ڕێحانەی فارسی.

المِضْمارُ: شوێنی بەخێوکردنو ڕاهێنانی ئەسپ بۆ پێشبڕکێ یان گۆڕەپانی

غارغارێنەکە ◊ یان ماوەی راهێنانو بەخێوکردنی ئەسپ کە چل رۆژە ◊ (ك: مضامیر).

**ضَمَزَ الحیوانُ ضموزاً:** ئاژەڵەکە لەکاوێژ کردن کەوت دەمی خۆی لەکاوێژکردن گرتەوە لەترسا یان لەبەر هۆی تر.

**ضَمَزَ فلان:** فلانکەس بێدەنگ بوو.

**ضَمَزَ فاه:** دەمی خۆی نوقاند.

**ضَمَزَ علی مالە:** دەستی بەماڵو سامانی خۆیەوە گرتو لێی نەبەخشی ◊ ملکەچ بوو ◊ ژێربار بوو.

**ضَمَزَ فلاناً:** فلانکەسی بێدەنگ کرد.

**ضَمَزَ اللقمة:** پاروەکەی قوت دا، یان زۆری پاروکردن.

**ضَمَزَ فلاناً:** رەخنەی لەفلانکەس گرت.

**الضَمْزُ:** گردۆلکە، تەپۆلکە ◊ کێوی بەتاقەوە بوو ◊ کێوێك بەردەکانی سوربنو گڵیان پێوەنەبێ.

**ضَمَسَهُ ضَمْساً:** بەهێواشی شتەکەی جوی، کەم جوی.

**ضَمْضَمَ الأسدُ:** شێرەکە زریکاندی، نەڕاندی.

**ضَمْضَمَ فلان:** فلانکەس دڵی بەهێز بوو، ئازا بوو.

**ضَمْضَمَ علی المال:** ماڵو سامانەکەی هەموو هەڵگرت.

**الضَماضِمُ:** شێری تورە کەهەموو شتێکی بۆخۆی دەوێ ◊ زۆر خۆری تێر نەخۆر کەهەموو نێچیرەکە بۆخۆی قۆرخ بکا ◊ بەخیلو چروك.

**الضُمْضَمُ:** چاو چنۆك کەهەموو شتێکی بۆخۆی بوێو خۆپەرستو خۆ ویست بێ.

**الضُمْضَمُ:** بەمانا (الضُماضِمُ)دێ ◊ مرۆڤی کەتەی تێکسمڕاو ◊ یان ئازاو ورەبەرز ◊ (ك: ضماضِم).

**الضَمیلة:** ئافرەتی گۆجو گێڕو فیچ ◊ ئافرەتی شەل ◊ (ك: ضمائل).

**ضَمَّ فلان من مالە ضَمّاً:** فلانکەس ماڵی خۆی هەڵگرت.

**ضَمَّ علی المال:** هەموو ماڵەکەی هەڵگرت.

**ضَمَّ الأشیاء:** شتەکانی خستنە پەنایەك کۆی کردنەوە.

**ضَمَّ الشیءَ الی الشیء:** شتەکەی خستە پەنا شتەکەی تر.

**ضَمَّ فلان الی صدره:** فلانکەسی لەئامێز گرتو بەخۆیەوە گوشی.

**ضَمَّ جناحه عن الناس:** باڵی میهرەبانی بۆ خەڵکی کردەوە.

**ضَمَّ الحرف:** بزوێنی بۆری خستە سەر پیتەکە.

**ضَامَّهُ الیه مضامّة وضماماً:** بەمانا (ضَمَّه)دێ.

ضامّ فلان فلاناً: فلانكەس چووە پاڵ فلان لەکارێکی تر.

إضطمّ بعضه الى بعض: پاڵی پێوەدا.

إضطمّ عليه: دايپۆشی.

إضطمّ الشيءَ: شتەکەی هێنایە پاڵ خۆیەوە ٥ هێنایە ژێر رکێفی خۆیەوە.

إنضمَّ الشيءُ: شتەکە هەندێکی چووە پاڵ هەندێکی تری.

إنضمّ القومُ: خەڵکەکە پاڵیان لەیەکتردا.

الإضمامَة: هەرشتێك هەندێکی پاڵ هەندێکی تری بدرێ، کۆمەڵێك لەخەڵك بنەچەیان یەك نەبێ‌و بچنە پاڵ یەکتری ٥ دووسیەو نیضبارە ٥ گورزە قاغەزی نوسراو ٥ کۆمەڵێك کتێب بەیەکەوە بەسترابن ٥ (ك: أضاميم)، دەگوترێ: (فرس سَبّاق الأضاميم): ئەسپێکە پێش هەموو رەوە ئەسپەکان کەوت.

الضِّمامُ: کۆکەرەوەی شت ٥ هەرشتێك شتی پێ لێك بدرێ، دەشگوترێ: (التقوى ضِمام الخير كله): لەخودا ترسان کۆکەرەوەی هەموو خێرو بێرێکە.

الضِّمامة: بەمانا (الإضمامة)ی.

الضِّمة: گۆڕەپانی پێشبرکێی ئەسپ ٥ بزوێنی بۆر.

الضَّميم: لێك دراو، پێکەوە بەستراو ٥ پاڵدراو بۆلای شتی تر.

ضَمِنَ ضَمَناً وضمانةً: نەخۆشی‌و پەتایەکی توش بوو.

ضَمِنَ على أهله: بوو بەبارو قورسایی بەسەرکەس‌و کاریەوە.

ضَمِنَ الرجلَ ضماناً: بوو بەکەفیل‌و بەرعۆدە بووی پیاوەکە یان ئەرکی ئەستۆی پیاوەکەی خستە سەرشانی خۆی.

ضَمِنَ الشيءَ: بەرعۆدەی باشی‌و بێ عەیبی شتەکە بوو.

أضمنه الله أو غيره: خودا نەخۆشی خست.

ضَمَّنَ الشيءَ الوعاءَ: شتەکەی خستە ناو کیسەکەوە.

ضَمَّنَ فلاناً الشيءَ: فلانکەسی والێ کرد بەرعۆدەی باشی‌و بێ عەیبی شتەکە ببێ.

تضامنوا: هەریەکەیان ئەرکی ئەستۆ ی ئەوی تری خستە سەرشانی خۆی‌و بڕیاری دا هەرچی ئەو نەتوانێ ئەنجامی بدا ئەم لەجیاتی ئەو جێ بەجێی بکا.

تَضَمَّنَ الوعاءُ ونحوه الشيءَ: زەرفەکە شتەکەی لەخۆ گرت ٥ شتەکە تێیدا حەوایەوە.

تضَمَّنَت العبارة معنىً: دەقەکە راستەو خۆ یان ناڕاستەو خۆ ماناکەی گەیاند.

تضمّنَ الغَيْثُ ونحوه النّبات: بارانەکە گژوگیاکەی هێنایە دەرو گەشەو نەشەی پێ دا.

التضامن: ئەوەیە دەسەڵاتدار یان دەوڵەمەند پارمەتیدانی بێ هێزو هەژار لەئەستۆی خۆی بگرێ.

التّضمين: بەلای زانایانی زمانی عەرەبییەوە چەند جۆرێکی هەیە، جۆرێکیان ئەوەیە وشەیەك لەشوێنی وشەیەکی تر دابنێی‌و هەمان مامەڵەی لەگەڵ بکەی لەم ڕووەوە کەئەم وشەیە مانای وشەکەی تری لەخۆ گرتووە جۆرێکی تری ئەوەیە شاعیرێك یان وتار بێژێك حەدیسێك یان ئایەتێك یان بەشێك لەشیعری شاعیرێکی تر بخاتە ناو نووسینەکەی خۆیەوە بەبێ گۆڕانکاریی لەلەفظو مەعنای دەقە هێنراوەکەدا.

الضّامِنُ: بەرعۆدە بوو بۆکەسێکی تر ٥ قەرزدار.

الضّمان: بەرعۆدە بوون‌و ئەرك خستنە ئەستۆ.

ضَمان الدرك: گێڕانەوەی بەها بۆ کڕیار کاتێ فرۆشیار نەیتوانی فرۆشراو تەسلیم بکا.

ضمان الرهن: ئەوەیە بەرعۆدە بوونەکە لەنرخی کاڵاکە کەمتر بێ.

ضمان الغصب: ئەوەیە بەرعۆدەی نرخەکەبێ.

ضمان المبيع: ئەوەیە بەرعۆدەی نرخی فرۆشراوەکە ببێ کەم بێ یا زۆر.

الضمان الإجتماعي: ئەوەیە دەوڵەت پارمەتیدانی ئاتاجان لەخۆ بگرێ.

الضّمانة: دێکومێنت‌و بەڵگە نووسراوێکە، کەمرۆڤ لەڕێیەوە شت لەئەستۆ دەگرێ بۆ هاوەڵەکەی یان ئەوەیە فرۆشیار بەعودەی ئەوە ببێ کە فرۆشراوە کە بێ عەیب‌و لەککەیە بۆماوەیەکی دیاریکراو ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا یان هەر بەگوفتار بەرعودەی بێ عەیبی فرۆشراوە کە دەبێ.

الضّمْنُ: ناوەوەی شت، ژێر پەردەی شتەکە، دەشگوترێ: (يفهم من ضِمن كلامه): لەناوەڕۆکی قسەکەی ئەوە دەردەکەوێ.

الضّمِنُ: گۆج‌و ئیفلیج، نەخۆش ٥ دڵدارو عاشق، قورسایی‌و بارگرانی.

الضّمين: بەمانا (الضامِنُ) دێ ٥ (ك: ضمناء)، هەروەها بەمانا (الضّمِنُ)دێ ٥ (ك: ضمن).

**المِضمانُ**: بەمانا (الضّامِن)دێ یان بەمانا (الحامِلُ)دێ.

**المضمون**: ناوەڕۆك، دەگوترێ: (مضمون الكتاب): یان (مضمون الكلام) ٥ (ك: مضامین).

**ضنأت المرأة ضَنْئاً وضنوءاً**: ئافرەتەكە منداڵی زۆر بوون.

**ضَنا المالُ**: ماڵو سامانەكە زۆر بوو.

**أضنأت المرأة وغیرها**: بەمانا (ضنأتْ)دێ.

**الضّنءُ من كل شيئ**: وەچەو نەوە ٥ (ك: ضُنوء).

**ضَنكه ضَنكاً**: تەنگی كردەوە، دەگوترێ: (ضَنَّك الله عیشه): خودا گوزەرانی تەنگ كرد.

**ضَنُكَ ضناكةً وضنوكةً**: تەنگ بوو، دەگوترێ: (ضَنَكَ عیشه): ژیانی كولەمەرگی بوو.

**ضُنِّك فلان**: فلاّنكەس جەستەی لاواز بوو، یان عەقڵی كزو كەم بوو.

**ضُنِّكَ السحابُ وغیره**: هەورەكە سواری یەك بون و بوونە گەواڵ گەواڵ.

**ضُنِك ضَنكاً**: هەلاّمەتی توش بوو، درمی پێوە نووسا.

**أضنكه الله**: خودا توشی هەلاّمەتی كرد.

**تضنّك**: ماندو كرا.

**الضُّناك**: هەلاّمەت، درم، پەتا.

**الضُّناك**: تێكسمڕاو بەهێز ٥ درەختی گەورە یان چڕو پڕ ٥ لقو پۆپو گەلاّ ٥ (ك: ضُنُك).

**الضُّنك**: تەنگەبەری‌و كەمو كورتی لەهەرشتێك دا بێ.

**الضُّنكة**: بەمانا (الضُّناك)دێ.

**الضُّنیك**: تەنگە بەر ٥ لاواز لەجەستەدا لەبیرو باوەڕدا ٥ شوێنكەوتەو كاسە لێس ٥ نانەسكو چڵكاو خۆر ٥ دابڕاو.

**ضَنَّ به علیه ضِنّاً**: زۆر ڕژدو چروك بوو.

**ضَنَّ بالمكان**: لەشوێنەكە مایەوەو بەجێی نەهێشت.

**الضُّنانة**: دەگوترێ: (أخذت الأمر بضنانته): بەبێ گۆڕانكاری‌و دەست لێدان كارەكەم لەئەستۆ گرت یان دەگوترێ: (هجمتُ علی القوم وهم بضنانتهم): هێرشم بردە سەر خەڵكەكە هێشتا بلاّوەیان نەكردبوو.

**الضَّنَنُ**: ئازاو چاونەترس.

**الضِّنُّ**: هەڵگیراوو پارێزراو، یان شتی بەنرخ‌و ناوازە كە دەستت لێی نابێتەوەو دڵت نایە لەدەست خۆتی بدەی، دەگوترێ: (فلان ضِنّي): فلاّنكەس دۆستی راستەقینەمەو

دڵم نایە لەخۆمی بکەم ٥ (وهو ضَنی من بین إخواني): لەناو برادەرەکانم دا ئەو شوێنو جێگای تایبەتی هەیە.

الضَّنِين: زۆر رژدو چروكو دەست قوچاو ٥ یان کەسێك شتی گرنگ بپارێزێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ ٥ (ك: أضِنّاء وهن ضنائن) ٥ (ضنائن الله): پیاوە تایبەتییەکانی خودا.

المَضِنَّةُ: هەرشتێك گرنگی پێ بدرێ کێ برکێی تێدا بکرێ بۆ وەدەستهێنانی.

المضنون والمضنونة: هەرشتێك ناوازە بێو خەڵك هەوڵی ئەوە بدەن وەدەستی بهێنن.

ضَنَّت المرأة وغيرها ضنواً وضناً: ئافرەتەکە منداڵو نەوەی زۆر بوون.

ضَنِيَ ضنىً وضناءً: نەخۆشییەکەی پەرەی سەند هەتا وای لێ هات جەستەی لاواز بوو ٥ (فهو ضَنّي وضنٍ).

أضْنى: بەهۆی نەخۆشی لەجێگادا کەوت.

أضنى المرض وغيره الإنسان: نەخۆشییەکە ئادەمیزادەکەی داتەپاندو پۆڵکاندی.

ضانى المرض ونحوه: بەنەخۆشییەکە گرفتار بوو ئازاری چەشت.

تضَنّى: خۆی بەنەخۆش خست، خۆی بەنەخۆش دانا.

الضِّنَى: نەخۆشیو لاواز بوونی جەستە ٥ نەخۆشی درێژ خایەن.

الضَّنِيُّ: نەخۆش، خەستە ٥ (ك: أضنياء).

ضاهاه: لەوچوو، کرداری وەکوو ئەوی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ﴾ ٥ بەزەیی پێداهات.

الضهياء: ئافرەتێك وەکوو پیاوبێ لەوەدا عادەی مانگانەی نەبێ، منداڵی نەبێ، لەم ڕووەوە کۆئەندامی زاوزێی لەقۆناغی ناکاملی دایە.

ضَهَبَ الرجلُ ضُهوباً: پیاوەکە لەپێگەیشتنی ڕەوشتی نێرینەیی دا دواکەوتو دیاردەی پیاوەتی لێ دەرنەکەوت.

ضَهَبَ اللحمَ وغيره بالنار ضَهْباً: گۆشتەکەی برژاند، گۆڕی.

ضاهَبَهُ: بەبێ پەردە قسەی ناشیرینی ئاڕاستە کرد.

ضَهَّبَ الرمحَ أو القناة أو العَصا أو القوس بالنار: رمبەکە یان شمشێرەکە یان عەصاکە یان کەوانەکەی بەئاگر وردە وردە گەرم کردو مشتوماڵی کردو چەماندی، ڕاستی کردەوە.

**ضَهَّبَ اللحمَ ونحوه:** گۆشتەکەی برژاند بەڵام زۆری نەبرژاند یان لەسەر بەردی گەرم گۆشتەکەی برژاند.

**الضَّهْبَاءُ:** کەوانی تیر کە بەئاگر چەمێندرابێتەوە ◦ (ك: ضُهْبٌ).

**ضَهَدَهُ ضَهْداً:** زەلیلی کرد، ستەمی لێ کرد.

**أضْهَدَه ویه:** بەمانا (ضَهَدَه)دێ.

**إضطهد:** زێدەڕۆیی کرد لەچەوساندنەوەی دا.

**الضُّهْدَةُ:** زاڵبوون و ژێربار کردن ◦ کەسێك خەڵك زۆر بچەوسێنێتەوە، زۆر ستەمی لێ بکەن ◦ (وهي ضهدة).

**الضَّاهِر:** لوتکی کێو ◦ یان قولایی شیوو دۆڵ ◦ (ك: ضواهر).

**الضِّهْرُ:** تۆپەڵاکی کێو ◦ پارچەیەك لەکێو رەنگی لەوی تر جیابێ ◦ کیسەڵ ◦ (ك: ضهور وأضهار).

**ضَهَلَ اللبن ونحوه ضهلا وضهولاً:** شیرەکە وردە وردە کۆ بۆوە.

**ضَهَلَ الشرابُ:** ئاوەکە (شلەمەنییەکە) کەم بوو، رون بوو.

**ضهلت الشاة:** مەڕەکە شیری کەم بوو.

**ضَهَلَ الظِلُّ:** سێبەرەکە لایدا، کەم بوو، هەڵکشایەوە.

**ضَهَلَ اليه:** بۆی گەڕایەوە، دەگوترێ: (ضَهَلَ اليه خَبَرٌ): هەواڵەکە بیسترا، پەیدا بوو، زاندرا.

**ضَهَلَ فلاناً حقه ضهلاً:** مافی فلانی کەم کردەوە، یان کەم کەم مافی خۆی دایە.

**أضْهَلَ البُسْرُ:** هێشوە خورماکە ئاڵ و بۆڵی تێکەوت، دەشگوترێ: (أضهلَ النخلُ): خورماکە بۆڵی شیرینی تێکەوت.

**أضْهَلَ الى فلان مالاً:** ماڵ و سامانەکەی گەیاندە فلان.

**تضهّلَ الى فلان:** بەمانا (ضَهَلَ)دێ.

**اسْتَضْهَلَ الخبرَ:** لەهەواڵەکە بەگوێرەی خۆی شتێکی لێ هەڵکڕاند.

**الضَّاهِلة من العيون:** چاو کە ئاوی کەم بێ ◦ (ك: ضواهل).

**الضَّهلُ:** ئاوی کەم ◦ شیری کۆ بۆوە.

**الضَّهول من النعام:** نوعامەی سپی ◦ (ك: ضُهُلٌ).

**ضَهِيَتْ ضَهىً:** ئافرەتەکە نەکەوتە عادەی مانگانەوە، منداڵی لەسکی نەکەوت واتە سروشتی مێینەی تێدا بەرجەستە نەبوو.

**أضْهى:** ئافرەتی نەزۆکی مارە کرد.

**ضاهاه:** لەوچو، شوبهایە ئەو.

**الضَّهوةُ:** حەوزی ئاو (چاڵی ئاو) ◦ (ك: أضهاء).

**الضَّهِيُّ:** هاوشان و هاو وێنە ◦ بەرامبەر.

**ضاء الشيئُ ضوءاً وضياءً**: شتەکە روناکی دا شوێنەکەی ڕۆشن کردەوە.

**أضاء**: بەمانا (ضاء)دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَكادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾.

**أضاء الشيئَ**: شتەکەی والێ کرد روناکی بدا ڕۆشنایی ببەخشێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ﴾.

**ضَوّأ الشيئَ**: شتەکەی روناك کردەوە.

**ضَوّءَ عنه**: لێی لادا، خۆی لێ پاراست.

**تَضَوّأ الشيئَ**: شتەکە لەناو روناکی دا بینی (واتە بینەر لەتاریکی داو بینراو لەروناکی دا بوو).

**استضاء**: هەوڵی روناکی پەیداکردنی دا.

**استضاء بە**: داوای روناکی لێ کرد ویستی ڕۆشنایی بداتێ.

**الضّوء**: روناکی، ڕۆشنایی ٥ (ضوء ونور): لەفظیان جیایەو مانایان یەکە ٥ یان دەگوترێ: (وشەی (ضوء) بۆ روناکی زۆرو بەهێز بەکاردێ (نور) بۆ روناکی بێ هێز ٥ یان وشەی (ضوء) بۆ روناکی بنەڕەتیو ئەصڵی بەکاردێ وەکوو بڵێی (ضوء الشمس وضوء النار) وەلێ (نور) بەو ڕۆشناییە دەگوترێ کە ڕاستەو خۆ لەکانەکەیەوە وەرنەگیرێ، وەکوو بڵێی (نور القمر) ٥ قورئانیش دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُورًا﴾ ٥ (ك: أضواء).

**الضُّوءُ**: بەمانا (الضَّوْءُ)دێ.

**ضاج الوادي ونحوه ضَوْجاً**: شیوەکە پانو پۆڕ بوو.

**ضاج عنه**: لێی لادا.

**إنضاج الوادي ونحوه**: شیوەکە پانو پۆڕ بوو.

**إنْضَوّجَ في ضوج الوادي**: چووە ناو قوڵایی شیوەکە.

**تضوّج الوادي**: شیوەکە پانو پۆڕ بوو ٥ بەرزو نزمی ناو شیوەکە زۆرو جۆراو جۆر بوو.

**الضّوج**: قوڵاییو نزمایی ناو شیو ٥ (ك: أضواج).

**ضار ضوراً**: زۆری برسی بوو.

**ضار الشيئُ فلاناً وغيره**: شتەکە زیانی گەیاند بەفلان.

**تضوّرَ**: لەبرسا یان بەهۆی ئازار تلاو تلی کرد.

**الضُّوْرَةُ**: برسیایەتی.

**الضُّورة**: مرۆڤی پرو پوچو لاواز کەنەتوانێ بەرگری لەخۆی بکا.

**ضَوْضَأ ضوضأةً**: قاوو قیژی کرد،

دەگوترێ: (ضوضأ القومُ): خەڵکەکە دەستیان کرد بەقیڕەو هەراو قاوو قیژو دەنگیان تێکەڵو پێکەڵ بوو.
**ضَوضى ضوضاءاً**: بەمانا (ضَوْضَأ).
**الضّوضاء**: قاو قیژو هەراو هوریا.
**الضوضى**: دەق بەمانا (الضوضاء)دێ.
**ضَوِطَ لکه ضَوَطاً**: شەویلەی خوار بوو (فهو أضوط وهي ضوطاء).
**الضّويطة**: قوڕی بنکی حەوز ٥ هەویری شلی زۆر ئاو.
**الضّوطارُ**: کەسێکە بچێتە ناو بازاڕو سەرمایەی نەبێ فرتو فێڵ بکا بۆ پارە پەیداکردن.
**الضّوطَرُ**: کەتەو زەبەللاحی بێ خێرو بێر.
**السضّوطري**: بەمانا (السضوطر)دێ ٥ کۆمەڵگایەك کەپێداویستی خۆیان دابین نەکەن پێیان دەگوترێ (بنو ضوطری).
**أبو ضوطری**: نازناوی برسیایەتی یە.
**ضاع الشيءُ ضوعاً**: شتەکە جمو جوڵی تێکەوتو بۆنو بەرامی بلاّو بۆوە.
**ضاعت الرائحة**: بۆنی خۆش بوو، بۆنەکەی بلاّو بۆوە.
**ضاع الضُوَعُ**: باڵندە بوم ئاساکە کەوتە ناڵەو فیغان.
**ضاع الشيئ**: شتەکەی چەماندەوە ٥ جوڵەی پێ کرد ٥ ترساندی، دەگوترێ: (لايُضَوِعَنَّكَ ماتسمع منه): گرنگی مەدە بەوەی لێی دەبیسی، ترست لێی نەبێ.
**ضاع الطائر فرخه**: باڵندەکە خۆراکی بۆ بێچووەکانی دابین کرد.
**ضَوَّعه**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای(ضاعه)دێ.
**إنضاع الفرخُ**: بێچووەکە باڵی فش کردنەوە بۆئەوەی دایکەکەی خواردنی بکاتە دەمیەوە.
**تضوَّعَ**: ناڵەو فیغانی زیادکرد ٥ باڵندەکە درێژەی بەخوێندنو ناڵە ناڵ دا.
**الضّواع**: دنگو شینو ناڵە ناڵی باڵندەی بوم ئاسا.
**الضُّوَع**: باڵندەیەکە وەکوو بوم (کوندە بوو) کەهەست دەکا بەڕابوونی شەو نزیکبوونەوەی بەرەبەیان دەست دەکا بەخوێندنو ناڵە ناڵ ٥ (ك: أضواع وضيعان).
**ضان ضوناً**: وەچەو نەوەی زۆر بون.
**تضوّن**: بەمانا (ضان)دێ.
**الضّون**: جۆرە ڕوەکێکە وەکوو باینجان ٥ جۆرە مادەیەکە لەگەدەی گۆلكو کاریلەدا پەیدا دەبێ.
**الضّيون**: پشیلە نێرە ٥ (ك: ضَياوِن).
**ضَوى اليه ضيّاً وضوياً**: مەیلی ئەوی کرد، خوی دایە ئەو.

**ضوى فلاناً وغيره اليه**: فلانكەسی خستە گەڵ خۆی، بۆلای خۆی كێشی كرد.

**ضَوِيَ ضوىً**: زەعیفو لاواز بوو، یان باریك بوو.

**ضويت الإبلُ ونحوها**: حوشترەكە توشی نەخۆشی هەوكردن بوو.

**أضوى**: بەمانا (ضَوِيَ)دێ ٥ ئافرەتەكە منداڵی كزو لاوازی بوون ٥ لەحەدیث دا هاتووە (إغتربوا ولا تضووا): لەبێگانە ژن بێنن لەخزمی نزیكی خۆتان ژن مەهێنن بۆئەوەی منداڵی قونپوچتان نەبن.

**أضوى فلاناً**: فلانكەسی والێ كرد زەعیفو لاواز ببێ قونپوچ بێ.

**أضوى الأمرَ وغيره**: كارەكەی باش ئەنجام نەدا.

**أضوى حقهُ**: مافی پێشێل كرد، كەمی دایە، دەشگوترێ: (أضوى فلاناً حقه): مافی فلانكەسی بەتەواوی نەدا.

**إنضوى اليه**: خۆی پاڵ ئەودا، دەشگوترێ: (إنضوى تحت لوائه): چووە ژێر ئاڵای ئەوەوە.

**الضِواةُ**: لوێكە، یان شێوە لوێكە لەژێر نەرمەی گوێ پەیدا دەبێ ٥ هەر لوێك رەقو وشك بێ ٥ شوێن برینو شكاوی لەجەستەدا.

**ضاحت البلاد ونحوها ضَيحاً**: وڵات گرانیو قاتو قڕی تێدا نەما.

**ضاح اللبنَ**: شیرەكەی تێكەڵ بەئاو كرد هەتا وای لێ هات رێژەی شیرەكە زۆر كەم بوو، دەگوترێ: (عيش مضيوح): ژیانی تێكەڵ بەچورتمو تەنگو چەڵەمە.

**ضَيَّحَ اللبن**: ئاوی تێكەڵ بەشیرەكە كرد.

**ضَيَّح فلاناً**: ماستاوی رونی دا بەفلانكەس (دۆشینكەی دەرخوارد دا).

**تَضَيَّحَ فلان**: فلانكەس ماستاوی رونی خواردەوە.

**تَضَيَّحَ المستقى**: ئاو دەرەكە كاتێك هاتە سەر حەوزو بیرەكە زۆری ئاژەڵەكان ئاویان خواردبۆوە.

**الضَيّاح**: ماستێك زۆری ئاو تێكرابێ، بوبێتە دۆشینكە ٥ هەر دەرمانو زەهرێك ئاوی زۆری تێكەڵ بكرێ.

**الضَيِّح**: بەمانا (الضَيّاح)دێ.

**ضارَهُ كذا ضيراً**: زیانی پێ گەیاند ٥ قورئان دەفەرموێ: (﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾).

**ضاز ضيزاً**: خوار بوو، ستەمی كرد، دەگوترێ: (ضاز فلاناً وضاز حقه): ستەمی لێ كرد.

**الضِيزى**: (قسمة ضيزى): دابەشكردنی

ستەمكارانە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾.

**ضاع ضياعاً**: فەوتا، پاشگوێ خرا.

**أضاع فلان**: فلانكەس شتو مەكەكانی بلاو بوونەوە یان زۆر بوون.

**أضاع الشيئ**: شتەكەی فەوتاند، وای لێ كرد بفەوتێ.

**ضَيَّعَهُ**: بەمانا (أضاعه)دێ.

**الضائع**: هەژاری خاوەن خێزانو ماڵو منداڵ ٥ برسی ٥ (ك: ضُيَّع وضياع).

**الضَّيعةُ**: زەوی بەپیت ٥ كردەوەی بەسودو باش ٥ مامەڵەی پڕ خێرو بێر، دەگوترێ: (فشت عليه ضيعته): ماڵو سامانی زۆر بوون ٥ یان ئیشو كاری زۆر بون ٥ ئیشەكان زۆرو هەمەجۆر بوون ٥ (ك: ضياع وضِيَعٌ).

**المضياع**: كەسێك زۆر ماڵی خۆی بەفیڕۆ بدا (وهي مضياع ومضياعة).

**المَضْيَعة**: پاشگوێ خستن ٥ دەشتو سارای كاكی بەكاكی كە مرۆڤ سەری تێدا دەرناچێ ٥ هەرشتێك ببێتە هۆكاری لەناو بردنو فەوتاندنی ماڵو سامان وەكوو یاری قومارو گرەوو شتی لەوجۆرە.

**ضاف اليه ضَيفاً وضيافةً**: نزیك بۆوە لێیو وەگری بوو میوانداریی كرد.

**ضاف منه**: لێی ترسا.

**ضاف فلاناً**: بوو بە میوانی فلانكەس، دەشگوترێ: (ضافه الهم وغيره): خەمو خەفەت بوو بەمیوانی ٥ داوای لێ كرد میوانداریی بكا.

**أضاف اليه**: بەمانا (ضاف)دێ، دەشگوترێ: (أضاف الى صَوْته): وەگری بوو ویستی لێی نزیك بێتەوە.

**أضاف منه**: لێی ترسا ٥ (أضاف الشيئ اليه): شتەكەی پاڵ ئەودا خستییە پاڵ شتەكەی تر ٥ ئیسنادی دا نیسبەتی دا بۆلای فلان شت.

**أضاف فلاناً**: بەهانای فلانەوە چوو لەخۆی گرت، داڵدەی دا كردییە میوانی خۆی رێزی لێ گرت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا﴾.

**إنضاف اليه**: چووە پەنا ئەو، پاڵی بەوەوە دا.

**تضايف الوادي ونحوه**: شیوەكە تەسك بۆوە.

**تضايف فلان الوادي**: فلانكەس كەوتە ناو چاڵو چوێڵی شیوەكەوە كەوتە ناو تەنگەبەرایی شیوەكەوە.

**تضايف السبعان فلاناً**: دوو دڕندەكان

فلانکەسیان خستە نێوان خۆیانەوە.
**تضایف الکلاب ونحوها الصَّیْدَ وعلیه:** سەگەکە نێچیرەکەی خوارد.
**تضیَّفَ فلاناً:** وەگری فلان بوو، خۆشی ویست.
**استضاف فلاناً:** پەنای بردە بەر فلانکەس ٥ یان داوای لێ کرد میوانداریی بکا.
**استضاف منه الی کذا:** پەنای بردە بەر ئەو.
**الإضافة:** لەلای ئەحوییەکان بریتییە لەبەیەکەوە نانی دوو ناوو پاڵدانیان بۆلای یەکتر بەجۆرێك ناوی یەکەم ناسین یان تایبەتمەندی تایبەتی بۆ پەیدا ببێ ٥ لەلای زانایانی حیکمەت پەیوەندی نێوان دوو ناوە کەبۆنی یەکێکیان داخوازی بوونی ئەوی ترە وەکوو (الأبوة، الإخوة، البُنُوَّةُ، الصداقة).
**التضایف:** بەمانا (الإضافة)دێ.
**الضَّیف:** میوان ٥ بۆ نێرو مێو تاكو کۆ بەکاردەهێندرێ ٥ (ك: أضیاف وضیوف وضیاف وضیفان).
**الضِّیفُ:** تەنیشتو ئەملاو ئەولا، ئەمبەرو ئەوبەر، دەشگوترێ: (ضیف الوادي وضیف الجبل) ٥ (ك: أضیاف).
**الضَّیْفَنُ:** کەسێك بەشێوەی مندالبازاڕی شوێن میوان بکەوێو قەشمەری پێ بکا.
**المضاف:** کەسێك پاڵ بنەماڵەیەك بدرێو لەوان نەبێ (زۆڵەزابێ).
**المضوفة:** کاری ترسناك ٥ ئیشێك خەڵك ترسیان لێبێ.
**المِضیافُ:** کەسێك میوانی زۆر بێ.
**المضْیَفَةُ:** شوێنی میوانداریی ٥ (ك: مضایف).
**المضیفة:** بەمانا (المضوفة)دێ ٥ هەروا بەمانا غەمو ناڕەحەتی دێ.
**المُضیفُ:** کەسێك بانگی خەڵك بکا بۆ ئەوەی ببنە میوانیو خزمایەتیان بکا ٥ کەسێك خزمەتی ئەوانە بکا کە بەفڕۆکە هاتو چۆ دەکەن.
**المُضیفة:** ئەو کیژۆڵە تایبەتیانەن کەلەناو تەیارەدا خزمەتی گەشتیارەکان دەکەن.
**ضاق ضَیْقاً وضِیقاً:** تەنگە بەربوو ٥ وێکهاتەوە جێگای ئەوشتەی ئەکردەوە کەتێی کرابوو، دەشگوترێ: (ضاقت حیلته): فڕتو فێڵی دادیان نەدا.
**ضاق بالأمر:** بەکارەکە ناڕەحەت بوو.
**ضاق صدرهُ به:** شتەکەی بۆ قبوڵ نەکرا، پێی تێکچوو ٥ بەلایەوە گرانو قورس بوو.

**أضاق**: کەوتە ناو تەنگو چەڵەمەوە ٥ماڵو سامانی نەما، هەژار بوو، وای لێ کرد هەژار بکەوێ.

**ضايقه في كذا**: تەنگی پێ هەڵچنیو چاو پۆشی لێ نەکرد لەوکارەدا.

**ضَيِّقَهُ**: بەمانا (أضاقه)دێ.

**ضيق عليه**: ئیشەکەی لێ توند کرد.

**تضايق**: بەمانا (ضاق)دێ.

**تضايق منه**: لێی پڕ بوو، چاوپۆشی بۆ لێ نەکرا، نەیتوانی لێی بێدەنگ بێ یان نارازیبوونی خۆی بەرامبەر دەربڕێ.

**تضايق القومُ**: خەڵکەکە لەگەڵ یەکتر هەڵیان نەکرد، لەڕەوشتی یەکتر نارازی بوون، نەیانتوانی پێکەوە بژین هەریەکەیان تەنگی بەوەی تر هەڵچنی.

**الضِّيقُ**: هەژاریو نارەحەتی، هەرشتێك دڵ چەواشە بکاو ببێتە هۆی دڵە ڕاوکێو خەمو خەفەت.

**ضِيق النفس**: تەنگە نەفەسی ئەزمەیەکی جەستەییە توشی ئادەمیزاد دەبێ وەکوو نەخۆشی ڕەبوەو شتی وا.

**المضيق**: تەنگانەو کارەساتی ناخۆش ٥ ڕێڕەوی تەنگە بەری ئاو، تەنگڵ، تەنگە، وەکوو تەنگەی دەردەنیلو تەنگەی هورمز.

**أضال المكانُ**: شوێنەکە ڕووەکی (الضّال)ی لێ ڕوا.

**الضّال**: درەختی نەبقی کێوی کەبە باران ئاو بدرێ.

**الضّالة**: تاکی (الضّال) ٥ چەكو سیلاح یان تیر.

**ضامَهُ ضيماً**: ستەمی لێ کرد ٥ ژێر باری کرد.

**ضام فلاناً**: فلانکەسی لەکەدار کرد ٥ کەسایەتی شکاند ٥ زەرەر مەندی کرد.

**استضامه**: بەمانا (ضَامَهُ)دێ.

**الضّيم**: ستەمو چەوساندنەوە ٥ (ك: ضيوم).

**طـــاء**: پیتی شانزەهەمە لەزنجیرەی پیتەکانی هیجاء، شوێنی هاتنەدەرەوەی قەراخ زمانو بنکی ددانی پێشینی سەرەوەن، دەنگێکی قورسو بەهێزو داگرندەی زمانو مەلاشووە، زانایانی پێشوو وتویانە دەنگەکەی (مەجهوورە) ئێستا زۆربەی وڵاتانی عەرەب پێی دەڵێن (مەهمووسە).

**الطابور**: کۆمەڵێك سەرباز ژمارەیان لەهەشت سەدەوە بۆ هەزار ٥ ریزو چین ٥ لەهەندێ کتێبی قاموس دا نوسراوە (تابور).

**الطابور** الخامس: لەزاراوەی سیاسی دا بریتیە لەو هاووڵاتیانەی پەیوەندییان بەدوژمنەوە هەیە دژی وڵاتی خۆیان یان ئەو کەسانەی لەوڵاتێکدا نیشتەجێنو لەدژی ئەو وڵاتە پەیوەندی بەدوژمنەوە دەبەستن.

**طَأْطَأَ** من الشَّيء: لەشتەکەی داشکاند.

**طَأْطَأَ** من فلان: لەرێزی فلانکەسی کەمکردەوە.

**طَأْطَأَ** يده بعنان الفرس: جڵەوی ئەسپەکەی شل کرد.

**طَأْطَأَ** الحفرة ونحوها: چاڵەکەی قوڵ کرد.

**طَأْطَأَ** فرسه: ئەسپەکەی تاوداو بەئاوزەنگی لەکەلەکەی دا بۆئەوەی غاربدا.

**تطَأْطَأَ**: نزم بوو، بچوك بۆوە، دەگوترێ: (تَطَأْطَأَ له): خۆی بەبچوك دانا لەئاستی دا.

**طَامَنَ**: بڕوانە (طَمْأَن).

**طَـبَّ** فلان: فلان دەست ڕەنگینو کاردروست بوو، لێزان بوو.

**طَبَّ** بە: لەگەڵی دا لەسەرەخۆو هێدی بوو.

**طَـبَّ** المريضَ ونحوه طبّاً: نەخۆشەکەی دەرمان کرد، تیمار کرد، دەشگوترێ: (طَبَّ له أو لدائه): بۆی تیمار کرد یان چارەسەری دەردەکەی کرد ٥ جادوی لێ کرد.

**طَبَّ** الشَّيءَ: شتەکەی چاك کرد ڕێکی خست.

**طَبَّ** خُرَزَ السقاء ونحوه: کونی کوندەو مەشکەکەی بەچەرم پینەکرد.

**طَابَّهُ**: دەرمانی کردو چاکی کردەوە.

**طَبَّبَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (طَبَّهُ)دا.

**طَبَّبَ الخَيّاطُ الثَوبَ ونحوه**: خەیاتەکە پارچەیەکی خستە سەر قوماشەکە بۆئەوەی پان‌و فراوانی بکا.

**تَطَبَّبَ فلان**: فلانکەس دەستی وەردایە کاروباری پزیشکی بەلام تێیدا کارامە نەبوو.

**تَطَبَّبَ لـه**: پرسیاری بۆ لەپزیشکەکە کرد.

**إستَطَبَّ لدائـه**: پرسیاری بۆ لەپزیشکەکە کرد دەربارەی نەخۆشییەکەی ئاخۆ کام دەرمانەیان بۆ چارەسەری ئەو بەکەڵکە.

**اِستَطَبَّ بالدواء ونحوه**: چارەسەری خۆی کرد دەرمانی نەخۆشییەکەی کرد.

**الطِّبابُ**: چارەسەر.

**الطِّبابَـة**: پیشەی پزیشکی ◦ کونی لاکێشەیی لەقوماش یان کونێکە لەقوماش دەکرێ بۆئەوەی بەرفراوان بێ ◦ پارچە پێستەیەکی لاکێشەییە دەنوشتێندرێتەوە بەسەر قەراخی پێستێکی ترداو دەدروێ‌و تەریب دەدرێ بۆئەوەی کونە بچوکەکان داپۆشێ‌و پتەوی بکا ◦ ڕێگای درێژو باریك لەزەوی یان لە لمبەلان.

**الطَّـبُّ**: لێزانی‌و کارامایی ◦ دەست ڕەنگین‌و کاراما ◦ هاوڕێی لەسەرە خۆو کار دروست.

**الطُّبُّ**: لێزانی‌و کارامایی.

**الطِّبُّ**: چارەسەری جەستەو دەروون ◦ لەسەرە خۆیی‌و دەست سوکی‌و فێڵزانی ◦ جادو بازی ◦ داب‌و نەریت.

**الطَّبِیبُ**: پزیشك؛ کەسێك پیشەی پزیشکی بێ ئەوکەسەی خەریکی چارەسەری نەخۆش‌و دەردەداربێ ◦ زاناو بەئەزمون لەبواری پزیشکی دا ◦ دەست ڕەنگین‌و کاراماو لێزان ◦ هاوەڵی زمان پاراوو قسەزان ◦ (ك: أطِبَّةُ وأطِبّاءُ).

**الطَّبِیبَةُ**: کەلەبەری لاکێشەیی لەزەوی یان لەقوماش‌و هەورو پێست ◦ (ك:طبائب).

**طَبَخَهُ طَبْخاً**: کولاندی، کردی بەشۆرباو بۆ خواردن ئامادەی کرد ◦ برژاندی ◦ سوری کردەوە ◦ گەرمی کردو تواندییەوە، دەگوترێ: (طَبَخَ الآجر): خشتەکەی سور کردەوە، سوتاندییەوە.

**طَـبَخَ القِدرَ ونحوها**: ئەوەی لەناو مەنجەڵەکە دا بوو کولاندی، دەگوترێ: (طَبَخَ الحرُّ الثَمَرَ): گەرما میوەکەی پێگەیاند.

طَبَّخَ الطعامَ وغيره: زێدەڕەوی کرد لەکوڵاندنی خواردەمەنیەکە.
إطَّبَخَ: کاڵەك‌و گوندۆری پەیدا کرد.
إطَّبَخَ الشّيْءَ: شتەکەی کوڵاند.
إنْطَبَخَ: کوڵێندرا.
تَطَبَّخَ: کاڵەکی خوارد.
الطّابِخُ: لەرزوتای توند ٥ تای بەهێزو توندو بەردەوام.
الطّابِخَةُ: مێینەی (الطّابخ) ٥ گەرمای پێش نیوەڕۆ ٥ (ك:طوابخ).
الطُّبَاخَةُ: گوشراوی شتی کوڵاو ٥ ئەو کەف‌و کوڵەی بەدەوری لێواری مەنجەڵەوە دەبێ لەکاتی شت تێداکوڵاندن دا.
الطِّبَاخَةُ: پیشەی ئاشپەزی‌و خواردن دروست کردن.
الطَّبّاخُ: کێشت لێنەر کە گۆشت‌و شتی وا دەکوڵێنێ.
الطِّبّــاخ: کاڵــەك (بـەزمانی خەڵـکی مەدینە).
الطَّبِيخُ: کوڵاو.
الطَّبِيخُ: کوڵاو.
المَطْبَخُ: چێشتخانە ٥ دەگوترێ: (هو أبيض المَطْبَخ) بەکەسێك دەگوترێ رژدو چروك بێ ٥ (ك:مَطابخ).
المِطْبَخُ: ئامێری کێشت لێنان وەکوو مەنجەڵ‌و کەوگیرو تەباخ‌و ئەو جۆرە شتانە ٥ (ك:مَطابخ).
طَبَرَ طَبْراً: بازی دا ٥ خۆی شاردەوە، خۆی پەنادا.
الطَّبَرُ: جۆرە چەکێکی زۆر کۆنە وەکوو پاچ وایە.
الطباشير: تەباشیر؛ مادەیەکی سپی جیرییە لەسەر تەختە رەشەو شتی وا پێی دەنووسرێ.
طَبْطَبَ الماءُ ونحوه: ئاوەکە یان لافاوەکە لەکاتی جمبوش‌و هەڵسانی دا دەنگی لێوە هات ٥ هەڵبەزو دابەزی کردو شەپۆلی دان.
طَبْطَبَ الماءَ وغيره: ئاوەکەی شڵەقاندو وای لـێ کـرد دەنگـی لـێ بـێ ٥ هەڵبەزو دابەز بکا.
تَطَبْطَبَ الماءُ ونحوه: بەمانا (طَبْطَبَ)دێ.
الطَّبْطابــة: تەختــە دارێــکە یــاری تۆپتۆپێنی پێ دەکرێ.
الطَّبْطَبَةُ: لاسایی کردنەوەی دەنگی ئاو ٥ حیکایەت کردن ٥ خرمە خرم‌و تەپەتەپ‌و خشپە خشپی دەنگی قاچە لەکاتی رۆیشتن دا.
طَبَعَ الشّيءَ طبعاً وطباعة: شتەکەی چاپ کـرد، کـۆپی کـرد لەشـێوەیەك لەشێوەکان دا، دەگوترێ: (طبع الله الخلق): خودا بونەوەرەی لەوشێوەدا

هێناوەتە دی ◊ (طَبَعَتْ الدولة النّقد): حکومەت پارەی چاپ کرد، سکەی لێداو بەوشێوە خستیە بازاڕەوە.

**طَبَعَ** الإناءَ من الطين ونحوه: گۆزەو کیتەڵەی لەقوڕ دروست کرد، یان دەوری و پیاڵەی لەشوشە دروست کرد، نەقش و نیگارو رەسمی تێدا دروست کردن.

**طَبَعَ** الكتابَ: کتێبەکەی لەپیتە رصاص و مەعدەنییەکانەوە یان لەفلیم و لەوحەکانەوە یان لەدیسك و میمۆرییەوە خستە سەر کاغەزو چاپی کرد.

**طَبَعَ** فلاناً على كذا: فلانکەسی لەسەر ئەو جۆرە ڕەوشتە راهێناو پەروەردەی کرد.

**طَبَعَ** الشَّيْءَ وعليه: شتەکەی مۆرکرد، ئیمزای کردو خستیە کیسەوەو خەتمی کرد، مۆری لێ دا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿خَتَمَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾: خودا دڵی ئەو کافرانەی داخستوەو خێرو فەڕ وەرناگرن و شتی بەکەڵك ناچێتە ناو دڵیانەوە.

**طَبَعَ** الدابةَ: باری قورسی وای لەوڵاخەکە بارکرد کەنەیتوانێ.

**طَبَعَ** الشَّيْءَ: شتەکەی چڵکن کردو خراپی کرد.

**طَبِعَ** طبعاً: پیس بوو، عەیبدار بوو جا چ لەبواری جەستەیی دا بێ یان لەبارەی ڕەوشتەوە بێ.

**طَبِعَ** السَّيْفُ: شمشێرەکە ژەنگاوی بوو.

**طَبِعَ** الثوبُ: قوماشەکە زۆر پیس و چڵکن بوو.

**طَبِعَ** فلان: فلانکەس پیاوەتی لەدەست هەڵنەهات و هیچ رۆڵێکی نەبوو لەبواری چاکە کاری دا ◊ (فهو طَبِعٌ وطبعٌ).

**اطبَعَهُ**: باری قورسی لێبارکرد ◊ کۆڵی گرانی لەکۆڵی دا.

**طَبَّعَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (طَبَعَهُ)دێ.

**طَبَّعَهُ** على كذا: لەسەر ئەوشتە رای هێنا ◊ چڵکن و پیس و پۆخەڵ کرد ◊ باری قورسی لێبارکرد.

**إنْطَبَعَ**: بۆ موطاوەعەی (طَبَعَهُ)دێ.

**تَطَبَّعَ** بكذا أو بطباعه: ئەو ڕەوشتەی گرت، بەو ڕەوشت و شێوازەوە راهات.

**تَطَبَّعَ** الإناء بالماء: قاپەکە پڕبوو لەئاوو سەرڕێژی کرد.

**الطّابَعُ**: ئەوەی شتی پێ چاپ و کۆپی دەکرێ یان پێی مۆر دەکری ◊ ئامێری داخکردن و نیشانەکردن ◊ ڕەوشتی باوو بەربڵاو ◊ پولی بەرید، ئەو پولەی دەوڵەت چاپی دەکاو برێ

نرخی لەسەر دیاریی دەکاو بەزەرفی نامەو شتی واوە دەلکێندرێ.

**الطَّابَعُ**: بەمانا (الطابَعُ)دێ ٥ تەبیعەتو ڕەوشت ٥ دەگوترێ: (لە طابع حسن): ڕەوشتی جوانی هەس.

**الطِّباعَةُ**: پیشەی چاپکردنو کۆپی کردن ٥ دەرکردنو چاپکردنی چەند نوسخەیەك.

**الطَّبيعُ**: کاکڵەی لاسکی طەلع ٥ کرکراگەی طەلع.

**الطَّبْعُ**: ڕەوشت ٥ شێوەو شێوازو صیفەی شت ٥ لەبواری زانیاری دەروونناسی دا کۆمەڵێك دیاردەو ئاکارو ڕەفتارو هەستو سلوکن کە مرۆڤ پەیدایان دەکا، یان بۆماوەو میراتین، بەهۆیانەوە ئەم کەسە لەوکەسە جیادەبێتەوە ٥ (ك:طِباع وأطباع).

**الطَّبَعُ**: چڵكو پۆخەڵی زۆر ٥ ژەنگ ٥ عەیبو لەککە.

**الطَّبِعُ**: چڵکن ٥ ڕەوشت ناشیرین.

**الطَّبِيعُ**: بەمانا (الطَّبعُ)دێ.

**الطَّبيعة**: ڕەوشتو سروشت ٥ میزاجو پێکهاتەی ئادەمیزاد ٥ هێزو توانایەکە لەجەستەدا بەهۆیەوە جەستە دەگاتە پلەی بەرزی سروشتی خۆی.

**طبيعة** النار: ئەو سروشتەی کە خودا لەئاگردا دروستی کردووە کەسوتاندنو گەرمییە.

**طبيعة** الدواء: ئەو هێزە کاریگەرەیە کەلەدەرمانەکەدایە.

**علم** الطبيعة: زانیارییەکە دەربارەی سروشتی شتەکانو ئەو هێزەی تیایاندایە.

**الطَّبائع** الأربع: بەلای حوکەماو زانا سروشت ئاسە کۆنەکانەوە بریتین لەگەرمیو ساردیو تەڕیو وشکی.

**الطبيعي**: شتێك پاڵ طەبیعەت بدرێ.

**المطبعة**: چاپخانە؛ شوێنی چاپکردنو کۆپی کردنی کتێبو شتی وا ٥ کۆمەڵێك ئامێرو کەرەسەی بەکارهێنان بۆ چاپکردنو کۆپی کردن.

**المَطْبوع**: ئەوەی لەسەری ڕاهێندراوە ٥ چاپکراوو بڵاوکراوە ٥ فێربوو کارامەو لێزان ٥ دەگوترێ: (فلان مطبوع في فن كذا): فلانکەس لەوفەنو ئیشەدا دەست ڕەنگینو کارامەیە ٥ (فلان مطبوع على الكرم): فلانکەس ئانبدەییو پیاوەتی سروشتو تەبیعەتیەتی لەسەر ئەو ڕەوشتە بەرزە خولقاوە.

**اطبق** القومُ على كذا: خەڵکەکە لەسەر

ئەو شتە كۆكو يەك ڕاو بيرو بۆچون بوون.

**اطبقت** عليه الحمى: بەردەوام لەرزو تای بوو شەوو ڕۆژ بەری نەدا.

**اطبق** الليلُ: شەو تاريك بوو، تاريكی داهات.

**اطبق** الشّئ: چينێكی لەشتەكە لەسەر چينەكەی تر داناو ڕێكی خست.

**اطْبَقَ** الرّحَى: بەرداشی سەرەوەی خستە سەر بەرداشی ژێرەوە.

**اطْبَقَ** فَمَهُ: دەمی قوچاند، لێوەكانی پێكەوە نوساندن.

**اطْبَقَ** شفتيه: لێوی پێكەوە نوساندن.

**اطْبَقَ** الشّئُ الشّئَ: شتەكە شتەكەی تری داپۆشی، دەگوترێ: (أطبق السحابُ السماءَ): هەور ئاسمانی داپۆشی.

**اطْبَقَ** الثلجُ الأرضَ: بەفر زەوی داپۆشی.

**طابق** الفرسُ في مشيه: ئەسپەكە لەرۆيشتن دا قاچی لەجێی دەستی دانا.

**طابق** المقيّدُ: پێوەند لەپێكە ڕۆيی، هەنگاوی كورتی هەڵێنا.

**طابق** فلاناً: هاوڕای فلانكەس بوو ٥ يارمەتی دا.

**اطبق** على الأمر: لەكارەكەدا يارمەتی داو هەمئاهەنگی كرد.

**طابق** الشيء على الشّئ: بەمانا (أطبقه)دێ.

**طابق** بين الشيئين: دوشتەكەی بەرامبەر يەكتر كردن.

**طابق** بين قميصين: دوكراسەكەی لەسەر يەكتر لەبەر كردن.

**طبّق** الجازرُ: قەصابەكە جومزگەی كوشتييەكەی بڕييەوە.

**طَبَّقَ** الحاكمُ: دادوەرەكە بڕيارو فەرمانەكەی ڕێكودادوەرانە بوو.

**طَبَّقَ** الفرسُ ونحوه: ئەسپەكە هەردو دەستی بەيەكەوە هاويشتنو بەيەكەوە داينان لەغاركردن دا.

**طَبَّقَ** الشّئَ: بەمانا (أطبقه)دێ.

**طَبَّقَ** الشّئَ على الشّئ: شتەكەی خستە سەر شتەكەی تر.

**طَبَّقَ** المصلّي أو الراكع كفيه أو يديه: نوێژكەرەكە لەركوعو تەحيات خوێندن دا دەستی خستنە ناو رانيەوە يان نێوان ئەژنۆكانيەوە، ئەمەش كارێكی باش نيەو نەهی لێكراوە ٥ دەشگوترێ: (طَبّقَ السحابُ الجوَّ): هەورەكە بەری ئاسمانی گرت ٥ (طَبَّقَ الماء وجه الأرض): ئاوەكە زوربەی زەوييەكەی داپۆشی.

**إنطبق**: شتەکان پاڵیان لێکداو کەوتنە سەریەك.

**إنطَبَقَ** علیە کـذا: لەگـەڵی گونجـاو موناسیبی بوو ٥ کەوتە سەری.

**تطابقا**: ئـەو دوو شـتە وەك یـەك هاتنـەوەو لێـك چـونو بەرامبـەر بوون.

**تطَبَّقَ**: بەمانا (إنطبق)دێ.

**الإطْباقُ**: ئەوەیـە لـەگوتنی پیتەکـەدا هەردو فەراخی زوبان بۆلای مەلاشو بەرزبکەیتـەوەو دەنگـی پیتەکـە بەگـەورەیی بێتـە دەر ٥ پیتـەکانی (الأطباق)چوارن (ص.ض.ط.ظ).

**التطبیـق**: راهێنـانو کردنـی یاسـا نـەظـەرییـەکان بـۆ پـەیرەوکردنیان بەشێوەی عەمەلیو زانستی.

**الطَّابَق**: بەرامبـەر ٥ مەنجـەڵو تـاوەو شـتی وا کەشـتی تێدا بکوڵێنـدرێ ٥ خـشتی سـورەوەکراوی گـەورە ٥ (ك:طوابق وطوابیق).

**الطِّبَـاقُ**: بـەمانا (المطـابَقُ)دێ بـەلای زانایانی زانستی جوانکاریی (البدیع) کۆکردنەوەیـە لـەنێوان دومانـای جیاواز وەکوو (مردنو ژیان، تاریكو رونـاك ...هتـد) ٥ هـەروا وشـەی (الطِّباق) کۆی (طبقة وطبـق) ٥ هەر لـەم مانایـەدا کـە دەگـوترێ: (الـسماوات الطِّبـاق) لـەم ڕووەوە کەئاسمانـەکان چـین لەسـەر چـین لەسەر یەکن.

**الطّباقاءُ**: ئەوکەسەیە کە ئەرکەکانی سـواری یـەك بـوونو هـەموو کـاتی ژیانی گیراوەو هیچ کاتێ بێ ئـیش نییـە ٥ کەسێـك کـە قـسەدەکا لێوەکانی وێك دێنەوە.

**الطُّبَـاقُ**: گیـا دوکەڵـە؛ ڕوەکێـکی تەمەندرێژە لەپێری تێکەڵەی گوڵە لولەییـە، لەهەنـدێ دەفـەری شام دا بـۆ پـەرژینو پارێزگـاریی تـرێ بەکاردێ.

**الطِّبْقُ**: هاوشانو چونیەكو هاوشێوە.

**الطَّبَقُ**: بەرامبەرو هاوشـان ٥ پـەردەو داپۆشـەر ٥ قـاپو دەوری شـت تێـدا خـواردن ٥ حـاڵو وەزعو مـەنزڵو پایە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَتَـرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ ٥ دەشگوترێ: (بـات یرعی طَبَقَ النجـوم): شـەو چاودێری ئەسـتێرەکانی کـرد چـۆن دەڕۆنو حـاڵو وەزعیـان چـۆنە ٥ لـەبواری پزیشکی دا بریتییە لە غوضـروفو ئەو پارچە لینجەی دەکەوێتە نێوان هـەموو دوو فەقـەرەی موراغـەی پشتی ئادەمیزادو گیانلەبەری تر.

**اطباق** الرأس: ئێسقانی سەر.

بنات طَبَق: کیسەڵ.

الطَّبْقَةُ: تەڵەو داو.

الطَّبَقَةَ: چین دوا چین ◊ خەڵکانی هاوتەمەنو هاوچەرخ ◊ حاڵو وەزعو پلەو پایە ◊ فەقەرەیەك لەفەقەرەکانی پشت ◊ توێژێکی زەوی ◊ لەبواری زانستی زەوی ناسی دا بریتییە لە توێژێکی یەك شێوەیی بەردی رسوبی کەلەرەنگو پێکهاتە دا لە توێژی ژێر خۆیەوە جوداوازە ◊ وەکوو چینی بەردی رەملی، چینی بەردی جیری.

المُطبَّقُ: ئەوشتەی توێکڵی مرواری پێوە چەسپ دەکرێ تاوای لێ دێ هەردەڵێی خودی مرواریيەکەیە.

المُطْبَقُ: (رجلٌ مُطْبَقٌ علیه): پیاوێکە لەهۆش خۆی چووە.

المُطْبِقُ: بەندیخانە لەژێر زەوی دا ◊ جۆرێکە لەشێتی هەمیشەییو بەردەوام دەگوترێ (جهل أو جنون مُطْبِقٌ) نەزانی یان شێتی بەردەوامو هەمیشەیی ◊ (حُمىً مُطْبِقَةٌ): لەرزوتای هەمیشەییو بەردەوام.

المَطْبَقِيَة: ئامێرێکە لەمەتبەخ دا چینەکانی قاپو قاچاخو کەرەستەکانی کێشت لێنانی پێ ریز دەکرێ.

طَبَلَ طَبْلاً: تەپڵی لێ دا.

طَبَّلَ: زۆری تەپڵ لێ دا.

التَّطَبُّلُ: لەبواری پزیشکی دا هەڵاوسانی ریخۆڵەیە وەکوو لەئاکامی گرانەتادا دێتە دێ.

الطِّبالة: پیشەی تەپڵ لێدان.

الطَّبَّالُ: خاوەن تەپڵ ◊ تەپڵ لێدەر ◊ یان زاناو کاراما لەتەپڵ لێدان دا.

الطَّبْلُ: تەپڵ ◊ ئامێرێکە پێستێکی پانی لەسەر قایم دەکرێو بەدارێکی تایبەتی لێی دەدرێ، زوربەی تەپڵەکان دووو رون، واتە لەدولاوە پێستی لێ شەتەك دەدرێ ◊ (ك:طبول وأطبال).

برود الطبل: پارچە قوماشێکە فەرمانرەواکانی میصر کاتی خۆی لەبەریان کردوە.

الطَّبْلَةُ: تەپڵ ◊ بەزۆری بەتەپڵێك دەگوترێ کەیەك روبێ.

الطَّبْلِيَّةُ: شتێك پاڵ تەپڵ بدرێو پەیوەندی بەتەپڵەوە هەبێ ◊ سفرەو خوانێکە نانی لەسەر دەخورێ ◊ (ك:طبالي).

طَبَنَ النارَ طَبْناً: ئاگرەکەی ژێر گڵ دا بۆئەوەی پشکۆ ئاگرەکان نەکوژێنەوە، نەبن بەخۆڵ.

طَبَنَ الشَّيءَ ولـه وبـه طبناً وطبانةً: بەشتەکەی زانیو بۆی رون بۆوە.

**طَبَنَ** فلاناً ولـه: فێڵی لەفلان کردو نائومێدی کرد.

**طَبِنَ** له وبه: بەمانا (طَبَنَ)دێ.

**طابَنَهُ** مُطابنة وطِباناً: نرخو بەهای کەمکردەوە لەرێزو شکۆمەندی شکاند.

**الطّابُونُ**: ئەوچاڵو قوڵکە گەورەیەی پشکۆ ئاگری تێدەکرێ بۆئەوەی پشکۆ ئاگرەکان نەبنە خۆڵەمێش و نەکوژێنەوە ٥ ئێستا ئەم وشەیە بۆنانەوەخانە بەکاردێ، هەروا بۆ فرن بەکاردێ.

**الطُّبْنُ**: هەردارو پەردویەك هەبێ شتی پرو پوچ ٥ خانوی لەگڵو قوڕ دروستکراو.

**الطُّبْنَةُ**: دەنگی تەنبور ٥ (ك:طُبَنٌ).

**طَبَاه** اليه طَبْواً: بەشێوەیەکی جوان و نەرمو نیان بانگی لێ کرد ٥ رابەرایەتی کرد.

**طَبِيَتْ** الناقةُ وغيرها: گۆی گوانی حوشترەکە شل بوو.

**إطَّبَاهُ** اليه: دەگوترێ: (إطّبى القلوبَ): خۆی لەدڵی خەڵك دا خۆشەویست کرد ٥ بەفێڵ و تەڵەکە خۆی لێ نزیك کردەوەو فرسەتی لێ هێناو کوشتی.

**الطِّبْواءُ**: حوشترێك گۆی گوانەکانی شل بوو بێ.

**الطِّبْيُ**: گۆی گوانی حوشتر ئەوبەشەی بێچو لەکاتی مژینی شیردا دەیخاتە دەمی خۆیەوە ٥ وادەبێ بۆ هەموو گوانەکە بەکاردێ ٥ (ك:أطْبَاءُ) ئەمە تەنها بۆ ئاژەڵ بەکاردێ.

**الطبوغرافية**: شێوازی روبەری زەوی بەگشتی جا سروشتی بێ یان دەست لێ دراو بێ.

**طَثَّهُ** طَثّاً: بەدەست هاویشتی ٥ لێی داو پاڵی پێوەنا بۆئەوەی لەشوێنی خۆی لایبەرێ.

**الطَّثْرَةُ**: بڕوانە وشەی (الطَّعرةُ).

**طَجَنَ** الشَّيْئَ طَجْناً: شتەکەی لەتاوەو مەنجەڵ دا سورکردەوە.

**طَجَّنَهُ**: بەمانا (طَجَنَهُ)دێ.

**الطَّاجِنُ**: تاوە؛ قاپی شت تێدا سورکردنەوە، قاپێکی لەقوڕ دروستکراوی خڕو کیتەڵەیی خۆراکی تێدا دەبرژێندرێ لە فڕن دا ٥ (ك:طواجن).

**المُطَجَّنُ**: ئەو کێكو خواردنانەی لەکیتەڵەو شتی وادا لەناو فڕن دا دەبرژێندرێ، دەگوترێ: (قَلِيَّة مُطَجَّنَةٌ).

**طَحَّهُ** طَحّاً: بەپاژنە پێی شێلای.

**اطَحَّهُ**: بەری دایەوە، فڕێی دا.

**إنْطَحَّ**: كرایەوە کەیفخۆش بوو.
**طَحَرَ طَحْراً وطُحاراً وطَحيراً**: نالاندی، هەناسەی سواربوو، بەهۆی بار قورسیو تەنگە نەفەسییەوە هانکاندی.
**طَحَرَ الشَّيءَ طَحْراً**: شتەکەی هاویشت، دەشگوترێ: (طَحَرَتْ عينُ الماءِ الطحالِبَ): کانیاوەکە قەوزەی هەڵێنا.
**طَحَرَتْ القوسُ السَّهْمَ**: کەوانەکە تیرەکەی هاویشت.
**طَحَرَ الحجامُ ونحوه القُلفةَ**: خەتەنەکەرەکە پێستی وانێکی بڕی.
**الطُحارُ**: ئەوکەسەی کەوا هەناسەی سوار بوو تەنگە نەفەس بوو لەکاتی هەناسەدان دا نیخە نیخو ناڵە ناڵی کرد.
**الطَّحورُ**: کەوانێك تیرەکە دور بهاوێ.
**طَخْطَخَ**: بەهێواشی پێکەنی.
**طَخْطَخَ الشَّيءَ طَخْطَخَةً وطِخْطاخاً**: شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کردو فەوتاندی، دەگوترێ: (طَخْطَخَ بهم الدَّهْرُ): رۆژگار تێکی شکاندنو فەوتاندنی.
**تَطَخْطَخَ**: بۆ موطاوەعەی (طَخْطَخَة)دێ.

**طَحَلَهُ طَحْلاً**: سپڵی هەنگاوت.
**طَحِلَ طَحَلاً**: سپڵی گەور بوو.
**الطِّحالُ**: سپڵ؛ ئەندامێکە لەنێوان گەدەو پەردەی لەمپەڕ لەلای چەپی سك دایە ئەرکی ئەوەی هەیە خوێن دروست بکاو خڕۆکە کۆنەکان لەناو بەرێ ◦ (ك:طُحْلٌ واطْحِلَةٌ).
**الطُّحالُ**: دەردێکە توشی سپڵ دەبێ.
**الطَّحِلُ**: ڕەشو لێڵ ◦ رق هەڵساو تورە.
**الطَّحْلاءُ**: مێینەی (الأطْحَلُ) ◦ (ك:طُحْلٌ).
**الطَحْلَةُ**: ڕەنگێکە لەنێوان تۆزاویو سپی دا ◦ ڕەنگی تێکەڵ لەسپیو ڕەش ◦ ڕەنگێك لەشێوەی ڕەنگی قەوزەدایە.
**طَحْلَبَ الماءُ**: ئاوەکە قەوزەی سەرکەوت.
**طَحْلَبَتْ الأرضُ**: زەوییەکە بەهۆی لێروانی گزوگیاوە ڕەش هەڵگەڕا.
**الطُّحْلُبُ**: سەوزاییەکە سەرئاوی راوەستاو دەگەوێ ◦ قەوزە؛ ڕوەکێکە بەسیتو بێ گوڵو بێ ڕەنگو گەڵایە چەند جۆرێکی هەیە، سەوز، زەرد، بوننیو سروشتین لەئاوی شیرینو سوێردا دەژی هەروا لەزەوی شێدارو تەڕدا هەیە ◦ (ك:طحالب).
**طَحَنَ الحبَ وغيره طَحْناً**: دانەوێڵەکەی

هـاڕیو کـردی بـەئارد، دەگـوترێ: (طحنـتهم الحـرب وأحـداث الأيـام): شەڕو روداوی رۆژگار ئەو خەڵکەی هاڕی، تەفرو توناى کردن.

**طَحّنَهُ**: زێدەڕەوی کرد لەورد هاڕینی دا.

**الطاحِنَة**: خرێ؛ ئەو ددانانەی خواردن ورد دەکـەن (١٢)ددانـن دەکەونـە دوا ئـەو ددانانـەی لـەکاتی پێـکەنین دا دەردەکەون، پێیان دەگوترێ هاڕەڕ ◊ (ك:طواحين).

**الطّاحونُ**: ئاش ◊ ئا مێری شت هـاڕین ◊ دەستاڕ ◊ بەرداش ◊ (ك:طواحين).

**الطحانَـةُ**: هـاڕین ◊ پیـشەی هـاڕین ◊ ئاشەوانی.

**الطَحَـــان**: ئەوکەســـەی لـــەئاش دا کاردەکات، ئاشەوانی.

**الطَحّانة**: مێینەی (الطَحّـان)ە ◊ هـەروا ناوە بۆ ئاشو ئامێری شت هاڕین.

**الطِّحْنُ**: هاڕدراو، ئەوشتەی وردکراوە ◊ ئارد.

**الطُحَنَـــةُ**: ئـــەوەی زۆر ورد کرابـــێ، ئەوکەسەی زۆر شت وردبکا ◊ کورتە باڵا، کوڵەبنە.

**الطَّحُونُ**: ئاشەوان، ئەوکەسەی لـەئاش دا کاربکـا ◊ کەتیبـە سـەربازی زۆر گەورە کەهەرچی بیگاتێ بیپرووێنێ، هەموشتێـك تارو مار بکا، دەگوترێ: (حرب طحون): شەڕی تـارو مارکـەر شـەڕی ئەسـتەم کەهـەموو شتێـك بهاڕێ.

**الطَّحِينُ**: وردکراو ◊ ئارد ◊ هاڕاو.

**الطَّحينةُ**: تلپەی کونجی دوای گوشینی، کەئـەم گوشـراوە لەدروسـتکردنی شیرینەمەنی دا بەکاردەهێنرێ.

**المِطْحَـانُ**: مـاری پاپۆکـە بەسـتو ◊ (ك:مطاحين).

**المَطحَنُ**: ئامێری هاڕینو شوێنی شت هاڕین.

**المِطْحَنَـــةُ**: ئـــامێری هـــاڕین ◊ (ك:مَطَاحِن).

**طَحَـا** طَحْـواً: دوورکەوتـەوە ◊ لەهـەموو لایەکەوە گەمارۆ دراو.

**طَحَا** المكانُ: شوێنەکە پانو فراوان بوو.

**طَحَـا** الـشَّيْ: شـتەکەی پـان کـردەوە، رایخـــست ◊ بـــەرفراوانی کـــرد ◊ هاویشتی، دەگوترێ: (طَحَا بالكرة).

**طَحّى**: کرایەوە، پان بۆوە، درێژ بووە ◊ ڕەپــەو ڕوو ڕاکــشا ◊ بەزەوییـــەوە نوساو هەڵنەستا هەردانیشت.

**تَطَحّى**: بەمانا (طَحّى)دێ.

**الطّحا**: دەشتاییو تەختایی لەزەوی.

**المُطَحَيَّةُ**: ڕوەکـی پانـەوەبوو بەسـەر زەوی دا وەکـو ڕوەکـــی پـــەیکوڵو

کاڵەکو ترۆزیو پەڵپینە ... هتد.

**طَخَّ** طَخّاً وَطَخوخاً: چەموش بوو، ڕەوشتی ناشیرین بوو.

**طَخَّ** الـشَّيْءَ: شـتەکەی فـڕێ داو دوری خستەوە.

**المِطَخَّةُ**: ئامێری شت دوور خستنەوە ٥ (ك:مطاخ).

**طَخَا** الليلُ ونحوه طخواً: شەو تاریك بوو، تاریکیەکـەی پـەرەی سـەندو زۆر تاریك بوو.

**الطَّخـاء**: پەردە کە شتی تـر داپۆشـێ ٥ دەگوترێ: (على قلبه طخـاء): پـەردە بەسـەر دڵـیـەوە هەیـە داپۆشـیوە، پەردەی خەمو خەفەت یان پـەردەی نەزانی دڵی داپۆشیوە ٥ هەوری بەرز کەزۆر لەزەوی دووربن.

**الطَّخواء** من الليالي ونحوها: شەوی زۆر تاریك.

**الطَّخْيـاءُ**: بـەمانا (الطخــواء) دێ ٥ رستەی قسە کەمانا نەگەیەنێ.

**الطَّخْيَةُ**: تاریکی زۆر ٥ پەڵە هەور.

**طَـرَأَ** طـراءاً وطـروءاً: پەیـدا بـوو، هاتـە پێـشەوە، سـەری هەڵـدا ٥ لـەناکاو دەرکەوتو پەیدا بوو.

**طَرُأَ** طَرَاءَةً: ناسكو تەڕو تازە بوو ٥ (فهـو طریءٌ).

**طَرَّأهُ**: ناسـکی کـرد وای لێـکرد تـەڕو تازەبێ.

**الطارِئُ**: غەریبو بێـگانە ٥ (ك:طُـرّاء وطُــرَآء) ٥ بـۆ جگـە لـەئادەمیزاد دەگوترێ (طواري).

**الطّارِئة**: مێنەی (الطارئ)ە ٥ بەڵایـەك نەزانــدرێ لــەکوێوە هــاتووە ٥ (ك:طوارئ).

**الطُّرآنيُّ**: بەڵاو کارەساتێـك نەزانـدرێ لـەکوێوە هـاتووە، دەگـوترێ: (کـلام طرآنـي): کەلامێـکە لەچوارچێوەی ئەدەبو ڕەوشت بەرزیی دا نیە.

**طَرِبَ** طَرَبـاً: کـەیفخۆشو تـەڕدەماخ بـوو، لەخۆشـیو تـەڕدەماخی دا هـەموو جەسـتەی پێدەکـەنێ، یـان لەغـەمو ناڕەحـەتی دا دەهـەژێ، دەگـوتری: (طَـرِبَ الغنــاء): گـۆرانی بێژەکـە خۆشنود بوو گەشەی کـرد ٥ هەموو جەستەی لەخۆشی دا هـەژا ٥ (فهـو طرِب وطروب وهي طروب وطروبة).

**اطْرَبَهُ**: وای لـێ کرد کەیفخۆش بێ.

**طَرَّبَ**: گۆرانی گوت.

**طَـرَّبَ** في صـوته: دەنگـی لەرانـدەوەو ناسکی کردەوە.

**طَـرَبَ** فلانـاً: فلانکەسـی هێنایـە حاڵەتی خۆشیو شادمانییەوە.

**اسـتَطْرَبَ**: بـەمانا (طَـرَبَ)دێ ٥ داوای گۆرانی گوتنو خۆش رابواردنی کرد.

**إسْتَطْرَبَ فلاناً**: داوای لەفلانکەس کرد گۆرانی بڵێو شادمانی بەرپا بکا ٥ یان فلانکەسی هێنایە جونبوش‌و گۆرانی گوتن.

**الطَّرَبُ**: لەرزەو خۆشی‌و تەڕدەماخییەکە توشی دەرونی ئادەمیزاد دەبێ بەهۆی پەیدابوونی حاڵەتی فەرەح بەخش، یان لەرزین‌و غەم کەبەسەر ئادەمیزاددا دێ حاڵەتێکی نائاسایی بۆ دێتە جێ جم‌و جوڵ‌و هەژانی بۆ پەیدا دەبێ ٥ بەزۆری وشەی (الطَّرَب) بۆ خۆشنودی دڵ‌و تەڕدەماخی بەکاردێ ٥ هەروا بۆ گۆرانی‌و هەڵپەرکێ بەکاردێ.

**الطَّرُوبُ**: کەسێك زووبکەوێتە حاڵەتی خۆشنودی‌و جونبوشەوە ٥ شتی فەرەحبەخش زووکاری تێبکاو بیهەژێنێ ٥ (ك:طِرَابَ).

**المُطْرِبُ**: گۆرانی بێژ ٥ گۆرانی بێژی دەنگ خۆش‌و شارەزا لەگۆرانی گوتن دا.

**الطُّرْبِيدُ**: گوللە تۆپێکی گەورەیە کەشتی دەریایی یان فڕۆکەی شەڕ دەیهاوێژێ بۆ زیان گەیاندن بەکەشتی دوژمن.

**الطَّرْبوش**: تەربوش، کلاوێکی سورە لەخوری‌و شتی وا دروست دەکرێ، جاری واهەیە قوماشێکی سپی لێ دەهاڵێندرێ، پێش نوێژو خوتبەخوێنی موسوڵمانان لەسەری دەکەن ٥ (ك:طرابیش).

**طَرْبَلَ فلان**: فلانکەس داوێنی خۆی بەسەرزەوی دا راکێشاو لەرۆیشتن دا شل‌و شێواو بوو.

**الطِّرْبَالُ**: نیشانەو بورج‌و سەنگەرێکە لەسەر تۆپەڵاکی کێو دروست دەکرێ ٥ هەربینایەکی بەرز بێ وەکوو منارەو شتی وا ٥ هەرلوتکە شاخ‌و دیوارێکی بەرز هەڵچوو بۆلای ئاسمان ٥ (ك:طرابیل).

**الطِّرْبِيلُ**: جەنجەڕ؛ ئامێرێکە گەنم‌و جۆی درواوەی پێ ورد دەکرێ، ولاغێك یان دوو ولاخ رایدەکێشن بەکەوانەیی بەناو کرشەکەدا دەخولێنەوەو کرشەکە ورد دەکەن تادەبێتە کا ئەوکات بەشەنەو لەشوێنێکی بەرەو با خەرمانەکە وردە وردە بەربا دەدا تادانەوێڵەو کاکە لەیەکتر جیادەبنەوە، بەوکارە دەگوترێ خەرمان سورکردن ٥ (ك:طرابیل).

**الطُّرْثُوث**: روەکێکی مشەخۆرە لەپێری (السنومورية)یە جۆرێکی تری هەیە درێژکۆڵەو باریك

لەچۆڵەوانی وڵاتی میصرو کەناری دەریای رۆم دەڕوێ.

**طَرَحَ** الشَّیْءَ وبه طرحاً: شتەکەی فڕێ دا، هاویشتی، دەگوتری: (طرحت به النوی کل مطرح): دوریو غەریبی بەهەموو لایەکی داداو هەڵیدایە هەموو کونو قوژبنێکەوە.

**طَرَحَ** عدداً من عدد: ژمارەیەکی لەژمارەیەکی زۆر تر دەرکرد.

**طَرَحَ** علیه شیئاً: شتێکی بۆ هاویشت، شتێکی خستە سەر ٥ شتەکەی بڵاو کردەوە رایخست.

**طَرَحَ** علیه المسألة: مەسەلەکەی خستە بەردەمیو داوای لێکۆڵینەوەی لێ کرد ٥ کارەکەی خستە بەردەستی.

**طَرَحَ** الشَّیْءَ عنه: شتەکەی لێ فڕێ داو لێی دوورخستەوە.

**طَرِحَ** طَرَحاً: دوورکەوتەوە ٥ (فهو طَرِحٌ).

**طارحهُ الحدیثَ ونحوَه**: گفتو گۆی لەگەڵ کردو راوو بۆچونیان لەگەڵ یەکتر گۆڕیەوە.

**طَرَّحَ** الشَّیْءَ: بەمانا (طَرَحَهُ)دێ.

**طَرَّحَ** البناءَ: باڵەخانەکەی زۆر بەرزکردەوە، فراوانی کرد.

**إطَّرَحَهُ**: بەمانا (طَرَحَهُ)دێ.

**إنْطَرَحَ**: بۆ موطاوەعەی (طَرَحَهُ)دێ.

**تطارحا** الحدیثَ ونحوه: بیرو بۆچونو قسەو گفتو گۆیان گۆڕیەوەو دانوسانیان کرد.

**تَطَرَّحَ**: بە لۆژە لۆژ رۆیيو لاتە لاتی بوو ٥ تەیلەسانی لەبەرکرد.

**الأطروحة**: پێش نیازکردنو بیرو رادەربڕین بۆ لێکۆڵینەوەو دانو سان تێیدا ٥ مەسەلەو باسو خواسێک بۆ لێکۆڵینەوە بخرێتە بەر دانو سان ٥ (ك:أطاریح).

**الطرّاح**: شوێنی دور، زۆر دوور.

**الطَّرْحُ** في الحساب: کەمکردنی ژمارەیەکە لەژمارەیەکی تری زۆر تر لەخۆی.

**طَرْحُ** البحر في مصر: بریتییە لەزەوییەك بەرزبۆتەوە لەسەر قەراخی روباری نیل.

**الطِّرْحُ**: دەرکراو؛ واتە شتی کەم لەشتی زۆر جەرت کرابێ.

**الطَّرْحَةُ**: تەیلەسان کەبریتییە لەپۆشاکێك شانو ملی پێ دادەپۆشرێ، وەلێ ئێستا ناوە بۆ پارچە قوماشێك سەروشانو ملی پێ داپۆشرێ وەکوو چارۆکەی ئافرەتو تارای بوكو ئەو چەفتەیەی لەژێر عەگاڵەوە پیاوی عەرەب سەروشانو ملی پێ دادەپۆشێ ٥ (ك:طِراح).

**الطَّرُوحُ**: ئەوەی زۆر شت فڕێ دەدا یان زۆر دووری دەخاتەوە ٥ کەوانێك تیرەکەی بەتەوژم بهاوێ ٥ (ك:طُرُحٌ).

**الطَّرِيحُ**: فڕێ دراو، واز لێهێندراو لەبەر بێ نرخیو هیچو پوچی شتەکە ٥ (ك:طراحی).

**المَطْرَحُ**: شوێنو جێگای شت ٥ بۆیە بەشوێنی نیشتەجێبونو شوێنی دانیشتنو یانەو ئەنجومەن دەگوترێ (مَطْرَح) ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنی دوور ٥ جاری واش دەبێ وەکوو چاوگ (مصدر میمی)بەکاردێ.

**المِطْرَحُ**: ئامێری شت فڕێ دان ٥ رمبی دوور هاوێژراو ٥ ئامێری تەون کردن.

**المِطْرَحة**: رفێدە؛ ئەو شتەی نانی پێ دەخرێتە تەندورو فڕنەوە ٥ (ك:مَطَارِحٌ).

**المَطْرُوحُ**: ژمارە دەرکراوەکە کە بچوکترە لەژمارە لێ دەرکراوەکە کەپێی دەگوترێ (مطروح منه).

**الطَّرخُون**: گیاتەرخون؛ ڕوەکێکی تەمەن درێژە بۆنی گەڵاکەی خۆشەو بەتەڕی لەگەڵ خواردەمەنی دا دەخورێ، پێشی دەگوترێ (الحُوذان).

**الطِّرِّيحُ**: ماسییەکی بچوکەو خوێ دەکرێو دەبرژێندرێو دەخورێ.

**طَرَدَهُ**: دەری کرد لەبەر قێزەونی یان لەبەر هیچو پوچی یان بەمەبەستی سزادانو تۆڵە لێ ستاندن.

**طَرَدَ** المُغِيرَ ونحوه: هێرش هێنو پەلامار دەرەکەی راونا، شکاندی.

**طَرَدَ** الدوابَ: لەملاو ئەولاوە وڵاخەکانی خڕکردنەوە، دەگوترێ: مەڕەکەی بەسەریەك دا دایەوە.

**طَرَدَ** القاعِدة والحكم: یاساو بڕیارەکەی بەگشتی ئاڕاستە کرد.

**طَرَدَ** بَصَرَهُ في أثر القوم: چاوی لەدوی گەلەکەی بوو.

**طَرَدَ** المولودُ أخاه: منداڵەکە لەدوا براکەی لەدایك بوو.

**طَرَدَ** القومَ: بەسەر خەڵکەکەدا تێپەڕی.

**طَرَدَ** الصيدَ طَرداً: هەوڵی نێچیرکردنی نێچیرەکەی دا.

**اطْرَدَهُ**: وای لەشتەکە کرد دەرکراو فڕێدراوبێ.

**اطْرَدَ** فلاناً من البلد أو عنه: فەرمانی کرد فلانکەس لەوڵات دەربکرێو دوور بخرێتەوە.

**اطْرَدَ** صاحِبَهُ: گرەوی لەگەڵ هاوەڵەکەی کرد لە راکردنو پێشبڕکێ دا یان لەقومار دا یان لەزۆرانبازی دا.

**طَارَدَهُ مُطارَدة وطِراداً:** هەڵمەتی بۆبردو پەلاماری دا، دەری کرد، دەری پەڕاند ◦ پیشبڕكێی لەگەڵ دا کرد لەهەڵمەت بردن بۆ سەردوژمن.

**طَرَّده:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طرده)دێ.

**طَرَّدَ السَّوْطَ:** شوڕکەکە یان گورزەکەی درێژ کرد.

**إطَّرَدَ:** بەشوێن یەك دا هات، زنجیرەی بەستو نەبڕایەوە ◦ هەربەم بۆنەیەوە لەڕوانگەی ئەم مانایە دەگوترێ: (إطّردَ الكلامَ أو الحديث): واتە قسەکانی بەزنجیرو بەشێوەیەکی رێكو پێك ئاراستە کردنو مەبەستی گەیاند.

**إطّردَ النهرُ:** روبارەکە بەردەوامو بەشێوەیەکی نەپساوە ئاوەکەی پێداهاتو بڕانەوەی نەبوو.

**إطّرَدَ القياسُ:** حوکمو وەصفەکە (عیلەتو بایسەکە) بەبونو بەنەبون دەومرانیان کرد، بۆ نمونە سەرخۆشکردن کەهۆکارو عیلەتی حوکمێکە کەحەرامبوونە دەومران دەکەن، لەهەرشوێنێك وەصفو عیلەتەکە هەبوون حوکمەکە هەیە، واتە هەرشتێك ئادەمیزادی سەرخۆشکرد حەرامە.

**تطارد الأقران وغيرهم في الحرب:** شەڕکەرەکان هەندێکیان هەندێکیانیان راوەدوونا.

**تطارد الشّيئ:** شتەکە زنجیرەی بەستو یاساکەی بەرقەرار بوو.

**إستطرد له في الحرب وغيرها:** لەشەڕدا بەفێڵو بۆ ئەوەی هەڵی بخەڵەتێنێ لەبەری هەڵاتو دوایی هەڵمەتی بۆ هێنایەوە.

**استطرد في الكلام:** لەقسەکان دا لەباسێکەوە گواستیەوە بۆ باسێکی تر.

**الطَّرّاد:** (فرسان الطَّرّاد): ئەو سوارچاکانەی گۆڕەپانی شەڕن کەهەڵمەت بۆیەکتر دەبەنو یەکتر راوەدوو دەنێن، یەکتر دەهێننو دەبەن.

**الطَّرْدُ:** ئەو کاڵاو شتو مەکەیە بەهۆی بەریدەوە لەشوێنێکەوە دەنێردرێ بۆ شوێنێکی تر ◦ ئەم وشەیە لەبنەڕەتا چاوگە، دوایی بۆکاڵای نێردراو بەبەریدا بەکارهاتوو ◦ لەبواری زانستی پزیشکی دا بۆ دەرهێنانی منداڵ لەسکی دایکی بەشێوەی ناسروشتی بەکاردەهێندرێت.

**الطَّرَدُ:** راوچیەتیو نێچیروانی، دەگوترێ: (هذا يوم الطَّرَدِ): ئەمڕۆ

رۆژی راوکردنو راوەدونانی نێچیرە ٥ پورەهەنگ ٥ (ك:طرود).

**الطَّرَّادُ:** سەربانی رێکو روبەری دەشت ٥ ئامێرێکە بەگاسنی هەوجارەوە شەتەك دەدرێ بۆئەوەی خەتە جوتەکان گەورە بن ٥ کەشتی بچوکو تیژڕەو ٥ ئێستا بۆ کەشتی جەنگی تیژڕەو بەکاردەهێندرێ.

**الطَّرَّادَة:** کەشتی جەنگی تیژڕەو.

**الطَّرِيد:** دەرکراو ٥ راوەدونراوو دەرپەڕێندراو لەلانەی خۆی، جا نێچیربێ یان شتی تر ٥ ئەو منداڵەی دوا منداڵی پێش خۆی لەدایك دەبێ.

**الطَّرِيدَةُ:** دەرکراو راوەدونراو ٥ ئەو نێچیرە یان هەرشتێکی تر لەلا ئەی خۆی دەرپەڕێندرێ، رێچکەو باریکە رێ ٥ کونێك لەقوماش کرابێ بەدرێژی ٥ پەڕۆیەکە تەڕدەکرێو ناوتەندوری پێ دەسرڕدرێتەوە.

**المَطْرَدَة:** شوێنی جلیت بازیو راوەدونانی ئەسپ سوار لە کاتی شەڕو هەراداو هەڵمەت بردنی سوارەکان بۆ یەکتری ٥ نیشانەی رێگاو بان ٥ (ك:مَطارد).

**المُطَّرِدُ:** هەرشتێك چەموش بێ ماڵی نەبێ.

**طَرَّطَرّاً وطروراً:** جوانو روگوشادو رمزاشیرین بوو.

**طَرَّ الشَّعْرُ:** مووەکان روان، دەگوترێ: (طَرَّ شاربه): ئەو گەنجە موی لێ هاتن ریشی روا، سمێڵی هاتن.

**طَرَّ النبتُ:** روەکەکە رواو دەرکەوت.

**طَرَّ النجوم:** ئەستێرەکان هەڵاتنو روناکییان دا.

**طَرَّ الثوبَ:** قوماشەکەی دڕاند، دەگوتری: (طَرَّهم بالسيف).

**طَرَّ الشَّعْرَ:** مووەکانی کورت کردنەوە.

**طَرَّ البناءَ ونحوه:** باڵەخانەکەی بۆیەکردو جوانی کرد.

**طَرَّ المال ونحوه:** ماڵەکەی دزی یان رفاندی.

**اطَرَّ:** شارەزای کرد ٥ بەم بەرو ئەو بەری شیوەکەدا هاتوچۆی کرد ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ (أطِرّى فانك ناعله): ئەوکارە قورسە بکە تۆ بۆکاری وا گران لێهاتوی.

**اطَرَّ الشَّيْءَ:** شتەکەی بریەوە، خستیە خوار.

**طَرَّرَ:** تورەی دروستکرد یان تورەو نارمی پەیداکرد.

**طَرَّرَ الثوبَ:** بۆ قوماشەکە نارمی پەیدا کرد ٥ تورەو مۆری لەقوماشەکە دا.

**طَرَّرت** الجارية: کیژەکە بەزوڵف‌و قژی پێشەسەری تورەی بۆخۆی دەستەبەر کرد.

**الطُّرُ**: ئەو توك‌و کوڵك‌و موومیە کەدوا برینەوەو روتانەوە دێنەوە ٥ مۆری طوغراو ئارمی شت ٥ (ك:طُرَرٌ وطِرار).

**الطُّرُ**: لایەن‌و دەفەرو لایەنی شت ٥ پەراوێز ٥ کۆمەڵ ٥ (ك:أطرار).

**الطُّرَّةُ**: ناوە بۆشتی بڕدراوە ٥ کەناری هەمووشت ٥ لێواری شیو ٥ ئەو قژەی ئافرەت لەسەر ناوچەوانی رێکی دەخاو دای دەهێنێ، کاکۆڵ ٥ مۆری طوغرا ٥ (ك:طُرَرٌ وَطِرار)، دەگوترێ: (بدت مخايل الأمر وطرره): نیشانەی کارو روداوەکە دەرکەوت.

**الطَّرَار**: دزو گیرفانبڕ ٥ گیرفانی پیاو دەدڕێ‌و دەبڕێ پارەکەی دەردێنێ.

**الطَّرُورُ**: کاکۆڵی کچ‌و کوڕ ٥ (ك:طُرُرٌ وطِرار).

**الطَّرِيرُ**: کاکۆڵی رێك‌و پێك‌و شانەکراو ٥ خاوەن روخساری جوان‌و رەزا شیرین‌و جەستە رێك‌و پێك ٥ گەنجێك سمێڵی بۆرکردبێ.

**طَرَزَهُ طَرْزاً**: پاڵی پێوەناو پاڵەپەستۆی دا.

**طَرِزَ طَرَزاً**: رەوشتی جوان بوو دوای ئەوەی لەوەپێش بەد خو بوو ٥ لەپۆشینی پۆشاك‌و خواردن دا شتی باش‌و خاوێن بەکاردێنێ ٥ خواردنی خۆش دەخواو پۆشاکی جوان‌و بەنرخ لەبەردەکاو بەرێك‌و پێکی خۆی دەردەخا ٥ (فهو طرِزٌ).

**طَرَّزَ** الثوب وغيره: پەراوێزی نایابی بۆ کراسەکەی دروست کرد، ئەتەمین‌و شیرازەی پێوە دادرو.

**تَطَرَّزَ** في الملبس وغيره: شتی نایاب‌و جوانی پۆشی.

**الطِّراز**: شێوەو شێواز، شتی باش لەهەموو جۆرێك، دەگوترێ: (ليس هذا من طرازك): ئەمە لەشێوەو شێوازی تۆ نیە ٥ ئارمی قوماش‌و شتی لەوجۆرە ٥ ئەو قوماش‌و پۆشاکەی بۆ پاشا ئامادەدەکرێ ٥ ئەو شوێنەی قوماشی باشی لێ دەچێندرێ‌و لێوەی بەرهەم دەهێندرێ ٥ (ك: طُرُزٌ وأطرِزَة).

**الطَّرَّازة**: پیشەی پەراوێز چنی قوماش‌و پۆشاك.

**الطِّرَازة**: پیشەی پەراوێز چنی قوماش‌و پۆشاك.

**الطَّرَّاز**: ئەوەی پەراوێز چنی دەکا ٥ یان بەهەودای ئاوریشم پەراوێز چنی کراسەکە دەکا.

**الطِـرْزُ**: شـێوازو شـێوە ٥ شـتی بـاش لەهەرجۆرێك بێ.
**الطِرْزِيُّ**: بەمانا (الطِّراز)دێ.
**المُطَرَّزُ**: بەمانا (الطِّراز)دێ.
**طَـرَسَ** الكتـابَ طَرْسـاً: كتێبەكـەی نووسیەوە ٥ رەشی كردەوە.
**طَرَّسَـهُ**: بـەمانا (طَرَسَـهُ) دێ ٥ سـەر لەنوێ كتێبەكەی نوسییەوە، بەسـەر دێڕەكاڵو كوژاوەكان دا چۆوە.
**تطَـرَّسَ** في ملبـسه ومطعمـه: پۆشـاكی باشی پۆشیو بەشێوەی رێكو پێـك پۆشـاكی پۆشـی ٥ خـواردنی چـاكی هەڵبژاردو خوارد.
**تَطَـرَّسَ** عـن الـشَّئِ: خـۆی لەشـتەكە پاراسـتو خـۆی لـەوە بـەرزتر زانـی كەخەریكی ئەو جۆرە شتانە بێ.
**الطِّـرْسُ**: كاغـەزو پـەڕە ٥ پەڕاوێـك نوسراوێـك كوژابێتەوەو دوایـی تـۆخ كرابێتـــەوە یـــان نوســـرابێتەوە ٥ (ك:طروس وأطراس).
**طَرِشَ** طَرَشـاً وطُرْشـةً: گوێی گـران بـوو ٥ كەڕ بوو.
**تطَـارَشَ**: خـۆی بەكـەڕو گـوێ گـران نیشان دا.
**الأطْرَشُ**: كەڕو گوێ گران ٥ بۆ مێینـە دەگوترێ: (طَرْشاء) ٥ (ك:طُرْش).
**الأُطروش**: بەمانا (الأطرش)دێ.
**الطَّرَشُ**: گوێ گران.

**طَرْطَـرَ**: شـانازی بەشتێـك كـرد كەنیەتی.
**طَرْطَرَ** بضأنه ونحوها: بـانگی مـەڕەكانی كرد بۆئەوەی بیاندۆشی.
**الطَرْطَـرُ**: شـەرابی پـاڵێوراو، خلتـەو پلتەی شەرابی پاڵێوراو.
**الطَرْطور**: شتی بـاریكی درێـژ ٥ فیـسی درێژ بۆسەری باریك ٥ نـەفامی لاواز ٥ (ك:طَراطِیر).
**الطِّـرْطِیرُ**: خلتـەو پلتـەی بنكـی پیاڵەشـەراب، دوایـی بەكارهێنـدراوە بـۆ خلتـەو پلتـەی هـەموو شلەمەنیەك.
**طَـرَفَ** البَـصَرَ طرفـاً: پێڵـوی چـاوی هەڵتەكانـد، جوڵانـدی، دەگـوترێ: (مابقیـت مـنهم عـین تطـرِفُ): هەموویان فەوتانو كەسیان نەماوە.
**طَرَفَ** الیه: بۆی روانی، سەیری كرد.
**طَرَفَ** عینیه وبهما: پێڵوی چاوی جوڵانـدن ٥ (طَرَفَ الـشیئَ): سـەیری شـتەكەی كرد.
**طرف** عینه الحزن وطَرَفَ عینه المالَ: خـەمو خەفـەت یـان مـاڵو سـامان چـاوی كوێركردو حەقو راستی نەبینی.
**طَرَفَ** فلاناً عن الشَّئِ: فلانكەسی لـەوكارە لادا.
**طَـرُفَ** طَرَافـةً: ناسـكو تـەڕو تـازە بـوو.

**اطْـرَفَ:** شتێـکی سـەیرو عەنتیکـەی هێنایەکایەوە.

**اطْـرَفَ الرجـــلَ:** شتێـــکی نایـــابو عەنتیکەی دابەفلان.

**اطْرَفَهُ بکذا:** بەدیاری ئەوشتە نایابەی دایە.

**اطْـــرَفَ الثـــــوبَ:** قوماشـــــەکەی نیشانەکردو وێنەو شتی وای لەسەر رەسم کـرد ٥ لەقەراخـەکانی وێنـەی کێشا.

**طَـرَّفَ الجنـدي:** سـەربازەکە لەقـەراخ شەرگەدا شەڕی کرد.

**طَرَّفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی خستە کەنارەوە ٥ قـــەراخی بۆدانـــا ٥ کەنارەکـــەی دیـاریی کـرد ٥ شـتەکەی بەناسـکو تازە لەقەڵەم دا.

**طَرَّفَـت** المـراةُ أناملــها وأظفارهـــا: ئافرەتەکـــە قامـــکو نینۆکـــەکانی بەخەنە ڕەنگ کردن، جوانی کردن.

**إطَّرَفَ الشَّيء:** شتەکەی بەناسکو تەڕو تازە دانا ٥ تازە هەڵی بژارد.

**تَطَرَّفَ:** هاتـە کـەنارەوە، چووە قـەراخ شـــتەکە، دەگـــوترێ: (تَطَرَّفَـــت الـــشمسُ): خـۆر لـەئاوابوون نزیـك بۆوە.

**تَطَـرَّفَ منـــه:** لێــی دوور کەوتـــەوە ٥ لەســـنووری ئاســـایی خـــۆی لایـــداو تێپەڕی کرد.

**تَطَرَّفَ الشَّيْءَ:** قەراخی شتەکەی گرت ٥ بەناسكو تەڕو تازەی لەقەڵەم دا.

**إستَطْرَفَهُ:** بەناسكو نـاوازەی لەقەڵەم دا.

**الأطروفـة:** نوکتــەی خــۆشو قــسەی ســەیرو چیرۆکی ســەیرو ســەمەرە ٥ دیاریو شتی عەنتیکە ٥ شتی تـازە داهاتووی سەیرو سەمەرە.

**التطريف:** نینۆك کـردنو جوانکردنی دەستو پەنجە.

**الطَّـارِفُ:** شـتی ناسـكو دڵخۆشـکەر ٥ قسەی خۆش.

**الطَّارِفَـةُ:** چـاو ٥ کـونو کەلەبـەری خێمەو ڕەشماڵ کەدەکەونـە ئـەملاو ئەولایـەوەو لێیانــەوە دەڕوانــی بـۆ دەرەوە ٥ چەند حەلقـەو قوڵفەیـەك کـە حـــەبلیان تێخـــراوەو بەســـنگە داکوتراوەکانــەوە خێمەکــە شــەتەك دراوە ٥ (ك:طوارف).

**الطَّـراف:** قــسەی بـــەتوانجو توێـــکڵ بۆئـــەوەی ببێتـــە هـــۆی خۆشـــیو پێـــکەنین ٥ خانوێـــك لەخـــشت دروســتکرابێو بــچوكو نەوێلکــەبێ واتە قۆخیلکە، خانوی عەرەبـە سارا نـــشینەکان ٥ ئـــەوەی لەقـــەراخو بیجـاخی کـشتوکاڵ دەڕوێو لــێ دەکرێتەوە ٥ (ك:طُرَف وطرافة).

**الطَّرْفُ**: جولاندنو هەڵتەکاندنی پێڵوی چاو ◦ خودی چاو ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ﴾ ◦ تێروانینو سەیرکردن ◦ کۆتاییو ئەوپەڕی هەموو شتێك ◦ هەروا بەمانا (الطَّرَف)یش هاتووە ◦ (ك:أطراف).

**الطُّرْفُ**: پیاوی پیاوانەو سەخیو نانبدە ◦ ئەسپی رەسەن ◦ قسەی خۆشو پێکەنین ئاوەر ◦ هەرمانایەك وشەی (الطَّارف) بیگرێتەوە، ئەمیش دەیگەیەنێ ◦ هەر گوڵو بەرو بومێکی روەکی کە هێشتا لەخونچەکەی دابێو نەپشکوتوبێ ◦ ئەوکەسەی لەسەر هیچ ئیشو بیرو رایەك بەردەوام نەبێ ◦ ئەوکەسەی زوزو لە لەوەڕگاو پاوانێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ لەوەڕگایەکی ترو لەلەوەڕگایەك دا نامێنێتەوە ◦ چاو چنۆكو چاولێکەرو بەخیل، هەرشتێك ببینێ پێی خۆشە بۆئەو بێ ◦ قسەی جوانو پڕمانا ◦ (ك:طروف وأطراف).

**الطَّرَفُ**: لەهەمووشتێك ئەمسەرو ئەوسەریو کۆتاییەکەی ◦ ناوچەو دەڤەر ◦ کۆمەڵێك لەشت ◦ یەکێك لەکڕیارو فرۆشیار ◦ (ك:أطراف).

**الطرفاء**: درەختێکە لەپێری (الطرفاویة) ◦ درەختی (الأثل)لەو پێڕەیە.

**الطَّرْفَةُ**: خاڵێکی سورە لەچاودا پەیدا دەبێ لەئاکامی خوێن تێزان بەهۆی زەختو زەبرێك کەلە چاو دەکەوێ.

**الطُّرْفَةُ**: هەرشتێك تازە قەڵاو عەنتیکەو سەرسورهێنەر بێ.

**الطُّرْفَةُ**: مێینەی (الطُّرْف) ◦ (ك:طِرَفٌ) ◦ شتی چاکی عەنتیکەو ناوازە ◦ قسەو گفتو گۆی خۆشو گاڵتەو گەپ.

**المِطْرَفُ**: چارەکەیەکە یان پۆشاکێکە لەئاوریشم چوار گۆشەیەو گوڵی تێدان ◦ (ك:مَطارِف).

**المُطَرَّفُ** من الخيل: ئەسپێك سەری سپی بێ یان کلکی سپی بێو باقی جەستەی ڕەنگی تر بێ ◦ یان ئەو دوو شوێنەی رەش بنو باقی جەستەی ڕەنگێکی تر بێ.

**المُطَرَّفَةُ**: مەڕێك دەوروبەری گوێی سپی بێو باقی جەستەی رەش بێ ◦ یان بەپێچەوانەوە دەورو بەری گوێچکەی رەش بێ باقی جەستەی سپی بێ.

**المطروفُ**: چاو تێ بڕدراو، دەگوترێ:

(فلان مطروف بفلان): فلانكەس چاوی لەفلان بڕیوەو سەیری کەسی تر ناکا.

**المَطْرُوفَةُ** من النساء: ئافرەتێك چاو داخاو چاو زەق نەکا.

**طَرَقَ** النجمُ طُرُوقاً: ئەستێرەکە شەو هەڵهاتو جوان دەرکەوت.

**طَرَقَ** المَعْدِنَ طَرْقاً: مەعدەنەکەی خستە سەر سندانو بەچەکوچ لێی دا درێژی کرد پانی کرد.

**طَرَقَ** الصوف ونحوه: خوریيەکەی بەشەکردو شی کردەوە لۆکەکەی شی کردەوە بەهەلاج.

**طَرَقَ** البابَ: لەدەرگاکەی دا.

**طَرَقَ** القوم: شەو درەنگانێك کابرا هاتە ماڵی ئەو خێڵەو بوو بەمیوانیان.

**طَرَقَ** الطَّرِيقَ: ڕێگاکەی پیادەکردو پێیدا ڕۆیی.

**طَرَقَ** الكلامَ: قسەکەی هێنایە پێشەوەو خستیە بەرباسو لێکۆڵینەوە.

**طُرِق** طَرْقاً: سەری داخستو بێدەنگ بوو، قسەی نەکرد ٥ لەترساو بەهۆی حەبەسانەوە بێدەنگ بوو ٥ چاوی داخستو خۆی لێ بێ ئاگا کرد.

**اطْرَقَ** جناح الطائر: باڵی باڵندەکە هەندێ لەپەڕەکانی کەوتنە سەریەك.

**اطْرَقَ** الشَّيْئَ: هەندێ لەشتەکەی خستە سەر هەندێکی.

**اطْرَقَ** الشَّيْئَ بالجلد ونحوه: چەرمی لەبەرشتەکە کرد.

**اطرَقَ** فلاناً فحلاً: نێریيە قەرە یان حوشترە نێرەیەکی دا بەفلانکەس بۆئەوەی بزن یان حوشترەکانی پێ کەڵ دا.

**اطْرَقَ** الصيْدَ: تەڵەو داوی بۆ نێچیرەکە نایەوە بۆئەوەی بیگرێ.

**طَارَقَ** الشَّيْئَ: شتەکەی هەندێکی خستە سەر هەندێکیو ڕاستەو پاستەی کرد.

**طَارَقَ** الشَّيْئَين وبينهما: دوشتەکەی خستنە سەریەكو پێکی گرتن.

**طَارَقَ** النعلَ ونحوها: نەعلەکانی خستنە سەریەكو قاتقات دانان.

**طَرَّقَت** الحَامِلُ: ئافرەتە سکپڕەکە منداڵەکەی لەسکی دا گیربوو ٥ یان هەندێکی هاتە دەرو هەندێکی ماوە نایەتە دەر ٥ دەگوترێ: (طَرَّقَت بولدها): منداڵەکەی لەسکی دا ئاخێ بوو.

**طَرَّقَت** الدجاجةُ ونحوها: مریشکەکە هێلکەی بەناخۆشی کرد.

**طَرَّقَ الشَّيْئَ:** زۆری شتەکە فش کردەوە.

**طَرَّقَ الموضِعَ:** شوێنەکەی کردە ڕێبازو ڕێڕەو.

**طَرَّقَ طريقاً:** ڕێگاکەی تەختو خۆش کرد.

**طَرَّقَ له:** ڕێگای بۆکردەوە.

**إنطرق:** بۆ موطاوەعەی (طَرَقَهُ)دێ.

**تطارَقَ:** بەدواداچونی بۆکرد.

**تَطَرَّقَ اليه:** ویستی ڕێگای بۆ بکاتەوە ٥ لێی پاڕایەوە کارەکەی بۆبکاو یارمەتی بدا، دەگوترێ: (تطرّق الى ذهنه كذا): ئەوە بەبیری داهاتو ئەوە چووە دڵیەوە.

**تطرَّقَ الى الموضوع:** باسەکەی وروژاندو خستیە بەرلێکۆڵینەوە.

**إسْتَطْرَقَ الى الباب:** ڕێگای دۆزیەوە بۆلای دەرگاکە یان بەو ڕێگایە دا ڕۆیی کەدەچووە لای دەرگاکە.

**إسْتَطْرَقَ فلاناً:** داوای لەفلان کرد ڕێگا چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە.

**إسْتَطْرَقَ فلاناً فحلاً:** داوای لەفلان کرد حوشترە نێرەیەکی بداتێ بۆ کەڵدانی حوشترە مێیەکانی.

**الطارِقُ:** میوانی شەو، کەسێک شەو بێ بەمیوانی یان بۆ مەبەستی تر بێ ٥ ئەستێرەی ڕوناک کە بەڕوناکایی خۆی تاریکی شەو کون بکا ٥ ڕوداو ٥ ڕوداوێک بەشەو ڕوبدا ٥ (ك:طُرّاق) بۆ ئادەمیزاد.. بۆ شتی تر (طَوَارِق).

**الطارِقَةُ:** خێڵو هۆزی پیاو ٥ سیستەمی بچکۆلە بۆ نوسین ٥ ئەوکەسەی بەردی پشکو گرەو دیاری دەکاو دەستە گوڵی لێ دەدا.

**الطِّراقُ:** توێژێکی پێست کەدەکەوێتە سەر توێژێکی تر ٥ تۆوی ئەسپو حوشتری نێرە کە بۆکەڵدان بەکاریان دێنن.

**الطَّرْقُ:** دیاریکردنی بەردوچکەی فاڵ گرەوە کەمەزندەی دەکاو لێی دەدا ٥ داونانەوە، تەڵە نانەوە بۆ نێچیر ٥ بەزو پیو ٥ هێزو توانا ٥ (ك:أطراق).

**الطَّرْقَةُ:** یەکجار لێدانی پشك ٥ یەك جار لەهەرشتێك بێ، دەگوترێ: (آتيه في اليوم طرقتين): لەڕۆژێك دا دووجار هاتم بۆلای یان دەگوترێ: (آتيه في اليوم طَرْقَة واحدة).

**الطُّرْقَةُ:** ڕێگا ٥ ڕێبازو بیرو بۆچونی ئایینی یان سیاسی یان هەربوارێك ٥ دابو نەریت ٥ ڕێگاو چۆنیەتی پێك گرتنی دوو شت یان زیاترو دانانیان لەسەر یەکتر.

**الطَّرُقُ**: دانانی بەرد چین لەسەر چین.

**الطَّرِيقُ**: رێگا، شوێنی پێداڕۆیشتن ◦ رێگای پانو پۆڕ ◦ رێبازی پێڕی صۆفیو دەروێش ◦ (ك:طُرُقٌ).

**طُرُقٌ** الطعن: لەقانونی مورافەعاتدا بریتییە لەو هۆکارە یاساییو بەڵگە مادیو مەعنەوییانە کە تاوانبارو حوکمدراو پەنای بۆدەبا بۆئەوەی ئەو حوکمەی بەسەری دا دراوە هەڵبوەشێتەوە، یان راستەو پاستە بکرێ.

**الطَّرِيقَةُ**: رێباز ◦ ژینامەو بەسەرهاتی تاکەکەس ◦ مەزهەبو بیرو بۆچوونو پەیڕەوو پرۆگرام ◦ چینو توێژ ◦ (ك:طرائق).

**الطَّرَائِقُ**: چینەکان هەندێکیان لەسەر هەندێکیان ◦ کۆمەڵو تاقمی بیرو باوەڕ جیاواز، دەگوترێ: (ثوب طرائق): کراسێکی رزیوو کۆنە، یان پارچە پارچەیە.

**المُسْتَطْرِقَةُ**: قاپو قاچاخی مەعدەنی.

**المِطْرَاقُ**: چەکوچ ◦ ئامێری کوتان ◦ رێگایەك زۆری رێبوار پێدا بڕۆن.

**المِطْرَاقُ** من الشَّيء: شتێك بەدوا شتێك دا بێ یان هاوشانو هاوشێوە بێ ◦ (ك:مطاريق).

**المطاريق**: پیادەڕەو، دەگوترێ: (جاءت الدواب مطاريق): وڵاخەکان بەڕیز بەشوێن یەکدا هاتن.

**المِطْرَقُ**: چەکوچ؛ ئامێرێکی ئاسنینە ئاسنی گەرمکراوو مەعدەنی تری پێ دەکوترێ ◦ ئامێرێکە خوری پێ شی دەکرێتەوە یان لۆکەی پێ شی دەکرێتەوە.

**المِطْرَقَةُ**: بەمانا (المِطْرَقُ)دێ.

**المَطْرُوق**: کەسێك بێ عەقڵو گێل بێ.

**المُنطَرِقَاتُ**: ئەو قەبارە مەعدەنیانەی بەچەکوچ راست دەکرێنەوە، درێژو پان دەکرێن.

**طَرِمَت** بيوتُ النحل طَرْماً: شانە هەنگوینەکان پڕبوون لەهەنگوین.

**اطْرَمَت أسْنَانه**: ددانەکانی بەڵغی سەوزیان گرتوە.

**الطَّارِمَةُ**: خانوی بچوك لەدار دروستکراوبێ وەکوو قوببە.

**الطُّرَامَةُ**: ئەو چڵكو بەڵغە سەوزەی دەکەوێتە سەرددان ◦ پاشماوەی خواردن لەناو ددانەکان دا.

**الطَّرْمُ**: هەنگوین ◦ رۆنەکەرە.

**الطِّرْمَةُ**: زیبکەو لووە بچکۆلەیەکە لەناوەڕاستی لێوی سەرو ◦ (ك:طِرَمٌ وَطُرَم).

**الطُّرْنُشُولُ**: گوڵە بەڕۆژە، روەکێکە

لــەپێری (المركبــة)یــە گۆڵەكــەی هەمیشە ڕوی لەخۆرە.

**طَرِيَ** طراوة وطـراءَةً: ناسكو نـەرمو شل بوو.

**طَرُوَ** طَراوةً: تەڕو تازەو ناسك بوو.

**اطـراهُ**: زۆری پەســن كــردو رەوشــتە جوانــەكانی ژمــاردن ٥ زێــدە ڕەوی كرد لەپەسن كردنیو باسی رەوشتە جوانەكانی.

**طَرّاهُ**: وای لێ كرد ناسك بێ.

**طَرّى** الطيبَ: بۆنە خۆشـەكەی بـەهۆی راتەكانو راوەشاندن بڵاو كردەوە.

**الإطْرِيَة**: جۆرە خواردەمەنیەكە وەكوو هـەودا دەزوو وایـە لـەئارد دروسـت دەكرێ.

**الطَّـرِيّ**: نـەرمو شـلو تـەڕو تـازە ٥ پاڵفتەكراو پاڵێوراو.

**المُطَرّاة**: جۆرە بۆنێـكی خۆشە.

**الطّازجُ**: تەڕو تازە.

**الطَّزاجـة**: بـەمانا (الطّــازج)دێ، یــان لۆغەتێكە لە (الطّازج).

**الطَّست**: تەشت ٥ قاپێـكی كەوانەییـە لــەمسو شــتی وا دروســت دەكــرێ بۆشــت تێداشــتنو كــاری تــر ٥ (ك: طسوت).

**طَسَّ** في الأرض واليها طسّاً: زۆر ڕۆیـشتو دووركەوتەوە.

**طَسَّ** فلاناً: فلانكەسی زامار كرد برینی تێــكرد ٥ كێشەو نیزاعـی لەگـەڵ دا كردو بۆڕی دا.

**طَسَّ** الشَّيءَ في الماء ونحوه: شتەكەی لەئاودا نقــوم كــرد ٥ بەســەری پەنجــەی شتەكەی گرت، یان خواردی.

**طَسْسَ**: بەناوزەوی دا ڕۆیی.

**الطّاسَـةُ**: برینێــك قــوڵ بــێو بگاتــە كلۆرایی.

**الطَسّاسة**: پیشەی تەشت دروستكردن.

**الطَّــسُّ**: تەشــت ٥ (ك:طــــسوس، وأطساس).

**الطَـسّاسُ**: تەشـت دروسـتكەر، تەشـت فــرۆش ٥ نینــۆك ٥ (ك:طِــــساس وأطساس).

**الطَّـسّانُ**: گۆڕەپـانی شـەڕو جـەنگ ٥ تەپو تۆز كاتێ بەرپا دەبێ.

**الطَّسَّةُ**: یەكجار نقوم كردن ٥ تەشت ٥ نینۆك ٥ (ك:طِسَاس وأطساس).

**الطِسَّةُ**: تەشت ٥ (ك: طِسَاسٌ وطِسَسٌ).

**الطَّشتُ**: تەشت ٥ (ك: طشوت).

**طشتِ** السَّمَاءُ طـشاً وطِشيـشاً: ئاسمان بارانی كزی باراند.

**طش** المَطَرُ: بارانەكە كەمو لاواز بوو.

**طَشَّ** فـلان: فلانكـەس هەڵامـەتی هێنـا ٥ لوتی ئاوی پێوە نـەماو هاتـە خـوارو

زۆر پـڕمیو ئـاوی لـوتو دەمـی پرژاند.

**الطَّشَاشُ** مـن المطـر: پرژانـی باران، بارانێـــك نەبەرێژنـــە بـــێو نەپرۆشەبێ ٥ چاوكزو نابینا.

**الطُّـشَاشُ**: نەخۆشـییەكە وەكـوو هەلامـەتو ئینفلـوەنزا كـە كـابرا دەپـــژمێو ئـــاوی لـــوتو دەمـــی دەپرژێنێ.

**الطَّشُّ**: بەمانا (الطَّشَاش)دێ.

**الطَّشیش**: بارانێـكی مـام ناوەنـدی نەبەرێژنەبێ نەبەوردە باران بێ.

**طَعِمَ** طَعْماً وطعاماً: خواردی ٥ چەشتی.

**طَعِمَ** الغصنُ: لقە درەختەكە لە درەختێكی تردا موتربەكرا.

**طَعِـمَ** الـشَّيْءَ ومنـه: شـتەكەی بـەددانی پیشینی خوارد.

**اطعمتِ** الْبُـسْرَةُ: خورماكـە گـەیی‌و شیرنایی لێ بەدەركەوت.

**اطعمت** الشجرة: درەختەكە میوەكەی پێ گەیی.

**اطعمت** المأكول: تامی خواردەمەنیەكە سەر سورهێنەر بوو.

**اطعَمَ** فلاناً: وای لەفلانكەس كرد شت بخوا.

**اطعَـمَ** اللهُ فلانـاً: خـودا رزق‌و رۆژی دا بەفلانكەس.

**اطعَمَ** الْغُصْنَ بآخر من غير شـجره: لقـە درەختەكـەی لەدرەختێـكی تـر موتوربە كـرد بۆئـەوەی درەختێـكی تـر یـان لـێ بێتـەدی درەختەكـەش لقە موتوربە كراوەكەی قبوڵ كرد.

**طاعَمَهُ**: نانی خوارد، یان نانی لەگەڵ یەكێكی تر خوارد.

**طاعَمَ** الحمام انثاه: كۆترەكە دەنـدوكی خستە ناو دەندوكی مێیەكەوە.

**طعَّمَ** العظـم: ئێسقانەكە مۆخی تێدا پەیدا بوو.

**طَعَّـمَ** الغُـصْنَ: لقــە درەختەكــەی لەدرەختێكی تردا موتوربە كرد.

**طعَّمَ** الخَشَبَ بالصدف ونحوه: صـەدەف‌و مـرواری لەدرەختەكە چەسپاند بۆ جوانی‌و رازاوەیی.

**إطَّعَمَتِ** الْبُـسْرَةُ: خورمـا بەرسیلەكە ئاڵ‌و بۆڵی تێكەوت‌و تامی شیرینی لێ پەیدابوو.

**إطَّعَمَتِ** الشجرة: درەختەكە میوەكەی پێ گەیی، دەگوترێ: (فلان لا يَطَّعِمُ): فلانكـــەس رام نابـــێ‌و عـــەقڵی مەجلیس‌و ئاداب فێرنابێ.

**تطاعما**: پێكەوە نانیان خوارد.

**تطاعمت** الحمامتـان: كـۆترە نێرەكـە دەندوكی خستە نێو دەندوكی كۆترە مێیەكەوە.

**تطـاعم** المتلاثمـــان: ئــەو دوو مــاچو موچكەره دەميان خسته نـاو دەمـی يـەكترەوه وەكـوو دوو كـۆتری نێـرو مێ، دەشگوترێ: (انه المتطاعم الخلق): ئــەو مرۆڤــە جەســتەو هەنــدامی رێكو پێكن.

**تطعَّمَ**: بۆ موطاوەعەی (طعّم)هاتووه.

**تطعَّـمَ الـشّيْ**: شـتەكەی تـام كـرد، تۆزێكی لـێ چەشت بۆئەوەی بزانـێ تامی چۆنه.

**إستطعَمَ الـشّيْ**: تـامی شـتەكەی كـرد كەمێـكی لـێ خسته نـاو دەمـی تـا بزانـێ تـامی چـۆنه ٥ تـامی كـردو بەلایەوه خۆش بوو.

**استطعَمَ** فلاناً: داوای خـواردنی لـەفلان كرد ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا﴾.

**اســتطعم** فلانـــاً الحــديث: داوای لەفلانكــەس كـــرد قـــسەی بـــۆ بگێڕێتـــەوه بۆئـــەوەی گـــوێ لەقسەكانی بگـرێو تـامی وتـەكانی بچێژێو لەزەتيان لێبكا.

**التطعيم** في النبــات: ئەوەيـە لاسـكی رووەكێــك بێنــی لەگــەڵ لاســكی رووەكێكــی تــر كــەرەگو ريــشەی داكوتابن تێكيان با هەڵدەیو يـەكتر بگرن.

**الطّـاعِمُ**: بخـۆر ٥ خــاوەن خـۆراك ٥ لەبارەی خواردنەوه رێكو پێك.

**الطّعام**: خۆراك، هەرشتێـك بخورێو مانـەوەی جەسـتەی پێـوه بەنـدبێ ٥ هەرشتێـك بكـرێ بـە بـژێو وەكـوو گـەنمو جـۆو خورمـاو ئـەو جـۆره شــتانه ٥ ئــەهلی عێــراقو حيجــاز بـەزۆری وشـەی (الطعـام) بۆگـەنم بەكاردێنن ٥ (ك:أطعمة).

**طعام** البحر: ئەو ماسيانەی لەناو ئاوی قـــەراغو بيجـــاخی دەريـــاداناو ئاوەكەيان رۆدەچێو ماسيەكان بەبێ راوكـــردن بەيدەســـت دەبـــن ٥ هەرشتێك بـەناوی دەريا ئاوبـدرێو روابێ.

**الطّعامی**: خۆراك فرۆش.

**الطّعْمُ**: تامو چێژ كەبەهەستی چەشتن كەلەزمانداپـە هەسـتی پـێ دەكـرێ وەكـوو شـيرينیو تـاڵیو مـزریو ساردیو گـەرمی ...هتـد. ئـەوەی نەفسی زينـدەوەر حـەزی لـێ دەكـا لـەخۆراك ٥ دەگـوترێ: (تغـير طعـم فـلان): هەسـتی چەژتنی فلانكـەس لەحاڵـەتی ئاسـايی خـۆی دەرچـوو گۆڕا ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فـلان ذو طعـم): فـلان خـاوەن عـەقڵو بـيرو بۆچونی خۆيـەتی ٥ (وما هـو بـذي

طعـم): فلانكـەس خـاوەنی عـەقڵو رای پەسەند نیە.

**الطُعْمُ**: خواردەمـەنی ٥ ئـەو خـواردنو شـتەی کەبۆماسـی فـڕێ دەدرێ بۆئەوەی نێچیر بکرێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ هـەموو ئەوشـتانەی دەدرێ بەیـەکێ تـر بـۆ مەبەستێـك وەکوو بـەرتیلو بەخـشینو دیـاری ٥ شـلەمەنیەکی زەردە لـەخوێن وەردەگیرێ لەڕێـگەی دەرزیو شـتی واوە دەکرێتە ناوجەستەوە بۆئەوەی چارەسـەری هەنـدێ نەخۆشـی پـێ بکرێ.

**الطَّعِمُ**: بەمانا (الطّاعم)دێ.

**الطُّعْمَةُ**: هەرشتێـك بخـورێ ٥ رزقو رۆزی ٥ گومرکو مەرانەو سـەرانە ٥ دەیەكو خەراج ٥ دەسکەوتی جەنگ ٥ شێوەو بـواری کاسبی ٥ دەگـوترێ: (هـو طیـب الطعمـة): کاسـبییەکەی حـەلاڵو پوختـە ٥ (هـو خبیـث الطعمـة): کاسـبییەکەی پـیسو نامەشـروعە ٥ بـانگ کـردن بۆنـان خـواردن "داوەت" ٥ مامەڵەیەکـە بریتییـە لـەوە کـابرا زەوییـەك دەدا بە پیاوێك بۆئەوەی بەکاری بینـیو دەیـەك بـداو بەدرێـژایی ژیـانی ئـەم گرێبەستو مامەڵەیـە بـەردەوام بـێ کـە کـابرا مـرد زەوییەکـە نـادرێ بـەمیراتگرەکان بەڵـکو دەگەڕێتـەوە بۆ خاوەنەکەی ٥ (ك:طُعَمٌ).

**الطَّعْمَةُ**: ئـەو بـوارەی رزقو رۆزی لـێ دەستەبەر دەبێ.

**الطَّعْمِيَّةُ**: جۆرە خواردنێـکە لەئاردی پاقلـە (فـول) کەسۆی پێـوە نـەبێو برێ سەوزەو شتی وا لەگەڵ خوێو تـەوابلی تێـکەڵ دەکـرێو دەکرێتـە هـەنگوت هـەنگوتی بـچوكو لـەناو رۆنو زەیت دا سور دەکرێتەوە.

**الطُّعُومُ**: ئەو ئاژەڵەی لەناو ئێسقانی دا مـۆخ هـەبێ ٥ یـان هەنـدێ بـەزی تێدایە ٥ ئاژەڵی قەڵەو ٥ (ك:طُعُمٌ).

**الطَّعُومَةُ**: ئـەو ئاژەڵـەی دادەبەسـترێ (دابەستە).

**الطَّعِيمُ**: بەمانا (الطُّعُومُ)دێ.

**المِطعامُ**: زۆر خـۆر ٥ زۆر نانبـدەبێ ٥ زۆر میـوانی هـەبن ٥ بـۆ پیـاوو ژن ئـەو وشـەیە بەکاردەهێنـدرێ، دەگـوترێ: (إمـرأة مِطْعَـامٌ) ٥ (ك:مَطاعِمٌ).

**المَطْعَمُ**: خـۆراك ٥ شـوێنی پێـشکەشکردنی خـواردنی چـاك ٥ چێشتخانە ٥ (ك:مطاعم).

**المُطْعَمَ**: کەسێـك لـەڕاوەدا شـتی چاکی دەسـت بکـەوێ ٥ دەشگوترێ: (إنـك مُطْعَمُ مودتي): ئـەتۆ خۆشەویستیو

ڕێـزت لـەدڵی مـن دا بۆخـۆت پـەیا کردووە.

**المِطْعَمُ**: زۆرخۆر.

**المُطْعِمَـةُ**: قـورگ ◦ دەگـوترێ: (أخـذ بِمُطْعِمِـهِ): لەشـەڕدا دەسـتی لەبینـە قاقـای نـاو جەڕانـدی ◦ ئـەو کەمەنـدەی نێـچیری پـێ دەگـیرێ ◦ ئـەو چـنگو نینۆکـەی باڵنـدەی گۆشـت خـۆر گۆشـتی پـێ دەپـچڕێو دەگـرێ ◦ نینۆکـە گـەورەی باڵنـدە کەدەکەوێتە پێشی قاچی ◦ هـەموو باڵندەیەك دوو نینۆکی ئاوا گەورەی هەن گۆشتیان پێ دەگرێ.

**طَعَنَ** فیه: تانەی لـێ داو عەیبـو لەککەی تێـدا پەیـدا کـردن ◦ ڕەخنـەی لـێ گرت ◦ دەگوترێ: (طَعَـنَ في عِرْضـه): تانەی لەناموسو شەرەفی دا.

**طَعَـنَ** في الـشّيء: چـووە نـاو شـتەکەوە، دەستی بە ئیشەکە کرد.

**طعنـت** المـرأة في الحيـضة: ئافرەتەکـە چووە ناو عادەی مانگانەی خۆیەوە.

**طَعَـنَ** غـصن الـشجرة في الـدار: لقـە درەختەکە چووە ناو خانوەکەوە.

**طَعَنَ** في السّنِ: چووە ساڵەوەو پیر بوو.

**طَعَنَ** في الأرض: بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**طَعَـنَ** الفـرسُ ونحـوه في عنانـه: ئەسـپەکە خـۆی کێـشایەوەو دەسـتی کـرد بەڕۆیشتن.

**طَعَنَ** الليـلَ ونحـوه: شـەوڕەوی کـرد ◦ یـان هەموو شەوەکە بەڕێوە بوو.

**طَعَـنَ** فلانـاً وغـيره بـالرمح وغـيره طعنـاً: بەڕمب لێی دا یان ڕمبی تێوە ژەنی.

**طُعِنَ**: توشی تاعونو پەتا بوو.

**طعِن بكذا**: توشی ئەو نەخۆشییە یا ئـەو بەڵاو چورتمو ناخۆشییە بوو.

**طُعِـنَ** في بطنـه أو في جنازتـه: کەوتـە گیانەڵاوەوە نزیکە گیانی دەرچێ.

**طاعنه** بكذا مطاعنـة وطِعانـاً: هەریـەك لەو دوانە لەیەکتریان دا.

**إطّعَنَا**: هەریـەك لەودوانـە لەیـەکتریان دا.

**تطاعنا**: بەمانا (إطّعنا)دێ.

**الطـاعون**: تـاعونو پـەتا، دەردێـکی گوازراوەیـە، هۆکارەکـەی مکرۆبێـکە توشـی مـشكو جـرج دەبـێ مێـشولە دەیگوازێتـەوە بـۆ مـشکی تـرو بـۆ ئادەمیزاد ◦ (ك:طواعين).

**الطّعّـان**: ڕەمبـر وەشـێن کەسێـك زۆر ڕمب وەشێن بێ.

**الطّعين**: بـەمانا (الطّعّـان) دێ ◦ یـان دەسـت ڕاسـتو لێـزان لەڕمبروەشاندنا.

**الطّعْـنُ**: لـەقانونی مورافـەعات دا

بريتييه لەوه حوكمدراو حوكمەكەی بگەیەنێته دادگای هەڵوەشاندنەوەو داوا بكا حوكمه بەسەراسەپاوەكەی هەڵبوەشێتەوە بەبەڵگەی قانوونی.

**الطَّعْنَةُ**: یەكجار زەبر لێدان ٥ كاریگەریو شوێندەستی زەبرەكە.

**الطَّعِينُ**: زەبر لێدراو بریندار كراو ٥ (ك: طُعُنٌ).

**المِطعانُ**: بەمانا (الطَّعَان)دێ ٥ (ك: مطاعين).

**المَطْعَنُ**: بەمانا (الطَّعنُ)دێ ٥ شوێنی زەبرەكە، شوێنی عەیبدارییەكە، برینەكە، روشاوەكە.

**المطعَنُ**: بەمانا (المِطْعَانُ)دێ.

**الطُّغْراءُ**: مۆری پادشا ٥ تورەو ئارم ٥ ناوو نیشانو عینوان كەلەلای ژووری نامە رەسمییەكان دەنووسریو دەكەوێتە پشت (بسم الله)وە ٥ نازناوو شۆرەتی حاكمو فەرمانرەوای تێدا تۆماركراوە ٥ بنەمای ئەم وشەیە (طورغای)ە وشەیەكی تەتەرییە رۆمو فارس بەكاریان هێناوە، پاشان عەرەب لێیان وەرگرتوون ٥ (الطُّغْرَى والطُّغْرى) هەر بەمانا (الطُّغراء)ن ٥ نالی دەفەرموێ:

برۆت باڵی هوما سایەی سەری سوڵتانی حوسنت بوو
خەطت هاتو وتی: من ناسیخی طوغرایی خونكارم

**الطُّغرائي**: دروستكەری مۆری طوغرا یان نووسەری طوغرا.

**تَطَغَّمَ عليه**: خۆی نەزان كرد ٥ كاری هەتیو مچانەی كرد.

**الطَّغَامُ**: خوێڕیو هەتیو مچەو بێ عەقڵو كاڵفام ٥ لاوازو خراپو پوچ لەهەموو شتێك.

**الطَّغَامَةُ**: تاكی (الطَّغام)ە ٥ ئەحمەقو گێل ٥ (ك: طُغَام).

**الطَّغْمُ**: دەریا ٥ ئاوی زۆر.

**الطُّغْمَةُ**: كاری پەستو بێ رێزی ٥ لاوازیو زەبونی ٥ گێلیو نەفامی.

**الطُّغْومِيَّة**: بەمانا (الطَّغومُ)دێ.

**طَغَى طَغْياً وطُغياناً**: لەسنور دەرچو، زێدە رۆیی كرد ٥ ئاو لەسنوری خۆی زیادبكاو تێپەڕێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاء حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ﴾.

**طَغَتْ البحرُ**: دەریا كەوتە جونبوشو شەپۆلدانو شەپۆلی دا، هەڵچو ٥ دەگوترێ: (طغى الموجُ): شەپۆلەكە هەڵچو.

**طَغَى فلان**: فلانكەس لەتاوان كردن دا رۆچوو ٥ ستەمی كردو خۆی بەزلزانیو سەر رەقی نواندو زێدە رۆیی كرد.

**طَغَي** به الدمُ: خوێنی گەرم بوو، تورە بوو، هەڵچو.

**اطغاه** المالُ والسلطانُ: ماڵو سامانو دەسەلات وای لێ کردوە لەخۆی بایی بووەو لەسنووری خۆی دەرچووە.

**تطاغي** المرجُ: شەپۆلەکە هەڵچووو هەڵبەزو دابەزی کرد.

**الطّاغوتُ**: ملهورو دیکتاتۆر ٥ دەستدرێژکەرو زێدە رۆو سنوور بەزێن ٥ هەرکەسێك رۆچوبێتە ناو زەلکاوی گومڕاییەوەو لەڕێبازی حەق لای دابێ ٥ کاهینو کولەومنانی ٥ جادو باز ٥ هەرشتێك جگە لەخودا پەرستشی بۆ بکرێ جا ئەو شتە جندۆکە بێ یان مرۆڤ بێ یان بتو صەنەم بێ ٥ بتخانە ٥ (ك:طواغیت وطواغ).

**الطّاغیة**: ستەمکاری گەورە ٥ زۆر ملهورو دیکتاتۆر ٥ هەورە بروسکەو گرمەو ناڵەی زەندەقبەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ﴾ ٥ بەمانا (الطّغیان)دێ واتە دەرچوون لەسنوور ٥ (ك:طواغ).

**الطّغوی**: بەمانا (الطغیان)دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا﴾.

**الطّغیان**: لەسنوور دەرچونو زێدە ڕەوی کردن لە ستەمکاری دا ٥ لەبواری زەوی ناسی دا بریتییە لە داپۆشینی روی زەوی بەئاوی دەریا بەجۆرێك کەخلتەو ڕەواسبی دەریا کە روبەرێکی زۆری زەویەکە داپۆشێو چین چین بکەوێتە سەریەك.

**الطُّغیَةُ**: هەرشوێنێك بەرز بێو عاسێ بێو نەتوانی بچیە سەری، لوتکە شاخی لوسو بەرز.

**طَفِئَتْ** النارُ ونحوها طفئاً وطفوءاً: ئاگرەکە خامۆش بوو، کوژایەوە ٥ دەگوترێ: (طَفِئَ النورُ والسّراج وطفِئت العین وطَفِئت الفتنة).

**طَفِئَ** فلان: فلانکەس پوکایەوە، کوژایەوە شکۆمەندیو کەسایەتی نەماو تێ شکاو پوچایەوە ٥ مرد.

**اطفَا** النارَ أو الفِتنةَ ونحوهما: ئاگرەکەی کوژاندەوە.

**طَفّأ** النارَ وغیرها: بەمانا (أطفَأ)دێ.

**إنطفَأ**: بەمانا (طَفِئَ)دێ ٥ بۆ موطاوعەی (أطفَأَ).

**المُطفِئُ**: (مُطفِئ الرَّضف): روداوێك ئەوەندە کاریگەر بێ روداوی پێش لەبیر بەرێتەوە.

**المُطفِئة**: ئاگر کوژێنەوە ٥ شلەمەنی بێ یان هەوابێ.

**مُطْفِئةُ** الرَّضف: مەری قەڵەو ٥ بەڵای گەورەو کارەساتی کاریگەر کە رووداوی پێش خۆی لەبیر بەرێتەوە.

**طَفِحَ** الإناء أو النهرُ طَفحاً وطُفُوحاً: قاپەکە یان روبارەکە پڕ بوو لەم لاو لای سەری کرد، دەگوترێ: (طفح الكيلُ): ربەکە پڕ بوو لەسەریەوە ڕژا.

**طَفَحَ** السكرانُ: سەرخۆش و مەست بوو فول سەرخۆش بوو.

**طَفَحَ** القِدْر ونحوها بزبدها: مەنجەڵەکە کەف و کوڵی خۆی فڕێ دا.

**طَفِحَتْ** البشرةُ أو الجلدُ: پەڵە بەسەر پێست و جەستەیەوە پەیدا بوو.

**طَفَحَ** عقلهُ: عەقڵی کامڵ بوو.

**طَفِحَت** الحامِلُ: ژنە سکپڕەکە منداڵی زۆر بوون.

**طَفَحَت** بالولد: منداڵەکەی بەکامڵی بوو.

**طَفَحَ** الفرسُ ونحوه: ئەسپەکە بازی هاویشت و غاری دا.

**طَفَحَ** عنه: ڕۆیشت.

**طَفَحَ** الإناءَ: قاپەکە پڕ بوو بەسەریەوە ڕژا.

**طَفَحَتْ** الريح ونحوها الشَّيْءَ في الهواء: ڕەشەبا شتەکەی بەرز کردەوە بۆ هەوا.

**اطْفَحَهُ**: وای لێ کرد هەڵبچێ سەر ئاو بێ، بەرز بێتەوە.

**طَفَّحَهُ**: بەمانا (أطْفَحَهُ)دێ.

**إطَّفَحَ** القِدرَ ونحوها: کەف و بەڵغی دەوری مەنجەڵەکەی کڕاند، لێی کردەوە، دەگوترێ: (إطَّفَحَ الطفاحة): کەف و بەڵغی دەورێ مەنجەڵەکەی پاك کردەوە.

**الطُّفاحَةُ**: ئەو کەف و کوڵ و بەڵغەیە مەنجەڵ و شتی وا لە کاتی کوڵاندنی شت تێیدا بەملاو بەولای خۆی دا دەری دەدا ٥ هەرشتێك هەڵبچێ و بەقەراخی حەوزو مەنجەڵ دا سەر ڕێژبکاو بڕژێ.

**الطَّفَح**: لەبواری پزیشکی دا نەخۆشییەکی پێستە لەنەخۆشی ترەوە پەیدا دەبێ.

**الطَّفحان**: بەمانا (الطَّافِحُ)دێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (الطفحى).

**الطِّفَاحُ**: (فرس طفّاح القوادم): ئەسپێکی باز هاوێژو تیژڕەوە.

**المِطْفَحَةُ**: ئەسکوێ و کەوگیرێکە یان شفرەو شتێکی وەهایە کەف و بەڵغی ڕەقەوەبووی دەورو بەری مەنجەڵی پێ دەکرێندرێ ٥ (ك:مطافِحَ).

**طَفَرَ** اللبنُ طَفراً: شیرەکە سەر توێژی کرد.

**طَفَرَ** فلان طفراً وطفوراً: فلانكەس بازی هاویشت.

**طَفَرَ** الشَّیءَ: لەسەر شتەكە وە بازی داو خستیە دوا خۆیەوە.

**اطفَرَ** الفرسُ ونحوه: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طَفَرَ)هاتووە.

**الطَّفْرَة**: یەكجار باز هاویشتن ٥ توێژ بەستنی شیرو ماستە كە توێژێكی سەرەوە یان ڕەق دەبیٚو ژێرەوەیان رونە.

**طَفَسَ** طفوساً: مرد، خپ بوو ٥ لەناو چوو ٥ یان بەبیٚ ئەوەی نەخۆشیەكی ئاشكرای هەبیٚ مرد.

**طَفِسَ** طَفَساً وطفاسةً: چڵكن بوو، پیس بوو.

**طَفَّسَ**: بەمانا (طَفِسَ)دیٚ.

**طَفْطَفَ**: تەسلیم بەناحەزەكەی بوو، بووە دیلی دوژمن.

**طَفْطَفَ** الطائرُ: باڵندەكە باڵەكانی كردنەوە ٥ باڵی فش كردن.

**الطَّفْطَاف**: تەنیشتو پەنا ٥ ئەملاو ئەولا ٥ كەناری روبارو دەریا ٥ رووەكی ناسكو تازە ٥ قەراخو بیجاخی درەخت ٥ گەڵای لقەدار.

**الطَّفْطَفَةُ**: كەلەكە ٥ گۆشتە نەرمەی ورگ ٥ تەنكایی قەراخی جەرگ ٥ (ك:طِفاطِف).

**الطِّفْطِفَةُ**: بەمانا (الطُّفْطَفَةُ)دی.

**طَفَّ** الشَّیءُ طَفّاً: شتەكە سەر ئاو بوو ٥ بەرز بۆوە ٥ نزیك بۆوە ٥ ئامادە بوو.

**طَفَّت** الشمسُ: خۆر نزیك ئاوا بوون بۆوە.

**طَفَّ** منه ولە: دەركەوت ٥ بەیدەست بوو بەئاسانی دەستی دەگەیشتیٚ.

**طَفَّ** الفرسُ ونحوه: ئەسپەكە چوستو چالاك بوو.

**طَفَّ** لە بحجر ونحوه: داهاتەوە بەردێك هەڵگریٚو تیٚی گریٚ.

**طَفَّ** الحائط: چووە سەر دیوارەكە.

**طَفَّ** الشَّیءَ بیده أو برجلە: شتەكەی بەدەستی یان بەقاچی بەرز كردەوە.

**طَفَّ** الناقة ونحوها: قاچی حوشترەكەی بەست.

**اطَفَّ**: بەرز بۆوە ٥ نزیك بۆوە ٥ (أطَفَّ علیه): بەسەری دا ڕوانی ٥ لەخۆی گرت، دایپۆشی.

**اطفت** الناقة أو الحامل: حوشترەكە سكپڕەكە بەنەكامڵی بێچووەكەی بوو.

**اطَفَّ** لە: زیرەك بوو، تیٚی گەیی ٥ ویستی فێڵی لیٚ بكا.

**اطَفَّ** علیه بحجر ونحوه: بەمانا (طَفَّ)دیٚ واتە داهاتەوە بەردێك هەڵگریٚو پێیدا دا.

**اطَفَّ** لە السیف ونحوە: شمشێرەکەی دەرهێناو لێی نزیک کردەوەو هەڕەشەی لێ کرد.

**اطَفَّ الشَّئَ**: شتەکەی والێ کرد بەرز بێتەوە.

**اطَفَّ الكَيْلَ** ونحوە: پێوانەکەی گەیاندە ئەوپەڕی سنورو چاك پڕی کرد.

**اطَفَّ المكیالَ**: ئامێری پێوانەکەی دارماڵ کردو زێدەکەی سەری لابرد.

**طَفَّفَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طَفَّ)دێ.

**طَفَّفَتِ الشمسُ**: خۆر نزیك ئاوابوون بۆوە.

**طَفَّفَ الطائرُ**: باڵندەکە باڵەکانی فش کردنەوە.

**طَفَّفَ به الفَرَسُ** ونحوە: ئەسپەکە بازی دا سوارەکەش لەسەر پشتی بوو.

**طَفَّفَ به كذا**: پاڵی پێوەنا بۆلای ئەوەو بەرامبەری کرد یان وای لێ کرد دەستدرێژی بکاتە سەر.

**طَفَّفَ علی فلان**: کەمتری پێدا لەمافی خۆی ٥ زیادی لێ وەرگرتو کەمی پێدا.

**طَفَّفَ علیە أو علی عیالە**: چڕوکی لەگەڵ ماڵو منداڵی دا کرد، یان چڕوکیو دەست قوچاوی گرتەبەر دەربارەی بەخێوکردنی ماڵو خێزانی.

**طَفَّفَ المكیالَ** ونحوە: ئامێری پێوانەکەی بچوك کردەوە ٥ (تەرازو بازیی کرد).

**إستَطَفَّ**: بەمانا (طَفَّ)دێ.

**إستَطَفَّ السَّنامُ** ونحوە: دوگی حوشترەکە بەرز بۆوە.

**إستَطَفَّ** لە الشَّئُ: شتەکەی لێ دەرکەوت.

**إستَطَفَّ** علیە: بەسەری دا ڕوانی.

**الطَّافَةُ**: (طافة البستان): شوراو پەرژینی باخو بێستان ٥ (ك:طوافٌ).

**الطَّفَافُ**: (طفاف الشمس): نزیکبوونەوەی خۆر لەئاوابوون.

**الطَّفَاف مِن المكیال** ونحوە: قەڵاقوچکەی ڕبەو قسناغو پێوەری تر ٥ پڕکردنی ئامێری پێوانە دوای دارماڵ کردنی ٥ تاریکایی شەو.

**الطَّفَافَةُ**: شتی کەمو بەرماوە لەبنکی قاپو مەنجەڵو پەرداخ دا ٥ هەرشتێك گرنگ نەبێو گرنگی پێ نەدرێ.

**الطَّفُّ**: ئەو بەرزاییو بانوەی لەوڵاتی عەرەب بەسەر ساراو دەشتی عێراق دا دەڕوانێ ٥ لایەنو دەقەر ٥ کەناری ڕوبارو دەریا ٥ دامێنی کێو ٥

حەوشـــەو بـــەربێڵای خـــانوو ○ (ك:طُفُوفٌ).

**الطُّفَّـاف**: جەسـتە سـوكی تیـژڕەو ○ چوستو چالاك.

**الطُّفيـفُ**: ناتـەواو ○ کـەم ○ کـەمی بـێ نرخ ○ بێ بەهاو هیچو پوچ.

**طَفِقَ** يَفعَلُ الـشَّيءَ طَفَقاً وطفوقـاً: دەستی بەشتەکە کرد ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾.

**طَفِقَ** به: فرسەتی لـێ هێنا.

**طَفَلَت** الناقةُ ونحوهـا طَفْـلاً: حوشـترەکە بێچوەکەی پەروەردە کرد.

**طَفَلَـت** الـشمسُ طَفْـلاً وطفـولاً: خـۆر بـەرەو ئـاوابوون رۆیـی ○ یـان خـۆر لەئاسۆی ئاوابوون دا سوور هەڵـگەڕا ○ یـان نزیکـە لـەخۆر هەڵاتـەوە دەربکەوێو گزنگی هەتاو دیاری بـدا ○ یـان خۆرکەوتـە کـاتی پـێش ئاوابوون.

**طفل** فلان: فلانکـەس کەوتـە کـاتی پێش خۆرئاوابوون.

**طَفِلَ** النبات طَفْلاً: روەکەکە گڵی لـێ باری خۆڵبـارانی لـێ پەیـدا بـوو خراپـی کردو نەیهێشت گەشە بکا.

**طَفُـلَ** طفولـة وطفالـةً: نـەرمو نیـان بـوو، تەنكو لاواز بوو ○ بوو بەمنداڵ.

**اطْفَلَت** الأنثى: مێینەکە بێچوی بوو.

**اطْفَلَت** الشمسُ: خۆر بەرەو ئاوا بوون رۆیـی، لەئاسۆی ئـاوابوون دا سـوور هەڵـــگەڕا ○ خەریکـــە لـــەخۆر هەڵاتەوە دەربکەوێ.

**اطفَلَ** فـلان وغـيره: فلانکـەس کەوتـە کاتی پێش خۆرئاوابوونەوە.

**طَفَّلَتِ** الشمسُ: بەمانا (طَفَلَتْ)دێ.

**طَفَّلَ** الليلُ: شەو داهات ○ شـەو تـاریکی خۆی هێنا.

**طَفَّلَتِ** الناقة ونحوها: بەمانا (طَفَلَتْ)دێ، دەشگوترێ: (طَفَّلَتِ الناقةُ وَلَدَها).

**طَفَّـلَ** الحيـوان وغـيره: گیانلەبەرەکـە بەهێواشی رۆیشت.

**طَفَّـلَ** الإبـلَ ونحوهــا: لەرۆیـشتن دا بەهێواشی حوشـترەکەی لـێ خـوڕی بۆئەوەی بێچوەکەی بتوانـێ لەگەڵی بڕوا.

**طَفَّلَت** الماشية العُشبَ: ئاژەڵەکان گڵو خۆڵیـان خـستە سـەر گیـاو گژەکـەو خراپیان کرد.

**طَفَّلَ** الكلامُ: لەقسەکە ورد بۆوە.

**تَطَفَّـلَ**: بـوو بـەخۆتێ هەڵقورتێنـەر ○ خۆی لەشت هەڵقوتاند.

**الطُّفالُ**: قوڕی وشکەوە بوو.

**الطَّفْلُ**: شتی نەرمو ناسكو تەنك، دەگوترێ: (إمرأة طَفْلَة الأنامِل): ئافرەتێكە دەستو پەنجە نەرمو شلە ٥ قورێكی وشكەوە بووی تەبار بەستو بەهۆی قورسایی ئەوبەردو شتەی لەسەریەتی ٥ (ك: طُفُولٌ وطِفالٌ).

**الطِّفْلُ**: منداڵ، زارۆك كەتازە لەدایك دەبێ ٥ منداڵ تادەگاتە تەمەنی باڵق بوون ٥ (ك:أطفال) ٥ گیای كورتە باڵا ٥ پشكۆ ئاگرو بریشكە ئاگر ٥ دەگوترێ: (تطایرت أطفال النار): هەروا دەگوترێ: (هو یسعی لي في أطفال الحوائج): ئەو هەوڵ دەدا پێداویستی بچوكو بێ نمودم بۆ جێ بەجێ بكا ٥ (أتیته واللیل طفل): هاتم بۆلای كەتازە شەو داهاتبوو.

**الطَّفَلُ**: نەرمو نیان، ناسكو شلك ٥ هاتنی شەوو تاریكبوونی بەشێك لەروبەری زەوی ٥ تاریكایی شەو ٥ كاتی پێش خۆرئاوابوون ٥ یان كاتی دوا عەصر كەخۆر بەرەو ئاوابوون دەڕوا.

**طَفَلُ** العِشيّ: كۆتایی ئێوارە، كەخۆر ئاوادەبێو كەناری ئاسمان زەرد هەڵدەگەرێ ٥ كاتی دوا هەڵاتنی خۆر، ئەوكاتەی خۆر لەئاسۆ دەردەكەوێو هێشتا بەرز نەبۆتەوە.

**طَفَلُ** الغداة: دوا خۆر هەڵاتن، كەهێشتا گزنگی هەتاو دەركەوتووەو خۆر بەرز نەبۆتەوە.

**الطُّفولیّة**: بەمانا (الطُّفولة)دێ.

**الطُّفیلُ**: ناوی لێڵ كەلەبنكی حەوزدا دەمێنێتەوە.

**الطُّفیلیّ**: ئەوكەسەی بۆ هەموو داوەتو كۆڕو كۆبونەوەیەك دەچێ بەبێ ئەوەی بانگ بكرێ، دەڵێن: پیاوێكی كوفەیی لەخێڵی عەبدوڵلای كوڕی غەتەفان هەبووە بۆ هەموو داوەتو كۆڕو كۆبوونەوەیەك چووە، بەبێ ئەوەی بانگ بكرێ ئامادەی هەموو شاییو نانخواردنێكی ژن مارە كردن بووە بۆیە پێیان وتووە: (طفیل العرائس أو الأعراس): ئێستا هەركەسێك پەیڕەوی كاری ئەو بكا پاڵ ئەو دەدرێو پێی دەگوترێ: (طفیلي) ٥ لەبواری زانستی (الأحیاء)دا بونەوەرێكی زیندووە بەشێوەیەكی خۆ هەڵواسەر لەسەر حیسابی بونەوەرێكی تری زیندو دەژی.

**المُطْفِلُ**: خاوەن منداڵ، منداڵەبەر ٥ خاوەن بێچو ٥ دەشگوترێ: (لیلة

مطفل): شەوێكی مندالّ كوژە لەبەر زۆر ساردی.

**طفا** الشيءُ فوق الماء طفواً وطُفُوّاً: شتەكە نقوم نەبوو، سەرئاو بوو، سەركەوت.

**طفا** الثور الوحشي: كەڵەگا كێوییەكە چووە سەر تەپۆڵكەكە.

**طفا** الفرسُ: ئەسپەكە سەری خۆی بەرز كردەوەو سەری خۆی بادا.

**طفا** الظبيُ: ئاسكەكە چوستو چالاك بوو بازی دووری هاویشت.

**طفا** فلان: فلاّنكەس چووە ناو نیشەكەوە ٥ درێژەی بە بێعەقڵیو نەفامی خۆی دا لەبەرامبەر بابای لەسەرەخۆو عاقڵ.

**طفا** فلان فوق الفرس: فلاّنكەس خۆی هەڵدایە سەرپشتی ئەسپەكە.

**طفت** الخوصةُ فوق الشجرة: چرۆو تەرزە لەسەر درەختەكە دەركەوت ٥ (فهو طاف وهي طافية).

**اطّفى** فلان: فلاّنكەس بەردەوام بوو لەسەر خواردنی ئەو ماسییانەی سەر ئاو دەكەون.

**الطّافية** من العِنب: ئەو بۆڵە ترێیەی لەشێوەو قەبارەی بۆڵە ترێیەكانی تر جیا دەبێتەوە ٥ لەوحەدیسەی باسی دەجال دەكا هاتووە دەفەرموێ: (وكأن عينه عنبة طافية).

**الطّفاوة**: ئەو چەوریو كەفو كوڵەیە دەكەوێتە سەرو قاپەكە، دەگوترێ: (أصبْنا طُفاوة من الربيع) ٥ شتێكمان لەبەهار دەسكەوت ٥ خەرمانەی مانگو خۆر.

**الطُّفْيَة**: كرۆكو چرۆی درەختی (دۆم) خەتی سپی یان ڕەش یان زەرد لەسەر پشتی مار، ماری كلك كورتو نەرمە لیقەی پیس (كوڵە هۆیباب) كەبەسەر پشتیەوە دوو خێت هەن ٥ (ك: طُفَى) ٥ ئەم جۆرە مارە ناوێكی تریشی هەیە پێی دەگوترێ: (ذات الطفيتين).

**الطّقْسُ**: نیظام ٥ تەرتیب ٥ لەلای مەسیحییەكان ناوە بۆ خزمەتی ئاینیو ڕێو ڕەسمی بۆنەو حەفلەكانیان ٥ كەشو هەوا ٥ (ك: طقوس).

**طَقَّ طِقّاً**: تەقە تەقی هات ٥ دەنگی تەق تەقی لێ بیسترا.

**طَقْطَقَ** : دەنگی لێ هات ٥ یان دەنگی زۆر بوو یان دەنگی (تەق تەقی) دوبارەو سێ بارە كردەوە.

**طَقْطَقَ** الحِجَارة: بەردەكان هەندێكیان كەوتنە سەر هەندێكیانو تەقە تەقیان هات.

**طَقْطَقَتْ** الدواب: وڵاخەکان بەسمەکانیان لەسەر زەوی ڕەق تەقە تەقیان کرد.

**طَقْطَقَ** الشَيْ: شتەکەی والێ کرد دەنگی لێ بێ.

**طِقْ**: لاسایی کردنەوەی دەنگی بەردەکە بەیەکتر دەکێشرێن‌و دەکەونە سەریەك (تەق‌و هوڕ یا خڕو هوڕ) یان قرە قری بۆق کەلەکەنار روبارو شتی وا دەقرێنن ٥ دەشگوترێ: (هذا لايساوي طِقْ): ئەمە هیچ ناهێنێ.

**الطَّقَمُ**: کۆمەڵێك کەرەستەو ئامێری جیاجیا کە پیشەوەر بەکاریان دێنێ بۆکارەکەی وەکوو تاقمی فیتەر تاقمی شیش بەست، تاقمی تەنەکەچی، تاقمی .... کۆڕو کۆمەڵێك کە کارێکی تایبەتی دەکەن‌و هەریەکەیان لایەنێکی کارەکە ئەنجام دەدا.

**طَلَبَهُ طَلَباً**: بەدوی دا گەڕا ، هەوڵی دا دەستی بکەوێ ٥ ویستی ئەو شتە بۆ ئەو بێ ٥ داوای کرد بیدرێتێ.

**طَلِبَ طَلَباً**: دوور کەوتەوە بۆ ئەوەی خۆشەویست بیو هەوڵی دیتنی بدرێ.

**اطْلَبَ**: بەمانا (طَلَبَ)دێ.

**اطْلَبَ فلاناً**: فریا فلانکەس کەوت‌و پێداویستییەکانی بۆ دابین کردن‌و یارمەتی دا ٥ دەشگوترێ: (أطْلَبَ فلاناً الشيَ): فلانکەسی ناچارکرد بۆئەوەی داوای ئەوشتە بکا.

**طالَبَهُ** بحقه مطالبة وطلاباً:داوای مافی خۆی لێ کرد.

**طَلَّبَهُ**: بەمانا (طَلَبَهُ)دێ.

**إطَّلَبَهُ**: بەمانا (طَلَبَهُ)دێ.

**تَطَلَّبَهُ الأمرُ كذا**: کارەکە پێویستی بەوە بوو.

**الطالب**: قوتابی ئەوکەسەی هەوڵی فێربوونی زانستی دەدا ٥ بەزۆری بۆ خوێندکار بەکاردێ لەقۆناغی دواناوەندی‌و کۆلێژو زانکۆدا ٥ (ك: طلاب وطلبة).

**الطِّلابُ**: داواکراو.

**الطِّلابَة**: داواکراو.

**الطِلْبُ**: داواکراو ٥ دەگوترێ: (هي طِلْبُ فلان): ئەو ئافرەتە حەزلێکراوی فلانکەسەو عاشقی بووە بەمانا هەوڵدەردێ، دەگوترێ: (هو طِلْبُ نساء): ئەو پیاوە بەدوژن دا دەگەڕێ ٥ (هي طلب رجال): ئەو ئافرەتە هەوڵی دۆزینەوەی پیاوێتی شوی پێ بکا یان بیکاتە دۆستی خۆی.

**الطَّلَبُ**: داواکراو ٥ لەبواری ئابوری دا ئەو چەندیەتە کاڵایە یە بەنرخێك

کڕیــــار دەیکــــڕێ ٥ (ك: طلبـــــات الطَّلَبـــات). لـەقانونی (مرافعـات)دا بریتییـە لـە پێشنیاری داواچی کـە پێشکەشی دەکا بۆ دادگاو داوادەکا بەپێی ئەو پێشنیارە دادوەر حوکم بکا.

**الطُّلْبَةُ**: سەفەری دوورو درێژ.

**الطُّلْبَةُ**: داواکراو ٥ (أم طِلْبَـةُ): نازنـاوی دالاشە (داڵە کەرخۆر).

**الطِّلْبَةُ**: داواکراو ٥ پێویستی.

**الطَّلاَّبُ**: کەسێك داواکاریی زۆربن.

**الطُّلُـــوبُ**: بــــەمانا (الطَّــــــلاَّبُ)دێ، دەگـوترێ: (بئـر طَلُـوبٌ): بیرێـکە ئاوەکـەی زۆر لـەقوڵی دایـە ٥ (ك: طُلُبٌ).

**الطَّلِيـــبُ**: بــــەمانا (الطَّالِــــب) و (الطَّلوب)دێ ٥ (ك: طُلَبـاءَ) ٥ (وهـي طليب وطليبة) ٥ (ك: طلائب).

**المَطْلَبُ**: بەمانا (الطَّليـب)دێ ٥ هـەروا بەمانا مەبەستو نیاز دێ ٥ شوێنی توێژینـەوەو لێـکۆڵینەوە ٥ شـوێنی داواکردن ٥ (ك: مطالِب).

**طَلَـــحَ** طَلْحـــاً وطلاحـــاً: مانـدوو بـوو لەرۆیشتنو نـەیتوانی بڕوا.

**طَلَحَ** فلان طلاحاً: فلانکەس بەد خوو بوو، داوەشا تێکچوو.

**طَلَحَ** البعير ونحوه طَلْحاً: حوشترەکەی والێ کـرد مانـدوو شـەکەت بـوو وەسـتاو نەیتوانی بڕوا.

**طَلَحَ** المكانُ: شوێنەکە درەختـی (تـەلح)ی زۆر بوو.

**طَلَحَ** الإبلُ: حوشـترەکە بـەهۆی خـواردنی گـەڵای درەختـی (تەلحـەوە) سـکی هێشا ٥ (فهي طَلاَحَى).

**طَلَحَ** البعيرُ: حوشترەکە ناوسکی خاڵی بـوو لەخۆراك ٥ (فهو طَلِحٌ).

**اطْلَحَ**: بەمانا (طَلَحَ)دێ.

**اطْلَحَ** البعيرَ ونحوه: بەمانا (طَلَحَهُ)دێ.

**طَلَّحَ**: بەمانا (أطْلَحَ)دێ.

**طَلَّحَ** البعيرَ: بەمانا (أطْلَحَهُ)دێ.

**طَلَّحَ** عليه: زۆری تین بۆهێناو مانـدوو شەکەتی کرد.

**الطَّلْحُ**: درەختێـکی گەورەیـە لـەجۆری درەختی (العِـضاء) حوشـتر گەڵاکـەی دەخواو حەزی لێیەتی ٥ هەروا ناوە بـــۆ میـــوەی مـــۆز، کـــە قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿وَطَلْـــحٍ مَنْـــضُودٍ﴾: مەبەســت مــۆزە ٥ جــاری وادەبــێ لەجیاتی (الطَّلْحُ) دەگوترێ: (الطَّلْعُ)، هەروا وشـەی (الطَّلْعُ) نـاوە بـۆ نـاوی قوڕاوی بنکی حەوزو شتی وا ٥ وەرگ خـــاڵیو برســـی ٥ ریخۆڵـــە ٥ (ك: أطلاح).

**الطِّلْحُ**: ماندو ٥ کزو لاواز.

**طَلَسَ** بَصَرَهُ طَلْساً: چاوی کوێر بوون.
**طَلَسَ** بالشيء على وجهه: شتەکەی هێنا وەکوو خۆی ٥ چونی بیستبوو ئاوا گێڕایەوە.
**طَلَسَ** به في السجن ونحوه: فڕێی دایە ناو بەندیخانەوە.
**طَلَسَ** الكتابَ: نووسینی ناو کتێبەکەی شێواند تێکی دا.
**طَلِسَ** طَلَساً وطُلْسَةً: کوژاندییەوە.
**طَلِسَ** الثوبُ: کراسەکە یا پۆشاکەکە رزی کۆن بوو ٥ یان رەنگی بۆری مەیلەو رەش بوو.
**طَلَّسَهُ**: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (طَلَسَهُ)دێ.
**إنْطَلَسَ**: کوژایەوە، سڕایەوە، گوم بوو.
**تَطَلَّسَ**: بەمانا (إنْطَلَسَ)دێ.
**تَطَلَّسَ** بالطالسان: خاولی لەملی خۆی پێچا، خاولی بەسەر شانو ملی خۆی دا دا ٥ (طالِسان): کە جۆرە پۆشاکێکە لەبەری کرد.
**الأَطْلَسُ**: ئەوەتا رەنگی بۆری مەیلەو رەش بێ ٥ بۆیە بە گورگی بۆرمقنەی مەیلەو رەش دەگوترێ (الأطلس).
**الأطْلَسُ**: دز، سەگ ٥ چڵکن ٥ کەسێك کارێکی ناشیرینی پاڵدرابێ ٥ پارچە ئاوریشم ٥ (ك: طُلْسٌ).
**الأطلس** الجغرافي: بڕوانە وشەی (الأطلس) لەپیتی (أ)دا.
**الطَّالسان**: جۆرێکە لەسەرپۆش و مل پێچ دەخرێتە سەرشان یان لەجەستەوە دەپێچرێ و نەبڕدراوە نەدەدروێ، لەمیصر پێی دەگوترێ: (شالْ) ٥ بڕوانە (الطيلسان).
**الطِّلْسُ**: گورگی بۆرمقنەی مەیلەو رەش ٥ پۆشاکی چڵکن یان قوماشێك رەنگی بۆرمقنەی مەیلەو رەشی تێدا بن ٥ نوسینێك سڕدرابێتەوەو شوێنەواری مابێ ٥ پێستی رانی حوشتر ئەگەر روتابێتەوە.
**الطَّلْسَاءُ**: مێینەی (الأطلس) ٥ (ك: طُلْسٌ).
**الطُّلْسَةُ**: بۆرمقنەی تۆزاوی مەیلەو رەش ٥ تەنکە هەور ٥ (ك: طُلَسٌ).
**الطَّلاَّسَةَ**: تەختە سڕ ٥ پەڕۆیەك تەختەی شت لەسەر نووسراوی پێ بسڕدرێتەوەو نوسینەکەی لابرێ.
**الطَّلِيسُ**: کوێر.
**الطِّلِيسُ**: کەسێك چاوی نوقابن و هەڵنەیەن.
**الطَّيْلَسُ**: لوغەتێکە لە (الطَّيلسان) ٥ (ك: طيالِس وطيالسة) ٥ عەرەب کە

جنێو بەیەکێک دەدەن دەڵێن: (یا ابن الطَّیلسان): نارِەسەن، عەجەم.

**طَلْسَمَ**: سەری داخستو روی گرژ کرد ٥ ساحیرو جادو ٥ جادوو تەلەسمی نووسی.

**طَلْسَمَ الشَّیءَ**: خەتو هێڵکاری جۆراوجۆری بۆشتەکە کێشانو پێی وابوو بەوخەتو هێڵانەی دەیاننوسێ گیانی ئەستێرە بەرزەکان بەسروشتە نزمەکانی سەرزەوییەوە دەبەستێتەوەو دەتوانێ سود راکێشێو زیان دوور بخاتەوە، ئەم وشەیە لەبنەرِەت دا وشەیەکی یۆنانییەو بەهەموو ئەو شتانە دەگوترێ کە چەواشە کاری تێدایەو تەمو مژی نەزانی دایپۆشیوە، وەکوو لوغزو فاڵو قاوە گرتنەوەو بەخت گرتنەوەو ئەو جۆرە شتانە ٥ لەکوردی دا بەزۆری تەلیسم بەکار دەهێندرێ ٥ دەگوترێ: (فَكٌ طَلْسَمَهُ أو طَلاَسِمَهُ): تەلیسمەکەی رون کردەوە، چەواشەکارییەکانی شی کردەوە.

**الطِّلَسْمُ**: بەمانا (الطِّلَسْمُ)دێ.

**طَلْطَلَ**: دەستی راوەشاند لەکاتی رۆیشتن دا ٥ بەپەل راوەشان رۆیشت.

**طَلْطَلَ الشَّيءَ**: شتەکەی جولاند.

**الطَّلاطِلُ**: دەردی بێ دەرمان ٥ ئازاری پشت ٥ نەخۆشییەکە پشتی گوێدرێژ دابڕ دابڕ دەکا.

**الطُّلاَطِلَةُ**: بەمانا (الطُّلاطِلُ)دێ ٥ سەربرِینی خێرا ٥ گۆشتێکە لەقورگ دا یان ئاڵو کەوتن کەتوشی ئادەمیزاد دەبێو ناتوانێ خواردنو خواردنەوە قوت بدا.

**الطُّلْطُلُ**: نەخۆشی بەردەوام ٥ (ك: طلاطِلٌ).

**طَلَعَ الشمسُ أو الكوكبُ طلوعاً**: خۆر لەبەرزاییەوە دەرکەوت ٥ خۆرهەڵات ٥ ئەستێرە دەرکەوت ٥ دەشگوترێ: (طَلَعَ منه أو فيه على كذا): ئەو رەوشتانەی تێدا بەدی کردن.

**طَلَعَ النّخلُ**: درەختە خورماکە چرۆکەی دەرکەوت.

**طَلَعَ عليه**: روی تێ کرد ٥ هێرشی کردە سەر ٥ لەنکاو هات.

**طَلَعَ عنه**: لێی گوم بوو ٥ خۆی لێ شاردەوە بۆئەوەی نەیبینێ.

**طَلَعَ السَّهْمُ ونحوه عن الهدف**: تیرەکە نیشانەکەی نەپێکاو نەی هەنگاوت.

**طَلَعَ الشَّيءَ رفيه**: چووە سەرشتەکەو پێیدا سەرکەوت.

**طَلَعَ المكانَ**: گەییشتە شوێنەکە، چو بۆ شوێنەکە.

اطْلَعَ النخلُ: بەمانا (طَلَعَ)دێ.
اطْلَعَ الشجرُ: درەختەکە گەڵای گرت.
اطْلَعَ الشجرُ: درەختەکە گەڵای گرت.
اطْلَعَ الرامي: تفەنگ هاوێژەکە، تیر هاوێژەکە تیرەکەی سەری کردو نیشانەکەی نەپێکا.
اطْلَعَ علیه: بەمانا (طَلَعَ)دێ.
اطْلَعَتْ النخلةُ: درەختە خورماکە درێژ بوو، بەرز بوو.
اطْلَعَ الشَّيْءَ: وای لەشتەکە کرد دەربکەوێ.
اطْلَعَ رأسَهُ علی الشَّيْ: بەسەر شتەکەی دا روانی بۆئەوەی ببینێ.
اطْلَعَتْ النخلةُ الطلعُ: درختە خورماکە چروزەکەی دەرخست.
اطْلَعَ فلاناً علی کذا: فلانکەسی بەسەر شتەکەدا ئاگادار کردو بۆی دەرکەوت.
اطْلَعَ فلاناً: پەلەی لەفلانکەس کرد.
اطْلَعَ الیه معروفاً: چاکەی لەگەڵ کرد.
طَالَعَ الشَّيْءَ مُطَالعةً وطلاعاً: بەهۆی تێروانینو لێ ورد بونەوە بەسەر شتەکەدا ئاگادار بوو.
طالَعَ الکتابَ: کتێبەکەی خوێندەوە.
طالَعَ فلاناً: تەماشای ئەوەی کرد لای فلان بوو.
طالَعَ فلاناً بالأمر: فلانکەسی بەسەر کارەکەدا ئاگادار کردەوە.
طالَعَ فلانا بکتبه: کتێبەکەی بۆفلان کەس نارد بۆئەوەی بەسەری دا ئاگادار بێ.
طَلَّعَ النخلُ: درەختە خورماکە چروزەکەی دەرکرد.
طَلَّعَ الکیلَ: ربەکەی پێواو پڕی کرد.
إطَّلَعَ: بەمانا (طَلَعَ)دێ.
إطَّلَعَ علی الأمر: کارەکەی زانی.
إطَّلَعَ علی الشَّيْ: بەسەر شتەکەی دا روانی ٥ بەسەری دا ئاگادار بوو.
إطَّلَعَ الیه: بەسەری دا ڕوانی ٥ سەیری کرد بۆئەوەی بزانێ چییە.
إطَّلَعَ للأمر: بەسەر کارەکەدا باڵا دەست بوو توانی ئەنجامی بدا.
إطَّلَعَ الأمرَ: کارەکەی زانیو بەسەر نهێنیەکەی دا ئاگادار بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أطَّلَعَ الغیب أم إتَّخذ عند الرحمن عهداً﴾.
تَطَلَّعَ: بەمانا (طَلَعَ)دێ.
تَطَلَّعَ الإناءُ: قاپەکە پڕ بوو.
تَطَلَّعَ الماءُ ونحوه من الإناءِ: ئاوەکە سەر ڕێژی کردو لەهەموو لایەکی شتەکەوە هەڵڕژا.
تَطَلَّعَ في مشیه: لەڕۆیشتنەکەی دا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.
تَطَلَّعَ الی الشَّيْ: سەیری دیمەنی

شتەکەی کرد ٥ شتەکەی زانی.

**تطَلَّعَ** الی قدومه: چاوی هەڵبڕی سەیری کرد، دەگوترێ: (عافی الله رجلاً لم یَتطَلّع في فِمِك): ڕەحمەتی خودا لەوکەسەی بەدوا قسەکانی تۆدا نەگەڕا.

**إستَطْلَعَ** الشَّيْءَ: ویستی شتەکە دەربخاو بزانێ چییە.

**إستَطْلَعَ** رأيَهُ: لەڕاو بۆچونەکانی ورد بۆوە تابزانێ چییە.

**الإستطلاع الصحفي**: باس‌و لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسی، کە نووسەرێك یان زیاتر ئەنجامی دەدا دەربارەی ڕوداوێك بەوەسف‌و وێنەوە.

**الطالِعُ**: مانگی یەکشەوە ٥ گزنگی درۆزنی بەرە بەیان (فەجری کاذب) ٥ تیرێك بکەوێتە ئەو دیو مەبەست‌و سەربکا ٥ لەبواری ئەستێرە ناسی‌و ئاسمانشوناسی دا ئەو هەواڵە بێ بنەمایەی ئەستێرە ناس بڵاوی دەکاتەوە دەربارەی هەڵاتنی ئەستێرەیەکی تایبەت‌و پەیدابوونی ڕوداوی سەیرو سەمەرە ٥ (ك: طُلَّعٌ وطوالع).

**الطَّالِعَةُ** من الإبل: یەکەم حوشتر کەلەکاروانەکەدا دەردەکەوێ.

**الطِّلاعُ**: بەمانا (الإطلاع)دێ ٥ هەروا ناوە بۆ هەرشوێنێك خۆری لێ هەڵبێ ٥ (طِلاع الشَّيْءِ): پڕی شتەکە ٥ دەگوترێ: (طِلاع الأرض وطِلاع الإناء) یان دەگوترێ: (قوس طِلاع الکف): قەوسەکە پڕ بەدەستە ٥ (قِداح طِلاع): پەرداخێکە پڕە ٥ (عین طِلاع): چاوێکە پڕە لەفرمێسك ٥ (ك: طُلُعٌ).

**الطِّلْعُ**: شوێنی بەرز کەلێیەوە بڕوانی بۆ شتێکی تر یا شوێنێکی تر ٥ دەڤەرو لایەن‌و ناوچە ٥ (ك: طلوع واطلاع).

**الطَّلْعَةُ**: ئەوەی دەربکەوێ لەشت هەرشتێك بێ ٥ دەم‌و چاو ٥ پارچەیەك لەچروزەی تازە دەرکەوتوی دارخورما.

**الطُّلَعَةُ**: ئەوەی زۆر دەربکەوێ، یان چاوەڕوانی شت بێ ٥ دەگوترێ: (إمرأة طُلَعَةٌ خبأة): ئافرەتێکە جار جار دەردەکەوێ‌و جار جاریش خۆ گوم دەکا ٥ (وطُلَعَةٌ قبعة): ئافرەتەکە جارجار جار سەر ڕوت دەکا و جار جاریش سەری دادەپۆشێ ٥ (ونفس طُلَعَةٌ): نەفسێکە زۆر چاوەڕوانی ئەوشتەیە.

**الطَّلاَّعُ**: (طَلاَّ الثنایا): قاڵبوو لەبۆتە

دراوی روداوی ڕۆژگارەو باش دەزانی تەگبیر یان بکاو حەلیان بۆ بدۆزێتەوە.

**الطَّلِيعةُ** من الجيش: پیشە تای سوپا، یەکەم وەجبەی سوپا کە دەردەکەوێ ◊ ئەو تاقەو کۆمەڵەی سوپا کە دەنێردرێن بزانن سوپای دوژمن چۆنەو چەندەو چی دەکەن ◊ دەشگوترێ: (هو في الطليعة أو في طليعة كذا) ◊ (ك: طلائع).

**المَطْلِعُ**: پێشەتاو دیباچەی چامە شیعر ◊ یەکەم دێڕە شیعری چامەکە ◊ شوێنی خۆر هەڵاتن ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ﴾ ◊ کاتی بەیانیو خۆر هەڵاتن ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾.

**مَطْلَعُ** الأمر: شوێنی بۆچونی کارەکەو چۆنیەتی دەست پێکردنیو ڕێبازی چوونە ناوەوەی ◊ مەصعەدو ئامێری بەرز بوونەوە لە نزمییەوە بۆ بەرزی ◊ دەشگوترێ: (هذا مطلعَ الأكمة): ئەمە ڕونو ئاشکرایە ◊ (ك: مطالِعَ).

**مطالع** الشمس: شوێنە جیاجیاکان کەخۆر لێیانەوە هەڵدێ، چونکە خۆر ڕۆژانە شوێنی دەرکەوتنو ئاوابوونی دەگۆڕێ.

**اطَّلَفَ** فلان: فلانکەس تۆڵەکردنەوەی دوژمنەکەی هەڵوەشاندەوەو پیلانەکەی پوچ کردەوە.

**اطَّلَفَ** دم القتيل: خوێنی کوژراوەکەی بەفیڕۆ دا.

**اطَّلَفَ** مالَ فلان أو حقهُ: مافو ماڵی فلانکەسی ژێر پێ دا.

**اطَّلَفَ** فلاناً كذا: فلان شتی بەخشی بەفلانکەس.

**طَلَّفَ** عليه: لێی زیادکردو لەسەری زیادکرد.

**الطَّلْفُ**: بەفیڕۆ دان ◊ بەتاڵو پوچ.

**الطَّلَفُ**: بەمانا (الطَّلْفُ)دێ ◊ شتی ئاسانو بەیدەست ◊ زیادەی شت ◊ بەخششو دیاری.

**الطَّلِيفُ**: بەمانا (الطَّلْفُ)دێ ◊ شتی بەلاش ◊ کاری ئاسانو کەم ئەرکو هەرزان بەها.

**طَلَقَ** طلوقاً وطلاقاً: لەکۆنترۆڵی ئەودا نەما، لەژێر دەسەڵاتی چووە دەر.

**طَلَقَت** المرأة من زوجها: ئافرەتەکە لەژێر نیکاحی مێردەکەی چووە دەرو لەقەیدو ئەرکی مێردەکەی ڕزگاری بوو.

**طَلَقَ** يده بالخير: دەستی بەبەخششو ئانبدەیی بڵاو کردەوە.

**طَلَقَ** فلاناً الشَّيْءَ: شتەکەی بەخشی بە فلانکەس.
**طَلَقَ** طَلَقاً: دوورکەوتەوە.
**طَلُقَ** طُلُوقةً وطَلاقَةً: بەمانا (طَلَقَ)دێ.
**طَلُقَت** اليدُ: دەستەکە بەخشندە بوو.
**طَلُقَ** الوجهُ: دەمو چاوی رونو گەشەدار بوونو کەیف خۆشو تەڕدەماخ بوو.
**طَلُقَ** اللِسانُ: زمانی رەوانو قسە شیرین بوو.
**طَلُقَ** فلانٌ: فلانکەس روگوشادو روخسار جوانو قسە خۆش بوو.
**طَلُقَ** اليومُ: رۆژەکەی مام ناوەندی بوو نەسارد بوو نەگەرم.
**طَلُقَتِ** المرأةُ من زوجها: بەمانا (طَلَقَتْ)دێ.
**طُلِقَتِ** المرأة أو الحاملُ في المخاض: ئافرەتەکە ئازاری زانو نارەحەتی مندالبونی توش بوو ◦ (فهي مطلوقة).
**اطْلَقَ** القومُ: خەلکەکە حوشترەکانیان بەرەللا کردن بۆ ئەوەی بلەوەڕێن، بگەرێن لەوەرێکیان دەست گیر ببێ.
**اطْلَقَ** الشيءَ: شتەکەی بەرەللا کرد ◦ دەگوترێ: (أطْلَقَ الأسيرَ): دیلەکەی بەرەلاکرد ◦ (أطلق الماشية): ئاژەلەکانی بەرەلای لەوەرگا کردن ◦ (أطلق خيله في الحلبة): ئەسپەکەی لەگۆرەپانی جلیت بازی دا هێناو برد ◦ (أطلق المرأة): ئافرەتەکەی تەلاق دا ◦ (أطلق له العنان): بەرەلای کرد مەرەخەسی کرد ◦ (أطلق له التصرف): رێگای دا چۆن کاردەکا بیکا.
**اطلق** الدّواءُ بطنَهُ: دەرمانەکە سکی چواند ◦ توشی گوفیرەو رەوانی کرد.
**اطلق** الكلامَ: قسەکەی بەرەهایی کردو تایبەتمەندی نەکرد بەشتێکەوە.
**اطلق** يده بخير: دەستی خۆی بەخێرو بەخشیش بلاو کردەوە.
**اطلق** المِدْفَعَ ونحوه: تۆپەکەی والێ کرد گوللە بهاوێ ◦ گوللە بتەقێنێ.
**اطلَقَ** كذا على كذا: ئەوەی کردە ناو بۆئەوە ◦ یان ئەو ناوەی بۆ بەکار هێنا.
**طَلّقَهُ**: بەمانا (أطلقه)دێ.
**إطّلَقَ**: دلخۆش بوو.
**إنْطَلَقَ**: بەرەلا بوو، جولا ◦ لەوە رزگاری بوو ◦ رۆیی ◦ دەگوترێ: (إنطلق يفعل كذا): دەستی کرد بەوشتە، خەریکە ئەو شتەبکا.
**انطلق** الوجه أو اللسانُ: روخساری گوشادو جوان بوو ◦ زمانی کرایەوەو قسە شیرین بوو.

**تَطَلَّقَ:** بەمانا (إنطلق)دێ.

**تَطَلَّقَ الظَبيُ ونحوه:** ئاسكەكە بەخێرایی ڕۆیی.

**تَطَلَّقَ الخیلُ:** ئەسپەکە لەپێشبڕکێ دا بەرەهایی ڕۆیی هیچ شتێك جڵەوی نەگرتەوە.

**تَطَلَّقَ الفرسُ:** ئەسپەکە دوای ڕاکردن میزی کرد.

**إستَطلَقَ:** بەمانا (تَطَلَّقَ)دێ.

**إستَطلَقَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەپەلە کرد ٥ یان داوای بەر هەڵدانی کرد ٥ دەگوترێ: (إستَطلَقَ من صاحب الدین کذا): داوای لەخاوەن قەرزەکەی کرد ئەوەی بۆ بکا.

**الطالِق:** تەلاقدراو ٥ دەگوترێ: (إمرأة طالق): ئافرەتەکە لەبەندو ئەرکی مێرداری ڕزگاری بوو ٥ (ناقة أو شاة طالق): حوشترێك یان مەڕێکی بەرەڵا کراوە بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی بلەوەڕێ ٥ (ك: طُلَّقٌ وطوالِق).

**الطالِقة من النساء:** بەمانا (الطّالِق)دێ ٥ هەروا ئەگەر بۆ حوشترو مەڕو شتی واش بەکارهات هەربەمانا (الطّالِق)دێ.

**الطالِقة من اللیالي:** شەوی هەوا مام ناوەندو نەساردو نەگەرمو بێ چورتمو ناخۆشی ٥ (ك: طوالِق).

**الطّلاق:** بەرەڵلا کردنو مەرەخەس کردن ٥ لەبواری شەرع دا بریتییە لەهەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نێوان ژنو مێرد، لابردنی نیکاحی نێوان ژنو مێرد.

**الطّلْقُ:** بەرەڵاو بێ کۆتو زنجیر ٥ دەگوترێ: (طَلْقُ الیَدَ أو الیدین): پیاوێکی دەسکراوەو نانبدەیە.

**فرسٌ طَلْقُ الید:** ئەسپێکە دەستی پێوەندی تێدا نییە پێوەند نەکراوە ٥ قاچی پەتو شتی وای تێ نەخراوە، هەروا وشەی (ألطَلْق) ناوە بۆ ئاسك لەم ڕووەوە کە تیژڕۆیە ٥ ناوە بۆ سەگی ڕاو چونکە بەخێرایی پەلاماری نێچیر دەدا، هەروا ناوە بۆ دەمو چاوی گوشادو ڕوخساری جوانو دەم بەپێکەنین ٥ بۆ زمانی ڕەوانو قسە شیرین ٥ شەوو ڕۆژی هەوا خۆشو نەساردو نەگەرم بێ ڕەشەباو شتی ناخۆشو زیانبەخش ٥ ژانی منداڵبون ٥ گیایەکە لەبواری بۆیەو ڕەنگ دا بەکاردەهێندرێ ٥ بەردێکە بریسکە دارو ڕونە کەبەئاسن پێی کێشی پریشکی لێ دەبێتەوە، دەهاڕدرێو وەکوو بۆدرە بەجەستە دەکرێ پێستی مرۆڤ نەرم دەکا.

**الطَلِقُ**: بەرەڵڵا یان دەستکراوەو ئازاد بەجۆرێـك بتوانـێ هـەموو شتێـك ئەنجام بدا، روخساری گوشادو زمانی ڕەوان.

**الطُلُقُ**: بەرەڵڵا کراو ٥ دەگوترێ: (بعير أو ناقـة طُلُــقٌ) ٥ هـەروا ئـاوە بـۆ روخساری شیرین‌و زمانی ڕەوان.

**الطُلَقُ**: ئـۆرە ٥ بـەش‌و بـار ٥ ریخۆڵـە ٥ دەوران دەوری گەدە ٥ (ك:أطلاق).

**الطَلِقُ**: روخسار شیرین‌و زمـان ڕەوان ٥ قسەزان.

**الطَلْقَةُ**: یەکجار ژان گرتن، یان یـەکجار تەلاقـدان، یـەك تـەلاق یـان یـەکجار بــەرەڵڵا کــردن ٥ شــەوی ئەســاردو ئەگەرم.

**الطَلَقَةُ**: پیاوێـك زۆر ژن تەلاق بدا.

**الطَلاقُ**: بەمانا (الطُلَقَةُ)دێ.

**الطَليـقُ**: روخـسار شـیرین‌و روکـراوەو زمــان ڕەوان ٥ یــان دیــل‌و دەســت بەسەر کە بەرەڵڵا دەکرێ‌و وازی لـێ دێندرێ بۆخۆی چی دەکا بیکا ٥ ئەو کەسـەی بـەزۆر موسـوڵمان کـراوە ٥ (ك: طلقاء).

**المِطـلاقُ**: پیاوێـك ژن تـەلاق بـدا ٥ حوشتری بەرەڵڵا ٥ (ك: مطاليق).

**المُطلَــقُ**: ڕەهــاو بـــێ مـــەرج‌و تایبەتمەندی ٥ شتی نادیاری کراو ٥ حــوکم‌و بڕیارێــك کەچــەرت‌و وەلانـانی تێـدا نـەبێ ٥ ئـاوی بـێ قەیــدو مــەرج، ئـاوی سروشـتی‌و نەگۆڕاو پاك‌و بێ گـەرد ٥ ئەسپێـك بازنەی سروشتی لەقاچ دا نەبێ یان پەت‌و پێوەندی لەقاج نەبێ.

**المُطَلَّقُ**: ئەوکەسەی دەیەوێ پێشبڕکێ بەئەسپەکەی بکا.

**طَلَّ** دم القتيل: خوێنی کوژراوەکە بـەفیڕۆ ڕۆیـی ٥ تۆڵـەی ئەسـەندرایەوەو خوێنیشی وەرنەگیرا ٥ زەوی شـەونم لـێ دراو.

**طَلَّ** اللبنُ: شیرەکە کەم بوو.

**طَـلَّ** دمَ فـلان: خـوێنی فلانـی بـەفیڕۆ دا، بەتاڵی کردەوە.

**طَـلَّ** فلانـاً: فلانکەسـی پاشـگوێ خسـت‌و هەوڵی دا مافی پێشێل بکا.

**طَـلَّ** المَطَـرُ الأرضَ: بارانەکـە زەوییەکـەی ئاودا، تەڕی کرد.

**طَـلَّ** فلانـاً حقـه: فلانکەسـی مـەنع کـرد لـەمافی خـۆی‌و هـەوڵی دا مـافی لـێ زەوت بکا.

**طَـلَّ** الـشَّيءَ بالـدهن: شـتەکەی بـەرۆن هەنوو.

**طَلَّ** الإبلَ ونحوهـا: بـەزەخت حوشـترەکەی لـێ خوڕین.

**طُلَّ** دَمُهُ طُلاً: بەمانا (طَلَّ)دێ.

**طُلَّت** الأرض: زەوییەکە شەونم لێی دا ◦ (فهي مطلولة).

**طَلَّ** طلاً وطَلاَلَـةً: جوانو سەرنج راکێش بوو.

**طَـلَّ** فـلان: فلاّنکـەس کـەیف خـۆشو تەڕدەماخ بوو.

**اطَلَّ**: بەسەری دا ڕوانـی ◦ دەشـگوترێ: (أطلَّ عليه).

**اطَلَّ**: نزیك بۆوە.

**اطَـلَّ** علـى حقـه: لـەمافی خـۆی دا بەسەری دا زاڵ بوو.

**اطَلَّ** عليه بالأذى ونحوه: بـەردەوام بـوو لەسەر ئەزیەتدانی.

**اطَـلَّ** دمَ القتيـل: خـوێنی کوژراوەکـەی بەفیڕۆ دا ◦ دەشگوترێ: (أُطِلَّ دَمُهُ).

**تطالَ**: مۆڵەتی داو چاوەڕوانی کرد.

**تَطَلَّـلَـت** الأرض: زەوییەکـە گیـاو گـژی لـێ ڕواو کەس ناوی نەکەوت، کەس پێی لـێ نەنا.

**إستَطَلَّ** عليه: بەمانا (أَطَلَّ)دێ.

**إستَطَلَّ** الفرسُ ونحـوه ذَنَبَـهُ: ئەسـپەکە کلکی بەرزکردەوە.

**الطَّلاَلَـةُ**: جـوانیو روخـسار شـیرینی ◦ کـەیف خۆشـیو تـەڕ دەمـاخی ◦ کەسایەتی هەموو شتێـك ◦ قـەبارەی خانوو هەیکەلی ◦ کەلاوەی خانوو.

**الطَّلُّ**: جوانو سەرنـج راکێش لەهەموو شتێـك دا ◦ وردە بـاران ◦ نمـە بـاران کـە زۆر زەوی تـەڕ نـەکا ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَـإِن لَّـمْ يُـصِبْهَا وَابِـلٌ فَطَلٌّ﴾ ◦ شەونمو تەڕاییەك کە ڕەگی درەخـــتو روەك دەیــدا بـــەلقو گـــەڵاکان ◦ شـــیرو ماســـت ◦ پـــیرو بەساڵاچوو ◦ (ك:طِلال وطِلَلٌ).

**الطِلُّ**: بەتاڵو پوچ.

**الطَّلَـلُ**: شـوێنەوارو کـەلاوە ◦ سـەکۆی بەربێڵاو خانوو کەشوێنی دانیشتنی خێزانە بۆ پشودانو حەسانەوە یان خـــواردنو خواردنـــەوەی لەســـەر دادەنـرێ ◦ خێمـەو پارچـە قوماشـی گەورە کەکەشتیو بارو بارگنەی پـێ دادەپۆشرێ ◦ (ك:أطلال وطلول).

**الطُّلاَّءُ**: خوێنی ڕژاو.

**الطُّلَّةُ**: ئافرەت ◦ زەوییـەك نمـە بارانی لـێ درابێ ◦ نازو نیعمەت لەپۆشاكو خواردەمـــەنی دا ◦ شـــەرابی گـــواراو بەلـەزەت ◦ هەرشـتێ: بـۆنی خۆشـی لـێ بێ.

**الطُّلَّةُ**: قومەشـیر، قومـە ماسـتو دۆ ◦ مل ◦ (ك: طُلَلٌ).

**الطَّليـــــلُ**: ڕژاو (خـــــوێنی ڕژاو) ◦ حەصـــیری چـــندراو لـــەپرژو پـــاڵی درەختـــی دۆم یـــان لەتوێـــکڵی ئـــەو درەختە ◦ ڕزیوو پۆڵـکاو ◦ (ك: أطِلَّةٌ

وطُلُلٌ وطِلَّةٌ) ٥ بۆ مێینه (طلائـل) ٥ دەگوترێ: (المُطِلُّ مـن الأمـور): شتی بەرقـەرار نـەبوو ٥ دەگـوترێ: (أمـر مُطِلٌ): کارێکی گۆڕاوو نابەردەوامە.

**المطلولُ**: ماست توێژێـکی بەسەرەوە بـێ‌و ئـاوی سـەرکەوتبێ وابزانـی ماسـتی چـاکە، بـەڵام لـەواقیع دا خراپ بێ.

**طَلَمَهُ**: شەپلاغەی لـێ دا.

**طَلَمَ الخُبْزَةَ**: نانەکەی پان کـردەوەو رێـکی خست.

**طَلَّمَ الخُبْـزَةَ**: بـەمانا (طَلَـمَ)دێ ٥ واتـە: نانەکەی پان کردەوەو رێکی خست.

**طَلَّمَ العرق عن جبينه**: عەرەقی لـەناو چاوانی خۆی سڕی.

**الطُّلْمُ**: سفره خـوان کـەنان‌و پێخـوری لەسەر دادەندرێ.

**الطَّلَـمُ**: چڵـك‌و بـەڵغی دەم‌و ددان کەبـەهۆی گـوێ پێنـەدانیان پەیـدا بوو بێ.

**الطُّلْمَةُ**: نانی برژاو بەخۆڵە مێشی زۆر گەرم نانی پێشاو لەناو خۆڵەمێشی گـەرم ٥ بـەردی پـان کـەوەکوو پنـە نـانی لەسـەر پـان بکرێتـەوە ٥ (ك: طُلَمٌ).

**المَطْلَمَةُ**: تـیرۆك؛ ئامێرێکە نـانی پـێ پـان دەکرێتــەوە پــێش ئــەوەی بیرژێندرێ.

**طَلْمَسَ**: بـەمانا (طَلْسَمَ)دێ واتـە تەلیسمی لـێ کرد ٥ یان دەم‌و چاوی گرژو مۆن کرد.

**طَلْمَسَ الکتـابَ**: نوسـینی کتێبەکـەی سڕیەوە، رەشی کردەوە.

**إطْلَمَّسَ اللیلُ**: شەوەکە تاریك بوو یـان تاریکییەکەی زۆر کەسکون‌و بـەهێز بوو.

**الطِّلْمِسَاءُ**: تاریکی بەهێزو زۆر تاریـك ٥ زەوی‌و سارایەك کـەهیچ نیشانەو باڵەخانەو خانوبـەرەی تێدا نـەبێ ٥ تەنکە ئاو.

**طلا** طَلْـواً وطَـلاَوَةً: ئاسکەکەی بەستەوە، بەندی کرد.

**طَلِیَتْ** أسنانُهُ طلاً: ددانـی زەرد بـوون ٥ بەڵغێکی سەوز کەوتە سەر ددانـی ٥ بــەڵغی زەرد ددانـــی داپۆشـــین ٥ دەگـوترێ: (طَلِيَ فَمُـهُ): دەم‌و ددانـی بەڵغ گرتـی ٥ لـەتینوان دەمـی وشـك بوو.

**اطْلَتِ** الظَّبِیَةُ: ئاسکەکە بێچویەك یـان زیاتری بوو.

**اطْلَـی** فلان: فلاَنکەس ملی بەلایـەك دا خوار بوو ٥ دەگوترێ: (ما أطْلَی نَبِيٌّ قـط): هـیچ پێغەمبەرێـك شـوێن هـەواو ئـارەزوی خـۆی نەکـەوتووە.

**الطَّلاَ**: شتی بچوك لەهەرشتێك بێ ٥ زارۆك ٥ بێچوی ئاژەڵ کەلەدایك دەبێ تا خۆ دەگرێ ٥ بێچوی ئاسك ٥ تفی وشکەوە بووی ناو دەم ٥ یان تفێکی لینج کەددان دادەپۆشێ‌و لەئاکامی تینوایەتی زۆر یان برسیەتی یان نەخۆشی پەیدا دەبێ ٥ (ك: أطْلاَء وطِلاَء وطُلّی)یە.

**الطُّلاَةُ**: مل، گەردن ٥ یان لامل ٥ (ك: طُلّی)یە.

**الطِّلاوَةُ**: جوانی‌و رەونەق‌و گەشەو نەشە ٥ توێژێکی تەنکە لەسەر شیرو ماست‌و خوێن پەیدا دەبێ ٥ پاشماوەی خۆراك لەناو دەم‌و ددان دا.

**الطُّلاَوَةُ**: هەرشتێك بۆ چەورکردن رەنگ کردن بەکاربێ قەوز ٥ قسەو باسی کورت‌و کەم.

**الطِّلْوُ**: گورگ ٥ نێچیرەوانی چوست‌و لەش سوك ٥ حەبلێك سەرێکی لەقاچی ئاژەڵەکە دەخرێ‌و سەرەکەی تری بەسنگێکەوە دەبەسترێ ٥ (ك: أطلاء وطِلاء).

**الطُّلْواءُ**: چاوەروانی ٥ تەمبەڵی‌و قونگرانی ٥ قەوز.

**الطَّلَوان**: بەڵغێکی سپییە زمان دادەپۆشێ بەهۆی نەخۆشی یان تینوایەتی پەیدا دەبێ.

**الطُّلْوَةُ**: سپیایەتی بەیان، روناکی ئاسۆی بەرەبەیان ٥ (ك: طُلّیً).

**الطِّلْوَةُ**: بێچوە ئاژەڵی کێوی ٥ گوریس‌و حەبل یان پارچە حەبل ٥ شتی بێ نرخ‌و بەها ٥ دەگوترێ: (مایساوی طِلْوةً): پەتکە گوریسێك ناهێنێ.

**طَلَی** الماءُ طَلْیاً وطِلاءً: ئاوەکە قەوزی لێ پەیدا بوو.

**طَلَی** الشَّيءَ بکذا: شتەکەی بەشتێك بۆیەکرد دایپۆشی.

**طَلَی** الليلُ الآفاق وغیرها: شەو بەتاریکی خۆی دونیای داپۆشی ٥ (طَلَی فلاناً): جنێوی بەفلانکەس دا.

**طَلَی** الظَّبْيَ: ئاسکەکەی بەستەوە ٥ کردیە کۆزوگەوی تایبەتیەوە.

**طَلَّی** فلان: فلانکەس گۆرانی گوت.

**طَلَّی** الشَّيءَ بکذا: زێدەرەوی کرد لە هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی شتەکە.

**إطَّلَی** بکذا: بەوە چەوری کرد.

**تَطَلَّی**: بۆ موطاوعەی (طلاّه)دێ ٥ خوی بەگاڵتەو کەپو خۆش رابواردنەوە گرت.

**الطُّلَّی**: قومەشیرو کەوچکە دۆیەك.

**الطَّلاَّءُ**: ئەوکەسەی مەعدەن‌و شتی وا بۆیەدەکا.

**الطَّلَـى**: بێـچوی ئاسـك ٥ بۆیـەكراو بەقەتران ٥ (ك: أطلاء وطلاء).

**الطِّلاء**: هەرشتێك شتی تری پێ بۆیە بكرێ وەكوو قـەتران‌و رۆن‌و قـوڕو شـتی وا ٥ دۆشـاوی تـرێ ٥ زیـوی خـاڵص‌و پاڵفتـە كـراو ٥ ئـەو پـەت‌و حەبلـــەی ئاژەڵەكـــەی پـــێ بەستراوەتەوە.

**الطَّلْيَاءُ**: گروێ ٥ ئەو پەڕۆیەی ئافرەت بەخۆیـــەوە هەڵـــدەگرێ لـــەكاتی كەوتنە ناو عادەتی مانگانەیەوە.

**الطِّلْيانُ**: بەڵغی زەرد كەدەكەوێتە سەر ددان.

**الطُّلْيَـةُ**: مـــل ٥ لامـــل ٥ پارچـــە خوریەكە یا لفكەیەكـە جەستەی گروێـــی پـــێ چـــەور دەكـــرێ ٥ نەخۆشییەكە دەشوبهێتە نەخۆشی پێـست قەڵـشین‌و تـوك روتانـەوە ٥ لەلاتەنیشتی مرۆڤ پەیدا دەبێ.

**المِطْلَى**: ئامێری شت چەور كردن.

**المِطْلاَءُ**: بەمانا (المِطْلَى)دێ.

**المَطْلِـيُّ**: (أمـــر مَطْلِـــيٌّ): كارێـــكە چەواشەو نامەعلوم‌و تەم‌و مژاوییە.

**طَمِثَتِ المـرأةُ**: ئافرەتەكـە یەكـەمجار كەوتە عادەی مانگانەوە ٥ (ك: طُمُثٌ وطوامِث).

**طَمِثَ المرأةَ**: چووە لای ئافرەتەكە، دەستی لێ دا، لەگـەڵی جوت بـوو ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَطمِثْهُنَّ إنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ﴾ ٥ دەشـگوترێ: (مـا طِمِـثَ هذا الـبعيرَ حَبْـلٌ): كـەڵ سواری ئـەو حوشـترە نـەبوە ٥ (ومـا طمِـثَ هـذا المرتع أو هذه الروضَةَ أحد قبلنا).

**الطَّمْـثُ**: خـوێنی حـەیز ٥ چڵـك‌و دزوێنی.

**طَمَحَ** الماءُ ونحوه طُموحـاً وطِماحـاً: ئاوەكـە بەرز بۆوە.

**طَمَحَت الدَّابَّةُ**: وڵاخەكە چەموش بوو.

**طَمَحَ** اليه بصره: سەیری كرد ٥ بۆی ڕوانی ٥ دەشـگوترێ: (طَمَحَ ببصره): چاوی بۆ بەرز كردەوە، چاوی تێ بڕی.

**طَمَحَ** بأنفه: خۆی بەزلزانی، فیزی كرد.

**طَمَحَ** الى الأمر: چاوڕوانی كارەكەی كرد.

**طَمَحَتْ** المرأةُ علـى زوجهـا: ئافرەتەكە مێردەكـەی بـەجێ هێـشت‌و چـۆوە بۆماڵی باوانی.

**طَمَحَ** في الطلب: لەداواكارییەكـەی دا دوور ڕۆیی.

**اطَّمَحَـهُ**: وای لـێ كـرد هیـواو ئـاواتی بەرزی هەبن.

**اطْمَحَ** اليه بصره: چاوی بۆ هەڵبڕیو تەماشای کرد.

**طَمَّحَ** الفرسُ ونحوه: ئەسپەکە هەردو دەستی هەڵبڕین.

**طَمَّحَ** بالشيئ في الهواء: شتەکەی بۆ حەوا هەڵدا.

**الطَّامِحُ**: هەر بەرزاییو تەپۆڵکەیەك ◦ ئافرەتێك رقی لەمێردەکەی بێو بڕوانێتە پیاوی تر، دۆستایەتی لەگەڵ پیاوی بێگانەدا بگرێ ◦ (ك: طوامِحُ).

**الطَّمْحَةُ**: یەکجار سەیرکردن.

**طَمَحَات** الدهر: بەلاو کارەساتی رۆژگار.

**الطَّمَّاحُ**: کەسێك هیواو ئاواتی زۆری هەبێ ◦ چلێس ◦ بۆ بەرزو دوور ڕوانین.

**الطَّمَّاحة**: ئافرەتێك چاوە چاوی بێو بەڕاستو چەپ دا بڕوانێ بۆ پیاوی بێگانەو رقی لە مێردەکەی بێ.

**الطَّمُوحُ**: دەگوترێ: (بحر طَمُوحُ الماء): دەریایەکە شەپۆلەکانی بەرزن ◦ (بئر طموح الماء): بیرەکە ئاوی بەرزە.

**طَمَرَ** طَمْراً وطموراً: بازی بۆ ژێرەوە دا هەڵهاتە خوار.

**طَمَرَ** في الأرض ونحوها: بەناو زەوی دا رۆیشتو خۆی شاردەوە.

**طَمَرَ** الشيئ طَمْراً: شتەکەی شاردەوە بەنهێنیو کەسنازانێ لەکوێی شاردەوەو چۆنی شاردەوە.

**طَمَرَ** البئرَ: بیرەکەی پڕکردەوە.

**طَمَرَ** المطمورة: چاڵەکەی پڕکرد لەگەنمو شتی وا.

**طَمِرَ** في ضرسِه: ژانی ددانی تەنگی پێ هەڵچنی.

**طُمِرَت** يده: دەستی هاوسا.

**اطمَرَهُ**: بەمانا (طَمَرَهُ)دێ.

**طَمَّرَهُ**: زێدە ڕەوی کرد لەشاردنەوەی شتەکەدا ◦ پێچایەوە.

**طَمَّرَ** السِّتْرَ: پەردەکەی شل کردەوە، دایدایەوە ◦ کۆی کردەوەو خستنیە سەریەك ◦ فەوتاندنی.

**إطَّمَرَ** على فرسِهِ: لەدواوە خۆی هەڵدایە سەرپشتی ئەسپەکەو سواری بوو.

**إطَّمَرَ** الشيئ: بەمانا (طَمَرَهُ)دێ.

**الطَّامر** بن الطامر: خۆیو باوکی نەناسراون کەس نازانێ کوڕی کێنو خەڵکی کوێن.

**الطامور**: رۆژنامە ◦ (ك: طوامير).

**الطَّمَارُ**: شوێنی بەرز ◦ سەکۆی بەربڵاو خانوو ◦ بەزۆری بەبێ (ال) بەکاردێ ◦ (بنات طمار) ◦ بەلاو کارەسات.

**الطِّمْرُ**: پۆشاکی کۆنی ڕزیوی ٥ (ك: أطمار).
**الطِّمِرُ**: ئەسپی ڕەسەنی خۆ شرۆی باز هاوێژی بەهێز.
**طَمْرَةُ** الشباب: سەرەتای گەنجیەتی.
**الطّومار**: بەمانا (الطّامور)دێ.
**المِطمارُ**: تەناف، ئەو داوە پەتەی رایەڵ دەکرێ بۆ ئەوەی چینە دیوارەکە ڕاست دەرچێ ٥ پێشی دەگوترێ نیمام ٥ دەشگوترێ: (هو علی مطمار أبیه): ئەوە لەسەر شێوەو شێوازی باوکی کاردەکا ٥ پیاوێك جلە شڕەو جلی کۆنو ڕزیوی لەبەردا بێ ٥ (ك: مطامیر).
**المِطْمَرُ**: تەنافی دیوار ٥ دەگوترێ: (أقِمِ المِطْمر یا محدثُ): ئەی قسەکەر، ئەی حەدیث گێڕەوە قسەکانت ڕیك بخەو هەڵەکانت هەڵگرەوەو ڕاستگۆ بە لە قسەکردن دا ٥ (ك: مطامِر).
**المطمورة**: چاڵی هەڵگرتنی ئازوخە، چاڵە گەنمو جۆ کە زوربەی کات ئەم جۆرە چاڵانە لەژێر زەوی دروست دەکرێن ٥ بەندیخانە ٥ (ك: مَطامیر).
**طَمَسَ** الشَّیْئَ طموساً: شتەکە شێوەو شێوازی گۆڕان ٥ دەگوترێ: (طَمَسَ القمرُ أو النجم أو البصرُ): واتە مانگو ئەستێرە روناکییان نەما یان چاو بینایی نەماو نابینێ.
**طَمَسَ** القلب: دڵ شێواوەو هیچ وەرناگرێ.
**طَمَسَ** الشَّیْئَ وعلیه طمساً: شتەکەی شێواند، یان شێوەی سڕیەوەو کوژاندیەوە، دەگوترێ: (طَمَسَتِ الریحُ الأثرَ): ڕەشەباکە شوێنەکەی سڕیەوە پڕی کردەوە.
**طَمَسَ** الغیمُ الکوکب: هەورەکە بەری روناکی ئەستێرەکەی گرت.
**طَمَسَ** عَیْنَه وعلیها: چاوی کوێر کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَشَاء لَطَمَسْنَا عَلَى أَعْيُنِهِمْ﴾.
**طَمَّسَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طَمَسَهُ)دێ.
**إنْطَمَسَ**: بۆ موطاوەعەی (طَمَسَهُ)دێ.
**تَطَمَّسَ**: بۆ موطاوەعەی (طَمَّسَهُ)دێ.
**الطّامِسُ**: دەگوترێ: (رسم طامس): قەبارەیەکی پوچاوەو کوژاوەیە ٥ (طریق طامس): ڕێگای دوور ٥ (نجم طامس): ئەستێرەی بێ نور، ئەستێرەیەکە روناکی نەماوە ٥ (ك: طوامِس) ٥ دەشگوترێ: (رجل طامس القلب): پیاوێکی دڵ داخراوەو هیچ وەرناگرێ.
**الطّمیسُ**: بەمانا (المطموس) دێ ٥

کوێرێــك کـه پێڵـوی چـاوی جـم‌و جوڵ نه‌کا.

**طَمْطَمَ البَحرُ:** ده‌ریا ئـاوی زۆر بـوو پـڕ بوو.

**طَمْطَـمَ فـلان:** فلاّنکـه‌س لـه‌ده‌ریادا مه‌لـه‌ی کـرد ٥ یـان چـووه نـاو ده‌ریاوه‌و به‌ده‌ریادا رۆیی.

**طَمْطَـمَ في کلامـه:** قـسه‌کانی رون نه‌کردنه‌وه.

**الطَّمَاطِمُ:** ته‌ماته، به‌کاڵی‌و بـه‌کوڵاوی ده‌خورێ.

**الطُّمَاطِمُ:** بێ زوبان.

**الطَّمْطَـامُ:** ناوه‌ڕاسـتی ده‌ریـا ٥ ئـاگری گه‌وره‌و زۆر.

**الطُّمْطماني:** به‌مانا (الطُّمَاطِمُ)دێ.

**الطُّمْطُمَانية:** قسه‌ی ته‌م‌و مژاوی‌و بـێ مانـا ٥ (طُمْطمانيـة حِمـير): زاراوه نـه‌گونجاوه‌کانی حیمیه‌رییـه‌کان ٥ وه‌کو ئـه‌وه (الـ)ی تـه‌عریف ده‌که‌نـه (ام) لـه‌جیاتی بڵێن (الصيام) ده‌ڵێن (أمصيام).

**الطِّمْطِمُ:** به‌مانا (الطُّماطِمُ)دێ.

**الطِّمْطِمَةُ:** قـسه‌یه‌ك به‌غـه‌یری زمـانی عه‌ره‌بی بگوترێ.

**الطِّمْطِميُّ:** به‌مانا (الطُّمَاطِمُ) دێ.

**طَمِعَ فيه وبه طَمَعـاً وطماعيـة:** حـه‌زی لـێ کرد، ویستی بۆ ئه‌و بێ.

**طَمُعَ طَمَعاً:** ته‌ماعی زۆر بوو.

**اطْمَعَهُ:** وای لـێ کرد ته‌ماعی هه‌بێ.

**طَمَّعَهُ:** وای لـێ کـرد تـه‌ماعی هـه‌بێ ٥ ده‌شگوترێ: (طَمَّـعَ المَطَـرُ): بارانه‌کـه ده‌ستی کرد بـه‌بارین بـه‌ڵام که‌مێـك بـاری ٥ ده‌شـگوترێ: (کـان حـديثها تطميـــع قطـــر): قـــسه‌کانی ده‌ڵێـــی رشێنه‌ی بارانن.

**تَطَمَّعَ:** بـۆ مـوطاوه‌عـه‌ی (طَمَّعَـهُ)دێ ٥ حه‌زی لـێ کردو ویستی بۆ ئه‌و بێ.

**الطَّمَعُ:** ته‌ماع ٥ به‌ته‌ما بوون ٥ هیـواو ئـاوات ٥ بـه‌زۆری بـۆ شتێـك بـه‌کار ده‌هێنـدرێ که په‌یدابوونی نزیك بێ ٥ (ك: أطماع).

**الطَّمَّاعُ:** که‌سێـك زۆری ته‌ماع هه‌بێ.

**الطَّموعُ:** به‌مانا الطَّمَّاعُ)دێ.

**المِطمـاعُ:** بـه‌مانا (الطَّمَّــاع)دێ ٥ بـۆ نێرو مێ به‌یه‌ك شێوه به‌کاردێ.

**المِطماعُ مـن النـساء:** ئافره‌تێـك زۆر تـه‌ماع بخاتـه بـه‌ر غـه‌یری خـۆی‌و خه‌ڵك والـێ بکـا تـه‌ماعی تـێ بکـه‌ن به‌ڵام خـۆی به‌ده‌سـته‌وه نـه‌دا ٥ (ك: مطاميع).

**المَطْمَعُ:** بـه‌مانا (الطَّمَـعُ)دێ ٥ شتێــك داخـوازی تـه‌ماع لـێ کـردن بـێ ٥ شتێــك تـه‌ماعی لـێ بکـرێ ٥ ئـه‌و باڵنده‌یـه‌ی ده‌خرێتـه نـاو قه‌فه‌زه‌وه

بۆ ئەوەی باڵندەی تری پێ هەڵخەڵەتێنێ‌و فرسەتیان لێ بێنێ ○ (ك: مَطامِع).

**المَطْمَعَةُ**: بەمانا (المَطْمَعُ)دێ.

**طَمَلَ** فلان طَمْلاً وطمولاً: فلانکەس گوێی نەدایە چی دەکاو چی ناکا.

**طَمَلَ** الجَمَلُ وغيره: حوشترەکە بەخێرایی رۆیی.

**طَمَلَ** الإبلَ وغيرها طَمْلاً: حوشترەکەی بەخێرایی لێ خوڕی.

**طَمَلَ** الشَّيْءَ: شتەکەی توند بەست‌و شەتەکی دا.

**طَمَلَ** الحصيرَ: حەصیرەکەی چنی‌و خێت‌و گوڵ‌و نیشانەی تێدا دروست کردن.

**طَمَلَ** الشَّيْءَ بكذا: شتەکەی گۆڕی بەتێهەڵسونی فلان شت ○ دەگوترێ: (طَمَلَ الدَّمُ السهمَ): خوێنەکە لەتیرەکە هەڵسوا، تیرەکەی خوێناوی کرد.

**طَمَلَ** الصَّبّاغ الثوبَ ونحوه: بۆیەچییەکە قوماشەکەی باش رەنگ کرد، رەنگێکی تێری دایە.

**طَمَلَ** الخَبّازُ الخُبْزَ بالمِطمَلَة: نانەوا نانەکەی بەتیرۆك پان کردۆتەوە.

**طَمِلَ** بكذا طَمَلاً: رەنگی کرد، بۆیەکەی تێ هەڵسو.

**اطْمَلَ** الكتابَ ونحوه: نوسینی ناوکتێبەکەی سڕیەوە رەشی کردەوە.

**إطَّمَلَ** ماءَ الحوض ونحوه: هەرچی ئاوی لەبنکی حەوزەکە دا بوو هەمووی هەڵگوازت‌و هیچی تێدا نەهێشت.

**إنْطَمَلَ** فلان: فلانکەس هاوکاری دزەکانی کرد.

**الطِّمْلُ**: هەموو شتێکی رەش ○ قوماشێك بەتێری رەنگ کرابێ ○ ملەوانکە، گلادە ○ ئاوی لیڵ ○ پیاوی چەقەچەناوی خوێڕی کە گوێ بەکردەوەکانی خۆی ناداو هیچ گرنگی بەوەنادا چی دەڵێ‌و چی پێ دەگوترێ ○ ئەحمەق‌و گێل ○ هەژاری بێ ڕەوشت‌و حاڵ شپرێو ○ گورگی بۆرە قنە ○ دزو جەردە ○ (ك: طَمولٌ واطمالٌ).

**الطُّمْلَةُ**: ئەو ئاوە قوڕاوو لیڵەی لەبنکی حەوزدا دەمێنێتەوە یان تەنکە قوڕی بنکی حەوز.

**الطُّمَلَةُ**: بەمانا (الطُّمْلَةُ)دێ.

**الطِّمْلَةُ**: ئافرەتی زەعیف‌و لاواز ○ (ك: طِمَلٌ).

**الطُّمُولُ** من الرجال: بەمانا (الطِّمْلُ)دێ.

**الطِّميلُ**: جەستە خوێناوی شەڵتاخ بوو لەخوێن دا ٥ نانی پانكراوە بەتیرۆك ٥ حەصیر ٥ سەرەتیری پان.

**الطِّميلَةُ**: مێینەی (الطِّميل)ە.

**المِطْمَلَةُ**: تیرۆك؛ دارێكە نانی پێ پان دەكرێتەوە ٥ (ك: مطامِلُ).

**طَمَّ الشَّيْءُ طَمُوماً**: شتەكە زۆر بوو تا پەرەی سەند ٥ دەگوترێ: (طَمَّ البحرُ أو الماءُ).

**طَمَّ** الفرسُ وغيره في سيره: ئەسپەكە چوستو تیژڕۆ بوو.

**طَمَّ** الشَّيْءَ وعليه طَمّاً: شتەكەی داپۆشیو نغرۆی كرد.

**طَمَّ** التراب البئرَ: گڵەكە بیرەكەی پڕكردەوە.

**طَمَّ** الإناءَ وغيره: قاپەكەی پڕكرد تا لە هەموو لایەكەوە سەر ڕێژی كرد.

**طَمَّ** شَعْرَهُ: قژی بڕیەوە ٥ مووی بڕیەوەو لەبێخ دەری هێنا.

**اطَمَّ** شَعْرُهُ: كاتی ئەوە هاتوە قژی بتاشێ مووەكانی بتاشێ.

**طمَّمَ** الطائِرُ: باڵندەكە لەسەر لقی درەختەكە نیشتەوە.

**إستَطَمَّ** شعره: بەمانا (أطَمَّ) دێ.

**الطامُّ**: شتی گەورە ٥ ئاوی زۆر.

**الطامَّةُ**: قیامەت؛ ڕۆژی ڕەستا خیز ٥ بەلاّو كارەساتی وا كە ڕوداوەكانی پێش خۆی لەیاد بەرێتەوە.

**الطِّمُّ**: دەریا.

**الطِّمُّ**: ئاوی زۆر ٥ ژمارەی زۆر ٥ شتی سەر سوڕهێنەر ٥ ئەسپی ڕەسەنو چالاك ٥ بێچووی حوشتر ٥ دەگوترێ: (أتاهم الطِّمُّ والرِّمُّ): شتی زۆرو كەمی بۆهات.

**الطُّمَّةُ**: گومڕایی‌و سەر لێ شێوان ٥ پارچەیەك لەلەوەڕ، بەزۆر بۆ ئالفی وشك بەكار دەهێندرێ ٥ شتی فیزەون ٥ كۆمەڵی ئادەمیزاد یان كۆمەڵگای ئادەمیزاد ٥ یان ناوەندی كۆمەڵگا.

**الطِّمُومُ**: ئەسپی تیژ ڕەو.

**الطَّميمُ**: زۆر كراو ٥ (طميم الناس): زۆرینەی ئادەمیزاد.

**طَمْأَنَهُ**: ئارامی پێ گرت ٥ هێواشی كردەوە ٥ دڵنیای كرد ٥ نزمی كردەوە، خواری كردەوە.

**إطمَأَنَّ**: دڵنیابوو، هێواش بووە ٥ دەگوترێ: (إطْمَأَنَّ به القرارُ وإطمَأَنَّ جالساً وإطمَأَنَّ القلب): هێواش بوو دامەزرا، دوای چەواشە كاریو ڕاڕایی هێواش بۆوە، دڵنیا بوو.

**إطْمَأَنَّ** المكانُ: شوێنەكە نزم بوو، كەوتە نزمایی.

**إطْمَأَنَّ** بالمكان وفيه: لەوشوێنە

نیشتەجێ بوو ٥ شوێنەكەی كردە زێدو نیشتمانی خۆی.

**إطْمَأَنَّ** عمّا كان يفعله: وازی هێنا لەوكارەی دەیكرد.

**تَطَأْمَنَ**: بۆ موطاوعەی (طَأْمَنَهُ)دێ ٥ وا دەبێ سەنگو سوكی لەوشەكەدا دەكرێ دەبێتە (تَطَامَنَ).

**الطُّمَأْنينة**: ئارام گرتن ٥ بتمانە ٥ دڵنیایی.

**طما** الشَّيءُ طُمُواً: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (طما الماءُ): ئاوەكە بەرز بۆوە ٥ (طمن هِمَّتُهُ) ورەو هیمەتی بەرز بۆوە ٥ (طَمَتْ المرأةُ بزوجها): ئافرەتەكە لەمێردەكەی ناچیزە بوو ٥ (طما به الهَمُّ): غەمو پەژارەی زۆرو ئەستەم بوو.

**طما** بالغَويّ نفسُهُ: نەفسی كابرای گومڕا سەركەش بوو ٥ گومڕابووەكە لەخۆی بایی بوو، لەسنور دەرچوو.

**الطَّمْيُ**: قوڕو لیتە كەلافاو دەیهێنێو لەشوێنێك لەسەر زەوی دەمێنێتەوە چ تەڕبێ چ وشك بێ ٥ پێشی دەگوترێ (الغرين).

**طنـا** طَنْأً وطُنوءاً: شەرمی كرد ٥ بێ ڕەوشت بوو، داوێن پیس بوو.

**طَنِئَ** فلان طَنَأً: شتێكی لەدڵی خۆی دا شاردەوە كە نەیویست ئاشكرای بكا.

**طَنِئَ** الحيوانُ: ئاژەڵەكە سپڵی بەلاكەلەكەیەوە نووسا.

**طَنِئَ** الإنسانُ: ئادەمیزاد تای لێ هات ٥ سپڵی گەورە بوو بەهۆی تا لێهاتنەوە.

**اطْنَأَ**: گومانی برد، ڕوی لەبەدڕەوشتیو داوێن پیسی كرد ٥ حەزی كرد بگەڕێتەوە بۆ شوێنو مەنزڵی، حەزی كرد ڕاكشێو بخەوێ، بەهۆی تەمبەڵیو تەوەزەلییەوە لەجێگا خزاوەو هەڵناسێ ٥ حەزی لەحەوزەكە كردو لەئاوەكەی خواردەوە ٥ دەشگوترێ: (حیة لا تُطْنِئ): مارەكە مۆڵەتی نێچیرەكەی ناداو یەكسەر دەیكوژێ.

**الطِنْءُ**: شكو گومان ٥ تۆمەت ٥ بەدڕەوشتیو داوێن پیسی ٥ بەرماوەی ئاو كە لەبنكی حەوزو شتی وادا دەمێنێتەوە ٥ دوا هەناسەی ژیانو باقی ماندەی ڕوح لەجەستەدا ٥ خۆڵەمێشی ساردەوەبوو گەرمی تێدانەماو ٥ خانوێك بەبەرد بكرێ لەسارادا بۆ ئەوەی شەو تێیدا بمێنیەوە ٥ تەڵەو فاقە بۆ گرتنی دڕندە ٥ (ك: أطنان).

**طَنِبَ** طَنَباً: قاچی درێژ بوو ٥ پشتی

دریَژ بوو ٥ ئەم حالەتە بۆ ئەسپ بەعەیبو نارِەسەنی دادەنریٚ.

**طَنِبَ الرِّمْحُ**: رمبەکە خوارو خیٚچ بوو ٥ (فهو أطنب وهي طنباء) ٥ (ك: طُنُبٌ).

**اطنب النهرُ**: رووبارەکە ریٚرِەوەکەی دریٚژە.

**اطنبَ الريحُ**: رەشەباکە بەهیٚز بوو لەگەلْ تۆزو خۆلْ دا.

**اطنب الدوابُ**: ولاٚخەکان یەك بەدوایەك دا ریٚچکەیان بەست لەرِۆیشتن دا.

**اطنب في العدو ونحوه**: پیٚش بازدانەکە ورد بۆوەو خۆی کیٚشایەوە بۆئەوەی بازی باش بدا.

**اطنب الكلامَ**: قسەکەی دریٚژ کردەوە ٥ زیٚدە رِۆیی کرد لەقسەو گوفتاری دا.

**طانَبَهُ**: کۆلەکەی رِەشمالەکەی بەتەنیشت کۆلەکەی رِەشمالْی کابراوە چەقاند.

**طَنَّبَ الشَيْءُ**: شتەکە زۆر بوو تاوای لیٚ هات ئەمسەرو ئەوسەری دیار نییە.

**طَنَّبَ بالمكان**: لەوشویٚنە مایەوە ٥ دایکوتا.

**طَنَّبَ الخيمةَ**: چەند سنگو کۆلەیەکی بۆ خیٚمەو رِەشمالەکە چەقاندو خیٚمەکەی پیٚوە شەتەك دا.

**طَنَّبَ السقاءَ**: کوندە ئاوەکەی بەکۆلەکەی خیٚمەکەوە هەلْواسی.

**تطانبا**: هەریەك لەو دوو کەسە کۆلەکەو سینگیان بۆ خیٚمەکانیان چەقاند.

**الإطناب**: لەزاراوەی عیلمی مەعانی دا بریتییە لەوەی وشەکان لەماناکان زیاتربن بۆ مەبەستو سودیٚك بەپیٚچەوانەی کورتبرِی (ئیجاز) ٥ لەنیٚوان (الأطناب)و (الإجاز)دا حالەتیٚك هەیە پیٚی دەگوتریٚ (المساوات).

**الإطنابة**: ئاغزونەی قایش پشتیٚنو شتی وا ٥ چەترو بارانگرەوە ٥ رِەوە ئەسپ ٥ کۆمەلە بالْندە ٥ (ك: أطانيب) ٥ دەگوتریٚ: (خيل أطانيبُ): ئەسپەکان بەشویٚن یەك دا ریٚچکەیان بەستووە ٥ (حاجات أطانيب): ئیشو کاری زۆرو زەبەندەو نەبرِاوە (غارات أطانيب): هیٚرشو پەلاماری یەك بەدویەك داو بیٚ برِانەوە.

**الطُّنُبُ**: حەبلیٚکە خیٚمەو کەژاوەو شتی وای پیٚ شەتەك دەدریٚ ٥ رِەگی درەخت کە زۆر رِۆچوو بیٚ ٥ شادەماری جەستە کە ماسولکەو

ئێـسقان پێـکەوە دەبەسـتێتەوە ٥ ڕەگێـکە لـە ئەستۆدا کە ئادەمیزاد ئاوڕ دەداتەوە درێـژدەبێ‌و دەکشێ ٥ شـاڕەگی لامـل، دوشـا دەمـارن ٥ دەفەرو لایەن ٥ (ك: أطناب، وطِنَبة).

**اطنـاب الـشمس**: تیـشکی خـۆر کـە درێژدەبێتـەوە ٥ دەگـوترێ: (مـدت الـــشمسُ أطنابهـــا): خـــۆر هێڵـــه تیشکەکانی درێـژ کردنـەوەو گزنگـی دەرکـەوت ٥ (تَقَـضَبَتْ أطنابهـا) ٥ خۆرئاوابوو.

**الطِّنـبُ**: کەسێـك کۆڵەکـەو سـنگی خێمەکـەی لەپەناکۆڵەکـەو سـنگی خێمـەی تۆبـێ ٥ کەسێـك پێویـست بێ دالدەی بدەی‌و بارێزگاری بکـەی ٥ (ك: طُنَباء) ٥ بۆ مێینـه دەگـوترێ: (هنّ طنائب).

**المِطناب من الجیوش**: سوپای زۆرو بـێ شمار ٥ (ك: مطانیب).

**المَطْنَبُ**: شان ٥ (ك: مطانِب).

**المِطْنَبُ**: بـەمانا (المَطْنَـبُ)دێ ٥ بـەمانا چاپاڵێوك دێ وەکوو شیر پـاڵیوك‌و شتی مەصفی ٥ (ك: مطانب).

**الطنبـور**: ئامێرێـکی مۆسـیقایە ٥ ئامێرێکی ئاودێرییە ٥ (ك: طنابیر).

**الطِّنبِلُ**: تەنبـەڵ‌و تـەوەزەل ٥ گێـل‌و ئەحمەق.

**طَنْثَرَ**: جەستەی بـەخواردنی چەوری قورس بوو ٥ کێشی زۆر بوو.

**تَطَنْثَرَ**: بەمانا (طَنثَرَ)دێ.

**تَطَـنَّجَ فِي الكـــلام**: لەقـــسەکردن دا کارامـــایی بـــەکار هێنـــاو لـــەزۆر لایەنەوە دوا.

**الطَّـنْجُ**: جـۆر ٥ فـەنن‌و کارامـایی ٥ سیپارەو ئامیلکە ٥ (ك: طنوج).

**الطَّنْجَرَةُ**: مەنجـەڵ‌و لەگـەن لـەمس‌و شتی وا ٥ ترسـنۆکی خوێڕی ٥ یـان کینایەیـــە لەشارســـتانی چـــونکە لـەقاپی جوان‌و بەنرخ دا خـواردن دەخۆن ٥ (ك: طناجیر).

**طَنِخَ طَنَخاً**: قەڵەوییەکەی زیادی کرد.

**طَنِخَ نفسه**: دەرونی پیس بوو.

**اطْنَخَه الدسمُ**: چەوری قەڵەوی کرد.

**طَنَّخَهُ**: بەمانا (أطنَخَهُ)دێ.

**طَنَزَ به**: گاڵتەی پێ کرد ٥ پێی پێکەنی.

**طانَزَهُ**: گاڵتەیان بەیەکتر کرد.

**الطَّنّاز**: کەسێك زۆر گاڵتـە بەکەسانی دیکە بکا.

**المَطْنَـزَةُ**: شـوێنی گاڵتـە پێـکردن ٥ دەشـگوترێ: (قـوم مَطْنَـزَة): گـەل‌و هۆزێـکی بـێ کەڵـك‌و هـیچ لـەبارا نەبوون ٥ (ك: مطانز).

**طَنْطَنَ**: دنه دنی کرد یان (دَنْدَنَ) مینگه منگی کرد ویزه ویزی کرد.

**الطّنطان**: هەراو هۆریا، چەقە چەق ٥ دەگوترێ: (رجلٌ طُنطان): پیاوێکی هەراو هۆریا کەره.

**الطّنطنةُ**: دەنگی تەنبور ٥ زۆر بلێیو دەنگ هەڵبڕین ٥ قسەی سرته ٥ مینگه منگ.

**طَنِفَ** طَنَفاً وطنافةً: بێکەڵك بوو ئێکسپایەر بوو ٥ ناوەی دارِزا ٥ خواردنی کەم بوو ٥ تۆمەتبار کرا ٥ دەگوترێ: (طَنِفَ بکذا): بەوشته تۆمەتبار کرا.

**اطْنَفَ**: لەسەربانی خانوەکەی دیکۆری باران دورخەرەوەی دروست کرد ٥ (علا الطّنفَ): دیکۆری خانوەکەی بەرزکردەوە.

**طَنَّفَ** فلانٌ للأمر: فلانکەس کارەکەی دەست پێ کرد، لێی نزیك بۆوە.

**طَنَّفَ** فلاناً بکذا: فلانکەسی بەئەوشته تۆمەتبار کرد.

**طَنَّفَ** نفسَهُ الی کذا: تەماعی بەرخۆی نا بۆ ئەو شته.

**طَنَّفَ** البستانَ: پەرژینی بۆ باخەکە کرد.

**طَنَّفَ** الجدارَ: لەسەر دیوارەکە چقڵو تەڵو شتی وای دانا بۆ ئەوەی نەتواندرێ پێیدا سەربکەوێ.

**تَطَنَّفَ**: بۆ موطاوەعەی (طَنَّفَهُ)دێ.

**تَطَنَّفَ** نفسُهُ الی کذا: نەفسی لەوشته نزیك بۆوە حەزی لێی بوو.

**تَطَنَّفَ** القومُ: قەومەکەی داپۆشی.

**الطّنُفُ**: لوتکەو دوندی تۆقەسەری شاخ ٥ سەقفی سەرەوەی خانوو بۆئەوەی بارانی لێ دوربخاتەوە گوێسە بانەی خانوو ٥ هەر دیکۆرێك لەخانوەکە دور بکەوێتەوە.

**الطُّنُفُ**: بەمانا (الطِّنْفُ)دێ.

**طَنْفَسَ** الرجلُ: پیاوەکە دوای رەوشت جوانی گۆڕاو رەوشتی ناشیرین بوو ٥ پۆشاکی زۆری لەبەر کردن.

**طَنْفَسَ** السماءُ: ئاسمان هەوری چڕو پڕ دایپۆشی.

**الطّنْفِسُ**: خراپو ناشیرینو بێ کەڵك.

**الطّنْفِسَةُ**: راخەر، بەڕەو قاڵی ٥ ئەو پارچە قوماشەی بەسەر بارو کەژاوەدا دەدرێ ٥ (طنافِس).

**الطُّنْفُسَةُ**: بەمانا (الطَّنفَسَةُ)دێ.

**طَنْفَشَ** النظرَ الیه: چاوی تێ بڕیو چاوی لێ لانەدا.

**الطّنْفَشُ**: چاوکزو کەم بینا.

**طَنَّ** طَنّاً وطنیناً: منگە منگی کرد، ویزه ویزی کرد ٥ دەگوترێ: (طَنَّ

الذبابُ): مێشەکە ویزە ویزی کرد.
طَنَّ النحاسُ: مسەکە زرینگایەوە.
طَنَّ العودُ: عودەکە لەرییەوە.
طَنَّت الاذنُ: گوێچکە زرینگایەوە.
طَـنَّ المقطـوعُ: شـتە بڕاوەکـە لـەکاتی بڕینەوەی دا دەنگی لێ هات.
اطَنَّهُ: وای لێ کرد زرینگەی لێ بێ.
اطَنَّ ساقَهُ: قاچی بڕییەوە.
طَنَّنَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طَنَّ)دا دێ.
الطُّنُّ: بـەمانا (الطُّـنُّ)دێ ٥ جەسـتەی ئـادەمیزادو شـتی تـر ٥ تەندروسـت، تەن داهێزاو ٥ بالآو قـەدو قامـەت ٥ گـورزە شـوڕكو گـورزە قمفـەژاز ٥ فـەردە لۆکـەی شێـکراوە ٥ کێـشی قـورس کـە بەهـەزار کیلـۆ گـرام مەزنـدە بکرێ ٥ (ك: أطنـان وطنـون وطِنان).
الطَّنَّانَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (طَـنَّ)دا دێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (طَنَّانَـةُ) ٥ دەشگوترێ: (قـصيدة طنّانـة): چامە شیعرێکی بەناو بانگو مەشهورە.
الطَّنِّيُّ: جەستە گەورەو زەبەللاح.
الطَّنينُ: جۆرە دەنگێکە وەکوو دەنگی زەنـگو عـود دەگـوترێ: (قـصيدة أو خطبة أو مقالة لها طنين).
طَنِيَ طَنىً: کزو لاواز بوو ٥ نەخۆش بوو.
اطْنَى: بەمانا (أطْنَأ)دێ ٥ مـەیلی شـكو گومانی کرد ٥ حـەزی لەبەدڕەوشـتی کرد مەیلی داوێن پیسی کرد.
اطْنَـى فلانــاً: شـوێنی کوشــندەی نەهەنگاوت.
اطنى المرضُ فلاناً: نەخۆشی فلآنکەسی گرتــەوە، توشــی فلآنکـەس بـوو ٥ پاشمـاوەی نەخۆشـی لەفلآنکـەس دا مایەوە ٥ دەگـوترێ: (حية لا تطنـي): مارێکە کوشندەیە بەهەرکەسێکەوە بـدا یەکـسەر دەیکـوژێ ٥ (ضـربة لاتُطْنِي): زەبری کوشنـدە.
اطْنَـى الـشَّجَرَ أو ثمـر النخـل: درەختەکـەی فرۆشـت یـان بـەری درەختە خورماکەی فرۆشت.
إطَّنَـى الـشجرَ أو ثمـر النخـل: بـەری درەختەکـەی یـان بـەری درەختەخورماکەی کڕی.
الطَّنَـى: بـەمانا (الطِّـنْءُ) دێ ٥ کـزو لاوازی، نەخۆشـی ٥ سـپڵ هاوسـانو گەورە بوونی، نوسانی سپڵو ریخۆڵە بەلاتەنیشتەوە ٥ گەورەبوونی سپڵ بەهۆی گرانەتاو تاداریيەوە ٥ بەمانا (الطُّنُّ)دێ ٥ شوێنێـك تاداربـێ ئـاوو هـەوای وابـێ هەرکەسـێ تێـی بـچێ تووشی تاداری ببێ.

**الطَّنَي**: چاكبوونەوە لەپێوەدانی دووپشك.

**طَهُرَ** طُهْراً وطهارةً: لەپیسو پۆخەڵی پاكبۆوە، پاكبوونەوە لەلەككەو عەیبو خەوش.

**طَهُرَت** الحائض أو النفساءُ: ئافرەتە بێنوێژەكە لەخوێنی حەیز پاكبۆوە، كۆتایی بەعادەی مانگانەی هات یان لەخوێنی پاش منداڵبوون پاك بۆوە، یان دوای بڕانو كۆتایی هاتنی دیاردەی ئەو جۆرە خوێنانە خۆی شت.

**طَهَّرَ** الشَّيْءَ بالماء: شتەكەی بەئاو پاك كردەوە، چڵكو پیسی لێ كردەوە.

**طَهَّرَ** المولودَ: زارۆكەكەی خەتەنە كرد.

**طَهَّرَ** القناة: جۆگاكەی پاكماڵ كرد، قوڕو لیتەی لێ لابرد.

**طَهَّرَ** الجسمَ: جەستەكەی لەمیكرۆب پاك كردەوە بەهۆی دەرمانو عەقاقیری جیاجیاوە.

**إطَّهَّرَ**: بەمانا (تَطَهَّرَ)دێ.

**تَطَهَّرَ**: بۆ موطاوەعەی (طَهَّرَهُ)دێ.

**الطاهِرُ**: پاكو خاوێن ◊ دەگوترێ: (فلان طاهر الثوب أو طاهر الذيل أو العرض): فلانكەس پۆشاكی پاكو خاوێنە ◊ داوێنپاكە ◊ حەیاو ناموس پارێزراوە ◊ بێ عەیبو خەوشە ◊ دەستپاكە ◊ شەریفە ◊ ئاوێكی پاكی وەها بەكەڵكی شت بێ پاككردنەوەو دەست نوێژ گرتن بێ ◊ ئافرەتێك لەعادەی مانگانەدا نەبێو خوێنی حەیزو شتی وای پێدا نەیە ◊ (ك: طواهر).

**الطَّهارَة**: خۆ پاككردنەوەو دەست نوێژ گرتن.

**الطُّهارة**: پیشەی خەتەنەكردنی منداڵ.

**الطُّهْرُ**: پاكبونەوە لەپیسو پۆخەڵیو خوێنی حەیزو شتی وا ◊ (ك: أطهار).

**الأطهارُ**: ئەو رۆژانەیە كە ئافرەت بێ نوێژ نیە.

**الطُّهْرُ**: بەمانا (الطّاهر) دێ ◊ دەگوترێ: (رجل طهر الخلق): پیاوێكی ڕەوشت پاكە.

**الطَّهُورُ**: ئەوشتەی بۆ خۆی پاك بێو پاككەرەوەی شتی تریش بێ ◊ وەكوو ئاوی پاك ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾.

**الطُّهُورِيـة**: پاكبونەوەو پاكردنەوەی تەواو.

**المَطْهَـرُ**: بەلای مەسیحییەكانەوە

شوێنێکه دوای مردن بەشێوەیەکی کاتی نەفسی تێدا سزا دەدرێ بۆئەوەی لەتاوان پاك ببێتەوە.

**المِطْهَرَةُ**: ئامێری پاککردنەوە ٥ هەر مەسینەو گۆزەو تەنەکەو شتی وەها کە بەهۆی ئاوی ناویانەوە شت پاك دەکرێتەوە ٥ (ك: مطاهر).

**المَطْهَرَةُ**: بەمانا (المِطْهَرَةُ)دێ ٥ هەرشتێك بەپاکەوەکەر بژمێردرێ ٥ پێغەمبەر فەرمویەتی: (السواك مَطْهَرَة للفم): سیواك پاکەوەکەری ناو دەمە.

**المُطَهِّرُ**: مادەیەکە ناهێڵێ شت بۆگەن بکا یان بگورێ یان کێمو زوخاو بکا.

**طَهَشَ** فلان طَهْشاً: فلانکەس ئەوکارەی دەستی تێوەردا تێکی داو بێ کەڵکی کرد.

**طَهَشَ العَمَلَ**: کارەکەی شێواند، خراپی کرد.

**طَهَمَ** منه: قێزی لێ کرد، لێی نەبان بوو.

**طَهَمَ الشَّيْءُ**: شتەکە گەورەو کەتەو زەبەلاح بوو.

**طَهَّمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی گەورە کرد.

**تَطَهَّمَ**: بۆ موطاوەعەی (طَهَّمَهُ)دێ.

**تَطَهَّمَ** الطعامَ وغيره: خواردنو شتی وای پێش چاوکەوت نەفسی لێی بێزرا.

**تَطَهَّمَ** عنه ومنه: بەمانا (طَهَمَ)دێ.

**الطُّهْمُ**: خەڵك، ئادەمیزاد.

**الطُّهْمَةُ**: ڕەنگێکە ئەوەندە گەندم ڕەنگ بێ بگاتە ڕەشی.

**المُطَهَّمُ**: قەڵەوو گۆشتنی زیاد لەحەد ٥ دەمو چاو هەڵاوساو ٥ لەهەموو لایەکەوە تەواو ٥ زۆر جوانو کەشخە ٥ وەجاخزادە.

**تَطَهْمَلَ**: بەبێ ئەوەی هیچی پێ بێ ملی ڕێگای گرتەبەر.

**تَطَهْمَلَ لفلان**: چاوو ڕاوو ماستاوی بۆ فلان کرد بۆئەوەی شتێکی لێی دەست بکەوێ.

**الطَّهْمَلُ**: جەستە گەورەی زەبەلاحو ناقوڵا ٥ (ك: طهامِلُ).

**طها** اللحمَ ونحوه طَهْواً وطُهُوّاً: گۆشتەکەی کوڵاند لێی نا ٥ پێی گەیاندو ئامادەی کرد بۆ خواردن، دەگوترێ: (طها الخُبزَ وطَها الأمرَ): نانەکەی برژاند، کارەکەی ئەنجام دا بەباشی ڕێکی خست.

**اطْهى فلان**: فلانکەس لەکاری خۆی دا دەست ڕەنگین بوو.

**الطاهي**: چێشتکەر، کێش لێنەر ٥ (ك: طُهَاةٌ وطُهِيٌّ) ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (طاهية وهن طواه).

**الطُهَاةُ**: ئەو توێژە ڕەقەی دەکەوێتە سەر شیرو خوێن.

**الطهاية**: پیشەی کێشت لێنەر.

**الطَّهْيُ**: کوڵاندنو پێکەیاندن.

**الطَّهْيَان**: تەختە دارێکە ئاوی گەرمی لەسەر سارد دەکرێتەوە.

**الطَّوابُ**: خشت یان خشتی سورەوە کراو ٥ تاکەکەی (طوبة) دەگوترێ: (فلان لا آجُرَةَ لە ولا طوبة): واتە هیچی نییە.

**الطَّــوَّابُ**: خشت دروستکەر یان فرۆشیاری خشت.

**طوبَةُ**: مانگی پێنجەمی قیبتییەکانە.

**طوبى**: بڕوانە مادەی (طيب).

**طاحَ** طوحاً: فەوتا، تێداچوو.

**طاحَ** فلان: فلانکەس عەقڵی شێوا.

**طـاحَ** في الأرض: ڕێگای لێ تێک چوو سەری لێ شێوا.

**طاحَ** السهمُ: تیرەکە نیشانەکەی نەپێکا.

**طاحَ** به فرسـهُ: ئەسپەکە وەکوو تیرێکی نیشانە نەپێکاو بردی.

**طاحَ** الـشيءُ مـن يـده: شتەکەی لەدەست کەوتە خوار.

**اطاحه**: لەناوی برد، بردی، لای برد.

**اطاح شعره**: قژی سەری هەڵوەراند.

**طاوحه**: تیریان تێك گرت.

**طوَّحَهُ**: بەمانا (أطاحه)دێ.

**طوَّحَ** الشَّيءَ وبـه: شتەکەی لەکیس دا، فەوتاندی ناردی بۆ شوێنێك لێی نەگەڕێتەوە ٥ هەڵی دا بۆ حەواو بەحەواوە کەوتە پەلەقاژە ٥ بەگۆچان لێی دا.

**تطـاوح**: دوورکەوتەوە ٥ فڕێی دا ٥ دەگوترێ: (تطاوحت بهم النوى): دوریی لەخۆشەویست بەهیلاکی بردن.

**تطاوح** القـومُ الأمْرَ بينهم: خەڵکەکە کێشەیان تێکەوتو کەوتنە بەر بەرەکانی یەکتری.

**تطـاوح** القـومُ فلانـاً بالـضرب ونحـوه: خەڵکەکە فلانکەسیان بەلێدان لەناو برد.

**تطوَّح**: هاتو چوو بەحەواداا.

**المَطَـاحُ**: شوێنی تێداچون ٥ شوێنی بەردەلانو ناخۆش.

**المطاحَةُ**: بەمانا (المطاح)دێ.

**المِطْـواحُ**: ئامێری شت فەوتاندن ٥ ئامێری شت هەڵدان بۆ حەوا ٥ گۆچانو عەصا.

**طاد** طَوْداً: جێگیر بوو، چەسپا.

**طَـوَّد** في الـبلاد تطويـداً: بەوڵات دا سوڕایەوە.

**طَوَّد** الشَّيءَ وبه: بەمانا (طوَّحَهُ)دێ ٥

شتەکەی درێژ کردەوەو بەرزی کردەوە.

**إنطادَ**: کەوتە حەواو بەرز بۆوە بۆ عاسمان.

**تطوَّدَ**: بۆ موطاوەعەی (طوَّدە)دێ.

**تطوَّدَ في البلاد**: زۆر بەوڵات دا سوڕایەوە.

**الطادُ**: کێش قورس، گران ◊ حوشتری چەموش‌و هار.

**الطَّود**: چەسپاوو جێگیر ◊ کێوی گەورەو بەرزو سەرکەش ◊ بانوو تەپۆڵکەی بەرز کەبڕوانێتە دەشتایی ◊ بەسەر نزمی دا بڕوانێ ◊ (ك: أطواد).

**ابن الطود**: بەردی گەورەی گلۆرەوە بوو لەبەرزاییەوە ◊ دەنگدانەوە.

**المَطَادُ**: بەمانا (المطاح)دێ ◊ دەشتایی پان‌و پۆڕ.

**المَطَادَةُ**: بەمانا (المطادُ)دێ ◊ (ك: مَطاوِدَ).

**المُنطادُ**: بەرزایی، تەپۆلکەو کێو ◊ جۆرە فرۆکەیەکی زەبەلاحە ◊ ئامێرێکە خرە غازی هێدرۆجینی تێ دەکرێ‌و لەژێریەوە شوێنی سواربون‌و شت دانانی هەیە، بەرەڵڵای هەوا دەکرێ‌و دەڕوا.

**طار** الشَّيْءَ وبه وحوله طوراً وطواراً: دەوری دا، لێی نزیك بۆوە.

**طَوَّرَهُ**: پێشی خست، گۆڕانکاری تێدا کرد.

**تطوَّرَ**: لەحاڵێکەوە بردیە سەر حاڵێکی تر.

**التطوّر**: گۆڕانکاری تەدریجی کەلە بونیەی شتە زیندوەکان دا ڕو دەدا ◊ هەر واگۆڕانکاریی تەدریجی کەلەپێکهاتەی کۆمەڵ دا پەیدا دەبێ ◊ یان گۆڕانکاریی یاساو پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان.

**الطَّوَارُ**: ئەندازەو مەزندە.

**طوار الطريق**: شۆستەی ڕێگا کەهەندێ لەڕێگا کە بەرزترەو خەڵك بەسەری دا دەڕوا ◊ هاوشان‌و یەکسان بەو.

**الطَّوْرُ**: جارێك، کەڕەتێك ◊ سنور ◊ دەگوترێ: (تعدى طوره): لەسنوری خۆی دەرچوو ◊ هەروا وشەی (الطور) بەمانا جۆرو نەوع دێ ◊ بەمانا حاڵ‌و هەیئەت دێ ◊ (ك: أطوار) ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾.

**الطور**: کێو ◊ کێوێك درەختی لێ بڕوێ ◊ حەوشەی خانوو.

**الطوراني**: شتێك پاڵ (طور)بدرێ ◊ ئادەمیزادی نامۆ ◊ باڵندەی نامۆ.

**الطُّوْرَة**: (طورة الدار) سنوری خانوو.

**الطُّورَةُ**: بەمانا (الطُّوْرة)دێ.

**الطَّوَرَةُ**: ڕەشبینی ٥ ڕمڵو فاڵی خراپ.

**طـاس** طوسـاً: وەکـوو مـانـگ جـوان بـوو درەوشایەوە.

**طاس** الشَّیْءَ: پێی لەشتەکە نا، ژێر قاچی دا، شکاندی.

**طـوَّس** المـصور: وێنەگرەکـە وێنـەی طاوسی گرت.

**طوَّسَ** الشَّیْءَ: شتـەکەی وەکوو طـاوس لـێ کرد ڕازاندییەوە.

**تطوَّسَ**: بۆ موطاوەعەی (طَوَّسَه)دێ.

**تطوسـت** المـرأةُ: ئافرەتەکـە خـۆی ڕازاندەوە.

**الطاس**: قاپێـکە لەمسو شتی وا ئـاوی پێ دەخورێتەوە.

**الطَّاووس**: باڵدارێـکی جوانو ڕازاوەیە پـەڕو پـۆڵی ڕەنگـاو ڕەنگـە، خـۆی دەکاتەوە پەڕی کلکی وەکوو تاقێـکی کەوانـەیی دەوەسـتن ٥ ئـادەمیزادی جـوانو شـۆخ ٥ زەوی سـەوز کـە بەجۆرەها گوڵو گوڵزار ڕازابێتەوە ٥ (ك: طواويس وأطواس).

**الطاءوس**: بەمانا (الطاوس)دێ.

**الطَّواسُ**: شەوێـك لەشەوەکانی کۆتایی مانگ.

**الطُّوْسُ**: مانگ ٥ (ك: أطواس).

**الطَّواسُ**: دەرمانێـکە سکی پێ دەچێ ٥ سك ڕەوان دەکا.

**طَوَّشَ** فـلان: فلانکـەس قەرزدارەکـەی خۆی مۆڵەت دا.

**طـوَّش** فلاناً: فلانکەسـی خەسـاند، یـان دەعباکەی بڕی.

**الطَّواشِيُ**: خەسێندراو.

**طـاعَ** فـلان طوعـاً: فلانکـەس گەردنکەچ بوو.

**طاعَ** النباتُ: ڕووەکەکە بەکەڵکی ئـەوە دێ بکرێتە لەوەڕ.

**طـــاعَ** الــشجرُ: درەختەکـە بەکەڵــکی ئەوەهات میوەکەی کۆبکرێتەوە.

**طاعَ** لسانُهُ: زمانی ڕاهات.

**طاعَ** الغلامُ أباه: کوڕەکە بەقسەی بـاوکی کرد.

**طاعَ** الكلأُ الحيـوانَ: لەوەڕەکـە بـەرفراوان بوو بـۆ ئاژەڵەکـە دەتوانـێ بەکەیفی خۆی جێ گۆڕکێی لـێ بکا.

**اطـاع** الـشجرُ اطاعــةً: درەختەکـە پێگەیی.

**اطـاع** الثمــرُ: میوەکـە کـاتی ڕنـینو چنینی هات.

**اطـاع** النبــاتُ: ڕووەکەکـە بەیدەسـتی بخۆرەکەی بوو.

**طاوعـه**: بەقـسەی کـرد ٥ گـوێ بیـستی بوو.

**طَوَّعَ**: بۆ موطاوعەمو زێدە ڕۆیی لەمانای (طاع) دا دێ ٥ بۆ هەڵنانو دەنەدانو پاڵپێوەنان دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ﴾.

**إنطاعَ** له: گەردنکەچ بوو بۆی.

**تطاوع** للأمر: زۆری لەخۆکرد دەست بەکارەکە بکا بۆ ئەوەی پێی رابێ.

**تَطَوَّعَ**: نەرم بوو بۆی ٥ گەردنکەچبونی بەسەر خۆی دا هێنا ٥ زێدە تاعەتو خودا پەرستی کرد.

**تطوَّعَ** للجندیة: دوای خزمەتی سەربازی ئیجباری، بەئارەزۆی خۆی خزمەتکردنی تازەکردەوە.

**استطاع** الشَّيْءَ: توانای بەسەر شتەکەدا شکا.

**استطاع** فلاناً: داوای لەفلانکەس کرد گەردنکەچی ببێ.

**الطّاعة**: بەگوێ کردنو گوێڕایەڵی.

**الطّواعیة**: بەمانا (الطّاعة)دێ.

**الطّوعُ**: بەی دەست ٥ دەگوترێ: (هو طَوْعُ یدك): ئەوە لەژێر دەستی خۆت دا یە بەویستی تۆ هەڵس و کەوت بکا ٥ دەگوترێ: (فرس طوع العنان): ئەسپێکە سەر نەرمو رێشمە خۆشە ٥ (فلان طوع المکاره): فلانکەس پشوو درێژە بۆکاری قورسو خۆڕاگرە لەبەردەم کارەسات دا.

**الطَّیِّعُ**: گوێڕایەڵ ٥ دەشکوترێ: (رجل طَیِّعُ اللسان): پیاوێکی زمانڕەوانە.

**المُطاعُ**: بەقسە کراو ٥ قسە بیستراو ٥ دەگوترێ: (فلان شخٌ مطاع): فلانکەس دەست قوچاوەو ئەوەی خودا لەسەری فەرزکردوە نای دا.

**المُطاوِعُ**: گوێڕایەڵو تەباو هاوڕا.

**المِطواعُ**: ئەوکەسەی زوو گەردنکەچی خۆی دەردەبڕێ.

**المِطواعَة**: بۆ زێدە مانای (المِطْواعُ)دێ.

**المُطَّوِّعُ**: بەمانا (المُتَطَوِّعُ): دێ، ئەوانەی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ جیهادو گیانبازی دەکەن لەرێگای خوادا.

**طافَ** حوله وبه وعلیه وفیه طوفاً وطوافاً: بەدەوری دا سوڕایەوە، دەورەی دا.

**طافَ** الخیالُ: خەیاڵ هاتە سەری.

**طافَ** الکری أو النومُ: هەنۆزی برد.

**اطاف** به أو علیه: بەمانا (طافَ)دێ.

**طاف** الشَّيْءَ بکذا أو علیه او فیه أو حوله: وای لێ کرد بەدەوری دا بسوڕێتەوە.

**طَوَّفَ** حوله وبه وعلیه وحوله: بەمانا

زێدەماناى (طافَ)دێ.

**طوّف الناسُ والجراد وغيرهما**: ئادەميزادو كولله زەوييان پڕكرد.

**طوّف الشّيَ**: بەدەورى شتەكەدا سوڕايەوە.

**تَطوّف** به وحوله وفيه وعليه: بەمانا (طافَ)دێ.

**إستطاف** به وعليه وحوله: بەمانا (طافَ)دێ.

**الطائِفُ**: حەسحەس كەبەدەورى ماڵ دا دەسوڕێتەوە بۆ پارێزگارى كردنى، بەتايبەتى بەشەو ◦ هەروا وشەى (الطائف) بەمانا خەياڵو ئەندێشە يەك دێ كەبەشەو بۆ ئادەميزاد دروست دەبێ ◦ خزمەتكار كەبەرێكو پێكى خزمەتى ئاغاكەى دەكا.

**الطّائفة**: پێڕو كۆمەڵو تاقم ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ ◦ كۆمەڵو تاقمێك كە مەزهەبو بيرو بۆچونێك كۆيان بكاتەوە.

**الطائفي**: شتێك نيسبەت بدرێ بۆ وڵاتى طائيف وەكوو ترى تايەفى ◦ يان نيسبەت بدرێ بۆ تايەفەو تايەفەگەرى.

**الطائفية**: دەمارگيرى بۆتايەفەو كۆمەڵێك.

**الطّوّافُ**: سوڕانەوە بەدەورى كابەدا.

**الطّوْفُ**: ديوار ◦ كوندەو مەشكە فويان تێ دەكرێو بەپەنايەكەوە شەتەك دەدرێنو شتێكى وەكوو لەوحەو تەختەدارييان دەخرێتە سەرو ئەمجار خەڵكيان سواردەبێو كەڵەكەوان سەوڵە لێ دەداو بەناو ئاودا دەڕوا ◦ حەسحەسو حەرەسى شەو كە بەدەورى خانوو ماڵ دا بسوڕێتەوە بۆ پارێزگارى.

**الطّوفان**: هەرشتێك زۆربێو لەسنور دەرچێ بەجۆرێك شتى تر داپۆشێ وەكوو تۆفانى سەردەمى حەزرەتى (نوح) سەلامى خواى لێ بێ.

**الطّوّاف**: هەرشتێك زۆر بسوڕێتەوە ◦ خزمەتكار كەخزمەتى ئاغاكەى بكا بەرێكو پێكى ◦ كەڵەكەوان ئەوكەسەى بەهۆى كەڵەكەوە بەناو ئاودا شت دێنێو دەبا ◦ دابەشكارى بەريد بەناو دێهاتو وڵات دا.

**المَطَافُ**: بەمانا (الطّواف)دێ ◦ شوێنى تەواف بەدەورى كابەدا.

**المُطَوِّف**: چاوساغى حاجيان ◦ ئەوكەسەى لەرۆژانى حەج دا دەبێتە شارەزايى كارى حاجى نابەڵەد.

**طَاقَه** طوقاً وطاقةً: دەسەڵاتی بەسەردا شکا ٥ توانی بیکا.

**اطَاقَهُ** وعليه وله: بەمانا (طاقَهُ)دێ.

**طَوَّقَهُ** الطَّوْقَ: توقی لەمل کرد.

**طوَّقَهُ** الشَّيْءَ وبه: شتەکەی بۆ کردە تۆق‌و لەملی کرد ٥ دەگوترێ: (طَوَّق الجيشُ العَدُوَّ): سوپا ئابلوقەی دوژمنی دا.

**طَوَّقَ** اللهُ فلاناً أداءَ حقه: خودا فلانکەسی والێ کرد توانای بەسەر شتەکەدا بشکێ.

**تَطَوَّقَ**: بۆ موطاوەعەی (طَوَّقَهُ)دێ ٥ تۆقەی لەمل کرد.

**تطوَّقت** الحيةُ: مارەکە بوو بەتۆق‌و خۆی تێ باهەڵدا.

**الطَّائِقُ**: بەمانا (الطَّوْق)دێ ٥ لوتکە شاخ‌و هەڵبەزیوەی کێوو کەژ ٥ تاق‌و کەوانەی دیکۆری خانوو.

**الطَّاقَة**: تواناو دەسەلات ٥ هەرشتێک ئادەمیزاد بتوانێ بەگرانی‌و بە ناخۆشی بیکا ٥ دەسکە گوڵ‌و ڕێحانە ٥ گورزە شورك ٥ گورزە حەبل‌و دەستە گوش.

**الطاقية**: کلاو ٥ کڵێتە.

**الطَّوْقُ**: تواناو دەسەلات ٥ هەرشتێک خڕو کەوانەیی بێ‌و دەوری شتێکی تری دابێ ٥ هەرشتێک بازنەیی سروشتی بێ وەکوو تۆقی گەردنی کۆتر ٥ یان دەستکردبێ وەکوو بازنەی دەست‌و خرخاڵی قاچ‌و ملەوانکەی گەردن ٥ هەربەم بۆنەیەوە بەکۆتر دەگوترێ (ذات الطوق)، هەروا ناوە بۆ ئەو حابولەی کە ئادەمیزاد بەکاری دەهێنێ بۆ چوونە سەر دارخورما ٥ (ك: أطواق).

**الطَّوْقَةُ**: زەوییەکی خەرمانەیی دەکەوێتە نێوان دوو زەوی ڕەق‌و پتەو.

**المُطْوَّقُ** من الحمام: ئەو کۆترەی تۆقی لەگەردن دا بێ.

**المُطوَّقَةُ**: گۆزەی گەورەو دەسکدار کە ملی هەبێ.

**طَال** طولاً: بەرز بۆوە.

**طَال** عليه طَوْلاً: فەضل‌و نازو نیعمەتی بەسەردا رشت.

**طَال** فلاناً: بەسەر فلان دا زاڵ بوو لەبالا بەرزی دا یان لەنازو نیعمەت دا.

**طوِل** البعيرُ: حوشترەکە لیچی سەرەوەی لەلیچی خواروی درێژ تر بوو ٥ (فهو أطول وهي طَوْلى).

**اطَال** عليه الليلُ: شەوی لەسەر درێژ بوو.

**اطَال** عليه: پیاوەتی بەسەردا کرد.

**اطالَ الشَّيءَ**: شتەکەی درێژ کرد.

**اطـال الله بقـاءَهُ**: خـودا تەمـەنی درێـژ کرد.

**طاول في الشّيء**: شتەکەی درێـژە پێـدا، درێژی کردەوە.

**طـاول فلانـاً**: بەسـەر فلانکـەس دا زاڵ بـوو لـەبارەی بـاڵا بەرزییـەوە یـان لەبواری پیاوەتیو بەخشندەییەوە.

**طاول فلاناً في الدَّين**: قەرزی فلانکەسی دواخـــستو لـــەکاتی خـــۆی دا نەیدایەوە.

**طَـوَّلَ الدابّـةَ**: حـەبلی وڵاخەکـەی شـل کردو رێگەی دا بلەوەڕێ.

**طوَّلَ الشَّيءَ**: شتەکەی درێژ کرد.

**تطـاول**: بـەمانا (طـالَ)دێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَـكِنَّا أَنـشَأْنَا قُرُونًـا فَتَطَـــاوَلَ عَلَـــيْهِمُ الْعُمُـــرُ﴾ ٥ بەراوەســـتانەوە خـــۆی هـــەڵبڕی بۆئەوەی بۆ دوور بڕوانێ.

**تطاول الی الشّيء**: ملی خۆی درێژ کرد بۆئـەوەی شـتەکە ببینـێ ٥ خـۆی بـەباڵا بـەرز نیـشان دا، یـان خـۆی بەبەخشندە نیشان دا ٥ خۆی بـەزل زانیو فیزی کرد.

**تطاول علیـه بکـذا**: پیاوەتی بەسـەردا کرد ٥ دەست درێژی کردە سەر.

**تطـاول الـــرجلان**: ئـەو دوو پیـاوە پێـشبڕکێیان کـرد لەدرێـژیو بـاڵا بـەرزی دا لـەپیاوەتیو بەخـشندەیی دا.

**تطوَّلَ**: بۆ موطاوەعەی (طوّلە)دی.

**تطول علیه**: پیاوەتی بەسەردا کرد.

**استطال**: بەمانا (طالَ)دێ.

**استطال علیه**: دەستدرێژی کردەسەر.

**استطال الـشّيءَ**: شـتەکەی وابینـی کـە درێژە.

**الطّائلُ**: زۆرو دەوڵەمەندو سودمەند ٥ شـکۆمەندیو دەسـەڵات ٥ منـەتو پیـــاوەتی ٥ دەوڵەمەنـــدیو ژیـــان خۆشـی ٥ سـودو قـازانج ٥ لـەدوای نەفیـەوە نـەبێ وشـەی (الطائـل) بـێ (تێی خڕ) نابێ، وەکوو دەڵێی: (هذا أمر لا طائل تحته) ٥ (ك: طوائل).

**الطّائلة**: یـاریی تاوڵـە ٥ سـفرەی نـان خواردن.

**الطّوال**: بەمانا (الطّـول)دێ ٥ درێـژایی رۆژگار، دەگـوترێ: (لا أکلمـه طَـوال الدهر): هـەتا هەتایە قسەی لەگەڵ ناکـەم ٥ تەمـەن ٥ دەگـوترێ: (طـال طَوَالك): تەمەنت درێژبێ.

**الطُّوالُ**: درێژ.

**الطُّوالة**: مێش دەرکەرەی وڵاخو شتی وا.

**الطَّـولُ**: فـەضـلو دەوڵەمەنـدیو

بەخشندەیی ٥ دابین کردنی پێداویستی بۆ هەرشتێك بێ.

**الطُّولُ**: درێژ پێچەوانەی کورت یان پێچەوانەی پان.

**الطُّوَلُ**: قونگە جرەو دواخستنی کار بەهەرشێوەیەك بێ.

**الطِّوَلُ**: بەمانا (الطُّوَلُ)دێ ٥ حەبلو گوریس کەسەرێکی لەقاچی ولاخەکە دەخرێو سەرەکەی تری بەسنگێکەوە دەبەسترێ درێژە بۆنەوەی ولاخەکە بتوانێ بلەوەرێ.

**الطُّولى**: مێینەی (الأطول) ٥ حالو وەزعی خۆشو لەبار ٥ (ك: طُوَلٌ).

**السَّبْعُ الطُّوَل**: حەوت سورەتی قورئانن لەدوای سورەتی فاتیحە بەمەرجێ (ئەنفالو براءة) بەیەك سورەت حیساب بکرێن ٥ هەروا (السبع الطول): ناوە بۆ حەوت چامە شیعری عەرەبی سەردەمی پێش ئیسلام کەپێیان دەگوترێ: (المعلقات السبعة).

**الطُّوَّلُ**: بالندەیەکی ئاوییە دوو قاچی درێژی هەن.

**الطَّویل**: درێژ، پێچەوانەی کورتو پانی ٥ دەگوترێ: (هو طویل الباع): سەخیو نانبدەو دەست کراوەیە.

**طویل الید**: خائینو دزو جەردە ٥ یان کەسێك تورەو تەوسن بێ زوو هەڵچێو پەلاماری بەرامبەری بدا ٥ وشەی (طویل) ناوی بەحرێکی عوروزیشە کەلەسەر وەزنی (فعولن مفاعیلن، فعول مفاعیلن) ٥ (ك: طِوال).

**الطَّویلة**: بەمانا (الطِّوَلُ)دێ ٥ واتە گوریسی درێژ کە لەناو لەوەڕگادا ولاخی پێ دەبەسترێتەوە بۆنەوەی بلەوەڕێ ٥ دەگوترێ: (أرخی طویلة الدابة) ٥ (ك: طِوال).

**الطِّیلُ والطُّیَلُ والطِّیَلَةُ**: بەمانا (الطُّوَلُ)دێ.

**طوى الشَّيَ**: شتەکەی پێچایەوە قەدی کردو لولو خستیە سەریەك ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاء كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾.

**طوى الله عمرَهُ**: خودا مراندی تەمەنی پێچایەوە.

**طوى فلان کشحه أو نفسه عني**: فلانکەس روی لێ وەرگێڕامو دەنگی لێ دابڕیم.

**طوى الخبرَ**: هەواڵەکەی شاردەوە ٥ دەگوترێ: (طوى فؤاده على الأمر): کارەکەی ئاشکرا نەکرد.

**طوى بطنَهُ**: خۆی برسی کرد ٥ یان خۆی بەبرسی نیشان دا ٥

لەحەدیشدا هاتووە (کان یطوی بطنه عن جاره): خۆی برسی دەکردو خواردنەکەی دەدایە جیرانەکەی.

**طوی** الأرض والبلاد: بەناو زەوی دا گەڕاو وڵاتی زۆر گەڕا.

**طوی** الله البعیدَ: خودا خۆشەویستە دوورەکەی نزیك کردەوە.

**طوی** السیرُ الماشيَ: رۆیشتن ڕێبوارەکەی لاواز کرد.

**طوی** فلان البئرَ: فلانکەس بیرەکەی هەڵچنی بەبەرد.

**طوی** السقاءُ: کوندە ئاوەکە پوچایەوە وێك هاتەوە.

**طوی** البطنُ: گەدە لەبرسان وێك هاتەوە.

**طوی** فلان: فلانکەس برسی بوو.

**اطوی**: بەمانا (طوِيَ)دێ.

**انطوت الحیة وغیرها**: مارەکە پاپۆکەی بەست.

**الإنطواء**: لەبواری فەلسەفەدا ئەوەیە فەرد سەرنجی خۆی ئاراستەی شعوری خودی خۆی بکا بەجۆرێك وا لەسەرنجی خۆی دا ڕۆبچێ بکەوێتە هەڵەو زیادە ڕۆییەوە.

**الطّایة**: سەربان، ڕوبەر ٥ خەرمانی خورما ٥ بەردێکی زۆر گەورە لەشوێنێك کەبەردی تری لێ نەبن.

**الطّوی**: کوندەو مەشکە کە خاڵی ببن‌و وێك بێنەوەو تەڕاییان تێدا بمێنێ.

**الطُّوی**: شتی دوو لۆو قەدکراو ٥ کێوێکە لەشام ٥ یان شیوێکە لەخوار کێوی تورەوە ٥ چەماوەیەکە وەکوو گرێ وایە لەکلکی کوللەدا ٥ (ك: أطواء).

**الطّويّ**: پێچراوە، قەدکراو ٥ کۆمەڵە گەنم ٥ سەعاتێك لەشەو.

**الطّيُّ**: ناوەوەی شت ٥ ڕق‌و کینی ناو دڵ ٥ (ك: أطواء) ٥ لەبواری زانستی عەروزدا لابردنی پیتی چوارەمە لەکێشی (مستفعلن ومفعولات) دەبێتە (مستعلن مفْعُلاَت) ٥ لەبواری زەوی ناسی دا بریتییە لە وێك هاتنەوەی توێکڵی زەوی لەئاکامی جم‌و جوڵی زەوی دا کەدەبێتە هۆی پاڵە پەستۆکردنی شاخەکان لەیەکتر.

**الطّیّة**: لای شت، ناوچەیەکی دوور ٥ نیاز، پێویستی.

**المِطوی**: شتێکە ڕیس‌و بەنی لەسەر هەڵدەکرێ وەکوو مەکۆکی جۆڵا.

**المِطْوَاةُ**: کێردێکی بچوکە.

**طاب** الشّئ طِیباً وطیبةً: پاکبۆوە حەڵاڵ بوو، چاك بوو ڕەسەن بوو، جوان بوو، خۆش بوو.

**طابت الأرضُ**: زەوییەکە بەپیت بوو، بەرو بومی بوو.

**طابت نفسه للشيء**: بەهەوەسی ئەو بوو ٥ لەگەڵی گونجا نەفسی وەری گرت.

**طاب عنه نفساً**: وازی لێهێنا ٥ دەگوترێ: (طابت نفسي عنه تركاً).

**اطابَ**: شتێکی حەڵاڵو خاوێنی هێنا.

**اطاب في مكسبه**: کاسبی حەڵاڵو خاوێنی کرد.

**اطاب في كلامه**: قسەی بەسودو بەنرخی کردن.

**اطاب للضيف وغيره**: خۆراکی خۆشو خاوێنی خستە بەردەم میوانەکەی.

**اطاب الشَّيءَ**: شتەکە خاوێن کردو وای لێ کرد پاك بێ ٥ یان بەپاكو خاوێنی دەستی کەوت.

**طيَّبَ الشَّيءَ**: شتەکەی والێکرد پاكو حەڵاڵ بێ ٥ بۆنی خۆشی تێهەڵسو.

**طيّب الصَّبيَ**: منداڵەکەی لاواندەوە، بەقسەی خۆش هێنایە گروگاڵ.

**طَيَّبَ خاطِرَهُ**: دڵی راگرتو خاتری گرت ٥ سوحبەتو یاری لەگەڵ کرد.

**طَيَّبَ لغريمه أو غيره نصف المال أو الدين**: نیوەی ماڵ یان نیوەی قەرزەکەی بۆ قەرزدارەکەی داگرت، لێی خۆش بوو پێی بەخشی.

**تَطَايَبَا**: ئەو دووکەسە سوحبەتو یاری خۆشییان لەگەڵ یەکتر کرد.

**تَطَيَّبَ**: بۆ موطاوەعەی (طَيَّبَهُ)دێ.

**إستطاب**: لەچڵكو پیشسی پاك بۆوە ٥ شەرابی خواردەوە.

**استطاب الشَّيءَ**: شتەکەی بەپاكو خاوێنی هاتە بەرچاو.

**استطاب القومَ**: داوای شتی خاوێنی لێ کردن یان داوای ئاوی شیرینو گوارای لێ کردن.

**الأطيب**: (اسم تفضيل)ە بۆ نێرینە (طوبى) بۆ مێینە ٥ واتە پاکتر خاوێن تر حەڵاڵ تر.

**الأطيبان**: خواردنو نیکاح، یان نوستنو نیکاح یان بەزو گەنجی.

**الطَّابُ**: بۆنی خۆش، شتی خاوێنو پاك.

**الطَّابَةُ**: شەراب.

**الطّوبى**: شتی باشو خاوێن ٥ خێرو چاکە ٥ نازو نیعمەت ٥ بەهەشت.

**الطِّيبُ**: بۆنی خۆش، هەرشتێك خۆی پێ بۆنخۆش بکرێ ٥ شتی حەڵاڵ ٥ شتی باشو باشتر لەهەر جۆرێك بێ ٥ دەگوترێ: (طيب العيش وطيب الحياة).

**الطَّيِّبَةُ من الأشياء**: شتی باشترو پاکتر

٥ دەگوترێ: (مال طِيِّبَةٌ): ماڵو سامانێکی حەڵاڵ.

**الطَّيِّبُ**: هەرشتێك هەستەکان لەزەتی لێ وەربگرن یان نەفس حەزی لی بکا ٥ هەرشتێك زیانو پیسی تێدا نەبێ ٥ هەرکەسێك ڕەوشتی ناشیرینو خراپی تێدا نەبێ ٥ دەگوترێ: (فلان طیب الإزار، طیب القلب): فلانکەس داوێن پاکە دڵ پاکە ٥ (زبون طیب): زەبونێکی مامەڵە خۆشە، هەڵسو کەوتی جوانو ئاغرانەیە ٥ دەگوترێ: (إمرأة طيّبة): ئافرەتێکی داوێن پاكو بەحیرسو خاوەن حەیایە ٥ (نفس طيّبة): نەفسێکی بەقەناعەتەو رازییە بەبەشی خۆی ٥ (کلمة طيّبة): وتارێکی جوانو دڵگیر بوو ٥ (بلدة طيّبة): ولاتێکی پرخێرو بێرە، ئاسایشو ئەمنو ئارامی تێدا بەرقەرارە ٥ هەوا سازگارو پڕ بەروبوومە ٥ (ریح طيبة): بۆنێکی خۆشو دەمار شێلو سوکە.

**المَطایِبُ**: شتی باش لەهەر جۆرێك بێ.

**المَطْیَبَةُ**: شوێنی بۆنی خۆش، کارگەی عەتر.

**المُطَیِّبُون**: پێنج خێڵی عەرەبن (بنو عبد مناف، بن أسد، بنو تمیم، بنو زهرة، بنو الحارث).

**طَاحَ طیحاً**: بەهیلاك چوو.

**اطاحَهُ**: بەهیلاکی برد، لەناوی برد.

**اطاح شَعْرَهُ**: قژی هەڵوەراند.

**طَيَّحَهُ**: لەناوی برد، فەوتاندی.

**تَطَايَحَ**: پەرتو بڵاو بۆوە، بەحەوادا چوو.

**الطَّيْحُ**: هەوجاری جوتکردن.

**الطَّيْحَةُ**: دەگوترێ: (أصابتهم طَيْحَةٌ): بەڵاو کارەستێك توشیان بووە هەموویانی پەرتەوازە کردن.

**طاخَ طَيْخاً**: بەڕەوشتی ناشیرین ناسراوە، کردەوەی ناشیرینی پاڵ دەدرێ ٥ قسەی نەگونجاو دەکا ٥ نەفام بوو ٥ لوتبەرزیی نواند.

**طاخ فلاناً**: کاری ناشیرینی پاڵ فلانکەس دا، تۆمەتی خراپی خستە پاڵ.

**طاخ الأمرَ**: کارەکەی خراپ کرد.

**طَيَّخَ علیه**: زۆری پێگیری لێ کردو فەوتاندی ٥ دەگوترێ: (طَيَّخَ الهمُّ أو العذاب علیه).

**طَيَّخَ الأمْرَ**: کارەکەی تێك دا.

**طَيَّخَ الشَّيءَ**: شتەکەی بەقەتران بۆیەکرد.

**طَيَّخَ السمنُ الحیوانَ**: قەڵەوی

ئاژەڵەكەی هاخنیوه لەگۆشتو بەز.

**تَطَيَّخَ**: بەرەوشتی ناشیرین بێزرا، گوفتارو كرداری ناشیرینی پاڵ درا.

**الطّائخ**: گێلو نەفامو فیزەونی بێ خێر.

**الطّيخة**: بەمانا (الطّائخ) دێ ٥ فیتنه ٥ شەڕو هەرا.

**طار** الطائرُ ونحوه طَيْراً وطيراناً: باڵندەكە فڕیو بەرز بۆوه بۆ حەواو باڵەكانی لێك دانو هەوا پەرواز بوو ٥ دەشگوترێ: (طار طائره): رقی هەڵسا.

**طار** غُرابَه: پیر بوو ٥ (طار قلبه مطاره): دڵی بۆ لایەنێك چوو حەزی لێ كرد دڵی پێیەوه نووسا.

**طارت** نفسه شعاعاً: نەفسی چەواشە بوو.

**طار** الشّيْءُ: شتەكە درێژ بوو، بڵاو بۆوه.

**طار** له صيت أو ذكر في الناس أو الآفاق: دەنگی دایەوه ناوو شۆرەتی بەناو خەڵك دا بڵاو بۆوه.

**طارَ** السِّمْنُ في الدواب ونحوها: قەڵەوی جەستەی ئاژەڵەكەی داگیر كردو بەسەری دا زاڵ بوو.

**طار** فلان الى كذا: فڵان پەلەی كرد.

**طار** الى بلد كذا: سەفەری بۆ فڵان شار كردو بەرەو ئەوی بەفڕۆكە سەفەری كرد.

**طار** الشّيْءَ عن الشّيْءِ: شتەكە لەشتەكە كەوتە خوار.

**اطارَ** المكانُ: شوێنەكە باڵندەی زۆر بوو.

**اطارَ** الطائرَ وغيره: وای كرد باڵندەكە بفڕێ.

**اطار** نومَهُ: خەوی زڕاند.

**اطار** المالَ ونحوه بينهم: ماڵەكەی لەنێوانیان دا بەش كرد.

**طايَرَهُ**: لەفڕین دا پێشبڕكێیان كرد ٥ لەفڕین پێشی كەوت.

**طَيَّرَهُ**: فڕاندی، وای لێ كرد بفڕێ.

**إنطار**: شەق بوو، درزی برد ٥ قەڵشا.

**تطايَرَ**: بەمانا (طالَ)دێ ٥ پەرتو بڵاو بوو ٥ دەگوترێ: (تطايَرَ القومُ): خەڵكەكە پەرتەوازە بوون، بڵاو بوونەوه ٥ پەلەیان كرد.

**تَطَيَّرَ**: گەشبینی نواند بەجۆرە هەڵسو كەوتێكی ئەو باڵندەیە ٥ لەبناغەدا رەشبینیو گەشبینی بە باڵندە دەكرێ، بەڵام دوایی مادەی (تطير)یان بەكارهێنا بۆ هەرشتێك رەشبینیو گەشبینی پێ بكرێ ٥ واش دەبێ دەگوترێ: (اِطَّيَّر) ئەصلی وشەكە (تطَيَّر)یە قەڵبو ئیدغامی

تێدا کراوه بووەتە (إطَّيَرَ) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾.

**استطار الشَّيْئُ**: بەمانا (تطاير)دێ ٥ تەشەنەی کردو بڵاو بۆوه ٥ (استطار البرقُ في أفق السماء): روناکی هەورەبروسکەکە بەکەناری ئاسمان دا بڵاو بۆوه ٥ (استطار الفجرُ أو الصُبْحُ): بەیانی گزنگی بەوڵات دا بڵاو بۆوه ٥ (استطار البِلى في الثوب): رزینی قوماشەکە پێوه چوو تەنیوه ٥ (إستطار الشِّقُّ أو الصدعُ في الحائط أو الزجاجة): درزەکە لەدیوارەکە دەرکەوت یان لەشوشەکە درز دیاری داو پێوه چوو زیادی کرد ٥ (إستطار الشَّيْئَ): شتەکەی والێ کرد بفڕێ ٥ (إستطار السيف): شمشێرەکەی خێرا راکێشاو روتی کرد.

**استُطِيرَ**: گەشبینی پێ کرا ٥ تیز تێپەڕی وەکوو باڵندە ٥ یان دەتکوت باڵندە هەڵی گرتووه ٥ ترسێندرا ٥ دەگوترێ: (استطيرَ فؤاده): دڵی ترسێندرا ٥ (أُسْتُطير الفرسُ): لە رۆیشتن دا پەلە بەنەسپەکە کرا ٥ دەگوترێ: (فحل مستطار): وڵاخە نێرەیەکی چەمووشە.

**الطَّائِرُ** من الحيوان: هەر باڵندەیەك بەدو باڵ بەحەوادا بفڕێ ٥ یان گەشبینیو ڕەشبینی پێ بکرێ ٥ بەشو بار لەخێرو شەڕ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦ﴾.

**طار طائِرُهُ**: رقی هەڵسا پەلەی کرد ٥ (هو ساكن الطائر): ئەو کابرایە پیاوێکی لەسەرە خۆو عاقڵمەندە ٥ (هو ميمون الطائر): پیاوێکی موبارەكو پیرۆزه ٥ دەشگوترێ: (طائرُ الله لا طائِرُك): بابڕیاری خودا جێ بەجێ بکرێ نەك ئەو بڕیارەی تۆ لێی دەترسی ٥ هەروا دەگوترێ: (كأن على رؤوسهم الطيرُ): بێدەنگو گوێ کراوەو دڵ ئامادە بۆ بیستنی شتی بەسود.

**الطائرة**: فڕۆکە؛ کەلەسەر شێوەی باڵندە دروستکراوه بۆ کاڵا گواستنەوەو سەفەرکردنی ئادەمیزادو زۆرشتی تر بەکاردێ.

**الطَّيْرَةَ**: شەپلەو پەلەقاژەو پەلامار دان (طيرة الغضب): خراپی رق هەڵسانو ئاکامەکەی.

**الطِّيَرَةُ**: بەمانا (التطيّر)دێ ٥ هەرشتێك گەشبینیو ڕەشبینی لێ رەچاو بکرێ.

**الطِّيرِيَّةُ**: نەخۆشـییەكی گـوازراوەی ڤایرۆسییە، لەباڵندەوە دەگوازرێتەوە بـۆ ئـادەمیزاد بەتایبەتی لەبەبەغاوە، تای لەگەڵ دەبیٚو چەند دیاردەیەكی ئازاری گەدەو ریخۆڵەو سی لیٚ دەكەوێتەوە.

**الطَّيَّارُ**: فرۆكەوان.

**الطَّيُورُ**: كەسێك زوو زوو بگۆڕیٚو لەم حاڵەوە بچێتە سەر حاڵێكی ترو جیٚ گۆڕكیٚو كارگۆڕكیٚ بكا.

**المطارُ**: فرۆكەخانە.

**المَطَارَةُ**: شوێنێك زۆری باڵندە لیٚ هەبن ◊ بیری دەم پان.

**طاس** طَيْساً: زۆر بوو.

**الطَّيْسُ**: شتی زۆر لەهەر جۆرێك بیٚ وەكوو رەمڵو ئاوو شتی وا ◊ هەرشتێك وەچەو زرۆێتی زۆر بیٚ وەكوو مێشو هەنگو شتی وا.

**طاش** طَيشاً وطَيَشاناً: كەوتە پەلەپەلو جمو جۆڵی ناسایی.

**طاش** فلان: فلانكەس گوفتارو رەفتاری نەفامانەی ئەنجام دا.

**طاش** عقله: عەقڵی كەم بوو، نەفام بوو، نەزان بوو.

**طاش** السهمُ ونحوه عن الهدف: تیرەكە نیشانەكەی نەپێكا لیٚی لادا ◊ كەسێك سەر لیٚ شێواو بیٚ پێی دەگوترێ: (طاش سهمه).

**أطاشه**: وای لیٚ كرد جمو جۆڵی نەفامانە بكا.

**الطَّائش**: چەپلەر ئەو كەسەی شت بهاوێو نیشانە نەپێكیٚ.

**الطَّيَّاش**: سەر لیٚ شێواوو راڕا مەبەستو ئامانجێكی تایبەتی نەبیٚ ◊ پیاوی هەرزەو بیٚ عەقڵو خێرا هەڵچوو.

**طاعَ** طيعاً: بەگوێی كرد، ملكەچی فەرمانیەتی.

**طاف** بە: دەورەی دا ◊ بەدەوری دا سوڕایەوە.

**أطافه**: وای لیٚ كرد بەدەوری دا بسوڕێتەوە.

**طَيَّفَ**: بەمانا (طوَّفَ)دیٚ.

**تَطَيَّفَ**: بەمانا (طاف وأطاف) دیٚ ◊ بەمانا تەواف كردن دیٚ.

**الطَّيَّاف**: رەشایی شەو.

**الطَّيْفُ**: خەیاڵ ◊ خەونو خەیاڵ ◊ شێتی ◊ رق هەڵسان ◊ شۆقە زێڕینە، قەوسو قەزەحو رەنگە جۆراو جۆرەكانی ◊ (ك: أطياف).

**طان** فلان طيناً: بەباشی ئیشی قوڕەكاری كرد.

**طان** الشَّيْءَ: قوڕی لەشتەكە هەڵسو.

**طان** الكتابَ أو الرسالةَ: نامەكەی بەقوڕ مۆر كرد.

**طان** الله فلاناً على الخير أو الشر: خودا سروشتی فلانكەسی لەسەر خێر یان شەڕ داڕشتووە.

**طان** فيه من الصفات كذا: فلان ڕەوشتی تێدا رواند.

**اطانَهُ**: بەمانا (طانَهَ)دێ.

**طيّنَهُ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (طانـه)دا دێ.

**تطـيَّنَ**: قـوڕاوی بـوو ٥ دەشـگوترێ: (إطّينَ).

**الطين**: قوڕ.

**الطِّينة**: پارچەیەك لەقوڕ ٥ لەڕۆژگاری پێشودا نامەو شتی وایان پێ مۆر كردوە وەكوو مۆم ٥ سروشت ٥ (ك: طين).

**الطّيَّانُ**: قوڕگرەوە.

**الظاء:** پیتی حەفدەهەمی پیتەکانی هیجایە، شوێنی لێ دەرخستنی سەری زمانو قەراخی ددانی پێشینەی سەرووە، هەموو مەلاشوو دادەگرێ.

**ظَأَبَ** فلان ظَأباً: فلانکەس نارۆکەی گوتن، شاییو بەزمی گێڕا ٥ هاوسەرگیری کرد ٥ ستەمی نواند ٥ هاتو هاواری کرد.

**ظَأَبَ** فلان فلاناً مظاءبةً: فلانکەس خوشکی ژنی فلانی مارەکردو بوو بە ئاوەڵزاوای.

**تظاءَبَ** الرجلان: ئەو دوو پیاوە یەکیان ئافرەتێکی مارەکرد ئەوی تریان خوشکی ئافرەتەکەی مارەکرد ٥ بوون بە ئاوەڵزاوا.

**الظَّأبُ:** ئاوەڵزاوا، مێردی خوشکی ژنی پیاو.

**ظَأَرت** المرأةُ والناقة ونحوهما علی ولد غيرها ظأراً وظِئاراً: ئافرەتەکە منداڵی یەکی تری هەڵگرتەوەو سۆزی خۆی دایە ٥ حوشترەکە بێچوی حوشترێکی تری هەڵگرتەوە.

**ظأر** فلان علی عدوّه: فلانکەس هێرشی کردە سەر دوژمنەکەی.

**ظأرَ** المرأةَ والناقةَ: ئافرەتەکەی والێ کرد سۆزی بۆ منداڵی یەکێکی تر هەبێو لەخۆی بگرێو بەخێوی بکا، وای کرد حوشترەکە بێچوی حوشترێکی تر هەڵبگرێتەوە.

**ظأرَ** فلاناً علی کذا: فلانکەسی هەڵنا سۆزی بۆ فلان شت ببێ.

**ظأرَ** فلاناً علی الأمر: فلانکەسی هەڵنا بۆ کارەکە یان زۆری لێ کرد کارەکە ئەنجام بدا.

**أظأرها** علی ولد غيرها: وای لێ کرد سۆزی هەبێ بۆ منداڵی ئافرەتێکی تر، دەشگوترێ: (أظأر فلاناً علی کذا).

**ظاءَرَ:** دایەنی گرت.

**ظاءَرَتْ** المرأةُ: ئافرەتەکە منداڵێکی لەخۆ گرت بۆئەوەی شیری بداتێو بەخێوی بکا.

**ظاءَرَ** فلان فلاناً: فلانکەس بوو بەئاوەڵزاوای فلانکەس.

**أظأرت** المرأة: ئافرەتەکە سۆزی بۆ منداڵی یەکێکی تر نواندو لەخۆی گرت.

**أظأرَ** لولده ظِئراً: دایەنی بۆ منداڵەکەی گرت.

**الظّأرُ**: هاوشانو هاووێنـه ٥ دهگوترێ: (عدوّ ظأرٌ): دوژمنێکه هێشتا هێزی تەواوەتی خۆی بەکار نەهێناوە.

**الظِئــرُ**: ئافرەتێـك شـیربدا بەمنـداڵی یەکێـکی تـر ٥ دایـەن ٥ مێـردی ئافرەتی دایەن ٥ سوچی باڵەخانـە ٥ (ك: أظؤر وآظآر وظئور).

**الظِئــرَةُ**: کۆڵەکەیــەك کــە بکرێتــە بەهێزکردنی دیوار.

**ظَأَفَهُ** ظَأفاً: دەری کرد، ترۆی کرد.

**الظّبأة**: کەمتیاری شەل.

**ظَبْظَبَ** فلان ظَبْظَبَةً وظِبْظاباً: فلانکەس هاتو هاواری کردو هەڕەشەی کرد بەشەڕو کارەسات.

**الظّبْظَابُ**: نەخۆشی ٥ دەگوترێ: (مابه ظَبْظَاب) هیـچ نەخۆشی پێوەنیـە ٥ هـەروا وشـەی (ظبظــاب) نــاوە بـۆ جۆرێك لـە کوانو تلۆقو زیبکـە ٥ زیبکـەی سـەر روخـسار ٥ عـەیبو خەوش ٥ ئێشو ئـازار ٥ قـاوو قیـژو هەراو هوریا.

**الظّبْظَبَةُ**: هەراو هوریا ٥ (ك: ظباظب).

**الظّبَةُ**: تیزایی شمشێرو رمبو خەنجەر ٥ (ك: ظُباً ظباة وظبون).

**أظبت** الأرض: زەوییەکە ئاسکی زۆر بوون.

**الظّبــيُ**: ئاسـك؛ جـۆرە ئاژەڵێـکی سـم دوفاقە شاخی کلۆرە، بەناوبانگترین ئاسـك ئاسـکی عەرەبییـە کـەپێی دەگوترێ (الغزال الأعفر) ٥ لەپەندی پێشینان دا هـاتووە دەڵێ: (بـە داء ظَبي): واتـە کـەم نـەخۆش دەکەوێ یـان نازانـدرێ کـوێی نەخۆشـە ٥ دەگـوترێ: (لأترکنـك تـرك الظَبـيّ ظله): واتـە جێـت دێڵمو نایەمـەوە بـۆلات چـونکە ئاسـك کەلەشوێنێـك تەرەبوو نایەتەوە ئـەو جێیـە ٥ (ك: أظبٍ وظُبيٌ وظباءٌ).

**الظِبْيَةُ**: کونـدەی پێـستە ئاسـك ئەگـەر مووەکانی پێوەبن.

**المَظْبَاةُ**: (أرض مَظْبَاةٌ): زەوییەکە ئاسکی زۆرە.

**ظَرِبَ** ظَرَباً: پێوەی نووسا.

**الظّــرِبُ**: لوتکـە بـەرد، سوچـی بـەرد کەتیز بێ ٥ کێوی پانەوە بوو ٥ (ك: ظِـراب) ٥ لـەدوعای نوێـژە بارانـەی پێغەمبـەردا هـاتووە فەرموویـەتی: (اللهمّ على الآكام والظِـراب وبطـون الأودية).

**الظِربــانُ**: ئاژەڵێــکە لــەپێری ئاژەڵــە گۆشتنەکانو سمبۆرەکانـە، لەپشیلە بـچوکترە گـوێ کـورت، گـوێ بـڕاوو سـەر خـڕە لـوت درێـژو قـاچ کورتـە بۆنێــکی زۆر ناخۆشــی لــێ دێ ٥ لەپەنــدی پێــشینان دا هــاتووە (فــسابنهم الظَّربــان): زەریبــان

تــاخیر بــوون ٥ کەوانەیەکــە یــان قورصێــکە بــۆ ســوڕانەوە دەبــێ ٥ سوکانی سەیارە ٥ تایەی سەیارە.

**العَجُولُ**: کۆسـت کـەوتوو ٥ (ك: عُجُـلٌ وعجائل).

**المِعجـالُ**: سـکپڕ کـە پـێش وەخـت سـکەکەی دانـێ ٥ بێچووەکەی ببـێ ٥ بـەربهاوێ ٥ منـداڵی لـەبار بـچێ ٥ کورتکردنـەوەی ڕێـگا ٥ دەگـوترێ: (خذ معاجل الطرق فانها أقرب).

**المُعَجَّلَ**: پێشینە (مُعَجَّلُ الصِداق)مارەیی حازرو پێشینە.

**عَجَـمَ** الحـرف والكتـاب: خـاڵی لەسـەر پیتەکان دانا ٥ بەهۆی دانانی نوختەوە دەقی ناو کتێبەکە روون بۆوە.

**عَجَمَ** الـشيءَ عَجْمـاً: شتەکەی گەسـت، قـەپاڵی لێ گـرت بـۆ ئـەوەی رەقـیو شلی شتەکە لێك جیابکاتەوە.

**عَجَمَ** فلاناً: فلاّنکەسی تاقیکردەوە.

**عَجَـمَ** عــودە: کەســایەتی فلاّنکەســی تاقیکردەوە.

**عَجَمَـت** الأمـور فلانـاً: کـارو ڕوداوەکان فلاّنکەسـیان لەبۆتــەداوەو قاڵیــان کـردوە ٥ دەشگـوترێ: (مـا عَجَمَتـكَ عینــي منــذ کــذا) چــاوم پێــت نەکەوتووە ٥ (جعلت عیني تعجمـه) چاوم دەتبینێو وادێتـە یـادم لـەوەو پێش ئەمن تۆم دیوە .

**عَجُم** فلان: فلاّنکـەس لـە زمـانی دا جـۆرە خواریو خێچییەکی ناعەرەبی تێدایـە ٥ ئەگەر قسەکانی ڕەوان نـەبوون پێـی دەگوترێ: (عَجُمَ الكلام).

**أعجَـمَ** الكــلام: قـسەکەی مانـا شـێاو نەکرد، وای لێ کرد مانای کەلامەکە زۆر ڕوونو ئاشـکرا نـەبێ، لایـەنی عوجمەی تێدا زاڵ بوو.

**اعجَمَ** الكتاب: بەمانا (عَجَمَ)دێ.

**تَعاجَمَ**: منگە منگی کردو زمـانی باداو هێنایيو بردی نـەیتوانی مەبەسـتی خۆی دەربڕێ.

**إستَعجم**: بـێ دەنـگ بـوو ٥ دەگـوترێ: (سألته فاستعجم) پرسیارم لێ کرد بێ دەنگ بوو وەڵامی نەدایەوە.

**إستَعجم** الكلام علیه: قسەکەی لێ تـەمو مژاوی کردو لێی شاردەوە.

**الأعجَمُ**: لاڵ ٥ (موج أعجم) شەپۆلی بێ دەنگو بێ پرژاندنی ئاو.

**الأعجمي**: زمان ناڕەوان ٥ لاڵ ٥ (لـسان أعجمـي) زوبـانی ناعـەرەب (کتـاب أعجمــي) کتێبێــکی نووســراو بــە زمانی عەرەبی ناڕەوان یان نووسراو بەزمانی ناعەرەبی.

**العَجَــامُ**: دەنکــی هــەر شتێــك لــە بـەروبوم، مێـوژ بێ یـان هـەنار یـان هەرشتێـکی تربێ.

**العُجامَـةُ**: ئـەوەی بەتاقیدەکەیـەوەو دەیخەیتە ناو بۆتەوە.

**العَجَمُ**: ناعەرەب هەرکەسێك لە نەتەوەی عەرەب نـەبێ ٥ تاکەکەی(عَجَمِيٌّ) جا بـەزمانی عـەرەبی قـسە بکـا یـان نـا ٥ هەروا کراوە بە ناو بۆ نەتەوەی فارس بەتایبەتی ٥ هەروا بەمانا (العُجامُ)دێ.

**العُجَمُ**: پێچەوانەی (العُربَ).

**العَجمـاءُ**: ئـاژەڵ، بـێ زمـان ٥ (صـلاة عجمـاء) نوێژێـك بـەدەنگی بـەرز فاتیحەو قورئانی تێدا نەخوێندرێ.

**المُعجَـمَ**: قاموسـی وشەگەلێـك کـە بەشـێوەیەك لـە شێوەکان وشـەکانی تێـدا ریزکـرابن ٥ (ك: معجمـات، ومعـاجم) ٥ (حـروف المُعجَـم): پیتەکانی هیجا.

**عَجَـنَ** فـلان عَجنـاً: هەڵسایە حـەوا بەشێوەیەك دەستەکانی دادابونـە سـەر زەوی وەکوو هـەویر شـێل لەبـەر پیری یان لەبەر قەڵەوی‌و نەخۆشی.

**عَجَـنَ** الـدقيق: ئاردەکـەی تێـکەڵ بـە ئاوکردو هەویری شێلا.

**أعجَنَ**: پیر بوو و کەوتە ساڵەوە.

**إعتجن** الدقيقَ: ئاردەکەی کردە هەویرو شێلای.

**عاجِنة** المكان: ناوەڕاستی شوێنەکە.

**العَجّان**: هەویر شێل ٥ کەسێـك پیشەی هەویر شێلان بێ ٥ گێل‌و نەفام.

**العَجينُ**: هەویر (ئاردی تێـکەڵ کراو بە ئاو) ٥ ژنانی‌و خوێڕی ٥ (ك: عُجُن).

**المِعجَـنُ**: ئامێرێـکە هـەویری تێـدا دەشێلرێت.

**المِعجَنة**: ئامێری هەویر پێ شێلان.

**المَعجـون** مـن الأدويـة: ئـەو دەرمانـەی وەکوو هەویر شێلدرابێ.

**عجـت** الأم الولـد عَجـواً: دایکەکـە شـیر پێـدانی منداڵەکـەی لـەکاتی خـۆی دواخست ٥ شیری پێدا تـا خۆی گـرت‌و تـوانی سـەرپێ بکـەوێ ٥ دەشـگوترێ: (عجـاه اللّـبَنَ) شـیری پێدا بـۆ ئـەوەی ببێتە بژێو بۆی.

**عَجَا** فلان فاه: فلانکەس دەمی کردەوە.

**عَجـا** الـشيئ: شـتەکەی لارکـردەوە ٥ دەگـوترێ: (لقـی مـا عجـاه) توشـی چورتم‌و ناخۆشی بوو.

**عَجِـيَ** الـصَّبِيُّ: فلانەکـەس شیرێـکی بـە منداڵەکە دا شیری دایکی خۆی نەبوو ٥ منداڵەکەی لـە شـیر بڕیـەوەو خـۆراکی تری دایە.

**عـاجيَ** الـشيئَ: خـەریکی شـتەکە بـوو رێـکی خـست‌و چـاکی کـرد ٥ حـەجاج بـە کابرایـەکی عـەرەبی گوت دەتبینـم لە بـواری کـشت‌وکاڵدا شارەزای: وتی (اني طالما عاجيته).

عَجىٌ وجهه: دەمو چاوی خوارو خێچ کرد.

العُجاوة: شیرێك كه دەكرێته بزێوی منداڵی هەتیو.

العَجوة: جۆرێکه له هەره جۆری خورمای باشی شاری مەدینە ٥ خورمای تێکەڵ لەچەند جۆرێكو كۆمەڵكردنی.

العَجِيُّ: منداڵی بێ دایك: كه بەشیری ئافرەتێکی تر بەخێو بکرێ.

عَدَّ الدراهِمَ وغيرها عدّاً وتعداداً وعدّةً: دیرهەمەکانی هەژمار کرد.

عَدَّ فلاناً صادقاً: گومانی وابوو فلانکەس ڕاستگۆیە.

أعَدَّ الشيءَ: شتەکەی ئامادەکرد.

عادّه معاداة: شانازی بەسەردا کرد لە ڕوی زۆرییەوە بەرهەڵستی کرد لە شەڕو هەرادا.

عادَّ المرضُ فلاناً: نەخۆشیەکە ماوەیەك لە فلانکەس دوورکەوتبۆوە دوایی بۆی گەڕایەوە ٥ دەگوترێ: (عادته اللسعة) ٥ و (عادّته الحُمى) لە حەدیسی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (ما زالت أكلة الخيبر تُعادّني) تا ئێستاش کاریگەری ئەو خواردنەی خەیبەر کە ژەهری پێوەکرابوو بەیناو بەین بۆم دەگەڕێتەوە.

عادّهُمُ الشيءَ: شتەکەیان بەش کردو بەئەندازەی ئەوان بوو ٥ هەرکەسە بەشی خۆی درایە.

عَدَّدَ الشيءَ: شتەکەی هەژمارکرد ٥ دەشگوترێ: (عددت النائِحَةُ) ژنە وایە شێرکەرەکە ڕەوشتی مردووەکەی یەك بەیەك ئەژماردن ٥ شتەکەی کرد بە خاوەن ژمارە.

إعتَدَّ: ژمێردرا.

إعتَدَّت المرأة: ئافرەتەکە کەوتە عیدەی خۆیەوە ٥ دوای مردنی مێردەکەی یان وەرگرتنی تەڵاقی لەمێردەکەی ٥ عیدەی بەسەرچوو.

إعتَدَّ بالشيءَ: شتەکەی داخڵی حیساب کردو گرنگی پێدا.

إعتَدَّ الشيءَ: شتەکەی ئامادەکرد.

تعادَّ القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان سەرژمێری هەندێکیانیان کرد.

تَعَدَّدَ: بوو بە خاوەن ژمارەی زۆر ٥ (وهم يتعدون على الف) ئەوان لە هەزار تێپەڕین.

استَعَدَّ له: خۆی بۆ ئامادەکرد.

الإستعداد: ئامادەباشی.

التَّعداد: سەرژمێریکردنو هەژمار کردن ٥ سەرژمێریکردنی هاوڵاتیان لەماوەی تایبەتیو دیاریکراودا.

العِدادُ: کاتی مردن ، دەگوترێ: (هذا عِداد الحمی) ئەمە کاتی هاتنی لەرزو تایەکەیە ، (به مرض عِداد) نەخۆشییەکی لەگەڵە بەینێک لێی دووردەکەوێتەوەو ماوەیەك بۆی دێتەوە ، (فلان في عِداد بني فلان) فلانکەس بەیەکێك لە خێڵی بەنی فلان دەژمێردرێ ، (هذا یوم عِداد) ئەمە ڕۆژی هەینییە ، یان ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان جەژنی قوربانە.

العِدُّ: ئاوی ڕەوان کە کۆتایی نەیەت وەکو ئاوی جۆگەو ڕوبار ، شتی زۆرو بێ شومار ، کۆنو لە مێژینە ، دەگوترێ: (حسب عِدُّ) ڕەسانەیەتی لە مێژینە ، هاوشانو بەرامبەر.

العُدُّ: زیبکەی دەموچاو ، زیبکەی گەنجیەتی (حب الشباب).

العُدُّ الوردي: زیبکەی سەر ڕومەتو لوت.

العَددُ: ژمارە، ئەندازەی ژمارەو ژماردن.

العَدّاد: ئامێرێکە بەکاردێ بۆ مەزەندەکردنی کات ، یان بۆ مەزەندەکردنی خێرا تێپەڕبوونو سوڕانەوەی هەندێ ئامێر ، یان ئەندازەی بەکارهێنانی ئاو یان غازی ڕووناکی کارەباو ئەوشتانە.

العِدّان: زەمانی شتو سەردەمی شت.

العِدَّةُ: ئەندازەی ئەوەی دەژمێردرێو چەندییەتەکەی ، کۆمەڵو تاقم ، دەگوترێ: (عدة کتب) و (عدة رجال).

عِدة المطلقة المتوفی عنها زوجها: ئەو ماوەی شەرع دایناوە ئافرەتی تەڵاق دراو یان مێرد مردوو بەبێ مێرد بەسەری بەرێ.

العُدَّةُ: ئامادەباشی ، خۆ ئامادەکردن بۆ ڕوداوێك کە نزیك بێ ڕووبدا ، (ك:عِدَدٌ).

العَدید: هاوشانو بەرامبەر ، کەسێك لەو خێڵە حیساب بکرێو لەوان نەبێ ، (ك: أعداد وعدائد) ، ژمارەی زۆر ، دەگوترێ: (وهم عدید الحصی والثری) ئەوان زۆرن وەکوو زۆری بەردە وردەو گڵو خۆڵ ، (هذا عدید هذا) ئەوە بەئەندازەی ئەوە لە زۆریدا.

العدیدة: بەشو بار (ك: عدائد).

المِعدادُ: لەبواری ڕیاضەدا بریتییە لە ئامێرێك بۆ کاری ژماردن بەکاردێ.

المعدودات: (الأیام المعدودات) ڕۆژانی ئەنجامدانی تەواوکردنی کاروباری

حەجە: کە بریتیین لە سێ ڕۆژی دوای ڕۆژی جەژنی قوربان.

**عَدَسَ** في الأرض عدساً وعدوساً: ڕۆیشت ٥ دەگوترێ: (عدست بە المنیة) مردن لەناوی برد.

**عَدَسَ** بالبغل: دەنگی هێسترەکەی داو تێی ڕاخوڕی بەوتنی (عدس).

**عَدَسَ** فلاناً: خزمەتی فلانی کرد.

**عُدِسَ** فلان: فلانکەس تووشی نەخۆشی خڕوێلکە بوو.

**العَدَسُ**: نیسك، جۆرە خواردنێکە.

**العَدَسة**: خڕۆیلکە جۆرە زیپکەیەکە وەکوو پەتا کەم کەس هەیە نەیگرێ ٥ یان سوڕێژەیە، ئەو جۆرە زیپکەیە کە لەجەستەدا پەیدا دەبێ‌و وەکوو طاعوون وایەو بەزۆری تووشی منداڵی ساوا دەبێ ٥ یان پارچەیەکە لە مادەیەکی ڕوونو شەفاف وەکوو شوشەی دوو ڕووبەر، ڕوبەرێکیان زەق یان قوڵ بووە ٥ یان یەکیان زەقو یەکیان چاڵە.

عدسة العین: قەبارەیەکی ڕوونو شەفافەو نەرمەو کەوانەیە بۆ بەهێزکردنی بینینی چاو دادەنرێ.

**العَدُوسُ** من الناس والدواب: ئادەمیزادی ئازا بۆ ڕۆیشتن یان وڵاخی ئازا بۆ ڕۆیشتن ٥ دەگوترێ: (هو عدوس السُّرى وهو عدوس اللیل).

**العدیسة**: لە بواری ڕووەك ناسیدا بریتییە لە کونی بچکۆلەی شێوە نیسکی، بە زۆری لە قەدی ڕووەکەکەدا دەبێ.

**عَدَلَ** عدلاً وعدولاً: مەیلی کرد، لایدا ٥ دەگوترێ:

**عَدَلَ** عن الطریق: لە ڕێگا لایدا.

**عَدَلَ** الیه: گەڕایەوە بۆلای.

**عَدَلَ** في أمره: لە کاروباریدا عەدالەتی نواند، دادپەروەری ئەنجام دا.

**عَدَلَ** فلاناً عن طریقە: فلانکەسی لە ڕێگەی خۆی گێڕایەوە، لای دا.

**عَدَلَ** فلاناً الى طریقە: فلانکەسی هێنایەوە بۆ ڕێگەی خۆی.

**عَدَلَ** الشیءَ عدلاً: شتەکەی بە ڕاستو دروستی چەسپاند، دادپەروەرانە ڕەفتاری کرد.

**عَدَلَ** المیزان: تەرازووەکەی ڕاست کرد.

**عَدَلَ** الشيء بالشيء: شتەکەی بەو شتە ڕاستو پاستە کردو وەکوو یەکی لێکردن ٥ دەگوترێ: (عَدَلَ بربه عدلاً) هاوشانی بۆ خودای خۆی بڕیاردا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ الَّذِینَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم یَعْدِلُونَ﴾.

**عَدَلَ** فلاناً بفلان: یەکسانی خستە نێوان

فلانو فلان وەكوو یەك ڕەفتاری لەگەڵ کردن.
**عَدَل** الأمتعة: کاڵاکەی تاتاو فەردەفەردە کردن بۆئەوەی تایەکان هاوکێش بن بۆ بارکردن بەسەر پشتی وڵاخەکەوەو بارەکە خوارنەبێ.
**عَدَل** فلاناً في المِحمل: لەگەڵ فلانکەس لەکەژاوەکەدا سوار بوو.
**عَدُلَ** عدالة وعدولةً: عادڵ بوو.
**عادَلَ** عنه: لێی لادا.
عادَلَ بین الشیئین: هاوکێشەیی و یەکسانی خستە نێوان ئەو دوو شتەوە.
عادَلَ الشيء بالشيء: یەکسانی خستە نێوان ئەو دوو شتەوەو وەکو یەکی لێ کردن.
عادَلَ الأمر: لە کارەکە وەستاو نەیرۆیاند.
**عَدَّل** الشيءَ: شتەکەی چەسپاندو ڕێکی خست.
**عَدَّل** المکیال والمیزان: تەرازوو ئامێری پێوانەکەی ڕاستو درووست کردنو کەمو کورپیان تێدا نییە.
**عَدَّل** الحکم: بڕیارەکەی گۆڕی بەشێوەیەك کە پێی چاکتر بوو.
**عَدَّل** الشاهد أو الراوي: پەرێز پاکی شایەتەکە یان فەرموودە گێڕەوەکەی چەسپاند، تەزکییەی کردن.
**عَدَّل** المتاع: کاڵاکەی کردە دوو لاباری وەکوو یەك.
**إعتَدَلَ**: میان ڕەوی کرد لە نێوان دوو حاڵ یان دوو چۆنیەتیدا وەکوو دەڵێ: (إعتدل الجو بین الحرارة والبرودة ٥ والماء بین الحار والبارد ٥ وجسم معتدل بین الطول والقِصر وبین البدانة والنحافة).
**إعتدل**: ڕێكو پێك بوو ٥ دەگوترێ: (هو حسنة الأعتدال) شێوەو سەروسیمای ڕێكو پێکە.
**تعادلا**: وەکوو یەك بوون.
**الإعتدال**: ئەو کاتەی شەو و ڕۆژ تێیدا یەکسان دەبن وەکوو یەکەم شەو و ڕۆژی بەهارو یەکەم شەو و ڕۆژی پایز.
**العدالة**: لە زاراوەی فەلسەفەدا یەکێکە لەو چوار ڕەوشتو بەها بەنرخانەی لە دێر زەمانەوە فەیلەسووفەکان بڕوایان پێی هەبووەو بانگەوازیان بۆ کردوون ئەو چوار ئاکارە بەرزەش: (حیکمەت، ئازایەتی، دەستوداوێن پاکیو دڵو دەروونو زمان پاکی، عەدالەت).

العَدلُ: ويژدان ٥ هاوشانو بەرامبەر ٥ پاداش ٥ فيديەو بەدەڵ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُقْبَلُ مِنهَا عَدْلٌ﴾.

العِدلُ: هاوشانو بەرامبەر ٥ لاتای بار كە لەسەر پشتی ولاخ بێ جەواڵو هۆڕ كە لەمديوو و ئەو ديوی پشتی ولاخدا بن.

العَديلُ: هاوشانو بەرامبەر (عديل الرجل) مێردی خوشكی خێزانی، واتە: ئاوەڵزاوا ٥ (ك: أعدال وعُدَلاء).

العديلتان: دوو تايينچە يان دوو شريف كە كاو لۆكەو خوربيان تێ دەكرێو لە ولاخ باردەكرێن.

المُعَادَلَة: لە بواری ماتماتيكدا هاوكێشەيەكە ناديارێك يان زياتری تێدايەو دەتەوێ دەری بێنی.

المُعتدِلَة: (المنطقة المعتدلة) لە بواری جوگرافيدا دوو ناوچەيە دەكەونە ئەم ديوو ئەو ديوی ناوچەی ناوەڕاست (المنطقة الإستوائية).

المُعَدَّلات: سووچەكانی ناو خانوو.

المَعدِل: دەگوترێ: (ماله عنه مَعدِلٌ) شتێك نيە لەو شتە لابدا.

عَدِمَ المال عَدماً وعُدماً: ماڵەكەی لەكيس چوو، ماڵەكەی فەوتاند.

أعدَمَ فلانٌ: فلانكەس نەبوو بوو ٥ هەژاركەوت.

أعدَمَ الشَّيءُ فلاناً: فلانكەس شتەكەی دەست نەكەوت.

أعدَمَ فلاناً: فلانكەسی مەنع كرد.

أعدَمَ فلاناً الشيء: شتەكەی لەكيس فلانكەس دا ٥ دەگوترێ: (لا أعدمني الله فضلك) خودا فەزڵو پياوەتی تۆم لەسەر نەفەوتێنێ هەر پايەدار بێ.

أعدَمَ الجلاّدُ المجرم: جەللادەكە تاوانبارەكەی ئيعدام كرد.

الإعدام: لەناوبردنو لە قەنارەدان ٥ دەگوترێ: (قضى الحاكم باعدام المجرم) دادوەر بڕياری لەقەنارەدانی تاوانبارەكەيدا ٥ بڕيارێدا لە تۆڵەی تاوانەكەی گيانی دەربچوێندرێ.

العَدَمُ: پێچەوانەی وجودو بوونە ٥ هەژاری.

العُدمُ: هەژاریو نەبوويی.

العَديمُ: هەژارێك كە هيچی نەبێ ٥ (ك: عُدماء).

المعدوم: نەبوو ٥ خاوەن شانسو بەخت، شتی وای بۆ دەستەبەر دەبێ بۆ كەسانی تر نايەتە دی ٥ لە حەديسی خاتوو خەديجەدا هاتووە: (كلا انك تكسب المعدوم وتحمل الكل).

**أعامَ** القومُ: خەڵکەکە حوشترەکانیان فەوتان‌و شیریان لێ بڕا.

**أعامَ** الله فلاناً: خودا حوشتری فلانکەسی فەوتاندن‌و کابرا بێ شیرو ماست مایەوە.

**إعتامَ** الرجلُ: پیاوەکە زۆر ئارەزۆی ماستی کرد ٥ زۆری تینوو بوو.

**إعتامَ** الشَّيْءَ: قەصدی شتەکەی کرد ٥ هەوڵی بەدەستهێنانی دا.

**العَيَامُ**: ڕۆژ ٥ دەگوترێ: (سِرت العيام كله) هەموو ماوەی ڕۆژ لە ڕۆیشتن دا بووم.

**العَيمَةُ**: حەزلێکردن‌و تاسوخی زۆر بۆ ماست‌و شیر ٥ تینوایەتی زۆر.

**العِيمَةُ**: لەهەموو شتێک باشەکەی ٥ (ك: عِيَمٌ).

**عانَ** الحَفّارُ عَيناً: بیرهەڵکەنەکە گەیشتە کارێزاو ٥ دەگوترێ: (حَفَرتُ حتی عِنتُ).

**عان** الماءُ أو الدمعُ: ئاوەکە ڕەوان بوو ٥ فرمێسک ڕژا.

**عان** البئرُ: بیرەکە ئاوی زۆر بوو.

**عان** على القوم: چاودێر بوو بەسەر قەومەکەوە.

**عان** فلاناً: چاوی هەنگاوت.

**عان** الحاسِدُ فلاناً: چاوچنۆك بەچاو فلانی هەنگاوت ٥ چاوەزاری لێ دا.

**عان** القومَ ولهم عِيانةً: بوو بەچاودێر بەسەر قەومەکەیەوە.

**عَينَ** عَيناً وعِينةً: چاوی گەورەو جوان بوو (فهو أعين وهي عيناء).

**اعان** الحفّارُ: بیر هەڵکەنەکە گەیشتە کارێزاو.

**أعان** الحاسِدُ الشَّيْءَ: چاو پیس‌و حەسودەکە بەدوای شتەکەدا گەڕا بۆئەوەی بەچاو بیهەنگێوێ.

**اعيَنَ** الحَفّارُ: بیرهەڵکەنەکە گەیشتە کارێزاو.

**عاينه** معاينةً وعياناً: بەچاو بینی ٥ دەگوترێ: (لقيته عياناً) توشی بووم‌و بەچاوی خۆم بینیم ٥ گومانم لەبینینەکەدا نیە.

**عَيَّنَ** الرجلُ: پیاوەکە کالای داو کالای وەرگرت بەسلفە.

**عَيَّنَ** التاجرُ: بازرگانەکە کالاکانی بەقەرز فرۆشتن‌و دوایی لەکڕیارەکەی کڕینەوە بەنەقدی‌و حازر بەنرخی کەمتر بۆئەوەی مامەڵەکەی ریباو سووی تێنەکەوێ ٥ (بەکوردی حیلە شەرعی کرد).

**عَيَّنَ** الشجرُ: درەختەکە سەوز بوو گوڵی کرد.

**عَيَّن** القِربَةَ: ئاوی کردە کوندەکەوە بۆئەوەی لە شوێنی دوراوەو

پینەکراوی بێتە دەرو کونە وردەکانی بەهاوسانی دزوەکە بگیرێن.
عَيَّنَ الثوبَ: کراسەکەی پەراوێز نەخشاو کرد بەچوار گۆشەی بچوك بچوك تا بشوبهێتە چاوەگا.
عَيَّنَ اللؤلؤة: مرواریەکەی کونکرد.
عَيَّنَ الحربَ: شەڕو جەنگەکەی بەڕێوەبرد.
عَيَّنَ الشَّيئَ: شتەکەی دەستنیشان کرد لەناو شتەکاندا.
عَيَّنَ المالَ لفلان: ماڵەکەی تایبەت کرد بەفلانکەسەوە.
عَيَّنَ فلاناً: هەواڵی دا بەفلانکەس بەو لەککەو عەیبانەی کەلەدەمو چاوی دا دیارن ○ دەگوترێ: (عَيَّنَ عليه) خەبەری پاشای لێداو لای پاشا ڕەخنەی لێ گرتو هەڵوێستە خراپەکانی دژی گەلو ولات بۆ پاشا رونکردەوە ○ دەشگوترێ: (أتيت فلاناً فما عَيَّنَ لي بشيئ) هاتمە لای فلانو هیچی نەدامێ.
عَيَّنَ فلاناً في وظيفته: فلانکەسی تەعین کرد لە وەزیفەکەیدا.
إعتانَ القومَ رهم: هەواڵی بۆ قەومەکە هێنا.
إعتان الشَّيئَ: لەشتە باشەکەی هەڵگرت ○ بەقەرز شتەکەی کڕی.
تَعَيَّنَ الرجلُ: پیاوەکە سلفەی وەرگرت ○ چاوی هەڵبڕیو لەشتەکە ورد بۆوە تا بەچاو بیهەنگێوێ.
تَعَيَّنَ السِّقاءُ: کوندەکە کۆن بوو ڕزی تەنك بوو.
تَعَيَّنَ عليه الشَّيئُ: خودی شتەکە لەسەری چەسپا.
تَعَيَّنَ الشَّيئَ: شتەکەی بەچاوی خۆی بینی.
تَعَيَّنَ القومُ عينا: خەڵکەکە یەکێکیان دیاریکرد بۆئەوەی کاری سیخوڕیان بۆبکا.
العَائِنُ: دەگوترێ: (ما بالدار عائِنُ) کەس لەخانوەکەدا نیە ○ (شرب من ماء عائن) لەئاوی ڕەوانی خواردەوە.
العائِنَةُ: مێینەی (العائِنَ) ○ (عائِنة بني فلان) ماڵو دارایی خێڵی فلان.
العَينُ: چاو ○ کارێزاو ○ ئاوێك لەزەوی بێتە دەرو ڕەوان ببێ ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ ○ خەڵکی شار تاکی خێزان ○ سیخوڕو جاسوس ○ سەرۆکی سوپا ○ پێشەتای سوپا ○ ڕیش سپی هۆزو خێڵ ○ خودی شت ○ پارەی سکە لێدراو ○ دەگوترێ: (إشتريت بالعين لا بالدين): بەحازر کڕیم نەك بەقەرز ○ شتی

حازرو بەبەدەست هەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (بعتُ عَيناً بعين) فرۆشتم حازر بەحازر ٥ شتی بەنرخو کاکڵەی شت ٥ دەگوترێ: (هذه القصيدة من عيون الشعر).

**عين** الجمل: گوێز.

**عين** السمكة: ئەستووربوونی پێستو رەق بوونی وەکوو ئەو خاران‌و ئەستوربون‌و رەقبونەی پێستی قامکی قاچ بەهۆی زەختی پێڵاوەوە.

**العِينةُ**: باشی شت ٥ لەهەرشتێك باشەکەی ٥ سلفەو پێشینە ٥ کەرەستەی شەڕ ٥ دەشگوترێ: (ثوبٌ عينة) کراسێکی جوانە.

**العَيونُ**: چاوپیس ٥ کەسێك زۆر چاوی پیس بێ‌و هەنگێو بێ.

**العَيِّنُ** من الرجال: پیاوی گرینۆك ٥ کوندەو گۆزەیەك ئاوی لەبەر بڕوا.

**العَيِّنَةُ**: جوزئێك لەمادەیەك وەکوو نموونە بۆهەمووی.

**المَعانُ**: شوێن مەنزڵ‌و جێی حەوانەوە ٥ دەشگوترێ: (هم منك بمعان) ئەوان لەتۆوە دیارن دەتوانی بیان بینی.

**المِعيانُ**: چاو پیس‌و بەچاو هەنگێو ٥ (ك: معايين).

**المعيون** من الماء: ئەو ئاوەی بەدەرەوەیەو لەسەر زەوی ڕەوان دەبی‌و دەبینرێ.

**المَعِينُ**: بەمانا (المَعيون) دێ.

**المُعَيَّنُ** من البقر: مانگایەکە نێوچەوانی رەش بێ ٥ هەروا بەقوماشێك دەگوترێ پەراوێزچن کرابێ‌و بەوێنەی چوارگۆشەیی بچوك بچوکی وا بشوبهێتە چاوە گاکێوی ٥ لەبواری ئەندازیاریشدا بە چوارگۆشەیەك دەگوترێ لایەکانی چوونیەك بن‌و سوچەکانی ڕاست نەبووبنەوە.

**عاهَ** المالُ والزرعُ: ماڵ‌و سامانەکە، کشت‌وکاڵەکە توشی بەڵا بوو.

**عِيهَ** المالُ والزرعُ: بەمانا (عاه)دێ.

**أعيَهَ** القومُ: خەڵکەکە کشت‌وکاڵەکەیان توشی بەڵا بوو نەخۆشی تێکەوت ٥ یان ئاژەڵەکانیان نەخۆشیان تێ کەوت.

**عَيَّهَ** بالرجل: بانگی پیاوەکەی کرد هاواری لێ کرد ٥ بەسەریا نەڕاندی.

**العائِهَة**: هاوارو دەنگ بەرزکردنەوە.

**العاهَةُ**: بڕوانە مادەی (عَوَهَ).

**عَيَّ** في منطقه عِيّاً وعَياءً: زمانی گیرا، قسەی بۆ نەکرا، نەیتوانی مەبەستی خۆی دەربڕێ ٥ دەشگوترێ: (عَيَّ بأمره و عَيَّ في حجته).

**عَيَّ** الأمرَ وبالأمرِ: کاری خۆی نەزانی ٥

(فهو عيٌّ) ٥ (ك: أعياء).

**أعيا الرجلُ أو البعيرُ في سيره:** پياوەكە يان حوشترەكە لە ڕۆشتنيدا ماندو بوو زۆر شەكەت بوو ٥ دەشگوترێ: (أعياه السيرُ) ڕۆيشتن زۆرى ماندوو كرد.

**أعيا عليه الأمرُ:** كارەكە دەسەوسانى كرد نەيزانى چۆن ئەنجامى بداو لەكوێوە دەستى پێ بكا ٥ دەشگوترێ: (أعيا الداءُ الطبيب) نەخۆشييەكە پزيشكەكەى دەستەوەسان كرد هەرچەندە هەوڵى دا نەيزانى چۆن قەلاچۆى بكا.

**عايا فلان:** فلانكەس قسەيەكى هێنايە پێشەوە كەس تێى ناگا ٥ يان كارێكى ئەنجامدا نازانرێ چۆنەو چيە.

**عايا صاحِبَهُ:** قسەيەكى ئاڕاستەى هاوەڵەكەى كرد نازانرێ ڕوى لەكێيەو مەبەست چيە.

**عَيَّا الرجلُ:** پياوەكە قسەيەكى كرد يان كارێكى ئەنجامدا نازانرێ مەبەستى چيە.

**عَيَّا صاحِبَهُ:** قسەيەكى ئاڕاستەى هاوەڵەكەى كرد نازانرێ ڕوى لەكێيەو مەبەست چيە.

**تعايا الرجلُ:** خۆى وا نيشاندا كەناتوانێ قسەبكاو زمانى گيراوە وايش نيە زمانى نەگيراوە.

**تعايا بالأمر:** نەيتوانى كارەكە باش ئەنجام بدا.

**تعايا عليه الأمرُ:** كارەكە دەستەوەسانى كرد نەيزانى چۆن دەستى پێ بكاو چۆن ئەنجامى بدا ٥ دەشگوترێ: (تعاياه الأمرُ).

**تَعَيَّا بالأمر وعليه الأمرُ:** دەق بەمانا (تعايا به وعليه) دێ.

**إستَعيا بالأمر:** كارەكەى نەزانى، بۆى جێبەجى نەكرا.

**الأعيِيَّةُ:** ئەوەيە هاوەڵەكەتى پێ هەڵخەڵەتێنىو چەواشەى بكەى بەيەكێ لەو هەڵەو غەڵەتانەى خەڵك بەكاريان دێنێ بۆسەر لێ شێواندنو چاوبەستەكێ.

**العَياءُ** (الداء العياءُ): دەردێكى كوشندەى وەها چاكبوونەوەى نەبێو دەرمانى دەست نەكەوێ.

**العِيُّ:** زمان گيرانو قسە بۆنەكران ٥ نەبوونى توانا بۆئەوەى مەبەستى خۆت دەرببڕى بەشێوەى پێويست ٥ نەدۆزينەوەى ڕێگاى مەبەست ٥ نەزانينى ئەنجامدانى كار.

**الغَينُ**: پیتی نۆزدەهەمە لە پیتەکانی هیجا ٥ شوێنی لێ هاتنە دەرەوەی کۆتایی گەرووە بەلای دەمەوە، لەخوار زمانە بچکۆلەوەیە.

**الغاز**: چۆنیەتیو حاڵەتێکی مادەیە لەسێ حاڵەتەکەی ٥ بەرواڵەتو عادەت شەفافەو لەهەموو حەییزو کونو کەلەبەرێک دەخزێو دەچێتە ناویانەوەو شێوەی ئەو دەگرێ، وەکوو هەواو ئۆکسجینو دوانەئۆکسیدی کاربۆن لە پلەی گەرمی ئاساییو پەستانی ئاسایدا.

**غاز الفحم**: تێکەڵاویەکی غازەکانە بۆ گەرمکردنەوەو روناکی بەکاردەهێنرێ.

**غاز الاستصباح**: هەر غازێک بەکاربهێندرێ بۆ روناکی بەهەڵگیرساندنی.

**غاز الخردل**: غازێکی ژەهراوییە لە شەڕدا بەکاردەهێندرێ.

**الغازوزة**: شەرابێکی شیرینەو کەمێک زەیتی عەتر ئامێزی لەگەڵ دایەو غازی دوانەئۆکسیدی کاربۆنی تێکەڵە بەهۆی پاڵەپەستۆیەکی بەهێزتر لە پاڵەپەستۆی هەوا، وادەبێ مادەی تریشی تێکەڵ دەکرێ بۆنەوەی تامی جیا و ڕەنگی جیا پەیدا بکا.

**غَبَّتِ الماشيةُ في الورد غِبّاً**: ئاژەڵەکان ڕۆژێک ئاویان خواردەوەو ڕۆژێک نەیان خواردەوە.

**غَبَّتِ الحميُّ على المحموم**: لەرزوتادارەکە ڕۆژە ناڕۆژێک تای لێ دێ.

**غَبَّ الرجلُ في الزيارة**: پیاوەکە کات دوای کات سەردانی کرد ٥ هەر لەم ڕوانگەوە گوتراوە: (زر غِبّاً تَزدَدْ حُبّاً) ئاوە ناوە بچۆرە دیدەنی خزمو دوستو ئاسیاو زوزو مەچۆ بۆئەوەی زیاتر خۆشەویست ببێ.

**غَبَّ الأمرُ**: کارەکە گەیشتە کۆتایی.

**غَبَّ الطعامُ غَبّاً وغُبُوباً**: خۆراکەکە بۆگەنی کرد گوراو خراپ بوو.

**غَبَّ فلان عنده غِبّاً**: فلانکەس لای مایەوە، شەو لای مایەوە.

**غَبَّ الرأيَ**: هەڵوەستەی کرد لە دەربڕینی راو بۆچونی خۆی ٥ بە کاڵەو خۆ ڕای خۆی دەربڕی.

**أغَبَّ القومُ**: خەڵکەکە ئاژەڵەکانیان ڕۆژێک ئاویان خواردەوەو ڕۆژێک نەیان خواردەوە.

**أغبَتِ الحَلُوبَةُ**: شيردەرەكە درەنگ شيرى دا زوزو گوانى شيريان تىَ نەهاتەوە.

**أغَبَّ الطَعامُ**: خۆراكەكە تێكچو بۆگەن بوو.

**أغَبَّ عنده**: شەو لەلاى مايەوە.

**أغَبَّ الماشية**: ئاژەڵەكانى ئاو نەدان.

**أغَبَّ القومَ**: ڕۆژێك هاتە لاى خەڵكەكەو ڕۆژێك نەهات ◦ ڕۆژە ناڕۆژێك سەردانى قەومەكەى كرد.

**أغَبَّ الشَّيْئُ فلاناً**: شتەكە كەوتە سەر فلانكەس ◦ شتەكە ڕووبەڕوى فلانكەس بۆوە ◦ دەشكوترىَ: (فلان لا يُغِبُّنا عطاؤه) بەخشش‌و عەتاى فلانمان لىَ نابڕىَ، هەموو ڕۆژىَ بۆمان دەنێرىَ.

**غَبَّبَ الطعامُ**: خۆراكەكە خراپ بوو بۆگەنى كرد.

**غَبَّبَ فلان في الأمر**: فلانكەس زێدە ڕەوى لەكارەكەدا نەكردو بەئاسايى وەرى گرت.

**غَبَّبَ الشَّاةَ**: ڕۆژە ناڕۆژێك مەڕەكەى دۆشى.

**التَغبِيَّةُ**: شايەتى بەدرۆ.

**الغِبُّ**: لەهەموو شتێكدا كۆتايى‌و دواييەكەيەتى ◦ دەق بەمانا (بَعدَ)دىَ ◦ دەگوترىَ: (جاءَ غِبَّهُ) دواى ئەو هات ◦ (حمّى الغِب) لەرزو تا كە ڕۆژە نا ڕۆژێك بوو.

**الغُبُّ**: ئاوى سەر كردوى شەپۆلى دەريايە، كەبەسەر كەنارەكانى دا سەرڕێژ دەكا ◦ شيوو دۆڵ ◦ (ك: أغباب وغُبّان) دەگوترىَ: (أصابنا مطر سال منه الغُبّان) بارانێكمان لىَ بارى شيوو دۆڵەكان لافاويان لىَ هەڵسا.

**الغَبَبُ**: ژێر چۆڵەمە، غەبغەبە ئەو گۆشت‌و پێستە هەڵاوساوەى لە ژێر گەردنەوە شۆڕ دەبێتەوە بەتايبەتى لەهى ئادەميزادو كەڵەشێرو ڕەشەوڵاخ ◦ (ك: أغباب).

**الغُبَّةُ**: ژيانى كولەمەرگى.

**الغَبيبُ**: گۆشتى شەو ماوە ◦ گۆشتە كۆن ◦ سێلاو وجۆگاى تەنگە بەرى قەدپاڵى كێوو ناوزەوى.

**الغَبيبَةُ**: شيرى بەيانى كە شەو شيرى ترى بۆ دەدۆشرىَ‌و دەخرێتە سەرى‌و هەوێن دەكرىَ‌و بەيانى دەهەژێندرىَ.

**المَغَبَّةُ من كل شيئ**: كۆتايى‌و سەرەنجامى شت ◦ دەگوترىَ: (هذا الأمر مَغَبَّة طيبة) ئەم ئيشە سەرەنجامێكى باشى هەيە.

**المُغَبِّبُ**: (ثور مُغَبِّبٌ) گايەكى چۆڵەمە ئەستوورو گەورەيە.

**غَبَثَ الشَّيْئَ غَبثاً**: شتەكەى تێكلاو كرد ◦

دەگوترێ: (غَبَثَ الزبد بالعسل) رۆنە کەرەکەی تێکەڵی هەنگوین کرد.

غَبِثَ اللونُ غَبثاً وغُبثةً: رەنگی خاکی بوو تەپو تۆزاوی بوو ◦ (فهو أغبث وهي غَبثاء) ◦ (ك: غُبث).

إغبَثَّ: بەمانا (غَبِثَ)دێ.

الغَبيثةُ: کەشك وردەکرێو تێکەڵ بەرۆن دەکرێ.

غَبِجَ الماءَ غَبجاً: قوم دوا قوم ئاوەکەی خواردەوە.

الغُبجَةُ: قوم (مزە خواردنەوەی شلەمەنی).

غَبِرَ غبوراً: مایەوە ◦ تێپەڕی.

غَبِرَ الشَّيْئُ غَبراً وغُبرَةً: تەپوتۆز دایپۆشی ◦ رەنگی خاکی بوو ◦ (فهو أغبر وهي غبراء) ◦ (ك: غُبرٌ).

غَبِرَ الجرحُ غَبَراً: برینەکە لەسەر پیسی گۆشتەوەزوونی هێنایەوە سەرەوەی چاك بۆوەو ناوەوەی داوەشا بۆیە پاش ماوەیەك: زارکی برینەکە درایەوەو کێمو زوخاوی لێ هاتەدەر ◦ (فهو غَبِرٌ).

أغبَرَ: تەپو تۆزی بەرپاکرد.

أغبَرَ الشَّيْئُ: رەنگی شتەکە وەکوو رەنگی خاکی لێ هات.

أغبَرَ في حاجته: زۆر تێکۆشاو هەوڵی جیدی دا بۆ ئەنجامدانی کارەکانیو دابینکردنی پێداویستیەکان.

غَبَّرَ: تەپوتۆزی هەڵساند.

غَبَّرَ في وجهه: پێشی کەوت ◦ وەکوو بڵێی لە پێشیەوە تەپو تۆزی هەڵساند.

غَبَّرَ الشَّيْئَ: شتەکەی تەپوتۆزاوی کرد.

غَبَّرَ الضيفَ: دوو دەنك خورمای تازە پێگەیشتوی پێشکەشی میوانەکە کرد ◦ دەرخواردی دا.

تَغَبَّرَ: تەپو تۆزاوی بوو.

تَغَبَّرَ الناقةَ: دوا چۆڕە شیری حوشترەکەی دۆشی ◦ دەشگوترێ: (تَغَبَّرَ من المرأة ولداً) منداڵێکی لەنافرەتەکە بوو ◦ قازانجی ئەوەی لە ژنەکە کرد منداڵێکی لێ بوو.

إغبَرَّ الشَّيْئُ: بەمانا (غَبِرَ)دێ ◦ دەشگوترێ: (غبَرَّ اليومُ) رۆژەکەی تەپو تۆزاویو خۆڵ باران بوو ◦ تەپو تۆزەکەی زۆر چڕو پڕ بوو.

إغبَرَّت الارض: زەوی روتەن بوو هیچی نەڕواندو بێ بەرو بووم بوو.

الأغبَرُ: تێپەڕبوو کۆنو ڕزیو ◦ بێ بەقاو بەردەوام نەبوو ◦ دەگوترێ: (لا يغُرنّكَ عزّ الدنيا فانه أغبَرُ) با جوانیو رازاوەیی دونیا وات لێ نەکا لەخۆت بایی بی چونکە دونیا بێ بەقایەو بۆکەس تاسەر نییە.

**الغــــابِرُ**: بــــاقی‌و مــــاوە ٥ قورئــــان دەفــەرموێ: ﴿إلاَّ امْرَأَتَــهُ كَانَــتْ مِــنَ الْغَــــابِرِينَ﴾: جگــە لــە ژنەكــەی حەزرەتی لوط ئـەو دەمێنێتـەوە لـە خانوەكــەدا بۆئــەوەی عەزابەكــە بیگرێتەوە.

**غـابر بـني فـلان**: باقی مانـدەی خێڵی فلان ٥ هەروا وشەی (الغـابر) بـەمانا رۆژگــاری رابــردو دێ ٥ دەگــوترێ: (كان ذلك في الزمن الغابر).

**الغُبارُ**: تەپو تۆزو خۆڵەپەتە ٥ جۆرە خەتێــكی وردە نامــەی بــەكۆتردا ڕەوانــەكراوی پــێ نووســراوە ٥ دەشگوترێ: (طلـب فلانـاً فمـا شـق غُبـاره) هـەوڵی دا بگاتـە فلانكـەس‌و بەتۆزی پاشی نەگەیی ٥ نەیگەیشتێ ٥ (الغُبار الذرّي) ئەو مادە تیشكانەن كـە لـەناكامی تەقینـەوەی زەرڕەدا دێتە جێ‌و رەشـەبا بـەم لاو بـەولادا بۆشــــــوێنی دوری دەبــــــاو لەسەرزەوییەكە .دەكەوێ‌و زیـان بـە زینــــــدەوەرانی ســــــەرزەوییەكە دەگەیەنێ.

**الغُبارِيَّةُ**: تێـكچون‌و پشێوی سییەكانە لــەناكامی هەڵمــژینی تــەپو تــۆز پەیدا دەبێ.

**الغُبَّرُ**: (غُبَّرُ كـل شـيء) كۆتـایی‌و بـاقی ماندەی هەموو شتێكە ٥ (غُبَّرُ الليل) كۆتای‌و باقی ماندەی شەو.

(غُبَّرُ المرض) كۆتـایی‌و ئاسـەوارە بـاقی مانــدەكانی نەخۆشــییەكە ٥ وای لێ هـاتووە بـەزۆری بـۆ بـاقی مانــدەی شیری نـاو گـوانی ئـاژەڵ بـەكاربێ ٥ هەروا ناوە بۆ باقی مانـدە خـوێنی عـــادەی مانگانـــەی ئـــافرەت ٥ دەگوترێ: (ناقة بها غُبَّر) حوشترێـكە هەندێكی شیر لەگواندا مـاوە ٥ (ك: غُبَّرات).

**الغُبْرُ**: بەمانا (الغُبَّرُ) دێ ٥ (ك: أغبار).

**الغَبَـرُ**: بـەمانا (الغُبـار)دێ ٥ مانــەوەو بــەردەوامی ٥ دەردێــكە لــە سمــی حوشتردا پەیدا دەبێ پێی دەگوترێ: (تەبەقە).

**الغَـبراء**: زەوی ٥ لەحەدیـسدا هـاتووە: (ماقلّت الغَبراءُ ولا أظلّـت الخـضراءُ، أصدق من لهجة أبي ذرّ).

**الغَـبِرَاءُ**: وشكەساڵەكان ٥ ئـەو سـاڵانەی بارانیان تێدا نابارێ ٥ (بنـو الغـبراء) هەژارە ئاتاجەكان.

**الغبرتــان**: دوو دەنكــە خورمــای تــازە پێگەیشتوو لە قاپێكدا.

**الغبرةُ**: تەپوتۆزاوی بوون.

**الغَبَرَةُ**: بەمانا (الغُبارُ) دێ.

**الغُـبَيْراءُ**: شەرابێـكی سەرخۆشكەر كە لەزورات دەگیرێ ٥ جۆرە ڕوەكێـكی

درەختییە لە پێـری دارە گوڵدارەکانە بۆ جوانیو بۆ مەبەستی تریش دەروێندرێ.

**غَبَسَ اللیلُ غَبساً**: شەو تاریك بوو ٥ (فهو أغبس وهي غبساءُ) ٥ (ك: غَبسٌ).

**الغَبَسُ**: تاریکایی ٥ رەنگی خاکی.

**الغُبسةُ**: تاریکایی.

**غَبَشَ فلاناً**: فێڵی لە فلانکەس کرد.

**غَبَشَ اللیلُ غَبشاً وغُبشَةً**: باقی ماندەی شەو تێکەڵ بە سپیایی بەیانی بوو.

**غَبِشَ الدّابةُ**: وڵاخەکە رەنگی خاکی بوو (فهو أغبش وهي غَبشاء).

**أغبَشَ اللیلُ**: بەمانا (غَبَشَ) دێ.

**الغَبَشُ**: باقی ماندەی شەو تاریکی کۆتایی شەو.

**الغُبشةُ**: تاریکایی کۆتای شەو ٥ رەنگی رەشی زۆر تاریك لە رەنگی ئاژەڵدا.

**غَبِصَت العَینُ غَبَصاً**: چاوی ریبۆقی کرد بەهۆی گریانی زۆرەوە ٥ (فهي غَبصاء) ٥ (ك: غُبصٌ).

**الغَبَصُ**: چڵکێکی سپییە لە قولینچکی چاودا کۆدەبێتەوە.

**غَبَطَ الحیوانُ غَبطاً**: دەستی لە ئاژەڵەکە دا بۆئەوەی بزانێ کزە یان قەڵەوە.

**غَبَطَ فلاناً**: ئاواتە خواز بوو وەکوو فلانکەسی لێ بێ ٥ ئەوەی ئەو پێی گەیشتووە لەنازو نیعمەت بۆ ئەمیش بێ، بەبێ ئەوەی ئاوات بخوازێ فلان نیعمەتەکانی نەمێنن و بۆ ئەم بێن.

**غَبِطَ فلاناً غَبطاً**: بەمانا (غَبَطَهُ) دێ.

**غُبِطَ غِبطَةً**: حاڵو وەزعی باش بوو (فهو مغبوط).

**اغبَطَ فلان الغبیطَ علی الدّابة**: بارو بارگەنەکەی بەسەر پشتی وڵاخەکەوە هێشتەوە لێی نەکردەوە.

**أغبَطَ علیه الحمی**: لەرزو تاکەی پێوە ماو لێی نەکەوتەوە.

**إغتَبَطَ**: بەنازو نیعمەت کەیف خۆش بوو.

**أغتُبِطَ**: بەمانا (إغتَبَطَ) دێ.

**الغَبطُ**: سواڵە گەنمو سواڵە جۆ (باقة) گەنمو جۆ کە درەوی دەکرێ سواڵە سواڵەو باقە باقە دەکرێ ٥ پاشان دەکرێ بە گەڵیشەو شارا.

**الغِبطَةُ**: ئەوەیە مرۆڤ حەز بکا ئەو نازو نیعمەتەی بۆ فلان هەیە بۆئەمیش دەستەبەر بێ ٥ نەك حەز بکا نازو نیعمەت بۆ ئەم بێو بۆکەسانی تر نەمێنێ.

**الغبیطُ**: ئەوەی دەخرێتە سەر پشتی وڵاخ بۆ جێ خۆشکردنی ئافرەت لەسەری وەکوو بارو بارگەنەو کەژاوە ٥ زەوی دەشتاییو پان کە

قەراخەکانی بەرز بن ٥ جۆگای ئاو کە گردۆڵکە دابڕێ‌و شەقە جۆگا دروست بکا ٥ هۆڕ یان تێرە، جەواڵێکە دولای هەن زارکیان بۆلای سەرەوەیە دەخرێتە سەر پشتی ئاژەڵ بۆئەوەی ئاوی تێ بکرێ یان شتی تر.

غَبِغَبَ فلان: فلانکەس لە کڕین‌و فرۆشتنندا خیانەتی کرد.

الغَبِغَبُ: بەمانا (الغَبَبُ) دێ ٥ کە بریتییە لە ژێر چۆڵەمە واتە: ئەو گۆشت‌و پێستەی لەژێر چەناگەوە شۆڕ دەبێتەوە ٥ هەندێ کەس تایبەتیان کردوە بەژێر چۆڵەمەی کەڵەشێرو رەشە ولاخ‌و ئادەمیزادەوە ٥ (ك: غباغِب).

غَبَقَهُ غَبقاً: شیری خواردنەوەی ئێوارەی پێشکەش کرد.

غَبَقَ الماشيةَ: ئاژەڵەکەی ئێوارە دۆشی یان ئاوی دا.

غَبَّقَهُ: بەمانا (غَبَقَهُ) دێ.

إغتَبَقَ: شیری ئێوارەی خواردەوە، ئێوارە شیری خواردەوە.

إغتَبَقَ الماشيةَ: ئاژەڵەکانی ئێوارە ئاودا یان دۆشی.

تَغَبَّقَ الماشيةَ: بەمانا (إغتَبَقَها) دێ.

الغَبقانُ: ئەوکەسەی ئێواران شیر دەخواتەوە ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (غَبقى).

الغَبوقُ: ئەو شیرو شەربەت‌و ماستاوەی ئێواران دەخورێتەوە ٥ ئەو شیرەی ئێوارە دەدۆشرێ ٥ هەندی کەس حوشترێك یان ئاژەڵێکی تر تایبەت دەکا بەخۆی‌و هەر شیری ئەو حەیوانە دەخواتەوە ٥ دەگوترێ: (هذە الناقة عبوقي) ئەو حوشترە شیرەکەی تایبەتە بەخۆمەوەو ئێواران دەیخۆمەوە.

المُغتَبَقُ: خواردنەوەی شیر لە ئێوارەدا ٥ شوێنی شیر خواردنەوەی ئێواران ٥ یان شوێنی شیر دۆشینی ئێواران.

غَبَنَهُ في البيع غَبناً: لە مامەڵەکەدا زیانی لێ دا.

غَبَنَ الثوبَ: جارێکی تر بەسەر دورمانی کراسەکەدا چۆوە ٥ کراسەکەی هەڵپێچا، هەندێکی لە درێژی نوشتانەوەو دروی بۆئەوەی کورت بێتەوە.

غَبَنَ الشَّيْءَ: شتەکەی لە شوێنی حەشارداندا شاردەوە.

غَبَنَ الرجلَ: بەلای پیاوەکەدا رۆیی‌و نەیبینی‌و هەستی پێ نەکرد.

غَبِنَ رأيه غَبَناً: ڕاو بۆچونەکەی کورتی هێناو هەڵەی تێدا بوو ٥ دەشگوترێ:

(غَبِنَ الرجلُ رأيه) پياوەكە ڕای خۆی بەهەڵە زانیو وازی لێ هێنا.
غَبِنَ الشَّيْءَ غَبناً: شتەكەی لەبیر چۆوە.
إغتَبَنَ الشَّيْءَ: شتەكەی لە حەشارگەدا حەشاردا.
تَغَابَنَ القومُ: خەڵكەكە هەریەكەیان بەشی ئەوی كەم كردەوە.
تغابَنَ لـه: دانیشتو ئیشی نەكرد تا زەرمەر مەند بوو.
التغابُنُ: (يوم التغابن) ڕۆژی پەشیمان بوونەوە كە ڕۆژی قیامەتە.
الغَبَنُ: ئەو شوێنەی شتی تێدا حەشار دەدرێ ٥ ئەو پرزو پاڵو سەرە زیادانەی لە قوماش دەبرێنو فڕێ دەدرێن.
الغَبِينَةُ: فرتو فێڵو چاو وراو ٥ دەگوترێ: (لحقته في تجارته غبينة) لە مامەڵەكەیدا توشی فێڵ لێ كردن بوو فێڵی لێ كرا.
المَغَابِنُ: بن هەنگڵ ٥ ڕەفیچك و موسوڵدان لەكانی هەڵترو شكانو ئاژەڵ دۆشیندا كە پێكەوە دەنوسێن ٥ (ك: مغابن).
غَبِيَ الشَّيْءُ عن فلان وعليه ومنه: شتەكەی لێ ون بوو ٥ نەیناسی.
غَبِيَ فلانٌ الشَّيْءَ وعنه: فلانكەس شتەكەی نەتوانیو هەستی پێ نەكرد (فهو غَبِيٌّ) ٥ (ك: أغبياء).
دەگوترێ: (لا يغبى عَلَيَّ ما فعلت) دەزانم چیت كردوە ٥ ئەوەی كردووتە لەمن نادیار نییە.
أغبَتِ السماءُ: ئاسمان ڕێژنە بارانێكی بەتەوژمو لێزمەی باراند ٥ هەڵڕژاندنی ئاوی زۆر ٥ تەپوتۆزی گڵ.
غَبَّى الشَّيْءَ: شتەكەی داپۆشی ٥ دەگوترێ: (غَبَّاهُ عن الشَّيْءِ) ٥ لە شتەكەی نەدیو كرد ٥ (غَبَّى البئرَ) سەری بیرەكەی داپۆشیو ئەمجار گڵی كردە سەر ٥ (غَبَّى الشَّعْرَ) قژەكانی كورت كردنەوە.
تغابى فلان: فلانكەس خۆی غافڵو بێ ئاگا كرد ٥ دەگوترێ: (تغابى الشَّيْءَ وتغابى عنه).
الأغبى: دەگوترێ: (غُصْنٌ أغبى) لقە دارێكی پڕ گەلایەو تێكچڕژاوە ٥ (ك: غُبْيٌ).
الغَبَاءُ: كونو كەلەبەرو پەناو پاسار ٥ تەپوتۆز ٥ ئەو گڵەی دەخرێتە سەر شت بۆئەوەی دیار نەبێ.
الغَبوةُ: غافڵیو بێ ئاگایی.
الغَبياءُ: (شجرة غبياء): درەختێكی چڕو پڕو تێكچڕژاو.
غَتَّ الطعامُ غَتّاً: خواردنەكە خراپ بوو كەڵكی نەما.

**غَتَّ الكلامُ:** قسەکە پڕو پوچ‌و بێ کەڵك دەرچوو.

**غَتَّ الميزابُ في الحوض:** پلوسکەکە زۆری ئاو لێ هاتە دەر بۆناو حەوزەکەو بەردەوام تێی ڕژا.

**غَتَّ الشاربُ الماءَ:** ئاو خۆرەکە دەمی بەئاوەکەوە نا دەمی لێ نەکردەوەو هەناسەی داو خواردیەوە.

**غَتَّ فلاناً في الماء:** فلانکەسی خستە ناو ئاوەوەو نوقمی کرد.

**غَتَّ اللهُ القومَ في العذاب:** خودا خەڵکەکەی لە عەزابدا نوقم کرد.

**غَتَّ فلان الضحكَ:** فلانکەس پێکەنینەکەی شاردەوە بە داپۆشینی دەمی بەدەستی یان بە پارچە پەڕۆیەك.

**غَتَّ فلاناً:** فلانکەسی ماندو کردو توشی ناخۆشی‌و چورتمی کرد لە حەدیسدا هاتووە: (فأخذني جبريلُ فغتني حتى بلغ مِنِيَّ الجهد).

**غَتَّني بالكلام:** بەقسەی نابەجی زیانی پێ گەیاندم دڵی هێشاندم.

**غَتَّ الدابّة بالسوط:** بەقامچی لە وڵاخەکەی دا.

**غَتَّ فلانٌ:** فلانکەس شێت بوو ٥ غەمبار بوو ٥ (فهو مَغبوت).

**غَتَّتَ الطعامَ:** خواردنەکەی خراپ کرد، لەکەڵکی خست.

**إغتَّتَ الطعامَ:** بەمانا (غتّه) دێ.

**غَتَمَ الحرُّ غَتماً:** گەرما بەهێز بوو خەریك بوو هەناسە لە زیندوان ببڕێ.

**غَتِمَ غَتَماً وغُتمَةً:** بەهۆی زاڵبوونی لایەنی عوجمەیی نەیتوانی بەزمانی عەرەبی مەبەستەکانی دەربڕێ ٥ (فهو أغتم وهي غَتماء) ٥ (ك: غُتمٌ).

**أغتَمَ فلان الزيارةَ:** فلانکەس زۆر چووە دیدەنی‌و خێزانە خانەخوێیەکەی وەڕز کرد.

**إغتَتَمَ الرجلُ:** پیاوەکە زۆری خواردو تووشی نینتەلا بوو ٥ (المُغتومُ) ئەو کەسەی بەگەرما جەستەی سوتابێ.

**غَثَّ الجرحُ غَثّاً:** برینەکە کێم‌و زوخاو و گۆشتەمردەی تێکەوت.

**غَثَّ اللحمُ و الشَّيْئُ غَثاثةً وغثوثةً:** گۆشتەکە کەڵکی نەماو لەکەڵك کەوت ٥ شتەکە خراپ بوو بۆگەنی کرد.

**غَثَّتِ الشاةُ:** مەڕەکە لاواز بوو گۆشتی پێوە نەما.

**غَثَّ حديثُ القومِ:** قسەی خەڵکەکە هیچ‌و پووچ‌و بێ کەڵك بوون.

**غَثَّ الرجلُ في المنطق:** پیاوەکە لە قسەکردندا سەرکەوتوو نەبوو قسەی پڕو پوچی کردن‌و هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.

**أغَثَّ:** بەمانا (غَثَّ) دێ.

**أغَثَّ الرجلُ اللحمَ**: گۆشتی بێ کەڵك و خراپی کڕی ٥ کە کڕی زانی بەکەڵك نایە.

**غَثَّ**: وردە وردە قەڵەو بوو ٥ دەگوترێ: (غَثَّ بعيري ثم غَثَّ) وشترەکەم لاواز بوو پاشان وردە وردە قەڵەو بوو.

**إستَغثَّ الجرحُ**: برینەکە کێم و زوخاوی لێ هاتە دەرو گۆشتەمردەی کەوتە ناو ٥ کێم و زوخاو و گۆشتەمردەکەی لێ دەرهێناو پاکی کردەوە ئەمجار دەرمانی کرد.

**الغَثُّ**: کزو لاواز پێچەوانەی قەڵەوی ٥ دەگوترێ: (هو لا يعرف الغثّ من السمين) ٥ فەرقی کزو قەڵەو ناکا ٥ شتی خراپ و بێ کەڵك لەهەر شتێك بێ.

**الغُثَّةُ**: شتی کەم لە پاوان و لەوەڕگا ٥ لەوەڕی کەم و کورِ ٥ ژیانی کولەمەرگی، ژیانی زبر ٥ مەڕی کزو لاواز.

**الغثيثُ**: شتی بێ کەڵك و بێ خێر ٥ کێم و زوخاو و گۆشتە مردەی ناو برین.

**الغثيثةُ**: بەمانا (الغثيثُ) دێ ٥ شێوانی عەقڵ و ئاوەز تێکچوونی عەقڵ.

**غَثَرَ المكانُ بالنباتِ**: شوێنەکە گیای زۆری لێ ڕوا.

**غَثِرَ الطائرُ والثوبُ غُثرَةً**: باڵندەکە شێوەی ڕەنگی خاکی بوو.

**غَثِرَ الرجلُ**: پیاوەکە ئەحمەق و گێل بوو (فهو أغثر وهي غثراء).

**أغثَرَ الشجرُ**: درەختەکە بنێشتی لێ ڕۆیی جەوی دەردا.

**اغثار الثوبُ**: قوماشەکە پرزو تووکی زۆر هەڵدا.

**تَمَغثَرَ**: بنێشتەکەی کۆکردەوە ٥ جەوییەکەی کۆکردەوە.

**الأغثَرُ**: ئەوەی خوری و بەرگی زۆر بێ ٥ مووکوڵکی زۆر بێ ٥ قەوزە ٥ (ك: غُثرٌ).

**الغثَرُ**: ئەو پرزو توکەی لە قوماش هەڵدەدا.

**الغثراءُ**: کۆمەڵێك دەنگ و هەراو هۆریای ئادەمیزاد.

**الغثَرَةُ**: هەرزانی و فەرەحی ٥ دەگوترێ: (هم في غَثرة من العيش).

**الغثَرَةُ**: کۆمەڵی تێکەڵ و پێکەڵی ئادەمیزادو هەراو هۆریایان ٥ زۆریی شتومەك و پێداویستی ژیان ٥ دەگوترێ: (عليه غَثَرَةٌ من مال).

**الغَيثَرَةُ**: بەمانا (الغَثَرَةُ) دێ ٥ تێکڕژانی خەڵك لە گۆڕەپانی جەنگدا.

**المِغثارُ**: شتێکە وەکوو بنێشت و جەوی

لە بڕێ درەخت دێتە دەر شیرینە وەکوو هەنگوین بۆنێکی ناخۆشی هەیە.

المِغثَرُ: بەمانا (المِغثارُ)دێ.

المَغثورُ: بەمانا (المِغثارُ)دێ.

غَثغَثَ القومُ: خەڵکەکە وردە شەڕێکیان کرد بەبێ چەك و تەقەمەنی.

غَثغَثَ فلان بالمكان: فلانکەس لەو شوێنە مایەوە.

غَثغَثَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەنوو شێلای دەستی پێدا هێنا.

غَثَمَ له من المال غَثماً: پارچەیەکی باشی لەماڵ پێدا.

غَثَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

غَثِمَ الرجلُ غَثَماً وغُثمة: پیاوەکە سپیایی مووەکانی بەسەر ڕەشەکانیدا غاڵب بوون، مووی سپی لە مووی ڕەشی زیاتر بوون ٥ (فهو أغثمُ وهي غَثماءُ) ٥ (ك: غثمٌ).

الغَثمَةُ: جارێك، جەڵێك، دەمێك ٥ غَثَمَ له من المال غَثمةً: جارێك وەجبەیەکی ماڵی باشی دایە.

غَثمَرَ مالَهُ: ماڵەکەی خراپ کرد تێکسپایەری کرد.

غَثمَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی تێکەڵ کرد.

المُغثمِرُ: کەسێك مافی کەسانی دی ژێر پێ بخاو حەقیان بخوا.

المُغثَمَرُ: قوماشی خراپ و شاش و پاش و زبر و رایەڵ ئەستور ٥ خواردنێك لە بێژنك نەدرابێ و نەپاڵێورابێ و پاك نەکرابێ.

غَثا الوادي غَثواً وغُثُوّاً: شیو و دۆڵەکە زۆر پوش و پەلاش و چیلکە و چەوێلی تێدا کۆبوەوە.

غَثا السیلُ: لافاوەکە زۆر پوش و پەلاش و چیلکە و شتی وای لەسەرخۆ هەڵگرتبوو.

غَثا نفسه غَثیاً وغثیاناً: دڵی تێکەڵ هات و هێڵنجی هاتنی و خەریکبوو بڕشێتەوە.

غَثَت السماءُ: ئاسمان هەوربوو.

غثا الکلامَ: قسەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کرد.

غَثَیَت النفسُ غثیً وغثیاناً: دڵی تێکەڵ هات و خەریك بوو بڕشێتەوە.

غَثَت الأرضُ بالنبات: زەویەکە پڕ بوو لەگژوگیا.

غَثِيَ الکلامَ غَثیاً: قسەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردن.

الغُثاءُ: ئەو چیلکە و خشت و خاڵ و پل و پوشەی لافاو لەگەڵ خۆی دەیهێنێ ٥ کەف و سەر ڕێژی مەنجەڵی کوڵهاتوو ٥ (غثاء الناس) خوێڕی و هەتیومچەی کۆمەڵی ئادەمی.

**الغَجَـرُ**: خـەڕات کۆمەڵـە خەڵکێـکی پاشکەوتوون بەناو هەموو جیهانـدا بڵاوبوونەوەو پابەندی دابونەریتی خۆیـانن‌و لەڕێـگەی بازرگـانی‌و پیشەسازی‌یەوە ژیانی خۆیان دابین دەکەن.

**غَـدَّ الـبعيرُ غَـدّاً**: حوشـترەکە غـودەی لێ پەیدا بوو.

**غُـدَّ الـبعيرُ**: حوشـترەکە غودەی لێ پەیـدا بوو.

**اغدَّتِ الإبلُ**: حوشـترەکە دەردە غـودەی توش بوو.

**اغَـدَّ القـومُ**: خەڵـکەکە حوشـترەکانیان توشـی غـودە بـوون ٥ دەشـگوترێ: (أغَـدَّ علیـه) ڕقـی هەڵـساو دەمـاری هاوسان‌و فش بوون.

**الغَدَدُ**: پەتای حوشتر.

**الغُدَّةُ**: بەمانا (الغَدَدُ) دێ ٥ ئەنـدامێـکی هـەڵتۆقیوەو لەچـەنـد خانەیـەکی پێستی پێـکهاتووە ٥ وادەبێ قـەناتی هەیە وادەبێ بێ قەناتە.

**الغُـدَّةُ الجرابیـة**: ناوێـکی کۆنـە بۆهـەر کیـسە غودەیـەك کـە لەجەسـتەدا پەیدا دەبێ.

**الغـدة الغرائیـة**: جـۆرە غودەیەکـە لـە کۆئەنــدامی زاووزێــی مێینــەی حەشــەراتدایە مادەیـەکی لیــنج دەردەدا بۆ لکاندنی هێلکە بەهەندێ هێلکەی ترەوە.

**الغُــدَدَةُ**: هــەر گرێــی‌و لوێــکە لــە جەستەداو بەز دەورەی دابێ.

**غَدَرَ الرجلُ غَـدراً وغَـدَراناً**: ئـاوی زلکاوی خواردەوە.

**غَدَرَ فلاناً وبه غَـدراً وغَـدَراناً**: ستەمی لـە فــلان کــردو وادەی بــەڵێنی خــۆی هەڵوەشاندەوە ٥ وەفای بەبەڵێنی خۆی نەکرد.

**یا غُدَرُ**: ئەی ستەمکار ٥ (یـا آلَ غُـدَرِ) ئەی ستەمکارینە!.

**غَدَرَت المرأة وَلَدَها**: ئافرەتەکە ستەمی لە منداڵەکەی کـردو بـژێوی ڕێـك‌و پێـکی نەدایە.

**غَدِرَ الرجلُ غَدَراً**: پیاوەکە لەئاوی زەلکاوی خواردەوە.

**غَدِرَ المکانُ**: شوێنەکە بـەردەڵان‌و دڕزاوی بـوو؛ قـوڕە لیتــەی وەشــکەوەبووی قەڵشت قەڵشت بوو.

**غَدِرَ عن أصحابه**: لە هاوەڵەکانی دواکەوت ٥ (فهو أغدر وهي غدراء).

**غَـدِرَ فـلان**: فلانکـەس براکـانی مـردن‌و بۆخۆی زیندوو.

**أغــدَرَهُ**: خــستیە نــاو زلکــاوەوە ٥ هێشتیەوە، دەگوترێ: (أعـاني فـلان فاغـدر لـه ذلـك في قلبـي مـودة) ٥

وشەی (أغدَرَ) لە ڕستەکەدا بەمانا هێشتنەوەیە.

**أغـدَرَ الـشَّيْئَ:** دوای خـۆی خـست، هێشتیەوە ٥ تێپەڕی ٥ دەگوترێ: (اغدَرَ المائةَ) لەسەد تێپەڕی ٥ (فهو مُغدِرٌ).

**غـادَرَهُ مُغـادرةً:** وازی لێ هێنا ٥ هێشتیەوە.

**إغتَدَرَ:** پرچی هۆنیەوە ٥ زولفی خۆی هەڵوێزنی.

**تَغـدَّرَ:** دواکەوت ٥ ڕوبەڕوی خەڵکی بۆوە لەمەیدانی شەڕدا.

**إغْتَدَرَ المكانُ:** شوێنەکە زلکاوی تێدا مان ٥ پاش ڕابوونی لافاو چەند زلکاوی تێدا پەیدا بوون.

**الغادِرَةُ:** دەگوترێ: (به غادرة من مرض) پاشماوەی نەخۆشی تێدا ماوە.

**غَـدَارِ:** واتە: هۆی ستەمکار صیغەی (فَعَالِ)یە.

**الغدَارَةُ:** پاشماوەی شت.

**الغَـدَّارَةُ:** تفەنگێکە بۆ فیشەك هاویشتن یان دەمانچەیەکە.

**الغَدَرُ:** هەرشوێنێك زەویەکەی توندو بەردەڵان بێ، زەویەکەی قەڵشت قەڵشت بێ بەجۆرێك ولاغ نەتوانێ پێیدا بڕوا ٥ قوڕە لیتەکە وشك بوبێتەوەو قەڵشت قەڵشت بووبێ ٥ (ك: أغـدار) ٥ دەشگوترێ: (رجل ثبت الغَدَرَ) پیاوێکی بەدەمو پڵو بەڵگە بەهێزە لەکاتی دەم تێك ژنین و کێشەو نیزاعدا.

**الغُدرَةُ:** بەمانا (الغَدارةُ) دێ.

**الغُـدَرَةُ:** کەسێك زۆر ستەم لەخەڵك بکا.

**الغَدَرَةُ:** تاکی (الغَدَرَ)ە ٥ پاشماوەی شت.

**الغَديرُ:** ئەو گۆماو و زلکاوانەن لەدوا لافاو دەمێننەوە ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوباری بچوك.

**الغَـديرَةُ:** پارچە ڕوەك، کۆمەڵە گیا ٥ (ك: غـدران) ٥ پرچی هۆنـدراوە ٥ لاجانگی هەڵوێزنراو، (ك: غدائر).

**غَدَفَ له في العطاء غَـدَفاً:** بەخشینەکەی زۆر کرد.

**أغـدَفَ الليـلُ:** شـەو پـەردەی خـۆی دادایەوە.

**أغدَفَت البحرُ:** دەریا شەپۆلەکانی لێڵ بوون.

**أغدَفَ الخاتِنُ:** کێر بڕەکە پێستی سەری هینەکەی لێ کردەوە.

**اغـدَفَت المـرأة قناعهـا:** ئافرەتەکە سەرپۆشەکەی هێنایە سەر دەموچاوی دەموچاوی خۆی داپۆشی.

**أغـدَفَ الـصيّاد الـشبكة على الـصيد:** نێچیرەوانەکە داو و تۆڕەکەی بەسەر نێچیرەکەدا دادایەوە.

**غادفَ القومُ مغادفةً وغِدافاً:** خەڵکەکە لە ژیانی خۆش گوزەرانیدان.

**إغتَدَفَ منه:** شتێکی زۆری لێ وەرگرت.

**إغتَدَفَ الثوبَ:** قوماشەکەی بڕی ٥ پارچە پارچەی کرد.

**إغدَودَفَ الليلُ:** شەو هات و پەردەی خۆی دادایەوە.

**الغُدافُ:** قەلەڕەشەی گەورەو باڵدرێژ ٥ موی درێژو پڕ ٥ (ك: غدفان).

**الغُدافِيُّ:** هەرشتێك ڕەنگی ڕەش بێ ٥ نیسبەتدراو بۆلای قەلەڕەشە ٥ دەشگوترێ: (ليلة غدافِيّة الأهاب) شەوێکی تاریك تونەکە.

**الغَدَفُ:** نازو نیعمەت و گوزەران فراوانی ٥ دەگوترێ: (هم في غَدَف من العيش) ئەوان لە ژیان و گوزەرانی خۆش دان.

**الغُدفَةُ:** شتێکە وەکوو چارۆکە ئافرەتی عەرەب بەخۆیانی دا دەدەن پێشی دەگوترێ: (غطفة).

**الغِدقَةُ:** تۆێکڵی فول و لۆبیاو ئەو جۆرە شتانە.

**الغَدَقَةُ:** بەمانا (الغِدقة) دێ.

**غَدَقَت الأرضُ غَدقاً:** زەویەکە ئاوی ڕۆچووی زۆر تێدا بوو، تەڕبوو.

**غَدِقَت الأرضُ غَدَقاً:** زەویەکە ئاوی زۆری تێدا بوو.

**غَدِقَ المَطَرُ:** بارانەکە پڕو لەنگێزە بوو.

**غَدِقَ العينُ:** چاوەکە فرمێسکی زۆر بوو زۆری ئاو لێ هەڵڕژا.

**غَدِقَت الأرضُ:** زەویەکە بەپیت و بەرەکەت بوو.

**إغدَودَقَ:** بەمانا (اغدق) دێ ٥ دەگوترێ: (إغدَودَق المطرُ) (وإغدَودَقت العينُ).

**غَيدَقَ:** بەمانا (إغدَودَقَ)دێ.

**الغَدَقُ:** ئاوی ڕۆچوی زۆر، ئاوێك زەوی داپۆشیبی و نەگونجی زەویەکەی بەکاربێنی بۆ کشت وکاڵ و ئاوەدانی.

**غَيدَقَ الرجلُ:** پیاوەکە لیکی زۆر بوو.

**الغَيداقُ من الغلمان:** کوڕی تازە پێگەیشتوی نەرم ونۆڵ ٥ پیاوی سەخی و نانبدە ٥ ئەسپی ڕەسەنی هەنگاو درێژ ٥ ژیانی خۆش و ئاسودە.

**الغَيدَقُ:** بەمانا (الغَيداقُ) دێ.

**غَدِنَ غَدناً:** شل ونەرم بوو.

**تَغَدَّنَ الغُصنُ:** لقەدارەکە ڕاژاو چۆمایەوە.

**إغدَودَنَ الشَّيءُ:** شتەکە درێژ بوو لێك هاڵا ٥ دەگوترێ: (إغدودن الشَّعرُ) زولف درێژ بوو لێك هاڵا.

**إغدودَنَ الشجرُ:** درەختەکە نەرم بوو چۆمایەوە.

إغـدودن النبـتُ: ڕوەكەكە سەوز بوو تاوای لێ هات ڕەش بنوێنێ بەهۆی تێر ئاویەوە ٥ (فهو مُغدَوْدِن).

الغُدانيُّ: گەنجی نەرمونۆڵ.

الغَدَنُ: نووستنو وەنەوز.

الغُدُنّـةُ: پارچە گۆشتێـكی ئەستووره لەلا شەویلەدا.

الغَدَودَنُ: گەنجی نەرمو نۆڵ.

المُغدَوْدِن: بەمانا (الغَـدَوْدِن) دێ ٥ قژی زۆر ڕەشی نەرم.

غَدا غُدُوّاً: بەیانی ڕۆیشت.

غَـدِيَ غـداً وغـداءً: نـانی بـەیانی یـان نیـوەڕۆی خـوارد (فهـو غَـديانٌ وهـي غَديانةٌ وغديا).

غاداهُ: زوو دەستی پێ كرد ٥ دەگوترێ: (غاديتـه مـع صـياح الـديك) بـەره بەیانو كەڵەباب خوێنـدنان دەستم پێ كرد.

غدّاهُ: نانی ئێوارەی پێشكەش كرد.

إغتَـدَى عليـه: زوو پـەلاماری دا، زوو دەستی پێ كرد.

تَغـدّى: نـانی بـەیانی یـان نیـوەڕۆی خوارد ٥ دەگوترێ: (أدنُ فَتَغَدَّ) نزیك بەوە نانی بەیانی بخۆ.

الغاديـةُ: هـەور بـەیانی پێـك بـێو كۆبێتـەوەو باران ببارێنێ ٥ بـارانی سەرلەبەیانی.

الغَـداءُ: خـواردنی بـەیانی، قـاوەڵتی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿آتِنا غَدَاءنا﴾ ٥ نانخواردنی نیوەڕۆ ٥ (ك: أغدية).

الغَدَاةُ: كاتی نێوان كازیوەی بەیانیو خۆر هەڵهاتن ٥ (ك: غَدَوات).

الغُدوَةُ: بـەمانا (الغَداة) دێ ٥ (ك: غَـداً وغُدُوّ)

المَغـدى: شـوێنی نـانخواردنی بـەیانی ٥ دەگوترێ: (ما ترك من أبيه مَغدىً ولا مراحاً) هیچی لە بابی ناچێ.

المَغْداةُ: بەمانا (المَغدى) دێ.

غَـذَّ الجُـرحُ غَـذّاً: كـێمو زوخـاوی نـاو برینەكە هاتە دەر.

غَذَّ العِرقُ: ڕەگەكە چی خوێنی تێدا بوو هاتە دەرو نەبڕا.

غَذَّ الشَّيْءَ غَذّاً: شتەكەی كەم كردەوە.

أغذَّ الجرحُ والعِرقُ: بەمانا (غَذَّ)دێ.

أغذَّ السّيرَ: بـە خێرایی ڕۆیی پەلەی كرد لە ڕۆیشتندا.

الغـاذُّ: ڕەگێـكە لەچاودا ئـاوی لێ دێو نابڕێ.

الغَـاذَّةُ: پیـستێـكی تەنكـە لەسـەری منداڵدا دێو دەچێ، كەڕەق بوو بوو بەئێـسقان دەبێتـە ئێـسقانی پێـشه سەر.

الغَذيذَةُ: ئەو كێمو زوخاوەیە كەلەناو برینـدایە.

إغتَـذَرَ: پـەڵو بەشیری دروست کـرد، حەڵوای شیری کرد.

الغَــذیرَةُ: ئـارد شـیری تـێ دەکـرێو دەکوڵێندرێ، گەرم دەکرێ بـە ئـاگر یان تیشکی خۆر.

غَذرَمَ الکلامُ: قسەکەی تێکەڵو پێکەڵ کرد.

غَــذرَمَ الــشَّیْئَ: شـتەکەی بـەگۆترە فرۆشت.

تَغَذرَمَ الرجـلُ یمینـاً: پیاوەکە سوێندی خوارد.

تَغَذرَمَ الشَّیْئَ: شتەکەی خوارد.

الغُـذارِمُ: ئـاوی زۆر ٥ پێوانـەی گـۆترە کاری.

المُغَـذرِمُ مـن النبـتِ: ڕووەکـی تێـکەڵو پێکەڵی خراپ.

غَذَمَــهُ غَــذماً: بـەخێرایی‌و حـەزەوە خواردی‌و هەڵی لوشی.

غَذَمَ الفـصیلُ: بێـچووەکە هەموو شـیری ناو گوانی دایکی خوارد.

أغذَمَ الفصیلُ ما في ضرع أمـه: بـەمانا (غَذَمَهُ) دێ.

إغتَذَمَ الفصیلُ ما في ضرع أمه: بـەمانا (غَذَمَهُ) دێ.

إغتَذَمَ فلان الشَّیْئَ: شتەکەی بەحـەزو ئارەزووەوە خـوارد ٥ دەگـوترێ: (هـو یتغذم کل الشَّیْئ) ٥ ئەگەر زۆر خـۆر بێ.

الغُذامَـةُ: زۆر خـۆر کەهـەموو شتێـك بخوا.

الغُذمَـةُ: شـیری زۆر ٥ جەڵەبـە مـەڕو بـزن ٥ ڕەنگــی لــێڵو خــاکی ٥ دەشـگوترێ: (أصــابوا مــن معروفـه غُذَماً) بـێ برانـەوە پیاوەتی ئـەویان پـێ گـەیی هـەر ڕۆژە شتێـکی بـۆ نـاردن‌و جۆرە پیاوەتییـەکی لەگـەڵ کردن.

الغُذَمَـةُ: (بئـر غُذَمَـة) بیرێـکی ئـاوداری ئاوی زۆرە.

الغَذَمَةُ: شیری زۆر ٥ جەڵەبە ئـاژەڵ ٥ (ك: غُذَمٌ).

غَـذمَرَ: ڕقـی هەڵـساو هـاواری کـرد ٥ بـەبێ لێ وردبوونـەوە دەسـتی بـە کارەکە کـردو چووە ژێـر ئـەو بارە قورســەوە ٥ بــە ویــستی خــۆی فــەرمانڕەوایی گەلەکــەی کــردو فـەرمانی ڕەت نەکرایـەوەو کـەس لێی یاخی نەبوو.

غَــذمَرَ الــشَّیْئَ: شــتەکەی تێــکەڵ بەشتێـکی تـر کـرد ٥ شـتەکەی بـە گــۆترە فرۆشــت بــەبێ پێــوان‌و کێشان‌و پێوانە شتەکەی فرۆشت.

تَغَذمَرَ: هاواری کردو بە ڕق هەڵسان‌و نەڕە نەڕو قـسەی تێـکەڵو پێـکەڵ هەڵس‌و کەوتی کرد.

الغَذامِرُ: ئاوی زۆر.

**غَذا الماءُ والعرقُ غَذواً**: ئاوەکە یان ئارەق ڕەوان بوو.
**غَذا العِرقُ**: ڕەگەکە خوێنی لێ دەرچوو.
**غَذا الجرحُ**: برینەکە بەردەوام خوێنی لێ هات.
**غَذا الجملُ بولَهُ وبِبولِهِ**: حوشترەکە میزەکەی پچڕ پچڕ کرد.
**غَذا الرجل والحیوان غَذواً وغَذواناً**: پیاوەکە یان ئاژەڵەکە پەلەی کرد.
**غَذا الطعامُ المولودَ غِذاءً**: خواردنەکە بۆ منداڵەکە سودبەخش بوو، پێی کەوتو بەشی کرد ٥ دەگوترێ: (غَذا الصَّبيَّ باللبن) منداڵەکە شیر بوو بە بژێوی، بەشیر بەخێوی کرد.
**غَذا فلاناً الطعامَ**: خواردەمەنی دا بەفلان.
**غذّى العِرقُ**: ڕەگەکە خوێنی لێ هات.
**غَذى الجملُ ببولِه**: حوشترەکە میزی پچڕپچڕ کرد.
**غَذّى المولودَ**: منداڵەکەی بەخێوکرد.
**إغتَذى**: بژێوی خوارد.
**تَغذّى**: بژێوی خوارد.
**الغاذي**: دەگوترێ: (فلان غاذي مال) فلانکەس زۆر بەشەماڵو سامانی خۆی دەخاتە گەڕو سەرو کاری دەکا.
**ألغِذاء**: بژێوی ٥ خواردنو خواردنەوە کە جەستە پێی گەشە دەکاو خۆڕادەگرێ ٥ (ك: أغذِية).
**الغَذوِيّ**: شیرە خۆرەیەك شیری دایکی خۆی نەخواو بەشیری ئافرەتێکی تر پەروەردە بکرێ.
**غَرَبت الشمسُ غروباً**: خۆر لەکەناری ئاسمان لای خۆرئاوا ئاوابوو دیارنەما.
**غَرَبَ فلان**: فلانکەس دیار نەما.
**غَرَبَ القومُ**: خەڵکەکە ڕۆیشتن.
**غَرَبَ عنه**: لێی دورکەوتەوە ٥ دەگوترێ: (أغرُب عنّي) لێم دوور بکەوە.
**غَرَبَ فلان غَرباً**: فلانکەس لە وڵات دوورکەوتەوە.
**غَرِبَ الشَّيْءُ غَرَباً**: شتەکە ڕەش هەڵگەڕا.
**غَرِبَت العينُ**: پێڵوی چاو ئەستور بوو هاوسا.
**غَرِبَت الشاةُ والفرسُ**: مەڕەکەو ئەسپەکە توشی نەخۆشی ئاو لەچاو هاتنو برژانگ ڕوتانەوە بوون.
**غَرُبَ عن وطنه غرابة وغربةً**: لە وڵات دورکەوتەوە.
**غَرُبَ الكلامُ غرابةً**: قسەکە جەواشەو مانا نادیار بوو (فهو غریب) (ك: غرباء) و (هي غریبة) ٥ (ك: غرائب).
**أغرَبَ**: چووە خۆرئاوا ٥ بوو بە غەریبو بێگانە لە وڵات ٥ سەفەری کرد ٥ شتی غەریبو ئاوازەی هێنا.

**أغـرب في كلامـه:** قـسەی وای کـردن تێگەیشتن لێیان زەحمەت بوو.

**أغــرب في الأرض:** ســەفەری کــردو لــەوڵات دوورکەوتــەوە ســەفەری وڵاتی دووری کرد.

**أغرب في الـضحك:** زێـدەڕەوی کـرد لـە پێکەنیندا.

**أغـرب الرجـل الأسمـر:** پیـاوە گـەنم ڕەنگەکە منداڵی سپی پێستی بوو.

**أغــرب فــلان:** فلاّنکـەس سـامانی زۆر بــوو، ومزعو حــاڵی خــۆش بــوو ◦ دەشکوترێ: (أغرب المالُ) و (أغـرب الحالُ).

**أغرَبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دوورخستەوە.

**غَــرَّبَ القــومُ:** خەڵــکەکە (قەومەکـە) چونە لای خۆرئاوا.

**غَرَّبـت المـرأة الـسمراء:** ئافرەتـە گـەنم ڕەنگەکە منداڵی سپی پێستی بوو.

**غَرَّب فلاناً:** فلاّنکەسی دوورخستەوە.

**غَرَّبَ الـدهرُ فلانـاً:** ڕۆژگار فلاّنکەسی دوورخستەوە.

**إغتَــرَبَ:** لـە وڵات دەرچـوو بـوو بـە غــەریبو پەناهەنــدە ◦ چوســتو چالاك بوو.

**إغتَرَبَ فلان:** فلاّنکەس ژنی لە خزمـی خـــۆی نـــەهێنا، لـــە بێـــگانە هاوسەرگیری کرد.

**تَغَرَّبَ:** لە وڵات دوور کەوتەوە.

**إستَغرَبَ الرجلُ في الـضحك:** پیاوەکـە زێــدەڕۆیی کــرد لــە پێــکەنیندا ◦ دەشکوترێ: (إستَغرَبَ عليه الضحكُ) زۆر پێــکەنی پێــکەنینی، قاقــای هات.

**إسـتَغربَ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی بـەنامۆو ناوازە هاتە بەرچاو.

**الغـارِبُ:** ناوشـان ◦ نێـوان دووگـو ملـی حوشــتر ◦ ئـەو شـوێنەی هەوسـاری حوشــتری دەخرێتــە ســەر کــاتی بــەرەڵلای نــاو لــەوەڕگا دەکــرێ بۆئەوەی بەئارەزوی خـۆی بلـەوەڕێ ◦ بەئادەمیزادیش دەگوترێ: (حبلك علی غاربك) تەواوی ئازادیت هەیـە بۆ کوێ دەچیت بچۆ ◦ ئەم ڕستەیە بۆ کینایە لە تەڵاق بەکاردەهێنرێ ◦ هــەروا نــاوە بــۆ تۆپــەڵاکی هــەموو شتێــك ◦ (ك: غــوارب) ◦ (غــوارب الماء:) سەر شەپۆلی ئاو.

**الغريــان:** پێـشەوەی دووگـی حوشــترو دواوەوەی.

**الغُرَابُ:** قەلەڕەشە ◦ جۆرە باڵندەیەکە لــە پێــری (الجــوارح) بــەزۆر جــۆری باڵنـــدە دەگـــوترێ: (قەلەڕەشـــە، قەلەباچـکە، واشـە، قەلەباڵدرێـژ) ◦ عـەرەب ئـەم باڵندەیـە بـە نیشانەی

شووم‌و نه‌گبه‌تی دادەنێن ◦ هەرکاتێ قەلەڕەشە فڕاندبیەتی‌و کابرای عەرەب خەریکی سەفەرکردن بووبێ سەفەرەکەی هەڵوەشاندۆتەوە، لەوە ترساون لەو سەفەرەدا تووشی بەڵاو ناخۆشی ببن ◦ بۆیە پێیان گوتووە: (غراب البين) قەلەڕەشەیەك كە بۆتە بەربەست لەنێوان خۆیان‌و مرازەکانیان ◦ قەلەڕەشە کراوەتە نمونە بۆ زۆر ڕۆیشتن ◦ دەگوترێ: (بكر بكور الغراب) وەکوو قەلەڕەشە هەرزوو بەیانی ڕابوو لەخەو هەڵسا ◦ (فلان أحذر من الغراب) فلانکەس لە قەلەڕەشە ورياو خۆپارێزترە ◦ (طار غرابه) قژی ڕەشی سپی بوو پیر بوو تەمەنی گەنجی بەسەر چوو ◦ هەروا وشەی (غراب) بەمانا سەرەتای هەموو شتێك یان تیژایی هەموو شتێك دێ ◦ دەگوترێ: (غراب الفأس وغراب السيف) تیژایی پاچ‌و شمشێر.

**الغَربُ**: خۆرئاوا ◦ لای خۆر ئاوابوون ◦ ئەو ولاتانەی کەوتونەتە بەشی خۆرئاوا، پێچەوانەی خۆرهەڵات ◦ سەرەتای هەموو شتێك‌و تیژایی شت ◦ دەگوترێ: (غَربُ السيف والسكين والفأس) ◦ چوست‌و چالاکی لەکاروباردا ◦ توندوتیژی ◦ دەگوترێ: (في لسانه غَرب) (و أخاف عليه غرب الشباب) (وسيف غَربٌ) ◦ هەر وشەی (ألغَربُ) ناوە بۆ دۆڵچەی گەورە کەلە پێستی گا دروست کرابێ ◦ هەروا ناوە بۆ فرمێسك ◦ ڕێڕەوی فرمێسك ◦ قولینچکی چاو ◦ دواوەی چاو پێشەوەی چاو ◦ زۆری هەبوونی تف لەدەمدا ◦ هەروا دەگوترێ: (أصابه سهم غَرب) تیرێکی وێڵی بەرکەوت نەزاندرا کێ هاویشتویەتی ◦ (ك: غُرُوب).

**الغَرَبُ**: زێڕ ◦ زیو ◦ پەرداخ‌و پیالە ◦ شەراب ◦ ئاوی چۆڕاوە لە کوندەو دێمكە ◦ جۆرە درەختێکە تیری لێ دروست دەکرێ ◦ لە ولاتی شامدا بەجۆرە درەختێك دەگوترێ کە لە پێری (الصفصافية)یەو لەقەراخ جۆگاناو دەڕوێندرێ بەمەبەستی سوود وەرگرتن لەدارەکەی ◦ لە ولاتی میصر جۆرێکە لە (الصفصاف) پێی دەگوترێ (شعر البنت) یان (أم الشعور) ◦ دەردێکە توشی مەڕو بزن دەبێ کە دەبێتە هۆی هەڵوەرینی موی لمبۆزی‌و

برژانگی چاوی ◦ دەگوترێ: (بعينيه غَـرب) چاوی هەمیشە ئاودەکاو ئاویان لێ نابڕێ.

**الغَرِبَـةُ**: دووری‌و غـەریبی ◦ سـپی خالیص.

**الغربيُّ**: هەر درەختێک تیشکی خۆر لـەکاتی ئاوابوونـدا لێـی بـدا ◦ هەرشتێک پاڵ خۆرئاوا بدرێ.

**الغريـبُ**: بێـگانە ◦ پیاوێـک لـەهۆزو خێڵەکە نەبێ‌و خۆی لەگەڵ ئـەوان حیساب بکا.

**المَغرِبُ**: شوێنی ئاوابوونی خۆر ◦ کاتی خۆرئاوابوون ◦ لای ئـاوابوونی خۆر ◦ وڵاتی مـەغریب ◦ ئـەو وڵاتانـەی دەکەونـە بـاکوری ئـەفریقیاو خۆرئـاوای میـصر کـە بریتییـە لـە وڵاتـی (لیبیـاو تـونس‌و جـەزائیرو مەراکیش وڵاتی مەغریبی ئەمرۆ).

**المُغـرِبُ**: هەرشتێـک داتپۆشـێ‌و بتـشارێتەوە (عَنقـاءُ مُغـرِب) باڵندەیـەکی گەورەیـە زۆر دوور دەڕوا ◦ باڵندەیـەکی ئەفـسانەییەو بوونی نییەو ناوی هەیە.

**المُغـرِّبُ**: دوور ◦ دەگـوترێ: (هـل مـن مُغرِّبـة خـبر) ئایـا هەواڵێـکی تـازە هاتوو لەوڵاتێکی دوورەوە هەیە؟.

**الغِربيـبُ**: جـۆرە ترێیەکـە ◦ پەرێـک مـووە سـپیەکانی بەخەنـە رەش بکاتـەوە ◦ شتێـک زۆر رەش بـێ ◦ بـەزۆری وشـەی (غِربيـب) دەکرێتـە ئاوەڵناو دەگـوترێ: (أسـود غِربيـب) (ك: غرابيب) ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَمِـنَ الْجِبَـالِ جُـدَدٌ بِـيضٌ وَحُمْـرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾.

**غَربَلَ فلان في الأرض**: فلانکەس بـەناو زەویدا ڕۆیی.

**غَربَلَ الحبَّ**: دانەوێڵەکەی لە بێژنگ دا.

**غَربَلَ القـومَ**: خەڵـکەکەی کوشت‌و بـڕ کرد.

**غَربَـلَ البلـدَ والنـاسَ**: کەشـفی حـاڵ‌و وەزعی خەڵکەکەی کرد.

**الغِربـالُ**: بێـژنگ؛ ئامێرێـکە بـۆ جیاکردنەوەی سەرکۆزرو پڵ‌و پوش لەدانەوێڵەکـە ◦ پیـاوی فیتنـەو دووزمـان ◦ (ك: غرابیـل) (العَظـم الغِربـالي) ئێـسقانێکە لەتـەختی جومجومەدایـەو دەکەوێتـە نێـوان لوت‌و مێشك.

**المُغربَلُ**: پیاوی هەڵبژاردە.

**المُغربِـلُ**: کەسێـک پیـشەی بێـژنگ دروستکردن بێ.

**غَـرِثَ غَرَثـاً**: برسـی بـوو (فهـو غرثـان) ◦ دەشـگوترێ: (إمـرأة غرثـى الوشـاح) ئافرەتێکە گەدەی بچوك‌و قەد باریکە.

**غَرَّدَهُ**: برسی کرد.
**غَرِدَ الطائرُ والإنسانُ غَرَداً**: باڵندەکە یان ئادەمیزادەکــە دەنگــی بــەرزکردەوەو گۆرانی گوتو خوێندی ٥ بۆ زێدەڕەوی لەمانای (غَرَدَ)دا دەڵێی: (غَرِد وغِرِّيدٌ).
**أغــرَدَ الطــائرُ والإنــسانُ**: باڵندەکــە ئادەمیزادەکــەی خــستە خۆشــیو زەماوەندەوە بەدەنگی خۆشی خۆی ٥ دەگوترێ: (سمعت قمرياً فـأغرَدني) گــوێم لــەدەنگی قــومری بــوو دەیخوێند خستمیە حاڵەتی خۆشیو هەڵپەڕینەوە.
**غَرَّدَ الطائرُ والإنسانُ**: بەمانا (غَرِدَ) دێ.
**إســتَغرَدَهُ**: هێنایــە خوێنــدنو گــۆرانی گوتنەوە.
**الأُغـرودَةُ**: خوێنــدنی بولبـولو کـۆترو باڵنـــــدەی تـــرو ئـــادەمیزادە ٥ دەگـوترێ: (طـائر أو مُغـنّ مُـستَمْلِحُ الأغاريد) باڵندەیـەکی دەنـگ خـۆش یـان گـۆرانی بێژێـکی دەنـگو ئـاواز خۆش.
**الغَـرادُ**: جـۆرە کارگێـکە هەڵـدەتۆقێ ٥ (ك: غِراد).
**غَرَّ الرجلُ**: پیاوەکە ئیش نەزانو بـێ ئاگا بوو لەکاروبار.
**غَرَّ الماءُ**: ئاوەکە ڕۆچوو.
**غَــرَّ فلانــاً غــرّاً وغُــروراً**: فلانکەســی هەڵخەڵەتانــد ٥ فێڵـی لێ کـرد ٥ زەبـری لە ناوچـەوانی دا ٥ مەبەسـتی خـۆی لێ وەدەست هێنا.
**غَرَّ الطائرُ فرخَهُ غرّاً وغِراراً**: باڵندەکە بـە دەنـدووکی خواردنی دا بە بێچووەکانی ٥ هەروا وشـەی (غـرَّ) بـەمانا سپییەتیو درەوشــانەوە دێ ٥ دەگــوترێ: (غــرّ وجهـــه) روخـــساری ســپیو جــوانو درەوشاوە بوو.
**غَـرَّ الفـرسُ**: ئەسپەکە ناوچـەوانی خـاڵی سپی پێوە بوو.
**غَـرَّ الرجـلُ**: پیاوەکە بـەرزبۆوە بـوو بـە گەورەو ڕیش سپی وڵاتەکەی ٥ کرداری جـــوانو ڕەفتـــاری پەســـەندی لێ دەرکـەوتن ٥ یـان پیاوەکـە بـێ ئاگـاو کەودەنو تێنەگەیشتوو بوو.
**غارَ السوق**: بازاڕ شکاو مامەڵە کەم بوو.
**غارَ الناقة**: حوشترەکە شیری کەم بوو.
**غــارَ التحيــةَ**: وەڵامــی سـڵاوەکەی کـەم کردەوە وەکوو پێویست وەڵامی سڵاوی نەدایەوە.
**غَرَّرَ به تغريراً وتغِـرَّةً**: خـستیە شـوێنی خەتەرناكو فەوتانەوە ٥ دەگـوترێ: (غــرَّرَ بنفــسه ومالــه) خـۆیو مـاڵو سامانی خستە خەتەرەوە.
**غـــرَّر الغـــلام**: منداڵەکـــە ددانـــی دەرکـەوتن: ددانـی پێـشینەی ڕوانو دەرکەوتن.

غَرَّرَ الطيرُ: باڵندەکە باڵەکانی بەرز کردنەوەو خەریکبوو بفڕێ.
غَرَّرَ القِربةَ: کوندەکەی پڕ کرد.
اغتَرَّ فلان: فلآنکەس غافڵو بێ ئاگا بوو ◦ فێڵی لێ کرا.
إغتَرَّ فلاناً: هەوڵی دا بیخافڵێنێو ئاگای لە رودوانەبێ.
إغتَرَّ الأمر فلاناً: روداوەکە بەغافڵیو بێ ئاگایی لەناکاو تووشی فلآنکەس بوو.
تَغَرَّرَ الفرسُ: ئەسپەکە ناوچەوان بەڵەك بوو ◦ دەگوترێ:
تَغَرَّرَ الفرسُ وتحجَّلَ: ئەسپەکە ناوچەوانی بەڵەك بوو هەروا قاچەکانیشی بەڵەك بوون.
إستَغَرَّ: بەمانا (إغتَرَّ) دێ.
إستَغَرَّ فلاناً: بە غافڵگیریو لەناکاو بۆی هاتو پەلاماری دا.
الأغَرُّ: مەشهورو بەناوبانگ دەگوترێ: (یوم أغرّ ولیلة غَرّاء).
الغارُّ: غافڵو بێئاگا ◦ بیر هەڵکەن.
الغِرارُ: تیزایی شمشێر ◦ شێوەو شکڵ ◦ دەگوترێ: (ضربَ نصاله علی غرار واحد) تیرەکانی لەسەر یەك شێوە تاشین (ضرب علی غراره) ڕێو شوێنی ئەوی گرتە بەر ◦ کەمێك لەخەو ◦ دەگوترێ: (ما ذقتُ من النوم إلا غراراً) نەنووستم جگە لەکەمێك خەو نەبێ ◦ (ما لبثتُ عنده إلا غراراً) کەمێك نەبێ لای ئەو نەمامەوە ◦ دەشگوترێ: (جاءنا علی غرار) لە ناکاوێكو گۆزو گوممەت هات بۆلام ◦ (لبثتّ الیومُ غرار شهر) بەئەندازەی مانگێك مامەوە.
الغرار من الصلاة: ناقیص بوونی روکنەکانی نوێژ.
الغَرَارَةُ: غافڵیو بێئاگایی ◦ مێرمندالی ◦ دەگوترێ: (کان ذلك علی غرارتي) ئەوە وەکوو سەردەمی مێرمندالیی من وایە.
الغِرارَةُ: گوێنیو خەرارێکە لە جەواڵ گەورەترە گەنمی تێ دەکرێ.
الغَرُّ: تیزایی شمشێر ◦ جۆگە شەقکردن بەناو زەویدا ◦ هەموو دوو لۆهێنانەوەو قەدکردنێك لە قوماشو شتی وا دا ◦ دەگوترێ: (طوی الثوبَ علی غَرِّهِ) قوماشەکەم وەکوو خۆی پێچایەوە.
(طویتُ فلاناً علی غَرِّهِ) فلآنکەسم جێهێشت لەسەر حاڵی خۆیو بەبێ ئەوەی ئیشوکارەکەی دەربخەم.
الغِرُّ: کەسێك بەئاسانی هەڵبخەڵەتێ.

**الغُرُّ:** باڵندەیەكی قاچ درێژە لەباڵندە ئاویەكان ڕەنگی ڕەشە سەری سپییە بەئاوی زلكاوەكان دەژی.

**الغَــــرَرُ:** خەتـــەرو ســـامناك ٥ روبەروبوونـــەوە، بەهیلاكـــچون ٥ كاڵایەك: كە كڕیارو فرۆشیار جۆرو چەندیەتی نەزانن ٥ یان دڵنیا نەبن لـە تەسـلیم كردنـی كاڵاكـە وەكـوو فرۆشـتنی ماسـی لـەئاودا ٥ یـان فرۆشتنی باڵندە بەئاسمانەوە.

**الغُرَّةُ:** لە هەموو شتێكدا سەرەتاكەی‌و باشـەكەی ٥ سـپیایی ناوچـەوانی ئەسپ ٥ مانگی یەك شەوە ٥ یەكەم ڕۆژی مانگ ٥ هـەڵاتن‌و دەركەوتنی مـانگ ٥ دەم‌و چـاوی مـرۆڤ ٥ هـەر روناكـایی‌و كازیوەیـەك سـەرەتاكەی دەربكـەوێ ٥ گـەورە پیـاو و ڕیـش سپی قـەوم ٥ كـاڵای بـاش‌و بـەنرخ ٥ سێ شەوی سەرەتای مانگ.

**الغِــرَّةُ:** بێئاگــایی‌و غــافڵی لــەكاتی بەخەبەریدا ٥ (ك: غِرَرٌ).

**الغُرورُ:** هەرشتێك ئادەمیزاد لە خشتە بەرێ ماڵ‌و سامان بێ یان پلەو پایە بـێ، یـان شـەهوەت‌و ئـارەزووی نەفس‌و شەیتان بێ.

***الغَریرَةُ:*** گەنجی بێ ئەزموون ٥ جەستەو ئەنـدام جوانی ٥ ژیانی نەرم‌و نـۆڵ‌و پـڕ نـازو نیعمـەت ٥ كـەفیل‌و بـــەرعودەو سەرپەرشـــتیار ٥ دەشـكوتری: (أنـا غریـرك مـن هـذا الأمـر) ئـەمن لـەم بـوارەدا شارەزاو خاوەن ئەزمونم.

**الغُرَیرُ:** گیانلەبەرێـكی گۆشت خۆرە ٥ شێوەی لەنێوان سەگ‌و پشیلەدایە ٥ قاچ كورت‌و قـاچ ڕەشـە ٥ روخسـاری سـپییە ٥ لەهـەردولای ڕوخساریەوە دوو خەتی ڕەش هەن ٥ هـەروا نـاوە بـۆ كەڵـە حوشـتری ڕەســەن ٥ لەپەندا هاتووە: (أغن من غُریرٍ).

**غَـرَزت الجـرادة غـرزاً:** كوللەكـە كلكـی چەقاندە زەوی بۆئەوەی هێلكە بكا.

**غَـــرَزَ الـــشَّیْءَ في الـــشَّيْءِ:** شــتەكەی لەشتەكەی چەقاند تێی كوتا.

**غَـــرَزَ الإبـرَةَ في الثـوب:** دەرزییەكـەی چەقاندە قوماشەكە.

**غَرَزَ العودَ ونحوه في الأرض:** چـڵە دارەكـەی لەزەوی چەقاند، سنگەكەی چەقاند.

**غَرَزَ الراكبُ رجلَه في الغرز:** سوارەكە قاچی خـستە نـاو ئاوزەنگییـەوە بۆئـەوەی سواری وڵاخەكە ببێ.

**غَـرِزَ غَـرزاً:** ملكەچی پاشا بـوو وازی لـە یاخیبوون هێنـاو فەرمانبـەرداری پاشا بوو.

***أغـرَزَ الـواديُ:*** دۆڵ‌و شـیوەكە رومكـی (غَرَزِ)ی لێ ڕوا.

**أغرَزَ الشَّيئَ:** شتەکەی چەقاند.

**غَرُزَ:** بەمانا (غَرَزَ) دێ.

**غَـرَّزَ فـلان الغـنمَ:** ڕۆژە نارۆژێـك مەڕەکەی دۆشی.

**إغتَرَزَ رجله في الغرز:** قاچی خستە ناو ئاوزەنگییەوە.

**التغريـز:** ئەوەیـە نەمامـە خورمـا لـە شوێنێـکەوە بگوێزرێتـەوە بـۆ شوێنێکی تر بۆئەوەی بچەقێندرێ.

**الغارِزُ:** نەزان.

**الغَرزُ:** ئاوزەنگی ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (کان اذا وضع رجلـه في الغَـرزِ يريـد السفرَ يقول بسم الله) ٥ دەشگوترێ: (إلزَم غَرزَ فلان) گوێڕایەڵی فەرمانی فلان بە ٥ (أشدد يدك بَغرزِه) دەست بگرە بە ئاوزەنگی فلانـەوە ٥ هـەروا وشـەی (الغَرزُ) نـاوە بـۆ هەرشتێـك لەزەوی بچەقێندرێ.

**الغَرَزُ:** ڕوەکێکی ساڵانەیە بەسەرزەوی دا بڵاو دەبێتەوەو پەلو پۆی زۆری هەیـە، بەرەکـەی بوندوقەیـەکی سێگۆشەیە.

**الغريزَةُ:** سروشتو تەبیات ٥ لـە بـواری فەلـسەفەدا وێنەیەکـە لـە وێنـەی چالاکی نەفسو جۆرێـکە لـە سلوك پـشت دەبەسـتێ بـە فـیترەو وەراسەوە.

**المَغـرَزُ:** شـوێنی گەرانانـەوەی گوللـە ٥ (ك: مغارِز).

**غَرَسَ الـشَّجَرَ ونحـوه غرسـاً:** درەختەکەی چـەقاندە زەوی ٥ دەشـگوترێ: (غـرس فـلان عنـدي نعمـةً) فلانکـەس پیاوەتیەکی باشی بەسەر منەوە هەیە.

**أغـرسَ الـشجرَ:** دارەکـەی ڕوانـد، چەقاندی.

**الغِـراسُ:** درەخـتو شـتی وا کـە دەڕوێنـدرێ، دەچـەقێندرێ ٥ کـاتی چەقاندنی درەخت.

**الغِراسةُ:** نەمامە خورما.

**الغَـرسُ:** درەختـی چـەقێندراو، ڕوێندراو.

**الغِـرسُ:** هەرشتێـك بڕوێنـدرێ، ٥ پێـستێکی تەنکـە بەسـەری منداڵەوەیە لەکاتی لەدایك بوونیدا ٥ (ك: أغراس).

**الغَريسُ:** درەختی ڕوێندراو.

**الغَريسَةُ:** نەمامـە خورمـا لەسـەرەتای ڕوانـی دا ئـەو دەنکـە خورمایـەی دەخرێتە ژێر گڵەوە بۆئەوەی بڕوێ ٥ یـان هـەر دانەوێڵەیـەکی تـر ٥ نەمامە درەختو شەتڵە ڕوەك ئـەو سـاتەی کـە دەچـەقێندرێ ٥ (ك: غرائس وغِراس).

**المَغـرِسُ:** شـوێنی نـەمام ڕوانـدن ٥ (ك: مغارِس).

**غَرَضَ فلان غَرضاً**: بەیانی زوو چووە سەر ئاوەکە.

**غَرَضَ السِّقاءَ ونحوه**: کوندەکەی پڕکرد ٥ مەشکەکەی هەژاند کە ڕونەکەی کلۆکلۆ بوو کۆی نەکردەوە بەڵکو دۆیەکەی بەڕۆنەوە دا بەخەڵکی‌و خواردیانەوە.

**غَرَضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەتەڕو تازەیی‌و ناسکی چنی‌و لێی کردەوە.

**غَرَضَ له غَريضاً**: شیری دەرخوارد دا.

**غَرَضَ الشيءَ**: وازی لەشتەکە هێنا.

**غَرَضَ السخلَ**: کارەکەی لەشیر بڕیەوە پێش ئەوەی کاتی لە شیر بڕانەوەی بێ.

**غَرِضَ إليه غَرَضاً**: بۆی تامەزرۆ بوو.

**غَرِضَ منه**: لێی جاڕز بوو، بێتاقەت بوو.

**غَرُضَ الشَّيْءُ غِرَضاً**: شتەکەی تەڕو تازە بوو.

**أغرَضَ الرجلُ**: پیاوەکە بۆ کردەوەکەی یان بۆ قسەکەی نیازێکی هەبوو ٥ (فهو مُغرِض).

**أغرَضَ للقوم غَريضاً**: بەیانی هەویرێکی بۆ خەڵکەکە شێلاو هەویری کۆنی بۆ نەکردن بەنان‌و دەرخواردی نەدان.

**أغرَضَ الرجلَ**: پیاوەکەی جاڕز کرد.

**أغرَضَ الاناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**غَرَّضَ**: گۆشتی تازەی خوارد ٥ خۆشی ڕابواردو پێکەنی.

**غَرَّضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بە تەڕوتازەیی چنی ٥ دەشگوترێ:

**غَرِّض في سقائك**: کوندەکە پڕمەکە.

**إغتَرَضَ الشَّيْءَ**: بەتەڕو تازەیی شتەکەی چنی.

**إنغَرَضَ الغُصنُ**: لقەدارەکە شکایەوەو لێی نەبوەوە.

**الإغريضُ**: ئەو دەنکە وردە سپیانەن کە درەختی پشکوتوو دەریان دەکەن ٥ دەنکە تەرزە ٥ هەموو شتێکی سپی تازە پەیدا بوو ٥ (ك: أغاريض).

**الغَارِضُ**: کەسێك بەیانی زوو بچێ بۆ سەرکانیاو و بیری ئاو بەمەبەستی ئاودانی ئاژەڵ یان ئاو هەڵێنجان ٥ دەگوترێ: (أتيته غارضاً) بەیانی زوو چوم بۆلای ٥ هەروا وشەی (الغارض) ناوە بۆ لوتی درێژ ٥ (ك: غرضان).

**الغَرضُ**: ئەو قایش‌و قەیاسەیە کورتان‌و کەژاوەی پێ لە سەرپشتی وڵاخ قایم دەکرێ ٥ لاشیو، بەشێك لە شیو ودۆڵ ٥ خواربوونەوەو دوولاهاتنەوە ٥ چرچ بوون ٥ یان جەستەی قەڵەو سیس ببێ‌و پێستەکە شیو و چرچی تێ بکەوێ ٥ لەپەندی پێشینان‌دا هاتووە:

(طويتُ الثوبَ على غروضة)
بەچرچ و لۆچەوە قوماشەکەم پێچایەوە ٥ واتە: وازم لەکارەکە هێنا وەك خۆی هێشتمەوە.

**الغَرَضُ**: نیشانەو هەدەف کە تیرو گوللەی ئاراستە دەکرێ ٥ مەبەستو نیاز ٥ دەگوترێ: (فهمت غَرَضَك) مەبەستو نیازی تۆم زانی ٥ (ك: أغراض).

**الغرضان**: لوتێك هەردوو بوری ئەملاو ئەولای داکەون.

**الغَرِيضُ**: تەڕو تازە لەگۆشتو خورماو میوەی تر ٥ هەرشتێك سپیو ناسك بێ ٥ هەر گۆرانیەکی تازە بێ ٥ گۆرانی بێژی باش ٥ ئەو ئاوەی بەیانی زوو دەچی بەکاری دێنی ٥ ئاوی باران.

**غَرغَرَ الرجلُ**: پیاوەکە ئاوی لە دەمو قورگیدا هێناو بردو قوتی نەدا دەگوترێ: (غَرغَرَ بالماء وبالدواء) ئاو یان دەرمانی لەقورگی خۆیدا هێناو برد ٥ کاتی گیانەلاو کە ڕۆح دەگاتە قورقوراگە ٥ گیزەی مەنجەڵو قلپە قلپی لەکاتی کولاندا ٥ ویزەی گۆشت لەکاتی برژانی دا.

**تَغرغَرَ بالماء وبالدواء**: بەمانا (غَرغَرَ)دێ.

**غَرغَرَت عيناه**: چاوەکانی ئاویان لێ هات فرمێسکیان کرد.

**الغِرغِرُ**: جۆرە مریشکێکە لە وشکانی دەژی، شوێنی ولاتی ئەفریقایە.

**الغَرغَرَةُ**: هێنانو بردنی ئاو لەدەمو قورگدا ٥ هەر شتێك دەرمان بێ غەرغەرەی پێ بکرێ.

**غَرَفَ الغرفَ والشيءَ غَرفاً**: بڕییەوە کەرتی کرد ٥ دوولای هێنایەوە دایپەرداوت.

**غَرَفَ الناصيةَ**: قژی کاکۆڵی بڕینەوە ٥ هەڵی پاچین.

**غَرَفَ الجلدَ**: پێستەکەی بە گەڵای درەختی (الغَرف) دەباغ کرد.

**غَرَفَ الماءَ ونحوه بيده أو بالمغرفة**: بە لوێچ ئاوی هەڵێنجا ٥ فهو غارف ٥ (ك: غُرّفٌ) (وهي غارفة) (ك: غَوارف).

**أغرَفَ الأسدُ**: شێرەکە چووە ناو درەختی چڕو پڕو پڕگەڵاو لانەی خۆیەوە، خۆی خزاندە ناو بێشەوە.

**إغتَرَفَ الماءَ بيده**: بە لوێچ ئاوی هەڵێنجا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إلاّ مَنِ اغتَرَفَ غُرفَةً بِيَدِهِ﴾ ٥ دەشگوترێ: (إغتَرَفَ منه).

**إنغَرَفَ الشَّيْءُ**: بۆ موتاوەعەی (غَرَفَهُ)دێ.

**تَغرَّفَهُ**: هەموو شتێکی لەگەل هەڵگرت.

**الغُرافةُ:** لوێچه ئاو ە ئەو تۆزە ئاوەی بەدەست هەڵدەگیرێ.

**الغُـرّافُ:** بـۆ زێـدە ڕۆیـی لـەمانای (الغارفُ) دێ ە ئەسپی هەنگاو درێژ، لۆق پان ە ڕوباری زۆر ئاو ە بارانی زۆرو بەلێزمە.

**الغَـــرفُ:** درەختێـــکی بـــچوکە لـــە نیوەدوورگـــەی عـــەرەبیو میـــصرو ئـــەفریقاو هیندوســـتان دەڕوێ، گـــەڵاکانی درێـــژو ڕەـــب ئاســـایی بەرەکـــەی زەردە وەکـــوو پورتوقـــاڵ، سێ مەترێك بەرز دەبێتەوە.

**الغَـرَفُ:** جـۆرە گیایەکـە لـە پێـری (النجیلیـــــة)یـــە مەترونیوێـــك بەرزدەبێتەوە، لقەکانی چڕو پڕن.

**الغُرفَـةُ:** لوێـچە ئـاو ە ژوری نوسـتنو دانیشتن.

**الغُرفَةُ التجارية:** ژوری بازرگانی.

**الغَروفُ:** بیرێـك کە ئاوی بەدەست لێ دەربهێنـــدرێ (دلـــو غـــــروف) دۆڵچەیەك ئاو زۆر بگرێ.

**الغريـــف:** درەختـــی چـــڕو پـــڕ هـــەر درەختێـــك بـــێ. (دلـــو غريـــف) دۆڵچەیەك ئاو زۆر بگرێ.

**الغريفةُ:** بەمانا (الغريف) دێ.

**المَغرَفَةُ:** ئەسکوێ، کەوچك، هەرشتێـك خـــواردنی پـــێ هەڵـــگوێزرێ ە (ك: مغارف).

**غَرِقَ في الماء غَرَقاً:** ئاو بەسەریدا زاڵ بوو خنکـا ە لـەئاودا خنکـا ە دەڵـگوترێ: (غَـــرِقَ في الـــدين أو البلـــوى) لـــە قەرزداریدا خنکا ە قەرز سواری شانی بوو ە بەڵاو کارەسات یەخەی گرت.

**غَرِقَت السفينة:** کەشتییەکە نوقمی ئاو ئاو بوو.

**غَرِقَت الأرضُ:** ئاو زەویەکەی داپۆشی ە (فهي غَرِقَةٌ).

**أغرق في الشَّيْئِ:** لە شتەکەدا زێدەڕەوی کردو لەسنور دەرچوو.

**أغرقَ فلاناً الشَّيْئَ في الماء:** فلانکەسی واڵ کـرد بخنکـێ ە یـان شـتەکەی نوقمی ئاو ئاو کرد.

**أغرَقَ الكأسَ:** پیاڵەکەی پڕکرد.

**أغـــرَقَ أعمالـــه الـــصالحة:** کـردەوە باشەکانی بـەفیڕۆدان بـەتاوان کـردن ە تاوانی وای کرد کردەوە باشـەکانی پوچ بوونەوە.

**غارَقَهُ:** نزیکی کردەوە، نزیکی بـوەوە ە دەگـوترێ: (غارقتـــه المنيـــة) مـــردن یەخـەی گـرت، مـردن لێـی نزیـك بۆوە.

**إغـــترقَ الـــنَفَسَ:** هەناســـەی قـــوڵی هەڵکێشا.

**إغترقَ البعيرُ الحزامَ:** حوشترەکە گەدەی گەورە بوو قەیاسەی لێ نەهاتەوە.

**إغتَرَقَـــت الفـــرسُ الخيـــلَ:** ئەسـپەکە

تێـــکەڵاوی ماینـــەکان بـــوو دوایـــی پێشیان کەوت ٥ دەشـگوترێ: (تجارینا فاغترق فرسي حلقة فرسه).

إستَغرَقَ في الضحك: زێدە ڕەوی کرد لە پێکەنیندا.

إستَغرَقَ الشَّيْئَ: شتەکەی هەموو لە خۆ گرت، هەمووی قۆزتەوە.

إستَغرَقَ البعيرُ الحزامَ: حوشترەکە هەموو قەیاسەکەی ویست هێنـدە قەڵەو و ورگن بوو هەموو قەیاسەکە ئەمجار لەتەنگەی هاتەوە.

إغرَورَقَـت العـينُ: چاوەکە پڕبـوو لـە فرمێسك.

الإغـراق: (لـەبواری ئابوری دا) پلانو ڕێفۆرمێکە بۆ باڵادەستیو زاڵبـوون بەسەر بـازاڕی بێـگانەدا بـەم جۆرە کـاڵای وڵات بـەهاوڵاتیان بفرۆشـرێ بـەنرخی گـرانو بـەدەرەوەی وڵات بەنرخی هەرزان.

غَرقَـــأَتِ الدجاجـــةُ: مریـــشکەکە هێلکەیەکی کرد توێـکڵە تەنکەکەی پێوەیـە ٥ دەشـگوترێ: (غرقـــات البیضة).

الغِرقـيُّ: توێکڵێـکی تەنکـە بەسپێنی هێلکەکەوە دەنووسێ.

الغَرقَدُ: درەختۆکەیەکە لە مەترێکەوە بـۆ سـێ مـەتر بـەرز دەبێتـەوە، لەپێڕی (ألباذنجانیة)یە قەدو لقەکانی سـپییە دەشـوبهێتە درەختـی (العوسج) ٥ بەرەکەی دەخورێ.

غَرقَـلَ الرجـلُ: پیاوەکـە بەیـەکجار ئاوەکەی بەسەری خۆیدا کرد.

غَرقَلـت البیـضة والبطیخـة: هێلکەکـە پیس بوو کاڵەکەکە گەنی.

الغِرقِلُ: سپێنی هێلکە.

غَرِلَ العامُ: ساڵەکە هەرزانی بوو.

غَـرِلَ العَـیشُ: ژیانی بـەرفراوانو خۆش بوو ٥ (فهو أغرلُ، وهي غرلاءُ).

غَـرِلَ الرجـلُ: پیاوەکـە شلو شێواو بـوو (فهو غرِلٌ).

الغُرلَـةُ: پێـستی سـەری هینـی نێرینـە کەلەکاتی سونەتکردندا دەبـڕدرێ ٥ (ك: غُرَلٌ).

غَرِمَ غُرماً وغَرَامة: پارەیـەکیان لێ ستاند کەلەسەری پێویست نەبوو ٥ دەگوترێ: (غَرِمَ الدینَ والدِیَـةَ) لـەجیاتی کەسانی دیکـە قەرزەکـەی دایـەوە: خوێنەکـەی دا.

غَـرِمَ في التجـارة: لـەبازرگانی دا زەرەری کرد.

أغرَمَهُ: وای لێ کرد قەرزدار بێ.

أغرِمَ بالشيئ: شەیدای شتەکە بـوو (فهـو مُغرَمٌ) ٥ دەگوترێ: (إنَّ فلاناً لمغرمٌ بکذا) فڵانکـەس شـەیدای فـلان شت بـوو.

**غَرَّمَـهُ**: بـەمانا (أغرَمَـهُ) دێ ٥ لەسـەری پێویست کرد غەرامەبدا.

**الغارِمُ**: ئەو کەسەی پابەندی بـەرعۆدە بونەکەی خۆی بوو.

**الغَرَامُ**: شەیدابونو پەیوەست بوون بـە شتێـکەوە کـە نـەتوانی خـۆتی لێ رزگـار بکـەی ٥ سـزای بـەردەوامو نـەبڕاوە، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾.

**الغَرامَةُ**: خەسارەتمەندیی ٥ (دەربارەی ماڵو دارایی) بەو پارەیە دەگوترێ: کە پێویست بێ بدرێ بەمەبەستی تەمبێ کردنو بارتەقا ٥ دەگوترێ: (حكم القاضي على فلان بالغرامة).

**الغُـرمُ**: ئـەو زیانـە ماڵیـەی تووشـی ئادەمیزاد دەبێ بـەبێ ئـەوەی هیچ تاوانێکی کردبێ.

**الغَريمُ**: خاوەن قەرز ٥ (ك: غُرماء).

**المَغـرَمُ**: بـەمانا (الغَرامـةُ) دێ ٥ (ك: مَغارم) ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (أعوذ بـالله مـن المغـرم والمـأثم) خودایـە پـەنادەگرم بـەتۆ لـەتاوانو یـاخی بوون.

**المُغـرَمُ**: قـەرزداری بـارگران ٥ شـەیدای شتێك کەنەتوانێ لێی جیابێتەوە.

***غَـرِنَ العجينُ علـى الانـاء***: هەویرەکـە بەشتەکەوە رەق بووە.

**غَرِنَ الرجلُ**: پیاوەکە زەعیفو لاواز بوو.

**الغَـرينُ**: کـەفی ئـاو؛ کەلـە حـەوزدا دەمێنێتەوە ناتواندرێ بخورێتـەوە ٥ قورە لیتە کەلافاو بیهێنێ ٥ وادەبێ لەسەر زەوی بمێنێتەوە بەتەڕی یان وشـك دەبێتـەوە ٥ (لـەبواری زەوی ناسـيدا) بریتییـە لەبـەردە قورینەیـەکی وەهـا کەدەنکـە وردە گلەکانی بەیەکەوە نووسابن بـەهۆی تەڕبونیان.

**الغِـريَنُ**: بـەمانا (ألغـرين) دێ ٥ دەشگوترێ: (أتى بـالطِريَنِ والغِريَنِ) تـوڕە بـوو رقـی هەڵـسا تـرشو دۆشاوی تێکەڵاو کرد.

**غَرنَـقَ**: بەچاو مێبـازی کـرد، چـاوی لێ هەڵتەکاند.

**الغُرانِـقُ**: روەکێـکی درەخـت ئاسـایە تەمەن درێژە لە پێڕی (الجارونية)یە لەوڵاتـە مـام ناوەندیەکانـدا دەڕوێ، گـەڵاکانی پـرژو پـاڵی هەیـەو مـل درێـژە ٥ گـوڵو غونـچەکانی وەکـوو چـادر وەهایـە میوەکـەی وشـکە ٥ گەنجی سپیو جوانو نـەرمو نـۆڵ ٥ (ك: غَرانـق وغرانيـق) ٥ دەگوترێ: (إمرأة غرانق).

***الغُرنـوقُ***: بـەمانا (الغُرانِـقُ) دێ ٥ باڵندەیەکی ئاوی سپییە قاچدرێژی

شـێوە جـوان، پەڵەپەڵـەی ڕنـگ زەردی ئاڵتون ئاسایی تێدان ٥ جۆرە کورکییەکە.
**غَرا الرجلُ غَرواً:** پیاوەکە سەرسام بوو.
**غَـرَ الـشَّيْئَ:** بـەمادەی غـەرە شـتـەکەی پێکەوە نووساندن ٥ دەشگوترێ: (غَـرا الـسَمنُ قَلبَـهُ: چـەوری بەهەلاشـی دەمارەکانی دڵیەوە نووساو داپۆشی).
**غَرِيَ به غَراً وغَـراةً:** دڵـی پێوەی نووساو عاشـقی بـوو دەتگوت بـەمادەی غـەرە پێوەی نووساوە.
**غَـرِيَ فـلانٌ:** فلانکـەس درێـژەی بـە رق هەڵسان و تورِد بوونی خۆی دا.
**غَـرِيَ الغـديرُ:** زلکاوەکـە ئاوەکـەی سـارد بوو.
**أغرى بين القـوم:** ئاشوب و فیتنـەیی لـە نێوان خەڵکەکە دا نایەوە.
**أغرى الإنسانَ وغيرَه بالشيئ:** مرۆڤەکەی هـەڵنا بـۆ شـتـەکەو وەدەسـتهێنانی ٥ دەگـوترێ: (أغـرى الولَـدَ بالفـضيلة) منداڵەکەی هەڵنا بۆ ڕەوشتی بەرزو جـوان ٥ (أغـرى الكلـبَ بالـصيد) سەگەکەی هەڵنا بۆئەوەی نێچیرەکە بگـرێ ٥ دەگـوترێ: (أغـرى العـداوةَ بيـــنهم) دوژمنايـــەتی فرێدايـــە ناویانـــەوە ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾.
**أغرى به:** عاشقی بوو.
**غَرّى الشَّيْئَ:** شتەکەی بەمادەی غـەرە چەسپ کرد ٥ یان رەنگی کرد.
**الإغـــراء:** لـــەزاراوەی نەحوییانـــدا بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی کەسـی بەرامبـەر بـۆ کردنـی کـاری بـاش و پێویست، دەگوترێ: (الصلاةَ الصلاةَ) ٥ (أخاكَ أخاكَ).
**الغِـرا:** مادەیەکـە لینجـە کاغـەزو دارو شـتـی تـری پـێ چەسـپ دەکـرێ بەشتی ترەوە.
**الغِراءُ:** بەمانا (ألغِراءُ) دێ.
**الغُروُ:** سەرسام بوون ٥ عەجايەب مان.
**الغُروىَ:** بەمانا (الغُروُ) دێ.
**الغَـرَوِيُّ:** هەرشتێـك نیـسبەت بـدرێ بـۆلای غـەرەو وەکـوو غـەرە لینـج و چەسپێنەربێ.
**الغَرَواني:** هەرشتێك وەکوو غەرەوابێ.
**الغَرِيُّ:** صمغێکی سوورە ٥ ناوی بتێکە کاتی خۆی خوێنیان تـێ هەڵدەسوو ٥ ڕوخسار جوان.
**غَزُرَ الشَّيْئُ غزارةً وغُزراً:** شتەکە زۆر بـوو ٥ دەگـوترێ: (ما طاب ونَزُرَ خير مما خَبُثَ وغَزُرَ) ئەوەی کەم بێ و پاك بێ باشـترە لەوەی پیس بێ و زۆر بێ ٥ (فهو غزير) ٥ (ك: غِزار).
**أغزَرَ القوم:** خەڵـکەکە حوشـتریان زۆر بوون و شیرو ماستیان زۆر بوو.

**أغــزَرَ الــشَّيْئَ:** شــتەکەی زۆرکــرد ٥ دەگـوترێ: (أغــزَرَ اللهُ مالــهُ) خـودا ماڵو سامانی ئەوی زۆر کرد.

**غازَرَ فلان:** فلاّنکەس شتێـکی بەخشی بۆئەوەی زیاتر وەرگرێتەوە.

**غَـــزَرَ:** هــەر رۆژە نارۆژێــك شــیری ئاژەڵەکانی دۆشی.

**إستَغزَرَ:** بەمانا (غازَرَ) دێ.

**إســتَغزَرَ الــشَّيْئَ:** داوای زۆر بــوونی شتەکەی کرد.

**الغَـزرُ:** قەرتاڵـەو سـەبەتەیە لـە لقـی دارخورما دروست دەکرێ.

**المُغزِرَةُ:** هەر روەکێـك کـە ئـاژەڵ بیخوا شیری زۆر بێ.

**غَـــزَّ فـــلان بفـــلان:** فلاّنکـــەس لـــە نێوهاوەڵــەکانی دا فلاّنکەســی کــردە کەسی تایبەت بەخۆی.

**غَزَّ فلان بالقرابة والأولاد والجيران:** فلاّنکەس پیــاوەتیو چــاکەی لەگــەڵ خـــزمو منداڵو هاوسێیەکانی کرد.

**غَـزَّ الثـوبَ أو الجـسمَ بـالإبرَة ونحوهـا:** کراسـەکە یـان جەسـتەی بـە نوکـە دەرزی هاژنیەوە ٥ لەسەرخۆ دەرزی هاژنی کرد.

**أغزَّت الـشجرةُ:** درەختەکـە چقڵی زۆر بـــوونو رەقو گـــەڵاو لقـــەکانی تێـکهاڵان.

**أغــزَّت الدَّابــةُ:** وڵاخەکــە: سـکەکەی بەناخۆشـــی دانـــا بەنارەحـــەتی بێچووەکەی لێ بۆوە.

**غازَّهُ:** پەلـەی بـۆلا کـردو بەربـەرەکانی کرد.

**إغتَزَّبه:** بەمانا (غَزَّبه) دێ.

**تغــازّوا الــشَّيْئَ:** لەشـتەکەدا کێـشەیان تێـکەوت.

**الغُزُّ:** خێڵێکی تورکومانین.

**غَزغَـــزَ:** پـــاروی پـــادانو حـــەزی لەخواردنەکەش نەبوو.

**غَزغَـزَ الـشَّيْئَ:** بـەردەوام بـوو لەسـەر سوزن هاژنکردنی شتەکە.

**غَـزَلَ الـصوفَ أو القُطـنَ ونحوهمـا غـزلاً:** خوری یان لۆکەکـەی رِستو کـردی بـە گلۆڵە.

**غَزِلَ غـزَلاً:** حـەزی لـە قـسەکردن لەگـەڵ ئافرەتدا هەبوو هەوڵی دەدا خۆی لایان خۆشەویـست بکــا ٥ مێبــازی لەگــەڵ دەکردن ٥ (فهو غَزِلٌ).

**أغزَلَ:** تەشی رِست ٥ تەشی بادا.

**أغزَلَ الظبية:** ئاسکەکە کارئاسکی بوو ٥ (فهي مُغزل).

**غـازَلَ المرأةَ:** قسەی لەگەڵ ئافرەتەکـە کردو خۆی لا شیرین کرد ٥ مێبازیی لەگەڵ ئافرەتەکە کرد.

**غازَلَ فلان الأربعين:** فلاّنکـەس تەمـەنی لــە چــل ســاڵی نزیــك بــۆوە.

سيف وغمده
غطاس
غواصة
غال
غلق
غليون
غمامة
غلاف الدائرة
غضارة
غدارة
غفارة
غربال
مغسلة كهربائية
مغزل
غلّ
مغراة
غار
غسول
غراب
الأغماد
غشائيات الأجنحة
غبيرة
غزال
غرنوق
غطاس أو غواص
غرة
غداف
غاق
غراب
غراب الزرع
غرغرة
غرير
غداف

إغتَزَلَ القطنَ ونحوه: لۆکەکەی ڕست ٥ کردی بەدەزو.

تَغَزَّلَ: بەتۆپزی دڵداری بەسەر خۆیدا هێنا ٥ دەگوترێ: (تَغَزَّلَ بالمرأة) حەزی لە ئافرەتەکەیە دڵداری لەگەڵ کرد.

الغَزالُ: کارئاسك گیسکەئاسك ٥ (ك: غِزلَة و غِزلان).

الغَزَالَةُ: بزنەئاسك ٥ خۆر لەکاتی هەڵهاتنیدا ٥ سەرەتای کێشتەنگاو ٥ (ك: غزالات) ٥ دەگوترێ: (أتيته غزالة الضحى) سەرەتای کێشتەنگاو هاتمەلای.

الغَزلُ: ریسی ڕێسراو ٥ (ك: غُزولٌ).

المَغزِلُ: شوێنی ڕستن (ك: مغازل).

المِغزَلُ: تەشی ٥ هەرشتێك خوری‌و لۆکەی پێ بڕێسرێ ٥ وەکوو ئامێری سەردەم کە لەکارگەکاندا بۆ ڕستن بەکاردێ.

غَزَا العَدُوَّ غَزواً وغَزَواناً: هێرشی بردە سەر دوژمن‌و تاڵان‌و بڕۆی کردن (فهو غازٍ).

أغزاهُ: ئامادەی کرد بۆ غەزاکردن.

أغزَى فلاناً: مۆڵەتی داو وەرگرتنەوەی قەرز لێی دواخست.

غَزَّاه: ئامادەی کرد بۆ چوون بۆ غەزا.

إغتَزَاهُ: چوو بۆی.

إغتَزَى بفلان: لەناو هاوەڵانیدا کردی بەکەسی تایبەتمەند بەخۆی.

الغَزَاةُ: ناوێکە لە ناوەکانی غەزا ٥ کە گوترا (غَزاة) ئەوە کاری ساڵانەیەو هەمیشەییە ٥ کە گوترا (غَزوة) ئەوە یەکجار غەزاکردن دەگەیەنێ.

الغَزوَةُ: یەکجار غەزاکردن.

الغِزوَةُ: ئەوەی داواکراوە، ئەوەی هەوڵی بۆدراوە.

المَغزَى: بەمانا (ألغزو) دێ ٥ شوێنی غەزا ٥ سرودی غەزاکردن ٥ داواکاریی ٥ دەگوترێ: (ما مَغزاك؟) داواکاریت چییە؟ ٥ مەبەستی قسە ٥ (ك: مَغازٍ).

غَسَرَ على الغريم غَسراً: تەنگی بەقەرزدارەکە هەڵچنی.

تَغَسَّرَ الأمرُ: ئیشەکەی تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو.

تَغَسَّرَ الغَزلُ: ریسەکە ئاخێ بوو نەیتوانی لە کلکە تەشییەکە دایبکەنێ.

تَغَسَّرَ الغديرُ: ڕەشەباکە چیلکەو دارو پەڵ‌و پوشی هاویشتە ناو زلکاوەکەوە.

الغَسِرُ: کاروباری شێواو و تێکەڵ‌و پێکەڵ.

الغَسَرُ: ئەو پەڵ‌و پوشەی ڕەشەبا دەیخاتە ناو زلکاو و شوێنی وەهاوە.

**غَسَّ خُطبةَ الخطيب غَسّاً:** ڕەخنەی لە وتاری وتارخوێن گرت.

**غَسَّ فلاناً في الماء:** فلانکەسی خستە ناو ئاوەوەو نوقمی کرد.

**غُسَّ البعيرُ:** حوشترەکە دەردی (غەساسی) گرت ٥ (غەساس) دەردێکە تووشی حوشتر دەبێ.

**إنغَسَّ في الماء:** لەئاودا نوقم بوو.

**الغُساسُ:** دەردێکە تووشی حوشتر دەبێ.

**الغُسُّ:** پیاوی زەعیفو بەدڕەوشتو هەتیومچە ٥ (ك: أغساس وغسوس وغَساس).

**غَسَقَ الليلُ غَسقاً وغسوقاً:** شەو تاریك بوو ٥ شەو داهات.

**غَسَقَ القمرُ:** مانگ گیرا.

**غَسَقَت عَينُهُ:** چاوی ئاوی کرد.

**غَسَقَت السماءُ:** ئاسمان تاریك بوو ڕەش هەڵگەڕا بارانی باراند.

**غَسَقَ اللبنُ:** شیرەکە بە خوڕەم لە گوانی ئاژەڵەکەوە ڕژایە خوار.

**غَسَقَ الجُرحُ:** زەرداو و زوخاو لە برینەکە دەرچوو.

**أغسَقَ الليلُ:** بەمانا (غَسَقَ) دێ.

**أغسَقَ فلان:** فلانکەس کەوتە ناو تاریکایی شەوەوە.

**أغسَقَ المؤذنُ:** بانگدەرەکە بانگی نوێژی شێوانی دواخست بۆ کاتی تاریك داهاتنو پەیدابوونی شەو.

**الغاسِقُ:** شەو کاتێك کە ڕوناکایی کەناری ئاسمان نامێنێ ٥ مانگی گیراو.

**الغَسَاقُ:** ئەو کێمو زوخاوەی لە پێستی دۆزەخیان دێتە دەر.

**الغَسَّاقُ:** بەمانا (الغَسَاقُ) دێ.

**الغَسَقُ:** تاریکایی شەو ٥ ئاوە بۆ دانەوێڵەیەکی ڕەش وەکوو مرۆرو زیزانە کە تێکەڵ گەنمو دانەوێڵە دەبێ.

**غَسَلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی شت ٥ بەئاو چڵكو پۆخەڵی لێ لابرد ٥ دەشگوترێ: (غَسَلَ اللهُ حوبته) خودا فلانی لەتاوان پاك کردەوە.

**غَسَلَ فلاناً بالسوط:** بەقامچی لە فلانکەسی داو ئازاری پێ گەیاند باشی کوتا.

**غَسَّلَ الأعضاءَ:** زێدەڕەوی کرد لەشتنی ئەندامەکانی جەستەیدا.

**غَسَّلَ الميِّتَ:** مردوەکەی شتو پاکی کردەوە.

**إغتَسَلَ بالماء:** جەستەی خۆی بەئاو شت.

**إنغَسَلَ الشَّيْءُ:** بۆ موتاوەعەی (غَسَلَهُ) دێ.

**الغاسولُ:** گیایەکی ساڵانەیە لەدەشتەکانی وڵاتی میصردا دەڕوێ.

**الغُسالَةُ:** ئەو چڵكو پیسییەی کەلەناکامی شتنی شتدا دێتە خوار.

**الغَسَّالَةُ:** ئافرەتێکە پۆشاك شۆرین بکاتە پیشەی خۆی ٥ ئامێرێکە بۆ شتنی پۆشاكو قاپو قاچاخ بەهێزی کارەبا ئیش دەکا.

**الغَسولُ:** ئەو صابونو شامپۆو ئەسپۆنو شتەیە بۆ شت شتن بەکاردەهێندرێ.

**الغُسلُ:** شتنی جەستە هەمووی ٥ بەمانا (الغسول) دێ.

**الغِسلُ:** بەمانا (الغَسولُ) دێ.

**الغِسْلَةُ:** بەمانا (الغِسلُ) دێ ٥ ئەو بۆنو شامپۆو عەترو عوتورەیە ئافرەت لەکاتی قژ بەشانەکردندا لەقژی دەدا.

**الغِسلِين:** ئەو چڵكو پیساییەی لەناکامی شتندا لە شتە شۆراوەکە دێتە خوار ٥ کێمو زوخاو کەلەجەستەی دۆزەخیان دێتەدەر.

**الغَسُولُ:** صابونو تایتو شامپۆو ئەسپۆنو شتی وا کەشتیان پێ دەشۆرێ.

**الغَسيلُ:** شۆردراو.

**المُغتَسَلُ:** شوێنی شت شتن ٥ ئاوی شت پێ شتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾.

**المَغسَلُ:** شوێنی شتن ٥ (ك: مغاسِلُ).

**المَغسَلَةُ:** شوێنی گشتی بۆ شتنی جلو بەرگ یان پاککردنەوەی ٥ تەختەی مردوشۆر، ئەو دارەی مردوی لەسەر دەشۆرێ.

**المِغسَلَةُ:** ئامێری شتن وەکوو لفکەو شتی وا.

**غَسَمَ الليلُ غَسوماً:** شەو تاریك بوو.

**أغسَمَ الليلُ:** بەمانا (غَسَمَ) دێ.

**أغسَمَ القومُ:** خەڵکەکە چونە تاریکیەوە.

**الغَسَمُ:** ڕەشایی ٥ تاریکی ٥ پەڵەهەور ٥ (ك: أغسام).

**الغُسمَةُ:** پەڵەهەور (ك: غُسَمٌ).

**غَسَنَهُ غَسناً:** جوی، لەناو دەمیدا هێنای و بردی و بەددان هەنجنی.

**الغُسان:** لای ژوروی دڵ.

**الغَسَّانُ:** بەمانا (الغَسَانُ) دێ ٥ دەگوترێ: (لقد علمت ان ذلك من غسان قلبك): زانیم ئەوە لە قوڵایی دڵتەوە دێ ٥ هەرەتی لاوەتی و گەنجی ٥ دەگوترێ: (کان ذلك في غَسّان شبابه) ئەوە لەهەرەتی لاوەتی دا بوو ٥ دەشگوترێ: (ما أنت من غَسّانه) ئەتۆ پیاوی ئەوشتە نیت.

**الغَسَّانيُّ:** زۆر جوان.

**الغُسنَةُ:** کۆمەڵە قژو توك لە پۆپنە یان لەناو چاوان یان لەلاجانگ.

**الغيسانُ**: هەرەتی لاوەتی ٥ دەگوترێ: (كان ذلك في غيسان شبابه).

**غَسا الليلُ غُسُوّاً**: شەو بەخۆیو تاریکییەوە هات.

**غَسِي الليلُ غَسيً**: بەمانا (غَسَا) دێ.

**أغسى الليلُ**: بەمانا (غَسَا) دێ.

**أغسَى الرجلُ**: پیاوەکە کەوتە ناو تاریکیەوە ٥ دەشگوترێ:

**اغسِ من الليلِ**: سەرەتای شەو مەڕۆ رابوەستە تا هەندێ تاریکییەکەی دەڕەوێتەوە.

**أغسى الليلُ فلاناً**: شەو تاریکی خۆی کردە بەر فلانو دایپۆشی.

**الغُسُوُّ**: تاریکی شەو لەکاتی شێوانو دوا ئەو کاتەش تا ڕوناکی کەناری ئاسمان (شفق الأحمر) ون دەبێ.

**غَشَّ صدرُهُ**: دڵی کینەو حیقدی لەخۆ گرت.

**غَشَّ صاحِبَهُ غِشاً**: شتی وای نیشانی هاوەڵەکەی دا کە بەرژەوەندی تێدا نەبێو زەرەری لێ بکا ٥ شتی وای بۆ دەرخست پێچەوانەی ناو دەروونی بوو.

**أغَشَّهُ**: خستیە ناو غەشو فرتو فێڵەوە.

**غَشَّشَهُ**: زۆری غەش لێکرد.

**إغتَشَّهُ**: گومانی غەشی لێ کرد.

**إستَغَشَّهُ**: بەمانا (إغتَشَّهُ) دێ.

**الغِشاشُ**: سەرەتای تاریکی شەو و کۆتایی شەو ٥ ئاوی ناخۆشو نازوڵاڵو ناسازو لێڵ ٥ نوستنی کەمو سەرەخەو شکاندن ٥ پەلەکردن ٥ دەگوترێ: (لقيته على غشاش بەپەلە بینیم.

**الغَشَشُ**: شوێنی ئاوخواردنەوەی لێڵ.

**المغشوش**: شتی ناپاڵفتە ٥ دەگوترێ: (لبن مغشوش) شیری ناپوختەو ناخالیص.

**غَشَمَ الحاطبُ غَشماً**: دارکەرەکە بەشەو داری کردن، بڕینی هەرچی بەردەستی هات بڕیو کۆی کردنەوە بەبێ تێفکرینو جوداکردنەوە.

**غَشَمَ الرجلَ غَشماً**: ستەمێکی زۆری لە پیاوەکە کرد ٥ (فهو غاشم).

**تَغاشَموا**: خەڵکەکە ستەمیان لەیەکتر کرد.

**الأغشَمُ**: ڕوەكو گژوگیای وشکەوە بووی کۆن.

**الغَشومُ**: ئەوەی دەکەوێتە ناو خەڵکەوە چی دەست بکەوێ دەیگرێو هەڵی دەگرێو دەی پێچێتەوە ٥ دەگوترێ: (حرب غشوم) شەڕێکە تاوانبارو بێ تاوان دەگرێتەوە.

الغشيم: ئيش نەزان ٥ گێل‌و بێ‌ئەقڵ ٥ كارنادروست.

المِغشَمُ: ئازاو چاو نەترس بەجۆرێك هیچ شتێك لەمەبەست‌و ویستی خۆی نەیگێڕێتەوە.

غَشمَرَ السیلُ: لافاو هات.

غَشمَرَ فلان: فلانكەس سواری بێ عەقڵی خۆی بوو هەر خۆی پێی ڕاستە، بەحەق‌و بەتاڵ ئەوە دەكا.

تَغَشمَرَ لە: ڕقی هەڵساو خۆی گیف كردەوە.

تَغَشمَرَ السیلُ أو الجیشُ: لافاوەكە هات یان سوپاكە هات.

تَغَشمَرَ الشَّیْئَ: بەزۆرە ملێ شتەكەی لێ ستاند.

الغَشَمشَمُ: پیاوی ئازاو چاو نەترس كە هیچ شتێك لەمەبەستی خۆی نەیگێڕێتەوە ٥ كەسێك ستەم زۆر بكا.

غَشِيَ اللیلُ غَشاً: شەو تاریك بوو.

غَشِيَ الفرسُ: ئەسپەكە سەری هەموو سپی بوو باقی جەستەی ڕەنگی تر بوو ٥ (فهي أغشى وهي غشواء).

غَشِيَ الأمرُ فلاناً غَشاً: شتەكە فلانكەسی داپۆشی ٥ كارەكە هەموو كاتی فلانی داگیر كرد ٥ دەگوترێ: (غَشِیَهُ النعاسُ وغَشِیَهُ الموجُ ٥ وغشیه العذاب وغشیه الموت).

غُشِيَ علیه غَشیَةً: بێ هۆش بوو لەهۆش خۆی چوو ٥ (فهو مَغشِيٌ علیه).

أغشى اللیلُ: بەمانا (غَشِيَ) دێ.

أغشَى اللهُ بَصَرَهُ: خودا پەردەی بەسەر چاویدا دا.

أغشى فلاناً الأمرَ: فلانكەسی واڵێ كرد داپۆشی.

أغشَى فلاناً: فلانكەسی هەڵنا بۆئەوەی بچێ بۆلای.

غَشَّى الشَّیْئَ وعلى الشَّیْئِ: شتەكەی داپۆشی.

غَشَّى فلاناً بالسوط أو السیف: بەقامچی زۆری لەفلانكەس دا.

تَغَشَّى الشَّیْئَ: شتەكەی داپۆشی.

تَغَشَّى الشَّیْئُ فلاناً: شتەكە فلانكەسی داپۆشی ٥ هەمووكاتەكانی داگیركردن ٥ دەگوترێ: (تغطىٌ فلان بثوبه) فلانكەس بە پۆشاكەكەی خۆی داپۆشی.

إستَغشَى ثوبَهُ بثوبە: بە پۆشاكەكەی خۆی داپۆشی بۆئەوەی هیچ نەبینێ‌و نەبیسێ.

الغاشِیَةُ: پەردە ٥ پەردەی دڵ ٥ ڕۆژی قیامەت ٥ ڕوداوی گەورە خێر یان شەڕ ٥ كالانی شمشێر ٥ سواڵكەری زۆر ٥ دیدەنیكەرو برادەر كە

لێکدان لێکدان سەردانت بکەن ◦ دەردی سك ◦ سزای گەورە.
**الغشاءُ**: داپۆشەرو پەردە.
**الغَشيَةُ**: لەهۆش چوونی گیانەلاو، ئەو حاڵەتانەی بەسەر مرۆڤدا دێن لەکاتی گیانەلاودا.
**غَصَبَ الشَّيْئَ: غَصباً**: بەزۆر شتەکەی ستاند.
**غَصَبَ المرأةَ**: بەزۆر زینای لەگەل ئافرەتەکە کرد.
**غَصَبَ الجلدَ**: کوڵك و توك و مووەکەی لە پێستەکە کردەوە بەبێ ئەوەی بیخاتە حەوزی دەباغەوە.
**غَصَبَ فلاناً على الشَّيْئ**: فلانکەسی ناچار کرد بەکردنی ئیشەکە.
**إغتَصَبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی داگیرکرد.
**غَصَّ بالماء. غَصّاً وغَصَصاً**: بەئاو قورگی گیراو ئاوەکە لەگەروی نەچوە خوار، بۆی قوت نەچوو.
**غَصَّ المكانُ بأهلهِ**: شوێنەکە بە دانیشتوانەکەی تەنگەبەر بوو.
**أغَصَّهُ**: وای لێ کرد ئاو لەقورگی بگیرێ.
**أغَصَّ عليهم الأرضَ**: زەویەکەی بەدانیشتواکەنەی تەنگ کرد.
**إغتَصَّ**: بۆ موتاوەعەی (أغصَّهُ) دێ.
**الغُصَّةُ**: هەرشتێك لەقورگ بگیرێ لەخواردن وخواردنەوە ◦ (ك: غُصَص).
**غَصَنَ الغُصنَ غَصناً**: لقەکەی بڕیەوە.
**غَصنَ الشَّيْئَ**: شتەکەی هەڵگرت.
**غَصَنَ فلاناً عن حاجته**: فلانکەسی لە ئیشەکە لادا ◦ دەشگوترێ: (ما غَصَنَكَ عنِي) چی تۆی لەمن بێ ئاگا کرد.
**اغصَنَ العنقود**: هێشوەکە بۆڵەکانی گەورە بوو.
**أغصَنَ الشجرةُ**: لقی درەختەکە ڕوا.
**غَصَّنَ العنقود**: هێشوەکە بۆڵەکانی گەورە بوون.
**الغُصنُ**: لقی درەختی جۆراوجۆر ئەستور یان باریك ◦ (ك: غصون، وأغصان).
**الغُصنَةُ**: لقی بچکۆلەی لقی گەورەی درەخت.
**غَضِبَ عليه**: ڕقی لێ هەڵساو ویستی تۆڵەی لێ بکاتەوە ◦ (فهو غَضِبٌ وهي غَضِبَةٌ وهو غَضبان وهي غَضبَى).
**غَضِبَ له**: لەسەر ئەو ڕقی لەکەسێکی تر هەڵسا.
**أغضَبَهُ**: هەڵینا بۆئەوەی ڕقی هەڵسێ.
**غاضَبَ فلان فلاناً**: هەریەك لەو دووانە ڕقی یەکتریان هەڵساند.
**غاضَبَ فلاناً**: دەنگی لە فلانکەس دابڕی و لێی دوورکەوتەوە.
**تَغَضَّبَ عليه**: ڕقی لێ هەڵسا ◦

دەگوترێ: (أغضَبَتهُ فتَغَضَّبَ).

**الغُـضابِيُّ**: پیـاوی خـواروخێچ لـە مامەڵەو هەڵس‌و کەوتیدا.

**الغَضِبُ من الرجال**: کەسێـك زوو ڕقی هەڵسێ.

**الغَضَبُ**: ڕق هەڵسان.

**الغَضوبُ**: کەسێك زۆر ڕق هەڵساو بێ زۆر ڕقی هەڵسێ.

**غَضَرَ علیه غَضراً**: بەزەیی پێدا هاتەوە.

**غَضَرَ عنه**: پشتی تێ کرد ◦ خۆی لێ لادا.

**غَـضَرَ الـشَّيْءَ**: شـتەکەی بڕیـەوە ◦ بـۆی دیاری کرد ◦ دەگوترێ:

**غَضَرَ له من مالـه**: لـەماڵ‌و سـامانی خـۆی شتێکی بۆ بڕیەوە بۆی دیاریکرد.

**غَـضَرَ الرجـلَ**: پیاوەکـەی بەنـد کـردو نەیهێـشت کارەکـەی ئـەنجام بـدا ◦ دەگوترێ: (أردت آتیك فغضَرَني أمرٌ).

**غَـضَرَ الجِلدَ**: پێستەکەی زۆر بـاش دەبـاغ کرد.

**غَـضَرَ الله فلانـاً غَـضراً**: خـودا دەرگـای ڕەحمەتی خۆی بۆ فلان کـردەوە نـازو نیعمەتی بەسەردا ڕشت.

**غَضِرَ الرجلُ بالمال والسَّعَةِ والأهل**: پیاوەکە دوای هەژاریی دەوڵەمەند بوو.

**غَضِرَ عن الشَّيْءِ**: ڕوی لەشتەکە وەرگێڕا.

**غَـضُرَ غَـضارةً**: لەخۆشـگوزەرانی‌و نـازو نیعمەتدا بوو.

**غَضُرَ النبـاتُ**: ڕوەکەکە لەگەش‌و نومادا بوو.

**أغتَـضِرَ**: بەگـەنجی مـردو دیـاردەی نەخۆشی پێوە دیار نەبوو.

**تَغَـضَّرَ عنـه**: ڕوی وەرگێـڕاو خـۆی لێ لادا.

**الغاضِـرُ**: قـوڕی لیـنج کـە بـۆ دروسـتکردنی گـۆزەو دیـزە بەکاردەهێندرێ.

**الغَضارةُ**: دەگوترێ: (إنهم لفي غضارة مـن العـیش) ئەوانـە لـەژیان‌و گوزەرانێـکی خۆشـدان ◦ هـەروا بـەمانا قـوڕی لیـنج دێ کـە قـاپ‌و قاچـاغی لێ دروسـت دەکـرێ ◦ یـان ناوە بۆ خودی قاپ‌و قاچاغەکان.

**الغَضراءُ**: زەویەك قوڕەکەی لینج بێ ◦ دەشـگوترێ: (هـم في غـضراء مـن العیش) ئەوان لەژیانی خۆشدان.

**الغُـضروف**: ئێـسقانی نـەرم لەهەرشوێنێـکی جەستەدا بێ.

**غَـضّت المـرأةُ غَـضاضة وغُـضوضةً**: ئافرەتەکـە پێـستی تـەنك بـوو بەجۆرێك خوێنەکەی دیارە.

**غَضِّتِ النبـاتُ وغـیره**: گژوگیاکە تـەڕو تازەیە.

**غَـضَّ بَـصَرَهُ وصَـوته**: چـاوی داخـست، دەنگـی نـزم کـردەوە ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾◦

دەشگوترێ: (غَضَّ الطرف) چاوی داخست لەشەرمو حەیاوە.

**غَضَّ طرفَهُ عن فلان**: سەرپێچی لە فلان قبوڵکردو چاوی لەناستی خراپییەکانی قوچاند.

**غَضَّ الغُصنُ**: لقە درەختەکەی شکاندەوە بەڵام لێی نەکردەوە.

**غَضَّ فلاناً حقه**: مافی فلانکەسی کەمکردەوە لێی داگرت ٥ دەگوترێ: (لا أغُضُّكَ دَرهماً) دیرهەمێکت لێ کەم ناکەمەوە.

**أغَضَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی کەم کردەوە.

**غَضَّضَ الشَّيْئُ**: شتەکە ناسك بوو تەڕو تازە بوو.

**إغتَضَّ منه**: لە ڕێزی کەم کردەوە.

**إنغَضَّ الطَّرفُ**: چاوی خۆی لە تەماشاکردن نزم کردەوە.

**الغُضَاضُ**: پێشە سەرو ناوچەوان (روخسار).

**الغَضاضَةُ**: زەلیلیو تێشکان ٥ ڕەخنەو قورساییو ئەرك.

**الغَضُّ**: تەڕو تازە لەهەموو شتێك.

**الغَضَّةُ**: زەلیلیو تێشکان.

**الغَضِيضُ**: چرۆو پۆخ لەکاتی دەرکەوتنیدا ٥ چاوی پێڵو شۆڕ ٥ زەلیلو خاوەن کەمو کوڕی ٥ (ك: أغِضّاء وأغِضّة).

**المَغَضَّةُ**: زەلیلیو کەمو کوڕی.

**غَضَفَ الفرسُ ونحوهُ غَضَفاً**: ئەسپەکە دەستی کرد بەڕۆیشتن.

**غَضَفَ العيشُ غُضوفاً**: ژیانو گوزەران خۆش بوو.

**غَضَفَ فلان**: فلانکەس دڵی نارام بوو.

**غَضَفَ العودَ والشيئَ**: شورکە دارەکەی شکاندەوە بەڵام بە تەواوی لێی نەکردەوە.

**غَضَفَ الكلبُ أذنَهُ**: سەگەکە گوێچکەکانی خۆی بۆ پێشەوە ڕەپێش کردنو شۆڕی کردنەوە.

**غَضِفَ الشَّيْئُ غَضَفاً**: شتەکە شلو نەرم بوو ٥ دەگوترێ: (غَضِفت الأذنُ، وغَضِفَت الأشفارُ. وغَضِفَت السهمُ) قەوسەکە تیرەکەی ئەستوور بوو.

**غَضِفَ الليلُ**: شەوەکە تاریك بوو ڕەش هەڵگەڕا.

**غَضِفَ العامُ**: ساڵەکە هەرزانی بوو.

**غَضِفَ العَيشُ**: گوزەرانو ژیان خۆش بوو ٥ (فهو أغضَف وهي غَضفاء).

**أغضَفَتِ الثمرةُ**: میوەکە شۆڕ بۆوە.

**أغضَفَتِ النخلةُ**: دارخورماکە لقو پۆپی زۆر بوو میوەکەی خراپ بوو ٥ (فهي مُغضِفٌ ومِغضَفَةٌ).

**أغضَفَت السماءُ**: ئاسمان هەور شاردیەوە.

أغـــضَنَ الليــلُ: شــەو تاريــكو ڕەش داهات.
غَضَّفَهُ: شەكانديەوەو خوارى كردەوە ◦ دەگوترىٚ:
غَضَّفَ العودَ: لقەدارەكەى شكاندەوە.
إنغضَنَ العودُ: لقەدارەكە شكايەوە.
إنغـضَنَ أذنـه: گوێـچكەى شۆڕبوونەوە بەشـــێوەيەكى دەســـتكرد ◦ نـــەك بەخيلقەتو سروشت.
إنغـضَنَ القـومُ في الغبـار: خەڵـكەكە كەوتنە ناو تەپوتۆزەوە.
إنغضَنَ البئرُ: بيرەكە تێك ڕوخا.
إنغضَنَ الـضبابُ: تەمومـژ چـين چـين كەوتە سەر يەك.
تَغضَّفَ: بۆ موتاوەعەى (غَضَفَهُ) دىٚ.
تَغـضَّفَت الحيَـةُ: مارەكـە قـۆرتو پێـچى كرد لە ڕۆيشتندا.
تَغضَّفَ عليـهم الليـلُ: شـەو بـەتاريكى خۆى دايپۆشين.
تَغـضَّفَ علـيهم الـدنيا: دونيـا ڕوى تێكردنو ژيـانو گوزەرانيـان خـۆش بوو.
تَغضَّفَ عليه: مەيلى كرد بۆلاىو سۆزى بۆى هەبوو.
تَغـضَّفَت البئـرُ: بيرەكـە تێـك ڕوخـا، ئەملاو ئەولاى ڕوخانە ناوى.

الغَـــضَفُ: درەختێـــكە لـــە ولاَتـــى هيندوستان دەشوبهێتە دارخورما لە لــقو پۆپــەكانى پــەردە دروســت دەكرێن.
غَـضفَرَ الـشَّيْئُ: شـتەكە قـورسو گـران بوو.
الغُضَافِرُ: شێر.
الغَـضفَرُ: تـەبيات وشـكى سـەر ڕەقو تورە.
الغَـضَنفَرُ: شـێر ◦ دەشـگوترىٚ: (رجـل غَضَنفَرُ) پياوێكى كەتەو زەبەلاحە.
غَضَنَتِ الناقة بولدها غَـضناً وغِـضاناً: حوشـترەكە بێـچووەكەى پـێش كـامڵ بـــوون فـــڕىٚدا ◦ هێـــشتا تـــوكى لىٚ نەهاتبوو نەدەزانرا مێيە يان نێرە.
غَـضَنَ فلانـــاً: فلاَنكەســى بەنــد كــرد ◦ دەگوترىٚ: (ما غَـضَنَكَ عنـا) چى تۆى لەئێمـــە دابـــڕى؟ نەيهێـــشت بێـــى بۆلامان؟.
غَـضِنَت العـينُ غَـضناً: چـاو شـۆڕبوو بەخيلقــەت چــاوى بــەرەو خــوار بوون.
غَضِنَتِ الجَبْهَةُ: ناوچەوان چرچو لۆچى تێكەوتن.
أغـــضَنَت الـــسماءُ: ئاسمـــان بـــارانى بـەردەوام بـوو ◦ دەگـوترى: (أغـضَنَ المطرُ) باران بەردەوام بـوو ◦ (أغـضَنَ

عليه الليلُ) شەو تاريك بوو.

**غاضَنَ عَينَه:** چاوی خۆی داخست بۆئەوەی گومانی خراپی لێ نەکەن‌و بڵێن مێبازی دەکا.

**غاضنت المرأة:** لەگەڵ ئافرەتەکە مێبازی کرد، چاوی لێ هەڵتەکاندو چاوی لێ داگرت.

**غَضَنَت السماءُ:** ئاسمان بارانی بەردەوام بوو.

**غَضَّنَت الناقة:** حوشترەکە بێچووەکەی بە ناکامڵی فڕێدا، لەباری چوو.

**غَضَّنَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دوولاو سێ‌لۆ کردەوە چرچی کرد ◊ گرژی کرد ◊ دەگوترێ: (دخلت على فلان فغَضَّنَ لي من جبهته) چومە لای فلان‌و ناوچەوانی لێ گرژ کردم.

**تغَضَّنَ الشَّيْءُ:** شتەکە چۆمایەوەو شکایەوە.

**الغَضَنُ (الغَضْنُ):** هەرشتێك هەر شکانەوەو لولبوون‌و چەمانەوەیەك روبدا لە قوماش یان زرێ یان پێست یان گوێ یان هەرشتێکی تر (ك: غضون) ◊ دەشگوترێ: (جاء في غضون كلامك هذا) لەناو قسەو وتارەکەت ئەم شتانە هاتن ◊ هەندێ لەقسەکانت ئەمە بوون ◊ هەروا بەمانا نارەحەتی‌و ماندوو بوون دێ ◊ دەگوترێ: (لأطلَنّ غَضَنَكَ) درێژە دەدەم بە ماندوو بونت‌و ناهێڵم ئیسراحەت بکەی.

**الغَضَنفَرُ:** بڕوانە (غَضفَر).

**غَضَا الليلُ غَضواً وغُضُواً:** شەو بەتاریکی خۆی هەموو شتێکی داپۆشی.

**غَضَا البعيرُ:** حوشترەکە لە درەختی (غەضا)ی خوارد.

**غَضَا فلان:** فلانکەس خواردن‌و پۆشاك‌و پێداویستیەکانی ژیانی بۆ پەیدا کرابوو ◊ بۆخۆی ژیانی خۆی چاك کردبوو ◊ پێڵوی چاوی لێك نزیك کردنەوە، خەریك بوو چاوی بقوچێنێ.

**غَضَا على الشَّيْءِ:** لەشتەکە بێدەنگ بوو.

**غَضِيت الأرضُ:** زەویەکە درەختی (غەضا)ی زۆر بوو.

**غَضَا الرجلُ:** پیاوەکە چاوی خۆی قوچاندن.

**غَضَا البعيرُ:** حوشترەکە بە زۆرخواردنی گەڵای درەختی (غەضا) ژانە سکی گرت.

**أغضى الليلُ:** شەو بەتاریکی خۆی هەموو شتێکی داپۆشی.

**أغضى فلان:** فلانکەس پێڵوی چاوی لێك نزیك کردنەوە.

**أغضى عنه طرفَه:** چاوی خۆی لێ قوچاند.

**أغضى على الشَّيْ:** لەشتەكە بێدەنگ بوو، خۆی لەسەر گرت ٥ بەئارام بوو لەسەری ٥ دەگوترێ: (أغضى عينا على قذى) صەبرو ئارامی هەبوو لەسەر ناخۆشی.

**تغاضى عنه:** چاوپۆشی لێ كرد، خۆی لێ گێل كرد.

**الغاضيةُ من الليل:** شەوی زۆر تاریك ٥ شەوی دەیجور.

**الغاضية من النيران:** ئاگری زۆرو گەورەو بەبڵێسە.

**الغضى:** درەختێكە لە درەختی (الآثل) دارەكەی زۆر رەقو پتەوە، پشكۆكانی زۆر دەمێننەوەو بەزوویی ئابن بەخۆڵەمێشو ناكوژێنەوە ٥ (أهل الغضا) ئاوە بۆ دانیشتوانی وڵاتی نەجد چونكە ئەو وڵاتە درەختی (غەضا)ی زۆرە.

**الغضياءُ من الأرض:** زەویەك زۆری درەختی (غەضا) هەبێ.

**غَطرَسَ على أقرانه:** زۆری كەشو فش بەسەر هاوەڵەكانیدا كرد ٥ شایی بەخۆی بوو بەخۆی نازی.

**غَطرَسَ فلاناً:** رقی فلانكەسی هەڵساند ٥ فلانی تورەكرد.

**تغطرَسَ:** بەمانا (غَطرَسَ) دێ ٥ رقی هەڵسا ٥ تورە بوو.

**تغطرَسَ في مشيته:** لە رۆیشتندا خۆی بادا ٥ لارو لەنجەی كرد.

**الغِطرِسُ:** ستەمكاری گەورەو خۆ بەزلزانو لوتبەرز ٥ (ك: غطارِس).

**الغِطريسُ:** بەمانا (الغِطرِسُ) دێ ٥ (ك: غطارِس).

**غَطرَشَ فلان غَطرَشَةً:** فلانكەس ملی بۆ حەق نەداو خۆی بەزلزانیو تەكەبوری كرد ٥ (فهو مغطرِش وهي مغطرِشَة).

**تَغطرَشَ فلان:** لوتبەرزی لەشتەكە كرد.

**غَطرَفَ:** خۆی باداو خۆی بەزلزانیو خراپەكاری كرد.

**تَغطرَفَ:** بەمانا خۆبادانو خۆبەزلزان دێ ٥ لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی كرد.

**الغَطارِفُ:** پیاو ماقوڵو رێزدار.

**الغِطريفُ:** بەمانا (الغَطارِفُ) دێ ٥ (ك: غطارِفه وغطاريف).

**الغِطرافُ:** بەمانا (الغُطارِف) دێ.

**غَطَسَ في الماء غَطساً:** خۆی لەئاودا نوقم كرد.

**غَطَسَ في البحر من أنعمه:** لە نازو نیعمەتدا نوقم بوو.

**غَطَسَ في الإناء:** دەمی نا بەگۆزەكەوەو ئاوی خواردەوە ٥ لەقاپەكەدا ئاوی خواردەوە.

**غَطَسَ الشَّيْئَ في الماء**: شتەکەی لەئاوەکەدا نوقم کرد.
**غَطَّسَهُ في الماء**: لەئاودا نوقمی کرد.
**تَغَاطَسَ القومُ**: خەڵکەکە یەکتریان لەئاودا نوقم کرد.
**تَغَاطَسَ الرجلُ**: پیاوەکە خۆی گێل کرد.
**الغَاطِسُ**: دەگوترێ: (لیل غاطِسٌ) شەوێکی تاریکە ٥ هەروا ناوە بۆ خواروی کەشتی کە لەئاودا نوقم دەبێ.
**الغِطَاسُ**: شتنی منداڵە مەسیحیە لە ئاوی (العمودیة)دا ٥ (عید الغطاس) جەژنێکی ئایینی قیبتییەکانە تێیدا یادی لە ئاودا شتنی حەزرەتی مەسیح دەکەنەوە.
**الغَطَّاسُ**: کەسێك پیشەی خۆ نقوم کردن لەئاودا بێ بۆنەوەی پێویستی خۆی لەناو دەربێنێ ٥ پێشی دەگوترێ: (ألغوّاص).
**الغطیسُ**: رەش ٥ زۆر رەش.
**المَغطِسُ**: شوێنی خۆشتن لەحەمامدا (ك: مغاطِس).
**غَطَشَ الليلُ غَطشاً**: شەو تاریك بوو.
**غَطَشَ فلان غَطشاً**: فلانکەس لەبەر پیری یان نەخۆشی بەهێواشی رۆیشت.
**غَطِشَ غَطَشاً**: چاوی کزبوو، وەکوو ئەوە بە بەشێکی چاوی تەماشا بکا ٥ (فهو أغطَش وغَطِشٌ وهي غطِشَةٌ وغطشى وغَطشاء).
**أغطَشَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە ناو تاریکییەوە.
**أغطَشَ الله الليلَ**: خودا شەوی تاریك کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾.
**غَطَّشَ**: دەگوترێ: (غَطِش لي شيئاً) رێگایەکەم بۆ بکەرەوە، بۆ قسەکردن و دەربڕینی راو و بۆچون.
**تَغَاطَشَ عنه**: خۆی لێ گێل کرد خۆی بێ ئاگا کرد.
**تَغَطَّشَت عَينُهُ**: چاوی تاریك بوو نەیبینی.
**إغطَاشُ البصرُ**: بینایی تاریك بوو، وردە وردە چاوی زەعیف بوو.
**غَطَّ في نومه غَطّاً وغَطيطاً**: لە خەودا پرخە پرخی کرد دەنگی لێ هات ٥ دەگوترێ: (غَطَّ النائمُ وغَطَّ المذبوح وغَطَّ المخنوق).
**غَطَّت القِدرُ**: مەنجەڵەکە (دیزەکە) کوڵی و دەنگی قڵپە قڵپی هات.
**غَطَّ الشَّيْئَ في الماء غَطّاً**: شتەکەی لەناو هەڵکێشاو نقومی کرد.
**غَطَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی کەبس کردو گوشی و دایچۆڕاند.

**إنغطّ في الماء**: نقوم بوو چووه بن ئاو.
**تغاطّ القومُ في الماء**: لەئاودا خەڵكەكە هەریەكەیان ئەوی تری نقوم كرد.
**الغُطاطُ**: تێكەڵبوونی تاریكی كۆتایی شەو بەسەرەتای روناكی ڕۆژ.
**غَطغَطَتِ القِدرُ**: دیزەكە (مەنجەڵەكە) كوڵاو قڵپەكانی بەرزبوونەوە.
**غَطغَطَ البحرُ**: دەریا شەپۆلەكانی بەرز بوونەوە.
**تَغطغَطَ البحرُ**: بەمانا (غَطغَطَ) دێ.
**تَغطغَطَ**: وردو هاڕبوو.
**غَطِفَ العيش غَطفاً**: ژیان خۆش‌و ئارام‌و هەرزانی بوو.
**غَطِفَ الرجلُ**: پیاوەكە برژانگ‌و موژوڵی زۆرو چڕو پڕو درێژ بوون ○ موی برۆی كەم بوون تەنك بوو ○ (فهو أغطَف وهي غَطفاء).
**غَطا الليلُ غَطواً وغُطُواً**: شەو تاریك بوو تاریكییەكەی هەموو شتێكی داپۆشی.
**غَطا الشَّيْءَ**: شتەكەی شاردەوە داپۆشی.
**أغطت الشجرةُ**: درەختەكە لقەكانی درێژبوون‌و بەسەر زەوی دا بڵاو بوونەوەو دەورو بەری خۆی داپۆشی.
**أغطّ الكرمُ**: دار مێوەكە ئاوی خواردەوە كەوتە گەشەو نەشە.
**غَطّاً الشَّيْءَ**: شتەكەی داپۆشی‌و ونی كرد ○ دەگوترێ: (اللهم أغط على قلبه) خودایە دڵی داپۆشە.
**غَطّاهُ**: دایپۆشی ونی كرد.
**غَطّى الليلُ فلاناً**: شەو تاریكی خۆی كردە بەرفلان ○ بەتاریكی دایپۆشی.
**إغتَطى**: ون بوو داپۆشرا ○ دەگوترێ: (إغتطى به) خۆی پێ داپۆشی.
**الغِطاءُ**: پەردە، داپۆشەر، هەرشتێك بخرێتە سەر شت‌و دایپۆشێ.
**الغِطايةُ**: ژێر كراس ○ ئەو پۆشاكە نەرم‌و تەنكەی ئافرەت لە ژێر پۆشاكەوە لەبەری دەكا.
**الغَطَوانُ**: داكۆكی كردن‌و بەرگری‌و زۆری ○ دەگوترێ: (إنه لذو غطوان).
**الغَطَيانُ**: (غَطَيان البحر) هەڵچوونی دەریا.
**المُغطِيُّ**: دەگوترێ: (فلان مَغطِيُّ القناع) فلانكەس نەناسراوو بێ ناوو نیشانە.
**غَفَرَ الجريحُ أو المريضُ**: برینەدارەكە تێ شكا برینەكەی هەڵوەشایەوە.
**غَفَرَ العاشقُ**: عاشقەكە سۆزو ئەندێشەی لەوە پێشی بۆ گەڕایەوە.
**غَفَرَ الشَّيْءَ**: شتەكەی داپۆشی.
**غَفَرَ الشيبَ بالخضاب**: پیری بەخەنە لەخۆدان شاردەوە مووە سپیەكانی بەخەنە ڕەنگ كردو دایپۆشین.

**غَفَرَ المتاع في الإناء**: كالآكانى خسته ناو قاپو زەرفەکەو دايپۆشى.

**غَفَرَ الله له ذنبه غَفراً**: خودا تاوانەكانى داپۆشين‌و لەگوناهەكانى خۆش بوو.

**غَفَرَ الجَلَبُ السوقَ**: هاوردە (كالآهێنەر) بازاڕى شكاندو هەرزانى خستە ولآتەوە.

**غَفِرَ الثوبُ**: قوماشەكە توكى هەڵدا.

**غَفِرَ الجرحُ أو المريضُ**: نەخۆشەكە حاڵى تێكچو، برينەكە تێكچووەوە، خراپ بۆوە.

**أغفَرَ الرَفثُ والعرفُط**: ڕوەكى رەفس يان (عورفوت) جەوى‌و لينجايى ناو خۆيان دەردا.

**أغفَرَ النخلُ**: خورماكە توێكلێكى تەنكى لەسەر پەيدا بوو.

**أغفَرَت الأرضُ**: زەويەكە ڕوەكى غەفرى تێدا ڕوا.

**أغفَرَت أنثى تيس الجبل**: بزنە كێوى بێچوى نێرى بوو.

**أغفَرَ المتاع في الوعاء**: كالآكەى خستە زەرفى خۆيەوەو پێچايەوە شارديەوە.

**أغفَرَ الشيبَ بالخضاب**: پيرى بەخەنەو بۆيە شاردەوە ؛ مووە سپيەكانى ڕيش سەرو سمێڵى بۆيە كرد.

**إغتَفَرَ له ذنبه**: لە گوناهەكانى خۆش بوو.

**تغافرَ القومُ**: خەڵكەكە داواى لێخۆشبوونيان بۆيەكترى كرد.

**تَغَفَّرَ**: جەوى‌و بەرە ميغفارەكانى لە ڕوەك‌و درەختەكان چنى.

**إستَغفَرَ اللهَ ذنبه**: داواى لە خودا كرد لەتاوانەكانى خۆش بێ.

**إغْفَارَّ الثوبُ**: قوماشەكە توكى هەڵدا.

**الغَفَّارُ**: توكێكى وردە (گەندە موو) لەسەر ڕومەت‌و پشتەمل‌و ناوچەوانى ئافرەت دەردەكەون.

**الغِفارُ**: نيشانەيەكە لەسەر ڕومەت.

**الغِفَارَةُ**: پارچە قوماشێكى بچوكە ئافرەت بەسەرى خۆيدا دەدا لە هەموو لايەكەوە سەرى دادەپۆشێ تا سەرشانى يان كەمتر ○ چارۆكە، پەچە ○ هەور لەسەر هەور ○ كلآوێكە لەمادەى زرێ دەچندرێ‌و لەژێر مێزەرو كلێتە لەسەر دەكرێ ○ (ك: غفائر).

**الغَفَرُ**: سك ○ گەندەموو ○ توكە وردەى سەر قوماش ○ مەنزڵێكى مانگە لە بورجى سونبولەدا كە بە مەنزڵى پانزەهەمى مانگ حسێب دەكرێ.

**الغِفرُ**: گۆلك (بێچوى مانگا).

**الغُفرُ**: گيسكە نێرى حەيوانە كێوى (بێچوى نێرى حەيوانە كێوى).

**الغَفَرُ**: ڕوەكێكە لە دەشتايى‌و تەپۆڵكەدا دەروێ، يان لەوەڕى ورد كراوو گێرە كراو.

**الغَفِـرُ**: دەگـوترى: (رجـل غَفِـرُ القفـا) پياوێـکە پـشتەملى تووکـە وردەى پێوەيە.

**الغُفْرَةُ**: مێينەى حەيوانە کێوى ◦ هـەر پـەردەو داپۆشـەرێـك شـتى پـێ داپۆشى ◦ شتى گونجاو بۆ شتى تر ◦ دەگوترێ: (إغفِروا هذا بغفرته) ئەوە بەشتێکى گونجاو چاك بکەنەوە.

**الغَفـيرُ**: گەنـدەموو ◦ زۆرو زەبەنـدە ◦ دەگـوترى: (جـاء القـومُ جمّـاً غَفـيراً) خەڵکەکە بەزۆرى هاتن بۆلام.

**الغَفيرَةُ**: دەگوترێ: (مـا عنـدهم غفـيرَةُ) لێخـۆش بوونيـان نييـە لەکـەس خۆش نابن ◦ سەرپۆش‌و چارۆکە ◦ زۆرو زەبەندە.

**المِغفارُ**: جەويەکە صمغێکە لە درەختى عورفـوت دێتـە دەر دەخـورێ، يـان دەکرێتـە نـاو تورەکـەو قوماشـەوە لەگـەڵ ئـاو دەهەژێنـدرێ‌و دەخورێتەوە.

**المِغفَرُ**: کڵاوێکە لەزرێ دروست دەکرێ بـۆ پاراسـتنى سـەر لـە ژێـر قەلنسووەوە لەسەر دەکرێ.

**المِغفَرَةُ**: بەمانا (المغفار) دێ.

**غافَـصَهُ**: لـەناکاو گرتـى، لەکاتێـکدا گرتـى کـە خـەريکى ئەنجامـدانى تاوانەکەى بوو.

**الغافِصَةُ**: بەڵاو کارەساتى ڕۆژگار (ك: غوافص).

**إغتَفَّـت الدّابـةُ**: وڵاخەکـە بەسـەر پێيەکـەوە لـەوەڕى کـەم کـەمى خوارد.

**إغتَـفّ فلانـاً**: شتێـکى کـەمى دا بەفلانکەس.

**تَغَفَّفَتِ الدابة**: بەمانا (إغتَفَّت) دێ.

**تَغَفّفَ الإناء والضرعُ**: ئەو کەمايەتيـەى لە قاپەکەدا بـوو يـان لـە گوانەکـەدا بوو دايدۆشى‌و دەرى هێنا.

**الغَفُّ**: پوش‌و گەڵا وشکە.

**الغِفانُ**: کات‌و وەرز ◦ دەگـوترى: (جـاء على غِفانه) لەکاتى خۆيدا هات.

**الغُفَّـةُ**: ژيـانى کوللـە مـەرگى، ژيـانى مامناوەنـدى ◦ ئـەو قـەپاڵ‌و پـاروە لەوەڕانـەى حوشـتر بەسـەر پێـوە دەيخـوا (لالـەوەڕ) شـتى کـەم لەبـەهاردا ◦ پاشمـاوەى شـيرى نـاو گوان‌و پاشماوەى ناو قاپ‌و قاچاخ.

**غَفَقَ فلان غَفقاً**: فلانکەس کتوپڕ لەناکاو هێرشى کردە سەر شتەکە.

**غَفَقَ فلان**: فلانکەس دواى ونبونى لەناکاو سەرى هەڵێنايەوە.

**غَفَـقَ الرجـلُ**: پياوەکـە جـار دواجـار خواردنەوەى زۆرتر بوو.

**غَفَقَ فلان غَفَقَةً**: فلانکەس نوست‌و بـەدەم

خەوەکەیەوە گوێی لەقسەی خەڵکەکە بوو.

**غَفَّقَ**: نوستو بەدەم خەوەکەیەوە گوێی لەدەنگی خەڵکەکە بوو.

**إغتَفَقَ به**: دەوری دا.

**تَغَفَّقَ الشرابَ**: جار دواجار شەرابەکەی زۆر خواردەوە.

**الغَفقُ**: بارانی کەم، وردەباران.

**غَفَلَ عَن الشَّيْءِ**: لە شتەکە غافڵ بوو لەبەر کەم بەئاگایی‌و نازیرەکی.

**غَفَلَ الشَّيْءَ**: وازی لەشتەکە هێنا لەبەر کەم بایەخ پێدانی ◦ شتەکەی داپۆشی ◦ (فهو غافل) ◦ (ك: غُفُول وغُفلٌ).

**أغفَلَ الشَّيْءَ**: لەشتەکە بێ ئاگا بوو.

**أغفَلَ الدَّابةَ**: وڵاخەکەی نیشانە نەکرد ئاژەڵەکەی داغ نەکرد.

**أغفَلَ فلاناً عَن الشَّيْءِ**: فلانکەس شتەکەی غافڵ کرد ◦ فلانکەسی بەغافڵ‌و بێئاگا بینی ◦ لەکاتی ئیشکردن‌و مەشغوڵیدا پرسیاری لێ کرد ڕانەوەستا تا لە ئیشەکە تەواو دەبێ.

**أغفَلَ فلاناً عَن الشَّيْءِ**: فلانکەسی لەشتەکە غافڵ کرد.

**غَفَّلَ فلاناً**: فلانکەسی غافڵ کرد وازی لێ هێنا لەکاتێکدا بەخۆی نەزانی.

**تغافَلَ**: بەئەنقەست خۆی بێئاگا کرد ◦ خۆی بەبێ ئاگا خستە بەرچاو.

**تَغَفَّلَ فلاناً**: لەکاتی بێئاگایی هاتە لای ◦ چاوەڕوانی ئەوەی کرد بێئاگا بێ.

**تَغَفَّلَ عن كذا**: لەکاتی بێ ئاگابوون دا فێڵی لێ کرد.

**إستَغفَلَهُ**: داوای غافڵ بوونی لێ کرد چاوەڕوانی غافڵبوونی ئەوی کرد.

**الغُفلُ**: کەسێکە خێرو شەڕی لێ چاوەڕوان نەکرێ، هیچی لەدەست نەیە ◦ پیاوێك وەجاغزادە نەبێ ◦ قوداحی قومار کە بێ نیشانە بێ ◦ شتێك نەقازانجی هەبێ نەزیانی لێ چاوەڕوان بکرێ ◦ دەگوترێ: (قدح غُفلٌ) هەروا وشەی (غَفلٌ) ناوە بۆ زەویەك نیشانەی ئاوەدانی تێدا نەبێ ◦ ڕێگایەك ئاوەدان نەبێ کەسی پێدا نەڕوا ◦ هەروا ناوە بۆ پیاوێك ڕۆژگار قاڵی نەکردبێ‌و دونیا دیدە نەبێ ◦ زەویەك بارانی لێ نەباریبێ ◦ مەوادی خام کەهێشتا شتی لێ دروست نەکرابێ ◦ شیعرێك شاعیرەکەی نەناسراو بێ ◦ کتێبێك نووسەرەکەی ناوی نەهاتبێ.

**الغَفَلُ**: گوزەران خۆشی ◦ دەگوترێ: (فلان في غفل من عيشه) فلانکەس لەگوزەرانی خۆشدایە.

**المُغَفَّلُ**: گێل‌و نەفام.

**غَفا غُفواً**: کەمێك نووست ◦ سەرخەوێکی شکاند.

**غفا الشَيْءُ على الماء**: شتەکە سەرئاو کەوت.

**أغفى فلان**: فلانکەس کەمێك نووست، سەرخەوێکی شکاند ◊ لەسەر خەرمانی کا نووست.

**أغْفَت الشجرةُ**: درەختەکە لقەکانی شۆڕ بوونەوە.

**الإغفاءَةُ**: نووستنێکی کەم سەرخەو شکاندن.

**الغَفا**: کا لەسەر خەرمان: سۆی گەنم (توێکڵی گەنم).

**الغَفوَةُ**: کۆختەو چاڵی نێچیرەوان کەخۆی تێدا حەشار دەدا.

**غَفَى البُرَّ ونحوه غَفياً**: گەنمەکەی لە کۆزەڵو بنزیل پاك کرد.

**غَفِيَ غفىً**: هەنۆزی برد.

**أغفى الطعامُ**: خۆراکەکە توێکڵو ڕەگو دەنكو شتی وای زۆر بوو.

**أغفى البُرَّ ونحوه**: گەنمەکەی پاك کرد.

**غَفَّي الطعامَ**: خواردنەکەی لە توێکڵو شتی وا پاك کردەوە.

**إنغفى الشَيْءُ**: شتەکە شکا.

**الغَفَى**: کاو کۆت لەسەر خەرمان ◊ خشتو خۆڵو زیزانەو مرۆرو شتی وا کە تێکەڵ گەنم دەبێ ◊ شتی خراپو نایەغ لەهەر شتێك بێ ◊ دەردێکە تووشی دارخورما دەبێ ؛ جۆرە تەپ و تۆزێکە دەکەوێتە سەر خورماکەو ناهێڵێ بگاو پێبگاو تامی ناهێڵێ بەکوردی پێی دەگوترێ: دەوکە ◊ توێکڵێکە دەکەوێتە سەر دەنکە خورمای بەرسیلەو نەگەیشتوو ◊ خوێڕیو هەتیو مچە.

**الغُفاءُ**: کا و کۆت کرشەو پڵو پوشی گەنم ◊ دەردێکە تووشی دارخورما دەبێ وەکوو تەپو تۆز وایە دەکەوێتە سەر خورما بەرسیلەو ناهێڵێ پێبگاو شیرین ببێ.

**الغُفاءَةُ**: سپێنی چاو کە گلێنەی چاو داپۆشێ ◊ زیزانەو مرۆرو قەڵداسوو شتی وا کە تێکەڵ گەنم دەبێ.

**غِق غِق**: لاسایی کردنەوەی دەنگی مەنجەڵە لەکاتی کوڵینیدا ◊ هەروا ناوە بۆ دەنگی باڵندەو خوڕەی ئاو لەهەندێ حاڵەتدا.

**غَقَّ القارُ والقِدرُ ونحوهما غَقّاً**: مەنجەڵو دیزەکە لەکاتی کوڵانیدا دەنگی قلپە قلپی پەیدا کرد.

**غَقَّ الطائرُ غَقيقاً**: باڵندەکە دەنگی لێوەهات.

**غَقَّ الماءُ غَقّاً**: ئاوەکە دەنگی لێوەهات کاتێك لە فراوانەوە بچێتە تەنگە بەراییەوە.

**غَلغَقَ الصقرُ:** بازەكە قيراندى ٥ دەنگى خۆى باريك كردەوە.

**غَلَبَهُ غَلباً وغَلَباً:** ژێربارى كرد پرواندى بەسەريدا زاڵ بوو.

**غَلَبَ فلاناً على الشَّيْئ:** شتەكەى بەزۆر لەفلان ستاند.

**غَلَبَ على فلان الكرمُ:** فلانكەس زۆربەى رەوشتەكانى سەخاوەتو پياوەتى تێدا بوو.

**غَلَبَت عليه الحمرة أو الصفرة:** رەنگى سورى تێدا زۆر بوو يان رەنگى زەرد بەسەريدا زاڵ بوو.

**غَلِبَ غَلَباً:** ملى ئەستور بوو.

**غَلِبَت الحديقة:** باخەكە درەختەكانى تێك چرژابوونو لێك هاڵابوون ٥ قورئان دەفەرموێ:﴿وَحَدَائِقَ غُلْبًا﴾.

**غُلِبَ على الشَّيْئ:** بەزۆر شتەكەى لێ ستاند.

**غالَبَهُ مُغالبةً وغلاباً:** هەريەكێ لەو دوانە ويستى بەسەر ئەوى تردا زاڵ ببێ.

**غَلَّبَهُ عليه:** واى لێ كرد بەسەرى دا زاڵ ببێ.

**غُلِّبَ على صاحبه:** بريار درا بۆى كە زاڵ بووە بەسەر هاوەڵەكەى دا.

**تغالبوا على البلد:** هەندێ لەوانە زاڵ بوون بەسەر هەندێكى تريانـدا لە گرتنى ولاتەكەدا.

**تَغَلَّبَ على بلد كذا:** بەزۆر فلان ولاتى كۆنترۆڵ كرد.

**إستَغلَبَ عليه الضحكُ:** پێكەنينى زۆر هات ؛ لەپرمەى پێكەنينى دا.

**إغلَولَبَ العُشبُ:** گياو گژەكە تێك هاڵاو گەشەى كرد.

**إغلَولَبَت الحديقة:** باخەكە درەختەكانى چرو پر بوون لقەكانيان تێك چرژان.

**إغلَولَبَ القومُ:** خەڵكەكە زۆر بوون.

**الأغلَبُ:** مل ئەستوور ٥ زۆر، دەگوترێ: (على الأغلب وفي الأغلَب) زۆر جار، بەزۆرى ٥ شێر.

**الأغلَبيَّة:** زۆرينە ٥ (الأغلبية المطلقة) ئەوەيە لە هەڵبژاردندا زياد لە نيوەى دەنگەكان بێنێ ٥ (الأغلبية النسبية) ئەوەيە پاڵێراوێك لەچاو پاڵێوراوێكى تردا دەنگى زياتر بێنێ.

**التَّغليب:** لە بوارى زمانەوانيدا هەڵبژاردنى وشەيەكە بەسەر وشەيەكى تردا بەمەرجێ لەنێوانياندا پەيوەندييەك هەبێ وەكوو (الأبوين، العمرين، المشرقين، الوالدين).

**الغَلَبَةُ:** ناونانى شت بەناوێك بەهۆى زۆر بەكار هێنانەوە ٥ وەكوو چۆن لەزاراوەى شەرعزاناندا وشەى

**فَـرِثَ الرجلُ فَرَثـاً:** پیاوەکـە تێـر بـوو ◦ دەگوترێ: (شـرِبَ علـى فَـرِث) لەسەر تێری خواردیەوە.

**فَرِثَ القومُ:** خەڵکەکە پەرتەوازە بوون.

**أفرَثَ الكرِث:** بەمانا (فَرَثَها) دێ.

**أفـرَثَ الرجـلَ:** تانـەو تەشـەری لـە پیاوەکەدا، زەبری لێ وەشاند.

**أفـرَثَ أصـحابَه:** بـە فیتننـەیی و دووزمانی هاوەڵەکانی خۆی خستنە نـاو گێـژاو و چـورتمەوە ◦ وای لێ کـردن بکەونـە بـەر تانـەو تەشـەری خەڵك.

**إنفَرَثَت الحُبلى:** بەمانا (فَرَثَت) دێ.

**تَفَرَّثَ القومُ:** خەڵکەکە پەرتەوازە بوون ◦ (تَفَرَّثَـت الحبلـى) ئافرەتـە دووگیانەکـە بـەهۆی قورسـی سکەکەیەوە تەنگەنەفەس بوو.

**الفُراثَةُ:** باقی ماندەی خۆراك لەگەدەدا.

**الفَـرثُ:** بـەمانا (الفُراثـةُ) دێ ◦ قورئـان دەفەرموێ: ﴿نُسقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾.

**الفَرِثُ:** تێرو تەسەل ◦ (المكان الفَـرِثُ) شوێنێـك نـە کێـو و کـەژ بـێ نـە دەشتایی بێ.

**فَـرَجَ بـين الـشيئين فرجـاً:** درزو قەڵشتی خستە نێوان دوو شت ◦ یان شتەکەی شەق کرد ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ﴾: کاتێـك ئاسمـان شـەق بوو، درزی برد.

**فَـرِجَ القـومُ لـه:** خەڵـکەکە رێـگەیان بـۆ درِدا، شوێنیان بۆ فراوان کرد.

**فَرَجَ اللهُ الغَمَّ:** خودا غـەمو ناخۆشیەکەی لابرد.

**فَرِجَ فَرَجاً:** شـەرمگای دەرکـەوت ◦ ترسـاو تاسا ◦ سمتی گەورە بوون.

**فَرِجَت ثنايـاهُ:** ددانـی پێـشەوەی شـاش بوون ◦ بۆشایی کەوتە نێوانیانەوە ◦ (فهو أفرج وهي فرجاء).

**فَرُجَ فَراجَةً:** نهێنی نەپاراست.

**أفـرَجَ الغُبـارُ:** تـەپو تۆزەکـەی لاچـوو نەما.

**أفرَجَ القَومُ عن المكـان:** خەڵـکەکە لـەو شوێنە دەرچوون.

**أفـرَجَ عـن الحبـيس:** بەندییەکـەی مەرەخەس کرد ◦ دەگوترێ: (أفـرَجَ عن الأسير أفرَجَ عن المال).

**أفرَجَت الدجاجَـةُ:** مریشکەکە جوجکی هەڵێنان.

**فَـرَّجَ الـشَّيءَ:** شـتەکەی فـراوان کـرد.

**فَـرَّجَ اللهُ الغـمَّ:** خـودا خـەمو خەفەتەکەی لابردو رەواندیەوە.

**إنفَـرَجَ الـشَّيءُ:** شتەکە فـراوان بـوو ◦ دەگوترێ: (إنفـرجَ مـا بـين الـشيئين) درزی نێوان دوو شتەکە فراوان بوو.

**إنفَرَجَ الغَمُّ والكَربُ**: غەمو نارەحتیەكان ڕەوانەوەو نەمان.

**تَفَرَجَ الرجلُ بكذا وعليه**: پیاوەكە تەسەللای هاتو خەمو پەژارەی ڕەوینەوە، بەو گەڕانو تەماشا كردنە غەمەكانی بەبادا.

**التفارُجُ**: (تفارج الأصابع) بۆشاییو درزی نێوان پەنجەكان.

**الفَرجُ**: درزو قەوارەی نێوان دووشت ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾: ئاسمان هیچ درزو قەوارەی تێدا نیە ◦ هەروا بە كینایەو دركە بەشەرمگای ئادەمیزاد دەگوترێو بەزۆری بۆ ئەو وانێكو هینەی پیاوو ئافرەت بەكاردێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾ ◦ یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ ◦ هەروا ناوە بۆ سەنگەرو بەندەنی ترسناك ◦ (فروج الأرض) ئەملاو ئەولای زەویو كونو كەلەبەری.

**الفَرَجُ**: لاچوونی خەمو خەفەتو چورتمو ناخۆشی.

**الفُرُجُ من الرجال**: پیاوێك نهێنی لا نەمێنێتەوە.

**الفُرجَةُ**: درزو كەلەبەری نێوان دوو شت ◦ لاچونی غەمو ناخۆشی ◦ بینینی شتی غەم ڕەوێن.

**الفَرَجِيَّةُ**: جبەی پیاو ی ئایینی پۆشاكێكی پانو قۆڵ درێژە پیاوی ئایینی لەبەری دەكا.

**الفَرُّوجُ**: كراسی بچوك ◦ جوجك؛ بێچوی مریشك.

**الفَرِيجُ**: كەوانێك ژێیەكەی لێ ترازابێ ◦ مێینەیەك زۆری منداڵ بووبن ◦ شتی بەدەرەوەو ئاشكرا بۆ نێرو مێ.

**المُفرَجُ**: كوژراوێك نەزاندرێ كێ كوشتویەتی ◦ مرۆڤی بێ كەسو بێ دەر نە ئەوەی هەبێ نە هۆزو خێڵ نەماڵو سامان.

**المُفَرَّجُ**: شانە ◦ كەسێك بن هەنگڵی پانو پۆڕ بێ.

**ألزاوية المنفرجة**: زاوییەی كراوە: كە لە نەوەد دەرەجە زیاتر بێ.

**الفِرجَارُ**: پەرگاڵ؛ پەرگار ئامێرێكە دووقاچی هەیە كەوانەو شتی وای پێ ڕەسم دەكرێ.

**فَرجَنَ الدَّابَةَ**: وڵاخەكەی ڕنەك كرد ◦ بە ڕنەك پێستی وڵاخەكەی پاك كردەوە.

**فَرجَنَ الثوبَ**: بە فڵچە كراسەكەی خاوێن كردەوە.

**الفِرجَونُ**: ئامێرێكە لە ئاسن وەكوو

شانە ددانی بۆ کراون ولاخی پێ ڕنەك دەکرێ ، بە کوردی پێی دەگوترێ: ڕنەك.

**فَرِحَ فَرَحاً**: کەیف خۆش بوو، ڕازی بوو لەحەدیس دا هاتووە: (للهُ أشدّ فَرَحاً بتوبة عبده) ، دەشگوترێ: (فَرِحَ بكذا) بەو شتە کەیف خۆش بوو.

**أفرَحَهُ**: کەیف خۆشی کرد.

**فَرَّحَهُ**: کەیف خۆشی کرد.

**المِفرَاحُ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (فَرِحَ) دێ.

**المُفرَحُ**: کەسێك قەرزداربێ قەرز شانی گرتبێو نەتوانێ بیداتەوە.

**أفرَخَ الطائِرُ**: باڵندەکە بێچوی بوون.

**أفرَخَت البيضةُ**: هێلکەکە شکاو جوچکی لێ هاتە دەر.

**أفرَخَ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە پەلو پۆی کردن.

**أفرَخَ فؤادُهُ**: دڵی ئارام بوو خەمو خەفەتی تێدا نەمان.

**أفرَخَ رَوعُهُ**: دڵی بی خەم بوو.

**أفرَخَ الأمرُ**: کارەکە دوای چەواشەیی مەعلوم بوو دەرکەوت چۆنەو چۆن نیە.

**أفرَخَ الله روع فلان**: خودا خەمو خەفەتی لە دڵی فلان لابرد.

**أفرَخَ القومُ بيضتهم**: خەڵکەکە نهێنی خۆیان ئاشکرا کرد.

**فَرَّخَ الطائِرُ والبيضةُ والزرعُ**: باڵندەکە بێچوی هەڵێنان ، هێلکەکە جوچکی لێ هاتە دەر کێڵگەکە جوچکی تێدا پەیدا بوو.

**فَرَّخَ القومُ**: خەڵکەکە ترسانو زەلیل بوون.

**فَرَّخَ الأمرُ**: کارەکە دوای چەواشە بوونی ئاشکرا بوو واقیعەکەی ڕوون بۆوە.

دەگوترێ: (باض الشيطان في رأسه وفَرَّخَ) شەیتان گەرای لەسەری دانایەوەو گومڕای کرد.

**إستفرَخَ الطائرُ**: باڵندەکەی ڕاگرت بۆئەوەی هێلکەی بۆ بکا ، جوچکەی بۆ بەرهەم بێنێ.

**الفَرخُ**: لە بنەڕەتدا ناوە بۆ بێچوی باڵندە، جوچکی پەلەوەر بێچوی هەموو هێلکە کەرێك ، هەروا ناوە بۆ هەموو بێچوی بچکۆلەی گیانداران ، بۆ نەمامی درەخت ، بۆ پیاوی زەلیلو ژێر دەستە ، بەروبوومی کشتو کاڵ کە زاری کردبێتەوەو دەنکەکەی دەرکەوتبێ ، پێشەوەی دەماغ.

**فِراخ الشجرة**: ئەو خەڵفو چرۆیەیە کەلەسەر بنکی درەختی بڕاودا هەڵدەداتەوە.

**الفَرخَةُ**: نوکه ڕمبی پان.

**الفَرّوخُ من السنبل**: ئەو دانەوێڵەیە لە گوڵەکەیدا دەرکەوتبێ ڕەق بووبێ.

**المَفارِخُ**: شوێنی جوجك هەڵێنان، کێڵگەی پەلەوەر هەڵێنان ٥ تاکەکەی: (مَفرَخ ومفرَخَة).

**فَرَدَ بالرأي**: سوور بوو لەسەر ڕای خۆیو تاکڕەو بوو.

**أفردت أنثى الحيوان**: حەیوانەمێینەکە یەك بێچوی بوو ئەمە کاتێك دەگوترێ: کە حەیوانەکە عادەتی وابێ زیاد لە بێچویەکی ببێ.

**أفرد بالامر**: تاکڕەو بوو لەکارەکەیدا.

**أفردَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تاك کرد وای لێ کرد تاکە شت بێ ٥ جیای کردەوە ٥ دووری خستەوە.

**أفرَدَ اليه رَسولاً**: پیاوێکی بۆ نارد بەتەدارەكو پێویستیاتەوە.

**فَرَّدَ الرجلُ**: پیاوەکە تێگەییشت ٥ لەخەڵك گۆشەگیر بوو چووە خەڵوەوە بۆ خودا پەرستی ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (طوبى للمفرِّدين).

**فَرَّدَ برأيه**: سوور بوو لەسەر ڕای خۆیو تاك ڕەویی ڕەچاو کرد.

**فَرَّدَ الذهب**: دەنکە ئاڵتونەکانی لە ملوانەکەکەدا بە میروی زیوو شتی وا جیاکردەوە، واتە: هەموو میروە ئاڵتونەکانی نەخستنە پەنا یەکترەوە بەڵکوو بە دەنکە مرواریو بەردی گرانبەهاو دەنکە زیو ناوانی کردن.

**فَرَّدَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کردە چەند تاکێك.

**فَرَّدَ الأشياء**: شتەکانی لێك دوور خستنەوە؛ ناوانی کردن بەشتی تر.

**إنفَرَدَ بالأمر**: بەتەنیا کارەکەی خستە ئەستۆی خۆی دیکتاتۆریی نواندو تاکڕەوی تێدا کردو نەیهێشت کەس هاوبەشی بکا.

**أنفردَ بنفسه**: گۆشەگیر بوو خۆی لەخەڵك جیاکردەوە.

**تَفَرَّدَ بالأمر**: بەمانا (إنفردَ) دێ.

**إستفرد بالأمر أو الراى**: تاك ڕەویی کرد لە کارەکەی دا نەیهێشت کەسی تر هاوبەشی بکەن ٥ سوور بوو لەسەر ڕای خۆی ڕای تری قبوڵ نەبوو.

**إستفردَ فلاناً**: بەتەنها لەگەڵ فلاندا کۆبۆوە ٥ فلانکەسی بەتەنیا بینی.

**إستفردَ الغوّاصُ هذه الدُرَّة**: مەلەوانەکە ئەو گەوهەرەی بەتەنیا دەست کەوت هیچی تری لەگەڵ نەبوو.

**إستَفرَدَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەتەنیا هەڵگرتو هیچی تری لەگەڵ نەبوو.

الإفـرادُ في النحـو: لـەزاراوەی نـەحودا ئیفراد ئەومیە تـەئنیـەو کۆنـەبێ ٥ لـە بـواری شـەرعدا ئیفـراد ئەومیە حـاجی ئیحـرام بەحـەج‌و عـەمرە بەیەکەوە نەبەستێ ٥ واتـە بـەجیاو یـەك لـەداوی یـەك ئیحرامیـان بـۆ ببەستێ.

الفارِدُ: تەنیا، تاقەوە بوو ٥ تەرە بوو ٥ دەگوترێ: (ثور فـارِد) کەڵەگاکە لـە گا ڕانەکە جیا بۆتەوە، تاکەوە بـووە ٥ (شـجرة فـاردة) درەختێـکە لـە درەختەکانی تـر جیـا بۆتـەوە، دوور لەپەڵـە درەختـەکان ڕواوە ٥ (ناقـة فـاردة) حوشـترەکە لـە لـەوڕگاو دوێـلاودا شـوێنی جیایـە ٥ (شـاة فـاردة) مەڕێـکە بـەجیا لەماڵـەوە دەدۆشـرێ ٥ هـەروا وشـەی (الفـارِد) ناوە بـۆ شـەکری زۆر سپی ٥ هـەروا ناوە بۆ حوشـترە نێـرەی زۆر کەتـەو بەهێز.

فُرادَ: دەگـوترێ: (جاء القومُ فُرادَ وفراداً وفرادی) خەڵکەکە یەکیەك هـاتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾.

الفـرد: تـاك ٥ تاكـەوە بـوو بـۆ مێینـە دەگـوترێ: (الفَــردَةُ) ٥ قورئــان دەفـەرموێ: ﴿رَبِّ لَـا تَـذَرْنِي فَـرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ کەسانێك گۆشـەگیر دەبـن لەکۆمـەڵ جیادەبنەوە.

الفَـردانُ: تـاك، تـەنها، بـۆ مێینـە دەگوترێ: (فَردی).

الفَردَةُ: تەپۆڵکە ٥ (ك: فُردات).

الفُردَةُ: کەسێك زۆر گۆشـەگیر بی زۆر خۆ تاق بکاتەوە.

الفَردِيـــة: تـــاکڕەوی، دیکتـــاتۆری ٥ ڕێبازێـــکی ڕامیارییـــە دەســـەڵات دەداتـــە دەســـت تـــاك‌و بـــڕوای بـــە ڕێکخراوی جەماوەریی نیە.

الفَـرّادُ: فرۆشیاری گەوهـەری بـەنرخ‌و بــەها، مــرواری ٥ ئــەو کەســەی ملوانکەی گەوهەر دروست دەکا.

الفُرُودُ من الأشياء: تاك ٥ تاقانە.

الفُرُودُ: ئەو ئەسـتێرانەن کـە بـەدەوری ئەستێرەی (سورەیا) سیوەیلەوەیە ٥ (فُرُودُ النجوم) تاکە ئەستێرەکان.

الفريـدُ: تـاك‌و تـەنها ٥ تاقانـە ٥ دەنکـە مرواری زیو و شتی تری تی بکەوێ ٥ تاکەکەی پێی دەگوترێ: (فريدة) ٥ گەوهەری بەنرخ‌و بەها.

المِفرادُ من النوق: حوشـتری تاقـەوەبوو، تەرە بوو.

المُفردُ: کەڵەگا کێوی ٥ لە بـواری وشـەدا (مُفرد) وشەیەکە بەشێك لە وشەکە

بەشێــــك لەماناكــەی ناگەیــــەنێ ٥ بەڵكو هەموو وشەكە دەلالـەت دەكا لەسەر ماناكەی.

**المُفَــرَّدُ**: دەگـوترێ: (راكــب مُفَــرَّدٌ) سوارێــكە خـۆی‌و حوشـترەكەیەتی كەسی تری لەگەڵدا نیە.

**فَردَسَ الكَرمَ**: پەل‌و پۆی مێوەكەی لێـك بڵاو كردنەوەو كەپری بۆ كرد.

**فَردَسَ قِرنَهُ**: هاوشانەكەی خۆی بەزەویدا دا بۆڕی دا.

**فَـردَسَ وِعـاءَ التمـر**: بەچـنەو پوشـی خورماكەی ناواخن كـردو زۆری تـێ پەستاوت.

**الفُـرَادِسُ**: دەگـوترێ: (رجـل فُـرادسٌ) پیاوێـكی نێسقان ئەستورە.

**الفردَسَةُ**: پان‌و پۆڕ.

**الفُردُوسُ**: زێدەزۆری گەنم‌و شتی وا.

**الفِـردَوسُ**: باغێـك كـە هـەموو جـۆرە میوەیەكی تێدا بێ ٥ شوێنێك زۆری درەختی مێو لێ بێ ٥ ناوی باغێـكە لــــە باغــەكانی بەهەشــت ٥ (ك: فراديس).

**فَرَّ فَرّاً فِراراً**: هەڵات.

**فَــرَّ اليــه**: پـەنای بـۆ بـرد ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿فَفِرُّوا إلَى اللّهِ﴾.

**فَرَّ**: پەلەی كرد خێـرا ڕۆیی ٥ دەگـوترێ: (فَـرَّ الفـارسُ) سوارچـاكەكە مـەودای ڕۆیشتنەكەی فـراوان كـرد بۆئــەوەی بەئاسانی كەوانەیی بگەڕێتەوە.

**فَرَّ فلانٌ**: فلانكەس تاقی كراوەو قاڵبوو.

**فَرَّ الدابّةَ**: ددانی وڵاخەكەی سەیر كـردن بزانـێ ئـاخۆ شیلەی مـاون، پیرە یـان گەنجە، تەمەنی چەند ساڵە.

**فَرَّ الأمـرَ**: لێـكۆڵینەوەی لەكارەكەدا كـرد بۆئــەوەی بزانــێ چـۆنەو چـۆن نیـە ٥ دەگـوترێ: (فَـرَّ فـلانٌ عمــا في نفـسه) پرسیار لە فلانكەس كرا بۆئەوەی چی لە دڵی دایە دەری بخا.

**أفَرَّتِ الدوابُ**: وڵاخەكە ددانـی كـەوتن بۆئــەوەی لــە شـوێنیان ددانــی تـر بڕوێنەوە.

**أفَرَّ فلاناً ونحوه**: وای لێ كـرد فلانكـەس هەڵبێ.

**أفَرَّ رأسـهُ بالـسيف**: سـەری بـە شمشێر لەت كرد.

**فارَرتُـهُ**: ئـەو لـەوەزع‌و حـاڵی منــی كۆڵیەوە منیش لەوەزع‌و حاڵی ئەوم كۆڵیەوە.

**إفتَــرَّ الــبرقُ**: هـــەورە بروســـكەكە مەشخەڵی دا.

**إفتَرَّ فلان**: فلانكـەس پێـكەنی‌و ددانـی دەركەوتن ٥ دەشگوترێ:

**إفتَـرَّ عـن اسـنانه ضـاحِكاً**: لەحاڵـەتی پێكەنیندا ددانی دەرخستن.

**إفترَّ الشَّيْئ**: بۆنی شتەکەی کرد هەڵی مژی.

**تفارَّ القومُ**: خەڵکەکە لەبەر یەکتر هەڵاتن.

**الفُرارُ من الشاءِ**: ئەو بەرخەیە لەشیر بڕدرابێتەوەو قەڵەو بووبێ‌و توانای لەوەڕ خواردنی پەیدا کردبێ.

**الفُرُّ**: باشترین شت ٥ دەگوترێ: (هذا فُرُّ مالي) ئەمە چاکترین ماڵ‌و سامانمە.

**الفُرُّ من الناس**: پیاو ماقوڵ‌و کەسایەتی خێڵ ٥ گوتراوە: (هو فُرُّ قومه).

**الفَراءُ من النساء**: ئافرەتی دەم‌و ددان جوان‌و ڕێك‌و پێك.

**الفُرَّةُ**: بەمانا (الفُرُّ) دێ.

**الفِرَّةُ**: دەگوترێ: (هو حسنة الفِرَّةِ) پێکەنینی جوانە ٥ زەردەخەنەی جوانە.

**الفُرَّى**: دەستە سەربازی شکاو و هەڵاتوو لەبەری جەنگ.

**الفَريرُ**: بەمانا (الفُرارُ) دێ.

**المَفَرُّ**: هەڵاتن ٥ پەناو شوێنی دالْدە دان.

**فَرَزَ الشَّيْئَ والنصيب**: شتەکانی جیاکردەوە، بەشەکانی جیاکردەوە، لێکی دوور خستنەوە.

**فَرَزَ مسام الجَسَدِ العرقَ**: کونکونۆکەی پێستی لەش عەرەقیان دەردا.

**فَرَزَ الغُدَّةُ اللُعابَ**: غودە تفی دەردا.

**فَرَزَ القطنَ ونحوه**: لۆکە خراپەکەی لە لۆکە چاکەکە جیاکردەوە.

**أفرَزَهُ**: بەمانا (فَرَزَهُ) دێ.

**أفرَزَ فلاناً بشيئٍ**: فلانکەسی بەو شتە تایبەت کردو بۆ ئەوی دانا.

**أفرَزَ الصّائِدُ الصَيدَ**: نێچیرەوان‌و ڕاوکەرەکە فرسەتی لە نێچیرەکە هێناو لە نزیکەوە تەقەی لێ کرد.

**فارز شريكه**: لە هاوبەشەکەی جیا بۆوە.

**فَرَّزَ عليه برأيه تفريزاً**: ڕای خۆی بەسەردا سەپاند ٥ بڕیاری خۆی بۆدا.

**إفتَرَزَ الأمرَ**: ڕای سەربەخۆی لەکارەکەدا ڕاگەیاند.

**تفارزا الشركةَ**: کۆمپانیاکەیان واز لێ هێنا هەڵیان وەشاندەوە.

**الإفريزُ**: ئەو کۆپلەو دیکۆرە زیادە دەرچووانەی بە دیواری باڵەخانەکانەوە دەر دەکەون وەکوو سوێبان‌و ئاو دوورخەرەوە.

**الفارِزُ**: دەگوترێ: (کلام فارز) قسەیەکی ئاشکراو یەکالا کەرەوەیە.

**الفَرزُ**: شوێنی نزمایی نێوان دوو تەپۆڵکە.

**الفِرزُ**: بەش‌و باری جیاکراوە ٥ (ك: أفراز وفروز).

**الفَرزَةُ**: درزی شتی ئەستور.
**الفِرزَةُ**: بەمانا (ألفِرز) دێ.
**المفروز**: جیاکراوە لەشتی تر ◦ قوماشی پەراوێز چندراو.
**الفَرَزدَقُ**: هەنگوتکە هەویر ◦ تاکەکەی (فرزدقــة)یــە ◦ نازنــاوی شــاعیری بەنابانگی عەرەبەکە نـاوی (هَمَّام)ە ◦ (ك: فَرازِق، فرازدة).
**فَــرَسَ الأســدُ فريــسته فرســاً**: شـێرەکە نێچیرەکەی گرتو کوشتی.
**فَرَسَ النبيحة**: ملی کوشتییەکەی شکاند پێش ئەوەی گیانی دەرچێ ◦ لەئایینی ئیسلامدا ئەو جۆرە سەربڕینە نەی لێ کراوە.
**فَرَسَ الأمرَ فراسةً**: بـە تێڕوانینـی تیـژو وردی خۆی چووە ناو ئیشەکەوە.
**فَرُسَ فراسة وفروسة وفروسية**: چاك فێـری سوار چاکیو بەخێوکردنی ئەسپ بوو.
**فَرُسَ فلان**: فلانکەس بوو بـە خـاوەن ڕاو بۆچوونی بـاشو لێـزان لـەکاروباردا ◦ دەگـوترێ: (فهـو فـارس بـالأمر) زانـاو ئاگادارە بە ڕاپەڕاندنی کاروبار.
**أفرس الراعي**: شوانە مەڕەکە بێ ئاگاو کەمتەرخەم بوو، گورگ فرسەتی لێ هێناو هەندێك لە مـەڕو بزنـەکانی خنکانـدن.
**أفرسَ فلان الأسَدَ**: فلانکەس ولاخەکەی بەجێ هێشت بۆ شـێرەکە بۆئـەوەی خۆی ڕزگار بکا.

**فارَسَهُ مفارَسَةً وفِراساً**: لە سوارچاکی دا بەسەر فلانکەسدا بالادەست بوو.
**فَـرَّسَ الأسَـدُ الغَـنَمَ**: شـێرەکە زۆری لـە مەڕو بزنەکان کەلەپارچە کرد.
**فَرَّسَ الأسَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕانواند بۆ شێرەکە تابیکاتە نێچیری خۆی.
**إفـترس فريـسته**: نێـچیرەکەی خـۆی کوشت.
**تَفَرَّسَ فلان**: فلانکەس خۆی وا نیشاندا سوارچــاکە لــە ئەســپ ســواریدا پێشکەوتووە ◦ دەگوترێ: (فلان ليس بفارس ولكنه يتفَرَّس).
**تَفَــرَّسَ في الــشَّيْءِ**: زۆری لـە شـتەکە کۆڵیــەوەو وردەکـاریی تێـدا کـرد ◦ دەگوترێ: (تَفَرَّسَ فيـه الخير) خێـرو خۆشـی لێ چـاوەڕوان کـرد، دیـاردەی پیاوەتیو مەردایەتی تێدا بینی.
**الأفرس**: دەگـوترێ: (هو أفرس بـالأمور) زانــاو لێزانــە لــەکاروباردا، زیــرەكو لێهاتووە بۆ ئەنجامدانی کارەکان.
**الفَــــارِس**: سوارچـــاكو لێـــزان لـــە سواربوونی ئەسـپ دا ◦ (ك: فوارس، و فرسان).
**الفُرسان في الجيش**: سوارەی سوپا ◦ ئـەو جەنگاوەرانــەی بەســواری ئەســپ دەجــەنگن ◦ شــێر ◦ لێــزان لــە هەڵسوڕاندنی کاروباردا.

**فارس**: نەتەوەیەکی ئاری نژادن ٥ (بلاد فارس) وڵاتی ئێران.

**الفارسي**: تاکی فارس نژاد.

**الفارسية**: زمانی فارسی.

**الفِرَاسَة**: پێش بینیو لێزانی لە ناواخنی کارەکاندا ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (إتقوا فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله) ٥ راو بۆچون دەربارەی چۆنیەتی فلان ٥ دەگوترێ: (فِراسي في فلان الصّلاح).

**الفَرّاسُ**: دڕندەیەك زۆر نێچیری کەلەپارچە بکا.

**الفَرَسُ**: ئەسپ (ناوە بۆ ڕەگەزەکە) ناوی تاکەکانی (الخَيلَ) بۆ نێرو مێ ٥ (ك: افراس وفروس) ٥ لەپەندا هاتووە: (هما كفرسي رهان) ٥ بەدوو کەس دەگوترێ: کە پێشبڕکێیانە بۆ مەبەستێكو پێکەوە پێی دەگەن.

**فَرَسُ البحر**: جۆرە ماسیەکی دەریایین سەریان وەکوو سەری ئەسپ وایە.

**فَرَسُ النهر**: گیاندارێکی شیردەرە ناو دایدەپۆشێ ناوە زانستییەکەی (هیبوبوتاسە).

**الفَرسَة**: نەخۆشییەکە تووشی پشت دەبێو کۆمی دەکا ٥ برینێکە لە ئەستۆ دێو دایدەوەشێنێ ٥ ئەگەر یەکێك فەقەرەیەکی پشتی نەمێنێ دەگوترێ: (أصابته فَرسَةٌ) تووشی پشت کوڕی بووە.

**الفَرِيس**: کوژراو بۆ نێرو مێ یەك شێوەیە، دەگوترێ: (بقرة فريس وثور فريس) ز هەروا وشەی (الفريس) ناوە بۆ دارێکی کەوانەیی دەکرێتە ئەڵقەی قەیاسەو گوریس بۆ شەتەك دانی شت.

**الفريسة**: ئەو ئاژەڵو حەیوانەی دڕندە دەیکاتە نێچیری خۆیو تێکی دەشکێنێ ٥ (ك: فرائس).

**فَرسَخَ**: لەکۆڵی بۆوە ٥ دەگوترێ: (فرسخت عنه الحمّى والمرض) لەرزو تاو نەخۆشیەکەی لەکۆڵ بۆوە.

**الفَرسَخُ**: کەلەبەرو کونو قەڵیشت ٥ زەمانێکی زۆر لەشەو و ڕۆژ ٥ پێوەرێکی کۆنە لە پێوەرەکانی پێوانەی درێژی بە سێ میل مەزەندە دەکرێ ٥ هەرشتێك زۆرو نەبڕاوە بێ ٥ (ك: فراسِخ).

**المُفَرسَخُ**: دەگوترێ: (سراويل مفرسخة) دەرپێی پان.

**الفِرسِنُ**: سمی حوشتر، لای خواروی قاچ، هی ئەسپ پێی دەگوترێ: (حافِر) ٥ هی مرۆڤ (قدم).

**المُفَرسَنُ من الرجال**: پیاوێك دەمو چاوی گۆشتن بن.

**فَرَشَ النباتُ فَرشاً**: گیاو گژەکە بەسەر زەویدا بڵاو بۆوە.

**فَرَشَ الشَّيْءَ فرشاً وفراشاً**: شتەکەی بڵاو کردەوە ◊ دەگوترێ:

**فَرَشَ الطائِرُ جناحيه**: باڵندەکە باڵەکانی بڵاو کردنەوە لەشەقەی باڵیداو فڕی ◊ (و فَرَشَ لفلان بساطاً) بەڕەیان بۆ فڵانکەس ڕاخست مافوریان بۆ بڵاو کردەوە ◊ (فَرَشَ الدارَ ونحوها بالحجارة) بەردی لە تەختی خانوەکەدا بڵاو کردنەوە ڕەصیفی کرد.

**فَرَشَ الأمرَ**: ڕوداوەکەی بڵاو کردەوە بەخەڵکی ڕاگەیاند.

**فَرَشَ فلاناً أمره**: کارەکەی خۆی بۆ فڵانکەس باس کردو باشباش تێی گەیاند.

**أفرَشَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بەخاوەن فەڕش.

**أفرَشَ الشجر**: درەختەکە لقو پۆپی کردن، لقو پۆپی بڵاو کردنەوە ◊ دەشگوترێ: (ما أفرَشَ عنه) چی بوو وازی پێ لەوە هێنا.

**أفرَشَتِ الشجَّةُ الرأسَ**: برینەکەی لەسەریدا پەیدا بوو گۆشتی بڕیو ئێسقانی نەشکا.

**أفرَشَ فلاناً**: پاشملە بەخراپە باسی فڵانی کرد.

**أفرَشَ السيفَ**: شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد.

**أفرَشَ فلاناً بساطاً**: بۆ فڵانکەس بەڕەی ڕاخستو میوانداری کرد.

**فَرَّشَ الطائِرُ**: باڵندەکە باڵەکانی کردنەوەو فڕی.

**فَرَّشَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە بەسەر زەویدا بڵاو بۆوەو گەشەی کرد.

**فَرَّشَ فلان الدارَ**: فلانکەس تەختی خانوەکەی کۆنکرێتو کاشی کرد تەبلیتی کرد.

**فَرَّشَ فلاناً بِساطاً**: بەڕەیەکی بۆ فڵانکەس ڕاخست.

**إفتَرَشَ الشَّيْءُ**: شتەکە ڕاخرا، بڵاو بۆوە.

**إفتَرَشَ الثوبَ ونحوه**: قوماشەکەی ڕاخستو کردی بەڕاخەر.

**إفتَرَشَ السماءُ القومَ**: ئاسمان بارانی بەسەر خەڵکەکەدا باراند.

**إفتَرَشَ فلاناً**: فڵانکەسی بەزەویدا داو چووە سەری سواری بوو.

**إفتَرَشَ لسانه**: زمانی کردەوە بەئارەزوی خۆی قسەی کرد.

**إفتَرَشَ أثَرَهُ**: شوێن پێی هەڵگرت؛ شوێنی کەوت.

**إنفَرَشَ الشَّيْءُ**: شتەکە بڵاو بۆوە.

**تَفَرَّشَ الطائِرُ**: باڵندەکە باڵەکانی بڵاوکردنەوەو فڕی.

الفَراشُ: پەپولە ٥ ڕەگەزی پەپولە هەر باڵندەیەك لە پێڕی پەپولە بێ ئەوانەی بەدەوری چراو گڵۆپو شتی وادا کۆدەبنەوە خۆیان بەسوتاندن دەدەن ٥ ئەو بڵقە بچکۆلانەی دەکەونە سەر ئاو و شلەمەنی تر.

فَراش اللسان: گۆشتی بنی زمان.

فَرَاش الظهر: شوێنی لێ ڕوانی سەری پەراسوەکان لە پشت دا.

الفِراش: ڕاخەری ناو ماڵ هەرشتێك مرۆڤ ڕای بخاو بۆلەسەر دانیشتن‌و پشوو دان ٥ خانو ومالّ ٥ لانەی باڵندە ٥ بنکی زمان لەقولایی دەم دا ٥ (ك: فُرُش وأفرِشَة).

الفَراشة: تاکی پەپولە ٥ پیاوی سەر بچکۆلە ٥ هەر ئێسقان‌و ئاسنێك باریك‌و بچوك بێ ٥ کەمێك ئاوی ماوە لە بنکی حەوزدا ٥ ئێسقانێکی پچکۆلە لەو هەشت ئێسقانەی قاوغی مێشکییان پێك هێناوە ٥ (ك: فَراش).

الفِراشَةُ: پیشەی فەڕاشی‌و جێ ڕاخستن‌و پاککردنەوەی ڕاخەرو شتی وا.

الفَرّاشُ: ئەو کەسەی کاری جێ ڕاخستن‌و پاککردنەوەی ناوماڵ‌و فەرمانگە لەئەستۆ دەگرێ ٥ ئەو کەسەی کورسی‌و ڕاخەرو شتی وا بەکری دەدا بەکەسانی دیکە بە بۆنەی داوەت‌و شایی‌و شینەوە.

الفَرْشُ: فەڕش‌و ڕاخەری ناو ماڵ (فرش المسائل) شی کردنەوەو لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکان‌و حوکم‌و ئاکامەکانیان ٥ دەشت‌و سارای بەربڵاو ٥ شوێنێك زۆر گژو گیای تێدا ڕوابێ ٥ کشت‌و کاڵ کەبەسەر زەویدا بڵاو بێتەوە ٥ بێچوە حوشترو گۆلك‌و شتی وا کە بچوك بن‌و بەکاری ئەوە نەیەن باریان لێ بندرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الأَنعَامِ حَمُولَةً وَفَرْشًا﴾.

اَلفَرِيشُ: ڕاخەر ٥ لەگیاو گژدا بریتییە لەو گیاو گژەی لەسەر لاسکی خۆی ناوەستێ‌و بەسەر زەوی دا بڵاو دەبێتەوە ٥ (ك: فرائش).

المُفَرَّشُ من الجمال: ئەو حوشترانەی دوگیان نیە.

المِفرَشُ: قوماشی ئەستوور کەدەکرێ بە خێمەو ڕەشماڵ ٥ پەردەیەکە بەسەر سفرەو خوانددا دەدرێ.

المِفرَشَةُ: فەڕشێکی بچکۆلە ٥ پارچە خێمەیەکە جاجم‌و جاخێکە لەسەر کورتان‌و زین‌و بارو بارگنە دا بڵاو دەکرێتەوە ٥ سوار لەژێر خۆیەوە بەسەر کورتان‌و زینی دا دەدا.

المَفروشـةُ: دەگـوترێ: (ناقـة مفروشـة الرِجـلِ) حوشترێـکی قـاچ خـوارو خێچە.

فَرشَـحَ فَرشَـحَةً: قاچـی لێـک دوورخـستنەوە ٥ نێـوان قاچـەکانی پان کرد.

فرشحَتِ الدابَةُ: ئاژەڵەکە قاچەکانی پان کردنەوە بۆئەوەی بیدۆشن.

تَفَرشَحَ: بەمانا (فرشح) دێ.

الفِرشاحُ مـن الحوافر: ولاخـی هێدیو لەسـەر خـۆ ٥ ئەگـەر بـۆ هـەور بـەکارهات مەبەسـت هـەوری بـێ بارانـە ٥ ئەگـەر بـۆزەوی گـوترا: مەبەست زەوی پانو پۆرە.

فَرَصَ الثَوبَ ونحوه فَرصاً: لـەباری درێـژی قوماشـەکەی دادڕی ٥ کـونی کـرد ٥ قەوارەی تێکرد ٥ دەگوترێ:

فَـرَصَ الحَـذاء النعـلَ: پینەچـیەکە نەعلەکەی کون کرد بۆئـەوەی شـڕاکی تێهەڵکێشێ.

فَـرَصَ الحیـوانَ: بندەسـتی ئاژەڵەکـەی هەنگاوت، گوللەو تیرەکەی لەبندەسـتی دا.

فَـرَصَ الفرصَـةَ: هەلەکـەی قۆسـتەوەو نەیهێـشت لەکیـسی بـچێ ٥ بـەئاواتی خۆی گەیی.

فُـرِصَ فَرصـاً: ماسولکەی نێـوان شـانیو سنگی ئازاری بوو.

أفرَصَتِ الفرصَـةُ فلانـاً: هـەل بـۆ فلان ڕەخسا، هەلو مەرجەکە وای کـرد فلان بەئاواتی خۆی بگا ٥ دەگوترێ:

أفرصهُ الأمرُ: کارەکە خۆی بۆ گونجاند.

فارَصَهُ في الشَيْئِ: نۆرەی لەگەڵدا کـرد دەربارەی شتەکە.

إفتَرَصَ الفرصة: هەلەکەی قۆزتەوە.

إفترصَ فلانـاً ظلمـاً: بەناحـەق ئـابڕوی فلانکەسـی بـرد، دەسـتی گەیـشتە ناموسو شەرەفی، تانەو تەشەری لێ دا.

تفارصَ القومُ بئرهم: خەڵکەکە بـەنۆرە چـوونە سـەر بیرەکـەو ئـاوی پێویستیان لێ دەرهێنا.

تَفرَّصَ الفُرصَةَ: هەلەکەی قۆزتەوە.

الفِراصُ: بەهێزو توانا.

الفَرصُ: (نـوی المقـل) بـەری درەختـی (الدوم)ە.

الفَرصـاءُ مـن النـوق: حوشترێـکە خـۆ کـەنار دەگـریو پاڵەپەسـتۆ ناکـا: کەسەر دوێڵاوەکە چۆڵ بوو ئـەمجار دێتـە سـەر دوێڵاوەکـەو ئـاو دەخواتەوە.

الفَرصَةُ: دەردێکە توشی فەقەری پشت دەبێو کوڕی دەکا، کۆمی دەکا.

الفُرصَـةُ: نـۆرە: نـۆرە ئـاودانی ئـاژەڵو نـۆرە ئـاودانی کـشتوکاڵ ٥ پاسـاو

ڕێسایەکە خەڵکەکە لەناو خۆیاندا پەیڕەوی دەکەن بۆ دابەشکردنی ئاو بۆ خواردنەوەو بۆ ئاودێری ٥ دەگوترێ: (جاءت فرصَتُك من البئر) ٥ (وجاءت فرصتك من السقي) ٥ دەشگوترێ: (إنتهز فلان الفرصة) فلانکەس هەلەکەی قۆزتەوەو بەناواتی خۆی گەیی.

**الفَريصُ**: خاوەن بەشە ئاو.

**الفَريصَةُ**: نۆرە ئاو ٥ یاساو ڕێسایەکە خەڵکەکە لەناو خۆیاندا پەیڕەوی دەکەن بۆ دابەشکردنی ئاوی خواردنەوەو ئاودێری کشتوکاڵ ٥ پارچە ماسولکەیەکە لەنێوان شانو سنگ دا لەکاتی ترساندا دەکەوێتە لەرزین ٥ ماسولکەکانی سنگ ٥ (ك: فريص وفرائص) ٥ دەشگوترێ: (فلان ضخم الفريصة) فلانکەس ئازاو بەجەرگە.

**المِفْـراصُ**: ئاسنێکی ڕەقو تیژە مەعدەنی تری پێ دەبڕدرێ ٥ کێردێکی درێژو تیژە پینەچی چەرمی پێڵاوی پێ دەبڕێ.

**المِفرَصُ**: بەمانا (المِفراصُ) دێ.

**الفِرصادُ**: توت ٥ ڕەنگێکی سورە ٥ دەنکی بۆڵە ترێ.

**فَرَضَ الشَّيْءُ فروضاً**: شتەکە فراوان بوو.

**فَرَضَ الشَّيْءَ وفيه فرضاً**: شتەکەی تێ کوتا، تێی ڕۆکرد ٥ دەگوترێ: (فرض العود وفرض فيه العودَ).

**فَرَضَ الأمرَ**: ئەرکەکەی واجب کرد بە پێویستی دانا.

**فَرَضَهُ عليه**: لەسەری فەرز کرد.

**فَرَضَ له في العطاء**: لە بەخشش دا بەشی بۆدیاری کرد.

**فَرَضَ القاضي فريضة**: دادوەر شتە پێویستەکەی مەزەندە کردو بڕیاری لەسەر دا.

**فَرَضَ الحيوان فراضة**: ئاژەڵەکە کەوتە ساڵەوەو پیر بوو (فهو فارِض وهي فارض) قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ﴾.

**أفرضَ لفلان**: بۆ فلانکەس بەشی دانا.

**أفرضَ المالُ**: ماڵەکە گەیشتە ئەندازەی زەکات لێ دەرکردنو زەکاتی تێدا واجب بوو.

**أفرضَ فلاناً**: بەشی مەزەندەکراو و پێویست کراوی دا بەفلانکەس.

**فَرَّضَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەماناى (فَرَضَ) دێ.

**فَرَّضَ الباحِثُ**: لێکۆڵەرەوەکە هەوڵیدا مەسەلە میراتیەکە حەل بکا.

**إفتَرَضَ الجُنْدُ**: سەربازەکان بەشی دیاریکراوی خۆیان وەرگرت.

**إفـتَرضَ فلانـاً**: بەشـی دیـاریکراوی دا بەفلانکەس.

**الفـــارِضُ**: ئــەو کەســـەیە شــارەزایە لەدابەشکردنی میرات دا.

**الفَرائِض**: جۆرە زانیاریەکە بەهۆیـەوە دەزانــدرێ چـۆن مـیرات دابــەش دەکرێ.

**الفِـــراضُ**: سەرچـاوەی چـۆمو ئـەو شـوێنەی ئاوەکـەی لێ هەڵـدەقوڵێ ٥ ئـەو بلێـسە ئـاگرەی لـە شـقارتەو چـەرخو ئەسـتیو شـتی وا بـەرز دەبێتەوە لەکاتی لێدانی دا.

**الفراضُ**: بەمانا (الفارِض) دێ.

**الفَـرضُ**: ئـەو ئەرکـەی خـودا لەسـەر بەندەکانی پێویـست کـردووە ٥ ئـەو شـتەی ئـادەمیزاد بۆخـۆی لەسـەر خۆی پێویست دەکا ٥ فیکـرەو بـیرو بۆچونێـــکە لـــەبواری بەڵـــگە هێنانـــەوەو گفـتوگۆ بـۆ حـەلی مەسـەلەیەك کـاری پـێ دەکـەی ٥ بەخشـشی دیـاری کـراو، موچـەی دیـاری کـراو ٥ مـەتاڵ ٥ تـیر پـێش ئـەوەی بـاڵو سـەرە تیژەکـەی لێ ببەسترێ ٥ (ك: فُرُوض).

**الفُرضَـةُ مـن النهـر**: شـوێنی ئـاو لێ خواردنەوەی چۆم.

**الفُرضَـــةُ مـــن البحـــر**: شـــوێنی لەنگــەرگرتنی کەشــتی ٥ هــەروا وشـەی (الفُرضـة) نـاوە بـۆ شـوێنی قەڵـەم لـەناو ئـامێری نوسـین دا ٥ نـاوە بـۆ کـونی دیواریدەرانـدەر ٥ داکوتـانی بزمـارو شـتی وا لـە دارو شتی وا ٥ گرێژەنـەی دەرگا ٥ چاڵو چـوێڵی نـاو قـەدی کێـو و ئـەملاو ئەولای.

**الفَرَضِيُّ**: فەرائیز زان، لێـزان لەدابـەش کردنی میرات دا.

**الفَريضُ**: فـەرائیز زان شارەزا لـەبواری فەرائیزدا ٥ حوشتری بەساڵا چوو.

**الفَريـضة**: ئـەو ئەرکـەی خـودا لەسـەر بەندەکانی پێویست کردبێ بـەکردن یـان بەنـەکردن ٥ ئـەو ئەندازەیـەی دیاری کراوە ئادەمیزاد بیکا، بیدا لە عیبـادەتو زەکاتـدانو شـتی تـر ٥ هـەروا وشـەی (الفریـضة) نـاوە بـۆ ئاژەڵو وڵاخی بەساڵاچوو.

**المِفـــراضُ**: ئــەو ئاسـنەی شـتی پـێ دەبڕیەوە.

**المُفرَضَـةُ**: دەگـوترێ: (ثنایـاه مُفرضَـةٌ) کەڵبەکانی تیژو بڕەڕن.

**المِفـرَضُ**: بـەمانا (المِفـراضُ) دێ ٥ (ك: مفارِض).

**فَرَطَ فروطاً**: پەلەی کرد زۆر خێرا بوو لە ئەنجامدانی کارێك دا.

**فَرَطَ منه کلام**: بەبێ لێوردبوونەوە قسەی

لەدەم دەرچوو، ئاگای لەخۆی نەبوو قسەی لەدەم دەرچوو ٥ دەگوترێ: (فَرَطَ منه خير أو شر) بەبێ تێفیکرین خێرا ئەو کارە باشە یان خراپەی لەدەست هات.

**فَرَطَ الى سيفه:** پەلاماری شمشێرەکەی داو روتی کرد ٥ لە کەلان دەری هێنا.

**فَرَطَ عليه في القول:** زێدە ڕۆیی کرد لەقسەکردندا.

**فَرَطَ في الأمر:** لەکارەکەدا کەمتەرخەمی کرد ٥ بەزۆری وشەی (فَرَطَ) لەناو ئامادەکردنو خۆ سازدان بۆ چونە سەر ئاوو شتی وا بەکار دەهێندرێ.

**أفرَطَ اليه رسولاً:** بەپەلە نێردراوی بۆلا نارد.

**أفرَطَ فلان ولَداً:** فلانکەس منداڵەکەی بە بچوك لەقەڵەم دا ٥ دەشگوترێ: (فَرَطَ لە ولَدٌ) منداڵێکی بچوکی پێش خۆی بۆ بەهەشت چوو.

**أفرَطَ العِقدَ والعنقودَ ونحوهما:** ملوانکەکەی پچڕاندو دەنکە مورووەکانی بڵاو بوونەوە، هێشوە ترێو میوەکەی پەرتو بڵاو کردەوە بۆڵ بۆڵی کردو بۆڵەکانی بڵاو کردنەوە.

**أفرَطَ:** زێدە ڕەوی کردو لەسنوری خۆی دەرچوو ج لەبواری گفتوگۆدا بێ یان لەبواری هەڵسو کەوتدا ٥ پیاوێکی نارد بۆلای بۆئەوەی پێداویستیەکانی جێبەجێ بکا.

**أفرَطَ بيده الى سيفه ليستلَّهُ:** پەلاماری شمشێرەکەی داو لەکالان دەری کێشا.

**أفرَطَ عليه:** بارێکی خستە سەر کە نەتوانێ هەڵی بگرێ.

**أفرَطَ فلاناً:** پەلەی بەفلاّن کرد.

**أفرَطَ الشَّيْءَ:** شتەکەی پێش خست؛ خێرا هێنانی ٥ لەبیری چۆوە.

**أفرَطَ أمرَهُ وفي أمره:** بەپەلە کارەکەی ئەنجام دا پەلەی کرد لەئەنجامدانی کارەکەیدا ٥ (أفرَطوه الى الماء) پێشیان خست بۆ ئاو خواردنەوە.

**أفرَطَ الحوضَ:** حەوزەکەی پڕ کرد لەئاو تابەسەریەوە ڕژا.

**أفرَطَ فلان ولداً:** فلانکەس تەمەنی منداڵەکەی مەزندە کرد پێش باڵغ بوونی.

**أفرَطَ فلاناً في الخصومة:** فلانکەسی هەڵنا بۆئەوەی کێشەو نیزاع بەرپا بکا.

**فارط فلاناً مفارطةً وفراطاً:** پێش فلاّن کەوت ٥ پێشبڕکێی لەگەڵ کرد.

**فَرَّطَ الشَّيْءَ وفيه:** کەمتەرخەمی تێدا کردو گرنگی پێ نەدا تا فەوتا ٥ وازی لێ هێناو لەبیر خۆی بردەوە.

**فَرَّطَ البِئرَ**: وازی لە بیرەکە هێنا تا ئاوی تێ هاتەوەو پڕبۆوە لەئاو.

**فَرَّطَ فلاناً**: فلانکەسی پێش خست.

**فَرَّطَ في الخصومة**: هەڵینا بۆ کێشەو نیزاع، وای لێ کرد کێشە دروست بکا.

**فَرَّطَ اليه رسولاً**: نێردراوێکی بۆ ناردو پێشی خست.

**إفتَرَطَ اليه في هذا الأمر**: لەم کارەدا پێشی کەوتو پێش کەوت ٥ دەگوترێ: (فلان مفترط السجال الى العلا) فلانکەس دەست پێشخەری هەیە بۆ پیاوەتیو شکۆمەندیی.

**إفتَرَطَ فلان ولداً**: فلانکەس چەند منداڵێکی بە بچوکی مردنو پێش خۆی کەوتوون بۆ بەهەشت.

**إنفَرَطَ الشَّيْئُ**: شتەکە پەرتو بڵاو بوو لێک هەڵوەشا.

**تفارط القومُ**: خەڵکەکە پێشبڕکێیان کرد.

**تفارطَ الشَّيْئُ**: شتەکە کاتی بەسەر چوو، فەوتا.

**تفارط الرجلُ**: پیاوەکە پێش کەوتو پەلەی کرد.

**تفارط الهمومُ فلاناً**: خەمو خەفەت پەلەیان کرد بۆلای فلانو شانو ملیان گرت.

**تفارط القطا الماءَ**: قەتێکە پەلەی کرد بۆسەر ئاوەکەو بەفڕینی خێرا خۆی گەیاندە سەر ئاوەکە.

**تَفَرَّطَ الشَّيْئُ**: شتەکە کاتی بەسەرچوو فەوتا، دەگوترێ:

**تفرَّطت العشاءُ**: کاتی نوێژی عیشا بەسەر چوو.

**تَفَرَّطَ الشيئُ**: شتەکە پێش کەوت ٥ دەگوترێ: (تَفَرَّطَ الفرسُ الخيلَ) ئەسپەکە پێش ڕەوەکە کەوت.

**الفَارِطُ**: پێش کەوتو و پێشەنگ ٥ کەسێک پێش خەڵکەکە بکەوێ ئاویان بۆ ئامادە بکا ٥ (ك: فُرّاط).

**الفِراطَةُ**: ئاوی بەلاش لەنێوان کۆمەڵێک هۆبەو گەڕەك دا ٥ هەرکەسێک پێشتر بگاتە سەری دەتوانێ پێداویستی خۆی لێ دابین بکاو کەس مەنعی نەکا ٥ دەگوترێ: (الماءُ بينهم فراطة).

**الفَرّاطَة**: ئامێرێکە دەنکە زوراتی پێ دەکوترێ.

**الفَرطُ**: سنوور بەزاندن ٥ ئیشێك زێدە ڕەوی تێدا بکرێ ٥ (ك: أفرط وافراط).

**الفُرطُ**: پێدەشتی کێو ٥ (ك: أفراط) ٥ دەگوترێ: (أفراط الصباح) دیاردەو نیشانەی بەرەبەیان ٥ گزنگی بەرەبەیان.

**الفَـرَطُ**: بـەمانا (الفـارِطُ) دێ ٥ واتـە پێشکەوتوو ٥ ناوێـك پـێش هـەموو ناوەکـان بگـا ٥ پێـشەکیو سـلفە کـە دەدرێ بە کرێی شتو حـەقی کـار ٥ لـە دوعـا کردنـدا بـۆ منـداڵی مـردو دەگـوترێ: (اللـهم إجعلـه لنـا فَرَطـاً) خودایە ئەم منداڵەمان بۆ بکە بە تێشوو دەستپێـکی کردەوەمـان بـۆ قیامەتمان.

**الفُرُطُ**: کارێـك خاوەنەکەی زێـدەڕەوی بکا لەکەمتەرخەمی تێدا کردنـی دا تـا لــەکیس دەچـێو دەفـەوتێ ٥ لەقورئانـدا هـاتووە: ﴿وَاتَّبَـعَ هَـوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾.

**الفَرَطِيُّ**: مرۆڤـی سـەر ڕەق ٥ حوشـتری سەر ڕەقو چەموش.

**المَفَـارِطُ**: (مفـارط البلـد) دەورو بـەری شار.

**فَرطَحَ الشَّيْئَ**: شتەکەی پانو پۆڕ کردو بـڵاوی کـردەوە ٥ (رغیـف مفـرطح) نانێـکی پانکراوەیـە ٥ (رأس مُفَرطح) سەری مەیلەو پان.

**فَـرطس الخنزیـر**: بەرازەکـە لـوتی درێـژ کردەوە.

**الفِرطــاسُ**: لــوتی پانــەوە بــوو ٥ دەگـوترێ: (أنف فِرطاس).

**الفُرطوسَـةُ مـن الخنزیـر**: لـوتی بـەراز ٥ (ك: فراطیس).

**فَرَعَ الشَّيْئُ فراعَةً**: شتەکە درێژ بوو بەرز بۆوە ٥ (فهو فارِع).

**فَرَعَ الـشَّيْئَ فرعـاً وفروعـاً**: سـەر شـتەکە کەوتو بەسەریدا باڵا بوو ٥ دەگوترێ: (فَــرَعَ قومَــهُ) بەســەر گەلەکەیــدا باڵادەسـت بـوو، بـوو بـە ڕیـش سـپیو پیاو ماقوڵیان.

**فَرَعَ الأرضَ**: هاتوچۆی بەناو زەویدا کرد.

**فَرَعَ فرسَهُ**: جڵەوی ئەسپەکەی گرتەوە، توندی کرد.

**فَـرَعَ بـین المتخاصـمین**: نـاوانی دوو کێـشە کارو دژەکـانی کـرد، ئاشـتەوایی خـستە ناویانەوە.

**فَــرَعَ البکـر**: کـچێنی دڕانـد ٥ پـەردەی کچێنی لابرد.

**فَرِعَ فَرَعاً**: قژی زۆرو پڕو درێژ بوو (فهو أفرع وهي فرعاء).

**أفرَعَ الشَّيْئُ**: شـتەکە درێـژ بـوو، بـەرز بۆوە، باڵای کرد.

**أفـرعَ فـلان في قومـه**: فلاّنکـەس لـەناو گەلەکەیــدا بــەرز بــۆوەو ڕێــزو شکۆمەندی بەدەست هێنا.

**أفـرَعَ في الجبـل**: بەکێوەکـە هەڵـگەڕا ٥ پێیدا سەرکەوت.

**أفـرَعَ بنـو فـلان**: خێڵـی فـلاّن پـێش هـەموو کـەس هـەوڵی دابینکردنـی

لەومرِو ئاوی ئاژەڵەکانیان داوە ٥ خێڵی فلان ئاژەڵەکانیان کەوتنە زاو زێو وەبەرهێنان ٥ خێڵی فلان بێچوی ئاژەڵەکانیان سەربڕی.

**أفرَعَت النَّعَمُ:** ئاژەڵەکان زاو زێیان کردو بێچویان بوو.

**أفرَعَت المرأةُ:** ئافرەتەکە پێش منداڵبوون خوێنی بینی.

**أفرَعَ القومُ من سفرهم:** خەڵکەکە پێش وادەی مەزەندە کراو لە سەفەرکەیان گەڕانەوە.

**أفرَعَ الحديث والأمرَ:** دەستی بەقسەکردن کرد دەستی بەکارەکە کرد ٥ دەگوترێ: (نعم ما أفرَعتَ) شتێکی باش بوو ئەوەی دەستت پێ کرد.

**أفرَعَ اللجامُ الفرسَ:** لغاوەکە دەمی ئەسپەکەی خوێناوی کرد.

**أفرَعَ الأرضَ:** بەناو زەویدا هاتوچۆی کرد.

**أُفرِعَ بسيد فلان:** گەورەی خێڵی فلان دەستگیر کراو کوژرا.

**فارَعَ الرجلَ:** ئەرکی پیاوەکەی خستە ئەستۆی خۆی.

**فَرَّعَ فلان:** فلانکەس بێچوی ئاژەڵەکەی سەربڕی.

**فَرَّعَ بين المُتخاصمين:** دوو مرۆڤە بەکێشە هاتووەکانی لێک کردەوەو صوڵحی نێوانی کردن.

**فَرَّعَ في قومه:** بەسەر قەومەکەیدا بالا بوو.

**فَرَّعَ من الأصل المسائلَ:** مەسەلەکانی لە ئەسڵەکە دەرهێنان ٥ دەگوترێ: (فلان حَسَن التفريع للمسائل) فلانکەس شارەزاو لێزان بوو بۆ شی کردنەوەی مەسەلەکان.

**فَرَّعَ الجبَلَ وفي الجبل:** بەکێوەکەدا سەرکەوت.

**فَرَّعَ الأرضَ:** بەناو زەویەکەدا هاتوچۆی کرد.

**إفتَرَعَ البِكرَ:** کچێنی لابرد، پەردەی کچێنی دڕی.

**إفتَرَعَ الأمرَ:** دەستی بەکارەکە کرد.

**تَفَرَّعَ الشَّيْئُ:** شتەکە لق و پۆپی لێ بوونەوە.

**تَفَرَّعَ الأغصان:** لق و پۆپەکانی زۆر بوون ٥ دەشگوترێ:

**تَفَرَّعَت المسائلُ:** مەسەلەکان جۆر جۆر بوون و ڕێ ڕێ بوون.

**تَفَرَّعَ الشَّيْئَ:** کەوتەسەر شتەکە، بەسەری دا بالابوو.

**تَفَرَّعَ قومَهُ:** بەسەر گەلەکەیدا بالا بوو، ڕێزو شکۆمەندی بەدەست هێنا.

**الأفرع:** کەسێک قژی پڕو چڕو درێژ بێ ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (فَرعاء).

**الفارِعُ:** بەرزو بڵند ٥ دەگوترێ: (هو

فارع الطول) تابلّیی بالای بەرزو بلّندە ٥ (ك: فَرعة) ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (هن فوارع).

**الفَرعُ من كل الشَّیئ:** وشەی فەرع لەهەموو شتێكدا ناوە بۆ سەرە تەرزەو سەرە تۆپەلاكی شت ٥ دەگوترێ: (نزلوا فرع الوادي) لەلای ژووروی دۆڵەكەوە دابەزیون ٥ (فلان فرع قومە) فلانكەس ڕیش سپیو گەورەی گەلەكەیەتی ٥ تووكو قژی سەر ٥ هەر شتێك لەشتێكی تر جیا بووبێتەوەو لەو پەیدا بووبێ ٥ (ك: فروع) ٥ (فروع الشجرة) واتە: لقو پۆپی درەخت ٥ (فروع الرجل) منداڵو نەوەی پیاو ٥ (فروع المسألة) ئەو باسو چورتمو شتانەی لە مەسەلەكەوە سەرهەڵدەدەن.

**الفَرَعُ:** یەكەم بەری سكو زای حوشترو مەڕو بزنە ٥ لەسەردەمی نەزانی دا ئەو نۆبەرەیان سەر دەبڕی بۆ بتەكانیان.

**الفُرَیعاءُ:** ئەو زەویەی بەروبومەكەی ناگاتە ئەندازەی ئەو مەسرەفەی تێیدا كراوە.

**فَرعَنَ فَرعَنَةً:** خۆی بە زلزانیو لوتبەرزی نواندا.

**فَرعَنَ فلاناً:** ڕێگای بەفلان دا ببێتە دیكتاتۆرو هەڵسو كەوتی فیرعەونی بنوێنێ.

**تَفَرعَنَ النباتُ:** ڕووەكەكە گەشەی كردو بەرز بۆوە.

**تَفَرعَنَ فلان:** فلانكەس لوت بەرزی نواندو خۆی بەزلزانی ٥ بەڕەوشتی فیرعەونەكان ڕەفتاری كرد.

**فِرعَونُ:** نازناوی پاشا كۆنەكانی میصرە.

**فَرَغَ الشَّیئُ فراغاً وفروغاً:** شتەكە خاڵی بوو ٥ دەگوترێ: (فَرَغَ الإناء و فَرَغَ الفؤادُ).

**فَرَغَ من الشَّیئ:** شتەكەی تەواو كرد لەشتەكە بووەوە.

**فَرَغَ الی الشَّیئ ولە:** قەصدی شتەكەی كرد بۆی چوو ٥ دەگوترێ: (لأفرغنَّ لك) لە عۆدەت دێم بادەستم بەتاڵ بێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَا الثَّقَلَانِ﴾.

**فَرُغَ الفرسُ فراغَةً:** ئەسپەكە لە ڕۆیشتنیو خێراییدا باش بووە پێشكەوتنی بەدەست هێناوە.

**فَرُغَت الطعنةُ:** برینەكە فراوان بوو.

**أفرغَ الماءَ:** ئاوەكەی ڕشت.

**أفرغَ الدماءَ:** خوێنەكەی ڕشت.

**أفرغَ الذهب والفضة ونحوهما:** زێڕو زیو و ئەو جۆرە مەعدەنانەی لەقاڵب دا، كردنی بەقاڵب.

**أفرغ الله الصَّبْرَ على القلوب:** خودا صەبرو ئارامی خستە ناو دڵەکانەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾.

**فَرَّغَ الشَّيْءَ:** شتەکەی خاڵی کرد ◦ دەگوترێ: (فَرَّغَ الإناءَ وفَرَّغَ المكانَ).

**فَرَّغَ ما في الوِعاءِ:** ئەوەی لەقاپەکەدا بوو ڕشتی.

**إفتَرَغَ الماءَ:** ئاوی بەسەر خۆی دا کرد.

**تَفَرَّغَ من الشغلِ:** وازی لەئیشەکە هێنا.

**تَفَرَّغَ له:** خۆی بۆ تەرخان کرد.

**إستفرغ فلان:** فلانکەس ڕشایەوە.

**إستفرغ جهوده في كذا:** هەموو هێزو توانای خۆی لەو ئیشەدا سەرف کرد.

**الفارِغ:** خاڵی ◦ دەگوترێ: (إناء فارغ وقول فارِغ وفؤاد فارغ).

**الفَراغُ:** بۆشایی ◦ شوێنی چۆڵ.

**الفِراغُ من الدلو:** ئەو لا کەچاییەی دۆڵچە کەئاوی لێوە ڕۆدەکرێ ◦ حەوزە ئاوێك لە پێستی ڕەشە وڵاخو شتی وا دروست بکرێ ◦ مەنجەڵی گەورە، قازان کەهەڵ نەگیرێ ◦ (ك: أفرغة) ◦ دەشگوترێ: (رجل فِراغ) پیاوێکی خۆشڕۆیە ◦ (ناقة فِراغ) حوشتری نیشانە نەکراو.

**الفَراغَةُ:** دڵە ڕاوکێو نارەحەتی دەروونی.

**الفَرغُ:** بەفیڕۆ چوون ◦ دەگوترێ: (ذهَبَ دَمُهُ فَرغاً) خوێنی بەفیڕۆ چوو.

**الفريغُ:** پانو پۆڕ ◦ چەقۆ و کێردی زۆر تیژ ◦ دەشگوترێ: (رجل فريغ) پیاوێکی زمان تیژو قسە زانە (طعنة فريغة) برینێکی قەوارەییەو خوێنی لێ دەتکێ.

**المُفَرَّغُ:** دەگوترێ: (درهم مُفَرَّغ)دیرهەمو زیوێکی لەقاڵب دراوە.

**المُفرَغَةُ:** دەگوترێ: (حلقة مفرغة) ئەڵقەیەکە نازانرێ سەرو بنی کامەیە هیچ شوێنی پێکەوە لکانی پێوە دیار نیە.

**فَرفَرَ:** پەلەی کرد لە ڕۆیشتنداو هەنگاوەکانی کورت کورتو خێرا خێرا هاویشتن ◦ خۆی تەکاند ◦ خۆی ڕاوەشاند.

**فَرفَرَ فلان:** فلانکەس کاڵفام بوو بێعەقڵ بوو ◦ کەژاوەی بۆ ئافرەت دروست کرد ◦ ملی نایە نەحمەقیو خوێڕیەتی.

**فَرفَرَ في كلامه:** قسەی تێکەڵو پێکەڵی کردن.

**فَرفَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕاوەشاندو دەنگی لێ هێنا، کردی بەشەقشەقە.

**فَرفَرَ الذئبُ الشاةَ**: گورگەکە مەڕەکەی ونجڕ ونجڕ کرد ◦ کەلەپارچەی کرد.

**فَرفَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵتەکاند، تەکاندی.

**فَرفَرَ فلاناً**: ناموس‌و حەیای لەکەدار کرد ◦ بوختانی بۆ هەڵبەست.

**الفُرافِرُ**: وێڵ‌و گێل‌و بێ مەبەست ◦ بێچوی مەڕو بزن‌و مانگا کێوی ◦ شێر: کە هاوشانی خۆی کەلەپارچە بکا ◦ دەگوترێ: (أسد فُرافِرُ وفرافرة) ◦ منداڵی تێکەیشتو و پێکەیشتو ◦ ئەسپێك لغاوەکەی بجوڵێنێ‌و هەوڵبدا لەسەری خۆی داماڵێ.

**الفَرفارُ**: دارێکی زۆر ڕەق‌و پتەوە زۆر درەنگ دەسوتێ‌و دەبێتە خۆڵەمێش: کاسەو کەوچك‌و شتی وای لێ دروست دەکرێ ◦ جۆرێکە لەکەژاوەی ئافرەت.

**الفُرفُرُ**: چۆلەکەی بچوك.

**الفُرفُورُ**: گەنجی پێکەیشتو ◦ چۆلەکەی بچوك.

**الفِرفِيُّ**: جۆرێکە لەڕەنگ؛ ڕەنگێکی سوری مەیلەو ڕەش ◦ دەگوترێ: (جوهر فِرفيري).

**الفِرفيرين**: لەبواری پزیشکیدا ڕەنگێکە مادەیەکە بۆ هیمۆگلۆبین پەیدا دەبێ.

**الفِرفيريني**: (بول فِرفيرني) میزێکە بەسروشت مادەی فرفیرینی تێدایە بەزۆری.

**فَرَقَ بين الشيئين فرقاً وفرقاناً**: دووشتەکەی لێك جیاکردنەوە.

**فَرَقَ بين الخصوم**: بڕیاری دا لەنێوان دوو دژو ڕکەبەرەکان‌و کێشەکەی بۆ یەکالا کردنەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾.

**فَرَقَ بين المتشابهين**: لایەنی جوداوازیی نێوانی دوشتە لێکچووەکانی دیاری کردو رونی کردەوە.

**فَرَقَ له عن الأمر**: کارەکەی ئاشکراکرد.

**فَرَقَ له الطريقُ أو الرأيُ**: ڕێگەکە ئاشکرا بوو، رون بۆوە.

**فَرَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دابەش کرد.

**فَرَقَ اللهُ الكتابَ**: خودا قورئانی بەئاشکرایی‌و رونی ماناو مەبەست نازڵ کردوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ﴾.

**فَرِقَ الصَّبيّ**: منداڵەکەی ترساند.

**فَرِقَ فَرَقاً**: زۆر ترساو هەڵلەرزی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾.

**فَرِقَ منه:** لێی ترسا.

**فَرِقَ عليه:** بەزەیی پیا هاتەوە بۆی بە پەرۆش بوو.

**فَـرِقَ فـلانٌ:** فلانکەس چووە ناو هەضەبەو بانوەکەو پێیدا ڕۆیی ◦ بە سروشتو زکماك دانی شاش بوون ◦ دەگوترێ:

**فَرِقت الأسنانُ:** ددانەکان شاشو کەل بوون.

**فَرِقَت الدّابّةُ:** وڵاخەکە کلۆتێکی بەرزو کلۆتێکی نزم بوو.

**فَـرِقَ التـيسُ:** نێرییەکە نێوان دوو شاخەکانی پان بوو ◦ یان نێوان دوو گونەکانی پان بوو.

**فَرِقَ الـديكُ:** کەڵەشێرەکە دوو پۆپنەی هەبوو، چونکە نێوانیان هەبوو ◦ دەگوترێ: (فَرِقَ عرف الديك) پۆپنەی کەڵەشێرەکە دوولا بوو دووکەرت بوو بەزکماك (فهو أفرق وهي فرقاء).

**أفرق العليلُ:** نەخۆشەکە چاك بۆوە.

**أفرق الناقةُ:** حوشترەکە بێچوەکەی لێ دوور کەوتەوە ◦ یان دووساڵو سێ ساڵی بەسەردا تێپەڕی ئاوس نەبوو.

**أفـرق فلانـاً:** فلانکەسـی واڵێ کـرد بترسێو هاوار بکا.

**أفـرَقَ الرجـلُ غَنَمـهُ:** پیاوەکە مەڕو بزنەکانی ونکردو فەوتاندنی.

**أفرق إبِلَهُ:** حوشترەکانی لە پاوانەکەدا بەرەڵڵا کردن بۆ ئەوەی بۆخۆیان بلەوەڕێن ◦ حوشترەکانی بەکەڵ نەدانو ئاوس نەبوون.

**فَارَقَهُ مفارقةً:** لێی دوور کەوتەوە.

**فَرَّقَ بين القوم:** تەفرەقەو جودازایی خستە نێوان دووشتە لێك چووەکە دەشگوترێ: (فَرَّقَ القاضي بين الزوجين) دادوەرەکە بڕیاری لێك جیابوونەوەی ژنو مێردەکەی دا.

**فَرَّقَ الشَّيْئَ:** شتەکەی پارچە پارچە کرد.

**فَرَّقَ الله القرآن:** خودا قورئانی پارچە پارچەو ئایەتئایەتو سورەت سورەت نازڵ کردووە.

**فَرَّقَ الأشياءَ:** شتەکانی بەش کردن.

**فَرَّقَ الصَبِيَّ:** منداڵەکەی ترساند.

**إفترق القومُ:** خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو هەریەکەیان بەلایەکدا ڕۆیی.

**إنفَرَقَ الشَّيْئُ:** شتەکەی بڵاو کردەوە ◦ دوولەت بوو ◦ دەگوترێ:

**إنفـرق الـصبحُ:** بەیانی گزنگی دا تاریکایی درێ پێ درا.

**تفارق القومُ:** قەومەکە هەندێکیان لە هەندێکیان جیابوونەوە.

**تَفَرَّقَ الشَّيْئ تَفَرُّقاً وتِفراقاً:** شتەکە کەرتو پەرت بوو.

**تَفـرّق الـرجلان:** دوو پیاوەکـە لێـك جیابوونـەوەو هەریەکـەیان بەلایەکدا ڕۆیی.

**التفـاريق:** پارچـەو بـەش ٥ (تفـاريق الشّيئ) پارچە بڵاو بووەکانی شت ٥ دەگـوترێ: (أخـذ حَقّـهُ بالتفـاريق) وەجبـە وەجبـەو بەشـبەش مـافی خۆی وەرگرت.

**الفَـارِقُ:** ئـەوەی شتێـك لـە شتێـك جیادەکاتەوە ٥ (ك: فوارِق).

**الفـاروق:** ئـەوەی حـەق و بـەتاڵ لێـك جیابکاتـەوە ٥ نازنـاوی عومـەری کوڕی خەتتابە ٥ زۆر ترسان.

**الفَاروقة:** ترسانی زۆر.

**الفِراقُ:** لێـك جیابوونـەوە بـەزۆری بۆ لێـك جیابوونـەوەی جەسـتە بەکاردێ.

**الفَرقُ بين الأمرين:** جیاکردنەوەی نێوان دووکارو روداو ٥ نێوان دوو کۆمەڵـە قژی سەر ٥ تۆقە سەر.

**الفِـرقُ:** بـەمانا شـەقامە ڕێـی نێـوان دوو کێو ٥ قەوارەی گەورە ٥ درزو شەبەقی گـەورە ٥ بـانوو دەشـتایی بـەرز ٥ شەپۆلی بەرزەوەبووی دەریـا ٥ کـەرتو لەتی هەر شتێك قەبارەی هەبێ.

**الفَرِقُ والفَرُقُ:** پیاوێك بە سروشت زۆر بترسێ.

**الفُرقـانُ:** قورئـانی پـیرۆز ٥ بەڵـگەو پاسـاو ٥ هەرشتێـك حـەق و بـەتاڵ لێك جیابکاتەوە.

**الفِرقَـةُ:** کۆمەڵێـك مـرۆڤ ٥ دەگـوترێ: (فرقـة التمثيـل) (فرقـة الألعـاب) ٥ کۆمەڵێـك قوتـابی هاوتەمـەن و هاوچەشـن لەخوێندنـدا ٥ چـەند هێزو لیوایەك لەسوپا.

**الفِرقَةُ:** لێك جیابوونەوە.

**الفَرُوقُ:** زۆر ترسان.

**الفريـق:** تاقمێـکی زۆری ئـادەمیزاد ٥ جیـابۆوەو دوورکەوتـە ٥ ئەسـپی پێشکەوتوو لە کێبڕکێدا ٥ پلەیەکە لەپلـەی سـەربازی ٥ (ك: فُرَقـاء وأفرقة).

**المَفرِقُ مـن الـرأس:** تۆقەسـەرو خـەتی لێـك جیابوونـەوەی قـژی سەر لـە ناوچـەوانەوە تـا پـشتە مـل ٥ ئـەو شوێنەی ڕێگاکان لێك جیادەبنـەوە، چـوار ڕێیـانو جیابوونـەوەی ڕێگاکان.

**مفـارِقِ الحـديث:** لایەنـە ئاشـکراو ڕوونەکانی ئاخاوتن.

**الفَرقَدُ:** ئەستێرەیەکە لەنزیك قوتبی شـیمالیەوە دەبینـدرێ، شـوێنەکەی دیارەو تا ئەندازەیەك سابیتە ٥ پێی دەگوترێ: ئەستێرەی قـوطبی ٥ لـە

نزیکیـــەوە ئەســـتێرەیەکی تـــرو هاوشێوەی ئەو بەڵام بچوکتر لەو پێکەون بۆیە شاعیر دەڵێ:

وكـــل أخ مفـــارق أخـــاه
لعمر أبيك حتى الفرقدان

گۆلکەڵە ◦ (ك: فراقد).

**الفُرقُودُ**: بـەمانا (الفَرقَـدُ) دێ ◦ (ك: فراقيد).

**فَرقَعَ الـشَّيْئَ**: شـتەکە دەنگـی لێ هـات، ناڵەی کرد.

**فَرقَعَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی تەقانـدەوەو گرمەی هات.

**فَرقَعَ أصابِعَهُ**: پەنجەی تەقاندن.

**فَرقَـعَ فلانـاً**: ملـی فلانکەسـی بـادا، بەجۆرێک دەنگی مل تەقاندنەکەی هات.

**إفرَنقَـعَ**: بازێـکی تونـدی هاویـشتو پشتی هەڵکرد.

**إفرَنقَعَـت الأصـابِعُ**: جومزگـەی پەنجەکانی تێك گیرانو دەنگیـان لێ هات ◦ دەشگوترێ: (إفرنقع القوم عن الشّيئ) خەڵکەکە بڵاوەیان لەشتەکە کردو لێی دوورکەوتنەوە.

**تفرقعت الأصـابع**: پەنجەکانی دەنگیـان لێوەهاتو تەقین.

**الفرقَعَـةُ**: دەنگـی لێـکدانی دوو شـت ◦ تەقینەوەی بەهێزو دەنگی گەورە.

**المُفَرقِعـات**: مـەوادی تەقینـەوە، ئـەو مەوادانەی هێزی تەقینـەوەیان زۆر بەهێز بێ.

**فَـرَكَ الـشَّيْئَ فَركـاً**: شـتەکەی کرانـد، خوراندی ◦ دەگوترێ:

**فَرَكَ الحِمصَ و فَرَكَ الجَوزَ**: توێکڵی نۆکەکە یـان گوێزەکـەی هەڵفلیقانـد بۆئـەوەی توێـکڵەکەیان لێـداماڵێ ◦ دەگـوترێ: (فَـرَكَ الثـوبَ) قوماشـەکەی کرانـد، خوراندی بۆئەوەی ئـەو شتەی پێوەی نووسـاوە لێـی بێتـەوە ◦ (فهـو فـارِك والثوب مفروك).

**فَرِكَ فَرَكاً**: ناخۆشی ویـست ڕقـی لێ بـوو، بـەزۆری بـۆ ڕق لێبـونی نێـوان ژنو مێرد بەکاردێ ◦ (فهو وهي فارك).

**أفرَكَ السُّنبُلُ**: گوڵە گەنمەکـەی بووبـە فـەریك بـەکاری ئـەوەدێ هـەڵێ پروزێنێو بێ پرووێنێو پاك بکرێو بخورێ.

**إنفرك الشَّيْئُ**: شتەکە تـەفرو تونا بـوو هەڵوەریو کەوتە خوار.

**إنفـرك المنكِـبُ**: شـانی داچـۆڕاو شـانی داکەوت.

**تفَـرَّكَ المُخَنَّـثُ**: نێرەموکەکـە لەقـسەو ڕۆیـشتنو هەڵسوکەوتـدا ژنانـە ڕەفتاری کردو خۆی وەکوو ئـافرەت نیشان دا.

إستفرك الحَبُّ في السُنْبُلَةِ: دانەوێڵەکە لە گوڵەکەیدا پێگەیی‌و ڕەق بوو.
الفرِكُ من الأشياء: ئەوشتەیە توێکڵی لێ بووبێتەوە ٥ توێکڵی لێ داماڵدرابێ.
الفَريـك: توێکڵ لێ کراوە پاککراو ٥ گەنم‌و (زوڕات) گەنمەشامی سەرەتای پێگەیشتنیان ٥ فەرەخەرمان ٥ ئێسقانێکی بچکۆلەیە لەبنی زماندا.
المفروكة: خواردنێکی گوندنشینە میصریەکان دروستی دەکەن لە گەنمەشامی‌و ڕۆن‌و شیر.
فَرِمَ اللحمَ: گۆشتەکەی هەنجنی.
أفرَمَ الإناءَ: قاپەکەی پڕکرد.
الفَرّامَةُ: ئامێری هەنجنین.
الفَرّانُ: نانەوا، نانکەر.
الفُرنُ: تەندوری نانەوا خانە.
الفُرنِيَـةُ: نانێکە شیرو ڕۆن‌و شەکری تێکەڵ دەکرێ.
الفِرِنـدُ: شمشێر ٥ ئەو تیشکەی لەئاکامی شەپۆلی ڕوناکی لەپانایی شمشێرەکە بەرچاو دەکەوێ ٥ دەنکە هەنار ٥ گوڵی سور.
الفُرانِقُ: شێر ٥ شارەزاو چاو ساغی پێش سوپا، یان پێشەنگی نامە بەر.
فَـرِهَ فَراهـاً: تەڕدەماغ‌و لەخۆ بایی‌و بەدڕەوشت بوو.
فَـرُهَ فَراهـةً وفَروهَـةً: جوان‌و قۆز بوو ٥ چوست‌و چالاك‌و شارەزاو لێزان‌و دەست ڕەنگین بوو.
أفرَهَ: شتێکی جوان‌و سەرەنج ڕاکێشی بەدی هێنا ٥ شتێکی جوانی دروست کرد خانوێکی نایابی بنیات نا.
أفرَهَـت المـرأة: ئافرەتەکە منداڵێکی جوانی بوو، کوڕێکی قۆزو شۆخ‌و شەنگی بەوەلەد هێنا.
فَرَّهَ: بەمانا (أفرَهَ) دێ.
إستفرَهَ: شتی باشی هەڵبژارد.
أفرَهَ: جوانتر، قۆزتر ٥ دەگوترێ: (فلان أفرَهُ من فلان) فلان لە فلان قۆزترە، جوانترە.
فَرهَـدَ الغـلامُ: منداڵەکە (گەنجەکە) خۆی دارشت‌و پێگەیی.
فَرهَدَ نَفَسَهُ: هەناسەی تەنگ بوو.
تَفَرهَدَ الغـلامُ: کوڕەکە قەڵەو و جوان بوو.
الفُرهُـدُ: گەنجی جوانخاس‌و تازە پێگەیشتوو ٥ بێچوە شێر.
الفُرهـودُ: بەمانا (الفُرهُـدُ) دێ ٥ (ك: فراهید).
فَرّى الثياب: قوماشەکەی کردە فەروە ٥ فەروەی لەسەر پۆشاکەوە پۆشی ٥ قوماشەکەی توکن کرد پرژی تێ کرد.

**إفترى فرواً**: فەرووەی پۆشی.

**الفَرا**: کەرەکێوی.

**الفَـرّاءُ**: فـەروە دروسـت کـەر ٥ فـەروە فرۆش.

**الفَروُ**: پێستی بـرێ گیانلەبـەرە وەکـوو ورچ‌و ڕێـوی، پێـستە کـە دەبـاغ دەکـرێ‌و دەکرێتـە پۆشـاك بـۆ خۆپاراستن لەسەرما یان بۆ جوانی‌و زینەت لەبەر دەکرێ.

**الفَــروةُ**: پێـستێـك تـوکی پێوەبـێ ٥ دەگـوترێ: (فــروة الــرأس) (فــروة الدب، فروة الثعلب، فروة الغنم).

**فَرى الشَّيْءَ فرياً**: شتەکەی هەڵاشت، دڕی و وردی کرد.

**فَــرى القِربَــةَ**: دێمکـە ئاوەکـەی ئەنـدازە کـــرت‌و دروســـتی کـــرد ٥ (قِربـــة) پارچەیەك پێستی خاراو و دەباغکراوە لایـــەکی دەدورێتـــەوە و دەکرێتـــە دێمکەی ئاو یان هی دۆو ماست.

**فَــرَى الکــذبَ**: درۆکــەی هەڵبەســت ٥ بوختانی کرد.

**فَرى الأرضَ**: بە زەوییەکە دا ڕۆیی‌و بڕی.

**فَرِيَ فرىً**: سەرسام‌و حیرەت زەدە بوو.

**أفــرَى الـشَّيْءَ**: شـتەکەی شـەق کـرد، دڕاندی.

**أفرى فلاناً**: زۆر بەتوندی دابەزیە سەر فلان‌و سەرزەنشتی کرد.

**أفــرَجَ الأوداجَ**: شـا ڕەگــەکانی لاملــی بـــڕین‌و خوێنەکـــەیان دەرهـــات، خوێنەکەیانی دەرهێنا.

**فَرَاهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەماناى (فَرَاهُ) دێ.

**إفترى القولَ**: قسەکەی هەڵبەست.

**إنفرى الشَّيْءُ**: شتەکە شـەق بـوو لێـك بۆوە.

**تفرّى الـشَّيْءُ**: شـتەکە شـەقی بـرد، دڕا دادڕا ٥ دەگـوترێ: (تَفَرّى عنـه ثوبـه) کراســەکەی لەبــەردا دڕا ٥ (تفــرّى الليلُ عن صبحه) شـەوگار شـەق بـوو بەیانی دا.

**تَفرّت العينُ**: کارێزەکە هەڵقوڵی‌و ئـاوی لێ هات.

**تفرت الأرض بالعين**: زەوییەکە شەق بوو ئاوی لێ هەڵقوڵا.

**الفِريَةُ**: بوختان‌و درۆ ٥ (ك: فِرىً).

**الفَرِيُّ من الأمـور**: قـسەی هەڵبەسراو، شـتی بـەدرۆو بـێ بناغـە ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا﴾ ٥ دەگوترێ: (فلان يفـرى الفَـــريَّ) ئەگـــەر ئیـــشی چـــاك ئەنجامداو شتی سەیرو سەمەرە بکا ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوی بوختانکەر.

**فَـزَرَ الثـوبَ فَـزراً**: قوماشـەکەی دادڕی ٥ ڕزاندی.

**فَزَرَ الـشَّيْءَ**: شتەکەی شـەق کـردو لێـکی جیاکردەوە.

**فَزَرَ الشَّيْئَ من الشَّيْئِ**: شتەکەی لە شتەکە جیاکردەوە.

**فَزِرَ فَزَراً**: لە پشتی یان لە سنگی گرێیەك دەرچوو ٥ (فهو أفزر وهي فزراء).

**أفزَرَ الشَّيْئَ**: بەمانا (فَزَرَهُ) دێ.

**فَزَّرَ الشَّيْئَ**: بەمانا (فَزَرَهُ) دێ.

**إنفَزَرَ الثوبُ**: کراسەکە شەق بوو، ڕزی.

**تَفَزَّرَ**: قەڵش قەڵش بوو.

**الفازِرَةُ**: ڕێگایەك بەناو لمبەلانی تەبارە بەستوودا، هەر دەڵێی درزەو بەسروشت لە زەویەکە بووە.

**الفَزارَةُ**: پڵنگی مێینە.

**الفِزرُ**: بێچوە نێرەی پڵنگ ٥ بێچوە نێرەی بەور ٥ کارە کێوی.

**الفَزراءُ**: کچۆڵەی گەنجو گۆشتنو تێکسمڕاو و خۆداڕێژ.

**الفُزرَةُ**: لووە گۆشتو ئێسقانێکە لە سنگ یان لە پشت پەیدا دەبێ.

**الفِزرَةُ**: پڵنگی مێ ٥ دێڵە پڵنگ ٥ کەندڕو درزی گەورە.

**فَزَّفَزّاً**: ترسا ٥ (فَزَّ عن الأمر) لەکارەکە دوور کەوتەوە، لای دا.

**فَزَّ الرجلُ فَزازةً وفُزوزَةً**: پیاوەکە چوستو چالاك بوو گورجو گۆڵ بوو (فَزَّ الجرح فَزّاً) برینەکە هەوی کردو کێمو زوخاوی لێ ڕەوان بوو.

**فَزَّ فلاناً فَزّاً**: ترساندیو ئیزعاجی کرد.

**أفزَّهُ**: بەمانا (فَزَّهُ) دێ.

**تَفازّا**: هەریەك لە دوو بەرامبەرەکە ویستی بەسەر ئەوی تریان دا زاڵ بێ.

**إستَفَزَّهُ الخوفُ**: ترسو بیم جاڕزی کرد.

**إستَفَزَّ فلاناً**: فلانکەسی تورە کردو تەنگی پێ هەڵچنی.

**الفَزُّ من الرجال**: پیاوی چوستو قاڵب سوك ٥ بێچوی مانگا کێوی.

**الفَزَّةُ**: بازدانی بەزۆر تەنگەتاو کردن.

**فَزَعَ فلاناً فَزعاً**: فلانکەس گرژو ناڕەحەت بوو، هەڵسلەمیەوە لەشتێکی سامناك.

**فَزَعَ القومَ**: بەهانای قەومەکەوە هاتو یارمەتی دان.

**فَزِعَ فَزَعاً**: ترساو دڵی داخورپا.

**فَزِعَ اليه**: پەنای بۆ بردو داوای بەهانا هاتنی لێ کرد ٥ گوتراوە: (أفزَعَهُ لَمّا فَزِعَ) کەترسا بەهانایەوە هات.

**فَزِعَ من نومه**: لەخەو ڕاستی کردەوە، بەئاگای هێنا.

**فَزَّعَهُ**: بەمانا (أفزَعَهُ) دێ.

**فُزِّعَ عنه**: ترسو بیمی لێ ڕەواندەوە.

**الفَزّاعَةُ**: زۆر ترسناك ٥ ئەوەی دەیترسێنێ ٥ ئەوەی بەهانایەوە دێ.

**الفَزَعُ**: ترسو بیم ٥ پەنابردن ٥ بەهاناوە هاتن.

الفَـزِعُ: بـەهاناوە هـاتوو ٥ هـاوار بـەرو پەنابەر.
الفُزْعَةُ من الرجال: ئەو كەسەی خەڵك زۆر لێی دەترسێ.
الفُزَعَـةُ مـن الرجـال: پیاوێـکە زۆر لەخەڵك بترسێ.
المَفـازِعُ مـن الرجـال: کەسێـکە هانا بۆ کەسـانی دیکـە بـەرێ یـان بـە پێچەوانە بەهانای خەڵکەوە بچێ.
المُفَزَّعُ: ئەو کەسەی ترس‌و بیمی لەکۆڵ کرابێتەوە ٥ ترسنۆك.
المَفـزَعُ: کەسێـك لـەکاتی تەنگانــەدا پەنای بۆ دەبرێ.
المَفزَعَـةُ: بـەمانا (المَفـزَعُ) دی ٥ هـەر شتێك ترسی لێ بکرێ.
فَزفَزَهُ: جاڕزی کردو دەری کرد.
فسَأ الثـوبَ: قوماشـەکەی ڕاکێـشا تـا دڕاو هەڵتلیشا.
فسَأ فلاناً عن الأمر: فلانکەسی لەکارەکە مەنع کرد.
فَسِئَ فَسَأً: سنگی دەرپـەڕی‌و پـشتی چاڵ بوو ٥ (فهو أفسأ وهي فَسآءُ).
فَـسَّأ الثـوبَ تفـسِئَةً: قوماشـەکەی زۆر ڕاکێشا تا هەڵتلیشاو دڕا.
تَفَسَّأ الثوبُ: قوماشەکە هەڵدڕاو ڕزی.
الفُستانُ: پۆشاکێکی ئافرەتانە جۆرەها ڕەنگ‌و شێوەی هەیە.
الفُستُقُ: درەختێـکی بـەرداره لـەپێری درەختــە قەزوانیەکانــە، قاوغەکـەی دوو فلیقــەو ناوکەکــەی مەیلــەو سەوزەو تامی خۆشە لە وڵاتی شام‌و لـــەئێران‌و زۆر وڵاتـــی تـــر دەروێندرێ‌و وەبەر دەهێندرێ.
الفُـستقي: ڕەنگـی فـستەقی مەیلـەو سەوز.
فَـسَحَ لــه في المجلــس فَــسحاً: لــە مەجلیسەکەدا ڕێـگای بـۆ کـردەوە تـا دابنیشێ.
فَـسَحَ لـه الأمـير: پاشـا ڕێـگای پـێدا سەفەر بکا.
فَسَّحَ الخرزتين: کونی مورووەکـەی فـراوان کرد.
فَـسَّحَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی بـڵاو کـردەوە، پانی کردەوە.
فَسُحَ المكانُ فَساحةً: شوێنەکە فراوان بوو.
أفسَحَ المكانَ: شوێنەکەی فراوان کرد.
فَسَّحَ المكانَ: شوێنەکەی فراوان کرد.
إنفَسَحَ المكانُ: شوێنەکە فراوان بوو.
إنفَسَحَ صدرُهُ: سنگی فراوان بوو.
إنفَـسَحَ طرفُـهُ: ڕوانینـی درێـژ بـۆوەو دووری بینی.
تفاسَحَ القومُ: خەڵکەکە مەجلیسەکەیان فراون کرد بۆئەوەی جێگای کەسانی تریش ببێتەوە.

تَفَسَّحَ المكانُ: شوێنەکە فراوان بوو.
تَفَسَّحَ فلان: فلانکەس داوای جێگە کردنـەوەی کـرد ٥ داوای پـشودانی کـرد لەکارکردنـدا بۆئـەوەی بحەسێتەوە.
تَفَسَّحَ لـه في المجلس: مەجلیسەکەی فراوان کرد ٥ جێگای بۆ کردەوە.
الفَسحُ: جەوازی سەفەر.
الفُسحُ: دەگوترێ: (منـزل فُـسحٌ) مەنزلێکی پانو پۆڕ ٥ (رجل فُسحٌ) پیاوێکی سنگ فراوانە.
الفُسحَةُ: پانوپۆڕ، فـراوان ٥ دەگوترێ: (في هـذا الأمـر فـسحة) لـەم کارەدا فوسـحەو مـەجال هەیـە ٥ پـشودان لەنێوان دوو وەجبەی کار.
الفُسحتان: دوو لاچەناگەی خوار لێوی ژێرەوە موی لێ نەڕوابێ.
فَسَخَ الرجل فَسخاً: پیاوەکە زەعیفو لاواز بوو نەزان بوو.
فَسَخَ الرأيَ: ڕایەکەی فەسادو شێواند.
فَـسَخَ الأشـياءَ: شـتەکانی لێـك جیاکردنەوە.
فَسَخَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵوەشاندەوە.
فَـسَخَ البيـعَ أو العقـدَ: مامەڵەکـەی هەڵوەشاندەوە، گرێبەستەکەی پوچـەڵ کردەوە.
فَـسَخَ المِفصَلَ: جومزگەکـەی لەشـوێنی خۆی لابرد بەبێ ئەوەی بیشکێنێ.
فَسَخَ الثوبَ عن نفسه: کراسـەکەی خۆی داکەندو فڕێی دا.
فَسِخَ الرأيُ ونحوه فَسخاً: ڕایەکە پوچەڵ بوو، خراپ بوو.
أفسَخَ القرآنَ: قورئانی لەبیر چۆوە.
فاسَخَهُ البيعَ: داوای لێ کـرد مامەڵەکە پوچەڵ بکاتەوە ٥ یان هاوڕای بێ بۆ پوچەڵ کردنەوە.
إنفَسَخَ الـشَّيْءُ: شـتەکە هەڵوەشـایەوە، پوچەڵ بۆوە.
تفاسَخَ البَيِّعَانِ البَيعَ: کڕیـارو فرۆشـیار هـەردوکیان بڕیاریانـدا مامەڵەکـە هەڵبوەشێننەوە.
تَفاسَـخَ الأقاويـلُ: قـسەو باسـەکان دژ بەیەك بوون.
تَفَسَّخَ الشَّيْءُ: شتەکە داوەشاو فاسید بوو.
تَفَـسَّخت المـادة العـضوية: مـادە عـوضـوییەکـە بـەهۆی کاریگـەری بەکتریاکانەوە داوەشاو ڕزی.
تَفَسَّخ الشَّعرُ عن الجلد: توکی پێستەکە ڕوتایـەوەو هـەڵوەری ٥ دەشگوترێ: (تَفَسَّخَ اللحمُ عن العظـم) گۆشـتەکە لەئێسقان داماڵدرا هەڵوەری.
تَفَسَّخت الفارة في المـاء: مـشکە تۆپاوەکە لەناوەکە دا ڕزیو پارچە پارچە بوو.
تَفَسَّخ الفصيل تحت الحمل الثقيل: بێچوە حوشترەکە نەیتوانی بـارە قورسـەکە هەڵبگرێ.

**الفَسخُ**: کەسێکی لاواز کە نەتوانێ بەرەنگاری چورتمو تەنگانە ببێتەوەو کاری خۆی ئەنجام بدا.
**الفَسیخُ**: رزیو، هەڵوەشاوە، پوچەڵ کراوە، داوەشاو ٥ جۆرە ماسیەکە.
**فَسَدَ اللحمُ أو اللبَنُ**: گۆشتەکە یان شیرەکە بۆگەنی کردو کەڵکی نەما.
**فَسَدَ العقدُ**: گرێبەستەکە پوچەڵ بۆوە.
**فَسَدَ الرجلُ**: پیاوەکە رێبازی راستیو حیکمەتی هەڵەکردو سەری لێ شێوا.
**فَسَدَ الأمورُ**: کارو ئیشەکان گەندەڵ بوونو پشێویو نارێکو پێکی تیایاندا زۆر بوو.
**أفسَدَ الرجلُ**: پیاوەکە گەندەڵ بوو.
**أفسَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی داوەشاندو رزاندی خراپی کرد.
**فاسَدَ الرجلُ رهطه**: پیاوەکە خراپەی بەرامبەر تاقمو پێرەکەی خۆی ئەنجام دا خیانەتی لێ کردنو ئەوانیش دژی وەستان ئاشوبیان نایەوە.
**تفاسَدَ القومُ**: خەڵکەکە پشتیان لەیەك کردو قەتعی سیلەی رەحمیان کرد، لێك دابران.
**إستَفسَدَ الشَّيْءَ**: کاری بۆ ئەوە کرد شتەکە فاسید بێ ٥ دەگوترێ: (إستفسد الزرعَ) کشتوکاڵەکەی وا لێ کرد کەڵکی نەبێ.
**إستَفسَدَ الرجلُ رَهطَهُ**: پیاوەکە خراپەو خیانەتی بەرامبەر خزمو خێڵی خۆی ئەنجام دا.
**الفساد**: رزینو داوەشانو بێ کەڵك بوون ٥ پشێویو ئاژاوە، گرانیو قاتو قڕی ٥ زیان گەیاندن بەخەڵك.
**المَفسَدَةُ**: زەرەرو زیان ٥ دەگوترێ: (هذا الأمر مَفسَدَة لكذا) ئەم کارە زیانی بۆ ئەو شتە هەیە ٥ هەرشتێك سەربکێشێ بۆ فەسادو گەندەڵیو خراپەکاری ٥ (ك: مفاسِد).
**فَسَرَ الشَّيْءَ فسراً**: شتەکەی رون کردەوە.
**فَسَرَ الطبيبُ**: پزیشکەکە سەیری میزی نەخۆشەکەی کرد بۆئەوەی بزانێ نەخۆشیەکەی چییە.
**فَسَّرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی رون کردەوە.
**فَسَّرَ آيات القرآن الكريم**: ئایەتەکانی قورئانی تەفسیر کردنو ماناو مەبەستەکانی رون کردنەوە، نهێنیو حیکمەتو ئەحکامەکانی خستنە روو.
**إستَفسَرَهُ عن كذا**: داوای لێ کرد ئەو شتەی بۆ رون بکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (إستَفسَرَهُ كذا).
**التَفسِرَةُ**: شیکردنەوەو رون کردنەوە.
**تفسير القرآن**: لەبواری زانستە

ئیسلامیەکاندا مەبەست
ڕونکردنەوەو شیکردنەوەی ماناو
مەبەستەکانی ئەو کتێبە پیرۆزەیە،
دەرخستنی ئەو عەقیدەو نهێنیو
حوکمو حیکمەتانەن کە لە
دووتوێی ئایەتەکانی دا هەن.

**الفُسطاطُ**: خێمەو ڕەشماڵ کە لە
کوڵك و مو دروست بکرێ ٥ شارێکی
مێژووییە لە وڵاتی میصر عەمری
کوڕی عاص لەو شوێنەی خێمەکەی
خۆی لێ بوو دروستی کردووە ٥
هەروا وشەی (فسطاط) ناوە بۆ
کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

**الفَسیطُ**: نینۆك کەر ٥ ڕەحەتیو
پالێوەری شلەمەنی.

**فَسفَسَ فلان**: فلان زۆر گێلو ئەحمەق
بوو.

**فَسَافِس**: مێشێکی زیانبەخشو بۆگەنە
بەعەرەبی ناوێکی تریشی هەیە
پێی دەگوترێ: (البقة).

**الفَسفاسُ**: کەسێك زۆر ئەحمەقو گێل
بێ ٥ شمشێری کولو نەبڕ ٥
ڕووەکێکی سەوزی بۆگەنە گوڵێکی
سپی هەیە لەدەم جۆگەو ڕووبار
دەڕوێ.

**الفِسفِسُ**: خانوی ڕازاوە بەپارچە
شوشەو بەردی مەڕمەڕو لەتە میرو
ئەو شتانە.

**الفُسَیفِساءُ**: وردە پارچەی ڕەنگاو
ڕەنگ لەبەردی مەڕمەڕو موورو
شتی وا، پێکەوە دەلکێندرێنو
وێنەو دیکۆریان لێ دروست دەکرێ
بۆ دیوارو هەلآشی خانو.

**فَسَقَ کل ذي قِشر فِسقاً وفُسوقاً**:
فیستەقەکە لە توێکڵەکەی خۆی هاتە
دەر، گوێزەکە، بادامەکە لە قاوغەکە
یان هاتنە دەر ٥ دەگوترێ: (فَسَقَت
الرُّطبة عن قشرها) میوە تەڕو
شیرینەکە لە توێکڵەکەی هاتە دەر ٥
(فَسَقَت الفأرة عن جحرها) مشکەکە لە
کونەکەی هاتە دەر.

**فَسَقَ فلان**: فلانکەس لە خودا یاخی بوو،
سنووری بەزاندو فەرمانو نەهیەکانی
شەرعی پاشگوێ خست.

**فَسَّقَهُ**: بەفاسقی لەقەڵەم دا.

**إنفَسَقَتِ الرطبة**: میوە تەڕو شیرینەکە
لە توێکڵەکەی هاتەدەر.

**فَسَاقِ**: بەم صیغە بەکاردەهێندرێ بۆ
بانگکردنی ئافرەت ٥ دەگوترێ:
(یافَسَاقِ) ئەی ئافرەتی سنوور
بەزێن!

**الفِسِّیقُ**: زۆر فاسقو سنوور بەزێن.

**الفِسقُ**: بەمانا (الفِسِّیقُ) دێ.

**الفُسُوقُ**: بەمانا (الفِسقُ) دێ.

**الفَسقِیَّةُ**: حەوزێکە لە ڕوخام
کەوانەیی یە ئافورەی تێدایە

بـەزۆری لەباڵەخانـەو حەدیقـەو شتی وادا دروست دەکرێ.

فَـسكَلَ الفَـرَسُ: ئەسـپەکە لـە پێـشبڕکێکەدا دواکـەوت لـە ڕیـزی ئاخیرەوە بوو.

الفُـسكولُ: ئەسپێـك لەغاردانەکـەدا پاشـەتا بـێ ٥ پیاوێـك لـەڕیزی ڕێبـواران دا لـە دواوە بـێ ٥ (ك: فَسَاكيل).

فَـسَلَ الفَـسيلَ: نەمامەکـەی چـەقاند، ڕواندی.

فَـسُلَ الرجـلُ فَـسالَةً وفَـسولةً: پیاوەکـە ترسنۆك بوو ڕەزیلو هیچو پوچ بوو.

أفـسَلَ الفَـسيلة: نەمامەکـەی لـە درەختەکـە کـردەوە ٥ یـان لـە زەوییەکە هەڵی کێشاو لە شوێنێکی تر ڕواندی.

فَسَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی ڕەزیلو تـەزویر کرد.

فَسَّلَ الرجلَ: پیاوەکەی بـێ هێـز کـردو ورەی ڕوخاندو نیشاتی شکاندەوە.

إفتَـسَلَ النبـاتَ: ڕوەکەکـەی هەڵکێـشا بۆئەوەی لە شوێنێکی تر بیڕوێنێ.

الفَسَالَةُ: لاوازیو بیرو ڕای ناپەسەند ٥ نەخۆشـیەکە توشـی درەختـی مێـو دەبێ گەشەو ئەشەی دەوەستێنێ.

الفُسالَةُ مـن الحديـد ونحـوه: وردە ئاسـن کەلـەکاتی کوتـانو لێدانـدا هەڵدەوەرێ.

الفَسلُ: ئەمامە مێو کـە ئامادە دەکـرێ بـۆ چـەقاندن ٥ هەرشتێـك خـراپو بـێ کەڵـك بـێ ٥ دەگـوترێ: (رجـل فَـسلٌ) پیاوێـکی بـێ ڕەوشـتو بـێ مروئەتـە ٥ (درهم فَـسلٌ) پارەیـەکی تەزویرو مەغشوشە.

الفُسُلَةُ: ڕای ناپەسەندو بێ مروئەتی ٥ نەخۆشـییەکە لـە نەخۆشـییەکانی گەشـەکردنی جەسـتە بـەهۆی بەدخۆراکییەوە تووشی مرۆڤ دەبێ.

الفَـسيلَةُ: ئەمامـە خورمـا لـە بنکـە سـەرەکییەکەیەوە دەبـڕدرێ یـان لەزەوی هەڵدەکەندرێو لەشوێنێکی تر دەچەقێندرێ ٥ پارچـە ڕوەکێـك لە بنکە سەرەکییەکەی دەکرێتەوەو دەڕوێندرێ.

فَسَا فَسواً وفساءاً: تسی کەند ٥ بایەکی لێ بۆوە دەنگی نەبوو بۆنی هەبوو.

المَفسى: شوێنی بـا لێ بوونـەوە، کـونی پاشەوە.

الفَاسِيءُ: خونفوسایە، لـەم ڕووەوە کـە ئەویش بۆنی لێ دێ.

فَـشَجَ فَـشجاً: قاچـی بـڵاو کـردەوە بـۆ میزکردن یان بۆ شتی تر.

فَشَّجَ: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (فَشَجَ) دێ.

**تَفَشَّجَ**: بەمانا (فَشَجَ) دێ.

**فَشَخَ فلاناً فَشخاً**: شەپلاغەی لە فلان دا.

**فَشَخَ الصبيانُ في لعِبِهِم**: منالەکان لە یاریەکەیاندا درۆیان کردو لێکیان دا.

**فَشَخَ الرجلُ**: پیاوەکە جومزگەکانی شل کردنەوە ◊ ماندوو بوو.

**تَفَشَّخَ**: جومزگەکانی شل بوونەوە.

**فَشَّ فَشّاً**: کەمێک هەوای تێ کرد ◊ پەقی هاتەوە.

**فَشَّ الورمُ**: هەوکردنەکەی نیشتەوە، دابەزی.

**فَشَّ القِربَةَ ونحوها**: ئەوەی لە کوندەکەدا هەبوو لەئاو و هەوا دەری کرد خالّی کردەوە.

**فَشَّ غليلَهُ**: ڕقی خۆی ڕشت، دەراوی بۆ ڕقی خۆی بەرەلا کرد بۆئەوەی کەمێک هێواش بێتەوە.

**فَشَّ الضرعَ**: گوانەکەی دۆشی، شیری تێدا نەهێشت.

**فَشَّ القفلَ**: بەبێ کلیل قفڵەکەی کردەوە.

**أفَشَّ القومُ**: خەڵکەکە بە پاڵەپەستۆو هەڵسڵەمینەوە ڕۆیشتن.

**إنفَشَّتِ القِربَةُ ونحوها**: کوندەکە ئەو هەوایەی تێیدا بوو هاتە دەرو هیچی تێدا نەما.

**إنفَشَّ اللبن** : ماستەکە لەمەشکەکە هاتە دەر.

**إنفَشَّت الريحُ**: هەواکە لە کوندەو میزەڵدانو تۆپەکە هاتەدەر.

**إنفَشَّ الجرحُ**: برینە هاوساوەکە نیشتەوە ◊ دەشگوترێ:

**إنفَشَّت علة فلان**: نەخۆشی فلان لاچوو نەما.

**إنفَشَّ فلان عن الأمر**: فلانکەس لەکارەکەدا تەمبەڵی کرد.

**إنفَشَّ الأنفُ**: لوتەکە لای سەروی بەرزو نەرماییەکەی بەرز بۆوە.

**الفَشُّ**: گێلو نەحمەق ◊ قوماشو پۆشاکی باشو نەچندراو، ڕایەڵ کەمو تێوەدانی شاشو پاش ◊ زەلکاوی ئاو.

**الفَشّاشُ**: ئەو کەسەی بەبێ کلیل دەزانێ قوفڵو شتی وا بکاتەوە.

**الفِشَّةُ**: سی گیانلەبەر کە هەوا دەردەداتەوەو هیچی تێدا نامێنێ.

**الفَشوشُ من الأشياء**: شتی بێ سوود حوشترێک بەبێ دۆشین شیر لەگوانی بتکێ ◊ مەشکەیەک دۆی لێ بڕژێ.

**الفَشيشُ**: دەنگی هەوا: کەلەشت دێتە دەر دەگوترێ: تایەی ئۆتۆمبێلەکە فشەفشی دێ ◊ واتە هەوای لێ دەردەچێ.

**فشيش الأفعى**: فیشکە فیشکی مار ◊ خشەی مار کەبەسەر شتی وشکدا بڕوا.

**فَشَغَ الشَّيْئُ فَشغاً**: شتەكە بڵاو بۆوە.

**فَشَغَ غيهَ**: كەوتە سەر شتەكەی ترو دايپۆشی.

**فَشَغَ بالسوط**: كەوتە سەری‌و بەقامچی لێی دا.

**فَشِغَت الثَنِيَةُ فَشَغاً**: ددانەكە ڕواو لە ڕیزی ددانەكانی پێشەوە دەرچوو.

**فَشِغَ الرجلُ**: پیاوەكە ددانەكانی پێشەوەی شاش‌و پاش بوون ◊ (فهو أفشَغُ وهي فشغاءُ).

**فاشَغَ فلاناً بالأمر**: پەلەی لە فلان كرد بۆ كارەكە، هەر لەگەڵ پێی گەیی خێرا دەنەدەنەی دا.

**فَشَّغَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَشَغَ) دێ.

**فَشَّغَ النومُ فلاناً**: خەو فلانی داگرت.

**إنفَشَغَ الشَّيْئُ**: شتەكە زۆر بوو بڵاو بۆوە.

**تَفَشَّغَ**: بڵاو بۆوە ◊ دەگوترێ: (تَفَشَّغَ الشيبُ فلاناً وتَفَشَّغَ الشيبُ فيه) پیری، موی سپی بەجەستەی فلان دا بەسەرو ڕیشی فلان دا بڵاو بۆوە.

**تَفَشَّغَ الولدُ**: منداڵ‌و نەوە زۆر بوون‌و بڵاو بوونەوە.

**تَفَشَّغَ فلان بيوت الحي**: فلانكەس چووە ناو خانووی گەڕەكەكەوەو ونبوو نەبینرایەوە.

**تَفَشَّغَ الدين فلاناً**: قەرز سواری شانی فلان بوو.

**الأفشَغُ**: بەرانێك شاخی نەمابن هەردوو شاخی شكابن.

**الفُشاغُ**: پارچە چەرم كە كوندەی پێ پینە بكرێ ◊ درەختێكە حەوت مەتر زیاتر بەرز نابێتەوە، لە پێڕی (زەنبەقییە) وەكوو (ترترە) بەدرەختی تر هەڵدەگەڕێ‌و تێی دەهاڵێ‌و بڕستی لێ دەبڕێ.

**الفِشاغ**: ژن بەژنی، كچ بەكچی ◊ دووپیاو ڕێك بكەون هەریەكەیان كچی ئەوی تریان یان خوشكی ئەوی تریان مارەبكا ◊ یان هەر یەكێ لەم دوو ئافرەتە بكرێنە مارەیی ئەوی تریان ◊ ئەم جۆرە ژن بەژن‌و كچ بەكچییە لە كۆمەڵگەی دواكەوتودا باوە ◊ تەمبەڵی‌و تەوەزلی.

**الفُشّاغ**: بەمانا (الفُشاغ) دی كە بەمانا درەختێكە بە درەختی تر هەڵدەگەڕێ‌و خۆی تێ با هەڵدەدا.

**الفَشغةُ**: جۆرە مادەیەكە وەكوو لۆكە وایە لەناو كرۆكی قەفەزاژو هەندێ درەختی تردا هەیە.

**فَشفَشَ**: ڕای لاوازی هەبوو.

**فَشفَشَ في قوله**: درۆی كردو خۆی بەشتی وا هەڵنایەوە كە لەودا

نەبون‌و کردارو ڕەفتاری کەسانی دیکە بوون.

**فَشفَشَ الماءَ:** ئاوەکەی هەڵێنجا.

**الفشفاشُ:** پۆشاکێکە باش نەچنراوە، تەنك‌و شاش‌و پاشە، ڕایەڵ‌و تێوەدانی باش نەڕێسراوە ٥ دەگوتری: (سیف فشفاش): شمشێرێکە خراپ دروستکراوە ٥ کەسێك فشەفش بەشتێکەوە بکا هی ئەو نیە ٥ گیایەکە وەکوو بەسباس دەچێ.

**فَشَقَ الشَّيْءَ:** شتەکەی شکاند.

**فَشِقَ فَشَقاً:** بازی دا ٥ ڕارا بوو لەنێوان هەڵبژاردنی ئەم یان ئەو تا هەردووکی لەکیس چوون.

**فَشِقَ الظبيُ ونحوه:** ئاسکەکە نێوان شاخەکانی فراوان بوو ٥ (فهو أفشق وهي فشقاء) ٥ (ك: فُشقّ).

**فاشَقَهُ:** لەناکاو پەلاماری دا، گوزو گومەت ڕوبەڕوی بۆوە.

**تَفَشَّقَ الرجلُ:** پیاوەکە کراسەکەی بن هەنگڵی ڕاستی داو لاکەی تری بەسەر شانی چەپی دادایەخوار.

**فَشَلَ لِحيته فَشلاً:** ڕیشی بزو ژاکاو کرد.

**فَشِلَ فَشَلاً:** شل‌و شێواو بوو ترسنۆك بوو ٥ تێشکا، نەیتوانی کارەکە ئەنجام بدا ٥ دەگوترێ: (دعي الى القتال فَفَشِلَ) بانگکرا بۆ شەڕو نەچوو نەیتوانی بچێ.

**فَشِلَ عن الأمر:** لە کارەکەدا سەرکەوتوو نەبوو تێ شکا.

**تَفَشَّلَ الماءُ:** ئاوەکە جاری بوو.

**تَفَشَّلَ الرجلُ:** پیاوەکە ژنی لە بێگانە خواست بۆئەوەی منداڵی ناکامڵ‌و نەخۆشی نەبێ.

**الفِشلُ:** پەردەو خێمەی کەژاوە ٥ شتێکە وەکوو بەڕە لەکەژاوەدا ڕادەخرێ بۆ لەسەر دانیشتن ٥ (ك: فشول).

**الفَيشَلَةُ:** هێنی پیاو ٥ سەری هەرشتێك خڕو لوس بێ ٥ (ك: فياشل).

**فشا فَشواً وفُشُواً:** دەرکەوت‌و بلاو بۆوە.

**فشا عليه أمورُهُ:** کارەکانی بەسەرا دان هێندە زۆر بوون نەیزانی کامەیان ئەنجام بدا.

**فشا أنعامُهم:** ئاژەڵەکانیان زۆر بوون.

**أفشاهُ:** قسەکەی بڵاو کردەوە ٥ نهێنییەکەی ئاشکرا کرد ٥ دەگوترێ: (أفشى سِرّه وخَبَرَه ومعروفه).

**أفشى الله رزق فلان:** خودا ڕزق‌و ڕۆزی فلانکەسی زۆر کرد تاوای لێ هات قیامەتی لەبیر چۆوە.

**تفشى الشَّيْءُ:** شتەکە بلاو بۆوە فراوان بوو ٥ دەگوترێ: (تفشت القرحَةُ)

برینەکـە لـە گەدەیـدا تەنیـەوە، فراوان بوو

**تَفَشّى المرضُ القومَ وبهم:** نەخۆشییەکە پەتاو تاعونەکە لەناو خەڵکەکەدا بڵاو بۆوەو هەمووی گرتنەوە.

**التَّفَشّي:** لەزانستی تەجویدا بڵاو بوونەوەی هەوایە لەناو دەم دا لەکاتی گوتنی پیتی شین، بەم جۆرە کلایی بخەیە نێوان مەلاشوو پشتی زوبان.

**الفاشية:** نوستنی سەر لە ئێوارە بۆئەوەی پاش ماوەیەك بەخەبەر بێیو نەخەویەوە کارێك ئەنجام بدەی.

**الفَاشِيُّ:** ئەو کەسەی شوێن ڕێبازی فاشیەت دەکەوێ.

**الفَاشِيَّةُ:** ڕێبازو مەزهەبێکی رامیاری‌و ئابورییە لە وڵاتی ئیتاڵیا لەسەدەی بیستەم دا سەری هەڵدا، لەسەر یاسای نیقابات دامەزراوە، ڕێگە دەدات دەوڵەت دەست بخاتە ناو هەموو دیاردەو کاروبارێکی جم‌و جۆڵی ئابوری.

**الفَشاءُ:** زاو زێکردنی ماڵ‌و سامانەو زۆر بوونیەتی.

**الفَشوَةُ:** سندوقێکە یان جانتایەکە ئافرەت ئەو شتانەی تێدا هەڵدەگرێ: کە بۆ ئارایش‌و خۆ بۆنخۆش کردن بەکاریان دەهێنێ.

**فَصَحَهُ الصُّبحُ فَصحاً:** بەیانی لێ هات‌و بەتەواوی دنیای لێ ڕوناك بوو.

**فَصُحَ اللبنُ فَصحاً وفصاحةً:** شیرەکە پاڵفتە بوو، خشت‌و خۆڵ‌و موو پوشکەو پەلاشی لێ جیاکرایەوە.

**فَصُحَ الرجلُ:** زمانی کرایەوە بەقسەی ڕەوان‌و ئاشکرا ٥ دەگوترێ: (فَصُحَ الأعجمي) کابرای ناعەرەب بەزمانی عەرەبی قسەی کردو هیچ خوارو خێچی تێدا نەبوو.

**أفصَحَ الصُّبحُ:** بەیانی دەرکەوت‌و ئاسۆ ڕوون بۆوە.

**أفصَحَ الأمرُ:** کارەکە ئاشکرا بوو.

**أفصح النهار:** ڕۆژەکە تاوسان‌و بێ هەورو تەم‌و مژ بوو.

**أفصح عن مراده:** مەبەستی خۆی دەربڕی‌و بەپوختی رای گەیاند.

**أفصَحَ النصارى:** مەسیحیەکان کەوتنە جەژنی فیصحیانەوە ٥ (ك: فصائح).

**فَصَّحَ:** بۆ موبالەغەو زێدەڕەوی لەمانای (فَصَحَ) دێ.

**تفاصح في كلامه:** خۆی بەزمان ڕەوان هێنایە بەرچاو و وای قسە کرد گوایە فەصیح‌و ڕەوان بێژە.

**تَفَصَّحَ الرجلُ:** پیاوەکە زمانڕەوان بوو، زمانی ڕاهات بەڕەوانبێژی بدوێ.

**تَفَصَّحَ في كلامه**: خۆی بەزمان ڕەوان لەقەڵەم دا، زمانڕەوانی بەسەر خۆی دا هێنا.

**الفصاحَة**: مەبەست گەیاندنو توانای شت ڕونکردنەوە ٥ خاوێنی وشەكان لەتەمو مژو نارێكی لێكدانی وشەكان.

**الفِصحُ من الأيام**: ئەو ڕۆژانەیە نە هەورو هەڵایە نە ساردو سەرمایە ٥ لەلای جولەكە یادەوەری جەژنی ئەو ڕۆژەیە كە لەمیصر دەرچوون لەسەردەمی فیرعەوندا ٥ لەلای مەسیحیەكان جەژنی زیندوبوونەوەی حەزرەتی عیسایە، بەجەژنی گەورەی ناودەبەن.

**الفَصيح**: دەگوترێ: (رجل فصيح): پیاوێكی قسە ڕەوانە، بەجوانی مەبەستەكانی دەردەبڕێ قسەی بەنرخو بێ نرخ لێك جیادەكاتەوە ٥ (كلام فصيح) كەلامێكی ڕەوانو ئاشكرایە، گوێچكە بیستنی پێ خۆشەو وەری دەگرێ، عەقڵ هەست بە وردیو جوانی قسەكان دەكا ٥ (لسان فصيح) زمانێكی ڕەوانەو جوان مەبەستەكان دەردەبڕێو وشەكان تێك ناگیرێن.

**فَصَدَ العِرقَ فَصداً**: دەمارەكەی قەڵاشت بۆ كەڵەشاخ گرتن ٥ دەگوترێ: (فَصَدَ المريضَ) كەمێك خوێنی لە نەخۆشەكە گرت بەمەبەستی چارەسەر كردن.

**فَصَدَ الناقةَ**: دەماری حوشترەكەی شەق كرد بۆئەوەی خوێنی لێ دەربێنێو بیخواتەوە (ئەمە لەكاتی گرانیو قاتو قڕیدا ڕودەدا).

**أنصدت الشجرةُ**: درەختەكە چرۆكانی پشكوتنو گەڵاكانی دەركەوتن.

**فَصَّدَ**: بۆ موبالەغە لەمانای (فَصَدَ) دی ٥ دەگوترێ:

**فَصَّدَ السيلُ الأرضَ**: لافاوەكە زەویەكەی هەڵدڕی.

**فَصَّدَ الشَّيْءَ**: شتەكەی لەناوی كەم هەڵكێشا ٥ لەئاوی كەمی وەردا.

**إفتصد**: بەمانا (فصد) دێ.

**إنفصد الدمُ ونحوه**: خوێنەكە جاری بوو.

**تفصَّدَ الدمُ**: خوێنەكە جاری بوو ٥ دەشگوترێ: (جاء يتفصَّدُ جبينه عرقاً) هات ئارەقی لە ناوچاوان دەچۆڕایەوە ناوچاوانی ئارەقی لێ دەتكا.

**الفاصِدان**: ڕێڕەوی هاتنە خوارەوەی فرمێسك لەسەر ڕومەت.

**أبو فصادة**: باڵندەیەكە لە پێری (فوتاحیە)و جۆرە چۆلەكەیەكە دەنـدوك هەڵدڕاوە خواردنی حەشەرەو كرمو شتی وایە.

**المِفصَدُ**: گوێزان‌و کێردی پزیشك که بۆ کەڵەشاخ گرتن بەکاری دەهێنێ.

**فَصَّ الجرحُ فَصیصاً**: برینەکە هەندێ کێم‌و زوخاوی لێ هات.

**فَصَّ العرقُ**: ئارەقەکە تکا.

**فَصَّ الجُندُبُ**: صەرصیرەکە (سیسرکەکە) دەنگی لێ هات.

**فَصَّ الشَّیْئَ**: شتەکەی جیاکردەوە لەشتەکەی تری داماڵی.

**أفَصَّ الیه حقه شیئاً**: بەشێکی لەمافەکەی خۆی پێدایەوە.

**فَصَّصَهُ**: بۆزێدەڕەوی لەماناى (فَصَّه) دێ.

**أفَصَّ الخاتَمَ**: نقێمی بۆ ئەنگوستیلەکە دروست کرد.

**إفتَصَّ الشَّیْئَ**: شتەکەی جیاکردەوە لەوی تری دارنی.

**إنفَصَّ منه**: لێی جیابۆوە.

**إستَفَصَّ**: دەگوترێ: (ما إستفصَّ منه شیئاً) هیچی لێ دەرنەهێنا.

**الفَصُّ**: بەیەککەیشتنی هەردوو ئێسقانێك ٥ هەر نقێم‌و بەردی بەنرخ‌و گەوهەر کە دەکرێتە ئەنگوستیلەوە ٥ قەڵشتی لیمۆو سەلکە سیرو شتی وا ٥ گلێنەی چاو ٥ حەقیقەت‌و کرۆکی شت ٥ بڵقۆکەی شلەمەنی ٥ دەگوترێ: (فلان خَزّاز الفصوص) فلانکەس ڕای پەسەندو وەڵامی بەجێیە.

**الفَصّاصُ**: دروستکەری نقێم‌و ئەنگوستیلە.

**الفصیصُ**: دەنکە مورووی لوس ئەوەندە لوس بێ وابزانی چەورە.

**فَصَعَ الرطبةَ**: دەنکە خورما تەڕەکەی بەپەنجە پلێشاندەوە بۆئەوەی دەم بکاتەوەو ئەوی ناوەوەی دەربکەوێ.

**فَصَعَ الصَّبيُ قلفته**: کوڕەکە پێستی سەری بچوکی خۆی گرو و دایماڵی ٥ سەری بچوکی خۆی بەدەر خست.

**فَصَعَ العَمامة عن رأسه**: مێزەری لەسەری خۆی داماڵی سەری خۆی ڕوت کرد.

**فَصَعَ الشَّیْئَ عن الشَّیْئ**: شتەکەی لە شتەکە دەرهێنا.

**فَصُعَ الرجلُ**: پیاوەکە بای لێ بۆوە.

**فَصَّعَ له بمال**: ماڵ‌و سامانی پێدا.

**فَصَّعَ الشَّیْئَ من غیره**: شتەکەی لەوی تر دەرهێنا.

**إنتَصَعَ الغلامُ**: کوڕە منداڵەکە پێستی سەری هێنی خۆی گرو و لایداو دایماڵی، سەری بچوکی خۆی دەرخست.

**إنتَصَعَ حَقَّهُ**: بەزۆرە ملێ مافی خۆی ستاند.

**إنفَصَعَ الشَّیْئُ**: شتەکە ڕوت بوو پەردەی پێوە نەما.

**إنفَصَعَ من غيره**: لەشتەکە هاتە دەر.
**تفَصَّعَ**: بۆ موتاوەعەی (فَصّع) دێ.
**الأفـصـعُ**: کـوڕی چـوك هەڵماڵـدراو، سەری چوکی هەڵماڵدرابێ.
**الفَـصعانُ**: کەسێـك سـەری خـۆی ڕوت بکا لەبەر ناڵۆش‌و خرۆ، یان گەرما.
**الفُـصعَةُ**: سـەری چـوکی کـوڕ: کـە پێستەکەی فراوان بێ‌و گۆپکەکەی دەربکەوێ پێش خەتەنە کردنی.
**فَصفَصَ فلان**: فلانکەس هەواڵی ڕاستی هێنا.
**فَصفَصَ دابتهُ**: گیـای فیصفیصی دا بـە وڵاخەکەی.
**تَفَصفَصُوا عنه**: لێی تەکینەوە دەوریـان چۆڵ کرد.
**الفَصَافِصُ**: پیاوی ئازاو ورە بەرز.
**الفِصفِصُ**: ڕوەکێـکی ئاڵفییـەو تەمـەن درێژە، لەپێری (القرنیة) ە لـە وڵاتـی شـام پێـی دەگـوترێ: (الفِـصة) لـە وڵاتـی حیجـازیش پێـی دەگـوترێ: (البرسیم الحجازي).
**الفِصفِصَةُ**: بەمانا (الفِصفِصُ) دێ.
**فَـصَلَ الکـرمُ فـصولاً**: مێوەکـە دەنکـە ترێیەکانی ورد بوون.
**فَـصَلَ القـومُ عـن البلـد**: خەڵـکەکە لـە شارەکە چونە دەر.

**فَصَلَ بـين الـشيئين**: نـاوانی دوو شـتەکەی کرد، لێکی جیاکردنەوە.
**فَصَلَ الحاكمُ بـين الخـصمين**: دادوەر حـوکم‌و بڕیـاری خـۆی لـەنێوان دوو کێـشە کارەکەدا ڕاگەیاند.
**فَـصَلَ الـشَّيْءَ عـن غـيره فـصلاً**: شـتەکەی لەوی تر دوور خستەوە.
**فَصَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕی.
**فَصَلَ الخطيـبُ ونحـوه القـولَ**: وتـار بێژەکە قسەی جوانی کردن، وتارەکەی بەپێزو ڕێـك‌و پێـك بوو.
**فَـصَلَ الفـصيلَ عـن أمـه**: بێـچووەکەی لـەدایکی دابـڕی دووری خـستەوە ە لەشیری بڕیەوە.
**فاصَلَ شريكهُ**: حـەق‌و حیـسابی لەگـەڵ هاوبەشەکەیدا کردو لێی جیا بۆوە.
**فَصَّلَ الـشَّيْءَ**: شـتەکەی پارچـە پارچـە کردو کردی بەچەنـد بەشێـکی لێـك جیاو سەربەخۆ.
**فَصَّلَ الأمرَ**: کارەکەی ڕونکردەوە.
**فَـصَّلَ القَـصَّابُ الـشاةَ**: قەسـابەکە مەڕەکـەی سـەربڕی‌و گۆشـتەکەی پارچـە پارچـە کـرد ە دەشـگوترێ: (فَـصَّلَ الخيـاطُ الثـوبَ) خەیاتەکـە قوماشـەکەی پارچـە پارچـە کـردو ئەنـدازەی گـرت بۆئـەوەی بـۆ خاوەنەکەی بیدورێ.

**فَصَّلَ العِقدَ:** له ملوانکەکەدا میروی ترو ڕەنگــی تــری خــستە نێــوان دەنکەکانیەوە.

**إفتــصلت المــرأة رضــیعها:** ئافرەتەکـە منداڵەکەی لەشیر بڕیەوە.

**فَصَّلَ النخلَـةَ:** دارخورماکەی لەشوێنی خۆی گواستەوە بۆ شوێنێکی تر.

**إنفَصَلَ الشَّیْئُ:** شتەکە دابڕا.

**إنفَصَلَ القومُ عن مکان کذا:** خەڵـکەکە ئەو شوێنەیان جێهێشت.

**الفاصِلُ:** جیاکەرەوە، یەکالا کەرەوە.

**الفاصِـلَةُ:** مورویــەکی تایبەتییــە لــە ملوانکــەدا دەخرێتــە نێــوان دوو مــوروی تــرەوە ٥ نیــشانەیەکە لــە حیساب دا دەخرێتـە نێوان خانـەی دەیان‌و سەدان‌و هەزاران...هتد ٥ لە بــواری زانــستی عــروزدا بریتییــە لەســێ پیتــی خــاوەن بــزوێن کــە بەشــوێنیاندا پیتێــکی ســاکن بــێ وەکوو (کَتَبَت) یان چوار پیت‌و بە شــوێنیاندا پیتێــکی ســاکن هــەبێ وەکوو (سَمِعَهُم).

**الفاصولیا:** فاسۆلیا بەتەڕی‌و بەوشکی دەکوڵێنــدرێ‌و دەخــورێ ٥ فاســۆلیا چەند جۆرێکی هەیە.

**الفِــصالُ:** لــێ بڕینــەوەی زارۆکــە لــە شیرخواردنی دایکی.

**الفَــصلُ:** مــاوەی نێــوان دووشــت ٥ پــەردەی نێــوان دووشــت ٥ شــوێنی بەیــەك گەیــشتنی دوو ئێــسقان ٥ بنك‌و وەچەو لقی شت ٥ دەگوترێ: (للنسب أصول وفصول).

**فصول السنة:** وەرزەکانی ساڵ (بـەهارو هــاوین‌و پــایزو زســتان) ٥ هــەروا وشــەی (الفَــصل) نــاوە بــۆ بەشێــك لــەکتێب: کەبەچــەند فەصڵێــك دەبنە یەك (باب)و چەند بابێـکیش کتێبەکە پێـك دێـنن ٥ هەروا نـاوە بــۆ بەشێــك لەشــانۆگەری ٥ قــسەی یەکالا کەرەوە.

**یــوم الفــصل:** ڕۆژی قیامــەت ٥ (فــصل الخِطاب) ئەوەیە حوکمێك بێ کەس ڕەتی نەکاتەوە.

**الفصلة:** درەختی خورمای گوازراوە لـە شوێنێــکەوە بــۆ شوێنێــکی تــر ٥ بەحس‌و مەقالێـك کـە لەگۆفارێـك جیاکرابێتــەوە ٥ نیــشانەیەکە لــە نیشانەکانی خاڵبەندی بەم شێوە (،) دادەنــرێ پێــی دەگــوترێ فــاریزە واتــە: وەکــوو واوێــکی ســەرەو ژێــر بەپــچوکی دەنوســرێ‌و دەخرێتــە نێــوان جوملــەی بەســەر یەکــدا هــاتوەوە ٥ هــەروا دەخرێتــە نێوان جــۆرو بەشــی شــتەوە، هــەروا

دەخرێتە دوا وشەی بانگ لێکراوەوە ٥ فاریزەی نوختەداریش هەیە لە دوو شوێن دادەنرێ:
(١) لەنێوان جوملەی درێژدا،
(٢) لەنێوان دووجوملەدا کە دووەمیان هۆکاری یەکەمیان بێ، (ئەمشەو نەنوستم؛ بۆ ئەوەی بڕێ لە ئیشەکەم ئەنجام بدەم).

**الفصيلُ**: بێچوە حوشتر ٥ گۆلکەلە ٥ دوای لە شیر بڕینەوەیان و دوورخستنەوەیان لەدایکیان ٥ دیوارێکی نزم.

**الفصيلة**: پارچەیەك لەجەستە ٥ پارچەیەك لە گۆشتی ڕان ٥ هۆزو خێڵی پیاو ٥ خزمی پیاو ٥ لەبواری ڕوەکناسی دا کۆمەڵە ڕەگەزە گیایەکن صیفاتی هاوبەشیان هەن ٥ (فصيلة الجيش) بەشێکە لەسوپا.

**الفيصل**: یەکالا کەرەوە دادوەر کە کێشەو نیزاعی نێوان دووکەس یان زیاتر یەکالا بکاتەوە ٥ جودا کەرەوەی نێوان حەق و بەتاڵ ٥ دەگوترێ: (حكومة فيصل، وقضاء فيصل، وقول فيصل، وطعنة فيصل).

**المُفَصَّلُ**: یەك لەسەر حەوت بەشی کۆتایی قورئان لەم ڕووەوە نیشانەوە ناوبڕەکانی سورەتەکان زۆرن.

**المُفَصَّلَةُ**: ئەنجامەی دەرگا ٥ ئەرمادەی دەرگا.

**المَفصِلُ**: شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو ئێسقان لەجەستەدا ٥ شوێنی گرد بوونەوەی بەردی ڕەق و پتەو (کەڵەکە بەرد) ٥ لێو چەوی نێوان دوو گردو کێو کە ئاوی لێ بێتە دەر ٥ (داء المفاصِل) دەردە جومگە.

**المفصِليّات**: پێڕێکن لە گیانلەبەری (اللافقريات)ی وەکوو دوپشك و مێروو جاڵجاڵۆکەو شتی وا.

**المِفصَلُ**: زوبان.

**فَصَمَ الشَّيْئَ فَصماً**: شتەکەی قەڵاشت ٥ شەقی کرد بەبێ ئەوەی دوولەتی بکا.

**فَصَمَ العقدة**: گرێیەکەی شل کردەوە.

**فَصَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی چەماندەوە.

**أفصَمَ الشَّيْئ**: شتەکە ڕۆیی بەسەرچوو ٥ دەگوترێ: (أفصم الحر وأفصم المطر وأفصمت عنه الحُمىّ).

**فَصَّمَهُ**: بەهێزو تۆپزی زۆر شتەکەی قەڵاشت.

**إنفَصم الشَّيْئُ**: شتەکە شکا بەبێ ئەوەی لێك جیابێتەوە.

**إنفَصمت العقدة**: گرێیەکە شل بۆوە.

**إنفَصمت العُروة**: قڵفەکە (دەسکەکە) لێ بۆوە.

**إنفَصم ظهرُهُ**: پشتی شکا.

**إنفَصمت الدُرَّةُ:** گەوهەرەکە لایەکی درزی برد.

**إنفَصم المطرُ:** بارانەکە وەستایەوە (بروکەی دایە).

**تَفَصَّمَ الشَّيْئُ:** شتەکە شکا بەبێ ئەوەی لێك جیابێتەوە.

**الفَصمَةُ:** درزو قەڵشت.

**الفِصمَةُ:** ئەو وردەو پرژو پاڵەی لەسیواك‌و شانەو شتی وا هەڵدەوەرێ.

**الفصيم:** دەگوترێ: (فأس فصيم) تەشوێ‌و پاچێکی گەورەیە.

**فصى الشَّيْئَ من الشَّيْئ وعنه فصياً:** شتەکەی لە شتەکە جیاکردەوە لێی کردەوە ٥ دەگوترێ: (فصى اللحمَ عن العظم) گۆشتەکەی لە ئێسقانەکە جیاکردەوە.

**أفصى من الأمر:** لەکارەکە ڕزگاری بوو جا خێر بێ یان شەڕ.

**أفصى المطرُ:** بارانەکە وەستایەوە.

**أفصى عنه البردُ أو الحرُّ:** سەرماکە ڕۆیی یان گەرماکە نەما.

**أفصى الصائد:** نێچیرەوانەکە قولاپەکەی یان تەڵەو داوەکەی هیچی پێوە نەبوو.

**فَصَّاهُ منه وعنه:** ڕزگاری کرد ٥ لێی کردەوە ٥ دەگوترێ: (فَصّى اللحم عن العظم) گۆشتەکەی لە ئێسقانەکە کردەوە.

**إنفصى اللاصق من غيره:** لەزگەکە لەشتەکە بۆوە ٥ دەشگوترێ:

**إنفصى اللحمُ عن العظم:** گۆشتەکە لە ئێسقانەکە بۆوە.

**تفصّى من الشَّيْئ وعنه:** لەشتەکە ڕزگاری بوو.

**تفصّى من الديون:** لەقەرزداری ڕزگاری بوو ٥ دەشگوترێ: (ما كدت أتفصّى منه).

**تَفَضَّجَ الجسمُ:** جەستەکە قەڵەو و گۆشتن بوو.

**تَفَضَّجَ الشَّيْئُ:** شتەکە فراوان بوو.

**تَفَضَّجَ الرأسُ عرقاً:** سەر ئارەقی لێ تکا.

**فضحه فَضحاً:** عەیب‌و عارەکانی دەرخستن، عەیبەکانی خستنە ڕوو ٥ ڕونی کردەوەو ئاشکرای کرد.

**فَضَحه النهار:** ڕوناکی ڕۆژ عەیبەکانی دەرخستن.

**فَضح القمرُ النجومَ:** مانگ ڕوناکی ئەستێرەکانی مەحو کردەوەو دیار نەکەوتن.

**إفتَضَحَ الرجلُ:** پیاوەکە عەیبەکانی دەرکەوتن.

**تفاضح الرجلان:** هەریەك لەو دوو کەسە عەیب‌و عاری یەکتریان خستە ڕو.

**الفاضح (الفعل الفاضح)**: كردەوەی حەیابەرە ٥ کردەوەیەکی مادیەو شەرەفو کەسایەتی لەنگ دەکا.

**الفضيحة**: بڵاوبوونەوەی ناو و ناتۆرەی عەیبو عار ئامێز.

**الفضحُ**: شتی کلۆر.

**فضح فضحاً**: شکاندی شەقی کرد ٥ دەگوترێ: (ضرب الرأسَ ففضحه) لەسەری داو شکاندی برینی لێ کرد ٥ (وضرب البطيخةففضحها) کاڵەکەکەی قاش کرد.

**فضح العَينَ**: چاوەکەی کوێر کرد ٥ هەڵیکۆڵی.

**فضَحَ البُسرَ**: خۆشاوی لە خورما نەگەیوەکە دروست کرد.

**أفضَحَ العُنقُودُ**: هێشوە میوەکە کاتی ئەوەی هات بگوشرێو شەرابی لێ دروست بکرێ.

**إفتضخ الشَّيْئَ الأجوف**: شتە کلۆرەکەی شکاند.

**إفتَضَخَ البُسرَ**: لە خورما نەگەیوەکە شەرابی خۆشاوی دروست کرد.

**إنفَضَخَ**: بۆ موتاوەعەی (فَضَخَ) دێ.

**إنفَضَخَ الشَّيْئُ**: شتەکە پانو فراوان بوو.

**إنفَضَخَ السقاءُ وهو ملآن**: کوندە ئاوەکە (تەنکیە ئاوەکە) درزی بردو ئاوی لەبەر ڕۆیی.

**إنفَضَخَ فلان**: فلانکەس گریاو فرمێسکی زۆری ڕشتن.

**إنفَضَخَ الدَّلو**: دۆڵچەکە چی ئاوی تێدا بوو فیچقەی کردو هاتە دەر.

**إنفَضَخَت العينُ**: چاوەکە کوێر بوو.

**إنفَضَخَ القارورة**: گۆزەکە شکاو هیچی تێدا نەما.

**الفَضوخُ**: شەرابێك بخۆرەوەکەی سەرخۆش بکا.

**الفَضيخُ**: گوشراوی ترێ ٥ دۆشاو ٥ شەرابێکە لەخورمای ئاڵو بۆڵ تێکەوتوو (خورمای تازە گەییو) دروست دەکرێ بەبێ ئەوەی ئاگری تێدا بەکار بهێندرێ ٥ ماستاوی زۆر ڕون.

**المِفضَخَةُ**: کوپەو گۆزەی شەراب تێدا دروست کردن ٥ دۆڵچەی زۆر گەورە ٥ (ك: مَفاضخ).

**فَضَّ الشَّيْئَ فَضّاً**: شتەکەی لێك جیاکردەوە ٥ دەگوترێ: (فَضَّ القومَ) خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد (فَضَّ المال القوم) ماڵو سامانەکەی بەسەر خەڵکەکەدا دابەش کرد.

**فَضَّ خاتَمَ الكتاب**: نامە داخراوەکەی هەڵپچڕی، مۆرکراوەکەی لێك کردەوە ٥ دەگوترێ: (فَضَّ الكتابَ و فَضَّ الخاتم عن الكتاب).

**فَضَّ الماءَ**: ئاوەکەی ڕشت.

**فَضَّ اللؤلؤةَ ونحوها**: مرواریەکەی کونکرد ٥ دەشکوترێ:

**فَـضَّ عُـذرة المـرأة**: کـچێنی ئافرەتەکـەی لابرد.

**فَضَّ ما بینهما**: نێوانی کردن.

**فَـضَّ الأمـرَ**: کارەکـەی بڕیـار دا (بڕیـاری لەسەر کارەکە دا).

**فَضَّ الله فـاه**: خـودا دەمو دانـی وردو هاڕ بکا.

**فَضَّضَ الشَّیْئَ**: شتەکەی زیوکەفت کـرد ٥ بەزیو شتەکەی ڕوکەش کرد.

**إفتَضَّ**: بەمانا (فَضَّ) دێ.

**إنفَضَّ الشَّیْئُ**: شتەکە شکا.

**إنفَضَّ الجمعُ**: کۆمەڵەکە پەرتەوازە بوو.

**الفُـضاضُ**: ئـەوەی لـەکاتی شـکاندا پەرتەوازە دەبێ ٥ دەگوترێ: (طارت عظامه فُضاضاً) ئێسقانەکانی لەکاتی لێدان دا کەرتو پەرت بوون.

**الفُضاضةُ**: بەمانا (الفُضاض) دێ.

**الفَـضُّ مـن النـاس**: قـەومو خێڵـی پەرتەوازە ٥ دەگوترێ: (خرز فَـضٌّ): مورووی پەرتەوازەو بڵاوە بوو.

**الفَضَضُ من الشیئ**: ئـەوەی لـە شـتەکە جیابۆتـــەوەو بـــڵاو بۆتـــەوە ٥ دەشکوترێ: (أصابه فضض من الماء) پرپشکی ئاوی ڕێکەوت.

**الفَضَّةُ**: بەردی کەڵەکە بوو بڵاوە بووی کۆمـــەڵ لەســـەر کۆمـــەڵ ٥ زەوی بەردەلانی ڕەشو سوتەمەڕۆ.

**الفِـضَّةُ**: زیـو ٥ عونـسورێکی سـپییە، لەهـەموو مادەیـەك زیـاتر ئامـادە باشـی گەیانـدنی گـەرمیو تـەزوی کارەبایی تێدایـە ٥ لـەدوای زێـڕ لـە جەوهەرە بەنرخەکانە کە بـەکاردێ بۆ سکەلێدنی پارە.

**الفَضیض**: ئەو پرژو وردە دڵۆپە ئـاو و ئاردەڵوکـــەو بـــەفرە وردەیـــە کـــە لـەکاتی پرژانـی ئـاودا یـان لـەکاتی هەڵـــکردنی ڕەشـــەباو رادانـــی ئاردەڵۆکـەی بـەفرا دەبینـدرێ ٥ ئـاو کەلەسەرچـاوە هەڵـدەقوڵێ ٥ یـان کەلەئاسمانـــەوە دەبـــارێ ٥ شـــوێنی ئـاودار ٥ ئـــەو دەنکـــە خورمایـــەی کەلەدەم فڕێ دەدرێتەدەر.

**المِفضاضُ**: ئـامێری هـاڕینو وردکردنـی بەردو گڵی زەوی.

**المِفَضُّ والمِفَضَّةُ**: بەمانا (المِفضاض) دێ.

**فَضفَضَ الشَّیْئُ**: شتەکە بەرفراوان بوو.

**فَضفَضَ الثوبُ**: کراسەکە پانو بۆڕ بوو (فَـضفَضَ الـدِرعُ) زرێیەکـە پـانو

فراوان بوو (فَضفَضَ العيش) ژيان فراوان بوو ٥ (فهو فضفاض).
تَفَضفَضَ بول الناقة: ميزی حوشترەكە بەسەرڕانی دا بلاّو بۆوە.
الفَضافِضة من الدروع ومن الثياب: زرێی فراوان پۆشاكی فراوانو پانو پۆڕ.
الفَضفاض من المياه: ئاوی زۆر ٥ پیاوی بەخشندە ٥ كراسی پانو پۆڕ ٥ زەوی كە بە هۆی بارانی زۆرەوە ئاوی لەسەر ڕاوەستابێ.
الفَضفَاضَةُ: (سحابة فضفاضة) هەوری باراناوی، هەور كەزۆری باران تێدا بێ.
فَضَلَ الشَّيْئُ فضلاً: شتەكە زیاد لە پێویست بوو ٥ دەگوترێ:
أنفِق من مالك مافضل: ئەوەی لە پێویستی خۆت زیادە لەسامانەكەت لێی ببەخشە.
فَضُلَ الشَّيْئُ فضولاً: شتەكە بە خاوەن ڕێزو باش وەصفدار دەكرێ.
أفضل عليه: چاكەی لەگەڵ كرد.
أفضل من الشَّيْئ: لە شتەكە هەندێكی هێشتەوە.
أفضل عليه في الحسب: لەبنەچەو نژاددا لەو خانەدان ترە.
فَاضَلَهُ مفاضلةً وفضالاً: لەفەزڵو ڕێزدا بەسەریدا بالاّدەست بوو.

فاضل بين الشيئين: بەرامبەریو هاوكێشەیی لە نێوان دوو شتەكەدا كرد.
فَضَّلَهُ على غيره: بەگەورەترو ڕێزدارتری لەقەڵەم دا.
تفاضَلَ القومُ: خەڵكەكە كێبڕكێیان هەبوو لەوەجاغزادەیی دا هەریەكەیان لافی ئەوەیان لێدەدا كە ڕێزدارترە لەوی تر.
تَفَضَّلَ: پۆشاكی پشودانو ناومالّی لەبەر كرد.
تَفَضَّلَ عليه: چاكەی لەگەل كرد ٥ لافی ئەوەی لێدا كە پیاوەتی بەسەریەوە هەیە.
تَفَضَّلَ على غيره: پیاوەتیو ڕێزداریو وەجاغزادەیی بۆ چەسپا بەسەر كەسانی دیكەدا.
إستفضل من الشَّيْئ: لەو ڕێزدارتر بوو.
إستفضل الشَّيْئَ: شتەكەی بەزیادە لەمافی خۆی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (أخذ حقه وأستفضل ألفاً).
الفاضِل: زیاد لەپێویست ٥ پیاوی ڕێزدارو شكۆمەند.
الفاضلة: نازو نیعمەتی گەورە ٥ (ك: فواضل).
فواضل المال: بەروبوومی زەوی ٥ شیرەمەنی ئاژەڵ ٥ قازانجی بازرگانی.

**الفِضالُ**: جزداشه ٥ بيجامه، پۆشاكى ناو ماڵ كه ئافرەتو پیاو لەماڵدا دەیپۆشن بۆ نوستنو پشودان.

**الفُضَالَةُ**: پاشماوەى شت، بەرماوەى شت.

**الفَضلُ**: چاكەو نيعمەت بەبێ پاساو ٥ زیادەى بودجە لەبوارى ئابوریدا ٥ بەرماوەى شتو زیادە.

**فَضل الزمام**: لایەكى ڕیشمەو هەوسار.

**الفُضُلُ**: ئافرەت كە پۆشاكى ئيش لەبەربكا ٥ دەشگوترێ: (إمرأة فُضُلٌ) ئافرەتێكە داوێنى لەزەوى دەخشێو لەنجەو لار دەكا

**الفَضلَةُ**: بەرماوەو پاشماوەى شت ٥ ئەوەى لە جەستە دێتە دەر لە پێشەوەو لەپاشەوە (ك: فضلات وفضال).

**الفُضُولُ**: شتى بى سودو قازانج، شتى پرو پوچ ٥ دەگوترێ: (هذا من فضول القول) ئەمە قسەى پرو پووچە ٥ خۆ تێ هەڵقورتاندنى مرۆڤ لەكارێك كە پەیوەندى بە ئەوەوە نەبێ ٥ (حِلف الفُضول) بەڵێننامەو سوێندخواردنێكى قورەیشیەكان بوو لەناوخۆیاندا بڕیاریان دا لەناو مەككەدا ستەم نەهێڵێنو قەلاچۆى زۆردارى بكەن ٥ پێغەمبەرى ئیسلام پێش ئەوەى ببێتە پێغەمبەر ئامادەى ئەم هاوپەیمانیە ستراتیجیە بووە، كەلەماڵى عەبدوڵلاى كوڕى جەدعان دا مۆركراو هەموو تیرەو هۆزەكانى قورەیش پابەند بوونى خۆیان بەم پەیمانە ڕاگەیاند.

**الفُضُولِيّ من الرجال**: كەسێك بەكارى لاوەكییەوە خۆى خەریك بكا ٥ لەشەرعو یاسادا بەكەسێك دەگوترێ: سەرپەرشتیارو وەلى ئەمر نەبێ وەكیلو ئەصیلیش نەبێ.

**الفَضيلَةُ**: پلەى بەرز لە ڕەوشتى جواندا ٥ (فضيلة الشّئ) تایبەتمەندى شتو وەزیفەى شت ٥ (ك: فضائل).

(أمهات الفضائل) كانو سەرچاوەى ڕەوشتى بەرز عەدالەتو، حیكمەتو لێزانىو، داوێن پاكىو، مەردایەتییە.

**فضا المكان فضاءً وفُضواً**: شوێنەكە فراوان بوو.

**فضا الشجرُ بالمكان**: درەخت لە شوێنەكە زۆر بوو.

**فضا فلان دراهمه**: فلانكەس پارەكانى نەكردنە كیسە باخەڵەوە.

**أفضى المكانُ**: شوێنەكە فراوان بوو.

**أفضى فلان**: فلانكەس چوو بۆ دەشتو سارا.

**أفضى الى فلان**: گەیشتە فلان.

**أفضى الأمر به الى كذا**: کارەکە فلانکەسی بەوە گەیاند ٥ دەشگوترێ:

**هذا الكلامُ يفضي الى كذا**: ئەم قسە سەر بەو دەکێشێو ئەمە دەگەیەنێو ئەو ئاکامە بەدی دێنێ.

**أفضى الساجدُ بيده الأرضَ**: سوژدەبەرەکە لەکاتی سوژدەدا دەستی بەزەوییەکەدا هێنا.

**أفضى الى فلان بالسِّرّ**: نهێنیەکەی بەفلان گوت.

**أفضى الى المرأة**: چووە خەلوە لەگەڵ ئافرەتەکە.

**أفضى المكانَ**: شوێنەکەی فراوان کردو خاڵی کرد لەشت.

**الفَضَا**: تەنها ٥ دەگوترێ: (سَهمُ فضاً) تاقە تیرێك ٥ (وبقيت فَضاً) بەتەنیا مامەوە ٥ (تركت الأمرَ فضاً): کارەکەم بەدانەمەزراوىو نارێکخراوی جێ هێشت ٥ یان دەگوترێ: (أمرهم فَضاً بينهم) فەرمانڕەوایىو کار ڕاپەڕاندن لەناویاندا یەکسانەو کەس فەرمانڕەوایىو کوێخایان نیە.

**الفَضاءُ**: زەویو دەشتایی بەرفراوان ٥ زەوی خاڵیو چۆڵەوانی ٥ خانوێك بەردەمی چۆڵ بێ ٥ بۆشایی نێوان شارە ئەستێرەکان: کە هەر خودا دەزانێ ئەو مەسافانە چەندن.

**فَطَا به عن رأيه فَطْئاً**: لەڕاو بۆچونەکەی خۆی لایدا.

**فَطَا الشَّيْءَ**: شتەکەی درز پێ برد، ڕوشاندی.

**فَطَأ الرجلَ**: لەپشتی پیاوەکەی دا پانەو پان.

**فَطَا به الأرضَ**: بەزەوی دا دا، خستی.

**فَطَا القومَ**: خەڵکەکەی واڵێ کرد کارێك بکەن پێیان ناخۆش بێ.

**فَطَا ظهرَ بعيره**: باری گرانی خستە سەر پشتی حوشترەکەیو پشتی چەماند.

**فَطِئَ الرجلُ فَطَئاً**: پیاوەکە پشتی چاڵو سنگی دەرپەڕی ٥ لوتی پان بۆوە، لوتی پلیشابووەوە.

**فَطِئَ البعيرُ**: حوشترەکە پشتی نەوی بوو ٥ چۆمایەوە ٥ (فهو أفطأ وهي فطآء).

**أفطأ الرجلُ**: پیاوەکە دەوڵەمەند بوو ٥ ڕەوشتی ناشیرین بوو، دوای ئەوەی لەوە پێش ڕەوشتی جوان بوو.

**أفطأ فلاناً**: خواردنی دا بەفلان.

**تَفَاطأ**: پشتی زۆر بەقوڵدا چوو سنگی زۆر دەرپەڕی.

**تَفاطَأَ عنه**: تەمبەڵی کرد لە ئیشەکەدا.

**تَفاطَأَ عن القوم**: لە هەڵمەت بردن بۆسەر قەومەکە وازی هێناو کشایە دواوە.

**فاطأ به الأرضَ**: بەزەوی دا دا، خستی.

**الفُطأةُ**: پشت بەقوڵدا چونو سنگ دەرپەڕینە.

**فَطَحَت المرأةُ بالولد فَطحاً**: ئافرەتەکە منداڵەکەی فڕێ دا.

**فطح الشَّيْءَ**: شتەکەی پان کرد ٥ دەگوترێ: (فَطَحَ القَلَمَ) قەڵەمەکەی دادا وای لێ کرد پان بنوسێ.

**فَطَحَ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لە فلانکەسی دا ٥ دەشگوترێ: (فَطَحَ ظَهرَهُ) لەپشتی دا.

**فَطِحَ فَطَحاً**: پان بوو ٥ دەگوترێ: (فَطِحَ الرأسَ) سەری پان بوو (فَطَحت القدم) قاچی پان بوو.

**فَطَّحَ**: بۆ موبالەغە لەمانای (فَطح) دێ ٥ دەگوترێ:

**فَطَّحَ الحديدة**: ئاسنەکەی پان کردەوە.

**الأفطَحُ**: پانو پانەوەبوو.

**الفِطَحلُ**: لافاوی گەورە ٥ شتی کەتەو قەبارە زل ٥ زۆرزانو عالم ٥ کەسێك زۆر عالم بێ، بۆیە ئێستا بەکۆی زانا گەورەکان دەگوترێ: (فطاحِل) ٥ هەروا وشەی (الفِطحل) ناوە بۆ ڕۆژگارێك کەهێشتا ئادەمیزاد دروست نەکراوە.

**فَطَرَ ناب البعير**: کەڵبەی حوشترەکە گۆشتەکەی شەق کردو دەرکەوت.

**فَطَرَ النباتُ**: ڕوەکەکە زەوی قەڵاشتەوەو سەری دەرهێناو ڕوا.

**فَطَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی شەق کرد.

**فَطَرَ الأمر**: شتەکەی دەست پێ کرد هێنایە گۆڕێ.

**فَطَرَ العالَم**: خودا لە نەبوونەوە بوونەوەری هێنایە کایەوە.

**فَطَرَ العَجِينَ**: هەویرەکەی کرد بەنانو نەیهێشت هەڵبێ ٥ هەر شێلایی‌و خێرا کردی بەنان ڕانەوەستا هەویرەکە بگورێو هەڵبێ ٥ دەشگوترێ: (فَطَرَ الأجيرُ الطينَ) کرێکارەکە قوڕەکەی بەکارهێنا بۆ سواغ پێش ئەوەی قوڕەکە ماوەیەکی بەسەردا بڕواو بگورێو بترشێ.

**فَطَرَ الناقَةَ**: بەقامکە گەورەو قامکە شادەی گوانی حوشترەکەی دۆشی.

**افطَرَ الصائِمُ**: ڕۆژوەوانەکە ڕۆژوەکەی شکاند.

**افطَرَ فلان**: فلانکەس کەوتە کاتی ڕۆژو شکاندنەوە ٥ ژەمی بەیانی خوارد ٥ قاوەڵتی کرد.

**افطَرَ على الرُّطب ونحوه**: بەخورمای تەڕو شیرین ڕۆژوی شکاند ٥

خورمای تەڕو شیرینی کردە ژەمی بەیانی.

أفطَرَ الشَّيْئُ الصومَ: شتەکە ڕۆژووەکەی بەتاڵ کردەوە ٥ دەگوترێ: (هذا العمل يُفطر الصائِمَ).

فَطَّرَ الشَّيْئَ: بۆ موبالەغە لەمانای (فَطَرَ) دێ.

فَطَّرَ الصَّائِمَ: وای کرد ڕۆژووەوانەکە ڕۆژووەکەی بشکێنێ.

فَطَّرَ الرجلَ: شتێکی خستە پێش دەمی پیاوەکە بۆئەوەی ڕۆژووەکەی پێ بشکێنێ.

إفتَطَرَ الأمرَ: کارەکەی لەسەرتاوە دەست پێکردو دای هێنا.

إنفَطَرَ الشَّيْئُ: شتەکە شەق بوو.

إنفَطَرَ الغصنُ: لقە درەختەکە گەڵای کرد، گەڵاکەی دەرکەوت.

تَفَطَّرَ الشَّيْئُ: شتەکە شەق بوو درزی برد، قەڵشا ٥ دەگوترێ: (تَفَطَّرَت اليَدُ) دەستەکە قەڵشا.

تَفَطَّرَ الثوبُ: قوماشەکە دڕا ٥ دادڕ دادڕ بوو.

تَفَطَّرَت الأرض بالنبات: زەوییەکە قەڵش قەڵش بوو بەهۆی ڕوانو سەردەرهێنانی گیاو گژەوە.

التفاطيرُ: گیاو گژ کە دوا یەکەم بارانی بەهار دەڕوێ ٥ زیبکە کە لەدەموچاوی کوڕو کچی تازە پێگەیشتوودا پەیدا دەبن.

الفُطارُ: دەگوترێ: (سيف فُطَارٌ) شمشێرەکە مشتو ماڵ نەکراو بەکارهێندرا بۆیە بڕندە نەبوو.

الفُطارِيّ من الرجال: پیاوێك هیچی لەدەست هەڵنەوەرێ نەخێرو نەشەڕ هیچی لەدەست نەیە.

الفَطرُ: درزو قەوارەو قەڵشت ٥ (ك: فطور)

الفِطرُ: ڕۆژو شکاندن ٥ دەنکی ترێ لەکاتی دەرکەوتنی دا ٥ دەشگوترێ: (رجل فِطرٌ وقوم فِطر) پیاوێکە بەرۆژو نیە، قەومێکن بەڕۆژونین.

عيد الفِطر: جەژنی ڕەمەزان، جەژنی ڕۆژو شکاندن.

زکاة الفِطر: سەرفیترە ٥ جۆرە زەکاتێکە موسوڵمانان پێش هاتنی جەژنی ڕەمەزان یان لەکاتی جەژندا دەیدەن بەهەژارو ئاتاجان.

الفُطرُ: بۆڵە تری لەسەرەتای دەرکەوتنی دا ٥ کارگو قاچکو تەقیلە چەند جۆرێکن، هەیە دەخورێو هەیە ژەهراوییە ٥ سێوە بن عەرزە ٥ شیری کەم کە بەپەنجەی شایەتمانو قامکە گەورە دەدۆشرێ.

**الفِطرَةُ**: زەکاتی سەرفیترە ◦ سروشتو فیترەتـی دروستـکراوان سروشـتی ساغو بـێ خـەوش ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ﴾.

**الفِطـرة السـليمة**: لـە زاراوەی فەیلەسوفەکاندا ئامادەباشی مرۆڤـە بـۆ زانـینو دەسـت لەسـەر دانـانی حوکمـەو جیاکردنـەوەی حـەقو ڕاستیو بەتاڵو پوچە.

**الفِطريّة**: بیرو بۆچونێکە گوایە فیکرەو مەبدەئـەکان سروشـتیو خۆڕسکن لەنـەفس دا بـەبێ ئـەزمونو پـێ گوتنو خوێندن بونیان هەیە.

**الفُطـور**: ئـەو خـواردنو خواردنەوەیـە ڕۆژوەوان لـەدوای خۆرئـاوابوون ڕۆژویان پێ دەشکێنێ ◦ فاوەڵتی.

**الفَطِيُر**: هەر شتێك پێش پێگەیشتنی بـەکار بهێنـدرێ ◦ دەگـوترێ: (خبـز فطـیر) نانێـکە هەویرەکـەی هەڵنـەهاتبوو کـرا بـەنان هێـشتا هەویرەکـەی نـەگورابوو، خـۆش نـەبووبوو نـانی لێ دروسـت کـرا ◦ (رأي فطـیر) ڕایەکـە بـەبێ لێ وردبونەوە دەربڕاو گوترا.

**الفَطـيرة**: نانێـکە لەگـەڵ ڕۆنەکـەرە دەخـورێ، ڕۆنەکـەرەو شـتی وا دەکرێتە پێخۆری.

**فَطَس فَطساً وفطوساً**: بـەبێ هـەبوونی نەخۆشیەکی دیـار تێیـدا مـرد هـۆی مردنەکەی نەزاندرا.

**فَطَسَ الحديـدَ**: بـەهۆی گـەرم کـردنو کوتانەوە ئاسنەکەی پان کردەوە.

**فَطَسَ فلاناً بالكلمة**: بەقسە بـەرەنگاری فلان بۆوە.

**فَطِسَ فَطساً**: بۆری لوتی دابـەزی، نـزم بۆوە ◦ (فهو أفطس وهي فَطساءُ).

**فَطَّسَ**: بۆ موبالەغە لـەمانای (فَطَـسَ)دا دێ

**الفَطسَةُ**: دەنکی ئاس.

**الفَطَـسَةُ**: پـان بـوونو دابـەزینی بۆری لوتە ◦ لوتی بەراز.

**الفِطّيسُ**: چەکوچی ئاسنگەر چەکوچی گەورە کـە ئاسـنی سـور کـراوەی پـێ دەکوتێ ◦ پان پیكو کوپن کەبەردی پێ دەشکێندرێ.

**الفِطّسَةُ**: لوتی بەرازو دەوروبەری.

**فَطَـمَ العـودَ أو الحبـلَ فَطمـاً**: دارەکە یـان حەبلەکـەی بڕیـەوە دوولـەتی کـرد ◦ دەگـوترێ: (فَطَـمَ فلانـاً عـن عادتـه) فلانکەسی لە خووڕەوشتەکەی لادا.

**فَطَمَـت المرضـعُ الرضـيعَ**: شـیردەرەکە شیرەخۆرەکەی لەشیر بڕیەوە.

**أفطَـمَ الرضـيعُ**: شـیرەخۆرەکە کـاتی ئەوەی هاتووە لەشیر ببڕدرێتەوە.

**إنفطـم**: لـە شـیرخواردن بڕدرایـەوە.

**إنفَطَمَ عن الشَّيئ**: وازى لەشتەكە هێنا.

**الفاطمية**: (الدولة الفاطمية) دەوڵەتێـك بـوو لـە وڵاتـی مـەغریبو میـصر سـاڵی ٣٥٩ی كۆچـی دامـەزراو سـاڵی ٥٦٧ی كۆچـی لەسـەر دەسـتی صەلاحوالدینی ئەیوبی ڕوخێنرا.

**الفِطامُ**: لەشیر بڕینەوەی منداڵە لەشیر خواردنی دایكی.

**الفطيم**: لەشیر بڕاوە.

**الفـواطِم**: خەلیفـەكانی دەوڵـەتی فاتیمیەن.

**فَطَنَ الأمرَ فِطنَةً**: كارەكەی زانی ئاشكرای كرد ڕونی كردەوە.

**فَطِـنَ فَطَنـاً وفِطنـةً**: بـوو بـەخاوەن تێـگەیشتنو زیرەكی.

**فَطِنَ للأمر وبە**: لەكارەكە بەئاگا هاتو مەبەستەكەی زانی چیە.

**فاطنه في الكلام**: دەربارەی قسەكە بۆی گەڕایەوە، چووە لای.

**فَطَّنَـهُ**: ڕۆشـنبیری كـرد بۆئـەوەی زیرەكیو ژیری بەدەست بێنێ.

**فَطَّنَـهُ للأمـر**: وای لێ كـرد لەكارەكـە ئاگادار بێو پێی بزانێ.

**تَفَطَّنَ**: بەمانا (فَطِنَ) دێ.

**الفطانَةُ**: هێزو توانای زیهنە بۆ زانـینو هەست پێكردنی ئەو شتانەی دێنـە سەری.

**الفِطنَةُ**: بەمانا (الفِطانة) دێ ◦ زیرەكیو وریایی لەبەڕێوەبردنی كاروباردا.

**فَظَّ فَظَظاً و فظاظـةً**: دڵڕەقو بێ بـەزیی بوو ◦ خراپەكار بوو.

**إفتَظَّ البعيرَ**: ورگی حوشـترەكەی دڕیو ئاوەكـەی دەرهێنـا بـۆ خواردنـەوە ◦ ئەوە بووە لەلای عەرەبەكان لـەكاتی ڕۆیـشتن بـە چـۆڵەوانیو دەشـتی بـیرون دا بـەكاروان دەڕۆیـشتن لەپێش دا حوشـترەكانیان ئـاو دەداو پاشـان دەمیـان دەبەسـتن بۆئـەوەی كاوێژ نەكەن، جا كە تینویان دەبـوو ئاوبەنـدی حوشـترەكەیان هەڵدەدڕیو ئاوەكەیان دەردێنا.

**الفَظُّ**: تەبیات وشكو خراپـەكار ◦ (ك: أفظاظ) ◦ ئاوی ناو ئاوبەندی حوشـتر كەلەشوێنی بێروندا تینویان دەبـوو بەكاریان دەهێنا.

**فَظِـعَ بـالأمر فَظعـاً وفظاعـةً**: كارەكـەی بەگەورە زانیو توشی سەرسامی كرد.

**فَظُـعَ الأمـرُ فَظاعـةً**: خراپەكارەكـە چڕ بۆوەو گەیشتە ئاستێكی ترسناك.

**أفظَعَ الأمرَ**: بەمانا (فَظُعَ) دێ.

**أفظَعَ فلاناً**: فلانكەسی خستە ناو كـاری ترسناكەوە.

**أفظَعَ الأمرَ**: كارەكـەی بـەقورسو گـران هاتە بەرچاو.

**أنظَعَ الأمرُ فلاناً:** کارەکە فلانکەسی خستە حاڵەتی سەرسامیو تاسانەوە.
**فَظُعَ الأمرَ:** کارەکەی وا لێ کرد ترسناك بێ.
**إستَفظَعَ الأمرَ:** کارەکەی بەترسناك لەقەڵەم دا.
**فَعفَعَ في أمرِه:** لەکارەکەیدا پەلەی کرد.
**الفَعفاعُ:** ترسنۆك.
**فَعَلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کرد، ئەنجامی دا.
**إفتَعَلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبەست، تەزویری کرد ٥ دەگوترێ: (إفتَعَلَ الحديثَ) قسەکەی هەڵبەست ٥ (إفتَعَلَ عليه الكِذب) درۆی بەدەمەوە هەڵبەست.
**إنفَعَلَ:** بۆ موتاوەعەی (فَعَلَهُ) دێ.
**إنفَعَلَ بكذا:** بەو شتە کار لێ کراو بوو (موتەئەسیر) بوو کرایەوە یان گرژ بوو.
**تفاعلا:** ئەو دوو شتە هەریەکەیان کاریگەری لەسەر ئەوی تریان هەبوو.
**الأفعولة:** کرداری ناشیرینی چاوەڕوان نەکراو و سەرسام کەر ٥ (ك: أفاعيل).
**التفاعل:** کارلێکی کیمیاوی.
**التفاعيل:** لە زانستی عەروزدا چەند وشەیەکن دانراونو وشەگەلی شیعریان پێ دەکێشرێ ٥ وەکوو (فعولن، مفاعلتن، مستفعلن).
**الفاعِل:** بکەر ٥ بەتوانا ٥ دارتاش ٥ کەسێك بەکرێ دەگیرێ بۆ ئیشکردنی بیناکردنی خانوو هەڵکەندنی بناغەو زێرابو بیرو شتی وا ٥ لەزاراوەی نەحوییان دا ئیسمێکە کردەوەیەکی بۆلا ئیسناد درابێو کردارەکە لەپێش ئیسمەکەوە بێ.
**الفاعلية:** بوون بە بکەر، هەرشتێك وەصفی (فاعیل)ی تێدا بێ.
**الفَعَالُ:** کردەوە چاك بێ یان خراپ بێ بەمەرجێ بکەر یەکێك بێ ٥ کردەوەی چاك ٥ بەخشندەیی.
**الفِعالُ:** کردەوە ئەگەر دووکەس ئەنجامی بدەن.
**الفِعلُ:** کردەوە ٥ لەزاراوەی نەحوییان دا وشەیەکە دەلالەت دەکا لەسەر ڕودانی ڕوداوێكو زەمانی ڕوداوەکەش.
**الفَعلَةُ:** کردنی کردەوەیەك یەکجارو مەبەستیش پێی کردەوەی ناشیرینە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾.
**الفِعليُّ:** شتی هەبوو، پێچەوانەی شتی مومکین.

**المَفاعِلُ الـذرّي**: جيهازو ئاميرێكه مادەی تێدا دەگۆڕدرێ بە وزە بەهۆی تەقینەوەی گەردیلە نەوەوییە یۆرانیۆمەكانەوە.

**المفتعل**: هەرشتێك رێك بخرێو لەوە پێش نمونەی نەبێ ◦ دەگوترێ: (جاء بالمفتعل) كارێكی گەورەو سەر سوڕهێنەری هێنایە كایەوە ◦ كارو هەڵسو كەوتێك تەصەنوع و تەكەللوفی تێدا بێ.

**فَغَمَ الإناء فَغماً**: قاپەكەی پڕكردو زێدەڕۆیی كرد لە پڕكردنیدا.

**فَغِمَهُ الطيبُ فَغماً**: بۆنەكە لوتی پڕكرد.

**فَغُمَ الإناءُ فَغامَةً وفُغومة**: قاپەكە پڕ بوو.

**فَغُمَ الساعِدُ**: قۆڵی پتەو و گۆشتن بوو.

**فَغُمَت المرأةُ**: ئافرەتەكە خۆی دارشتو جەستەی رێكو پێك وەستا ◦ (فهي فَغمَةٌ)

**أفغَمَ الإناءَ**: قاپەكەی پڕكرد پڕكردنەكەی تەواو كرد ◦ دەگوترێ: (أفغَمَه الخَبَرُ مسرةً مَساءةً) هەواڵەكە دەرونی پڕ كرد لەبارەی خۆشییەوە یان ناخۆشییەوە.

**أفغَمَ المِسكُ البَيتَ**: بۆنی میسك ماڵەكەی پڕكرد ◦ (فهو مُفغَمٌ).

**فَغَّمَ الإناءَ**: بەمانا (فَغَمَهُ) دێ.

**الأفغَمُ**: شتێك پڕبێو لەسەریەوە بڕژێ.

**الفَغمُ**: دەگوترێ: (وجه فَغمٌ) دەمو چاوێكی پڕە، گۆشتنو بێ چرچو لۆچە ◦ (جاريه فَغمَة) كچێكی تێكسمڕاو و خۆداڕێژە، گۆشتنو جەستە تەواوە.

**حَيٌّ فَغمٌ**: گەڕەكێكی ئاوەدانە بە دانیشتووانەكەی.

**أفعى فلان**: فلانكەس بوو بە شەڕەنگێز.

**فَعّيَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەداخێك نیشانە كرد لە وێنەی مار بوو.

**تَفَعّى فلان**: فلانكەس وازی لە چاكە خوازیی هێناو روی كردە شەڕەنگێزی.

**الأفعى**: ماری ژەهراوی كوشندە؛ خاڵ خاڵەو مل باریكو سەر پانە، ژەهرەكەی زۆر كوشندەیە.

**الأفاعي**: چەند رەگو دەمارێكن لە حالوبەوە بڵاو دەبنەوە.

**الأُفعُوان**: نێرە مار.

**المَفعَاةُ**: (أرض مَفعَاةٌ) زەوییەكە زۆری مار تێدان.

**المُفَعَّاةُ**: داخێكە لەشێوەی ماردا حوشتری پێ نیشانە دەكرێ یان دەكرێتە نیشانەو ئارمی شتی تر.

فَغَرَ فَمَهُ فَغراً: دەمی كردەوە.
أفغَرَ فاهُ: بەمانا (فَغَرَهُ) دێ.
إنفَغَرَ الفمُ: دەمەكە كرایەوە.
إنفَغَرَ النورُ: غونچەكە پشكوت.
فَغار: دەگوترێ: (طعنة فغارٍ) برینێكی ئەمدیواو دیوە.
الفُغرَةُ: دەراوی دۆڵو شیو.
المَفغَرَةُ: زەوی فراوان ٥ دەربەندی كێو و تەنگڵی كێو.
فَغَمَ النَّورُ فَغماً وفغوماً: غونچەكە دەمی كردەوە پشكوت.
فَغمت الرائحة أنفَهُ: بۆنەكە لوتی پركرد.
فَغمت الرائحة زكام المزكوم: بۆنەكە گیرانی لوتی هەڵامەت تووشبوەكەی كردەوە.
فَغِمَ بالشيئ فَغماً: وەگری شتەكە بوو لەخۆی گرتو دەستی لێ بەرنەدا.
فَغِمَ بالمكان: لە شوێنەكە مایەوەو تێیدا جێگیر بوو.
أفغَمَ البيتَ: خانوەكەی پركرد لەبۆن.
أفغَمَ فلاناً: فلانكەسی هەڵنا بۆ كردنی ٥ دەگوترێ: (هو مفغم به) ئەو وەگری بووەو دڵی لێی نابێتەوە سووره لەسەری.
فَغَّمَهُ: بۆنی خۆشی تێدا بڵاو كردەوە، پڕی كرد لەبۆنی خۆش.
إنتَغَمَ الزكامُ: هەڵامەتەكەی چاك بوو، بەری دا.
إنفَغَمَ الزكامُ: بەمانا (إفتغم) دێ.
تَفَغَّمَ النَّورُ: غونچەكە دەمی كردەوە.
الفَغمُ: ئەو وردە خواردنو ڕیشاڵە خۆراكانەیە كە لەنێوان ددان دا دەمێنێتەوە.
الفُغمُ: چەناگە بەهەردوو لاشەویلەوە ٥ دەم.
الفَغَمُ: لوت چونكە بۆنی خۆش دەیكاتەوە
الفَغمَةُ من الطيب: بۆنی خۆش.
المَفغُومُ: شتی بۆنخۆشكراو بە بۆنی خۆش ٥ كەسێك نەخۆشی هەڵامەتی گرتبێ.
فَغَا الشَّجَرُ فَغواً: درەختەكە چرۆكەی پشكوت.
فَغَا الشَّيْئُ: شتەكە دەركەوتو بۆنی بڵاو بۆوە.
فَغَا جِسمَهُ: جەستەی خۆی بەبۆنی خۆش بۆندار كرد.
فَغِيَ التَمرُ فَغيً: توێكڵەكەی ئەستور بوو بەهۆی نەخۆشی كشتوكاڵی كە تووشی بووە.
أفغى الشجرُ: درەختەكە چرۆكەی پشكوتو غونچەكەی كرایەوە.
أفغى التمرُ أو البُسرُ: خورماكە خورما ئاڵو بۆڵ تێكەوتووەكە توێكڵەكەی بەهۆی نەخۆشییەو ئەستور بوو.

**أنفت النخلةُ**: خورما تازه پێگەیشتووەکانی دارخورماکە توێکڵەکەیان ئەستوور بوو.

**أنفى فلان**: فلانکەس دوای جوانی ناشیرین بوو ٥ دوای فەرمانبەرداری لەخودا یاخی بوو ٥ دوای دەوڵەمەندی هەژار کەوت.

**أنفى الطعامَ**: خواردنەکەی لەشتی پوچو پڵو پوش پاککردەوە.

**الفاغيةُ**: غونچەی درەختی خەنە ٥ غونچەی هەموو ڕوەك و درەختی بۆنخۆش ٥ بۆنی خۆش.

**الفَغي**: خورمای ئاڵو بۆڵ تێکەوتووی خراپو پوچ ٥ شتی خراپ لەهەر جۆرێك بێ.

**الفَغو**: بەمانا (الفاغية) دێ.

**الفَغوَةُ**: گوڵ ٥ بۆنی خۆش.

**المَفغُوُّ من الأشياء**: شتی بۆنخۆش کراو بەبۆنی خۆش.

**فَقَا العينَ أو البثرةَ ونحوها فَقأً**: چاوەکەی هەڵدڕی دەری هێنا ٥ دومەڵەکەی گوشی دەری کرد.

**فَقَا الحَبَّ الرُّمان**: دەنکە هەنارەکەی گوشیو ئاوەکەی لێ دەرهێنا.

**أفقَأ فلان**: فلانکەس بەهۆی نەخۆشیەوە سنگی بەقوڵدا چوو.

**فَقَّأ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فقا) دێ.

**إنفَقَأ**: شەقی برد، درزی برد.

**تَفَقَّأ**: بۆ موتاوەعەی (فَقَا) دێ.

**تَفَقَّأ النباتُ**: ڕوەکەکە غونچەکەی پشکوت ٥ بەرەکەی دەرکەوت.

**تَفَقَّأت السحابةُ عن مائها**: هەورەکە بارانی باراند.

**تَفَقَّأ فلان شحماً**: فلانکەس جەستەی پڕ بوو لە بەزو پێستی شەقار شەقار بوو.

**الفاقياءُ**: ئەو ئاوەی لەگەڵ لەدایك بوونی منداڵ دێتە دەر ٥ ئەو پەردەی منداڵەکەی تێدایە لە منداڵدانی دایکی.

**الفَقءُ**: چاڵێکی بچکۆلەیە لەماڵدا دەکرێ ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە.

**الفَقأةُ**: هەور بێ گرمەو بێ بروسکەو بارانی زۆر بێ.

**المُفَقَّئَةُ**: شیو و دۆڵی ناو زەوی.

**فَقَحَ النباتُ فَقحاً**: ڕوەکەکە غونچەکانی کرانەوەو گوڵی کرد.

**فَقَحَ الجَروَ ونحوه**: بێچوە شێرەکە توتکە سەگەکە بێچوە گورگەکە یەکەمجار چاوی هەڵێنان.

**فَقَّحَ**: بۆ موبالەغە لەمانای (فَقَحَ) دێ ٥ دەگوترێ: (فَقَّحنا وصَأصَأتم) ئێمە حەقو ڕاستیمان بینی ئێوە نەتان دی.

**تفاقحَ القومُ**: خەڵكەكە پشتیان لەیەك كرد.

**تَفَقَّحَ الشَّيْئ**: شتەكە دەمی كردەوە، كرایەوە ٥ دەگوترێ: (تَفَتَّح الورد وتَفَقَّحَ النورُ).

**الفُقاحَةُ**: گوڵی رووەك كاتێك لە غونچەكەی دێتە دەر هەر ڕەنگێكی هەبێ

**الفُقاحِيَّةُ**: دەگوترێ: (حُلَّة فُقَاحِيَة) پۆشاكو خشڵێكە ڕەنگی وەكوو ڕەنگی گوڵی تازە پشكوتووە ووەهایە.

**فَقَدَ الشَّيْئَ فقداً وفُقداناً**: شتەكە فەوتا تێدا چوو.

**فَقَدَ الكتابَ وفقد المال**: كتێبەكە فەوتا ٥ ماڵو سامانەكە بوو بە زەرەر ٥ (فقدت المرأة زوجها) ئافرەتەكە مێردەكەی ونبوو سەری تێدا چوو.

**أفقَدَهُ الشَّيْئَ**: وای لێ كرد شتەكەی لێ ون بێ لەكیسی بچێ.

**إفتَقَدَ الشَّيْئَ**: شتەكەی لێ ونبوو، لەكیسی چوو ٥ بۆی گەڕا بۆئەوەی وەدەستی بێنێ

**تفاقد القومُ**: خەڵكەكە هەریەكەیان ئەوەی تری لێ ون بوو، بۆ یەكتر گەڕان یەكدی بدۆزنەوە.

**تَفَقَّدَ الشَّيْئَ**: لەكاتی دیارنەبوونی شتەكە دا بۆی گەڕا، چاوی بۆ گێڕاو نەیبینی ٥ قورئان دەفەموێ: ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ﴾.

**تَفَقَّدَ احوال القوم**: لەحاڵو وەزعی خەڵكەكە ورد بۆوە بزانێ واقیعی حاڵیان چۆنەو چۆن نیە.

**الفاقد من النساء**: ئافرەتی مێرد مردوو یان منداڵ مردوو یان ئافرەتێك خزمی مێردەكەی مردبێ، برای مێردی مردبێ.

دەشگوترێ: (ظبية فاقد أو بقرة فاقد) ئاسكێك درندە بێچووەكەی خواردبێ، مانگایەك درندە بێچووەكەی خواردبێ.

**الفقيدُ**: مردوی شوێن خاڵی، كەسێك مردنەكەی كەسەری گەورەی هەبێو خەڵكی بۆی بە پەرۆش بن ٥ دەگوترێ: (مات فلان غيرُ فقيد) فلانكەس مرد كەس بۆی بەپەرۆش نیە.

**فقر الأرض فقراً**: زەوییەكەی هەڵكۆڵی ٥ دەگوترێ:

**فقر البئرَ**: بیرەكەی هەڵكەند ئاوی دەرهێنا.

**فقر الخَرَزَ**: موورەكەی كون كرد بۆ ملوانكەكە.

**فقر الشَّيْئَ**: شتەكەی شكاند.

**فَقَرَ الرجلَ**: فەقەری پیاوەكەی شكاند.

**فَقَرَتـه الداهيـة:** بـەڵاو كارەسـات پـشتی شكاند.

**فَقِـرَ فَقَـراً:** فەقـەرەی پـشتی ئـازاری بـوو بـەهۆی شـكان یـان سـوان یـان لێـك ترازان یان نەخۆشی تر.

**أفقَـر الظهـرُ:** فەقـەرەی پـشتی بـەهێز بوو.

**أفقَـر الـصَّیدُ فلانـاً:** نێـچیرەكە لـە ڕاوچییەكە نزیك بۆوە نێچیرەكە وای كرد ڕاوچییەكە فرسەتی لێ بێنێ.

**أفقَرَ فلاناً دابتهُ:** وڵاخەكەی بەئەمانەت دا بە فلان.

**أفقَـرَ فلانـاً أرضـاً:** زەوییەكـەی بەئەمانەت دا بەفلان بۆ كشتوكاڵ.

**أفقر الله فلاناً:** خودا فلانكەسی هـەژار كرد.

**فَقّرَ الشَّیْئَ:** شتەكەی زۆر شكاند، وردو هاڕی كرد.

**فَقّـرَ للفـسیلة:** بـۆ نەمامەكـە چاڵێـكی هەڵكەند بۆئەوەی تێیدا بڕوێنێ.

**إفتَقَرَ:** هەژار كەوت.

**إفتقـر الی الأمـر:** پێویـستی بەكارەكـە بوو.

**تَفـاقَرَ:** خـۆی بەهـەژار دانـا، خـۆی بەهەژار لەقەڵەم دا.

**تَفَقَّـرَت الأرض:** زەوییەكـە زۆری چـاڵو چوێڵ تێدا بوو.

**الفاقِرَةُ:** كارەسات ٥ (ك: فواقر).

**الفقـارة:** یەكێـكە لـە زیـنجیرە ئێسقانیەكانی پشت كە لە كلێجەوە تـا پاشـە سـەر ڕیزیـان بەسـتووە ٥ كۆی فەقەرەكان سیو سێ فەقـەرەن ٥ حەوتیان لـە ملـدان دوانزەیـان لـە پـشت دان پێنجیـان لـە سـكدان، پێنجیـان لـە ڕان دان، چواریان لـە كلێجەدان ٥ (ك: فقار).

**الفَقرُ:** ئاتـاجیو پێداویـستی، قەڵشتو درز ٥ غـەمو گرنگـی دان بەشـت، سوور بوون لەسەر شت.

**فَقرَ الدم:** كەم خوێنی ٥ ناڕێكو پێكی لە پێكهاتەی خوێنەكەدا.

**الفِقرَةُ:** بـەمانا (الفقارة) دی ٥ نیـشانەی شـت جـا كێـو بـێ یـان شـتی تـر ٥ ڕسـتەیە لـە ئاخـاوتن ٥ بەشێـك لەسەر باسو لایەك لە شیعر ٥ نیوە شـیعر ٥ دەگـوترێ: (زدت في كلامـه أو من شعره فِقرةً).

**الفُقرَةُ:** چاڵ، قوڵكە كـە هەڵدەكەنـدرێ بۆ نەمامو شەتڵ.

**فُقَرَةُ القمیص:** یەخەی كراس.

**الفقـیرُ:** فەقـەرە شـكاو ٥ دەم لولـەی بۆڕیو جۆگا: كەناوی لێ هەڵـدەڕژێ ٥ هەژارو نەبوو كە كەمترین بژێوی بـۆ دابـین بكـرێ ٥ دەروێـشو گەڕیدەی بێ نەوا.

**المفاقر**: جۆرەکانی هەژاری ٥ دەگوترێ: (سدّ الله مفاقره) خودا لایەنەکانی هەژاریی لەسەر لابردو دەوڵەمەندی کرد.

**فَقَسَ فَقوساً**: کتو پڕ مرد ٥ بازی دا.

**فَقَسَ فلاناً عن الأمر فَقساً**: بە ناشیرین ترین شێوە ڕەدی فلانی دایەوە.

**فَقَسَ الطائرُ بيضتَهُ**: باڵندەکە هێلکەکەی شکاند بۆئەوەی جوجکەکە بێتە دەر.

**فَقَسَ الحيوانَ**: حەیوانەکەی کوشت.

**فَقَسَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەزۆر ستاندو داگیری کرد.

**فَقَسَ الفخُ الطيرَ**: تەڵەکە باڵندەکەی گرت ٥ دوفاقی تەڵەکە باڵندەکەی گرت.

**إنفَقَسَ الشَّيْئُ**: شتەکە قلپ بۆوە.

**تفاقسا**: هەریەك لەو دوانە قژی یەکتریان ڕاکێشا.

**الفقوسُ**: لە ولاتی شام جۆرە کاڵەکێکە ٥ لە ولاتی میصر جۆرە خەیارێکە.

**المِفقاسُ**: دارێکی خوارکراوەیە لەتەڵەدا کە باڵندەکە خۆی لێ دەدا دارەکە هەڵدەگەڕێتەوەو دەیگرێ.

**فَقَشَ البيضةَ ونحوها فَقشاً**: هێلکەکەی پلیشاندەوە بەدەست شکاندی بۆئەوەی ئەوەی تێیدایە بێتەدەر.

**الفقوسُ**: تروزی زەوی دێم.

**فَقَّطَ الحسابَ**: نوسینی برە حیسابەکەی بە وشەی (فقط) کۆتایی پێ هێنا ٥ واتە هیچی تر.

**فَقَعَ اللّونُ فَقعاً وفقوعاً**: ڕەنگەکە سافو بێ گەرد بوو ٥ بەزۆری بۆ ڕەنگی زەرد بەکاردەهێندرێ.

**فَقَعَ الشَّيْئَ**: شتەکەی شەق کرد ٥ دەگوترێ: (فقعته الفواقعُ) بەلاو کارەسات تێکیان شکاند.

**فَقَّعَ فلان**: فلانکەس قسەی پڕوپوچی کردن هیچیان بەسەر هیچەوە نەبوو.

**فَقَّعَ الأديمَ**: چەرمەکەی بەڕەنگی زەرد ڕەنگ کرد.

**فَقَّعَ الخفَّ**: لوتی بۆ خوفەکە دروست کرد

**فَقَّعَ المفاصِلَ**: جومزگەکانی تێك ترنجاندنو تەقاندنی ٥ پەنجەو شانو ملو پەنجەی خۆی تەقاندن.

**فَقَّعَ الشَّيْئَ المنفوخ**: شتە فودراوەکەی بە زەختی دەستو پێ پیانان تەقاندو دەنگی لێ هێنا.

**إنفَقَعَ الشَّيْئَ**: شتەکە شەق بوو، درزی دا.

**تفاقعت عَينُهُ**: چاوی سپی بوو.

**تَفَقَّعت الوَرَقَةُ**: وەرەقەکە ونجڕ ونجڕ بوو دڕاو دەنگی لێ هات ٥ تورەکە

کاغەزە فوتێکراوەکە بە پێکێشانی بە بەری دەست دەنگی لێ هات.
**تَفَقَّعَتِ الأصابِعُ**: پەنجەکانی تەقەیان هات لەکاتی تەقاندنیان دا.
**تَفَقَّعَ النباتُ**: ڕوەکەکە وشك بوو ڕەق بوو قرمەی لێ هات.
**الأَفْقَعُ**: پەنجە تەقێن، ئەو کەسەی شانو ملو پەنجەی خۆی بتەقێنێ.
**الفَاقِعُ**: ڕەنگی سافو ڕوون، بەتایبەتی ڕەنگی زەرد.
**الفَاقِعَةُ**: کارەساتو بەڵای سامناك.
**الفَقَعُ**: قاچکی خراپ.
**الفَقّاعُ**: پیسو خراپ.
**الفُقّاعُ**: شەرابێکە لەئاوی جۆ دروست دەکرێو دەگورێو بڵقۆکەی دەکەونە سەر
**الفُقّاعَةُ**: بڵقۆکە ئاون لەسەر ئاو و شتی وا دروست دەبنو زەنگۆڵ زەنگۆڵ دەوەستێو زووزوو دەپوچێنەوە.
**فَقفَقَ الماءُ**: ئاوەکە لەکاتی هاتنە دەرەوەی دا بڵقە بڵقی لێهات.
**فَقفَقَ فلان في كلامه**: فلانکەس گزافی هەڵکێشاو دەنگی هەڵبڕیو قسەی نابەجێی کرد.
**الفَقفَاقُ من الرجال**: پیاوی زۆر بڵێو قیزە کەرو هاوارکەری بێ سود.

**فَقَّ الشَّيْءُ فَقّاً**: شتەکە دەرکەوتو ئاشکرا بوو.
**فَقَّ الشَّيْءَ فَقّاً**: شتەکەی کردەوە هەڵی پچڕی ٥ دەگوترێ:
**فَقَّ البابَ ونحوه**: دەرگاکەی کردەوە.
**فَقُّ النخلةِ**: بۆشایی خستە نێوان لقو پەڕژو پاڵی دارخورماکە بۆئەوەی بتوانێ موتوربەی بکا.
**إنفَقَّ الشَّيْءُ**: شتەکە بەربوو، کرایەوە.
**الفَقّاقُ**: زۆر بڵێی بێ سود.
**فَقَمَ فلاناً فَقماً**: دووشەویلەی فلانکەسی گرت دەمی بەست.
**فَقِمَ الرجلُ فَقَماً وفَقماً**: دەمو لێوی پیاوەکە ڕێك نەبوونو لای خواروی یان لای سەروی شەویلەی درێژتر بوو بۆیە کە دەم دەقوچێنێ لای خواروی دەمیو سەروی تێك دەپەڕن ٥ (فهو أفقم وهي فقماء).
**فَقِمَ الإناءَ وغيره فَقماً**: قاپەکە پڕبوو ٥ دەشگوترێ: (أصاب من الطعام حتى فقم) ئەوەندەی خوارد تا ئینتەلای کرد.
**فَقِمَ الأمرُ**: کارەکە قورس بوو کێشەکە توند بوو ٥ بەڕێكو پێکی نەڕۆیشت.
**فَقُمَ الأمر فقامةً**: شەڕو خراپی کارەکە لەسنوور دەرچوو.

**تفاقم الأمرُ**: شەڕو نەگبەتی کارەکە لەسنوور تێپەڕی ◊ (الأفقم من الأمور) کاری خوارو خێچ.

**الفُقمُ**: دوولای شەویلە سەرو خواری دەم ◊ دوولای دەمی گازو چەکوچ و شتی وەها ◊ لایەك لە لمبۆزی سەگ.

**الفُقمَةُ**: گیاندارێکی ئاوییە (ماسییەکی گەورەیە).

**فَقِهَ الأمرَ فَقَهاً وفِقهاً**: باش لەشتەکە حاڵی بوو.

**فَقُهَ فقاهة**: بوو بە شەرعزان.

**أفقَهَه الأمرَ**: کارەکەی تێ گەیاند.

**فَاقَهَهُ**: لە شەرعزانی دا بالآدەست بوو بەسەری دا.

**فَقَّهَهُ**: کردی بەشەرعزان.

**تَفَقَّه الأمرَ**: کارەکەی زانیو لێی حاڵی بوو ◊ دەشگوترێ: (تفقّهَ فیه).

**الفَقاهَــةُ**: تێگەیشتنو زیرەکی ◊ زانیاری ◊ بەزۆری بۆ زانیاری شەرع بەکاردێ.

**الفَقیــهُ**: زاناو تێگەیشتوو و زیرەك لەبواری شەرع دا ◊ (ك: فقهاء).

**فَکَّر في الأمر فکراً**: عەقڵو هۆشی لەکارەکەدا بەکارهێنا هەندێ لەزانیاری خۆی خستە گەڕ بۆئەوەی نەزانراوێك بزانێو پەی پێ ببا.

**أفکر في الأمر**: لەکارەکەدا بیری کردەوە، لە ڕوداوەکە وردبۆوە ◊ (فهو مُفکِّرٌ).

**فَکَّرَ في المشکلة**: لەکێشەو موشکیلەکەدا عەقڵی خۆی خستە گەڕ بۆئەوەی حەلی بکا بگاتە بنجو بناوانی چورتمەکە.

**فَکَّرَ فلاناً**: فلآنکەسی بە خەیاڵدا هات.

**إفتکرَ**: یادی کردەوە بیری هاتەوە.

**تَفَکَّرَ في الأمر**: بەمانا (إفتکر) دێ.

**التفکیر**: بیر لێ کردنەوە ◊ بەکارهێنانی عەقڵو وردبوونەوە لە موشکیلەیەك بۆئەوەی ڕێگا چارەی بۆ بدۆزییەوە.

**الفِکر**: بەکارهێنانی عەقڵە لە شتی زانراودا بۆئەوەی شتی نەزانراو بزانی ◊ دەگوترێ: (لي في الأمر فکر ونظر وروية).

**الفَکْرُ**: دەگوترێ: (لیس لي في هذا الأمر فکر) من لەم کارە چ لێ وردبوونەوەیەکم نیەو گرنگی پێ نادەم.

**الفِکرة**: بەمانا (الفِکرُ) دێ ◊ وێنە زیهنیەکان بۆ شتێك، زەین بەکار هێنان بۆ شتێك.

**الفِکريُّ**: بەمانا (الفِکر) دێ.

**الفِکّیرُ**: کەسێك زۆر بیر بکاتەوە.

**المُفَكِّرَةُ**: دەفتەرێكی بچكۆلەیە هەندێ زانیاری پێویستی تێدا دەنووسرێ.

**فَكَّ الشَّيْءَ فَكّاً**: شتەكەی كردەوە، پارچەكانی لێك كردنەوە ◊ دەگوترێ: (فَكَّ الآلة ونحوها) مەكینەكەی كردەوە.

**فَكَّ النُقودَ**: پارەكەی وردكردەوە ◊ (بیستو پێنج دیناریەكەی كردە تاك دیناریو شتی وا).

**فَكَّ العُقدَةَ**: گرێیەكەی كردەوە.

**فَكَّ القَيدَ**: زنجیرەكەی كردەوە.

**فَكَّ الأسيرَ**: ئەسیرەكەی بەرەڵاكرد.

**فَكَّ الرَّهنَ**: ڕەهنەكەی ڕزگار كرد، لەدەستی ڕەهن لەلاكراوی دەرهێنا.

**فَكَّ الصَّبِيَّ**: دەمی منداڵەكەی كردەوە بۆئەوەی خواردنی بداتێ ◊ دەرمانی بداتێ.

**فَكَّ إدغام الحرفين**: دووپیتە گوشراو وتێكخراوەكەی لێك كردەوە.

**فَكَّ المِفصَلُ**: جومگەكە شل بوو، لاواز بوو هێزی تێدا نەما.

**فَكَّ الرجلُ فَكَّةً**: پیاوەكە بێ هێز بوو هەڵوەشاو كەسایەتی ڕوخا ◊ (فهو أفَكّ وهي فَكّاء).

**أنفَكَّ الظبيُ من الحِبالَة**: ئاسكەكە لە داوەكە ڕزگاری بوو.

**فَكَّكَ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (فَكَّ) دێ.

**إفتَكَّ الرهنَ**: ڕەهنەكەی دایەوە، ڕزگاری كرد.

**إنفَكَّ الشَّيْءُ**: شتەكە جیا بۆوە.

**إنفَكَّت العُقدَةُ**: گرێیەكە شل بوو، كرایەوە.

**إنفَكَّ عظم المِفصل**: ئێسقانی جومگەكە لەجێ چوو ◊ دەشگوترێ: (ما إنفك يفعل كذا) وازی نەهێناوە هەرخەریكی كارەكەیە.

**تَفَكَّكَ**: بەمانا (إنفَكَّ) دێ ◊ دەشگوترێ: (تَفَكَّكت شخصية فلان) كەسایەتی فلانكەس زەعیفو لاواز بوو، كەسایەتیەكەی هەڵوەشایەوە ◊ (فلان يتفكّك في مشيه) فلانكەس لە ڕۆیشتنی دا ناڕێكو پێكە ◊ شلو شێواوە.

**إستَفَكَّ العُقدَةَ**: هەوڵی كردنەوەی گرێیەكەی دا ویستی چورتمەكە یەكالا بكاتەوە.

**الأفَكُّ**: شەویلە شكاو ◊ بۆ مێینە دەگوترێ: (فَكّاء) ◊ بەیەك گەیشتنی هەردوو شەویلە ◊ (ك: فَكّ).

**الفاكّ من الرجال**: پیاوی زۆر گێلو ئەحمەق ◊ پۆڵكاو، پیر.

**الفِكاك**: (فِكاك الرهن والأسير) ڕەهن دانەوە ڕزگاركردنی ماڵی ڕەهن

کراو، بەرەڵا کردنی ئەسیر ٥ یان ئەو ماڵو پارەیەی ڕەهنەکەی پێ دەدەیەوە.

**الفَكّ**: شەویلە ٥ پوك، ئەو شوێنەی ددانی لێ دەڕوێ ٥ ناوە بۆ هەردوو شەویلە (خواروسەرو) ٥ دەگوترێ: (مقتل الرجل بين فكيه) هۆی بە فتارەچوونی ئادەمیزاد ئەوەیە لەنێوان دوو شەویلەی دایە (واتە: زوبان).

**المِفَكّ**: ئامێرێکە بزماری پێ هەڵدەکێشرێ، گازو پلایس ٥ تەرنەفیز.

**الأفكَل**: لەرزین، شەقەتۆڵە ٥ دەگوترێ: (أخذه أفكَلُ) توشی لەرزینو شەقەتۆڵەو شپڵە بووە لەترسان یان لەسەرمان.

**فكَنَ**: چووە ناوەوە.

**تَفَكَّنَ**: سەری سوڕما، سەرسام بوو.

**تَفَكَّنَ علی الشيء**: خەمو خەفەتی خوارد بۆ فەوتانی شتەکە.

**تَفَكَّنَ في الأمر**: بیری لە شتەکە کردەوە.

**الفُكنَةُ**: پەشیمان بوونەوە لەسەر شتی لەدەست چوو.

**فكِهَ فَكهاً وفكاهةً**: قسەخۆش بوو، قسەی پێکەنین ئاوەری کردن.

**فكِهَ منه**: سەری لێ سوڕما، (فهو فكِه وفاكه).

**أفكَهَتِ الناقة ونحوها**: حوشترەکە شیری باشی دا پێش ئەوەی بێچوی ببێ ٥ (فهي مُفكِهٌ ومفكهة).

**فَكَّهَ القومَ**: میوەی بۆ قەمەکە هێنا ٥ قسەی خۆشی بۆ خەڵکەکە کردو هەمووی هێنانە پێکەنین.

**تفاكه القومُ**: خەڵکەکە یاریو قسەی خۆشیان بۆ یەکتر کرد.

**تَفَكَّهَ**: میوەی خوارد.

**تَفَكَّهَ الرجلُ**: پیاوەکە پەشیمان بۆوە.

**تَفَكَّهَ منه**: سەری لێی سوڕما.

**تَفَكَّهَ بالشيء**: لەزەتی لەشتەکە بینی ٥ دەگوترێ: (ترکت القومَ يتفكّهون بفلان) خەڵکەکەم جێ هێشت خەریکی غەیبەت کردنی فلان بوونو بەو پاشملە باسکردنە لەزەتو خۆشییان دەبینی.

**الأفكوهة**: سەیرو سەمەرە.

**الفاكِهُ من الرجال**: پیاوی تەنپەروەرو بەناز پەروەردە.

**الفَاكِهاني**: میوە فرۆش.

**الفاكهة**: میوەی بەلەزەتو خۆش تام ٥ حەڵوا.

**الفاكِهي**: بەمانا (الفاكهاني) دێ.

**الفُكاهَةُ**: گاڵتەو گەپ ٥ قسەی خۆش‌و پێکەنین ئاوەر.
**الفَكِـهُ**: بەمانا (الفاكـه) دێ ٥ دڵپاك‌و نەفس بەرزو قسەخۆش ٥ دەگوترێ: (فلان فَكِهٌ بأعراض الناس) فلانکەس لەزەت دەبینێ لە غەیبەت کردنی خەڵکانی تر.
**الفَكيهَةُ**: بەمانا (الفُكاهة) دێ.
**الفَيكهان**: مرۆڤی پێکەنیناوی‌و قسە خۆش.
**فَلَتَ الشَّيْئُ فَلتاً**: شتەکە ڕزگاری بوو.
**أفلـت منـه**: لێی ڕزگار بوو ٥ دەشگوترێ: (أفلَتَني الشَّيْئُ) شتەکەم لەکیس چوو.
**فَالَتَهُ مفالتَةً وفِلاتاً**: کت‌وپڕ بەرەنگاری بوو.
**فَلَّتَهُ**: بەمانا (أفلَتَهُ) دێ.
**إفتَلَتَ الأمرُ**: کارەکەی لەکیس چوو، پەلەی کرد لەدەست بۆ بردن‌و کێش کردنیدا.
**إفتَلَتت الكلامَ**: خێرا هاتە قسەو بە ئیرتیجالی وتاری دا.
**إفتلت الشَّيْئَ**: شتەکەی چەپاو کرد.
**إفتَلَتَهُ الموتُ**: مردن تێکیەوەپێچا.
**إنفَلَتَ**: ڕزگاری بوو ٥ بەخێرایی ڕزگاری بوو.
**تَفَلَّتَ عليه**: هێرشی کردە سەر.

**إستَفلَتَ الشَّيْئَ من يده**: شتەکەی لەدەست فڕاند.
**الفُلَتُ**: ئەسپی خۆش ڕۆو تەڕدەماخ.
**الفَلَتانُ**: بەمانا (الفُلَتُ) دی ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوی ئازاو ورە بەرز ٥ بۆ ئافرەت (فلتانة) دەگوترێ ٥ گۆشتن‌و تێکسمڕاو.
**الفَلْتَةُ**: کارێك ڕوو‌بدا بەبێ وردبوونەوەو پلان بۆدانان ٥ دەگوترێ: (حدث هذا فلتة) ٥ قسە لەدەم دەرچوون بەبێ مەبەست ٥ شت لەدەست قەومان بەبێ نیاز ٥ دەگوترێ: (هذا من فلتات اللسان).
**الفَلُوتُ من الثياب**: ئەو پۆشاکەیە لەبەر تەسکی‌و بچوکی ئەملاو ئەولای نەگەنەوە بەیەك ٥ یان لەبەر نەرمی لەسەر جەستە نەوەستێ.
**فَلَجَ فَلجاً**: بەئامانج گەیشت، زەفەری لێ بینی.
**فَلَـجَ بحاجته**: بەمەبەستی خۆی گەیی ٥ بەڵگەی خۆی هێنایەوەو بەرامبەری بۆڕدا.
**فَلَجَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کرد بە دووبەش.
**فَلَجَ الحَرَاثُ الأرضَ للزراعة**: کشتیارەکە زەویەکەی هەڵگێڕایەوە بۆ زەراعەت‌و شت تێدا ڕواندن.

**فَلَجَ الطعامَ ونحوه بينهم**: خواردنەکەی لە نێوانیاندا دابەش کرد.
**فَلَجَ الوالي الجزية على القوم**: فەرمانڕەوا سەرانەی خستە سەر خەڵکەکە.
**فَلِجَ الرجلُ ونحوه فَلَجاً وفَلَجَةً**: پیاوەکە نێوان قاچەکانی بەزگماك پان بوو، یان نێوان ددانەکانی کەلێنیان هەبوو ددانی شاش بوون ◦ دەگوترێ: (فَلِجَ ثغرهُ) ◦ (وفلِجَت أسنانه) (فهو افلج وهي فلجاء).
**فُلِجَ الرجلُ**: پیاوەکە نەخۆشی شەلەلی نصفی توش بوو (فهو مفلوج).
**أفلَجَ فلاناً على خصمه**: فلانکەسی بەسەر ڕکەبەرەکەیدا زاڵ کرد.
**أفلج الله حُجّتَهُ**: خودا بەڵگەو دەلیلی فلانی چەسپاندنو ئاشکرای کردن.
**فَالَجَهُ**: لەدەست پێشخەریو زەفەر پی بردندا پێشی کەوت.
**فَلّجَ الطعامَ بينهم**: بەرێكو پێکی خواردنەکەی بەسەردا دابەش کردن.
**فَلّجَ الأمرَ**: لەکارەکە ورد بۆوەو تێی فکری.
**فَلّجت المرأةُ أسنانها**: ئافرەتەکە ددانی خۆی شاش کردن بۆ جوانی.
**اَفَلّجَ**: شەقارشەقار بوو.
**تفَلّجت الأسنان**: ددانەکانی شاش بوون.

**الفالِجُ**: نەخۆشیەکە توشی لایەکی جەستە دەبێ (نیوە شەلەل) ◦ حوشتری گەورەی دوو دوگ ◦ (ك: فوالج).
**الفَلَجُ**: جۆمی پچکۆلە ◦ (ك: فلوج).
**الفِلجُ**: نیوەی شت ◦ چینە مرۆڤێك.
**الفُلُجُ**: جۆگایەك هەموو باخەکە ئاو بدا.
**الفَلَجاتُ**: زەوی کشتو کاڵی.
**الفُلجَةُ**: گەیشتن بەئاوات.
**الفَلُوجَةُ**: زەوی گونجاو بۆ کشتو کاڵ.
**المفَلّجُ**: دەگوترێ: (رجل مُفلّج الثنايا) پیاوێکە ددانی شاشن ◦ (أمور مُفَلّجَة) کاری شێواو و نارێك.
**فَلَحَ فلاحاً**: بەئاواتی خۆی گەیی، ڕزگاری بوو، سەرفراز بوو.
**فَلّحَ بالقوم فلاحةً**: فرۆشتنو کڕینی بۆ فرۆشیارو کڕیار جوان کرد، هەڵێنان بۆ دامەزراندنی مامەڵەکە.
**فَلّحَ في البيع**: لە نرخی کاڵاکەی زیاد کرد بۆئەوەی کڕیار هەڵخەڵەتێنێ.
**فَلَحَ الشَّيْءَ فَلحاً**: شتەکەی هەڵدڕی ◦ دەگوترێ: (فَلَحَ الأرضَ للزراعة) زەوییەکەی کێڵا بۆ کشتو کاڵ.
**فَلِحَ فَلَحاً**: لێوی قەڵشا ◦ دەگوترێ: (فَلِحَت شفته) ◦ (فهو أفلح وهي فلحاء).

**أفلَحَ**: زەفەری برد بەوەی مەبەستی بوو ٥ نازو نیعمەتی ڕۆژی دوایی دەست کەوتو بەمراز گەیی.

**إنفَلَحت اليد أو الشفة**: دەستی یا لێوی قەڵشا ٥ شەقار شەقار بوو.

**فَلَّحَ به**: گاڵتەی پێ کرد بەچاوی سوك سەیری کرد.

**تَفَلَّحَ**: بەمانا (إنفَلَحَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تفلحت اليدُ و تَفَلَّحت الشَفَةُ) لەسەرمان دەستی قەڵشتن یان لێوی قەڵشت.

**إستَفلَحَ بأمره**: بەمرازی خۆی گەیی ٥ هەوڵی ڕزگاربوونی دا.

**الأفلاح**: دەگوترێ: (قوم أفلاح) گەلێکی بە مراز گەیشتوون.

**الفَلاحُ**: بەمراز گەیشتن ٥ بەردەوامو مانەوە، دەگوترێ: (لا أفعل ذلك فلاح الدهر).

**الفِلاحَةُ**: سەروکاری کردنی زەوی کشتوکاڵی و خەریکبوون بەکاری کشتوکاڵیەوە.

**الفَلحُ**: شەق کردنو هەڵدڕینی زەوی ٥ (ك: فلوح).

**الفَلّاحُ**: کشتیار ٥ کەشتیەوان ٥ (ك: فلاحون).

**الفَلحة**: قەڵشانی لێوی خوارەوە.

**تَفَلحَسَ الرجلُ**: پیاوەکە کاری منداڵانەی کرد ٥ زۆر داواو پاڕانەوەی کرد، زۆر کرۆزایەوە.

**الفِلحاسُ من الرجال**: ناشیرینو قسەخۆش

**الفَلحَسُ**: سوور بوو لەسەر شت، بەخەمەوە بوو بۆ شت ٥ زۆر داواکەر ٥ زۆر گیرەگیڕ کەر.

**فَلَذَ الشَيْءَ فَلذاً**: شتەکەی بڕیەوە ٥ دەگوترێ: (فَلَذَ من ماله) لەماڵی خۆی هەندێکی جیاکردەوەو پێی دا.

**فَالَذَهُ**: قسەی لەگەڵدا کردەوە.

**فَلَّذَ الشَيْءَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَلَذَ)دا دێ.

**إفتَلَذَ الشَيْءَ**: شتەکەی دابڕی ٥ لێی ستاند.

دەگوترێ: (إفتلذت منه حقي) مافی خۆم لێ ستاند.

**الفالوذ والفالوذجُ**: حەڵوایەکە لە ئاردو ئاو و هەنگوین دروست دەکرێ ٥ هەروا لە نەشاو ئاو و شەکر دروست دەکرێ.

**الفِلذُ**: جەرگی حوشتر ٥ (ك: أفلاذ).

**الفِلذَة**: پارچە جەرگ، پارچە گۆشت ٥ پارچە زێڕو زیو.

**أفلاذ الأكباد**: منداڵو نەوە.

**أفلاذ الأرض**: کانو گەنجینەی ناو زەوی.

**الفولاذ**: پۆڵا.

**المُفلوذ**: (سيف مفلوذ) شمشێرێکە لە پۆڵا دروست کراوە.

**الفِلذُ**: عونصورێکی کیمیاوییه، ورشەیەکی مەعدەنی هەیە، بۆ گەیاندنی تەزوی کارەبا گونجاوه ٥ پیاوی توندڕەو و کەلە ڕەق ٥ پیاوی چروکی دەست قوچاو هیچ لەدەست هەڵنەوەریو.

**فَلِسَ مِن الشَّيْءِ فَلَساً**: خالی بوو لەشتەکەو لێی دوور بوو ٥ دەگوترێ: (هو فِلِس من الخير) ئەو بێ خێرو بێرە پیاوەتی لەدەست هەڵناوەرێ.

**أفلَسَ فلان**: فلانکەس هەژار کەوتو هیچی بەدەستەوە نەما دوای ئەوە کە ساماندار بوو ٥ (فهو مُفلِسٌ).

**أفلَسَ فلاناً**: ویستی بچی بۆلای فلانکەس و شوێنەکەی هەڵەکرد.

**فَلَّسَ القاضي فلاناً**: دادوەر بڕیاری ئەوەی دا کە فلان هەژارو هیچ نەبووە.

**الإفلاس**: حاڵەتێکە بۆ بازرگان پەیدا دەبێ کە ناتوانێ قەرزی کەڵەکە بووی سەرشانی بداتەوە.

**الفَلسُ**: توێکڵی جەستەی ماسی پێستی پلپلەی ماسی ٥ پارەیەکی سکە لێدراوە لە غەیری مادەی زێڕو زیو ٥ جاران فلس بریتی بوو لە شەشیەکی دیرهەمێك ٥ لەم ڕۆژگارەدا بەشێکە لەهەزار بەشی دینار لە عێراقو هەندی ولای تر ٥ مۆرێکە لەملی ئەوانە دەدرێ کە سەرانەیان دەخرێتە سەر.

**الفَلَسُ**: پەی پێنەبردن، فرسەت لێ نەهێنان.

**المُفَلَّسُ**: دەگوترێ: (شيءٌ مُفلَّسٌ اللون) شتێکە بەسەر پێستەکەیەوە پلپلە هەن وەکوو فلوس وان.

**فَلسَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەشیکاری فەلسەفەیی شی کردەوە.

**تَفَلسَفَ**: ڕێگای فەیلەسوفەکانی گرتەبەر بۆ باس و لێکۆڵینەوەکانی ٥ بەبێ ئەوەی زانیاری فەلسەفەی هەبێ لافی فەیلەسوفەکانی لێ دا.

**الفَلسَفَةُ**: دیراسەو لێکۆڵینەوەیەکە گرنگی دەدا بە شیکردنەوەی زانیاری بە شیکردنەوەیەکی عەقڵی، لە ڕۆژگاری کۆندا زانیاری فەلسەفە هەموو زانیاریەکی دەگرتەوە، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا فەلسەفە کورت هەڵێندراوە لەسەر زانیاری مەنتیق و ئەو دیو جیهانی مادە.

**الفَيلسوف**: زاناو لێ کۆڵەرەوە لەبواری فەلسەفەدا.

**أفلَصَ الحبلُ من يده**: حەبلەکەی لەدەست بەربوو.

**فَلَّصَهُ من يده**: لەدەستی ئەو ڕزگاری کرد.

**تَفَلَّصَ حبل من يده:** حەبلەکەی لەدەست بەرەڵا بوو.
**فَلطَحَ الشَيْئَ:** شتەکەی بڵاو کردەوە، پانی کرد ◊ دەگوترێ:
**فَلطَحَ الخُبزَ والقُرصَ:** نانەکەی پان کردەوە، هەنگوتکە هەویرەکەی پان کردەوە.
**فَلَعَ الشَيْئَ:** شتەکەی قەڵاشت ◊ دەگوترێ: (فَلَعَ رأسَهُ بالسيف) بەشمێر سەری قەڵاشت.
**فَلَّعَهُ:** بەمانا (فَلَعَهُ) دێ.
**إنفَلَعَ الشَيْئُ:** شتەکە شەق بوو ◊ دەگوترێ: (إنفَلَعَتِ البيضة عن الفرخ) هێلکەکە شەق بوو جوچکەکە سەری دەرهێنا.
**تفَلَّعَ الشَيْئُ:** شتەکە شەق بوو، قەڵشا.
**تفَلَّعتِ القدمُ:** قاچی قەڵشتن.
**فَلَغَ رأسَهُ:** سەری برینداری کرد.
**تفَلَّغَ الشَيْئُ:** شتەکە وردو خاش بوو.
**فَلغَمونُ:** هاوسانێکە لەژێر پێست دا.
**فَلفَلَ الطعامَ:** فلفلی خستە ناو خواردنەکە، فلفلی تێ کرد.
**فَلفَلَ فاهُ:** دەمو ددانی بەسیواك پاك کردەوە.
**فَلفَلَ الأُرزَ:** برنجەکەی لێنا بەبێ کوتان، بەبێ ئەوەی برنجەکە پاك بکا کردی بە چێشت.
**تَفلفَلَ الشَعرُ:** قژەکە گشتو گرژ بوون.
**تَفلفَلَت حلمات الضرع:** گۆی گوانەکان رەش بوون.
**تَفلفَلَ في سيره:** لە رۆیشتنەکەیدا لارو لەنجەی کرد.
**الفُلفُلُ:** روەکێکە لە پێری (الفلفلية) لە وڵاتی گەرمەسێر دەروێ ◊ بەرەکەی وشك دەکرێو دەهاڕدرێو دەکرێتە ناو چێشتو خواردەمەنی ترەوە.
**المُفَلفَلُ:** هەر خواردنێك فلفلی تێ بکرێ ◊ قژی ئاڵۆزکاو و گرژو گشت ◊ پێستێك زیپکەی وەکوو فلفلی لێ پەیدا بێ.
**الفُلَيفِلَةُ:** روەکێکە لەپێری (فولفول) بەرەکەی وەکوو فلفل وایە ◊ جۆرە بەرێکیشی هەیە تیژایی تێدا نیە وەکوو باینجان وایە.
**فلقت النخلةُ فَلقاً:** طەلعی دار خورماکە شەق بوو دەنکەکانی دەرکەوتن.
**فَلَقَ الشَيْئَ:** شتەکەی شەق کرد ◊ دەگوترێ: (فلق الله الحبَّ عن النبات) خودا دەنکە دانەوێڵەکەی لە روەکەکە دەرهێنا ◊ (فَلَقَ الله الصبحَ) خودا روناکی بەیانی لەناو تاریکی شەودا دەرخستو ئاشکرای کرد.
**أفلقَ الشاعِر:** شاعیرەکە شیعری عەجایەب و سەیرو سەمەرەی دانان (فهو مُفلِقٌ).

**أفلَـقَ في الأمـر:** لەکارەکـەدا شـارەزاو لێزان بوو.

**فَلَّـقَ الـشَّيْءَ:** بـۆ زێـدەڕۆیی لـەماناى (فَلَقَهُ) دێ.

**إفتَلَقَ الجِسمُ:** جەستەکە کشاو گەورە بوو.

**إفتَلَـقَ في عَـدوه:** بازەکـەی تونـد کـردو زیاد لەئاسایی تێپەڕاند.

**إنفَلَقَ الشَّيْءُ:** شتەکە شەق بوو.

**تَفَلَّقَ:** شەق بوو کەرت بوو، درزی برد.

**تَفَلَّـقَ الجِـسمُ:** جەسـتەکەی گـەورەو زەبەلاح بوو.

**تَفَلَّـقَ في عـدوه:** لـە بازدانەکـەی زۆری بــڕیو لــە ئەنــدازەی ئاســایی تێپەڕاند.

**تَفَلَّـقَ اللـبنُ:** ماسـتەکە بـەهۆی زۆر ترشانەوە کلۆ کلۆ بوو.

**تَفَيلَقَ الغلامُ:** کوڕەکە جەستەی گـەورە بوو زل بوو ◦ لە بازداندا تینی دایـە خۆی زۆر ببڕێ.

**الفَالِقُ:** ڕێگای نزمو چاڵ: کە بکەوێتە نێوان دوو تەپۆڵـکەوە ◦ (والله فـالق الحـب والنـوى) خـودا دەرهێنـەری دانەوێڵەو دەنکە میوەیـە لـە ڕووەکو درەخت (فالق الأصباح) دەرهێنـەری ڕوناکییە لەناو تاریکایی شەودا.

**الفِلاق من اللبن:** شیرو ماستی بزرکاو بەجۆرێك کلۆ کلۆ ببێ.

**الفُلاقة:** پارچە ◦ (ك: فلاق).

**الفَلْـقُ:** درزو شـەق ◦ لقـە دارخورمـاو شـتی وا کـەدەکرێ بـەدوو پارچـە هەرپارچـەیەکی پێـی دەگـوترێ: (فَلَقٌ) ◦ شوێنی جودا بوونـەوەی قـژ لـە تۆقەسـەردا کـە هەریەکـەیان ڕو لەلایەك دەکەن ◦ (ك: فلوق).

**الفِلـقُ:** کـاری سـەر سـوڕهێنەر ◦ لقـە دارخورمـای شـکاوە کـە دەکـرێ بـە دوو بەش هەریەکی پێی دەگـوترێ: (فِلق).

**الفَلَـقُ:** بـەیانی کەلـە تاریکـایی شـەو دەرکـــەوێو تاریکـــایی دڕدەدا ◦ ڕێگایەك نـزم بێو بکەوێتـە نێوان دوو تەپۆڵـــکەوە ◦ دارێـــکە کـــونی تێدان بەئەندازەی قاچی مـرۆڤ دزو جــەردەی پــێ فەلاقــەو پێوەنــد دەکرێ.

**الفُلقانُ:** درۆی ئاشکرا.

**الفِلقَـةُ:** پارچـە ◦ دیـزەو گـۆزە کەلـە ناوەڕاسـت دا بکـرێ بـەدوو بـەش، هــەر بەشێــکی پێــی دەگــوترێ: (فِلقة).

**الفَلَقَةُ:** داری فەلاقەکردن.

**الفَلَقِي:** کاری سەر سوڕهێنەر.

**الفَلِّيـقُ:** قـۆخو قەیـسی کـە دەنکیـان دەربێ.

**الفَليقُ**: کاری سەیرو سەر سوڕهێنەر ٥ قولایی ژێر گەردنی ملی حوشتر.
**الفَلیقَةُ**: کاری سەیرو سەر سوڕهێنەر.
**الفَیْلَقُ**: کۆمەڵێکی زۆر لە سوپا ٥ کاری سەر سوڕهێنەر.
**المِفلاقُ**: مرۆڤێـك کاری خـراپ ئـەنجام بدا ٥ (ك: مفـالیق) ٥ قەیـسیو شتی وا کـە دەنکـی تێـدا نـەمابێو وشـك کرابێ.
**فَلَـكَ ثدي الفتـاة فَلكاً**: مـەمکی کچەکە خڕ بوون ٥ دەشگوترێ: (فلكت الفَتاةُ).
**فَلِـكَ فَلَـكاً**: جومزگـەی وشـك بـوونو سمتی ئەستورو گەورە بوون.
**أفلَـك الرجلُ في الأمـر**: پیاوەکـە چووە ناو ئیشەکەوە.
**أفلكـت الفتـاةُ**: کـچەکە مـەمکی خـڕ کردن ٥ (فهي مفلك).
**فَلَّكَ ثدي الفتاة**: بۆ زێدەڕۆیی لـەمانای (فَلَـك) دێ.
**فَلَّكَ فلان الأمر**: بەمانا (أفلَـك) دێ.
**فَلَّكَ الفیصلَ**: زوبانی بێچوەکەی بەست بۆئـەوەی نـەتوانی شـیری دایکـی بمژێ.
**تَفَلَّكَ ثدي الفتاة**: بەمانا (فَلَـك) دێ.
**إستفلك ثدي الفتاة**: بەمانا (فَلَـك) دێ.
**الفلاكة**: هەژاریی.
**الفُلكُ**: کەشتی.

**الفَلَـك**: گردی لەبەڵانی خڕ کـە دەوران دەوری چـۆڵ بـێ ٥ شـەپۆلی دەریـای جونبوشـاوی ٥ ڕێـڕەوی ئەسـتێرەو قەبارە ئاسمانییەکان.
(علـم الفلـك) زانیـاری ئاسمانـشوناسی قەبارە ئاسمانییەکان.
**الفَلَـكة**: فولکە؛ پارچـەیەکە لـەزەوی کەوانەییەو لەدەوران دەوری خـۆی بەرزتـر ٥ شوێنی بەیەك گەیـشتنی دوو فەقـەرەی پـشت ٥ کۆمەڵـە مویـەك بـە زوبـانی بێـچووەوە دەبەسترێ بۆئـەوەی نـەتوانێ شـیری دایکی بمژێ ٥ سەرە تەشی.
**الفَلَـكيُّ**: کەسێـك خـەریکی زانیـاری ئاسمانشوناسی بێ.
**الفُلَیكَةُ**: کەشتی بچوك.
**المفلوك**: هەژار ٥ (ك: مفالیك).
**فلكلور**: فۆلکلۆر.
**فَلَّ عن فلان عقله فلاً**: فلانکەس عـەقڵی ڕۆییو بۆی هاتەوە.
**فَلَّ السیفُ**: شمشێرەکە کـەل بـوو کەڵـکی تێکەوت.
**فَلَّ الـسیفَ**: کەڵـکی لـە شمـشێرەکە کـرد تیژایی نەهێشت.
**أفلَّـتِ الأرضُ**: زەوییەکـە بـوو بـە سوتەمەڕو سەوزایی تێدا نەما.
**أفَلَّ القومُ**: خەڵکەکە چوونە شوێنێـکی بێ لەوەڕو سەوزایی.

## علم الفلك : بروج السماء

لا بد من التذكير أن كل شهر يسجل فرق ساعتين في وقت طلوع النجوم. وعليه، فإن نجمًا يكون طلوعه الساعة الثامنة في أول حزيران، فإن هذا النجم ذاته سيطلع حوالي الساعة العاشرة في أول أيار والساعة الثانية عشرة في أول نيسان. وبالعكس إن هذا النجم سيطلع الساعة السادسة في أول تموز .... الخ.

أفَلَّ فلان: فلانكەس ماڵو سامانی فەوتا.

فَلَّلَ السَّيفَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَلَّهُ) دێ.

فَلَّلَ الثَّغْرَ: ددانی تیژ کردنەوەو پاکی کردنەوە ٥ دەمو ددانی شتن.

إفتلَّ السيفُ: شمشێرەکە تیژی نەما کول بوو.

إنفَلَّ السَّيفُ: شمشێرەکە تیژایی کەلی تێکەوت.

إنفَلَّ القومُ: خەڵکەکە هەلاتن تێ شکان.

تَفَلَّلَ السيفُ: شمشێرەکە تیژایی نەما ٥ کول بوو ٥ هەروا بۆ موتاوەعەی (فَلَّلَهُ) دێ ٥ دەگوترێ:

تَفَلَّلَت مضارِبُهُ: شوێنی لێدانی شمشێرەکەو تیژاییەکەی شکاو کەل بوو.

تَفَلَّلَ القومُ: خەڵکەکە هەلاتنو لەشەڕا شکان.

إستفَلَّ السيفَ: شمشێرەکەی کەل کەل کرد کەڵکی تێخستن.

إستَفَلَّ الشَّيْءَ الصَّلبَ: لەشتە پتەو و ڕەقەکە کەمێکی لێ کردەوە.

الأفَلُّ من السيوف: شمشێرێك کەل بووبێ کول بێ.

الفَلُّ: کەلبوونی تیژایی شمشێرە ٥ هەروا ناوە بۆ وردە پارچەی کەلەشت هەڵدەوەرێ ٥ وەکوو وردەی زێو و ئاڵتونو وردە ئاسنو پرپشکی ئاگر ٥ (ك: فلول) هەروا ناوە بۆ کەسێك لە جەنگ دا تێشکابێ ٥ زەوییەك سوتەمەرو بێو بارانی لێ نەباریبێ ٥ دەگوترێ: (فلان فَلٌّ من الخير) فلانکەس خاڵییە لە خێرو پیاوەتی (ك: فُلُولٌ).

الفِلُّ: زەوییەك گیاو گژی تێدا نەبێ ٥ قژو موی تەنكو کەم.

الفِلَّةُ: تۆپەوانەی گۆزەو سوراحیو شتی وا لەمادەی فیلین (تەبەدۆر).

الفُلُّ: ناوە بۆ یاسەمین.

الفِليُّ: کۆمەڵە سەربازی شکاو و هەلاتوو لەجەنگ دا.

الفَلِّيَّةُ: زەوییەك ساڵێك بارانی لێ بباریو ساڵی دواتر باران لێی نەدا ٥ (ك: فلالِي).

إنفَلَّمَ أنفه: لوتی برِی، لوتی عەیبداری کرد.

تَفَيلَمَ الغُلامُ: کوڕەکە قەڵەو بوو.

الفَيلَمُ من الرجال: پیاوی کەتەو زەبەلاح ٥ هەروا وشەی (الفَيلَمُ) ناوە بۆ کاری گرنگو گەورە ٥ بۆ شانەی

گەورە ٥ بۆ بیری دەم فراوان ٥ (ك: فیالم).

**الفِیلمُ**: شریتی دەنگ تێدا کۆکراوە یان کاسێتی وێنەو دەنگ تێدا تۆمار کراو ٥ (ك: أفلام)

**الفِلّینُ**: مادەیەکە مەطاطییە بۆ هاخنین گونجاوە، قەت بۆن ناکا لە توێکڵی دار بەرو و شتی وا بەرهەم دەهێندرێ‌و دەکرێتە تۆپەوانەو دەم هاخنی زەرفی شوشەو شتی وا، بەزۆری دەمی شوشە عەرەق‌و شوشە دەرمانی پێ دەگیرێ.

**فُلان**: بۆ مرۆڤ بەکار دەهێندرێ بۆ ئافرەت دەگوترێ (فُلانة).

**الفُلهَدُ**: کوڕی گەنج‌و قەڵەو لەتەمەنی نزیک پیاوەتی.

**الفُلهودُ**: بەمانا (الفُلهَدُ) دێ.

**فلاه بالسیف فَلواً وفِلاءً**: بەشمشێر لەسەری دا.

**فَلا الصبيَّ**: منداڵەکەی پەروەردە کردو تەربیەتی دادا.

**فَلا الرضیعَ**: شیرەخۆرەکەی لەشیر بڕیەوە

**فَلَی راسَهُ فَلیاً**: سەری دۆزی بۆنەوەی ئەسپێی لێ بکوژێ ٥ زەبری لەسەری داو بڕی.

**فَلَی القومَ**: بە وردی‌و تێڕامانەوە سەرنجی خەڵکەکەی دا.

**فَلَی الأمرَ**: لە ئیشەکە ورد بۆوە ٥ دەگوترێ: (فَلَی الخَبرَ، وفَلَی الرجلَ) لە هەواڵەکە ورد بۆوە پیاوەکەی بەتاقی کردەوە ٥ (فَلَی الشّعرَ) وشە بێگانەو تەم‌و مژاوی ناو شیعرەکەی هێنانە دەر ٥ (فَلَی القضیة) لە ڕوداوەکە ورد بۆوەو سەرنجی دایەو زۆری تێ ڕاما.

**فَلِيَ فلاً**: دابڕا.

**أفلَی القومُ**: خەڵکەکە چوونە دەرەوە بۆ دەشت‌و سارا.

**أفلَی الفَرسُ**: ماینەکە جوانوی بوو ٥ بێچووەکەی کاتی ئەوەی هات لەدایکی دابڕێ‌و رام بکرێ بۆ ئیش.

**أفلَی الصَّبيّ والرَّضِیعَ**: منداڵەکەی لەشیر خواردن بڕیەوە.

**أفلَی القَومَ**: چووە ناو خەڵکەکە.

**فَلّی الشّعرَ أو الثوبَ ونحوهما**: قژەکەی دۆزی کراسەکەی دۆزی بەمەبەستی پاککردنەوەیان لەئەسپێ‌و شتی وا.

**إفتلی القومَ**: زۆر بە وردی سەرنجی خەڵکەکەی دا.

**إفتلی الصبيَّ أو الرضیعَ**: منداڵەکەی پەروەردە کرد یان شیرە خۆرەکەی لەشیر بڕیەوە.

**إفتلی المکانَ**: چاودێری شوێنەکەی کرد.

**تفالی النساءُ**: ئافرەتەکان سەری یەکتریان دۆزی قژی یەکتریان

پشكنى بۆ كوشتنى ئەسپێو شتى وا.

**تفالى فلان:** فلانكەس حەزى لێ بوو سەرى بدۆزن.

**تَفَلَّى فلان:** فلانكەس قژى خۆى دۆزىو لەئەسپێو شتى وا پاكى كردەوە.

**إستفلى فلان:** فلانكەس خۆى دۆزى.

**الفَلاةُ:** دەشتى چۆڵو بێ ئاوەدانى ٥ (ك: فَلا وفلوات).

**الفَلاّيَةُ:** شانەى دەنك ورد كە قژى پێ دابێنێ ئەسپێو شتى وا لەقژ بێنێتە دەر.

**الفِلوُ والفُلوُ:** جاشە كەر يان جوانوى شيرە خۆرە يان تازە لە شير بڕدرابێتەوە.

**الفُلَيَّةُ:** ڕوەكێكى عوشبيە لە چۆڵەوانىو كێو دەڕوێ خۆڕسكە گوڵێكى بۆنخۆشى هەيە دەگوشرێو دەرمانى دەردى پێ دەكرێ.

**الفَمُ:** دەم، دەمى ئادەميزاد بێ يان دەمى گيانلەبەرى تر ٥ جارى واهەيە بۆ زاركى شتو دەراوى شت بەكاردێ ٥ دەگوترێ: (فَم القِربة) دەمى كوندەو مەشكە ٥ (فَمُ الترعە) ڕێڕەوى ئاو دەراوى ئاو ٥ (فَم الوادي) سەرەتاى شيو و دۆڵ.

**فَنجَلَ:** بە هێواشىو لەرزە لەرز ڕۆيى وەكوو ڕۆيشتنى پياوى پيرو لاواز ٥ ڕۆيشت بەشێوەيەك قاچى پان هاويشتن.

**الفِنجالُ:** فنجان، پيالەيەكە لە سوالەتو گەچو شتى وا دروست دەكرێ قاوەو شتى واى تێدا دەخورێتەوە.

**الفنجانُ:** بەمانا (الفنجال) دێ ٥ (ك: فناجين).

**الفِنجانَةُ:** بەمانا (الفنجان) دێ.

**فَنَخَ العَظمَ فَنخاً:** ئێسقانەكەى كوتا بەبێ ئەوەى گۆشتى لەسەر ئێسقانەكەى شەق كردبێ ٥ دەگوترێ: (فَنَخَ رأسَهُ).

**فَنَخَ فلاناً:** فلانكەسى ملكەچو ژێر بار كرد.

**فَنَخَ العقدَ والعزمَ:** وادەو بەڵێنو پەيمانەكەى بەرێوە نەبرد لێى پەشيمان بۆوە.

**فَنَّخَهُ:** بۆزێدە ڕۆيى لەماناى (فَنَخَ) دێ.

**الفنيخ من الرجال:** پياوى شلو شێواو و تەمبەڵ ٥ دەگوترێ: (شيخ فنيخ).

**المِفنَخُ من الرجال:** كەسێك زۆر توندو تيژ بێ لەژێرباركردنى دوژمنەكانى دا، زۆر ڕەقو بێ ڕەحم بێ بەرامبەر بە دوژمنەكانى.

**فَنِـدَ فَنَـداً**: لەبـەر پـیری ڕای لاوازو نەگونجاوی هەبوو ٥ درۆی کرد ٥ شتی پڕو پوچی هێنا.
**أفنَـدَ**: بـەمانا (فَنِـدَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (أفنده الكِبَـرُ) پـیری عـەقڵو هۆشی بردوە ٥ فکرو هۆشی نەماوە.
**افند فلاناً**: فلانکەسی بەدرۆ خستەوە.
**فَنَّـدَ في الـشراب**: خـۆی بەسـەر شەرابەکەدا کۆشمەڵە کرد.
**فَنّدَ فلاناً**: فلانکەسی بەدرۆ خستەوە ٥ دەشگوترێ: (فَنَّـدَ رأي فـلان): ڕای فلانـی بـە لاواز دانـاو بـەدرۆی خستەوە.
**فَنَّدَ الفرسَ**: ئەسپەکەی لاواز کرد.
**إفتَنَـدَ**: لەبـەر پـیری پۆڵـکاوەو ڕای نادروست دەردەبڕێ.
**تَفَنَّـدَ فـلان**: فلانکـەس لـە ڕایـەکی پەشـیمان بـۆوە چـوونکە هەڵـەی کردوە.
**أفندي**: بڕوانە وشەی (أفندي) لە پیتی هەمزەدا.
**الفِنْدُ**: لوتکەی شاخ لـە تۆپـەڵاکی کێو ٥ هـەروا نـاوە بـۆ بـەمرۆڤی کەتـەو زەبـەلاح و تەمبـەڵو قـونگران ٥ دەگـوترێ: دەڵێـی (فِنـد)ە ٥ هـەروا وشـەی (فِنـد) نـاوە بـۆ زەوییـەك بارانی لێ نەبارێ ٥ لقی درەخت.
**المُفَنّدَ**: کەسێـك هەمیشە ڕاو بۆچونی لاواز بێ.
**الفُندق**: ئوتێل ٥ (ك: فنادق).
**الفَنّارُ**: چرایەکی بەشۆقە (بڕۆجکتەر) لەسـەر بـەرزایی بـورجو شـتی وا دادەگیرسێندرێ بۆ شارەزایی کردنی کەشتیو گەمێکان لەناو دەریادا بـۆ ڕێبازی خۆیانو خۆ پاراستنیان لـە ڕێبـازی خەتـەرناك ٥ وشـەی (فنـار) هەڵەو گێڕو گۆڕاوی وشەی (منار)ە.
**فَنسَ**: بڵاو بۆوە.
**الفـانُوسُ**: گیـا سـەعتەر یـان پـنگ ٥ فـانۆس جـۆرە چـرایەکە لەهـەموو لایەکـەوە بـە شوشـە دەورە دراوە بۆئەوەی هەوا کاری تێ نـەکا ٥ (ك: فوانیس).
**الفَنَسُ**: توێکڵی پشتی ماسی.
**فَـنَشَ في الأمـر**: لەکارەکـەدا سـەرکەوتوو نەبوو.
**فَنَشَ عنه**: تێ شکاو لێی گەڕایەوە.
**الفِنطـاسُ**: حـەوزی ئـاوی شـیرین زەرفێـکی گەورەیـە ئـاوی شـیرینی تێدا خـەزن دەکرێ بـەزۆری بۆنـاو کەشـتی بەکاردەهێنـدرێ ٥ هـەروا نـاوە بۆ بەرمیلێـك شلەمەنی تێدا هەڵدەگیرێ ٥ (ك: فناطيس).
**فَنِعَ الرجلُ فَنَعـاً**: پیاوەکە ماڵو سامانی زۆر بوو ٥ سەخی بـوو مـاڵی بەخشی.

فَنِعَ المسك: میسکەکە بۆنی بڵاو بۆوە.
فَنِعَ الرجلُ: پیاوەکە باسی پیاوەتی کرا.
الفونغراف: ڤاوان ٥ تەسجیل.
فَنَقَ فنقاً: خۆشگوزەران بوو.
أفنق فلان: فلانکەس دوای دەست کورتیو هەژاریی ژیانی خۆش بوو گوزەرانی فراوانو پڕ نازو نیعمەت بوو.
فَنَقَهُ: نازو نیعمەتی پێدا.
تَفَنَّقَ: بەمانا (فَنَقَ) دێ.
تَفَنَّقَ في أمر كذا: لە فلان شتدا هەڵوێستو کرداری جوان بوو.
الفنيق من الإبل: حوشترە نێرە بۆ کەڵدانی حوشترە مێینەکان.
الفَنيقَةُ من النساء: ئافرەتی بەناز پەروەردە ٥ تێرەو هۆڕی بچوك.
فَنَكَ في الأمر فُنوكاً: چووە ناو کارەکەوە.
فَنَكَ بالمكان: لە شوێنەکە مایەوەو جێگیر بوو.
أفنكَ في الأمر: بەمانا (فَنَكَ) دێ.
فَنَّكَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَنَكَ) دێ.
الفَنَكُ: جۆرێکە لە ڕێوی، پێستەکەی زۆر بەنرخە، پێستەکەشی هەر پێی دەگوترێ: (فنك).
الفَنيك من الإنسان: ناوقەدی چەناگە ئەو شوێنەی کە دوو شەویلە بەیەك دەگەن ٥ خوار سێبەندە، کلێجە ٥ ئەو شوێنەی هەردوو ڕان بەیەك دەگەن ٥ شوێنی لێ ڕوانی کلك ٥ مادەیەکی ژەهری پاکەوەکەرە.
أفنَت الشجرة: درەختەکە لقو پۆپی کردن.
فَنَّنَ الثوبُ: قوماشەکە هەندێکی شاش چنراوەو هەندێکی پڕ ٥ قوماشەکە ڕزی هەندێکی تەنك بوو هەندێکی ئەستوور.
فَنَّنَ الشَّيْءَ: شتەکەی کردە جۆراو جۆر ٥ دەگوترێ:
فَنَّنَ الكَلامَ: بە جۆرەها شێوە قسەکەی هێناو بردو گۆڕانکاری لە دەربڕینەکەدا کرد.
فَنَّنَ الرأيَ: ڕایەکەی گۆڕی.
إفتَنَّ في القول: لە قسەکردنەکەیدا چەندین گۆڕانکاری کرد.
إفتَنَّ في الخصومَةِ: کێشەکەی گەورە کرد.
تَفَنَّنَ الشَّيْءُ: شتەکە جۆرەکانی زۆر بوون
تَفَنَّنَ في القول: بەجۆرەها شێوە قسەکەی گۆڕی.
تَفَنَّنَ في الأمر: لەکارەکەدا شارەزا بوو.
تَفَنَّنَ في السَّيرِ: لە ڕۆشتنەکەیدا فۆڕتو پێچی کردن.

**إستَفَنَّ فَرَسَهُ**: ئەسپەکەی فێری جۆرەها ڕۆیشتن کرد ٥ بەجۆرەها شێوە ئەسپەکەی ئاژوت.

**الأفنونُ**: لقو پۆپی چڕو پڕی درەخت ٥ جۆرە ئاخاوتنو شێوازی قسە.

**الفــنّ**: فەن، کارێکی نائاسایی ٥ کۆمەڵێک هۆکارن مرۆڤ بەکاریان دەهێنێ بۆ وروژاندنی هەستو سۆزی بینەر یان بیسەر یان هەردووکیان، بەتایبەتی عاتیفەی جەمال وەکوو وێنەو موسیقاو شیعر ٥ دەست ڕەنگینییەکە زەوقو مەوهیبە دەستی باڵایان تێیدا هەیە ٥ (ك: فنون).

**الفِــنُّ**: دەگوترێ: (فلان فِنُّ العلوم) فلانکەس مێملی زانیاریەکانە باش دەزانێ بەدەستیان بێنێو سودیان لێ وەربگرێ.

**الفَنَنُ**: لقی ڕاست هەڵچوو لەدرەخت ٥ (ك: أفنان) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ذَوَاتَا أَفْنَانٍ﴾.

**الفَنّــاءُ**: (شجرة فَنّاءٌ) درەختی لقو پۆپدار.

**الفَنّــانُ**: فەن زان ٥ خاوەنی هەستو سۆزێکی جیاو مەوهیبەیەکی فەن ئامێز وەکوو شاعیرو نووسەرو مۆسیقارو گۆرانی بێژو ئەکتەری شانۆ و ئەو شتانە ٥ کەرەکێوی لەم ڕووەوە کە بە جۆرەها شێوە غاردەداو بازدەدا.

**الفَنّيُّ**: لێزانو کارامە لە پیشەکەیدا.

**الفينــانُ**: درەختی لقو پۆپ دار ٥ دەگوترێ: (شجرة فينان) ٥ (شَعرٌ فينان) قژی درێژ.

**المَفَــنُّ**: شوێنێک فەنی تێدا ئەنجام بدرێ.

**المِفَنُّ**: فەنان.

**فَنَى الشَّيْءُ**: شتەکەی فەوتاو تێدا چوو.

**فَنِــيَ فلان**: فلانکەس پیر بووەو قاچی لەسەر لێوی گۆڕن.

**فَنَى في الشَّيْءِ**: لە شتەکەدا تواوەتەوەو بەتەواوی تێکەڵی بووە ٥ دەگوترێ: (فلان يفنى في عمله) فلانکەس لە پیشەکەیدا دەتوێتەوە بەتەواوی ئاوێتەی دەبێ.

**أفنى الشَّيْءَ**: شتەکەی فەوتاند لەناوی برد.

**فاناه**: لەگەڵی دا مەداری کرد.

**تفــانى القــومُ**: خەڵکەکە یەکتریان بڕیەوە یەکتریان کوشتو بڕ کرد لەشەڕو پێکداداندا.

**تفانى في العمل**: هێزو توانای خۆی لەشتەکەدا خەرج کردو تێکۆشا تا نزیک بوو تێدا بچێ.

**الأفنى**: دەگوترێ: (شعر أفنى) قژی جوانو پرو تێك باهەڵدراو ٥ (رجل أفنى) پیاوێكی قژ درێژو قژ پرە (إمرأة فَنواء) ٥ ئافرەتێكی قژ پرو درێژە.

**الأفنَاءُ من الناس**: كەسانێك كە نەزاندرێ لە چ هۆزو خێڵێكن.

**الفِناءُ**: گۆڕەپانو ساحە لەخانودا یان لەبەردەم خانوودا ٥ (ك: أفنية).

**الفَناةُ**: ترێ ڕێویلكە ٥ جۆرە ترێیەكە.

**فَهَدَ لفلان فَهداً**: پیاوەتی باشی لەگەڵ فلان كرد بە غائیبانە.

**فَهِدَ الرجلُ فَهَداً**: پیاوەكە خەوی زۆر بوو وەكوو فەهد ٥ كەمتەرخەمی كرد لەئەنجامدانی ئەركی سەرشانی.

**فَهِدَ عن الأمر**: لەكارەكە غافڵ بوو.

**الأفهودُ**: گەنجی تازە پێگەیشتوی قەڵەوو جەستە تەواو.

**الفَهدُ**: درندەیەكە لە پێری (السنورية) جەستەی لەنێوان سەگو پڵنگ دایە لە پڵنگ بچوكترە، زۆر ڕق ئەستوورە، زۆر حەزی لە خەوەو زۆر دەنوێ ٥ بەنموونە دەهێندرێتەوە دەگوترێ: (أنوَمُ مِن فَهدٍ) فلان لە درندەی فەهد خەو خۆشترە.

**الفَهدَةُ**: مێینەی (الفهد) ٥ دووپارچە گۆشتن لە سنگی ولاخە بەرزەدا لەلای ڕاستو لای چەپی. ئێسقانێكە بەرز بۆتەوە لە پاشگۆی حوشتر لەڕاستو لەچەپ پێیان دەگوترێ: (فهدتان).

**الفهّادُ**: كەسێك درندەی فەهد ڕابگرێ، یان كەسێك فەهد فێرە ڕاو بكا وای ڕابێنێ نێچیر بگرێو نەیخوا.

**الفَوهَدُ**: دەق بەمانا (الأفهود) دێ.

**أفهر فلان**: فلانكەس قەڵەو بوو گۆشتەكەی گری گرێ وەستا ئەم جۆرە ناشیرینترین شێوەی قەڵەوییە ٥ (أفهرت الدابة) ولاخەكە بەهۆی باری گرانەوە ماندو شەتەك بوو.

**فَهَّرَت الدابة**: بەمانا (أفهرت) دێ.

**تَفَهَّرَ في الكلام**: لەقسەكردن دا درێژەی پێداو نەی بریەوە ٥ دەشگوترێ: (تَفَهَّرَ في المال).

**الفِهرُ**: بەرد، بەردێكی نەرمە ورد دەكرێو دەكرێ بەدەرمان ٥ (ك: أفهار وفهور).

**الفُهرُ**: جەژنی جولەكەكانە دەكەوێتە ڕۆژی چواردەو پانزەی مانگی ئازارەوە.

**الفِهرَةُ**: پارچە بەردێك.

**المفاهِرُ**: گۆشتی سینگ.

**فَهرسَ كتابه**: پێرستی بۆ كتێبەكە كرد.

الفِهرِسُ: کتێبێکە ناوی کتێبی جۆراو جۆری تێدا تۆمار دەکرێ بەگوێرەی یاسایەکی تایبەتی ناوی کتێبو دانەرەکانیان ڕیزبەند دەکرێن ٥ ناوە بۆ پاشکۆیەك لەسەرەتای کتێبەکەوە یان لە کۆتایی دا سەرەباسی ناو کتێبەکەی تێدا تۆمار دەکرێن، هەندێ جار بۆتاقە کتێبێك چەند فەهرەسەیەك دەکرێن وەکوو پێڕستی سەرەباس‌و پێڕستی ناوی جۆراوجۆری ناو کتێبەکە پێڕستی ناوی شوێن‌و شارو هۆزو ئەو شتانە.

الفهرست: بەمانا (الفهرِس) دێ ٥ ناوی کتێبە بەناوبانگەکەی ئیبنو نەدیمیشە.

فَهقَهَ الرجلُ فَهقَهَةً: ماندوو بوو زمانی گیرا، هەندێ پیتی ناو قسەکانی چەند جار دووبارە کردنەوە ٥ لە شوێنێکی بەرزەوە کەوتە خوار.

أفهَقَ الإناءَ وغيره: قاپەکەی پڕ کرد.

تَفَهَّقَ الشَّيْئُ: شتەکە فراوان بوو.

تَفَهَّقَ فلان في الكلام: فلاّنکەس قسەکەی درێژ کردەوەو وشەکانی گوشین‌و خۆی هەڵکێشاو لافو گەزافی لێ دا.

تَفَيهَقَ في كلامه: قسەکانی درێژ کردنەوە زێدەڕەوی کرد لە وشە گوشین‌و زمان بادان‌و قسەی قمبە قمب ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (إن أبغضكم اليّ الثرثارون المُتَفَيْهِقُونَ).

تَفَيهَقَ في مشيه: لە ڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد ٥ دەگوترێ: (هو يتفيهَقُ علينا بمال غيره): ئەو فیزمان بەسەرەوە لێدەدا بەماڵ‌و سامانی خەڵك پۆز لێ دەداو خۆی بەزل دەزانێ.

الفَهْقَةُ: یەکەم فەقەرەی مل بەلای سەرەوە.

الفَيهَقُ من كل شيئ: فراوان‌و گەورە ٥ دەگوترێ: (مفازة فيهق) سارایەکی فراوانە.

فَهِمَهُ فَهماً: جوان لە شتەکە حاڵی بوو ٥ ئامادەباشی تەواوی هەیە بۆ دەرهێنانی حوکم‌و ئاکام.

أفهمه الأمرَ: جوان وێنەی کارەکەی بۆ کێشا.

فَهَّمَهُ الأمرَ: ڕێگای بۆ خۆش کرد کە تێ بگاو فێر ببێ.

تفاهَمَ: وردە وردە پلە بە پلە لەشتەکە حاڵی بوو.

تفاهَمَ القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان هەندێکیانیان فێر کرد.

تَفَهَّمَ الكلامَ: پلە بە پلە لەقسەکە حاڵی بوو.

**إستَفهَمَهُ**: داوای لێ کرد فێری بکا ٥ دەگوترێ: (إستفهم من فلان عن الأمر) داوای لێ کرد شتەکەی بۆ ڕون بکاتەوە.

**الفَهم**: تێگەیشتنو حاڵی بوون لەشت.

**الفَهامة**: بەمانا (الفهم) دێ.

**الفَهّامَـةُ**: بۆ زێدەڕۆیی‌و موبالەغە لەمانای (فهم) دا دێ.

**المفهوم**: کۆمەڵێك صیفاتو تایبەتمەند کە مانایەکی کوللی‌و عام دەگەیەنن بۆ شتێك ٥ واتە: مانای شت.

**فَهَّ فَهّاً وفهاهَةً**: زمانی گیرا، ماندو بوو ٥ بەهۆی ماندو بوونو شتی واوە هەڵەی کرد.

**فَـهَّ الـشَّيْءَ وعنـه**: شتەکەی لەبیر چوو لەشتەکە بێ ئاگا بوو.

**أفَهَّهُ الله**: خودا ماندوی کرد.

**أفَهَّ فلان فلاناً عن حاجته**: فلانکەس فلانکەسی وا لێ کرد پێداویستی خۆی لەبیر بچێتەوە.

**فَهَّهَهُ الله**: بەمانا (أفَهَّهُ) دێ.

**الفاهَةُ**: زمان گیرانو وەستان لەقسە ٥ هەڵە.

**الفَهَّةُ**: بەمانا (الفهاهة) دێ.

**فها فلان فَهواً**: دوای زمان لاری‌و نارەوانی، زمانی ڕەوان بوو.

**فها فؤاد فلان فَهواً**: دڵی فلان کەوتە لێدانی بەپەلە پتە پت ٥ دڵی بەشتەکەوە نووساو هەر خەیاڵی لەوە.

**فها عن الشَّيْ**: هەڵەی لە شتەکەدا کرد.

**أفهى فلان**: فلانکەس ڕایەکەی لاواز بوو ٥ یان ڕای خۆی دەربڕی.

**الأفهاء**: مرۆڤی گێلو بێ عەقڵ.

**فات الأمر فوتاً وفواتاً**: کاتی شتەکە بەسەر چوو ئەنجام نەدرا.

**فات فلان**: فلانکەس ڕۆیی.

**فات الأمر فلاناً**: کارەکە فلانکەسی نەگرتەوە، یان فلان فریای ئیشەکە نەکەوتو لەکیسی چوو.

**فات فلاناً في كذا**: لەو شتەدا پێش فلان کەوت.

**أفاته الأمر**: وایکرد کارەکەی لەکیس بچێ.

**فَوَّتَهُ**: بەمانا (أفاته) دێ.

**افتات في الأمر**: لەکارەکەدا تاکڕەوی کردو لەو بوارەدا بەقسەی کەسی شارەزای نەکرد ٥ دەگوترێ: (إفتات علیه فیه) گوێی بەڕاوێژو ڕای ئەو نەدا لەئیشەکەدا و خۆبەسەری کارەکەی کرد ٥ (فلان لا یفتات علیه) فلانکەس پیاوێکی وەهایە، بەبێ پرسو ڕا بەو کارەکە سەر ناگرێ.

إفتات الكلامَ: قسەکەی هەڵبەست ٥ دەگوترێ: (إفتات عليه القولَ): بەدرۆ قسەی بەدەم ئەوەوە هەڵبەست.

تفاوت الشيئان: ئەو دوو شتە لەمەزندە کردندا جیاوازن.

تفاوت الرجلان: دوو پیاوەکە لە رێزو شکۆمەندیدا جیاوازن وەکوو یەك نین.

تفاوت الخلق: خەڵکەکە هەمویان چوون یەك نینو لێك ناچن.

تَفَوَّتَ الشَّيْئُ: شتەکە جوداواز بوو، شێوا، تێکچو.

تَفَوَّت عليه في الرأي: بەبێ راوێژکردن بەو و خۆبەسەریو تاکڕەوانە کارەکەی کرد.

تَفَوَّت عليه في ماله: تاکڕەوانە هەڵسو کەوتی کرد.

الفَوَاتُ: (موت الفوات) مردنی ناکاو.

الفَوت: بۆشایی نێوان پەنجەکانی دەستو قاچ ٥ دەگوترێ: (جعل الله رزقَهُ فَوت فَمه) خودا ڕزقو ڕۆزی ئەوەندە لێ نزیك کردۆتەوە تۆزێك لەدەمی دوورە کەچی پێی ناگا، بۆی نابێ ٥ دەستی نایگاتێ.

أفاجَ القومُ: خەڵکەکە کۆمەڵ کۆمەڵ ڕۆیشتن.

الفائجُ: فەوجو تاقمو کۆمەڵ.

الفائجة: شیو و دادڕێك لەنێوان دوو تەپۆڵکەی لمبەلاَنو شتی وادا بێ ٥ فەوجو کۆمەڵ.

الفَوجُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ تاقمێك مرۆڤی خێرا ڕۆ ٥ (ك: فؤوج وأفواج).

فاح الشيئُ: بۆنی شتەکە بلاو بۆوە، جا بۆنەکە خۆش بێ یان ناخۆش بێ.

فاحت رائحة الأمر: ناو و ناوبانگی خراپی شتەکە بلاو بۆوە.

فاحت الشَّجَّةُ: برینەکە خوێنی لێ ڕژا خوێنی لێ هات.

أفاح الدَّمَ: خوێنی ڕژاند.

تفاوح الزهرُ: بۆنی خۆشی گوڵەکە بلاو بۆوە.

الفَوحُ: بلاوبوونەوەی بۆن ٥ (فَوح الحَرّ) جەنگەی گەرما.

فاخت ريح المسك: بۆنی میسکەکە بلاو بۆوە بەجۆرێك خەریکە هەناسە بگرێ.

فاخت الريحُ: ڕەشەبایەکە هەڵی کردو هاژەی دێ.

فاد المالُ فَوداً: ماڵەکە بۆ خاوەنەکەی چەسپا.

أفاد فلان المالَ: فلانکەس ماڵو سامانی کۆکردەوە ٥ (أفاد فلاناً المالَ): ماڵەکەی دا بە فلانکەس.

**تَفَوَّدَ الوَعِلُ فوق الجبل:** گا کێویەکە چووە سەر لوتکەی شاخەکە.

**الفائدة:** قازانج ٥ ماڵی چەسپاو بۆ خاوەنی ٥ هەر سودو قازانجێك مادی بێ یان مەعنەوی لە زانیارییەوە یان لە کردارو تێکۆشانەوە یان بەهۆی ماڵێکەوە دەستە بەربێ ٥ قازانجی پەیدابوو لەماڵو سامان لە ماوەیەکی دیاریکراو بەنرخێکی دیاری کراو ٥ (ك: فوائد).

**الفَودُ:** لاسەر، پشت گوێچکە ٥ ئەو موانەی لە پشت گوێچکەوە لە لاسەر ڕواون ٥ لاجانگ ٥ دەگوترێ: (حَلّ الشَّيبُ بفوديه) موی سپی لەلاجانگی پەیدا بوون ٥ (لفلان فودان) فلانکەس زولفی بەرداونەوە ٥ لاشیۆ ٥ دەگوترێ: (نزلَ القوم بين فودي الوادي) خەڵکەکە لە نێوان ئەمبەرەو بەری شیوەکەدا جێگیر بوون ٥ هەروا بەمانا لابار، تای باری ولاخ هاتوە ٥ دەگوترێ: (قَعَدَ بين الفودين) لە نێوان دوو تای باردا دانیشت (جعل الصحيفة فودين) پەڕە کاغەزەکەی نوشتاندەوە کردی بەدوولا.

**المِفواد:** بەسوودو قازانج ٥ خاوەن سوود.

**فارَ الماءُ فَوراً وفَوَراناً:** ئاوەکە بەتەوژم هەڵقوڵی لەزەوی ٥ فیچقەی کرد.

**فار القِدرُ:** مەنجەڵەکە کوڵیو شلەمەنی ناوی کەوتە جمبوشو قڵپە قڵپ.

**فارت النار:** ئاگرەکەی بڵێسەی ساندو کڵپەی کرد.

**فار غضبُهُ:** ڕقی هەڵسا.

**فار العِرقُ:** ڕەگەکە هاوسا ٥ فش بوو.

**فار المِسكُ:** بۆنی میسکەکە بڵاو بۆوە.

**أفار القِدرَ:** وای کرد مەنجەڵەکە بکوڵێو بکەوێتە قڵپە قڵپ.

**فَوَّرَ:** هێنایە کوڵانو قڵپە قڵپ.

**الفارُ:** ماسولکەی ئادەمیزاد.

**الفارةُ:** (فارة المسك) بۆنی میسك ٥ قوتوی میسك.

**الفَورُ:** سەرەتای کات ٥ دەگوترێ: (أتيت من فوري) (وفعلت ذلك من فوري، وفوراً وفور وصولي) واتە دەست لە عاستو خێرا یەکسەرو بێ ڕاوەستان.

**الفَورُ من الحَرّ:** جەنگەی گەرما.

***الفَورُ من الشفق:*** *باقی ماندەی سورایی لە ئاسۆی ئاسمان دوای ئاوابوونی خۆر.*

**الفُورُ**: ئاسك ◦ دەگوترێ: (ما أفعل ذلك مـالألأت الفُـورُ) ئـەوە ناكـەم هـەتا ئاسـك گـوێ نەلـەقێنێ واتـە: قـەت نایکەم.

**الفَـورَةُ**: جەنگـەی گـەرما ◦ كۆمەڵـگای ئـــادەمیزاد ◦ ســــەرەتای ڕۆژ ◦ دەگوترێ: (أتیتهم من فورة النهـار) ◦ هەروا ناوە بۆ سەرانسەری كێو.

**الفَوّارُ**: شتێـك زۆر هەڵقوڵێ.

**الفَوّارة من الماء**: سەرچاوەی ئـاو ◦ ئـەو كەفـو بەڵخەی كـە مەنجـەڵ لـەكاتی كوڵینو قڵپە قڵپ دا دەری دەهاوێ ◦ حەوزو فرووێلكی كۆتایی ڕان.

**الفیار**: یەكێـكە لـەو ئاسنانەی دەوری زوبانی لاتەرازوو دەدا.

**الفیرةُ**: خورماو ڕۆن كە دروست دەكرێ بۆ ئافرەتی زەیستان.

**الفَیّور مـن الرجـال**: ئـادەمیزادی تونـد تەبیاتو زوو هەڵچوو.

**فاز فلان بالخیر فوزاً ومفازاً ومفازَةً**: فلانكەس زەفەری بە خێرو قازانج برد.

**فاز من الشرّ**: لەشەڕو نەگبـەتی ڕزگاری بوو.

**فـــاز قِـدح المیـسر**: قـوداحی قومارەكـەی بردەوە.

**أفازه الله بكذا**: خودا بەو خێرو بێرەی گەیاند.

**فَــوَّزَ الرجـلُ**: پیاوەكـە چـووە ســاراو چــــۆڵەوانییەوە ◦ كەوتـــــەڕێ ◦ بەهیلاك چوو.

**تَفَوَّزَ**: كەوتەڕێ، سەفەری كرد.

**الفائزة**: دەگوترێ: (فاز بفائزة) شتێـكی دەسكەوت كە بووە هـۆی دڵخۆشو مــراز حاصـل بـوونی، خـــەڵاتی وەرگرت.

**الفازة**: چەتر كەلەسەر عەمودێـك یـان دوو عەمود بێ.

**المَفاز**: ساراو چۆڵەوانی ◦ ڕزگار بـوون لە ناڕەحەتی.

**المفــازة**: بـە مـراز گەیـشتنو خـەڵات وەرگـــرتن ◦ ڕزگـــار بـــوون لـــە ناخۆشیو چورتم ◦ ساراو چۆڵەوانی ◦ شـوێنی خەتـەرناكو ترسـناك ◦ (ك: مفاوز).

**فاوضــه في الأمــر مفاوضــة**: دانوسـانی لەگــەڵدا كــرد بۆئــەوەی بگەنـــە ڕێــــكەوتنو ئاســـایی كردنــــەوەی بارودۆخ.

**فاضــه في المــال**: هاوبەشــی كــرد لــە وەبەرهێنانی ماڵەكەدا.

**فَوَّضَ الأمرَ الیه**: كارەكەی دایـە دەست ئـەو چۆنی بـەڕێوە دەبـا بـەڕێوەی بەرێ.

فَوَّضت المرأةُ زوجها: ئافرەتەکە بەبێ مارەیی شوی کرد، مارەیی لە مێردەکەی داوانەکرد.

تفاوضا: هەریەك لەو دووانە دانوسانی لەگەڵ بەرامبەرەکەی کرد.

الفَوضى: (قوم فوضى) گەلی بێ سەرۆكو رابەر ٥ شاعیری عەرەب دەڵێ:

لا يصلح الناسَ فوضىً لا سُراة لهم
ولا سُراة إذا جهالهم سادوا

دەشگوترێ: (مالُهم ومَتاعُهم فوضى بينهم) ماڵو کاڵایان هاوبەشە هەریەکەیان بۆخۆی دەستی تێوەردەدا.

الفَوضَةُ: لوغەتێکە لە (المفاوضة).

الفَوضَوِيّة: تاقمێکن داوای ئەوە دەکەن حوکمەت نەبێو هەرکەسە بۆخۆی ئازاد بێ چۆن کاردەکاو لەگەڵ کێ عەلاقەو پەیوەندی دەبەستێ.

المُفاوَضَة: دانوسانو بیرو ڕا گۆڕینەوەیە لەگەڵ قسە ڕۆیشتوو کاربەدەستان بۆئەوەی بگەنە ڕێك کەوتنو دامەزراندنی ژیانی ئاشتەوایی.

(شركة المفاوضة) لەبواری فیقهو قانون دا هاوبەشی نێوان دووکەسو زیاترە کە لایەنەکان یەکسان بن لەبارەی سامانو کارکردن تێیدا.

المُفَوَّضُ: (الوزير المفوّض) مووەظەفێکی سیاسییە تەمسیلی وڵاتەکەی دەکا لە پایتەختی وڵاتێکی بێگانەدا ٥ پلەی لەخوار پلەی سەفیرەوەیەو لە ژوور پلەی جێبەجێکارەوەیە.

المُفَوَّضيّة: شوێنو بارەگای وەزیری شت پێ سپێردراو لە وڵاتی بێگانەدا.

فَوَّطَهُ: فۆتەی کردە بەری.

الفوطة: دەرپێیەکی کورتو ڕەختەو ئەستوورە لە پێ دەکرێ، نێوان ناوكو ئەژنۆی داپۆشی کاتی خۆی لە وڵاتی سندەوە دەهێندرا ٥ دەرپێیەکە لەسەر پۆشاکەوە لە پێ دەکرێ بۆئەوەی لەکاتی ئیشکردن دا جلەکانی پیس نەبێ ٥ خاولیەك دەستو دەمو چاوی پێ دەسڕدرێتەوە ٥ یان لەسەر سنگو ئەژنۆ دادەنرێ لەکاتی نان خواردن دا وەکوو بەرهەڵبێنە وایە بۆئەوەی پۆشاکەکانی چەورو شتی وا نەبن.

الفوطي: لەبواری ڕەنگ دا ئەوەیە شینو تەڵخ بێ.

الفُوَطِيّ: ئەو کەسەی فوط دەفرۆشێ یان دروستی دەکا.

**الفَوّاط**: کەسێك قوماشی فوط دەچنی یان فوط دەفرۆشێ.

**فاظت نفسُهُ**: مرد ○ دەگوترێ: (فاظَ الرجلُ) پیاوەکە مرد.

**فاعَ الطيبُ**: بۆنە خۆشەکە بڵاو بۆوە.

**الفَوعَةُ**: بۆنی خۆش ○ کوشندەی ژەهر ○ سەرەتای گەنجی ○ سەرەتای ڕۆژ ○ سەرەتای شەو.

**فافَ بە فَوفاً**: قەراخی نینۆکی قامکە گەورەی نووساند بە پێشەوەی نینۆکی قامکە شادەو گوتی ئەوەندۆکەشت نادەمێ بەتەمای هیچ مەبە.

**الفُوفُ**: ئەو دەنکە سپییەی لەناو دەنکە خورمادایە کە لەوەوە ئەمامە خورما شین دەبێ‌و دەڕوێ ○ ئەو توێکڵە تەنکەی بەسەر دەنکە خورماکەوەیە ○ پۆشاکێکی تەنکی خەتخەتە ○ پارچە لۆکە.

**المُفوّفُ**: (بُرد مُفَوّفٌ) عەبایەکی تەنکی خەتخەتە.

**فاق الناقةُ وغيرها**: حوشترەکە شیر لە گوانیدا کۆ بۆوە دوای دۆشینی.

**فاق فلان بنفسه عند الموت**: فلانکەس هەناسەی لێ براو مرد ○ (فاقَ الشَّيئَ فَوقاً) چووە سەر شتەکە.

**فاق أصحابَه**: بەسەر هاوەڵەکانیدا بالادەست بوو لەوان چاکترو ڕێزدار تر بوو.

**فاق السهمَ**: تیرەکەی لەکەوانەکەدا ڕەپێش کرد بۆ هاویشتن ○ شوێنی لێ شەتەکدانی ژێی کەوانەکەو دابڕاوی شوێن تیرەکە شکا.

**فوِق السهمُ فَوَقاً**: شوێنی دابڕانی تیرەکە کەمێك خواری تێکەوت.

**أفاق فلان**: فلانکەس وەهۆش خۆ هاتەوە ○ دەگوترێ (أفاق السكران من سكره) ○ (والمجنون من جنونه).

**أفاق الزمانُ**: ڕۆژگار دوای گرانی هەرزانی بەخۆیەوە بینی.

**أفاق عن فلان النُّعَاسُ**: فلانکەس هەنۆزەکەی لە کۆڵ بۆوە.

**فَوّقَ السَّهمَ**: ڕێڕەوی بۆ تیرەکە لە پشتی کەوانەکە دروست کرد.

**فَوّقَ الرضيعَ**: قوم قوم شیری دا بەشیرەخۆرەکە.

**فَوّقَ فلاناً على غيره**: فلانکەسی بەسەر کەسانی دیکەدا پاساودا.

**إفتاق الرجلُ**: پیاوەکە هەژار کەوت.

**إنفاقَ السهمُ**: تیرەکە شوێن دابەستن‌و ڕەپێش کردنەکەی شکا.

**إنفاقت الدابة**: وڵاخەکە کزو لاواز بوو ○ فەوتا تێداچوو.

**تَفَوّقَ على قومه**: بەسەر گەلەکەی دا بالادەست بوو، پلەو پایەی لەوان بەرزتر بوو.

**تَفَـوَّقَ شـرابَهُ**: شـەرابەکەی قـوم قـوم خواردەوە.

**تَفَوَّقَ الأمرَ**: کارەکەی بەچەند وەجبەو لەکاتی جیاجیادا ئەنجام دا.

**إستَفاق**: بەمانا (أفاقَ) دێ.

**الفائق**: باش‌و نایاب لە هەرشتێـك بێ ٥ شوێنی بەیـەك گەیشتنی فەقـەرەی سەر بەعەمودی فەقەری‌و ئێسقانی سەر ٥ مرۆڤی جیاواز لە خەڵك.

**الفاقة**: هەژاری‌و ئاتاجی.

**الفَواقُ**: کـاتی نێـوان دووجار دۆشـینی ئاژەڵی شیردەر ٥ ئـەو کاتـەی ئـاژەڵ دۆشـەکە گوانەکـە دەگـرێ‌و شـیرەکە دادەچۆڕێنێ‌و شیری تر دێتـەوە نـاو گوانەکـە ٥ مۆڵەتـدان‌و پـشودان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنظُرُ هَؤُلَاء إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ﴾.

**الفُـواقُ**: بـەمانا (الفَـواقُ) دێ ٥ وێـکهاتنەوەیەکی کـوت‌و پڕییـە توشی پەردەی نێوان دەبێ‌و پرخەو لرخەیـەك دەخـولقێنێ‌و دوای کەمێـك دەبـڕێ ٥ ئـەو حاڵەتـەی توشـی ئـەو کەسـە دەبـێ کـە لـە گیانەڵادایـە ٥ ئـەو هەوایـەی دێتـە دەر لـەکاتی هەناسـەدان‌و پرخەکردنی یەك لەدوای یەك.

**فَوقَ**: زەرفی مەکانەو بەرزی دەگەیـەنێ ٥ دەگوترێ: (السَّماءُ فوق الأرض) ئاسمان لە ژوور زەوییەوەیە.

**الفُوقُ**: کەرەت‌و جار ٥ لێزانـی‌و فـەن لـە کەلام دا ٥ بۆشایی دەم‌و کونی دەم ٥ لە کـەوان دا ئـەو شـوێنەی تیرەکـەی لێ قایم دەکرێ‌و ڕەپێش دەکـرێ بـۆ هاویـشتن ٥ شـانس‌و بـەخت ٥ دەگوترێ: (هو أعلاهم فُوقًا).

**الفُوقـة**: (فوقـة الـسهم) بـەمانا شـوێنی چەسپاندن‌و ڕەپێش کردنـی تـیر لـە کەوان دا دێ.

**الفيقـة**: ئـەو شـیرەی لـەگوان دا کۆدەبێتـەوە لـە نێـوان دووکـاتی دۆشین دا ٥ (ك: أفاويق).

**فيقة الضحى**: سەرەتای چێشتەنگاو.

**الأفاويق**: گەواڵە هەور کەسات دواسات بـارانی لێ ببـارێ ٥ زۆربـەی شـەو ٥ دەگوترێ: (خرجوا بعد أفاويق الليل) دوای تێپـەڕبوونی زۆربـەی شـەو چوونە دەر.

**المُفوِّقُ**: خواردن‌و خواردنەوەی کەم: کە مـرۆڤ هەنـدێ کـات بۆخـۆی دەستەبەر دەکا.

**الفـول**: ڕوەکێـکی عوشـبییە گوڵـەکانی سـپین بـۆنی خۆشـی هەیـە، پـایز

دەچـێنرێو بـەهار پـێ دەگـا ٥ دەکرێتە بژێوی مرۆڤو ئاژەڵ.

**الفَوَّالُ**: فولفرۆش.

**الفُومة**: گوڵەگەنمو جۆ ٥ سەلکە سیر ٥ شتێـکی کـەمو بـچوك بەدووپەنجـە هەڵی دەگری.

**فاهَ بـالقولِ فوهـاً**: دانـی نـا بەقسەکەداو گوتی ٥ دەگوترێ: (هذا أمر ما فُهتُ به) ئەمە قسەیەکەو شتێکە بەدەمی منـدا نەهاتووەو نەم گوتووە.

**فَوِهَ فَوهاً**: دەمی گەورە بوو ٥ لێوی لێـك بلاو بوونو دەم کراوە بوو، زار قز بوو ٥ (فهو أفوه وهي فوهاء).

**فاهاه**: قسەی لەگەڵ دا کردو شانازی بەسەردا کرد.

**فَـوَّهَ الطعـامَ أو الـشرابَ**: خـواردنو خواردنەوەکـەی بـە داو و دەرمـان ڕازاندەوەو خۆشی کرد.

**فَـوَّهَ الثـوبَ**: قوماشـەکەی بـە ڕەنگـی وەرگیراو لـە ڕەنگـی (الفَـوَّه) ڕەنـگ کرد.

**فَوَّهَ الشَّيْءَ**: دەمی شتەکەی گەورە کرد.

**تَفَاوَهَ القومُ**: خەڵکەکە قسەیان کرد.

**تَفَوَّهَ بـالکلام**: دەمی کرایـەوە بەقـسەو ناخاوتن ٥ دەڵێی: (ما تفوَهـت بهـذا الأمـر) مـن لـەم ئیـشە قـسەیەکم نەکردووە.

**تَفَـوَّهَ المکـان**: لـەدەرگاو زارکـی شوێنەکەوە چووە ناوی.

**الفـاهُ**: مرۆڤـی زار بـەهاوار، هەرچـی لەدڵیـدا بـێ دەیڵـێ ٥ هیـچی تـێ ناوەستێ.

**الفُوهُ**: دەم ٥ (ك: أفواه) ٥ بۆنی خۆش ٥ داو و دەرمـان کـە خـواردنی پـێ دەڕازێنرێتەوە.

**الفَوهـاء**: دەم زلو پـان ٥ دەگـوترێ: (فرس فوهاء) (وبئـر فوهـاء) (وطعنـة فوهاء).

**الفُـوَّه**: ڕوەکێـکی تەمـەن درێـژە لـە کـەنارەکانی دەریـای ناوەڕاسـت دەڕوێ، لاسـکەکەی سـوورە بـەرو تۆوەکـەی سـوورە، مادەیـەکی لێ دەردەهێنرێ بەکاردەهێنـدرێ بـۆ بۆیەکردنی ئاوریشمو خوری.

**الفُوَّهَةُ من کل شيئ**: دەمو زارکی شت ٥ سـەرەتای شـت ٥ (ك: فُوَّهـات) دەگوترێ: (قَعَدَ علی فُوَّهـة الطریـق) لەسەرەتای ڕێگاکە دانیشت ٥ هەروا وشـەی (الفُوَّهـة) بـەمانا قـسەو قـسەلۆکی خەڵـك دێ، دەگـوترێ: (هو یخاف فُوَّهة الناس).

**المُفَوَّه**: زۆر بلێو چەقەچەناو.

**فاءَ فَیئاً**: گەڕایەوە ٥ دەگوترێ: (فاء عـن غـضبه) لـە ڕق هەڵـساویەکەی وازی

هێناو گەڕایەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆی.

**فاءَ الظِلُّ:** سێبەرەکە لەلای خۆرئاواوە گەڕایەوە بۆلای خۆرهەڵات.

**فاءت الشجرةُ:** درەختەکە سێبەرەکەی بڵاو بۆوە.

**فاء على ذي الرحم:** سۆزی بۆ خزمەکانی جوڵا.

**فاء الرجلُ الى إمرأته:** پیاوەکە کەفارەتی سوێندەکەی داو چووە لای ژنەکەی.

**أفاءَ الظِلُّ:** سێبەرەکە بڵاو بۆوە ، ئەم حاڵەتە لەکاتی لادانی خۆر لە هێڵی ناوەڕاستو ئیستیوادا دەبێ.

**أفاء الأمرَ:** کارەکەی گێڕایەوە.

**أفاء عليه الخيرَ:** خێرو بێری بۆ هێنا.

**أفاء عليه المالَ:** ماڵو سامانەکەی بۆ کرد بە فەیئو و بەخشش.

**أفاء فلاناً على الأمر:** کابرا کارێکی ویست ئەو بردیەسەر کارێکی تر.

**أفاءت الرياح الزرعَ:** ڕەشەباکە کشتوکاڵەکەی هێنایە کەرووێشکە کردنو هەژان ، دەشگوترێ:

**فَيَّأت المرأةُ شعرها:** ئافرەتەکە قژەکانی ڕاژاندن بۆ نازو فیزو بەخۆ نازین.

**تَفَيَّأت الشجرةُ:** بەمانا (فَيَّأت) دێ.

**تَفَيَّأ فلان على الشجرة وبالشجرة:** فلانکەس چووە ژێر سێبەری درەختەکە.

**تَفَيَّأ الظِلالُ:** سێبەرەکان جێ گۆڕکێیان کرد، لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات هاتن ، قورئان دەفەرموێ: ﴿يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِلَّهِ﴾.

**تَفَيَّأ الظلُّ:** سێبەرەکە دوای نیوەڕۆ لەلای خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات هاتەوە.

**تَفَيَّأت المرأةُ لزوجها:** ئافرەتەکە نازی بەسەر مێردەکەیدا کرد.

**تَفَيَّأ فلان الأخبارَ:** فلانکەس هەوڵی زانینی هەواڵی دا ویستی بزانێ هەواڵەکان چینو چی نین.

**إستفاء:** گەڕایەوە.

**إستفاءَ المالَ:** ماڵەکەی بەشێوەی عەطاو بەخشش وەرگرت.

**إستفاءَ الأخبارَ:** هەوڵی بەدەست هێنانی هەواڵەکانی دا.

**الفَيْءُ:** سێبەری دوا لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان ، باجو خەراج ، دەستکەوتی بێ شەڕو جەنگ.

**الفَيْئَةُ:** گەڕانەوەیەك؛ دەگوترێ: (فاء الى الله فيئة حسنة) تۆبەی کردو بەشێوەیەکی باش گەڕایەوەو بەتەواوی وازی لە تاوانو سەرپێچی هێنا ، کاتو ماوە ، دەگوترێ: (جاء بعد فيئة) پاش ماوەیەك هات ،

كۆمەڵە باڵندە كە ڕەو دەكەن بۆ وڵاتی ترو لەوەرزی تایبەتی دا دێنەوە زێدی خۆیان.

**المَفاءُ**: هەرماڵو سامانێك بەشێوەی فەیئو بەخشش وەربگیرێ.

**المُفيءُ**: ئەو كەسەی ماڵی بەشێوەی فەیئو بەخشش وەرگرتبێ.

**الفيتامين**: مادەیەكی عوضوی جۆراوجۆرە بەكەمی لە خۆراكەكاندا دەست دەكەوێ، زۆر پێویستە بۆ تەواوبوونی بژێوو دەستەبەر بوونی نیشاتی زیندویەتی.

**الفيتو**: مافی مەنع كردنو نەهێشتن ٥ ئێستا بەو مافە ڕەسمییە دەگوترێ كە نەتەوە یەككرتووەكان داویەتی بە پێنج وڵاتی زلهێز (ئەمریكا - ڕوسیا – بەریتانیا – چین – فەرەنسا) كە دەتوانن بڕیاری مەجلیسی ئەمن ڕابگرنو نەهێڵن تەنفیز بكرێ.

**فاج فَيجاً**: بڵاو بۆوە.

**فاجت الدابّة برجليها**: وڵاخەكە جووتی وەشاند.

**الفائجُ**: زەوی تەختی نێوان دوو بەرزایی ٥ (ك: فوائج).

**الفَيجُ**: كۆمەڵی ئادەمیزاد ٥ هەور (ك: فيوج).

**فاح المِسكُ فَيحاً وفَيحاناً**: میسكەكە بۆنی بڵاو بۆوە ٥ دەگوترێ: (فاحت رائحة المسك).

**فاحت الشجّةُ**: برینەكە خوێنی لێ هات، خوێنی فڕێ دا.

**فاح الحَرُّ**: گەرما پەرەی ستاند بەهێز بوو

**فاح القِدرُ**: مەنجەڵەكە كوڵی.

**فاح الرّبيعُ**: بەهار هاتو پڕ گژوگیاو دانەوێڵە بوو.

**فاحت البلاد**: وڵات هەرزانی تێكەوت.

**فاح فَيحاً**: بڵاو بۆوە ٥ دەگوترێ: (فاح المكان وفاح البحرُ، وفاحت المفازة، وفاحت الدار، وفاحت الروضة) ٥ (فهو افيح وهي فيحاء) ٥ (ك: فِيحٌ).

**أفاحَ الدمَ**: خوێنەكەی ڕژاند.

**أفاح القِدرَ**: مەنجەڵەكەی وای كرد بكوڵێ.

**أفاح فلان**: فلانكەس خۆی فێنك كردەوە ٥ دەگوترێ:

**افِح عَنكَ من حَرّ الظّهيرة**: بمێنەوە تۆزێك هاڵاوی گەرمای نیوەڕۆ لە خۆت دەركەو خۆت فێنك بكەرەوە.

**فَيَّحَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بڵاو كردەوە بەزۆریو بەفراوانی.

مفصّلة
الفم
فلك
الإفليكان
انف أفطس
فانوس
مفصد
فنجان
فقع الذئب
فلك البروج
فنار
فلقة
فاكورة
فطر زراعي
فطر
فوفل
فول
فصلة
فكتوريا ملكية
فلفل
فليفلة
فوّة
فومي اسود
فاصوليا
فقمة
فظ
فاوانيا
فوشيا
مثلثات الفلوق
فلكسرة
أفعى
فيلجة
فلوس السمك
فنك
فنطيسة الخنزير
فيل
فهد

**الفيحـاءُ**: حـەڵواو خواردنێـکە داو و دەرمـانی تێـدا بـێ ◦ نازنـاوی شاری بەصرەیە ◦ دەگوترێ: (بصرة فيحاء) هەروا نازناوی دیمەشق‌و تەرابلوسی شامیشە.

**الفَیّـاحُ**: (رجـل فَیّـاح) پیاوێـکی بەخشندەو سەخییە، ماڵو سامانی خۆی بەزۆری دەبەخشێ.

**الفَیّاحَـةُ**: دەگـوترێ: (ناقـة فَیّاحـة) حوشترێکی گوان گەورەو شیر زۆرە.

**فادت لفلان فائدة فَیداً**: ماڵو سامانەکە بۆ فلانکەس چەسپا.

**فادَ فلان**: فلانکەس لارو لەنجەی کرد.

**فـادَ فـلان الـشَّیْءَ**: فلانکـەس ترسـی لـە شتەکە بوو لێی لادا.

**فادت المرأةُ الطیبَ**: ئافرەتەکە بۆنەکەی لەناو ئاوەکەدا هێناو برد بۆنـەوەی بتوێتەوە.

**فادَ الزعفرانَ**: زەعفەرانەکەی ورد کـردو بەناو تەڕی کرد.

**أفـاد فـلان علمـاً أو مـالاً**: فلانکـەس قازانجی زانیاری یان ماڵو سامانی کرد.

**أفادَ فلاناً علماً أو مالاً**: سودی زانیاری یان سامانی بە فلانکەس گەیاند.

**أفـاد المَلَّـةَ عـن الخبـز**: سووتوەکە یـان تەپ‌وتۆزەکەی لە نانەکە کردەوە ◦ تەکاندی.

**تفایـدا بالمال أو بـالعلم**: هەریـەك لـەو دووانە سودو قازانجی ماڵ‌و زانیاری بەوی تریان گەیاند.

**تَفَیَّدَ**: خـۆی باداو لارو لەنجـەی کـرد ◦ لەشتێـك ترساو خۆی لێ لادا.

**إستفاد مالاً**: ماڵو سامانی پەیدا کرد.

**الفائدة**: بڕوانە (فَوَدَ).

**الفَیـدُ**: گـەڵای زەعفـەران ◦ تـواوەی زەعفـەران ◦ ئـەو موانـەی بەسـەر لچی وڵاخەوەن.

**الفَیّـادُ**: لارو لەنجەکـەر ◦ کەسێـك هەرچـی بەردەسـتی بکـەوێ لـولی دەداو هەڵی دەگرێ.

**الفیروز**: بەردێکی گرانبەهایەو شەفاف نیە، بەڕەنگی شین‌و پیرۆزەیی شێوە ڕەنـگ ئاسمـانی یـان مەیلـەو سـەوز دەناسـرێ‌و دەکـرێ بەخـشڵ‌و خـۆی پێ دەڕازێندرێتـەوە (لـون فـیروزي) ڕەنگـی شـینی پیرۆزەیـی شـینی مـەیلەو سەوز.

**الفـیروس**: فـایرۆس، کائینێـکی زۆر بچوکەو بـە میکرۆسکۆب‌و ئامێری زۆر وردبـین نـەبێ نابینـدرێ‌و هەندێ نەخۆشی بڵاو دەکاتەوە.

**فاش الرجلُ فیشاً**: پیاوەکە شانازی کـردو خـۆی هەڵنایـەوەو هیچیـشی نـەبوو.

**فاش فلان فيشوشةً**: فلانكەس لاواز بوو ئەندامەكانی جەستەی شل‌و بێ هێز بوون.

**فايش فلان**: فلانكەس زۆری هەڕەشەو گوڕەشە كرد لەشەڕدا بەلام ڕاستی نەكرد.

**فايش فلاناً**: شانازی كرد بەسەر فلان داو بە ناحەق خۆی هەڵكێشا.

**فَيَّشَ عن الأمر**: لەكارەكە گەڕایەوە و ترسنۆك بوو.

**تفايَشَ القومُ**: خەڵكەكە شانازییان كردو خۆیان هەڵكێشاو لافی زۆریان لێ دا.

**تَفَيَّشَ عنه**: لەشتەكە هەڵگەڕایەوەو نەیتوانی ئەنجامی بدا.

**تَفَيَّشَ الشَّيْءَ**: لافی شتێكی لێ دا كە نەیبوو.

**الفَيُوشُ من الرجال**: پیاوێك لافی شتێك لێ بداو وایش نەبێ.

**الفَيَّاشُ**: خۆهەڵكێش‌و لاف لێدەر بەشتێك كە نیەتی ٥ دەگوترێ: (رجل فَيَّاش) پیاوێكە شمشالی فشەبازی لێ دەداو بەناحەق خۆی هەڵدەكێشێ.

**فاصَ من الأمر فَيصاً**: لەكارەكە لایدا ٥ دەگوترێ: (ما إستَطَعْتُ أن أفيص منه) نەمتوانی خۆمی لێ لابدەم.

**أفاصَ الصيدُ من يده**: نێچیرەكە لەدەستی ڕزگاری بوو لەدەستی بەرەڵابوو.

**فاضَ الماءُ فَيضاً وفيوضاً وفيضاناً**: ئاوەكە زۆر بوو بووبە لافاو و هەڵسا ٥ دەگوترێ: (فاض النهر وفاض السيل) ڕووبارەكە هەڵسا ٥ لافاوەكە هەڵسا.

**فاض الإناءُ**: قاپەكە پڕ بوو هەتا لە هەرچوار لاوە سەر ڕێژی كرد.

**فاضت عينه**: چاوەكەی فرمێسكی ڕشت.

**فاض الشَّيْئ**: شتەكە زۆر بوو ٥ دەگوترێ: (فاض الخيرُ) خێرو بێر زۆر بوو.

**فاض الخبرُ**: هەواڵەكە بلاو بۆوە.

**فاض صدره بالسر فَيضاً**: سنگی پڕ بوو لە نهێنی‌و نەیتوانی چیدی بیانشارێتەوە.

**فاض عليه الدِرعُ**: زرێیەكە بۆی گەورە بوو فراوان بوو.

**أفاضَ القوم في الحديث**: خەڵكەكە درێژەیان بە قسەكان دا.

**أفاضَ بالشيئ**: شتەكەی هەڵدا ٥ فڕێی دا.

**أفاضَ اللهُ الخيرَ**: خودا خێرو بێری زۆر كرد.

**أفاضَ الإناءَ**: قاپەكەی پڕ كرد تا لەهەر چوار لاوە سەر ڕێژی كرد.

**أفاضَ الماء على جسده**: ئاوی بەخۆی دا كرد.

**أفـاضَ دَمْعَـهُ**: فرمێسكی ڕشـتن ◦ دەشكوترێ:

**أفاضَت العين الدَّمْعَ**: چاو فرمێسكی ڕژاند.

**إستفاض الخَبَرُ**: هەواڵەكە بڵاو بۆوە.

**إستفاض القومُ في الحديث**: خەڵكەكە درێژەیان بە قسەكانیان دا.

**إستفاض الوادي شجراً**: دۆڵەكە پڕبوو لەدرەخت.

**الإفاضة**: هەڵڕژانی حاجیانە لەكێوی عەرەفاتـەوە بـۆ دەشـتی مینـا ◦ (طواف الإفاضة) تەوافكردنی ڕۆژی جـەژنی قوربانـە كـە حـاجی ڕۆژی جەژن دوای دابەزینی لەعەرەفاتەوە تەوافی كەعبە دەكا.

**الفائض**: زێدە سود كـە سودخۆر وەری دەگـرێ بـەهۆی سـەرمایەكەیەوە كەلای كابرای پارە وەرگرە.

**الفـيض**: زۆرو زەبەنـدە ◦ دەگـوترێ: (أعطانا غيضاً من فيض) بەشێكی كەمی لەزۆر پێداین.

**رَجُـل فَـيْض**: پیاوێـكی خـاوەن خێـرو بێرەو پیاوەتی زۆرە.

**الفيـضان**: هەڵسانی ڕوبـارو كەوتنـە جونبوشـی بـەهۆی هاتنـەوە سـەری چەند جۆگاو ڕوبارێك.

**الفُيُوضُ**: پانو پـۆڕ ◦ دەگـوترێ: (دِرْع فيوض) زرێیەكی فراوانە.

**الفَيَّـاض**: بـۆ زێـدەڕۆیی لـەمانای (الفـائِض) دێ ◦ دەگـوترێ: (نهـر فَيّاض) ڕوبارێكە ئاوی زۆرە ◦ (رجل فيـاض) پیاوێـكە خێـرو بێـرو بەخششی زۆرە.

**المُفَـاضُ**: بڵاوكـراوە، بـڵاو بـۆوە ◦ دەگوترێ: (حديث مُفاض) قسەیەكی بـڵاوە بـۆوە ◦ (و دِرع مُفَـاض) زرێیەكی پانو پۆڕو نەرمە.

**فاظ فلان فَيظاً وفيوظاً**: فلانكـەس مـرد ◦ دەگوترێ: (فاظت نفسه وروحه) گیـانی دەرچوو.

**أفاظَهُ الله**: خودا مراندی.

**الفَيظُ**: مردن ◦ دەگوترێ: (حان فَيْظُـهُ) كاتی مردنی هات.

**الفَيْـفُ**: سـارای پـانو پـۆڕو تـەخت ◦ ڕێـگای نێـوان دوو كێـو ◦ شوێنێـك هـەوا تێیـدا هـەر دەمـە لەلایەكـەوە بێو گۆڕانی تێدا پەیدا بێ.

**الفَيْفاء**: سارا ◦ (ك: الفيافي)یە.

**فاق فَيْقاً**: گیانی لەدەست دا خۆی بـەخت كرد.

**أفْيَـقَ الـشاعر**: شـاعیرەكە شـیعری سەرسوڕهێنەری گوتن.

**فالَ رأيُهُ فيلاً وفيولاً**: ڕایەکەی لاوازو بێ بنەما بوو ٥ دەشگوترێ: (فال الرأي) و (فال الرجل في رأيه).

**فايَلَهُ مفايلة وفيالاً**: یاری فییالی لەگەڵ کرد (جۆرە یاریەکی منداڵانەیە یەکێکیان شتێك لەناو گڵدا دەشارێتەوە دوایی گڵەکە دەکا بە دووبەش ئەمجار پرسیار دەکا ئاخۆ شاردراوەکە لەناو کام دوو کۆمەڵە گڵەدایە؟).

**فَيَّلَ رأيَهُ**: ڕایەکەی بەلاواز داناو، بەهەڵەی حسێب کرد.

**تَفَيَّلَ رأيُهُ**: ڕاو بۆچوونەکەی زەعیفو لاواز بوو ٥ ئەومندە قەڵەوو گەورە بوو تا وەکوو فیلی لێ هات.

**إستَفْيَلَ الجملُ**: حوشترەکە لە گەورەییو زەبەلاحیدا وەکوو فیلی لێ هات.

**الفَائِلُ**: گۆشتی سمتو خڕایی ڕان ٥ ڕەگێکە لەڕان دا.

**الفائلتان**: دوو پارچە گۆشتو گوڵمە گۆشتن لەمبەروبەری کلێجەوەنو کلێجەیان لەناو خۆگرتووەو بەملاو ئەولای هەردوو ڕان دا شۆڕبوونەوە.

**الفَالُ**: بڕوانە مادەی (الفأل).

**الفِيالُ**: بڕوانە مادەی (الفِئال).

**الفيل**: حەیوانێکی قەبارە گەورەیە، خورتومێکی درێژی هەیە شتی پێ بۆخۆی دەستەبەر دەکا ٥ وەکوو چۆن مرۆڤ بەدەستی شت بۆخۆی دەستەبەر دەکا ٥ دوو کەڵبەی گەورەو بەدەرەوەی هەن مادەی عاجی لێ دروست دەکرێ. (ك: أفيال وفِيَلَة) ٥ (داء الفيل) هاوسانێکە لە پێست دا پەیدا دەبێو سەر دەکێشێ بۆ گیرانی (أوعیة)ی لمفاوی ٥ (أصحاب الفيل): سەربازو دارو دەستەی ئەبرەههەی حەبەشی بوون، پێش هاتنی ئیسلام ئەبرەههە بەخۆیو سوپاو فیلیەکانیەوە هاتە سەر مەککەو دەیویست کەعبە بڕوخێنێ، بەڵام خودای مەزن بەشێوەیەکی موعجیزە ئەبرەههەو سوپاکەی تارومار کردن.

**الفَيَّال**: فیلەوانی بەخێوکەری فیلو ڕامکردنی فیلەکان.

**تَفَيْلَقَ**: بڕوانە مادەی (فَلَقَ).

**الفَيْلَقُ**: بڕوانە مادەی (فَلَقَ).

**الفَيْلَمُ**: بڕوانە مادەی (فَلَمَ).

**فان الرجلُ فيناً**: پیاوەکە هات.

**الفَينة**: ساتو کات ٥ دەگوترێ: (أزوره الفينة بعد الفينة وفينة بعد فينة) دەچمە دیدەنی ناو بەناو و کات دوا کات.

**الفينان**: قژ درێژو جوان ٥ (وهي فَيَّانَةٌ) ٥ دەگوترێ: (شعر فينان) قژی درێژ.

**تَفَيْهَقَ**: بڕوانە (فَهَقَ).

**الفَيْهَقُ**: بڕوانە (فَهَقَ).

**القاف:** پیتی بیست‌ویەکەمی پیتەکانی هیجایە.

**قـابَ الطعـامَ أو الـشرابَ قَأبـاً:** هەرچی لەقاپەکەدا بوو خواردی.

**قَئِبَ من الشراب قَأباً:** پڕبوو لەشلەمەنی.

**القَؤوبُ:** کەسێـك زۆر ئـاو و شـلەمەنی بخواتەوە.

**المِقأبُ:** بەمانا (القؤوبُ) دێ.

**القِئْقِـئُ:** توێـکڵی تـەنکی هێلکـە ئـەو توێـــکڵەی لــــەژێر توێـــکڵە ڕەقەکەوەیە.

**قَبَّ النباتُ أو اللحمُ أو نحوهمـا:** ڕووەکـە یـان گۆشـتەکە وشـك بـوو ٥ دەگـوترێ: (قَبَّ الجُرحُ) برینـەکە وشك بۆوە.

**قَبَّ القومُ:** خەڵکەکە دەنگیان بـەرزبۆوەو کەوتنە غەڵبە غەڵبو مشتو مڕ.

**قَبَّ ذو النّـاب:** دڕندەکە ددانـەکانی لێـك خشاندنو جیڕە جیڕی ددانەکانی هات.

**قَبَّ جوفُ الفرس:** گەدەی ئەسپەکە قۆڕەی لێ هات.

**قَبَّ القُبَّةَ:** قوببەی بنیات نا.

**قَـبَّ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی بڕیـەوە ٥ ئـەملاو ئـەولای شـتەکەی خـڕ کـردەوە، وەکـوو قوببەو گومبەزی لێ کرد.

**قَبَّ بَطنَهُ:** سکی خۆی گوشی ٥ لـەدوولاوە گەدەی خۆی گوشیو خڕی کردەوە.

**قَبَّ قَبَباً:** کەلەکـەی خـۆی باریـكو ورگـی بچوك کردەوە ٥ (فهو أقبُّ وهي قَبّاءُ).

**أقَبَّ السفرُ الفرسَ:** سـەفەر ئەسپەکەی کزو لاواز کرد.

**قَبَّبَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَبَّ) دێ.

**قَبَّـبَ البيـتَ:** کومبـەزی بـۆ خانوەکـە دروست کرد.

**قَبَّبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی وەکوو گومبەز لێ کرد.

**تَقَبَّبَ القُبَّةَ:** چووە ناو گومبەزەکە.

**القابَةُ:** دڵۆپە باران.

**القُبابُ:** شمـشێری بڕنـدە ٥ لـوتی زل ٥ لوتی وەکوو کەشك وەکوو کەشکۆڵ.

**القَـــبُّ:** نێـــری بـــەهێزو توانـــا چ لـەئادەمیزاد بـێ یـان لـە حوشـترو شـــتی وابـــێ ٥ ڕابـــەرو ســـەرۆکی نەتــەوەو گــەل ٥ ئــەو دابڕاویــەی لەناوقـــەدی بـــەکرمدا هەیـــەو دەزوەکــەی لەســـەر هەڵــدەکرێ ٥ گیرفـانی نـاوەوەی پۆشـاك ٥ لغـاوی ڕەقو گەورە.

**القِبُّ**: ئێسقانی بەرزەوەبووی خوار سێبەندەو زوور کلۆت.
**القَبَّةُ**: یەخەی کراس.
**القُبَّةُ**: گومبەز؛ بینایەکی خڕی کەوانەیی ناوبۆشە، بەزۆری ئەم بینایە بەخشت دروست دەکرێ ◦ هەروا ناوە بۆ خێمەیەکی بچکۆلە لای سەروی کەوانەیی بێ ◦ (ك: قِباب وقبب).
**القِبَّةُ من الشاة**: ئەو شوێنەی جەستەی مەڕ کە ڕیخ‌و قشپلی دەگاتێ ◦ (ك: قِبابٌ).
**القُبِّيُّ**: ئەو کەسەیە درێژە بە بەڕۆژوبوون دەدا تا کز دەبێ‌و ورگی بچوك دەبێتەوە.
**القِبَةُ**: بەمانا (القِبَّةُ) دێ.
**القبيبُ**: ڕوەکی وشکەوەبوو ◦ قوڕەی ورگی ئەسپ ◦ جیرەی ددانی حوشترە نێرەو ئەسپی نێرو دەنگ خواردنەوەیەتی ◦ کەشکی تەڕو وشك کەتێکەڵ بەیەك بکرێن.
**المُقَبَّبُ**: هەرشتێك وەکوو گومبەز وابێ ◦ دەشگوترێ: (حافر مُقَبَّبٌ) سمێکی خڕو کەوانەیی.
**المُقَبَّبَةُ**: دەگوترێ: (سُرَّةٌ مُقَبَّبَةٌ) ناوك‌و ورگی کزو لاواز.
**المَقبوبَةُ**: بەمانا (المُقَبَّبَةُ) دێ.

**القَبَحُ**: کەو ◦ یان هەر باڵندەیەك لەو پێڕە بێ.
**قَبَحَ الله فلاناً قَبحاً وقبوحاً**: پەروەردگار فلانکەسی لەهەموو خێرو بێرێك دوورخستەوە.
**قَبَحَ وجهه له**: پێی گوت: خودا ڕوخسارت ناشیرین بکا.
**قَبَحَ الشَّيْءَ قَبحاً**: شتەکەی شکاند بۆئەوەی بزانێ چی تێدایە یان ئەوەی تێدایە بێتەدەر ◦ دەگوترێ: (قَبَحَ البثرة) دومەڵەکەی دڕی ◦ (قَبَحَ البيضَةَ) هێلکەکەی شکاند.
**قَبُحَ الشَّيْءُ قُبحاً وقباحَةً**: شتەکە ناشیرین بوو.
**أقبَحَ فلان**: فلانکەس کارێکی ناشیرینی ئەنجام دا.
**قابحه**: جوێنی پێ دا.
**قَبَّحَهُ**: لە هەموو خێرو بێرێك دووری خستەوە ◦ ناشیرینی کرد.
**قَبَّحَ وجهَهُ**: پێی گوت ناشیرین ◦ وتی ئەو ناشیرینە.
**قَبَّحَ لـه وجهه**: نارەزایی دەربڕی بەرامبەر کارێکی ناشیرینی ئەو کەئەنجامی دا.
**قَبَّحَ عليه فعله**: لایەنی ناشیرینی کردەوەکانی ئاشکرا کرد.
**قَبَّحَ البَثرَةَ**: دومەڵەکەی گوشی پێش

ئەوەی بگاو کاتی دەرکردنی بێ.

**إستَقبَحَهُ**: بەناشیرین‌و خراپی لەقەڵەم دا.

**القَبَاحُ**: قەراخی ئێسقانی قوڵە بەلای ئانیشکەوە.

**القُبْحُ**: پێچەوانەی جوانی ٥ واتە ناشیرین ٥ جا ناشیرینییەکە لە کردەوە دابێ یان لە گفتاردا یان لە وێنەو ڕوخساردا بێ ٥ هەر شتێك زەوقی ساغ‌و سەلیم قبووڵی نەکا.

**القبیح**: پێچەوانەی (الحسن)ە ٥ ناوە بۆ شتێك زەوقی ساغ لێی هەڵسڵەمێتەوە ٥ هەرشتێك شەرع بەناپەسەندی بزانێ ٥ هەرشتێك عورفی گشتی ڕەتی بکاتەوە ٥ (ك: قِباح وقَباحی وقُبحی).

**القَبیحَةُ**: ناپەسەند، ناشیرین، ناڕەوا.

**المَقَابِحُ**: هەر ڕەوشتێك ناشیرین بێ هەر ڕەوشتێك بە ناپەسەند دابنرێ.

**قَبَرَ المیتَ قَبْراً**: مردووەکەی شاردەوە ژێر گڵی دا.

**أقْبَرَ فلاناً**: قەبری بۆ فلان دیاری کرد.

**أقْبَرَ القومَ**: کوژراوەکەی دایەوە بە خەڵکەکە بۆئەوەی بینێژن ٥ دەشگوترێ: (أقبرهم قتیلهم).

**القُبَارُ**: چرای ڕاوکەر لەشەودا ٥ ئەو مرۆڤانەی کۆدەبنەوە بۆ ڕاکێشانی ئەو شەبەکەیەی خراوەتە ناو دەریاوەو زۆر نێچیری پێوە بوون.

**القُبَّرُ**: جۆرە باڵندەیەکە لەپێری (القبریات)ە دەنوکێکی مەخروطی هەیە ٥ سنگی پەڵەی ڕەشی پێوەن.

**القَبْرُ**: گۆڕ کە مردوی تێدا دەنێژرێ ٥ (ك: قبور وأقبر).

**القُبَرُ**: ترێیەکی سپیە بۆڵەکانی درێژن، مێوژی باشی لێ دەکرێ ٥ هەروا بەمانا (القُبَّرُ) دێ.

**القَبُرورُ**: خورمایەك زوو بەر بگرێ ٥ یان بەرەکەی بەلقەکانیەوە بێ‌و لێ نەکرابێتەوە.

**المَقْبَرَةُ**: گۆڕستان.

**قَبَسَ النارَ قَبساً**: ئاگرەکەی هەڵگیرساند ٥ داوای ئاگری کرد ٥ ئاگری برد.

**قَبَسَ العلم**: فێری زانیاری بوو ئیستفادەی زانیاری کرد.

**قَبَسَ الرجلَ علماً أو نوراً**: زانیاری یان ڕوناکی‌و نوری دا بەپیاوەکە ٥ لەو شتانە سوودی پێ گەیاند.

**أقْبَسَهُ**: دەستە چیلە ئاگرێکی پێدا ٥ یان ڕوناکیی کارەبای پێ بەخشی یان فێری زانیاری کرد.

**إقتَبَسَ ناراً**: ئاگرێکی هەڵگیرساند.

**إقتَبَسَ فلاناً**: داوای ئاگری لە فلان کرد

٥ دەشگوترێ: (إقتَبَسَ منه علماً) سوودی زانیاریی لێ کرد ٥ دەشگوترێ: (جئت لأقتبس من نورك) هاتم کەمێك لە نوری تۆ وەربگرم.

**القابِسُ**: سویچی کارەبا ٥ پلاکی کارەبا.

**القابوسُ**: پیاوی ڕوخسار جوانو ڕەنگ جوان.

**القَبَسُ**: ئاگر ٥ یان تروسکەیەك لەئاگر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ﴾.

**القَبَسَةُ**: تروسکە ئاگرێکە، دەستە چیلکە ئاگرێکە لەئاگری زۆر وەردەگیرێ ٥ بەمانا کاتی کورتو بەپەلە دێ ٥ دەگوترێ: (ما زُرْتك إلا کقبسة العجلان) بۆ ماوەیەکی کورتو زۆر بەپەلە دیدەنیم کردی.

**القوابِسُ**: ئەو کەسانەی کە زانیاریو زانست دەبەخشنە کەسانی دی.

**المِقْباسُ**: دەستە چیلەی ئاگر ٥ مێینەیەك زوو ئاوس بێ.

**المَقْبِسُ**: ئەو شوێنەی پلاکی کارەبای پێوە دەکرێ بۆئەوەی هێزی کارەبای لێ وەربگیرێ.

**المِقْبَسُ**: ئەو دارو بنەوەندو سەرە بزوتەی ئاگری پێ دەگوێزرێتەوە.

**المُقتَبِسُ**: پشکۆ ئاگر.

**قَبَصَ قَبصاً**: بازێکی خێرای دا.

**قَبَصَ الغلامُ**: کوڕەکە بووبەگەنج.

**قَبَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەسەرە پەنجە هەڵگرت.

**قَبَصَ الرجلَ وغيرَهُ**: نەیهێشت پیاوەکە کارەکەی تەواو بکا پێی بڕی، دەستی پێ لەکارەکە هەڵگرت ٥ دەگوترێ:

**قَبَصَ الشارِبَ**: نەیهێشت ئاو خۆرەوەکە ئاوەکەی بەتەواوی بخواتەوە، ئاو خواردنەوەکەی پێ بڕی.

**قَبِصَ قَبَصاً**: چوستو چالاك بوو ٥ توشی نەخۆشی جگەر بوو.

**قَبِصَ الرجلُ**: پیاوەکە سەری گەورە بوو (فهو أقبص وهي قبصاء) ٥ دەگوترێ: (هو أقبَصُ الرأس) سەر گەورەو سەر خڕە ٥ (هامة قبصاء) ناوچەوان پانو گەورە.

**قَبَّصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەسەرپەنجە هەڵگرت.

**إقتَبَصَ**: شتێکی لە شوێن دەستی ئەو وەرگرت ٥ شتێکی لێ فێر بوو.

**إنقَبَصَ**: وێکهاتەوە.

**تَقَبَّصَ الجرادُ على الشجر**: کوللەکە لەسەر درەختەکە گرد بوونەوە.

**تَقَبَّصَ الحَبْلُ**: حەبلەکە نەکشاو درێژ نەبوو.

**القابِصَةُ**: کۆمەڵو تاقم ٥ (ك: قوابص).

**القَبْصُ**: ئازارێکە لەجەرگدا پەیدا دەبێ.

**القِبْصُ**: كۆمەڵێكی زۆر لە ئادەمیزاد ◦ دەگوترێ: (هم في قِبْص الحَصى) ئەوان بەئەندازەی بەردە وردە زۆرن، ئەژمار ناكرێن ◦ كۆمەڵە لمی زۆر ◦ شارە مێرۆی قەرەباڵغ ◦ هەروا وشەی (القِبْصُ) بەمانا ئەصڵو وەجاغزادە دێ ◦ دەگوترێ: (فلان كريم القِبْصِ) فلانكەس نژاد پاكو وەجاغزادەیە.

**القَبِصُ**: دەگوترێ: (حَبلٌ قَبِصٌ) حەبلێكە ناكشێ درێژ نابێ.

**القَبَصُ**: بەمانا (القُبْص) دێ.

**القُبصَةُ**: ئەو شتەی بەسەرپەنجە هەڵی دەگری لەخۆراكو دانەوێڵە ◦ چنگە شت ◦ كوللەی گەورە.

**القَبيصُ**: كۆمەڵە گەڵ ◦ ئەسپێك لەكاتی ڕاكردن دا سەری سمی لەزەوی بدا.

**المِقْبَصُ**: حەبلێك كە ڕادەهێڵدرێ لەبەر دەم ئەسپەكان دا لە گۆڕەپانی پێشبڕكی دا بۆ ئەوەی لە سنووری حەلەبەكە تێنەپەڕن ◦ (ك: مَقابِص).

**قَبَضَ الشَّيْءَ وعليه قَبضاً**: شتەكەی گرت ◦ بەچنگ گرتی ◦ دەگوترێ: (قبض الدار أو الأرضَ) خانووەكە یان زەویەكەی خستە ژێر دەستی خۆیەوە.

**قَبَضَ اللصَّ**: دزەكەی دەستگیر كرد.

**قَبَضَ عليه الرِزقَ**: ڕزقو ڕۆزی لەسەر كەم كردەوە ◦ گوزەرانی تەنگ بوو.

**قَبَضَ المالَ**: ماڵەكەی وەرگرت.

**قَبَضَ العامِلُ أجرتَه**: كرێكارەكە كرێی خۆی وەرگرت.

**قَبَضَ الله فلاناً وقَبَضَ روحَه**: خودا فلانكەسی مراندو گیانی كێشا.

**قَبَضَ يَدَهُ عن الشَّيْءِ**: دەستی لەشتەكە گرتەوە وەری نەگرت.

**قَبَضَ يده عن النفقه**: دەستی خۆی لەنەفەقەو بەخشین گرتەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ﴾.

**قَبَضَ الشَّيْءَ**: شتەكەی پێچایەوە.

**قَبَضَ الظِّلَ**: سێبەرەكەی كوێر كردەوە، لای برد.

**قَبَضَ الطائِرُ جناحَيْه**: باڵندەكە باڵەكانی كۆكردنەوە بۆئەوەی بفڕێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ﴾.

**قُبِضَ فلانٌ**: فلانكەس مرد یان خەریك بوو بمرێ.

**اقبضَ السيفَ**: شوێن دەستی بۆ شمشێرەكە دروست كرد.

**اقْبَضَ فلاناً المتاعَ**: فلانكەسی واڵ كرد كاڵاكە وەربگرێ.

**قابَضَهُ**: هەریەكە لەو دووانە دەستی

بەسەر مافی ئەوی تردا گرت.

**قَبَّضَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەچنگی خۆیدا کۆکردەوە ٥ خستیە ژێر چنگی خۆیەوە ٥ کۆی کردەوەو پێچیایەوە ٥ دەگوترێ:

**قَبَّضَ وجهَهُ**: دەموچاوی خۆی وێکهێنایەوەو خۆی گرژ کرد.

**قَبَّضَ فلاناً المالَ**: ماڵەکەی خستە دەستی فلانکەسەوە.

**إقتَبَضَ الشَّيْءَ**: بەمانا (قَبَضَهُ) دێ.

**إقتَبَضَ المتاعَ لنفسه**: کالاکەی وەرگرت بۆخۆی.

**إنقَبَضَ الشَّيْءُ**: شتەکە وێکهاتەوەو کۆبۆوە.

**إنقَبَضَ المالُ**: ماڵەکە وەرگیرا.

**إنقَبَضَ الرجلُ على نفسه**: پیاوەکە بارودۆخەکەی پێ ناخۆش بوو بەو ژیانە ڕازی نەبوو خۆی گۆشەگیر کرد.

**إنقَبَضَ عن الشَّيْءِ**: بێزی لەشتەکە هەڵسا.

**إنقَبَضَ عن القَوم**: وازی لە خەڵکەکە هێناو جێی هێشتن.

**إنقَبَضَ في حاجته**: پەلەی کرد، چاکی داوێنی لێ هەڵمالی.

***تَقَايَضَ المتبايعان***: *کڕیارو فرۆشیار هەریەکەیان مافی خۆی وەرگرت؛* فرۆشیار پارەو کڕیار کاڵا.

**تَقَبَّضَ الشَّيْءُ**: شتەکە وێکهاتەوەو کۆبۆوە.

**تَقَبَّضَ الأسَدُ**: شێرەکە خۆی کۆکردەوە بۆ هەڵمەت بردن و باز هاویشتن.

**تَقَبَّضَ الجلدُ**: پێستەکە گرژ بوو وێکهاتەوە.

**تَقَبَّضَ عنه**: دەموچاوی خۆی لێ گرژ کردن و پێناخۆشبوونی خۆی بەرامبەر دەربڕی.

**القابِضُ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوا ٥ لەبواری دەرماندا ناوە بۆ دەرمانێك کە سکچون بگرێتەوە فەزەلاتی ناو ڕیخۆڵەکان توند بکاتەوە.

**القَبْضُ**: دەگوترێ: (صار الشَّيْءُ في قبضه) شتەکە بوو بە مڵکی ئەو.

**القَبْضَةُ من الشَّيْءِ**: چنگێك لەشت چنگ داگرتن ٥ دەگوترێ: (أعطاه قبضة من تمر) چنگە خورمایەکی دا بەفلان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ الرَّسُولِ﴾.

**القُبْضَةُ**: ئەوەی چنگی لێ دادەگرێ و دەکەوێتە ژێر چنگتەوە.

**القُبَضَةُ**: کەسێك توند چنگ بەشت دا بگرێ و هەرشتێکی لەدەستا بوو *بەری نەدا ٥ دەگوترێ: (رَجل قُبَضَةٌ*

رَفضَة) پیاوێکە کەشتێکی کەوتە دەست لەدەستی نابێتەوە ٥ هەروا وشەی (قُبضَة) ناوە بۆ شوانی حوشتر کە کۆیان دەکاتەوە لێیان دەخورێ بۆ ئەو شوێنەی مەبەستییەتی.

القَبیض من الدّواب: وڵاخێک لەغاردانەدا خێرا خێرا قاچەکانی بهاوێ ٥ دەگوترێ: (فرس قبیض الشَّدِ) ٥ هەروا وشەی (القبیض) ناوە بۆ پیاوی عاقڵو کاراو بەردەوام لەسەر ئیشی خۆی.

المَقبِضُ: شوێنی مالْ دەستکەوتن ٥ دەسکی شمشێر کە بەدەست دەگیرێو پڕ بە مشتە.

المِقبَضَةُ والمِقبَضُ: بەمانا (المَقبِضُ) دێ.

المُنقَبِضُ: کەسێک چەموشو دڵ تەنگ بێو نەکرێتەوە ٥ پیاوێکی کۆمەڵایەتی نەبێو حەزی لە گۆشەگیری بێ.

قَبَطَ الشَّيْءَ قَبطاً: بەدەست شتەکانی کۆکردەوە ٥ یان شتەکەی تێکەڵاو بەشتی تر کرد.

القِبطُ: وشەیەکی یۆنانییەو ناوە بۆ دانیشتوانی وڵاتی میصر ٥ وەڵێ ئەمرۆ مەبەست بەو وشەیە مەسیحیەکانی وڵاتی میصرە ٥ (ك: أقباط).

القُبْطِيَّةُ: قوماشێکی سپی کەتانی تەنکە ٥ کاتی خۆی لە وڵاتی میصر چندراوە.

قَبَعَ القُنفُذُ قُبُوعاً: ژیشکەکە سەری خۆی خستە ناو پێستەکەیەوەو خۆی خڕکردەوە.

قَبَعَ الرجلُ: پیاوەکە سەری خستە ژێر کراسەکەیەوە.

قَبَعَ النجمُ: ئەستێرەکە دەرکەوت دوایی ون بۆوە.

قَبَعَ الراکع: پیاوەکە لەکاتی ڕکوع بردنەدا سەری زۆر شۆڕکردەوە.

قَبَعَ فلان: فلانکەس ماندوو بوو هەناسە برکێی پێ کەوت.

قَبَعَ في الشَّيْءِ: چووە ناو شتەکەوە.

قَبَعَ في الأرض: بەناو زەویدا گەڕا، ڕۆیی.

قَبَعَ عن أصحابه: لەهاوەڵەکانی دواکەوت.

قَبَعَ الجُوَالِقَ: لێواری جەواڵەکەی هەڵگێڕایەوە، لێوارەکانی بۆ دیوی ناوەوە دادایەوەو بۆئەوەی بەئاسانی شتی ناوەوەی دەربهێنێ.

إقتَبَعَ السِّقاءَ: سەری خستە ناو کوپەناوەکەوەو ئاوی لێ خواردەوە.

إنقَبَعَ فلان: فلانکەس سەری خۆی خستە ناو کراسەکەیەوە.

إنقَبَعَ الطائرُ: باڵندەکە چووە ناو هێلانەکەیەوە.

**القَابِعَةُ من خيول السبق**: ئەو ئەسپەیە لە پێشبڕکێدا لەدوای ئەسپی یەکەمەوەیە واتە بەدوای ئەسپی پێشکەوتووەیە.

**القُبَاعُ**: ژیشك ٥ ئامێری پێوانەی گەورە وەکوو تەغارو عەربە.

**القُبَّعَةُ**: کۆچکەی منداڵ ٥ جۆرە کڵاوێکە سەرو دەموچاو دەپارێزێ لەباران و تیشکی خۆر ٥ ستارەو بێری.

**القِبَّعَةُ**: لوتی بەراز.

**القُبَّعُ**: ژیشك.

**القُبَّعَةُ**: دەگوترێ: (إمرأة قُبَعَةٌ طُلَعَةٌ) ئافرەتێکە جارجارە سەری خۆی ون دەکاو جارجارەش سەر دەردێنێ چاو شارکێو سەرە تاتکە دەکا.

**القبيعَة من السيف**: ئەو شمشێرەی بەقەراخی شوێنی دەست پێ گرتنیەوە پارچە زیو یان ئاسن هەبێ.

**القَوْبَعُ**: دەسکی شمشێر کە بەقەراخی جێ دەستەکەوە پارچە زیو یان ئاسن هەبێ ٥ باڵندەیەکی قاچ سوورە لە پێری (الذعريات)ە دەندوکی هەڵشاوە.

**قَبْقَبَ الفَحْلُ أو الأسَدُ ونحوهما**: کەڵەکە یان شێرەکە دەنگی خۆی لە گەرویدا گەڕاندەوە ٥ ددانی جیڕکردنەوەو دەنگی لێ هات.

**قَبْقَبَ الرجلُ**: پیاوەکە قسەی تێکەڵ و پێکەڵی کردن و بزڕکاندی ٥ (فهو قَبْقابٌ).

**تَقَبْقَبَ الفحلُ أو الأسدُ**: کەڵەکە یان شێرەکە دەنگی خۆی لە قوڕگیدا گێڕایەوەو خواردیەوە.

**القُبَاقِبُ**: زۆر بڵێو چەقەچەناو.

**القَبقَابُ**: نەعل ٥ قاپقاپ بنکەکەی لەدارەو پشت پێی لەچەرمەو شتی وایە.

**قَبَلَ قَبْلاً**: هات ٥ دەگوترێ: (قبل الليل أو العام أو الربيع).

**قَبَلَت الريحُ**: بایەکە هەڵی کرد.

**قَبَلَ على العَمَلِ**: پەلەی لە ئیشەکەدا کرد.

**قَبَلَ المكانَ**: شوێنەکەی خستە بەردەمی ٥ دەگوترێ: (قَبَلْتُ الجبَلَ مرةً ودبرته مرة أخرى) جارێك کێوەکەم دەخستە بەردەمم و دەمێکیش دەم خستە دواخۆمەوە ٥ دەشگوترێ: (قَبَلت الماشِيَةُ الواديَ) ئاژەڵەکان هاتن بۆ شیوەکە ٥ (قَبَلَ النعْلَ) پشتەپێی بۆ نەعلەکە دروست کرد ٥ (قَبَلَ الثوبَ) کراسەکەی پینە کرد.

**قَبِلَ بفلان**: بوو بە بەرعودەی فلان و کەفیلی کرد.

**قَبِلَت القابلةُ الوَلَدَ**: مامانەکە لەکاتی لەدایکبوونی منداڵەکەدا پێشوازی لێ کرد یەکەم کەس بوو لەکۆشی گرت.

**قَبِلَ الشَّيْءَ قبولاً**: بە پێخۆشحاڵیەوە دیاریەکەی وەرگرت ◦ دەشگوترێ: (قَبِلَ الله دعاءَ فلان) خودا نزای فلانی قبوڵ کرد.

**قَبِلَ العَمَلَ**: بە ئیشەکە ڕازی بوو ◦ (قَبِلَ الخَبَرَ) هەواڵەکەی بەلاوە ڕاست بوو بەڕاستی زانی.

**قَبِلَ فلان قَبَلاً**: فلانکەس لەچاویدا جۆرە خێلییەکی تێدا بوو ◦ (فهو أقبل) ◦ دەشگوترێ: (قَبِلَتْ عينه) ◦ (فهي قَبلاءُ).

**قَبُلَ الرَّجُلُ قَبَلاً**: پیاوەکە بوو بەکەفیل‌و بەرعۆدە.

**أَقْبَلَ**: هات، گەیشت ◦ دەگوترێ: (أقبل الركب) کاروانەکە گەیشت ◦ (وأقبل العام) ساڵ تازە بۆوە ساڵی نوێ هات.

**أَقْبَلَ بالشيئ**: شتەکەی چاك ئەنجام دا ◦ دەشگوترێ:

**أقبلت الأرضُ بالنبات**: زەویەکە گیاو گژی باشی ڕواند.

**أقبل بفلان**: فلانکەسی هەڵپشکنی‌و چەندو چونی لەگەڵ دا کرد بۆئەوەی کارەکە قبوڵ بکا.

**أَقْبَلَ على العمل ونحوه**: دەستی بەکارەکە کرد ◦ دەشگوترێ: (أَقْبَلَت الدنيا عليه): دونیا ڕوی تێ کردو خێرو بێری بەسەردا ڕژا.

**أَقْبَلَ عينَ فلان**: چاوی فلانی خێل کرد.

**أَقْبَلَ فلاناً الشَّيْءَ**: شتەکەی خستە بەردەمی فلان ◦ دەشگوترێ: (أقبلت الماشيةَ الواديَ) ئاژەڵەکانی بەرەو دۆڵەکە ئاڕاستە کردن.

**أقبلنا الرماحَ نحو القوم**: ڕمبەکانمان ئاڕاستەی خەڵکەکە کرد.

**أَقْبَلَ فلاناً الطريقَ**: فلانکەسی شارەزای ڕێگاکە کرد.

**قابَلَهُ**: بەرەو ڕوی بۆوە ڕوی تێ کرد.

**قابل الشَّيْءَ بالشيئ**: شتەکەی بەرامبەر شتەکە کرد.

**قابل الكتاب بالكتاب**: کتێبەکەی لەگەڵ کتێبەکەی تردا بەراورد کرد.

**قَبَّلَهُ**: ماچی کرد.

**قَبَّلَ العامِلَ العَمَلَ**: کرێکارەکەی واڵێ کرد بەشێوەی گرێبەست پابەندی کارەکە بێ.

**إِقْتَبَلَ الرَّجلُ**: پیاوەکە دوای گێلی‌و نەفامی عاقڵ بوو.

**إِقْتَبَلَ أمْرَهُ**: دەستی بەکارەکەی کردەوە.

**إِقْتَبَلَ الخُطبَةَ**: بەشێوەی سەردەستەکی‌و ئیرتیجالی وتارەکەی خوێندەوە،

لەوە پێش ئامادەباشی بۆنەکردبوو.
**تقابَلا**: بەرەو ڕوی یەکتر بوونەوە ٥ ڕویان لەیەکتر کرد.
**تَقَبّلَ به**: بوو بەکەفیلی‌و بەرعودەی بوو.
**تَقَبّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی قبوڵ کرد، بەشتەکە ڕازی بوو ٥ دەشگوترێ: (تَقَبّلَ الله الأعمال) خودا کردەوەکانت لێ وەربگرێ‌و پاداشتت بداتەوە.
**إستَقْبَلَهُ**: پێشوازی لێ کرد ٥ بە پێخۆشبوون‌و سۆزەوە بەرەو پیری هات.
**إستَقْبَلَ الأمرَ**: کارەکەی دەست پێکردەوە.
**الإستقبال**: زۆری پێشوازیی کردن لە میوان ٥ بەربێلا.
**القابلة**: مامان ٥ (ك: قوابل).
**قَوابل الأمر**: سەرەتاکانی شت ٥ سەرەتاکانی کار.
**القابلية**: ئامادەباشی بۆ قبوڵ کردنی شتێك.
**القابول**: هەلاشێك لەنێوان دوو خانوو یان دوو دیواردا کە بەژێریا خەڵك بڕوا واتە: دالان ٥ (ك: قوابيل).
**القِبالُ**: ئەوەیە دوو قاچی مرۆڤێك پێشەوەیان لێك نزیك بێ‌و پاژنەکانیان لێك دوورکەونەوە.
**القُبالُ من كل شيئ**: سەرەتای هەموو شتێك ٥ یەکەم دیمەن کە دەیبینی لەهەر شتێك.
**قُبالُ الدابة**: ناوچەوانی وڵاخ‌و یاڵەکانی.
**القَبالَةُ**: کومپیالە ٥ دەشگوترێ: (نحن في قَبالة فلان) ئێمە لە ژێر عوهدەو پەیمانی فلان داین.
**القِبالَةُ**: کەفالەت‌و بەرعودە بوون ٥ پیشەی مامانی ٥ کردەوەیەك کە مرۆڤ لە ئەستۆی دەگرێ.
**القُبالَة من الطريق**: ئەوەی دێتە بەردەم ڕێگا ٥ دەگوترێ: (جلس فلان قُبالة فلان) فلانکەس لەبەرامبەر فلاندا دانیشت.
**قَبْلُ**: زەرفی زەمانی ڕابردوە ٥ یان زەرفی مەکانی پێشەوەیە.
**القُبْلُ**: مەبەست ٥ دەگوترێ: (إذاً أقبلُ قُبْلَك) کەوابێ من مەبەستی تۆ دەکەمە مەبەستی خۆم.
**القُبُلُ**: پێشەوەی شت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ﴾ ٥ هەروا وشەی (قُبُلْ) ناوە بۆ بناری کێو ٥ بۆ سەرەتای زەمان‌و ڕۆژگار ٥ دەگوترێ: (کان هذا في قُبُل الصيف): ئەمە لەپێش هاتنی هاوین دا بوو ٥ هەروا ناوە بۆ

شەرمگای پێشەوەی پیاو و ئافرەت ٥ دەشگوترێ: (رأيته قُبلاً) بە ئاشكرا ئەوم بینی.
**القِبَلُ**: هێزو توانا ٥ دەگوترێ: (مالي به قِبَلٌ) ئەمن توانای ئەوەم نیە ٥ (لي قِبَلَ فلان دين) من لای فلان قەرزم هەیە.
**القُبَلُ**: دەگوترێ: (رأيته قُبلاً) بەئاشكرا ئەوەم بینی.
**القَبَلُ**: جۆرە خێلییەكە لەچاودا ٥ بەڵگەی ئاشكرا .كێو و گردو تەپۆڵكە ٥ بناری كێو ٥ دەگوترێ: (إنزل بقَبَلِ هذا الجبل) دابەزە بۆ بناری ئەو كێوە.
**القُبْلَةُ**: ماچ ٥ نیشانەیەكە بە گوێچكەی مەڕەوە.
**قُبْلَةُ الحُمىً**: زیبكەیەكە لەسەر لێوی لەرزوتادار پەیدا دەبێ.
**القِبْلَةُ**: ڕۆگە ٥ كەعبە كە موسوڵمانان لە نوێژدا ڕوی تێدەكەن ٥ لایەنو ڕو ٥ دەگوترێ: (ما لكلامه قِبْلَة) قسەكەی هیچ ڕویەكی نیە.
**القَبَلَةُ**: میرویەكە لەناو كۆمەڵگای پاشكەوتوودا هەڵی دەگرن، بەخۆیدا دەكەن بۆ دەفعی چاوەزار یان بۆ دەستەبەر كردنی خۆشەویستی یەكێكی تر بۆخۆی، بەتایبەتی هەندێ ئافرەتی كاڵفام بەكاری دەهێنن بۆئەوەی مێردەكەی خۆشی بوێ ٥ ئێستاكە دەبینی هەندێ كەس میروی شین بە پێشی ئۆتۆمبێلەكانیانەوە دەكەن ئەوە پاشماوەی ئەو دابو نەریتە دواكەوتوویە.
**القَبُولُ**: ڕەزامەندیو مەیلی دڵ بۆلای جوانیو خاڵو نیشانە ٥ بای صەبا.
**القَبيلُ**: چینو كۆمەڵو شوێنكەوتەو داروودەستە ٥ هاوشێوە ٥ كەفیلو بەرعوودە ٥ عەریف.
**القبيلة**: هۆزو خێڵو تایەفە ٥ سیرمەی لغاو ٥ كونە قۆبچە ٥ ئێسقانێكی سەرە ٥ (ك: قبائل).
**قبائل الشجرة**: لقو پۆپی درەخت ٥ دەشگوترێ: (ثوب قبائل) قوماشی ڕزیو.
**المقابَلُ من الرجال**: پیاوی وەجاخزادە لەلایەن دایكو باوكەوە.
**المقابَلَةُ من الشاء والنوق**: مەڕو حوشتری گوێ هەڵدڕاو لەلای پێشەوەی گوێیان دڕاویەكە دیارنەبێ.
**المقابَلَة**: لە زاراوەی زانستی بەدیع دا بریتیە لەوەی دوو مانا یان زیاتر بهێنی، ئەمجار دژی ئەو مانایانە

بێنــی وەکــوو (فليــضحكوا قلــيلا وليبكوا كثيرا).

**المقبَلَـةُ**: (أرض مقبلــة) زەویەکــە بــاران ناوبــەناو لێــی بــاریوە هــەمووی نەگرتۆتەوە.

**قَــبَنَ قبونــاً**: بــەناو زەویــدا گــەڕا بــۆ بەدەستهێنانی سودو قازانج.

**أقْبَنَ فلان**: فلانکەس تی شکا هەلات ٥ خێرا بازی هاویشت.

**قَبْنَ الشَّيْئَ**: بە قەپان شتەکەی کێشا.

**القِبانَة**: قەپانچیەتی.

**القَبّــانُ**: قــەپان ئامێرێــکە بــۆ پێــوانی شــت ٥ چــاودێرو ئەمینــدار ٥ دەگـوترێ: (فـلان قَبـان علـى فـلان) فلانکــەس چــاودێری فلانــە بەئیــشەکانی دا دەچــێتەوە ورد بينييان تێدا دەکا.

**القَبِينُ**: کەسێك کارەکانی بــەجوانی بــۆ ڕەهــا نــەکرێن‌و هەرخەرێــك بــێ‌و بەرهەمی باشی نەبێ.

**قَبَاهُ قَبْواً**: بەسەری پەنجەی شتەکەی کــۆکردەوە ٥ دەشــگوترێ: (قبــا الزعفــران ونحــوە) زەعفەرانەکــەی چنی.

**قبا الشَّيْئَ**: شتەکەی کەوانە کردەوە.

**قبا البناءَ**: باڵەخانەکەی بەرز کردەوە.

**قَبَّــى الثّــوبَ**: قوماشــەکەی وا درو بەکەڵکی ئەوە بێ لەسەر پۆشاکەوە لەبەر بکرێ.

**قَبَّى المتاعَ**: کاڵاکەی پێچایەوەو ئامادەی کرد بۆ ناردن بۆ شوێنێکی تر.

**إنقَبَى**: خۆی شاردەوە.

**تَقَبَّى الشَّيْئُ**: شتەکە وەکوو گومبەزی لێ هات.

**تَقَبَّــى فــلان**: فلانکــەس پــاڵتۆی لەبــەر کــرد ٥ ڕۆبــی زانکۆی لەبـەر کـرد ٥ دەگـوترێ: (تَقَبَّــى قبــاءە) پاڵتۆکــەی خۆی لەبەر کرد.

**القابياءُ**: پیاوی خراپو خوێڕی ٥ (بنـو قابیــاء): کۆمەڵێــك مــرۆڤ کۆببنــەوە بۆ مەی خواردنەوە.

**القابیــة**: ئافرەتێــکە ڕوەکــی عوصـفور بچنێ‌و کۆی بکاتەوە.

**القِبَا**: (قِبَا القوس) نیوەی کەوان، واتـە: نیوەی دارە کەوانەییەکە.

**القَبَاءُ**: پۆشاکێـکە لەسـەر پۆشـاکی تـر لەبـەر دەکـرێ وەکـوو پـاڵتۆو ڕۆبـو ســەدریە ٥ یــان کراسێــکی درێــژەو پشتێنی لەسەر دەبەسترێ.

**القَبْوُ**: تاقمێـکی کەوانـەیی ٥ سـەردابو ژێــر زەمینێــکە لەهاوینــدا فێنــكو گونجــاوە بــۆ تێــدا هەڵــگرتنی شیرەمەنی‌و میوە.

**القبــوَة**: کورەخانــە ٥ دوکــەڵ کێــشی تەندور.

**قَتَّبَهُ قَتْباً**: ڕیخۆڵەی سورکراوەی دەرخوارد دا.

**أقْتَبَ البعيرَ**: کورتانە بچکۆلەی لەپشتی حوشترەکە شەتەك دا.

**أقْتَبَ اليمينَ**: سوێندەکەی جەخت کردەوەو گەورەی کرد ٥ (أقْتَبَ فلاناً يميناً): سوێند خواردنەکەی لەسەر فلانکەس گران کرد.

**أقْتَبَ الدينَ فلاناً**: قەرزەکە فلانکەسی لە گلو گۆ خست.

**قَتَّبَهُ تَقْتيباً**: کەوانەی کردەوە چەماندیەوە.

**القَتَبُ**: زینو کورتانێکی بچوکە بەئەندازەی دوگی حوشترە.

**القَتِبُ**: پیاوی کەم چلێدانەو تورەو تەوسن ٥ کەسێك زوو تورە بێ.

**القِتْبُ**: بەمانا (القَتَبُ) دێ ٥ ڕیخۆڵە ٥ ئامێری ناعورو ناو هەڵکێشان بەهەموو جۆرەکانیەوەو بەهەموو پارچەکانیەوە.

**القِتْبَةُ**: ڕیخۆڵە ٥ (ك: قِتب).

**القَتوبَةُ من الإبل**: حوشترێکە کە زینو کورتانی بچوکی لێ شەتەك درابێ ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (لا صدقة في الإبل القتوبة) زەکات لە حوشتری تەرخانکراو بۆ ناو هەڵکێشانو نیش کردنی لەو جۆرە نیە.

**قَتَّ فلان قَتّاً**: فلانکەس درۆی کرد.

**قَتَّ فلان بين الناس**: فلانکەس گوێی هەڵخست بۆئەوەی قسەی خەڵك ببیسێو ئەوان پێی نەزانن.

**قَتَّ فلاناً**: شوێن فلانکەس کەوت بەنهێنی بۆئەوەی بزانێ چی دەکاو بۆ کوێ دەچێ.

**قَتَّ الحديثَ**: قسەکەی بەشێوە هەڵەوگێڕو تەزویر گێڕایەوە ٥ دەگوترێ: (هو يقت الحديث) قسەکە تەزویر دەکاو درۆو دەلەسەی پێوە دەنێو وایشی نیشان دەدا کەحەقو ڕاستە.

**قَتَّ أثر الشَّيْئِ**: بەدوادا چوونی بۆ شتەکە کردو ویستی بزانێ چۆنەو چییە.

**قَتَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی ئامادە کرد ٥ کەمی کردەوە ٥ کەم کەم گردی کردەوە ٥ (فهو قَتات وقتوت).

**قَتَّت الأحاديثَ**: قسەکانی بەشێوەی ناڵەبار و گەندەڵی گەیاند.

**قَتَّتَ الأفاويه**: داو و دەرمانەکانی خستە ناو مەنجەڵەکەوە بۆ کوڵاندن.

**قَتَّتَ الزيتَ**: لەناو زەیتەکەدا بۆنی خۆشی تێ کردو قرچاندی ٥ یان زەیتەکەی تێکەڵی ڕۆنی بۆنخۆش کرد (فهو مُقَتَّت).

**القَتُّ**: درۆی ئامادەکراو ٥ هەموو ڕوەكو گژو گیایەك کە خۆڕسك بێ

یان بچێندرێ لە باخچەو بەردرگادا.

**القَتّاتُ**: ئـەو کەسـەی خـۆ لەخەڵـك دەگـرێو گـوێ بـۆ وتـو وێـژەکانیان هەڵدەخاو ئەوان ئاگایان لێ نیە.

**قَتِدَت الإبل قَتداً**: حوشترەکە توشی سك ئێشە بوو بەهۆی خواردنی ڕوەکی (قەتاد) گوێنی.

**القتاد**: ڕوەکێـکی پتـەوە چقڵاویە لـە پێری (القرنیـة)یـە لـە وڵاتـی سودان پێی دەگوترێ: (الخشاب) باشترین صەمغی لێ بەرهەم دەهێندرێ، ئـەم ڕوەکـە لـە وڵاتـی کوردسـتان پێـی دەگوترێ گوێنیو لـە کوێـستانەکان خۆڕسـکەو کـەتیرەی لێ بەرهـەم دەهێنـدرێ، ئـەم ڕوەکـە چـقڵەکانی دەپرووزێنرێو ورد دەکرێ باشترین لەوەڕو ئالفە بۆ ڕەشە وڵاخ.

**القَتَدُ**: ئەو دارو تەختەیەیە بۆ ڕەحلو شـەبەکەی دەوری دووگـی حوشـتر پێـکەوە شـەتەك دەدرێ وەکـوو جـۆرە کورتانێـك ◊ (ك: أقتـاد و قتود).

**قتر فـلان قَتراً**: فلانکـەس ژیـانی تـەنگو گوزەرانی ناخۆش بوو.

**قـتر فـلان علـى عیالـه**: فلانکـەس کـەمو کـوڕی ڕەچـاو کـرد لـە بـەخێوکردنی ماڵو منداڵی دا.

**قتر اللحمُ**: گۆشـتەکە بـۆنو بـەرامی بڵاو بۆوە.

**قتر للأسد**: لە نزیك داو و تەڵەوە گۆشتی بـۆ شـێرەکە دانـا بەجۆرێـك شـێرەکە بۆنی گۆشتەکە بکا بۆئـەوەی بکەوێتـە داوەکەوە.

**قَتَرَ الشَّیْئَ والأمرَ**: شـتەکەی بـە پێویـست زانی، کارەکەی بە پێویست لەقەڵەم دا ◊ شتەکەی فڕێ دایە لاوە ◊ هەنـدێ لـە شتەکەی خستە پەنا هەندێکی.

**قَتَرَ الدِرعَ**: سەرە بزماری تیژی بۆ زرێـکە دروست کرد.

**قَتِرَ البخورُ و اللحمُ وغیرُهُ قَتَراً**: بوخورەکە یان گۆشتەکە بۆنو بەرامی بڵاو بۆوە.

**أقتر الرجلُ**: پیاوەکـە گـوزەرانی تـەنگ بـوو ◊ قورئـان دەفـەموێ: ﴿وَعَلَـى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ﴾.

**أقـترت المـرأة**: ئافرەتەکـە دار عـودو بوخوری سوتاند.

**أقترت الصّائِدُ أو الصَّیدُ**: نێـچیرەوانەکە یان نێچیرەکە چووە کۆختەکەوە.

**أقـتر الله رزق فـلان**: خـودا ڕزقـی فلانـی کەم کردەوەو گوزەرانی ناخۆش کرد.

**أقْتَرَ النارَ**: ئاگرەکەی وای کرد دووکەڵ بکا.

**قَتَّرَ علی عیاله**: لە ڕوی بەخێو کردنی مـاڵو منداڵیـەوە ڕژدو چـروك بـوو

باش بەخێوی نەکردن.

قَتَّرَ الشواءُ: بۆنی برژاوەکە بڵاو بۆتەوە ◦ دەشکوترێ:

قَتَّرَ الرجلُ الشواءَ: پیاوەکە بۆنی برژاوەکەی وروژاند.

قَتَّرَ الصيّادُ للأسد: نێچیرەوانەکە گۆشتی بۆ شێرەکە لە نزیك داو و تەڵەکەدا دانا بۆئەوەی بۆنی بکاو بکەوێتە داوەکەوە.

قَتَّرَ الأشياءَ وبينها: شتەکانی لێك نزیك کردنەوەو ئامادەی کردن بۆ بەکارهێنان، لە حەدیسدا هاتووە: (أن أبا طلحة كان يرمي والنبي صلى الله عليه وسلم يُقَتِّرِ بين يديه) واتە: ئەبو تەڵحە تیربارانی کافرەکانی دەکرد پێغەمبەر (د.خ) سەرەتیرەکانی بۆ ڕێك دەخستن.

قَتَّرَ فلاناً على قُترِهِ: فلانکەسی بەسەر لادا خست.

اقْتَتَرَ الصائدُ في قترته: نێچیرەوانەکە چووە ناو قوختەکەیەوە، خۆی تێدا حەشار دا.

تَقَاتَرَ القومُ: خەڵکەکە فێڵو فەرەجیان لەیەکتر کرد.

تَقَتَّرَ فلان: فلانکەس ڕقی هەڵساو خۆی ئامادە کرد بۆ کێشەو دەمە دەمێ.

تَقَتَّرَ فلان للصيد: فلانکەس لە قوختەکەیدا خۆی حەشاردا بۆئەوەی فێڵ لە نێچیرەکە بکاو بیگرێ یان بیکوژێ.

تَقَتَّرَ عنه: لێی لاکەوت، لێی دوور کەوتەوە.

تَقَتَّرَ فلاناً: هەوڵیدا فێڵ لە فلانکەس بکاو غافڵ گیری بکا.

القاتِرُ: زەعیفو لاواز.

القُتارُ: دوکەڵێك بۆنێکی تایبەتی هەبێ کەبەهۆی برژاندنو کوڵاندن، یان سوتاندنی ئێسق یان بوخور.

القُتْرُ: ئەملاو ئەولای شت ◦ (ك: أقتار).

القِتْرَةُ: قەصەب کەئاراستەی ئامانج دەکرێ ◦ (ك: قِتَرٌ) ◦ (إبن قِتْرَة) مارێکی پیسە بەهەر کەسێکەوە بدا دەیکوژێ.

القُتْرَةُ: گوزەرانی ناخۆشو تەنگ ◦ کونو درز لە جۆگا ئاو یان حەوزی ئاو یان بۆری ئاو کەئاوی لێ بچێ بۆ ناو باغچە ◦ کونی سورگیو زمانەی کیلۆن کە لەکاتی داخستن دا ئەو زمانەیە تێیدا دەوەستێ ◦ ئەڵقەی قەڵغانو زرێ ◦ کونی تەندور، چاوی تەندور ◦ کونێك کە دەران دەر بێ ◦ کۆختەو سەنگەری نێچیرەوان کە خۆی تێدا حەشار دەدا لەکاتی هەوڵدانی دا بۆ گرتنی.

**القَتَرَةُ**: شێوه دوکەڵو تەپو تۆزێکە لەکاتی کارەساتی ناخۆشدا دەموچاو دادەگرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ، تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ﴾.

**القَتُورُ من الرجال**: پیاوی ڕژدو چروكو بەخیل.

**القتِيرُ**: سەری بزمار لەنەڵقەی زرێ دا ٥ سەرەتای دەرکەوتنی موی سپیو نیشانەی پیری.

**قَتَعَ قُتوعاً**: چەوسایەوەو ژێردەستەو زەلیل بوو.

**قاتَعَهُ**: شەڕی لەگەڵ کرد، کوشتی.

**القِتْعُ**: شانەی هەنگ لە کونە شاخێکی کەمێك قوڵ.

**القَتَعُ**: کرم بەگشتی ٥ کرمێکی سورە وەکوو مۆرانە وایە دار دەخوا.

**القَتَعَةُ**: زەلیلو ژێردەستەو چەوساوە.

**قَتَلَهُ قَتْلاً**: کوشتی ٥ دەشگوترێ: (قَتَعَ الله فلاناً) خودا شەڕو نەگبەتی فلانکەسی لابرد ٥ برسیایەتی یان تینوایەتیەکەی نەهێشت ٥ (قتل غليله) شیفای دا ٥ (قتل الخمر) ئاوی تێکەڵ بە شەرابەکە کرد بۆئەوەی کە سکونیو کاریگەریەکەی کەم بێتەوە.

**قَتَلَ فلاناً**: فلانکەسی زەلیل کرد.

**قَتَلَ الشَّيْءَ علماً**: چووە ناو شتەکەوەو لێی کۆڵیەوەو چووە بنجو بناوانی باسەکەو بەتەواوی تێیدا کارامە بوو.

**أقْتَلَهُ**: ڕاینواند بۆ کوشتن.

**قاتله مقاتلة وقتالاً**: شەڕی لەگەڵ کرد ٥ مەنعی کردو لەمپەڕی خستە بەردەم ٥ لە حەدیسدا هاتووە کە پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی کەسێك کە بە بەردەم نوێژکەردا بڕوا فەرمویەتی: (قاتله فأنه شيطان) مەیهێڵەو ڕەدی بکەرەوە ئەوە نوێژ بڕە.

**قاتَلَ الله فلاناً**: خودا نەفرینی لە فلانکەس کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَاتَلَهُمُ اللّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾.

**قَتَّلَ فلاناً**: فلانکەسی کوشتو ئەتکی جەستەی کرد ٥ زەلیلو ژێرباری کرد ٥ دەگوترێ: (قلب مُقَتَّلٌ) سۆزو عیشق کاری تێ کردووە.

**قَتَّلَ القومَ**: ژمارەیەکی زۆری لە قەومەکە کوشت.

**إقتَتَلَ القومُ**: خەڵکەکە یەکتریان کوشتو بڕ کرد.

**إقْتَتَلَت النساءُ فلاناً**: ئافرەتەکان فلانکەسیان توشی داوی عیشق کردو وازیان لێ نەهێنا تا لەناویان برد.

**إقتَتَلَهُ الجِنُ**: جندۆکە شێتیان کردووە.
**أُقْتِلَ الرَجُلُ**: پیاوەکە عەشقو دڵداری شێتی کردووە ٥ عەقڵو هۆشی لەدەست داوە.
**تقاتل القوم**: خەڵکەکە یەکتریان کوشتو بڕ کرد.
**تَقَتَّلَ القومُ**: خەڵکەکە شەڕیان بوو.
**تَقَتَّلَ الرجلُ لحاجته**: پیاوەکە بەپێر پێداویستیەکانی خۆیەوە چوو هەوڵی دابینکردنی دا.
**تَقَتَّلَ للمرأة**: خۆی بۆ ئافرەتەکە گەردنکەچ کردو ملکەچی بوو.
**تَقَتَّلَتِ المرأةُ في مشيتها**: ئافرەتەکە لە ڕۆیشتنی دا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.
**تَقَتَّلَت المرأةُ للرجل**: ئافرەتەکە خۆی ئارایش داو خۆی ڕازاندەوە بۆ پیاوەکە تاوای لێ کرد عاشقی بێ.
**إسْتَقْتَلَ**: ملکەچی کوشتن بوو.
**إسْتَقْتَلَ في الأمر**: لەکارەکە دا ملکەچی بوو.
**القَتَالُ**: نەفس ٥ یان باقی مەندەی نەفس ٥ دەگوترێ: (أصاب قَتَالَهُ) ٥ (دابة ذات قَتال) ئاژەڵێکە گۆشتو بەزی زۆرە.
**القِتْلُ**: هاوشانو بەرامبەر ٥ دەگوترێ: (هما قِتلان) ئەو دووە هاوشانی یەکترن ٥ زاناو ئاگادارو لێزان بەکاروبار، دەگوترێ: (إنه لقِتل شَرّ) ئەو لێزانە لەشەڕو جەنگ دا.
**القَتُولُ**: کەسێك زۆر بکوژ بێ زۆری خەڵك کوشتبێ.
**المُقاتِلُ**: جەنگاوەر، ئامادەکراو و ڕامکراو بۆ شەڕ.
**المُقَتَّلُ**: ماندو و شپرزە بەکاری گەردنکەچیو زەلیلی ٥ پیاوی ڕاڵبوو و لە بۆتەدراو و خاوەن ئەزمون.
**المُقْتَتَلُ**: شوێنی شەڕو جەنگ یان کاتی شەڕو جەنگ ٥ شوێنی کوشندەی ئادەمیزاد یان گیانلەبەری تر کە پێکراو زەبری لێ درا گیانی لەدەست بدا ٥ دەگوترێ: (مقتل الرجل بين فكيه) کوشندەترین شوێنی ئادەمیزاد لە نێوان دووشەویلەیەتی واتە: زوبانیەتی ٥ دەشگوترێ: (وَلّني مقاتِلَك) ڕوم تێکە دەموچاوت بخەرە بەرامبەرم.
**المَقْتَلَةُ**: گۆڕەپانی شەڕو جەنگ، شەڕی کوشندەو تارومار کەر ٥ دەگوترێ: (كانت بالروم مقتلةٌ عظمة).
**قَتَمَ قَتوماً**: تەپوتۆزاوی مەیلەو ڕەش یان مەیلەو سوور ٥ دەگوترێ: (قَتَمَ الغُبارُ، وقَتَمَ الوجه).

**قَتِمَ النهارُ:** ڕۆژەکە تەپوتۆزی زۆری تێدا بوو.

**قَتِمَ قَتَماً وقُتُوماً:** بەمانا (قَتَم) دێ ٥ (فهو أقتم وهي قتماء).

**أقتَمَ الشَّيْئُ:** بەمانا (قَتَمَ) دێ.

**أقْتَمَ اليوم:** ڕۆژەکە تەپوتۆزی زۆر بوو.

**الأقْتَمُ:** شتێك کە تەپوتۆزاویو مەیلەو ڕەش یان مەیلەو سوورە ٥ (أحمر قاتِمٌ) ڕەنگی زۆر سوور.

**القتام:** تەپوتۆزی مەیلەو ڕەش ٥ دەگوترێ: (إرتفع القتامُ حتى خفيت الاعلام) تەپوتۆزی هێندە بەرز بوو نیشانەو دیاردەکان تارماییان نەما.

**القَتَمُ:** تەپوتۆز ٥ بایەکە تەپوتۆزی زۆر بهێنێ.

**القَتَمَةُ:** ڕنگێکە تەپوتۆزی مەیلەو سوورە ٥ یان مەیلەو ڕەشە.

**قَتِنَ المِسْكُ أو الدَّمُ قتوناً:** میسکەکە وشك بوو تەڕایی نەماو ڕەش هەڵگەڕا.

**قَتُنَ الرجلُ وغيره قَتَانَةً:** پیاوەکە خواردنی کەم بوو کزو لاواز بوو (فهو وهي قَتِين).

**أقْتَنَ:** بەمانا (قَتُنَ) دێ.

**القَتِينُ:** هەزار پێ ٥ کزو لاواز ٥ سەرە ڕمبی تیژ.

**قتا فلاناً قَتْواً:** خزمەتی فلانکەسی کرد ٥ دەگوترێ: (فلان يقتو الملوك) فلانکەس خزمەتکاری پاشایان دەکا.

**إقتوى فلان:** فلانکەس بوو بە خزمەتچی.

**المقتوى:** خزمەتکار ٥ (ك: مقاتية ومقتوون).

**المقتوين من الناس:** کەسانێك بەنانەسکی خزمەتی خەڵك دەکەن ٥ بۆنێرو مێو تاكو کۆ و دوانی بەیەك شێوە دەگوترێ: (رجل مقتوين) و (إمرأة مقتوين) (ورجلان مقتوين وإمرأتان مقتوين ورجال مقتوين و نساء مقتوين).

**أقْثأ المكان:** شوێنەکە خەیارو شتی وای زۆرە ٥ دەگوترێ: (أقْثأ القوم) خەڵکەکە خەیاریان زۆر بوو.

**القِثَّاءُ:** جۆرە کاڵەکێکە لەخەیار دەچێو لەو درێژتر دەبێ وەکوو تروزیو کالیار ٥ لە وڵاتی میصر بەهەموو جۆرەکانی دەگوترێ خەیار.

**المَقْثَأة:** شوێنێك خەیاری لێ بێ، خەیاری لێ بچێندرێو لێی بڕوێ ٥ (الأرض المقثأة) زەویەك خەیاری زۆر بێ.

**قَثَّ الشَّيْئَ قَثّاً:** شتەکەی کۆکردەوە زۆری

گردکـردەوە ٥ دەگـوترێ: (قَـثّ فـلانٌ مالاً) فلاّنکەس مـاڵو سامانێـکی زۆری کۆکردەوە ٥ دەگـوترێ: (وجاءَ يَقُثُّ معه دينـا عريـضة) ٥ هـەروا وشـەی (قَـثَّ) بـەمانا لابـردنو ڕادان دێ، دەگـوترێ: (قَـثَّ الـسيلُ هـشيم النبـات) لافاوەکـە پـوشو پەڵاشـەکەی ڕاداو پـێش خـۆی دا.

**إقْتَثَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی لەڕەگ دەرکێشا، لە بێخ هەڵی کەند.

**إقْتَثَّ القومَ عـن أصـلهم**: خەڵـکەکەی لەشوێن خۆی هەڵکەند.

**القُثاثُ**: کـاڵا ٥ دەگـوترێ: (جـاء القـوم بقُثـــائِهم) خەڵـــکەکە بـــەخۆیانو کاڵاکانیانەوە هاتن.

**القَثاثَةُ**: کۆمەڵێـك ئادەمیزاد.

**القَثيـثُ**: ئـەو توێـکڵو پـرژو پاڵەیـە لەقـــەدی دارمێـــو یـــان دارخورمـــا دەکەوێتـە خـوار ٥ ئەمامـە خورمـا لـەو کاتـەدا کەلـە بنکەکـەی خـۆی هەڵدەکەندرێ.

**القَثيثَةُ**: بەمانا (القثاثة) دێ.

**المَقَثَّـةُ**: تەختـە دارێـکی پانـە منـداڵ یاریی پێ دەکەن.

**قَثَمَ فلان في مشيه**: فلاّنکەس لە ڕۆیشتندا تەمبەڵی کرد.

**قَثَمَ لفلان من ماله**: لەماڵو سامانی خۆی بەشی فلاّنکەسی دا.

**قَثَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی هەموو یان زۆربـەی کۆکردەوە.

**إقْتَـثَمَ الـشَّيْئَ**: بـەمانا (قَثَمَـهُ) دێ ٥ شـــتەکەی لـــەبێخ دەرهێنـــاو شوێنەواری لێ نەهێشتەوە.

**قَثـامِ**: ئیـسمی فیعلـی ئـەمرە بـەمانا (أقْـــثِمْ) دێ ٥ هـــەروا نـــاوە بـــۆ کەمتیاری مێ لـەم ڕووەوە کـەمتیاری مـێ تەمبەڵـەو لـە ڕۆیـشتندا زۆر لەسەر خۆ دەڕوا.

**القَثُومُ**: کەسێـك کۆکەرەوەی خێرو بێر بێ

**قَثـا فـلان**: فلاّنکـەس شتێـکی خـوارد خرمەی هات وەکوو خەیارو ترۆزی.

**قَثَا المالَ**: ماڵو سامانی کۆکردەوە.

**قَحَـبَ الجمـلُ أو الفـرسُ قَحْبـاً وقُحابـاً**: حوشترەکە یان ئەسپەکە کۆکەی هاتێ کۆکی.

**قَحَبَت المرأةُ**: ئافرەتەکـە داوێـن پـیس بوو.

**قَحَّبَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَحَبَ) دێ.

**تَقَحَّبَت المرأةُ**: ئافرەتەکە بوو بەقەحبە.

**القُحابُ**: تێـکچوونی نـاوەوەی جەسـتە بەهۆی کۆکە.

**القَحْـــبُ**: بەتەمـــەنو کۆنەســـاڵ کـــە کۆکەی بێ.

**القَحْبَةُ**: پیرەژنی پیرەساڵ کە کۆکەکۆکی بێ ٥ کەسێك ناوەوەی جەستەی داوەشابێ بەهۆی دمردەوە.

**قَحَّ قُحوحةً**: پاڵفتەو پوختە بوو.

**القُحاحُ**: پوختەو خاڵی لەکوێزرو خشتو خاڵ ٥ دەشگوترێ: (أعرابي قُحاح): عەرەبێکی ڕەسەنو لادێ نشینو سارانشینە، تێکەڵ بەشارو شارستانیەت نەبوە ٥ دەشگوترێ: (صار الى قحاح الأمر) چووە ناو کرۆكو جەوهەری شتەکە.

**القُحُّ**: (القحاح) پاڵفتەو ڕەسەن ٥ وەجاخزادەو نەجیب.

**قَحَرَ الرجلُ أو البعيرُ قحوراً**: پیاوەکە یان حوشترەکە چووە ساڵەوەو گوڕی گەنجی تێدا ماوە.

**القحارية من الجمال والرجال**: حوشتری قەبارە گەورە مرۆڤی زەبەللاحو جەستە زل.

**القَحْرُ**: پیر، بەساڵاچوو کە کەمێك هێزو گوڕی گەنجی تێدا مابێ ٥ (ك: أقحر وقحور).

**قَحَزَ الرجلُ قَحْزاً**: بەتوڕەیی بازی دا.

**قَحَزَ عن ظهر دابته**: لەسەر پشتی ولاخەکە کەوتە خوار.

**قَحَزَ به**: خستی، بەزەویدا دا ٥ دەگوترێ: (ضربهُ فقحزهُ).

**قَحَزَ الرامي السَّهمَ**: تفەنگ هاوێژەکە نەیزانی تفەنگ بهاوێ گولەکە کەوتە بەردەمی نیشانەو نەیپێکا.

**قَحَزَ فلاناً وغيره عن الماء**: فلانکەسی لەئاوەکە گێڕایەوە (فهو قاحِزٌ).

**قَحَّزَهُ**: وای لێ کرد باز بدا، هەڵمەت بەرێ.

**القُحّازُ**: نەخۆشییەکە توشی ئاژەڵ دەبێ ٥ کۆکەی حوشتر.

**القُحَازَةُ**: ئامێرو داوێکە باڵندەی پێ دەگیرێ.

**قَحَطَ المطر قَحْطاً**: بارانەکە وەستایەوە، باران نەباری.

**قَحَطَ العامُ**: ساڵەکەی بێ بارانی بوو وشکەساڵی بوو.

**قَحَطَ البلدُ**: وڵات توشی قاتو قڕی بوو.

**أقْحَطَ**: توشی قاتو قڕی بوو ٥ دەگوترێ: (أقحط القوم) و (أقحط البلد) (أقحط الله الأرضَ) خودا زەویەکەی تووشی قاتو قڕی کرد.

**القَحْطُ**: نەبارینی بارانو وشکبوونەوەی زەوی ٥ کەمی بەروبوم.

**القَحِطُ**: ئەو وڵاتو قەومەی توشی قاتو قڕی ببێ.

**المِقْحَطُ من الأفراس**: ئەو ئەسپانەی لە غاردان ماندوو نابن.

**المقحطةُ**: گرانیو قاتوقڕی ◊ دەگوترێ: (هم في مقحطة) ئەو گەلو نەتەوانە لە قاتو قڕیدان.

**قَحَفَ المطرُ قَحفاً**: بارانەکە لەناکاو بوو بەلێزمەو لەنگێزەو لافاوی هەڵساندو هەرچی بەر لافاوەکە کەوت ڕایدا.

**قَحَفَ الإنسانَ**: زەبری لە ئێسقانی سەری مرۆڤەکە دا، کاسەی سەری زامدار کرد.

**قَحَفَ الإناءَ**: هەرچی لەقاپەکەدا بوو بەخواردەمەنیو شلەمەنیەوە هەمووی خوارد.

**قَحَفَ الرُمانَةَ**: هەنارەکەی قاش کرد؛ توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**قاحَفَهُ**: بەکاسەو شتی وا شلەمەنییەکەی خواردەوە ◊ پێشبڕکێی لەگەڵدا کرد لەوەدا ئاخۆ کامەیان تۆڵەی کوژراوەکە لە بکوژ دەکاتەوەو ڕقی خۆی بەدوژمن دەڕێژێ ◊ بەخوێنی کاسەی سەری تینوایەتی خۆی دەشکێنێ ◊ هەندێ عەرەبی سەردەمی نەزانی دابو نەریتیان وابوو کە براکوشتەو بابەکوشتەی خۆیان دەکوشتەوە تا بەکاسەی سەری ئاوی نەخواردایەوە بیرۆشی نەدەهات!!

**إقتحف ما في الإناء**: هەرچی لەقاپەکەدا بوو لوشی دا.

**إقتحف السيلُ النباتَ**: لافاوەکە ڕوەکەکەی هەڵکەندو بردی.

**إقتحف قِحفاً من رأس فلان**: پارچەیەکی لە ئێسقانی سەری فلان دەرخست، سەری شکاندو ئێسقانی دەرخست.

**القُحافُ**: ڕادەر ◊ دەگوترێ: (سَيْل قُحَاف) لافاوێکی ڕادەرە هەرچی بێتە بەر ڕایدەماڵێ.

**القُحَافَةُ**: هەرچی لەقاپو لەگەن دا هەبێ لە تێگوشاو و شتی وا.

**القِحْفُ**: یەکێکە لەو هەشت پارچە ئێسقانەی کە کاسەی سەریان لێ پێك هاتووە ◊ ئەوەی لە جومجومە شەق دەبێو ئێسقانەکە دەردەکەوێ ◊ قاپێکە لە دار دروست دەکرێ پێی دەگوترێ: کاسە دارینە بەزۆری بۆ دۆو ماست بەکاردێ ◊ توێکڵی هەنار.

**القحفاءُ**: دەگوترێ: (عَجَاجَة قحفاء) ڕەشەباو عەجاجێکی ڕادەرە، هەموو شتێك ڕادەماڵێ.

**القُحُوفُ**: ئەسکوێ، ئامێری هەڵگوازتن.

**المِقحَفَةُ**: دارێکە گەنمو شتی وای پێ شەن دەکرێ، سێلك یان شەن ئامێرێکە دانەوێڵەو کاو کۆتی

بەهۆی بای شەماڵەوە پێ لێك جیادەکرێتەوە ٥ مەولەوی دەڵێ.

خەرمانی خەمان هاوەبەرباوە
شەنكەر یەكێكە دووشەن وەلاوە.

**قَحِلَ الشَّيْئُ قَحَلاً وقَحلاً**: شتەكە وشك بۆوە ٥ دەگوترێ: (قَحِلَ العودُ) و(قَحِلَ الجلدُ) (قَحِلَ الشيخُ) پیرەمێردەكە پێستەكەی وشك بۆوە.

**قَحِلَت الأرضُ**: زەوییەكە وشك بۆوە، بوو بە سوتەمەرۆ.

**أقْحَلَ الشَّيْئَ**: شتەكەی وشك كردەوە.

**أقحله الصومُ**: ڕۆژوو گرتن كزو لاوازی كردو وشكی كردەوە.

**أقْحَلَ القحطُ الماشيةَ**: گرانیو قاتوقڕی ئاژەڵەكانی لەڕو لاواز كردن.

**قَاحَلَهُ**: كەوتە گەڵیو لێی جیا نەبۆوە.

**تَقَحَّلَ**: بەمانا (قَحَلَ) دێ.

**تَقَحَّلَ فلان**: فلانكەس دەستگرتنەوەی لە خواردنو پۆشاك گرتەبەر بڕیاری دا تەقەششوف بكا.

**القاحِل**: وشك، وشكەوەبوو ٥ دەگوترێ: (عود قاحِل) و (جلد قاحل) و (مكان قاحِل).

**القُحَالُ**: دەردێكە تووشی ئاژەڵ دەبێو پێستی وشك دەبێتەوە و مندار دەبێتەوە

**قَحَمَ المنازلَ والمغاوِرَ**: یەكەیەكە مەنزڵەكان گەڕاو بەناویان سوڕایەوە لەهیچیان دا نیشتەجێ نەبوو.

**أقحم أهل البادية**: لادی نشینو ڕەشماڵ نشینەكان لە شوێنی خۆیان هەڵاتنو ڕەویان كرد لەترسی گرانیو قاتو قڕی بەرەو وڵاتێك كە نانو ئاویان بۆخۆیانو لەوەڕو ئاو بۆ ئاژەڵەكانیان دەست بكەوێ.

**أقحَمَ فلاناً المكانَ**: فلانكەسی خستە ناو ئەو شوێنەوە بەبێ تێفكرینو لێ وردبوونەوە.

**قَحَّمَهُ في الأمر**: خستیە ناو كارەكەوە ٥ دەگوترێ: (قَحَّمَ نفسه في الشَّيْئ): خۆی خستە ناو شتەكەوە.

**قَحَّمَ الفرسُ فارِسَه**: ئەسپەكە سوارەكەی بردە ناو شوێنی ترسناكەوە.

**إقتحم النجمُ**: ئەستێرەكە ئاوا بوو.

**إقتحم المكان**: بەزۆری چووە ناو شوێنەكەوە.

**إقتَحَمَ الأمر العظيم**: خۆی فڕێدایە ناو كارو كێشەیەكی گەورەو سامناكەوە هیچ بیری لەسەرەنجامی نەكردەوە.

**إقتحم فلان عقبة أو وهدة**: فلانكەس خۆی فڕێدایە ناو چورتەمو كۆسپەوەو دەیەوێ لێیان تێپەڕێو سەركەوتووبێ.

**إقتَحَمَ الشَّيْئَ**: خۆی فڕێدایە ناو

شتەکەوە ٥ شتەکەی بەهیچو پوچ زانی.

**إنْقَحَمَ في الأمر**: بەبێ تێفکرین خۆی هەڵدایە ناو کارێکی گەورەوە.

**تَقَحَّمَتْ الدابة براكبها**: وڵاخەکە سوارەکەی هەڵگرتو بەرەو چاڵو هەڵدێر هەڵی تیزاندو لەوانەیە هەڵی دابێتە ناو کەندرێکەوە.

**تَقَحَّمَ الأمر**: خۆی فڕێدایە ناو کارێکی ئەستەمەوە.

**القَحَامَةُ**: بەساڵاچوون و گەیشتنە بەتەمەنێک کە دەگاتە ئاستی ڕەزیل بوون.

**القَحْمُ**: کەسێک بگاتە تەمەنی ناناسایی و زۆر پیر ببێ ٥ حەیوانو وڵاخی کزو لاوازو پیر ٥ (ك: قحام).

**القَحمَةُ من النخل**: دارخورمای بەتەمەنو قەد باریک بوو، پەڕژو پاڵ کەمو ڕوتاوە.

**القُحْمَةُ**: کاری قورس و گران کە کەس نەوێرێ خۆی تێوە بگلێنێ ٥ قات و قڕی و گرانی ٥ تاوان کردن.

**قُحَمُ الطريق**: ڕێگای ناخۆش و پڕ مەترسی.

**القُحَمُ من الشهر**: سێ شەوی کۆتایی مانگ.

**القَحُومُ**: کەسێک بکەوێتە ساڵەوەو زۆر پیر ببێ ٥ یان حەیوانو ئاژەڵ کە زۆر پیر بوبێو لەڕو لاواز ببێ.

**المُقحَمَةُ**: دەگوترێ: (لفظة مُقْحَمَة) وشەیەکی زێدەو نەگونجاوە لەگەڵ ڕستەو عیبارەتەکەدا ٥ (ك: مقحمات).

**قحا المال قَحواً**: هەموو ماڵو سامانەکەی برد.

**قحا الدَّواءَ**: گوڵە ئوقحوانەکەی کردە ناو دەرمانەکەوە.

**أقحَتِ الأرضُ**: زەوییەکە گوڵە ئوقحوانی ڕواند.

**إقتحى المالَ**: ماڵو سامانەکەی برد هیچی نەهێشتەوە.

**الأقحوان**: ناوە بۆ چەند جۆرە ڕوەکێک لەپێری (أنتاميس) و(کریزینتموم) ٥ یەکێکە لەو ڕووەکانەی پێی دەگوترێ (البابونج الأبيض) ٥ (ك: أقاحي).

**أقاحي الأمر**: سەرەتای کارو ئیش.

**القُحوانُ**: لۆغەتێکە لە (الأقحوان).

**المِقْحاةُ**: ئامێری شت ڕادان و شت ڕامالین ٥ وەکوو کەرتو و بێڵو شتی وا ٥ یان ئامێری پێشکەوتوو کە ئێستا بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکار دەهێندرێن وەکوو گریدەو شتی وا.

**قَدَحَ السود في الشجر أو الأسنان:** خمخۆركه لەدارەكەی داو كرمۆڵی كرد.

**قَدَحَ بالزند:** بە ئەستێیەكە لەبەرد ئەستێكەی دا بۆئەوەی ئاگری لێ دەربێنێ ٥ دەشگوترێ: (قدح النار من الزند) ئاگری لەبەرد ئەستێكە دەرهێنا.

**قَدَحَ الزندَ:** بەردەكەی لەئەستێكە دا بۆئەوەی ئاگری لێ بێتە دەر.

**قَدَح الشَّيْئُ في صدره:** شتەكە كاری لەدڵو دەرونی كرد.

**قَدَحَ في عرض أخيه:** تانەی لە ناموسی براكەی دا عەیبو عاری لە ناموسی برادەرەكەی گرت.

**قَدَحَ الطبيب العَيْنَ:** پزیشكەكە ئاوی سپی لە چاوەكە دەرهێنا.

**قَدَحَ القِدرَ:** مەنجەڵەكەی بەتاڵ كرد چی تێدا بوو دەری هێنا.

**قَدَح ختامُ الإناء:** مۆری زەرفەكەی كردەوە دوروای كیسەو تورەكەكەی كردەوە.

**قادَحَهُ:** رەخنەیان لەیەك گرتو هەریەكەیان بەرامبەرەكەی بەتاوانبارو كەم تەرخەم ناوبرد.

**قَدَّحَ الفرسَ:** ئەسپەكەی كزو لاواز كرد.

**إقتَدَحَ بالزند:** بە ئەستێكە لەبەرد ئەستێكەی دا.

**إقتَدَحَ الأمرَ:** لە كارەكە ورد بۆوەو تێی فكری.

**تقادَحَا:** دانو سانیان كرد، كەوتنە دەمە دەمێو بەڵگە هێنانەوە بۆ بۆردانی لایەنی بەرامبەری.

**إستَقدَحَ زَندَهُ:** ئاگری لەبەردو ئەستێكە دەرهێنا.

**القادِحُ:** درزی دار، قەڵشتی دار ٥ رەشاییەكە لە ددان دا پەیدا دەبێ ٥ خۆركەو مۆرانەیەكە توشی دارو ددان دەبێ ٥ (ك: قوادح).

**القِداحَةُ:** چەرخ دروست كردن.

**القِدْحُ:** پارچە دارێك كە كەمێك خمخۆركەو مۆرانە لێی بدا ٥ دارێك خەتو نەخشی لێ دەكرێنو هەر قەدەحێك لەو قەدەحانە ئەندازەی یەك خەتو خیشكەی تێدا دەبنو بۆ قومارو مەیسیر بەكار دەهێندرێن.

**القِدْحُ المُعَلَّى:** شانسو بەختی باش.

**القَدَحُ:** پەرداخو گلاسێكە ئاو و مەیو شلەمەنی تری تێدا دەخورێتەوە ٥ پێوەرێكە هەشتیەكی كێلەیەكە.

**القَدّاحُ:** چەرخ دروستكەر ٥ ئەستێ بەبەردە ئەستێی دەكێشیو ئاگر دێنێ ٥ بەردی بەردەئەستێ ٥ غونچەی روەك پێش ئەوەی بكرێتەوە ٥ پزیشكی دەرهێنانی ئاوی سپی لەچاو.

**القَدّاحَةُ**: چەرخ، ئەستێ؛ ئەو ئاسنەی بە بەردەکە دەکێشرێ‌و ئاگر دروست دەکا ◦ چەرخی ئاگر کردنەوە کە بەشێوەیەکی سەردەم دروستکراوە غازی تێ دەکرێ‌و بەردو ئاسنەکەی تێدایەو بووەتە ئامێری ئاگر کردنەوە.

**القَدُوحُ**: مێش ◦ بیرێك ئاوی بەدەست لێ دەربهێندرێ پێویست بەدۆڵچەو پەت‌و شتی وا نەکا ◦ دەگوترێ: (بئرٌ قَدُوح) بیرێکە بە لوێچ لوێچ ئاوی لێ دەردەهێندرێ.

**القَدُوحُ**: (قَدُوحِ الرَّحْل) ئەو دارو شەبکانەی بەکاردێن بۆ ڕەحلەکەو ڕەحلەکەیان لێ پێك هاتووە.

**القديحُ**: بنكڕ، ئەو چێشت‌و خواردنەی بە بنکی مەنجەڵەوە دەنووسێ‌و بەزەحمەت لێی دەبێتەوە ◦ دەگوترێ: (في أسفل القدرِ قديح) بنكڕ بەبنی مەنجەڵەکەوە ماوە ◦ باقی مەندەی شۆرباو.

**المُتَقَادِحُ** (شجرة متقادِح): دارێکە لق‌و پۆپەکانی نەرمن، کەڕەشەبا هەڵدەبێ لقەکان لێك دەدرێن‌و ئاگریان لێ دەبێتەوە.

**المِقدَاحُ**: ئەو پارچە ئاسنەی لەبەردە چەرخەکە دەداو ئاگری لێ دەبێتەوە.

**المِقْدَحُ**: ئەو کەلێن‌و دابڕاویەی لە تیرو کەوانەکەدا بنکی تیرەکەی لێ دەبەسترێ.

**المِقْدَحُ والمِقدَحَةُ**: بەمانا (المِقْداحُ) دێ.

**قَدَّ القَلَمَ أو الثوبَ ونحوهما قَدّاً**: قەڵەمەکەی قەڵاشت ◦ قوماشەکەی دادڕی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ﴾.

**قُدَّ فلان**: فلانکەس تووشی سك ئێشە بوو.

**قَدَّدَ الشَّيْءَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَدَّ) دێ.

**قَدَّدَ اللحمَ**: گۆشتەکەی لەباری درێژیەوە توێ توێ کردو خوێی کردو بەهەواو خۆر وشکی کردەوە.

**إنْقَدَّ الثوبُ أو الجلدُ**: قوماشەکە یان پێستەکە دادڕا قەڵشا.

**تَقَدَّدَ الشَّيْءُ**: شتەکە شەقار شەقار بوو، وشك بۆوە.

**تَقَدَّدَ القومُ**: خەڵکەکە پەرتەوازە بوون بونە پارچە پارچە.

**القَدادُ**: قالۆنچە ◦ دەعبایەکە وەکوو جرج وایە کەمێك لەو گەورەترەو کلکێکی درێژی هەیە.

**القُدَادُ**: سك ئێشە.

**قَدْ**: حەرفی تەحقیقە ئەگەر چووە سەر

فیعلی ماضي بۆ جەختو تەئکیدە ٥ ئەگەر چووە سەر فیعلی موضاریع بۆ تەقلیلە یان بۆ تەکثیرە.

**القَدُّ**: ئەندازە ٥ دەگوترێ: (هذا علی قَدّ ذاك) ئـەوە بەئەنـدازەی ئەوەیـە ٥ قەدو باڵا ٥ تورەکەیەکە لە پێست ٥ کـــەوڵی بەرخۆلـــە لـــەکاتی لەدایکبوونی دا.

**القِـدُّ**: شـتی تـوێ تـوێ کـراو، سیرمەی پێست بۆ چنینو درونـی پێلاو ٥ هەمبانەو تورەکە لە پێست دروست دەکرێ ٥ قەمچی.

**القُـدُّ**: ماسـییەکە زەبـەللاح لـە پێـری (الحـــــوت) گۆشـــتی دەخـــورێ، لەجـەرگی ئـەو ماسـییە زەیتێـك دەردەهێنـدرێو دەکرێتە دەرمان.

**القِـدَّةُ**: پارچـەیەك لەشـتی بـڕاوو تـوێ تـوێ کـراو ٥ کۆمەڵێـــك مـــرۆڤ کەتاکەکانی ڕای جیاجیایان هەیـە ٥ ڕاســـتەیەکی گەورەیـــە لـــەدار دروستکراو یـان لـە ئەلەمنیۆم پێـی دەگـوترێ چەفتە کـەجکاریو لـەبێغو کۆنکرێتی پێ ڕاست دەکرێ.

**القدیـد مـن اللحـم**: ئـەو گۆشـتەیە بـە درێـژی تـوێ تـوێ کرابـێو خـوێ کرابـێو لەبـەر هـەتاو هـەڵبخرێ بۆئەوەی وشك بێ ٥ تورەکەیەکە لە مووی ڕێسراو دروست دەکرێ وەکوو خوێندانی ماڵـە مـەڕداری بڵبـاس ٥ قوماشی ڕزیو.

**المَقَدُّ**: شوێنی تـەخت ٥ ڕێـگەو ڕێبـاز ٥ دەگـوترێ: (هو مستقیم المقد).

**المِقَدُّ والمِقَدَّةُ**: ئاسنێـکە، کێردێـکە شـتی پـێ تـوێ تـوێ دەکـرێ، شـتی پـێ دادەڕێندرێ.

**المقدود**: (جاریة مقدودة) کچۆڵێـکی قـەد جوانو باڵا سنەوبەرییە.

**قَدَرَ علیه قُدارة**: دەسەڵاتی بەسەردا شکا.

**قَـدَرَ الـشَّیْءَ قَـدراً**: ئەنـدازەی شـتەکەی دیاری کرد.

**قَدَرَ فلاناً**: ڕێزی فلانی گرتو بەگـەورەی زانـی ٥ بەئەنـدازەو سـنوورو نەخـشە شتەکەی بنیات نا.

**قَدَّرَ الأمرَ**: کارەکەی مەزندە کردو لێی ورد بۆوەو هەوڵی ڕێکخستنی دا.

**قَدَّرَ الـشَّیْءَ بالـشیئ**: شـتەکەی بەشـتەکە گرتو بەئەندازەی ئەو هێنایە کاراوە.

**قَـــدَّرَ اللهُ الأمــرَ علــی فــلان**: خـودای پـەروەردگار کارەکـەی بـۆ ئـەو دانـا، بڕیاری بەوە بۆدا.

**قَـــدَرَ اللحـــمَ**: گۆشـتەکەی لەمەنجەڵـدا کوڵاند.

**قَدِرَ الشَّیْءُ قَدَراً**: شـتەکە کورتی هێنـا ٥ کـورت بـوو ٥ دەگـوترێ: (قَـدِرَ الرجـلُ وقَدِرَ العنق).

**قَدِرَ الفرسُ:** ئەسپەکە لە ڕاکردندا پاشوی خستە شوێنی دەستەکانی (فهو أقدر وهي قدراء).
**أقدَرَهُ اللهُ على الأمر:** خودا توانای پێ بەخشی لەکارەکەی دا سەرکەوتوو بوو.
**قادرە:** هەوڵیدا ئیشی وەکوو ئەو بکا ◦ دەگوترێ: (فلان يقادرني) فلانکەس لە هەوڵی ئەوەدایە وا ئیشان بدا توانای وەکوو منی هەیە.
**قَدَّرَ فلان:** فلانکەس ورد بۆوەو بیری لە جێبەجێ کردنی کارەکە کردەوە.
**قَدَّرَ الشَّيْءَ:** ئەندازەی شتەکەی ڕون کردەوە.
**قَدَّرَ الشَّيْءَ بە:** شتەکەی بە ئەو مەزەندە کردو پێوانی ◦ بەئەندازەی ئەوی لێ کرد
**قَدَّرَ اللهُ الأمرَ عليه ولە:** پەروەردگار کارەکەی بۆ دەست نیشان کرد بڕیاری بۆ ئەو دا.
**قَدَّرَ فلاناً على الشَّيْءِ:** فلانکەسی بەسەر ئیشەکەدا بالادەست کرد.
**قَدَّرَ أمرَ كذا:** نیەتی فلان کاری هێناو بڕیاری دا ئەنجامی بدا.
**إقتَدَرَ على الشَّيْءِ:** بەمانا (قَدَرَ) دێ.
**إقتَدَرَ القومُ:** خەڵکەکە گۆشتیان لەمەنجەڵدا کوڵاند.

**إنقَدَرَ:** بەئەندازەی ئەو بوو ◦ دەگوترێ: (قدرت الثوبَ فانقدر).
**تقادر الرجلان:** ئەو دوو پیاوە هەریەکەیان داوای ئەوەی کرد بەئەندازەی ئەو بێ.
**تَقَدَّرَ عليه الأمر:** کارەکە بۆ ئەو بوو ◦ بڕیار بۆ ئەو درا.
**تَقَدَّرَ عليه الثوبُ:** قوماشەکە بەئەندازەی ئەو بوو.
**تَقَدَّرَ له الأمرُ:** کارەکە بۆ ئەو سازا.
**إستَقدَرَ اللهَ خيراً:** داوای لەپەروەردگار کرد توانای بداتێ خێرو بێر وەدەست بێنێ.
**القادر:** ناوێکە لە ناوەجوانەکانی پەروەردگار.
**القادِرَةُ:** دەگوترێ: (بيننا ليلة قادرة) شەوی خۆشمان بردەسەر ڕۆیشتن تێیدا ئاسانو خۆش بوو.
**القَدْرُ:** ئەندازە، دەگوترێ: (هم قَدْرُ مائة) ئەوان ئەندازەی سەد کەسێک دەبن ◦ هەروا دەگوترێ: (جاء الشَّيْءُ على قَدْرِ الشَّيْءِ) شتەکە بەئەندازەی فلان شت بوو ◦ دەشگوترێ: (عندي قَدْر) من ڕێزو حورمەتم هەیە ◦ (سورة القدر) سورەتێکی قورئانی پیرۆزە ◦ (ليلة القدر) شەوێکی پیرۆزی مانگی ڕەمەزانەو دەکەوێتە

شەوێك لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان.

**القِدْرُ**: مەنجەڵ: خواردنو شتی تری تێدا دەکوڵێندرێ.

**القِدْرُ الكاتمة**: مەنجەڵی بوخار کە بەکورتترین ماوە شتی تێدا دەکوڵێندرێ.

**القَدَرُ**: ئەندازەی شتو حاڵەتو چۆنیەتی شتو مەزەندەکردنی، قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ ٥ هەروا وشەی (قَدَر) ناوە بۆ کاتی شت، بۆ شوێنی دیاریکراوی شت ٥ قەزاو قەدەری خودا لەبونەوەردا ٥ (ك: أقدار).

**القَدْراءُ**: گوێچکەیەك نەبچوك نە گەورە بێ.

**القُدْرَةُ**: دەسەڵاتو توانا ٥ هێزو توانا بەسەر شت دا ٥ دەوڵەمەندیو سامانداری ٥ دەگوترێ: (رجل ذو قُدْرَة) پیاوێکی سامانداری هەبووە.

**القَدَرَةُ**: نێوانی دیاریکراوی هەردوو درەختە خورمایەك ٥ یان هەر درەختێکی تر ٥ دەگوترێ: (غَرَسَ علی القَدَرَة) درەختەکەی لە شوێنی گونجاو و دووری دیاریکراودا چەقاند.

**القَدَرِيَة**: پێڕەوێکن ئینکاری قەزاو قەدەر دەکەنو دەڵێن مرۆڤ خالیقی کردەوەی خۆیەتی.

**القَدِيرُ**: خاوەن دەسەڵات ٥ ناوێکە لە ناوە جوانەکانی پەروەردگار لەم ڕووەوە کەهەرچی بیەوێ دەیکا بەگوێرەی داخوازی حیکمەتی خۆی ٥ هەروا ناوە بۆ شتی کوڵاو لەناو مەنجەڵدا.

**المقتدر**: ناوی خودایە یان نازناویەتی.

**المِقدار**: (مقدار الشَّيْء) ئەندازەی شت لەژمارەدا یان لە پێوانەو کێشو بەرفراوانی دا ٥ ئامێرێکە ساتو کاتی شەو و ڕۆژی پێ دیاری دەکرێ ئێستا پێی دەگوترێ سەعات.

**المَقْدِرَةُ**: هێزو دەسەڵات.

**قَدُسَ قُدْساً**: پاك بوو، پاك بۆوە.

**قَدَّسَ الرجلُ**: پیاوەکە دیدەنی بەیتولەقدیسی کرد.

**قَدَّسَ للهِ تقديساً**: خۆی بۆ خودای خۆی پاك کردەوە نوێژی بۆ کرد ٥ بەگەورەو شکۆمەندی زانی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾.

**قَدَّسَ فلان اللهَ**: فلانکەس بڕوای وابوو خودا پاکو دوورە لەهەر شتێك شایەنی خودایەتیو ئەو نەبێ.

**قَدَّسَ الله فلاناً**: خودا فلانی پاك

کردەوەو پیرۆزی کرد.

**تَقَدَّسَ**: خۆی لەتاوان پاراست.

**تَقَدَّسَ الله**: خوای بە دوور گرت لەهەر شتێك شیاوی خودایەتی ئەو نەبێ ٥ (فهو متقدس).

**القَادِسُ**: کەشتی گەورە ٥ کەعبەی پیرۆز.

**القادوسُ**: زەرفێکی سواڵەتییە وەکوو (جەرە) ٥ لە شێوەی ئەو زنجیرەیەك رێك دەخرێو وەکوو ئاعوور ئاوی پێ لەبیر هەڵدەهێنجندرێ ٥ دوێڵی ئاش: ئەوەی دانەوێڵەکەی تێدەکەنو لەژێریەوە کونێکی بچوکی هەیەو وردە وردە بەهۆی چەقچەقەوە دانەوێڵەکە دێتە خوار بۆ گەروی بەرداشەکە بۆئەوەی بکەوێتە نێوان دوو بەرداشەکانەوەو هارِینو وردبوونیو بوونی بەئارد.

**القُداسُ**: رێزو شکۆمەند ٥ دەنکە موورویەکی بچوکە لە زیو دروست دەکرێ بەشێوەی لولوئی مرواری.

**القَدَاسَةُ**: پاکبوونەوەو بەرەکەت.

**القُدّاسُ**: بەلای نەصرانیەکانەوە نوێژکردنە لەسەر نانو مەی بەشێوەیەکی تایبەتی.

**القُدُّوسُ**: پاكو خاوێن لەهەموو لەکەو عەیبێك ٥ سیفەتێکە لە سیفەتەکانی پەروەردگار.

**القِدِّيسُ**: بەلای مەسیحیەکانەوە ناوە بۆ رەبەنو خواپەرستێك کە بەبێ تاوان بمرێو کرداری باشی زۆر بن.

**القُدْسُ**: پیرۆزو بەرەکەت ئامێز ٥ (حظیرة القدس) شەریعەت ٥ یان بەهەشت ٥ بەردێکە هەڵدەدرێتە ناو بیرەوە بۆئەوەی بزاندرێ ئاخۆ ئاوی زۆرە یان کەمە ٥ ناوی شاری ئۆرشەلیمە.

**القُدُسُ، القُدْسُ، روح القُدْس**: ناوی حەزرەتی جوبرائیلە.

**روح القدس**: بەلای مەسیحیەکانەوە ئوقنومی سێیەمە.

**قدس الأقداس**: بەلای جولەکەکانەوە ئەو جێگەیەیە لە پەرستگاکەیان دا پیرۆزترین شوێنە ئەوەیش گومبەزی پەیکەرە.

**القُدَسُ**: سەتڵێکە خۆی تێدا دەشۆردرێ.

**المُقَدَّسُ**: راهیبو رەبەن ٥ کەسێك دیدەنی قودسی کردبێ ٥ (الكتاب المقدس): عەهدی قەدیمە لە تەورات ٥ بەلای مەسیحیەکانەوە بریتییە لەعەهدی کۆنو عەهدی تازە.

**المُقَدَّسَةُ** (الأرض المُقَدَّسَة): وڵاتی فەلەستین.

**اَلْقُدِسُ**: بەیتولەقدیس ٥ حەرەمی مزگەوتی قودس.

**قَدَعَ الفرسَ قَدْعاً**: ئەسپەکە بازی دا.

**قَدَعَ الفَحْلَ**: بە شتێك لە لوتی فەحلەکەی دا بۆئەوەی بگەڕێتەوەو سواری مێیەکە نەبێ ٥ دەگوترێ: (قَدَعَ أنفه) هەروا دەگوترێ: (فحل لا يُقدع أنفُهُ) کەڵێکە ئەوەندە ڕەسەنە کەس شورك لە لوتی ناداو لە مێینەکەیان نایگێڕنەوە.

**قَدَعَ الفَرَسَ**: لغاوی ئەسپەکەی ڕاکێشا بۆئەوەی ڕاوەستێ.

**قَدَعَ السفينة**: پاڵی بە بەلەمەکەوە نا بۆ ناو ئاو.

**قَدِعَ الرجلُ وغيره قَدْعاً**: پیاوەکە وازی هێنا ٥ مەنعی کرد ٥ چاوی سور هەڵگەڕا بەهۆی گریانی زۆرەوە ٥ دەگوترێ: (قَدِعَتْ عَيْنُهُ).

**قَدِعَتِ العينُ**: چاوەکە کەم بین‌و لاواز بوو بەهۆی زۆر تەماشاکردنەوە.

**أقْدَعَهُ**: مەنعی کرد، وازی پێ لێ هێنا.

**إنقَدَعَ**: وازی هێناو مەنع بوو.

**إنقَدَعَ عن الشَّيْئ**: شەرمی لەشتەکە کرد.

**تَقَادَعَ القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان هەندێکیانیان لە ڕۆیشتن مەنع کرد.

**تقادَعَ الفَراش في النار**: پەپولەکان یەك لەدوای یەك کەوتنە ناو ئاگرەکە ٥ دەشگوترێ: (تَقَادَعَ القومُ): خەڵکەکە یەك لەدوای یەك مردن.

**تَقَدَّعَ له بالشَرِّ**: خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد.

**القَدِعُ من الرجال والخيل**: پیاوێك یان ئەسپێك تەپوتۆز بەرپا بکا ٥ (القَدِعِ من الماء) ئاوێك ئەوەندە سوێر بێ بەکەڵکی خواردنەوە نەیە.

**القِدْعَةُ من الثياب**: ڕۆبێکی کورت یان کەوایەکی کورت کە نەگاتە خوار ئەژنۆ.

**القَدِعَةُ**: کەم قسەو شەرمن، کەم دو و زۆر شەرمن.

**القَدُوعُ من النساء**: بەمانا (القَدِعَةُ) دێ ٥ هەروا ئافرەتێك بەهیچ ڕازی نەبێ ٥ ئەسپە نێرەیەك پێویستی بەوە بێ شورکی لەلوتی بدرێ جڵەوی توند بکرێ بۆئەوەی لەخێرا ڕۆیشتن مەنع بکرێ.

**المِقْدَعَةُ**: گۆچان‌و عەصایەکە مرۆڤ پارێزگاری پێ لەخۆی دەکا.

**قَدَفَ الماءَ قَدْفاً**: ئاوی هەڵگوازت.

**القُدافُ**: لوێچە ئاو لەحەوز هەڵگوازتن ٥ کوڵێنەو مەرکانە ٥ جەرەی ئاو

لەسواڵەت ؛ گۆزە.

**قَدَم فلان قُدُماً**: فلاَنکەس پێش کەوت.

**قَدَم فلان قَدْماً**: فلاَنکەس ئازاو بەجەرگ بوو ٥ (فهو قدوم ومِقدام).

**قَدَم القومَ قَدْماً وقدوماً**: پێش خەڵکەکە کەوتو بوو بە پێشەنگیان ٥ قورئان دەفەموێ: ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.

**قَدِمَ على الأمر قُدُوماً**: ڕوی لەکارەکە کرد ٥ دەگوترێ: (قَدِمَ على العيب): بەعەیبەکە ڕازی بوو.

**قَدِمَ من سَفَرِه**: لەسەفەرەکەی گەڕایەوە.

**قَدِمَ البلدَ**: چووە ناو شورایەکە ٥ (فهو قادم) ٥ (ك: قدوم).

**قَدُمَ الشَّيْئُ قِدَماً وقدامةً**: زەمانێکی زۆر بەسەر بوونەکەیدا تێپەڕی ٥ (فهو قديم) ٥ (ك: قُدَماء وقُدامى) ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (هي قَديمة) ٥ (ك: قدائم).

**أقدم فلان**: فلاَنکەس چووە پێش.

**أقدَمَ على العمل**: پەلەی کرد لە ئەنجامدانی کارەکەدا بەبێ ڕاوەستان ملی لێ ناو تەواوی کرد.

**أقدم فلان على العيب**: فلاَنکەس بەعەیبەکە ڕازی بوو.

**أقدمَ فلاناً**: فلاَنکەسی پێش خست.

**أقدمَ فلاناً على الأمر وعلى قرنه**: فلاَنکەسی واڵێ کرد پەلە بکا بۆ هێرش بردن بۆسەر فلاَن بەبێ ڕاوەستان.

**قَدَّمَه**: خستیە پێشەوە.

**قَدَّمَ الشَّيْئَ الى غيره**: شتەکەی نزیك کردەوە لەفلاَن ٥ دەشگوترێ: (قَدِّم رجلك الى هذا الأمر) ئەو کارە ئەنجام بدە.

**تقادم الشَّيْئُ**: شتەکە ڕۆژگاری دوورو درێژی بەسەردا تێپەڕیو درێژەی کێشا.

**تَقَدَّمَ فلان**: فلاَنکەس پێش کەوت، بووبە پێشەنگ.

**تَقَدَّمَ اليه**: لێی نزیك بۆوە.

**تَقَدَّمَ الى فلان بكذا**: فەرمانی بە فلاَنکەس کرد بەفلاَن شت ٥ یان داوای لێ کرد فلاَن کار بکا.

**تَقَدَّمَ القومَ**: لە شەرەفو پیاوتیدا پێش قەومەکە کەوتو بوو بەپێشەنگیانو ڕابەرایەتی کردن.

**إستقدم القومَ**: پێش گەلەکەی کەوتو بوو بە ڕابەریان.

**إستقدم فلاناً**: داوای هاتنو ئامادەبوونی فلاَنی کرد ٥ دەگوترێ: (إستقدمه الأمير) ئەمیر داوای کرد فلاَن ئامادە بێ لەلای بۆکاری پێویست ٥ دەشگوترێ: (فلان مُستقدم اليّ) فلاَنکەس ڕوی دوژمنایەتی لەمنەو بەچاوی دۆستایەتی ناڕوانێتە من.

(التقادم في القانون): ماوەیەکی دیاریکراوە بەتێپەڕبوونی، مافی داواکردنی ماف یان جێبەجێ کردنی بڕیارو حوکم پوچەڵ دەبێتەوە.

**القادِم من الإنسان:** لە مرۆڤ دا مەبەست سەریەتی ٥ لەکاروان قافڵەدا پێشەواو سەرەتایەتی.

**القادمة من الجیش:** کۆمەڵێك سەربازن پێش سوپا دەڕۆنە پێشەوەو دەبنە پێشەنگی سوپا.

**القادمة من الرحل:** پێشەتای کاروانو گەڕاوەی ٥ هەروا ناوە بۆ یەکێك لە پەڕەگەورەکانی باڵی باڵندە یان یەکێك لەچوار پەڕی پێشەوەی باڵ ٥ (ك: قوادم).

**القَدَّامُ:** زەرفی مەکانە بەمانا پێشەوەو بەردەم دێ.

**القِدْمُ:** ناوێکە لەناوەکانی زەمان ٥ دەگوترێ: (کان کذا قِدْماً).

**القُدُمُ:** ڕۆیشتن بەرەو پێش ٥ پیاوی ئازاو چاو نەترس.

**قُدُمَ:** زەرفی مەکانە، واتە بەرەو پێش ٥ دەگوترێ: (هو یمشي القُدُم) ٥ هەروا دەگوترێ: (یمشي في الحروب قُدُماً).

**القَدَمُ:** قاچ، ئەو بەشەی دەخرێتە سەر زەوی، لەوێ بەرەوژوور پێی دەگوترێ: (السّاق) ٥ جومزگەی نێوانیان پێی دەگوترێ: (الرُّسغ) ٥ هەروا وشەی (القَدَم) بەمانا پێشکەوتن لە خێر یان لە شەڕدا دێ ٥ دەگوترێ: (لفلان قَدَم في العلم أو الکرم ونحوهما) فلانکەس لەزانیاریو بەخشندەیی دا پێشکەوتنی باشی بەدەست هێناوە ٥ دەشگوترێ: (قدم صدق وقَدَم کرم).

**القَدِمُ من الرجال:** کەسێك زۆر دەست پێشخەری هەبێو چاو نەترس بێ.

**القُدْمَةُ:** کەسێك زۆر خۆ بخاتە پێشەوە بۆ ڕوبەڕو بوونەوەی دوژمنو چاونەترس بێ ٥ دەست پێشخەر لەکارو هەڵوێست دا.

**القَدَمَةُ:** ئافرەتێك پلەو پایەی لەکاری خێردا هەبێ ٥ ئازایەتی ٥ لەبواری مەڕو ماڵاتیش ئەو مەڕو بزنەیە کەلە لەوەڕان دا لەپێشەوە بێ.

**القُدَمِیَةُ:** خۆبادانو لارو لەنجە، دەگوترێ: (مشی القدمیة).

**القَدُومُ:** ئازاو بەجەرگو پێشمەرگەو سڵ لەدوژمن نەکەرەوە ٥ ئامێرێکی دارتاشیو نەحتو هەڵکۆڵینە.

**القَدیمُ:** ئەوەی بەسەر هەبوونی دا ڕۆژگارێکی زۆر تێپەڕ بووبێ ٥ بەلای زانایانی عیلمی کەلامەوە

وشەی (قَدیم) بەهەبوویەك دەگوترێ سەرەتای بوونی نەبێ واتە هەر هەبووبێ‌و کاتێك نەبێ نەبووبێ ٥ ناوێکە یان نازناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

**القَیْدامُ**: پێشەوە ٥ دەگوترێ: (جلستُ قیدامە) لە پێشیەوە دانیشتم ٥ هەروا وشەی (قَیدام) لەهەموو شتێك دا پێشەوەیەتی.

**المِقدامُ والمِقدامة**: کەسێك زۆر بچێتە ناو کاری سامناکەوەو سڵ لە دوژمن نەکاتەوە ٥ هەر بەرەو پێش بڕوا ٥ (ك: مقادیم).

**المُقَدَّمُ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ واتە: ئەوەی شت پێش دەخاو شت لەشوێنی شیاوی خۆی دادەنێ ٥ باریکایی لوت ٥ کۆتایی لوت بە لای چاودا ٥ لەهەموو شتێك سەرەتاکەی ٥ پلەیەکە لە پلەکانی سوپاو پۆلیس لەنێوان پلەی (الرائد) و پلەی (العقید)ە.

**المُقدَّمَةُ**: دیباچە ٥ لەهەموو شتێك دا سەرەتاکەیەتی ٥ لەبواری سوپادا کۆمەڵێکە لەسوپا لە پێشەوەی سوپاوە دەڕوا ٥ ڕوخسارو ناوچەوان.

**قَذا قَذواً**: نزیك بۆوە.

**قَذا الفَرَسُ ونحوه**: ئەسپەکە پەلەی کرد.

**قذا الطعامُ**: خواردنەکە تام‌و بۆنی خۆش بوو.

**أقدی فلان**: فلانکەس لەسەفەر گەڕایەوە ٥ لەبواری خێرو چاکەدا بەردەوام بوو ٥ تەمەنی درێژ بوو پیربوو نزیك مردن بۆوە.

**أقدی المِسكَ**: میسکەکە بۆنی بلاو بۆوە.

**قاداه**: دەگوترێ: (فلان لایقادیە أحد) فلانکەس کەس نیە چەنەبەری بێ‌و شان لەشانی بدا.

**تَقدّی الراكبُ علی الدابة**: سوارەکە لەپشتی ولاخەکە مایەوە تا ڕێگاکە ئاشکراو دیار بوو ٥ دەگوترێ: (تقدّت الدابة بفلان كذلك) ٥ هەروا وشەی (تقدّی) بەمانا خۆبادان‌و لارو لەنجە کردن دێ.

**إقتدی بە**: چاوی لەو کردو لاسایی ئەوی کردەوەو خۆی بەئەو شوبهاند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾.

**القادیة**: کۆمەڵێکی کەم لە ئادەمیزاد ٥ دەگوترێ: (أتتنا قادیة من الناس).

**القادیانیة**: پێڕێکن، جۆرە بیرو بۆچونێکی ئایینیان هەیە پاڵ میرزا ئەحمەدی قادیانی دەدرێن میرزا ئەحمەد ساڵی ١٩٠٨ز مردووە.

**القَدا**: بۆن‌و بەرام ٥ دەگوترێ: (ما

أطيب قَدا اللّحم) بۆنو بەرامی گۆشت چەند خۆشە.
**القِدى**: ئەندازە ◊ دەگوترێ: (هو مني قِدی رِمحٍ) ئەو کابرایە لێم نزیکە، ئەندازەی رِمبێك لێم دوورە.
**القَدَاةُ**: بەمانا (القَدا) دێ.
**القَداوة**: بەمانا (القَدا) دێ.
**القِدَةُ**: میسال‌و نمونە: کەدەکرێ چاوی لێ بکرێ‌و لاسایی هەڵوێست‌و کارەکانی بکرێتەوە.
**القِدْوُ**: بنك‌و بنەما کەلق‌و پۆپی لێ دەبنەوە.
**القَدْوی**: راوەستاوی، بەردەوام بوون.
**القُدْوَةُ**: نمونەو رابەرو میسال ◊ دەگوترێ: (فلان قدوة).
**القَدِي والقَدِيُّ من الأطعمة**: ئەو خواردنەیە بۆن‌و بەرامی زۆر بێ ◊ بەزۆری ئەمە بۆ خواردنی برژاو یان کولاو بەکاردەهێندرێ ◊ دەگوترێ: (طعام قدِ وقَدِيّ).
**قَذَّ قذّاً**: بڕییەوە، رێکی خست ◊ دەگوترێ:
**قذّ الريشةَ**: پەرەکانی تیرەکەی لابردو رێکی کردەوە.
**قذّ فلاناً**: لەپشتەملی فلانکەسی دا.
**أقذّ السهمَ**: پەری تیرەکەی لابردن.
**قَذَّذَ الشيْءَ**: شتەکەی رێکخست‌و جوانی کرد.
**قَذَّذَ شعْرَه**: مووەکانی هەڵپاچین کورتی کردنەوە.
**تَقَذَّذَ القومُ**: خەڵکەکە پەرتەوازە بوون.
**الأقذُّ من السهام**: تیرێکە پەری هەبن ◊ شتێك برینەوەکەی راست بێ هیچ خوارو خێچییەکی تێدا نەبێ ◊ (ك: قُذّ وقِذاذ).
**القاذُّ، القاذَّة**: دەگوترێ: (فلان في قتاله مايدع شاذاً ولا قاذّاً) فلانکەس لەشەردا هەرچی بێتەبەری دەی پروێنێ.
**القُذاذَةُ من كل شيئ**: هەر شتێك هەڵوەری‌و لەشتێکی تر بکەوێتە خوار وەکوو پەرو پۆڵی باڵندەو شتی وا.
**القُذان**: موی سپی لاجانگ ◊ سپیایی باڵی باڵندە.
**القُذَّة**: پەری باڵی باڵندەی وەکوو بازو هەڵۆو دوای تاشین‌و رێکخستنی وەکوو سەرە تیرو بەکارهێنانی لەکەوان دا ◊ گوێچکەی ئادەمیزادو ئەسپ ◊ (ك: قُذَذ وقِذان).
**المَقَذُّ**: کۆتایی روانی موو لەپشتە مل (پشتە سەر) ◊ بناغەی گوێچکە.
**المِقَذُّ والمِقَذَّة**: ئامێرێکە پەری باڵندەی پێ رێك دەخرێن بۆئەوەی بکرێن بەتیر.

**المُقَذَّذُ من الرجال**: پیاوی چوستو چالاك ٥ دەشگوترێ:

**رجل مُقَذَّذٌ**: پیاوێکە گرنگی دەدا بەخۆڕێکخستنو پۆشاکی.

**قَذَرَ الشَّيْءَ قَذْراً**: شتەکەی قێزەون کرد.

**قَذِرَ قَذَراً**: شتەکە چڵکنو پیس بوو.

**قَذِرَ الشَّيْءَ**: بەپیسو چڵکنی هاتە بەرچاو ٥ بێزی لێ کردەوە لەبەر چڵکنیو قێزەونی خۆی لێ پاراست.

**قَذُرَ قَذارَةً**: بەمانا (قَذِرَ) دێ.

**قَذَّرَهُ**: وای لێ کرد قێزەون بێ.

**أقذَرَهُ**: بەقێزەون هاتە بەرچاو.

**أقذَرَ فلاناً**: فلانکەسی جاڕز کرد.

**تَقَذَّرَهُ**: بەمانا (قَذِرَهُ) دێ.

**إستقذر الشَّيْءَ**: بێزی لەشتەکە هەڵسا.

**القاذورة**: چڵكو پیسایی ٥ کردەوەی ناشیرین وتەی نابەجێو ناشیرین.

(القاذورة من الرجال): پیاوی ڕەوشت ناشیرینو بەدخو کەبەکەڵکی تێکەڵ بوونو هاوڕێیەتی نەیە ٥ کەسێك گوێ نەداتە ئەوەی چ دەکاو چ ناکاو چ دەڵێو چ ناڵێ ٥ گو و میزو پیسایی ٥ (ك: أقذار).

**القُذَرَةُ**: (رجل قُذَرَةٌ) پیاوێکە خۆ لەو شتانە دەپارێزێ کەجێگای سەرزەنشتکردنن.

**القذور**: (رجل قَذور) پیاوێکە لەبەر بەدڕەوشتی تێکەڵاوی خەڵك نابێو لەگەڵیان هەڵناکا ٥ ئافرەتێك خۆ زۆر لەپیاوان دوور بگرێو تێکەڵاویان نەبێ ٥ ئافرەتێك خۆ بپارێزێ لەشوێنی گومان لێ کراو، توخن شتێك نەکەوێ گومانی خراپی لێ بکرێ.

**المُقْذَرُ**: دەگوترێ: (رجل مَقْذَر) پیاوێکە خەڵك خۆی لێ دەپارێزێو توخنی ناکەون.

**قَذَعَهُ قَذْعاً**: جوێنی ناشیرینی پێدا.

**قَذَعَهُ بالعصا**: بەگۆچان لێی دا.

**قَذَعَهُ عن الأمر**: لەکارەکە مەنعی کردو گێڕایەوە.

**أقذَعَهُ وله**: جوێنی ناشیرینی پێدا.

**أقذَعَهُ بلسانه**: بەقسە بۆڕی دا.

**أقذَعَ القول**: قسەی ناشیرینو بێجای ناڕاستە کرد.

**أقذعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەخراپو پیس هاتەبەرچاو.

**قاذَعَهُ**: جوێنی ناشیرینی ناڕاستە کرد.

**تَقَذَّعَ**: بێزی لێ کرد، ناخۆشی ویست.

**تَقَذَّعَ لـه بالشرِّ**: خۆی بۆ ئامادەکرد بەشەڕو زیان.

**الأقذع من الكلام**: قسەی ناشیرینو بێجا ٥ دەگوترێ: (منطق أقذع)

قسەی قۆڕو نابەجێ.
**القذيع من الكلام**: قسەی ناشیرین‌و قۆڕ.
**القذيعةُ**: جوێنی ناشیرین‌و خراپ.
**المُقَذّعات**: چڵك‌و پیسایی ◊ دەگوترێ: (رَماهُ بالمُقَذّعات).
**المُقْذِع**: هیجاو زەمکردن بگاتە ئاستی جوێن.
**المُقْذِعات**: جوێنی زۆر زەق‌و ناشیرین.
**القُذْعِلة من الأشياء**: شتی پڕو پوچ ◊ ئافرەتی کورتەبالآو هیچ‌و پوچ ◊ دەشگوترێ: (ما في السماء قُذعملة) توێسکە هەورێك بەئاسمانەوە نیە.
**قَذَفَ بالحجر**: بەردی پێدا دا، بەردی تێ گرت.
**قَذَفَ البحر بما فيه**: دەریا بەهۆی شەپۆلی بەهێزەوەی ماسی‌و شتی وای هەڵدانە دەرەوە.
**قَذَفَ فلان بقوله**: فلآنکەس بەبێ لێ ورد بوونەوە قسەی دەرپەڕاند.
**قَذَف بالشيئ على فلان**: شتەکەی بەفلآن دادا، بەوی کێشا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ﴾: حەق‌و ڕاستی بە بەتاڵ دا دەدەین‌و لەناوی دەبا.
**قَذف فلاناً بالشَّيْئ**: بەشتەکە فلآنکەسی هەنگاوت ◊ دەگوترێ (قذف بالكذب) بەدرۆزنی حیساب کرد درۆزنی پاڵ دا ◊ (وقذفه بالمكروه) شتی ناشیرینی پاڵ دا.
**قذف فلاناً في البحر**: فلآنکەسی هەڵدایە ناو دەریاوە.
**قَذَفَ المحصنة**: بوختانی بۆ ئافرەتە داوێنپاکەکە هەڵبەست، زیناکردنی پاڵدا.
**تقاذفوا بالحجارة**: شەڕەبەردیان کرد بەردیان بەیەکتردا دا ◊ جنێو و قسەی ناشیرینیان بەیەکتر گوت ◊ دەشگوترێ:
**تقاذفت بهم الفلوات**: هەریەکەیان کەوتنە وڵات‌و چۆڵەوانییەك.
**تقاذف الفرسُ في جريه**: ئەسپەکە لە ڕۆیشتنی دا پەلەی کرد.
**الأقذاف** (أقذاف القصر): سوێبان‌و بارکۆنی باڵەخانە.
**قاذفة القنابل**: فڕۆکەی بۆمب هاوێژ.
**القِذافُ**: شتێك پڕ بەچنگ بێ هەڵی بگری‌و بیهاوێژی ◊ ڕۆیشتنی خێراو بەپەلە ◊ دەشگوترێ: (مفازة قِذاف) سارایەکی دوورو درێژە ◊ (ناقة قِذاف) حوشترێکە لە ڕۆیشتن دا خۆدەخاتە پێش حوشترەکانی ترەوە.
**القذاف والقذافة**: ئامێری شت فڕێدان‌و

شت هاویشتنه وەکوو فۆچەقانیو تفەنگو کەوانو شتی وا.

**القِـذِّيفى**: دەگـوترێ: (بیـنهم قِـذِّيفى) بەفۆچـەقانی بـەرد بـۆ یـەکتر دەهاوێـژن ٥ جنێـوی کاریگـەرو جەرگبڕ.

**القَـذَفُ**: لایـەنی شـت ٥ شـوێنی لادانو کەوتنـــــه خـــــوارەوە ٥ دوور ٥ دەگوترێ: (مَفـازة قَـذَف) و (منـزل قَذَف) و (فلاة قذف).

**القُذَفُ**: بەمانا (القَذَفُ) دێ.

**القُذْفَةُ**: بەمانا (القَذَفُ) دێ ٥ (ك: قُذَف وقِذاف وقُذَفات).

**قُذْفـة الجبـل**: گـردو باسك كـە لـە كێـو بەرزتر بێ یان لوتکەو دوندی کێو ٥ بارکۆنی باڵەخانە.

**القَـــذُوف**: دوور ٥ تیرێـــك پـــەڕی پێوەنەبن.

**القذيفة**: هاوەنو هاوێژەر ٥ گولە تۆپو قومبولە کەبەهۆی تـۆپو فرۆکـەوە دەهاوێـژرێ ٥ جنێـوی ناشـیرین ٥ (ك: قذائف).

**الُمتَقاذِف**: خۆ شرۆو بازهاوێژی خێرا ٥ دەگوترێ:

**فَرَسٌ متقاذفٌ**: ئەسپێکی خێرا ڕۆیە.

**الَمقَـاذِفُ**: شـوێنی بەفـەتارە چـوون ٥ دەگـوترێ: (فـلان يقــذف بنفـــسه المقاذِف).

**المِقْـذاف**: سـەوڵە؛ دارێـکە سـەرەکەی تەختەیـەکی پـانی پێوەیـە بەلـەمو کەلەکی پێ پاڵ پێوە دەنرێ.

**الُمقَذَفُ**: گۆشتنو قەڵەو.

**المِقْـذَفُ**: ئـامێری شـت هەڵـدانو شـت هاویـــشتن ســـەوڵەی بەلەمـــەوانو کەڵەکەوان ٥ (ك: مقاذف).

**المَقْذَفَـةُ**: بـەمانا (المِقْـذَفُ) دێ ٥ (ك: مقاذِف).

**قَذَلَ فلان قَذْلاً**: فلانكەس لەحەق لای داو ستەمی کرد.

**قَذَلَ في الأمر**: گرنگی دا بەکارەکەو زۆری هەوڵدا ئەنجام بدرێ.

**قَذَلَ فلاناً**: زەبری لەپشتە سەری فلان دا ٥ شوێنی کەوت ٥ ڕەخنەی لێ گرت.

**القاذِلُ**: کەڵەشاخ گر.

**القَـــذالُ**: شـــوێنی بەیەکگەیـــشتنی ئێـــسقانەکانی پـــشتە ســـەری ئادەمیزادو وڵاخە بەرزە.

**القَذَلان**: ئەملاو ئەولای پشتە سەر.

**قَـذال الفـرس**: ئـەو شـوێنەی قایـشی هەوسـارەکە لـەدوا ناوچـەوانیەوە گرێ دەدرێ ٥ (ك: قُذُل واقذلة).

**قَذَمَ له مـن العطـاء قَـذماً**: بەخششی بۆ زۆر کرد.

**قَذِمَ من الماء قُذمةً وقَذَماً**: قومە ناوێـکی خواردەوە.

**القُــذام**: بـەرفراوان ٥ دەگـوترێ: (بئـر قُذام) بیرێـکی ئاو زۆرە.

**القُــذَمُ**: بەخـشندەو سـەخی سروشـت کەسێـك زۆر بەخشندە بێ.

**القُــذُمُ**: بەخـشندەکان، ئـەو مرۆڤانـەی بەخشندەن.

**القُذمَةُ من الماء**: قومە ئاو.

**القذوم مـن الآبـار**: بیرێـك ئـاوی زۆری هەبێ.

**قذى الشَّيْءُ قَـذياً وقَـذىً**: شتەکە چقڵو شتی وای تێدا بوو.

**قَذَت العينُ**: چاوەکە پوشـکەکەی دەردایـە دەرەوە ٥ ڕیپـۆقی دەرکـرد ٥ ڕیپـۆقی دەردا.

**أقــذت عينــه**: چـاوی ڕیپـۆقی دەردا پوشکەی دەرکردە دەرەوە.

**قاذاه**: پاداشی دایەوە.

**قَذّى عَيْنَهُ**: پوشکەی ناوچاوی دەرهێنـا ٥ (فهي مقذية).

**إقتذى الطائر**: باڵندەکە ڕیپۆقی لەچاو دەرکرد.

**الأقــذاء مــن النــاس**: هەتیومــچەو خوێڕی.

**القَــذى**: کـۆی (القــذاة) ئـەو ڕیپـۆقو زەرداوییەیـە کـە لەچـاودا پەیـدا دەبێ ٥ دەگوترێ: (هـو يغـضي علـى القذى) ئەو لەسەر ڕیپۆق چاو لێـك دەنـێ ٥ بەکەسێـك دەگـوترێ زەلیلـیو ژێردەسـتەیی قبـوڵ بکـاو هەوڵی خۆ ڕزگارکردن نەدا.

**القِـذى**: ڕیپـۆقو گڵـە وردە کەلەچـاودا کۆدەبێتـەوەو ڕەنگێـکی مەیلـەو زەرد وەردەگرێ.

**القَذَاةُ**: ئەو ئاو و خوێنەیە کە حوشترو مەڕو بزن پێش بێـچو بوونو دوای بێچو بوونیان لێیان دێتە دەر ٥ ئەو گڵەوردەیـە یـان هەرشتێـکی تـر کـە دەکەوێتە ناو چاوەوە یان دەکەوێتە نـاو ئـاو و شـەرابو دۆو شـتی شلەمەنیەوە ٥ دەگوترێ: (فلان قذاة في عين فلان) فلانکەس چقڵی چاوی فلانکەسە زۆری ڕق لێیە.

**القَذِيُّ**: دەگـوترێ: (رجـل قَـذِي العـين) پیاوێـکە چـاوی شـتی نـامۆی تـێ چووە.

**قَـرَأ الكتـابَ قـراءةً وقرآنـاً**: کتێبەکـەی خوێندەوەو وشە بەوشەو دێـڕ بـەدێڕ سـەیری نـاوەڕۆکی کتێبەکـەی کـردو خوێندیەوە تێی ڕوانیو لێی وردبۆوە.

**قَرَأَ الآية من القرآن**: بـەدەنگ ئایەتەکـەی خوێندەوە وشـەکانی بـەدەم گوتن، جا لـەناو قورئانەکـەدا یـان لەبـەر ٥ (فهـو قارئ).

**قَرأ عليه السلامَ**: سـڵاوەکەی پـێ گەیانـد.

**قَـرَأَ الـشَّيْئَ قَـرءاً وقرآنـاً**: شـتەكەی كۆكردەوەو خستیە پەنایەك.

**أقْرَأت المرأةُ**: ئافرەتەكە كەوتە حاڵەتی عـادەتی مانگانـەی خۆیـەوە ◊ یـان لەحەیز پاك بۆوە ◊ (فهي مُقْرِئ).

**أقـرأ الرجـلُ**: پیاوەكـە دەسـتی كـرد بەخودا پەرستیو تاعەت.

**أقـرأت النجـومُ**: ئەسـتێرەكان نزیكـی هەڵهاتن یان ئاوابوون بوون.

**أقرأت الرياحُ**: بایەكە هەڵی كرد.

**أقرأ فلاناً**: فلانكەسی واڵ كرد بخوێنێ ◊ (فهو مُقْرِئ) ◊ دەشگوترێ: (أقـرأهُ القــرآن) قورئانەكــەی پێــگەیاند (أقرأهُ السلامَ) سلاوەكەی پێگەیاند.

**قارَأَهُ مُقَارَأةً وقِراءً**: هاوبەشی كـرد لـە قورئان خوێندن دا.

**قَـرَّأ المـرأةَ**: ئافرەتەكـەی بەنـد كـرد بەمەبەســــتی چـــــاوەڕوانی پاكبوونەوەی لەعادەتی مانگانـەی ◊ (فهي مُقَرَّأة).

**إقـترأ القـرآنَ والكتـابَ**: قورئـان یـان كتێبەكەی خوێندەوە.

**تَقَرَّأ**: كەوتـە حاڵـەتی خـودا پەرسـتیو نوسوك كردنەوە.

**إستقرأهُ**: داوای لێ كرد كـە قورئـانی بـۆ بخوێنێ.

**الإستقراء**: لێكۆڵینەوەو بەدوداچوونی جوزئیـــاتو تاكـــە بـــۆ گەیـــشتن بەئاكامی كوللیو ڕەها.

**أقْرَأُ**: (إسم تفضيل) واتە: باشتر خوێن.

**القارِئ**: خوداپەرست ◊ موتەنەسیك.

**القـرآن**: نامـەی پـەروەردگارە: كـە بـە فریـــشتەی تایبـــەت دا ناردوویـــەتی بۆسەر پێغەمبەری خـۆی حـەزرەتی موحەممـەد (د.خ) كـە ئێـستا لـەناو دوو بەرگی جیاجیادا نوسراوەتەوەو دەخوێندرێتـــــــەوە ◊ جـــــــۆری خوێندنـــەوەی قورئـــان ◊ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿فَـإِذا قَرَأْنـاهُ فَـاتَّبِعْ قُرْآنَـهُ﴾: كـە قورئانمـان بەسـەردا خوێندییــەوە تــۆیش بــەو جــۆرە بیخوێنەوە.

**القُرْأُ**: حەیز ◊ پاكبوونەوە لـە حـەیز ◊ سەرەوای شـیعر ◊ (ك: أقـراء وقُـرُوءُ واقْرُؤ).

**أقراء الشعر**: سەرەوای شیعرو بەحری شیعرو جۆرەكانی.

**القَرَّاءُ**: كەسێـك بـاش قورئـان بخوێنـێ، قورئان خوێنی باش بێ.

**المَقْـرَأةُ**: شوێنێـكە لەمزگـەوت دا یـان ئارامگایەكـە قورئانخوێنـەكان تێیـدا كۆدەبنەوە بۆ قورئان خوێندن.

**قَرَبَ الـسَّيفَ قَرْبـاً**: كیفـی بـۆ شمـشێرەكە دروست كرد ◊ شمشێرەكەی خـستە نـاو كالانەوە.

**قَرِبَ الإبلَ:** بەشەو حوشترەکانی لێخوڕین بۆئەوەی بەیانی زوو بیانباتە سەر ئاو و ئاو بخۆنەوە.

**قَرِبَ الشَّيْئَ قُرْباً وقرباناً:** لەشتەکە نزیك بۆوە ◦ دەستی بۆ بردو خەریکی بوو ◦ بۆ تەشدیدو زێدەڕۆیی لەنەهی کردن لەشتێك دەگوترێ: (لاتقرب ذلك) ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى﴾ ◦ (ولاتقربا هذه الشجرة).

**قَرُبَ الشَّيْئُ قرابةً وقرباً:** شتەکە نزیك بۆوە، (فهو قريب) ◦ دەشگوترێ: (قَرُبَ منه، وقَرُبَ اليه).

**أقربت الحامل:** ئافرەتە سك پڕەکە نزیك کاتی منداڵبوون بۆوە.

**اقرب الدُمّلُ:** دومەڵەکە خەریکە بکاو بتەقێ.

**أقربَ المستقي الإناءَ:** ئاوگێڕەکە گۆزەکەی نزیك پڕبوون کردەوە.

**أقربَ فلاناً قراباً:** کالانە شمشێری بۆ فلان دروست کرد.

**أقربَ السيفَ والسكين:** کیفی بۆ شمشێرەکەو کێردەکە دروست کرد، یان خستیە ناو کیفو کالانەوە.

**قاربَ الإناءُ:** کوندە ئاوەکە نزیکە پڕبێ لەئاو ◦ دەگوترێ: (إناء قربان) ◦ (وقِصْعَةٌ قربى).

**قارب فلان في أموره:** فلانکەس لەکارەکانیدا میانەڕەو بوو.

**قاربَ الخطوَ:** هەنگاوەکانی نزیك کردنەوە.

**قارب فلان فلاناً:** فلانکەس گفتوگۆی جوانی لەگەڵ فلاندا کرد ◦ فلانکەس ڕاوبۆچوونی لەگەڵ فلاندا کرد.

**قَرَّبَ فلانٌ:** فلانکەس کەلەکەی ئازاری بوو ◦ دەستی خستە سەر کەلەکەی.

**قَرَّبَ الفرسُ:** ئەسپەکە بازێکی هێواشی هاویشت ◦ یان بەهێواشی هەنگاو دەنێ ◦ دەگوترێ: (جاء فلان يقرِبُ به فرَسُهُ).

**قَرَّبَ الشَّيْئَ:** شتەکەی نزیك کردەوە ◦ دەگوترێ: (قَرَّبه منه) و (قَرَّبَه اليه) و (قَرَّبَه عنده).

**قَرَّبَ القُربان:** قوربانییەکەی پێشکەش کرد.

**قَرَّبَ قِراباً:** کوندەئاوی دروست کرد.

**إقتربَ القومُ:** خەڵکەکە هەندێکیان لە هەندێکیان نزیك بوونەوە.

**إقتربَ الوعدُ:** وادەکە نزیك بۆوە ◦ دەگوترێ: (إقتربَ مِنه) لێی نزیك بۆوە.

**تقارَبَا:** هەریەك لەو دووانە نزیك بوونەوە.

**تقارب الزَّرْعُ:** کشتوکاڵەکە نزیکە پێ بگا.

**تقارب الوعدُ**: كاتەكە نزيك بۆوە.

**تقرّبَ اليه**: هەوڵی دا لێی نزيك بێتەوە ٥ دەشگوترێ: (تَقَرّبَ الى الله بالأعمال الصالحة) هەوڵی دا بەكردەوەی چاك لەخودا نزيك بێتەوە.

**إستَقرَبَهُ**: بەنزيكی دانا ٥ هيوای خواست نزيك بێ.

**التَّقرُبات**: دەگوترێ: (ظهرت تقربات الماء) نيشانەی هەبوونی ئاو دەركەوت ٥ بيرهەڵكەنو كارێزكەن كەدەگاتە بەردە وردەو جۆرە زيخێك بۆی دەردەكەوێ كەنزيكە بگاتە ئاو.

**القارِبُ**: بەلەم ٥ بەلەمی كێشت بەلەمێكە لەدرێژەوەيە لەسەر شێوەی بەلەمی ناو ئاو.

**القِرابُ**: كيفو كالانی شمشێرو كێردو شتی وا ٥ تورەكەو جۆرە جانتاو هەمبانەيەكە موسافير هەندێ پێداويستی خۆی تێدا هەڵدەگرێ.

**القُرابُ**: نزيك ٥ دەگوترێ: (ماهو بعالم ولا قراب عالم) نەزانايە نە لەزاناييش نزيكە ٥ يان دەگوترێ: (أتيته قراب العشي) و (قراب الليل).

**القَرابَةُ**: خزمايەتی نزيك لێك نزيكی لە خزمايەتی دا ٥ دەگوترێ: (هم ذوو قرابتي).

**القِرابَةُ**: ئەوەی بەشەو حوشتر بەرێ بۆئەوەی بەيانی زوو بيانبا بۆسەر ئاو.

**القُرابَةُ**: بەمانا (القُرابُ) دێ.

**القُرْبُ**: نزيكی ٥ خزمايەتی ٥ دەگوترێ: (بيني وبينه قُرْبٌ) ٥ خاليگەو كەلەكە.

**القَرَبُ**: بەمانا (القِرابَةُ) دێ ٥ بيری ئاو نزيك ٥ ئەو شەوەی لەسەر ئاو دەمێننەوە تابەيانی.

**القُربى**: خزمايەتی.

**القُربان**: هەرشتێك خۆی پێ لەخودا نزيك بكرێتەوە ٥ جا قوربانیو شتی وابێ يان كردەوەی چاكە بێ ٥ پياوی هاونشينو نزيك لەپاشا ٥ (ك: قرابين).

**القُرْبَةُ**: خزمايەتی، لێك نزيكی لەخزمايەتی دا ٥ دەگوترێ: (بينی وبينه قُرْبَةٌ) هەرشتێك خۆی پێ لەخودا نزيك بكەيتەوە لەقوربانیو خێرو چاكە.

**القِربَةُ**: كوندەو دێمكە ٥ زەرفێكە لە پێست دروست دەكرێ بەم جۆرە لايەكی دەدورێو ئاوی تێدەكرێ.

**القريب**: نزيك لەروی مەكانو شوێنەوە يان لەروی مێژووەوە يان لەروی

بنەچەو نـژادەوە ٥ هەروا نـاوە بـۆ بەحرێـــك لەشــيعری فارســـی كێـشەكەی (مفـــاعيلن مفـــاعيلن فاعلاتن).

**القَرِيبة**: خاوەنی خزمايەتی يان نزيكی لەشتی تردا.

**القَوْرَبُ**: ئاوێك ئەوەندە زۆر بێ بەری نەگيرێ.

**المتقارب من الرجال**: پياوی كورتەبالاّ ٥ بەحرێـــكە لەبـــەحری شـــيعر كێشەكەی هەشت جار (مفعولن).

**المُقَـارِبُ**: مامناوەنـديی لـەنێوان بـاش‌و خراپ.

**المَقْـرَبُ**: رێـــگەی كـورت ٥ شــەورەو ٥ رۆيشتنی شەو.

**المَقْرَبَـةُ**: بـەمانا (القَرَابَـةُ) دێ ٥ رێـگای كـــورت ٥ يـــان رێـــگای كـــورت كەدەتكەيـــەنێ بەرێـــگای درێـــژ ٥ خانو ئوتێل بۆئەوەی رێبـوار پشوی تێدا بدەن.

**المُقْرَبَةُ**: ئەسپ يان حوشـترو وڵاخـی تـر كەكاتی ئـەوەيان هاتبـێ بـۆ سـواريی بـەكار بهێنـــدرێن ٥ وڵاخـــە بـــەرزە خۆشەويـست بـێ ئـاخورو لـەوەرو ئاليكی لێ نزيك بكرێتەوە.

**المُقَرَّبات**: بەمانا (التَقَرُّبات) دێ.

**القَرَبـوسُ**: قەپوچـكی زيـن، قەپوچـكی پيشەوەو دواوە ٥ (ك: قرابيس).

**قَرَتَ الدَّمُ قَرُوتاً**: خوێنەكە وشـك بـۆوە ٥ دەگوترێ:

**قَـرَتَ الظفـرُ**: خـوێن لـەژێر نينۆكـەكان كۆبۆوەو وشك بوو.

**قَرَتَ الرجلُ**: پياوەكە بێدەنگ بوو.

**قَرِتَ الرجلُ قَرَتاً**: پياوەكە دەم‌وچاوی گۆڕا لەخەفـــەتان يـــان بـــەهۆی رقـــەوە ٥ دەگوترێ: (قَرِتَ وَجْهُهُ).

**القَرَتُ**: شتی بەستوی سپی.

**قَرَثَـهُ الأمـرُ أو الغَـمُّ قَرثـاً**: كارەكـە نارەحەتی كردو وەزعی تێك دا.

**قَرِثَ قَرَثاً**: ماندووی كرد.

**قَرَحَهُ قَرْحاً**: بريندارى كرد.

**قَرَحَ فلاناً بالحق**: بەحەق‌و عەداڵەتخوازيی پێشوازی لە فلاّنكەس كرد.

**قَرِحَ قَرَحاً**: چەند برين‌و روشاوێكی پێوە دەركـەوت ٥ دەگـوترێ: (قَـرِحَ جِلْـدُهُ)، (وقَرِحَ قَلْبُهُ من حزن).

**قَرِحَ الحيـوان**: گيانلەبەرەكە پەڵەی سپی بچكۆلە بەناوچاونييەوە دەركەوت.

**قَرِحَ للشَّيْئِ**: خەمی بۆ خوارد.

**أقـرَحَ فـلان**: فلاّنكـەس دەم‌وچـاوی زيبكەو ئاوڵاوی بوو.

**قارَحَـهُ**: بـەرەنگاری بـۆوە ٥ روبـەڕوی وەستا.

**قَرَّحَ الشجرُ**: درەختەكە پۆخ‌وچرۆكانی دەركەوتن.

**قَـرَّحَ سـنّ الـصغيرِ:** ددانـی منداڵەکـە خەریکە دەرکەون.

**قَرَّحَ الجِسمَ:** جەستەکەی بریندار کرد.

**قَرَّحَ الوَشمَ:** شوێنی کوتانی خاڵەکانی جەسـتەی بـەدەرزی هاژنیـەوە.

**إقـترح بِئـراً:** بیرەکـەی هەڵـکەند لەشوێنێـک بـیری لێ هەڵنەکەندرابوو.

**إقترح الأمـر:** کارەکەی داهێنا، هێنایە گۆڕێ.

**إقترح الكلامَ:** بە ئیرتیجالو سەرپێیی قسەکانی کرد.

**إقـترح الـشَّيْءَ:** شـتەکەی هەڵبـژارد ٥ دەگوترێ:

**إقترح عليه صوت كذا وكـذا:** لـەجیاتی ئەو دەنگی فلانو فلانی هەڵبژارد.

**إقـترح الـرأي:** ڕاو بۆچونێـکی خـۆی ئامـادەکرد بۆئـەوەی بیخاتـە بـەر باسو لێکۆڵینەوە.

**تَقَـرَّحَ الجِـسدُ:** جەسـتەکە زیبکـەو دومەڵو ناوڵەی تێدا دەرکەوتن.

**تَقَرَّحَ فلان للأمـر:** فلانکەس ڕوبەڕوی کارەکە بۆوە.

**الإقـتراح:** فیکـرەو بیرۆکـە ئامـادە دەکرێو شیدەکرێتەوەو دەخرێتە سـەر مێـزی بـاسو لێـکۆڵینەوەو بڕیار لەسەردان.

**القـارِحُ مـن ذي الحـافر:** ئەوەیـە وڵاخو ئاژەڵەکـە پێـنج سـاڵ تـەواو بکـاو ددانـی پـەنا ددانـی چـوارینەی کەوتبێو لەشوێنی ئەو کەڵبەی تـر ڕوابێ ٥ بـەکوردی پێیـان دەگـوترێ: (شیلە) ٥ هەرکەسێـک گوێدرێژێـک یـان هێـسترو شـتی وا مامەڵـە بکـا دەمـی وڵاخەکـە هەڵدەپـچڕێ دەڕوانێ ئاخۆ شیلەی کەوتوون یـان نا.

**القـراحُ مـن كـل الـشَّيْءِ:** پاڵفتـە ٥ دەگـوترێ: (ماء قراح) ئـاوی صـاف ٥ زەوییـەك ئامادەبێ بـۆ کـشتوکاڵو هـیچ بینـاو باڵەخانەیـەکی تێـدا نەبێ.

**القُـرْحُ:** بـرین ٥ گروێییەکـە توشـی بێچوە ئاژەڵ دەبێ.

**القَرْحَةُ:** زیبکـەو دومـەڵ کاتێ دەگەنـە ئـەوەی بگـەنو ناوەوەیـان ببێتـە کێمو زوخاو ٥ (ذو القـرح) نازنـاوی (إمرأ القيس) بووە.

**القُرحَـةُ:** بـەمانا (القَرحَـةُ) دێ ٥ سـپیاییەکە بەئەنـدازەی دیرهەمێـک یـان بـچوکتر بەناوچاوانی ئەسپەوە دەبێ.

**القـريح:** بریـندار ٥ ئـاوی صـافو بێگەرد.

**قَرِيح السحابَة**: ئاوى باران لەكاتى هاتنە خوارەوەى دا.

**القَرِيحَةُ من كل شيئ**: سەرەتاو نۆبەرەى شت ٥ دەگوترىٚ: (شربتُ قريحة البئر): نۆبەرەى ئاوى بيرەكەم خواردەوە يەكەمجار كەئاوى بيرەكەيان دەرهێنا من لێم خواردەوە.

**القريحة من الإنسان**: سروشتو تەبيعەتى مرۆڤ ئەو سروشتو فيترەتەى لەسەرى دروستكراوە ٥ مەلەكەو خودا داديٚكە ئادەميزاد بەهۆى ئەو مەوهيبەوە دەتوانىٚ راى پەسەند دەربڕىٚو قسەى جوانو ئاوازە بلىٚو شتى ناياب دەربڕىٚ.

**قَرَدَ المالَ قَرداً**: ماڵەكەى كەسب كردو كۆى كردەوە ٥ دەگوترىٚ: (قَرَدَ لعياله) ماڵو سامانى بۆ خێزانى كۆكردەوە.

**قَرِدَ البعيرُ قَرَداً**: حوشترەكە ئەسپێى زۆر بوون.

**قَرِدَ الشَّعرُ والصوف**: مو و خورييەكە گرژ بوو گرىٚگرىٚ وەستاو كەمێلى بەقەراخەكانيەوە زۆر بوو.

**قَرِدَ الأديمُ**: پێستەكە داوەشاو دارزى.

**قَرِدَ فلان**: فلاٚنكەس بەهۆى زمانگيرانو ماندوبوونەوە بىٚ دەنگ بوو.

**قَرِدَ لِسان فلان**: زمانى فلاٚن رەوان نەبوو توورىو پرتەپرتى پێوە ديار بوو.

**قَرِدَتْ أسنانه**: ددانەكانى بچوك بوونەوەو كەمێك لە پوكەكان جيابوونەوە ٥ دەشگوترىٚ: (قَرِدَ فَمُهُ).

**أقْرَدَ البعيرُ ونحوه**: حوشترەكە ئەسپىٚ حوشترى زۆر بوون.

**أقْرَدَ فلان**: فلاٚنكەس بێدەنگ بوو خۆى بەمردوو نيشان دا ٥ زمانى گيراو بىٚدەنگ بوو.

**أقرد الى فلان**: زەليلو ملكەچى فلاٚنكەس بوو.

**قَرَّد فلان**: فلاٚنكەس زەليلو ملكەچ بوو ٥ دەشگوترىٚ: (قَرَّد الى فلان).

**قَرَّدَ البعيرَ**: ئەسپێى ناو جەستەى حوشترەكەى دەرهێنا.

**قَرَّد فلاناً**: بەنەرمو نيانى فێڵى لە فلاٚنكەس كرد.

**تَقَرَّدَ الشَّعرُ ونحوه**: مووى گرژبوونو تێك هالاٚ.

**تَقَرَّدَ الدقيقُ ونحوه**: ئاردەكە لەناو ئاوەكە كلۆ كلۆ بوو ٥ هەر لەم مانايەدايە كە عومەرى كوڕى خەتتاب دەفەرموىٚ: (ذري الدقيق وأنا أحرك لئلا يتقرَّد) تۆ واز لەئاردەكە بێنە لەناو ئاوەكەدا من تێكى هەڵدەدەم

بۆنەوەی کلۆکلۆ نەوەستێ.

**القُرَادُ**: جۆرە ئەسپێیەکە قاچی زۆری هەن لەناو کوڵكو موی ئاژەڵو پەروپۆلی باڵندەدا دەژی ٥ گوێ مەمك.

**القِرْدُ**: مەیمون ٥ نزیکترین گیانلەبەر کە دەشوبهێتە مرۆڤ ٥ (ك: أقراد وقرود وقِرَدَة).

**القَرَدُ**: ئەو کەمێڵو خشتو خوڵو گەندە موومیە کە لەکوڵكو خوری هەڵدەومرێ ٥ لقە دارخورما کە توێکڵی لێ داڕندرابێ.

**القَرَاد**: ئەسپێو مۆرانە کەلەئاردو چەند جۆرە خواردنێكو داردا بەدی دەکرێو هەروا لە خوریو شتی وایش دا دەبێ.

**القرودُ**: بێدەنگو ژێردەستە.

**قَرَّدَ فلان**: فلانکەس زەلیلو ملکەچ بوو ٥ خۆی بچوك کردەوە.

**إقرندح الرجلُ**: پیاوکە خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ.

**إقرندح لفلان**: دەستدرێژی کردە سەر فلان.

**القُرْدُحَةُ**: ئەو پارچە سێگۆشەیەیە کەلە غوضروفی قورگ دا دەردەکەوێ پێی دەگوترێ سێوی ئادەم.

**القُرْدوحُ**: مەیمونی گەورەو زەلام.

**القَرْدَدُ**: زەوییەکی تەختو پتەو و بەرزە.

**القُردُودُ**: بەمانا (القَرْدَدُ) دێ.

**القُرْدودة**: فەقەرە ٥ سەرانسەری کێو ٥ (ك: قراديد).

**القِرْدِيدَةُ من الرجال**: پیاوی قسە توندو قسە پڕماناو بەپێز ٥ شێوەڵی ناوقەدی پشت ٥ (ك: قراديد).

**القِرْدَعُ**: جۆرە ئەسپێیەکە لە جەستەی حوشترو مریشك دا پەیدا دەبێ ٥ تاکەکەی (قِرْدَعَة).

**القُرْدوعُ**: مێرولەی بچکۆلە.

**قَرَّ قَرِيراً**: باڵندەکە قیڕانی، کەوەکە قاسپاندی.

**قَرَّت الحَيَّةُ**: مارەکە فیشکاندی.

**قَرَّ عليه الماءُ قَروراً**: ئاوی بەسەردا هەڵڕشت.

**قَرَّ اليوم قَرّاً**: ئەمڕۆ سارد بوو.

**قَرَّ بالمكان قَرّاً وقَراراً وقُروراً**: لەشوێنەکە نیشتەجێ بوو، دامەزرا ٥ دەگوترێ: (قَرَرت في هذا المكان طويلاً) زۆر لەم شوێنەدا مامەوە.

**قَرّ اليوم قَرّاً**: ئەمڕۆ زۆر سارد بوو.

**قَرَّت عَيْنُهُ**: چاوی فێنکایی هات ٥ (فهو قرير العين).

**أقَرَّ**: کەوتە ناو سەرماو سۆڵەوە ٥

**اصابتهم قِرَّةٌ:** سەرما لێی داون ٥ هەرجۆرە لەرزو سەرمایەك تووشی ئادەمیزاد بێ.

**القُرَّةُ:** هەرشتێك چاو پێی خۆش بێو فێنکایی چاوبێ ٥ دەگوترێ: (هو قُرَّةُ العين) ئەو هۆی فێنکایی چاوە ٥ یان دەگوترێ: (هو في قُرَّةٍ من العيش) ئەو لە گوزەرانی خۆش دایەو ژیانی نەرمو نۆڵە ٥ بنکرێ بنکی مەنجەڵ.

**قُرَّةُ العين:** ڕوەکێکی ئاوییەو تەمەندرێژە لەدەم جۆگاو شوێنی ئاودراودا دەڕوێ گەڵاکەی سەوزەو دەخورێ وەکوو ئەسپیناخو کەرەوزو شتی وا.

**القَرورُ:** ئاوی سارد کە بۆ خۆشۆردن بەکاربێ ٥ فرمێسکی سارد کەلەکاتی خۆشی دا دەرژێندرێن ٥ ئافرەتێك کە پێویست نەکا کل لەچاو بنێ.

**المُستَقَرُّ:** چەسپاندنو بەردەوام بوون ٥ دەگوترێ: (لكل نَبَأ مُستَقَر) بۆ هەموو هەواڵێك ئاکامو سەرەنجامێك هەیە ٥ (صار الأمر الى مستقره) کارەکە گەیشتە ئاکامو جێگیر بوو.

**المَقَرُّ:** شوێنی ئارامگرتنو جێگیربوون ٥ (ك: مَقَارّ) ٥ دەگوترێ: (أذكرني في المقارّ المقدسة) لە شوێنەپیرۆزەکان دا یادم بکەو بیرت نەچم ٥ شوێنێك ئادەمیزاد بیکاتە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی.

**المُقَرِّرُ:** ئەندامی لیژنەیەکە کەلیژنەکە ڕونکردنەوەی ڕای لیژنەکە بەو دەسپێرن.

**المُقَرَّرُ:** (أمر مُقَرَّر) کارێکی چەسپاو و بڕوا پێ کراو ٥ فەرمانێك واژو کرابێ لەلایەن کەسێکەوە ڕوخصەتی ئەو واژوکردنەی هەبێ ٥ لەبواری قوتابخانەو خوێندکارەوە کۆمەڵە سەرەباسو زانیارییەکن پێویستە قوتابی لەماوەیەکی دیاریکراودا بیانخوێنێو فێریان ببێ.

**المَقَرَّةُ:** حەوزی بچوك کەئاوی تێدا کۆبێتەوە.

**المقرور:** دەگوترێ: (يوم مقرور) ڕۆژێکی ساردو سەرمایە ٥ (رجل مقرور) پیاوێکە سەرما لێی داوە.

**قَرَسَهُ البَردُ قَرساً:** سەرما تینی بۆ هێنا ٥ دەستو قاچی چواندون.

**قَرِسَ الماءَ:** ئاوەکەی زۆر سارد کرد.

**قَرِسَ البردُ قَرَساً:** سەرما توندبوو تینی هێنا.

**قَرِسَ الإنسانُ:** ئادەمیزادەکە سەرما لێی دا دەستو قاچی چونو لەجمو جۆڵ

کەوتن‌و نەیتوانی کاربکا ٥ دەگوترێ: (قَرِسَت أصابعُهُ) دەست‌و پەنجەی چون‌و کاریان پێ ناکرێ.
أقرَسَ العودُ: دارو شورك‌و نەمامەکان وشك بوون‌و بەهۆی سەرماوە تەڕاییان تێدا نەماوە.
أقرس البردُ أصابِعَهُ: سەرما دەست‌وپلی چواندن‌و جەوجوڵیان پێ ناکرێ ٥ دەگوترێ: (أقرَسَهُ البَردُ) سەرما دەست‌و پەنجەی چواندن‌و هیچی پێ ناکرێ.
أقرَسَ الماءَ: ئاوەکەی زۆر سارد کرد.
قَرَّسَ الشَّيْئَ: زێدەڕەوی کرد لەساردکردنی شتەکە ٥ دەگوترێ: (قَرَّسَ الماءَ في الإناء) ئاوەکەی لەقاپەکەدا زۆر سارد کردو گەیاندییە ئاستی بەستن.
القارِسُ: سەرمای کوشندەو زۆر سارد ٥ دەگوترێ: (أصبح الماء قارساً) ئاوەکە زیاد لەئەندازە ساردبوو.
القَرْسُ: سەرمای زۆر بەشیدەت ٥ دەگوترێ: (ليلة ذات قرس) شەوێکی زۆر سارد ٥ سەرماو سۆڵ‌و سەهۆڵبەندان.
القِرسُ: شتی بەستو و بووبەسەهۆڵ ٥ سەرمای توندو کوشندە.
القريس: دەگوترێ: (أصبح الماء قريساً) ئاوەکە بەستی بوو بەسەهۆڵ ٥ خواردنی بەسەهۆڵ بوو بەسەرما بەستوو ٥ دەگوترێ: (سمك قريس) ماسییەکی کوڵاو یان برژاو یان بەهۆی سەرماوە ڕەق کراوە بووە بەسەهۆڵ بەستو.
قَرَشَ الشَّيْئَ قَرْشاً: شتەکەی لێرەو لەوی کۆکردەوەو خستیە سەر یەك ٥ دەشگوترێ: (قَرَشَ لعَيالِهِ) کاسبی بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆی کرد.
قَرَشَ من الطعام: کەمێکی لەخواردنەکە دەستکەوت.
قَرِشَ في معيشته: ژیانی تەنگ‌و گوزەرانی ناخۆش بوو.
قَرِشَ قَرَشاً وقُرْشَةً: ڕوخساری داماڵدرا لەبەر زۆر سورهەڵی.
أقرشت الشَّجَّةُ: ئێسقانەکەی درز پێبرد وەلێ وردوخاشی نەکرد.
أقرش فلان بفلان: فلانکەس فیتنەیی کردو چڕنوکی لەفلانکەس گرت ٥ عەیب‌و عارەکانی پێ گوتن.
قَرَّشَ بين القوم: نێوانی خەڵکەکەی وروژاندو فیتنەیی لەناویان بەرپا کرد.
قَرَّشَ لعياله: کاسبی بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆی کرد.
قَرَّشَ فلاناً: فلانکەسی بەقوڕەیشی لەقەڵەم دا.

**إقترَشَ لأهله:** ماڵو سامانی بۆ ماڵو منداڵی خۆی کۆکردەوە.

**إقترش الرماحُ:** ڕمبەکانی لێك خشاندن‌و دەنگیان لێ هات.

**إقترش فلان بفلان:** فلانکەس فیتنەیی بۆ فلان کردو ویستی زیانی پێ بگەیەنێ.

**تقارش القوم:** خەڵکەکە کەوتنە وێزەی یەکتری‌و لێکیان دا.

**تقارشت الرماحُ:** ڕمبەکان لێك خشان دەنگیان لێ هات.

**تقرّشَ القومُ:** خەڵکەکە کۆبوونەوە.

**تَقَرَّشَ فلان في معيشته:** فلانکەس گوزەرانی تەنگ بوو.

**تَقَرَّشَ لأهله وعياله:** ماڵو سامانی بۆ خێزان‌و منداڵی کۆکردەوە.

**تَقَرَّشَ الرجلُ:** پیاوەکە خۆی بەقوڕەیشی حیساب کرد ○ خۆی شوبهاند بەقوڕەیشییەکانەوە ○ خۆی لەکارو پیشەی پەست‌و نزم بەدوور گرت.

**تَقَرَّشَ الرماحُ:** ڕمبەکان لێك خشان‌و دەنگیان هات.

**تَقَرَّشَ المالَ والمتاعَ:** ماڵو کاڵای کۆکردەوە.

**تَقَرَّشَ الشَّيْءَ:** شتەکەی یەکە یەکە وەرگرت.

**القَرْشُ:** ئەوەی لێرەو لەوێ کۆدەکرێتەوە.

**القِرْشُ:** جۆرە ماسییەکی غوزروفییە ترسناك‌و زەێنەخرۆیە ○ جۆرە پارەیەکە لەهەندی وڵاتدا مامەڵەی پێ دەکرێ، ئەندازەی ئەم جۆرە پارەیە بەگوێرەی ڕۆژگارو کات‌و شوێن گۆڕدراوەو دەگۆڕێ، ئێستا بەشێکە لەسەد بەشی جونەیهی میصری یان لیرە ○ (ك: قروش).

**قريش:** خێڵێکی عەرەبن‌و دەچنەوە سەر موزەرو لەمەککەو دەوروبەری نیشتەجێ بوون حەزرەتی موحەممەد (پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) ) لەو هۆزە عەرەبە ڕەسەنەیە.

**القَرَشَةُ:** خرمەخرمی سمی ئەسپە کە بەکۆمەڵ دەڕۆن بەتایبەتی کەبەشەو دەڕۆن دەنگەکە باش دەبیسترێ ○ خرەی گوێز کە بیانجوڵێنی.

**القِرْواش من الرجال:** پیاوی خۆ تێهەڵقورتێنەر لەکارو بارێك کە پەیوەندی بەئەوەوە نیە ○ پیاوی سەر زل.

**القُريش:** بەهێز ○ جۆرە پەنیرێکە چەوری کەمەو وشکە.

**المَقْرَشَةُ**: ساڵی گرانیو فاتوفڕی.

**القِرْشَبُ من الرجال**: پیاوی زۆر خۆر ٥ (ك: قراشب).

**قَرَصَهُ قَرْصاً**: نەقورچکی لێ گرت.

**قَرَصَهُ البُرْغُوث**: مێشوله گەستی.

**قَرَصَتْهُ الحَية**: مار پێوەی دا، گەستی.

**قَرَصَ العجينَ**: هەویرەکەی هەنگوتك هەنگوتك کرد.

**قَرِصَ الرجلُ**: پیاوەکە بەردەوام بوو لەسەر نەفرین کردنو باسکردنی پاشملە بەخراپە.

**قارَصَهُ**: هەریەکە لەوانە ئەزیەتی ئەوی تری دا بەزوبانو تانەو تەشەر لکێدان ٥ دەگوترێ: (كان بينهما مقارصات).

**قَرَّصَ**: بۆزێدەڕۆیی لەمانای (قَرَصَ) دێ.

**قَرَّصَ العَجينَ**: هەویرەکەی کردە هەنگوتك هەنگوتك.

**قَرَّصَ الماءَ**: ئاوەکەی ئەوەندە ساردکرد زوبان بتەزێنێ.

**تقارَصا**: ئەو دووانە هەریەکەیان بەقسەی ناخۆش پێك گوتن ئەزیەتی ئەوی تری دا

**القارِصُ**: دۆی ترشو ماستی ترش کەزوبان بگەزێ ٥ دەعبایەکە وەکوو مێشوله دەگەزێ.

**القارِصة**: جنێو و قسەی ناشیرین کە دەروونی بەرامبەر ئازار بدا ٥ (ك: قوارِص).

**القراصيا**: درەختێکی بەرداره لە پێڕی (الوردية)یە لەوڵاتی میصر پێی دەگوترێ بەرقوقی وشك بوو ٥ لەوڵاتی شام پێی دەگوترێ قۆخە وشکە.

**القَرّاصُ**: دەگوترێ: (لجام قَرّاصٌ) لغاوێکە ئازاری ولاخەکە دەدا.

**القُرّاصُ**: ڕوەکێکە دەشوبهێتە ڕوەکی جیرجیر، درێژدەبێو گوڵێکی زەردی هەیە تفتیو تیژیەکی تێدایە وەکوو تفتی جیرجیر، بەرە دەنکێکی وردو سووری هەیە حەیوانات حەزی لە خواردنیەتی ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوەکێکی گیایی لە پێڕی (القراصية) چقڵێکی زۆر باریکی هەیە ئەگەر مرۆڤ دەستی بگاتێ تێی ڕادەچێو زەرداوێکی تیژو سوتێنەری لێ دێتەدەرو ئازار لەدەستی دا پەیدا دەکا ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوەکی (الوَرْس) کە ڕوەکێکی (الفراشية)یەو لە وڵاتی عەرەبو حەبەشەو هیندوستان دەڕوێ، مادەیەکی سور ڕەنگی ڕاتینجی تێدایە ٥ هەروا ناوە بۆ (البابونج)

که گوڵەسپی (الأقحوان)ە بەوشکی ٥ دەشگوترێ: (أحمر قَرّاصٌ) سوری زۆرسور.

**القُرْصُ**: پارچەی پانەوەبووی کەوانەیی وەکوو سینیو دیرهەمو دینارو شتی وا یان شێوەی نان ٥ هەروا ناوە بۆ دیمەنی کەوانەیی خۆر ٥ دەگوترێ: (غاب قرص الشمس) ٥ هەروا ناوە بۆ پارچە ئاسنێکی کەوانەیی وەکوو مەتاڵ کە منداڵ لەجۆرە یارییەك دا هەڵی دەدەن بۆئەوەی بزانن کامیان دەتوانێ دوورتر بیهاوێژێ ٥ (ك: أقراص وقراص).

**القُرْصَةُ**: نانێکی بچوکی پانەوەکراوی کەوانەییيە ٥ (ك: قُرَصٌ).

**القُرُوصُ**: لغاوێك ئەزیەتی ئەسپ بدا.

**المِقراصُ**: کێردی سەر کەوانەیی وەکوو چزوی دوپشك.

**المُقَرَّصُ**: (حليٌّ مقرّص) خشڵی کەوانەییو خڕ.

**المِقْرَصُ**: زەرفێکە شتی تێدا قارص دەکرێ.

**قَرْصَعَ فلان**: فلانکەس بەتەنیا نانی خوارد.

**قَرصَعَت المرأةُ**: ئافرەتەکە بەشێوەیەکی ناشیرین ڕۆیشت.

**قَرصَعَ الكتابَ**: پیتی کتێبەکەی بەوردیو لێك نزیکی دێڕەکانی نوسییەوە.

**تَقَرصَعَت المرأةُ**: ئافرەتەکە کشایەوەو خۆی حەشار دا.

**القُرصان**: دزو جەردەی ناو دەریا ٥ (ك: قَراصنة).

**القَرصَنَةُ**: هەڵکوتانە سەر کەشتیو گەمی لەناو دەریادا.

**قَرَضَ الشَّيْءَ قَرضاً**: شتەکەی بەمقەستو گاز و شتی وا هەڵبڕی ٥ دەشگوترێ: (قَرَضَ بنابه) یان (قرضته الفأرة).

**قَرَضَ المكانَ**: لەشوێنەکەی لادا.

**قَرَضَ فلاناً**: پاداشی فلانکەسی دایەوە.

**قَرَضَ الشّعرَ**: شیعری دانا، شیعری گوت.

**أقرَضَهُ**: قەرزی دایە ٥ دەگوترێ: (أقرضهُ المالَ وغيره).

**قارضَهُ مقارَضةً وقِراضاً**: قەرزی دایە ٥ ماڵی دایە، پارەی دایە بۆئەوەی بازرگانی پێوە بکاو قازانجو زەرەریان بەرێژەیەك بێ کەلەسەری پێك دێن ٥ پاداشی چاکەی دایەوە یان تۆڵەی خراپەکاری لێ ستاند.

**إقترض من فلان**: قەرزی لەفلان وەرگرت.

**إقترض عِرْضَهُ**: غەیبەتی کردو بەخراپی لێی دوا.

**إنقرض الشَّيْئُ:** شتەکە براپەوە.

**إنقرض القوم:** خەڵکەکە ڕۆیشتنو کەسیان لێ نەما.

**تقارضا الشَّيْئَ أو الأمرَ:** بەنۆبەو نۆرە شتەکە وەردەگرن، هەرجارە بۆ یەکیان دەبێ ٥ دەگوترێ: (هما یتقارضان الثناءَ): هەریەکە لەو دووانە ستایشی یەکتر دەکەنو بەیەکتردا هەڵدەڵێن ٥ (الخصمان یتعارضان النظر) ئەو دوو دژە بەرقەوە بۆیەکتر دەڕوانن ٥ (القوم یتقارضون الشِعْرَ) خەڵکەکە شیعریان بۆ یەکتر خوێندەوە.

**إستَقْرَضَ منه:** داوای قەرزی لەفلانکەس کرد.

**القُرَاضَةُ:** ئەو پرزو پاڵو سەرە مقەستو وردەو پردەیەی بەهۆی برینو ڕاستەو پاستەکردنی شتەوە هەڵدەوەرێ ٥ دەگوترێ: (قُراضة الذهب وقراضة الثوب).

**قراضة الفأرة:** ئەو پەتكو پاڵەی لەئاکامی جەواڵ برینو خواردنی مشك هەڵدەوەرێ.

**قراضة المال:** ماڵی خراپو بێ کەڵك.

**القَرَّاضَةُ:** کەسێك غەیبەتی خەڵك بکا ٥ خمخۆرکەو مۆرانە کەلەدارو کاغەزو خوریو ڕیسو شتی وا دەدا.

**القَرْضُ:** ئەو ماڵەی دەیدەی بەیەکێکی تر بەقەرز ٥ هەرکارێك ئادەمیزاد بیکا بەو هیوایەی پاداشی لەسەر وەربگرێتەوە.

**القرض الحسن:** قەرزێکە بدرێ بەبێ سودو قازانجی بازرگانی ٥ (ك: قروض).

**القِرْضُ:** بەمانا (القَرْضُ) دێ.

**القَرِيضُ:** شیعر.

**المِقراضُ:** مقەست، هەرشتێ قوماشو شتی وای پێ ببڕێ ٥ دەشگوترێ: (لسان فلان مقراض الأعراض) زوبانی فلانکەس مقەستی برینو درینی ناموسی خەڵکە.

**المِقْرَضُ:** (إبن مِقْرَض) گیانلەبەرێکە دەشوبهێتە چەقەڵ (إبن عِرْس) بەڵام ئەم تۆزێ جەستەی لەو گەورەترەو زۆر وەکوو چەقەڵ کێوی نیە، لەپێڕی (السمورية)و گۆشت خۆرە.

**قَرْضَبَ فلان:** فلانکەس بەچڵێسیەوە شتەکەی خوارد ٥ شتی وشکی خوارد.

**قَرْضَبَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بەتوندو زەخت بڕی.

**قَرْضَبَ اللحمَ:** هەموو گۆشتەکەی خوارد.

**قَرضَبَ الذئبُ الشاةَ**: گورگەکە هەموو مەڕەکەی خوارد.

**القِرْضابُ**: چڵێس و نەوسن لەخواردن دا ○ دزو جەردە ○ شێر ○ شمشێری برندە کە وێڕای گۆشت ئێسقانیش دەبڕێ ○ (ك: قراضية).

**قَرِطَت المعزى قَرَطاً**: بزنەکە دوو گواریلەی گۆشتینی هەبوون بەلای گوێچکەکانی هەڵواسرابوون ○ (وهو أقرط وهي قرطاء).

**قَرَّطَ الجاريةَ**: گوارەی لەگوێچکەی کچەکە کرد.

**قَرَّط السراجَ**: سوتاوییەکەی لە پڵیتەی چراکە هەڵوەراند بۆئەوەی باش بسوتێ و ڕوناکی بدا.

**قَرَّطَ الكراثَ ونحوه في القدر**: لەناو قاپەکەدا گیاو شتەکەی هەنجنی بۆئەوەی بیکوڵێنێ و بیکاتە پێخۆر.

**قَرَّطَ فَرَسَهُ**: لغاوی ئەسپەکەی خستە دوا گوێیەکانیەوە لەکاتی غارپێکردنی دا ○ دەشگوترێ: (قَرَّط الفرسَ عِنانَهُ).

**قَرَّطَ الخيلَ**: ئەسپەکەی هەڵنا بۆ بازدانی خێراو بەشیدەت.

**قَرَّط على فلان**: کەم کەم شتی دا بە فلانکەس.

**قَرَّط عليه في الطلب**: زۆر ئیلحاحی کرد لەداواکردن لێی.

**قَرَّطَ اليه رَسولاً**: خێرا پیاوێکی نارد بۆلای.

**تَقَرَّطت الجاريةُ**: گوارەی لەگوێی کچۆڵەکە کرد.

**القاريط**: دەنکە خورمای هیندییە.

**القِراطُ**: چرا ○ بڵێسەی چرا ○ ئاگر.

**القراطة**: ئەو سوتاویەی پڵیتەی چرایە کە دەکرێندرێ بۆئەوەی شۆقەکەی خۆش بێ و ڕوناکی زیاد بکا.

**القُرْطُ**: گوارە کە دەکرێتە نەرمەی گوێچکە ○ سورەیا ○ بڵێسەی ئاگر ○ ڕوەکێکی گیایی لەوەڕییە وەکوو وێنجە وایە.

**القِرْطُ**: جۆرە سەوزەو میوەیەکی سەر سفرەیە.

**القيراط**: پێوەرێکی کێشان و پێوانەیە ئەندازەکەی بەگوێرەی ڕۆژگار گۆڕانی بەسەردا هاتووە ○ ئەمڕۆ کێشەکەی چوار دەنکە گەنمە، لەکێشانی زێردا سێ دەنکە گەنمە ○ لەبواری پێوەریی دا بەشێکە لە بیست و چوار بەش ○ لەبواری فیدان دا بریتیە لە سەدو حەفتاو پێنج مەتر.

**قَرْطَب فلان**: فلانکەس ڕقی هەڵسا ○ دەگوترێ: (قَرْطَبَ عليه) ڕقی لێ

هەڵساو لێی تورە بوو ٥ بازێکی توندو بەهێزی هاویشت.

قرطب فلاناً: بەپشتا فلاّنکەسی خستە سەر زەوی ٥ بەسەر پشتەملی دا خستی ٥ دەگوترێ: (طعنه فقَرْطَبَهُ).

قَرْطَبَ الجزورَ: گۆشتو ئێسقانی کوشتییەکەی بڕی.

قَرْطَسَ: نیشانەکەی هەنگاوت.

تَقَرْطَسَ: بەهیلاك چوو، فەوتا.

القِرطاسُ: لاپەڕە کاغەز کەلەسەری دەنوسرێ ٥ هەر شتێك دەنرێتەوەو دەکرێت بەنیشانە ٥ دەگوترێ: (رَمى فقَرطَس) تفەنگەکەی هاویشتو نیشانەکەی پێکا ٥ جۆرە بوردەیەکی میصرییە ٥ حوشتری گەنجو تازە پێگەیشتوو ٥ ئافرەتی تازە پێگەیشتووی سپی پێستو بالاّ بەرز ٥ وڵاخێك ڕەنگی سپی تەواو بیٚو پەڵەی ڕەشی تێدا نەبن ٥ پەڕە کاغەزێك لول دەدرێ لای سەروی پانو بنەوەی تەسك گولەبەڕۆژەو شتی وای تێ دەکرێ بۆ خواردن ٥ (ك: قراطيس).

قَرْطَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڕییەوە.

قَرْطَمَ الخَفّافُ الخُفَّ: خوف دروست کەرەکە لوتی بۆ خوفەکەی دروست کرد.

القُرْطُمُ: ڕوەکێکی کشتوکاڵییە، گوڵەکەی بەکار دەهێندرێ بۆ تەوابیلو بۆ گۆڕینی ڕەنگی خواردنەکە، ڕەنگێکی سوریشی لێ بەرهەم دەهێندرێ.

القُرطومُ من الخُفِّ: لوتی خوفەکە ئەوشوێنەی سەرەپەنجەی تێدەکرێ.

قَرَظَ القَرَظَ قَرظاً: گزگلكو شتی وای کۆکردەوە.

قَرَظَ الجِلْدَ: پێستەکەی دەباغ کرد بەتاڵی گزگلك ٥ دەگوترێ: (قَرَظَ السقاءَ) کوندەو مەشکەکەی دەباغ کرد خاراندی ٥ پندری کرد.

قَرِظ فلان قَرَظاً: فلاّنکەس دوای هیچو پوچیو بێ ڕێزی بۆ بەرێزدارو گەورەو قسە ڕۆیشتوو.

قَرَّظَ فلاناً: مەدحی فلاّنکەسی کردو پەسنی ئەوی باس کرد.

قَرَّظَ الكتابَ: باسی لایەنی باشی کتێبەکەی کردو پێیدا هەڵگوت.

تقارظا المدحَ: هەریەك لەو دووانە مەدحی یەکتریان کرد ٥ دەگوترێ: (هما يتقارظان) ئەو دوو کەسە پەسنی یەکتریان درێژە پێدا.

القارِظ: ئەو کەسەی گزگلك کۆدەکاتەوە.

**القَرّاطُ**: گزگلك فرۆش.

**القَرَظ**: درەختێکی گەورەیە، قەدێکی ئەستوری هەیە وەکوو داری گوێز، جۆرە درەختێکە لەجۆری (السنط)ی عەرەبی صەمغێکی مەشهووری لێ دەردەهێندرێ.

**القَرَظَةُ**: گزگلك ٥ یان بەرێکی وەکوو گزگل وایە.

**القَرَظِيُّ**: دەگوترێ: (أديم قرظِيٌّ) پیستێکی دەباغ کراو بەتالی جەوت و گزگلکە.

**قَرَعَ الشَّيْءَ قَرْعاً**: لەشتەکەی دا، شتەکەی کوتا ٥ دەگوترێ: (قَرَعَ البابَ) لەدەرگاکەی دا تەقولبابی کرد ٥ (قرع راحِلَتَهُ بالسوط وقَرَع المُسِيءَ بالمقراع).

**قَرَعَ الدَّهْرُ بقوارعه**: ڕۆژگار بە بەڵاو کارەساتی خۆی فلانکەسی کوتا.

**قَرَعَ فلاناً الأمر**: کوتوپڕ کارێك بۆ فلان پەیدا بوو.

**قَرَعَ فلاناً بالرمح**: بەڕمب لەفلانکەسی دا.

**قَرَعَ الدابَّةَ بلجامها**: وڵاخەکەی بەلغاو کێشایەوەو نەیهێشت بڕوا.

**قَرَعَ فلاناً بالحق**: فلانکەسی بەحەق و بەڵگە دەمکوت کرد ٥ کێشی کرد بۆکارەکە ٥ هەوڵ و تێکۆشانی لەکارەکەدا بۆ فلان چرکردەوە.

**قُرِعَ لَه العصا**: گۆچانی نیشان درا ٥ بەعەصا تەقەی بۆ کرا ٥ واتە ئاگادار کرایەوە کە ئەو ئیشە ئاوایەو ئەوەی پێویستە.

**قُرِعَ عليه سِنُّهُ**: لەپەشیمانی خۆی ددانی بەیەك کێشان.

**قَرَعَ الشَّيْءَ**: بەشێوەی قورعەو پشك شتەکەی هەڵبژارد.

**قَرِعَ الفِناءُ قَرَعاً**: خانوەکە، حەوشەکە لەدانیشتوان و میوان چۆڵ بوو.

**قَرِعَ ماءُ البئر**: ئاوی بیرەکە وشکی کرد ٥ کۆتایی هات.

**قَرِعَ فلان**: فلانکەس سەری توشی کەچەڵی بوو ٥ (فهو أقرع وهي قرعاء) ٥ (ك: قُرُعُ، وقرعان).

**قَرِعَ النعامَةُ**: نەعامەکە پەروپۆڵی سەری لەبەر پیری هەڵوەرین و ڕوتایەوە.

**قَرِعَ الفصيلُ**: بێچوە ئاژەڵەکە (کاوڕەکە) لەمل و قاچی دا پەڵەپەڵەو زیبکەو دومەڵ پەیدابوون خوری و بەرگنی دەست و ملی ڕوتایەوە ٥ (فهو قَرِعٌ وقريع).

**أقرع الغائصُ**: کابرای مەلەوان گەیشتە بنکی ئاوەکە.

**أقرع المسافرُ**: موسافیرەکە نزیك مەنزڵی خۆی بۆوە.

**أقرع الى الحق**: گەڕایەوە بۆ حەق و ڕاستی.

أقرع عن الشَّيْئ: لەشتەکە گەڕایەوە.
أقرع بين القوم: قورعەو پشکی خستە ناو خەڵکەکەو لەناویاندا قورعەی کرد.
أقــرع الدَّابَّــةَ: وڵاخەکــەی بــەلغاو و ڕێشمەکە گرتەوە ڕێشمەو لغاوەکەی تونــد کــردو وڵاخەکــەی ســەری بــەرزکردەوەو لەڕۆیــشتن‌و خێــرا ڕۆیشتن گرتیەوە.
أقــرع الفَحْــلَ: فەحلەکــەی بەســتەوە بۆئەوەی نەتوانێ بگاتە حوشترەکە ◦ (فهو مُقْرع).
أقــرع فلانــاً: باشــترین مــاڵی خــۆی دا بەفلان.
أقرع فلاناً فحلاً: کەڵەنێرێکی ڕەسەنی دا بەفلان.
قــارَعَ الأبطــالُ: پاڵەوانــەکان لەشــەڕو ڕوبەڕوبوونەوەدا بەشمشێر لێکیان دا.
قارَعَ القومُ: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا پشك‌و قورعەیان کرد ◦ دەشگوترێ: (قارَعَــهُ فَقَرَعَــهُ): قورعــەی لەگــەڵدا کردو قورعەکەی لێ بردەوە.
قَــارَعَ فلانــاً بــالرمح وغــيره: بــەڕمب کەوتنە وێزەی یەکتر.
قَــرَّعَ فلانــاً: بەلۆمــەو سەرزەنــشت فلانکەسی کوتا.
قَرَّعَ الأقْرَاعَ: چارەسەری کەچەڵیەکەی کرد.
إقترعــوا علــى شــيئ: لەســەر شتێــك قورعەیان کرد ◦ دەگوترێ: (إقترعوا فيما بينهم): خەڵکەکە لەناو خۆیان دا قورعەیان کرد.
إقتَرَعَ الشَّيْئَ: شتەکەی هەڵبژارد.
تقارَعَ القومُ: خەڵکەکە قورعەیان کرد.
تقــارع القــوم بالرمــاح: خەڵکەکە بە ڕمب کەوتنە وێزەی یەکترو لێکیان دا.
تَقَرَّعَ الجلدُ: پێستەکە لەکەچەڵی پاك بۆوە.
تَقَرَّعَ الرَّجُلُ: پیاوەکە خەوی زڕاو هەر جنگڵی دان‌و ئەمــدیو و ئــەودیوی کردو خەوی لێ نەکەوت.
الأقْــرَعُ: کەسێــك کەچــەڵ بووبــێ ◦ دارێك توێکڵی پێوە نەمابێ‌و سپی کرابــێ ◦ زۆر ڕەق‌و پتــەو ◦ دەگوترێ: (تــرس أقــرع) مەتاڵێکی زۆر قایم‌و پتەوە ◦ (سـيف أقـرع) شمشێرێك ئاسنەکەی پتەو بێ‌و بۆ شــەڕە شمــشێر زۆر بــاش بــێ‌و شمشێری تر کەل بکا.
القارِعَة: قیامەت ◦ بەڵاو کارەسات.
قَرَعَتْهُم قوارع الدهر: بەڵاو کارەساتی ڕۆژگار ئەو قەومەی کوتاو برستی لێ بڕین.

**القُراعُ**: کەچەڵی.

**القَرّاعُ**: دارکوتکە، باڵندەیەکە لەپێری (النقاریة) جەستەی مامناوەنجیە، دەندوکێکی بەهێزی پێوەیە لەدارو درەختی دەکوتیو کونی دەکا ئەگەر دارەکە کەرمی تێدا بێ دەری دێنێو دەیخوا.

**القَرّاعَة**: چەرخی ئاگر کردنەوە.

**القَـرْع**: کولەکە بەزۆری عەرەب پێی دەڵێن: (الدُبّاءُ).

**القَـرَع**: کەچەڵی، نەخۆشی پێست ٥ شوێنێك گیای لێ نەڕوێ ٥ گرێی حوشتر ٥ کوزو ئاغەڵی خاڵی لەحوشتر.

**القَـرِعُ**: کەسێك خەوی لێ نەکەوێ ٥ نینۆك گەندەڵو قەڵشت بردو ٥ دەگوترێ: (رجل قرع وظُفْرٌ قرِع).

**القرعاء**: مێینەی (الأقرع)ە ٥ باغێك کە ئاژەڵ هەموو گیاو گژەکەی خواردبێو هیچیان تێدا نەهێشتبێ ٥ دەگوترێ: (جاء فلان بالسَّوْءَةِ القرعان) فلانکەس خراپەی ئاشکرای کرد ٥ بەڵاو موصیبەتێك هەموو ماڵو سامان بەرێ.

**القُرْعَةُ**: بەش‌و بار.

**القَرَعَةُ**: شوێنی کەچەڵی لەسەردا ٥ شوێنی خەتەر ٥ دەگوترێ: (ضربه على قرعة رأسه) لەشوێنی خەتەری سەری دا ٥ مەتاڵو دێوجامە.

**القَرِعَةُ من الأرض**: پارچە زەوییەك گیای لێ نەڕوابێ.

**القَروع**: مەڕێك لەسەری بکەونە شەڕو لێکدان.

**القَريعُ**: کەڵی هەڵبژێردراو بۆ پەڕینو کەڵدان ٥ بێچوو ٥ ئەو کەسەی لەشەڕدا بەدار یان بەشمشێرو خەنجەرو شتی وا لێت دەدا ٥ گەورەو ڕێزدار ٥ دەگوترێ: (فلان قريع دهره) فلانکەس گەورەو پیاو ماقوڵی ڕۆژگاری خۆیەتی ٥ (فلان قريع الكتيبة) فلانکەس سەرۆك‌و سەرپەل‌و سەرتیپی پێشمەرگەکانە.

**المِقْراعُ**: ئاسنێکە سەرێکی پانی نەخش جیاجیای پێوەیە بەئاگر سور دەکرێتەوە شوێنێکی ئاژەڵی پی داخ دەکرێو شوێنی داخکردنەکە توکی لێ نایەتەوە ئەو شوێن سوتاویو داخکردنە دەبێتە نیشانە بۆ ئاژەڵەکە، هەرخاوەن ئاژەڵێك داخی تایبەتی خۆی هەیە ٥ ئامێرێکە وەکوو پاچو پیك وایە بۆ شکاندنی بەرد.

**المُقرَعَةُ**: کارەساتێکی سامناکی ڕۆژگار.

**المَقْرَعَةُ**: زەوییەکە کولەکەی لێ ڕوابێ ٥

دەگوترێ: (أرضٌ مَقْرَعَة).

**المِقْرَعَـةُ**: گۆچـان، دارێـکە پێـی لـەئادەمیزاد دەدرێ، دارێـکە سەرگۆچان بـەزۆری لـە قوتابخانـەی منـدالان دا بـۆ لێـدانی قوتـابی نازیرەك‌و هارو هاج بەکار هاتووە ٥ (ك: مَقارِع).

**قَرَفَ قَرْفاً**: درۆی کـرد، شتی بـێ بنـەمای هەڵبەست.

**قَرَفَ لعیالـه**: لێـرەو لـەوێ کاسبی کـردو شتی بۆ ماڵ‌و منداڵی خۆی کۆکردەوە.

**قَرَفَ الشَّيْءَ**: شـتەکەی تێـکەڵ بەشتێـك کرد لەو کەمتر بێ.

**قَـرَفَ فلانـاً**: عـەیبی لـەفلان گـرت ٥ دەشگوترێ: (قَرَفَهُ بكذا) فلان شتی پاڵ ئەو دا.

**قَرَفَ الجِلْدَ**: پێستەکەی سپی کرد، دایماڵی ٥ دەگـوترێ: (قَـرَفَ الـشجرةَ وقَـرفَ القرحة) دوای وشکبوونی دارەکەی سپی کرد، دوای وشـکبوونی برینەکـە تـوێ‌و تەباری لابردن.

**قَرَفَ الذنبَ**: تاوانی ئەنجام دا.

**قَرِفَ قَرَفاً**: نەخۆشییەکەی گرت.

**أقرف الرجلُ**: پیاوەکە یەکێـك لەدایك‌و بـاوکی عـەرەب بـوو ئـەوی تریـان ناعەرەب

**أقْـرَفَ وجـه فـلان**: ڕوخـساری فـلان سوراییەکی تێدا بوو وەکوو توێـکڵ وایە.

**أقرف الشَّيْءَ**: شتەکەی گرت تێـکەڵاوی بوو

**أقرف فلاناً**: باسی فلانی بەخراپە کرد.

**أقـرف المـرضُ الرجـلَ**: نەخۆشـییەکە لەپیاوەکـەوە تەنیـەوە بـۆ کەسـانی دیکە.

**قـارف الـشَّيْءَ**: لـە شتەکە نزیـك بـۆوە تێـکەڵی بوو ٥ دەگوترێ:

**قارف فلان الـذنبَ والخطيئـة**: فلانکـەس تاوانەکەی ئەنجام دا.

**قـارف الجَـرَبُ الـبعيرَ**: گرویێیەکـە لەحوشترەکەوە تەنیەوە.

**إقتَرَفَ**: کردی ئەنجامی دا، کاسبی کـرد ٥ دەگوترێ:

**إقترف لعياله**: کاسبی بۆ مـاڵ‌و منـداڵی خۆی کرد.

**إقترف الذنبَ**: تاوانەکەی ئەنجام دا.

**إقترف فلان من مرض فـلان**: فلانکـەس لەفلانـەوە تووشـی نەخۆشی بـوو ٥ نەخۆشی ئەوی گرتەوە.

**تَقَرَّفَت القرحَةُ**: برینەکە توێکڵی هەڵدا.

**القَرافَةُ**: گۆڕسـتان ٥ ئـەم وشـەیە لـە بنەڕەت دا ناوی هۆزێـکی یەمەنییـە لـەنزیك گۆڕسـتانەوە نیـشتەجی بـوون، دوایـی ئـەم نـاوە کـرا بـە

عەلەمو ناو بۆ هەموو گۆڕستانێك.

**القُرافَةُ**: توێكڵی درەخت.

**القَــرْفُ**: پێــستی ســوور ٥ دەگــوترێ: (أَحْمَرُ قَرْفٌ) سوری زۆر سور.

**القِرْفُ من كل شيء**: توێـكڵی هـەموو شتێك.

**قِرْفُ الشجرة**: توێكڵی درەخت.

**قِرف الرمانة**: توێكڵی هەنار.

**قِرْفُ الطَب**: چڵكو بەڵغی ماستو دۆ: كە بەمەشكەوە دەنووسێ ٥ چڵمە ڕەقـە كەبەناو لوتەوە دەنووسێ.

**القَـرَفُ**: تێـكەڵبوونی شـتی قێـزەونو نەخوازراو ٥ تەنینەوەی نەخۆشـیو پەتا ٥ تۆمەت ٥ (ك: قِراف).

**القِرفَـةُ**: توێـكڵی درەخـت: كەلـەپێری درەختی غازی بێ ٥ بـەناوبانگترینی ئـــەم جـــۆرە درەختـــە قیرفـــەی سەیلانیو قیرفەی چینی یە عەترو بـــۆنی خۆشـــی لێ دەردەهێنـــدرێ ٥ هـەروا وشـەی (القِرفـــة) نـاوە بـۆ توێكڵی هەنار كە پێستو شتی وای پێ دەباغ دەگرێ ٥ كاسبی ٥ تۆمـەت ٥ كەسێـك تۆمەتی شتی لێ بكەی.

**القَروفُ**: كەسێـك زۆر سەرپێچی كـارو یاخی بووبێ.

**المَقْرِفُ**: شوێنی توێـكڵ هەڵدانی برینو پێست.

**المُقْـرِفُ**: پیـاوی خـوێری ٥ ڕوخـساری ناشیرینو نەگڵەوەت.

**قَرْفَصَ**: هەردوو دەستی لەژێر قاچیەوە بەستن.

**القُرْفُـصاءُ**: ئەومیە مـرۆڤ: لەسـەر دوو كلۆتی دانیشێو هەردوو ئەژنۆی بـە ورگییەوە بنوسێنێ، هەردوو دەستی بێنێتەوە بۆ پێشەوەو لەسـەر خـوار ئەژنۆیـەوە دایـان نـێ ٥ یـان لەسـەر ئـــەژنۆكانی دانیـــشێو ورگـــی بەڕانەكانیـەوە بنووسـێنێ هـەردوو دەستی بخاتە بن هەنگڵیەوە.

**قَرْفَلَ الطعامَ**: تەوابیلی بـۆ خواردنەكە لە قەرەنفول دروست كرد.

**قَرِقَ قَرْقاً**: بزركاندی، وڕێنەی كرد.

**قَــرَّقَ**: گاڵتــەی كــرد، لەقــسەكانی دا پێـكەنی.

**القَرْقُ**: دەنگی مریشك كە جوجیلەكانی كۆدەكاتەوە.

**القِرْقُ**: دەشتی تەختو بێ كەندو لەند ٥ كۆمەڵێك لەكەسانی بچكۆلە.

**القَــرَقُ**: شـوێنی تـەختایی كـە بـەردو داری تێدا نەبێ.

**قَرْقَرَ في ضحكه**: لەپێـكەنین دا قاقـای كرد ٥ دەنگی لەقورگی دا گێڕایەوە.

**قَرْقَــرَ الــشرابَ في حلقــه**: ناوەكـەی لەقورگیـــدا هێنایـــە قرەقـــڕ ٥

غەرغەرەی کرد.

قَرْقَرَ بَطْنُهُ: ورگی قوڕەقوڕی کرد جا یان بەهۆی برسییەتیەوە یان بەهۆی خواردنێکەوە کە قوڕەقوڕ لەگەدەدا پەیدا دەکا.

قَرْقَرَت الدَجاجةُ: مریشکەکە دەنگی وای لەخۆ هێنا وەکوو ئەوە ئاو بکەیە ناو شوشەوە.

القُراقِرُ من الحُدَاة: دالآشی دەنگ خۆش.

القُراقِرَةُ: حیلکەو حەنەحەنی نێرە کەڵ کەدەنگی خۆی دەخواتەوە.

القُراقِريُ من الرجال: پیاوی دەنگ گەورە ٥ دەگوترێ: (حادٍ قراقري).

القَرْقَارُ، والقَرْقَارةُ: سوراحی شوشە، قاپێکی شوشەیە ملی درێژە ٥ هەروا ناوە بۆ مرقەمرقی حوشتر.

القَرْقَرُ من الأراضي: زەوی نزمو چاڵاییو نەرمەڵان ٥ دۆڵو شیوی ڕۆتەنو بێ درەختو بەرد ٥ دەوروبەری شارو شارۆچکە.

القَرْقَرَةُ: دەنگ خواردنەوەی حوشتر لەقورگی دا ٥ قوڕەقوڕی ورگ ٥ پێکەنینی بەقاقاو دەنگی بەرز ٥ پێستی دەمو چاو ٥ (ك: قراقِر).

القُرْقُورُ: کەشتی گەورەو زەبەلاحو درێژ ٥ (ك: قراقير).

القَرْقِيرُ: سوراحییەکی شوشەی مل درێژە.

القِرْقِسُ: مێشولەی بچوك ٥ حەشەرەیەکە دەق دەشوبهێتە تەپۆ.

القَرْقُوسُ: دەشتی زەوی پتەو کە ڕوەکی تێدا نەبێ هەندێ جاریش لەم جۆرە شوێنانە ئاوی بۆگەنو جۆرە نەوتێك هەن.

قَرْقَفَ المبرود: سەرما بردووەکە لەسەرما هەڵ لەرزی ٥ دەشکوترێ: (قَرْقَفَت ثناياه): ددانەکانی لەسەرمان کەوتنە لێکدانو شەقەشەق.

قَرقَف الفحلُ والحَمامُ في الهدير: کەڵەکە یان کۆترەکە لە دەنگ خواردنەوەی خۆی دا زێدەڕەوی کرد.

قَرقَفَ الرجلُ في الضَّحك: پیاوەکە بەدەنگی بەرزو قاقا پێکەنی.

قَرقَفَ البردُ فلاناً: سەرما فلانکەسی خستە لەرزە لەرز.

تَقَرقَفَ: سەرمای بوو، سەرما تینی بۆ هێنا تاوای لێ کرد ددانی بکەونە شەقەتوڵەو بەیەك بکێشرێن.

القَرْقف: مەیو شەراب ٥ ئاوی ساردو ڕون.

القِرِلَّى: باڵندەیەکی جەستە بچوکە، چاوی تیژن، زوو شت دەفڕێنێ، زۆر بەپارێزو حەزەرە، یاری لەگەڵ

سێبەری خۆی دەکا.

**قَـرِمَ الـصغيرِ قَرْمـاً**: منداڵەکـە خـواردنی کـەمی خـوارد چـونکە تـازە لەشـیر براوەتـەوەو بـاش فێـری خـواردن نەبووە.

**قَرَم الطعامَ قَرْماً**: خواردنەکەی خوارد.

**قَـرَم الـشَّيْءَ**: شـتەکەی سـپی کـرد توێکڵەکەی لێ داماڵی.

**قَرَم فلاناً**: جوێنی بەفلان داو عـەیبی لێ گرت.

**قَـرِم الفَحْـلُ**: کەڵەکـە وازی لەپـەڕینو سواربوونو کەڵدان هێنا.

**قَرِمَ اللحمَ واليه**: زۆری حەز لە گۆشتەکە بوو.

**أقرم الفَحْلَ**: ڕێزی کەڵەکەی گرتو دڵی نەهات بیپەڕێنێ.

**قَرْمَـةُ**: فێـری خـواردنی کـرد لـەکاتی لەشیر بڕینەوەی دا.

**تَقَـرَّمَ الـصغيرُ**: منداڵەکـە تـازە لەشـیر بڕدراوەتەوەو خواردنی کەمە.

**إستقرَمَ الفحـلُ**: کەڵەکە وازی لەپـەڕین هێنا.

**القِـرامُ**: جـۆرە پەردەیەکـە، نـەخشو نیگـاری تێدایـە، قوماشێـکی ئەسـتوورە لـەخوری ڕەنگـاو ڕەنـگ دروسـت دەکـرێ بـۆ ڕاخـستنو بـەخۆدا دان لـەناو کـەژاوەدا بەکاردەهێنـدرێ وەکـوو جـاجمو خورجو شتی وا.

**القُرامَةُ من الخبز**: هەر پارچەو گوێچکە نانێك کە بە تەندوورەوە بنوسێ.

**القَرْمُ من الفحول**: ئەو کەڵەیە کە هیچ ئیشێکی پێ نەکرێ، باری لێ نەنرێ تەرخان بکرێ بۆ کەڵدانو پەڕین ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوی ڕیش سپیو گەورەی هۆزو خێڵ.

**القُـرْمُ**: درەختێـکە لـەناو ئاودا دەڕوێ، دەق دەشـوبهێتە درەختـی دولـب لەقەد ئەستوریو سپی توێـکڵی دا، گەڵاکەی وەکوو گەڵای بادامو ئیراك وایـە، میوەکـەی وەکـوو خورمـای صەومەر وەهایە.

**القَرَمُ**: حوشتری بچوكو بێچو، گیسك.

**القَرْمَـةُ**: نیـشانەیەکە بەسـەرە تـیری کەدەهاوێژرێ لە قومارد.

**المِقْـرَمُ**: پەردەیەکـە نـەقشو نیگـاری تێدایە.

**المِقْرَمَةُ**: بەمانا (المِقْرَمُ) دێ.

**قَرْمَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەقیرو شتی وا سواخ دا.

**قَرْمَدَ الحائطَ بالجُصِّ**: دیوارەکەی بەگەچ سواخ دا.

**قَرْمَـدَ الثـوبَ بـالزعفران**: قوماشـەکەی بەزەعفەران ڕەنگ کرد.

قَرْمَدَ الثـوبَ بالطيـب: بـۆنی خۆشی لەقوماشەكە دا.

قَرْمَدَ البنـاءَ: باڵەخانەكەی بەخشت‌و بەرد دروست كرد.

قَرْمَدَ الشَّيْئَ: شتەكەی بەرز كردەوە هەڵی چنی ٥ تەسكی كردەوە.

القَرْمَـدُ: هەرشتێـك بەمەبەستی جوانی‌و ئارایش دان شتی پێ سواخ بدرێ یان ڕەنگ بكرێ وەكوو گەچو زەعفەران.

القُرمـود: كاریلـەی حەیوانـە كێـوی بێچوی حەیوانە كێوی.

القِرْمیدُ: بەمانا (القَرْمَدُ) دێ ٥ نهۆمی خانوو ٥ (ك: قرامید).

القِرمِزُ: ڕەنگی سوری مەیلەو ڕەش ٥ دەشـگوترێ: (لـون قرمـزي).

قَرْمَشَ الشَّيْئَ: شتەكەی كۆكردەوە ٥ خراپـی كـرد دایوەشـاند گەنـدەڵی كرد.

القِرْمَشُ: خەڵكی تێكەڵ‌و پێكەڵ.

قَرْمَصَ القِرْماصَ: چاڵێكی سەر تەسكی ناو فراوانی دروست كرد بۆئەوەی لـەكاتی سـەرمادا خـۆی تێـدا بحەوێنێتەوە ٥ چووە ناو چاڵی سەر تەسكی نـاو فـراوان‌و خـۆی تێدا كۆشمەڵە كرد.

تَقَرْمَصَ: چووە نـاو چاڵی سەرتەسكی ناو فراوان.

القِرْمـاصُ: چاڵێـكە پـان‌و پـۆڕە سەرەكەی تەسكە لەترسی سەرما دەچـنە نـاوی ٥ هێلانـەی كـۆتر ٥ شـوێنی دروسـتكردنی نـانی بـرژاو لەسەر بەردو زیخی سورەوە بوو یان نانی پیشاو لەناو گڵی گەرم كراودا ٥ (ك: قرامیص).

قَرَامِیص ضـرع الناقـة: دیوی ناوەوەی ڕانی حوشتر (لاڕەفیسك).

القِرْمِصُ: بەمانا (القِرْماص) دێ.

القُرْمـوُصُ: بـەمانا (القِـرمِصُ) دێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ چاڵێـك كـە هەڵدەكەنـدرێ بـۆ نێـچیر گـرتن ٥ كۆختەی ڕاوكەر.

قَرْمَطَ في خطـوه: لـە ڕۆیشتن دا قاچی لێـك نزیك كردنەوە.

قَرْمَطَتِ الدابَّةُ: ولاخەكە هەنگاوەكانی لێـك خستنەوە.

قَرْمَطَ الكاتبُ في الكتابة: نووسـەرەكە دێـڕی نووسـینی كتێبەكـەی وردو باریك‌و لێـك نزیك نووسینەوە.

تَقَـرمَطَ: چـووە سـەر مەزهـەب‌و بـیرو ڕای قەرامیتەكان.

القُرْموطُ: میوەی ڕەنگ سوری درەختی غـەضا ٥ جـۆرە هەنارێـكە مـەمكی خڕی ئـافرەتی پـێ دەشـوبهێندرێ ٥

جۆرە ماسییەكی پێست ئەسمەرو لینجو گۆشت سورەو تامی خۆشی نیە.

**القَرامِطــة**: پێرێكن لەشیعەی توندڕەو سەرەتا لەعێراق سەریان هەڵداو لەوڵاتی حیجازدا بەهێز بوونو داوای یەكسانیی تاكەكانی كۆمەڵیان دەكرد.

**قَرْمَلَهُ**: بەعەرزی دادا، خستی.

**القِرْمِلُ**: بێچوە حوشتر ◦ حوشتری دوو دوگ ◦ قژ: كە ئافرەت بەقژی خۆیەوە دەنووسێنێو دەیخاتە سەر قژەكانی.

**القَرْمَلَـةُ**: ڕوەكێكی ساڵانەیە، قەدی كورتەو گوڵێكی بچوكی زۆر زەردی هەیە.

**قَـرَنَ الفَرسُ قَرْناً**: ئەسپەكە لەغاردانو ڕۆیشتن دا قاچی دواوەی دەخاتە شوێن قاچی پێشەوەی.

**قَـرَنَ البُسْرَ**: خورمای گەیشتو و نەگەیشتوی تێكەڵ بەیەك كردن.

**قَـرَنَ الشَّيْءَ بالشيءِ وقرن بينهما قَرْناً وقرانا**: شتەكانی كۆكردنەوە، خستنیە پەنایەكەوە ◦ دەگوترێ:

**قَـرَنَ بين الحج والعمرة**: نیەتی حەجو عومرەی پێكەوە هێنا، ئیحرامی بەنیەتی حەجو عومرە هێنا ◦ هەروا دەگوترێ: (قرن بين ثورين) هەردوو گاجوتەكانی خستە ژێر یەك نیرەوە ◦ (قرن بين عملين) هەردوو كارەكەی بەیەكەوە ئەنجام دا.

**قَرَنَ الشَّيْءَ الى الشَّيْءِ**: شتەكەی بەتوندی بەشتەكەی ترەوە شەتەك دا.

**قَـرَنَ فلاناً**: زەبری لەتەپڵی سەری فلانكەس دا.

**قَرِنَ فلان قَرَناً**: فلانكەس برۆی تێكەڵاو بوونەوە (فهو أقْرَنُ وهي قرناء الحاجبين).

**قَرِنَ كل ذي قرن**: شاخدارەكە شاخی درێژ بوون (فهو أقرن وهي قرناء) ◦ (ك: قُرْن).

**أقـرن فلان**: فلانكەس دوو شتی بەیەكەوە شەتەك دا یان دوو كاری پێكەوە ئەنجام دان ◦ فلانكەس سەری ڕمبەكەی بەرز كردەوە بۆئەوەی زیان بەوانەی پێشیەوە نەگەیەنێ.

**أقرن أناطير وجه الغلام**: شوێنی ڕیش لێ ڕوانی ڕوخساری كوڕەكە ئاوڵەی لێ هات.

**أقـرن الثريّا**: ئەستێرەی سیومیل (سورەییا) بەرز بۆوەو خەریكە بگاتە ناوەڕاستی ئاسمان.

**أقـرن الدم في العرق**: خوێن

لەدەمارەكەدا زۆر بوو.

**أقــرن الــدُمَّلُ:** دومەڵەكـە، كوانەكـە خەریكە بگاو كاتی هەڵدڕینی بێ.

**أقــرن للــشيئ:** دەســەڵاتی بەســەر شتەكەدا شكاو بەسەریا باڵادەست بوو.

**أقــرن علـــى غريمـــه:** تـــەنگی بەقەرزدارەكەی هەڵچنی.

**أقرن بين الحج والعمرة:** ئیحرامی حەجو عومرەی بەیەكەوە بەست.

**أقرن فلاناً:** بوو بەهاوشانی فلان.

**أقرن القِرن:** بەسەر هاوشانەكەیدا زاڵ بوو.

**قارنه مقارنة وقِراناً:** هاوڕێیەتی كرد.

**قــارن بــين القــوم:** خەڵــكەكەی ڕێــك خستەوە.

**قارن بين الزوجين قِراناً:** ژنو مێردەكەی یەك خستنەوە.

**قـــارن الـــشَّيْئَ بالـــشيئ:** شـــتەكەی بەشتەكە مەزەندە كرد.

**قارن بين الشيئين أو الأشياء:** دوشتەكەی بەرامبەر كردن مەزەنـدەی كـردن ٥ (فهــو مقــارن) ٥ دەگــوترێ (الأدب المقارن أو التشريع المقارن).

**قَرَّنَ الأَسَارَى:** دیلەكانی بەحەبل دەست بــەس كــردن ٥ دەشــگوترێ: (قَــرّن المجرمين في القران) تاوانبارانی لە نـاو پێوەندو دەست بەست دا كۆكردەوە.

**إقترن الشَّيْئَ بغيره:** شتەكەی بەشتێـكی ترەوە پەیوەست كرد.

**تقارن الـشيئان:** دووشـتەكە پەیوەسـتی یەكتر بوون.

**إستقرن للأمر:** تاقەتی بەكارەكـە شكاو توانی بیكا.

**إستقرن فـلان لفـلان:** فلانكـەس بـەلای خۆیەوە هاوشانی فلانكەسە.

**إســتَقْرَنَ الــدم في العــرق:** خوێنەكـە لەدەماردا زۆر بوو.

**إستَقْرَنَ الدُمَلُ:** كوانو دومەڵەكە نـەرم بوو گەیی.

**القِران:** ئیحرام بەستن بەحەجو عەمرە ٥ كۆكردنـەوەی ژنو مێـرد بـەهۆی گرێبەسـتی مارەكردنـەوە ٥ هـەروا نـــاوە بـــۆ حەبلێـــك شـــتی پـــێ ڕادەكێشرێ.

**القرانيا:** پێڕی درەختێكە دەروێنـدرێ بــۆ جــوانیو بــۆ ســود وەرگــرتن لەبەرەكەشی.

**القَـــرْنُ:** شـــاخ مادەیـــەكی ڕەقـــە بەپەناگوێی ڕەشەوڵاخو مەڕو بزنو ئــاژەڵی تــری لــەو جــۆرە دەڕوێ ٥ بـەزۆری ئـەو ئاژەڵانـە دووشـاخیان دەبن.

**القَـرْنُ مـن القـوم:** ڕیـش سپیو پیـاو

مـاقولّى قـەومو نەتـەوە ◦ (قَـرْن السـيف) تيـژايى شمشێر ◦ (قـرن الجبـل) لوتكەى سەرانـسەرى كێـو ◦ (قَرن الجرادة) ئـەو دوو تالّە مـووەى بەسـەرى كوللـەوەن ◦ (قـرن البـاقلاء واللوبيـــــاء) ئـــەو توێــــكلّەى دانەوێلّەكەى تێدايە ◦ هەروا وشـەى (القرن) ناوە بۆ بەرى لوسو خـاوێن ◦ يـان شـەوطو هـەلى غـاركردن ◦ دەگوترێ: (عدا الفرس قَرناً أو قرنين فعـــرِق) ئەســپەكە دوو شـــەوط دوونۆرە غارى دا ئارەقى كرد.

**القَـرْنُ مـن الزمـان**: مـاوەى سـەد سالّە (سـەدەيەك) ◦ دەشـگوترێ: (إمـرأة قَــــرْن) ئافرەتێـــكە هاوشـــانە لەئازايـەتىو چاونەترسـى دا ◦ (ك: قرون).

**وحيد القـرن**: كەركەدەنـە چونكە يـەك شاخى هەيە لەپێشەسەرى.

**القِرْن للإنـسان**: هاوشـان لەئازايـەتى دا لــەزانيارى دا لـــە هێــزو توانـــاو خۆڕاگريى لەشەڕدا ◦ (ك: أقران).

**القَرَنُ**: حەبلێـك: كە دوو حوشـترى تـێ بخرێن ◦ (ك: أقران).

**القَرْنـاء**: مارێــك دوو پارچـە گۆشـت لەسـەرى بەربىنـەوە وەكـوو شـاخ وەهابن.

**القَرْنـان**: گـەوادو خـوێڕى ◦ كەسێــك مـاڵو منــداڵى داوێـن پـيس بـن ئەويش لێيان بێدەنگ بێ.

**القَرْنُوَةُ**: گيايەكى سەوزى تۆزاوى يـەك قــەد گەڵاكــەى مەيلــەو ســورە، بەرێــكى وەكــوو ســونبوولى هەيــە تامێـكى تفـتو تـاڵى هەيە كونـدەو مەشكەى پێ دەباغ دەكرێ ◦ هـەروا ناوە بۆ ڕوەكێك دەشوبهێتە ڕوەكـى لۆبيـا دەنكێـــكى هەيـــە لــەنۆك گـەورەترە، كـە بـەكرەكراو هـاڕدرا زەرد دەبــێ وەكـــوو هەريـــسەو كەشـكەك دەكولێنـدرێ دەخـورێ پەزمەندەش دەكرێ بۆ زستان.

**القَرْنية**: بەشى پێشەوەى گلێنەى چاو.

**القُـرونُ**: نـەفس ◦ دەگـوترێ: (اسمحـت قَرونُـهُ) نەفـسى خۆى زەلـيل كـردو پابەنـدى فەرمانەكـە بـوو ◦ هـەروا نـاوە بـۆ وڵاخێـك بـە ڕۆيشتن زوو عـەرەق بكـاو زۆر عـەرەق بكـا ◦ ئەسـپو حوشترێـك لـە ڕۆيـشتنو غاردان دا قاچى دواوەى بخاتە شوێن جێى قاچى پێشەوەى ◦ حوشترێـكى شيردەر كەجارى دوو سەتڵ شيرى لێ بدۆشرێ ◦ پێداويستى ◦ دەگـوترێ: (أخذت قُروني من الأمر) پێداويستى خۆم لەكارەكە هەڵگرت.

**القَرُونَةُ**: نەفس ٥ دەگوترێ: (أسْمَحَتْ قرونتە) نەفسی خۆی زەلیل كردو لەكارەكەدا شوێنی كەوت ٥ ڕوەكێكە دەشوبهێتە ڕوەكی (اللوبیاء) دانەوێڵەیەكی هەیە لەنۆك گەورەترە كە كرە كرا بەزەردی دێتەخوار وەكوو ڕوەكی (الورس) شەوچەرەی سارانشینەكانەو بەزۆری دەست دەكەوێ.

**القرین**: هاوتاو هاوشان ٥ هاوسەر ٥ حوشتری هاوتا بۆ حوشترێكی تر ٥ دیل ٥ (ك: قُرَناء).

**القُرَیْناءُ**: لۆبیا.

**القرینة**: نەفس ٥ هاوسەرو خێزان.

**المِقْرَنُ**: نیر؛ دارێكە دەخرێتە سەر ملی دووگا یان دوو ئێسترو بارگیر بۆئەوەی هەوجاڕو مزانەكە لەناوەڕاستی نیرەكە بەهۆی بنەوەندێكەوە شەتەك بدرێ.

**المقرونة**: جۆرە خواردنێكە لەهەویرو ڕۆنو بادام دروست دەكرێ.

**قرنس الدیكُ**: كەڵەشێرەكە لە كەڵەشێری بەرامبەری ترساو هەڵات.

**قَرنَسَ السَّقفُ والبیتُ**: هەلاشەكە یان خانوەكەی بەشتی جۆراو ڕازاندەوەو دیكۆراتی جۆراوجۆری تێدا دروست كرد.

**القِرْناسُ**: گردو تەپۆڵكەی پێش كێو ٥ سەرە تەشی.

**القُرْناسُ**: ئەو پارچە دارو شتەی كە ڕیسی لەسەر هەڵدەكرێ بۆ ڕستن ٥ (ك: قرانیس).

**القَرانیسُ**: پێشەتای لافاو كە خشتو خاڵو پڵوپوش لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ.

**القَرَنْفُلُ**: جینسی جۆرە گوڵێكە كە بەناوبانگەو پێی دەگوترێ (المشتري) و لەپێڕی (القرنفلیة)یەو لە وڵاتانی گەرمەسێر دەچێندرێ بۆئەوەی لە گوڵە وشكەوەبووەكانی تەوابیل دروست بكرێ.

**قَرِهَ الجلد قَرَهاً**: پێستەكە ڕوتایەوەو مووەكانی هەڵوەرین چونكە توشی دەردە (قوبا) بووە كە نەخۆشی پێست گرێ بوونو ڕوتانەوەیە ٥ توێژی هەڵدا ٥ ڕەش هەڵگەڕا بەهۆی زۆر لێدانەوە ٥ (فهو أقره وهي قرهاء).

**القَرِهُ**: پێستی وشك هەلاتوو.

**قَرَجوز**: دومیەیەكی بچوكە لە كاغەزو مقەبا یا تەختەداری تەنك دروست دەكرێ لەشوێنێكی نادیارەوە مرۆڤێك دەیجوڵێنێو هەندێ قسەی لێ دەبیسرێن وادەبینرێ

خۆی دەجوڵێ‌و خۆی قسە دەكا.

**قَرا فلاناً قَرْواً**: قەصدی فلانكەسی كرد، نیازی لای ئەوی بوو ٥ بەدواداچوونی كردو لەكارەكانی ورد بۆوە.

**قَرا الأمرَ**: بەدواداچوونی بۆ كارەكە ئەنجام دا ٥ دەگوترێ: (قَرا البلادَ): بە وڵاتەكەدا بست بەبست گەڕاو سەیری كردو لەبارودۆخ‌و دیمەن‌و ئاو وهەوای ورد بۆوە.

**قَرا الأرضَ**: بەدواداچوونی وردی بۆ ئەو كەسانە كرد كە لەزوویيەكەدا نیشتەجێ بوون.

**قَرَا بني فلان**: یەكەیەكە چووە لای خێڵی فلان‌و لێی پرسین.

**قَری فلانٌ قَرياً وقَرىً**: لاشەویلەی فلانكەسی هاوسان بەهۆی ددان هێشانەوە.

**قَری كلُّ مُجتر قرياً**: ئاژەڵە كاوێژكەرەكە هەموو خواردنەكەی هێنایەوە ناو دەمییەوەو كاوێژی كردەوە ٥ دەشگوترێ: (قری فلان في شدقه جوزة) فلانكەس گوێزەكەی لە گوپی دا شاردەوە.

**قَری الشَّيْئَ**: شتەكەی كۆكردەوە ٥ دەگوترێ: (قَری الماء في الحوض) ئاوەكەی لەحەوزەكەدا كۆكردەوە.

**قَری الضَّيْفَ قِرىً**: رێزی میوانەكەی گرت‌و خواردنی باشی بۆ ئامادە كرد.

**قَرِيَت الناقةُ قَراً**: حوشترەكە پشتی قایم بوو دوگی درێژ بوو ٥ (فهي قَرْواءُ) ٥ دەگوترێ: (جمل أقری).

**أقری فلان**: فلانكەس پشتی ئازاری هەبوو ٥ وەگری شتەكە بوو زۆری ئیلحاح كرد ٥ گوندنشین بوو ٥ داوای زیافەت‌و دەعوەتی كرد.

**أقْرَت الناقَةُ**: حوشترەكە ئاو لە بێچوەدانی دا كۆبۆوە.

**إقتری فلان**: فلانكەس داوای دەعوەت‌و نان بۆ ئامادەكردنی كرد.

**إقتری الأمرَ**: بەدواداچوونی بۆ كارەكە ئەنجام دا.

**إقتری البلادَ**: بە وڵاتەكەدا بست بەبست گەڕاو لەبارودۆخ‌و ئاو و هەوای ورد بۆوە.

**إقتری بني فلان**: لای یەكە یەكەی خێڵی فلان دا تێپەڕی‌و پرسیاری لێ كردن.

**إقتری الضيف**: خواردن‌و رێزی بۆ میوانەكە دابین كرد.

**إقتری فلاناً**: داوای دەعوەت‌و زیافەتی لەفلان كرد.

**تقرّی البلادَ**: بست بەبست بەناو وڵاتەكەدا گەڕاو سەیری بارودۆخەكەی كرد.

**تَقَرّى المياهَ:** بەشوێن ئاوەکان دا گەڕاو لێکۆڵینەوەی دەربارەیان ئەنجام دا.
**إستقرى الدُمَّلُ:** کوانەکە (دوومەڵەکە) کێمو زوخاوی تێدا کۆبۆوە.
**إستقرى فلان:** فلانکەس داوای زیافەتو خواردنی کرد.
**إستقرى فلاناً:** داوای لەفلان کرد دەعوەتی بکا.
**إقرَوْرى فلان:** فلانکەس پشتی درێژ بوو.
**القاري:** گوندنشین.
**القَارَاةُ:** کۆمەڵگاو کۆمەڵە خانو و شارەستان.
**القَارِيَةُ:** بەمانا (القارة)دێ ٥ سەرانسەری دوگ یان لای خواروی دوگ ٥ تیژایی شمشێرو سەرە ڕمبو نوکە خەنجەر ٥ باڵندەیەکی قاچ کورتی دەندوك درێژە، پشتی سەوزە، عەرەب خۆشیان دەوێو بەلایانەوە پیرۆزە، پیاوی سەخی بەو دەشوبهێنن ٥ کاری قورسو گورچکبڕ.
**القَرا:** پشت ٥ ناوەڕاستی پشت ٥ تۆپەڵاکی گردو تەپۆڵکە ٥ (ك: قروان وأقراء).
**القَرْوُ:** حەوزێکی بچکۆلەیە بەتەنیشت حەوزی گەورەوە ئاوی تێ دەکرێ بۆئەوەی ئاژەڵو ولاخ ئاوی لێ بخۆنەوە ٥ پیاڵەو جامیلکەیەك لە دار دروست کرابێ؛ کاسە دارینە ٥ جۆرە قۆڕییەکە توشی پیاو دەبێ ٥ یەك ڕێبازیو یەك هەڵوێستی؛ دەگوترێ: (رأيت القوم على قَرْوٍ واحد) خەڵکەکەم وابینی یەك ڕێبازیان گرتووە ٥ (ك: أقراء).
(أقراء الشعر) جۆرەکانی شیعرو ڕێبازەکانی ٥ دەشگوترێ: (أصبحت الأرض قَرْواً واحداً) زەوی هەمووی ئاو دایپۆشیوەو بۆتە یەك دەریا ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە دارێك زۆر ڕەقو پتەوە کەرەستەی ناومالی لێ دروست دەکرێ ٥ بڕوانە وشەی (بلوط).
**القَرْوى:** دابونەریتو سروشت ٥ ڕێگای یەکەم ٥ دەگوترێ: (عاد فلان الى قرواه) فلانکەس گەڕایەوە بۆ ڕێگای یەکەمجاری.
**القَرْوانيّ من الرجال:** ئەوەیە بەهۆی نەخۆشیەوە کیسی هێلکەگونی گەورە بووبێ.
**القَرَوِيّ:** ئەو خواردنو ڕێزو هەڵسو کەوتەیە کە پێشکەش بەمیوان دەکرێ ٥ (ك: أقراء).
**القِرْيُ:** هەرشتێك یەك ڕێبازی هەبێ.

**القَراءُ**: میوانداریو زیافەت.
**القَرْيَـةُ**: گەورەشار ٥ هەرشوێنێك خانوەكانی پێكەو نووسابنو كرابێتە نشینگەو شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون.
**قرية النمل**: شارە مێرو.
**القريتان**: شاری مەككەو شاری طائیف.
**القَرِيُّ**: ئەو كەسەی میوانداری خەڵك دەكا ٥ شوێنی هەڵڕژانی ئاو لە پلوسكو بەرزاییەوە بۆناو باغچە ٥ (ك: أَقِراء، وقُرْيان) ٥ یەك ڕێباز ٥ دەگوترێ: (مازال على قَرِيّ واحد).
**القَرِيَّةُ**: گۆچانو عەصا ٥ شارەمێرو ٥ ئەو دارەی لەسەر كەژاوە ڕادەنگێودرێ.
**المَقْرَى**: حەوزێك ئاوی تێدا كۆببێتەوە ٥ سەرانسەری تەپۆڵكە ٥ (ك: المقارِي).
**المِقْرَى**: ئەو كەسەی میوانداری خەڵك بكا ٥ دەگوترێ: (إنه لَمِقرى للضّيف) ٥ ئەو دەوریو بەلەمو سینییەی خواردنی تێدا پێشكەش دەكرێ بۆ میوان ٥ شوێنی چاڵ كە لەهەموو لایەوە ئاوی تێدا كۆببێتەوە.
**المِقْراءُ**: ئەو كەسەی زۆر میوانداری خەڵك بكا.
**قَزَحَ قَزحاً**: بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (قزحت الأسعار).
**قَزَحَتْ نفّاخات الماء**: بڵقە ئاوەكان بەرز بوونەوە.
**قَزَحَ القِدْرُ قَزحاً وقزحاناً**: مەنجەڵەكە كاتی ئەوەی هاتووە ئەوەی تێیدایە داچۆڕێندرێ.
**قَزَّحَ القِدْرَ**: داو و دەرمانی كردە ناو مەنجەڵەكە.
**قَزّحت الشجرة**: درەختەكە پەل پەل بوو.
**قَزّح الحديث**: قسەكەی ڕازاندەوەو تەواوی كرد بەبێ ئەوەی درۆی تێدا بكاو زیادەی پێوە بنێ.
**تَقَزَّحَ النباتُ**: ڕوەكەكە پەل پەل بوو پێوە ڕۆییو تەنیەوە.
**القازِحَةُ**: بڵقی سەر ئاو.
**قُزَح**: شۆقە زێڕینە.
**القِزْحُ**: ئەو زەردەچەوەو كەمونەو كوزبرەیە كە دەكرێتە ناو مەنجەڵی چێشتەوە.
**القُزَحية**: پەردەیەكە كەوانەییو ڕەنگاو ڕەنگ لەدوا گلێنەی چاوەوە، لەناوەڕاستی دا كونێك هەیە پێی دەگوترێ: (إنسان العين).
**المِقْزَحَة**: ئەو حاجەتو شوشەی داو و دەرمانی تێدا هەڵدەگیرێ.
**قَزّ الرجل**: پیاوەكە دانیشت بەشێوەیەكو

دوایی بازی دا.

**قَـزَّ نَفْـسُهُ الـشَّيْئَ:** نەفسی لـەو شـتە هەڵـسڵەمیەوەو تفـی دایـەوە ٥ ڕەتـی کردەوە.

**تَقَـزَّزَ عـن المعاصـي:** لـە تـاوان دوورکەوتەوەو خۆی پاراست.

**تَقَـزَّزَ مـن الـشَّيْئ:** بێـزی لەشـتەکە کردەوە ٥ دەگوترێ: (تَقَزَّزَ مـن أكـل الضب): بێزی لەخواردنی سوسەمار کرد.

**القـازوزة:** کیتەڵـە، پیاڵەیەکـە بـچوك وەکـوو پـەرداخو سوراحی بـچوك ٥ کاسـەو جامیلکـە ٥ فنجـان ئـاو و شـەرابی تێـدا دەخورێتـەوە، جـۆرە خورادنەوەیـەکی غازییـە لـەئاوی غازاویو شەکر دروست دەکرێ.

**القِـزُّ مـن الرجـال:** پیاوێـکە لـەتاوان هەڵـسڵەمێتەوەو قیـزی لێ بـێو بەسروشت خـۆ لـەتاوان بپارێزێ ٥ کەسێـك بێـز لـەجۆرە خواردنێـك بکاتەوە.

**القَـزُّ:** ئاوریـشم لـەو حاڵـەدا کـە لـە صـولجەو پـەردەی خـۆی دەردەهێنـدرێ، (دود القـزّ) کرمـی ئاوریشم.

**القَـزَّاز:** ئاوریـشم فـرۆش ٥ جـۆلای ئاوریشم.

**القُزَّازُ من الرجال:** کەسێـك بەسروشت بێزی لەتاوان کردن بێ.

**القَزَّةُ:** بازدان، ڕاپەڕین.

**القَزِّيَّـةُ:** چـەند جـۆرە حەشـەرەو جروجانەوەرێکن صولجاتو کیسەو پـەردەی ئاوریـشمی دەچـنن ٥ جۆرێـکیان بزێوەکـەی گـەڵای درەختـی (ألتـوت) پێـی دەگـوترێ: (دودة القَـزّ) هەیـە بـزێوی گـەڵای درەختـی بـەلوطـە ئـەم جـۆرە لـە وڵاتی هیندوستان ئاوریشمی چاکی لێ بەرهـەم دەهێنـدرێ ٥ هەنـدێ کـرمو حەشـەرەی تـر هەیـە زیـان دەگەیەنن بەدرەخت.

**القوازير:** بەمانا (القوارير).

**قَـزَعَ الفَـرَسُ والـبعير والظَّبْـيُ:** ئەسپەکە پەلەی کرد بازی توندی هاویشت.

**قَزِعَ الكبشُ ونحوه قَزعاً:** بەرانەکە هەندێ خوریەکـەی بـەرداوەو ڕوتاوەتـەوە هەندێکی پەڵە پەڵە پێوە ماوە.

**قَـزِعَ الـصَبِيُّ:** منداڵەکە سەریان تاشیو هەنـدێ کۆمەڵـە تـوکی پەڵـە پەڵـە بەسەریەوە ماونەوە (فهـو أقـزع وهـي قزعاء).

**أقـزع الرجـلَ وغـيره:** پیاوەکـە خـۆی تـەرخانکرد بـۆ کارێـكو بەهیـچی تـرەوە مەشـغوڵی نـەبوو.

**قَزَّعَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَزَعَ) دێ.
**تَقَزَّعَ الفرسُ**: ئەسپەکە ئامادەبوو بۆ غاردان.
**تَقَزَّعَ القوم**: خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو بڵاو بوونەوە.
**تَقَزَّعَ السحابُ**: هەورەکە ڕەویەوەو نەما.
**تَقَزَّعَ الرجلُ**: پیاوەکە هەندێ کۆمەڵە موی جیاجیا بەسەریەوە مانەوە.
**قَوْزَعَ الديكُ**: کەڵەشێرەکە پەڕو پۆڵی دەوران دەوری ملی خۆی فش کردنەوە.
**القُزَّعَةُ**: کۆمەڵە موو کەلەسەری منداڵدا دەهێڵدرێنەوە وەکوو کاکۆڵو گودلە ٥ موی کەم بەتۆقەسەرەوە.
**القَزَعُ**: هەرشتێك پارچەپارچەی جیاجیابن ٥ پەڵەهەوری جیاجیا بەئاسمانەوە ٥ پارچەپارچە قژی سەر ٥ خوری مەڕ کەلەوەرزی بەهاردا هەندێکی بەردەداو دەکەوێتە خوار ٥ باریکایی پەڕی تیر ٥ پەڕی بچوکی تیر ٥ هەوری زۆر بەرز ٥ هەوری بچوك کەبەئاسمانەوە خێرا بڕوا.
**القُزْعَةُ**: بەمانا (القُزَّعَةُ) دێ.
**قَزَلَ قَزلاً وقزلاناً**: بازی دا ٥ بەهەنگڵەشەلە ڕۆیی.
**قَزِلَ**: زۆر شەلی بەخراپترین شێوەی شەلین ڕۆیی ٥ قاچی باریك بوون بەهۆی ئەوە گۆشتیان پێوە نەما ٥ (فهو أقزَل وهي قزلاء) ٥ (ك: قُزْلٌ).
**الأقْزَلُ**: گورگ.
**الأقزلان**: دووپەڕن لەناوەڕاستی کلکی داڵاش‌و داڵەکەرخۆرە دان.
**قَزَمَهُ قَزْماً**: ڕەخنەی لێ گرت.
**قَزِمَ قَزَماً**: خوێڕی بوو، ناکەسبەچەو ناپیاو بوو.
**تَقَزَّمَ**: بەتوندو تیژی لەگز کارەکە ڕاچوو.
**الأقزامُ**: پێرو توێژێکی ئادەمیزادن کورتەباڵاو کوڵە بنەن ٥ لەهەرێمە دارستانە ئیستیوائییەکانی ئەفریقاو دەوروبەری باشووری کیشوەری ئاسیادا دەژین.
**القِزامُ**: بەدخو و خوێڕی ٥ دەگوترێ: (قوم قِزام) گەل‌و نەتەوەیەکی خوێڕی‌و هیچ‌و پوچن.
**القَزْمُ**: (رجل قَزْمٌ) پیاوێکی کورتەباڵایە ٥ خوێڕییە.
**القَزَم**: جەستە بچوك‌و کورتەباڵا ٥ (ك: أقزام).
**القَزِمُ**: بەمانا (القَزَمُ) دێ ٥ ڕژدو چروك‌و هەتیومچە: کە هیچ خێرو

بێرێـکی لـەلا چـاوەڕوان نـەکرێ ٥ (ك: أقزام).

**القَزَمَةُ**: کورتـەبالاّ چ ژن بێ چ پیـاو ٥ هەروا ناوە بـۆ مـەڕی بـچوك‌و لـەڕو بێ بەروبوم.

**القِـزان**: مەنجـەڵی گـەورە، قـازان ٥ کـە لەمس‌و شتی وا دروست کرابێ.

**قَزا قَزْواً**: بێزی کردەوە هەڵسلەمیەوە.

**قَـــزا بعـــصاه**: بـــە گۆچـــانەکەی زەوی هاژنیەوە.

**أقزی**: بەعەیبو خراپە لەکەدار بوو.

**القَزْو**: کەسێك غافڵو بێ ئاگا نـەبێ ٥ هەمیشە وشیار.

**القُزَةُ**: ماری کۆڵەهۆیباب.

**قَسَبَ الماءُ قَسْباً**: ئاوەکە بـەخوڕی ڕۆیـیو خوڕەی هات.

**قَـسُبَ قُـسُوباً**: پتـەو و ڕەق بـوو ٥ (فهـر قسب وقسیب).

**القَیْسَبَةُ**: درەختۆکەیەکە بنکی یەکەو پـــەل پـــەل دەبـــێ ٥ بەئەنـــدازەی حـــەفتاو پێـــنج ســـانتیمەتر بـــەرز دەبێتـــەوە، گوڵەکـــەی وەکـــوو گـــوڵی وەنەوشـــە وەهایـــە بەتـــەڕی ئـــاگر دەگرێ وەکوو حاڵەتی وشـکی ٥ (ك: قَسِیبٌ).

**قسر فلاناً**: زۆری لەفلان کرد.

**قَـسَرَ علـی الأمـر**: ناچـاری کـرد لەسـەر شتەکە.

**إقتَسَرَهُ**: زاڵ بوو بەسەری داو ملکەچی بوو.

**قَسْوَرَ الرجلُ**: پیاوەکە کەوتە ساڵەوە.

**قَـسْوَرَ النبـتُ**: گیـاو گژەکـە زۆر بـوو تێکچڕژا.

**القَسْوَرُ**: شێر ٥ کوڕی گەنجی شانو مـل قەویو بەهێز ٥ ڕاوکەری تیر هاوێژ ٥ (ك: قساورة).

**القَـسْوَرَةُ**: شـێر ٥ مرۆڤـی شـکۆمەندی ســـەرکەوتوو ٥ هەرشتێـــك خـــاوەن هێزو توانا بێ.

**قَـسَّ فـلان قـسوسة**: فلاّنکـەس بـوو بـە کەشیش.

**قَسَّ قَسّاً**: فیتنەیی کرد.

**قَسَّ الحدیثَ**: قسەکەی بلاّو کردەوە.

**قَـــسَّ الـــشَّيْئَ**: شـــتەکەی داوا کـــردو بەدواداچوونی بۆ کرد.

**قَسَّ الرجـلُ مـا علـی العظـم مـن اللحم**: هەرچی گۆشتی سەر ئێسقانەکە بـوو دایماڵی، لێی کردەوە.

**قَسَّ الإبلَ**: باش شوانی حوشترەکانی کرد.

**تَقَـسَّسَ الـشَّيْئَ**: داوای شـتەکەی کـرد، بەدوادا چوونی بۆ کرد.

**تَقَـسَّسَ النـاس باللیـل**: بەشـەو گـوێی لەقسەی خەڵك ڕاگرت.

**القَسُّ**: کەشیش پیاوی ئایینی مەسیحی

٥ ئێستا پلەیەکە لەنێوان نوسقوفو شەماس دا ٥ لێزانو کارامە ٥ دەگوترێ: (فلان قَسّ إبل) فلاَنکەس زاناو لێزانە لە بەخێوکردنی حوشتردا ٥ (ك: قسوس) لەسەر وەزنی (فلوس).

**القَسَّاسُ**: فیتنە گێرو فیتنە جۆ.

**القَسِيُّ**: قوماشێکە لەکەتانو ئاوریشم کاتی خۆی لە ولاَتی میصرو شام دا دروست کراوە هەندێ گوڵی لە شێوەی نارنجیو شتی وا تێدا نەخش دەکران.

**القِسِّيسُ**: کەشیش ٥ (ك: قساوسة وقساقسة وقسيون).

**قَسَطَ فلان قِسطاً**: فلاَنکەس دادوەر بوو.

**قَسَطَ قَسْطاً وقُسُوطاً**: ستەمی کردو لەحەق لای دا.

**قَسِطَتِ العُنُقُ قَسَطاً وقسوطاً**: ملی وشك بوو.

**قَسِطَت العظامُ**: لەبەر لەڕیو لاوازی ئێسقانی وشك بوو.

**قَسِطَت الرُكبَةُ**: ئەژنۆی ڕەق بوو ناتوانێ بیان نوشتێنێتەوە.

**قَسِطَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە ڕانی کورتو باریکایی قاچەکانی کورت ٥ قاچەکانی باش بۆ هەڵنەهاتنەوە ٥ (فهو أقسط وهي قسطاء).

**أقسَطَ**: عەداڵەتی ڕەچاو کرد ٥ دەگوترێ: (أقسط في حكمه وأقسط بينهم واليهم).

**قَسَّطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەشبەش کرد.

**قَسَّطَ الدينَ**: قەرزەکەی کردە چەند وەجبەیەكو لەچەندماوەی جیاجیادا وەری بگرێتەوە.

**قَسَّطَ النفقة على عياله**: بژێوی ماڵو منداڵی خۆی کەم کردەوە.

**تَقَسَّطوا المال بينهم**: ماڵو سامانەکەیان لەناو خۆیان دا دابەش کرد.

**القِسْطُ**: عەداڵەتکاریی ٥ ئەندازەیەك لەناو و شتی تر ٥ تەرازوو ٥ بەشوبار ٥ دەگوترێ: (وَفَّاهُ قِسطَهُ) بەشی خۆی پێدا.

**القُسْطُ**: جۆرە عودو چڵە دارێکە لە هیندوستانەوە دەهێنرێ دەکرێتە ناو بخورو دەرمانەوە.

**القَسْطاء**: (رجل قسطاء) پیاوێکە خوارییی لەقاچی دا هەیە بەجۆرێك قاچەکانی لێك دوور دەکەونەوەو ئەژنۆو خوار ئەژنۆکانی خەریکە پێکەوە بنوسێن.

**المُقسِطُ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

**القِسطاسُ**: ڕاسترین تەرازوو باشترینی.

**قَسْطَرَ الدَراهمَ**: دیرهەمەکانی نەخدینە

کردن لەبۆتەی دان.

**القَسْطار**: ئەو کەسەی دیرهەمەکان ئەخدینە دەکاو عەصڵو ناعەصڵ لێك جیادەکاتەوە.

**القَسْطَرَةُ**: بۆرییەکی نایلۆنەو نەرمەلیقەیە دەخرێتە ناو ڕێڕەوی میزەوە بۆئەوەی خڵتەو پڵتەی کۆبوۆوەی ناو میزەڵدان پاك بکاتەوە.

**القَسْطَرِيُ**: جەستە گەورە ٥ (ك: قساطرة).

**القَسْطلُ**: تەپوتۆزی شەڕگە ٥ درەختێکە لەپێری دار بەڕو، بەرێکی زۆری هەیە بەبرژاوی دەخورێ.

**قَسْقَسَ في السير**: لە ڕۆیشتندا کۆششی کردو خۆی ماندوو کرد ٥ دەشگوترێ: (قَسقَسَ لیله أجمع) هەموو شەوەکەی بێداربوو نەنووست.

**قَسْقَسَ عن أمر الناس**: پرسیاری کرد دەربارەی کاروباری خەڵك ٥ (فهو قسقاس).

**قَسْقَسَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جولاند، خستیە جموجۆڵ ٥ دەگوترێ: (قسقس العصا) گۆچانەکەی هەڵسوڕاند.

**قَسْقَسَ ما على المائدة**: هەرچی لەسەر سفرەکە بوو خواردی.

**تَقَسْقَسَ أصواتهم بالليل**: بەشەو گوێی بۆ قسەی خەڵکەکە کلۆر کرد، هەوڵی دا بزانێ چی دەڵێن.

**القَسْقاسُ**: چاوساغو شارەزا بۆ ڕێ نیشاندانی نەشارەزایان: کە هەمیشە بەدڵسۆزی کاری خۆی ئەنجام بدا ٥ برسیایەتی زۆر ٥ ڕوەکێکە دەشوبهێتە کەرەوز ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوەکێکی بۆن ناخۆش کە لەڕێڕەوی ئاودا دەڕوێو گوڵێکی سپی هەیە.

**قسم الشَّيْءَ قَسْماً**: شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ کردی بە دوو بەش.

**قَسَّمَ بين القوم**: شتەکەی لەناو خەڵکەکەدا دابەش کردو هەرکەسە بەشێکی پێدا ٥ دەشگوترێ: (قَسَمَ الله الرزقَ) ٥ دەشگوترێ: (قَسَم القوم الشَّيْءَ بینهم) خەڵکەکە شتەکەیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد هەریەکەیان بەشی خۆی برد.

**قَسَم الدَّهرُ القومَ قَسْماً**: ڕۆژگار خەڵکەکەی پەرتەوازە کردو لێکی دابڕین.

**قَسَّمَ فلان أمرَهُ**: فلانکەس نیشەکەی خۆی مەزندە کردو تێ فکری ئاخۆ

چۆن کاری تێدا بکا.
**قَسُمَ الوجه قساماً وقسامةً:** ڕوخساری جوان بوو ٥ دەگوترێ: (قسم الرجلُ فهو قسيم وقسيم الوجه).
**أقْسَمَ إقساماً:** سوێندی خوارد ٥ دەگوترێ:
**أقسم بالله:** سوێندی بەخودا خوارد.
**قاسم فلان فلاناً:** هەریەك لەو دووانە بەشی خۆی هەڵگرت ٥ دەشگوترێ: (قاسمه المالَ)ماڵەکەی لەگەڵ دابەش کرد.
**قاسم فلاناً:** سوێندی بۆ فلانکەس خوارد.
**قَسَّمَ الشَّيْئَ:** شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ دەگوترێ: (قسموا المال بينهم).
**قَسَّمَ القومَ:** خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد بەشێکی بردە فلان شوێن‌و بەشەکەی تری بردە فلان ٥ دەشگوترێ: (قَسَّمَهم الدهرُ) ڕۆژگار پەرتەوازەی کردن.
**قَسَّمَ الهمومُ فلاناً:** خەم‌و خەفەت فلانکەسی بەشبەش کردوە هەردەمە دڵی لە شوێنێك‌و هەڵەوگیری شتێکە.
**قَسَّمَ الشَّيْئَ:** شتەکەی جوان کرد.
**قَسَّمَ الثوبَ:** قوماشەکەی بڕی بۆنەوەی بیدروێ.
**إقتسمَ فلان:** فلانکەس بیری کردەوە لەنێوان کارەکانی دا تێفکرینی ئەنجام داو پڕۆفەی کردن ٥ دەگوترێ: (ترکت فلاناً يقتسِمُ) فلانکەسم جێهێشت خەریکی بیرکردنەوەو تێفکرین بوو لەنێوان ئەم کارو ئەوکار.
**إقتسمَ القومُ:** خەڵکەکەیان گرت‌و سوێندخۆری یەکتری بوون بۆکاری داهاتوویان.
**إقتسمَ الشَّيْئَ بينهم:** هەریەکە لەخەڵکەکە بەشی خۆی برد.
**إنقَسَمَ الشَّيْئُ:** شتەکە پارچە پارچە بوو.
**تقاسم القومُ:** خەڵکەکە سوێندیان بۆ یەکتر خوارد بەڵێن‌و وادەیان بەیەکتر دا ٥ دەشگوترێ:
**تقاسموا بالله:** سوێندیان خوارد بەخودا.
**تقاسَمَ الشَّيْئَ بينهم:** شتەکەیان لەناو خۆیان دا بەش کرد.
**إسْتَقْسَمَ فلان:** فلانکەس داوای ئەو بەشەی خۆی کرد کە بۆی دیاریکراوە ٥ داوای دابەشکردنی شتەکەی کرد بەهۆی تیروپشکی شێوە قومارەوە.
**إستقسم فلان:** فلانکەس بیری کردەوەو

مەزنـدەو پێـك گرتنـی لـەنێوان دووكارەكەدا ئەنجام دا.

إسْتَقْسَمَ فلاناً بالله: داوای لەفلانكەس كرد سوێندی بۆ بخوا بەخودا.

الإسْتِقْسَامُ: جـۆرە تیروپـشكێكە بـۆ دابەشـكردنی شتێـك بـەهۆی ئەزلامەوە ٥ ئەزلام بریتی بوو لەوە عەرەبـەكان لەسـەردەمی پـێش ئیسلام دا كۆمەڵێـك تیریـان دەهێنـا لەسەر هەندێكیان دەنووسی (إفْعَلْ) لەسەر برێكیان دەنووسی (لاتفعل) برێكیـشیان هیـچیان لەسـەر نەدەنووسین جائەگەر بیانویستایە كارێـك بكـەن ٥ بـەم تیرانـە تیروپشكو قورعەیان دەكرد.

الأقسومة: بەشوبار ٥ (ك: أقاسیم).

القَسَامُ: جـوانیو جوانخاسـی ٥ كـاتی هـەڵاتنی خـۆر لەناسـۆوە كەلـەو كاتـەدا خـۆر جـوانترین دیمـەنی هەیە.

القَسَامَةُ: جـوانیو جوانڕوخـساریی ٥ ڕاگرتنی شەڕو هـەوڵی ئاشتەوایی ٥ كۆمەڵێـك سـوێند لەسـەر مـافی خۆیـان دەخـۆن وەری دەگـرن ٥ سـوێندی قەسـامە؛ ئەومیـە پـەنجا كـەس لـەخزمو خـوێنگری كـوژراو سوێندەخۆن كە ئەوان مافی خۆیانە خوێنی كوژراوەكەیان لە خێڵی فلان وەربگـرن ئەمـە كاتێـك كوژراوەكـە بەمردوویی بدۆزنەوە لەدەڤەری ئەو خێڵـەو نەشـزانن خـودی بكوژەكـە كێیـە، ئەگـەر لەئـەوان پەنجا كـەس سـوێندی خـوارد ئـەوە خـوێنی بكوژەكـەیان وەردەگـرن، ئەگـەر لەتۆمـەتبارەكان پـەنجا كـەس سوێندی خـوارد كـە ئـەو كـوژراوە دەسـتی ئـەوانی تێـدا نیـە خوێنەكەیان لەسەر لادەچێ.

القُسَامَةُ: ئـەو بەشـەیە كەدابـەش كـەر وەلای دەنێ وەكوو كرێ بۆخۆی.

القِسَامَةُ: پیشەی شت بەش كردن.

القَسَامِيّ: ئـەو كەسـەی پۆشـاك كۆدەكاتـەوەو قـەدی دەكا بۆئـەوەی قەد بگرێ ٥ ڕوخسار جوان.

القَسْمُ: بـەش ٥ بەشێـك لەشـتە بەشكراوەكە ٥ عـەطاو بەخـشش ٥ ڕاو بۆچوون ٥ دەگـوترێ: (فلان جید القَسْمِ) ٥ شكو گومان ٥ باران ٥ ئـاو ٥ ڕەوشـت ٥ دابونـەریت ٥ (حـصاة القـسم) بەردێـكە دەخرێتـە نـاو جامێـكەوە ئـەمجار ئـاو دەكرێتـە جامەكـەوە تـا بەردەكـە دادەپۆشـێ، یەكێك ئەو بەشە ئاوە دەخواتـەوە ئـەمجار بـۆ یەكێـكی تـر ئـاوی تـێ دەكـرێ تابەردەكـە دادەپۆشـێو یەكێكی تر دەیخواتەوە، بـەو جـۆرە

ئاوەکە بەش دەکەن‌و هەرکەسە بەشی خۆی دەخواتەوە ئەمە کاتێک دەبێ کۆمەڵێک خەڵک لەشوێنێک بن ئاوی خواردنەوەیان کەم پێبێ بەو شێوەیە ئاوەکە دابەش دەکەن.

**القِسْمُ**: بەشو بار ◦ (ك: أقسام).

**القَسَمُ**: سوێند ◦ (ك: أقسام).

**القِسْمَةُ**: دابەشکردن ◦ بەش‌وبار.

**القَسْمَة**: تورەکەی عەتر فرۆش ◦ ئەو شتەی عەتر فرۆش شوشە عەترەکانی تێدا هەڵدەگرێ.

**القَسِمَةُ**: جوانی ڕوخسارو دیمەن ◦ خودی ڕوخسار ◦ دیمەنی دەم‌و چاو ◦ تورەکەیەکی ڕەنگاو ڕەنگە عەتر باشی شوشە عەترەکانی تێدا هەڵدەگرێ ◦ (ك: قَسِمَات).

**القَسُومُ**: دەگوترێ: (نوىً قسوم) دەنکی بڵاوەبوو ◦ ناوکە خورمای پەرتەوازە بوو.

**القَسيم**: کەسێک شت لەگەڵ یەکێکی تر بەش بکا ◦ بەش‌وبار ◦ بەشێک لەشت ◦ (ك: أقسماء).

**القسيمة**: بەڵگەنامەو دیکۆمێنتێکە زیاد لە نوسخەیەکی هەیە بۆ مامەڵە پێ کردن.

**المُقَسَّمُ**: جوان‌و ڕێک‌و پێک ◦ دەگوترێ: (فلان مُقَسَّمُ الوجه) فلانکەس ڕوخسار جوان‌و شۆخە.

**المَقْسَمُ**: بەش‌وبار.

**المَقْسِمُ**: شوێنی دابەشکردن ◦ خودی دابەشکردن.

**المُقْسَمُ**: سوێند ◦ شوێنی سوێند خواردن.

**أقْسَنَ الرجلُ**: پیاوەکە دەستی ڕەق هەڵاتن‌و پێستی بەری دەستی پتەو بوون بەهۆی ئیش کردنەوە ◦ دەگوترێ: (أقسنت يده).

**قسا الجسمُ قَسْواً وقساوة**: جەستەی توندو پتەو بوو.

**قسا القلبُ وقلبه**: دڵی ڕەق بوو بێ بەزیی بوو ◦ سۆزو ڕەحمەتی تێدا نەما ◦ خوشوع‌و ترسی خودای تێدا نەبوو ◦ (فهو قاس، وقاسِيّ وهي قاسية وقَسِيَّة).

**قَسَت الأرض**: زەوییەکە ڕوتەن بوو هیچی لێ نەڕوا.

**قسا اليوم أو العامُ**: ڕۆژەکە یان ساڵەکە توش‌و پڕ تەنگ‌و چەڵمە بوو.

**أقْسى قَلْبَهُ**: دڵی خۆی ڕەق‌و بێ بەزەیی کرد ◦ دەشگوترێ: (أقْسَتِ السيئات قَلْبَهُ) تاوان‌و خراپەکاری دڵی ڕەق کردوە.

**قاسي الأمر الشديد**: تاڵاو و ناڕەحەتی کارە ناخۆشەکانی چەشت، لەگەڵیان ژیا.

**الأقسى**: دەگوترێ: (هو أقسى من الحجر) ئەو لەبەرد ڕەقترە.

**القَسْوَةُ**: ڕەق‌و پتەو لەهەموو شتێك دا، بێ ڕەحم‌و بەزەیی‌و دڵڕەقی.

**القَسِيُّ**: توندو تیژ.

**المَقْسَاةُ**: دەگوترێ: (الذنب مقساة للقلب) تاوان‌و خراپەکاریی دڵ ڕەق دەکاو ڕەحم‌و بەزەیی تێدا ناهێڵێ.

**قَشْوَر**: بڕوانە مادەی (قَسَر).

**قَشَبَ الشَّيْئَ بالشيئ قَشْباً**: شتەکەی تێکەڵ شتەکەی تر کرد ◦ (قشب الطعامَ) خواردنەکەی تێکەڵ بەژەهر کرد.

**قَشَبَ فلاناً**: فلانکەسی ژەهر خوارد کرد.

**قَشَب فلاناً بعيب نفسه**: فلانکەسی بەعەیبەکانی خۆی لەکەدار کرد ◦ (قشب بسوءٍ) خراپەی پێوە لکاند (قشب فلاناً رِيحُ كذا) بۆگەنی فلان شت فلانکەسی جاڕز کرد، زیانی پێ گەیاند ◦ (قشب السَّيفَ) شمشێرەکەی مشت‌و ماڵ کرد.

**قَشُبَ الثوبُ ونحوه قَشَابَةً**: کراسەکە (قوماشەکە) زۆر پاك‌وخاوێن بوو.

**القِشْبُ**: ژەنگ ◦ ئەو توێکڵ‌و پارچە بێکەڵکانەن کە لەشت پێك دێ‌و هەندێ میکرۆب‌و بەکتریا دەری دەدەن ◦ (ك: أقشاب).

**القَشَبُ**: ژەهر ◦ (ك: أقشاب).

**القشيب**: تازەو پاك‌و خاوێن ◦ دەگوترێ: (ثوب قشيب) و (ربطة قشيب) و (سيف قشيب) ◦ شمشێرێکە تازە مشت‌وماڵ کراوە ◦ هەموو شتێکی تازە قەشیبە ◦ (ك: قُشُبٌ).

**قَشَدَهُ قَشداً**: پێستەکەی لێ کردەوە، سپی کرد.

**إقتَشَدَ السمنَ**: ڕۆن‌و چەورییەکەی کۆکردەوە.

**القَشَادَةُ**: خشت‌وخۆڵ‌و بندۆك کە دەکەوێتە بنکی مەنجەڵە ڕۆنی قاڵکراوەوە.

**القِشْدَةُ**: ڕۆنەکەرە ◦ زوبدەیەك چەوری کەم بێ ◦ گیایەکە کە ئاژەڵ بیخوا شیری زۆر دەبێ.

**قَشَرَ الشَّيْئَ قَشْراً**: توێکڵی لەشتەکە کردەوە.

**قَشِرَ الرجلُ قَشَراً**: پیاوەکە زۆر سوور بوو، وەکوو ئەوە بڵێی پێستەکەی لێ داماڵدراوەو خوێنەکەی دەرکەوتووە ◦ (فهو أقشر وهي قشراء).

**إنقَشَرَ أنفه**: لوتی سوور بۆتەوە بەهۆی تینی خۆرەوە سوتاوەتەوە.

**إنقَشَرَ التمرُ**: دەنکە خورماکان پێستەکەیان ئەستور بوو.

**قَشَّرَ الشَّيْئَ**: توێکڵی شتەکەی داماڵی.

**إقتشر الرجلُ**: پیاوەکە پۆشاکی خۆی داماڵی خۆی روت کردەوە.

**إنقشر الشَّيْئُ**: شتەکە توێکڵەکەی داماڵدرا.

**تَقَشَّر الشَّيْئُ**: بەمانا (إنقشر) دێ.

**القُشارُ**: توێژی مار.

**القُشارَةُ**: ئەوەی هەڵدەوەرێ لە توێکڵەکان لەکاتی توێکڵ لێ کردنەوەی شتەکە.

**القِشْرُ**: توێکڵ داپۆشەری سروشتی شت ٥ وەکوو توێکڵی پرتەقاڵو پێستی کوانو دومەڵ ٥ هەروا ناوە بۆ هەر پۆشاکێك کە جەستەیەك داپۆشێ.

**قِشر البياض**: ماسییەکە ڕەنگ نیلی جەستەپان درێژی زیاد لە بستێکە، گۆشتەکەی باشترین گۆشتی ناسکە.

**القَشِرُ**: هەرشتێك توێکڵی زۆر بێ.

**القَشراءُ**: مار کە توێژ (کاژ)ی فڕێ دەدا.

**القِشْرَةُ**: تاکی (القِشر) قوماشی زۆر تەنك (کوتاڵی زۆر تەنك کەجەستە داپۆشێ).

**القُشْرَةُ**: بارانی بەلێزمە: کەڕوی زەوی بشواتەوە.

**القَشُورُ**: دەرمانێکە لەدەموچاو دەدرێ بۆئەوەی ڕەنگی روخسار صافو بێگەرد بنوێنێ.

**القَشُورُ من النساء**: ئافرەتێکە نەکەوێتە عادەی مانگانەیەوە.

**القَشِيُ**: توێکڵ زۆر.

**المِقْشَرَةُ**: ئامێرێکە توێکڵی میوەو شتی وای پێ دادەماڵدرێ ٥ میوەی پێ سپی دەکرێ ٥ وەکوو پەتاتەو خەیارو کاڵەك.

**المَقْشورة من النساءِ**: ئافرەتێکە جوانکاری بۆ ڕوخساری کرابێ بۆئەوەی صاف بنوێنێ.

**قَشَّ النباتُ قَشّاً**: ڕوەکەکە وشك بوو.

**قَشَّ الإنسانُ**: مرۆڤەکە لێرەو لەوێ کۆی کردەوە ٥ چی لەسەر سفرەو خوان هەبوو کۆی کردەوە ٥ ئەو بەرماوەو خۆراكو شتەی کەسانی تێرو تەسەل فرێی دەدەن ئەم کۆیان دەکاتەوەو دەیانخوا.

**قَشَّ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە دوای کزو لاوازیی قەڵەو بوو.

**قَشَّ القوم**: خەڵکە ئاژەڵەکانیان لەنەخۆشیو برسیایەتی ڕزگاریان بوو.

**قَشَّ الرجلُ من مرضه**: پیاوەکە لەنەخۆشییەکە ڕزگار بوو، هەڵسایەوە.

**قَشَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی لێرەو لەوێ کۆکردەوە ٥ شتەکەی بەنینۆك ئەوەندە کڕاند تا وردو ونجڕ ونجڕ بوو.

**قَشَّ المكانَ**: چی لەسەر ڕوی شوێنەکە هەبوو لەگڵو شتی وا لای بردو پاکی کردەوە.

**أقشَتِ البلادُ**: وڵاتەکە وشکانی زۆر بوو.

**قَشَّشَ**: هەوڵی دا خواردن لێرەو لەوێ کۆبکاتەوە ◦ چی بەردەستی کەوت لەسەر سفرەو خوان کۆی کردەوە لولی دا.

**تَقَشَّشَ**: بەمانا (قَشَّشَ) دێ.

**تَقَشَّشَ الرجلُ من مرضه**: کابرا لەنەخۆشییەکەی چاك بۆوە.

**تَقَشَّشَ الجرحُ**: برینەکە بەرەو چاکبوونەوە دەچێ.

**القُشاشُ**: ئەوەی کە لێرەو لەوێ کۆدەکرێتەوە.

**القَشاشُ**: کەسێك شتی خراپو بێ کەڵك کۆدەکاتەوەو دەیخوا ◦ کۆکەرەوەی پاشەڕۆكو شتی خراپو کۆنو بێ کەڵك.

**القَشُّ**: خورمای خراپ ◦ خشتو خۆڵو خاشاکی ماڵدراو لەناو ماڵو فەرمانگەو شوێنی وا ◦ بن خەرمانی دانەوێڵە ◦ (ك: قشوش).

**القَشَّةُ**: تاکی (القَشُّ).

**المِقَشَّةُ**: گەسك.

**قَشَطَ الشَّيْءَ عن الشَّيْءِ قَشْطاً**: شتەکەی دەرخستو پەردەو توێکڵەکەی لێ داماڵی ◦ (قَشَطَ الخَشَبَةَ) ڕوی دارەکەی تاشیو زبرییەکەی ڕاماڵیو لوسی کرد.

**قشط فلاناً بالعصا**: بەعەصاو گۆچان لە فلانکەسی دا.

**تَشَطَهُ**: سپی کرد، لای برد نەیویست.

**إنقَشَطَت السماءُ**: ئاسمان هەوری پێوە نەماو بوو بەساماڵ.

**تقشطت السماءُ**: بەمانا (إنقشطت) دێ.

**القُشاطُ**: بەردی یاری تاوڵە ئەوانەی ڕەشن یان سپین.

**المِقْشَطُ**: ئامێری کەوڵ کردنو تاشینو توێکڵ لابردن ◦ (ك: مَقاشط).

**قَشَطَتِ الريحُ الغيمَ**: ڕەشەباکە هەورەکەی ڕاداو توێسکە هەور بەئاسمانەوە نەما.

**قَشَعَ النورُ الظلامَ**: ڕوناکی تاریکی ڕادا.

**قَشَعَ القومَ**: خەڵکەکەی پەرتەوازە کردو لەشوێنی خۆیان لایان بردن.

**أقشَعَ السحابُ**: هەورەکە کەلێنی تێکەوتو نەما.

**أقشَعَ القومُ**: خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کردو پەرتەوازە بوون.

**أقْشَعَ عن الماء**: لەدەوروبەری ئاوەکە ڕۆیشتن.

**أقْشَعَ الريحُ الغيمَ**: ڕەشەباکە هەورەکەی ڕاداو ئاسمانی هەساوکرد.

**إنْقَشَعَ عنه الشَّيْئُ:** شتەکە دەرکەوتو دڕی بەداپۆشـــــراوییەکەی دا ٥ دەگـوترێ: (إنقَـشَعَ الظَـلامُ عـن الـصُبح)تاریکـایی دڕی پـێ دراو گزنگی بەیانی دەرکەوت.

**إنقَشَعَ الهَمُّ عن القلب:** غەمو نارەحەتی لەسەر دڵو دەروونی فلان لاچوو ٥ (إنقشع السَحابُ عـن الجـو) هـەورو هەلا لەحەوادا نەما.

**إنقَـشَعَ القـومُ:** خەڵـکەکە پەرتـەوازە بوون‌و بلاوەیان لێ کرد.

**إنقَشَعَ عن الماء:** لەلای ئاوەکە ڕۆیشتن‌و شوێنەکەیان جێهێشت.

**إنقَشَعَ الليلُ:** شەو ڕابردو ڕۆیی.

**إنقَـشَعَ الـبلاءُ عـن الـبلاد:** بـەلاو کارەسـاتەکە لـەولات نـەماو کۆتـایی پێ هات.

**تَقَشَّعَ عنه الشَّيْئُ:** بەمانا (إنقَشَعَ) دێ.

**القَشْعُ:** ئاوێـکی کەمو تەنکاو کە ببێتـە سـەهۆڵ ٥ شـوێنی داکەنـدنی جـل لەناو حەمام دا.

**القَشِعُ من الرجال:** پیاوێـك لەسەر کاری خۆی بەردەوام نەبێ‌و هەر ڕۆژە مل بداتـە کارێـك ٥ وشـك ٥ پارچـەیەك لە پێستی وشکەوەبووی ڕزیو ٥ (ك: قِـشاع) ٥ پارچـەیەك: لـە قـوڕی وشـکەوەبوو ٥ توێژێـك لـەزەوی کەلای بدەیو فڕێی بـدەی ٥ پارچـە هەورێـك دوای ڕەوینـەوەی هـەور لەئاسـۆدا بمێنـێ ٥ بـای شـەماڵ لـەم ڕووەوە کەهـەور ڕادەدا ٥ پیرێـك کەلەبەر پیری گۆشتی پێوە نەمابێ.

**إقشَعَرَّ جلدُهُ:** پێستی جەستەی لەرزی.

**إقـشَعَرَّ جِلـدُهُ مـن الجـرب:** بـەهۆی گرووییەوە پێستی جەستەی وشکەڵ بوو.

**إقْـشَعَرَّت الأرضُ:** زەوییەکـە وشـك‌و سووتەمەڕۆ بوو بارانی لێ نەباری.

**إقْشَعَرَّ النبات:** ڕوەکەکە تێراو بوو.

**إقْشَعَرَّت السَّنَة:** ساڵەکە کەم باران بوو، وشکەساڵ بوو.

**القُشاعِر:** زبر.

**القشعَرِيرَة:** هەڵ لەرزین‌و وەشـەقەتۆڵە کەوتن.

**القِشعَامُ مـن الرجـال والنـسور والـرُّخَم:** پیـاوی پـیر، هـەڵۆو داڵـە کـەرخۆری بەسالاچـــوو ٥ نێـــرە هـــەڵۆی جەستەگەورە.

**القِشْعامَةُ:** تەڵەو داو.

**القَشْعَمُ:** بەمانا (القِشعَامُ) دێ.

**القِشْعَمُ:** بەمانا (القَشْعَمُ) دێ.

**قَشِفَ فلان:** فلانکەس شێوە چڵکن‌و پلکن بوو ٥ گوزەران تەنگ‌و کولەمەرگی بوو ٥ بـەهۆی خۆرەتـاوەوە ڕەنگـی پێـستی

گۆڕاوە ٥ چڵكن‌و پیس‌و پۆخەڵ بوو ٥ گرنگی بەپاك‌و خاوێنی نەدا.

**قَشُفَ فلان قَشافَةً:** بەمانا (قَشَفَ) دێ.

**قَشَّفَ الله عَيشَهُ:** خودا گوزەرانی تەنگ كردوە.

**تَقَشَّفَ:** وازی لەخۆش ڕابواردن هێنا.

**عـام أقـشَفُ:** ساڵێـكی تونـدو تیـژو گرانی‌و ناخۆشە.

**القَشَفُ:** چڵك‌و پیسی كە بەجەستەوە بنووسـێ ٥ بەتایبـەتی لـەوەرزی زستان دا.

**قَشقَشَ اللَّحْمُ على المقلى أو في القـدر:** جزەی گۆشتەكە لەسەر مەقەڵی یان لەناو مەنجەڵدا بیسترا.

**قـشقش القطـرانُ الجَـرَبَ:** قەترانەكـە گرویێەكەی چاك كردەوە.

**تقـشقش:** ئامادەباشـی پەیـدا كـرد بـۆ چاكبوونەوە ٥ دەگوترێ:

**تقشقش الجُرحُ:** برینەكە گۆشتە وەزونی هێنایەوەو خەریكە چاك بێتەوە.

**قَشَمَ فلان قشماً:** فلانكەس خواردنی زۆر بوو.

**قَـشَمَ الطعـامَ:** خـراپ‌و سوتاو و ڕزیـوی لەخواردنەكــە جیــاكردەوەو جــۆرە باشەكەی خواردنەكەی خوارد.

**قشمَ الخوصَ:** لقـە دارخورماكانی شیتەڵ شیتەڵ كرد بۆئەوەی بیانتەنێ.

**إقتشمه:** لێرەو لەوێ شتی كۆكردەوەو خواردی.

**القَــشامُ:** ئەسـپی خــوری (گەنــە) حەشــەرەیەكی فــرە قاچــە لــەناو خوری كوڵك‌و موی ئاژەڵ دا دەژی.

**القُـشامُ:** خـواردنی خـراپ‌و بـێ كەڵـك كەفری دەدرێ.

**القُشامَةُ:** بەمانا (القُشامُ) دێ.

**القَشَمُ:** خورمای سپی پێش ئـەوەی بگا ٥ گۆشــتی زۆر ســوور بــەهۆی زۆر پێگەیشتنەوە.

**القَشيمُ:** گزوگیای وشكەوەبوو.

**قشا العودَ وغيره قشواً:** دارەكەی سپی كرد توێكڵەكەی لێ كردەوە.

**قشا الحَبَّةَ:** توێكڵی لە دانەوێڵەكە كردەوە.

**أقــــشى فـــلان:** فلانكــــەس دوای دەوڵەمەندیی هەژار كەوت.

**قَشّى العودَ وغيره:** دارەكەی سپی كـرد، توێكڵی لێ كردەوە.

**قَـشّى الحَبَّـةَ:** توێـكڵی لـە دانەوێڵەكـە كـردەوە، چـەڵتوكەكەی كـرە كـرد ٥ سپی كرد.

**القُشاءُ:** تف.

**القشاوَةُ:** (المسنّاة المستطيلة في الأرض).

**القشوان من الرجـال:** پیـاوی لاوازو بـێ گۆشت ٥ داڵگۆشت.

**القَشوَةُ:** بوخچەو سوندوقێـكە ئـافرەت

بۆنی خۆشو صابونو کلو کلتورو پێداویستی خۆی تێدا هەڵدەگرێ ٥ (ك: قشوات وقشاء) ٥ جۆرە گیراوەیەکە بۆ ئافرەتی زەیستان.

**قصب الشَّيْءَ قَصْباً**: شتەکەی بڕیەوە.

**قصب الجزارُ الشاةَ**: قەصابو حەیوان سەربڕەکە مەڕە کوژراوەکەی پارچە پارچە کرد.

**قَصَّب فلاناً**: جنێوی بە فلان داو عەیبداری کرد.

**أقصب الزَرْعُ**: کشتوکاڵەکە قەدو لاسکی کردو باڵای بەرزبۆوە.

**أقصب المكانُ**: شوێنەکە قەفەزاژو شتی وای زۆر بوو ٥ ڕوەکی شێوە قەفەزاژی زۆر بوو.

**أقصب فلاناً عِرْضَهُ**: وای لە فلانکەس کرد بتوانێ جنێو بە ناموسی بڵێ.

**قَصَّبَ**: بەمانا (أقْصَبَ) دێ.

**قَصَّبَ شعرَهُ**: پرچی وەنینەوەو بای دانو گشتی کردن ٥ دەشگوترێ: (أخذ الرجلُ الرَّجلَ فقَصَبَهُ).

**إقتصب الزَّرْعُ**: کشتوکاڵەکە قەدو لاسکی کرد.

**إقتصب الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوە.

**التقصيبة**: گلۆڵەمو ٥ (ك: تقاصيب).

**القاصِبُ**: ئەو کەسەی فو بە قەفەزاژدا دەکا ٥ هەورێك بگۆڵێنێ.

**القِصابَةُ**: پیشەی قەصابیی.

**القُصْبُ**: پشت ٥ ڕیخۆڵە ٥ خالیگەو کەلەکە ٥ ژێی کەوانو شتی وا کە لەڕیخۆڵە دروست بکرێ ٥ (ك: أقصاب).

**القَصَبُ**: هەر ڕوەکێك لاسکەکەی کلۆر بێو گرێ گرێ بێ ٥ هەروا ناوە بۆ قەصەبی شەکر ٥ ڕوەکێکی ئاوییە لە پێڕی نەجیلییەو قەدێکی درێژی هەیە لەدەم جۆگاو ڕوباردا دەڕوێ ٥ وایش دەبێ دەڕوێندرێ ٥ لەوڵاتی میصر پێی دەگوترێ: (الغاب البلدي) یان (قصب النيل) ٥ هەروا ناوە بۆ ڕێڕەوی ئاوی سەرچاوە ٥ ئێسقانی دەستو قاچو پەنجە ٥ گەوهەری ڕوکەش کراو بەیاقوت ٥ هەرپارچە زێڕو زیوێك لە درێژەوەبێو ناوەکەی بۆش بێ هەروا هەر شتێك وەکوو بۆری ئاو و شتی وا ناوەکەی کلۆر بێ ٥ بەشەکانی ڕیخۆڵە ٥ قوماشێکە لە کەتانی تەنكو نەرم ٥ چەند شریتو جۆرە پارچەی باریکی درێژن قوماشیان پێ دەنەخشێندرێ.

**القصباءُ**: کۆمەڵێك قەفەزاژی ڕواوی چڕوپڕ ٥ شوێنی ڕوانی قەفەزاژ.

**اَلقَصَبَةُ**: هەر لاسکێکی ڕوەك کلۆر بێو ئەمسەر وسەری گرێی هەبن ٥ وەکوو لاسکی قەفەزاژو گندۆڕو گیا گەنەمەو قەڵداسو شتی وا ٥ هەر ئێسقانێك خربێو مۆخی تێدا بێ ٥ ئێسقانی پەنجە ٥ ئێسقانی لوت ٥ شارو شارۆچکەی وڵات ٥ باڵەخانە ٥ ناوەوەی قەڵا ٥ پارچە قەصەبێکە لە وڵاتی میصر درێژیەکەی سێ مەترو حەفتاو پێنج سانتیمەترە زەوی پێ دەپێورێ.

**القَصَّابَةُ**: ماڵماڵ؛ ئامێرێکە بە وڵاخ ڕادەکێشرێ بۆ تەختکردنو ڕێکخستنی زەوی ٥ یان هێزێکی ئالییە، مەکینەیەکە بەوزەی بەنزینو گازو شتی وا کاردەکا.

**القُصَابَةُ**: گلۆڵە مووی هەڵکراو ٥ بۆری ٥ زورناو بلوێر ٥ ژێی دروستکراو لە ڕیخۆڵە ٥ (ك: قَصَّابٌ).

**القَصِيبة**: گلۆڵە موو ٥ بۆری ٥ (ك: قصائب).

**اَلمَقصَبَة**: شوێنی لێ ڕوانی قەفەزاژو قەصەب ٥ دەشگوترێ:

**أرض مَتْصَبَةٌ**: زەوییەکە قەصەبی زۆرە.

**اَلمُقَصِّبُ**: ئەو کەسەی زۆرجار لە پێشبڕکێدا سەر دەکەوێو دەیباتەوە ٥ ماستو شیر کە توێژیان زۆر بێ.

**قَصَدَ الطريقُ قَصْداً**: ڕێگاکە ڕاستو ڕەوان بوو.

**قَصَدَ الشاعِرُ**: شاعیرەکە شیعری وەنینەوە

**قصد له واليه**: چو بۆ لایو بەمەبەستەوە بەرەو لای ئەو ڕۆیشت ٥ دەشگوترێ: (قَصَدَه) بۆ هەمان مانا.

**قَصَدَ في الأمر**: لەکارەکەدا مام ناوەند بوو.

**قصد في الحكم**: لە بڕیارەکەدا عادل بوو بەحەق جوڵایەوە.

**قَصَدَ في النفقة**: لە مەسرەف کردندا مامناوەندی پەیڕەو کرد.

**قَصَدَ في مَشيه**: لە ڕۆیشتن دا نەخێرا ڕۆیی نەزۆر هێواش مامناوەندی گرتە بەرچاو.

**قَصَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوە.

**أقصد السَّهمُ**: تیرەکە نیشانەکەی پێکا.

**أقْصَدَ الشاعِرُ**: شاعیرەکە درێژەی بەشیعر دانان داو چامە شیعری هۆنینەوە.

**أقْصَدَ فلاناً**: زەبری لە فلانکەس داو شوێنی کوشندەی گرت ٥ دەشگوترێ: (عَضّته الحية فأقصدته).

**قَصَّدَ الشاعِرُ الشِّعرَ**: شاعیرەکە شیعرەکەی پاڵفتە کردو کردی بەچامە شیعرێکی نایاب.

**قَصَّدَ العودَ**: دارەکەی شکاندو کردی بەدوولەت.

**إقتصد فلان**: فلانکەس مامناوەندی بوو نە کزبوو نە قەڵەو.

**إقتصد الشاعِرُ**: شاعیرەکە بەردەوام بوو لەشیعر گوتن دا.

**إنقَصَدَ العودُ**: دارەکە شکا.

**تَقَصَّدَ العودُ**: دارەکە شکا ٥ دەگوترێ: (تقصدت الرماحُ) ڕمبەکان شکانو پارچە پارچە بوون.

**الإقتصاد**: زانیارییەکە باس لە دیاردە تایبەتییەکانی بەرهەمهێنانو دابەشکردن دەکا.

**القاصِدُ من الأسفار**: سەفەری ئاسان ٥ دەگوترێ: (بيننا وبين الماء ليلة قاصدة) شەو ڕۆشتنێکی مامناوەندیمان مابوو بگەینە ئاوەکە، ئەگەر شەوێك بەهێواشی تا بەیانی بڕۆشتینایە دەگەیشتینە ئاوەکە ٥ هەروا وشەی (القاصد) ناوە بۆ تیر کە ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی نیشانە دەکرێ.

**القَصْدُ**: دەگوترێ: (هو على القصد) واتە: لەسەر ڕاستە ڕێیە ٥ ڕێبازی ڕاست ٥ پیاوێك نەقەڵەو بێو نەکزو لاواز ٥ بەرامبەر دەگوترێ: (هو قصدك) ئەو بەرامبەرتە ٥ کەم ٥ دەگوترێ: (أعطاه قَصْداً) کەمی پێدا ٥ گۆشتی وشکەوەبوو.

**القَصِدُ من الرماح ونحوها**: ڕمبی شکاو.

**القِصْدَةُ**: پارچەی شتی شکاو ٥ کەرتێکی شتە شکاوەکە ئەگەر کرابوو بەدوو لەت.

**القَصيدة والقصيد**: حەوت دێڕ شیعر یان زیاتر ٥ بەکوردی چامەشیعر ٥ (ك: قصائد) ٥ ئێسقانێ مۆخی هەبێ ٥ ڕمی شکاو.

**المَقْصِدُ**: مەبەست ٥ شوێنی مەبەست.

**المَقْصَدُ**: دەگوترێ: (إليه مَقْصدي) ئامانجی سەفەرو ڕێبازم بەرەو لای فلانە.

**المُقْصَدُ**: ئەو کەسەی نەخۆش دەکەوێو زوو دەمرێ.

**المُقَصَّدُ**: کەسێك مام ناوەند بێ نەزۆر قەڵەو بێ نەزۆر کز بێ.

**القِصديرُ**: عونصورێکی فلزییە ڕەنگ زیوییە ٥ ئەوپەڕی ئامادەباشی تێدایە بۆ بڵاو بوونەوەو پانبوونەوەو تەنك بوون، بۆ تەغلیف کردنی زۆرێك لە مەوادی بڕێو بەکار دەهێندرێ، لەگەڵ ڕەصاص دا دەتوێندرێتەوە بۆئەوەی بۆشاییەکانی پڕ بکاتەوە ٥ لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی زۆری بەروبومی

قیصدیر لـه پیـشەسازی صـەفیحو تەنەكەو شتی وادا بەكاردەهێندرێو قـاپو قاچـاغی ئاسـنو مـسی پـێ ڕوكەش دەكرێ.

**قصر عن الأمر قـصوراً:** لەناست كارەكـەدا دەستەوسـان بـوو وازی لێ هێنـاو بـۆی ئەنجام نەدرا.

**قَصَرَ الـسهمُ عـن الهـدف:** تیرەكە كورتی هێناو نەگەیشتە نیشانەكە.

**قصر الطعامُ:** خواردنەكە كەم بوو ٥ گـران بوو نـرخی بەرز بۆوە.

**قصرت النَّفقةُ بـالقوم:** بژێوەكە بەشـی خەڵـكەكەی نـەكردو مەبەسـتیانی جێبەجی نەكرد.

**قَصَرَ الشَّیْءَ:** شتەكەی كورت كردەوە.

**قَصَرَ القیدَ:** زنجیرەكـەی تەسـك كـردەوە ٥ دەگوترێ:

**قصر له من قیـده:** زنجیرەكـەی بـۆ تەسـك كردەوە.

**قَـصَرَ الـصلاة:** نوێـژی چـوار ڕكـاتی كـەم كردەوە كردی بە دوو ڕكات.

**قَـصَرَ الـشعْرَ:** قـژەكانی كـورت كردنـەوە هەندێـــكی لێ گـــرتو لـــە بنـــەوەڕا نەیتاشی.

**قَصَرَ الشَّیْءَ علـی الأمـر:** شتەكەی كـورت هەڵێنا لەسەر ئـەو كـارە تایبـەتی كـرد بە ئەو.

**قَصَرَ الدارَ:** خانوەكەی بەدیوار پتەو كرد.

**قَـصَرَ الثـوبَ قَـصراً:** قوماشـەكەی لەسـەر جلشۆر بـه كـوتكی دار كوتـاو پـاكی كردەوە.

**قَـصَرَ اللـونَ:** ڕەنگەكـەی لابـرد یان پـاكی كردەوە.

**قَصِرَ قَصَراً:** ئـازار لـەملی پەیدا بـوو ملی خوار كرد ٥ (فهـو قَـصِرٌ وأقـصر، وهـي قَصِرَةٌ وقصراء).

**قَصُرَ الـشَّیْءُ:** شـتەكە كورت بـوو ٥ (فهـو قصیر).

**أقْصَرَ عن الشَّیْء:** وازی لەشتەكە هێناو دەسەڵاتی هەبوو بەسەری دا.

**أقْصَرَ الشَّیْءَ:** شتەكەی كورت كردەوە.

**قَصَّرَ عن الشَّیْء:** وازی لەشتەكە هێنـاو دەسەڵاتی بەسەردا نەبوو.

**قَـــصَّرَ في الأمـــــر:** كەمتەرخـــــەمی لەكارەكەدا كرد.

**قَصَّرَ في العَطِیَّة:** بەخششەكەی لێ كـەم كردەوە ٥ (فهو مُقَصِّرٌ).

**قَصَّرَ الشَّیْءَ:** شتەكەی كورت كردەوە.

**قَصَّرَ الصلاة:** لە نوێژی چوار ڕكاتی دا دوو ڕكـاتی كـردن واتـە نوێژەكـەی كورت كردەوە.

**قَـصَّرَ شـعرَهُ:** قـژی كـورت كـردەوە، هەندێكی لێ گرت.

**قَـــصَّرَ الثـــوبَ:** بـــەداری جـــل شـــتن

قوماشەکەی لەسەر جلشۆر کوتاو پاکی کردەوە، سپی کردەوە.
إقتصر علی الشَّیْئِ: بەشتەکە قنیاتی کردو تەجاوەزی لیٚ نەکرد.
إقتصَرَ الشَّیْئَ: لە درێژی شتەکەی کەم کردەوە.
إقتصرَ أثر الشَّیْئِ: بەدواداچوونی بۆ شتەکە کرد.
تقاصَرَ عن الأمر: وازی لە کارەکە هێناو نەیتوانی بیکا ٥ بە ئەنقەستو تەصەننوع خۆی بەکورت نیشان دا.
تقاصَرَ نفس فلان: نەفسی فلانکەس بچوك بۆوە توایەوە.
تَقَوْصَرَ الرَّجُلُ: پیاوەکە وێکهاتەوە، چووە یەکەوە وەکوو زیشك خۆی خڕ کردەوە.
إستقصره: بەکورتی لەقەڵەم دا ٥ بەکەمتەرخەمی حسێب کرد.
القاصِرُ من الورثة: میراتگرێك منداڵ بێ نەگەیشتبێتە تەمەنی ڕوشدو بەخۆچاران.
القاصِرَةُ: دەگوترێ: (إمرأة قاصِرة الطرف) ئافرەتێکی بەحەیاو بەشەرمو چاو نەرمو دڵ زیندووە ٥ کچۆڵێك تەمەنی نەگەیشتبێتە تەمەنی ڕوشدو بەخۆچاران.
القُصَارُ: ئەو پەڕی کارو پیشە ٥ دەگوترێ: (قصارك أن تفعل كذا) ئەو پەڕی کارت ئەوەیە ئەوە بکەی ٥ ئەو کارەت بەسەو کیفایەتت دەکا.
القِصَارَةُ: پیشەی جلشۆریو جل کوتان بەداری جل شتن.
القُصَارَةُ: ئەو سەر کوێزرو سۆو شتەی لە هێڵەكو بێژینگ دا دەمێنێتەوە دوای لە بێژینگ دانو لە هێڵەکدانی شت ٥ ئەو دانەوێڵەی لە گوڵەکەی دا دەمێنێتەوەو بە گێرەکردن دەرنایە ٥ توێکڵی سەرەوەی دانەوێڵە ٥ شوێنی تایبەتی ناو ماڵ: کەهەر خاوەن ماڵ بۆی هەیە بچێتە ناوی: وەکوو ژوری نوستن.
القَصْرُ: پێچەوانەی مانای (المدّ) ٥ کەمتەرخەمی ٥ کۆتایی شتو ئەو پەڕیو غایەتی ٥ دەگوترێ: (قَصْرُك أن تفعل كذا) ئەو پەڕی کاری تۆ ئەوەیە ئەو کارە بکەی ٥ یان ئەگەر ئەوەبکەی بەستەو هیچی ترت ناوێ ٥ باڵەخانەو تەلار ٥ (ك: قصور) ٥ هەروا ناوە بۆ کاتی ئێوارەو سەرەتای شەو ٥ دەگوترێ: (أتيته قَصراً): کاتی عیشا هاتم بۆلای ٥ یان دەمەو ئێوارە هاتم بۆلای.
هەروا وشەی (القَصْرُ) ناوە بۆ لابردنی

ڕەنگ یان کاڵ کردنەوەی لە ئەلیافی شتی چندراو.

**القَصْرَةُ**: کورت هەڵهێنانو تایبەت کردن ٥ دەگوترێ: (أَبْلِغْ هذا الكلامَ بنِي فلانٍ قصرة) ئەم قسە بەهۆزی فلاّن بگەیەنەو بەکەسی تری مەڵێ.

**القَصَرَةُ**: بنکی درەخت ٥ لای خواروی مل بەلای شانەوە ٥ ئەستورایی مل ٥ لای خواروی درەختی خورما ٥ پارچە دار ٥ وردە ناسن ٥ ئەو سەرگوێزرو پوشو سۆو شتە بێکەڵکو پوچو خراپانە دەکەوێتە سەر بێژینگو گڵگیر ٥ کاو کوتی گەنمو جۆ: کە وشك بۆوە، توێکڵی بەروبوم وەکوو توێکڵی گوێزو توێکلە بادامو شتی وا ٥ تەمبەڵیو فونگرانی.

**القَصَّارُ**: ئەو کەسەی جل دەشواو پاکیان دەکاتەوە بەهۆی کوتانی جلەکان لەسەر بەردو بەشەپکە داری جل شتن.

**القُصُورُ الذاتي**: کورت هێنانی جەستەو نەبوونی ئامادەباشی تێیدا بۆ ئەنجامدانی کارەکانی بەشێوەیەکی ئاسایی، واتە نەتوانێ بەئاسایی بڕوا یان بەئاسایی دابنیشێ یان هەر جمو جولێکی تر.

**القصير من السيول**: لافاوێکە لەچەند شیو و دۆڵێك کۆببێتەوە ٥ دەشگوترێ: (فلان قصير النسب) واتە بەس ناوی باوکی بێنی دەناسرێ ٥ هەرگوترا: فلان کوڕی مەلامستەفای بارزانییە ئیتر ناسراوەو پێویست بەناوهێنانی باپیرو باپیرە گەورەی ناکا.

**القصيرة**: ئافرەتێك هەر لە ماڵەو بێو ڕێگای نەدرێ لەماڵ بچێتە دەر ٥ دەشگوترێ: (هو إبن عمي قصيرة) ئەوە کوڕی مامەو نەژادمان لێك نزیکە.

**القُصَيْرَى**: بنکی مل بەلای شانەوە ٥ لای سەروی پەراسوو لای خواروی پەراسوو (کورتە پەراسوو) ٥ دەشگوترێ: (قُصَيْراك أن تَفعل كذا) ئەو پەڕی توانای تۆ ئەوەیە ئەوە بکەی هیچی ترت بۆ ناکرێ.

**القَوْصَرَةُ**: قەرتاڵەو سەبەتە کە لەقەصەب دروست دەکرێو خورمای تێدەکرێ.

**المَقْصَرَةُ من الظلام**: تێکەڵاو بوونی تاریکی، داهاتنی تاریکی کاتی ئێوارە ٥ لاڕێ.

**المِقْصَرَةُ**: کوتكو شەپکەداری جل شۆر کە پۆشاکەکانی پێ دەکوتی بەمەبەستی پاکبوونەوەیان.

**المَقْصورَة من النساء:** ئافرەتی بەنازو نیعمەت پەروەردەبوو خانمو خاتوونی ماڵ ◊ لەناو ماڵو خانوو شانوودا بریتییە لە ھۆدەیەكی جیاكراوەو تایبەتە لەسەر نەھۆمی ئەرزی ◊ ھەروا ناوە بۆ چامە شیعرێك كۆتاییەكەی بەئەلفی مەقصورە بێ ◊ خرخاڵ ◊ ھەر سوچو قوژبنێك لەناو خانووی گەورەو فراوان دا ◊ شوێنی خوتبە خوێندنەوەی وتارخوێنو جێی نوێژی پێش نوێژ ◊ دەشگوترێ: (أبلغ هذا الكلام بني فلان مقصورة) ئەم قسەیە بگەیەنە بە خێڵی فلانو بەس، بەكەسی تری مەڵێ ◊ ھەروا دەگوترێ: (هو إبن عمي مقصورة) ئەو كوڕی مامەو خزمایەتیمان لێك نزیكە.

**قصت الفرس قَصّاً:** ماینەكە ئاوسبوونی دەركەوت.

**قَصَّ الثوبَ وغيره:** بەمقەست قوماشەكەی بڕی.

**قَصَّ بينهما:** لێكی دابڕینو ناوانی تێك دان.

**قَصَّ الشَّيءَ:** شوێن پێی شتەكەی ھەڵگرتو دوای كەوت.

**قَصَّ القِصّةَ:** چیرۆكەكەی گێڕایەوە ◊ دەگوترێ: (قَصَّ عليه الرؤيا) خەونەكەی بۆ گێڕایەوە ◊ (قَصَّ عليه خبره) ھەواڵەكەی بەڕاستی بۆ گێڕایەوە ڕوداوەكە چۆن بوو ئاوا بۆی گێڕایەوە.

**أقَصَّ فلان من نفسه:** كابرا وای كرد دوژمنەكەی زەفەری لێ بێنێو تۆڵەی لێ بكاتەوە (أَقَصَّ فلان من غريمه) فلانكەس فرسەتی لە دوژمنەكەی ھێناو تۆڵەی لێ كردەوە.

**أقَصَّ فلانٌ فلاناً:** فلانكەس ھەلی بۆ فلانكەس ڕەخساند كە تۆڵە لە دوژمنەكەی بسێنێ.

**قاصَّهُ مقاصَّةً:** قەرزدارەكە قەرزی لەسەر ھاوەڵەكەی بوو، قەرزەكەیان بەیەك گرتن، قەرزەكەیان خستە بری قەرزی یەكتر.

**قَصَّصَ الشَّعرَ والصوتَ والظُّفرَ:** قژەكەی قرتاند، دەنگی پێ بڕی ◊ نینۆكی قرتاند.

**قَصَّصَ دارَهُ:** خانوەكەی گەچكاری كرد.

**إقْتَصَّ فلانٌ:** فلانكەس تۆڵەی ستاند ◊ بەدواداچوونی بۆكرد.

**إقْتَصَّ الخبرَ عليه:** ھەواڵەكەی بێ زیادو كەم بۆ گێڕایەوە.

**تقاصَّ القومُ:** ھەریەكە لە قەومەكە

**أقعَى الكلبُ**: سەگەکە هەڵتروشکا، سمتی خستە سەر زەوی‌و هەردوو دەستی ڕاست کردنەوە.

**أقعى الأنفُ**: نەرمە لوتی بەرز بۆتەوەو ئەمجار سوڕاوە بۆلای ئێسقانی.

**أقعى فَرَسُهُ**: ئەسپەکەی پاشەو پاش گێڕایەوە.

**القَعْوُ**: بەکرەی دار.

**القَعوانُ**: دوو پارچە ئاسن یان دوو پارچە دارن میحوەرێکیان لە نێوانداییەو بەکرەیەکیان لەنێوان دێوو دەچێ.

**القَعْواء**: سمت پوچ یان قاچ باریك.

**قَعْوَلَ**: واڕۆیشت وەکوو ئەوە بەقاچەکانی گڵ هەڵبگرێ هەرکە قاچی هەڵدێنێتەوە بەسنگی پێی گڵ هەڵدەدا.

**قَفِئَتِ الأرضَ قَفْئاً**: زەوییەکە گیاو گژو ڕوەکی داوەشاو تێکچو، باران‌و گڵ‌و خۆڵبارین گیاو گژەکەی داوەشاند.

**قَفحَ عن الشَّيْءِ قَفحاً**: بێزی لەشتەکە بۆوە.

**قَفَفَ الشَّيْءَ**: بەقێزو بێزەوە شتەکەی قوت دا ٥ وەکوو چۆن دەرمان بەنابەدڵی دەخورێ.

**قَفَدَ لفلان قَفْداً**: ئیشی بۆ فلانکەس کرد.

**قَفَدَ فلاناً**: شەپلاخەی لە پشتەملی فلانکەس دا.

**قَفِدَ كل ذي عُنُقٍ قَفَداً**: ملی شل بوو یان ملی ئەستوور بوو.

**قَفِدَ الرجلُ**: پیاوەکە زەعیف بوو جومزگەکانی شل بوون ٥ لەسەر سەرەپەنجەکانی ڕۆیشت‌و پاژنە پێیەکانی لەزەوی نەکەوتن ٥ (فهو أقفد وهي قفداء).

**قَفِرَ الأثَرَ قَفراً**: شوێنی ئەسەرو دیاردەکە کەوت.

**قَفِرَ المالُ قَفراً**: ماڵ‌و سامانەکە کەم بوو.

**قَفِرَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە گۆشتی کەم بوو.

**قَفِرَ الرأسُ**: سەر قژی کەم بوو، توکی کەم پێوە بوو.

**قَفِرَ الطعامُ**: خواردنەکە بێ پێخۆر بوو.

**أقفَرَ الرجلُ**: پیاوەکە کەوتە چۆڵەوانی ٥ نانی بێ پێخۆری خوارد ٥ برسی بوو ٥ لە خزم‌و کەس‌وکاری دابڕا.

**أقفَرَ الطعامُ**: خواردنەکە بێ پێخۆر بوو.

**أقفَرَ المكان**: شوێنەکە کەسی تێدا نەما چۆڵ بوو.

**أقفَرَ الرأسُ**: سەر توکی پێوە نەما بێقژ بوو.

**أقفَرَ فلانٌ البَلَدَ**: فلانکەس وڵاتەکەی بەچۆڵی بینی.

**إقْتَفَرَ الأثَرَ**: بەمانا (قَفَرَهُ) دێ.

**تَقَفَّرَ الأثَرَ**: بەمانا (قَفَرَهُ) دێ.

**القَفَارُ**: بەمانا (القَفَرُ) دێ ٥ نانی بێ پێخۆر.

**القَفْرُ**: زەوی بێ ئاو و لەوەڕو درەختو ڕوەكو چۆڵەوانی، خاڵی لە مرۆڤو حەیوانات ٥ دەگوترێ: (نزلنا ببني فلان فبتنا القفر) چووینە لای خێڵی فلان، میوانداریان نەكردین لەساراو چۆڵ شەومان بەرۆژ كردەوە ٥ هەروا وشەی (القفر) ناوە بۆ جوانەگا كە لەدایكی دابڕدرێو فێری جوت پێكردنی بكەن.

**القَفْرَةُ**: بەمانا (القَفر) دێ ٥ واتە: زەوی چۆڵو سوتەمەڕو.

**المِقْفارُ**: چۆڵەوانیو سارای سوتەمەڕۆ.

**قَفَزَ الظَّبيُ**: ئاسكەكە بازی دا.

**قَفَزَ فلان**: فلانكەس مرد.

**قَفِزَ الفرسُ قَفَزاً**: ئەسپەكە هەردوو دەستی تا ئەژنۆی سپی بوو بەڵام پاشوی وانەبوو ٥ (فهو أقفز).

**تقافَزوا**: بازیان دا.

**تَقَفَّزَتِ المرأةُ بالحناء**: ئافرەتەكە بەخەنە دەستو قاچی خۆی ڕەنگ كردن.

**القافِزَةُ**: ئەسپی تیژڕۆ ٥ بۆق.

**القُفَازُ**: دەستكێش ٥ بەهەردوو دەستكێشەكان دەگوترێ: (قُفَازان).

**القُفَيْزى**: یارییەكی منداڵانە، بریتیە لەوە دارێك دەچەقێندرێو بازی بەسەردا دەدەن.

**القفیز**: پێومرێكی دانەوێڵە پێوانە وەكوو قسناغ لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر ئەندازەكەی دەگۆڕێ، لە وڵاتی میصر قەفیز، نزیكەی شانزە كیلۆگرامە.

**القَفیزُ من الأرض**: لەبواری پێوانەی زەوی دا سەدو چلوچوار زیراعە ٥ ئاسنۆكێكە زمانۆكەی قفلٚ دەچێتە ناویەوە.

**قَفَسَ الرَّجُلُ**: پیاوەكە مرد.

**قَفَسَ الشيْئَ**: شتەكەی بەزۆر ستاند.

**قَفَسَ فلاناً**: قژی فلانكەسی گرتنو بەرەو خوار ڕایتەكاندن.

**قَفَسَ الظَّبْيَ**: دەستی ئاسكەكەی بەستن.

**قَفِسَ قَفَساً**: لایەكی نەرمەی لوتی گەورە بوو ٥ (فهو أقفَس وهي قفساء).

**تقافَسَ الرجلان**: دوو پیاوەكە عەمبازی یەكتری بوونو كاكۆڵو قژی یەكتریان گرت.

**الأقفَسُ**: هەرشتێك درێژ بووبێتەوەو چەمابێتەوە ٥ كەسێك دایكی عەرەب بێو باوكی ناعەرەب بێ ٥ دەشگوترێ: (عبد أقفس) كۆیلەیەكی بەدڕەوشتو سەرپێچیكەرە ٥ ئەگەر مێینە بوو دەڵێی: (أمة قفساء).

**قَفَشَ الرجل قفشا**: پیاوەکە لە خواردن دا کارا بوو، زۆر خۆر بوو.
**قَفَشَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵگرت.
**قَفَشَ فلاناً بالعصا أو بالسيف**: بەعەصا یان بەشمشێر لە فلانکەسی دا.
**قَفَشَ الناقَةَ**: زوو حوشترەکەی دۆشی.
**إقْتَفَشَ العنكبوتُ ونحوهُ**: جاڵجاڵۆکەکە چووە کونەکەی خۆیەوەو دەستو قاچی خۆی وێك ناو خۆی خڕ کردەوە.
**إنْتَفَشَ العنكبوتُ**: بەمانا (إقْتَفَشَ) دێ.
**القَفْشُ**: جۆرێکە لە زۆر خۆریو خێرا خۆری.
**القَفَشُ**: دزو جەردەی فێڵبازو بێ ویژدان.
**قَفَصَ قَفْصاً**: چوستو چالاك بوو بازی دا ٥ سەرکەوتو بەرز بۆوە.
**قَفَصَ الأشياءَ**: شتەکانی لێك نزیك کردنەوەو کۆی کردنەوە.
**قَفَصَ الظَّبْيَ**: قاچی ئاسکەکەی کۆکردنەوەو بەستی.
**قَفَصَ اليعسوبَ**: شاژنە هەنگەکەی لە هەنگەلانەکەدا بەداوە دەزو حەبس کرد بۆئەوەی نەڕواتە دەر.
**قَفَصَ المرضُ أو البردُ فلاناً**: نەخۆشییەکە یان سەرماکە ئازاری فلانکەسی دا.
**قَفِصَ الفَرَسُ قَنَصاً**: ئەسپەکە لە بازدان دا خۆی گرتەوەو بەتەواوی خۆی هەڵنەدا.
**قَفِصَ فلان**: فلانکەس قورگی چوزایەوەو گەدەی ترشا.
**قَفِصَ أصابعُ فلان من البرد**: پەنجەی فلانکەس لەسەرمان چونو گرمۆڵە بوون.
**قَفَّصَ الظَّبْيَ**: بەمانا (قَفِصَه) دێ.
**قَفَّصَ الثوبَ**: قوماشەکەی خەتخەت کرد.
**تقافَصَ الثوبُ**: قوماشەکە گوڵەکانی تێك چرژانو چوونە ناو یەکەوە.
**تَقَفَّصَ**: کۆبۆوە، چۆوە ناو یەك ٥ وێکهاتەوە.
**القافِصَةُ**: لوتکەی بەرز، هەرشتێك لەزەوی بەرز بێتەوەو بەحەوادا بچێ.
**القُفَاصُ**: نەخۆشییەکە توشی وڵاخو مەڕو بزن دەبێ قاچیان وشك دەبن.
**القفاصة**: قەفەزچنی، کەسێك پیشەی قەفەز چنین بێ.
**القَفَصُ**: قەفەزی باڵندە تێدا بەند کردن ٥ لە شوڕکە داری باریك بەشاشی دەچندرێ.
**القَفَّاصُ**: قەفەز دروستکەر.
**القَفِيصُ و القفيصَة**: گاسن؛ ئاسنێکە بۆ زەوی کێڵان بەجوتو گاو هێستر بەکاردێ.

**قَفَطَهُ**: چاكەی دايەوە، پاداشی چاكەی دايەوە.

**القُفْطانُ**: پاڵتۆ، ساقو، پۆشاكێكی پان‌و ئاو دامانە لای پێشەوەی لەسەرەوەڕا بۆ خوارەوەی كراوەیە بەجۆرە پشتێنێك هەردوو لای لێك دەدرێن، لەسەر هەموو پۆشاكەكانەوە لەبەر دەكرێ.

**قَفَعَهُ بالمِقْفَعَة قَفْعاً**: بەدار لە پەنجەكانی دا بۆ تەمبێ كردن.

**قَفَعَ فلاناً عن كذا**: فلانكەسی لەو شتە مەنع كرد.

**قَفِعَ فلاناً قَفَعاً**: فلانكەس هەمیشە سەر شۆڕ بوو.

**قَفِعَت الأذنُ**: گوێچكەی خڕبوونەوەو دەوران دەوریان وێكهاتەوە.

**قَفِعَتِ الرجلُ**: قاچەكە پەنجەكانی بەرەو دواوە هەڵگەڕانەوە.

**قَفِعَ الكبشُ أو الشاةُ**: بەرانەكە یان مەڕەكە دووگی كورت بوو ٥ (فهو أقفع وهي قفعاء).

**قَفَعَ البَرْدُ أو الداءُ أصابِعَهُ**: سەرما یان نەخۆشی پەنجەكانی گرمۆڵە كردن‌و چواندونی.

**قَفَّعَ الشَّيْءَ**: شتەكەی خستە ناو سەوی دەم تەسكی بن بلاو.

**إنْقَفَعَ النباتُ**: ڕوەكەكە وشك‌و ڕەق بوو.

**إنْقَفَعَ عن الشَّيْءِ**: خۆی لە شتەكە گرتەوە

**تَقَفَّعَ فلان**: فلانكەس هەمیشە سەر شۆڕ بوو ٥ وێكهاتەوە.

**القُفَاعُ**: نەخۆشییەكە دەست‌و پێ گرمۆڵە دەكا.

**القَفْعُ**: مەتاڵێكە لەدار دروست دەكرێ وەكوو دەبابە وابووە جەنگاوەرەكان چوونە ناویەوە لە ژێریەوە چوونە پێش بەرەو قەڵاو شورە بۆئەوەی كونی بكەن‌و بچنە ناوییەوە.

**القفعَاءُ**: ڕوەكێكە ئەڵقە ئەڵقە دەوەستێ.

**القَفْعَةُ**: (قفة واسعة الأسفل ضيقة الأعلى) سەویەكە بنكی پان‌و پۆڕو دەمەكەی تەسكە.

**المِقْفَعَةُ**: دارێكە دەسكی هەیە پێی لە پەنجە دەدرێ.

**قَفَّ الشَّيْءُ قَفّاً**: شتەكە وێكهاتەوە.

**قَفَّ الثوبُ**: قوماشەكە دوای شتنی وشك بۆوە.

**قَفَّ الشَّعرُ**: لەترسان مووەكانی گرژ بوون.

**قَفَّ الصيرفي**: كابرای پارە گۆڕەوە لەناو پەنجەكانی دا دیرهەمی دزین.

**قَفَّت الأرضُ**: زەوییەكە ڕوەكەكانی وشك بوونەوە.

**قَفَّ فلانٌ**: فلانكەس کەوتە لەرزەو شەقەتۆڵەو گرژبوو.

**أقَفَّتِ العينُ**: چاوەکە فرمێسکی ڕژاندو ڕشێنەکەی بەرز بوونەوە.

**قَفَّت السائمة**: حەیوانە بەرەڵاکراوەکە بۆ لەوەڕان لەوەڕەکەی بە وشکی دەست کەوت.

**قَفَّت الدجاجَةُ**: مریشکەکە لەهێلکە چووەوە.

**القَفُّ**: پشتی شت.

**القُفُّ**: کورت ○ تەپۆڵکەو گردی ڕەق و پتەو ○ هەوری ڕەشی گەورە ○ کونی پاچ ئەوەی کلکەکەی تێدەخرێ ○ پیاوی خوێڕی و هەتیومچە.

**القَفّاف**: پارەگۆڕەوەیەك زۆر بتوانی دیرهەم لەنێوان پەنجەکانی دابدزێ ○ زەمبیل دروستکەرو بەچنە دروستکەر، بەچنە چن.

**القَفّاتُ**: جەماعەت و کۆمەڵ (قَفّان الشّيء) بەدواداچوون و هەوڵدان بۆ زانینی شت ○ کات و وەرزی شت ○ دەشگوترێ: (أتيتهُ على قفّان ذلك) بەشوێن ئەوەدا هاتم بۆلای.

**القَفَّةُ**: پیاوی جەستە بچوك ○ لەرزینی جەستە بەهۆی لەرزو تاوە.

**القُفَّةُ**: پاڵتۆی گەورە ○ زەنبیل ○ بەلەمی بچکۆلە کەلەناو ڕووبارو دەریاچەی بچوك دا بەکار دەهێندرێ.

**القِفَّةُ**: لەرزین و چۆقە چۆقێکە لەناکامی لەرزوتاوە توشی جەستە دەبێ ○ ئەو پیسایيەی یەکەمجار لەگەدەی منداڵ دێتە دەر.

**القَفِيفُ**: ڕوەکی وشکەوەبوو قانگەلاشك.

**قَفْقَفَ**: بەهۆی سەرمای زۆرەوە جەستەی وەچۆقەچۆق کەوت ○ ددانی وەشەقشەقە کەوتن.

**قَفْقَفَ النبتُ**: ڕوەکەکە وشك بوو.

**تَقَفْقَفَ**: بەمانا (قَفْقَفَ) دێ.

**القَفْقافُ**: ڕوەکی وشکەوە بوو، قانگەلاشك

**القَفْقَفُ**: شەویلە ○ (قَفْقَفان) هەردوو شەویلە.

**قَفْقَفا الطائر**: هەردوو باڵی باڵندە.

**قَفَلَ الفرسُ قفولاً**: ئەسپەکە لاواز بوو.

**قَفَلَ الجلدُ أو الشجرَ**: پێستەکە یان درەختەکە وشك بوو.

**قَفَلَ من السفر**: لەسەفەر گەڕایەوە.

**قَفَلَ في الجبل**: بەکێوەکەدا هەڵگەڕا.

**قَفَلَ الطعامَ قَفْلاً**: خواردنەکەی کۆکردەوە.

**قَفَلَ الشيئَ**: شتەکەی مەزەندە کرد.

**قَفَلَ القومَ بعينه**: چاوی بەدوا خەڵکەکەدا گێڕا.

**أَقْفَلَ الجيشُ**: سوپاكه گەڕايەوه.

**أَقْفَلَ البابَ**: دەرگاكەی داخست.

**أَقْفَلَ القومَ من مَبْعَثِهِم**: خەڵكەكەی گێڕايەوه.

**أَقْفَلَ على كذا**: كۆی كردنەوه.

**أَقْفَلَ في الطريق**: لە ڕێگادا چاوی بەدوودا گێڕان.

**أَقْفَلَ الشَّيْئَ**: شتەكەی وشك كردەوه.

**أَقْفَلَ العَطَشُ أو الصوم فلاناً**: تينوايەتی يان ڕۆژو فلانكەسی لاواز و وشك كردەوه.

**أَقْفَلَ المالَ**: ماڵەكەی بەكۆ و بەيەكجار دايە.

**تَقَفَّلَ في الجبل**: بەكێوەكەدا سەركەوت.

**إستَقْفَلَت يدا فلان**: فلانكەس چروك‌و ڕژد بوو.

**القافِلَةُ**: كاروانی بەرێكەوتوو بۆ سەفەر يان لەسەفەر گەڕاوە ٥ (بەمەرجێ كاروانەكە قەرەباڵغ بێ‌و ولاخ‌و كەل‌وپەلی زۆريان پێ‌بێ).

**القَفَّالُ**: قفڵ دروستكەر يان قفڵ فرۆش.

**القَفْلُ**: درەختی وشك.

**القُفْلُ**: قفڵ: كە دەرگای ماڵ‌و سندوق‌و شتی وای پێ دادەخرێ‌و بەسويچ‌و كليل دەكرێتەوه ٥ (ك: أقفال وقفول).

**القَفْلَةُ**: پێدانی شتی زۆر بەكۆ و بەيەكجار.

**القُفَلَةُ**: كەسێك هەرچی ببيسێ لەبەری بكاو لەزەينی خۆيدا هەڵی بگرێ ٥ كەسێك گومانی بۆ شتێك بچێ‌و گومانەكەشی ڕاست دەرچێ.

**القَفيلُ**: درەختی وشكەوەبوو، پێستی وشكەوەبوو ٥ قامچی ٥ شيو و دۆڵی تەنگ كەنەتوانی بەناويدا باز بدەی.

**القيفالُ**: ڕەگێكە لە قۆڵدا لەديوی دەرەوه.

**المُتَقَفِّلُ**: (رجل مُتَقَفِّلٌ) پياوێكی ڕژدو دەست قوچاوه.

**قَفَنَ الرجلُ**: پياوەكە مرد.

**قَفَنَ الكلبُ**: سەگەكە دەمی تێ خست.

**قَفَنَ الشَّيْئَ قَفْناً**: بەقەمچی يان عەصا لێی دا.

**قَفَنَ الشَّاةَ ونحوها**: لە پشتەملەوه مەڕەكەی سەربڕی.

**قَفَنَ رأسَهُ**: بۆ زێدەڕۆيی لەماناي (قَفَنَ) دێ.

**القَفِينَةُ**: مەڕ يان حوشتر: كە لە پشتەملەوه سەر ببڕدرێ.

**قفاهُ قَفْواً**: لە پشتەملی دا.

**قفى الشَّاةَ ونحوها**: مەڕەكەی لە پشتەملەوه سەربڕی.

**قَفَى الشَّيْئَ أو الأثَرَ:** شوێن شتەکە کەوت، بەدو شوێنەوارەکە دا گەڕا.

**قفا الله أثَرَهُ:** خودا شوێنەواری فەوتاندو ناسەواری بڕیەوە.

**قفا فلاناً بأمر:** فلاّنکەسی تایبەت کرد بەکارێکەوە.

**قفا فلاناً:** کارێکی ناشیرینی پاڵ فلاّنکەس دا.

**قفا السيلُ العُشْبَ:** لافاوەکە گڵو خشتو خاڵی خستە سەر گیاو گژەکە وای لێ کرد بە کەڵکی خواردنی ئاژەڵ نەیە.

**قفي قَفْياً:** بەمانا (قفا) دێ.

**أقفى الرجلُ:** پیاوەکە خۆراکی ناوازەو هەڵبژاردەی خوارد.

**أقفى به:** ڕێزی لێ گرت.

**أقفى فلاناً بأمر:** فلاّنکەسی هەڵبژارد بۆ کارێك.

**أقفى فلاناً على غيره:** فلاّنکەسی پاساو دایەوە بەسەر کەسانی دیکەدا.

**قَفَّى على الشَّيْئ:** شتەکەی داپۆشی، فەوتاندی لای برد.

**قَفَّى الشِّعرَ:** سەرواى بۆ شیعرەکە ڕێکخست.

**قَفَّى فلاناً:** فلاّنکەسی شوێن فلاّنکەسی خست.

**قَفَّى على أثره بفلان:** بەشوێن ئەودا فلاّنکەسی هێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعَيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾.

**أقتفاه:** شوێنی کەوت.

**إقْتَفَى الشَّيْئَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**إقْتَفَى فلاناً بأمر:** فلاّنکەسی بۆ کارێك هەڵبژارد ٥ دەگوترێ:

**إقْتَفَى بفلان:** خۆی تایبەت کرد بەفلاّنەوە.

**تقافى الناقةَ:** سواری پشتی حوشترەکە بوو.

**تقافى الأكمةَ:** چووە سەر گردەکە.

**تقافى فلاناً:** بوختانی بۆ فلاّنکەس کرد.

**تَقَفَّى بە:** پێشوازی لێ کردو پێی خۆشحاڵ بوو.

**تَقَفَّى الدَّابَّةَ بالعصا:** بەگۆچان لە پشتەملی ولاّخەکەی دا.

**تَقَفَّى فلاناً:** شوێن فلاّنکەس کەوت.

**تَقَفَّى الشَّيْئَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**إستقفاه:** بەشوێنی دا ڕۆیی بۆ ئەوەی شوێن پێی بسڕێتەوە.

**القافِيَةُ:** پشتە مل ٥ کۆتایی هەرشتێك ٥ لەبواری شیعردا بەو پیتانە دەگوترێ: کە بە بزوێن دەست پێ دەکاو بەشوێنیدا پیتی بێ بزوێن دێن لەکۆتایی دێڕە شیعرەکە.

**القَفَا:** پشتەمل ٥ (وقفا كل شيئ) دواوەیەتی.

**القَفَاوَةُ**: ئـەو خواردنو خواردنەوانـەن کە بۆ ڕێزلێنان لە میوان پێشکەش دەکرێ.
**القَفْوُ**: گڕ و تەپو تۆزێکە لەسـەرەتای باران بارین دا هەڵدەستێ ٥ گەنینو خراپبوونی گژوگیا بـەهۆی ئـەوەی ژێر لافاو کەوتون.
**القِفْـــوَةُ**: هەرشتێـــك هەڵبــــژێری ٥ هەڵبـــژاردە ٥ هەرشتێـــك بکرێتـــە هۆکار بۆ ڕێزلێنان لە میوان.
**القُفْيَـةُ**: چاڵێـکە: ڕاوکـەر خـۆی تێـدا حەشـار دەدا بۆئـەوەی فرسـەت لـە نێچیر بێنێ.
**القَفِيَةُ**: زێدەو پاساو دانـەوە ٥ دەڤـەرو ناحیـە ٥ مـەڕ: کـە لـە پـشتەملەوە سەربڕابێ ٥ هەروا ناوە بۆ کەسێـك شوێن دابونەریتی باوكو باپیرانی خۆی کەوتبێ ٥ دەگوترێ: (هو قَفِيـة آبائه).
**قَلَبَ الشَّيْئَ قَلْباً**: شتەکەی هەڵەوگێر کـرد ٥ لای ســـەروی هێنایـــە خـــوارو لای خـوارەوەی بـردە سـەروی، یـان چـەپی کــردە ڕاســتو ڕاسـتی کــردە چـەپ ٥ دەشگوترێ: (قَلَبَ الأمر ظهْراً لبطن).
**قَلَبَ فلاناً عما يريـد**: فلانکەسـی لادا لـەو شتەی مەبەستی بوو.
**قَلَـبَ الله فلانـاً اليـە**: خـودا فلانکەسـی مراند.
**قَلَـبَ للقـومِ قَلِيبـاً**: چاڵی بـۆ خەڵـکەکە هەڵکەند.
**قَلَبَ الداءُ فلاناً**: نەخۆشییەکە توشی دڵی فلانکەس بوو ٥ لەدڵی دا.
**قَلِـــبَ قَلَبـــاً**: لێـــوی هەڵــگەڕاوەبوو ٥ دەگوترێ: (قَلِبـتِ الـشَّفَة) (فهـو أقلـب وهي قلباء).
**قُلِبَ فلان**: فلانکەس دڵی ئازاری پێـگەیی ٥ (فهو مقلوب).
**قُلِبَتِ الدَّابَّةُ**: ولاخەکە دەردە دڵی توش بوو تۆپی.
**أقْلَبَ الخُبْـزَ**: نانەکە کاتی ئـەوەی هات هەڵەو گێڕ بکرێ.
**أقْلَـبَ القـومُ**: خەڵـکەکە ولاخـەکانیان تووشی دەردە دڵ هاتن.
**أقْلَبَ العِنَبُ**: ترێیەکە ناوەکـەی وشـك بوو بووبە مێوژ.
**أقْلَـبَ الخُبْـزَ**: نانەکـەی هەڵـگێڕایەوە بۆئەوەی دیوی ناوەوەشی ببرژێ.
**قَلَّـبَ الـشَّيْئَ**: بـۆ موبالەغـە لـەمانای (قَلَبَ) دێ ٥ دەگوترێ:
**قَلَّبَ الأمُورَ**: لەئاکامو دواڕۆژی کارەکان ورد بۆوە.
**إنقَلَـبَ**: بـۆ موتاوەعـەی (قَلَبَـهُ) دێ ٥ گەڕایــەوە بــۆ دواوە ڕۆیــی پــشتی هەڵکرد.

**تَقَلَّبَ فِي الأمور**: بە ویستی خۆی دەستی وەردایە کاروبارەوەو ئاڵ وگۆڕی تێدا کردن ٥ دەگوترێ: (فلان يتقلب في أعمال السلطان) ٥ فلاّنکەس دەست لەکاروباری پاشاوە دەدا.

**تَقَلَّبَ فِي البلاد**: بەناو وڵات دا گەڕا ٥ هاتوچۆی کرد.

**الإنْقِلاب**: کودەتا ٥ هەڵگێڕانەوەی شت لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر ٥ گۆڕانکاری لە دەسەڵات دا؛ لابردنی کۆمەڵێك لە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارو دانانی کۆمەڵێکی تر، یان هەر ئەوانەی کە فەرمانڕەواکان لادەبەن خۆیان دەسەپێنن ٥ لە زاراوەی جوگرافی دا (الإنقلاب) بریتیە لە گەڕانەوەی خۆر لەو پەڕی مەودای خۆیەوە بەرامبەر زەوی ئەم حاڵەتەش ساڵی دووجار ڕودەدا جارێکیان لە سەرەتای وەرزی زستان دا جارێکی تریشیان لەسەرەتای وەرزی هاوین دا.

**القالَبُ**: قاڵب؛ جا قاڵبی خشتو بلۆك بێ یان قاڵبی ئاڵتونو شتی تر بێ.

**القالِبُ**: بەمانا (القالَبُ) دێ ٥ خورمای گەیشتوی سورهەڵگەڕاو.

**القُلابُ**: دەردێکە تووشی دڵ دەبێ.

**القَلْبُ**: دڵ.

**قَلْبُ كل شيئ**: ناوەڕاستی شتو کاکڵەی شت.

**قَلْبُ النخلة**: کرۆکی دارخورما.

**قَلْبُ الشجر**: کرۆکی درەختو ئەوەی کە نەرمەو وەکوو پشوو وایە ٥ دەگوترێ: (رَجُلٌ قلبٌ): پیاوێکی وەجاخزادەو ڕەسەنە.

**القُلْبُ**: کە بۆ درەختو دارخورما بەکارهات بەمانا (القَلْبُ) دێ واتە: کرۆکی درەختو دارخورما ٥ بازنەی یەك ئەخشو شێوە.

**القَلَبَةُ**: هەنگاوتن بەقولاب.

**القُلَّبُ**: کەسێك زۆر ئەمبەرو ئەوبەرو ئاڵوگۆڕ بکا ٥ دەگوترێ: (رجل حُوَّلٌ قُلَّبٌ) پیاوێکە لێزانو شارەزایە بەگۆڕانی کاروبارەکان.

**القَلُوبُ**: بەمانا (القُلْبُ) دێ.

**القَليبُ**: بیر.

**المِقْلَبُ**: پاچێکە زەوی کشتوکاڵی پێ هەڵەوگێڕ دەکرێ.

**المَقْلَبُ**: فرتوفێڵ.

**المَقْلوبُ**: کەسێك تووشی ئەخۆشی دڵ بووبێ ٥ دەشگوترێ: (كلامٌ مَقْلوبٌ) قسەیەکە لە ڕێڕەوی خۆی لادراوە.

**قِلِتَ قَلَتاً**: ڕوبەڕوی لەناوبردن بۆوە ٥ داوەشا.

**قَلِتَ فلان**: فلانکەس لاواز بوو، گۆشتی کەم بوو.

**أَقْلَتَهُ**: ڕوبەڕوی لەناوچونی کردەوە ٥ دەگوترێ:

**أَقْلَتَهُ السفرُ البعيدُ**: سەفەری دوور خستیە حاڵەتی هیلاکەتەوە ٥ دایوەشاندو تێکی دا، ڕزاندی گەناندی.

**القَلْتُ**: چاڵو قوڵکە لەبەردا ٥ بەرداو ٥ دەگوترێ:

**قَلْتُ السيل**: چاڵاو و بەرداو.

**قَلْت الخاصِرَة**: قوڵایی کەلەکە.

**قَلْتُ العين**: قوڵکەی چاو.

**قُلْت الركبة**: ڕەفیسك ٥ (رجل قَلْتٌ) پیاوێکی گزو کۆڵەوار.

**القَلْتَةُ**: نێوان دوولای سمێڵ.

**المِقْلاتُ**: ئافرەتێکە منداڵی بۆ ڕانەوەستێ ٥ یان ئافرەتێك یەکجار منداڵی ببێ‌و ئیتر لەسەك بوەستێتەوە.

**المَقْلَتَةُ**: شوێنی تێدا فەوتان‌و خەتەرناك ٥ شوێنی ترسناك.

**قَلِحَتِ السِّنُّ قَلَحاً**: ددانی ڕەنگیان گۆڕا بەوەی کەوا بەڵخی زەرد یان سەوز دایپۆشین ٥ (فهو أقلح وهي قلحاء).

**قَلَّحَ الرجلَ**: چارەسەری زەردبوونی ددانی فلانی کرد.

**الأَقْلَحُ**: قالۆنچە.

**القُلاحُ**: بەڵخی زەرد یان سەوز کە ددان دادەپۆشێ.

**القِلْحُ**: پۆشاکی چڵکن.

**قَلَدَ الشَّيْءَ قَلْداً**: شتەکەی چەماندەوە ٥ دەگوترێ:

**قَلَدَ الحديدَةَ**: ئاسنەکەی چەماندەوە بەسەر شتەکەدا.

**قَلَدَ الحبلَ**: حەبلەکەی بادا.

**قَلَدَ الماءَ في الحوض**: ئاوەکەی لەحەوزەکەدا کۆکردەوە.

**قَلَدَ الحمى فلاناً**: فلانکەس هەموو ڕۆژێ تای لێ دێ.

**قَلَدَ الزرعَ**: کشت‌وکاڵەکەی ئاو دا.

**أَقْلَدَ البحرُ عليهم**: ئاوی دەریاکە دایپۆشین‌و غەرقی کردن.

**قَلَّدَ القِلادَةَ**: ملوانکەکەی کردە ملی.

**قَلَّدَ البدنة**: شتێکی لەملی حوشترەکە کرد بۆئەوەی بزانرێ کە حوشتری دیاری‌و قوربانییە.

**قَلَّدَ فلاناً السيفَ**: حەمایەڵی شمشێرەکەی لەمل کرد.

**قَلَّدَ فلاناً نِعْمَةً**: نازو نیعمەتی بەخشی بەفلان ٥ پیاوەتی لەگەڵ فلانکەس کرد.

**قَلَّدَ قِلادة سوءٍ**: هەجوی فلانی کرد جوێنی پێدا.

**قَلَّدَ فلاناً الأمرَ أو العمل**: کارەکەی خستە ئەستۆی فلان.

**قَلَّدَ الشَّيْخُ حَبْلَهُ**: پیرەمێردەکە بەهۆی پیری خەرەفاوییەوە گوێی لێ ڕاناگیرێو هیچی بەقسە ناکرێ.

**قَلَّدَ فلاناً**: شوێن ڕێبازی فلانکەس کەوت لە گوفتارو کرداردا بەبێ لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە ٥ دەشگوترێ: (قَلَّدَ القِردُ الإنسانَ) مەیمونەکە لاسایی مرۆڤی کردەوە.

**تَقَلَّدَ القِلادةَ**: ملوانکەی لەمل کرد.

**تَقَلَّدَ السَّيفَ**: شمشێری لەشان کرد.

**تَقَلَّدَ الأمرَ**: کارەکەی لەئەستۆ گرت.

**إقْلَوَّدَهُ النُّعَاسُ**: هەنۆزو خەوەنوچکە بەسەریدا زاڵ بوو.

**الإقليدُ**: ئەڵقەیەکە دەکرێتە لوتی حوشتر ٥ کلیل ٥ مل ٥ (ك: أقلاد).

**التَّقاليد**: دابونەریت کە چیناوچین پاشینە لە پێشینە وەری دەگرێ.

**القِلادَةُ**: ملوانکە لە زێرو زیو متومیرو و شتی بەنرخ ٥ ویسامی ڕێز لێنانە حوکمەتو فەرمانڕەوا دەیبەخشێ بەکەسانێکی لێهاتوو لەبوارێک دا ٥ (ك: قلائد).

**قلائد الشعر**: شیعری نەمر شیعرێک کە بەدرێژایی ڕۆژگار لەبیر نەچێتەوەو لەدڵی خەڵک دا بێ.

**القَلْدُ**: بازنەی بادراوو لەزیو دروستکراو.

**القِلْدُ**: بەشە ئاو بۆ ئاودێری کشتوکاڵ ٥ دەگوترێ: (سَقَينا أرضنا قِلدها) زەوییەکەمان بە بەشەئاوی خۆی ئاودێر کرد ٥ (وسقتنا السماء قِلْداً كل أسبوع) هەموو هەفتەیەك ئاسمان برە ئاوێکی بۆ باراندوین ٥ دەشگوترێ: (أعطيته قِلد أمري) کاروباری خۆم پێ سپاردووە.

**القَلْداءُ**: (ناقة قَلداء) حوشترێکی مل درێژە.

**القَلّودُ**: بیرێك ئاوی زۆر بێ.

**القِليد**: گەنجینە ٥ مەخزەن.

**القَليدُ**: شریت ٥ دەشگوترێ: (حبل قليد) حەبلی بادراو.

**المِقْلادُ**: گەنجینە ٥ عەمبار ٥ کلیل ٥ (ك: مقاليد) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ﴾ ٥ دەشگوترێ: (ألقيت اليه مقاليد الأمور) کاروبارەکانو ئەنجام دانیان خراونەتە ئەستۆێ ئەو.

**المِقْلَدُ**: بێژنگ: ئامێری پێوانە ٥ داس ٥ کلیل.

**رَجُلٌ مِقْلَدٌ**: پیاوێکە گەیشتۆتە تەمەنی کاملی.

**المِقَلَّدُ**: شوێنی ملوانکە ٥ شوێنی قایشی

شمشێرو شتی وا لەناو شان دا ٥ ئەسپی پێشکەوتوو لە گۆڕەپانی پێشبڕکێ دا .

**مُقَلَّداتُ الشِّعر**: شیعری نەمر.

**المَقْلودُ**: حەبلی بادراو و گشت کراو ٥ (سِوارٌ مَقْلودٌ) بازنەی باهەڵدراو.

**قَلَزَ الجرادُ قَلْزاً**: کوللەکە کلکی لەزەوی چەقاند.

**قَلَزَ فلان**: فلانکەس شەل بوو.

**قَلَزَ العصفور ونحوه**: چۆلەکەکە بازی دا.

**قَلَزَ فلانٌ**: فلانکەس بەهەڵمزین ئاوی خواردەوە.

**قَلَزَ بالشیئ**: شتەکەی فڕی دا.

**قَلَزَ فلاناً**: لەفلانکەسی دا.

**قَلَزَ فلاناً أقداحاً**: چەند پیاڵەیەکی شلەمەنی بە فلانکەس خواردەوە.

**قَلَّزَ الجرادَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَلَزَ) دێ.

**إقْتَلَزَ الكأسَ**: پیاڵەکەی هەڵقوڕاند.

**تَقَلَّزَ**: چوستو چالاك بوو.

**تَقَلَّزَ الوَعْلُ**: کەڵەکێویەکە بازی دا.

**القَلْزُ**: (رجل قَلْزٌ) پیاوێکە زەعیفو لاوازە.

**القِلَّزُّ**: پیاوی بەهێزو توانا ٥ مس کە ئاسن کاری لێ نەکا.

**قَلْزَمَ فلان**: فلانکەس هاتو هاواری کرد ٥ خوێڕیو بەدڕەوشت بوو.

**قَلْزَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی قوت دا هەڵیلوشی.

**تَقَلْزَمَ فلان**: بەهۆی بەخیلیو چاوچنۆکی مرد.

**تَقَلْزَمَ الشَّيْئَ**: بەمانا (قَلْزَمَهُ) دێ.

**القِلْزِمُ**: بەدڕەوشتو لەئیم.

**القُلْزُمُ**: شارێکی کۆنە، ئێستا شاری سویس لە میصر لە شوێنی ئەو شارە بنیات نراوە ٥ (بحر القُلْزُم) دەریای سور.

**قَلَسَت نفسُه قَلساً**: نەفسی خراپ بوو.

**قَلَسَ الرجلُ قَلْساً وقلساناً**: پیاوەکە پڕبەدەمی خواردنو خواردنەوەی هێنایەوە، قرقێنەی هاتەوە.

**قَلَسَ الإناءُ ونحوه**: قاپەکە، بەرمیلەکە، مەنجەڵەکە سەرڕێژی کرد ٥ دەگوترێ: (قَلَسَ البحر بالزبد) دەریا کەفی فڕێ دا.

**قَلَسَت الطَّعْنَةُ بالدم**: زەبرەکە خوێنی دەرهێنا.

**قَلَسَ فلان قَلْساً**: فلانکەس زۆری بیرە خواردەوە ٥ ڕەقصو سەمای کرد لە خۆشیا ٥ گۆرانی چاکی گوت.

**قَلَسَت السحابة الندى**: هەورەکە شەونمی هاویشت.

**قَلَسَ النحلُ العَسَلَ**: هەنگەکە هەنگوێنەکەی خواردەوە.

**قَلَّسَ لفلان:** دەستی بۆ فلان خستە سەر سنگیو ملکەچی بۆ نواند.

**قَلَّسَ فلان:** فلانکەس دەفی لێداو گۆرانی گوت ○ یاری غەمڕەوێنی ئەنجام دا بۆئەوەی بینەران کەیفو شادیی ڕویان تێ بکا.

**قَلَّسَ فلاناً:** قەلەنسووەو فێسی لەسەری فلانکەس کرد.

**تَقَلْنَسَ:** قەلەنسووەی لەسەر نا.

**الإنْقَليسُ:** ماسییەکە وەکوو مار دەچێ پێی دەگوترێ: (ثعبان السمك).

**القَلْسُ:** ڕشانەوە، ڕشو ○ حەبلێکی ئەستوورە بۆ کەشتی بەکار دەهێندرێ ○ (ك: أقلاس).

**القَلاّسُ:** قەلەنسووە دروستکەر، وەستای قەلەنسووە ○ دەشگوترێ: (بحر قلاّس) دەریایەکە کەف فرێ دەدا.

**القَلَنْسُوَةُ:** فێسێکە، کلاوێکە هەمەجۆرە، پۆشاکی سەرە ○ (ك: قلانس و قلانیس).

**القَلِیسُ:** هەنگوین.

**المُقَلِّسُ:** ئەو کەسەی یاری غەمڕەوێن ئەنجام دەدا ○ یاری وادەکا غەمو خەفەتی بینەران بڕەوێنێ.

**قَلَصَ الشَّیْئُ قلوصاً:** شتەکە نزیك بۆوەو هاتەپاڵی ○ وێکهاتەوە.

**قَلَصَ الثوبُ بعد الغسل:** قوماشەکە دوای شتن تێچوو وێکهاتەوەو کورتو تەسك بۆوە.

**قَلَصَ الظِلّ عني:** سێبەرەکە هەڵکشایەوەو کەم بۆوە.

**قَلَصَت الشفَةُ:** لێوەکە هەڵگەڕایەوە.

**قَلَصَ البِئرُ أو الغدیر:** بیرەکە یان زەلکاوەکە زۆربەی ئاوەکەی ڕۆچوو.

**قَلَصَ القومُ:** خەڵکەکە خڕبوونەوەو ڕەویان کرد.

**قَلَصَ الرجلُ:** پیاوەکە ڕۆیشت.

**أقْلَصَت الناقةُ:** حوشترەکە شیری تێدا ئەماو وشکی کرد.

**قَلَّصَ الشَّیْئَ:** بەمانا (قَلَصَ) دێ.

**قَلَّصَ الدِرعُ:** زرێیەکە وێکهاتەوە.

**قَلَّصَت الدوابُ:** وڵاخەکان پەلەیان کرد لە ڕۆیشتن داو بەردەوام بوون.

**قَلَّصَ بین الرَجُلَین:** دوو پیاوەکەی لێك جیاکردنەوە لەشەڕو جنێو بەیەکدان.

**قَلَّصَ ثوبَه:** کراسەکەی هەڵکرد.

**تقَلَّصَ الشَّیْئُ:** بەمانا (قَلَصَ) دێ.

**القَلْصَةُ:** (قَلْصَةُ البئر) هەڵقوڵانی ئاو لەناو بیردا.

**القَلاّصُ:** حوشتر دۆش ○ (ماء قلاّص) ئاوی هەڵقوڵاو و بەرزەوە بوو.

**القَلوصُ من الإبل:** جوانوە حوشتری تێکسمڕاو تا دەگاتە تەمەنی

نۆسالّى ٥ لەو تەمەنە بەو لاوە پێى دەگوترێ: (النّاقة) ٥ بێچوە نوعامە ٥ بێچوە حوبارا.

**المُقَلِّصُ:** (فرس مُقَلِّصٌ) ئەسپێکی قاچ درێژو گەدە بچوکە.

**القِلِّيطُ:** قۆڕی.

**القَلِيطُ:** گونهاوساو، گون قۆڕو گون زل.

**القَلِيطَةُ:** بەمانا (القَلِيطُ) دێ.

**قَـلاووز:** (مسمار قلاووز) بزماری بورغی، کە بە بادان ڕۆدەچێ نەک بە داکوتان.

**قَلَعَهُ قَلْعاً:** دەری هێنا، هەڵی کەند.

**قَلِعَ الراكبُ:** سوارەکە نەیتوانی لەسەر زینەکە خۆی بگرێ.

**قَلِـعَ المُصَارِعُ:** زۆرانبازەکە لەکاتی زۆرنبازیو بەربەرەکانی قاچی چەسپاو نەبوونو خۆی نەگرت.

**أَقْلَعَ الشَّيْئُ:** شتەکە دەرکەوتو پەردەی لەسەر لاچوو ٥ دەگوترێ: (أَقْلَعَ السَّحابُ) و (أَقْلَعَت الغمةُ).

**أَقْلَعَت السماءُ:** ئاسمان لە باران باراندن وەستایەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي﴾.

**أَقْلَعَ عن الأمر:** وازی لە کارەکە هێنا دەستی لە ئیشەکە هەڵگرت.

**أقلعت عنه الحمى:** لەرزوتاکە وازی لێ هێنا تووشی نەبۆوە.

**أَقْلَعَ الملاحُ السفينةَ:** کەشتیوانەکە ئاڵای کەشتیەکەی بەرز کردەوەو ئامادە بوو بۆ ڕۆیشتن.

**أَقْلَعَ المدينةَ:** شارەکەی وا دروستکرد وەکوو قەڵاو شورا قایمو پتەو بێ.

**قَلَّعَهُ:** بۆ موبالەغە لەمانای (قَلَعَهُ) دێ.

**إِقْتَلَعَهُ:** بەمانا (قَلَعَهُ) دێ.

**إِقْتَلَعَ الشَّيْئَ:** شتەکەی ڕفاند.

**إِنْقَلَعَ:** بۆ موتاوەعەی (قَلَعَ) دێ.

**إِنْقَلَعَ البعيُ:** حوشترەکە ساغو سەلیم بوو کەوتو مردار بۆوە.

**تَقَلَّعَ في مِشيته:** لە ڕۆیشتن دا مامناوەندیی بوو ٥ ڕۆیشتنەکەی بەجۆرێک بوو وەکوو ئەوە لەبەرزاییەوە داپەڕێتە خوار.

**القِلاعُ:** شیراعی کەشتی.

**القُلاعُ:** نەخۆشیەکە توشی ئاژەل دەبێو لەناکاوێک دەکەوێو مردار دەبێتەوە ٥ قورگ کەناوی تێدا نامێنێو وشک دەبێتەوەو شەقار شەقار دەبێ ٥ نەخۆشییەکە تووشی منداڵی بچوک دەبێ، دیاردەکەشی ئەوەیە خاڵی سپی لەدەمو قورگیدا پەیدا دەبن، ئەم نەخۆشییە دەتەنێتەوە.

**القُلاعَةُ:** بەردێکی گەورە، درکە شاخێکە لەناو سارادا ٥ بەردێک یان

کەمـــسەکە گـــڵ کـــە لـــەزەوی هەڵدەکەنـــدرێو دەهاوێـــژرێ ٥ دەگـوترێ: (رماه بِقُلاعـة) کەمسکە گڵ یان بەردێکی پێدا دا ٥ یان بە بەڵگەیەکی بەهێز بێدەنگی کرد.

**القَلْـعُ**: تێـشوی شـوانو پێداویـستی ٥ چەکوچو تەشوێی وەستای دیوار.

**القِلْـعُ**: شـیراعی کەشـتی ٥ (ك: قُلـوع وقِلاع و قِلَعَة).

**القُلْـعُ**: پیـاوی بـەتوانا بـۆ ڕۆیـشتنو خۆشڕۆ.

**القَلَعُ**: ئەوکاتەی لەرزوتا دەڕەوێتەوە ٥ ئـەو کرێـژو پـرژو شـتانەی لەسـەر پێستی گروێ دەردەکەون.

**القَلِـعُ**: (شـیخ قَلِـعٌ) پیرەمێردێـکە بەهێواشی ڕاست دەبێتەوە.

**القَلْعَـةُ**: قـەڵا، دژوعاصـی لـە کێـودا ٥ نەمامو تولە درەخت کە لـە دارەکە دەکرێتـەوە بـۆ ڕوانـدنو شـتی وا ٥ ئـــەو دارخورمایـــەی لـــە ڕەگـــەوە هەڵدەکەندرێ.

**القِلْعَةُ**: درز.

**القُلْعَةُ**: پیاوی زەعیفو لاواز ٥ پیاوێـك خـــۆ بەســـەر زینـــەوە نـــەگرێ ٥ درەختێك لە ڕیشەوە هەڵکەندرابێ ٥ مـــاڵو ســـامانی تەمـــەن کـــورت، کاڵایـــەك زۆر نەمێنێتـــەوە ٥ مـــاڵی بەئامانـــەت وەرگـــیراو ٥ دەگـــوترێ: (الـــدنیا دار قلعـــه) دونیـــا شـــوێنی گۆڕانکارییـە ٥ (هو علـی قُلعـة) ئـەو لەسەر سەفەرە ٥ (هـو مجلـس قلعـة) خانوەکەمان شوێنی کاتییـەو مڵـکی خۆمان نیە.

**القَلْعِيُّ**: ڕەصاصـی بـاش: کـەزۆر سـپی بێ.

**القَلاّعُ**: پۆلیس ٥ ئەو کەسەی لای پاشا بەخراپە باسی خەڵك دەکاو دژیان دەدوێ ٥ گۆڕ هەڵدەرەوەو کفن دز ٥ درۆزن.

**القَلوعُ**: (قوس قلوع) کەوانێـکە زووزوو لەجەمـــسەری خـــۆی دەردەچـــێو هەڵدەگەڕێتەوە.

**المِقْلاعُ**: قۆچەقانی ئەو ئامێرەی بەردی پێ دەهاوێژرێ.

**المَقْلـــوعُ**: ئـــەو کەســـەی نەخۆشـــی (القُلاع)ی توش دەبێ.

**قَلَفَ الشجرة وغيرها قَلْفاً**: توێـکڵەکەی لـە درەختەکە داماڵی.

**قَلَفَ الظفر**: نینۆکەکەی لەبن ڕا دەرهێنا.

**قَلَفَ الخاتِن القلفة**: خەتەنەکەرەکە پێستی سەرە وانێـکی منداڵەکەی لێ کردەوە.

**قَلَفَ الدَّنَّ ونحوه**: پەردەی لەسەر کوڵینەکە هەڵدایەوە.

**قَلَفَ السفينة**: کەشـتیەکەی ئامـادە کـردو

کون‌و کەلەبەرەکانی بەلیف‌و توێکڵە دار گرتن‌و بەقیر روکەشی کرد ٥ (فهو مقلوف وقليف).

**قَلَفَ قَلْفاً**: خەتەنە نەکراوە، یان پێستی سەری وانێکی گەورە بوو ٥ (فهو أقلف).

**قَلَّفَ السَّفِينةَ**: کەشتییەکەی ئامادە کردو بەتوێکڵە دار درزو کونەکانی گرتن‌و بەقیر روکەشی کرد.

**إقْتَلَفَ الظفرَ**: نینۆکەکەی لەبن ڕا دەرهێنا.

**إنْقَلَفَتْ سُرَّتُه**: ناوکی هاوسا ٥ گەورە بوو.

**القِلافَةُ**: کەسێك پیشەی ئەوە بێ کون‌و کەلەبەری کەشتی بهاخنێ‌و بەقیر کەشتی ڕوکەش بکا.

**القُلافَةُ**: توێکڵ ٥ کۆمەڵە پەڕەیەکن لەبنکی گوڵی هەندێ ڕوەکا هەیە.

**القِلْفُ**: شوێنی بەردەڵان‌و زبر.

**القُلْفَةُ**: ئەو پێستەی خەتەنەکەر دەیبڕێ لەوانێکی کوڕ.

**القَلْفَةُ**: بەمانا (القُلْفَةُ) دێ.

**القَلِيفُ**: میوەی وشکەوبوو، وشکەوە کراو.

**القِلْفِعُ**: ئەو پرزو پرشکانەی لەئاسنی سورەوەکراو بڵاو دەبنەوە لەکاتی کوتانی بەچەکوچ لەسەر سندان ٥ قورو لیتە: کەناوەکەی ڕۆچووو وشکەوە بوو شەقار شەقار بێ.

**قَلَقَ الشَّيْءَ قَلْقاً**: شتەکەی جوڵاند.

**قَلَقَ الهَمُّ وغيرُهُ فلاناً**: خەم‌و خەفەت فلانکەسی خستە دڵە ڕاوکێ.

**قَلِقَ قَلَقاً**: حەراسانی لێ هەڵگیراو حەجمینی نەبوو، لەهیچ شوێنێك جێگیر نەبوو.

**أقْلَعَتِ الناقَةُ**: حوشترەکە تەکەتەکی بەبارەکەی کرد ٥ یان ئەو شتومەکەی لەسەر پشتی حوشترەکە بوو لەقەلەقی کرد.

**القَلَقُ**: دڵەڕاوکێ (حاڵەتێکی ئینفیعالییە تایبەتە بەهەبوونی ترس لە ڕودانی شتێك لەداهاتوو).

**المِقْلاقُ**: کەسێك زۆر ڕاڕا بێ‌و دڵەڕاوکێی زۆر بێ ٥ دەگوترێ: (رجل مِقلاق) و (إمراه مقلاق).

**القُلْقاسُ**: ڕوەکێکی کشتوکاڵیە لە پێڕی (القلقاسيّة)یە لاسکەکەی دەکوڵێندرێ‌و دەخورێ.

**تَلْقَلَ في الأرض**: بەناوی زەوی دا ڕۆیشت.

**تَلْقَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جوڵاند، شتەکەی خستە تەکەتەك.

**قَلْقَلَ الحزنُ دَمْعَهُ**: خەفەت فرمێسکی پێ ڕژاندن.

صناعات
ميزان او
قبان
قبان
آلة تصوير
هاتف اوتوماتيكي
هاتف او تلفون
مذياع البرقيات
مذياع
بوق مكبّر للصوت
حك او بوصلة
مكبّر الصوت
مجهر
باعثة الاشباح اوآلة سينما
أسطوانة
موّاج اوراديو
حاك او فونوغراف
ميزان الحرارة

رافعة الاثقال (ونش)
مِفكّ البراغي
مِروحة
جُنْزُرة
مِطْرَقة
مُصفّحة المعادن
كَمّاشة
مِخْرَطة
أوعية متّصلة
مكواة على الكهرباء
مِضَخّة دافعة
مِضخّة جاذبة
مِضَخّة
مِروحة
بَكَرة وكلّاب
مكنة خياطة
مِحْلَق على الكهرباء
مرفاع او مُخَنّس

**تَقَلْقَلَ**: جم‌وجۆڵی کرد.

**تَقَلْقَلَ في البلاد**: بەناو وڵات دا گەڕا.

**القُلاَقِـلُ**: کەسێـك خێـرا بـڕۆ و بـجێ، چوسـت و چـالاك بـێ لەسـەفەر دا ٥ دەگوترێ: (فرس قُلاقِـل) ئەسپێـکی ڕەسەن و گورج و گۆڵە.

**القَلْقَلَـةُ**: لەزانـستی تەجویـد دا گـوتنی پیتێــــکی ســــاکینە بەشــــێوەی بزوێنێـکی سـوك ئـەم حاڵەتـە لـە پیتەکانی (قطبجد)دا دێتە دی.

**قَلَّ الشَّيْءُ قِلَّةً**: شتـەکە کەم و کوڕو نـاوازە بــوو، واش دەبــێ پیتــی (مــــا) بەکۆتاییەکـــــەوە دەلکێنـــــدرێ و دەگوترێ: (قَلَّما).

**أَقَلَّ فلان**: فلانکەس هەژار بوو ٥ کەمی هێنا.

**أَقَلَّ الشَّيْءَ ومنه**: شتەکەی کەم کردەوە ٥ دەشـگوترێ: (أَقَلَّ فِعْـلَ کـذا) ئـەو کـارەی نـەکردوە (هـەر لـە بناغـەوە نەیکردوە).

**أَقَلَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا أَقَلَّـتْ سَـحَابًا ثِقَـالاً سُـقْنَاهُ لِبَلَـدٍ مَّيِّتٍ﴾.

**قاللـتُ لــه العطــاءَ**: بەخشـشەکەیم کەمکردەوە.

**قَلَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کەم کردەوە.

**قَلَّلَ الشَّيْءَ في عينـه**: شـتەکەی بەکـەم خـستە بەرچـاوی ئـەو ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ﴾.

**تَقَلَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەکەم بینی.

**إِسْتَقَلَّ**: بەرز بۆوە ٥ دەگـوترێ: (إِسْتَقَلَّ الطائرُ في طيرانه) ٥ هـەروا دەگـوترێ: (إستَقلَّ النَّباتُ، وإستقلّت الشمسُ).

**إِسْتَقَلَّ القومُ**: خەڵکەکە ڕەویـان کـردو شوێنی خۆیان جێ هێشت.

**إِسْتَقَلَّ فلان**: فلانکەس سـەربەخۆ بـوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆی دا ٥ دەشگوترێ: (إِسْتَقَلَّ بأمره).

**إِسْتَقَلَّت الدَولـةُ**: دەوڵەتەکـە کاروبـاری ســـەربەخۆیی خـــۆی تـــەواو کـــرد دەســـەڵاتی یاســـایی خـــۆی بەســـەر وڵاتــی دا پــەیڕەو کــردو ئازادانــەو سەربەستانە بەڕێوەی برد.

**إِسْتَقَلَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەکەم بینـی ٥ شتەکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوە.

**إِسْتَقَلَت الرَّعدةُ فلاناً**: لـەرزین و شـەپڵە تووشی فلان هاتووە.

**الأَقَلِّيَّـــــةُ**: کەمینـــــە ٥ پێـــچەوانەی (الأكثرية)یە ٥ (ك: أقليات).

**القِـلالُ**: ئـەو دارانـەی تۆلـە مێـوی پـێ لـەزەوی بـەرز دەکرێتـەوە ٥ کـەپری مێو.

**القُلالُ**: کەم ٥ (ك: قُلَلٌ).

**قِلالَةُ الجَبَلِ**: تۆپەلاکی کێو ٥ سەرانسەری کێو.

**القِلُّ**: لەرزەو شەپلە ٥ دەنکە تۆم کە تاکتاكو لاواز بڕوێ.

**القُلُّ**: کەم ٥ دەگوترێ: (شيئٌ قُلٌّ) شتێکی تاکە، کەمە ٥ پیاوی کورتەبالا ٥ کولەبنە ٥ دەشگوترێ: (هو قَلّ بن قُلّ) نازاندرێ باوكو باپیری کێیە.

**القَلَّةُ**: ڕاپەڕین ٥ ڕزگاربوون لەهەژاریی، لەنەخۆشی.

**القِلَّةُ**: کەمینە: پێچەوانەی (الکثرة)٥ یە کە بەمانا زۆرینەیە ٥ (ك: قِلَلٌ).

**القُلَّةُ**: قاپێکە لە سوالەت دروست دەکرێ بۆ ئاو تێدا خواردنەوە ٥ کوپەو کولینە ٥ (قُلّة کل شیئ) تۆپەلاکی شت ٥ (ك: قُلَلٌ وقِلال).

**القِلِّيَّةُ**: ژورێکە وەکوو خەڵوەخانەی ڕەبەنەکان وایە.

**القَلیلُ**: کەم ٥ پێچەوانەی (الکثیر) ٥ ناوازەو نادر ٥ کورتەبالاو کولەبنە ٥ جەستەبچوك ٥ (ك: أقِلاء) ٥ وایش دەبێ وشەی (قلیل) بەمانا نەبوون دێ دەگوترێ: (رجل قلیل الخیر) پیاوێکە بێ خێرو بێرە ٥ خێری لەدەست نایە ٥ (ما أخذت منه قلیلة ولا کثیرة) هیچم لێ وەرنەگرت نەکەم نەزۆر.

**قَلَمَ العودَ قَلْماً**: چڵە درەختەکەی بڕی، دایدا کردی بەقەڵەم.

**قَلَمَ القَلَمَ**: قەڵەمەکەی دادا.

**قَلَمَ الظُفُرَ**: نینۆکی کرد نەیهێشت درێژ بن ٥ بەمرۆڤی بێ دەسەڵات دەگوترێ: (مقلوم الظفر).

**قَلَّمَ**: بۆ موبالەغەی مانای (قَلَمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (قَلَّمَ ظُفُرَهُ) زەعیفو لاوازی کرد، دەسەڵاتی لێ سەندەوە، زەلیلی کرد.

**قَلَّمَ الشجرةَ**: وشکەڵو لقوپۆپی بێ کەڵکی درەختەکەی لێ کردەوە بۆئەوەی درەختەکە بەهێز بێ.

**الإقليمُ**: دەڤەرو هەرێم ٥ لە جوگرافی کۆن دا زەوی دابەشکراوە بۆ حەوت ئیقلیم.

**القالِمُ**: پیاوێك زنی نەهێنابێ یان ئافرەتێك مێردی نەکردبێ.

**القَلَمُ**: پێنوس ٥ قەڵەمێك پێی بنووسرێ ٥ (ك: أقلام وقلام).

**القَلَمُ المِقَص**: پێشی دەگوترێ: (القلمان) ئەو سەرە تیرەیە کە لەقومارو قورعەو پشك دا بەکاردەهێندرێ ٥ (جُفَّ القَلَمُ) کار براوەتەوەو بڕیار تەواو بووە.

قەڵەم چەند جۆرێکی هەیە: (قەڵەم

ڕەصـاص، قەڵـەم جـاف قەڵـەم مەرەکـەب، قەڵـەم ماجیـك، قەڵـەم تەصحیح).

**القُلامَةُ**: ئەو پارچەیەی لە نینۆك یان لەسـم یـان لـەدار دا دەدریٚو دەتاشریٚ.

(**قُلامـة الظُّفـر**) نمونەیەکـە دەهێندرێتـەوە لەکـەمیو شتی بـیٚ نرخ دا.

**المِقـلامُ**: ئـامێری قرتانـدنو تاشـین، نینۆککەر.

**المَقْلَمُ مـن القـصب ونحـوه**: گرێـی نێـوان دوو بـۆری قەفەزاژەکـە ٥ (ك: مَقَالِم).

**المِقْلَمَة**: قەڵەمدان، ئەو زەرفەی قەڵـەمی تێدەخریٚ.

**قَلَـت الدَّابَّـةُ قَلْـواً**: وڵاخەکـە سـوارەکەی ڕفاند.

**قلــى الدَّابَّــةَ**: بـەخێرایی وڵاخەکـەی لیٚ خوڕی.

**قلى الـصَّبيُ القُلَّـةَ أو الكرة**: مندالەکە بەدارەکـە (بەشـەبکەکە) لـە تۆپەکـەی دا.

**قلــى الــشَّيْءَ**: شـتەکەی پێـگەیاند، کوڵاندی، سوری کردەوە.

**قلــى الحَــبَّ واللَّحــمَ**: گوڵەبـەڕۆژە یـان برێـشکەکە یـان گۆشـتەکەی برژانـد، سوری کردەوە.

**قلــى فلانــاً: قِلىً**: فلاَنکەسی بوغزانـد، وازی لیٚ هێنا ٥ پاشگوێی خست.

**تقاليــا**: دوو مرۆڤـە کـە یـەکتریان ناخۆش ویست.

**تَقَلَّـى الـشَّيْءُ الى نفـسي**: شـتەکەم لا ناخۆش بوو.

**تَقَلَّى فلان**: فلاَنکەس حەجمینی لیٚ برِا وەکوو ئەوە لەسەر ئاگر بیٚ.

**إقلَوْلى الطائرُ**: باڵندەکە لە فڕینەکەیدا بەرز بۆوە.

**إقلَوْلى فـلان في الجبـل ونحـوه**: فلاَنکەس چووە سەر کێوەکە.

**إقلَـوْلى الدَّابَّـةَ**: وڵاخەکـە سـوارەکەی ڕفاند.

**إقلَوْلى فـلان**: فلاَنکـەس سـەفەری کـرد هەڵبەزو دابەزی کـرد حـەجمینی لیٚ بڕا وەکوو ئـەوە لەسـەر ئـاگر بـیٚ ٥ لەشوێنی خۆی دوور کەوتەوە.

**إقلولى في أمره**: لەکارەکەیدا پاشەکشەی کرد.

**القُلَّةُ**: هەلوك؛ دارێکە نزیکەی بیـست سـانتیمەترە ئەمـسەرو ئـەو سـەری باریك دەکریٚو ناوەڕاستی ئەستورە بـەدار دەسـت لێـی دەدریٚو دەهاوێـزریٚو بـەیاری هـەلوکێن ناسراوەو مندالٌ دەیکەن.

**القَـلاَّءُ**: کەسێـك دارهـەلوكو هـەلوك

دروست بكا ◊ يان پيشەی شت سوركردنەوە بێ.

**القَلاَّءَةُ**: شوێنێكە تاوەو ئامێری شت سوركردنەوەی لێ بێ.

**القِلْـوُ**: شتی سوكو بچوك لەهەر شتێك بێ ◊ ولاخێك توانای ڕۆیشتنی زۆر بێو باش بڕوا.

**قَلَـوِي**: تایبەتمەندی هەرشتێك ئامادەباشی سوركردنەوەو برژاندنی تێدابێ.

**قَلي**: مادەی توانەوە ◊ كاوێی توانەوە.

**القَلِيَّةُ**: هەر خواردنێك سور بكرێتەوە ◊ شۆربايەكە لە گۆشتو جگەر و شتی وا دروست دەكرێ ◊ خەڵوەخانەو پەرستگای پیاوە ڕەبەنەكان.

**المَقْلَی**: شوێنی برژاندنو سوركردنەوەی نۆكو فول.

**المِقْلَی**: تاوە، یان هەرشتێك خواردەمەنیو شتی وای تێدا سوور بكرێتەوە.

**قَمَأَت الماشيةُ قُمُوءاً**: ئاژەڵەكە قەڵەو بوو.

**قَمَأَ الرجلُ بالمكان قَمْئاً**: پیاوەكە لەو شوێنە مایەوە ◊ جێگیر بوو.

**قَمُؤَ الرجلُ وغيره قَماءً وقُمَاءةً**: پیاوەكە بچوك بوو لەپێش چاو هیچو وپوچو خوێری دیار بوو.

**أقْمَأ القومُ**: خەڵكەكە ئاژەڵەكانیان قەڵەو بوون.

**أقمَأ المرعى الماشيةَ**: لەوەڕگاكە ئاژەڵەكانی قەڵەو كردن ◊ لەوەڕی لەوەڕگاكەیان پێكەوتو پێی قەڵەوبوون.

**أقْمَأ الشَّيْءُ فلاناً**: شتەكە فلانكەسی سەرسام كرد.

**أقْمَأ فلان الشَّيْءَ**: فلانكەس شتەكەی بچوك كردەوەو زەلیلو ژێرباری كرد.

**إقْتَمَأ الشَّيْءَ**: شتەكەی كۆكردەوە.

**تَقَمَّأ الشَّيْءَ**: شتەكەی یەك دوای یەك كۆكردەوە ◊ باشەكەی هەڵگرتو خراپەكەی وەلانا.

**قامَأهُ المكانُ**: شوێنەكەی بۆ گونجاو بوو پێی كەوت.

**القَمْءُ**: شوێنێك ئاژەڵی تێدا بلەوەڕێ تا قەڵەو دەبن.

**القَمْأةُ**: هەرزانیو خۆشی.

**القَمِئُ**: زەلیل، بچوك، هیچو پوچ.

**قَمَحَ عن الماء قموحاً**: سەری لە ئاوەكە بەرز كردەوە بەهۆی تێرخواردنەوە یان حەزنەكردنی لە ئاوەكە.

**قَمِحَ الشراب**: دەمی لە شەلەمەنییەكە گێڕایەوە چونكە تێراو بوو یان تاڵو

تفتو سوێر بوو تەبیعەتی نەی برد.

**أقْمَحَ السُّنْبُلُ**: گوڵەگەنمەکە دانەوێڵەکەی دەرکەوت.

**أقْمَحَ القَمْحُ**: گەنمەکە پێگەیی.

**أقْمَحَ الرجلُ**: پیاوەکە سەری هەڵبڕی بەرەو ئاسمانو چاوی نوقاندنو زەلیلیو بێچارەیی خۆی نیشانداو پاڕایەوە.

**أقْمَحَ بأنفه**: لوتی خۆی بەرز کردو فیزی نواند.

**أقْمَحَ الراكبُ الدَّابَّةَ**: سوارەکە لغاوی وڵاخەکەی بۆ دواوە کێش کرد.

**أقْمَحَ الغُلُّ الأسيرَ**: زنجیرەکە تینی بۆ دیلەکە هێنا ناچاری کرد سەر بۆ حەوا بکا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَهِيَ إِلَى الأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ﴾.

**إقْتَمَحَ البُرُّ**: گەنمەکە کامڵ بوو بوو بەگەنمی تەواو.

**إقْتَمَحَ الحَبُّ ونحوه**: گەنمەکەی کردە مشتییەوە بۆئەوەی بیکاتە ناو دەمییەوە

**إقْتَمَحَ الشرابَ**: دەمی لە خواردنەوەکە گێڕایەوە چونکە تینوی نەبوو یان تامەکەی بەدڵ نەبوو.

**تَقَمَّحَ الحَبُّ ونحوه**: دانەوێڵەکەی بەلاوە پەسەند بوو.

**تَقَمَّحَ الشرابَ**: بەنابەدڵی شەرابەکەی خواردەوە.

**القامِحُ**: کەسێك لەبەر هۆیەك نەخۆشییەك ئاو لەدەمی ناخۆش بێ.

**القُماحُ**: نەخۆشییەکە توشی ئاژەڵ دەبێو ناهێڵێ ئاو بخواتەوە.

**القِماحُ**: حوشترێکە دەچێتە سەر ئاو و سەر بەرز دەکاتەوەو ئاوەکە ناخواتەوە.

**القَمْحُ**: ڕوەکێکی گیاییە دانەوێڵەکەی مەیلەو درێژە چاڵاییەکی لەناوەڕاست دایە دەهاڕدرێو دەکرێ بەئاردو جۆرەها خواردنی لێ دروست دەکرێ دانەوێڵەکە پێشی دەگوترێ: (الحِنطة، البُرُّ) بەکوردی گەنم.

**القُمْحَةُ**: ئەندازەی ئەوەی دەم پڕبکا لەقاوت یان لەئاو.

**القَمِيحَةُ**: هەرشتێك ڕەنگی گەنمی بێ ٥ گەنم ڕەنگ بێ.

**القَمَّاحُ**: گەنم فرۆش.

**القَمَحْدُوَةُ**: ئێسقانێکی بەرزەوەبووی پشتی سەرە ئێسقانی پاشە سەر ٥ (ك: قَمَاحِدُ).

**قَمَدَ قَمْداً وقموداً**: سەرپێچی کرد ٥ بەرگری کرد، نەیهێشت.

**قَمِدَ قَمَداً**: جەستەی درێژبوو، یان ملی

ئەستور بوو ٥ (هو أقمد وهي قَمْداء).

**قَمَرَ فلاناً**: لەیاری قوماردا بەسەری دا زاڵ بوو لێی بردەوە.

**قَمَرَتْ فلانَـةُ قَلْبَـهُ**: فلان ئافرەت دڵی کابرای بردووە.

**قَمَرَ الطَّيْرَ**: تیشکی گرتە چاوی باڵندەکە بۆئەوەی بیگرێ.

**قَمِرَت الليلَةُ**: شەوەکە مانگە شەو بوو بەڕوناکی مانگ، شەوڕۆشن بوو.

**قَمِـرَ فـلان**: فلانکەس بەهۆی ڕوناکی مانگەوە خەوی لێ زڕاو نوستنی بۆ نەکرا.

**قَمِرَ بَهَرُ نور القمر عينيه**: شوعلەی مانگ چاوی تاساندنو هیچی نەبینی.

**قَمِـرَ الرجـلُ وغيـره**: پیاوەکە جەستەی سپیو درەوشاوە بوو یان شتەکە سپی بوو.

**قَمِرَ الكلأ**: لەوەڕەکە زۆربوو ٥ (قَمِرَ الماءُ) ئاوەکە زۆربوو.

**قَمِرَ الإبلُ**: حوشترەکە تێراو بوو.

**أقْمَرَ الهلالُ**: مانگ خشت بوو، بووبە مانگی شەوی چواردە.

**أقمرت الليلةُ**: شەوەکە بەنوری مانگ ڕۆشەن بۆوە.

**أقْمَـرَ القـومُ**: خەڵکەکە مانگیان لێ هەڵات، مانگ لێیان دەرکەوت.

**أقْمَـرَ التَمْـرُ**: خورماکە سەرما لێی دا پێش ئەوەی پێ بگا بۆیە شیرین نەبوو.

**أقْمَرَ الإبلُ ونحوهـا**: حوشترەکە کەوتنە ناو لەوەڕی زۆرەوە.

**قـامَرَهُ مقـامَرَةً وقِمـاراً**: یاری قوماری لەگەڵ کرد.

**قَمَّـرَ القَمَـرُ**: مانگەکە خشت بوو، خەرێکە ببێتە مانگی شەوی چواردە.

**قَمَّـرَ الطـيرَ**: تیشکی ڕوناکی لەچاوی باڵندەکە گرت بۆئەوەی شەوکوێری بکاو بیگرێ.

**تقامَرُوا**: یاری قوماریان کرد.

**تَقَمَّرَ**: لەشەوی مانگەشەودا کەوتە ڕێ.

**تَقَمَّرَ فلانـاً**: لەشەوی مانگەشەودا چو بۆلای فلان.

**تَقَمَّرَ الصَيدَ**: فێڵی لە نێچیرەکە کرد ٥ دەگوترێ:

**تَقَمَّـرَ عَـدُوَّه**: چاوەڕێی هەڵاتنی مانگ بوو بۆئەوەی فرسەت لە دوژمنەکەی بێنێ.

**الأقْمَـرُ**: (وجـه أقمـر) دەمو چاوی نورانیو ڕوخسار وەکوو مانگ.

**القِمَـارُ**: هەر یارییەك گرەو و بردنەوەی تێدابێ.

**القَمَرُ**: هەسارەیەکی ئاسمانییە بەدەوری ئەستێرەیەکی لەخۆی گەورەتردا

دەسـوڕێتەوەو لـە پێـڕی ئـەوەو شـوێنکەوتەی ئـەوە ٥ یـەکێ لەوانـە مانگـە کەسـەر بەزەوییـەو تـابیعی ئـەوە ٥ هـەروا ئـەو ئەسـتێرانەی بـەدەوری مـەریخو زوحـەلو موشتەری دا دەسوڕێنەوە.

**القمـر الـصناعي**: مـانگی دەسـتکرد، قەبارەیەکـە بـەرەو ئاسمـان هەڵدەدرێ بۆئەوەی بەدەوری زەوی دا بخولێتـەوە، بـەهۆی صاروخێـکی پاڵنـەری قۆنـاغ دیـاری کـراو ئـەو مانگـە دەسـتکردە لـەو صـاروخە پاڵنەرە خێرایی پێویست وەردەگرێ ٥ چەند ئامێرێکی حەساسی تێدان بـۆ وەرگرتنـی زانیـاریو کۆکردنـەوەیانو ناردنـەوەی بـۆ سـەنتەری زانیارییـەکانیان لەسـەر زەوی لـەماوەی سـوڕانەوەی دا لەبۆشایی ئاسمان ٥ هەروەکوو چۆن ئـەم مانگـە دەسـتکردانە بـەکار دەهێندرێن بۆ پەیوەندی ڕادیۆییو تەلـەفزیۆنی بـەدەنگو ڕەنگـەوە، هـەروەکوو بەکاردەهێنـدرێن بـۆ چاودێری ئاسمانشوناسیو شتی تـر، یەکـەم مـانگی دەسـتکرد کـە ئـادەمیزاد ڕووەو ئاسمـان هـەڵی دا (٤)ی مـانگی ئۆکتۆبـەری سـاڵی (١٩٥٧م) بوو.

**قمـر الـدين**: حەڵوایەکـە لـە کـشمیشو شەکراو دروست دەکرێ لەسەر شێوەی پارچـەی تـەنك تـەنك ٥ دەشـگوترێ: (إستدعى مالَهُ القمـر) مـەڕو ماڵاتەکەی داونە دەست مـانگ چاودێرییان بکا ٥ ئـەم قـسە بـە تەوسـەوە ئاڕاسـتەی کەسێـك دەکـرێ کـە بەخـەم مـاڵو سـامانی خۆیـەوە نـەبێو بەدڵـسۆزی سەرپەرشتیاریی نەکا.

**القمـران**: مـانگو خـۆر ٥ (الـشهور القمريـة) ئـەو مانگانـەی ماوەیـان بـەگوێرەی سـوڕانەوەی مـانگ بەدەوری زەوی دا دیاریی دەکرێ.

(الـسنة القمريـة) بریتییـە لـە دوانـزە مانگی وەها کە ماوەیان بـەگوێرەی سوڕانەوەی مانگ بـەدەوری زەوی دا دیاری دەکرێ ٥ یەکەم مـانگی ساڵی قەمـەری مـانگی موحەرەمـەو دوامانگیشی مانگی (ذوالحجة)یە.

**القَمِـرُ**: ڕۆنـاك، ڕوناککـەرەوە، یـان مانگەشـەو ٥ دەگـوترێ: (لیـل قَمِـرٌ وليلة قَمِرَةٌ).

**القَمْراءُ**: روناکی مانگ ٥ (الليلة القمراءُ) شەوی مانگەشەو.

**القُمْـرَةُ**: زۆر سـپی، یـان سـپی مەیلـەو سەوز.

**القُمْـرِيّ**: جـۆرە کۆترێـکە خاڵێـکی

دەوران دەوری ملی هەیەو دەنگی خۆشە ٥ (ك: قُمْرٌ).

القُمْرِيَّةُ: كۆترە مێینە لەجۆری قومری.

القُمَيْرُ: بچووككراوەی (القَمَرَ) ٥ دەشكرێ بەناو بۆ سەرەتاو كۆتایی مانگ.

القَمِيرُ: ئەو كەسەی یاری قومارت لەگەڵ بكا.

قَمَزَ الشَّيْءَ قَمْزاً: شتەكەی بەسەرە پەنجەی هەڵگرت.

القُمْزَةُ: كۆمەڵە گڵ كە دەكرێتە نیشانەی رێگا ٥ توێكڵی دانەوێڵە.

قَمَسَ الجلُ وغيره في الماء قَمْساً: پیاوەكە لە ئاوەكەدا نقوم بوو دوایی سەری دەرهێنایەوە ٥ دەگوترێ:

قَمَسَت الأكامُ والقِنان في السراب: گرد و تەپۆڵكەكان لەناو تراویلكەو سەرابەكەدا لەپێش چاو دەمێك گوم دەبوونو دەمێك دەردەكەوتنەوە.

قَمَسَ الشَّيْءَ: شتەكەی فڕی دایە ناو ئاوەوەو نقوم بوو ٥ دەشگوترێ: (قَمَسَ به في الماء).

قَامَسَ فلاناً فَقَمَسَهُ: لە نقوم كردندا بەسەر فلاندا زاڵ بوو.

قامَسَ غيره: بەرامبەرەكەی نقوم كرد لە نقوم كردن بەسەر بەرامبەرەكەی دا زاڵ بوو ٥ یان شانازی بەسەردا كردو وتی من باشترم لەتۆ لە نقوم كردن دا ٥ دەشگوترێ: (فلان يُقامِسُ الحوتَ): فلانكەس لە مەلەوانیو خۆ نقوم كردن دا لاسایی ماسی دەكاتەوە ٥ ئەم پەندە بۆ كەسێك دەگوترێ: كەبەربەرەكانی كەسێكی لەخۆی بەهێزترو شارەزاتر بكا.

تَامَسَ فلان في المكان: فلانكەس لەو شوێنە دەمێك دەردەكەویو كاتێكیش دیار نامێنێ.

إنْقَمَسَ الكوكبُ: ئەستێرەكە ئاوابوو.

إنْقَمَسَ في الماء: لەناو ئاودا بازی دا.

تَقامَسَ الصِّبْيان في الماء: منداڵەكان لەناو ئاودا یەكتریان نقوم كرد.

القامِسُ: مەلەوان، ژێردەریا، ئەو كەسەی بەهۆی ئامێری تایبەتییەوە دەتوانێ بچێتە ژێر دەریا.

القامِسَةُ: شتی سەرنج ڕاكێش، پیاوی لێ هاتوو ٥ بەڵاو كارەسات ٥ (ك: قوامس).

القاموس: دەریای گەورەو پانو پۆڕ ٥ ناوی كتێبێكی فەیروز ئابادییە لەبواری زمانەوانیو ڕافەی وشەی عەرەبی بەشێو ڕیزبەندییەكی تایبەتی ٥ دوایی كراو بە ناو بۆهەر

کتێبێك وشه شی بکاتەوە مانایان بکا.

**القَمّاسُ**: بەمانا (القامِسُ) دێ.

**القُمّسُ**: پیاوی گەورەو وەجاخزادەو ڕێزدار لەناو گەل‌و نەتەوەدا ٥ لەناو مەسیحییەکان پلەو پایەیەکی ناو کەنیسەیە، لە پلەو پایەی (قَسّ) گەورەترە ٥ (ك: قَمامِس و قمامِسة).

**القَموسُ**: بیر کە ئەوەندەی ئاو تێدا بێ دۆڵچەی تێدا ون بێ.

**القَوْمَسُ**: ڕیش سپی‌و گەورە پیاوی نەتەوەو گەل ٥ پاشاو فەرمانڕەوا.

**قَمَشَ الشَّيْءَ قَمْشاً**: شتەکەی لێرەو لەوی کۆکردەوە.

**قَمَشَت الریحُ ما علی وجه الأرض**: ڕەشەبا خشت‌و خاڵی سەرزەوی کۆکردەوە.

**قَمَّشَهُ**: بۆ موبالەغەو زێدەڕۆیی لەمانای (قَمَشَ) دێ.

**إقْتَمَشَهُ**: لێرەو لەوێ شتەکەی کۆکردەوە.

**إقْتَمَشَ الطعامَ**: هەرچی لە خواردنەکە هاتە بەردەستی خواردی گوێی نەدایە چاك‌و خراپ.

**تَقَمَّشَ**: هەرچی دەستی کەوت خواردی با خراپ‌و بێکەڵکیش بێ ٥ پۆشاکی باشی پۆشی.

**القُماشُ**: هەرچی شتی خراپ‌و بێ کەڵك بێ لەسەر ڕوی زەوی ٥ مرۆڤی خوێڕی‌و هەتیو مچە.

**قُماش البیت**: کاڵای ناوماڵ ٥ شتومەکی پێداویستی مرۆڤ ٥ هەرچی بچندرێ لە ئاوریشم‌و لۆکەو شتی وا بکرێ بە پۆشاك‌و پێخەف‌و پەردەو چەرچەف.... .

**القُماشَةُ**: بەمانا (القماش) دێ ٥ پارچەیەك لە قوماش.

**القَمْشُ**: شتی خراپ‌و بێ کەڵك لەهەر جۆرێك بێ.

**القَمّاشُ**: فرۆشیاری کاڵای بێ نرخ‌و خراپ ٥ کوتاڵ فرۆش.

**قَمَصَت الدّابَّةُ قَمْصاً وقِماصاً**: وڵاخەکە چەموش بوو لوشکی هاویشت، جوتەی هاویشت ٥ بەهۆی تەڕدەماخی‌و نیشاتەوە بازی دا.

**قَمَصَ فلان**: فلانکەس دڵەڕاوکێی توش بوو چەموش‌و سەرپێچی کرد.

**قَمَصَ البحرُ السفینَةَ**: شەپۆلەکانی دەریا کەشتیەکەی هێنایە جم‌و جۆڵ‌و هەڵبەزو دابەز.

**قامَصَ الصَّبِيُّ غیره**: منداڵەکە لەبازدان‌و ڕاکردن دا پێش کەوت.

**قَمَّصَ**: بۆ موبالەغە لەمانای (قَمَص) دێ.

**قَمَّصَ الثوبَ**: لە قوماشەکە کراسی دروست کرد ◦ بەشی کراسێکی لە قوماشەکە دادڕی.

**قَمَّصَ فلاناً**: کراسی لەبەر فلان کرد.

**تقامَصَ الصِّبيان**: منداڵەکان لە ڕاکردن دا پێشبڕکێیان کرد.

**تَقَمَّصَ في الماء**: لەناو ئاودا خۆی ئەمدیو و ئەودیو کردو خۆی نقوم کرد.

**تَقَمَّصَ القَميصَ**: کراسی لەبەر کرد.

**تَقَمَّصَ شخصية غيره**: لاسایی کەسێکی تری کردەوەو خۆی وەکوو ئەو نیشان دا لە شێوە و ڕەوشت دا.

**القَمَصَةُ**: مێشولەی بچوك کە بەسەر ئاوەوە دەفڕن ◦ (ك: قَمَصٌ).

**القُمَّصُ**: لەلای مەسیحییەکان بەمانا (القُمَّسُ) دێ.

**القَميصُ**: کراس ◦ جیلباب ◦ پەردەی دڵ ◦ مەشیمە ◦ ژێرکراسو فانیلە ◦ (ك: أقمِصةو قُمصَان).

**قَمَطَ الشَّيْءَ قَمْطاً**: شتەکەی شەتەك دا پێچایەوە، قوماتی کرد ◦ دەگوترێ: (قَمَطَ المولودَ) منداڵەکەی پێچایەوەو جەستەی ڕێك کردو بە پەڕۆی قومات شەتەکی دا.

**قَمَطَ الأسيرَ**: مرۆڤە دیلەکەی دەستو قاچ بەستراو کرد، دەستو قاچی بەحەبلێك پێکەوەبەست.

**قَمَطَ الحيوانَ**: دەستو قاچی ئاژەڵەکەی لەکاتی سەربڕین دا بەست.

**قَمَّطَ الإبلَ**: کاروانە حوشترەکەی ڕیز کردو کردنی بەزنجیرە بەستوی یەك لەدوا یەك

**قَمَّطَ الثوبَ**: ناوەڕاستی پۆشاکەکەی تەسك کردەوە بۆئەوەی بەجەستەیەوە بنوسێ.

**قَمَّطَ الأسيرَ والحيوانَ**: بەمانا (قَمَطَهُ) دێ.

**القامِطَةُ**: ئامێرێکە بۆ بەیەکەوەبەستنی شتەکان.

**القِماطُ**: حەبل یان پارچە قوماشێکی تایبەتییە بۆ شت پێچانەوەو شت شەتەك دان ◦ پارچە پەڕۆیەکە منداڵی ساوای پێ قومات دەکرێ.

**القِمْطُ**: حەبلو گوشێکە لە لیف یان لە خوص دروست دەکرێو گورزە پڕژو لقی دارخورماو شتی وای پێ دەبەسترێ ◦ حەبلێکە دەستو قاچی مەڕو بزنی پێ دەبەسترێ لەکاتی سەربڕینی دا ◦ (ك: أقماط).

**القَمَّاطُ**: قومات دروستکەر، ئەو کەسەی پیشەی سەرەکی قومات دروستکردن بێ بەهەموو جۆرەکانیەوە ◦ دزو جەردە.

**القَميطُ**: تەواو و کامڵ ◦ دەگوترێ: (مَرَّ بنا عام قميط).

**قَمْطَرَ الشَّيْءُ**: شتەکە کۆبۆوە.

قَمْطَرَ العدوُّ: دوژمن هەڵات.

قَمْطَرَ الشَّيْئَ: شتەکەی کۆکردەوە.

قَمْطَـرَ القِرْبَـةَ: کوندەکـەی پـڕ کـردو بەبەن دەمی کوندەکەی بەست.

إقْمَطَرَّ: کۆبۆوە و وێکهاتەوە.

إقْمَطَـرَّ اليـومُ أو الحـربُ: ڕۆژەکـە زۆر توندو تیـژ بـوو ○ یـان شەڕەکە زۆر توندو سامناك بوو.

إقْمَطَرَّ للشَرِّ: خۆی بۆ شـەڕو پێـکدادان ئامادە کرد.

إقْمَطَـرَّ الأشـياءُ: شـتەکان کۆبوونـەوەو کەوتنە سەر یەك.

القُمَاطِرُ: شتی کۆبۆوەو وێـکهاتوەوە.

القِمَطْـرُ: سـندوق‌و دۆلابـی تایبـەت بـە پاراستنی کتێب ○ (ك: قَمَطِرَ).

القِمَطْرِی: جۆرە ڕۆیشتنێکە ماسولکەی جەستەی تێدا گشت دەکرێ‌و تونـد دەکرێنــەوە ○ دەگــوترێ: (مَــشی القِمَطْری).

القَمطرير: گـرژو تـرش‌و تـاڵ ○ قورئـان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾.

قَمَعَ الشَّرابُ قَمْعاً: شەرابەکە بـەبێ قـوم لێدان بەقورگ دا ڕۆیشتە خوار.

قَمَعَ في البيت ونحوه: بەهـەڵاتوویی چووە ناو خانوەکە.

قَمَعَ فلاناً: بەئاسنێـکی سەر چەماوە یـان دارێکی وەکوو گۆچان لەفلانکەسـی دا ○ لەتەپڵی سـەری دا ○ نەیهێشت بگاتـە ویستی خۆی ○ ژێر بارو زەلیلی کرد.

قَمَـعَ الـبردُ النَّبَـاتَ: سـەرما گـزو گیـاو ڕوەکەکانی هەڵپڕوزاند.

قَمَــعَ الإنــاءَ: ڕەحەتــەی خــستە نــاو قاپەکـەوە نـاو بـەرمیل‌و تەنکییەکـەوە بۆئەوەی شلەمەنی تێ بکا.

قَمَــــعَ القِرْبَــــةَ: زارکــــی کوندەکــەی هەڵــــگێڕایەوە بــــەڕوی دەرەوەداو نوشتاندیەوە.

قَمَعَ سَمْعَهُ لفلان: گوێی بـۆ فـلان کلـۆر کردو جوان گوێی بۆ ڕاگرت.

قَمَعَ ما في الإناء: چی لەقاپەکەدا بوو یان لەناو زەرفەکەدا بـوو هـەمووی خـوارد، هەمووی هەڵگرت.

قَمَعَ البُسْرَةَ: چـروزە تـازە شـینبووەکەی هەڵکەند.

قَمِعَت عينُهُ قَمَعاً: چاوی کەم بینا بوو، چاوی کوێرە موشەو چاو کز بوو.

قَمِعَت الظَّبيَةُ ونحوها: ئاسکەکە بـەهۆی پێوەدانی مێشە سەوزە، یان چوونی بۆ ناو لوتییەوە سەری ڕاوەشاند.

قَمِعَ الفـرسُ: ئەسـپەکە هەڵـسڵەمیەوەو ڕاپـەڕی ○ یـان ئەژنۆیـەکی ئەسـتوور بوو.

قَمِعَ الفصيلُ: بێـچوەکە گـەورە بـوو بـەرز

بۆوە بەزی زۆر بوو ٥ دەگوترێ: (سنام قَمِعٌ).

**قَمَعَتِ البُسرَةُ ونحوها:** چروزە شین بووەکان هەڵکەندران.

**قَمِعَت المرأةُ بنانَها بالخضاب:** ئافرەتەکە سەرەپەنجەکانی بەخەنە ڕەنگ کرد.

**إقْتَمَعَ السِّقاءَ:** کونی کوندەکەی خستە ناو دەمیەوەو ئاوی لێ خواردەوە.

**إقْتَمَعَ ما في الإناء:** ئەوەی لەناو قاپەکەدا بوو یان لەناو زەرفەکەدا بوو هەمووی خوارد، هەمووی هەڵگرت.

**إقْتَمَعَ الشَّيْءَ:** هەڵبژاردەی شتەکەی بۆ خۆی برد.

**إنْقَمَعَ:** ونبوو ٥ چووە پەنا بەردەوەو خۆی شاردەوە.

**إنْقَمَعَ في البيت:** بەشەڵەژاویو بەهەلاتوویی چووە ناو خانوەکەوە ٥ بەتەنیا لەماڵەوە دانیشت.

**تَقَمَّعَتِ الظَّبْيَةُ ونحوها:** بەمانا (قَمِعت) دێ.

**تَقَمَّعَت في البيت:** بەمانا (إنْقَمَعَ) دێ ٥ سەرسامو سەرگەردان بوو ٥ ژێردەستەو زەلیل بوو.

**تَقَمَّعَ الشَّيْءَ:** هەڵبژاردەی شتەکەی هەڵگرت.

**تَقَمَّعَ الحمارُ:** گوێدرێژەکە سەری ڕاوەشاند بۆئەوەی مێشە سەوزە لەخۆی دەرکا ٥ دەشگوترێ: (ترکت فلاناً يَتَقَمَّعُ) فلانکەسم جێ هێشت لەبەر بێ ئیشی مێشی دەردەکردن.

**الأقْمَعُ:** مرۆڤێکە ئێسقانی گەروی گەورەیە.

**القِمْعُ:** ڕەحەتێ؛ ئامێرێکی سەر بلاوی بن تەسکی لولەیی، بۆئەوەی شلەمەنیو شتی وای پێ بکەیە ناو تەنکیو بەرمیلەوە ٥ دەشگوترێ: (وَيلٌ لأقماع القوم) هاوار بۆ ئەو خەڵکانەی دەبیستنو پەندی لێ وەرناگرن.

**القِمْعُ من الرمان:** ئەو پرزو پاڵەی بە هەنارەوەن.

**القِمْعُ من الورد:** ئەو بنکە سەوزەی گوڵ کەلەسەر لقەوە دەمێنێتەوە دوای وەرینی پەلکە گوڵەکان.

**القِمَعُ:** بەمانا (القِمْعُ) دێ ٥ دەشگوترێ: (فلان قِمَعُ أخبار) فلانکەس شوێن هەواڵەکان دەکەوێو لێیان دەکۆڵێتەوەو باسیان لێ دەکا.

**القَمَعُ:** ئەستوراییو ڕەقیەکە لە یەکێك لە ئەژنۆی ئەسپ دا ٥ ئێسقانێکی بچوکە لە گەرودا لەدیوی دەرەوە بەرز دەبێتەوە ٥

بۆری هەناسە لەسەرەتای قورگەوە بۆسەر سییەکان.

**القَمْعَةُ من الشَّيْئِ**: هەڵبژاردەی شت ٥ شێواویەکە لە قلینچکی چاوداو سوور هەڵگەڕانیەتی.

**القَمَعَةُ**: سەر ٥ تۆپەڵاکی دووگی حوشتر ٥ زیپکەیەکە لەدیوی ناوەوەی لێو پەیدا دەبن ٥ خراپ بوونو تێکچووونی قلینچکی چاو.

**قَمَعَة الذنب**: لایەکی کلك ٥ هەروا وشەی (القمعة) ناوە بۆ مێشێکی شینی گەورە دەچێتە ناو لوتی ولاخو ئاژەڵەوە ٥ هەروا لەکاتی گەرمادا بەحوشترو حەیواناتی ترەوە دەنیشێو دەیگەزێ.

**القَمِيعَةُ**: ئەو بەرزاییەی نێوان دوو گوێی ئاژەڵ ٥ لایەکی کلك ٥ (ك: قمائع).

**المِقْمَعَةُ**: دارێکە یان ئاسنێکە سەرێکی چەماوەتەوە پێی لەسەری فیل دەدرێ بۆئەوەی ژێر بار بێ ٥ (ك: مَقامِع).

**قَمْقَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کۆکردەوە.

**تَقَمْقَمَ**: چووە ناو ناوەوەو نقوم بوو تاخنکا.

**تَقَمْقَمَ الشَّيْئَ**: چووە سەر تۆپەڵاکی شتەکە.

**القَمْقَامُ**: دەریا ٥ کێشەو نیزاع ٥ دەگوترێ: (وقع في قَمْقام من الأمر) ٥ کەوتە ناوکێشەو نیزاعەوە گەورەو ڕێزدارو شکۆمەند.

**القُمْقُمُ**: گوڵاودانێکە لە شوشە یان زیو یان مس ئاوی گوڵی تێدەکرێو پێی دەپرژێندرێ ٥ حەوجۆشو شتی وا کەئاوی تێدا گەرم دەکرێ ئەم جۆرە ئامێرە لای خواروی پانو لای سەروی تەسکە ٥ هەروا زەرفێکی خورافیو ئەفسانەییە گوایە بەقسەی کوڵەوەنانیو پیاوە دەستبڕەکان شەیاتینییە سەرپێچیکەرەکانیان تێدا بەند کردون ٥ (ك: قماقم).

**القُمْقُمَةُ**: قومقومەو حەوجۆشو مەسینە لەمسو شتی وا کەدوو هەنگڵی هەبن ٥ (ك: قماقم).

**قَمِلَ الثوبُ أو الرأسُ قَمَلاً**: جانەوەری ئەسپێ لە پۆشاکەکەدا یان لەناو قژی سەردا زۆر بوون.

**قَمِلَ الرجلُ**: پیاوەکە زۆر کورتەباڵا بوو ٥ (فهو قَمِلٌ).

**القَمْلَةُ**: ئەسپێ، گیانەوەرێکە لەجەستەدا پەیدا دەبێ کە چڵکنو پڵکن بێ ٥ (ك: القَمْلُ).

**القُمَّلُ**: جانەوەرێکە لەپێڕی گەنەو

لەگەنە بچوکترە حەزی لەوەیە لەناو جەستەو توکی حوشتری لەڕدا بژی ٥ هەروا ناوە بۆ جانەوەری سن کەلە دەغلّودان دەداو مۆخەکەی دەخوا، بەعەرەبی ناوێکی تریشی هەیە پێی دەگوترێ: (النّطاط) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ﴾.

**قَمَّتِ الشاةُ**: مەڕەکە بەدوو لێوی لەوەڕی کەموکوڕی خستە دەمیەوە بۆئەوەی بیخوا.

**قَمَّتِ البيتَ**: ماڵەکەی ماڵی.

**قَمَّ ماعلى الخوان**: چی لەسەر سفرەکە هەبوو هەمووی خواردو هیچی لێ نەهێشتەوە.

**قَمَّمَ النّجمُ**: ئەستێرە هاتە ناوەڕاستی ئاسمان لەئاستی سەرمان بوو.

**قَمَّمَت الشاةُ**: مەڕەکە لەخشتو خاڵی ماڵدراو و شتی فرێدراو دا لەوەڕا.

**إقْتَمت الشاةُ الحَبَّ**: مەڕەکە لەدانەوێڵە گەڕا بۆئەوەی بیخوا.

**إقْتَمَّ فلان ماعلى الخوان**: فلانکەس چی لەسەر سفرەکەبوو خواردی.

**إقْتَمَّ الشيئَ**: چووە سەر تۆپەڵاکی شتەکە.

**تَقَمَّمَ**: بەشوێن قومامەو شتی وادا گەڕا.

**تَقَمَّمَ الجَبَلَ**: بەکێوەکەدا سەرکەوت تا گەیشتە تۆپەڵاکو سەرانسەری کێوەکە.

**تَقَمَّمَ النخلةُ**: چووە تۆپەڵاکی دارخورماکە.

**القُمامَةُ**: خشتوخاڵی ماڵدراوی ناو ماڵو سەرشەقامو کۆڵانو کۆکراوە بۆ فرێدان.

**القِمَّةُ من كل شيئ**: تۆپەڵاکو سەرانسەری شت ٥ جەستەو قەبارە ٥ دەگوترێ: (ألقى عَليه القِمَّةَ) ٥ هەروا بەمانا (هەموو) دێ ٥ دەگوترێ: (جاء القوم قِمَّةً) خەڵکەکە هەموویان هاتن.

**القَمِيمُ**: ڕوەكو پاقلەو شتی وای وشکەوەبوو.

**المِقَمُّ**: ئەو کەسەی هەرچی دەست بکەوێ لەسەر سفرە دەیخوا.

**المَقَمَّةُ**: حاویەو شریفو شتی وا کە قومامەی تێ دەکرێ.

**المِقَمَّةُ**: کەسك ٥ دوولێوی ئاژەڵی دووسم ٥ وەکوو مەڕو بزن.

**قَمِنَ كذا قَمَناً**: شیاوی ئەوە بوو.

**قَمُنَ بكذا**: بەمانا (قَمِنَ) دێ.

**تَقَمَّنَ الشَيْئَ**: بەسەر شتەکەی دا ڕوانی بۆئەوەی هەڵی بگرێ.

**تَقَمَّنَ موافقته**: هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوی دا.

القَمِنُ: لایەق‌و شیاو.
القَمَنُ: نزیك ٥ دەگوترێ: (داري قَمَنٌ من داره) ٥ خێراو گورج‌و گۆڵ ٥ لایەق‌و شیاو و گونجاو.
القَمِنَةُ: بۆگەن ٥ دەگوترێ: (رائحة قَمِنَةٌ) بۆنێكی ناخۆش‌و بۆگەن.
القَمِينُ: لایەق‌و شیاو ٥ نزیك ٥ خێراو گورج‌و گۆڵ ٥ تونی حەمام ٥ شوێنی خشت سووركردنەوە (كوره خشت).
المَقْمَنَةُ: دەگوترێ: (هذا الأمر مقمنة لذلك) ئەم كارە لایەق‌و شیاوە بۆئەوە.
قَمَهَ البعيرُ قموهاً: حوشترەكە سەری بەرز كردەوەو ئاوی نەخواردەوە.
قَمَهَ الشَّيْئُ في الماء: شتەكە لەناوەكەدا جار هەبوو نقوم دەبوو جاریش هەبوو دەردەكەوتەوە ٥ دەگوترێ: (قَمَهَ الشَّيْئَ في الماء).
قَمِهَ: بەسەرگەردانی بەناو ولاتدا ڕۆیی‌و نەیزانی بۆ كوێ دەچێ.
قَمِهَ قَمَهاً: ئیشتیهای خواردنی كەم بوو.
تَقَمَّهَ في الأرض: سەری خۆی هەڵگرت‌و ڕۆیی.
قَمَت الإبلُ قَمْواً وقَمْياً: حوشترەكە قەڵەو بوو.
قَمَى فلانٌ الى البيت: فلانكەس چووە ناو خانوو.
قَمَى فلان الدار قَمْياً: فلانكەس خانوەكەی ماڵی‌و پاكی كردەوە.
أقْمى الرجلُ: پیاوەكە دوای كزو لاوازیی قەڵەو بوو ٥ لەماڵەوە گۆشەگیر بوو بۆ خۆپاراستن لەفیتنەیی.
أقْمى عَدُوَّهُ: دوژمنەكەی ژێربار كرد.
قاماني الرجلُ وغيرهُ: پیاوەكە هاوڕا بوو لەگەڵم دا.
القامِيَةُ: ئافرەتی تێ شكاو لەناخی خۆیدا.
المَقْماةُ: ئەو شوێنەی خۆر لێی نادا.
قَنَا الشيئُ قَنوءاً: شتەكە زۆر سوور بوو (فهو قانِئٌ).
قَنَأت اللحيةُ من الخضاب: موی ڕیش بەهۆی بۆیەكردن بە وسمە ڕەش بوو ٥ (قَنَأ أطراف الجارية بالحناء) دەست‌و قاچی كچەكە بەخەنە سوور بوو.
قَنَا الجلدُ: پێستەكە خرایە ناو دەباغ.
قَنَا لِحْيَتَهُ: ڕیشی بەو سمە ڕەش كرد.
قَنَا اللَّبَنَ: شیرەكەی تێكەڵ بەئاو كرد.
قَنِئَ الأديمُ قَنُوءاً: پێستەكە گەنی، خراپ بوو.
قَنِئَ فلان: فلانكەس مرد.
اقنَأ الأديمَ: پێستەكەی خراپ كرد، ڕزاندی.
اقنَأ الشَّيْئُ فلاناً: شتەكە لەفلانكەس نزیك بۆوە.

**أقْنَأ فلاناً**: فلانكەسی کوشت، یان هەڵی نا بۆ کوشتن.
**قَنَأ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانا (قَنَأ) دێ.
**المَقْنَأةُ**: شوێنێك خۆری لێ هەڵنەیێ، خۆر لێی نەدا.
**المَقْنُوءَةُ**: بەمانا (المَقْنَأةُ)دێ.
**قَنَبَ الزَّهرُ قَنْباً وقنوباً**: گوڵەکە پەردەی خۆی دڕیو پشکوت.
**قَنَبَتِ الشمسُ**: خۆر بەتەواوی ئاوابوو ئاسەواری دیار نەما.
**قَنَبَ الرجلُ في بيته**: پیاوەکە چووە ناو ماڵەکەی.
**قَنَبَ العِنَبَ**: هەرچی زیان بەترێیەکە بگەیەنێ لێی کردەوە.
**أقْنَبَ**: خۆی لەفەرمانڕەوا یان لەخاوەن قەرز شاردەوە ٥ لە ڕۆیشتن دا هەنگاوی فراوانی هاویشتن.
**أقْنَبَ الخيلُ نحوالعدو**: ئەسپ سوارەکان کۆبوونەوە بۆئەوەی هێرش بەرن بۆسەر دوژمن.
**قَنَّبَ الزَّرْعُ**: کشتوکاڵەکە گوڵی کرد.
**قَنَّبَ الزَّهْرُ**: گوڵەکە پشکوت، لەپەردە هاتەدەر.
**قَنَّبَ الخَيلُ نحو العدوِّ**: بەمانا (أقنب) دێ.
**قَنَّبَ شجرَ العنب**: تولە زیادو بێ کەڵکەکانی دارمێوەکەی بڕین هەڵی پەرداوتن.
**تَقَنَّبَ في بيته**: چووە ناو خانووەکەیەوە.
**تَقَنَّبَ الخيلُ نحو العدو**: بەمانا(أقْنَبَ) دێ.
**القانِبُ**: تەتەر، مرۆڤی خۆشڕۆ کە لە شوێنێکەوە نامەو شتی وا بەرێ بۆ شوێنێکی تر.
**القُنابُ**: غونچە (ئەو پەلکە گەڵایانەی گوڵەکەیان لەخۆگرتووە).
**القِنابُ**: بەمانا (القُنابُ) دێ ٥ چنگی شێر ٥ ئەو پەردەیەی کە نینۆکەکانی شێر دەشارنەوە.
**قناب القوس**: ژێی قەوسو کەوان.
**القُنْبُ**: کوندەو گوێنی یان پەردەیەك کە شت لەخۆ دەگرێ ٥ وەکوو پەردەی داپۆشەری چنگو نینۆکی شێر ٥ پەردەی داپۆشەری گوڵی نەپشکوتوو ٥ هەروا ناوە بۆ نینۆکی شێر ٥ شیراعی گەورەی کەشتی.
**القُنابَةُ**: بەمانا (القُنابُ) دێ.
**القِنْبُ**: ڕوەکێکی ساڵانەی کشتوکاڵی لیفییە لە پێڕی (القِنَّبِيَّة) توێکڵەکەی بادەدرێو حەبلی گوشی لێ دروست دەکرێ.
**القُنَّبُ الهندي**: جۆرە ڕوەکێکی (ڤینەبییە) مادەی سڕکەرو بێهۆشکەری لێ بەرهەم دەهێندرێ

پێی دەگوترێ: حەشیشە.

**القَنبُ**: کۆمەڵانی خەڵك ٥ هەوری پڕو گەواڵ گەواڵ.

**القَیْنَـــابُ**: ڕێبـــوارو هاتوچـــۆکەری بەپەلە.

**المِقْنَـــبُ**: شـێوە قەفـەزو بێژنگێـــکە ڕاوکەر نێچیرەکانی تێدەخا ٥ هـەروا نـاوە بـۆ کۆمەڵـە ئەسـپ سوارێـك ژمارەیان لەخوار سەدەوەن‌و خۆیـان ئامـادە دەکـەن بـۆ هێـرش بـردن بۆسەر دوژمن ٥ (ك: مَقَانِب).

**القُنبُرَةُ**: بڕوانە مادەی (القُبَّرَةُ).

**القُنبِـیطُ**: قـەرەنبـیط، قـەرابـیط ڕوەکێـکە دەکولێندرێ‌و دەخورێ.

**قَنْبَـعَ في بیتـه**: لـەماڵی خۆیـدا ونبـوو، خۆی شاردەوە.

**قَنْبَعَـت الـشجرةُ أو البقلـة**: درەختەکـە هێـــشتا گوڵەکـــەی نەپـــشکوتووەو غونچەن.

**قَنْبَـعَ فـلان**: فلانکـەس ڕقـی هەڵـساو ڕەگی لاملی فش بوون.

**القُنْبُـعُ**: پـەردەی گـوڵ ئـەو پەڕانـەی دەوری غونـچەی گـوڵ دەدەن پـێش پـشکوتنی ٥ پـەردەی گوڵـە ڕوەك ٥ پـەردەی گوڵـە گـەنم‌و جـۆ ٥ پیـاوی کورتە بالای هیچ‌و پوچ.

**القُنْبُعَـةُ**: وەرەقـەی لای خـواروی گـوڵ، بـەرگی خونـچە ٥ پەڕۆیەکـە تـەنك دەدورێ‌و لەبەر منداڵ دەکرێ.

**قَنْبَـلَ فـلان**: فلانکـەس لـەناو هـۆزو خـێڵدا ژیـاو وازی لـە گۆشـەگیری هێنا.

**القُنَابِلُ**: پیاوی ڕق ئەستوورو بـەهێزو بەتوانا ٥ سەرزل.

**القَنْبَلُ**: کۆمەڵـە خەڵـك‌و ئەسپ سوار کە ژمارەیان لەنێوان سی تا چل.

**القُنْبُلُ**: پیاوی ڕق ئەستوورو بـەهێز ٥ کوڕی گەنجی سەرزلی ڕۆح سوك.

**القَنْبَلَـةُ**: بـەمانا (القَنْبَـــلُ) دێ ٥ (ك: قنابل)

**القُنْبُلَةُ**: تەڵەو داوێـکە (ابـو بـراقش)ی پـێ ڕاودەکـرێ ٥ قەبارەیـــەکی مەعدەنییـە کلـۆرە نـاواخن دەکـرێ بە مـەوادی تەقینـەوەو دەهاوێـژرێ بـەهۆی تۆپـەوە یـان بەدەسـت بـە کوردی پێی دەڵێن: بۆمبا بۆمب.

**القُنْبُلانیة من القدور**: ئەو مەنجەڵانەی خواردنی سی چل کەسی تێدا ئامادە دەکرێ.

**قَنَتَ قنوتاً**: ملکەچی فەرمانی خـودا بـوو، بەندایەتی خۆی بـۆ خـودا ڕاگەیەنـد ٥ درێژەی بەنوێژو پاڕانەوە دا.

**قَنَّـتَ اللهَ**: پابەنـدی بەندایـەتی کـردن‌و خوداپەرستی بوو.

**قَنَتَت المرأةُ لزوجها**: ئافرەتەکە گوێ بیستی فەرمانی مێردەکەی بوو ◦ (فهي قنوت).

**قَنُتَ قَناتةً**: کەمخۆر بوو ◦ (فهو وهي قنيت).

**أقنتَ**: لە نوێژدا زۆر ڕاوەستا درێژەی بە پێوە ڕاوەستان دا ◦ درێژەی بە غەزاکردن دا ◦ هەموو ساڵێ حەجی کرد، ملکەچو پابەندی فەرمانی خودا بوو ◦ دوعای شەڕی لە دوژمنی کرد.

**تَقَنَّتِ المرأةُ لزوجها**: بۆ زەینەمرۆیی لەمانای (قَنَتَ)دا دێ.

**إقْتَنَت**: ملکەچ بوو.

**القُنُوتُ**: تاعەتو ملکەچی، دوعاکردن.

**قَنَحَ الشارِبُ قَنحاً**: شلەمەنی خۆرەوەکە دوای تێر خواردنەوە لە ئاوو شتی وا زۆری لەخۆی کرد بۆ زیاتر خواردنەوە.

**قَنَحَ من الشراب**: ئاوەکەی هەڵمليست.

**قَنَحَ العودَ والغصْنَ**: لایەکی دارەکە یان لقەکەی چەماندەوە وەکوو گۆچانی لێ کرد.

**قَنَحَ البابَ**: دارێکی تاشیو دەرگاکەی پێ بەرز کردەوە.

**أقْنَحَ البابَ**: بەمانا (قنحه) دێ.

**قَنَّحَ البابَ**: گرێژەنە، یان کلیلی دەرگاکەی چاك کردەوە.

**تَقَنَّحَ من الشراب**: شەرابەکەی بەنابەدڵیو لەسەر تێراوی خواردەوە.

**القُنَّاحُ**: مەتاڵو پەردەی دەرگا.

**القُنَّاحَةُ**: کلیلێکی درێژو خوارە بۆ کردنەوەی شت ◦ هەرپارچە دارێك بیخەیە ژێر دارێکی ترەوە بۆنەوەی جەوجۆڵی پێ بکا وەکوو گرێژەنە.

**قَنَدَ السَّويق قَنداً**: هەنگوینو پوختەی شیرینی کردە ناو قاوتەکەوە.

**أقند السَّويق**: بەمانا (قنده) دێ.

**قَنَّدَ السَّويق**: بەمانا (قَنَدَهُ) دێ.

**القَنْدُ**: هەنگوینو پوختەو پاڵفتەی قەصەبی شەکر کە ڕەق بێ.

**القِنْدَأو**: مرۆڤی گورجو گۆڵ ◦ حوشتری خۆشڕۆ.

**القَنْدَةُ**: کڵۆشەکر پارچەیەك لە شەکر.

**القِنديد**: گوشراوی قەصەبی شەکر کە توندو ڕەق بوو ◦ شەراب ◦ کافور ◦ عەنبەر ◦ میسك.

**قَنْدَسَ**: دوای تاوانکردن تۆبەی کرد.

**قَنْدَسَ في الأرض**: ملی خۆی لە ڕێگاناو ڕۆیی‌و ئاوڕی نەدایەوە.

**القُنْدُسُ**: گیانلەبەرێکە ڕەفتارو شێوە جرجە، لەپێڕی (القندسية) توکنو

کلـك بـەهێزە لـەوڵاتی ئـەوروپاو ئەمریکای باکوردا هەیە.

**قَنْدَلَ فلان:** فلانکەس سەری گەورەیە ٥ بەهێواشیو لەسەرەخۆ ڕۆیشت.

**القَنادِلُ:** سەرزل.

**القَنْدَلُ:** بەمانا (القنادِل) دێ.

**القِنــديلُ:** چـرایەکە وەکـوو ئەسـتێرە وایــە، لەناوەڕاســتیدا پلێتەیــەك هەیـە، ئـاو و زەیتـی تـێ دەکـرێو هەڵدەگیرسێندرێ.

**القُنـزُعُ:** تـووکی دەوران دەوری سـەر ٥ ئەو پـەڕو پۆڵەی کۆبۆتـەوە بەسـەر سەری کەڵەشێرو قوببەڕەوەیە.

**القَنزَعَـةُ:** مـووی دەوران دەوری سـەر ٥ پارچــەموو (گودلــە) کەبەســەری منداڵەوە دەهێڵدرێتەوەو ناتاشرێ ٥ (ك: قنازِع).

**القُنزُعَــةُ:** بــەمانا (القَنزَعَــةُ) دێ ٥ ئافرەتی زۆر کورتەبالا ٥ پەڕو پۆڵی کۆبۆوە بەسەر سەری کەڵەشێرەوە.

**أقْــنَسَ فــلان:** فلانکــەس لافــی وەجــاخزادەیی لــێ داو بۆخۆیــشی خوێڕیو هەتیو مچەیە.

**القِنسُ:** ئەصڵو بنەچە ٥ تۆقەسـەر ٥ (ك: قنوس).

**القَنَسُ:** ڕشانەوەی کەم.

**القونس:** پێشەسەر ٥ تۆقەسـەری کڵاو خــوزە ٥ ئێــسقانێکە لــەنێوان دوو گوێچکەی ئەسپ دا بەرزەوە بـووە ٥ ناوەڕاستی ڕێگا.

**قَنسَرَتْهُ السِّنُّ أو الشدائد:** ساڵانی تەمەن یان بەڵاو جۆرتەم پیریان کرد.

**تَقَنسَرَ:** پیر بوو جەستەی وێکهاتەوە.

**القُناسِرُ:** بەڵاو ناخۆشی.

**القَنْسَرُ:** پیرو بەساڵاچوو ٥ کۆن.

**قَنَصَ الصَّيدَ قَنصاً:** نێچیرەکەی ڕاو کرد ٥ (فهو قانِص).

**إقْتَنَصَ الصَّيْدَ:** نێچیرەکەی ڕاوکرد.

**تَقَنَّصَ الصيدَ:** نێچیرەکەی ڕاوکرد.

**القانِصة من الطير:** چڵێدانە، بەشێـکە لە مەعیدەو تێیدا خواردن وردوهاڕ دەکــرێ ٥ ئــەم چــڵێدانە بۆئــەو باڵندانەیە بژێویان دانەوێڵەو شتی وایـە وەکـوو مریـشكو کـۆترو ئـەو جـۆرە باڵندانــە ٥ هـەروا لەهەنـدێ گیانلەبــەری تــریش دا هەیــە کــە خۆراکیان شتی قورس بێ.

**القَنَصُ:** شەبەکەوداو.

**القنيصُ:** ڕاوچی، شەبەکەو داو.

**القُنصُلُ:** وەکیلو نوێنـەری دەوڵەتێـك لـە دەوڵەتێـکی تـردا پلـەو پایـەی لــەخوار ســەفیرەوەیە، کاروبــاری سیاســیو بازرگــانیو ڕۆشــنبیریو پەروەردەیی لەو وڵاتـەدا سەروکاری دەکــا ٥ (بنـــت القنـــصل) جــۆرە ڕوەکێــکی (الــسرسبية) لــە وڵاتــی میصر هەیە.

**القُنْصُلِيّة**: سەفارەتخانە، شوێنی ڕەسمی قونصول.
**قَنَطَ قنوطاً**: نائومێد بوو بەتەواوی لێی نائومێد بوو.
**قَنَطَ قنوطاً وقناطةً**: نائومێد بوو.
**أقْنَطَهُ**: نائومێدی کرد.
**قَنَّطَهُ**: بەمانا (أقْنَطَهُ) دێ.
**قَنْطَـرَ**: لادێـی بەجێهێـشت بووبـە شارنـشین ٥ دەوڵەمەنـدبوو بـوو بەخاوەن پارەو پولی زۆر.
**قنطـر علينـا**: زۆر مایـەوەو لەشوێنی خۆی نەجولا.
**قَنْطَـرَ البنـاءَ**: خانوەکـەی لەشـێوەی کەوانەیی دروستکرد.
**القِنْطـــارُ**: ئامێرێـــکی پێوانەییـــە بەگوێرەی وڵات پێوانەکەی دەگۆڕێ لــەوڵاتی میــصر دەگاتــە ریطــل ٥ واتە: (٤٤,٩٢٨ کغم) ٥ مـاڵو سـامانی زۆر ٥ (ك: قناطير).
**القنطـرة**: پـردی کەوانـەیی کەبەسـەر ڕوبـارەوە دروســت دەکــرێ بــۆ پەڕینەوە بەسەری دا.
**المُقَنْطَـرُ**: (بنـاء مُقَنطـر) باڵەخانەیـەکی کەوانەییـــە پەنجـــەرەو دەرگـــاو دیکۆراتی کەوانەیی دروست کراوە.
**القنـاطير المقنطـرة**: مـاڵو سـامانی زۆرو سەریەك نراو.

**قَنَعت الإبلُ والغنمُ قَنْعاً**: حوشترو مەڕو بزنــەکان گەڕانــەوە بــۆ ئاغــەڵو تەویلەی خۆیان.
**قَنَعــت الــشاةُ**: مەڕەکـە گـوانی بـەرز بوونەوە
**قَنَعَ فلان قنوعاً**: قەناعـەتی بەشـتی کـەم کرد ٥ بەبەشی خۆی ڕازی بـوو ٥ (فهـو قانع وقنيع).
**قَنَعَ الى فلان**: بۆی ملکەچ بوو کەوتە ژێـر ڕکێفی فلانکەسەوە.
**قَنِعَ قَنَعاً وقناعـةً**: ڕازی بـوو بـەوەی پێـی درا ٥ (فهو قانع).
**أقْنَعَت الشاةُ**: بەمانا (قَنَعت) دێ.
**أقْنَعَ البعيرُ**: حوشـترەکە سـەری ڕاکێـشا بــۆلای حەوزەکــە بۆئــەوەی ئــاو بخواتەوە.
**أقْنَعَ فلان بيديـه في الـصلاة**: فلانکـەس هەردوو دەستی خۆی بەرز کردنەوە بـــۆلای ئاسمـــانو داوای ڕەحـــمو بەزەیی لەخودا کرد.
**أقْنَعَ فلانـاً الـشَّيْئُ**: شـتەکە فلانکەسـی ڕازی کرد.
**أقْنَــعَ الإبــلَ والغــنمَ**: حوشــترو مــەڕو بزنــەکانی ڕوەو لــەوەڕگا ئــاژوتن ٥ یان بەرەو ئاغەڵو تەویلـەی خۆیـان ئاڕاستەی کردن.
**أقْنَــعَ رأســهُ وعُنَقَــهُ**: سـەری بۆئاسمـان

بەرزکردەوەو چاوی لەئاسمان بڕیو زەلیلیو داماوی خۆی ڕانواند.

أَقْنَعَ حَلقه وفَمَه: دەمیو قورگی بەرز کردنەوە بۆئەوەی شتێکی لەشلەمەنییەکە دەست بکەوێ بیخواتەوە.

أَقْنَعَ الإناءَ: قاپەکەی خوارکردەوە بۆئەوەی ئەوەی تێیدایە ڕۆی بکا.

قَنَّعَهُ: ڕازی کرد.

قَنَّعَ المرأةَ: چارشێوەی لەبەر ئافرەتەکە کرد.

قَنَّعَ رأسَ الجبل: چووە سەر تۆپەڵاکی کێوەکە.

قَنَّعَ فلاناً بالسيف أو السوط أو العصا: بەشمشێر یان بەقامچی یان بەعەصا فلانکەسی داپڵۆسی.

تَقَنَّعَ: بەناچاریی قەناعەتی بەسەر خۆی دا هێنا ◦ خۆی بە چارشێو و شتی وا داپۆشی.

تَقَنَّعت المرأةُ: ئافرەتەکە چارشێوی پۆشی.

تَقَنَّعَ في السلاح: چەکی لەخۆ بەست.

إقْتَنَعَ: بەمانا (قَنَعَ) دێ.

إقْتَنَعَ بالفكرة أو الرأي: قەناعەتی بەفیکرەو ڕاو بۆچوونەکە کرد.

القانِعُ: خزمەتکاری گەل ◦ شوێنکەوتەی گەلو نەتەوەو بەکرێگیراوی ئەوان.

القِناع: سەرپۆشو چارشێو ◦ هەرشتێك ئافرەت سەری خۆی پێ داپۆشێ ◦ پەردەی دڵ ◦ پیریو موسپی بوون ◦ هەرشتێك ڕوخساری پێ داپۆشرێ.

القِنْعُ: چەكو سیلاح ◦ سەبەتەو سەلەو شتی وا کە لە پڕژی درەختی خورما دروست بکرێو نانی لەسەر دەخورێ یان میوەی تێ دەکرێ ◦ پێدەشت ◦ زەوییەکی دەشتە دەکەوێتە نێوان لمبەڵانو درەختی تێدا دەڕوێ ◦ لمبەڵانی تەبارە بەستوو ڕەق بوو ◦ بنەچەو بنەما ◦ (ك: أقناع وقنعة).

القُنْعُ: زوڕنا ◦ هەرشتێك فوی پێدا بکەیو دەنگی لێ بێ.

القُنْعانُ: (رجل قُنعان) پیاوێکە گوێی لێ ڕادەگیرێو بڕوا بەقەضاو حوکمی دەکرێ ◦ کەسێك بەکەم ڕازی بێو قەناعەت بکا.

المَقْنَعُ: عادڵو ڕاستاڵێك شایەتی دانی ڕەت نەکرێتەوە ◦ ڕاو بۆچوونێك جێگای ڕەزامەندی خەڵك بێ.

المُقَنَّعُ: کەسێك چەكو سیلاحی لەخۆ بەستبێو زرێی پۆشیبێ، کەسێك جەستەی خۆی بەزرێ داپۆشیبێو

قیناعی لەسەر کردبێ ٥ کەسێك کلاو خوذەی لەسەر نابێ ٥ دەمو چاو داپۆشراو

**قَنِفَتْ الأذنُ قَنَفاً**: گوێی گەورەو ڕەپو بەرەو پێش هاتوون (فالرجلُ أقنف) و (المرأةُ والأذنُ قنفاء).

**أقْنَفَ**: بوو بەخاوەن سوپای زۆر ٥ گوێی شۆڕ بوون.

**القِناف**: لوت زل لوت کەشکۆڵ ٥ سەرزل، ڕیش پان، ڕیش زل.

**القَنیفُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ هەوری بارانـاوی، هەورێك بارانی زۆر پێ بێ ٥ پیاوێك کەمخۆر بێ ٥ (ك: قُنفٌ).

**تَقَنفَذ القُنْفُذُ**: ژیشکەکە خۆی وێکهێنایەوە.

**القُنْفُذُ**: ژیشك؛ دەعبایەکی شیردەرە، جەستەی چقڵی تیژی پێوە هەن خۆی خڕ دەکاتەوە وەکوو تۆپ ٥ بەم چقڵانە خۆی لە دوژمنەکانی دەپارێزێ ٥ شوێنێك ڕوەکی تێدا باهەڵدراوی لێ بڕوێ ٥ دەشگوترێ: (هو قنفذ الليل) ئەوە ژیشکی شەوە چونکە ژیشك بەشەو لەهەوڵی بەدەستهێنانی بژێوی خۆی دایە.

**قَنِمَ الفرس ونحوه قَنَماً**: ئەسپەکە شەونم لێی دا دوایی تەپوتۆزی بەسەردا باری‌و چڵکن بوو.

**قَنِمَ الطعامُ واللحمُ وغيرهما**: خواردن‌و گۆشتەکە بۆگەن بوو کەڵکی نەما تێکچوو ٥ (فهو قَنِمٌ وأقنم).

**الأقنوم**: ئەصڵ‌و بنەما ٥ (ك: أقانيم).

**الأقانيم الثلاثة عند النصارى**: بریتین لە: (باوك و کوڕ و جوبرائیل).

**القَنَمَةُ**: خڵتەو پڵتەی زەیت‌و ڕۆن.

**قَنَّ الشَّيْءَ قَنّاً**: چاوی بەدوادا گێڕاو لێی وردبۆوە.

**قَنَّنَ**: یاسای دانان.

**إقْتَنَّ قِنّاً**: کۆیلەی بۆخۆی پەیدا کرد ٥ سەری داخست‌و بێدەنگ بوو.

**إقْتَنَّ الرَّحْلُ**: کەژاوەکە لەسەر پشتی حوشترەکە مایەوە.

**إسْتَقَنَّ بالأمر**: تایبەت بوو بەکارەکە ٥ لەگەڵ مەڕوبزنەکانی خۆی دامایەوە بۆئەوەی سود لە شیرەکەیان بکا.

**القانون**: پێوەری هەموو شتێك‌و ڕێبازو کەناڵەکانی؛ قانون‌و یاسا ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێرێکی مۆسیقا.

**القُنانُ**: قوڵی کراس ٥ بۆنی بن هەنگڵ.

**القِنُّ**: کۆیلە، ئەو کەسەی باوکیشی کۆیلە بووبێ.

**القُنَّةُ**: (قُنَّةُ کل شيء) سەرانسەرو تۆپەڵاکی هەموو شتێك.

**القِنَّةُ**: پتەویی حەبل یان پتەویی حەبلی لیف (گوش).

**القِنِّينَة**: سوراحیو گۆزە کەلەشوشە بێو شەرابی تێدا بێ.

**القِنْقِنُ**: ئەندازیاری شارەزا لە بواری ئاوی ژێرزەویو هەڵکەندنی بیرو شتی وا.

**قَنا لون الشَّيْئِ قُنُواً**: شتەکە زۆر سوور بوو.

**قَنا فلاناً**: بۆ فلانکەس سەرچاوە ژیانێکی بۆ دیاری کرد بۆئەوەی قنیاتی پێ بکا.

**قَنا فلاناً قِناوَةً**: پاداشی فلانکەسی دایەوە

**قَنا الله الشَّيْئَ قنواً**: خودا شتەکەی وەدی هێنا.

**قَنى الشَّيْئَ قَنياً**: شتەکەی کەسب کردو کۆی کردەوە.

**قَنى الغَنَمَ وغيرها**: مەڕو بزنەکانی وەرگرتن بۆئەوەی بەخێویان بکاو سوود لەبەرو بوومیان وەربگرێ نەك بۆ بازرگانیو جەڵەبچیەتی.

**قَنى فلاناً**: فلانکەسی ڕازی کرد.

**قَنَى الحياءُ فلاناً**: شەرمو حەیا وای لە فلانکەس کرد کەخۆی لە زۆر شت گێڕایەوە.

**قَنَى فلان الحياءَ**: فلانکەس شەرمی بەخۆی بوو، پابەندی حەیا بوو.

**قَنِيَ فلان قِناً**: فلانکەس ڕازی بوو ٥ دەگوترێ: (قَنِيَ بالشيئ) بەشتەکە ڕازی بوو.

**قَنِيَ الأنفُ قَناً**: لوت ناوەڕاستی بەرز بۆوە، کونەکانی بچوكو تەسك بوونەوە.

**قَنِتَ الشجرةُ**: درەختەکە درێژبوو ٥ (فهو أقْنَى وهي قنواء).

**قَنى الحياءَ قنواً**: پابەندی شەرمو حەیا بوو.

**القواهر**: کێوی بەرز.

**القُهْرَةُ**: دەگوترێ: (أخذت فلاناً قُهْرَةً) بەناچاریی فلانکەسم گرت ٥ (هو قُهْرَةُ الناس): ئەو دەتوانێ ستەم و زوڵمی کەسانی دی هەڵگرێ.

**القُهْرَةُ من النساء**: ئافرەتی شەڕانیو چەقاوەسوو.

**القَهّار**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا ٥ باڵادەستو زاڵ کەکەس دەستی بەسەردا نەڕوا.

**القُهْرُمُ**: پیاوی کورتەباڵا.

**القَهْرَمَانُ**: ئەمینداری تایبەتی پاشاو وەکیلو کلیل دارو بەڕێوەبەری کاروبارەکانیو ماڵو سامانیو خەرجیو داهاتی.

**القَهْرَمَانة**: ئافرەتی خانومانو کابانی دەست ڕەنگینو بەڕێوەبەری کاروباری ناوماڵ.

**تَقَهْقَرَ**: بەمانا (قهقر)دێ ٥ بە تێشکاویی پاشەوپاش کشایەوە.

**القهقار**: بەردی زۆر ڕەق‌و لووس کە بەردی تری پێ دەشکێندرێ.

**القَهْقَرِى**: گەڕانەوە بۆ دواوە ٥ دەگوترێ: (فلان يمشي القهقري) فلانکەس پاشەوپاش دەگەڕێتەوە دواوە.

**القَهْقَرَةُ**: (حِنطةٌ قَهْقَرَةٌ): گەنمێکە دوای سەوزبوون ڕەش هەڵگەڕا.

**قَهْقَهَ قَهْقَهَةً**: پێکەنی‌و لەقاقای پێکەنینی داو قاقای بیسترا.

**قَهِلَ جِلْدُهُ**: پێستی وشك هەڵاتو و تەڕایی تێدا نەما.

**قَهِلَ فلان**: فلانکەس جەستەی بەئاو ڕانەهاتووە و جەستەی خۆی پاك نەکردۆتەوە ٥ بەخششەکەی بەکەم زانی‌و کوفرانی نیعمەتەکانی کرد.

**تَقَهَّلَ**: پێستی وشك بۆوەو تەندروستی تێك چوو.

**تَقَهَّلَ فلان**: فلانکەس جەستەی بەئاو ئاشنا نەبووە خۆی پاك‌و خاوێن ڕانەگرتووە ٥ بەهێواشی ڕۆیی ٥ شەکوای حاڵ‌و وەزعی خۆی کرد.

**تَقَهَّلَ صوتُهُ**: دەنگی نزم‌و نەرم بوو.

**قَهِمَ قَهَماً**: ئیشتیای خواردنی کەم بوو بەهۆی نەخۆشی یان هۆکاری تر ئارەزۆی خواردنی لاواز بوو ٥ (قهِر قَهِمٌ).

**أقْهَمَ عن الشَّيْئ**: بێزی لەشتەکە هەڵسا ناخۆشی ویست.

**أقْهَمَ عن الطعام والشراب**: ئارەزۆی خواردن‌و خواردنەوەکەی نەبوو.

**أقْهَمَ السماءُ**: ئاسمان ساو بوو هەوری پێوەنەمان.

**أقْهَمَ في الشَّيْئ**: بێ موبالاتی لەشتەکەدا کرد.

**قَهْ قَهاً**: پێکەنی.

**أقهى فلان**: بەردەوام بوو لەسەر خواردنەوەی قاوە.

**أقهى عن الطعام**: خۆی لەخواردنەکە گرتەوەو حەزی لێ نەبوو ئارەزۆی خواردنەکەی نەکرد.

**القَهْوَةُ**: شەراب ٥ شیری ساغ‌و بێ غەل‌و غەش ٥ قاوە و چا ٥ بۆن‌و بەرام ٥ شوێنی قاوە خواردنەوە، قاوەخانەو چایخانە.

**المقهى**: شوێنێکی گشتییەو تێیدا چا و قاوە و ئاو پێشکەش دەکرێ.

**قَهِيَ قَهْياً**: ئارەزۆی خواردنی نەبوو ٥ دەگوترێ: (قَهي عن الطعام والشراب).

**قَهِيَ الشَّيْئُ فلاناً عن الطعام**: شتەکە فلانکەسی لەخواردنەوە گێڕایەوە.

**قاب الأرضَ قوباً**: لەزەویەکەدا چاڵێکی

کەوانەیی هەڵکەند.

**قاب الطائر بَیْضَتَهُ:** باڵندەکە هێلکەکەی شکاند بۆئەوەی بێچووەکەی سەری لەهێلکە بجروکێ.

**قَوَّب الشَّیْئَ:** شتەکەی لە ڕیشەوە هەڵکەند

**قَوَّبَ الأرضَ:** لە زەویەکەدا چاڵێکی کەوانەیی هەڵکەند.

**قَوَّبَ الجَرَبُ جِلْدَ البعیر:** گروییەکە وای لە پێستی حوشترەکە کرد پەڵەپەڵە توکی هەڵوەرێو بروتێتەوە.

**إنقاب المکان:** شوێنەکە پەڵەپەڵەی ڕوتەنو بێدارو درەختو گژوگیا بوو.

**إنقابَت الأرضُ:** لە زەوییەکەدا چەند چاڵێکی خڕو کەوانەیی هەڵکەندرا.

**إنقابت البیضة:** هێلکەکە شەق بوو شکا.

**تَقَوَّبَت الأرضُ أو البیضةُ:** بەمانا (إنقابت) دێ.

**تقوبت من رأسه مواضِعُ:** چەند پەڵەیەك لەسەری توکی هەڵوەری کەچەڵ بوو.

**تَقَوَّبَ الأسودُ من الحیات:** ڕەشمارەکە توێژی فڕێ دا.

**القابِبَةُ:** بێچو.

**القابُ:** ئەندازە ٥ لەقەوس دا نێوانی شوێن دەستو کۆتایی لایەکی کەوانەکە ٥ دەگوترێ: (بینهما قاب قَوْسٍ) واتە: نێوانیان زۆرکەمەو دووشتەکە زۆر لێك نزیکن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَکَانَ قَابَ قَوْسَیْنِ أَوْ أَدْنَی﴾.

**القُوبُ:** هێلکە ٥ جوچك ٥ (ك: أقواب).

**القُوباءُ والقَوَباءُ:** نەخۆشییەکە توشی جەستە دەبێ پێست واڵێ دەکا مەیلەو گروێ ببێو توکی لێ هەڵوەرێو بروتێتەوە.

**القُوبَةُ:** بەمانا (القوباءُ) دێ ٥ توێکڵی هێلکە.

**القُوَبَةُ:** بەمانا (القُوباءُ) دێ ٥ کەسێك نیشتەجێ بێو لەشوێنێکو نەجوڵێ.

**القُوبِيُّ:** کەسێك گۆشتی فڕوجو بخوا، زۆر حەزی لەخواردنی گۆشت فڕوجو بێ.

**قاتَ الرَّجُلَ:** ئەوەندەی خواردن دا بەپیاوەکە لەبرسا نەمرێ ٥ بەخێوی کرد.

**أقاتَهُ:** بژێوی پێدا.

**أقاتَ الشَّیْئَ:** توانای بەسەر شتەکەدا شکاو پێی وێرا.

**اقتات الشَّیْئَ:** شتەکەی کردە بژێو.

**إقتات للنار:** داری تری خستە سەر

ئاگرەكەو بلێسەی ئاگرەكەی خۆش كرد ٥ بەهێواشی فوی لەئاگرەكە كرد.

**تَقَوَّتَ بالشيئ:** شتەكەی خوارد.

**إستقاتَهُ:** داوای بژێوی لێ كرد.

**القاتُ:** ڕوەكێكە لەپێڕی (السلسترية) بۆ سود وەرگرتن لە گەڵاكەی دەڕوێندرێ، گەڵاكەی بەسەوزی دەجورێ كەمێكی بێدار كەرەوەیە بەڵام زۆرەكەی سڕكەرو موخەدیرە ٥ شوێنی سەرەكی وڵاتی حەبەشەیە ٥ بەزۆری لەوڵاتی یەمەن دەڕوێندرێو پێی دەڵێن: (شای العرب) ٥ چای عەرەب.

**القائِت من العيش:** ژیانی نەمرو نەژی ٥ ژیانی كیفایەت.

**القوت:** بژێو ئەو بەشە خواردنو خواردنەوەی جەستەی ئادەمیزاد خۆی پێ دەگرێو پێداویستی جەستەی پێ دابین دەكرێ.

**القيت والقيتة:** بەمانا (القوت) دێ.

**المُقيتُ:** ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا، واتە: بژێودەری هەموو گیانلەبەرێكو بەدەسەڵات بەسەر هەموو شتێك دا.

**قادَ الدّابَةَ قوداً وقياداً وقيادةً:** لەپێش وڵاخەكەوە ڕۆیشتو هەوسارەكەی گرتو ڕایكێشا.

**قاد القاتل الى موضع القتل:** بكوژەكەی بردە شوێنی كوشتنەكە.

**قاد الجيشَ:** سەروكاری سوپای كرد.

**قودَ الفرسُ وغيره قَوَداً:** ئەسپەكە پشتو ملی درێژبوو ٥ (فهو أقود وهي قوداء).

**أقادهُ خيلاً:** ئەسپێكی دایە، هەوسارەكەی ڕابكێشێ.

**أقاد القاتِلَ بالقتيل:** بكوژەكەی كوشتەوە لەتۆڵەی كوژراوەكەدا.

**اقتادَ الدَّابَّةَ:** ڕێشمەی وڵاخەكەی ڕاكێشا.

**اقتاد النَّبْتُ الثَّوْرَ:** كەڵەگا كێوییەكە بۆنی ڕوەكەكە كاری تێكردو بۆی چوو بیخوا.

**إنقاد:** بۆ موتاوەعەی (قاد) هاتووە ٥ ملكەچو زەلیلو ژێربار بوو ٥ ملكەچی ئیشەكە بوو.

**إنقاد الطريق:** ڕێگاكە ئاسانو ڕاست بوو.

**تقاود الرجلان:** دووپیاوەكە زۆربە خێرایی ڕۆیشتن، هەر یەكەیان دەیەویست پێش ئەوی تریان بكەوێ.

**تقاود الإبِلُ:** حوشترەكان ڕیزیان بەستو بەشوێن یەكدا ڕۆیشتن.

**تقارد المكانُ:** شوێنەكە تەختو ڕێك بوو.

**إستقادت الدَّابَّةُ**: ولاخەکە بەدوو قەتارچیەکەی دا ڕۆیشت.
**إستقاد فلان**: فلانکەس زەلیلو ملکەچ بوو ◦ دەگوترێ: (إستقاد له).
**إستقاد الأسيّ**: داوای کرد دیلەکە لەجیاتی کوژراوەکەی بکوژرێتەوە.
**إستقاد فلان من آذاه**: فلانکەس تۆڵەی لەو کەسە ستاندەوە کەزیانی پێگەیاندبوو.
**الأقْوَدُ من الناس**: کەسێکە کەروی کردە شتێك هەرگیز پشتی تێ ناکا ◦ ئەسپی ڕامکراو و ژێربارکراو ◦ ئەسپی پشتو مل درێژ ◦ پیاوی مل ئەستوور ◦ کێوی بەرزو سەرکەش.
**القائد**: کەسێك ڕابەرایەتی سوپا بکا ◦ کەسێك سەروکاری تیمێکی مۆسیقاژەن بکا ◦ (ك: قادة وقواد) ◦ هەر زەوییەك یان کێوێك درێژبووبێتەوە.
**القائِدَةُ**: تەپۆڵکە لەسەر زەوی درێژ بووبێتەوە.
**القَوُودُ**: (فرس قؤود) ئەسپێکی سەر نەرمو بارخۆشە.
**القادُ**: ئەندازە ◦ دەگوترێ: (هو مني قاد رمح) ئەو لەمنەوە ئەندازەی ڕمبێك دوورە.
**القَوْدُ**: کۆمەڵە ئەسپێك لەگەڵ قافڵەو کاروان دا لێ دەخوڕدرێن کەس سواریان نابێ بۆ ئیحتیاتو سپێرو کاتی پێویست هەڵدەگیرێن.
**القَوَدُ**: تۆڵەستاندن لەتاوانکار.
**القَوَّادُ**: گەواد؛ ئەو کەسەی دەلالی نێوان ئافرەتو پیاودەکا بۆ داوێن پیسی و بەدڕەوشتی.
**القِيَادُ**: ئەو پەتو حەبلەی ولاخی پێ ڕادەکێشرێ ◦ دەشگوترێ: (فلان سلس القِياد) فلانکەس بارخۆشەو بەئارەزوی تۆ هەڵسوکەوت دەکا ◦ (أعطى فلان القياد) فلانکەس ملکەچ بوو.
**القَيْدُ**: (فرس قيد) ئەسپێکی سەر نەرمو هەوسار خۆشە.
**القَيِّدَةُ من الإبل**: ئەو حوشترەی دەبرێ بۆ ئەوەی ڕاوی نێچیری پێ بکرێ ◦ حوشترێك نێچیری پێ هەڵخەڵەتێنرێ، هەروا دەگوترێ: (بعير قَيد) حوشترێکی ڕامکراو و بارخۆشە.
**المَقادَةُ**: دەگوترێ: (أعطاه مقادته) بۆی ملکەچ بوو.
**المِقْوَدُ**: گوریسو حەبل کە ولاخی پێ کێش بکرێ.
**المُقَوَّدُ**: کێوی درێژەوەبوو.
**قار قَوْراً**: لەسەر سەرپەنجەی ڕۆیشت

بۆئەوەی تەپەی قاچی نەیەو پێی نەزاندرێ.

**قار الصيدَ**: فێڵی لە نێچیرەکە کرد.

**قـار الشَّيْئَ**: کونێکی کەوانەیی لەناوەڕاستی شتەکە کرد.

**قار الصَّبِية**: کچۆڵەکەی خەتەنە کرد.

**قَوِرَ قَوَراً**: کوێر بوو ٥ (فهو أقور وهي قوراء).

**قَوِرَت الدارُ**: خانووەکە فراوان بوو (فهي قوراء والبيت أقور).

**قَوَّرَ الشَّيْئَ**: کونێکی کەوانەیی لەناوەڕاستی شتەکە کرد.

**تَقَوَّرَ**: بۆ موتاوەعەی (قَوَّر) دێ.

**تَقَوَّرَ السَّحابُ**: هەورەکە پەڵەپەڵەبوونو لێك بڵاو بوون.

**تَقَوَّرَتِ الحيَّةُ**: مارەکە پاپۆکەی بەستو خۆی کۆکردەوە.

**إقْوَرَّ فلان**: فلانکەس پێستی گرژبوو پشتی چۆمایەوە.

**إقْوَرَّ الجلدُ**: پێستەکە گرژبوو وێکهاتەوە.

**إقْوَرَّتِ الأرضُ**: زەوییەکە روەکی تێدا نەماو بوو بەسوتەمەڕۆ.

**الأقْوَرُ**: دەگوترێ: (لقيت منه الأقورين) لەوە توشی بەڵای سامناك بووم.

**القار**: قیر، زفت ٥ بڕوانە مادەی (زَفَتَ) ٥ (يوم ذي قار) ڕۆژێکە خێڵی بەنو شەیبان لەباشوری شاری کوفەی ئێستا توشی شەڕ هاتنو سەرکەوتن.

**القارَةُ**: کێوی پچکۆلەی ڕەشی کەوانەیی کەبەرەو ئاسمان منارە ئاسا هەڵچوبێ ٥ گردۆڵکە ٥ زەوییەك بەردی ڕەشی تێدابێ ٥ هۆزێکی عەرەب بوون لەسەردەمی نەزانیدا بەتیر ئەندازی چاك بەناوبانگ بوون ٥ لە پەند دا هاتووە دەڵێ: (قد أنصف القارة من رماها).

**القُوَارَةُ**: ئەوەی لەپۆشاك دەنوشتێندرێتەوە لەسەرە پڕژو شتی وا ٥ ئەوەی لەئەملاو ئەولای شت دەبڕدرێ ٥ ئەوەی لەکاتی هەڵکۆڵینی دارو کولەکەو باینجان دا دەردەهێندرێ.

**المِقْوَرَةُ**: ئامێری هەڵکۆڵینی باینجانو شتی وا.

**قَوَّزَ النَّبْتُ**: ڕوەکەکە زۆر بوو.

**تَقَوَّزَ البيتُ**: خانووەکە ڕوخا.

**القَوْزُ**: تەبارە لمی بەرز ٥ (ك: أقواز و قیزان).

**قَوْزَعَ**: بڕوانە مادەی (قَزَعَ).

**قـاسَ الشَّيْئَ على غيره قوساً وقِياساً**: شتەکەی بەشتێکی تر مەزەندە کرد ٥ شتەکەی بەئەندازەی شتێکی تر دیاری کرد.

**قُوِسَ قَوَساً**: پشتی کۆم بوو ◊ (فهو أقوس وهي قوساء).

**قَوَّسَ الشَّيْئُ**: شتەکە کەوانەیی بوو، چەمایەوە ◊ دەگوترێ:

**قَوَّسَ الشَّيخُ**: پیرەمێردەکە پشتی کۆم بوو

**قَوَّسَ السَّحابَةُ**: هەورەکە دایکردە رێژنەی باران.

**قَوَّسَ الشَّيْئَ**: شتەکەی وەکوو کەوانەیی لێکرد.

**تقَوَّسَ الشَّيْئُ**: بەمانا (قَوَّسَ) دێ.

**تَقَوَّسَ قَوْسَه**: کەوانەکەی لەشان کرد.

**تَقَوَّسَ الشَّيبُ فلاناً**: نیشانەی پیریی‌و موی سپی بەناو سەرو ریشی فلانکەس دا بلاو بۆوە، یان موی سپی و رەشی یەکسان بوو سەرو ریشی ماش‌وبرنج بوون.

**الأقْوَسُ**: تەپۆلکە لمبو تەبارە لمب ◊ رۆژگاری قورس‌و پڕ لەچورتم‌و نارەحەتی ◊ (لیل أقوس) شەوی زۆر تاریك.

**القَوْسُ**: کەوان؛ ئامێرێکە نیو کەوانەیی لەسەر شێوەی نیوە هیلال تیری پێ دەهاوێژرێ ◊ (ك: أقواس وقسّي) ناوی بورجێکیشە لەئاسمان، کەبریتیە لە نۆیەم بورج.

**قوس قزح**: کەوانەیەکە لەبەرزایی دا دروست دەبێ یالە نزیك زەوی باران لێدراو و هەلڕژانی باران‌و ئاو لە ئاوەڕێژەوە، لای ئاسوییشی بەرامبەر تیشکی خۆر دەبێ بەشێوەیەکی کەوانەیی‌و بەچەند رەنگی جیاجیا کەئاکامی رەنگدانەوەی تیشکی خۆر کەلە پرژو وردە بارانی هەلپرژاو دەدا پەیدا دەبێ.

**قوس النصر**: بریتیە لە کەوانەیەکی گەورە لەسەر رێگای گشتی‌و بەشێوەی کەوانەیی‌و بەگلۆپ‌و ئالای ولات دەرازێنرێتەوە بەبۆنە نیشتمانی‌و نەتەوایەتیەکانەوە، یان بەهۆی هاتنی پیاوێکی گەورەوە بۆ ئەو دەفەرە، زۆربەی کاتیش ئامازە بەو بۆنانەوە دەکرێ لەرێگای نوسینی لافیتەو شتی واوە.

**القُوسُ**: خەلوەتخانەی رەبەن‌و پیاوە ئاینییە مەسیحیەکان ◊ کۆختەی راوکەر.

**القُوسِيُّ مِن الأيام**: رۆژگاری درێژ ◊ رۆژگاری پرتەنگ‌و چەلەمە ◊ ولاتی دوور.

**القَوَّاس، والقَيَّاسُ**: وەستای کەوان دروستکەر کەوانساز ◊ کەوان لەشان، کەوانچی.

**المُقَاوِسُ**: ئەوکەسەی ئەسپ دەنێرێ بۆ پێشبڕکێ.

قلب
قالب
قيثارة
قلع
مقلاع
قفص
قماط
قنينة
قوس
مقنع
مقود
قمقم
قفاز
مقلى
قمع الخيّاط
قنديل
قوّة حَبْل
قانون
قِلادة
قمع
قمع البلّوط
قلقاس رومي
قلقاس
قمعولة
قيقب
قمريّة
قمريّة
قنّب
قنا
قمح
قنّبيط
قنطُريون
قنطريون صغير
قنديّة
قَلادة
قات
قبريوس
قمريّ
قاقلّة
قويسة
قانصة الطير
قاقم
أنقليس
قبق
قمل
قاق
قندس
قنغر
قنفذ

**المِقْوَسُ**: تیردان ◦ حەبلێکە لە شوێنی پێشبڕکێ دا ئەسپەکانی پێ ڕیز دەکرێن ◦ ئەو شوێنەی ئەسپەکان لێیەوە دەست دەکەن بەغاردان لەگۆڕەپانی پێشبڕکێ دا.

**تَقَوْصَرَ**: بڕوانە مادەی (قصر).

**القَوْصَرَةُ**: بڕوانە مادەی (قصر).

**قاضَ البناءَ قَوْضاً**: خانوەکەی هەڵوەشاند، دەشکوترێ:

**قاضَ الخيمة**: چادرەکەی هەڵوەشاند.

**قَوَّضَ البناءَ**: باڵەخانەکەی ڕوخاند ◦ دەشکوترێ:

**قَوَّضَ الصفوف والمجالِسَ**: ریزو یەکیەتیو ئەنجومەنەکانی لێك هەڵوەشاندن.

**بنى فلان ثم قوض**: فلانکەس کاری باشی کردو دوایی خراپی کرد.

**إنقاض البناءُ**: باڵەخانەکە ڕوخا ◦ دەشکوترێ: (تقوضت الصفوق والمجالس) پۆلو کۆمەڵو ئەنجومەنەکان لێك هەڵوەشان.

**إنقاض فلان**: فلانکەس هاتو ڕۆییو جێگیر نەبوو.

**القَوْط**: جەڵەبە مەڕو بزن ◦ (ك: أقواط).

**القُطَةُ**: زەمبیلەو بەرچنەی گەورە، قەرتاڵە، سەبەتە.

**القُوطَةُ**: تەماتە.

**القَوَّاطُ**: شوانی جەڵەبە مەڕو بزن.

**قاع فلان قَوْعاً**: فلانکەس پاشەوپاش کشایەوە، چووە دواوە.

**تَقَوَّعَ فلان**: فلانکەس لە ڕۆیشتن دا لەرەلەری کرد وەکوو ئەوە بەشوێنێکی چڵاێ دا بڕوا.

**تَقَوَّعَ الحِرباءُ الشجرةَ**: حیرباکە چووە سەر درەختەکە.

**القاعُ**: دەشتاییو زەوی نەرمانو دەوران دەوردراو بە کێو و گردۆڵکە ◦ کەلەهەموو لایەکەوە ئاوی بۆدێو تێیدا کۆدەبێتەوەو دوایی گیاو گژی باشی تێدا دەروێ.

**القاعة**: (قاعة الدار) بەربێلاو حەوشەی خانوو ◦ هۆڵێك جێگای خەڵکێکی زۆری تێدا بێتەوە وەکوو هۆڵی موحازەرە ◦ هۆڵی کۆنگرە ◦ (ك: قاعات).

**القُواعُ**: کەروێشکی نێر.

**قافَ أثرَهُ**: شوێن پێی ئەوی هەڵگرت بەدو ئەودا ڕۆیی ◦ (فهو قائف) ◦ (ك: قافة).

**إقتافَ أثرَهُ**: شوێن پێی ئەوی هەڵگرت.

**تَقَوَّفَ أثرَهُ**: شوێن پێی هەڵگرت ◦ بەدوی دا ڕۆیی.

**تَقَوَّفَ فلاناً**: قسەی فێری فلانکەس کرد دەرزی دادا، وتی ئاوا و ئاوا بڵێ.

**تَقَوَّفَ عليه مالَـهُ**: مامەڵەکردنی ماڵو سامانی خۆی لێ قەدەغە کرد.

**القوف**: دەگوترێ: (هو أقوف للأثر) ئەو زۆر زاناو کارامایە بەدۆزینەوەی شوێن هەڵگرتن.

**القـاف**: پیتێکە لەپیتەکانی هیجا، هەروا ناوە بۆ مووی زور قوڵکەی گەردن.

**القائِفُ**: کەسێک باش بزانێ شوێنکە هەڵگرێ بنیچەو وەچەی خەڵک بباتەوە سەریەك ٥ (ك: قافة).

**القُوفُ**: لای زووروی گوێچکە ٥ زووروی قوڵکەی گەردن ٥ دەشگوترێ: (أخذ بقوف رقبته) بینەقاقای گرت.

**القيافة**: پیشەی قیافەزانیو بردنەوەی ئەوە بۆ سەر بنیچەو باوان ٥ بەنیشانەو لێکچوون.

**قافـت الدجاجـة قوفـاً**: مریشکەکە گارەگاری کرد.

**القَـاقُ**: باڵندەیەکی ئاویی ملدرێژە ٥ درێژ یان زۆر درێژ.

**القـاووق**: تەپلەیەکی درێژە فارس لەسەری دەکەن.

**القُوقَـةُ**: کەچەڵی ٥ کەچەل ٥ باڵندەیەکە حەزی لەشوێنی وێرانەو چۆڵەوانییە ٥ کوندە بەبو ٥ ناوێکی تری هەیە پێی دەگوترێ: (أم قُوَيْق).

**المُقَوِّقُ**: کەسێک زۆربەی سەری تووکی پێوە نەبێ.

**قَوْقَأتِ الدجاجةُ**: مریشکەکە قاقای کرد گارەگاری کرد.

**قَوْقَـتِ الدجاجـة قيقـاء وقَوْقـاءً**: مریشکەکە قاقاو گارەگاری کرد بۆ هێلکە کردن.

**المُقَـوْقِسُ**: نازناوی پاشاکانی میصرو ئەسکەندەریە بوو ٥ باڵندەیەکە رەنگی سپیو رەشی کەوانەیی تێدان.

**القَوْقَـعُ**: گیانلەبەری (لافەقەرییە)، جەستە نەرمو نیانە ٥ لە وشکانیو لەناو دەریاو ئاوی شیرین دا دەژی.

**القَوْقعيـاتُ**: پێرێکن لە گیانلەبەری (لافەقەری).

**قَوْقَـلَ**: چووە سەر کێوەکەو پێیدا سەرکەوت.

**القاقُلَّةُ**: رەگەزی روەکە عەترییەکان لەپێری (الزنجبارية) ٥ لەوڵاتی هیندو چینو ئەفریقا دەروێو دەروێندرێ ٥ بەرەکەی یەکفاقە، لەعێراق پێی دەگوترێ: (حَبُّ الهال).

**القَاقُلِّي**: روەکێکی ساڵانەیەو کێوییە بەزۆری لە لبەلانی قەراخ دەریاو

ڕوبـاردا دەڕوێ ٥ پێـی دەگـوترێ: (رشاد البحر).

**قال قولاً ومقالاً**: قسەی کرد.

**قالَ عليه**: بوختانی بۆ هەڵبەست.

**قالَ عنه**: قسەی لێوەکرد.

**قالَ فيه**: کۆششی تێدا کرد.

**أَقْوَلَـهُ مـا لم يقـل**: داوای لەسـەر کـرد، شتێکی پاڵدا نەیگوتبوو.

**أَقْوَلَ فلاناً**: فلانکەسی فێری قسە کرد.

**قاوَلَـهُ في الأمـر**: دەربـارەی ئیـشەکە وتووێژی لەگەڵ دا کـردو دانوسانی ئـــەنجام دا ٥ کارەکـــەی بـــە بەڵێندەرایـەتی پێـداو قەباڵـەی لێ سـتاند بـەبڕی پـارەی دیـاریکراو لەماوەیـــەکی دیـــاریکراودا بـــۆی جێبەجێ بکا.

**قَوَّلَهُ**: قسەیەکی پاڵ دا نەیگوتبوو.

**تقـاولوا في الأمـر**: دەربـارەی کارەکـە وتووێژیان کرد.

**تَقَـوَّلَ عليـه قـولاً**: درۆی بەدەمـەوە هەڵبەسـت ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ﴾.

**التِّقوالَةُ**: زۆربلێو چەقەچەناو.

**القَـالُ**: ناوێـکە لـە (القَـوْلُ) ٥ (القـال والقيل) قسەی پوچو بێ مایە یان وتەیـەك دوژمنایـەتی لـەنێوان خەڵك دا پەیدا بکا.

**القَالَةُ**: قسەی هەڵبەستراو و بڵاوەبوو بەناو خەڵك دا چ خێر بێ یان شەڕ بێ.

**القَوْلُ**: قسە ٥ بیروباوەڕ.

**القَوْلِيَّةُ**: چەواشەکاریو غەوغایی.

**القَيْـلُ**: نـاوی پاشـایەکی یەمـەن بـووە لـەپێش ئیـسلام دا پلـەی لـەخوار پاشای گەورە بووە.

**القِيلُ**: بەمانا (القَوْلُ) دێ.

**المَقالَةُ**: بەمانا (القولُ) دێ ٥ مەزهـەبو ڕێبـــاز ٥ نووسینێـــکی کورتـــە لەبوارێـکی زانیـاری دا لـە ڕۆژنامـە یان گۆفارێـك دا بڵاو دەکرێتەوە.

**المَقـــاوِلُ**: بەڵێنـــدەر بـــۆ ئەنجامـــدانی کارێـــکی دیـــاریکراو بەچـــەند مەرجێکی دیاریکراو بـەبڕێ پـارەی دیاریکراو و ماوەیەکی دیاریکراو.

**المُقَاوَلَةُ**: بەڵێندەرایەتی؛ گرێبەستێـکە لەنێوان دوولایەن لایەنێکیان بەڵێن دەدا بـە لایەنەکـەی تـر کەکارێـکی تایبەتیو دیاریکراوی بۆ ئەنجام بدا لـــەبای بڕەپارەیـــەکی دیـــاریکراو کەوەری دەگرێ لەجیاتی کارەکەی.

**المِقْـــوالُ**: زۆربلێـــو چەقەچـــەناو و زمانلووس ٥ زوبان.

**القولنج**: بڕك ٥ کۆڵنج: نەخۆشـیەکە

هەرکەسێك گیرۆدەی ببێ بەناخۆشی پیسایی بۆدەکرێو باو و بژی بۆ ناکەندرێو ورگی بۆ خاڵی ناکرێتەوە.

**القولون:** ڕیخۆڵە ئەستورە.

**قام قَوْماً وقياماً:** ڕاست بۆوە، هەڵسایە سەر پێ.

**قام الأمرُ:** کارەکە ڕێکبوو ٥ دەشگوترێ: (قام میزان النهار) ڕۆژ بوو بەنیوە ٥ خۆر گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان.

**قام قائم الظهيرة:** کاتی ئەوە هات خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابدا.

**قام الماءُ:** ئاوەکە وەستاو دەراوی ڕەوان بوونی نیە.

**قامَ الحقُ:** حەق‌و ڕاستی جێگیر بوون‌و چەسپان.

**قامَ على الأمر:** لەسەر کارەکە بەردەوام بوو.

**قامَ للأمر:** سەرو کاری ئیشەکەی کرد.

**قامَ على أهله:** ماڵ‌و خێزانی خۆی بەخێوکردو سەرو کاری کردن.

**قامَ المتاعُ بكذا:** کاڵاکە نرخی لەسەر ئەوەندە وەستا ٥ دەشگوترێ:

**قامَ يفعل كذا:** دەستی بەکارەکە کرد.

**أقامَ بالمكان:** لەشوێنەکەدا جێگیر بوو کردییە نیشتمانی خۆی.

**أقامَ فلاناً من مكانه:** فلانکەسی لەشوێنی خۆی لابرد.

**أقامَ الشيْءَ:** بەردەوامی بەشتەکە دا ٥ دەستی کرد بەوە شتەکە ئەنجام دا ٥ دەگوترێ: (أقامَ الصلاةَ).

**أقامَ للصلاة:** بانگەوازیی کرد بۆ ئەنجامدانی نوێژ.

**أقامَ العودَ والبناءَ:** دارەکەی ڕاست کردەوە، دیوارەکەی ڕاست کردەوەو خواریی تێدا نەهێشت.

**أقام الشرعَ:** شەریعەتی ئاشکرا کردو کاری پێ کرد.

**قاوَمَهُ في المصارعة وغيرها:** ڕاپسکوت بۆ زۆرانبازیی.

**قَوَّمَت الشاةُ:** مەڕەکە توشی نەخۆشی قاچ ئیفلیجی بوو.

**قَوَّمَ المُعْوَجَّ:** خوارییەکەی ڕاست کردەوەو خواریی تێدا نەهێشت.

**قَوَّمَ السِّلْعَةَ:** کاڵاکەی نرخ دارکرد ٥ نرخی بۆ دیاریی کرد.

**تَقَوَّمُوا في الحرب:** لەشەڕدا هەندێ لەخەڵکەکە بۆ هەندێکیان ڕاپسکوتن.

**تقاوموا الشَّيْءَ فيما بينهم:** لەناو خۆیان دا نرخیان بۆ شتەکە دانا.

**تَقَوَّمَ الشَّيْءُ:** شتەکە ڕاست بۆوە ٥ نرخی دەرکەوت.

**إستقام الشَّيْءُ:** شتەکە ڕاست بۆوە.

**التقويم:** حیسابگەری زەمەنە بەساڵو بەمانگو بەڕۆژ و بەسەعات.

**تقویم البلدان:** دیاریکردنی شوێنی شارەکانو دیاردەکانیان.

**القائم:** (قائم السیف) دەسکی شمشێرو ئەو شوێنەی دەستی پێ دەگیرێ ٥ (دینار قائم) دینارێکی یەکسانە کێشەکەی کەمو زیادی تێدانیە.

**قائم الماء:** تەنکی ئاو کەلەشوێنی بەرز دابندرێ بۆئەوەی ئاوی لێوە دابەش بکرێ.

**القائمة من السیف:** دەسکی شمشێر ٥ لیستو ریزبەند کردنی چەند ناوێك.

**القَامَةُ من الإنسان:** بالای مرۆڤ ٥ ئامێرێکی پێوانەیە ئەندازەی درێژی شەش پێیە بۆ دیاریکردنی قوڵی دەریاکان بەکاردێ ٥ (ك: قامات).

**القُوَامُ:** نەخۆشییەکە توشی قاچی وڵاخ دەبێو ئیفلیجی دەکا، وڵاخەکە دەیەوێ بڕواو قاچەکانی لەدوی نایەن.

**القَوامُ:** عەدڵو داد خوازی ٥ (رمح قوام) رمبێکی ڕاست.

**قَوام الإنسان:** بالای مرۆڤو جوانی قەدو بالا.

**القِوامُ:** (قِوام کل شيء) کۆڵەکەو ڕاگری شتو پاساو ڕێسای بژێوی مرۆڤ؛ ئەوەی دەبێتە قوتو جەستەی بەهێز دەکا.

**قوام الأمر:** ڕاگری کارو سەرجەمسەری شت ٥ دەگوترێ: (هو قِوام أهل بیته) ئەو سەرپەرشتیارو ڕاگرو بەرێوەبەری کارو باری ماڵو منداڵی خۆیەتی.

**القِوامَةُ:** سەرپەرشتیاریی، کار بەدەستەوە گرتن.

**القوم:** نەتەوە ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد تایبەتمەندییەك کۆیان بکاتەوە ٥ وایش دەبێ بەمانا کۆمەڵێك پیاو دێ وەکوو لەشیعرەکەی زوهەیردا هاتووە دەڵێ:

(وما أدري وسوف إخال أدري
أقَوْمٌ آلُ حصن أم نِساءُ).

**قوم الرجل:** خزمو کەسو کاری پیاو.

**القَوْمَةُ:** ڕاپەڕین ٥ دەگوترێ: (قاموا قومة واحدة) ٥ بالای مرۆڤ ٥ ڕاوەستانی نێوان ڕکاتی نوێژ.

**القَوْمِيّ:** نژادپەرست ٥ نەتەوە پەرستو شۆڤینیو دەمارگیر کەسێك بڕوای بەوە هەبێ سوود بۆ نەتەوەکەی بێنێو زیانیان لێ دووربخاتەوە و لەم بوارەدا هەوڵو

کۆشــشی خــۆی بخاتــە گــەڕ ٥ نیشتمانی ٥ وەکوو دەگوترێ: (العید القومي).

**القومِیة:** پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیو سـۆزدارییە لـەئاکامی هاوبەشـی لـەبواری نیـشتمانو نـژادو زمـانو سـودوبەرژەوەندی دێتـە کایـەوەو ئاکامەکـــەی هەمئاهـــەنگیو هاریکارییە بۆ دروستبوونی گیانی یەکیەتیو تەبایی ٥ وەکوو (القومیة العربیة ، القومیة الکردیة).

**القَــوَّامُ:** بـاڵا شۆخوشـەنگ، کەسێـك بــەجوانیو لێهــاتویی کارەکــانی ئەنجام بدا.

**القَیم:** میانڕەو ٥ باڵاجوان.

**القِیام:** (قیام الأمر) ڕاگری کارو بڕبڕەی شت.

**القیامة:** سەروکاری کردنی ئیشو کار ٥ ڕۆژی ڕەسـتاخیزو زیندوبوونـەوەی مـەخلووقات بـۆ حیـسابو پاداشو سزا.

**القیمة:** (قیمة الـشّيء) ئەنـدازەی شت ٥ بەهاو نرخی کاڵا.

**قیمــة الإنــسان:** درێــژی مــرۆڤ ٥ دەشــگوترێ: (مــا لفــلان قیمــة) فلانکــەس بــەردەوامی لەســەر کارەکان نیەو ڕاڕایە.

**القَیّوم:** چاودێرو باڵادەستو پارێزگار بەسـەر هـەموو شتێـك دا ٥ ناوێـكە لەناوە جوانەکانی خودا.

**القَــیِّمُ:** گــەورەو پیــاو مــاقوڵ ٥ بەڕێوەبــەرو هەڵـسوڕێنەری کـار ٥ کەسێك سەرپەرشتیاری دەستگیراوو حیجر لەسەر دانراو بکا.

**قَیِّم القوم:** ڕابەری گەلو نەتەوە.

**أمر قَیِّم:** کاری ڕاستو ڕێكو پێك.

**کتاب قَیِّم:** کتێبی بەنرخ.

**القَیِّمَةُ:** (الأمة القَیِّمـةُ) گەلو نەتـەوەی عەداڵەتکارو کار دروست.

**المَقَــامُ:** شـوێنی لێ ڕاوەسـتان شـوێنی وەسـتانی قـاچ ٥ یانـەو مـەجلیس ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

**المَقامَــةُ:** کۆمەڵێـك ئـادەمیزاد ٥ یانـەو مـەجلیس ٥ خوتبـەو ئامۆژگـاریی ٥ چـیرۆکی کـورتو سـەجعدار کـە ئامۆژگـاری یـان نوکتـەیـەکی خۆشـی تێـــدابێ ٥ لــــە ڕۆژگـــاری عەباسییەکانو لەوەدواش نووسـەرو ئەدیبـەکان کارامـایی خۆیـان تێـدا بەتاقی کردۆتەوە.

**المُقَــامُ:** نیـشتەجێ بـوون، مانــەوە ٥ شوێنی مانەوە.

**المُقَامَةُ:** بەمانا (المُقامُ) دێ.

**المِقْوَمُ:** دەسـتەدوو؛ ئـەو دارەی جوتیـار

لەکاتی جوتکردن دا دەستی پێوە دەگرێ.

**القَوْنَةُ**: پارچەیەك لەئاسن یان لەزەرد کە پینەی قاپو مەنجەڵو شتی وای پێ دەکرێ.

**القـاوون**: ڕوەکێـکی ساڵانەیە لـەپێری ڕەگـەزی کولەکـە، بەرەکـەی زەردو شـیرینو تـام خـۆشو بۆنخۆشـە، بـەکوردی پێـی دەگـوترێ شـەمامە یان کاڵەکەزەردە.

**قَوَّه بصاحبه**: بانگی هاوەڵەکەی کرد.

**قَوَّه بالـصید**: هەرای لەنێچیرەکە کـرد بۆئـــەوەی لەلانەکـــەی خـــۆی ڕاپەڕێنێو فرسەتی لێ بێنێ.

**تقـاوه الـرجلان**: دووپیاوەکـە لێـکیان ڕاخـــوڕی بەشـــێوەیەك کەتـــەنها خۆیـان دەیـانزانی مەبەسـتیان لـەو هەرایە چیە.

**القاهُ**: شانسو بەختو حورمەتو ڕێـز ◦ ژیانی نەرمو نۆڵ ◦ دەگوترێ: (إنه لفي عيش قاهٍ).

**القـــاهي**: پیاوێـــك نـــەزۆك نـــەبێو بەزرویێت بێ.

**القَوهَـةُ**: ماستێـك کەمێـك گۆڕابـێو هێـشتا شـیرینی شـیرەتیەکەی تێـدا مابێ.

**القُوهي**: جۆرە پۆشاکێـکی سپییە.

**قَوِيَ على الأمر**: توانای بەسەر کارەکەدا شکا.

**قَوِيَ قَوىً**: زۆری برسی بوو.

**قَوِيَ المَطَرُ**: باران نەباری وەستایەوە.

**قَوِيَ الحَبْلُ والوَتَرُ**: حەبلەکـە یـان ژێیەکە هەندێـکی لەهەنـدێکی ئەستوورتر بوو ◦ (فهو قَوٍ).

**قويت الدار قوىً وقوايةً**: خانوەکە خاڵی بوو.

**أقوى الرجلُ**: پیاوەکە هـەژار کـەوت ◦ چووە چۆڵەوانیو لەوێدا نیشتەجێ بـــوو ◦ خـــواردنی نـــەماو تێـــشوی بڕایەوە ◦ برسی بوو هیچی لانـەبوو بیخوا.

**أقوت الدار**: خانوەکە خاڵی بوو.

**أقـــوى في الـــشِّعرِ**: بزوێنـــی ڕەوی (ژێروبـــۆری) ڕەهـــای لەشـــیعردا بەپێچەوانە بەکارهێنا.

**أقـــوى الحَبْـــلَ أو الـــوتر**: هەندێـــکی لەحەبلەکـــە یـــان لـــە ژێیەکـــەی ئەستورتر کرد لەوی تری.

**قاوَيـتُ فلانـاً**: لـەهێزو توانـادا بەسـەر فلانکەس دا زاڵ بووم.

**قَوّى الرجلَ أو الشَّيْءَ**: لەشوێنی بێهێزی هێزو توانای بەخشی بەپیاوەکە یان بەشتەکە.

**إقتوى**: بووبە خاوەن هێزو توانا ◦ یـان

هێزو توانای باش بوو.

**إقتوى على فلان:** سەرزەنشتی فلانی کرد.

**إقتوى الشَّيْئَ:** شتەکەی تایبەت کرد بەخۆیەوە.

**إقتوى شيناً بشيئ:** شتەکەی گۆڕی بەشتێکی تر.

**إقتوى الشركاء المتاع بينهم:** هاوبەشەکان کاڵاکەیان خستە پرۆسەی جاڕدانو زیادکردنو مەزادەوە نرخەکەیان بەرز کردەوە تاگەیاندییانە نرخی بەرز ئەمجار یەکێکیان هەڵی گرت بۆ خۆی.

**تقاوى فلان:** فلانکەس بە برسیایەتی شەوی بەرۆژ کردەوە.

**تقاوى القومُ الدَّلوَ:** خەڵکەکە لێوی دۆڵچەکەیان کۆکردەوەو ئاویان لێ خواردەوە.

**تقاوى الشركاء المتاعَ بينهم:** بەمانا (إقتوه) دێ.

**تَقَوّى:** بوو بەخاوەن هێزو توانا.

**التقاوى:** تۆوی لۆکە، تۆوی گەنمو فولو شتی وا کە بۆکشتوکاڵ دەچێندرێ.

**القاوى:** برسی ٥ شت وەرگر.

**القاوية:** هێلکە ٥ ساڵی بێ بارانو قاتو قڕی.

**القَواءُ:** زەوی چۆڵەوانی ٥ دەگوترێ: (أرض قواء) زەوییەکە کەسی تێدا نیە ٥ (مَنزِل قواء) مەنزڵو خانوێکی چۆڵو بێ ئەنیسە ٥ زەوییەکە وشکو بێ بارانە کەوتۆتە نێوان دووپارچە زەوی باران لێ باریوەوە.

**القَوَايَةُ:** زەوی سوتەمەڕۆو چۆڵ.

**القُوَّةُ:** هێزو توانا ٥ تاڵە حەبل ٥ توانینی گیانلەبەر بۆ ئەنجامدانی کاری قورس ٥ ئەو شتەی دەبێتە کاریگەر لە جوڵاندنو لادان یان ماتکردنو چەسپاندنو لەجووڵەخستنی قەبارەیەك واتە هەر هێزێك حاڵەتی قەبارە بگۆڕێ لە جمو‌جوڵەوە بیوەستێنێ یان لە حاڵەتی وەستانەوە بیجوڵێنێ ٥ (رَجل شديد القُوى) پیاوێکی جەستە دامەزراو و تێکسمڕاو و خاوەن هێزو توانایە.

**القوات المسلحة:** فەیلەقو هێزە سەربازییەکانی دەوڵەتن لەناو دەریاو وشکانیو حەوا.

**القَوِيُّ:** ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ پیتەکانی هیجا جگە لە جۆرەکانی لین ٥ خاوەن هێزو توانا.

**القُوَيُّ:** جوجك کە یەکەمجار سەر لە هێلکە دەردێنێ.

**القِيُّ**: زەوی دەشتی کاکی بەکاکی هیچ تێدا نەڕواو.
**المُقْوی (بلد مُقْوٍ)**: وڵاتێکە بارانی لێ نەباریوە.
**قاء ما أكَلَ قَيْئاً**: ئەوەی خواردبوی هێنایەوە.
**قاءت الطَّعنة الدم**: زەبرەکە خوێنی هێنایە دەر.
**قاءَتِ الأرضُ ما حوت**: زەوی چی تێدا بوو خستیە سەر پشتیو دەری خست ٥ دەشگوترێ: (قاءت الأرض الكمأة) زەوی قاچکی دەرداو خستیە سەر پشتی.
**ثوب يقيئ الصِّبغ**: قوماشێکە ڕەنگی تێرەو چاك ڕەنگەکەی هەڵمژیوە.
**أقاءَهُ**: وای لێ کرد بڕشێتەوە.
**قَيَّأَهُ هو أو الدَّواءُ**: ئەو یان دەرمانەکە ڕشاندییەوە.
**تَقَيَّأ**: بەئەنقەست خۆی ڕشاندەوە.
**إستقاءَ واسْتَقْيَأ**: بەمانا (تَقَيَّأ) دێ.
**القَيْءُ**: ئەوەی مەعیدە دەری دەداتە دەرەوە لەدەمەوە.
**القَيُوءُ**: کەسێك زۆر بڕشێتەوە ٥ دەرمانێك کە دخورێتەوە ڕشانەوە دروست دەکا ٥ دەگوترێ: (شربت القيوء فما قَيَّأني).
**المُقَيِّئُ**: دەرمانێکە دەبێتە هۆی ڕشانەوە.
**القُيَاءُ**: زۆر ڕشانەوە بەهۆی نەخۆشیو شتی وا.
**القيثارُ والقيثارَةُ**: کەمان؛ ئامێرێکی مۆسیقایە شەش ژێی لێ بەستراوە.
**أقاحَ الجُرحُ قَيحاً**: بەمانا (قاحَ) دێ.
**أقاحَ الرجلُ**: پیاوەکە سوور بوو لەسەر ئەوە کە هیچ نەدا بەسواڵکەر پاش ئەوەی داوای بەخشینی لێ کرا.
**قَيَّحَ الجرحُ**: بەمانا (قاحَ) دێ.
**القَيْحُ**: کێمو زوخاو.
**قادَه قَيْداً**: زنجیری کرد ٥ پێوەندی لەقاچ کرد.
**قَيَّدَهُ**: بەمانا (قادَهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (قيّده بالإحسان) بەچاکە کردنو پیاوەتی لەگەڵ دا کردن کۆتو زنجیری کردەوە.
**قَيَّدَ التَعَبُ فلاناً**: ماندوبوون و شەکەتی: بووە لەمپەر لە بەردەم فلان دا. دەشگوترێ: (ناقة مقيّدة) حوشترێکی ماندو وشەکەتە ناتوانێ هەستێ.
**قَيَّدَ العلم بالكتاب**: زانیارییەکەی چەسپاندو زەبتی کرد.
**قَيَّدَ الخَطَّ**: خەتو نووسینەکەی خاڵدار کرد، خاڵی خستنە سەر پیتەکان.
**قَيَّدَ الشَّيْءَ في دفتر**: شتەکەی لە

دەفتەرەکەیدا تۆمار کرد.

**تَقَيَّدَ**: بۆ موتاوەعەی (قَيَّدَ) هاتووە.

**القادُ**: ئەندازە ٥ دەگوترێ: (بينهما قاد رُمح) نێوانیان ئەندازەی ڕمبێکە.

**القِيادُ**: حەبلی هەوسار، ڕێشمە.

**القَيْدُ**: حەبلێکە یان شتێکی لەو جۆرە دەکرێتە پێوەند بۆ قاچی وڵاخو شتی وا بۆئەوەی نەتوانێ زۆر بجوڵێ ٥ دەشگوترێ: (فرس قيد الأوابد) ئەسپێکە خۆشڕۆیە پێوەندی حەیوانە وەحشییانە هیچ جانەوەرێکی کێوی لەبەری دەرناچێ ٥ ئەندازە ٥ دەگوترێ: (بينهما قيد رمح) نێوانیان ئەندازەی ڕمبێکە.

**قيود الأسنان**: پوك.

**القِيْدُ**: ئەندازە ٥ دەگوترێ: (بينهما قيد رمح).

**المُقَيَّدُ**: باریکایی قاچ، زوور قاپەڕەقە، شوێنی تێکردنی خرخاڵو پاوانە ٥ شوێنی لێ بەستنی پێوەندی قاچی وڵاخ کەدەکەوێتە زوور سمییەوە.

شیعرێك لە چوار چێوەی کێشی عورووزی دا هۆنرابێتەوە لایەنی وەزنو سەراوای تێدا بەرچاوگیرابێ ٥ هەروا ناوە بۆ شیعرێك پیتی ڕەوییەکەی ساکن بێو حەرفی مەد نەبێ وەکوو شیعرەکەی رۆبة کە دەڵێ: (وقاتم الأعماق خاوي المخترق).

**قَيَّرَ السفينة وغيرها**: کەشتییەکە یان شتی تری بەقیر سواخ دا.

**القار**: قیر ٥ زفت.

**القِيرُ**: بەمانا (القارُ) دێ.

**القَيْرَوان**: زۆربەی کەتیبەی سوپا ٥ کاروان ٥ کۆمەڵێك ئەسپ ٥ شارێکە لەوڵاتی مەغریب لە کیشوەری ئەفریقا.

**القَيَّارُ**: خاوەن قیر ٥ قیر فرۆش ٥ قیرچی.

**قاسَ الشَّيْئَ بغيره وعلى غيره قيساً وقياساً**: شتەکەی لەسەر ئەندازەی ئەو بەئەندازەی ئەو مەزندە کرد.

**قاس الطبيب الشَجَّةَ قَيْساً**: پزیشك قوڵی برینەکەی مەزندە کرد.

**قايَسَ الشَّيْئَ قياساً ومقياسةً**: شتەکەی مەزندە کرد.

**قايَسَ الشَّيْئَ بكذا**: شتەکەی بەئەو شتە مەزندە کرد.

**قَايَسَ فلاناً الى كذا**: پێش فلانکەس کەوت بۆ ئەو شوێنە.

**قَيَّسَ الشَّيْئَ بغيره**: شتەکەی بەشتێکی تر مەزندە کرد.

**إقتاسَ الشَّيْئَ بغيره وعليه**: شتەکەی

بەئەندازەی ئەو یان لەسەر ئەندازەی ئەو مەزەندە کرد.

**قَاسَ بأبيه**: ڕێبازی باوکی گرتەبەر.

**إنْقاسَ**: بۆ موتاوەعەی (قاس) دێ.

**تقايسَ القومُ**: خەڵکەکە داخوازییەکانیان خستنە ڕو.

**القاسُ**: ئەندازە ٥ دەگوترێ: (بینهما قاس رمح).

**القياسُ**: پێک گرتن ٥ گەڕاندنەوەی شت بۆ هاوشێوەی خۆی ٥ لەزاراوەی شەرع دا هێنانی حوکمی ئەصلێک کە عیللەتو بایسی خۆی هەبێ، سەپاندنی ئەو حوکمە بۆ شتێکی تر کە فەرعە لەبەر هەبوونی هاوبەشی نێوان ئەصڵو فەرعەکە لەعیللەتو بایس دا وەکوو حوکمدان بەیاساغی بیرەو شتی وا بەیاسای قیاسکردنی بۆسەر خەمر لەم ڕووەوە بیرەکەش وەکوو خەمر سەرخۆش کەرە.

**القَيسُ**: تەنگانە ٥ هەروا وشەی (قیس) ناوە بۆ هۆزێکی عەرەبی موزەری ٥ (أم القيس) دالاش، هەڵۆ.

**القَيَّاسُ**: کەسێک پیشەی ئەوە بێ زەوی‌و شتی وا بپێوێ، ڕوپێو.

**المِقْياسُ**: ئەندازە، ئامێری پێوانەو مەزەندەکردن.

**قاصت السِّنُّ قَيْصاً**: ددانەکە کەرت بوو لەقی، لەبن ڕا جوڵا.

**قاصَ البطنُ**: ورگەکە جوڵا.

**إنقاصتِ السِّنُّ**: ددانەکە شکا.

**إنقاصَ البناءُ والبئرُ والرملُ**: باڵەخانەکە، بیرەکە تەبارە لمبەکە ڕوخا.

**القَيْصَرُ**: نازناوی پاشاکانی ڕۆم‌و ڕوسیایە ٥ (ك: قياصرة).

**قاضَ الشَّيْئُ قَيْضاً**: شتەکە شەق بوو.

**قاضَ الجدارُ**: دیوارکە ڕوخا.

**قاضت السِّنُّ**: ددانەکە لەقی، جوڵا.

**قاضَ الفرْخُ البيضةَ**: جوچکەکە هێلکەکەی شکاندو سەری لێ دەرهێنا.

**قاضَ فلاناً بالشيئ**: لەجیاتی شتەکە فەرەبوی بۆ کردەوە.

**قايَضَ فلاناً قياضاً ومقايَضَةً**: لەگەڵ فلانکەس دا کاڵای بەکاڵا گۆڕییەوە.

**قَيَّضَ الله لە كذا**: پەروەردگار ئەو شتەی بۆ ئامادەکرد.

**قَيَّضَ الله فلاناً لفلان**: خودا فلانکەسی بۆ فلانکەس ڕەخساند.

**إقتاضَ الشَّيْئَ**: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا.

**إنقاضَ الجدارُ أو الكثيبُ**: دیوارەکە یان تەبارە لمبەکە ڕوخا، یان درزی برد، شەقی برد.

إنقاضت الركية أو السِّنُ: بیرەکە داڕوخا ٥ ددانەکە داخورا.

إنقاضت البَيضَةُ: هێلکەکە درزی بردو نەشکا، تێك نەقپا.

القَيْضُ: توێکڵی سەرەوەی هێلکە (توێکڵە وشکەکە) ٥ بەرامبەرو یەکسان ٥ دەگوترێ: (هذا قيض هذا) ئەمە هاوشانو یەکسانە بۆ ئەو شتە ٥ (هما قيضان) ئەو دووانە چونیەکن.

القِيضَةُ: پارچە ئێسقانی بچوك ٥ (ك: قِيَضٌ).

القَيِّضُ: یەکێك لەو دووکەسەی کالآ بەیەك دەگۆڕنەوە ٥ بەردێکی بچوکی خڕە گەرم دەکرێو حوشترو مەڕو بزنی پێ داخ دەکرێن بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی.

قاظَ یومُنا قَیْظاً: ڕۆژگارمان زۆر گەرم بوو

قاظَ القوم بالمكان: خەڵکەکە لەو شوێنە لەڕۆژانی گەرم دا نیشتەجێ بوون.

قایَظَهُ مُقایَظَةً وقِیاظاً: لەگەڵیا نیشتەجێ بوو.

قَیَّظَ بموضع کذا: لەفلان شوێن نیشتەجێ بوون.

قَیَّظَ فلاناً الطعامُ أو الشوبُ: خواردەمەنیەکە یان پۆشاکەکە بۆکاتی گەرما کیفایەتی بوو.

إقتاظَ بموضع کذا: لەو شوێنەدا نیشتەجێ بوو.

القَیْظُ: جەنگەی گەرمای هاوین.

القَیْظِيُّ: بەروبوومی هاوین.

المَقِیظُ والمَقْیَظُ: هاوینەهەوار.

قاقتِ الدُّجاجَةُ قَیْقاً: مریشکەکە گارەگاری کرد.

القِیقُ: ئەحمەقو گێلو سەرکەش.

القِیقاءَةُ: زەوی توندو ڕەقو پتەو.

القِیقِیَةُ: توێکڵێکی تەنکە لەژێر توێکڵی سەرەوەی هێلکەیە.

قالَ قَیْلاً: لەکاتی نیوەڕۆدا نوست، گورگەخەوی کرد.

پێویستە لەبۆ شێخی بەیانیان کورکەخەو تابڵێن: شێخ عابیدەو نانوێ بەشەو

خواردنەوەی شیرە لەکاتی نیوەڕۆدا.

قالَ فلاناً البَیْعَ: مامەڵەی فلانکەسی هەڵوەشاندەوە.

أقالَ البَیْعَ أو العَهْدَ: مامەڵەکە یان پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

أقالَ الله عَثْرَتَهُ: خودا لەتاوانەکانی خۆش بوو.

أقالَ فلاناً من عمله: فلانکەسی لەسەر کارەکە لابرد پۆستەکەی لێ وەرگرتەوە.

أقالَ الشَّيْءَ: شتەکەی والێ کرد

تانیوەڕۆژ درێژە بکێشێ لەحەدیس دا هاتووە: (کان لایقیل المال) واتە: ماڵو سامانێك کەلەبەیانی دا دەستی دەکەوت نەیدەهێشت بگاتە نیوەڕۆ هەمووی دەبەخشی.

**قایِلَهُ**: کاڵای لەگەل گۆڕیەوە.

**قَیَّلَهُ**: لەکاتی نیوەڕۆدا ئاوی دایە بیخواتەوە.

**إقتالَ فلان**: فلانکەس لەکاتی نیوەڕۆدا ئاوی خواردەوە.

**إقتالَ شیئاً بشيئ**: شتەکەی بەشتێکی تر گۆڕیەوە.

**تقایَلَ البَیِّعان**: کڕیارو فرۆشیارەکە مامەڵەکەیان هەڵوەشاندەوە.

**تَقَیَّلَ**: لەکاتی نیوەڕۆدا نوست ٥ شلەمەنی لەنیوەڕۆدا خواردەوە.

**تَقَیَّلَ الماءُ في المنخفض**: ئاوەکە لە نزمایی دا کۆبۆوە.

**تَقَیَّلَ الناقةَ**: لەکاتی نیوەڕۆدا حوشترەکەی دۆشی.

**تَقَیَّلَ أباه**: لەباوکی چوو لەشێوەو کردەوەدا.

**تَقَیَّلَ من کان قبلە من الملوك**: وەکوو پاشاکانی پێش خۆی وابوو لەهەڵسو کەوتو ڕەفتاردا.

**إستقالَ**: داوای پۆست لێ وەرگرتنەوەی کرد، داوای ئەوەی کرد لە پۆستەکەی دەری بکەن.

**إستقاله عَثرتَهُ**: داوای کرد لەتاوانەکانی خۆش بن.

**إستقاله البیع**: داوای کرد مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە.

**القائلة**: نیوەڕۆ ٥ نوستنی دەمی نیوەڕۆ، گورگەخەو.

**القیلولة**: نوستنی کاتی نیوەڕۆ، گورگەخەو ٥ یان ڕاکشانو پاڵدانەوەو پشوی نیوەڕۆ بەبێ خەو لێ کەوتن.

**المقالُ**: قەیلولەو گورگە خەو.

**المِقیال**: (دوحة مقیال) درەختی گەورە کە لەژێریا جێگای زۆرکەس بێتەوە بۆ نووستنو پشودانی دەمی نیوەڕۆو گورگەخەو.

**المَقیلُ**: بەمانا (المقال) دی ٥ دەگوترێ: (طعنة في مقیل حقده) زەبرێکە لە سنگی دراوە سنگی هەڵدڕیوە.

**قَیَّمَ الشَّیْئَ تقییماً**: نرخی شتەکەی مەزندە کرد.

**قانَ قَیْناً**: بوویە ئاسنگەر، پیشەی ئاسنگەری ڕەچاو کرد.

**قانَ الحدیدة**: ئاسنەکەی کردە ئامێری وەکوو پاچو تەشوێو پێمەڕەو شتی وا.

**قانَ الشَّیْئَ**: شتەکەی لێکداو کۆی کردەوە.

**قانـــت المـــرأةُ المـــرأةَ**: ئافرەتـــە ئارایـــشتکەرەکە ئافرەتەکـــەی ڕازاندەوە.

**قَيَّنَـــهُ**: جـوانی کـرد ڕازاندییـەوە ە دەگوترێ:

**قَيَّنت الماشِطة العروسَ**: ئارایشتکەرەکە بووکەکەی ڕازاندەوە.

**إقتـان**: جـوان بـوو، خـۆی ئـارایش دا ە دەگـوترێ: (إقتـان الرجـل، والنبـت، والروضة).

**تَقَيَّنَ**: خۆی ئارایش دا خۆی جوان کرد ە دەگوترێ: (تَقَينت العروس، وتَقَـيَّنَ النبت).

**القَـيْنُ**: ئاسـنگەر بەتایبـەتی ە دوایـی کراوە بەناو بۆهەموو پیشەسازێـك ە هەروا ناوە بۆ کۆیلە.

**القَيْنـانُ**: زەنـدی دەسـتو قاچی ولاخو حوشـتر باریکـایی ژوور سـم؛ ئـەو شـــوێنەی پێومنـــدو شـــتی وای تێدەکرێ.

**القَيْنَةَ**: ئەمەتەو جارییـە جا وەستایی بزانـێ یـان نـا ە بـەلام بـەزۆری بەچـــەتیوە کۆیلـــەو جارییـــەك دەگـوترێ گـۆرانی بزانـێو گـۆرانی بلێ ە ئافرەتی ئارایشدەر.

**المُقَيِّنة**: ئافرەتی ئارایشکار ڕازێنـەرەوە، ئەو ئافرەتەی پیشەی ڕازاندنـەوەی ئافرەتی ترە.

**عَدَنَ** بالمكان عَدناً وعدوناً: لەو شوێنە مایەوە ◊ (جنات عدن) باخەکانی بەهەشت کە شوێنی تێدا مانەوەن بۆ هەتاهەتایە.

**عَدَنَ** البلدَ: لەو شارەدا نیشتەجی بوو.

**عَدَنَ** الأرض: سەمادی بە زەویەکەدا کرد تا کشتوکاڵەکەی باش بێ.

**عَدَنَ** الحجر: بەردەکەی هەڵکەند.

**عَدَّنَ** الأرض: سەمادی بە زەویەکەدا کرد.

**عَدَّنَ** به الأرض: بەو شتە لە زەویەکەی دا

**التّعدين**: زانیاری دەربارەی دەرهێنانی مادە خامە مەعدەنیەکان.

**العدان**: کەناری دەریا ◊ کەناری ڕوبار ◊ لە ڕۆژگاردا ماوەی حەوت ساڵە.

**العدانة**: کۆمەڵو تاقم.

**الَمعدِن**: کانی شت ◊ شوێنی دەرهێنانی ئاڵتونو زیو و شتی وا ◊ دەشگوترێ: (فلان مَعدِن الخير و الكرم) فلاٌنکەس کانی خێرو بەرەکەتو ڕێزو شکۆمەندییە، خێرو کەرەم بۆ ئەو شتێکی سرووشتییە.

**عدا** عَدواً وعُدُوّاً و تعداءً وعَدَواناً: ڕۆیی ◊ ڕەوان بوو.

**عدا** عليه عدواً وعُدُواً: دەستدرێژی کردە سەر، ستەمی لێ کرد، لەسنوور دەرچوو.

**عدا** اللصُّ على الشيئ: دز شتەکەی دزی.

**عدا** عليه: بازی دایە سەری ◊ عەمبازی بوو.

**عدا** فلاناً على الأمر عَدواً و عدواناً: فلاٌنکەسی لە ئیشەکە لاداو بە شتێکی ترەوە مەشغوڵی کرد.

**عدا** الأمر وعنه: لەکارەکە وازی هێنا.

**عدا**: حەرفی (الإستثناء)ە ئیسمی دوای خۆی مەنصوب دەکا ئەگەر بە فیعلی حیساب بکەین، دوای خۆی مەجرور دەکا ئەگەر بە حەرفی جەڕی دابنێین ◊ ئەگەر (عدا) لەدواوەی (ما) مصدريه هەبوو ئیسمەکە واجبە مەنصوب بێ دەگوترێ: (جاء القوم ماعدا محمداً).

**أعداه**: وای لێ کرد باز بدا.

**أعدى** فلاناً من مرضه أو خلقه: دەردەکەی یان ڕەوشتەکەی گواستەوە بۆ فلاٌن ◊ دەگوترێ: (أعداه بالداء وأعداه الداءَ)دەردەکەی پێوەنا، وای لێ کرد دەردی ئەوی توش بێ.

**عاداه** معاداة وعداءً: کێشەی لەگەڵ پەیدا کرد، دوژمنایەتی لەگەڵ نایەوە.

**عادى** الشيئَ: شتەکەی دوور خستەوە.

**عـادي الوسـادةَ:** سـەرینەكەی دوولا هێنایەوە.

**عـادي بين إثنين:** ئـەو دووەی خستنە پەنایـەك ٥ بـەدوا یەكـدا هێنـانی ٥ دەگوترێ: (عَدِّ عما ترى) واز لـەوە بێنە كە دەیبینی.

**عَدّیَ الـشَّيْءَ:** لـە شتەكە لایداو چووە سەر شتێكی تر.

**عَـدّیَ الشيءَ اليه:** شتەكەی ڕایی كردو ئەنجامی دا ٥ دەگوترێ:

**عدّی الرَّجُلَ أو الشيءَ الى الشاطئ الآخر مـن النهـر:** پیاوەكـە یـان شـتەكەی لەمبـەری ڕووبارەوە ڕایی كـرد بـۆ ئەو بەری ڕووبارەكە.

**عـدّی فلانـاً عـن الأمـر:** فلاّنكەسی لەكارەكـە لادا ٥ دەسـتی پـێ لێ هەڵگرت.

**إعتدی علیه:** ستەمی لێ كرد.

**إعتدی الحقَّ:** لە حـەق‌و ڕاستی لایـدا ٥ دەشگوترێ:(إعتدی عن الحق، وفـوق الحق).

**تَعـادوا:** پێـشبڕكێیان كـرد لـە بـازدان‌و ڕاكردنـدا ٥ هەندێـكیان دووژمنایەتی هەندێكی تریان كرد.

**تعـادي النوائِـبُ:** بـەڵاو كارەسـات یـەك بەدوای یەكدا هاتن.

**تعادي الشيءُ:** شتەكە یەكسان نـەبوو ٥ دەگوترێ:

**تعادي الوِساذُ وتعادی المكانُ:** سەرینەكە ڕێـك‌و پێـك نـەبوو ٥ شـوێنەكە تەخت‌و ڕێك نەبوو.

**تعـادي عنـه:** لێـی دووركەوتـەوە ٥ دەگوترێ: (تعادی ما بینهم) نێوانیان بۆشـی تێـكەوت‌و لێـك دووركەوتنـەوەو ناوانیـان گەنـدەڵ‌و خراپ بوو.

**تَعَدّی علیه:** ستەمی لێ كرد.

**تَعَدّی الشيءَ:** لە شتەكە تێپەڕی ٥ جێی هێشت.

**اسـتعداه:** داوای كۆمـەكی لێ كـرد ٥ دەگـوترێ: (اسـتعدیت الأمـیر علـی فلان) داوای یارمەتیم لـە پاشا كـرد بۆ ئەوەی بەسەر فلاّنـدا زاڵ ببم.

**ألعادي:** دوژمن ٥ (ك: عـداة) ٥ (عادیـا اللوح) دولای لەوحەكە.

**العادیة:** مێینەی (العادي)یە ٥ كۆمەڵـە ئەسپ سواری هێرش بـەر ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَالْعَادِیَـاتِ ضَـبْحًا﴾ سـوێند بـەو كۆمەڵـە ئەسـپانەی هێرش دەبـەن ٥ كۆمـەڵی مـرۆڤ كـە ئامـادە دەكـرێن بـۆ شـەڕ ٥ ئـیش‌و كارێـك مەشـغوڵت بكـا لەشـتی تـر ٥ دەگوترێ: (دفعت عنك عادیة فـلان) شـەڕو بـەڵای فلاّنكەسـم لەسـەر

لابردى ٥ (ك: عوادٍ).

**عوادي الدهر**: بەڵاو کارەساتی ڕۆژگار.

**عوادي الكرم**: ئەوەی دەڕوێندرێ لای بنکی درەختی گەورە.

**العِدي**: کەناری ڕوبارو شیوو دۆڵ ٥ غەریبو بێگانە ٥ لێك دوورو پەرتەوازە ٥ کۆمەڵێك مرۆڤی دژ بەیەك.

**العَداءُ**: ئیشو کارێك لە شتی تر لات بدا ٥ قۆناغی یەکەم لە بازدانو ڕاکردن.

**عَداء الخندق**: ناوەوەی چاڵ.

**العِداء**: نۆرەی یەکەم لە بازدانو ڕاکردن ٥ بەردێك دابنرێ لەسەر شتێكو شتەکە داپۆشێ.

**العَداوة**: دوژمنایەتی.

**العَدّاءُ**: باز هاوێژی بەهێز ج ئادەمی بێ یان ئەسپ.

**العَدوى**: گواستنەوەی نەخۆشی لە نەخۆشەوە بۆ یەکێکی ساغ ٥ بە هۆیەك لەهۆیەکان.

**العُدواء**: زەوی ڕووخەكو بی هێز ٥ ولاخی سواری کە لاوازو کورتان شڕو پەڕپووت بێ.

**عُدَوَاءُ الشغل**: کۆسپو لەمپەر لەبەردەم ئیشو کاردا.

**العَدّوان**: باز هاوێژی بەهێزو توانا.

**العُدوان**: دەگوترێ: (لا عُدوان على فلان) دەسەڵات نییە بەسەر فلاندا ٥ هۆکار نییە بۆ سزادانی فلان.

**العُدوة**: تەپۆڵكەو بەرزایی ٥ کەناریشیوو دۆڵ، پەنا شیو.

**العَدوّ**: دوژمن ٥ (ك: أعداء).

**العَدِيُّ**: کۆمەڵە خەڵكێك خۆ ئامادە دەکەن بۆ شەڕ.

**المتعدّي**: (الفعل المتعدّى) فیعلێك بۆخۆی (مفعول به) مەنصوب بکا.

**المَعدى**: دەگوترێ: (مالي عنه معدى) من لەوە لانادەمو ناچمە سەر ڕێبازێکی تر.

**المُعَدِّيَةُ**: کەڵەكو بەلەمو شتی وا کە لەکەنارێکی ڕوبارەوە پێی بپەڕیەوە بۆ کەنارەکەی تری.

**العَدَوليّة**: ئەو کەشتیو گەمیانەی نیسبەت دەدرێن بۆلای (عَدولی) لەولاتی بەحرەین.

**عَذَب** عَذباً: وازی لە خواردن هێنا لەبەر تینوایەتی زۆر ٥ دەشگوترێ: (عَذَبَ الأكل).

**عَذَب** عنه: وازی لێ هێنا.

**عَذَب** فلاناً عن الشيء: فلانکەسی لەو شتە مەنع کردو نەیهێشت دەستی بۆ بەرێ.

**عَذُبَ** الطعام والشراب: خۆراكو شەرابەکە نەوشی گیانی بوو ٥

بەخۆشیو بێ گرێ گونجاو بوون بۆ قوتدان.

أعذَبَ عنه: وازی لێ هێناو جێی هێشت ٥ دەگوترێ: (اعذِب نفسك عن كذا) نەفسی خۆت لەو شتە بگرەوە.

أعـذَبَ المـاءَ: ئاوەکـەی شـیرین کـرد ٥ دەشـگوترێ: (أعذِب ماءك وحوضك) ئاوەکەت پاك بکـەرەوە، حەوزەکـەت لە قەوزەو قوڕو قاڵ پاك بکەرەوە.

عَذَّبه: ئەشکەنجەی داو تۆڵەی لێ سەند.

عَـذَّب فلاناً عـن الـشيء: فلانکەسـی لـە شتەکە مەنع کرد.

اعتذَبَ فلان: فلانکەس بۆ مێزەرەکەی دوولفکەی کردن ٥ لـە دواوە لـە دوو لاوە لفکەی مێزەرەکەی بەردایەوە.

إستَعذَبَ فـلان: فلانکـەس داوای ئـاوی شیرینو گوارای کرد.

إسـتعذب عـن الـشيء: سەرپێـچی لـە ئەنجامدانی شتەکە کرد.

إسـتعذب الطعـام والـشراب: خـۆراكو شەرابەکەی بەلاوە گواراو خۆش بوو بە ئاسانی بۆی قووت دەچوون.

إعذوذَبَ المـاءَ رغـيره: ئاوەکەی بـەلاوە گواراو خۆش بوو.

العَـذابُ: سـزاو تۆڵـە ٥ هـەر شتێـك لەسـەر دڵو دەروون قـورسو نـاخۆش بـێ ٥ لـە حەدیسدا هاتووە (الـسَّفر قِطعَـةٌ مـن العـذاب) سەفەر بەشێکە لە عەزاب.

العَذْبُ: خواردنو خواردنـەوەی گواراو خۆش قوت چوو ٥ دەشگوترێ: (هـو عذب اللـسان وعـذب الکـلام) ئـەو مرۆڤە زمان شیرینو قسە خۆشە.

العَذَبَـة: ئـەم سـەرو ئـەو سـەری شت ٥ دەگـوترێ: (عَذَبَـة الـسوط وعَذَبَـة اللسان، وعَذَبَة العمامة) ٥ ئەو پەتەی لە ناوەڕاستـی ستوونی تەرازودایـەو تەرازووەکەی پێ هەڵدەکێشرێ.

عَذَرَ فلان عُـذراً: فـلان تـاوانی زۆر بـوون، عەیبو عاری زۆری هەن.

عَـذَرَ فلانـاً فیمـا صَـنع: پاساوی لـە فلان قبووڵ کردو لەسەر کردەوەکەی سـزای نەدا.

عَـذَرَ الغـلامَ والجاریـةَ: کـوڕو کـچەکەیان خەتەنە کردن.

عَـذَرَ العـاذور فلانـاً: نەخۆشـی بینـەخڕە تووشی فلانکەس بوو.

عَذَرَ الفرس عذراً: ئەسپەکەی لغاو کرد.

أعذَرَ: عوزری هێنایەوە.

أعـذَرَ في الـشيء: لـە شـتەکەدا کـەم تەرخـەمی کـردو زۆر بـەوردیو سوور بوون کارەکەی ئەنجام نەدا.

أعـذَرَ: زێـدە ڕۆیـی کـردو بـە دڵسۆزی ڕوبـەڕوی کارەکـە بـۆوە ٥ تـاوانو

عەیبەکانی زۆر بوون.

أعذَرَ للقوم: خواردنی خەتەنە سورانی بۆ خەڵکەکە ئامادە کرد.

أعذَرَ فلاناً فیما صَنَعَ: عوزری لەفلان لەسەر کردەوەکەی قبوڵ کرد.

أعذَرَ فلاناً من فلان: تۆڵەی فلانی لە فلان ستاند.

أعذَرَ الغلامَ والجاریة: کوڕو کچەکەی خەتەنە کردن.

أعذَرَ الفرسَ: ئەسپەکەی لغاو کرد.

أعذَرَ فلاناً في ظهره: زەبری لە پشتی فلانکەس داو ئازاری پێ گەیاند ٥ دەشگوترێ: (ضربه فأعذَرَه) زەبری لێداو ئازاری پێ گەیاند ٥ (ضُرِبَ فأعذِرَ) لێی دراو خەریك بوو بمرێ.

عَذَّرَ الغلامُ: کوڕەکە مووی لاجانگی ڕوان.

عَذَّرَ الرجلُ: پیاوەکە بە زۆرلەخۆکردنو بێ بنەما عوزری هێنایەوەو پاساوی نەبوو.

عَذَّرَ فلان: فلانکەس نانو سفرەی خەتەنە سورانی ئامادەکرد.

عَذَّرَ القومَ: خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ نان خواردنی خەتەنە سوران.

عَذَّرَ الفرس: ئەسپەکەی لغاو کرد.

إعتذر فلان: فلانکەس بووبە عوزرخوا، عوزری هەبوو.

إعتذَرَ الیه: داوای لێکرد عوزری لێ وەرگرێ ٥ دەشگوترێ: (إعتذر من ذنبه) و (إعتذر من فعله) بەڵگەی هێنایەوەو عوزرو پاساوی خۆی خستنە ڕوو بۆ ئەوەی تاوانبار نەبێ.

إعتذر من فلان: شکاتی لە فلان کرد.

إعتذر العَمامَةَ: دوولکی بۆ مێزەرەکەی لە دواوە بەردایەوە.

تَعَذَّر عن الأمر: لە کارەکە دواکەوت.

تَعَذَّر من الذنب: خۆی لە تاوانەکە ڕزگار کردو پاساوی بۆ کارەکەی هێنایەوە.

تَعَذَّر علیه الأمر: کارەکەی لەسەر گران بوو تووشی چورتمو نارەحەتی بوو.

تَعَذَّر القوم علی فلان: خەڵکەکە پشتگیری فلانکەسیان نەکردو دەورو بەریان چۆڵکردو ڕیسوایان کرد.

إستَعذَرَ الیه: عوزرو پاساوی بۆ هێنایەوە.

إستَعذَرَ من فلان: وتی کێ یارمەتیم دەدا بۆ ڕزگار بوونم لەدەستی فلان ٥ داوای لە خەڵك کرد پاساوی بۆ بهێننەوە ئەگەر سزای دا.

العاذِر: ڕەگێکە خوێنی حەیزی لێ ڕەوان دەبێ.

العَاذورُ: دەردێکە تووشی قورگ دەبێ، پێـی دەگوترێ بینـەخڕە ٥ دەشگوترێ: (لقیت منه عـاذوراً) لەوەوە تووشی شەڕو نەگبەتی بووم ٥ لـە بـواری پزیشکیدا وشـەی (العـاذور) نـاوە بـۆ ئیلتیهـابی لەوزەتەین.

العِذار: لاجانگ ٥ لایەکی ڕیش ٥ ئەو پەتـەی بەسـەر ڕوومـەتی ئەسپدا ڕایەڵ دەبێ لەکاتی لغاو کردنیدا ٥ دەشگوترێ: (خَلَـعَ فـلان عـذاره) فلانکـەس ڕیشمەی لەسـەری خۆی دامـاڵی‌و ڕوی کردۆتـە گـومڕایی‌و خراپەکاری‌و حـەیای تکاوە ٥ (لـوّی عن عِذاره) لێی یاخی بوو ٥ سفرەو خـوانی داوەتـی خەتەنەسـوران ٥ جـوت شـفرەی تـیر ٥ دەشگوترێ: (فـلان شـدید العِـذار) فلانکـەس ورەبەرزو خاوەن عەزیمەیە.

عِـذار الحـائط: ئـەم دیـو و ئـەو دیـوی دیوار.

عِذار الطریق: ئەملاو ئەولای ڕێگا.

عِذارا الوادي: ئەمبەرو ئەوبـەری شیو و دۆڵ.

عِذار من النخل والشجر والرمـل: ڕیـزە دارخورمـاو درەخـت‌و تـەبارە لم ٥ دەگوترێ: (غَرَسَ في کرمه عِذاراً مـن الـشجر) ڕیـزە درەختێـکی لـەناو باخە ترێیەکەی واند.

العُذرُ: ئەو بەڵگەی دەکرێتە پاساو بۆ کارەکە.

العَـذراء: کـچ ٥ (ك: عـذاری و عـذار) دەگوترێ: (درة عذراء) گەوهەرێکی کـون نـەکراوە ٥ (رَملَـة عـذراء) لبەلانێکە کەس پێی لێ نەناوە.

العُـذرة: کـچێنی ٥ بینـە خـڕە، هەوکردنی لەوزەتەین ٥ ناوچەوان ٥ یاڵی ئەسپ ٥ کۆمەڵە قژ ٥ گودڵەی قژی سەر.

العَذِرَةُ: گو و پیسایی ٥ (عَـذِرَة الـدار) بەر بێلای خانوو.

العُذريُ: (هوی العُذري) عیشقی خاوێن ٥ کـە ئـەم جـۆرە سـۆزو عیـشقە نیسبەت دەدرێ بۆ خێڵی عەزرە کە بەم عیشقە بەناوبانگ بوون.

العَذیرُ: پاساو هێنەرەوە ٥ یارمەتیدەرو کارێـك کە ئـەنجامت دا پاساوی بـۆ بهێنیەوە ٥ دەگوترێ: (عَـذیرَكَ مـن فلان) کەسێـك پەیدا بکە پاساوت بۆ بێنێتەوە لای فلان ٥ (من عذیري من فـلان؟) کـێ پاساوم بـۆ دێنێتـەوە ٥ دەربـارەی فلانکـەس ئەگـەر لەسـەر کردەوەکەی بمەوێ سزای بدەم؟

المَعْـذِرُ: بەڵـگەو پاسـاو ٥ (ك: معـاذر ومعاذیر).

**عَذَفَ** من الطعام والشراب عَذفاً: شتێکی له خواردن‌و خواردنه‌وه‌که دەستکه‌وت ◦ (فهو عاذف).

**العَذوف**: خواردنی که‌م ◦ ده‌گوترێ: (ما ذقت عذوفاً) هیچم نه‌چه‌شتووه.

**عَذَقَ** النخلة عذقاً: پرژو پالی دارخورماکه‌ی بری.

**عَذَقَ** فلاناً الی کذا: فلانکه‌سی نیسبه‌تدا بۆ فلانه شت ◦ ده‌گوترێ: (عَذَقَهُ بِشرٍ أو قبيح) نیسبه‌تی دا بۆ شه‌ڕو خراپه‌کاری تاپێی ناسرا.

**عَذَّقَ** النخلة: به‌مانا (عَذَقها)دێ.

**العَذقُ**: لقه دار خورما به‌خورماکه‌یه‌وه ◦ (ك: عِذاق وأعذق).

**العِذقُ**: هه‌موو لقه دره‌ختێك که په‌لوپۆی هه‌بن ◦ هێشوه ترێ ئه‌گه‌ر بۆڵه ترێیه‌کانی لێ کرابنه‌وه‌و خورابن ◦ (ك: أعذاق وعذوق) ◦ هه‌روا وشه‌ی (العِذق) به‌مانا شکۆمه‌ندی‌و پیاوه‌تی دێ، ده‌گوترێ: (في بني فلان عِذق كهل) خێڵی فلان شکۆمه‌ندی‌و پیاوه‌تیان دێرین‌و ڕه‌سه‌ن‌و ڕیشه داکوتراوه‌و له‌و به‌هایانه‌دا گه‌یشتونه هه‌ره پله‌ی به‌رز.

**العَذِقُ**: زمان ڕه‌وان‌و قسه‌خۆش، قسه‌زان ◦ (طيب عَذِق) بۆنێکی خۆش.

**العِذقَةُ**: نیشانه‌یه، ڕه‌نگێکه له مه‌ڕ ده‌درێ بۆ نیشانه کردنی جیا له ڕه‌نگی خورییه‌که‌ی.

**عَذَلَه** عذلاً وعَذَلاً: لۆمه‌ی کرد ◦ له په‌ندی پێشیناندا هاتووه: (سبق السيف العَذلَ) شمشێر پێش سه‌رزه‌نشتکردن که‌وت ◦ بۆ شتێك ده‌گوترێ له‌کیس چوبێ‌و چاری نه‌کرێ.

**عَذَّلَهُ**: زێده ڕه‌وی کرد له سه‌رزه‌نشتکردنی دا.

**إعتَذَلَ**: سه‌ر زه‌نشتکردنه‌که‌ی قبوڵ کرد.

**إعتذل اليومُ**: ئه‌مرۆ زۆر گه‌رم بوو.

**إعتَذَلَ على الشيء**: بڕیاری دا له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی شته‌که.

**تعاذلوا**: هه‌ندێك له خه‌ڵکه‌که سه‌رزه‌نشتی هه‌ندێکی تریان کرد.

**تَعَذَّلَ**: قبووڵی لۆمه‌کردنه‌که‌ی کرد.

**العاذِلُ**: ده‌مارێکه خوێنی (ئیستیحاضه)ی لێوه دێ.

**العُذلَةُ**: که‌سێك زۆر لۆمه‌ی خه‌ڵك بکا.

**عَذا** البَلَدُ عَذواً: وڵاته‌که ئاو و هه‌وای خاوێن بوو.

**إستعذى المكانَ**: شوێنه‌که‌ی پێ خۆش

بوو ئاو و هەوای لەگەڵ سروشتی ئەودا گونجاو بوو.

**العَذَاة**: زەوی خاوێن‌و بەپیت‌و گونجاو بۆڕووەك‌و درەخت تێدا رواندن ٥ دوور لەئاوو هەوای میكرۆباوی‌و پەتا ئامێز ٥ (ك: عذوات).

**العـذِيُ**: كشتوكاڵێك كە بەباران ئاوبدرێ‌و بەس ٥ هەرشوێنێك شۆرەخاك نەبێ‌و رووەكی حومضی تێدا نەبێ.

**المَعَذيَّة**: زەوی پاك‌و خاوێن‌و گونجاو بۆ كشتوكاڵ‌و ئاو و هەوا سازگار.

**عَرِب عَرَباً**: زوبانی بۆ عەرەبی راست بووە خواری‌و لەنگی تێدا نەما.

**عَرِبَـت المعـدة**: گەدەی داوەشا ٥ لەحەدیس دا هاتووە دەڵێ كابرایەك هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) عەرزی كرد (إن إبـن أخـي غـرِبَ بطنُـهُ) برازاكەم گەدەی تێكچووە، پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: (إسقه عسلاً) هەنگوینی دەرخوارد بدە.

**عَرِبَ** فلان: فلانكەس گەدەی ترشا.

**عَرِبَ** الجرح: برینەكە كیم‌و زوخاوی لێ پەیدا بوو هاوسا ٥ دوای چاكبوونەوەی برینەكە شوێنەواری مایەوە.

**عَرِبَـت** المـرأة: ئافرەتەكە خۆی لای مێردەكەی خۆشەویست كرد.

**عَرِبَ** الماءُ: ئاوەكە صاف بوو.

**عَـرِبَ** النهـرُ ونحـوه: رووبارەكە ئاوی زۆر بوو.

**عَرُبَ عُرْباً** وعروبة وعروبية: زوبانی ڕەوان بوو لەنگی تێدا نییە ٥ دەشگوترێ: (عَرُبَ لسانه).

**أعرب** فلان: فلانكەس زمانی فەصیح‌و ڕەوان بوو لەزمانی عەرەبی داو خۆشی عەرەب نەبوو.

**أعرَبَ** الكـلام: قسەكەی رونكردەوە ٥ بەشێوەیەك قسەی كرد كە یاسای نەحوی تێدا ڕەچاو كردبوو.

**أعرَبَ** بمراده: مەبەستی خۆی بەشێوەی ڕێك‌و پێك دەربڕی.

**أعـرب** عـن حاجتـه: پێداویستییەكانی خۆی بەباشی دركاندن.

**أعـرب** الأسـم الأعجمـي: ناوە بێگانەكەی بە شێوەی عەرەبی گوت ٥ یاسای زمانی عەرەبی بەسەردا چەسپاند.

**أعـربَ** في البيـع: لە مامەڵەكەدا عەرەبون‌و پێشەكی دا.

**عَـرَّبَ** المشتري: كڕیارەكە پێشەكی شتەكڕدراوەكەی دا.

**عَرَّبَ** عن صاحِبه: لەجیاتی هاوەڵەكەی قسەی‌كردو بەڵگەی هێنایەوە.

**عَرَّبَ** لسانَهُ: زوبانی ڕەوان بوو بەباشی

مەبەستی خۆی گەیاند.

عَرَّبَ الكلام: قسەکەی ڕونکردەوە.

عَـرَّبَ فلانـاً: فلانکەسـی فێـری زمـانی عەرەبی کرد.

عَرَّبَ الأسم الأعجمي: نـاوە بێـگانەو عەجەمییەکـە بەشـێوەی زمـانی عەرەبی گوت.

عَرَّب منطقه: شێوە نوتـق‌و قسەکردنی خۆی لە خواری‌و خێچی پاککردەوە.

عَرَّب فلاناً: قسەکانی فلانکەسی بـەلاوە ناشـیرین بـوو بەرپەرچـی دایـەوە ٥ دەشکوتریٚ:

عَـرَّب عليـه: قـسەکانی ئـەوی بـەلاوە ناشیرین بوو.

تَعَرَّبَ: خـۆی بەعـەرەب شوبهاند ٥ لـە سـاراو هۆبەلادێیەکانـدا نیـشتەجێ بـوو، خـۆی کـرد بـە عــەرەبی سارانشین.

تَعَرَّبَـت المـرأة: ئافرەتەکـە خـۆی لای مێردەکەی خۆشەویست کرد.

إستَعْرَبَ: خـۆی کـردە عـەرەب‌و خـوی ئـەوانی گـرت‌و خـۆی بەعــەرەب لەقەڵەم دا.

الأعـراب: عـەرەبی‌و دەشـتەکی، ئـەو عەرەبـە خێڵەکیانـەی کـە بـەدوا لــەوەڕو ئــاو بــۆ ئاژەڵــەکانیان دەگەڕان.

الإعــراُب: گۆڕانکارییەکـە دەکەوێتـە سـەر کۆتـایی وشـە عەرەبییـەکان جارێـــك مـــەرفوع‌و دەمێـــك مەنصوب‌و جەلێك مەجرور دەبن.

التَعريب: راستەو پاستەکردنی وشـە نـا عەرەبیـــەکان بەشـــێوەی وشـــە عەرەبیـــەکان کاتێـــك لـــە شـــێوە ئەجنەبیەکەیـــەوە دەگوازرێتـــەوە بۆناو زمانی عەرەبی.

العاربة: عەرەبی رەسـەن‌و خـالیص کـە رەچـــەڵەکی بەســـاغی مابێتـــەوەو بێگانەی تێـکەڵ نـەبووبیٚ ٥ چـەند هـۆزو خێڵێـــکن دوابـــڕاو بـــوون‌و لەناوچـوون، وەکـوو گـەلی عـادو ئەمود طەسم‌و جەدیس ٥ بەمانـە دەگوتریٚ عەرەبی بائیدە

العِـرابُ: ئەسـپی عـیراب پێـچەوانەی ئەسپە بەرازینەیە.

العَـرَبُ: گـەلی عـەرەب سـامی نـژادن ٥ زێـدو مەڵبەنـدی کـۆن‌و ئەصـلیان نیـوە دورگـەی عەرەبییـە لـەوێوە پـەلیان هاویـشتوە بـۆ وڵاتـی تـر ٥ زۆربەی وڵاتە عەرەبیـەکانی ئـەمڕۆ لـــە بناغـــەدا ناعـــەرەبن‌و لـــەدوا فتوحـــاتی ئیـــسلامی وردە وردە نـــەژادو زمـــانی خۆیـــان لـــەبیر چۆتەوەو بوونە عەرەب.

العُربُ: بەمانا (العَرب)دێ.

العَرباء: عەرەبی ڕەسەنو سامی نژاد.

العَرَبانيُّ: کەسێك بەزمانی عەرەبی ئاخاوتن بکاو عەرەبیش نەبێ.

العَرَبَةُ: چۆمی تیژڕۆ ٥ نەفسو دەروون ٥ چەند گەمیو کەشتییەك بوون لەناو روباری دیجلە بەکاریان دەهێنان ٥ گالیسکە کە دوتایەی لەژێردابێ یان چوارتایە یەك ولاخ ڕایکێشێ و شتی پێ بگوازرێتەوە.

العُربونُ: عەرەبونو پێشەکی کە لە دوا ڕێککەوتنو براندنەوەی مامەڵەکە بەخێرایی دەدرێتە فرۆشیار وەکوو بتمانەیەك بۆ فرۆشیارو کڕیار.

العربین: مادەیەکە لە صمغی عەرەبی دەردەهێنرێ.

العَرُوبُ: ئافرەتێك خۆی لای مێردەکەی خۆشەویست دەکا ٥ (ك: عُرُب) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا، عُرُبًا أَتْرَابًا﴾.

العَروبة: بەمانا (العَروب) دێ ٥ (یوم العَروبة) ڕۆژی هەینی سەردەمی نەزانی بووە.

العُرُبَة: ئیسمێکە مەبەست لێی تایبەتمەندی ڕەگەزی عەرەبییە.

العُرُبيَّة: بەمانا (العُرُوبة)دێ.

العَریب: دەگوترێ: (ما بالدار عریب) کەس لە خانووەکەدا نیە.

المُتَعَرِّبَة من العرب: خێڵی بەنو قەحتانن ٥ ئەو عەرەبانەن کە لە وڵاتی عەرەبە ڕەسەنەکاندا نیشتەجێ بوون بە زاراوەی ئەوان ئاخاوتنیان کردووە.

المُستَعرِبَة من العرب: وەچەو نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلن ٥ کەوا بوو قورەیشییەکان عەرەبی ئەصڵی نین و کراو بە عەرەبن.

عَرِبَدَ: ڕەوشتی ناشیرین بوو.

عَربَدَ السکران علی الناس: سەرخۆشەکە خەڵکەکەی ئەزیەت دا.

العِربید: کەسێك زۆر خەڵك ئیزعاج بکاو شەڕانی بێ ٥ کەسێك بە سەرخۆشی خەڵك ناڕەحەت بکا.

عَربَنَه: عەرەبوونی دا بە فرۆشیار.

**عَرَجَ** الشيءُ عروجاً: شتەکە بەرز بۆوەو سەرکەوت ٥ (فهو عریج)

**عَرَجَ** فلان: فلانکەس ئازارێك لە قاچیدا پەیدا بوو وەکوو شەلی لێ هاتو شەلیەکەی سروشتی نەبوو.

**عَرَجَ** في السُّلمِ: بە پەیژەدا سەرکەوت.

**عَرَج** بالشيء: شتەکەی لەگەڵ خۆیدا بە پەیژەکەدا سەرخست.

**عُرِجَ** بالروح والعمل: گیانو کردەوەی

بەرز كردنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ﴾.

**عَرِجَ** عَرَجاً وعرجاناً: لە قاچیدا لەنگییەك هەبوو وای لێ هات بە ڕواڵەت دەشەلی ٥ بەهۆی ئازارێکی پەیدابوو توشی شەل بوو ٥ (فهو أعرج وهي عَرجاء).

**عَرَجَت** الشمس عَرَجاً: خۆر بەرەو ئاوابوون كشا.

**أعرجَ** فلاناً: فلانکەسی شەل کرد.

**عَرَّجَ** عليه: مەیلی کردە سەری‌و حەزی لێی بوو.

**عَرَّجَ** بالمكان: لەو شوێنە دابەزی‌و نیشتەجی بوو.

**عَرَّجَ** الشيئ: شتەکەی خوارکردەوە ٥ دەگوترێ: (عَرَّجَ البناءَ والنهر والخطَّ) چینی دیوارەکە یان جۆگاکە یان هێڵەکەی خوارکرد.

**عَرَّجَ** الثوب: قوماشەکەی خێت خێت کرد ٥ هێڵەکانی خوارکردن.

**إنعَرَجَ** الشيئ: شتەکە خوار بووە، لار بووە بە ڕاست‌و چەپدا مەیلانی کرد ٥ دەگوترێ: (إنعَرَجَ النهر): ڕووبارەکە پێچاو پێچ بوو ٥ (إنعرجَ الطريق): ڕێگاکە قۆرت‌و پێچ بوو ٥ (إنعرجت الشمس): خۆر بەرەو ئاوابوون ڕۆیی‌و لە ئاسۆی ئاوابوون نزیك بۆوە.

**إنعَرَجَ** القوم عن الطريق: خەڵکەکە لە ڕاستە ڕێ لایاندا.

**تعارجَ**: لاسایی شەلێکی کردەوە.

**تَعَرَّجَ**: لاربۆوە ٥ دەگوترێ: (تَعَرَّجَ البناء) دیوارەکە خوار بوو ٥ (و تعَرَّجَ النهر) ڕێڕەوی جۆگاکە پێچاو پێچ بوو.

**الأعرَجُ**: قەلە ڕەش.

**التّعاريجُ**: (تعاريج النهر) پێچاوپێچی ڕووبار.

**العُرجَة**: سەرکەوتن‌و بەرزبوونەوە ٥ شوێنی سەرکەوتن.

**العَريجُ**: بەرزایی ٥ کارێك یەکالا نەبو بێتەوە.

**المِعراج**: ئامێری بەرزبوونەوە ٥ پەیژە ٥ ئەو شتەی پێغەمبەر پێی بەرز بۆوە بۆ ئاسمانەکان لە شەوی میعراجدا.

**مُنعرج** الطريق والوادي والنهر: پێچاو پێچی ڕێگاو شیوو دۆڵ‌و ڕوبار.

**عَرجن** الثوبَ ونحوه: وێنەی لاسکە خورمای لەسەر قوماشەکە درووستکرد.

**العُرجون**: ئەو لاسکەی خورمای پێوەیە، هێشوە خورما.

**عَرَدَ** عروداً: دەرکەوت‌و پێگەیی‌و بەهێز بوو ٥ دەگوترێ: (عرد النابُ) ددانەکە

دەرکەوت و پتەو بوو ٥ (عَـرَدَ الـشجر) درەختەکە ڕواو بەهێز بوو.

عَرَدَ الحجر: بەردەکەی دوور فڕێ دا.

عَرِدَ عَرداً: هەڵات.

أعـرد الـشجرُ: درەختەکـە پتـەوو ئەستوور بوو.

عَـرَّدَ الـنجم: ئەسـتێرەکە بـەرەو ئاوابوون کشا.

عَرَّدَ عن الطريق: لە ڕێگا لای دا.

عَـرَّدَ الـسَّهم في الرَّمية: تیرەکـەی لـە کەوان ڕەها کرد.

عَـرَّد فـلان بحاجـة فـلان: فلانکـەس پێداویـستی فلانـی جـێ بـەجێ نەکرد.

ألعَرادةُ: کوللەی مێینە.

العَرِدُ: شتی ڕەق و پتەو.

العَرادة: ئامێرێکی شەڕ بووە لەکۆنـدا شتی پێ هاوێـژراوە بـۆ نـاو دوژمـن، بــە کــوردی پێــی دەگــوترێ قۆچەقانی، مەنجەنیق.

عَرَّت الإبل: حوشترەکە گروێ بوو.

عَـرَّ الظلـيمُ عِـراراً: بێـچوە نوعامەکـە قیڕاندی.

عَرَّ فلانـاً عَـرّاً: ئاسناوێـکی ناشـیرینی بـۆ فلانکـەس دانـا ٥ دڵـی نـاخۆش کـرد ٥ کردارو گوفتارێکی ناشیرینی پاڵ دا.

عَرَّه بِشرٍّ: شەڕو نەگبەتی پاڵدا.

عَرَّ الأرض: سەمادی بە زەوییەکە کرد.

إعترّ فلاناً واعترّ به: بەبێ ئـەوەی داوای لێ بکا پیاوەتی لەگەڵ کرد.

تعـارَّ فـلان: فلانکـەس شـەو خـەوی لێ زڕاو لەسـەر جێـگای نوسـتنی تـا بەیانی تلاو تلی کردو هاواری کرد.

إستَعَرَّهم الجربُ: گرویێی تییان دا بلاّو بووە.

العَرارُ: ڕووەکێکی بۆنخۆشە.

العـرارة: ڕەوشـت ناشـیرینیی ٥ تـەنگ و چەڵەمەو چورتم ٥ ئەو ژنانەی هەر منداڵی نێرینەیان ببن ٥ دەگـوترێ: (تزوج في عَرارة النساء).

العُـرُّ: گرویێـی ٥ (وعـرُّ الـوادي) ئـەم بەراو ئەو بەری شیو.

العُرّي: ئافرەتی عەیبدار.

العَـرَّةُ: چـورتم و ناخۆشـیی ٥ ڕەوشـتی ناشیرین.

العُـرَّةُ: گرویێـی: ئـەو حاڵەتـە شـێتی و ئەعـصاب تێـکچوونەیە کـە توشـی هەنـدێ ئـادەمیزاد دەبـێ ٥ تـاوان ٥ گرێـی دار گۆچان و عەصـا ٥ پـیس و پۆخەڵی ٥ دەگوترێ: (هو عُرَّة قومه) ٥ ئــەو قێزەونــی قەومەکەیــەتی ٥ بەزی دوگی حوشتر.

العَريرُ مـن الرجـال: پیـاوی غـەریب و بێـگانە.

**المُعتَرُّ**: هەژار ٥ میوان ٥ پیاوەتی لەگەڵ کراو بەبێ ئەوەی داوا بکا.

**المَعَرَّةُ**: ئەزیەتو چورتمو ناخۆشی ٥ بارگرانیو ئەرك ٥ خوێنی کوژراو کە لە بکوژ وەردەگیرێ ٥ تاوان ٥ تەنگژە ٥ شوێنی گروێیی.

**مَعَرَّةُ** الجیش: ئەوەیە سوپا لە شوێنێك بخا زەوی تایبەتی هاوڵاتیان بیو بەبێ ڕەزامەندی ئەوان لە کشتوکاڵەکەیان بخۆن.

**العِـرزالُ**: کاڵای کەمو بێ نمود ٥ دەگوترێ: (إحتمل عِرزاله) کاڵاکەمو بێ نمودەکانی لە کۆڵی خۆی شەتەك دا ٥ دارودەوەنی چڕو پڕ کە دەبێتە شوێنی حەوانەوەی شێر ٥ شوێنێکە باخەوانو ڕەزەوان لەسەر دارخورماو درەختی تر بۆخۆی چاکی دەکا بۆ ئەوەی خۆی لە شێر بپارێزێ ٥ دەمی کونەو مەشکە ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ (ك: عرازیل).

**عَرَسَ** عن الشّيءِ عرساً: لە شتەکە لای دا.

**عرس** البعیر: ملو دەستی حوشترەکەی پێکەوە شەتەك دانو بیخی دا.

**عَـرَسَ** فـلان عرسـاً: فلانکەس کەیف خۆشو تەڕ دەماخ بوو ٥ سەری سوڕما ٥ دەستی بەشەڕ کردو وازی نەهێنا.

**عَـرِسَ** الـشّيءُ: شتەکە توونـد بـوو بـە بنبەست گەیی.

**عَرِسَ** الشرُّ بینهم: شەڕ لەناویان بەرپابوو نەکوژایەوە.

**عَرِسَ** بالـشيءِ: خوی بەشتەکەوە گرتو ئولفەتی پێوەگرت ٥ دەگوترێ: (عَـرِسَ الـصَّبِيُّ بأمـه) منداڵەکە وەگری دایکی بوو.

**أعـرَسَ** المـسافرون: ڕێبوارەکان کۆتایی شەو خەستیانو ویستیان پشوو بدەنو ماندویی لە خۆیان دەربکەن.

**أعـرس** فـلان: فلانکەس بوکی گواستەوە.

**أعرس** بالمرأة: لەگەڵ ئافرەتەکە چووە خەڵوەوە.

**أعرس** الشّيءِ: خوی بە شتەکەوە گرتو پێی ڕاهات.

**عَرَّس** المسافرون: بەمانا (اعرَسوا)دێ.

**تَعَـرَّس** لإمرأتـه: خـۆی لای ژنەکـەی خۆشەویست کرد.

**عرائس** النیل: جۆرە گوڵێکی نیلۆفەرە.

**العـِرِّیسُ**: درەختێکی چڕو پڕ گەڵاو تێکچڕژاو کە شێر دەیکا بە شوێنی حەوانەوەو پشودانی خۆی.

**العِرِّیسة**: بەمانا (العِرِّیسُ)دێ.

**العِرسُ**: مێرد ٥ دەگوترێ: (هو عِرسُها)

ئـەوە مێردیـەتی ٥ (وهـي عِرسُـه)
ئەوە خێزانیـەتی ٥ (وهمـا عِرسـان)
ئـەو دوو ئـافرەتو پیـاوە ژنو مێردی یەکترن ٥ (ك: أعراس).
ابـن عِـرس: دەعبایەکە وەکوو جرج‌و مشك وایە جوجەڵە مریشك‌و شتی وا دەخوا.
العُـرسُ: ئاهـەنگی ژن گواستنەوەو ژن مارەکردن‌و نان‌و خوان ئامادەکردن بۆی ٥ (ك: أعراس).
العَرُوسُ: بوك ٥ واته: ئافرەتی شوکردو تا جلی بوکێنی لە بەردابێ ٥ هـەروا پیاو تالە ماوەی زاوایەتی دابێ ٥ بۆ پیـاوان کـۆی (العُـرُس)(عُـرُسٌ) بـۆ ئافرەتان (عرائِس).
العُرُوسةَ: ئافرەت تا لە پۆشاکی بوکێنی دابـێ ٥ بوکـە شوشـەو شـتی وا کـە منداڵ یاری پێ دەکا.
العَریس: پیاو لە فـەترەی زاوایـەتیی دا (ك: عِرسان).
المعـــرَسُ: کەسێـــك زۆر ژن بێنـــێ ٥ شۆفێری زیرەك‌و وریا بۆ لێخوڕینی ئۆتۆمبێلی بوك گواستنەوە.
المُعرَسُ: ئەو شوێنەی ڕێبـواری شـەوڕۆ لـە کۆتـایی شـەودا لێـی دەخـاو ئیسراحەتی تێدا دەکا.
عَـرَشَ فـلان عرشـاً: فلانکـەس کـەپرو ساباتی دروستکرد.
عَرَشَ بالمكان عُروشاً: لەو شوێنە مایەوە.
عَرَشَ العَرشَ: کەپری کرد.
عَـرَشَ الكـرمَ عَرشـاً: کـەپری بـۆ تولـە میوەکـان کـردو لـە زەوی بـەرزی کردنەوەو خستنیە سەر دار.
عَـرَّشَ فـلان: فلانکـەس کـەپری کـرد ساباتی ڕابەست.
عَرَّشَ الطائِر: باڵندەکە حەوا کەوت‌و بە باڵەکانی سێبەری لەو شتە کرد: کە لە ژێرەوەیەتی.
عَرَّشَ الأمر عنه: ئیشەکەی لێ دواخرا.
عَرَّشَ الكرمَ: تولەی میوەکەی لە زەوی بـەرزکردەوە خـستنیە سـەر داری ڕایەڵکراوو کەپر.
عَـرَّشَ البیـت: سـەقفی بـۆ خانووەکـە کرد.
إعـــترش فـــلان: فلانکـەس کـەپری دروستکرد.
إعتَرَشَ العِنب العَریشَ، وعلـی العـریش: تولـە میوەکـان بەسـەر کەپرەکـەدا بڵاوبوونەوە.
تَعَرَّشَ بالمكـان: لـەو شوێنەدا مایـەوەو جێگیر بوو.
العَـــرشُ: موڵـــك‌و فـــەرمان ڕەوایـــی‌و دەسەڵات ٥ کورسی پاشایەتی ٥ قورئـان دەفـەرموێ:﴿وَلَهَـا عَـرْشٌ عَظِـيمٌ﴾

٥ بەڕێوەبردنی کاروبارو کۆنترۆڵکردنی فەرمانڕەوایی ٥ (استوی الملك علی عَرشه): پاشا دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست ٥ (ثُلَّ عَرشُهُ): دەسەڵاتی لاواز بوو ٥ لە پاشایەتی خرا ٥ دروستکردنی هەڵاش و سێبەر بە زۆری لە قەفەزاژ دروست دەکرێ ٥ کەپرە مێو، کە دروست دەکرێ بۆئەوەی تولەی میوەکە بەسەریدا بڵاو ببنەوە ٥ پشتی پێ ٥ (عرشَ القوم) ڕیش سپی و سەرەك هۆز کە سەرۆکایەتی قەومەکە دەکاو کاروباریان بەڕێوە دەبا.

**عَرشُ** الطائر: لانەی باڵندە ٥ (ك: عروش وأعراش).

**العُرش**: کۆتایی موی یالی ئەسپە ٥ گوێچکە ٥ دەگوترێ: (نفث في عُرشَیهِ) چپەی بە گوێچکەیدا کرد.

**عُرشا** العنق: دووپارچە گۆشتی درێژن کەوتوونە ئەملاو ئەولای گردە مل.

**العَریشُ**: هەرشتێك سێبەرت لێ بکا ٥ کەپری مێو ٥ سەقفی خانو ٥ (ك: عُرُشٌ).

**العریشة**: کەژاوە ٥ (ك: عَرائش).

**عَرَصَت** السماء: ئاسمان هەورە بروسکەی بەردەوام بوو.

**عَرَصَ** البرقُ عَرَصاً: هەورە بروسکەکە پێچاو پێچی کرد.

**عَرِصَ** الصبیان: منداڵەکان گاڵتەو گەپیان کرد.

**عَرِصَ** فلان: فلانکەس نیشاتی پەیدا کرد، کەوتە گەشەو نەشە.

**أعرَصَ**: جم و جۆڵ و پەلە پەلی کرد.

**عَرَّصَ** اللحمَ: گۆشتەکەی فرێدایە دەشت ٥ فرێی دایە ناو قوڵکە ئاگردانەوە گۆشتەکە تێکەڵی خۆڵ بوو، خۆڵاوی بوو نەبرژا.

**إعتَرَصَ**: کەوتە جم و جۆڵ و پەلەپەل ٥ نیشاتی پەیدا کرد ٥ کەیفخۆش بوو.

**العَرّاصُ**: هەوری بروسکاوی و تەقوتوق ٥ ڕمبێك ئاسنەکەی نەرم بێ ٥ شمشێری نەرم.

**العَرصَةُ**: حەوشەی خانوو ٥ بەردەرگای ماڵ ٥ دەشت و سارای نێوان خانووەکان کە بینایان تێدا نەکرابێ ٥ کلۆ گلی سووتاو و سوورکراوە ٥ پارچە ئاسنێکە دەخرێتە ناو تەندوورەوە بۆ ئەوەی گەرم ببێ و نانی لەسەر ببرژێندرێ ٥ یان شتی تری لەسەر ببرژێندرێ.

**عَرَضَ** الشیئ عَرضاً وعروضاً: شتەکە دەرکەوت، ڕوون بۆوە.

**عَـرَضَ** الرجـل عَرضـاً: پیاوەکـە هاتـە مەککەو مەدینەو دەوروبەریان.

**عَرَضَ** بسلعته: کاڵاکەی گۆڕییەوە بـە کاڵای تر.

**عَرَضَ** له عارضٌ من الحُمیّ: لـەرزوتای پـێ فێربـوو نـەخۆش کـەوت ٥ دەگـوترێ: (سِـرت فعَـرَضَ لـي عـارِض) ڕۆیـشتم لەمپەرێکی قورسم تووش بوو.

**عَـرَضَ** الـشيءَ: شـتەکەی دەرخـستو ڕای نواند.

**عَـــرَضَ** الکتـــاب: کتێبەکـــەی لەبـــەر خوێندەوە.

**عَـرَضَ** المَتـاعَ للبیـع: کاڵاکەی ڕانوانـد بـۆ کڕیارەکان بۆئەوەی لێی بکڕن.

**عَرَضَ** علیـه الـشيءَ: شتەکەی نیشان دا ٥ دەگوترێ: (عَرَضَ الدابة علی الحـوض): حەوزەکـەی نیـشانی وڵاخەکـە دا بـۆ ئەوەی ئاوبخواتەوە.)

**عَرَضَ** القومَ علی السیف: خەڵـکەکەی بـە شمشێر کوشت.

**عَرَضَ** القـوم علـی النـار: خەڵـکەکەی بـە ئاگرر سووتاند.

**عَرَضَ** الحصیر: حەسیرەکەی ڕاخست.

**عَرَضَ** الشَّيء: شتەکەی بە پانی دانا.

**عَرَضَ** العود علی الأنـاء: دارەکـەی بەسـەر قاپەکەدا ڕاهەنگاوت.

**عَرَضَ** السیف علی فخذه: شمشێرەکەی بـە لاتەنیشتیدا شۆڕکردەوە.

**عَرَضَ** عُـرضَ فـلان: ڕێبازی فڵانـی گرتـە بـەر ٥ دەشـگوترێ: (لا تعـرض عـرض فـلان): باسـی فڵانکـەس بـە خراپـە مەکە.

**عُرِضَ**: شێت بوو.

**عَـرُضَ** الـشيءَ عِرضـاً وعراضـةً: شـتەکە دوولاکـــەی لێـــك دوورکەوتنـــەوە ٥ پانتاییەکەی زیادی کرد.

**عَـــریض**: زۆرو زەبەنـــد ٥ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا مَـسَّهُ الـشَّرُّ فَـذُو دُعَاء عَرِیضٍ﴾.

**أعـرضَ** الـشَّيء: شـتەکە دەرکـەوتو ئاشـکرا بـوو ٥ شـتەکە پـان بـۆوە ٥ دەگـــوترێ: (أعـــرض الثـــوب) قوماشەکە پان بوو.

**أعرَضَ** في الشَّيء: لە باری پانییەوە پاڵ شتەکە کەوت.

**أعرضَ** في العلم: لە زانستدا شارەزا بوو، ئاسۆی زانیاری کرایەوەو زۆر جۆری گرتەوە.

**اعـرضَ** لـە الـشَّيء: شـتەکەی بـۆ بـوو، دەستی کـەوت ٥ دەگـوترێ: (أعـرض لك الخیر) خێرو بێرەکە بۆ تۆ بـوو، کەوتە دەست تۆ.

**أعـرض** عنـــه: پـشتی تـێ کـرد، ڕوی وەرگێڕا.

اعرض فلان في المكارم: فلانكەس لە هەموو لایەکەوە ڕێزو نرخی دەست خۆی خستو لە هەموو شوێنێک پیاوەتی کۆکردەوە.
أعرضَ الشيْئ: شتەکەی پانو پۆڕ کرد.
أعرض المسألة: مەسەلەکەی بە پانو پۆڕی ڕانواندو زۆر لایەنی لێ شیکردەوە ٥ پەندێکی عەرەب هەیە دەڵێ: (أعرضتَ القِرفة) تۆمەتێکی پانو زۆر زەبەندت ئاراستەی خەڵکەکە کرد هەموو تاکەکانی کۆمەڵی گرتەوە.
عارضَ فلان معارضة وعراضاً: فلانکەس لایەکی ڕێگاکەی گرتە بەر.
عارضَ فلاناً: بەرپەرچی فلانکەسی دایەوە.
عارضَ فلاناً في السير: شان بەشانی فلانکەس ڕۆیی.
عارضَ الكتاب بالكتاب: کتێبەکەی بەرامبەری کتێبەکەو لەبەر ڕۆشنایی ئەودا هەڵەبڕی کرد.
عارضَ فلاناً: بەرامبەری فلانکەسی کرد، وەکوو ئەو هەڵسو کەوتی کرد ٥ لاسایی کردەوە ٥ دەگوترێ: (عارَضَهُ في السير، عارضه في الشعر) ٥ بەرەنگاری کردو بیرو بۆچوونەکەی هەڵوەشاندەوە.
عارض الجنازةَ: لە ڕێگا چووە پاڵ ئەوانەی کە جەنازەکەیان پێیە، لەماڵەوە لەگەڵی نەبوو.
عارضَ فلاناً بمتاع: ئاڵوگۆڕی کاڵای لەگەڵ فلانکەس کرد.
عارضَ في القضاء: تەعنی لە بڕیاری دادگا داو داوای کرد ئەو بڕیارە هەڵبوەشێتەوە یان گۆڕانکاری تێدا بکرێ.
عَرَّض الشّيْئ: شتەکەی پانکردەوە، بەپانی ڕای نواند ٥ دەشگوترێ:
عَرَّض الرمح: ڕمبەکەی پانەوپان ڕانواند.
عَرَّض العود على الإناء: دارەکەی بەسەر قاپەکەدا ڕاهەنگاوت.
عَرَّض فلاناً لكذا: فلانکەسی کردە ئامانج بۆ توانجو تەشەنە لێدان.
عَرَّض له بالقول: تانەی بە توێکڵی لێ داو ڕاستەو خۆ تانەو تەشەری لێ نەدا.
عَرَّضَ بفلان: تانوتی لە فلانکەس دا ٥ قسەی وای دەربارەی فلانکەس کرد لەککەداری بکا.
عَرَّض القومَ عُراضةً: دیاری بۆ قەومەکە هێنا ٥ یان کە هاتەوە لەسەفەر دیارییەکەی دانێ بۆ ئەوەی لێی بخۆن.

**إعترضَ الشّيئ**: شتەکە بوو بەلەمپەر.

**إعترضَ دونه**: بوو بە لەمپەرو ناوەندو کۆسپ.

**إعترضَ له**: مەنعی کرد.

**إعترضَ عليه**: نارەزایی دەربڕی بەرامبەر گوفتارو کرداری.

**إعترضَ له بشيئ**: ڕوی تێکردو شتەکەی تێ گرتو هەنگاوتیو کوشتی.

**إعترضَ الشيئَ**: شتەکەی ڕانواند، دەگوترێ: (إعترضَ المتاع للبيع) کالاکەی ڕانواند بۆ فرۆشتن ٥ (إعترضَ القائد الجُندَ) ئەفسەرەکە سەربازەکانی ڕانواند.

**عَرُض عِرض فلان**: دەمی ژەنییە کەسایەتیو نامووسی فلانو ویستی لە ڕێزی کەم بکاتەوە.

**تعارضا**: ئەو دووکەسە بەرپەرچی یەکتریان دایەوە ٥ هەریەکەیان دەیویست ئەوی تریان بۆڕ بدا.

**تَعَرَّضَ**: بەرەو ڕوی بۆوە ٥ دەگوترێ: (تعرّض المعروفَ) ڕوبەڕوی چاکەو پیاوەتی بۆوە.

**تَعرَّض فلان لكذا**: فلانکەس بووبە ئامانجو هەدەف بۆ ئەو شتە.

**تَعَرَّض الشيئُ**: شتەکە خوار خێچ بوو ٥ دەگوترێ: (تَعَرَّض في سيره) لە ڕۆیشتنەکەیدا زۆری ئەملاو ئەولای ڕێگاکە کرد جارێك لە ڕاستەوەو دەمێك لە چەپەوە دەڕۆیی ٥ قۆرتو پێچی کردن.

**إستَعرض الرجلُ**: پیاوەکە داوای شتی زۆری کرد.

**إستَعرض فلاناً**: بە فلانکەسی گوت چیت لایە نیشانم بدە.

**إستَعرض القائد الجندَ**: سەرکردەکە ویستی سەربازەکان بەسەری دا ڕابنوێندرێن.

**إستَعرض القومَ**: خەڵکەکەی کوشتو بڕکرد ٥ هەرچی بەر پەلی کەوت کوشتی.

**إستَعرض المسألة**: مەسەلەکەی شی کردەوە.

**العارض**: ئەوەی لە ئاسۆ بەری بگرێو پەردە پۆشی بکا ٥ هەور کە بەری خۆر بگرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿هَـذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾ ٥ ئەوە هەورێکە پێدەچێ بارانمان بۆ ببارێنێ ٥ هەروا وشەی (عارِض) بەمانا کێو و لاجانگو لا ڕومەت دێ ٥ ڕوبەری کوڵم ٥ بەهەردوو ڕومەت دەگوترێ: (عارِضان) ٥ هەروا دەگوترێ: (هو خفيف العارضين) ئەو موی

لاڕومەتەکانی تەنکە ◦ لامل ◦ بەڵاو ئافات کە لە شتدا دێنەدی ◦ لەمپەرو کۆسپ ◦ دەگوترێ: (عرض له عارِض) کۆسپێکی بۆ پەیدا بوو ◦ ددانی پێشەوە.

**ألعارِضَةُ**: لامل، ڕوبەری ئەستۆ ◦ دوودانی پێشەوە ◦ سەردەرانی دەرگا ◦ ئەوەی کە گرێژەنەکەی تێدا دەسوڕێتەوە ◦ دەشگوترێ: (هو قوي العارضة) ئەو ورە بەرزو دامەزراو و بەتوانایە لەسەر قسەکردنو ڕاو بۆچوونی پەسەندو سوودبەخشە ◦ (اجازه عارضة) پشوویەکە موچەخۆر وەری دەگرێ بەهۆی کۆسپێك کە دێتە ڕێگای.

**عارِضة الأزياء**: ئەو ئافرەتەی پۆشاکی مۆدە لەبەر دەکاو خۆی پیشانی بینەران دەدا بۆ بانگەشەو ریکلام کردن بۆ فرۆشتنی پۆشاکەکە.

**العُراضَة**: دیارییەکە ئەو کەسەی لە سەفەر دێتەوە پێشکەشی نەتەوەکەی دەکا.

**ألعَرَض**: کاڵا، هەر شتێك کاڵاو سامان بێ جگە لە دینارو دیرهەم ◦ دەگوترێ: (أخذت في هذه السلعة عَرَضا) لەبار تەقای ئەو کاڵایە کاڵایەکی ترم وەرگرت ◦ یان پێچەوانەی درێژیی ◦ کێو ◦ سوپای زۆرو گەورە ◦ پێشنیارو نووسراوێکە پێشکەش دەکرێ بۆ بەرپرس یان پاشا بۆ لابردنی ستەم یان هێنانی سودو قازانج ◦ (ك: عروض، عراض، أعراض).

**العَرَض العسكري**: نمایشکردنی چەند یەکەیەکی سەربازیی نمونەیی بە چەکەوە بە بەردەم سەرۆکی وڵاتدا لە ڕۆژێکی دیاریکراوو بەئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر لە هاوڵاتیان.

**ألعِرضُ**: جەستە ◦ نەفس ◦ ناموسو شەرەف ◦ بنیچەو خانەوادەو خێزان ◦ بۆن بەگشتی ◦ هەوری گەورەو چڕو پڕ ◦ شیو و دۆڵی پڕ دارو نزار ◦ (ك: أعراض).

**العُرض**: (عُرض السيف): پانایی شمشێر ◦ (عرض العنق) لامل ◦ (عُرض الحائط) پاش دیوار ◦ دەگوترێ: (إضرب به عُرض الحائط) فڕێی بدە بۆ پاش دیوارو هیچ گرنگی پێ مەدە ◦

**عُرضُ البحر والنهر**: ناوەڕاستی دەریا، ناوەڕاستی ڕوبار.

**عُرض الناس**: زۆربەی خەڵكو گشتی خەڵك ◦ (ناقة عُرض أسفار)

حوشترێکی بەتوانایە بۆ سەفەرو ڕێگا بڕین.

**العُرُضُ**: لەلایەکەوە ٥ دەگوترێ: (نظر الیە عن عرض) لە پەنایەکەوە سەیری کرد.

**العَـرَضَ**: ئەو شتەی پەیدا دەبێ‌و نامێنێ وەکو خۆشی‌و ناخۆشیی لەش ساغی‌و نەخۆشی‌و شتی وا ٥ نیشانە ٥ دەگوترێ: (هو عرضة للشر) ئازاو بەجەرگە بۆ شەڕ.

**العَرَضـي**: پێچەوانەی (الذاتي)یە ٥ دەگوترێ: (مسألة عرضية) مەسەلەیەکی لاوەکییەو ناچێتە چوارچێوەی کاکڵەی باسەکە.

**العَرَضِيّة**: لە زانیاری ڕوەکناسیدا وەصف کردنی ئەو ئەندامە رووەکیانەیە کە لە شوێنی ڕووەکی خۆیاندا نایەنە دی.

**العُرضية**: پیاوەتی‌و ویژدان پیرۆزی حەق پەرستی‌و ڕاستی خوازی‌و عەداڵەتکاری ٥ دەگوترێ: (فلان فیە عُرضیة) فلانکەس پڕە لە ڕەوشتی پیاوەتی ٥ (مشی الفرسُ العرضیة): ئەسپەکە لەسەر لا ڕۆیشت.

**العروضُ**: زانیاری عەروز، زانیاری کێشی شیعر ٥ وشەی کۆتایی نیوە دێڕی یەکەمی شیعر ٥ (ك: أعاریض) ٥ ناوچە، لای شت ٥ دەربەندو بەندن لە ناو پانتایی کێودا ٥ شوێنێک کە دەرۆی ڕوت لێی بێ، بەرەو ڕوت بێ ٥ مانای قسە ٥ دەگوترێ: (عرفت هذا في عُروض کلامه) ئەوەم لە مانای قسەکەی زانی ٥ دەشگوترێ: (هذه المسألة عروض هذه) ئەم مەسەلەیە وەکوو ئەو مەسەلەیە وایە.

**العریضة**: پێشنیارو شکات کردن‌و داواکردنی ماف بە نووسین لەسەر ڕوپەڕی کاغەزێک کە پێشکەش دەکرێ بۆ دادوەر یان بەرپرسێک...(ك: عرائض).

**المُعارضة في القضاء**: ڕێبازی تانەدانە لە بڕیاری پاشملە.

**المِعراضُ**: نا ڕاستەوخۆو تێدا شاردنەوە (تەورییە) دەگوترێ: (عرفت هذا في مِعراض کلامه) ئەوەم لە ماناو شاردراوەی قسەکەیدا زانی.

**المَعرِضُ**: نمایشگا (شوێنێکی گشتی بە نمونەی بەرهەمو شتە دروستکراوەکانی تێدا ڕادەنوێندرێ).

**المِعرَضُ**: پۆشاك کە ئافرەت خۆی تێدا ڕادەنوێنێ ٥ (ك: معارض ومعاریض).

**معاریض**: ناواخن‌و مانا: دەگوترێ:

(الألفاظُ معاريض المعاني) وشە زەرفو تێدا هەڵگیراوی مانایە ٥ ماناو وشەکان جوان دەکەن.

**العَرطنيثا**: ناوێکی ڕەگەز ئارامییە بۆ ڕووەکی بخوری مەریەم.

**عَرعَرةُ** كل شيئ: لای سەرووی شت ٥ ملی گۆزەو دیزە.

**العَرعَرُ**: درەختی عەرعەرو سنەوبەر جۆرەکانی زۆرن.

**عَرَفَ** فلان على القوم عرافة: فلانکەس کاروباری قەومەکەی بەڕێوە بردو باسی ڕامیاری سەروکاری کردن.

**عَرَفَ** الشيئَ عرفاناً: شتەکەی بە یەکێک لە هەستەکانی زانیو دەرکی پێکرد.

**عُرِفَ** فلان: فلانکەس تووشی نەخۆشی عەرفە بووە (نەخۆشییەکە توشی پێستی بەری دەست دەبێ) ٥ فلانکەس ناسرا.

**عَرِفَ** عَرَفاً: وازی لە خۆ بۆنخۆشکردن هێنا.

**عَرِفَ** الديكُ: کەڵەشێرەکە پۆپنەی هەبوو (گۆشتێکی درێژە بە تەپڵی سەری کەڵەشێرەکەوەیە).

**عَرُفَ** عَرافةً: فلانکەس بوو بە عەریف ٥ زۆری بۆن لەخۆدا.

**أعرَفَ** الطعام: خواردنەکە بۆنی خۆش بوو.

**أعرف** الفرسُ: ئەسپەکە یاڵی درێژ بوو.

**عَرَّفَ** الحجاجُ: حاجیەکان لەسەر کێوی عەرەفە وەستان.

**عَرَّفَ** الأسمَ: ئیسمەکەی کردە مەعریفەو ناسراو.

**عَرَّف** الشيئَ: شتەکەی پاکو خاوێنو بۆنخۆش کرد.

**عَرَّف** الضالة: بانگەوازی بۆ شتە گومبوەکە کرد.

**عَرَّفَ** عليهم عريفاً: چاودێرێکی بەسەرەوە دانان بۆ ئەوەی بزانێ کێ باشەو کێ خراپە.

**عَرَّف** فلاناً بكذا: فلانکەسی بەو شتە ناساندو ناوزەد کرد.

**عَرَّفَ** فلاناً الأمر: کارەکەی فێری فلانکەس کرد.

**إعترفَ** بالشيئ: دانی بەشتەکەدا ناو درکاندی ٥ دەگوترێ: (إعترف بذنبه) دانی بە تاوانی خۆیدا نا.

**إعترف** اليه: خۆی پێ ناساندو ناوونیشانی خۆی پێدا.

**إعتَرَفَ** للأمر: خۆی بۆ کارەکە ڕاگرت.

**إعترف** القوم: داوای لە قەومەکە کرد کە هەواڵی بدەنێ.

**تعارفوا**: خەڵکەکە لەناو خۆیاندا خۆیان بەیەکتر ناساند.

**تَعَرَّفَ**: دەگوترێ: (تَعَرَّفتُ الى فلان)

فلانکەسم والێ کرد بمناسێ.

**تَعَرَّفَ ما عنده:** شوێنی کەوتو لێی کۆڵیەوە تا بەتەواوەتی ناسی.

**إستَعرَفَ:** خۆی پێ ناساند ٥ دەگوترێ: هاتم بۆلای بە نەناسراوی دوایی (إستعرفت) خۆم پێ ناساند.

**الأعـراف:** شوێنێکە لە نێوان بەهەشـتو دۆزەخـدا ٥ شـوراو پەرژین.

**التّعريف:** پێناسە، سنوردارکردنی شت بە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی بە جۆرێك لە شتی تر جیابکرێتەوە.

**التّعريفة:** قائیمەیەکە نرخی کالاکانی تێـدا دیـاری دەکـرێ ٥ یـان کرێی گواستنەوەو شتی وای تێدا تۆمار دەکرێ.

**العارِفَة:** چاکە ٥ (ك: عوارف).

**العِرافـة:** پیشەی سەر ناسی‌و ئـاژەڵ ناسی.

**العَـرّاف:** ئەستێرە ناسـی ٥ پزیشکی عەرەبی ٥ کاهین‌و کولەومنانی.

**العَـرفُ:** بـۆن هـەر جۆرێـك بـێ ٥ بەزۆری بۆ بۆنی خۆش بەکاردێ.

**العُـرف:** چاکەو پیاوەتی‌و نانبـدەیی ٥ داب‌و نـەریت کـە کۆمەڵـگا خـوی پێوە دەگرێ ٥ بەمانا دان پیانـانیش دێ دەگـوترێ: (لــه علـيّ مــأة عرفاً)وشـەی (عُـرف) لێـرەدا بـەمانا (إعـتـراف) دێ ٥ یـاڵی ئەسـپ، مـوی ملـی ئەسـپ ٥ پۆپنـەی کەڵەشـێر ٥ تەپۆڵـکەو شـوێنی بـەرز ٥ شـەپۆلی دەریـا (ك: أعـراف) ٥ دەشـگوترێ: (طـار الطـيرُ عرفـاً) باڵنـدەکان یـەك بـەدوای یەکـدا فـرین (جـاء القـوم عرفاً) خەڵکەکە یـەك بـەدوو یەکـدا هاتن.

**العُرف والعِرف:** صەبرو خۆگری.

**العَرفَةُ:** کێم‌و زوخاو کە لەبەری دەست دێتەدەر.

**العُرفَةُ:** پـەردەی نێـوان دووشـت ٥ (ك: عُرَف).

**عرفات:** کێوی عەرەفە لە نزیك شاری مەککـە ٥ شـوێنی ڕاوەسـتانی حاجییـەکان لـە ڕۆژی عەرەفـەو شـەوی جـەژنی قوربانـدا ٥ (یـوم عرفـات) ڕۆژی نۆیـەمی مـانگی زیلحیجەیە.

**العُـرفيّ:** حـوکم‌و بـەڕێوەبردنی وڵات بەیاسای عورفیی ٥ بە شێوەیەك کە لەگەڵ یاسای وڵات ڕێـك نەیەتـەوە، بـەڵام لەبـەر دابینکردنـی ئـەمن‌و ئاسایش پەیڕەو دەکرێ.

**العَريـف:** سـەرکارو سەردەسـتە لێپرسـراوی کۆمەڵێـك سـەرباز ٥ زاناو شارەزا بەشت‌و کاروبار.

عرش
عَجَلة
نقطة الاعتدال الربيعي والخريفي
عجراء
عدسة
عتبة
عتبة الباب
عَجلة
عدل
العرض
عرعرة
عرادة
عباءة
عرق
العتب
معجن
عجرم
عذار
عرزال
عرفج
عدس الماء
عرعر
عدس
عذق الكمثرى
عبوثران
عذق
عرف الديك
عثكول
عرف الديك
عذرة
ابن عرس
عجمة التمر
عفرة
عرف الفرس
عذرة
عثة

**المَعارِف**: شێوەو ڕوخسار ٥ دەگوترێ: (هي حسنة المعارف) ئەو ئافرەتە ڕوخساری جوانو شیرینە ٥ (غطّوا مَعَارِفَهم) ڕوخساری خۆیان داپۆشی ٥ (هو من المعارف) ئەو لە ناسیاوەکانە.

**المَعرَفَةُ**: شوێنی پۆپنەی کەڵەشێرو یاڵی ئەسپ.

**المَعروفُ**: ناوە بۆ هەرشتێك جوانیو باشی بزانرێ جا یان بەعەقڵ یان لە ڕێگای شەرعەوە ٥ چاکە کردن لە گەڵ خەڵکدا.

**العُرفُطُ**: ڕوەکێکە لە جۆری ڕوەکی (العضاء) پێڕی (القرنية)یە.

**عَرَقَ في الأرض عُرُوقاً**: بەناو زەویدا ڕۆیی.

**عَرَقَ العظم عرقاً**: گۆشتی سەر ئێسقانەکەی کرۆستەوە بەددان لێی کردەوە ٥ دەشگوترێ: (عَرَقَته السنون وعَرَقَتهُ الخُطوبُ) بەڵاو کارەساتی ڕۆژگار برژاندویانە چەوساندویانەتەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان مَعروق) فلانکەس کزو کۆڵەوارە، داڵ گۆشتو لەڕە.

**عَرِقَ عرقاً**: ئارەقی کرد ٥ (عَرِقَ الحائط) دیوارەکە تەڕایی پەیدا کرد تەڕشوحی هەیە.

**أعرَقَ الشجرُ**: درەختەکە ڕەگەکانی بە زەوی دا ڕۆچوونە خوار ٥ دەشگوترێ: (اعرق فلان في الكرم) فلانکەس لە ئانبەدەییو بەخشیندا بنچو بناوانی هەیەو بەمیرات بۆی ماوەتەوە.

**أعرَقَ**: هاتە وڵاتی عێراق.

**أعرَقَ الفَرسَ**: ئەسپەکەی هێناو برد بۆئەوەی ئارەق بکا.

**أعرَقَ الشرابَ**: شەرابەکەی تێکەڵ بە هەندێ ئاو کرد.

**عَارَقَهُ**: شانازی کرد بە بنیچەو ڕەچەڵەکی خۆی.

**عرَّقَ**: بەمانا (أعرَقَ)دێ.

**إعتَرَقَ العَظمَ**: گۆشتی سەر ئێسقانەکەی کرۆستەوە.

**تَعَرَّقَ الشجر**: ڕەگی درەختەکە بە زەویدا ڕۆشتە خوار.

**تَعَرَّقَ العَظمَ**: گۆشتی سەر ئێسقانەکانی کرۆستەوە ٥ دەگوترێ: (تَعَرَّقَتهُ السنون وتَعَرَّقته الخَطوبُ) ڕۆژگار چەوساندیەوە ٥ بەڵاو کارەسات کرۆستیانەوە.

**تَعَرَّقتُ فلاناً**: سەری فلانکەسم خستە ژێر باڵمەوەو جەڕاندمو بە زەویمدا دا.

**إستَعرَقَ**: تووشی گەرما بووم ٥ یان

دەرمانێکی خواردەوە بۆ ئەوەی عەرەق بکا.
**إستَعرَقَ** الشَّجر: درەختەکە ڕەگی بە زەویدا ڕۆچوون.
**العِراقُ**: قەراغ دەریاو قەراغ ڕوبار ٥ حەوشەی خانوو بەردەرگا ٥ گۆشتی دەوروبەری نینۆك ٥ کلۆرایی لاسکی پەڕوباڵی باڵندە ٥ پشت ناوك بە پانتایی ورگ ٥ (ك: أعرُق).
**العُراقُ**: ئێسقان کە گۆشتەکەی خورابێ ٥ ئاوی پاكو صافو پاڵێوراو.
**عُراقُ** الغَيثِ: ئەو ڕوەکەی دوای بارینی باران سەر دەردێنێ.
**العَرَاقَةُ**: ڕەسەنیو ئەصالەت.
**العُراقَـةُ**: ئاوی صافو روون ٥ بارانی بەلێزمەو ڕێژنە.
**العَرقُ**: ئێسقان کە زۆربەی گۆشتەکەی خورابێو کەمێ گۆشتی باشی لەسەر مابێ.
**العِرقُ**: بناغەی هەموو شتێك ٥ ڕەگی ناوجەستە کە خوێن بەناویان دا هاتووچۆ دەکا ٥ شورەخاك کە لەبەر سوێری خاکەکە هیچی لێ نەڕوێ ٥ تیرگەی خانوی وا کە سەقفەکەی داربێ ٥ شتی کەم ٥ دەگوترێ: (فيه عِرق من ماء وعرق من حموضة وملوحة) (ك: عروق وأعراق وعراق).
**عِرق** السوس: ڕەگی ڕوەکی سوس.
**العَرَقُ**: ئارەق کە لەجەستە دێتەدەر.
**عَـرَقُ** الحـائِط والأرضِ: تەڕایی دیوار ٥ نمەی تەڕو توشی زەوی ٥ تەڕایی کە لە کونەدەو مەشکە دەردەکەوێ ٥ شەرابی سەرخۆشکەر ٥ شەرابی گۆڕاو و پاڵێوراو و سەرخۆشکەر لە میصرو عێراق لە خورما دروست دەکرێو لە شام لە ترێ دروست دەکرێ.
**عَرَقُ** الخِلال: ئەو شتەی دەبەخشرێ بە مەبەستی دۆستایەتیو بڵاوبوونەوەی خۆشەویستی ٥ چینی دیوار لە خشتو بلۆك یان بەرد ٥ دەگوترێ: (بنى الباني عرقاً أو عَرَقين) وستاکە چینێك دیوار یان دوو چینی دانا ٥ ڕێچکەی ئەسپ یان باڵندە ٥ کرێی کرێکار.
**العَرقاة**: بنكو بناغە ٥ بنکی درەخت کە بەزەوی دا ڕۆچێو لقو پۆپەکانیشی بڵاو ببنەوە.
**العِرقَـةُ**: بەمانا (العَرقـاة)دێ ٥ (ك: عِرَق).
**العَرَقَةُ**: چینە دیوار لە خشتو بلۆكو بەرد ٥ ئەو دارەی بەپانی دەخرێتە سەر دوو لاچینی دیوار ٥ ئەو سیرمەو حەبلەی دەستی گیراوی پێ کەلەبچە دەکرێ.

**العُرَقَــةُ**: دەگــوترێ: (رَجــل عُرَقَــة) پیاوێکە دەماری زۆرن.

**العَرقوَتــان**: دوو دارن ڕاســتو چــەپ دەخرێنە سەر دەمی دۆڵچە.

**العَرَقِيــة**: عەرەقــچین (کــڵاو) ٥ ئــەو پارچــە قوماشــە نەرمــەی دەخرێتــە ژێر کورتانو زینی وڵاخ.

**العَريق**: رجل عريق: پیاوێکی ڕەسەنو خانە دانە ٥ (فرس عريق) ئەسپێکی ڕەسەنە ٥ (غلام عريق) منداڵێکی کزو ڕۆح سوکە.

**المَعَرَّقُ**: داڵ گۆشتو لەڕ.

**المِعــرَقُ**: فانیلــە ٥ ژێرکــراس ئــەو پۆشــاکەی لــە ژێــر پۆشــاکەوە لەبــەردەکرێ بۆئــەوەی عــەرەقی جەستە هەڵمژێ ٥ کێرد کە گۆشتی پێ توێ توێ دەکرێ.

**عَرقَــبَ الدابــة**: ڕەفیــسکی وڵاخەکــەی بڕی.

**تَعَرقَــبَ**: شــوبها بــە عورقــوبی وڵاخ لــە خوارو خێچی دا ٥ عورقوب بریتیــە لە ناوەڕاستی خوارایی پاشوی وڵاخ ٥ هەروا دەگوترێ: (سلك العراقيب في الجبــال) بــەناو ڕێبــازی پێــچاو پێچی کێوو کەژدا ڕۆیی.

**تَعَرقَبَ لخصمه**: بــە ڕێچکەیەکی نادیار لە دوژمنەکەی دا ڕۆیی بۆ ئــەوەی فرسەتی لێ نەهێنێ.

**تَعَرقَبَ عن الأمر**: لە کارەکە لایدا.

**تَعَرقَبَ المَطيــة**: لــە دواوە سواری وڵاخــە مێینەکە بوو.

**عُرقــوب**: پیاوێــکە لــە عەمالیقــەکان بەنمونــە دەهێنرێتــەوە بۆ پابەنــد نــەبوون بــە وادەو بــەڵێنی خــۆی ٥ دەگــوترێ: (مواعيــــده مواعيــــد عرقوب).

**العُرقــوبُ مــن الأنــسان**: شارەگێــکە لــە قاچدا دەکەوێتە ژوور پاژنەی پێ ٥ لە وڵاخدا بریتییــە لــەو خوارایيــەی پاشــــوی کــــەوەکوو ئــــەژنۆی دەســتەکانیەتی ٥ لــە شــیوو دۆڵ دا بریتییــــە لــــە خــــوارو خێــــچیو پێچاوپێــچی ناویانــــدا ٥ ڕێــــگای تەنگەبەرو دەربەند لە کێوو کەژدا ٥ (ك: عراقيب).

**عراقيب الأمــور**: کۆسپو تەگــەرەکانی ئیشو کار.

**عَرقَلَ عليه كلامــه**: قسەکەی لێ خــوارو خێچ کرد ٥ دەگوترێ:

**عَرقَــلَ علــى فــلان**: قسەو کردەوەکانی فلانکەســــی خــــوارو خــــێچ کــــردو پلانەکانی هەڵوەشاندنەوە.

**عَرقَــلَ الأمــر**: کارەکــەی قــورس کــردو چەواشەی کرد.

أسماك
شبوط
رعّاد
ورنك
زمير
تُنّ
قرش
سمك موسى
جرّي او حنكليس
دلفين
سيف
سردين
بوري
منشار
إسقمري
بال
عنبر
سمك كراكي
سلمون
رنكة
صلّور
زجر

سفينة مصرية
مركب فينيقي
مركب حربي فرعوني
مركب شراعي اغريقي
«سانتا ماريا» من سفن كولومبوس الشراعية
شانية صليبية
مسطح ذو قلوع ومجاذيف (القرن ١٧)
شونة
باخرة
باخرة ذات مروحة
آخر مركب شراعي (١٨٧٥)

السُفن
الباخرة «ارجنتينا»
الشاحنة «سانتا اينس»
الباخرة «نورماندي»
اليخت الملوكي «بريطانيا»
الباخرة «ادواررانلي»
شاحنة النفط «كالتكس كنبرا»
الباخرة «ستراتهيرد»
الغوّاصة «مركوف»
ناقلة الطيارات «ايغل»
الطرّاد «مونكالم»
ضد نسّافة

حشرات
زيز
جُعَل
جرادة
ذرّاح
ذُبابة
عقرب
جُدجُد
رُتَيلاء
عنكبوت
قرنبى
يعسوب
أم أربع وأربعين
برغشة
قملة
بقّة
برغوث
هُدبيّة الذنب
نحلة
نملة
فراشة دودة القز
بنت وردان أو صرصور
فراشة
فراشة

**تَعَرقَلَ**: كارەكەی خوارو خێچ كرد.
**العَراقيل**: كۆسپو تەگەرە ○ (عراقيل الأمور) كارە قورسەكان.
**عَرَكَ** الجلدَ عَرْكاً: دەستی بە پێستەكە دا هێناو برد.
**عَرَكَ** الشيئ: شتەكەی كڕاند تا بەتەواوی كوژاندیەوە ○ دەگوترێ: (عركتهم الحرب) شەڕو هەرا بەسەریاندا هاتو چۆیەتی هەر بەینا بەینێك دەكەونە شەڕەوە.
**عَرَكهم** في الحرب: لە شەڕدا هەڵمەتی بۆ بردن.
**عَرَكه** الدهر: زمانە دەرزی دادا ○ قاڵی كرد ○ لە بۆتەی دا.
**عَرَكَتِ** الماشيةُ الأرضَ: ئاژەڵەكە زەویەكەی لە گیا ڕوتكرد.
**عَرَكَ** بجنبه ذنب فلان: تاوانی فلانكەسی خستە ئەستۆی خۆ.
**عَرِكَ** فلان عَرَكاً: فلانكەس لەشەڕدا هەڵمەتی توندو تیژی بردە سەر دوژمن.
**عاركه** معاركةً وعراكاً: شەڕی لەگەڵدا كرد.
**إعتركوا**: قەرەباڵغیو پاڵە پەستۆیان كردو كۆبونەوە ○ دەگوترێ: (إعتركوا في القتال) لەشەڕدا تەنگیان بەیەكتر هەڵچنی ○ (إعتركت الأبل على الماء) حوشترەكان لەسەر ئاوەكە پاڵە پەستۆی یەكتریان كرد ○ (تعاركوا في القتال والخصام) لەشەڕو كێشەدا پاڵەپەستۆی یەكتریان كرد.
**العِراكُ**: كۆبونەوەو پاڵەپەستۆكردنی حوشتر لەسەر ئاو ○ دەگوترێ: (أورد إبلَهُ العراك) بەراپێچو پاڵەپەستۆ حوشترەكانی بردنە سەر ئاوەكە.
**العَرْكَةُ**: یەكجار ○ دەگوترێ: (لقيته عركة بعد عركة) جار دواجار توشی بووم ○ وەجبەیەك شەڕ ○ شەڕێك.
**العُرَكَةُ**: كەسێك خۆ بۆ ئازار ڕابگرێ.
**العَرَكِيُّ**: ماسی گر ○ كەسێك ڕاوەماسی بكا ○ (ك: عَرَك).
**العَريكُ**: (رمل عَرِيكُ) لمێكی تێك پەستێوراوە.
**العَريكة**: دوگی حوشترە ○ بەرزایی ناوقەدی پشتی ○ یان پاشماوەی دوگی ○ سروشتو طەبیعەت ○ دەگوترێ: (هو ليّن العريكة) ئەو تەبیات نەرمو سروشت هێدییە ○ (هوشديد العريكة) تووڕەو تەبیات توندە ○ (ك: عَرائك).
**المُعتَرِكُ**: شوێنی تێكچرژانو پەلاماردنی یەكتری.
**معترك** المنايا من السنين: چەمبەرە

بەستن لەگەڵ مردن.. تەمەنی نێوان شەستو نەوەد ساڵە بەزۆری ئادەمیزاد لەو تەمەنەدا لەگەڵ مردن یەخەگیر دەبێ.

**المَعرَكُ**: بەمانا (المعترك)دێ ٥ (ك: معارك).

**المَعرَكَة**: گۆڕەپانی شەڕو شوێنی هەوڵدان بۆ کوشتنی دوژمنو زیان پێ گەیاندنی.

**عَرَمَ** فلان عَرماً: فلانکەس توند بوو تورە بوو ٥ شەڕەنگێزو زیبانە خرۆ بوو.

**عَـرَمَ** فلانـاً: بە تورەیی‌و توندو تیژی یەخەی فلانی گرت.

**عَرَمَ** الصَّبيُّ أمَّه: منداڵەکە شیری مەمکی دایکی خوارد.

**عَرِمَ** الشيءُ عَرمـاً وعرمـةً: شتەکە ڕەش‌و سپی بوو (هو أعرم وهي عَرماء).

**عَـرِمَ** فلان عَرَماً: فلانکەس توندو تیژ بوو.

**عَرُمَ** فلان عرامة: فلانکەس توندو تیژ بوو.

**عارَمَهُ**: کێشەی لەگەڵ دا کرد.

**عَرَّمَ** الشَّيءَ: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**إعتَرَمَ**: بەمانا (عَـرِمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (أعترمـت الفِتنـة) فیتنەیی پەرەی سەند.

**تَعَرَّمَ**: بەمانا (عَرِمَ) دێ.

**العارم**: (یوم عارم) ڕۆژێکی زۆر ساردو توشە ٥ (أمر عارم) کارێکی قورسە ٥ (خُلق عارِم) ڕەوشتی توندو تیژ.

**العُـرامُ**: توێـکڵی درەخـت ٥ چڵـکی مەنجەڵ ٥ زۆرو زەبەنـدەیی سوپاو جەربەزەیی.

**العَرِم**: لافاوێك هیچ بەربەستێك خۆی بۆنـەگرێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿فَأَعْرَضُـوا فَأَرْسَـلْنَا عَلَـيْهِمْ سَـيْلَ الْعَرِمِ﴾.

**العَرَمُ**: چڵکی مەنجەڵ؛ کیشتەرمقەڵەی کە بەمەنجەڵەوە دەنووسێ ٥ گۆشت ٥ کۆمەڵە گەنمی گێرە کراوی شەنە نەکراو، واتە: خەرمانی سورنەکراو.

**العُرمَة**: خەرمانی گێرە کراوی بەشەنە نەکراوی گەنم.

**العَرَمَـةُ**: بـەمانا (العُرمـة) دێ ٥ (ك: عَرَم).

**العَرِمَةُ**: بەربەستی دروستکراو لە شیو و دۆڵ دا بـۆ کۆکرنـەوەی ئـاو ٥ بارانی بەلێزمەو لەنگێزە.

**العَريمُ**: بەڵاو کارەسات ٥ جوتیار ٥ (ك: عُرمان).

**العَرَمرَمُ**: بەهێزو توانـا (جیش عرمـرم) سوپای زۆرو جەربەزە.

**عَرَنَـتِ** الـدار عِرانـاً: مـاڵی دوور بـوو خانوی دووركەوتەوە.

**اعـرنَ** فـلان: فلانکـەس بـەردەوام بـوو

لەسەر خواردنی گۆشتی کولاو.

عارنَ فلاناً معارنةً وعِراناً: شەڕی لەگەڵ کرد.

العارِنُ: شێر.

العِـــرانُ: خـــانووی دوور ٥ بزمارێـــك رمـــبو ســـەرە رمبەکـــە بەیەکـــەو شەتەك بدا.

العَـرَنُ: گۆشـت ٥ یـان گۆشـتی کـولاو ٥ نەخۆشـییەکە توشـی قاچـی ولاخ دەبـێ، دەورو بـەری سمـی ئەسـتور دەبێ.

العَـرِينُ: لانـەی شێرو کـەمتیار، کونـە گورگـو کونە ماری گەورە ٥ کۆمەڵـە درەخـــت ٥ حەوشـــەی خـــانوو، بـەردەرگا ٥ دەوروبـەری شـار ٥ (ك: عُـرُنْ) ٥ شـکۆمەندیو پارێزگـاری لەبەهابەنرخەکان.

العِـرنِين: سـەرەتای هـەموو شتێـك ٥ ئێـسقانی لـوت ٥ (ك: عـــرانین) ٥ دەگوترێ: (هم شمّ العرانين) ئەوانـە شکۆمەندو ولاتپارێزو گیانبەخشن لە پێناو بەها بەنرخەکان دا ٥

عــرانین القــوم: پیـاو مـاقولو گـەورە پیاوی گەل.

العِرنـاس: لوتکـەی کێـو ٥ دارێـکە یـان شتێکی تری وا ریسی لۆکەی لەسەر هەڵدەکرێ بۆ ڕستن ٥ (ك: عـرانیس وعرانس).

عــرانیس الــذرّة: ئـەو گیـاو گـژەی لـە نێوان ڕیزەکانی روەکی گەنمەشانیو گولەبەڕۆژەدا دەڕوێ.

عـراه الـداء والأمـر عـرواً: نەخۆشـیو ڕوداوەکە سواری شانی بوو.

عَـری فـلان فلانـاً: فلانکـەس هاتـە لای فـلانو داوای بەخـشش‌و پیـاوەتی لێ کرد.

عُـرِي فـلان: فلانکـەس لـەرزی هاتـیو سەرمای سەرەتای لەرزەکەی توش بـوو ٥ فلان حەزی لـە دیـدەنی فلان بـوو ٥ دەگوترێ: (عـري الى الـشيء) پەرۆشـی شـتەکەی بـوو، دوای ئـەوەی فرۆشـتی پەرۆشی بوو.

أعـرى القمـيص: قـۆڵی بـۆ کراسـەکە دروستکرد (أعرى الكوز) هەنگڵی بۆ گۆزەکە کرد.

أعـری صــدیقه: دۆسـتو برادەرەکـەی ڕیسواکردو یارمەتی نەدا.

عرّى القميص أو الكوز: قـۆڵو هـەنگڵی بۆ کراسو گۆزەکە دروستکرد.

عرّى الشيءَ: شتەکەی پاشگوی خست.

إعتراه: بەمانا (عرّاه) دێ.

العِروُ: ناحیەو لایەن ٥ دەشگوترێ: (هو عِروٌ منه) ئـەو گـوێ بـەو شـتە نـاداو لێی بێ ئاگایە.

**العُروُ**: یەکەم سەرما بوونی جەستە بەهۆی لەرزوتاوە ٥ نێوان زەرد هەڵگەرانی خۆرو داهاتنی تاریکی لەوەرزی زستانو سەرمادا.

**العُروَة** من الثوب: یەخەی کراس ئەو شوێنەی وەکوو ئەڵقە وایەو بە عەلاگەیدا دەکەی ٥ هەر ئەڵقەیەك دەستی پێ بگریو خۆتی پێ لە زیان بپارێزی ٥ درەختێك بە زستان گەڵاکەی نەوەرێ ٥ ماڵو سامانی بەنرخ ٥ ئەڵقەی گەردنبەندو ملوانکە ٥ دەگوترێ: (عری المرجان) ئەڵقەی مرواری ٥ دەوروبەری شاروشارۆچکە ٥

**العُری**: فەرماندەی سوپا ٥ لەبواری کشتوکاڵدا بریتیە لەکاتی چاندنی برێ جۆری سەوزە کە لەساڵێکدا زیاد لە جارێك دەچێندرێ ٥ دەگوترێ: (البطاطس تزرع في عروتين من السنة) پەتاتە ساڵی دووجار دەچێندرێ.

**العَريُّ**: شەوی سارد ٥ بای سارد.

**عَرِيَ** من ثيابه عُرياً وعريةً: پۆشاکی لەبەردا نەماو روت بوو لە پۆشاك ٥ (فهو عارٍ وعريان).

**عَرِيَ** من العيب: لە عەیبو خەوش سەلامەت بوو.

**عَرِيَ** بدنه من اللحم: جەستەی گۆشتی پێوە نەبوو.

**عَرِيَ** الفرسُ: ئەسپەکە زینی پێوە نەبوو.

**أعری** فلان: فلانکەس بە دەشتو سارادا ڕۆیی.

**أعری** فلان صديقه: فلانکەس لە دۆستو ناسیاوەکەی دوورکەوتەوە.

**أعری** فلاناً ثوبه ومن ثوبه: پۆشاکەکەی لەبەر فلانکەس داکەند.

**عاری** القومُ: خەڵکەکە بەبێ زین سواری ئەسپەکانیان بوون.

**عَرَّاه** ثوبه ومن ثوبه: پۆشاکەکەی لەبەر داکەند.

**عراه** من الأمر: لەکارەکە ڕزگاری کرد.

**تعرّی** من ثيابه: پۆشاکی خۆی داکەند، خۆی ڕوتکردەوە.

**تعرّی** من الأمر: خۆی لە کارەکە ڕزگاری کرد.

**إعروری** الفرسُ: بەمانا (عَرِيَ)دێ.

**إعروری** الرجلُ: پیاوەکە بەتەنها بەسارادا ڕۆیی.

**إعْرَوْرَى** الفَرَسَ: بەڕوتی سواری ئەسپەکە بوو ٥ دەشگوترێ: (فلان يعروري ظهور المَهَالِكِ) فلانکەس سواری پشتی کاری قورسو فەوتێنەر دەبێ، خۆدەخاتە ناوکێشەی قورسو سامناکەوە.

إعرَوری أمراً قبيحاً: پركێشی كارێكی ناشيرينی كرد.

التَعرية: روتبونی و شاخو بەردی توێكڵی زەوی بەهۆی بارانو باو و گەرمیو ساردی.

العَری: هەرشتێك شتێكت لێ نەدیو بكاو نەهێڵێ چاوت لێی بێ ٥ ناحیەو شوێن ٥ حەوشەو بەردەرگاو ماڵ ٥ دەگوترێ: (نزل بعُری فلان) لەماڵی فلان دابەزی.

العُريُ: (فرسٌ عري) ئەسپی پشت روتو بێ زین ٥ ناگوترێ: (فرس عريان) هەروا ناگوترێ: (رجل عُرّي).

العَراءُ: دەشتو سارا: كەهیچ شتێك لەبەردەميا نەبێو تا چاو بڕبكا ساراكە ببینی.

العُريان: دەگوترێ: (فلان عريان النَّجِيّ) فلانكەس نهێنی تێ ناوەستێو زوو دەری دەبرێو بڵاوی دەكاتەوە.

المعاري: كۆی (مَعرى) ئەوەی لە جەستە دەبینرێو داناپۆشرێ ٥ وەكوو دەمو چاو و دەستو پەنجەو قاچ تا قولەپێو بەلەك ٥ فەرشو قاڵیو بەڕەو مافوور ٥ شوێنێ رووەكی لێ نەروێ.

عَزَبَ الشَّيئ عزوباً: دووركەوتەوە، خۆی شاردەوە.

عَزَبَ فلان عزبة وعزوبة: فلانكەس عازەبەو ژنی نەهێناوە ٥ (فهو عازب) (ك: عُزّابٌ).

عَزَبَت المرأة الرجلَ عَزباً: ئافرەتەكە بە رێكو پێكی خزمەتی پیاوەكەی كرد.

أعزَبَ: دووركەوتەوە.

أعزَبَ الشَّيئ: شتەكەی دوورخستەوە.

عَزَّبه: دوری خستەوە.

عَزَّبت المرأة الرجل: ئافرەتەكە بەباشی خزمەتی مێردەكەی كرد.

تعَزَّبَ فلان: فلانكەس بێ ژنەو ژنی نیە ٥ دەگوترێ: (تَعَزَّبَ زماناً ثم تأهَّلَ) ئافرەتەكە ماوەیەكی دوورو درێژ عازەبو قەیرە بوو دوایی شوی كرد.

الأعزب من الرجال: پیاوێكە ژنی نەهێنابێ.

العَازِبةُ: (عَازِبَةُ الرجل) خێزانی پیاو كەبەباشی خزمەتی مێردەكەی بكا.

العَزَبُ: ئافرەتێك مێردی نەبێ یان پیاو ژنی نەبێ ٥ دەگوترێ: (إمرأة عَزَبةٌ) ٥ (ك: أعزاب).

العِزبةُ: مەزرەعەیەك كە خانوی خاوەنەكەی تێدا بێو خانووی وەرزێرەكان بەدەوری دا بنیات نرابن.

**العَزِيبُ**: دوور ◦ عازەب ◦ (ك:أعزاب).

**اَلمِعزابُ**: کەسێك زۆر قەیرە بێ‌و ژنی نەهێنابێ یان ئافرەت بێ‌و شوی نەکردبێ ◦ هەتا وای لێ هات ئارەزووی ژن هێنان یان شوکردنی نەمابێ.

**عَزَّرَ فلاناً عزراً**: سەرزەنشتی فلانی کرد ◦ یارمەتی دا.

**عَزَّرَ عن الشَّيِء**: مەنعی کردو نەیهێشت گێڕایەوە.

**عَزَّرَ علی فرائض الدین**: فێری کاروباری ئایینی کرد وای لێ کرد لەوبوارەدا شارەزای کرد ◦ سزای دا لەسەر کەمتەرخەمی کردن لە ئایین بە سزایەك نەگاتە سزای حەدی شەرعی.

**عَزَّرَه**: مەنعی کرد، گێڕایەوە ◦ تەمبێی کرد.

**عَزَّرَ القاضي المُذنِبَ**: قازی سزای تاوانبارەکەی دا ◦ ڕێزی لێ گرت‌و بەگەورەی حسێب کرد ◦ یارمەتی داو بەهێزی کرد ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾.

**عَزَّرَ علی فرائض الدین وأحکامه**: یارمەتی دا بۆ ئەنجامدانی پێویستییە ئایینیەکان‌و حوکمە شەرعییەکان.

**التَّعزیر**: لە زاراوەی شەرعدا، بریتییە لە تەمێ کردنی تاوانکار بە شێوەیەك نەگاتە ئەندازەی حەد.

**عَزَّ فلان عِزّاً وعِزَّةً وعزازة**: فلانکەس بەهێز بوو، لە زەلیلی‌و داماوی ڕزگاری بوو ◦ دەگوترێ: (عزّ فلان علی فلان) فلانکەس بەخشش‌و کەرەمی نواند بەسەر فلاندا.

**عَزَّ الشيءُ**: شتەکە کەم بوو وای لێهات دەست نەکەوێ.

**عَزَّ علي أن تفعل کذا**: پێم ناخۆشە ئەوە بکەی ◦ بەلامەوە گرانە ئەو کارە بکەی.

**عَزَّ فلاناً عَزّاً**: بەسەریدا زاڵ بوو، زۆر باری کرد ◦ بالادەست بوو ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ﴾.

**اعَزَّهُ**: بەهێزی کردو وای لێ کرد عەزیزو بالادەست بێ ◦ خۆشی ویست‌و ڕێزی لێ گرت.

**أُعزِزتُ بما أصابه**: پێم ناخۆش بوو تووشی ئەو جورتەو بەلایە بوو.

**عازَّهُ**: بەسەری دا زاڵ بوو.

**عَزَّزَهُ**: توندی کردو بەهێزی کرد پشتگیری بۆ نارد ◦ قورئان دەفەرموێ:﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾.

**إعتَزَّ به**: بەهۆی ئەوەوە ڕێزدار بوو،

خۆی بە عەزیزو بالآدەست لەقەڵەم دا.
تَعَزَّزَ فلان: بەمانا (عَزَّ)دێ.
استَعَزَّ الرملُ: لمبەکە یەکتری گرتو تێك ناڕوخێ.
استَعَزَّ بحق فلان: بەسەر فلآنکەسدا بالآدەست بوو.
استَعَزَّ علیه المَرضُ: نەخۆشی لەگڵو گۆی خستو بەسەریدا زاڵ بوو.
استَعَزَّ الله بفلان: خودا فلآنی مراند.
استَعَزَّ بالعلیل: نەخۆشیەکەی لەسەر قورسو گران بوو.
الأعَزُّ: بەمانا (عزیز) دێ بۆ مێینە دەگوترێ: (العُزّی).
العَزازُ: زەوی پتەو کە زوو لافاوی لەسەر هەڵسێ.
العُزّی: بتێك بوو تایبەت بوو بەبەنوکەنانەی قورەیشی ٥ یان درەختێك بوو لە درەختی سەمور کە بەنوقەحطان بینایەکیان بە دەوردا کردبوو دەیان پەرست، پێغەمبەر خالیدی کوڕی وەلیدی نارد خانووەکەی ڕوخاندو دارەکەشی بڕیو سوتاندی.
العَزَّةُ: بێچوە ئاسکی مێینە.
العِزَّةُ: هێزو تواناو دەسەلآت ٥ داکۆکیکردنو پارێزگاری لەبەها پیرۆزەکان، سەر ڕەقیو مل نەدان.
العَزیزُ: ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا ٥ بالآدەستو هەمیشە شکۆمەند، هیچ هێزێك نییە بەسەریدا زاڵ بێ.
عَزَفت نفسه عن الشيءِ عزوفاً: نەفسی لێی تەکیەوەو وازی لێ هێناو هیچ ئومێدێکی پێ نەما ٥ (فهو وهي عزوف) ٥ دەگوترێ: (هو عزوف عن اللهو) ئەو حەزی لە ڕابواردنو لەهو لەعب نییە.
عَزَفَ فلان عَزفاً وعَزیفاً: فلآنکەس بە ئامێر عەزفو مۆسیقای ژەنیو گۆرانی گوت ٥ دەشگوترێ: (عَزَفَ علی العود) بە ئامێری عود مۆسیقای لێ دا.
عَزَفَ الشَّيءُ: شتەکە دەنگی لێ هات ٥ دەگوترێ: (عَزَفَت الریحُ) (وعزفت القوس).
أعزَفَ: مۆسیقای بیست ٥ گوێی لە مۆسیقای عەزف بوو.
تعازفوا: گۆرانیان بۆ یەکتر گوتو شانازیان بەسەر یەکتریدا کرد.
العَزّافُ: (سحاب عَزّاف) هەورێکە گرمەو تریشقەی دەنگی دایەوە ٥ کەسێك پیشەی عەزف لێدان بێو بە ئامێری عەزف مۆسیقا بژەنێ.
العَزوف: کەسێك لەسەر دۆستایەتی

کەس بەردەوام نەبێو لەگەڵ هیچ کەسدا هەڵنەکا.

العَزیف: دەنگی وردە بەردو زیخە کە ڕەشەبا رایدەداو بەشتی دەکێشێو دەنگی لێ دێ ٥ دەنگی رەمڵو زیخە نازانی لە کوێوە دێ.

اَلمِعزَفُ: ئامێرێکی مۆسیقایە وەکوو عودو تەنبور وایە (ك: معازِف).

المِعزَفَة: بەمانا (المِعزَفُ)دێ.

المَعزوفة: پارچە مۆسیقایەکە لێ دەدرێ.

عَزَقَ الأرض عَزقاً: زەویەکەی شەق کرد.

عَزَقَ الحقل: گڵی کێڵگەکەی هەڵەو گێڕ کرد بۆ ئەوەی هەوا لێی بداو چیلکەو چەوێڵی لێ دور بخرێتەوە.

عَـزَقَ فلانـاً ضـرباً: بـاش بـاش لێـی دا، فلانکەسی شل شل کوتا.

عَزِقَ خلُقُهُ عَزقاً: ڕەوشتی ناشیرینو خراپ بوو.

عَزِقَ به الشّئ: شتەکەی پێوە نووسا.

أعـزَقَ فـلان: فلانکـەس بـە پاچـەکۆڵە یان بە پێمەڕە کاری کرد.

العَزیقُ: زەوی نەرمەڵانو دەشت.

المِعـــزَقُ: ئـــەو پـــاچو پێمـــەڕەو پاچـەکۆڵانەی بـاخو بێـستانی پـێ دەکێڵرێ.

المِعزَقَةُ: بەمانا (المِعزَقُ) دێ.

عَزَلَهُ عزلاً: دوری خستەوە، لایدا وەلای نا ٥ دەگوترێ:

عَزَلَـهُ عـن منـصبه: لـە پلـەو پایەکـەی هێنایـە خـوارێ ٥ جیـای کـردەوە ٥ دەگوترێ: (عَزَلَ الزوّان عـن القمـح) مرورەکەی لە گەنمەکە جیاکردەوە ٥ دەشـگوترێ: (عـزل المرضـی عـن الأصــــحاء) نەخۆشــــەکانیان جیاکردنەوەو لە شوێنێکی تایبەتی دا خـــستنیانە ژێـــر چـــاودێریەوە بۆئـــەوەی ســـاغەکان توشـــی نەخۆشییەکە نەبن.

إعتَـــزَلَ الـــشّئ وعنـــه: شـــتەکەی دوورخـــستەوەو لایـــدا ٥ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ لَّـمْ تُؤْمِنُـوا لِـي فَاعْتَزِلُونِ﴾.

إنعَزَلَ عنه: لێی لاکەوتو دوورکەوتەوە.

تَعـازَل القوم: خەڵکەکە لێـك دابـڕانو هەندێـــکیان لـــە هەندێـــکیان دوورکەوتنەوە.

تَعَزَّلَ الشّئ وعنه: بەمانا (إعتزل) دێ.

الأعزَلُ: مرۆڤی بێ چەك ٥ هەوری بـێ بـاران (ك: عُـزل وعُـزَّل) (الـسّماك الأعزل) بڕوانە مادەی (سَمَكَ).

العازِل الكهربائي: ناوەندێکە کاریگەری کارەبایی لەسەر نییە.

العُزُلُ: بەمانا (الأعزَلُ)دێ.

العـزلاءُ: شـوێنی هـەڵڕژانی ئـاوە لـە

زارکی گۆزمو کوپەوە ٥ (ك: عَزالي) ٥ دەگوترێ: (أرسلت السماء عَزاليها) ئاسمان بە لێزمەو ڕێژنە بارانی باراند ٥ (أرخس الدنيا عزاليها) دونیا لەززەتو نیعمەتەکانی زۆربوون.

**العُزلَة**: بەمانا (الإنعزال)دێ.

**المُعتزلة**: تاقمێکن لە موتەکەلمین، لە زۆر شت، دژی ئەهلی سونەو جەماعەن ٥ دامەزرێنەری مەزهەبەکەیان ناوی واصیلی کوڕی عەتایە ئەوەی لە مزگەوتی بەصرەدا دەرس بە دەورەی شێخ حەسەنی بەصری بەجێ هێشتو کەنارگیر بوو.

**المِعزال**: کەسێکە سیلاحی پێ نەبێ ٥ شوانی بەتەنیا ٥ کەسێک لەسەفەردا بەتەنیا لە ژورێکدا بخەوێو لە رەفیقەکانی دووربکەوێتەوە ٥ (ك: معازيل).

**المَعزِلُ**: گۆشەگیرو دوورە پەرێز دەگوترێ: (هو بمعزل عن كذا) ئەو لەو شتە کەنارگیرەو خۆی لێ دەپارێزێ ٥ شوێنێکە نەخۆشی تێدا جیادەکرێتەوە بۆئەوەی ساغەکان نەخۆشییەکە نەگرن.

**عَزَمَ** فلان عَزماً وعَزيماً وعَزيمةً: فلانکەس جیدیەتی نواندو بە دڵسۆزی لە گز کارەکەی ڕاچوو ٥ بەصەبرو پشوو درێژ بوو.

**عَزَمَ الله لي**: خودا صەبرو ئارامی پێ بەخشیوم هێزو توانای داومەتێ.

**عَزَمَ على فلان**: فەرمانی بە فلان کردو لێی توند کرد ٥ سوێندی خوارد.

**عَزَّمَ الراقي**: نۆ شتونووسەکە دووعاو نزای خوێندن.

**عَزَّمَ الأمر وعليه**: دوعاو نزای خوێندن.

**عَزَّمَ فلان الطريق**: فلانکەس ئەو رێبازەی گرتە بەرو کۆڵی نەدا.

**تَعَزَّمَ الأمر**: بەمانا (عَزَمَ الأمر)دێ.

**العَزّامُ**: ورەبەرزو سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی کار ٥ شێر ٥ خۆگرو پشوو درێژ.

**العَزمُ**: صەبرو ئارامو خۆڕاگری لەبەرامبەر ڕوداودا ٥ (أولو العزم من الرسل) ئەو پێغەمبەرانەی زۆر بە ورەبەرزیو صەبرو ئارامەوە ئەرکەکانی پێغەمبەرایەتییان بەجێ هێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾.

**العَزمةُ**: دەگوترێ: (هذا عزمة من عزمات الله) ئەمە مافێکە لە مافەکانی خودا لەسەر بەندەکانی ٥ (ك: عزائم).

**عَــزائم الله**: فــەرزو واجبــەكانى خــودا كەلەســـەر بەنـــدەكانى داينـــاون ٥ لەحەديسدا هاتووە: (إن الله يحب أن تُــؤتى رخــصه كمــا يحــب أن تــؤتى عَزائمه).

**عزا** فلاناً الى فلان عَزواً وعزيـاً: فلانكەسى پاڵ فلان داو وتـى: ئـەوە كورِى ئـەوە، پياوى ئەوە... ٥ دەگوترێ: (عـزا الخـبر الى صاحبه) هەواڵەكەى پاڵ خاوەنى داو بلاوى كردەوە.

**عَـزِيَ** عَـزَاءً: خۆراگرو پشوو درێـژ بـوو لەسەر ئـەو بـەلاو ناخۆشيانەى توشى هاتن ٥ (فهو عَزٌ عزيٌ).

**عَـــزَاءُ**: دڵنـــەوايى كـــردو هـــەوڵى دا بەصەبر بىَ‌و پشوو درێژ بىَ.

**إعتـزى إلى فـلان**: خـۆى پـاڵ فـلان دا، خۆى بە نەوەو وەچەى ئەو زانى.

**تعـازى القـوم**: خەڵـكەكە هەندێـكيان سەرەخۆشيان لە هەندێكيان كرد.

**تَعَـزّى فـلان تَعَزّيـاً**: فلانكـەس بـە زۆر لەخۆكردن هەوڵيدا واپيشان بدا كـە بەصەبرو خۆراگرە.

**تعزّى الى فلان**: خۆى پاڵ فلانكەس دا.

**تَعَزّى العربيُ**: كـابراى عـەرەب داواى لـە هـۆزو خێڵەكـەى كـرد بۆئـەوەى بـە هانايەوە بێن.

**العِزوةُ**: خـۆ نيـسبەتدان ٥ هـاواركردنى لىَ قەوماو لەهۆزەكەى.

**العِزيّةُ**: بەمانا (العِزوة)دىَ.

**المَعـزى**: شـوێنى سـەرە خۆشـى كـردن لەكۆست كەوتو.

**عَـسَبَهُ عـسباً**: نێرەكەرێـكى خواسـت بۆئـەوەى لـە ماينەكـەى بپـەڕێنىَ ٥ كەڵەگايەكى خواست مانگاكەى پىَ كەڵ بدا.

**أعـسَبَ الـذئبُ**: گورگەكـە بـازى داو قوچاندى.

**أعـسَبَ فـلان فلانـاً جَمَلَـهُ**: فلانكـەس حوشترە نێرەى لە فلان خواست بۆ تۆو بۆ كەڵدانى حوشترە مێيەكانى.

**إستَعْسَبَ منه**: ڕقـى لێـى بـوو ناخۆشـى ويست.

**استَعْـسَبَ الفـرسُ**: ماينەكـە حـەزى لـە (فەحل) بوو سوارى بىَ كەڵى بدا.

**استَعْـسَبَ جمله**: حوشـترە نێرەكەى لىَ خواست بۆئەوەى بيهاوێتە حوشـترە مێيەكانى.

**العُسبُ**: تۆوى (فەحل) تۆماوى وڵاخـى نێر بۆ كەڵدانى مێينـەكان ٥ نـەوەو زرِوێـتو منـداڵ ٥ دەگـوترىَ: (قطـع الله عُـــسبَهُ) خـودا دوا بـــڕاوت بكـا نەوەو زرِوێتت نەهێڵىَ.

**العَـسِبُ** (رأس عَـسِب): سـەرو قژێـكى زۆر ژاكـاوو نارێـكو پێـكە زۆر لـە مێـــژە چـــاك نـــەكراوەو بەشـــانە نەكراوە.

العَسَبَةُ: دەربەندو کەلێنی کێو.

ألعَسِيبُ: (عسيب الذنب) ئێسقانی کلك یان شوێنی لێ ڕوانی توك لێی ٥ لقی دارخورما توێکڵو پرژوپاڵی لێ داماڵدرێ ٥ یان هەر پرژوپاڵی پێوە نەبێ ٥ دەربەندو کەلێنی کێو ٥ (ك: أعسبة و عسب وعسبان).

عَسِيبة الذنب: ئێسقانی کلك.

أليَعسوب: پاشای هەنگ ٥ شاژنی هەنگ ٥ عەرەبەکان پێیان وابوو ئەو پاشای هەنگە دەبێ نێر بێ چونکە قەبارەی لەوانی تر گەورەترە ٥ دەشگوترێ: (هو یعسوب قومه) ئەو پاشاو سەرۆكو گەورەی نەتەوەکەیەتی ٥ (ك: یعاسیب).

العَوسَجُ: جۆرە ڕوەکێکی چقڵاویە لە پێری باینجانە ٥ بەرێکی خڕی هەیە وەکوو میروی مرواریوایە ٥ تاکەکەی (عوسجة)یە.

العَسجَدُ: ئاڵتون.

عَسَرَ الزمان عسراً: ڕۆژگارەکە زۆر ناخۆشو پڕ چورتمو کارەسات بوو.

عَسَرَت المرأة: ئافرەتەکە بەناخۆشی منداڵی بوو، ژانی بەئازاری توش بوو.

عَسَرَ المدينَ: تەنگی بە قەرزدارەکە هەڵچنیو داوای لێ کرد قەرزەکەی بداتەوە.

عَسَرَ فلاناً: لەلای چەپەوە هاتە لای فلان.

عَسِرَ الأمرُ والزمانُ عَسَراً: کارەکە قورس بوو، ڕۆژگار بوو بەکێشەو چورتمو بەڵاو کارەسات.

عَسِرَ فلان: فلانکەس لە کارەکاندا ڕەقیی نواندو لێبوردنی نەبوو.

عَسِرَ علیه الأمر: کارەکانی لێ تێکەڵاو بوو.

عَسِرَ فلانٌ: فلانکەس چەپلەر بوو هەر بەدەستی چەپی ئیشی کرد ٥ (فهو أعسَرُ وهي عسراء) (ك: عُسرُ وعُسران).

عَسُرَ الأمر عُسراً وعسارةً: بەمانا (عَسِر)دێ ٥ دەگوترێ:

عَسُرَ الزمانُ: ڕۆژگارەکە تەنگو چەڵەمەو ناخۆش بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ يَوْمًا عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيرًا﴾.

أعسَرَ فلان: فلانکەس هەژارو دەست کورت بوو، ژیانی تەنگو نارەحەت بوو.

أعسَرتِ المرأة: بەناخۆشیی منداڵی بوو.

أعسر المدين: بەمانا (عَسَر)دێ.

عاسَرَهُ: مامەڵەی توندی لەگەڵ کرد.

عَسَّرَ علیه: تەنگی پێ هەڵچنی.

عَسَّر علی فلان: سەرپێچی فلانی کرد دژی ئەو جوڵایەوە.

عَسَّرَ الأمر: کارەکەی قورس کرد.
عَسّر فلاناً: لەلای چەپەوە هاتە لای فلانکەس.
إعتسره: ژێر باری کردو ئیشەکانی قورس کردن ٥ دەگوترێ: (اعتسر الدابة) بە سرکیو ژێربارنەکراوی سواری ولاخەکە بوو (إعتَسَرَ من مالـه) لەماڵی خۆی خەرجی هەڵگرتو پێشی ناخۆش بوو، بەنابەدڵی لەماڵی خۆی خەرجی کرد.
إعْتَسَرَ الكلام: قسەکەی کرد بەبێ ئەوەی لێی ورد بێتەوە.
تَعاسَرَ الأمر: کارەکە قورسو گران بوو.
تعاسر البيعان: کڕیارو فرۆشیار نەگەیشتنە ئەنجام.
تعاسَرَ الزوجان: ژنو مێردەکە ڕێك نەکەوتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾.
تَعَسَّر الأمر: بەمانا (عَسِرَ)دێ.
الأعسَرُ: دەگوترێ: (أعسَرُ يَسَرُ) بە هەردوو دەست کاردەکا ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (عَسراءُ يَسَرَة) ٥ (حمام أعسَرَ) کۆترێکە بەباڵی ڕاستییەوە پەڵەی سپی هەیە ٥ (يوم أعسَرُ) ڕۆژێکی ناخۆشو سامناکە.
العَسراءُ: مێینەی (الأعسَرَ).
العُسرَةُ: دەست کورتیو هەژاری ٥ نەبوونی دارایی بۆ قەرزدانەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ ٥ (جيش العُسرَة): سوپای موسوڵمانان لەغەزای تەبوکدا ٥ (ساعَة العُسرَة) کاتی تەنگانەو ناخۆشی ٥
العُسرى: کاری ناخۆشو ئەرکی گرانو کردارو ڕەفتاری وەها کە سەربکێشێ بۆ سزاو ناخۆشی.
المِعسَرُ: ئەو خاوەن قەرزەی قەرزدارەکەی بەگیر دێنێ.
الَمعسَرَةُ: هەژاریو دەستکورتی.
الَمعسُورُ: بەمانا (العُسرُ)دێ.
عَسَّ فلان عَسّاً: فلانکەس شەوگەڕو عەسعەسو چاودێری جادەو کۆڵان بوو.
عَسَّ خَبَره عن فلان: هەواڵەکەی لە فلان دواخست زوو پێی نەگەیاند.
عَسَّ صاحبه: داوای هاوەڵەکەی کرد.
إعتَسَّ: بەمانا(عَسَّ) دێ.
إعتَسَّ الشَّئ: بەشەو داوای شتەکەی کرد ٥ هەواڵی شتەکەی زانی ٥ دەشگوترێ: (إعتسَّ الأثر) حەدیسەکەی گێڕایەوە.
العاسُّ: کەسێك بەشەو حەرەسی دەکاو چاودێری جادەو کۆڵانو ماڵو

ســامانی خەڵــك دەكــاو گومــان لێكراوان دەست نیشان دەكا ٥ (ك: عَسَسٌ و عُسَّاسٌ و عَسَسَةٌ).

**اَلعَسُّ**: دەگوترێ: (جاء الشَّيْ من عُسِّهِ وبَسِّه) ئەوەی هەبوو نەبوو هێنای.

**العَسَّاسُ**: بۆ زێدە ڕەوی لەمانای (عَسٌّ) دێ.

**العَسُوسُ**: گـەڕان بـە دوو نێـچیر ئـەو كەسـەی دەگـەڕێ بـە دوو نێـچیردا ٥ ئافرەتێــك بــێ چــاو و ڕووبــێو بەلایـەوە شـەرم نـەبێ لـە پیـاوی بێگانە نزیك ببێتەوە.

**العَسِیسُ**: گورگ.

**المَعَسُّ**: مەبەست ٥ دەگوترێ: (هو قریب المَعَسِّ) ئەو نیازو مەبەستی نزیكە.

**عَسعَسَ** اللیلُ: شـەو داهـاتو تـاریكی هێنا.

**عَسعَسَ** الذئبُ: گورگەكە شەو بـە دوو نێچیردا گەڕا.

**عَسعَسَ** السحابُ: هەور بەشەو لەزەوی نزیك بووە.

**عَسعَسَ** الأمر: كارەكـەی چەواشـەكردو تێكەڵو پێكەڵی كرد.

**عَسعَسَ** الشَّيْ: شـتەكەی جوڵانـد خستیە جەمو جۆڵ.

**تَعَسعَسَ** الذئبُ: گـورگ بەشـەو گـەڕا بۆئەوەی نێچیری دەست بكەوێ.

**العَسعاسُ**: هەرشتێ وەزنی سووك بێ.

**عَسَفَ** علی فلان ولفلان عَسفاً: كـاری بـۆ فلانكەس كرد ٥ دەگـوترێ: (هو یَعسِفُ ضَیعَتَهُم) ئەو چاودێری موڵـكو ماڵو ئیشو كاریان دەكاو بەڕێوەیان دەبا.

**عَسَفَ** الطریق: بە نـەشارەزایی بەڕێگاكەدا ڕۆیی.

**عَسَفَ** عنه: لێی دا.

**عَسَفَ** في الأمـر: بـەبێ لـێ وردبوونـەوەو تێفكرین ئیشەكەی كرد.

**عَسَفَ** فلانـاً: فلانكەسـی بەتونـدو تیـژی گرتو ستەمی لێ كرد.

**عَسَفَ** المرأة: دەسـت درێـژی كـردە سـەر ئافرەتەكەو ناموسی برد.

**عَسَفَ** الدَّمعُ الجفـون: فرمێسك هێرشـی هێنـاو لـە ڕێـڕەوی نائاسـایی خۆیـەوە هەڵڕژا.

**عَسَفَ** فلاناً: فلانكەسی كردە خزمەتكاری خۆیو ئیشی پێ كـرد ٥ (فهـو عاسـف وعسّاف وعسوف).

**أعسَفَ** فـلان: بەنەشـارەزایی بەشـەو ڕەوی كـرد ٥ كرێـكارەكەی بەئیـشی گران هەڵەوگیر كرد.

**عَسَّفَهُ**: ماندوی كرد.

**اعتسف** الطریـق وعـن الطریـق: بـەمانا (عَسَفَ)دێ.

**إعتَسَفَ** فلاناً: ستەمی لە فلانكەس كرد

◦ کاری پێ کرد خستیه سەر ئیش‌وکار.

إنعَسَفَ: لار بوو خوارو خێچ بوو.

تعَسَّفَ في الكلام: ویستی بەزۆر قسەو راو بۆچوونی خۆی بسەپێنێ.

تعَسَّفَ الطريق: بەنەشارەزایی بەرێگادا ڕۆیی.

تعَسَّفَ فلاناً: ستەمی له فلانکەس کرد.

التَّعاسيف: دەگوترێ: (هـو یركـب التعاسيف) ئەو بەرێگەی خوارو خێچدا دەڕوا.

العَسيفُ: کرێکاری سوکایەتی پێکراو ◦ (ك: عُسَفاء و عُسَف).

عَسِقَ بە عَسقاً: پێوەی نووساو داوێنی گرت‌و بەری نەدا ◦ وەگری بوو، خۆشی ویست.

عَسِقَ عليه: بە گیرە گیرو ئیلحاح داوای لێ کرد.

تعَسَّقَ بە وعليه: بەمانا (عَسِقَ)دێ.

ألعَسَقُ: لاری ◦ توندڕەوشتی ◦ تاریکی شەو.

العُسُقُ: ئەو خاوەن قەرزانەی تەنگ بە قەرزدارەکانیان هەڵدەچنن‌و داوایان لێ دەکەن قەرزەکانیان بدەنەوە.

العَسيقة: شەرابی خراپ کە ڕوون بێ‌و زۆر ئاوی تێکرابێ.

العُسقول: کارگ ◦ (ك: عساقل و عساقيل) ◦ لەبواری کشت‌وکاڵدا رەگێکی قەڵەوو فش بوو کە زۆر مادەی بژێوی لەخۆ گرتبێ وەکو پەتاتە.

عَسکَرَ القوم بالمکان: سەربازەکان لەو شوێنە کۆبوونەوە.

عَسکَرَ الليلُ: شەو تاریکیەکانی کەوتنە سەر یەك‌و بە تەواوەتی ڕەش داهات.

عَسکَرَ الشَّيْئ: شتەکەی کۆکردەوە.

العَسکَرُ: سوپا ◦ کۆبوونەوەی سوپاو شوێنی کۆبوونەوەی شتی زۆر لە هەرجۆرێك بێ ◦ دەگوترێ: (عسکر من رجال) (و عسکر من خيل) ◦ (وعسکر الليل): تاریکی شەو ◦ دەشگوترێ: (إنجلت عنه عسکر الهموم) غەمەکانی نەمان ◦ غەمە جۆرا جۆرەکانی نەمان ◦ (شهدتُ عسکرين) واتە: ئامادەی لێشاوی مرۆڤ بووم له عەرەفات‌و لە مینا ◦ (ك: عساکر).

العَسکَرَة: ناخۆشی‌و چورتم ◦ دەگوترێ: (وقعوا في عسکرة) کەوتنە ناو ناخۆشی‌و چورتمەوە.

العسکري: سەرباز ◦ تاکێك لەسوپا.

المُعَسکَرُ: سەربازخانە.

عَسَلَ الماء عسلاً وعُسولاً: ئاوەکە ڕەوان

بوو ٥ شڵەقا، شەپۆلی دا ٥ دەشگوترێ: (عَسَلَ الذئبُ والفرسُ) گورگەکە یان ئەسپەکە بازی دا لە بازدانەکەیدا هەڵبەزیەوە (فهو عاسل وعسول وعسّال).

**عَسَلَ** الطعام عَسلاً: خواردنەکەی تێکەڵی هەنگوین کرد.

**عَسَلَ** فلاناً: پێخۆری فلانکەسی کردە هەنگوین ٥ بەباشی باسی فلانی کردو وەسفی دا.

**عَسَلَ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی لای خەڵك خۆشەویست کرد ٥ پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (اذا أراد الله بعبد خیرا عسله في الناس).

**عَسَّلَتِ** النحلُ: هەنگەکە هەنگوینی کرد.

**عَسَّلَ** النائمُ: کابرا سەرە خەوێکی شکاند.

**عَسَّلَ** الطعامَ: هەنگوینی تێکەڵی خواردنەکە کرد.

**عَسَّلَ** القوم: هەنگوینی دەرخواردی خەڵکەکە دا.

**عَسَّلَ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی لای خەڵکی خۆشەویست کرد.

**عَسَّلَ** القومَ: خواردنی هەنگوینی دەرخواردی خەڵکەکەدا.

**استعسَلَ**: داوای بەخشینی هەنگوینی کرد.

**العَاسِلُ**: هەنگوین بڕ، ئەوکەسەی هەنگوین لە هەنگەڵان دەردێنێ ٥ گورگ ٥ (ك: عُسَّلٌ وعواسل وعُسلان) ٥ (مکان عاسِل) شوێنی هەنگوین ٥ ئەو شوێنەی هەنگوینی تێدایە.

**العَاسلة** (خلیة عاسلة): کۆڵەسە هەنگێك کە شانەکانی هەنگوینی تێدا بێ.

**العَسَّالُ**: دەرهێنەری هەنگوین لە شوێنی خۆی ٥ یان هەنگوین فرۆش.

**العَسالة**: پورە هەنگ ٥ هەنگ.

**العَسَلُ**: هەنگوینی ساغو بێ عەیب ٥ ئەوەی هەنگ لە ورگی خۆی دەری دێنێو دەیکاتە شانە هەنگوێنەوە ٥ دەشگوترێ: (فلان علی أعسال أبیه) فلانکەس لەسەر ڕەوشتو ڕێو شوێنی باوکی دەڕوا بەڕێوە.

**العَسلُ** الأسود: دۆشاوی وەرگیراو لە قەصەبی شەکر، کە پێی دەگوترێ: (قەند).

**العِسلُ**: (هو عِسلُ مال) ئەو زۆر لێزانە لەسەروکاری کردنی ماڵو ساماندا.

**العَسَلَةُ**: پارچەیەك لە هەنگوین ٥ دەشگوترێ: (ما أعرف له مَضربَ

عَسَلة) نايناسم‌و شارەزای بن‌و بنەچەی نیم‌و نازانم کوڕی کێیەو چ کەسە ٥ (ما ترك له مضرب عَسلة) جوێنی پێداو ڕەخنەی لێ گرت‌و بن‌و بنەچەی هەڵوەشاند.

العَسَلِيّ: هەر شتێك ڕەنگی هەنگوینی بێ.

العَسيلُ: کەسکی عەتر فرۆش‌و عەتارباشی کە دوکان‌و مەعمەلی پێ پاك دەکرێتەوە لەو ڕوەك‌و گژوگیایەی عەتری لێ دەرهێناون ٥ (ك: عُسلٌ).

المَعسَلَة: کۆلەسە هەنگ، پورە هەنگ.

المَعسولُ: شتی تێکەڵکراو بەهەنگوین ٥ (معسولة الکلام) دەم‌و لەفز شیرین‌و قسە خۆش ٥ (معسولة المواعید) وادە دروست‌و پابەند بوو بە پەیمانی خۆیەوە.

عَسلَجتِ الشجرة: درەختەکە چروزەی دەرکردن.

العِسلاجُ: چروزەی درەخت‌و تولە مێو کە تازەو ناسکن‌و خەڵقی ساڵن ٥ (ك: عساليج).

العُسلوجُ: بەمانا (العِسلاجُ) دێ ٥ (ك: عساليج).

عَسَمَ فلان عَسماً: فلانکەس تەماعی بوو ٥ دەگوترێ: (هذا أمر لا يُعسَمُ فيه) ئەمە شتێکە تەماعی تێدا نییە.

عَسَمَ فلان عَسماً: فلانکەس ئەوەی بەدەست هێنا.

عَسَمَ في الأمر: لە کارەکەدا هەوڵی داو تێیدا ماندوو بوو.

عَسَمَت عينه: چاوی فرمێسکی ڕژاندن.

عَسَمَ فلان بنفسه وسط القوم: فلانکەس خۆی هاویشتە ناو قەومەکەوەو تێکەڵیان بوو هیچ حیسابێکی بۆ نەکردن‌و لێیان نەترسا.

عَسِمَتِ القدمُ والکفُ عَسماً: قاچی یان دەستی لەمەچەکەوە وشك بوو هەتا خواروخێچ وەستا ٥ بۆ نێرینە دەگوترێ: (الأعسم) بۆ مێینە (العَسماءُ) (ك: عُسمٌ).

أعسَمَت عينه: بەمانا (عَسَمَت)دێ.

أعسَمَ يَدَهُ: دەستی وشك کرد.

أعسَمَ فلاناً: بەخششی دا بەفلان.

إعتَسَمَ: بەدەستی هێنا، کەسبی کرد.

العَسَمُ: نانی وشك ٥ (ك: عسوم).

العَسمة: تیکە نان، پاروە نان ٥ دەگوترێ: (ما ذقت إلا عَسمَةً).

العَسميُّ: ئەو کەسەی کاسبی باش بۆ ماڵ‌و منداڵی دەکا.

المَعسَمُ: شوێنی تەماع، شتێك کە تەماعی لێ بکرێ.

عَسَت يَدُهُ عُسواً: بەهۆی ئیشکردنەوە

دەستی زبر بوون.

**عسا** فلان عُسواً وعُسُوّاً: فلانکەس پیرو کەنەفت بوو.

**عَسّت** الليلُ: شەوەکە تاریکایی چڕ بووەو بوو بە هەنگوستە چاو.

**عسی** النبات عسياً وعُسِياً: بەمانا (عسا) دێ.

**عسی**: فیعلی (مقارەبە)یە مانای ڕەجاو هیوا دەگەیەنێ.

**عَسِيَ** فلان النبات: بەمانا (عَسَا)دێ.

**أعسی**: دەگوترێ: (ما أعساه بكذا) چەند شیاوی ئەو شتەیە.

**العَسِيُّ**: دەگوترێ: (هو عَسِيٌّ أن يفعل كذا) ئەو شیاوی ئەوەیە ئەو کارە بکا.

**عَشِبَ** المكانُ عَشباً: شوێنەکە گیاو گژی لێ ڕوا.

**عَشِبَ** الخبزُ وغيره: نانەکە وشك بووە.

**عَشُبَ** المكانُ عَشَابة: شوێنەکە گیاو گژی لێ ڕوا.

**أعشَبَ** المكان: بەمانا (عَشُبَ)دێ.

**أعشَبَ** القومُ: خەڵکەکە تووشی لەوەڕی تازە بوون.

**أعشَبَ** الإبلُ: حوشترەکە لەناو لەوەڕی تەڕو تازەدا لەوەڕا.

**عَشَّبَ** المكان: بەمانا (عَشُبَ)دێ.

**اعتَشَبَت** الإبلُ: حوشترەکە لەوەڕی تەڕو تازەی خوارد.

**تَعَشَّبَتِ** الإبلُ: بەمانا (إعتَشَبَت)دێ.

**إعشَوشَبَ** المكان: شوێنەکە لەوەڕی تەڕو تازەی لێ بوو.

**إعشوشبَ** القوم: خەڵکەکە تووشی لەوەڕی تازە بوون.

**التعاشيبُ**: پەڵە پەڵەی جیاجیا لە لەوەڕ ٥ دەگوترێ: (أرض تعاشيبُ) زەویەکە جۆرەها پەڵە لەوەڕی تێدان.

**العاشِب**: (مكان عاشِب) شوێنێکە لەوەڕی باشی لێیە ٥ (أرض عاشِبَة) زەویەکی پڕ لە گژوگیای تازە ٥ (حیوان عاشب) ئاژەڵێکە بژێوی گیاو گژە.

**العُشبُ**: لەوەڕی تەڕو تازە ٥ کە وشك بوو پێی دەگووترێ: (حشيش) پوش‌و پەڵاش ٥ لەبواری ڕوەك ناسیدا بریتییە لە ڕوەکێکی سەوزو تەڕو کەم خۆڕاگر ٥ (أعشاب).

**المِعشابُ**: (أرض مِعشابٌ) زەویەکی بەپیت‌و بەرهەمەو زۆری گژوگیا لێ دەڕوێ ٥ (ك: معاشيب).

**عَشَرَ** فلانُ: فلانکەس لە (دە) یەکێکی هەڵگرت ٥ یان لە ژمارە نۆ دانەیەکی زیاد کردو کردی بە (دە).

**عَشَرَ** القومَ: بوویە دەیەمینی گەلەکەی ٥

یان دەیەکی ماڵو سامانی لێ ستاندن ٥ دەگوترێ: (عَشَّرَ المالَ) بەزۆرو بەشێوەی ستەم دەیەکی ماڵەکەی بردن.

عَشَرَ الشَّيءَ: شتەکەی گەیاندە بیست کردی بەبیست.

أعشَرَت الناقة ونحوها: حوشترەکە دەمانگ بەسەر ئاوسبوونی دا تێپەڕی.

أعشَرَ القوم: خەڵکەکە بوون بە (دە).

عاشَرَهُ: هاوڕێیەتی کردو لەگەڵی تێکەڵاو بوو.

عَشَّرَ الحمارُ: گوێدرێژەکە لە سارادا زەڕاندیو زەڕاندنەکەی دووبارەو سێبارە کردەوە.

عَشَّرَ الغرابُ: قەلەڕەشەکە قیراندی.

عَشَّرتِ الناقةُ: حوشترەکە بوو بە (عوشراء) واتە سکی بوو بە دەمانگ.

عَشَّرَ العدد: ژمارە نۆی کرد بە ژمارە (دە) لە دوعاو پاڕانەوەدا دەگوترێ: (اللهم عَشِّر خطاي) خودایە! بەهەموو هەنگاوێکم دە چاکەم بۆ بنووسە.

عَشَّرَ القوم: دەیەکی ماڵو سامانی لێ وەرگرتن.

عَشَّرَ المالَ: دەیەکی ماڵی لێ ستاندن.

عَشَّرَ الشَّيءَ: شتەکەی کردە (دە) بەش.

إعتَشَرَ القوم: خەڵکەکە تێکەڵاو بوونو بوونە هاوەڵی یەکتری.

تعاشروا: بەمانا (إعتَشَرَ)دی.

العاشورُ: ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕەم.

عاشوراءُ: جۆرە حەڵوایەکە لە ئاردی گەنم دروست دەکرێ ٥ وادەبێ شیرو مێوژو شتی وایشی تێکەڵ دەکرێ.

عُشَارُ: دەگوترێ: (جاء القوم عشار) خەڵکەکە دەکەس دەکەس هاتن.

العشارةُ: پارچە لەهەر شتێک بێ ٥ (ك: عُشارات) ٥ دەگوترێ: (صار القوم عشارات) خەڵکەك بوونە پارچە پارچە.

العُشاريّ (لوبٌ عُشاريٌّ): قوماشێکە دەگەزی ٥ (غلام عشاري) گەنجێکی دەساڵانەیە.

العِشرُ: بەمانا (العُشارة) دێ ٥ (ك: أعشار).

العَشرُ: دە، (ژمارە دە) دەیەك کە لەبەروبوومی کشتوکاڵی وەردەگیرێ ٥ (ك: عشور وأعشار) ٥ (قِدرٌ أعشار) گۆزەیەکە بووە بە (دە) پارچە.

العُشراء من النوق: ئەوەیە حوشترێك بەسەر ئاوسبوونیدا دە مانگ تێپەڕ

ببـــێ ◦ (ك: عـــشار) قورئـــان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾.

العَـــشَرَة: یەكـــەم خانـــەی ژمارەیـــە ◦ دەگـوترێ: (عَـــشَرَة رجـــال وعـــشرُ النساء).

العِشرَةُ: تێكەڵاوی‌و هاوڕێیەتی.

العَشَّارُ: ئەو كەسەی باج لەسـەر كاڵا وەردەگرێ، گومرگ دەستێنێ.

عَشُوراء: بەمانا (العاشوراء)دێ.

العَـــشِيُ: بـــەمانا (العُـــشرُ)دێ ◦ (ك: أعشراء).

العَشِيرَة: هۆزو خێڵ، خزم‌و كـەس‌وكار ◦ (ك: عشائر).

المِعشار: بەشێك لە دە بەش.

المَعـــشَرُ: پێـــڕو تـــاقم‌و بـــەرە و ڕەگـــەز قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِـنِّ وَالإِنسِ أَلَـمْ يَـأْتِكُمْ رُسُـلٌ مِّـنكُمْ﴾ ◦ خزمـــی پیـــاو كـــەس‌وكاری نزیـــك لەپیاو ◦ (ك: معاشر) ◦ دەشگوترێ: (جاء القـوم مَعـشَرَ او مَعـشَرَ مَعـشَرَ) خەڵكەكە (دە) (دە) هاتن.

عَـــشَّ الطـــائرُ عَـــشّاً: باڵندەكـــە لەســـەر هێلانەكەی هەڵنیشت‌و مایەوە.

عَـــشَّ الـــشَيء: شـتەكەی داواكـرد ◦ كـۆی كردەوە.

عَشَّ القميصَ: كراسەكەی پینەكرد.

عَـــش المعـــروف: پیـــاوەتی‌و چـــاكەكانی كەمكردەوە.

عَشَّ بدنـه عـشاشة: جەسـتەی لـەڕو لاواز بوو.

أعَـشَّ الله بدنـه: خـودا جەسـتەی لاواز كرد.

أعَشَّ الله فلانـاً عـن حاجتـه: خـودا زوو پێویستی فلانكەسی هێنایە دی.

أعَـشَّ الظـبيَ وغـيره: ئاسكەكەی جاڕز كرد تەراندی.

عَشَّشَ الطائرُ: باڵندەكە لانـەی بۆخـۆی بنیات نا.

عَشَّشَ الأرضُ والعلأُ: زەوی‌و لەوەڕەكە وشك بوون.

عَشَّشَ الخبزُ: نانەكە كەڕوی هەڵهێنا.

عَشَّشَ فـلان الخبـزَ: فلانكـەس وازی لـە نانەكـە هێنـا تـا كـەڕوی هـەڵهێناو كەڵكی نەما.

إعـــتَشَّ الطـــائرُ: باڵندەكـــە هێلانـــەی دروست كرد.

إنعَشَّ القميصُ: كراسەكە پینەكرا.

العُشُّ: هێلانـەی باڵنـدە، ئـەو چیلكەو چـەوێڵەی كۆیدەكاتـەوە بۆئـەوەی بیكاتـە هێلانـە ◦ ئەگـەر هێلانەكـە لەســەر درەخــت بــوو ئــەوە پێــی دەگوترێ: (عُشّ) ئەگەر لەناو كونـە شـاخ‌و كونـە دیـواردا بـوو پێـی دەگوترێ: (وَكر) یان (وكَـنّ) ◦ (ك:

أعشاش وعشاش وعشوش).

**اَلعَشُّ**: بەمانا (اَلعُشُّ)دێ ٥ (ك: عِشاش وأعشاش) ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوێك نێسقانی دەستو قاچی نەرم بن.

**اَلمَعَشُّ**: مەبەست ٥ (ك: مَعَاشٌ).

**اَلمَعَشَّةُ**: زەوی تووندو پتەو و بەردەڵان ٥ (ك: مَعَاش).

**اَلعَشعَشُ**: هێلانەی یەك لەسەر یەك ٥ (ك: عَشَاعِش).

**عَشِقَهُ** عِشقاً وعَشَقاً: زۆری خۆشویست شەیدای بوو ٥ (فهو عاشق وهي عاشق وعاشِقة).

**عَشِقَ** بالشيئ: هۆگری بوو پێوەی نووساو لەگەڵی کەوت.

**عَشَقَ** الشَّيئ بآخر: لایەکی شتەکەی خستە نێوان پرژو پاڵی لایەکەی ترەوە.

**تَعَشَّقَ**: خۆی بەشەیداو عاشق نیشاندا.

**تَعَشَقَ** فُلانة: شەیدای فلانە ئافرەت بوو حەزی لێ کرد.

**العِشِّيقُ**: کەسێك زۆر عاشق بێ، شێتو شەیدا بێ.

**العُشُقُ**: ئەوکەسەی شەتڵە گوڵو شتی بۆنخۆش دەروێنێ.

**العَشَقَةُ**: درەختی لەبلاب.(ك: عَشَقٌ).

**العَشيقُ**: بەمانا شەیداو ئاشق دێ ٥ هەروا ناوە بۆ مەعشوقەو حەزلێکراوەکە.

**عَشِمَ** فلان عَشَماً وعَشَمَةً: فلانکەس تەماعی بوو.

**عَشِمَ** الشَّيئُ عَشماً وعشوماً: شتەکە وشك بوو.

**تَعَشَّمَ** الشَّيئُ: شتەکە وشك بوو.

**الأعشَم**: ئەو شتەی دوو ڕەنگی تێدا بن، بەڵەك بێ ٥ درەختی وشك بوو بەهۆی گڵە وشکەو تەپوتۆزەوە ٥ (وهي عشماء) دەگوترێ: (شجرة عشماءُ) درەختێکە وشکەڵی لە تەڕی زۆرترە.

**العَشَمَةُ**: تەماع ٥ وشکەوە بووی لەڕو لاواز.

**عَشَا** عَشواً: شەوکوێر بوو ٥ چاوی کەم بینایە ٥ ڕوی لێ وەرگێڕاو پشتی تێ کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾.

**عشَا** فلاناً: قەصدی فلانکەسی کرد.

**عَشَا** النارَ واليها عَشواً وعُشُوّاً: بەشەو ئاگری بینی چوو بۆلای بۆئەوەی ڕوناکایی بۆخۆی دابین کرد ٥ نان خواردنی ئێوارەی بۆ فلانکەس ئامادەکرد.

**عَشِيَ** عَشاً وعَشَاةً: شەوکوێر بوو ٥ (وهو أعشي وهي عشواء).

**عَشِيَ** فلان: فلانکەس شێوی خوارد، شێوی کرد.

**عَشِيَ عليه**: ستەمی لێ کرد.

**أعشى فلاناً**: خواردنی شێوی دایە ٥ شەوکوێری کرد.

**أعشى فلاناً الشَّيْءَ**: شتەکەی دا بە فلاّنکەس.

**عَشَّاه**: خواردنی ئێوارەی پێدا.

**عَشَّى عن فلان**: لەگەڵ فلاّنکەسدا هێدیو هێمن بوو.

**إعتَشَى فلان**: فلاّنکەس لەسەرەتای شەودا شەو ڕەوی کرد.

**إعتشى النارَ**: بەمانا (عَشاها)دێ.

**تعاشى**: وای دەرخست چاوی کزەو شەو کوێرە، وایش نیە ٥ دەشگوترێ: (تعاشى عنه) خۆی لێ نەزانو نەناس کرد.

**تَعَشَّى**: نانی شێوی خوارد ٥ لە پەنددا هاتووە دەڵێ: (تَغدَّ به قبل أن يتعشّى بك) دەسی خۆت پێش بخە بیکەرە پێخۆری بەیانی پێش ئەوەی تۆ بکا بە پێخۆری شێو.

**استعشاهُ**: کابرای بینی سەر لێ شێواو و حەیران.

**استَعشَى النار**: ئاگرەکەی کردە شارەزای ڕێگا بۆخۆی.

**ألعَشاءُ**: نان خواردنی ئێوارە، شێو.

**العِشاءُ**: سەرەتای شەو ٥ یان لە نوێژی مەغریبەوە تا دەگاتە کاتی شەوی زۆر تاریكو چڕ بوونەوەی تاریکی.

**العِشاءان**: مەغریبو عیشایە.

**العَشواءُ**: مێینەی (الأعشى)یە ٥ دەگوترێ: (هو يخبط خبط عشواء) ئەو شەوکوێرانە دەست دەکوتێو هیچی لێ دیار نیە وەکوو حوشتری شەو کوێر هەر پەلە کوتەیەتی ٥ تاریکی ئەنگوستە چاو ٥ دەگوترێ: (وهم في عَشواء من أمرهم) ئەوانە لە کاری خۆیان سەریان لێ تێك چووەو نازانن چی بکەن ٥ (رَكِبَ العشواء) کارەکەی شێواو شەوکوێرانە ملی نا.

**العَشْوَةُ**: نێوان سەرەتای شەو تا چواریەکی شەو ٥ تاریکی.

**العُشوَةُ**: تاریکی ٥ پریشکە ئاگر.

**العَشوَةَ**: مل نانە شت بەبێ شارەزایی.

**العَشِيُّ**: لە نێوان نیوەڕۆو خۆرئاوابوون ٥ یان نێوان خۆرئاوابوونو تێپەڕبوونی چواریەکی شەو.

**العَشِيَّةُ**: بەمانا (العَشِيّ)دێ.

**عَصَبَت الأسنان عَصباً وعُصوباً**: ددانەکان بەڵغیان گرت ٥ چڵکن بوون یان بەهۆی جگەرە خواردنەوە زەردبوون.

**عَصَبَ على الشَّيْءِ عَصباً وعصاباً**: دەستی بەسەر شتەکەدا گرت.

**عَصَبَ** به: دەورەی دا.
**عَصَبَ الريقُ بفيه**: تفی لەدەمدا وشك بوو.
**عَصَبَ الشَّيْءَ عصباً**: شتەكەی پێچایەوەو لـولی دا ٥ شـەتەكەی شـەتەك دا دەگوترێ: (عَصَبَ رأسه بالعِصابة) بە پەڕۆو لەفاف سەری پێچا.
**عَصَبَ الشجرة**: لق‌و پۆپی درەختەكەی لێك نزیك كردنەوەو بە حەبلێك بەستنی، ئەمجار ڕایوەشاند بۆ ئەوەی گەڵاكەیان هەڵوەرێ ٥ دەگوترێ: (عَصَبَهم الأمر) ڕوداوەكە یەكی خستن‌و كۆی كردنەوەو زیاتر كارەكەیان لەسەر گران بوون ٥
**عَصَبَ القُطنَ والصوفَ**: لۆكەو خوریەكەی ڕست.
**عَصَبَ الغُبارُ رأسَهُ**: تەپو تۆز سەری داپۆشی پێوەی نووسا.
**عَصِبَ اللَّحمُ عَصَباً**: گۆشتەكە ڕەگ‌و ڕیشەی زۆر تێدابوو.
**عَصِبَ القومُ به عَصباً**: خەڵكەكە لەدەوری كۆبوونەوە.
**عَصَّبَهُ**: بە پەڕۆو لەفاف شەتەكی دا.
**عَصَّبَ القومُ فلاناً**: خەڵكەكە فلانكەسیان كردە گەورەو سەرۆكی خۆیان ٥ (عَصَّبَ فلاناً) فلانكەسی برسی كرد ٥ لەناوی برد ٥ دەگوترێ: (عَصَّبته السِّنونُ) سالانی گرانی ماڵ‌و سامانەكەی لەناو برد.
**عَصَّبه بالسيف**: بە شمشێر لە تەپڵی سەری دا، لە شوێنی پێچی مێزەری دا.
**إعتَصَبَ**: سەری خۆی پێچا، مێزەرەكەی لەسەری خۆی پێچا.
**إعتَصَبَ القومُ**: خەڵكەكە بونە كۆمەڵ‌و تاقم‌و هێزیان پەیدا كرد.
**إنعَصَبَ**: توندبوو.
**تَعَصَّبَ**: پێچی سەری خۆی توندكردو شەتەكی دا.
**تَعَصَّبَ القوم عليهم**: خەڵكەكە كۆبومەوە سەریان.
**تَعَصَّبَ فلان**: فلانكەس خزم‌و كەس‌و كاری هەبوون ٥ دەگوترێ: (تَعَصَّبَ له وتَعَصَّبَ معه) یارمەتی دا.
**إعصَوصَبَ القومُ**: خەڵكەكە كۆبوونەوەو بونە تاقم‌و پێرێكی بەهێزو توانا.
**إعصَوصَبَ الأمر والشرُّ**: كارەكە قورس بوو شەڕەكە توند بوو.
**العِصابُ**: پەڕۆو لەفاف كە شتی پێ دەپێچرێ پەڕۆو مەندیل كە برین‌و شكاوی پێ ببێچرێ.
**العُصابُ**: تێكچونی دەروونی یان تێكچونی عەقڵییە.
**العِصابة**: بەمانا (العِصابُ) دێ ٥ مێزەر

• تاج • کۆمەڵێك ئادەمیزاد یان رەوە ئەسپ • یان کۆمەڵە باڵندە • (ك: عصائب).

العَصبُ: لە بواری زانستی عروزدا ساکن کردنی (لام)ی (مفاعَلَتن)ە.

العَصَبُ: ڕەگو دەماری جەستە کە جموژگەکان پێکەوە شەتەك دەدەن • چەند شێوە هەودایەکی سپی کە بەهۆیانەوە هەستو جوڵە لە مێشکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ جەستە.

العَصبَةُ: درەختی لەبلاب • (ك: عَصبٌ).

العُصبَةُ: کۆمەڵو پێرێك لە ئادەمیزاد • رەوە ئەسپو ماین • پۆلە باڵندە • قورئان دەفەرموێ: ﴿وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ﴾ • (ك: عُصَبٌ) • درەختی لەبلاب • (ك: عُصبٌ).

العَصَبَة: بەمانا (العُصبَةُ)دێ • تاکی (العَصَبَ).

عَصَبَةُ الرجل: کوڕو خزمو کەسوکار لەلایەن باوکییەوە • یان هۆزو خێڵێ کە کۆمەکی پێ دەکەنو پشتگیری لێ دەکەن • لەبواری فەرائیضو میرات دا بەو میراتگرانە دەگوترێ کە بەشی دیاریکراویان نییە بەڵکوو دوای میراتگرە خاوەن فەرزەکان چی مایەوە وەری دەگرن.

العَصَبِيُّ: ڕەگەز پەرستو دەمارگیر • ئەو کەسەی بە حەقو ناحەق پارمەتی خزمەکەی دەدا • تووڕەو خێرا هەڵچوو.

العَصَبية: پارێزەریو داکۆکیکردن لەو کەسەی کردویەتی بە وەکیل.

العَصيبُ: (يوم عصيب) ڕۆژێکی ناخۆشو پڕ تەنگانەیە • ڕۆژێکی زۆر گەرمو ناخۆشە • قورئان دەفەرموێ: ﴿هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾.

المَعَصَّبُ: گەورەو سەرۆك • هەژارو بێ سامان.

المَعصوبُ: کەسێك زۆری برسی بێ • شمشێری نایاب (معصوب الخلق): ئێسك ڕێكو پێكو جەستە توندوتۆڵ.

المَعصُوبة من النساء: ئافرەتی جەستە توندوتۆڵ.

عَصَدَ السهمُ عُصوداً: تیرەکە لار بۆوە • نیشانەکەی نەپێکا.

عَصَدَ العصيدة عصداً: پەلۆی دروستکرد.

عَصَدَ الشَّيئ: شتەکەی لار کردەوە.

عَصَدَ فلاناً على الأمر: تۆپزی لە فلان کرد بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

أعصَدَ العَصيدة: پەلۆی دروستکرد • (پەلۆو ئاردو ڕۆنو ئاوە تێکەڵ

بەیەك دەكرێن‌و دەكولێندرێن).

المِعصَدُ: ئەو ئەسكویّ‌و كەوچكەی پەڵۆی پیّ تێك هەڵدەدریّ.

عَصَرَ الشَّئ عَصراً: شتەكەی گوشی‌و چی تێدا بوو لە ئاو لە زەیت‌و شتی وا لێی دەرهێنا ٥ دەگوتریّ: (عَصَرَ الثوب و عَصَرَ الدُمَّلَ) كراسە تەڕەكەی گوشی ٥ كوان‌و دومەڵەكەی گوشی.

عَصَرَ الرَّكضُ الفَرَسَ: غاردان‌و بازدان عەرەقی بە ئەسپەكە كرد.

عَصَرَ الحَرُّ العود: گەرما شوڵە دارەكەی وشك كرد.

أعصَرَ: كەوتە كاتی عەسر.

أعصَرَتِ الفتاةُ: كچۆڵەكە گەیشتە تەمەنی گەنجی.

أعصِرَ القومُ: خەڵكەكە بارانیان لیّ باری.

عاصَرَ فلاناً: پەنای بۆ فلان بردو داوای كۆمەكی‌و پارێزگاریی لیّ كرد ٥ هاوچەرخی بوو ماوەیەك پێكەوە لەژیاندا بوون.

عَصَّرَ الزرعُ: كشت‌و كاڵەكە گوڵی كرد، پۆخی گوڵەكان دەركەوت.

عَصَّرتِ الفتاةُ: بەمانا (أعصرت)دیّ.

عَصَّرَ الشَّئ: جار دواجار شتەكەی گوشی.

إعتَصَرَ الماءُ: شتەكەی لەگەڵ ئاودا خواردو بەهۆی ئاوەكەوە پارووەكە قوت چوو.

إعتَصَرَ مِن الشَّئ: لە شتەكەی هەڵگرت.

إعتَصَرَ بالشَّئ: پەنای بە شتەكە برد، خۆی خستە پاڵی.

إعتَصَرَ الشَّئَ: شتەكەی گوشی.

إعتَصَرَ العصير: شەربەتی دروست كرد.

إنعَصَرَ: گوشرا.

تَعَصَّرَ: گوشرا.

تَعَصَّرَ فلانٌ: فلانكەس گریا.

الإعصار: ڕەشەبای بەهێزو گێژەڵۆكە ٥ لە بواری جوگرافیادا ناوچەیەكە لە پاڵەپەستۆ، ڕەشەباو گێژەڵۆكە كێش دەكا بۆ چەقی خۆی بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر لە نیوەگۆی باكوری زەوی دا ٥ ئەم ناوچانە بەوە دەناسرێن كە پاڵەپەستۆی هەوا تێیاندا دادەبەزیّ ٥ (ك: أعاصیر) ٥ لە پەنددا هاتووە: (إن كنت ريحاً فقد لاقيت إعصاراً) ئەگەر تۆ بای شەماڵی ئەوە گێژەڵۆكەو ڕەشەبا بەرەو ڕوت بوونەوە ٥ بە كەسێك دەگوتریّ خۆی بەئازاو گرنگ بزانیّ یەكێكی تری لیّ ڕاست بێتەوە بیبەزێنیّ.

العِصارُ: كات ٥ دەگوتریّ: (جاء على

عصار) لەکاتی خۆیدا هات ٥ تەپو تۆزی زۆرو بەهێز.

**العُصارُ**: ئەوەی دەدۆشری یان دەگوشری‌و شلەمەنی وەکو ئاو، شیر، هەنگوین، بنێشت‌و شتی وای لێ دەچۆڕێ ٥ دەشگوترێ: (أشنف فلان عُصارة أرضي) فلانکەس بەروبوومی زەویەکەی بردم ٥ (هو کریم العصارة) ئەو پیاوێکی نانبدەو سەخی ڕەوشتە ٥ (نِفایة ماعُصِرَ) تلپەی گوشراو.

**العَصرُ**: کاتی شۆڕبونەوەی خۆربەرەو ئاوابوون تاوای لێ دێ خۆر زەرد هەڵدەگەڕێ.

**صلاة العصر**: نوێژی کاتی عەسر.

**العَصران**: بەیانی‌و ئێوارە، شەو و ڕۆژ ٥ ڕۆژگار ٥ ماوەیەکی دیاریکراو لە مێژوو ٥ دەگوترێ: (العصر الجاهلي، العصر الإسلامي، العصر الأموي، العصر العباسي، عصر هارون الرشيد، عصر صدام حسين، عصر ملا مصطفى البارزاني).

**العُصرُ**: پەناگەو شوێنی ڕزگار بوون.

**العَصَرُ**: پەناگەو شوێنی ڕزگار بوون ٥ تەپو تۆز.

**العَصَرَةُ**: تەپوتۆزی زۆر.

**العُصرَةُ**: پەناگەو شوێنی ڕزگار بوون ٥ دەشگوترێ: (بلَّ المطر ثيابه حتى صارت عُصرَةً) باران پۆشاکەکانی تەڕ کردن تاوایان لێهات بگوشرێن ٥

**العَصّارة**: ئامێری شت گوشین، ئامێری میوە گوشین‌و قەصەبی شەکرو شتی وا.

**العَصيُّ**: ئەو شلەمەنیەی بەهۆی گوشرانەوە دەچۆڕێتە خوار.

**المِعصارُ**: ئەو ئامێرەی میوەی دەخەیتە ناوی‌و دەیگوشی بۆ ئەوەی ئاوی میوەکە بچۆڕێتە خوار ٥ (ك: معاصير).

**المَعصَرُ**: دەگوترێ: (هو كريم المَعصَرِ) ئەو پیاوە نانبدەو سەخی یە کاتێک داوای لێ بکرێ.

**المِعصَرُ**: ئامێرێکە بەروبووم‌و دانەوێڵەی تێ دەکرێ بۆ ئەوەی ڕۆنەکەی لێ دەربهێندرێ.

**المُعصِرُ**: کچۆڵەیەك بگاتە تەمەنی گەنجی.

**المِعصَرَةُ**: بەمانا (المِعصَرُ)دێ ٥ (ك: معاصِر).

**المَعصَرَةُ**: شوێنێک کونجی‌و ڕەشکەو شتی وای لێ دەگوشرێ بۆئەوەی ڕۆنەکەیان دەربهێندرێ.

**المُعصِراتُ**: هەور کە بای بەهێز پاڵە پەستۆیان دەداو بارانیان لێ دەبارێ

٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَـا مِـنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا﴾.

**العُـصعُصُ**: بنكـی كلـك ٥ بنكـی كلـك ئێـسقانە بـچكۆلەیەكە لـە كۆتـایی عەمودی بڕبڕەی پشت، پێـكدێ لـە سێ فەقەرە یان چوار.

**العَصعَـصَةُ**: ئازارێـكە لـە دەمارەكـانی جەستەدا پەیـدا دەبـێ یـان جـۆرە ڕۆماتیزمەیەكە لە سێبەندەدا پەیدا دەبێ.

**العُـصعوصُ**: بـەمانا (العُـصعُصُ)دێ ٥ (ك: عصاعیص).

**عَصَفَت الريحُ عَـصفاً وعُـصوفاً**: بایەكە بەهێز بوو، ڕۆیشتنەكەی زۆر تونـد بــوو بووبــە عاصــیفەو رادەر ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿جَاءتْهَـا رِيـحٌ عَاصِفٌ﴾ ٥ (ك: عواصف).

**عَصَفَت بهم الحربُ**: شەڕو شۆڕ لـەناوی بردن، دوابڕاوی كردن.

**عَصَفَ بهم الدهر**: ڕۆژگار لەناوی بردن.

**عَصَفَت الناقة**: حوشـترەكە پەلـەی كـرد خۆش ڕۆ بوو.

**عَصَفَ الشَّيْ**: شتەكە لار بوو.

**عَـصَفَ الـزرع عَـصفاً**: كـشتوكاڵەكەی دوریەوە.

**أعصَفَت الـريحُ**: بـەمانا (عَـصَفَت)دێ ٥ (فهي مُعصِف و مُعصِفَة).

**أعـصَفَ الـزرعُ**: كـشتوكاڵەكە گـوڵی كردو كاتی دروێنەی هات.

**أعـصَفَ المكـانُ**: شـوێنەكە كـشتوكاڵی زۆر بوو.

**العاصِفُ**: دەگوترێ: (یوم عاصف ولیلـة عاصــــفة) ڕۆژێــــكی ڕەشــــەبایە ٥ شەوێكی ڕەشەبایە.

**ســهم عاصِــف**: تیرێــكی نەهــەنگێوە نیشانەكەی نەپێكا.

**العُصافة**: وردە كاو پڵو پوش.

**العَصفُ**: بـەمانا (العُصَافة)دێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَالْحَـبُّ ذُو الْعَـصْفِ وَالرَّيْحَـــانُ﴾ ٥ یـــان دەفـــەرموێ: (فجعلـهم كعـصف مـأكول) گـەڵاو گـوڵی كـشتو كـاڵ ٥ غونـچە كـە دەكرێتــــەوەو گــــوڵو بەرەكــــەی دەردەكەوێ.

**العَـصفَةُ**: بـەمانا (العُـصافَة)دێ ٥ بـۆنی عەرەق.

**العَصیفة**: بەمانا (العُصافة)دێ ٥ خونچە كە گوڵەكەی تێدا كۆبببێتـەوە ٥ ئـەو گەڵایەی بەروبوومەكەی لەناودایە.

**عَـصفَرَ الثـوبَ**: قوماشـەكەی بـەڕەنگی زەرد ڕەنـگ كـرد ٥ بـە عوصـفور ڕەنگی كرد.

**تَعَصفَرَ**: بە ڕەنگی زەرد ڕەنگ كرا.

**العصفر**: ڕوەكێـكی هاوینەیە گوڵەكانی

لولەيين ٥ گوڵەكەی بۆ تامو تەوابیل بەكاردەهێنرێ بۆیاخێكی سوری لێ دەردەهێنرێ ئاوریشمی پێ ڕەنگ دەكرێ ٥ بۆ شتی تریش بەكاردێ.

**العُصفورُ**: چۆلەكە ٥ (العُصفورة) چۆلەكە مێینە ٥ ئێسقانێك لە ناوچەوانی ولاخە بەرزەدا هەڵبەزیوەتەوە لەلای ڕاستو چەپ پێیان دەگوترێ: (العصفوران) ٥ بزماری كەشتی ٥ (ك: عصافیر) ٥ دەگوترێ: (نَقَّتَ عصافیر بطنه) برسی بوو ٥ (طارت عصافیر رأسه) خۆی بە زلزانیو فیزی نواند.

**العُصفورة**: مێینەی (العُصفور) ٥ دارێكە لە شێوەی چۆلەكە دەرگای پێ دادەخرێ.

**عُصفورة الجمل**: دارێكی خوارە لەسەر پشتی حوشتر بارەكەی پێ شەتەك دەدرێ.

**العُصفوري من الجمال**: حوشترێكە دوو دوگی هەبن.

**العُصفورية**: جۆرە گوڵێكە لە پێری (جورەسیاتە) گوڵێكی هەیە دەشوبهێتە چۆلەكە بچكۆلە.

**عَصَلَ العود عَصلاً**: شتەكە لە ڕەقیو توندی خۆی خوار بوو دەگوترێ: (عَصِلَت ساقه) ٥ و (عَصِلَ ذنب الفرس) و(عَصِلَ النابُ) (فهو أعصَلُ وهي عصلاء).

**عَصَّلَ فلانٌ**: فلان تەمبەڵ بوو.

**عَصَّلَ العودَ**: دارەكەی خواركرد.

**العَصَلُ**: ڕیخۆڵە (ك: اعصال).

**العِصلُ**: بەمانا (العَصَلُ)دێ.

**العَصلاءُ**: ئافرەتی كزو لەڕ كە گۆشتی بەجەستەوە نەبێ.

**المِعصالُ**: گۆچانی خوار كە لقو پۆپی درەختی پێ دادەهێنی ٥ گۆچانی شەڕ لەمەیدانی سوارچاكیدا (صەولەجان) ٥ (ك: معاصیل).

**المِعصَلُ**: ئەو كەسەی تەنگ بە قەرزارەكەی هەڵدەچنێ.

**عَصلب الرجلُ**: پیاوەكە دەمار توندو تۆڵ بوو.

**العَصلَبُ**: پیاوی بەهێزو توانا و تێكسمڕاو.

**العَصلَبِيُّ**: بەمانا (العَصلَبُ)دێ.

**عَصلَجَ الشَّيْءُ**: شتەكە گران بوو و شێواو كەوتە چورتمو ناخۆشی.

**العَصلَجُ**: قاچ خوارو خێچ.

**عَصَمَ اليه عَصماً**: پەنای بۆ برد.

**عَصَمَ القِربة**: هەنگڵی بۆ كوندەكە دروست كردن.

**عَصَمَ الله فلاناً من الشرِّ**: خودا فلانكەسی

پاراست له شەڕو نەگبەتی.

**عَصَمَ** الشَّيْءَ: شتەکەی مەنع کرد.

**عَصِمَ** الحيوانُ عَصَماً وعُصمةً: حەیوانەکە قاچێکی سپییەتی تێدا بوو باقی جەستەی هەمووی ڕەش یان سور بوو ٥ (فهو أعصم وهي عصماء) (ك: عُصُمٌ) ٥ دەگوترێ:

**ظبيٌ** أعصَمُ وفرس أعصَمُ وغراب أعصَمُ: قەلە ڕەشێکی چنگو دەندوك سورە.

**أعصَمَ** به: دەستی پێوەگرت، دەگوترێ: (أعصَمَ بالفرس) دەستی بەیاڵی ئەسپەکەوە گرت.

**أعصَمَ** بفلان: پەنای بۆ فلاَنکەس برد (أعصم القِربة) هەنگڵی بۆ کوندەکە دروست کردن.

**إعتَصَمَ** به: داکۆکی لەخۆی کردو پەنای بۆ ئەو شوێنە برد ٥ تێیدا مانەوە بڕیاریان دا دەرنەچن مانیان گرتو داوایان کرد داواکاریەکانیان بۆ جێ بەجێ بکرێ ٥ دەگوترێ: (إعتَصَمَ الطلاب بكليتهم).

**إنعَصَمَ**: بۆ موتاوەعەی (عَصَمَهُ)دێ.

**إستَعصَمَ**: داوای خۆ پارێزی کرد.

**إستعصَمَ** به: بەمانا (إعتَصَمَ)دێ.

**العاصِمَةُ**: پایتەخت، بریتیە لە شارێك کە ببێتە سەنتەرو پایتەختی ولاَتێك، ئیقلیمێك ٥ (ك: عواصم).

**العِصامُ**: حەبلێکە کوندەی پێ شەتەك دەدرێو هەڵدەگیرێ ٥ هەنگڵی گۆزەو مەنجەڵو شتیوا ٥ (ك: عُصُمٌ، وأعصِمَة)

**العِصامي**: کەسێك خۆی خۆی پێبگەیەنێو ڕێزو نرخ بۆخۆی پەیدا بکا ٥ پێچەوانەکەی (العِظامي) کە بەکەسێك دەگوترێ بەهۆی ڕێزی باوكو باپیریەوە بناسرێ.

**العِصمةُ**: مەلەکەیەکی خوداییە ئادەمیزاد دەپارێزێ لە تاوانو کردەوەی خراپ ٥ پەیوەندی نێوان ژنو مێردو ئەو گرێبەستەی لە نێوانیاندا هەیە.

**المِعصَمُ**: مەچەك ٥ شوێنی بازنە لە مەچەکدا ٥ دەست ٥ (ك: مَعاصِم).

**عَصَاهُ** عصواً: بە گۆچان لێی دا.

**عَصَا** فلاناً: لە شەڕەگۆچاندا بەسەر فلاَنکەسدا سەرکەوت.

**عصَا** القَوْمَ: خەڵکەکەی کۆکردەوە لەسەر خێر یان شەڕ.

**عَصِيَ** بالعصا عَصاً: یاری بە گۆچان کرد وەکوو چۆن یاری بە شمشێر دەکرێ.

**أعصى** الكرمُ: دار مێوەکە تولەی کردنو ترێی نەگرت.

**عاصاه**: بە گۆچان لێکیان دا.

إعتصى على العصا: خۆی بەسەر عەصاکەیدا دا.
إعتصى الشَّيْءَ: شتەکەی کرد بە گۆچان.
العصا: ئەو شتەی لە دار یان لەشتی تر دەکرێ بە عەصاو خۆی بەسەردا دەدرێ ٥ (ك: عِصِيٌّ) ٥ هەروا ناوە بۆ ئێسقانی قاچو بۆ زوبان ٥ دەشگوترێ: (هو لَيِّن العصا و ضعيف العصا) ٥ هێدیو نەرمو نیانو سیاسەتمەداری رێکو پێکە ٥ (صُلب العصا شديد العصا) توندو تیژو رِق ئەستورە ٥ دەگوترێ: (شَقَّ العصا) لەریزی کۆمەڵ دەرچوو یاخی بوو ٥ (إنشقت العصا) کێشەو رِا جیاییان تێدا پەیدا بوو ٥
رَفَعَ عصاه: رِۆیشت (ألقى عصاه) جێگیر بوو نیشتەجێ بوو (قَرَعَ لە العصا) ئاگاداری کردەوە، (هۆشداری دایە.
العُصَيَّةُ: گۆچانووکە ٥ دەگوترێ: (إن العصا من العصيّة) کاری گەورە لەشتی بچکۆلەوە پەیدا دەبێ.
عَصاهُ مَعصيةً وعِصياناً: لە فەرمانبەرداری دەرچوو بەقسەی نەکرد (فهو عاصٍ و عَصَّاءٌ وعَصِيٌّ).
عاصاهُ: سەرپێچی فەرمانی ئەوی کرد.

إعتَصَت النواةُ: دەنکە میوەکە رِەق بوو.
تَعَصّى عليه: لێی یاخی بوو.
إستعصى عليه: بەمانا (تَعَصَّى)دی.
العِصيان: سەرپێچی کردنو مل نەدان بۆ یاساو فەرمان.
عَضَبَ عن الأمر عَضباً: وازی لەکارەکە هێنا، لە ئیشەکە زێوان بۆوە.
عَضَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی برِیەوە.
عَضَبَ الناقةَ: گوێی حوشترەکەی قلێشاند.
عَضَبَ فلاناً عن حاجته: فلانکەسی گێرِایەوەو پێداویستیەکەی بۆ جێ بەجێ نەکرد.
عَضَبَ فلاناً بلسانه: جنێوی بە فلانکەس دا.
عَضَبَ المرض فلاناً: نەخۆشی ماوەیەکی زۆر بە فلانکەسەوە نووساو لێی نەکەوتەوەو برِستی لێ برِیو لەجێ دا خستی.
عَضَبَ فلاناً بالرّمْحِ: بەرِمب لە فلانکەسی دا.
عَضَبَ بالعصا: بەگۆچان لێی دا.
عَضِبَ ذو الأذن: گوێچکە دارەکە گوێی شەق بوو.
عَضِبَ ذو القرن: شاخدارەکە شاخی شکا ٥ (فهو أعضَبُ وهي عَضباءُ) (ك: عُضبٌ) ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (نُهِيَ أن يُضَحَّى

بالأعضب القرن) پێغەمبەر (د.خ) نەهی کرد لەوەی ئاژەڵی شاخ شکاو بکرێ بە قوربانی.

**عَضُبَ** السَّيفُ عُضوباً وعضوبَةً: شمشێرەکە برندە بوو ٥ دەشگوترێ: (عَضُبَ اللسانُ) زمانی تیژ بوو.

**أعضَبَ** الناقة ونحوها: گوێی حوشترەکەی قەڵاشت.

**عاضَبَهُ**: بەرپەرچی دایەوەو مەنعی کرد.

**إنعَضَبَ** القرنُ: شاخی ئاژەڵەکە شکا.

**الأعضَبُ**: دەست کورتو بێ دەسەلات ٥ کەسێك یارمەتیدەری نەبێ ٥ کەسێك بێ برابێ (ك: عُضبٌ).

**العَضّابُ**: جنێو فرۆش ٥ کەسێك زۆر جنێو بدا.

**عَضبَرَ** الكلبُ: سەگەکە لاسایی شێری کردەوە.

**العِضبَارةُ**: بەردێکی گەورەی زۆر ڕەقە پۆشاکی لەسەر دەکوترێو دەشۆرێو سپی دەکرێتەوە.

**عَضَدَهُ** عَضداً: زەبری لە قۆڵی دا ٥ یارمەتی داو کۆمەکی پێ کرد.

**عَضَدَ** الشجرة عَضداً: درەختەکەی بە تەورداس بڕیەوە ٥ دەربارەی مەدینە لە حەدیسدا هاتووە: (نهی أن يعضد شجرها) نەهی کردوە کە درەختەکەی ببڕدرێ ٥ درەختەکەی کوتاو گەڵاکەی هەڵوەراند.

**عَضِدَ** عَضداً: دەردو نەخۆشی توشی قۆڵی بوو.

**عُضِدَ**: قۆڵی ئازارێکی پەیدا بوو.

**عاضَدَهُ**: یارمەتی داو کۆمەکی پێ کرد.

**إعتَضَدَ** بە: داوای یارمەتی لێ کردو خۆی پێ بەهێز کرد.

**إعتَضَدَ** الشيءَ: شتەکەی لەباوەش گرت.

**تعاضَدَ** القومُ: خەڵکەکە یارمەتی یەکتریان داو هەمئاهەنگی یەکتری بوون.

**تَعَضَّدَهُ**: لەباوەشی گرت.

**إستَعضَدَ** الثمرة: میوەکەی چنی.

**إستَعضَدَ** الشجرة: لقو پۆپی درەختەکەی داهێنانو بڕینی.

**الأعضَدُ**: قۆڵ باریك ٥ کەسێك دەستێکی لەوی تریانی کورتتربێ ٥ پیاو یان ئافرەتی کورتە باڵا.

**العَضادُ**: قۆڵ ئەستور ٥ پیاو و ئافرەتی کورتە باڵا.

**العِضادُ**: هەرشتێك لەقۆڵ ببەسترێ وەکو بازی بەندو سەعاتو بازنەو شتی وا ٥ ئاسنێکە وەکو داس لقو پۆپی درەختی پێ دادەهێندرێو دەبڕدرێ.

**العِضادَةُ**: دەوروبەری ڕێگا.

**عَضادتا النير**: ئەو دارەی دەکەونە ئەملاو ئەولای نیرەکە (واتە: دار کەڵەوە).

**عضادتا الباب**: دوو لاشیپانەی دەرگا ٥ ئەو دوو لاشیپانە لە ڕاستو چەپی درگاکەوە لە دیوارەکە چەسپ دەکرێو دەرگاکەی پێوە قایم دەکرێ.

**عضادتا الرجل**: دوو هاوڕێی پیاو ٥ یارمەتیدەرەکانی.

**العَضدُ**: هەڵپاچینو برینی پرژو پاڵی درەختەکەو ڕێکو پێک کردنی لقو پۆپەکانی.

**العَضدُ**: قۆڵ ٥ نێوان ئانیشکو شان.

**أعضاد المزارِع**: سنوری نێوان ئەم پارچە زەویەو ئەو پارچە زەویە ٥ یارمەتیدەر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُدًا﴾ ٥ دەگوترێ: (فَتَّ في عَضدهُ) لاوازی کرد ٥ (شَدَّ عَضُدَهُ) بەهێزی کرد ٥ تولەی مێو، تەرزە مێو ٥ خەڵفی ساڵ.

**العَضَدُ**: دەردێکە توشی دەستو قاچی حوشتر دەبێ ٥ کەرەگەڵای بڵاوەبوو ٥ ئەو پرژو پاڵەی لە لقو پۆپی درەخت دەکرێتەوە وەکو مێولاکو شتی وا ٥ (ك: أعضاد وعضود).

**المِعضادُ**: هەر شتێك لەقۆڵ بکرێ وەکوو بازنەو بازی بەند.

**المِعضَدُ**: بازنەو بازی بەندو هەرشتێکی تری لەو جۆرە.

**اليَعضيدُ**: ڕووەکێکی کێوییە دەشوبهێتە (هیندباء) لە زەوی تەڕو شێداردا دەڕوێ ٥ پێشی دەگوترێ: (أَجُعفَيض).

**العَضرَسُ**: تەرزە، سەرما، بەفر، هەروا ناوە بۆ ڕووەکێکی کێوی کە بە (الخطمي البري) دەناسرێو تەمەن درێژەو لەزەوی شێدارو تەڕدا لە وڵاتی ئەوروپاو ناوچەی موعتەدیلە دەڕوێ (ك: عضارس).

**عَضَّهُ وبه وعليه عَضًّا و عَضيضاً**: بە ددان گرتی، گەستی، گازی لێ گرت ٥ پێوەی نوساو لێی نەبووە ٥ پابەندی بوو دەستی لێ بەرنەدا ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء من بعد عَضّوا عليها بالنواجذ).

**عَضَّ فلاناً بلسانه**: بەخراپە باسی فلانکەسی کرد.

**عَضَّ الزمانُ الرجلَ**: ڕۆژگار پیاوەکەی گەستو چورتمو ناخۆشی بەسەردا هێنان.

**عَضّ** على يده حَنَقاً: زێده ڕەوی کرد لە دوژمنایەتیکردنیدا.

**عَضّ** على يده: پەشیمان بۆوە، دەستی خۆی گەست ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ﴾.

**أعضّت** الأرض: زەویەکە ڕوەکی چقڵاوی زۆر بوو.

**أعَضّ** فلان فلاناً الشّئ: فلانکەس وای لە فلان کرد ئەوشتە بگەزێ بە ددان بیگرێ ◊ ڕقی لێی بێو ناخۆشی بوێ.

**عَضَّضَ** الشّئ: شتەکەی زۆر ناخۆش ویست، زۆری ڕق لێبوو، زۆری گەست.

**العَاضُّ** (بعير عاضٌّ): حوشترێکە ڕوەکی چقڵاوی دەخوا.

**العَضاضُ**: ئەوەیە بەددان دەجورێو دەخورێ ◊ درەخت کە پتەو بێو لە حاڵەتی شلکەنەمامی دەربچێ ◊ (ك: عَضَضُ).

**العِضاضُ**: خۆگرو پشوو درێژ لەسەر چورتمو ناخۆشی.

**العُضُّ**: ڕوەکی چقڵاوی بچوك، پەیکوڵ.

**العَضوضُ**: حوشترێك لە لەوەڕی چقڵاویدا بلەوڕێ ◊ حەزی لە ڕوەکی چقڵاوی بێ ◊ ئەو شتەی بەددان دەگیرێو دەجورێو دەخورێ ◊ (ملكٌ عَضوض) فەرمانڕەوایی بەشێوەی ستەمکاری ◊ لە حەدیسدا هاتووە: (الخلافة بعدي ثلاثون سنة ثم يكون ملك عضوض) هەروا وشەی (العَضوض) ناوە بۆ ڕۆژگاری ناخۆش و پڕ ئاشوب و مەینەتی ◊ (ك: عُضَضٌ وعِضاضٌ).

**عَضَلَ** به الأمرُ عَضلاً: کارەکەی لەسەر قورس بوو گەیشتە بنبەستو دەراوی ڕونی نیە.

**عَضَلَ** عليه: تەنگی پێ هەڵچنیو بووە کۆسپ لەبەردەم ئامانجەکانیدا.

**عَضَلَ** المرأةَ: بە ناڕواو ستەمکاری نەیهێشت ئافرەتەکە شوبکا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾.

**عَضَلَ** فلاناً: زەبری لە ماسولکەی فلان دا.

**عَضِلَ** عَضلاً: ماسولکە قەوی بوو.

**أعضلت** الوالدة: دایکەکە بە ناخۆشی منداڵەکەی بوو ◊ یان منداڵەکەی لە منداڵدانی دا یاخی بوو.

**أعضَلَ** الأمرُ: کارەکەی قورس بوو گەیشتە بنبەست.

**أعضَلَ** الشّئ: ناشیرینیو خراپی شتەکە زۆر بوو، لە سنوور تێپەڕی.

**أعضَلَ الداءُ الأطباءَ**: دەردەكە هێندە كوشندەیە پزیشكەكانی دەستەوەستان كردوەو دەرمانی نادۆزنەوە، ناتوانن بەرەنگاری نەخۆشیەكە ببنەوەو چارەسەری بكەن.

**أعضَلَهُ فلان وأعضَلَ بە**: ئیشی فلانكەس زۆری ماندو كردو برستی لێ بڕی ٥ حەزرەتی عومەر فەرمویەتی: (أعضَلَ بي أهل الكوفة ما يرضون بأمير ولا يرضاهم أمير) خەڵكی كوفە زۆریان ماندو كردم بەهیچ كەس ڕازی نین ببێتە ئەمیرو كاربەدەستیان، هیچ ئەمیرو كاربەدەستێكیش لێیان ڕازی نیە.

**عَضَّلت الوالدة بولدها**: دایكەكە بە ناخۆشی منداڵەكەی بوو.

**أعضَلتِ الناقة**: حوشترەكە وەستاو توانای ڕۆیینی نەماو باری پێ نابڕێو بەكەڵكی سواری نەماو لەپەلو پۆكەوت.

**عَضَّلتِ الأرض بأهلها**: وڵاتەكە، زەویەكە بەدانیشتوانەكەی تەنگەبەر بوو، خەڵكەكە هێندە زۆر بوون جێگایان نابێتەوە.

**عَضَّلَ فلاناً وعليه**: تەنگی بە فلانكەس هەڵچنیو كۆسپو تەگەرەی خستە بەردەم ئامانجەكانی.

**عَضَّلَ المرأة**: بەمانا (عَضَلَ)دێ.

**تَعَضَّلَهُ الداء**: دەردەكەی بێ دەرمان بوو پزیشكەكانی نەیان توانی دەرمانی بۆ بدۆزنەوە.

**إستَعضَلَ الشَّيءُ**: شتەكە قورسو گران بوو بە بنبەست گەیی.

**العُضَالُ**: كاری لە توانادا نەبوو نائاسایی ٥ دەگوترێ: (داء عُضالٌ) دەردێكە دەرمانی نیە، پزیشكەكانی دەستەو سان كردەوە.

**العَضَلَةُ**: ماسولكەی جەستە.

**المُعضِلَة**: ڕێگایەك كە تەنگەبەر بێو ڕەوكردن پێیدا زەحمەت بێ ٥ مەسەلەیەك سەری لێ دەرنەكرێو نەتواندرێ حەل بكرێ.

**العَضمُ**: شەنە، ئامێرێكە لە دار یان لە ئاسن كلكی وەكوو كلكی خاكەنازەو لایەكی بە شێوەی شانە كەلكەلەو خەرمانی پێ شەن دەكرێ ٥ مەولەوی دەڵێ:

﴿خەرمانی خەمان ها وە بەرباوە
شەنكەر یەكێكەو دووشەن وەلاوە﴾

**عَضهَت الإبلُ عَضها**: حوشترەكە گەڵای درەختی چقڵاوی خوارد.

**أعَضَّهُ القومُ**: خەڵكەكە حوشترەكانیان گەڵای درەختی چقڵاوییان خوارد.

**أعضَهَت الأرضُ**: زەویەكە درەختی چقڵاوی زۆر بوو.

أعضَهَ الرجلُ: بەمانا (عَضَهُ)دێ.

عَضَهُ العِضاةَ: گەڵاو درەختی چقڵاوی خوارد.

العاضِهُ: ماری ژەهراوی پیسو کوشندە بە هەرشتێکەوە بدا یەکسەر دەیکوژێ ٥ حوشتر کە لە درەختی چقڵاوی گەڵا بخوا.

ألعاضِهَةُ: بەمانا (ألعاضِه)دێ.

ألعَضاهُ: هەر درەختێك چقڵاوی بێ پچوك یا گەورە.

ألعَضيهة: زەویەك زۆری درەختی (ألعَضاهُ) هەبێ ٥ بوختانو درۆ، قسەی بێ بنەما.

عَضا الشّيءَ عَضواً: شتەکەی پارچە پارچە کرد.

عَضّي الشّيءَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ دەگوترێ:

عَضّي القوم: خەڵکەکەی پەرتەوازە کرد.

العِضَةُ: تاقمو پێرو کۆمەڵ ٥ پارچە ٥ درۆ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾.

العَضو: ئەندام، ئەندامی جەستە ٥ ئەندامی حیزبو رێکخراو....هتد ٥ (ك: أعضاء).

العُضوية: سیفەتی ئەندامەکەیە لەناو کۆمەڵو پێرەکەدا.

عَطِب عَطباً وعطوباً: نەرم بوو، هێزی تێدا نەما.

عَطِبَ عَطباً: فەوتا تێداچوو لەکارکەوت ٥ خراپ بوو.

عَطِبَ البعيرُ والفرس: حوشترەکە یان ئەسپەکە تێ شکا.

عَطِبَ على فلان: رقی لە فلانکەس هەڵسا.

أعطَبَهُ: فەوتاندی.

عَطَّبَ الكرمُ: گرێی تولە میوەکانی دەرکەوتن.

عَطَّبَ الشرابَ: هەوڵی دا شەرابەکە وا لێ بکا بۆنی خۆش بێ.

إعتَطَبَ فلان: فلانکەس فەوتا.

إعتَطَب النارُ: ئاگری برد لەناو پارچە سواڵەتو قاپەشکاودا.

العُطبُ: لۆکە ٥ تیسکەلۆکە ٥ پارچە لۆکە.

العُطبَةُ: پارچە تەنەکە یان سواڵەتە شکاو یان قاپە شکاو پشکۆ ئاگری پێ دەگوێزنەوە لەم جێگاوە بۆ ئەو جێگا.

ألمَعطَبُ: شوێنی فەوتانو تێدا چون ٥ (ك: معاطب).

العُطبُلُ: ئافرەتی جوانی گۆشتنی خڕو خەپان ٥ ئاسکی گەردن درێژ ٥ (ك: عطابيل).

**عَطِرَ** عَطراً: به عەتر خۆی بۆنخۆش کرد.
**عَطَّرَهُ**: بەعەتر بۆنخۆشی کرد.
**تَعَطَّرَ**: به عەتر خۆی بۆنخۆشکرد.
**إستَعطَرَ**: بەمانا (عَطِرَ)دێ.
**العاطِرُ**: کەسێك زۆری حەز لەبۆنی عەتر بێ (ك: عُطرٌ).
**العِطارَةُ**: پیشەی عەتر باشی.
**العِطرُ**: هەرشتێك بۆنی خۆش بێو خۆی پێ بۆنخۆش بکرێ ٥ (ك: عطور وأعطار) ٥ ئەو ڕوەکانەی بۆنیان خۆشەو زەیتی عەتریان لێ دەردەهێندرێ.
**العَطِرُ**: شتی بۆنخۆش، هەرچەند شتی تری پێ بۆنخۆش نەکرێ.
**العَطّارُ**: عەتر فرۆش.
**المِعطارُ**: کەسێك زۆر خۆی بۆنخۆش بکاو عەتر بەکاربێنێ.
**المِعطيرُ**: بەمانا (المِعطارُ)دێ.
**عَطرَدَهُ**: کەرەستەو پێداویستی بۆ دابین کرد.
**عُطارِدُ**: ئەستێرەیەکە لە حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکانو لە هەموان زیاتر لە خۆر نزیکە ٥ گەورە خوای ناو چیرۆکە ئەفسانەییەکان ٥ خاوەنی زمانڕەوانیو بازرگانی.
**عَطَسَ الرجلُ**: پیاوەکە پشمی، پژمی ٥ فەوتاو لەناو چوو.
**عَطَسَ الصُبحُ**: بەیانی گزنگی دا.
**عَطَّسَه**: وای لێ کرد بپژمێ.
**العاطِسُ من الظباء**: ئەو ئاسکەی بەرەو ڕوت بێ ٥ بەیانی.
**العاطوسُ**: ئەو کەسەی شت هەڵدەمژێ بەلوت.
**العَطسَة**: هاوشێوە ٥ دەگوترێ: (فلان عَطسَة فلان) فلانکەس دەشوبهێتە فلانکەس لە جەستەو ڕەوشت دا.
**العَطوسُ**: ئەو کەسەی بانگهێشت دەکرێ بۆناو شەڕو جەنگ.
**المَعطِسُ**: لوت ٥ (ك: معاطس).
**المُعَطِّسُ**: تێشکاو.
**عَطِشَ** عَطشاً: تینووی بوو، هەستی کرد پێویستی بە ئاو خواردنەوەیە ٥ حەزی لێ بوو.
**أعطَشَ الرجلُ**: پیاوەکە مەڕو ماڵاتەکەی تینویان بوو.
**أعطَشَ فلاناً**: فلانکەسی تینو کرد.
**عَطَّشَهُ**: بەمانا (أعطشَهُ)دێ.
**تَعَطَّشَ**: خۆی تینو کرد، بە ئەنقەست ئاوی نەخواردەوە.
**العُطاشُ**: دەردێکە توشی ئادەمیزادو حەیوان دەبێ چەندێك ئاو بخواتەوە تێر ئاو نابێ.
**المَعطَشَةُ**: زەوی بێ ئاو ٥ زەوی بێڕون ٥ (ك: معاطش).

**عَـطَّ** الثـوبَ: قوماشـەکەی لـە درێـژەوە دادڕی ٥ یـان لـەباری پانیـەوە هـەڵی دڕی.
**عَطَّ** فلاناً الى الأرض: فلانکەسی بە زەویدا داو خستی.
**عَطَّطَ** الثوبَ: بەمانا (عَطَّهُ)دێ.
**إعتَطَّ** الشَّيْئَ: شتەکەی دڕی، قەلاشتی.
**إنعَطَّ** الثوبُ: قوماشەکە، کراسەکە دڕا.
**إنعَطَّ** العودُ: دارەکە چەمایەوە.
**عَطعَـطَ** القـومُ: خەڵـکەکە عیطـە عیطیان کردو وتیان: (عِيطِ عيطِ).
**عَطعَـطَ** الكـلامَ: قـسەکانی تێـکەڵاو کردن.
**عَطعَـطَ** الـذئبَ: دەنگـی گورگـەی داو وتی: (عاطِ عاطِ).
**العَطعَطَة**: هەراو هۆریـاو قـیڕەو بگـرەو بەردە لە گۆڕپانی شەڕدا.
**عَطَفَ** عَطفاً وعطوفاً: لاربـۆوە، خواربـوو ٥ دەشکوترێ:
**عَطَفَـت** الظبيـةُ: ئاسـکەکە ملـی خـۆی لارکردەوە.
**عَطَفَ** الى ناحيـة كـذا: مـەیلی بـۆ لاکـردو ڕوی تێ کرد.
**عَطَفَ** فلان عن كـذا: فلانکـەس لـەو شـتە گەڕایەوەو هاتە دواوە.
**عَطَفَت** الناقـة علـى ولـدها: حوشـترەکە سـۆزی بـۆ بێـچووەکە بـوو شـیری بـۆ هێنایەوە.
**عَطَفَ** عليه: بەزەیی پێدا هاتـەوە، عـەتفی بـۆ جـوڵا ٥ هەڵمـەتی بـۆ بـرد، بـۆی گەڕایەوە.
**عَطَفَ** الشَّيْئَ عَطفاً: شـتەکەی چـەماندەوە، لاری کردەوە.
**عَطَفَ** اللفظ على سابقه: وشەکەی لەبارەی ئیعرابەوە شوێن وشـەی پێشوو خـست بەهۆی حەرفی عەتفەوە.
**عَطَفَ** الله قلب السلطان وبقلبه على رعيته: خودا دڵی پادشای نەرم کرد بۆ ئـەوەی بەزەیی بە ڕەعیەتەکەیدا بێتەوە.
**عَطَّـفَ** الـشَّيْئَ: شـتەکەی خـوارکردەوە، لاری کردەوە.
**عَطَّـفَ** فلانـاً العِطـاف: پـاڵتۆی لەبـەر فلانکـەس کـرد وای لێـکرد پـاڵتۆ لەبەربکا.
**عَطَّفَ** الناقة: وای کرد حوشترەکە سۆزی بۆ بێچووەکەی هەبێ.
**إعطَّفَ** العِطاف وبه: پاڵتۆی لەبەر کرد.
**إعتطَفَ** السيف: شمشێری هەڵگرت.
**إنعَطَـفَ**: مـەیلانی کـرد، خـوار بـوو چەمایەوە.
**تعاطَفَ** القـومُ: خەڵـکەکە هەندێـکیان سۆزیان بۆ هەندێکیان هەبوو.
**تعـاطَفَ** فـلان في مِشيَته: فلانکـەس لـە ڕۆیـشتندا خـۆی بـادا قـۆرت پیـچی کردن.

**تَعَطَّفَ**: بەمانا (عَطَفَ)دێ.

**عَطَفَ عليه**: سیلەی ڕەحمی بەجێهێنا ٥ بەزەیی پێدا هاتەوە.

**عَطَفَ العِطافُ وبه**: پاڵتۆی کردە بەر.

**إستَعطَفَهُ**: داوای لێ کرد لەگەڵیدا بە سۆزو ڕەحم بێ.

**العاطِفَـــةُ**: خزمایەتی ٥ هۆکاری خزمایەتی ٥ پەیوەندی لەڕوی وەلائو ئازادکردنی بەندەو کۆیلە ٥ سۆزو خۆشەویستی لەبواری زانستی دەرون ناسیدا ئامادەباشی دەرونییە خاوەنەکەی هەڵدەنێ بۆ هەست کردن بە هەڵچونو داچونی تایبەتیو پەیڕەوکردنی سلوکێکی تایبەتی لەبەرامبەر (فکر) هزرێکی تایبەتی.

**العاطوف**: تەڵە.

**العطـاف**: پاڵتۆ ٥ فەرەنجی لەسەر هەموو پۆشاکێکەوە لەبەر دەکرێ بۆ خۆپاراستن لە سەرما ٥ (ك: عُطف وأعطفة).

**العَطّـافُ**: ڕەوشت جوانو خاوەن بەزەیی بۆ خەڵك ٥ ئەو کەسەی دالّدەی تێشکاوان دەدا.

**العَطَفُ**: تڕ تڕە، ڕوەکێکە گەڵاو لقو پۆپی نیە لە پێڕی (ألعَليقيـة)یە لە ڕوەکی تر دەهاڵێو بێ ڕەگو ریشەیە.

**العَطفُ**: لە زاراوەی نەحوییاندا ٥ دوو جۆری هەیە:

١- عەتف بەهۆی حەرفی عەتفەوە ٥ وەکوو (جاء محمد وعلي).

٢- عەتف بەیان وەکوو (رجع الى أرض الوطن رئيس اقليم كردستان مسعود البرزاني).

**العِطفُ**: تەنیشت ٥ جەستەی ئادەمیزاد لە پشتە سەریەوە تاخوار سێبەندەی ٥ ناوەڕاستی ڕێگاو ئەوسەری ٥ (ك: أعطاف وعطاف، وعُطوف) ٥ دەشگوترێ: (ثَنى عِطفَهُ) ڕوی وەرگێڕا پشتی تێکرد ٥ ڕۆیشت بە ڕێوە سەیری تەنیشتی خۆی کرد ٥ ڕۆیی‌و فیزی کرد، زۆری بەخۆشایی بوو.

**العَطـوفُ**: ئەو کەسەی تێشکاو و هەلاتوان داڵدە بدا ٥ ئافرەتێك خۆشەویستی مێردەکەی بێ ٥ حوشترێك سۆزی بۆ بێچوەکەی هەبێ.

**العَطيفُ**: ئافرەتێك نەرمو نیانو گوێ ڕادێری مێردەکەی بێ.

**المِعطَفُ**: پاڵتۆ ٥ (ك: معاطف).

**المُنعَطَفُ**: (مُنعَطَفُ الطريق) بەرزیو نزمی ڕێگا.

**عَطِلَ** عَطلاً وعَطولاً: خالّی بوو نەیبو.
**عَطِلَتِ المرأة**: ئافرەتەکە بێ خشڵو ئارایشت بوو.
**عَطِلَ الرجلُ**: پیاوەکە بێ ئیش بوو.
**عَطِلَتِ الإبلُ**: حوشترەکە بێ شوان بوو.
**عَطَّلَ الإبلَ**: حوشترەکەی بێ شوان بەرەڵا کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وإذا العِشارُ عُطِّلَت﴾.
**عَطَّلَ البِئرَ**: کەس نەچوە سەر بیرەکە بۆ ئاو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَبِئرٍ مُعَطَّلَةٍ وَقَصرٍ مَشِيدٍ﴾.
**عَطَّلَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە خشڵەکانی داکەند.
**عَطَّلَ الشيءَ**: شتەکەی خالّی کرد.
**عَطَّلَ الدار**: خانوەکەی چۆڵ کرد.
**عَطَّلَ الشريعة**: شەریعەتی خودای پاش گوێ خست، کاری پێ نەکرد.
**عَطَّلَ الثُغورَ**: سەنگەری سەر سنووری چۆڵ کردو سەربازی تێدا نەما.
**تعَطَّلَ**: بێ کار مایەوە.
**تعَطَّلَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە خشڵەکانی لەدەست دان لێی ونبوون.
**العَطَلُ**: مل (ك: أعطال) ٥ قەدو بالا ٥ دەگوترێ: (ما أحسن عَطَلَهُ) ئای کە قەدو بالای جوانە!.
**العُطُلُ**: ئافرەتی بێ خشڵ ٥ بێ ماڵو بێ رۆشنبیری ٥ (ك: أعطال).
**العُطلَةُ**: مانەوەی کرێکار بێ ئیش ٥ دەگوترێ: (فلان يشكو العَطَلَة) فلانکەس دادو بێ دادیەتی لەبەر بێ ئیشی ٥ ماوەی رۆژێك یان زیاتر فەرمانگەو قوتابخانە زانکۆکان تێیدا پشوو دەدەن.
**العَيطَلُ**: ئافرەتی مل درێژ، گەردن بڵند ٥ دەگوترێ: (إمرأة عَيطَلُ) ئافرەتێکی گەردن بڵندو بالا بەرزو روخسار جوانە.
**المِعطالُ**: ئافرەتێك دابو نەریتی وابێ خشڵ بەخۆدا نەکا، لەم رووەوە لەبەر جوانیەکەی حەوێجەی بە خشڵ نیە.
**عَطَنَت الإبلُ** عُطوناً: حوشترەکە دوای ئاو خواردنەوە لە نزیك ئاوەکە پیخی خواردو پاڵ کەوت.
**عَطَنَ الجلدَ** عَطناً: پێستەکەی خستە ناو تاڵو جەوتەوە.
**عَطَنَ الثِيلَ**: فریزو گیا چیمەنەکەو هەرێزەکەی خستە ناو ئاوەوە بۆئەوەی نەرم بێتەوەو رەگەکانی زیندوو ببنەوە
**عَطِنَ الجلدُ** عَطناً: پێستەکە بۆگەنی کردو رزی بەهۆی ئەوەوە فرێی دابوە ناو حەوزی دەباخەوەو ماوەیەکی زیاد لە پێویست جێی هێشتبوو.

**أعطَت الإبلُ**: حوشترەکەی ئاوداو پاشان لە نزیك ئاوەکە بیخی دا.

**عَطَّـنَ**: حـەوزی دەباخخانـەی دروسـت کرد.

**عَطِنَتِ الإبلُ**: بەمانا (عَطَنَت)دێ.

**عَطِنَ الجلدَ**: بەمانا (عَطَنَهُ)دێ ٥

**تَعَطَّنت الإبلُ**: بەمانا (عَطَنَت)دێ.

**العِطان**: زبڵ یان خوێو تاڵو جەوت کە دەکرێتە ناو پێستەوە بۆنەوەی بۆگەن نەکا.

**العَطَـنُ**: تەویلەو پشتیری حوشتر ٥ ئاغەڵی مەڕو بزن لە نزیك ئاوەوە ٥ (ك: أعطـان) ٥ دەگـوترێ: (ضـربت الإبلُ بِعَطَـن): حوشـترەکە تێـر ئـاوی خـواردەوەو لـە نزیکیـەوە بیخـی خـوارد ٥ (ضَـرَب فـلان بِعَطَـن) حوشـترەکەی ئـاوداو لـە نزیـك ئاوەکەوە بیخی داو مایەوە ٥ (فلان واسـع العَطَـنِ): فلانکـەس پـشوو درێـژو فـێڵ زانـە لـەکاتی چـورتمو کارەساتدا، ئانبدەو سەخی سروشتە ٥ پێچەوانەی (ضیق العَطَن).

**المَعطَـن**: بـەمانا (العَطَـنُ)دێ ٥ شـوێنی تەڕکردنو نەرم کردنەوەی (ئییەل) هەرێز.

**عَطـا الـشَّیءَ و الیـه عَطـواً**: وەری گـرت ٥ دەگوترێ: (عَطَا عرض أخیـه) ناموسی بـرای موسوڵمانی بـەخوێن وەرگـرت ٥ لـە حەدیـسدا هـاتووە دەفـەرموێ: (ان أربی الربا عُطو الرجل عَرض أخیـه بغـیر حق).

**عطا الیه یدە**: دەستی بەرز کردەوە بۆلای.

**عطا فلاناً**: لە بەخشەندەیی دا پێشبڕکێی فلانکەسی دا.

**أعطی البعیرُ**: حوشترەکە بەئاسانی ژێـر بار بوو.

**اعطی فلان بیـدە**: فلانکـەس هاتـە ژێـر بارو تەسلیم بوو.

**أعطـی فلانـاً الـشَّیءَ**: شـتەکەی دا بـە فلانکەس.

**عـاطاه الشَّیءَ معاطاة وعِطاءً**: شتەکەی دا بە فلانکەس.

**عَطَّاهُ**: پەلەی لێ کرد.

**تعاطی الرجل**: پیاوەکە لەسەر پەنجەی قاچی ڕاوەستاو دەستی هەڵبڕی بۆ وەرگرتن یان گرتنی شتێك.

**تَعاطی القومُ**: خەڵکەکە لە بەخشینو ئانبدەییـدا پێـشبڕکێیان کـردو باڵادەست بوون.

**تعاط الشَّیءَ**: شتەکەی وەرگرت.

**تعاط الأمرَ**: لە کڕ ئیشەکە ڕاچوو.

**إستَعطی**: داوای بەخششی کرد.

**العَطـاءُ**: ئـەوەی دەبەخـشرێ ٥ (ك:

أعطية) ٥ (أعطيات الملوك) بەخششی پاشاو مەلیك ٥ (أعطیات الجند) موچەو بژێوی سەرباز.
**العَطِيّة**: بەمانا (ألعطاء)دێ (ك: عطايا).
**ألمِعطَاءُ**: کەسێك زۆر بەخشندە بێ ٥ (ك: مَعاطٍ ومعاطي).
**ألمعطيات**: لەبواری فەلسەفەو مەنتیقدا بریتییە لە قەزایای سەلمێنراو بۆ گەیشتن بە قەزایای نادیار.
**عَظَرَ** السِّقاء ونحوه عَظراً: کوندەکە یان گۆزەکەی پڕ کرد.
**عَظَرَ** الشَّيءَ: شتەکەی ناخۆش ویست.
**أعظَرَهُ** الشراب: گۆزەکەی پڕکرد بۆئەوەی هەناسە نەدا.
**العِظارُ**: پڕکردنی شت لەشەراب.
**العِظارةُ**: بەمانا (العِظار)دێ.
**العِظارِيُّ**: نێرینەی کوللە (کوللە نێرە).
**العَظورُ**: گۆزەو جەڕەی پڕ لەشەراب ٥ (ك: عُظُرٌ).
**عَظَّه** بالأرض عَظّاً: بە زەویدا چەسپاند، نووساندی بەزەوییەوە.
**عَظَّ** الحرب والزمان فلاناً: شەڕو ڕۆژگار فلانکەسیان گەست داخیان کردوە، قاڵیان کردوە بە زبری ژیانی بەسەر برد.
**عاظَّ** القومُ مُعاظةً وعِظاظاً: خەڵکەکە لە شەڕدا زۆر توندو تیژ بوون.
**عاظ** فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس بوو درێژەی بە کێشەکەدا.
**عَظَلَت** الکلاب والسباعُ: سەگو درندەکان سواری یەکتر بوون لەیەك هەڵاتن.
**عاظَلَت** الکلاب والسباع: سەگو درندەکان سواری یەکتر بوون لەیەك هەڵاتن.
**عاظَلَ** بالکلام: قسەکانی گوشینو کەلامەکەی زۆر قورسو گران کردو گرێو گۆڵی تێدا دانا.
**عاظَلَ** الشاعِرُ في شعره: شاعیرەکە شیعرەکانی وا هۆنیەوە برێ شیعری بەبێ شیعرێکی تر مانای نەیەو نەزاندرێ.
**عَظَّلَ** القومُ: خەڵکەکە کۆبوونەوە.
**عَظَّلت** السباعُ ونحوها: درندەو شتی وا سواری یەکتر بوون لەیەك هەڵاتن بۆ زاوزێ.
**إعتَظَلت** السباعَ ونحوها: درندەو شتی وا سواری یەکتر بوون لەیەك هەڵاتن.
**إعتَظَلت** القوم علی الماء: خەڵکەکە لەسەر ئاوەکە پاڵەپەستۆی یەکتریان کرد.
**تعاظَلت** السباع ونحوها: بەمانا (عَظَلَت) دێ.

**تَعَظَّلَ** القومُ: خەڵکەکە خڕ بوونەوە.

**تَعَظَّلَ** فلان: بەدوادا چوونی بۆ شتێک کرد کە لەکیسی چووە.

**تَعَظْلَمَ** الليلُ: شەوەکە تاریك بوو بووبە شەوە زەنگ.

**العِظْلِمُ**: ڕووەکێکە صمغێکی شینی لێ دەردەهێنرێ پێی دەگوترێ: (ألنّيلة) ٥ هەروا ناوە بۆ شەوی زۆر تاریك و ڕەش.

**العَظْلَمَةُ**: تاریکی زۆر ڕەش و چڕ.

**عَظِمَـهُ** عَظماً وعَظمة: زەبری لە ئێسقانی دا.

**عَظَمَ** الكلبَ عَظماً: ئێسقانی دەرخواردی گەماڵەکە دا.

**عَظُمَ** الشَّيْءُ عِظما وعَظامَةً: شتەکە گەورە بوو.

**عَظُمَ** الرجلُ: پیاوەکە کەتەو زەبەللاح بوو ٥ شکۆمەندو گەورەو ڕێزدار بوو (فهو عَظيم) (ك: عظام و عُظماء).

**أعظَمَ** الأمر والقولُ الرجلَ: کارەکە یان قسەکە پیاوەکەی ترساندو سەرسامی کرد ٥ بە گەورەو ئەستەم هاتە بەرچاوی.

**أعظَمَ** الشَّيْءَ: شتەکەی گەورەکرد ڕێزو شکۆمەندی پێدا، بەگەورەو شکۆمەندی هاتە پێش چاو.

**أعظم** الكلبَ عَظماً: ئێسقانی دەرخواردی سەگەکە دا.

**عَظَّمَهُ**: گەورەی کردو ڕێزو شکۆمەندی پێدا.

**عَظَّمَ** الشّاةَ: لاکە مەڕەکەی کەرت کەرت کردو ئێسقانەکانی ورد کردن.

**تعاظم** فلان: فلانکەس گەورەیی بۆ خۆی ڕەچاو کردو لاسایی پیاوە گەورانی کردەوە.

**تعاظمَ** الأمرَ فلاناً: کارەکە لەسەر فلانکەس زۆر گەورە بوو ئیشەکەی لێ قورس بوو.

**تَعَظَّمَ**: خۆی بە زل زانی و فیزی کرد.

**إستَعظَمَ** فلانٌ: بەمانا (تعظم)دێ.

**إستَعظَمَ** الأمرَ: کارەکەی بە گەورەو قورس هاتە بەرچاو ٥ ئیشەکەی پێ ناخۆش بوو، بەدڵی نەبوو.

**إستَعظَمَ** الشَّيْءَ: زۆربەی شتەکەی وەرگرت، ئەنجامی دا.

**العِظامَـةُ**: ئەو پەڕۆو ئیسفنج و شتانەیە ئافرەت بە سمتی خۆیەوە دەیبەستێ بۆئەوەی سمتی گەورەو خڕ بنوێنن.

**العِظامي**: کەسێك شانازی بە بنەچەو باوك و باپیری خۆیەوە بکا ٥ پێچەوانەی (ألعَصامي)یە.

**العُظامَةُ**: بەمانا (ألعِظامة)دێ.

**العَظْمُ**: ئێسقان کە گۆشتی بەسەرەوە بێ، بە گۆشت داپۆشرابێ ٥ (ك: أعظم وعظام) (عَظْمَ الشيئ) زۆرینەی شت ٥ هەروا ناوە بۆ ئێسقانە بچکۆلەیەك لەخوار عەمودی فەقەرییەوەیە پێی دەگوترێ: کلێچە.

**عُظْمُ** الشَّيْئ: زۆربەی شتەکە.

**عَظَمُ** الطريق: ناوەڕاستی ڕێگاو تەختاییەکەی.

**العَظَمَة** من الذراع واللسان: ئەستورایی قۆڵ، ئەستورایی زوبان ٥ شکۆمەندیو گەورەیی ٥ سەربەرزیو گەشە.

**العَظَموتُ**: پیاوەتیو غیرەت، خۆ بەزلزانیو تەکەببور ٥ ڕوخۆشیو تەڕدەماخی.

**العَظْميُّ**: کۆتری سپی، کۆتری مەیلەو سپی.

**العَظيمةُ**: بەڵای بەشیدەت ٥ (ك: عظائم).

**اَلمعظَمُ** (معظم الشيئ): زۆربەی شت ٥ (ك: مَعَاظِمّ).

**اَلمَعَاظِمُ**: مافو سنورەکانی پەروەردگار.

**اَلمعظومُ**: بێچوە ئاژەڵ ئێسقانێك لە زمانی دایە دەشکێندرێ بۆئەوەی نەتوانێ شیر بخوا.

**عَظاهُ عَظْواً**: تیرۆری کرد، شلەمەنییەکی وای دایە بیکوژێ ٥ دەگووترێ: (أسقاه الله ما عظاه) خودا توشی شتێکی کرد گیانی دەربچێ ٥ لە خێرو خۆشی لایدا.

**العَظاءَةُ**: بیرۆیەکی خشۆکە چوار قاچی هەن، لە وڵاتی میسر پێی دەگوترێ: (السَّحلِيَّةُ) لە شام پێی دەڵێن: (السَّقاية) چەند جۆرێکی هەیە بەکوردی پێیان دەگوترێ قۆڕی، سەرما زەڵە، مارمێلکە.

**عَظي** الجَمَلُ عَظيً: حوشترەکە ورگی هاوسا بەهۆی خواردنی گیا ترشۆکە.

**عَفَتَهُ عَفتاً**: چەماندییەوە، شکاندیو دوولەتی نەکرد.

**عَفَتَ** يده وعُنُقَهُ: دەستی چەماندەوەو ملی خوارکردەوە.

**عَفَتَ** كلامه وفي كلامه: قسەکانی پچڕانو بڕبڕی تێدا بوو، بەهۆی لاڵیو توری قسەکانی بە ڕێكو پێکی بۆنەکرا.

**عَفَتَهُ** عن حاجته: لە پێویستیەکانی لایداو بۆی جێ بەجێ نەکردن.

**عَفِتَ عَفَتاً**: ئەحمەق بوو ٥ کە دانیشت زۆربەی شەرمگای دەرکەوت ٥ بەدەستی چەپی کاری کرد چەپلەر بوو ٥ (فهو أعفت وهي عفتاء) ٥ (ك: عُفتّ).

**العِفِتّانُ**: (رجل عِفِتّانٌ): پیاوی تەبیات توندو ئازاو بەهێز.
**العفِيتَهُ**: پەڵو ە ئاردو ڕۆنو ئاو تێکەڵ دەکــــرێو دەکوڵێنـــــدرێ ە (ك: عفائت).
**عَفَجَهُ** بالعَصا عَفجاً: بە گۆچان لە پشتیو لەسەری دا .
**عَفِجَ** عَفجاً: ڕیخۆڵەی ئەستوور بوون، هاوسان (فهو عَفِج واعفَجٌ وهي عَفِجَة وعَفجاءُ).
**تَعَفَّجَ** في مَشيه: لەڕۆیشتن دا قۆرتو پێچی کردن وەکو ڕیخۆڵە، وەکو گوریسی ناو هەمبانە خوارو خێچ بوو.
**العِفجُ**: ڕیخۆڵە ە (ك: أعفاج وعِفَجَة).
**المِعفاجُ**: گۆچان ە داری جل شۆرك، دارێکە جلی تەڕی پێ دەکوترێ بۆ ئەوەی پاك ببنەوە.
**المِعفَجُ**: ئەحمەقو گێل کە نەدەزانێ قسەبکاو نەکاری باش بکا.
**المِعفجةُ**: بەمانا (المِعفاجُ)دێ.
**عَفَدَ** عَفداً وعَفَداناً: قاچی جوت کردنو بازی دا.
**اعتَفَدَ**: دەرگای لەسەر خۆی داخستو داوای لەکەس نەکرد بۆئەوەی لە برسان بمرێ.
**عَفَرَ** عَفراً: لە گڵو خۆڵی دا گەوزاند، یان خستیە ناو گڵو خۆڵەوە ە بەزەویدا دا.
**عَفَرَ** الزرعَ: یەکەمجار کشتو کاڵەکەی ئاودا.
**عَفِرَ** عَفراً: ڕەنگی وەکو گڵو خۆڵی لێ هات.
**عَفِرَ** الرّجلُ: پیاوەکە لە ڕۆشتندا قاچی لەدوو نەهاتن.
**عَفِرَ** الظبيُ: ئاسکەکە سپیایەتی جەستەی تێکەڵی سوریی بوو ڕەنگی خاکی لێ پەیدا بوو ە (فهواعفر وهي عفراء).
**عَفَّرَ** الرّجلُ: پیاوەکە مەڕە ڕەشەکانیو حوشترەکانی تێکەڵی مەڕە سپیو حوشترە سپیەکان کردن.
**عَفَّرَت** المرأةُ في الفطام: ئافرەتەکە مەمکی خۆی قوڕاوی کردن بۆئەوەی منداڵەکەی قێزی لێ بکاتەوەو لە شیری ببڕێتەوە.
**عَفَّرَ** الشَّيءَ: بەمانا (عَفَرَهُ)دێ.
**عَفَّرَ** اللحم: گۆشتەکەی بەگەرمی خۆر لەسەر لبو بەرد وشك کردەوە.
**عَفَّرَ** النخلَ: لە تەلقیح کردنی دار خورماکان بۆوە.
**عَفَّرَ** الزرعَ: کشتو کاڵەکەی بە دەرمان ڕژاند بۆئەوەی جرو جانەوەری قەلاچۆبکا.
**عَافَرَهُ**: چەمبەرەی لەگەڵ بەستو

هەوڵیدا بیخاتە ناو گڵو خۆڵەوە.

عافر في الشّيء: لەگەڵ شتەکە خەریك بــوو بۆئــەوەی مەبەســتی خــۆی بەدیبێنێ.

إعتَفَرَ الـشّيءُ: شـتەکە تـەپو تـۆزاوی بوو.

إعْتَفَرَ الشّيءَ: شـتەکەی تـەپو تـۆزاوی کرد.

إنعَفَــرَ: خــۆی لــەناو گــڵو خــۆڵدا گەوزاند.

تَعَفَّرَ: بەمانا (إنعَفَرَ)دێ.

الأعفَرُ: ئاسك کە سپیایەتی لە سورایی زیـاتر بـێ ٥ کەسێـك شـەو بـەڕۆژ بکاتەوە بـە دڵەڕاوکێو خـەو زڕاوی پێـی دەگـوترێ: (بـات علـی قـرن أعفر).

العَفــارُ: موتوربــەکردنی خورمــاو چاکسازی تێـدا کردنـی بـۆ ئـەوەی بەری باش بگرێ ٥ درەختوکێکە لـە پێڕی (الأریکیة)یە میوەیەکی دەنـك ســوری هەیــە، ئــەم درەختــە چیلکەکەی زوو گڕ دەگرێ ٥ لەگـەڵ داری مـەرخ لێـکیان بـدەی وەکـوو شـقارتە ئـاگری لێ دێتــە دەر ٥ لــە پەنـدا هـاتووە: (في کـل شـجر نـار واسـتمجد المَـرْخَ والعفـار) هـەموو درەختێــك ئــاگری تێدایــە وەلێ درەختی مەرخو عـەفار لـە هـەموان زیاتر ئاگریان لەخۆ گرتووە.

العُفاریة: پیسو چڵکنو قیز لێکراو.

العَفَرُ: روی زەوی ٥ گڵ ٥ (ك: أعفار) ٥ یەکەم ئاودانی کشتو کاڵە.

العَفْـرُ: روی زەوی ٥ گڵ ٥ (ك: أعفـار) دەگـوترێ: (کــلام لا عفــر فیــه) قسەیەکە بـێ مانایە، مانـای جوانی لەخۆ نەگرتووە.

ألعِفــــرُ: شــتی پــیسو قێــزەون ٥ یەکانەبەراز، بەرازی نێر.

العُفرُ: ئازا ٥ کەتەو بەهێز ٥ (ك: أعفار وعفـــــار) ٥ دوریو کۆنەســـاڵی ٥ دیدەنی کردنی کەم ٥ دەگوترێ: (ما تأتینا إلا عـن عُفرٍ) کـەم کـەم نـەبێ نایەیتــە لامــان ٥ بـازاڕی کـەوتو و داوەشـــاو ٥ شـــەوی حەوتـــەمو هەشتەمو نۆیەمی مانگ.

العُفرُ: دوریو کۆنەساڵی.

العَفراءُ: زەوییەك پێ خۆست نـەکرابێ ٥ شەوی سیانزەی مانگ.

ألعِفراةُ: ئـەو موانـەی لـە تەوقەسـەری ئــادەمیزاد دەڕوێــن ٥ تــوکی پـشتەسەری شـێر ٥ (یـاڵی شـێر) ٥ پۆپنەی کەڵەشێر.

العُفرَةُ: سپیایی یـەك تێـکەڵ بـە سورایی ببێ ڕەنگی وەکوو ڕەنگی گڵی لێ بێ

٥ موی پشتەسەری شێر (یاڵی شێر)
٥ پۆپنەی کەڵەباب.
**اَلعَفَرَةُ**: بەمانا (العِفراةُ)دێ.
**العِفرُ**: پیس‌و فێزەون ٥ موی یاڵی شێر ٥ پۆپنەی کەڵەشێر ٥ (أَسَدٌ عِفرٌ) شێرێکی بەهێزو زەبەللاح.
**العِفرِيُّ**: بەمانا (اَلعِفرُ)دێ.
**اَلعُفُرَةُ**: خەڵکی تێکەڵ لە زۆر تاقم‌و پێڕ.
**العِفرِّين**: لێزان‌و کار دروست، ئیش لەدەست هاتوو ٥ (لیث عِفرِّينٌ) شێر ٥ پیاوی بەهێزو پێگەیشتو.
**اَلعِفرِيَةُ**: بەهێزو توانا، پیس‌و فێزەون ٥ پەڕو پۆڵی ملی کەڵەشێر ٥ موی پاشە سەری ئادەمیزادو وڵاخ ٥ قژی پێشەسەر (کاکۆڵ) ٥ دەگوترێ: (جاء فلان نافشاً عِفرِيَتَه) فلانکەس بە ڕق هەڵساویی هات.
**العَفَّارُ**: ئەو کەسەی پیشەی موتوربەکردنی دارخورما بێ.
**اَلعَفِيرُ**: ئەو کەسەی هیچ جۆرە دیارییەك نادا بەکەس ٥ گۆشتی برژێندراوو وشکەوەبوو لەسەر بەردو لمبەلان بەهۆی گەرمایی خۆرەوە ٥ (زرع العفير) پرژاندنی تۆوی کشتوکاڵ کە دەچێندرێ پێش ئەوەی ئاو بدرێ.
**اَلمُعافِرُ**: ئەو کەسەی لەگەڵ هاوەڵەکانی دەڕوا بۆئەوەی شتێکی لێیان دەست بکەوێ.
**اَلمَعفُورة**: بازاڕی کەوتوو بازاڕی بێ مامەڵە کە تەپ‌و تۆز کاڵاکانی داپۆشیبێ ٥ زەویەك گیاو گژەکەی خورابێ‌و گڵەکەی دەرکەوتبێ.
**اليَعفُورُ**: ئاسکی ڕەنگ خاکی ٥ گۆلکەڵەی مانگا کێوی ٥ بەشێك لە شەو ٥ (ك: يعافير).
**تَعَفرَتَ**: بووبە عیفریت.
**العِفرِيتُ**: پیسی‌و چڵکنی‌و فێزەون ٥ کار ڕۆیشتو و لێزان ٥ (ك: عفاريت).
**العَفَازُ**: گوێزی خوراو ٥ تاکەکەی (عَفَازَةُ).
**العُفازَةُ**: ناوکی لۆکە.
**عَفَسَه عَفساً**: بە زویدا داو ژێر پێی خست‌و شێلای ٥ زەبری لە سمتی دا ٥ لە ئیشەکەی گێڕایەوە ٥ بەندی کرد ٥ سوکایەتی پێ کرد.
**عافَسَ الأمور معافَسَةً وعِفاساً**: لە گژ کارەکەی ڕاچوو ٥ دەستی دایە ئیشەکەی.
**إعتَفَسَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە بەرەبەرەکانی یەکتری‌و یەکتریان کوشت.

معزق
عرناس
عرقية
معصم
عروة الإبريق
عروة الثوب
عش
عضادتا الباب
عصا
معضاد
عضد
الإعصار
عصابة
عكاز الأسقف
عقال
عقد
معفجة
معطف
عفج
عضم
عقد
عرنوس الذرة
عسقل
يعسوب
عكس
عفص
عفصية
عوسج
عصفور
عظاءة
يعسوب النحل
عقاب
عقرب
عصبات الأجنحة

إنعَفَسَ في الماء: خۆی لەناوەکەدا نوقم کرد ٥ خۆی لەناو گڵو خۆڵدا گەوزاند.
تَعافسوا: شەڕو بەگژ یەکدا چوونیان کردە پیشەی خۆیان هەمیشە لەناو خۆیاندا شەڕو هەرایانە.
عَفَشَ الشَّئَ عفشاً: شتەکەی کۆکردەوە.
الأعفَشُ: شەو کوێرو کوێرە مشە.
العُفاشة: ئادەمیزادی بێ خێرو بێر.
عَفَصَ الشَّئَ عَفصاً: شتەکەی داهێناو چەماندی ٥ دەگوترێ: (عَفَصَ یده) دەستی خوارکردەوە، چەماندیەوە ٥ دەریهێنا ڕیشە کێشی کرد.
عَفَصَ القارورةَ: سەرپۆشی خستە سەر دەمی گۆزەکە.
أعفَصَ الحِبرَ: مازوی خستە ناو مەرەکەبەکەی.
عَفَّصَ الثوبَ: کراسەکەی بە مادەی (العَفص) ڕەنگ کرد.
العِفاصُ: پەڕۆیەکە سەری گۆزەو دیزەی پێ دادەپۆشرێ، هەمبانە، تێشودان: کە شوان نانو خۆراکی خۆی تێدا هەڵدەگرێ.
العَفصُ: داربەڕو ٥ بەری دار بەڕو ٥ مازو و گزگلكو سیچکە ٥ دەرمانی سکچوون لەو بەرە دارانە دروست دەکرێ ٥ هەروا بۆ دروستکردنی حیبرو ڕەنگو شتی وا بەکار دەهێندرێ.
العَفَصُ: لوتگێران، خواریی لە لوت دا.
عَفَطتِ العَنزُ أو الضَّأنُ: مەڕەکە یان بزنەکە جرتی لێ دا ٥ پژمی ٥ دەگوترێ: (هو لا یساوي عفطة عنز) ئەو ترێکی بزن ناهێنێ.
عَفَطَ الراعي بغنمه عَفطاً: شوانەکە بە دەنگێك کەوەکو جرت لێدان بێ دەنگی ئاژەڵەکانی دا بۆنەوەی دەریان بکاو ڕایان جمێنێ.
عَفَطَ فلان بشفته: فلانکەس بە لێو جرتی لێ دا.
عَفَطَ في کلامه: بەعەرەبی قسەی کرد بەلام بە زمانێکی خوارو نارەوان ٥ (هو عافِط وعَفّاط).
عَفَّ عِفَّةً وعفافاً: وازی لەکارو گوفتاری نارەوا هێنا ٥ (فهو عَفٌّ وعفیفٌ) ٥ (ك: أعِفَّة، وأعفّاء) ٥ دەگوترێ: (هم أعِفَّة الفقر) ئەوانە ئەگەر هەژاریشبن سواڵ ناکەن.
عَفَّ اللبنُ عَفّاً: شیرەکە لەگوانی ئاژەڵەکەدا کۆبوەوە.
أعَفَّه الله: خودا بەدووری کرد لە حەرام و نارەوا.
أعفّت الشاةُ: مەڕەکە جۆڕ جۆرە شیری

لەگوانیدا کۆکردەوە.
**عَفَّفَهُ**: شیری کەمی دەرخوارد دا.
**إعتَفَّ**: بەمانا (عَفَّ) دێ.
**تَعَفَّفَ**: بەمانا (عَفَّ) دێ ٥ بەزۆرە ملێ پاکداوێنیو کارو گوفتار باشی بەسەر خۆی دا هێنا ٥ شیری کەمی خواردەوە.
**إستَعفَفَ**: بەمانا (عَفَّ)دێ.
**العُفافُ**: چۆرە چۆرە شیر کە لەگوانی ئاژەڵەکەدا کۆدەبێتەوە پێش ئەوەی زۆر بێ ٥ یان پێش دۆشینی.
**العُفَّةُ**: ماسی بچکۆلەی سپی ڕوت.
**العِفَّـةُ**: وازهێنانو دورکەوتنەوە لە هەرشتێك ناڕەوابێ ٥ دوایی تایبەت کراوە بۆ داوێنپاکیو شەرواڵ پاکی.
**العَفیفَـةُ**: ئەو ئافرەتەی ڕەوشتی داوێنپاکی هەیەو لەکاری ناڕەوا خۆی بپارێزێ ٥ ئافرەتی خاتونو ڕەنگ ژن.
**عَفَقَ** فلان عَفقاً: فلانکەس زۆری هاتووچۆ کرد بەبێ هودە کەمێك نوستو بەخەبەر هاتو پاشان نوستەوە.
**عَفَـقَ** فلانـاً بالسوطِ: بە قامچی لە فلانکەسی دا.
**عَفَقَ** الشَّيءَ: شتەکەی کۆکردەوە.
**عَفَقَ** العملَ: کارەکەی بەخراپی ئەنجامدا.
**عَفَـقَ** العـازفُ الـوتر: مۆسیقا ژەنەکە دەستی لەوەتەرەکان توند کردو بەهێز پەنجەی پێدانا.
**أعفَقَ**: زۆر هاتو چوو بەبێ سود ٥ یان بەبێ ئیش هاتو چوو.
**عافَقَهُ** مُعافقَةً وعِفاقاً: موعالەجەی کرد ٥ فێڵی لێ کرد.
**عـافَقَ** الذئبُ الغنم: گورگ کەوتە ناو مەڕەکەو تەفرو تونای کردن.
**عَفَّـقَ** الغـنم: مەڕەکەی بەسەر یەکدا دایەوە، تێکی کردنەوە خڕی کردنەوە.
**إعتَفَقَ** الشَّيءُ: شتەکە دوای هەڵچوونو ڕاست قامەتی، چۆمایەوە، خوار بۆوە.
**إعتَفَقَ** القـومُ: خەڵکەکە بە شمشێر لێکیان دا، شەڕە شمێشریان کرد.
**إعتَفَقَ** الأسدُ: شێرەکە بۆ نێچیرەکەی گەڕایەوەو گرتی.
**إنعَفَقَ** في حاجَتِه: دەستی بە کارەکەی کردو خێرا ئەنجامی دا.
**تَعَفَّقَ**: پەنای بۆ برد.
**المِعفـاقُ**: (رجل مِعفاقٌ) پیاوێکە زۆر دیدەنی دەکا، هەر دێو دەچێ.
**عَفِكَ** عَفَكاً وعَفكاً: زۆر گێلو ئەحمەق بوو ٥ (فهو عَفِكٌ وعَفيك).
**عَفَلَ** الكبش عَفلاً: دەستی لە سمتو گەڵو گونی بەرانەکە دا بۆئەوەی بزانێ قەڵەوە یان نا.

**عَفِلَت** المرأة أو الناقة عفلاً: شتێکی خڕ لە منداڵدانی ئافرەتەکە هاتە دەرەوە، یان لە هێنی حوشترەکە هاتە دەرەوە، بەزۆری هاتنە دەرەوەی ئەو شتە دوای منداڵبوون دەبێ، ئەم حاڵەتە توشی ئافرەتی شوو نەکردو نابێ.

**عَفَلَ** الرجلُ: پیاوەکە شتێکی خڕی لە کۆم هاتە دەر وەکوو هێلکە وایە ◦ (فهو أعفلُ وهي عفلاء) ◦ (ك: عُفلٌ).

**عَفَّلَ**: ئەو شتە خڕەی لە شەرمگای ئافرەتەکەوە هاتە دەر بەداخکردن پوکاندیەوە.

**العافِلُ**: ئەو کەسەی لەسەر پۆشاکی درێژەوە پۆشاکی کورت لەبەر بکا.

**العَفلُ**: بەزی ناو گەڵو گونی بەرانو ئاژەڵی لەو جۆرەیە، هەرکاتێ چێودار ویستی بزانێ ئاخۆ ئەو حەیوانە قەڵەوە یان نا دەست لەگەڵو گونی لاڕانی بەرانەکە دەدا ◦ هێڵە تیلماسکی نێوان کونی پاشو هێنی پێشەوە.

**العَفَلُ**: شتێکی خڕە وەکوو هێلکە گون لە منداڵدانی ئافرەتو هێنی حوشتر دێتە دەر دەشوبهێتە هێلکە گونی پیاو ◦ جاری واش دەبێ ئەم شتە خڕە لەکونی پاشەوەی پیاو دێتە دەر وەکوو هێلکەی ئاسایی وایە.

**العَفلاءُ**: ئافرەتێکە (بیلا ماناکە)ی تەنگ بێ بەهۆی ئاوساویو ئەستوربوونی دیواری ڕێڕەوی ناوەوەی.

**العَفَلَةُ**: قیتکە یان میتکەی بیلا مانەی ئافرەت ◦ شتێکی خڕو هێلکەییە لە منداڵدنی ئافرەت یان شەرمگای حوشتر یان کونی پاشەوەی پیاو دێتە دەر.

**عَفَنَ** الشَّيْءَ عَفناً: شتەکەی ڕانواندو بەرهەوای دا بۆنەوەی بترشێو بۆگەن بکا.

**عَفِنَ** الشَّيْءُ: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد ◦ (فهو عَفِنٌ وعفينٌ).

أعفَنَ فلان: فلانکەس پێستی قەڵش قەڵش بوو.

اعفَنَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەخراپیو بێ کەڵکی کەوتە دەست.

عَفَّنَ الشَّيْءَ: شتەکەی خراپو بۆگەن کرد وای لێ کرد بەکەڵکی هیچ نەیەت.

تَعَفَّنَ الشَّيْءُ: شتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد.

العَفَنُ: ڕوەکێکی فوترییە دەبێتە هۆی بۆگەنبوونی شتی تر.

**عَفَا** الأثرُ عَفواً وعُفُوّاً: شوێنەکە نەما،

شوێنەواری کوژایەوە ٥ دەگوترێ: (عفا أثر فلان) شوێنەواری فلانکەس نەما کوژایەوە .

**عَفَا** الشَّيْئُ: شتەکە گوم بوو دیار نەما.

**عَفَت** الأرضُ: زەویەکە ڕوەکی زۆری لێ ڕواو داپۆشرا.

**عَفَا** الماءُ: ئاوەکە صاف بوو هیچ شتێکی تری تێکەڵ نەبوو لیڵی بکا.

**عَفَا** الريحُ الأثر: ڕەشەبایەکە شوێنەوارەکەی پڕکردەوە، کوژاندیەوە.

**عَفَا** الشَّيْئَ: شتەکەی زۆرکردو درێژی کرد.

**عَفَا** فلاناً: هاتە لای فلانکەس داوای بەخشش‌و یارمەتی لێ کرد.

**عَفَا** لە بمالە: ئەوەی لە پێداویستی خۆی زیاد بوو دای بەئەو.

**عفا** عن ذنبه وعنه: لێی خۆش بوو، چاو پۆشی لێ کرد ٥ لەسەر تاوانەکەی سزای نەدا.

**أعفى** فلان: زیادەی خۆی پێدا، ئەوەی لە پێداویستی خۆی زیاد بوو دای بەئەو.

**أعفى** المريضُ: نەخۆشەکە چاك بۆوە.

**أعفى** فلاناً: قەرزەکەی لە فلان داگرت‌و داوای لێ نەکردەوە ٥ موحاسەبەی نەکرد.

**أعفى** اللهُ: خودا فلانکەسی لە بەلاو ناخۆشی پاراست.

**أعفى** الرجلَ: بەشی پیاوەکەی دا، بەخششی دایە.

**أعفى** الشَعرَ: مووەکانی هێشتنەوەو نەیتاشی ٥ لەحەدیسدا هاتووە دەڵێ: (قصوا الشوارب وأعفوا اللحي) سمێڵ کورت بکەنەوەو ڕیش بهێڵنەوە.

**عافاه** الله معافاةً وعِفاءً وعافيةً: خودا لە بەڵاو نەخۆشی رزگاری کردو لەش ساغی پێدا.

**عافت** الدولةُ فلاناً من الجندية: دەوڵەت فلانکەسی لە ئەرکی سەربازی مەرەخەس کرد عەسکەری پێ نەکرد.

**عَفّى** الحيوانُ: ئاژەڵەکە مووی درێژ بوون‌و زۆر بوون.

**عَفّى** فلانٌ الشَعرَ: فلانکەس مووی جەستەی هێشتنەوە.

**إعتفاهُ**: هات بۆلای داوای بەخششی لێ کرد.

**إعتفت** الإبلُ اليبيسَ: حوشترەکە بە لێوەکانی پوش‌و پەلاشەکەی لە گڵ‌و خۆڵەکە جیاکردەوەو خواردی.

**تعافى** فلان: فلانکەس چاك بۆوە.

**تعافى** الشَّيْئُ: وازی لە شتەکە هێنا.

**تعَفّى** الشَّيْئُ: شتەکە لاچوو نەما.

إســـتَعفى مُكَلَّفَـــهُ: داوای لێــكرد ئەركەكەی لەسەر لابەرێ.
إستَعفى الإبِـلُ اليبـيسَ: حوشـترەكە بە لـچی پـڵو پوشـەكەی لـە گـڵو خۆڵەكە جیاكردەوەو خواردی.
العافی: پێشەوا ○ ئەو كەسـەی دەچـێ بۆ سەر بیرو كارێزاو ○ میوان ○ هەر كەسێـك داوای بەخـشش‌و پارمـەتی بكا.
العافیة: تەندروستی تـەواو ○ میـوان ○ داواكاری بەخـشش‌و پارمەتیـدان ○ داواكـــاری بـــژێوی‌و خـــۆراك ○ هەڵوەدای خواردەمەنی چ ئادەمیزاد یان زیندەوەری تر.
العَفَـــــا: وڵاتێـــــكە دیــــاردەی فـــەرمانڕەوایی‌و پاشـــایەتی تێـــدا نەبێ، وڵاتی بێ میرو حاكم بێ.
العَفـاءُ: فـەوتان‌و تێداچـوون ○ گـڵو خۆڵ ○ باران ○ سپیایی چاو ○
العِفـاءُ: خـوری‌و مـوی درێـژەوەبوو ○ پەڕی درێژ ○ قژی درێژ.
العِفـــاءَةُ: پـەڕو پـۆڵی نەعامــە كــە درێژبن.
العُفـــارةُ: شـتی چـاك‌و بـاش لەهــەر جۆرێك بێ ○ كەفی مەنجەڵ بنكرِو بەرماوەی شۆربا.
العَفـوُ: مـاڵ‌و سامانێـك زیـاد بـێ لـە بـــژێوی پێویـــست ○ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ﴾ ○ بەرماوەی ئاو خۆرەوە ○ ئاوێـك زیـاد بـێ لـە ئـاو خـۆرەوەو بەئاسـانی دەست بكەوێ ○ باشـترین كـاڵا لەهـەر جۆرێـك بـێ ○ چـاكەو پیاوەتی ○ زەوی‌و زارێـك چۆڵ بـێ‌و كەسـی تـێ نەچـووبێ‌و شـوێنەواری كەسی لێ نەبێ ○ (ك: عِفاء وأعفاء).
العَفُـوُّ: كەسێـك زۆر لێبـوردە بـێ، لـێ خۆشـــبوونی زۆربـــێ ○ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿وَكَـــانَ اللَّـــهُ عَفُـــوًّا غَفُورًا﴾.

عَقَبَـــت الإبِـــــلُ: حوشـــترەكە لـــە لەوەڕگایەكــــەوە چـــووە نـــــاو لەوەڕگایەكی تر.
عَقَـبَ فـلان علـی فلانـة: فلانكەس فلان ئـافرەتی مـارە كـردوە دوای ئـەوەی بێـوەژن بـوو، لـەژێر نیكـاحی مێـردی یەكەمی نەما.
عَقَبَ فلان فلاناً عَقباً: فلانكەس دوای فلان كەوت‌و بەشـوێنی دا هـات ○ زەبـری لـە پاژنە پێی دا ○ بە ژنی وەتەری كـەمان شەتەكی دا.
عَقِـبَ النَّبـتُ: ڕوەكەكـە لاسكی باریـك‌و گەڵاكەی زەرد بوو.
عُقِبَ فلان: فلانكەس پاژنەی پێی ئێشا.
أعقَبَ الرجلُ: پیاوەكە منـداڵی لەپاش

جێما.

أعقَبَت الإبلُ: حوشترەکە لە لەوەڕگایەکەوە گواستیەوە بۆ لەوەڕگایەکی تر.

أعقَبَ الأمرُ: سەرەنجامی کارەکە بەسوود بوو.

أعقَبَ بين الشيئين: ئەو دوو شتەی یەك بەدوای یەکدا هێنان.

اعقَبَ عن الشَّيئ: لە شتەکە گەڕایەوە ە ژێوان بۆوە.

اعقب فلان في الراحلة والعمل وغيرهما: فلأنی کردە پاشکۆ.

أعقَبَ فلاناً باحسانه: پاداشتی خێری فلأنکەسی دایەوە.

أعقَبَ الطائفُ فلاناً: دەم دەمو جارجار شێتیەکە بۆ فلأن دەگەڕێتەوە، هەر دەمە نادەمێك کابرا تووشی حالەتی شێتی دەبێتەوە.

عاقَبَ بين الشيئين: ئەو دووشتەی یەك بەدوو یەك دا هێنان.

عاقَبَ فلاناً: بەدوا فلأنکەسدا هات.

عاقب فلاناً في الرحلة والعمل: لە سەفەرو کردەوەدا شوێن فلأنکەس کەوت.

عاقَبَ فلاناً مُعاقَبةً بذنبه: بە گوێرەی کارە خراپەکەی سزای فلأنکەسی دایەوە.

عَقَّبَ فلانٌ: شوێن مافی زەوتکراوی خۆی کەوت بۆئەوەی مافەکەی بسێنێتەوە.

عَقَّبَ فلان في الصلاة: دوای ئەنجامدانی نوێژ دانیشتو مایەوە چاوەڕێی نوێژێکی تری کرد.

عَقَّبَ في الأمر: ڕاڕا بوو لە درێژەپێدانی کارەکەی.

عَقَّبَ على فلان: هێرشی کردە سەر فلأنکەسو بە نارەوا ناوی زڕاندو عەیبو هەڵەکانی دەرخستن.

عَقَّبَ: گەڕایەوە سەری‌و ئاوڕی لێ دایەوە ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَّى مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾.

عَقَّبَ القاضي على حكم سلفه: دادوەر بڕیاری دادوەری پێش خۆی گوێ پێنەداو هەڵی وەشاندەوە ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ﴾.

عَقَّبَ فلاناً: بووە جێ نشینی فلأن.

عَقَّبَ فلاناً حَقَّهُ: مافی فلأنکەسی دواخست.

عَقَّبَ الشَّيئَ: شتەکەی بەتیل سیرمە شەتەك دا ە شتێکی تری هێنایە شوێنی شتەکە.

عَقَّبَ الجيشَ: هەندێکی لە سوپاکە گێڕایەوەو هەندێکی لێ ناردن.

إعتَقَبَ القوم عليه: خەڵکە لەسەر ئەوە

کۆمەکی یەکتریان کرد.
**إعتَقَبَ من کذا ندامَةً**: لەوە پەشیمانی بۆ مایەوە.
**إعتَقَبَ الرجلَ**: پیاوەکەی بەند کرد.
**إعتَقَبَ البائع السلعة**: فرۆشیار کاڵاکەی نەدایە کڕیار بۆئەوەی پارەکە وەرگرێ.
**إعتَقَبَ فلاناً**: بوو بەجێنشینی فلان، دوای ئەو هاتە سەر تەخت.
**إعتَقَبَ القومَ الشَّيْءَ**: خەڵکەکە شتەکەیان خستە بەرباس و لێکۆڵینەوە.
**إعتَقَبَ فلاناً خيراً أو شرّاً بما فعل**: بە گوێرەی کردەوەی چاك یان خراپ پاداش و سزای فلانکەسی ڕەچاو کرد.
**تعاقَب الشيئان**: ئەو دوو شتە یەك لەدوای یەك هاتنە کایەوە.
**تعاقَب القوم في الشّيء او الأمر**: خەڵکەکە شتەکەیان بەنۆبەو یەك لەدوای یەك گرتە ئەستۆ.
**تعاقَب القوم عليه**: خەڵکەکە لەسەری کۆك بوون و یارمەتی یەکتریان دا بۆ ئەنجامدانی.
**تَعَقَّبَ فلان بخير**: فلانکەس جار دوای جار خێرو بێری هێنا.
**تَعَقَّبَ فلاناً**: شوێن فلانکەس کەوت لێکۆڵینەوەی دەربارەی کرد، فلانکەسی لەسەر تاوان سزادا.
**تَعَقَّبَ عورة فلان أو عثرته**: لە عەیب و عاری فلانکەسی کۆڵیەوەو هەڵەو کارە ناشیرینەکانی شی کردنەوە بڵاوی کردنەوە.
**إستَعقَبَ منه خيراً أو شرّاً**: لە جیاتی فلان شت خێرو بێر یان شەڕو نەگبەتی لێوە دەست کەوت.
**إستَعقَبَ فلاناً**: بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەی دەربارەی فلان کردو هەوڵی دا عەیب و عاری تێدا بدۆزێتەوە.
**الأعقابُ**: ئەو لەتە سواڵەت و شتە وردانەیە دەخرێتە نێوان درزی ئەو خشتانەی دیواری پێ هەڵدەچندرێ بۆئەوەی دیوارەکە چاك کون بڕبێ و یەکتر بگرێ.
**التَّعَاقُبُ**: (التعاقب القمي) لەبواری زانستی ڕوەکناسیدا گەشەکردنی هەموو ئەندامەکانی ڕوەکە لەڕەگەوە تاسەرە تۆپەی لق و گەڵاکانی.
**العاقِبُ**: کۆتایی و خاتیمەی شت ٥ هەر شتێك دوای شتێکی تر بێ یان ببێتە جێ نشینی ٥ ئەو کەسەی دەبێتە جێنشینی گەورە پیاو لە پلەو پایەدا ٥ پاداشی چاکە.

**العُقابُ**: هەڵۆ، یان داڵاش ٥ باڵندەیەکی گۆشت خۆرو چنگ قەویە دەندوکی کورتو کەوانەییە ٥ زۆر چاو تیژو دوور بینە ٥ لە پەندی پێشینانداا هاتووە دەڵێ: (ابصَرُ من عقاب) فلانکەس لە داڵاش چاو تیژترو دوربینترە ٥ (ك: عُقُبٌ وعقبان).

**العُقْبُ**: کۆتایی شتو خاتیمەکەی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ ٥ دەشگوترێ: (سافرت في عُقبِ الشهر) کۆتایی مانگ سەفەرم کرد ٥ (عُقبُ الجمال) شێوەو شێوازی جوانی.

**العَقَبُ**: ئەو رەگە ئەستورو پتەوەی جەستەی حەیوانە کە ژێی کەوانو ئامێری مۆسیقای لێ دروست دەکرێ ٥ (ك: أعقاب).

**العَقِبُ**: پاژنە پێ ٥ ئێسقانی پاژنە پێ کە گەورەترین ئێسقانی قاچە ٥ کۆتاییو خاتیمەی شت ٥ مندال، منداڵی پیاو کە دواخۆی لە ژیاندابن ٥ (ك:أعقاب) ٥ دەگوترێ: (جاء عَقِبَهُ وبعَقِبِهِ) دوا ئەو هات ٥ (رجع على عقبه) بەرێگای خۆیدا گەڕایەوە ٥ (وَطِئوا عَقِبَ فلان) بە شوێن پێی فلانەدا ڕۆیشتن ٥ (فلان مُوَطَّأُ العقِب) فلانکەس شوێنکەوتوی زۆرە.

**العُقبى**: قیامەت ٥ گەڕانەوە بۆلای خودا ٥ کۆتایی هەموو شتێکو خاتیمەی ٥ پاداشتی کار.

**العُقبَةُ**: کۆتایی شتو خاتیمەی ٥ نۆرەو بەدەل ٥ ئەو شیرینیو شتەی دوای نان دەخورێ ٥ شۆرباو و چێشتی تر کە لەمەنجەڵی خوازراودا دەبرێتەوە بۆ خاوەنی مەنجەڵە خوازراوەکە ٥ شێوەو شێوازی جوانی ٥ دەشگوترێ: (فلان ما يفعل ذلك إلا عُقبة القمر) فلانکەس ئەو کارە ناکا مەگەر کۆتایی مانگ.

**العَقَبَةُ**: کاری قورسو کۆسپی گەورە ٥ (ك: عِقاب).

**العَقوبُ**: ئەو کەسەیە لەکاری باشدا دەچێتە جێگای یەکێکی پێش خۆی.

**العُقُوبة**: سزای تاوان ٥ (ك: عقوبات).

**العَقيبُ**: هەر شتێك دوای شتێکی تر بێو ببێتە جێ نشینی.

**المُعقِبُ**: سزادەر ٥ تۆڵە سێن.

**المِعقابُ**: ئافرەتێك عادەتی وابێ کوڕی بێ دوایی کچی بێ.

**المُعَقِّبُ**: کۆتایی ڕۆژ دەمەو ئێوارە ٥ دەگوترێ: (جاء فلان مُعَقِّباً) فلانکەس ئێوارە هات.

**اَلْمُعَقِّبات**: فریشتەی ڕۆژو شەو کە خودا داینـاون کـردەوەی چـاك‌و خراپـی بەنـدەکان بنووسـن ◊ کاروبـارێ کـە پێیـان سـپێردراوە ئەنجامی بدەن وەجیبە وەجیبەن‌و کە فریشتەی شەو هاتن فریشتەی ڕۆژ بەرز دەبنەوە ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ ◊ تەسبیحات کـە جۆرەکـانی بـەدوای یەکـدا دەگوترێن.

**اليَعاقِبَةُ**: تاقمێـکی نەصرانین شوێن کەوتووی (یعقـوب البراذعـي)ن ئـەم یاقوب ناوە لـە چەرخی شەشـەمی زایینـی دا لـە وڵاتـی شام دا ژیـاوە، بڕوایـان بەیەکیـەتی (لاهـوت و ناسوت) هەیەو پێیان وایە ئەم دوو شتە یەك سروشتیان هەیە.

**اليَعقُوبية**: بەمانا (اليعاقبة)دی ◊ بیرو باوەڕی یاقوبیەکان.

**تَعَقبَلَهُ**: شوێنی کەوت.

**العُقبولُ**: کاری قورس‌و کۆسپی گران ◊ پاشمـاوەی نەخۆشـی ◊ پاشمـاوەی دوژمنایـەتی، یـان دڵـداری ◊ ئـەو کەف‌و لیکەی لە ناکامی لەرزوتادا لەسـەر لێـو دەردەکـەوێ ◊ (ك: عقابیل).

**العَقابيلُ**: بەڵاو کارەسات.

**عَقَدَ السائلُ**: شلەمەنیەکە بەستی، ڕەق بوو جا یان بەهۆی ساردی یان گەرمی ◊ گوڵـوك کـە دوایـی دەوەرێ‌و لـە شوێنەکەی بەرو بووم دێتە ئاراوە.

**عَقَدَ** لفـلان علـى البلـد: فلانکەسـی کـردە فەرمانڕەوای وڵات.

**عَقَدَ** الحَبلَ: گرێی لەحەبلەکە دا.

**عَقَدَ** ناصيته: ناوچەوانی گـرژ کـردو خـۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ.

**عَقَدَ** طـرفي الحبـلِ ونحـوه: هـەردوو سـەری حەبلەکەی بەیەکەوە گرێدا.

**عَقَدَ** البناءَ: بـەردی دیوارەکـەی بەیەکـەوە لکانـدن بەجۆرێـك یـەکتری بگـرن‌و دیوارەکـە خـۆڕاگر بـێ ◊ بەشـێوەی کەوانەیی بیناکەی دروست کرد.

**عَقَدَ** التـاج فـوق رأسـه: تـاجی لەسـەرنا، تاجی بەسەری خۆیەوە شەتەك دا.

**عَقَدَ** البيع واليمين والعهـدَ: مامەڵەکە یان سـوێندەکە یـان بەڵێنەکـەی دوپـات کردەوەو سووربوو لەسـەر ئەنجامـدانی ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ﴾.

**عَقَّـدَ** العَـسَلَ: هەنگوینەکـەی شـل کردەوەو تواندیەوە.

**عَقَّـدَ** الكـلام: قسەکەی چەواشـە کـرد وای لێ کـرد ماناکـەی بـاش دەرنەکەوێ‌و بەئاسانی نەزانلرێ.

إعتَقَدَ الشَّيْءُ: شتەكە ڕەق‌و پتەو بوو ٥ دەگوترێ:

إعتَقَـــد الاخـــاء بينهـــا: برايـــەتی‌و دۆستايەتی لەنێوانياندا چەسپا.

إعتَقَدَ الحبلَ ونحوه: حەبلەكەی گرێ دا.

إعتَقَدَ التاج فوق رأسه: تاجی لەسەرنا، تاجی لەسەری خۆی قايم كرد.

إعتَقَـــدَ الـــدُرَّ: ملوانكـــەی مـــرواری هۆنيـــەوە ، لـــە مـــرواری ملوانكـــەی دروست كرد.

إعتَقَدَ فلان الأمرَ: فلانكەس شتەكەی بـەلاوە ڕاسـت بـوو لێـی دڵنيـا بـوو، دڵ‌و دەروونی لەسەری دامەزرا.

إعتَقَدَ عَقاراً: زەوی‌و زارەكـەی لەسـەر خۆی تاپۆ كرد بۆخۆی دانا.

إنعَقَـــدَ: دامـــەزرا ٥ بـــۆ موتاوەعـــەی (عَقَدَه)دێ ٥ دەگوترێ:

إنعَقَـــدَ الحَبـــلُ أو البنـــاءُ أو الـــيمينُ: حەبلەكـەی گـرێ دا، باڵەخانەكـەی ڕابەست، سوێندەكەی دامەزرا.

تَعاقَـدَ القـــومُ: خەڵـكەكە پـەيمانيان بەســـــتو وادەو بــــــەڵێنيان دا بەيەكتری.

تَعَقَّـدَ الخـيط ونحـوه: دەزووەكـە گرێـی خوارد، گرێ درا.

تَعَقَّدَ السائلُ: شلەمەنييەكە ڕەق بوو.

تَعَقَّدَ الرملُ: لمەكە يەكتری گـرتو ڕەق بوو.

تَعَقَّدَ السحابُ وقوسُ قَـزَح في الـسماء: هەورەكـە لـە ئاسمـان چـين لەسـەر چين وەستا وەكوو چينی ديوار يان شـــۆقە زێڕينـــە وەكـــوو ديـــواری كەوانەيی خۆی نواند.

تَعَقَّدَ الثرى: گڵەكە ڕەق هـەڵاتو ڕەق بوو.

تَعَقَّدَ الاخاءُ: برايەتيەكەيان دامەزرا.

تَعَقَّـدَ الكـلامُ: كەلامەكـە گـرێو گـۆڵی تێـدا پەيـدا بـوو بـەهۆی خـراپ ڕيزكردنـی وشـەكان، يـان هـەبوونی تەم‌ومژ لەسەر ماناكەی.

اَلتَّعقيـــدُ: بـــەلای زانايـــانی زانـــستی بەيانـــەوە ڕێكخـــستنی كەلامـــە بەشێوەيەك ماناكەی ئاشكرا نەبێ ٥ بەمە دەگـوترێ تەعقيـدی لـەفزی ٥ ئەگـــەر تەعقيدەكـــە بـــەهۆی مەجازێـــكی پەيوەنـــدی دوورو كينايەكی دوورە لزوم بوو ئەوە پێی دەگوترێ تەعقيدی مەعنەوی.

العَقدُ: ديوارێ كەوانەيی بێ، عەگادەيی بــــێ ٥ عەهـــــدو پـــــەيمان ٥ ڕێـــكەوتنامەی نێـوان دوو لايـەن ٥ وەكـوو گرێبەسـتی نێـوان كڕيـارو فرۆشيار ٥ نێوان ژن‌و مێرد ٥ هەروا ئـــاوە بـــۆ هـــەموو گرێبەستێـــكی ئـــابووری‌و سياســی ٥ لــە ژمــارەدا

بریتیه له خانەی دەیان تا دەگاتە نەوەد ٥ (ك: عقود) ٥ (صِیَغ العقود) ئەو ڕستەو وشانەن کە گرێبەستەکەی پێ دادەبەسترێ ٥ وەکوو ڕستەی: (زوجتك بنتي فلانة) (بعتك مالي هذا).

**العِقــدُ**: دەزوویەکە مورووی پێ دەهۆنرێتەوە دکرێتە ملوانکە یان دەستەوانەی مەچەك ٥ (ك: عُقُود).

**العُقدَة**: گرێ ٥ ئەو شوێنەی گرێیەکی لێ دەدرێ ٥ گرێیەکەی لەسەر لێ دەدرێ ٥ لە بواری زانیاری ڕووەکناسیدا شوێنی دەرکەوتنی چروزەو خونچەو گەڵایە لەسەر لاسك یان پەلو تولەی درەختەکە دەردێن ٥ لە بواری زانیاری دەروونناسی دا دیاردەیەکە لە خەمۆکیو کەبتەوە سەرهەڵدەداو هەبوونی خۆی دەچەسپێنێ ٥ لە بواری جوگرافیادا یەکەیەکە بۆ مەزندەکردنی مەسافاتی دەریاییو بە میلی دەریایی دەناسرێو درێژیەکەی (١٨٥٢مەتره) ٥ گرتنی شتێكو بەستنەوەی ٥ کۆمەڵو تاقم ٥ ئیمامی عەلی لە وتارێکدا فەرمووی: (هذا جزاء من ترك العقدة) ئەمە سزای ئەو کەسەیە لەکۆمەڵ تار بووە ٥ فەرمانڕەوایی وڵات ٥ زمان گیرانو لاڵی کە زمان وەکوو پێویست ناتوانێ وشەو ڕستەکان دەربڕێ، قورئان لەسەر زمانی حەزرەتی موسا دەفەرموێ: ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي، يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾ ٥ هەرچی ئادەمیزاد خاوەنداری بێ وەکوو خانو و بەرەو زەویو زارو کاڵا ٥ زەوییەك لەوەڕی زۆرو درەختی لێ بێ ٥ دەگوترێ: (عَشِّ إبلكَ بتلك العُقدَة) وشترەکەت لەو پارچە زەویەدا بلەوەڕێنە ٥ هەروا وشەی (عُقدَة) بە مانا چەسپانو دامەزرانو بڕانەوەو بڕیاردان دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ ٥ دەشگوترێ: (تَحَلَّلَت عُقَدُهُ) ڕقی نیشتەوە.

**العُقدَةُ النفسية**: تەنگەژەیەك تووشی ژیانی هەندێ ئادەمیزاد دەبێ سەردەکێشێ بۆ تێکچوونی دەروونی.

**العَقَدُ**: بنکی زوبان، ئەستورایی زوبان

**العَقّادُ**: بەمانا زێدە ڕۆیی لە گرێدان دا دێ ٥ دەزوو ڕێس، دەزوو فرۆش.

**العَقِیدُ**: لە بواری شلەمەنیدا مەبەست شلەمەنی خەستە ٥ پلەیەکی

سەربازیە لە نێوان پلەی (مقدم)و عەمید دا.

العَقیدةُ: بیرو باوەڕ کە بگاتە پلەی دڵنیایی‌و خاوەن باوەڕەکە شك‌و گومانی تێدا نەمێنێ ٥ لە بواری ئاییندا بریتییە لە بیرو باوەڕ بەبێ کردار وەکوو بڕاوابوون بە هەبوون‌و تاك‌و تەنهایی خودا ٥ ناردنی پێغەمبەران ٥ (ك: عقائد).

العنقود: هێشوە ترێ‌و شتی وا.

المُعتَقَدُ: بەمانا (العقیدة)دێ.

المَعقِدُ: شوێنی گرێبەست ٥ شوێنی گرێ ٥ دوخینی دەرپێ‌و شتی وا.

المُعَقَّدُ: هەرشتێك زۆر پرگرێ‌و گۆڵ بێ قۆرت‌و چورتمی زۆربن ٥ قسەی پڕ توێکڵ‌و گرێ‌و گۆڵ.

المُعَقِّدُ: جادوباز، ئەو کەسەی گرێ لەشت دەداو فوی لێ دەکا.

عَقَرَت المرأة والرّجلُ عَقراً وعُقراً: ژن‌و پیاوەکە نەزۆك بوون منداڵیان نەبوو ٥ (فهو وهي عاقر).

عَقَرَ النخل عَقراً: دارخورماکەی لەسەرەوە بڕی.

عَقَرَ الإبلَ: قاچێکی حوشترەکەی بڕیەوە بۆئەوەی بکەوێ‌و بتوانێ سەری ببڕێ.

عَقَرَ الحیوانَ: ئاژەڵەکەی سەر بڕی.

عَقَرَ السرجُ والرحلُ الظَّهرَ: زین‌و کورتانەکە پشتی وڵاخەکەی بریندار کرد.

عَقَرَ الکلبُ الولدَ: سەگەکە منداڵەکەی گەست.

عَقَرَ الرجلُ عن حاجته: پیاوەکەی لە نیازو مەبەستەکانی لادا لێی مەنع کرد.

عَقِرَ الرجلُ عَقراً: پیاوەکە لە شوێنی خۆی مایەوە پاش‌و پێشی نەکرد، چونکە ترساو حەبەسا، هەروەکوو قاچی بڕابێ.

عَقِرَت المرأة عَقاراً: ئافرەتەکە منداڵی نەبوو.

عَقُرَتِ المرأةُ عُقراً: ئافرەتەکە نەزۆك بوو ٥ دەگوترێ:

عَقُرَ الرجلُ: پیاوەك نەزۆك بوو.

عَقُرَ الأمرُ: کارەکە سەرئەنجامی نەبوو.

أعقَرَ الرَّحلُ والسرجُ الظَّهرَ: کورتان‌و زینەکە پشتی وڵاخەکەی بریندار کرد.

أعقَرَ اللهُ رحم المرأةِ: خودا منداڵدانی ئافرەتەکەی تووشی دەردێك کرد توشی نەزۆکی بوو.

عاقَرَ الخمرَ: هۆگری ئارەق خواردنەوە بوو وازی لێ نەهێنا.

عاقَرَ فلاناً: پێشبڕکێی لەگەڵ فلاندا کرد لە حوشتر سەربڕیندا بۆ خۆدەرخستن لەوەدا ئاخۆ کامیان سەخی ترە.

إنعَقَرَ ظهرُ الدابةِ: پشتی ولاخەکە بریندار بوو.
إنعَقَرَ البَعيرُ والفرسُ: حوشترەکە قاچی بڕدرایەوە بە شمشێر.
تَعاقَرَ الرجلان: دوو پیاوەکە پێشبڕکێیان کرد لە حوشتر سەربڕیندا.
تَعَقَّرَ فلان: بەمانا (أعقَرَ)دێ.
تَعَقَّرَ ظهر الدابّة: پشتی ولاخەکە بریندار بوو.
تَعَقَّرَ شحمُ الناقة: بەز و پیوی حوشترەکە کۆبووەوە.
تَعَقَّرَ الغيثُ: بارانەکە بەردەوام بوو.
تَعَقَّرَ النبتُ: ڕوەکەکە درێژ بوو.
العاقِرُ من الطيور: ئەو باڵندەیەیە کە پەرو پۆڵی تووشی نەخۆشی دەبن ناهێڵێ باش بڕوێن ◊ هەروا وشەی (العاقِر) ناوە بۆ ڕوەکێك لە هێری (المركبة) ڕەگەکانی لە بواری دەرمان سازیدا بەکار دەهێنرێ، ئەم ڕوەکە لە وڵاتی ئەفریقیا زۆرە.
العَقارُ: زەوی‌و خانوبەرە ◊ موڵکی نەگوێزراوە ◊ (ك: عقارات).
العَقارُ الحُرُّ: موڵکی پاڵفتەی وەها ساڵانە بەری خۆی بدا.
العَقارُ: لەهەموو شتێکدا جۆری باشییەتی.
العُقارُ: شەراب ◊ لە هەموو شتێك جۆری باشی.
العَقرُ: شوێنکە، شوێنەوار وەکوو شوێنکەی پەتی بەستنەوە بەقاچی ولاخ‌و شتی واوە ◊ بناغەی هەموو شتێك ◊ هۆبەی گەل‌و هۆز.
العُقرُ: بناغەی هەموو شتێك ◊ ناوەڕاستی خانو ◊ هۆبەی گەل‌و هۆز ◊ لەوەڕی باش ◊ مارەیی ئافرەت ئەگەر بە شوبهەو هەڵە خرایە پەردەی بوکیەتییەوە ◊ جوانترین دێڕەشیعری چامەشیعر ◊ (ك:أعقار) ◊ (بيضة العُقر) یەکەم هێلکەی مریشك کە دەیکا.
العُقُرُ: سەرەتای ئاگر، یەکەم دەستە چیلەی ئاگر کە لەوەوە ئاگرەکە بەهێز دەبێ‌و بڵێسە دەسەنێ ◊ دەرمانێکە دەبێتە هۆی دروست بوونی زاروك لە منداڵداندا ◊ (ك: اعقار).
العُقرَةُ: نەزۆکی.
العُقَرَةُ: جۆرە موورویەکە ئافرەت هەڵی دەگرێ بۆئەوەی سکی نەبێ، ئاوس نەبێ ◊ دەگوترێ: (إمرأة عُقَرَة) ئافرەتێکە منداڵدانی نەخۆشەو منداڵی تێدا دروست نابێ.
العَقّارُ: ئەو کەسەی زۆر حوشتر

ســـەربڕیٚ ◦ ئـــەو گـــژو گیـــاو کەرەســـتانەی دەرمانیـــان لیٚ پێـــك دەهێندریٚ ◦ (ك: عقاقیر).

**العَقُــورُ**: بــۆ زێــدە ڕۆیــی لــەمانای (عاقر)دیٚ ◦ دەگـوتریٚ: (کلب عقور) سەگی دڕو مێنگر ◦ (ك: عُقُرٌ).

**العَقِيرُ**: سەربڕاو ◦ (ك: عقری) پیاوێك کە نەزۆك بیٚ منداڵی نەبیٚ.

**العَقِيرةُ**: سەر بـڕواو لـە نێـچیرو ئـاژەڵی تر ◦ قاچی بـڕدراوە ◦ دەنـگ ◦ (ك: عقائر).

**عَقــرَبَ المكــانُ والأرضُ**: شــوێنەکە، زەویەکە دووپشکی زۆری بوو.

**العَقرَبُ**: دوپشك؛ پیرۆیەکـە لـە پێـری (عەنکەبیات)و ژەهرداره.

**عَقــرَبُ البحـــر**: جـــۆرە ماســـیەکی دەریاییەو سەری گەورەیەو بەسەر پشتیەوە زێدە باڵو گەندەمۆ هـەن، بڕێکیان ژەهـراوین ◦ بورجێـکە لـە بورجەکانی ئاسمان ◦ سیرمە چەرمو ڕایەڵە چەرمی نەعلە کە قاچی تـیٚ دەگریٚ ◦ هـەرەتی سـەرمای زسـتانو کوشندەی ◦ (ك: عقارب).

**العَقَارِبُ**: فیتنەو فیتنەجۆ.

**عَقرَبـا الـساعة**: دووکلکـی کاتـژمێر ◦ یـــەکیان ســـەعاتو ئـــەوەی تریـــان دەقیقە مەزندە دەکا.

**العَقرَبَاءُ**: دوپشکە مێیە.

**العَقرَبَـــةُ**: بـــەمانا (العقربـــاءُ)دیٚ ◦ ئاسنێـکی سـەر گۆچـان بـە زیـنو کـەژاوەو کورتانـەوە هەڵدەواسـریٚ بۆئـەوەی دێمکـەو شـتی وای پێـدا بکریٚ.

**العُقرُبَانُ**: دوپشکە نێرە.

**المُعَقــرَبُ**: شـتی چـەماوەو گۆچـانی ◦ ئـادەمیزادی تێکـسمڕاوو کەتــەو زەبەللاح.

**عَقصَت المرأة شَعرهَا**: ئافرەتەکە پـرچو قژی خۆی گورزە گورزە کردنو لولی کـردنو گرێـی دان بۆئـەوەی بـار بەشـکاوەیی‌و پەرێـشانی بگـرنو ئەمجار کردنیەوە، نالی دەڵیٚ:

﴿ئەزدەهای زولفت لەدەوری گەنجی حوسنت حاریسە حەلقە حەلقە چین بەچین سەرتا بەخواری گرتووە.﴾

یــان قــژی هــەڵوێزنینو ســەرە داوی قــژەکانی بــردەوە بــۆلای بنکــە کانیانو وەك هەنار خـڕی هەڵدانو لەپاشەسـەری یـان لـە تۆقەسـەری بەستنی.

**عَقَـــصَ أمـــرَه**: کارەکـەی خـوارکردو لەڕێڕەوی خۆی لایدا ◦ چەواشەی کرد.

**عَقِصَ التَّيسُ ونحوه عَقَصاً**: نێرییـە قەرەکـە شاخی بۆ دواوە کەوانە بوونەوە.

**عَقِصَت أسنان الرجلِ**: ددانی پیاوەکە بۆ ناو دەمی خواربوونەوە.

**عَقِــصَت أصـــابِعُهُ**: پەنجـەی پیاوەکـە

سواری یەکدی بوون.

**عَقِصَ الرجلُ**: پیاوەکە بەخیلو رژد بوو، ڕەوشتی ناشیرین بوو.

**عَقِصَت الدابةُ**: ولاخەکە لەکاتی لێخوڕین دا لەباتی ئەوەی بەرەو پێش بڕوا پاشەو پاش کشایەوە ٥ (فهو اعقص وهي عقصاء) (ك: عُقُصٌ).

**العِقاصُ**: دەزوویەکە سەری پرچی پێ دەبەستریٚ (ك: عُقُصٌ).

**العَقِصُ**: ملەگەدە ٥ لمبەلانێکی قەبارە بەستو کە ڕێگای پێدا ڕۆشتنی نەبیٚ.

**العِقصَةُ**: کۆمەڵە قژو پرچی هەڵوێزنراو وکۆکراوەن لە پشتە سەر یان لە تۆقەسەر (ك: عِقَصٌ وعقاص).

**العُقصَةُ**: گرێی شاخی ئاژەڵ ٥ (ك: عُقَصٌ).

**العَقَصَةُ**: کۆمەڵە لمبی قەبارە بەستووە ٥ کە ڕێگای تێدا نەبیٚ.

**العَقِيصُ**: رژدو دەست قوچاو تەبیات زبرو رەوشت ناشیرین.

**العُقَيصاءُ**: گەدە بچکۆلەی نووساو بەگەدە گەورەوە.

**العَقِيصَةُ**: بەمانا (ألعِقصَةُ)دیٚ ٥ (ك: عقائص وعِقَاصٌ).

**ألمِقاصُ**: مەڕی شاخ خوارو خێچ.

**ألمِقصُ**: تیری خوار ٥ مقەست ٥ (ك: معاقص).

**عَقعَقَ العَقعَقُ**: قەلە ڕەشەکە قڕاندی.

**العَقعُقُ**: باڵندەیەکە لە پێری قەلەڕەشە دەندوك درێژو کلك درێژە، عەرەب بەنیشانەی نەگبەتی دەزانن.

**العَقعَقَةُ**: دەنگی قەلە ڕەشە، قڕە قڕی قەلەڕەشە ٥ دەنگی کاغەزی تازەو قوماشی تازە.

**عَقَفَ الشَيْءُ عَقفاً**: لاری کردەوە، خواری کردەوەو چەماندیەوە.

**عُقِفَتِ الشاةُ**: مەڕەکە تووشی نەخۆشی عوقاف بوو.

**عَقَّفَهُ**: بەمانا (عَقَفَهُ) دیٚ.

**إنعَقَفَ الشَيْءُ**: شتەکە چەمایەوە، خوار بۆوە.

**تعَقَّفَ الشَيْءُ**: بەمانا (إنعَقَفَ)دیٚ.

**الأعقَفُ**: چەماوەو خوارەوەبوو ٥ دەگوتریٚ: (عود أعقَفُ) داری چەماوە، ئاسنی چەماوە ٥ (ظَبيٌ أعقف القرون) ئاسکی شاخ چەماوە.

**العُقافُ**: نەخۆشیەکە تووشی چوارپەلی مەڕوبزن دەبیٚو قاچی خوار دەبن.

**العَقفاءُ**: ئاسنێکە سەرێکی خوارکراوەتەوەو شتی پێ کێش دەکریٚ.

**العُقَافَةُ**: دارێکه سەرێکی چەماوەتەوە شتی پێ کێش دەکرێ.

**المَعقوفُ**: (الصليب المَعقوف) صەلیبی چەماوە ◊ ئەم شێوە صەلیبە ✠ شیعارو ئارمی نازیەکان بووە ◊ (القوسان المَعقوفان [ ]): لەبواری چاپەمەنیدا ئەو زانیاریەیان تێدا دەنووسرێ کە لەدەقە ئەصلیەکە زیادە

**عَقَّت** أنثى الحيوان عَقَقاً وعِقاقاً: ئاژەڵە مێیەکە ئاوس بوو.

**عَقَّ** البَرقُ عَقّاً: بروسکەکە دەرکەوت.

**عَقَّ** فلان: فلانکەس موی پێشەسەری منداڵە تازە لەدایك بووەکەی تاشی بۆئەوەی عەقیقەی بۆ بکا.

**عَقَّ** القوم بسهم: خەڵکەکە تیریان بە ئاسمانەوە نا، رووەو حەوا تیریان هاویشت وەکوو نیشانەیەك بۆ رازیبوون بەخوێن وەرگرتن‌و خوێن بەستنی کوژراوەکەیان، واتە: رازی بوون لەجیاتی ئەوەی بکوژ بکوژنەوە خوێن وەرگرن.

**عَقَّ** عن ولده: ئاژەڵێکی سەربڕی لە رۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵەکەیدا، حەوتمی بۆکرد.

**عَقَّ** ثوبَهُ: قوماشەکەی دادڕی.

**عَقَّت** الريحُ السحابَ: بایەکە هەورەکەی کردەوەو بارانی لێ باراند.

**عَقَّ** أباه عَقّاً وعُقوقاً: ئەزیەتی باوکی داو سوکایەتی پێ کردو چاکەی لەگەڵ نەکرد ◊ (فهو عَقٌّ وعاقٍ وعَقوق).

**عَقَّ** رحِمَهُ: سیلەی رەحمی بڕی پەیوەندی خزمایەتی‌و کەسایەتی پچڕاند.

**أعقَّت** النخلة أو الكرمة: دارخورماکە یان دار مێوەکە قوناریان دەرکرد واتە: نەمام‌و لقی تر لە بنکەکەیان سەریان هەڵدا.

**أعَقَّ** فلان: فلانکەس بەرامبەر دایك‌و باوکی خراپەی کرد یان ئەزیەتی باوکی‌و دایکی‌و کەسانی تری دا.

**أعَقَّتِ** المرأةُ: ئافرەتەکە لەسکی دا منداڵەکەی قژی لێ ڕوا.

**أعَقَّ** الماءَ: ئاوەکەی تاڵ کرد.

**عاقَّهُ**: پێچەوانەی ئەو جولایەوە.

**إعتَقَّ** السَّحابُ: هەورەکە بارانی باراند.

**إعتَقَّ** المُعتَذِرُ: پاساو هێنەرەوە کە درێژەی دا بەپاساو هێنانەوەکەی زێدە ڕۆیی کرد لەوبارەوە.

**إعتَقَّ** فلان السيفَ: فلانکەس شمشێری راکێشا ڕوتی کرد.

**إنعَقَّ** الثوب والغبارُ والسحابُ: قوماشەکە دڕا، تەپ‌وتۆزەکە ڕەویەوە، هەورەکە کەلێنی

تێکەوتو خۆی سوك کرد.

إنعَقَّ البرقُ: هەورە بروسکەکە لەهەورەکەدا بڵاو بۆوە.

إنعَقَّ الوادي: شیوەکە قوڵ بوو.

إنعَقَّتِ العقدةُ: گرێکە توند بوو.

العُقاقُ: ئاوی زۆر تاڵو تفت.

العَقُّ: بەمانا (ألعاق)دێ ٥ هەموو درزێك لە لمبەلانو شتی تر ٥ چاڵێکی درێژو قوڵ لە زەوی ٥ ئاوی تاڵ.

العُقَقُ: هەورەبروسکە لە پانتایی هەوردا کەوەکوو شمشێری بریسکەدار شوعلەی درێژبێتەوە ٥ منداڵێك ئەزیەتی باوكو دایکی بدا.

العِقانُ: (عِقان الکروم والنخیل) ئەو قونارو دەومنانەی لە بنکی دار مێو و دارخورما دێنە دەر.

العَقّةُ: چاڵێکی قوڵ لە زەوی ٥ هەورە بروسکە کە بە پانتایی ئاسمان درێژ دەبێتەوە.

العَقوقُ: ئاژەڵی ئاوس ٥ (الأبلق العقوق) دەونەی شتێکە کەنەبێ وەکوو تەیری عەنقاو شاری جابولقا ٥ چونکە (الأبلق) بە ئەسپی نێر دەگوترێ دیارە ئەسپیش ئاوس نابێ ٥ دەگوترێ: (کلفتني بیض الأنوق والأبلق العقوق) داوای هێلکەی حوشترو ئەسپی ئاوسم لێ دەکەی ٥ (ك: عُقُقٌ وعِقاق).

العُقُقُ: دوژمنی دوور ٥ ئەوانەی قەتعی سیلەی ڕەحم دەکەن.

العَقیقُ: ئاقیق، بەردێکی سوورە لەگەڵ ئاڵتون بەکاردێ بۆ خشڵ، ئەم جۆرە ئاقیقە لە وڵاتی یەمەنو کەنارەکانی دەریای سپی ئاوەڕاست دەست دەکەون ٥ شیوی قوڵ کە ئاو لە کۆندا دابڕیبێو بووبێتە چەم ٥ موی بێچو کەلەسکی دایکیدا لێی ڕوابن.

العَقیقَةُ: موی سەری بێچو کە لەسکی دایکیدا لێی ڕوابن ٥ حەیوان سەربڕین بۆ ڕۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منداڵ (حەوتم) ٥ ڕوناکایی هەورە بروسکە کە بۆ ماوەیەکی کەم لە ئاسماندا دەمێنێتەوە ٥ شیوی درێژی قوڵ لەزەویدا ٥ (ك: عقائق).

العَقائقُ: شمشێری بریسکەدار کەوەکوو هەورە بروسکە درەوشاندنەوەی لێ بەدی دێ ٥ دەگوترێ: (سَلّو عقائق کالعقائق) ٥ شمشێر لەکالان ڕاکێشن وەکوو بروسکە بریسکەیان بێ.

عَقَلَ عَقلاً: شتەکانی وەکوو حەقیقەتی

خۆيان زانى.

**عَقَلَ** الغلامُ: منداڵەكە پێگەيى‌و چاكەو خراپەى لێك جياكردەوە ٥ دەگوترێ: (ما فعلت هذا مذ عقلت) لەوەتاى دەست‌و دوى خۆم ناسيوە شتى وام نەكردووە.

**عَقَلَ** اليه عَقلاً وعقولاً: پەناى پێ بردو خۆى تێدا قايم كرد.

**عَقَلَ** الظلُّ عقلاً: سێبەرەكە هەڵكشانەوەو كۆبوونەوە لەكاتى نيوەڕۆدا.

**عَقَلَ** الشَّيْءَ: شتەكەى وەكوو حەقيقەتى زانى.

**عَقَلَ** البعيرَ: دەستى حوشترەكەى بە ئەستورايى پشت ئەژنۆيەوە بەحەبل شەتەك دا بۆئەوەى بەبيخ دراوى بمێنێتەوە.

**عَقَلَ** الرجلَ: پاشقولى هێنايە پياوەكەو بەزەويدا دا.

**عَقَلَ** فلاناً عن حاجته: فلانكەسى لە پێويستيەكانى مەنع كرد.

**عَقَلَ** القتيلَ: خوێنى كوژراوەكەى دا.

**عَقَلَ** الدَّواءُ البطنَ: دەرمانەكە سكچوونەكەى ڕاگرت دواى ئەوەى كابرا سكى دەچوو سكچوونەكەى ڕاوەستا.

**عَقَلَ** فلان فلاناً عَقلاً: فلانكەس لە فلان عاقڵتر بوو.

**عَقِلَ** البعيرُ ونحوه: حوشترەكە قاچى تێك گيران قاچى لێك دان فەيزەن بوو ٥ (فهو أعقَل وهي عقلاء).

**عاقَلَهُ**: لە عەقڵ‌و ئەزموونـدا پێشبڕكێيان كرد.

**عَقَّلَ** الكرمُ: دارمێوەكە بەرسيلەى دەركرد.

**عَقَّلَ** فلاناً عن حاجته: فلانكەسى لە پێداويستيەكانى مەنع كرد.

**عَقَّل** فلاناً: فلانكەسى ئاقڵ كرد.

**إعتَقَلَ** بَطنُهُ: گەدەى گيرا، سكچونى نەما.

**أُعتُقِلَ** لِسانُهُ: زمانى گيرا.

**إعتَقَلَ** من دم فلان: لەجياتى خوێنى فلان ماڵى وەرگرت.

**إعتَقَلَ** فلاناً عن حاجته: فلانكەسى لە پێداويستيەكانى مەنع كرد.

**إعتَقَلَ** الشرطة المُتَّهَمَ: پۆليس تۆمەتبارەكەى گرت، بەندى كرد بۆئەوەى دادگايى بكرێ.

**إعتَقَلَ** الدواء بَطنَهُ: دەرمانەكە سكى نەخۆشەكەى لە ڕەوانى ڕزگار كرد.

**إعتَقَلَ** فلاناً: پێپيلكەى هێنايە قاچى فلان‌و بەعەرزيدا دا.

**إعتَقَلَ** الرِجلَ: قاچى نوشتاندەوە خستيە سەر كلێجەى.

**إعتَقَلَ** فلان رُمحَهُ: شمشێرەكەى خستە نێوان قاچى‌و زينەكەوە.

**تعاقَلَ الرَّجلُ**: پیاوەکە خوێنەکەی خستە سەرخۆی.

**تعاقَلَ القوم دم القتيل**: خەڵکەکە لەناو خۆیاند پارەی خوێنی کوژراوەکەیان دا.

**تَعَقَّلَهُ** عن حاجته: پێداویستیەکانی لێ مەنع کرد.

**تَعَقَّلَ البعيرَ**: دەستی حوشترەکەی هەڵبەست بۆئەوەی بەیخ دراوی بمێنێتەوە.

**تَعَقَّلَ الرَّجلَ**: قاچی نوشتاندەوەو خستیە سەر سمتی.

**العاقِلُ**: زیرەك‌و هەستیارو بەئاگاو عاقڵمەند ٥ (ك: عُقَّال، وعقلاء) (وهي عاقل وعاقلة وهن عواقل) ٥ ئەو کەسەی پارەی خوێنبەستنەکە دەدا ٥ (ك: عاقلة)

**عاقِلة الرجل**: خزم‌و کەسی پیاو ئامۆزاو بن ئامۆزاو بەرەو خوارتریش ئەوانەی هاوبەشی دەکەن لەخوێن دانەکەدا.

**العاقولُ**: ڕوەکێکە چقڵاویە، پەل‌و پۆپەکانی دەبنە چقڵی درێژ، گوڵەکانی سورن لەبەهاردا دەپشکون، بەرێکی ڕەقی هەیە لە شیو و دۆڵ‌و چۆڵەوانی دەڕوێ ٥ خۆشترین لەوەڕی حوشترە ٥ هەروا ناوە بۆ زەویەکی درکەو پڕ شیو و دۆڵ‌و ڕێگا نادیار ٥ کاروباری شێواو ٥ (ك: عواقيل).

**العِقالُ**: ئەو حەبلەی حوشتری پێ دەبەسترێتەوە ٥ جوانوە حوشتر ٥ (عِقال المِئين) لەلای عەرەبەکان بەکەسێکی خانەدانی وا گوتراوە کە دیل کرابێ دووسەد حوشتری بۆ دراوە بەفیدیە ٥ پارچە بادراوێکە لەخوری یان لە ئاوریشم کرابێتە عەگاڵ‌و لەسەر گۆترەوە لەسەر بنرێ ٥ گۆترەو عەگاڵ بەزۆری عەرەب دەیکەنە پۆشاکی سەر.

**العُقَّالُ**: گرژبوونی ماسولکەو دیاردەیەکی ئێش‌و ئازاری ماسولکەیە و سەردەکێشێ بۆ وەستانی جم‌و جۆڵی کاتی لەهەندێ ئەندامی جەستەدا ٥ دەشگوترێ: (داء ذو عُقَّال) دەردێکی درێژ خایەنەو چاکبوونەوەی نیە.

**العُقَيلي**: بەرسیلە.

**العَقلُ**: ئاوەز ٥ پێچەوانەی غەریزەیەکە کە ئیختیاری نیە ٥ هەربۆیە دەگوترێ: (الإنسان حيوان عاقل) ئادەمیزاد گیانلەبەرێکی عاقڵمەندە ٥ ئەو هێزە نادیارەی ئادەمیزاد بەهۆیەوە بیردەکاتەوە

بەڵــگە دەهێنێتــەوە، تەصـــەوەرو تەصدیق رێك دەخا ٥ ئەو هێزەی چاکەو خراپـەو جـوان و ناشـیرین لێــك جیادەکاتــەوە ٥ خێــرو شــەڕ دیاریــدەکا ٥ حــەقو بــەتاڵ لێــك هەڵدەهاوێرێ ٥ هـەروا بـەمانا: دڵ، خوێن، قەڵاو پەنادێ.

العُقْلَةُ: ئەوەی شتی پـێ دەبەسترێتەوە وەکو زنجیرو گوریسو حەبلو شتی وا ٥ لە بواری وەرزشی جەستەییەوە بریتییە لە پارچە دارێك، ئاسنێـك لــەنێوان دوو حـــەبلی بەســـتراو بەشتێکی زوور خۆیەوە ٥ لولەیەکی قەفــەزازە کەبکەوێتــە نێــوان دوو گرێــی لولــە زازەکــەوە ٥ لــەبواری نــەمامو شــەتڵ ناســیدا لقێـــکە لـــــەدرەخت جیادەکرێتـــــەوەو دەنێــژرێ، وەکــوو تولــە مێــوو لقــە هەنجیرو شتی وا.

ألعَقولُ: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (عاقـل) دێ ٥ دەرمانێکە سکچون ڕابگـرێ ٥ لـــەبواری پزیـــشکیدا هۆکارێـــکە ئەنسیجەکان وێـك بێنێتـەوە ٥ یـان ئیفرازات بوەستێنێ ٥ یـان نـەزیفـو شتی وا بوەستێنێ.

العَقيلَةُ: خـانمی مـاڵو کـەژاوە نـشین ٥ ژنــی ڕەنــگ ژنو خــانو مـــان ٥ گەورەی گەلو هۆز ٥ (ك: عقائل).

المُعتَقَلُ: بەندیخانە، شوێنی بەندکردن.

المَعقِـلُ: پــەناو قــەڵاو شــورە ٥ (ك: مَعاقِل)

عَقَمَت المرأة والرجلُ عَقماً وعُقماً: ژنو پیاوەکــە نــەزۆك بــوون ٥ جــۆرە نەخۆشیەکیان پێوە بوو کە ڕێـگر بوو بۆ دروست بـوونی منـداڵ لـە منداڵداندا.

عَقَمَ الله الرجلَ والمرأة عَقيماً: خـودا ژنو پیاوەکــەی نــەزۆك کــردن منــداڵیان نەبوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا﴾.

عَقِمَ عَقَماً: بـەمانا (عَقَمَ)دێ ٥ (فهـو عقـيم وهي عقيم) ٥ (ريح عقيم) بای بێ باران ٥ (يوم عقيم) ڕۆژی بێ هەوای سازگارو خۆش ٥ (عقل عقيم) عەقڵی بێ خێر.

عاقَمَــهُ: کێــشەی لەگــەڵ دا کــردو حەنەحەبەشەی لەگەڵدا نایەوە ٥

عَقَّمَ الـشَّيءَ: تـەعقیمی شتەکەی کـرد، هەرچی بەکتریاو میکرۆبی تێدا بوو لەناوی برد.

العُقامُ: دەگـوترێ: (يوم عقام) ڕۆژگـاری ســەختو نــاخۆش کــەس وەســەر کەسـی نـاپرژێ ٥ (داء عقـام) دەردی درێژ خایەن کـە چاك بوونـەوەی لێ نەبێ.

ألعَقامُ: بـەمانا (العُقـام) دێ ٥ پیاوێـك منداڵی نەبێ.

**العُقمُ**: نەزۆکی، نەخۆشیەکە دەبێتە بەربەست لە دروستبونی منداڵ، جا نەخۆشیەکە لە ژنەکەیە یان لە پیاوەکەیە یان لە هەردووکیانە.

**العَقَنقَلُ**: شیوی قوڵو گەورە ٥ تەپۆڵکە لیەلانی یەکگرتوو.

**عَقَا** الرجلُ: پیاوەکە بیری هەڵکەندو لەقەراغیەوە ئاوی تێ چوو بەنارەحەتی ناوی لێ هەڵدەگۆزرێ.

**عَقَا** فلان الأمرَ: فلانکەس کارەکەی پێ ناخۆش بوو.

**عقى** المولودُ عَقياً: منداڵە تازە لەدایك بووەکە پیسایی ناوسکی دەردا.

**أعقى** الشَّيْءُ: شتەکە تاڵ بوو.

**أعقى** فلان الشَّيْءَ: فلانکەس شتەکەی تف دایەوە لەبەر تاڵی بۆی قوت نەچوو.

**عقَّى** الطائرُ: باڵندەکە زۆر بەرز فری.

**عقّى** المولودَ: خواردنێکی دایە منداڵەساواکە پیسایی ناوگەدەی فرێدایە دەر.

**إعتقَى** الرجل: پیاوەکە بیری هەڵکەند ئاو لە قەراغیەوە ڕژایە ناوی.

**إعتقى** فلان: فلانکەس چووە ناو قسەو لەمزۆر باسو خواس دوا.

**العَقَاةُ**: شوێنی بەرفراوان لەبەردەم ماڵ یان لەدەورو بەری ٥ (ك: عَقاً).

**العَقوَةُ**: بەمانا (ألعَقاة)دی ٥ (ك: عِقاءٌ).

**العِقيُ**: پیسایەکە لەگەدەی منداڵی تازە لەدایك بوو دێتە دەر ٥ (ك: أعقاء).

**ألعِقيانُ**: زێڕی کۆبوەوە لە کانەکەیدا، زێڕی بێ خشتو خوڵ، زێڕی پاڵفتە.

**عَكَبَ** عكوباً: پاڵەپەستۆیان کرد ٥ دەگوترێ: (عكب النَّاسُ) خەڵکەکە کۆبوونەوەو پاڵەپەستۆیان کرد.

عَكَبت القِدرُ: مەنجەڵەکە بوخاری بەرز بۆوە.

**عَكِبَ** فلان عَكباً: فلانکەس جەستەو قەبارەی کەتەو زەبەللاح بوو ٥ پەنجەکانی لێك نزیکبونو سواری یەکتر بوون (فهو أعكب وهي عكباء).

**عَكَّبَتِ** النارُ: ئاگرەکە دوکەڵی کرد.

**إعتَكَبَ** الغبارُ: تەپوتۆزی هەڵساند.

**تَعَكَّبَتهُ** الهموم: خەمو خەفەت لێی کۆبوونەوە.

**العُكابُ**: تەپو تۆز ٥ دوکەڵ ٥ هەڵمی مەنجەڵو دیزەی پڕ لەخواردەمەنی ٥ هەرمتی کولانی مەنجەڵە کێشت.

**العَكوبُ**: تەپو تۆز ٥ کەنگر.

**عَكَدَ** اليه عَكداً: پەنای بۆ برد.

**عَكَدَ** الأمر فلاناً: کارەکە بۆ فلانکەس مەیسەر بوو.

**عَكِدَ** البعيرُ والضَّبُ عَكَداً: حوشترەکە قەڵەو بوو گۆشتی توند بوو.
**أعكَدَ** اليه: پەنای بۆ برد.
**إعتَكَدَهُ**: پێوەی نووسا، لەگەڵیدا بوو لێی دانەبڕا.
**إستَعَكدَ** البعيرُ والضبُ: بەمانا (عَكِدَ)دێ.
**إستَعكَدَ** الطائرُ والضبُ: باڵندەکە یان بزن مژەکە خۆی شاردەوە لەترسی ئەوەی باڵندەی وەکوو بازو داڵاش پەلاماریان بدەن.
**إستَعكَدَ** الماءُ: ئاوەکە ڕاوەستا.
**العُكدَةُ**: بنکی کلكو بنی زوبان ٥ هێزو توانا ٥ کونو لانەی بزن مژە ٥ پەڕێکە نانی پێ کونج کونج دەکرێ.
**المَعكودُ**: نیشتەجێی بەردەوام ٥ خۆراکی هەمیشەیی ٥
**عَكَرَ** عَكراً وعكوراً: گەڕایەوە ٥ دەگوترێ: (عكر على الشيئ) گەڕایەوە بۆسەر شتەکە.
**عَكَرَ** عليه الزمان بخير: ڕۆژگار بەخێرو بێرەوە گەڕایەوە سەری.
**عَكَرَ** به بعيرُهُ: بە سواری حوشترەکەی گەڕایەوە بۆ لای ماڵو منداڵو خزمو کەسو کاری ٥ (فهو عاكر وعَكّار).
**عَكِرَ** الماءُ: ئاوەکە لێڵ بوو ٥ دەگوترێ: (فلان يصطاد في الماء العكر) فلانکەس لەناوی لێڵو قوڕاودا ماسی دەگرێ، ڕاوەکا ٥ سود لە پشێویی کاروبار وەردەگرێ.
**أعكَرَ** الرجلُ: پیاوەکە جەڵەبە حوشتری هەبوو.
**أعكَرَ** السنامُ: دوگی حوشترەکە بەزی زۆر بوو.
**اعكَرَ** الليلُ: شەو تاریکی زرینگایەوەو چڕبووە.
**أعكَرَ** الشَّيئَ: شتەکەی لێڵ کرد.
**عَكَّرَ** الشَّيئَ: بەمانا (أعكَرَهُ)دێ.
**إعتَكَرَ** فلان: فلانکەس هاتو ڕۆیی ٥ ڕوی تێکردو پشتی تێکرد.
**إعتَكَرَ** على الشَّيئ: گەڕایەوە بۆسەر شتەکە.
**إعتَكَرَ** القوم في الحرب: خەڵکەکە لەشەڕدا تێکەڵاو بوون.
**إعتَكَرَ** الشَّيئَ: شتەکەزۆر بوو کۆبوەوە.
**إعتَكَرَ** الليلُ: شەو زرینگایەوەو تاریکیەکەی چڕ بۆوە.
**إعتَكَرَت** الريحُ: ڕەشەباکە تەپوتۆزی هێنا.
**إعتَكَرَ** الشبابُ: گەنجی مایەوەو بەردەوام بوو زوو پیر نەبوو.
**تعاكر** القوم: خەڵکەکە لەشەڕدا تێکەڵ بوون.

**اَلعَكَرُ**: جەڵەبە حوشتری زۆر.
**اَلعِكرُ**: ئەصلو بنەما، دابو نەریت.
**اَلعَكَـــرُ**: خـــاكو زەوی كـشتوكاڵی ٥ بەجێماوو بنزیلی هەرشتێك بێ.
**اَلعَكَرَةُ**: جەڵەبە حوشتر، بنی زوبان ٥ (ك: عَكَرٌ).
**اَلعِكـرِشُ**: ڕوەكێـكی كراوەیـەو پـەل دەهاوێ ٥ لەشوێنی تـەڕو شـێداردا دەڕوێ گەڵاكـــــەی درێژكۆڵـــــەو گوڵەكەی سونبوولیە.
**عِكرِم** اللیل: تاریكایی شەو.
**العِكرِمَةُ**: كۆترە مێ.
**عَكَـزَ** بالـشيئِ عَكـزاً: شـوێن شـتەكە كـەوتو كـردی بـە ڕێ نیـشاندەری خۆی.
**عَكَـزَ** علــى عُكازَتِــهِ: خـۆی بەســەر گاڵۆكەیدا دا.
**عَكَزَ** الرُّمحَ: ڕمبەكەی لەزەوی چەقاند.
**تَعَكَّـزَ** علــى عُكازتــه: خـۆی بەســەر گاڵۆكەكەیدا دا.
**عَكَـزَ** قوسَـهُ: كەوانەكـەی كـردە گـاڵۆكو خۆی دا بەسەری.
**العُكازَةُ**: بەمانا (العُكازُ)دێ.
**عَكَسَ** الشَّيئَ: شتەكەی پێچەوانە كردەوە هەڵیگێڕایەوە ٥ بەسەر یەكی دا دایەوە ٥ دەشگوترێ: (عكس الكلام) قسەكەی بە پێچەوانەوە گێڕایەوە.
**عَكَـسَ** الدّابَّـةَ: جڵـەوی وڵاخـەكـەی تونـد كرد، سەری وڵاخەكەی بـۆ دواوە كـێش كرد.
**عَكَسَ** الراكـبُ الدابـةَ: سوارەكە جڵـەوی وڵاخەكـــەی كـــێش كـــرد بـــۆ دواوە بۆئەوەی پاشەو پاش بگەڕێتەوە.
**عَكَسَ** علی فـلان أمـرَهُ: كارەكـەی بەسـەر فلاّنكەسدا دایەوە.
**عَكَـــسَ** الـــشَّيئَ: شـتەكەی بـۆلای زەوی كێشكردو پەستاوتی.
**عَكَسَ** الدّابة عَكساً وعكاساً: حەبلێكی لە لوتی وڵاخەكە كـردو بـە دەستێـكیەوە بەستیو بۆئەوەی نەتوانێ جوڵەو بكاو زەلیل بێ.
**عَكَـــسَ** القـضية: قەزیـەی مەنتیقەكـەی پێچەوانە كردەوە.
**عاكَـسَهُ**: پێـچەوانەی ئـەو جوڵایـەوەو ڕەدی دایەوە ٥ هەر یەك لەو دووانە پێـشەسەری ئـەوی تریـانی گــرت چنگیان تێك وەرهێنا.
**إنعَكَسَ** الشَّيئُ: كۆتـایی شتەكە بەسـەر سـەرەتاكەیدا درایــەوە ٥ لایـەكانی كەوتنــەوە سـەر یـەك ٥ هەڵـەوگێڕ كرایەوە.
**العَـاكِسُ**: (عــاكس التیـار) ئامێرێـكە گەڕانـــــەوەی تـــــەیار پێـــــچەوانە دەكاتـەوە ٥ بـۆ شـێوەی ڕاوەسـتان ٥

(المفتاح العاكِسُ) ئامێرێكە ڕێڕەوی تەیاری كارەبا پێچەوانە دەكاتەوە لە دائیرەی كارەبایی دا.

**العَكسُ**: ستەمو ناحەقی ٥ بەستنەوەی ولاخ بەبێ ئالیك بەبێ ئەوەی ئالفی بۆ دابنرێ ببەسترێتەوە ٥ لە زانستی مەنتیقدا گۆڕین‌و هەڵەوگێڕ كردنی هەردولای قەزییەیە بۆئەوەی قەزییەكی تری لێ پەیدا بێ لە ڕاستیدا وەكوو قەزییەی پێشوو وەهابێ ٥ لەبواری زانستی بەدیعدا بریتیە لە پێش خستنی بەشێكی كەلامەكە بەسەر بەشێكی تری داو پێچەوانە كردنەوەی، دەگوترێ: (عادات السادات سادات العادات).

**ألعَكيسُ**: شیر شۆربای بەسەردا بكرێ‌و بخورێتەوە ٥ تولە مێو بەسەر زەویدا بگوێزرێتەوەو بكرێتەوە بەنەمام.

**عَكَشَت** العنكبوتُ عَكشاً: جاڵجاڵۆكە تەونی ئەنجام دا.

**عَكَشَ** على الشّيْءِ: سۆزی بۆ شتەكە بوو.

**عَكَشَ** الشّيْءَ: شتەكەی كۆكردەوە.

**عَكَشَ** الشّيْءُ: شتەكە وێك هاتەوە چووە ناو یەكەوە.

**عَكَشَ** الأمرُ: كارەكە قورس بوو ڕاوەستا.

**عَكَشَت** العنكبوتُ: جاڵجاڵۆكەكە قاچی وێكهێنانەوە بۆ ئەوەی تەومنەكەی بكا ٥ بچنێ.

**العَكّاشَةُ** و **العُكّاشَةُ**: جاڵجاڵۆكە.

**عَكَصَهُ** عَكصاً: ڕەتی كردەوە، گێڕایەوە.

**عَكِصَ** عَكصاً: ڕەوشتی ناشیرین بوو.

**عَكَصَت** الدّابَةَ: ولاخەكە پاشەو پاش كشایەوە.

**تَعَكّصَ** بە: ڕژدی پێكرد، لەدەستی دەرنەهات.

**عَكَظَ** الشّيْءَ عَكظاً: شتەكەی تاشی، شتی پێدا هێنا ٥ دەگوترێ:

**عَكَظَ** الأديم بالدِّباغِ: بە دەباغكردن پێستەكەی خۆشكرد.

**عَكَظَ** خصمهُ بالحجج: بەبەڵگەوە بەرامبەرەكەی بۆڕدا.

**عَكَظَهُ** في المفاخرة: لە خۆ هەڵنانەوەدا بالادەست بوو بەسەریدا، بەرامبەرەكەی بۆڕدا.

**عَكَظَ** الدّابةَ: ولاخەكەی حەبس كرد.

**عَاكَظَهُ**: لەمەبەستەكانی گێڕایەوەو نەیهێشت بەمراد بگا.

**عَكّظَهُ** عن حاجتە: لە پێویستیەكانی لایدا.

**تعاكظوا**: شیعریان خوێندەوەو خۆیان هەڵنایەوەو شانازیان كرد ٥

شەڕەشمشێریان کرد، مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتنیان ئەنجام دا.

**تَعَكَّظَ** أمره، وعليه أمره: کارەکەی خوارو خێچ بوو گەیشتە بنبەست.

**تَعَكَّظَ** القوم في مكان كذا: خەڵکەکە لەوێ کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بیر لە ئیش‌و کاری خۆیان بکەنەوە.

**عكاظ**: بازارێکی عەرەب بوو لەسەردەمی پێش ئیسلامدا وەرزانە تێیدا کۆدەبوونەوە، شیعریان دەخوێندەوە شانازیان بەخۆیانەوە دەکرد ٥ ئەم بازارە کەوتبوە نێوان (النحلة) و (طائف)ەوە لەیەکەم ڕۆژی مانگی زیلقە عیدەوە دەستی پێ دەکرد تابیستی ئەو مانگە بەردەوام دەبوو.

**عَكَف** في المكان عكفاً وعكوفاً: لەو شوێنە مایەوەو تێیدا جێگیر بوو.

**عكف** في المسجد: لە مزگەوتدا مایەوە بەنیازی خودا پەرستی.

**عَكَف** على الشَّيْءِ: ڕوی لە شتەکە کردو دەستی دایەو وازی لێ نەهێنا.

**عَكَفَ** القوم حَولَهُ: خەڵکەکە لەدەوری گرد بوونەوە.

**عَكَفَ** الطيرُ حول القتيل: باڵندەو داڵەکان لەدەوری کوژراوەکە گرد بوونەوە.

**عَكَفَ** فلاناً على كذا عَكفاً: فلانکەسی لەسەر فلان شت بەندکرد.

**عَكَفَ** فلاناً عن حاجته: فلانکەسی لە پێداویستیەکانی مەنع کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْهَدْيَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُ﴾.

**عَكَّفَ** الشَّيْءَ: شتەکەی خوارکرد، چەماندیەوە.

**عَكَّفَ** الشَّعرَ: قژەکانی گشت‌و گرژ کردنەوە.

**عَكَّفَ** القوم عن كذا: خەڵکەکەی لەو شتە مەنع کرد.

**إعتَكَفَ** في المكان: لە شوێنەکە مایەوە.

**إعتَكَفَ** على الشَّيْءِ: لەسەر شتەکە مایەوە، بەردەوام بوو.

**تَعَكَّفَ** في المكان: لە شوێنەکە مایەوە.

**الإعتِكاف**: مانەوە لە مزگەوتدا بەنیەتی تاعەت‌و خودا پەرستی.

**العَكِفُ**: قژی گرژ.

**عَكَّ** الحرُّ عَكّاً: گەرما ڕەویەوەو بایەکەشی خست.

**عَكَّ** الرجلُ: پیاوەکە جێنشین بوو مایەوە.

**عَكَّ** بالأمرِ: ئەوەندەی شتەکە دووبارە کردەوە تا لێی ماندو بوو.

**عَكَّ** فلاناً بالقول: بەڕەقی‌و لالوتەوە وەڵامی فلانکەسی دایەوە.

**عَكَّ** فلاناً بشرّ: هێرشی هێنایەوە سەر

فلانكەس، مافی فلانکەسی دواخست ◦ بەندی کرد.

**عَكَّه** عن حاجته: لە پێداویستیەکانی لایدا.

**عَكَّ** فلاناً بالحجة: بەبەڵگە فلانی بۆڕدا.

**عَكَّ** الحُميَّ: لەرزوتا توشی فلانکەس بوو کزو لاوازی کرد.

**عَكَّ** الكلامَ: قسەکەی شی کردەوە.

**عَكَّ** الحديث من غيره: قسەی فلانی دووبارە کردەوە.

**عُكَّ** فلان: فلانکەس تای لیٚ هات ◦ گەرمی جەستەی زۆر زۆر بوو کاریگەری خراپی خستە سەر تەندروستی.

**ألعِكاكُ**: هەڕەتی گەرما لەگەڵ خستنی ڕەشەبا ◦ دەگوتریٚ: (یوم عِكاك ◦ ومكان عِكاك).

**ألعَكَكُ**: بەمانا (ألعِكاكُ) دیٚ.

**ألعَكّ**: بەمانا (ألعِكاكُ) دیٚ.

**ألعَكَّةُ**: زۆری گەرمیو وەستانی ڕەشەبا ◦ لەبەلان کە خۆر گەرمی کردبیٚ ◦ لەرزوتاو سەرەتای هەڵلەرزین لەکاتی لەرز داگرتندا.

**ألعُكَّةُ**: هیزەی بچکۆلە بۆ هەڵگرتنی ڕۆن تیایدا ◦ (ك: عكك وعكاك).

**عَكَلَ** عليه الأمرُ عَكلاً: کارەکەی لیٚ تیٚکچوو لیٚی گۆڕا.

**عَكَلَ** فلان في الأمر: فلانکەس ڕای خۆی دەربارەی کارەکە دەربڕی.

**عَكَلَ** الشَّيْءَ: شتەکەی کۆکردەوە، شتە بڵاوەکانی گرد کردنەوە.

**عَكَلَ** الدّابةَ: دەستی وڵاخەکەی هەڵبەست بۆئەوەی نەتوانیٚ بڕوا.

**عَكَلَ** المتاعَ: کالاکانی لەسەر یەکتر ڕیز کردن.

**أعكَلَ** عليه الأمر: کارەکەی لیٚ شێوا، لیٚی گۆڕا.

**إعتَكَلَ** الرجلُ: پیاوەکە گۆشە نشین بوو، لاکەوت ◦ شەڕو بەربەرەکانی کرد ◦ دەگوتریٚ: (إعتَكَلَ الثوران) دوو کەڵەگاکە شەڕە قۆچیان کرد.

**إعتَكَلَ** عليه الأمر: بەمانا (عَكَلَ عليه الأمر) دیٚ.

**ألعِكالُ**: حەبلێکە دەستی وڵاخی پیٚ هەڵدەبەستریٚ ◦ حەبلەکە لە زەندی وڵاخەکە دەبەستریٚو بە ئەستورایی دەستیەوە شەتەکی دەدا.

**ألعِكلُ**: خوێریو پڕوپوچ ◦ (ك: أعكال).

**ألعَوكَلُ**: پشتی کۆمەڵە لمب، سەر کۆمەڵە لمب ◦ پیاوی کورتە باڵا کە قاچەکانی لیٚك دوور کەوتبنەوە ◦ ئافرەتی گێلو کەودەن.

**ألعَركَلَةُ**: بەمانا (ألعَوكلُ)دیٚ.

**عَكَمَ** عَكماً: قەڵەو بوو.

**عَكَمَ** فلان: فلانكەس چاوەڕوانی کرد.
**عَكَمَ** المتاعَ: کالاکەی بەحەبل‌و شتی وا شەتەك دا ٥ قوماشەکەی بلاو کردەوە شەتەکی خستە ناو و ئەمجار قوماشەکەی بەسەردا دایەوە، واتە: قوماشەکەی لەشتەکەوە پێچا ٥ شتەکەی خستە ناو لایەکی هۆرەکەوە.
**عَكَمَ** الدّابةَ: وڵاخەکەی تەنگ دا ٥ دەمی جەواڵ‌و خەرارو گوێنیەکەی بەست.
**أعكَمَ** فلاناً: یارمەتی فلانکەسی دا لەسەر شەتەك دانی کالاکان.
**عَكِمت** الدّابةُ: وڵاخەکە قەڵەو بوو.
**إعتَكَمَ** القومُ: خەڵکەکە بارو بارگەنەیان ڕێکخست بۆئەوەی لەسەر پشتی وڵاخەکان شەتەکیان بدەن.
**إعتَكَمَ** الشّيْئُ: شتەکان کەوتنە سەر یەك.
**العِكامُ**: ئەو حەبل‌و گوریس‌و شتانەی کالایان پێ شەتەك دەدرێ ٥ (ك: عُكُمٌ).
**العِكمُ**: قوماش لاتاو تێرەو هۆرو قەرتاڵەو شتی وا بەمەرجێ کالایان تێدا بێ ٥ حەبلی بیر، گوریسی بیر ٥ حەبلی ناو هەڵکێشان لەبیر ٥ (ك: أعكام)
**العَكّامُ**: ئەوکەسەی لاتاو لابارەکان لەسەر پشتی وڵاخ ڕێك دەخاو شەتەکی دەدا ٥ قەتارچی.
**عَكَنَتِ** الجاريةُ: چەتیوەکە لوێچی لەگەدەی پەیدا بوون بەهۆی قەڵەویەوە.
**تَعَكَّنَ** البطنُ: گەدەی شورابەی کرد لوێچ‌و لۆچی تێدا پەیدا بوون.
**تَعَكَّنَ** الشّيْئُ: شتەکە هەندێکی کەوتە سەر هەندێکی‌و دوو لۆو سێ لۆ بۆوە.
**العَكناءُ**: ئافرەتی قەڵەوی ورگ شۆڕ.
**العُكنَةُ**: گۆشتی گەدە کە لوێچ‌و لۆچی تێدا پەیدا بوون‌و چرچەکانی کەوتبنە سەریەك.
**عَكَتِ** الدّابةُ عَكواً: وڵاخەکە لەبەهاردا کەتەو زەبەللاح بوو، قەڵەو بوو.
**عكا** الدخان: دووکەڵەکە بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە.
**عكا** فلان بازاره: فلانکەس بە بەرکۆش‌و ئیزارەکەی ورگی شەتەك دا بۆئەوەی گەدەی دانەچۆڕێ ورگی شل نەبێ.
**عكا** الضبُّ: بزنمژەکە کلکی خوارکردەوە، چەماندیەوە.
**عكا** الرجل ذنب الدّبة: پیاوەکە کلکی وڵاخەکەی گرێدا.
**عكا** الشّيْئَ: شتەکەی شەتەك دا.
**عكا** فلاناً في الحديد: فلانکەسی پێوەند کرد.

**عَكَتِ** المرأةُ شَعرَها: ئافرەتەکە قژەکانی کۆکردنەوە.

**عكى** فلان بازاره عكياً: فلانكەس بە ئیزارو بەرکۆشەکەی بەرموسلدانی خۆی بەست بۆئەوەی ورگی شۆڕابە نەکا.

**عكى** فلان: فلانكەس مرد.

**أعكى** فلان: بەمانا (عكى)دێ.

**عكّى** فلان: بەمانا (عكى)دێ.

**عَكّى** على السيف والرُمح: ڕەگە لاملێکی تەڕی لە شمشێرەکە یان لە ڕمبەکە شەتەك دا بەو سیرمە شمشێرەکەی پێچا.

**عَكّى** الدخان: دوکەڵەکە بەرەو حەوا بەرز بۆوە.

**الأعكى**: قەد ئەستۆر ◊ کەلەکەو خالیگە ئەستور.

**ألعاكي**: ریس ڕێسێك کە دوای رستنی ریسەکە بیفرۆشێ واتە: کەسێك پیشەی ئەوە بێ ریس بڕێسێو بیفرۆشێ ◊ کەسێك زۆر حەزی لە شێری ساغ بێ، شیری بێ غەڵو غەش بخواتەوە.

**العَكوَةُ**: بنکی کلك کە توکی ڕوتابێتەوە ◊ بنکی زمان ڕەگێکی سپیە تلّیش دەکرێو بادەدرێو دەگرێتە قەمچی منداڵانەو یاری پێ دەکرێ ◊ چالیەکە لە چەناگەی منداڵی ساوادا.

**ألعُكوَةُ**: بەمانا (ألعَكوَةُ) دێ ◊ ئەستوراپی شت ◊ زوربەی شت ◊ ناوقەد ◊ گلۆڵە ریسی ڕێسراو کە لەتەشیەکە دادەماڵدرێ.

**ألعَكِيُّ**: شیری خالیصو بێ غەش.

**عَلَبَ** الشَّيْءُ عَلباً: شتەکە ڕەق بوو، وشکەوە بوو ◊ دەگوترێ: (عَلَبَ اللحمُ) گۆشتەکە بۆگەنی کرد.

**عَلَبَ** الشَّيْءَ عَلباً وعلوباً: شتەکەی نیشانە کرد خەتخەتو کونج کونجی کرد دابڕدابڕی کرد.

**عَلَبَ** السيفَ ونحوه: دەسکی شمشێرەکەی بە ڕەگە لاملی حوشتر پێچا.

**عَلِبَ** الشَّيْءُ عَلَباً: بەمانا (عَلَبَ) دێ.

**عَلِبَت** يده: دەستی ئەستوور بوو.

**عَلِبَ** الحيوانُ: ئاژەڵەکە نەخۆشی توشی ڕەگی لاملی بوو ملەخڕەی گرت وملی خواربوو.

**عَلِبَ** السيفُ: شمشێرەکە کەل بوو، کەڵکی تێکەوت.

**عَلِبَيَ** الرجلُ: پیاوەکە ڕەگی لاملی دەرکەوت بەهۆی لوتبەرزیو خۆ بەزلزانی.

**عَلَّبَ** الرجلُ: پیاوەکە قسناغی دروست کرد (ئامێرێکی پێوانەی

دانەویڵەیە لەدار یان لە پێستی حوشتر دروست دەکرێ).

**عَلَّبَ** السیف: دەسکی شمشێرەکەی بە تیلمە سیرمەی ڕەگی لاملی حوشتر پێچا.

**عَلَّبَ** الشَّیْءَ: شتەکەی نیشانە کرد، خەت خەتی کرد، کەلکەلی کرد.

**عَلَّبَ** الفاکهة واللحمَ والخضر ونحوها: میوە یان گۆشت یان سەوزەکەی خستە ناو سندوق و کارتۆنەوەو پێچایەوە بۆئەوەی بنێردرێ بۆ فرۆشتن یان بەشێوەیەك لە شێوەکان بۆ ماوەیەك هەڵبگیرێ.

**استَعلَبَ** اللحمُ: گۆشتەکە بۆگەنی کرد، بۆنی گۆڕا.

**استَعلَبَ** البَقلَ: پۆلکەو دانەویڵەکەی بە کامڵیو ڕەق بویی هاتەدەست.

**استَعلَبَت** الماشیة البقل: ئاژەڵەکە پۆلکەو لەوەڕەکەی بەدڵ نەبوو نەیخوارد.

**إعلنبی** الدیك والکلبُ: کەڵەشێر یان سەگەکە خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕ (شەڕە کەڵەشێرو) و (شەڕە سەگ).

**العَلبُ**: شتی توندو پتەو و ڕەق ◊ شوێنکەو کەلکەل کردن ◊ زەوی کە گیای لێ نەڕوێ ◊ (ك: عَلوبٌ).

**العِلبُ**: زەوی گیا تیانەڕواو ◊ پیاوی تەبیات وشك و کەتە ◊ شوێنی ڕوانی درەختی سیدر ◊ (ك: عُلوب).

**العَلِبُ**: کەتەو زەبەللاحو بەتەمەنو زبر ◊ بەزۆری دەکرێتە ناوەڵناوی نێر یەقەرەو گاکێوی ◊ زەوی گیا تیانەڕواو ◊ پیاوی وشك تەبیاتو کەتەو تووڕە.

**العِلباءُ**: ڕەگی لامل ◊ دەگوترێ: (تَشَنَّجَ عِلباء الرجل) ڕەگی لاملی پیاوەکە گرژ بوو ◊ (ك: العلابي).

**العُلبَةُ**: عەرەبەو قسناغ (ئامێرێکی دانەویڵە پێوانە لە تەختەدار یان پێستی حوشتر دروست دەکرێ) ◊ زەرفێکە، سندوقێکە، هیزەیەکە، تەنەکەیەکە شتی تێدا هەڵدەگیرێ بۆ کاتی پێویست ◊ (ك: عُلَبٌ وعِلاب).

**المَعلوبُ**: ڕێگای تەخت کراو وخۆش کراو.

**عَلَثَ** الزندُ عَلَثاً: چەرخەکە ئاگری نەکردەوە.

**عَلَثَ** الشَّیْءَ: شتەکەی کۆکردەوە، تێکەڵاوی کرد.

**عَلَثَ** القومُ عَلَثاً: خەڵکەکە شەڕیان کرد.

**عَلَثَ** بە: پێوەی نووسا، هۆگری بوو.

**عَلَثَ** الذِئبُ بالغنم: گورگەکە کەوتە ناو مەڕەوەو دەستی خۆی وەشاند.

**عالَثَهُ**: خۆی لێ نزیك کردەوەو شەڕی لەگەڵ کرد.

**عَلَّثت** النفس: دمروونی تێکەڵهات.

**عَلَّثَ** الشَّيْءَ: شتەکەی تێکەڵ کرد.

**إعتَلَثَ** فلان: فلانکەس نیسبەت درا بۆلای غەیری باوکی خۆی.

**إعتَلَثَ** الزندُ: چەرخەکە ئاگری نەکردەوە ٥ دەگوترێ: (فلان غير مُعتَلِثِ الزناد) فلانکەس بەدڵی خۆی ژنی نەهێناوە ٥ (فلان معتلث الزناد) فلانکەس بەدڵی خۆی ژنی هێناوە.

**إعتَلَثَ** الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵنەبژارد، هەروا هەرچەمەکی هەڵی گرت.

**إعتلث** زنداً: دارێکی هەڵگرت نازانێ ئاخۆ ئاگری تێدایە یان نا ٥ ئاگری پێ دەکرێتەوە یان نا.

**إعتلثَ** الشَّيْءَ: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**العُلاَّثَةُ**: دووشت کە تێکەڵاو کرابن ٥ پیاوێك لەم لاو لەلا قاچو قۆچ بکا.

**ألعَلَثُ**: ئەو شتەی تێکەڵ گەنم دەکرێ ٥ (گەنمو ماش، گەنمو جۆ) خواردەمەنی تێکەڵکراو بەگەنمو جۆ.

**ألعَلِثُ**: کەسێك پاڵ غەیری باوکی بدرێ.

**العُلثَةُ**: ئەو شتەی پیاو قنیاتی پێدەکا لە بژیو.

**العَلثى**: خواردن کە شتێکی تری کوشندەی تێکەڵ بکرێ ٥ دەگوترێ: (قتل النسر بالعلثى) بازەکەی بەخواردنی ژەهر تێکەڵاو کوشت.

**العَلِيثُ**: ئاردی لەگەنمو جۆ تێکەڵکراو.

**العَلِيثة**: بەمانا (ألعليث)دێ.

**عَلَجَ** الغلام وغيره عَلَجاً وعلوجاً: منداڵەکە زلو کەتە بوو.

**عَلَجَ** البعيرُ: حوشترەکە ڕوەکی عیلجانی خوارد.

**عَلَجت** الناقةُ عَلَجاناً: حوشترەکە هەڵسورو داسوڕی کرد.

**عَلَجَ** فلاناً عَلَجاً: بەسەر فلانکەسدا زاڵ بوو.

**عَلِجَ** عَلَجاً: پتەو بوو، گشت بوو، هێزی پەیداکرد.

**عالَجَ** الشَّيْءَ معالجةً: خەریکی شتەکە بوو سەرو بەری کرد.

**عالَجَ** المريض: دەرمانی نەخۆشەکەی کرد.

**عالَجَ** فلاناً: بەسەر فلاندا بالادەست بوو.

**عالَجَ** عنه: داکۆکی لێ کرد.

**عَلَّجَ** الإبلَ: ڕوەکی عەلەجانی دا بەحوشترەکە.

**إعتَلَجَ** القومُ: خەڵکەکە شەڕیان بوو یەکتریان کوشتو بڕ کرد.

**إعتَلَجتِ** الأرض: زەویەکە ڕوەکی باشی

لێ ڕوا ٥ گیاو گژی باڵای کرد چڕو پڕو زۆر بوو.

**إعتَلَجَ الموجُ:** شەپۆلەکان تێك بوونەوە.

**إعتَلَجَ الهم في صدره:** خەمو خەفەت لەدڵیدا سواری یەك بوون.

**إعتَلَجَ الرملُ:** لمبەکە کۆبوەوە.

**تَعَلَّجَ الرملُ:** لمبەکە کۆبوەوە.

**تَعَلَّجَ الجلدُ:** پێستەکە ئەستوور بوو.

**إستَعلَجَ الجلدُ:** بەمانا (تَعَلَّجَ)دێ.

**إستَعلَجَ فلان:** فلانکەس کەتەو بەهێزو پتەو بوو.

**العالِجُ:** لمی سوار یەك بوو و پەستێوراو (ك: عوالج) ٥ لە حەدیسی پاڕانەوەدا هاتووە: (وما تحوبه عوالج الرمال) ئەوەی لمی پەستێوراوی لەناوخۆی گرتووە.

**العِلاجُ:** چارەسەر، ناوە بۆ ئەو شتەی چارەسەری پێ دەکرێ.

**العِلجُ:** هەر پیاوێك توندو تیژو وەشکە تەبیات بێ ٥ گوێدرێژ، کەرەکێوی قەڵەو ٥ (ك: علوج وأعلاج).

**العَلِجُ من الرجال:** پیاوی بەهێزو توانا کە زۆر لە ڕکەبەرانی خۆی خستبن‌و لەناوی بردبن ٥ چارەسەرکاری ئیشی چەواشەو گران.

**العَلَجُ:** بەمان (العَلِجُ)دێ.

**العَلَجُ:** گیا عەلەجان ٥ وردە هەنگ.

**العُلجان:** کۆمەڵە درەختی عیضاە.

**العَلَجان:** ڕوەکێکە لە دەشت‌و سارادا دەڕوێ لاسکەکانی سەوزو باریکن، گەڵاکانی درێژۆکەو وردن، گوڵێکی زەردو بەرێکی وردی هەیە دەشوبهێتە ئانیسۆن‌و بۆنی زۆر خۆشە.

**العَلجَمُ:** زەلکاوی زۆر ئاو ٥ حوشتری درێژ، کەری درێژ ٥ (ك: علاجم).

**العُلجُمُ:** زۆر ڕەش.

**العُلجومُ:** بەمانا (العُلجُمُ) دێ ٥ دێڵە کەری قەڵەو ٥ ئاوی زەلکاوی زۆرو قوڵ ٥ بۆقە نێرەو کیسەڵە نێرە ٥ (ك: علاجیم)

**عَلِدَ الشَّيءُ عَلَداً:** شتەکە ڕەق‌و پتەو بوو.

**العَلَدُ:** ڕەگی مل ٥ شتی ڕەق‌و پتەو لەهەر شتێك بێ ٥ ڕوەکێکی درەخت ئاساییە ٥ بەرەکەی بێ توێکڵە گەڵای نیە، لە ساراو چۆڵەوانیدا دەڕوێ لەسارای سینادا زۆرەو ئاژەڵ حەزی لەخواردنیەتی ٥ (ك: أعلاد).

**عَلِزَ الی الشَّيءِ:** مەیلی شتەکەی کرد حەزی لێ بوو.

عمامة
معلف
علبة
الانعكاس
خطّ عمودي
عامد المضلّع المنتظم
عامد الهرم المنتظم
عسّالة
عسيرة النحل
عويسة
عمود
معول
عود
العين
عامة
عنبيّات
عناقيّة
عنصل
عناب
عنبة
عنب الدبّ
عنب الحيّة
علاقة
عليق
عنم
عنم الكرم
عنقود العنب
عنب الثعلب
العاج
عنكبوت
عناق الأرض
علقة
عنز
عير

**أعلَزَه** الوجعُ: ترس‌و بیم خەوی لێ زڕاندو حەجمینی لێ هەڵگرت.
**اعلَزَ** الشّئ: شتەکە عاجزو دامای کرد.
**العِلَوْزُ**: ئازاری سك ○ مردنی کتوپڕ ○ شێتی.
**عَلَسَ** عَلساً: خواردی‌و خواردیەوە.
**عَلَسَ** الرجلُ: پیاوەکە هەراو هۆریای کرد.
**عَلَستِ** الإبلُ: حوشترەکە شتێکی خوارد، شتێکی دەست کەوت ○ بەزۆری بۆ نەفی بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (ما عَلَسَ الرجلُ) (ما علَسَتِ الإبلُ).
**عَلَّسَ** الداءُ: دەردو نەخۆشیەکە پەرەی سەندو گەورە بوو.
**عَلَّسَ** فلان: فلانکەس هات‌وهاواری کرد ○ دەگوترێ:
**ما عَلَّسَ** ضیفَهُم: خواردنیان نەدا بەمیوانەکەیان.
**العُلاّسُ**: خۆراك ○ دەگوترێ: (ما أكلت اليومَ عُلاساً).
**العَلَسُ**: هەر شتێك بخورێ‌و بخورێتەوە ○ جۆرێکە لە گەنم دوودەنك‌و سێ دەنکی لە توێکڵەکەیدایە بەزۆری خۆراکی دانیشتوانی شاری صەنعای یەمەنە.
**العَلَسِيُّ**: پیاوی ئازاو بەهێز.
**العُلوسُ**: خواردەمەنی ○ دەگوترێ: (ما ذقت اليوم عُلوساً).
**العَلیسُ**: برژاوی قەڵەو ○ برژاوی پێگەیشتو ○ برژاو بەپێستەوە.
**عَلِصتِ** التخمَةُ في بطنه: تێری‌و گەدە ترشان ئازاری دا.
**العِلَّوصُ**: تێری‌و گەدە ترشان‌و سك ئێشە ○ گورگ.
**عَلَضَهُ** عَلضاً: جوڵاندی‌و لەقاندی بۆئەوەی دەری بێنێ ○ دەگوترێ: (عَلَضَ الوتدَ) سنگەکەی لەقاند بۆئەوەی دەری بێنێ.
**عَلَطَ** البعيرَ عَلطاً: لاملی حوشترەکەی داخ کرد ○ نیشانەی تێدا جێهێشت.
**عَلَطَ** الرجلُ بقبيح: شتی ناشیرینی پاڵ پیاوەکە دا.
**عَلَطَ** البعير: بەمانا (عَلَطه)دێ ○ نیشانەو شوێنکەی داخی لاملی حوشترەکەی سڕیەوە ○ لای برد ○
**إعتلَطَهُ** وبه: کێشەی لەگەڵ نایەوەو شەڕی پێ فرۆشت.
**تعَلَطَ** القوسَ: کەوانی لەشانی کرد ○ (تیروکەوانی لەخۆ دان) ○
**إعلَوَّطَ** الشّئَ: خۆی بەشتەکەوە هەڵواسی‌و بەخۆیەوە نوساند ○ دەگوترێ: (إعلَوَّطَ البعيرَ) خۆی بەملی حوشترەکەوە هەڵواسی‌و سەری کەوت.

**إعلَوَّطَ** فلاناً: فلانكەسی گرت ◦ بەندی کرد.

**إعلَوَّطَ** فلان الأمرَ: فلانکەس چووە ئەو ئیشەوە بەبێ تێفکرین‌و ورد بوونەوە.

**الإعليط**: نیشانەیەکە لەلامل خەتێك یان زیاتر بەپانی لەلاملی حەیوانەکە دەبینرێ ◦ هەر لق‌و شورك‌و لقەدار کە گەڵای وەری بێ ◦ توێکڵی بەری درەختی مەرخ.

**العالِطُ**: (شاعر عالط) شاعیرێکی فەسیح‌و زمان ڕەوانە قسەکانی دەڕازێنێتەوە.

**العِلاطُ**: لامل ◦ نیشانەی لامل خەتێك یان زیاتر بەپانی ◦ حەبلێکە بەدەوری ملدا.

**العَلْطُ**: شوێنکەی داخ کردن بەلاملەوە ◦ ڕەشیەکە ئافرەت لە ڕوخساریدا خۆی پێ جوان دەکا ◦ (ك: أعلاط).

**الأعلاط** من الكواكب: ئەو ئەستێرانەن کە ناویان نیە.

**العُلَطةُ**: ڕەشییەکە ئافرەت بۆ جوانی‌و خۆ ڕازاندنەوە لە دەم‌وچاوی خۆی دەدا ◦ ملوانکەی هۆنراوە لە قەرەنفول.

**عُلَط** (العُلطَتان): دوو خاڵن لەملی باڵندەدا.

**عَل عَل**: تێڕاخوڕین لەمەڕو بزن.

**تَعَلعَلَ**: کەوتە جم‌و جۆڵ‌و هەڵبەزو دابەز ◦ هێواش بۆوە.

**العَلعالُ**: باڵندەی نێرە لەجۆری قەنبەر.

**العُلعُلُ**: بەمانا (العَلعالُ) دێ ◦ لاپەڕاسو.

**العُلعُولُ**: شەڕ ◦ تێکرو تێکوشیوی‌و شەڕو هەرا.

**عَلَفَ** الرجلُ عَلفاً: پیاوەکە زۆری خواردەوە.

**عَلَفَ** الحيوانَ: ئالفی دا بەئاژەڵەکە.

**أعَلَفَ** الطّلحُ: درەختەکە پۆخەکەی دەرکەوت.

**أعلَفَ** الحيوانَ: ئالفی دا بەئاژەڵەکە.

**عَلّفَ** الطلحُ: درەختەکە گوڵوکەی هەڵوەری‌و میوەکەی خڕهەڵدا.

**عَلّفَ** الحيوانَ: بەزۆری خەریکی ئەوە بوو عەلەف بخاتە بەردەمی ئاژەڵەکان.

**إعتَلَفَت** الدّابةُ: ولاخەکە ئالفەکەی خوارد.

**تَعَلّفَ** الرجلُ: پیاوەکە لەشوێنی گونجاو گەڕا بەدوا لەوەڕدا.

**إستَعلَفت** الدّابة وغيرها: ئاژەڵەکە بەدوا لەوەڕدا گەڕا.

**العُلفُ**: درەختێکی یەمەنییەو وەکوو

دارمێـو وایـە ٥ هەڵـدەگیرێو وشـك دەكرێ گۆشتی پێ دەكولێندرێ.

**العِلفُ**: بەمانا (العُلفُ)دێ ٥ زۆر خۆر.

**العَلَـفُ**: ئالیـكو ئـاڵفی ئـاژەڵ ٥ (ك: علوفة وأعلاف وعلاف).

**العُلفـى**: خەرمانلۆغـە، ئـەو بەشـە دانەوێڵەیەیە كە فەلاح دایدەنێ بۆ برادەرو خوێشەكانی.

**العَلاّفُ**: ئالیك فرۆش ٥ ئالف فرۆش.

**العُلّـفُ**: میـوەی ڕوەكـی (الطّلـح)٥ دەشوبهێتە پاقلەی تەڕو تـازە، شین دەبێو حوشتر دەیخوا.

**العُلّفـةُ**: دانەوێڵەیەكـە وەكـوو فـولو نیسكو فاصۆلیا.

**العُلوفَـةُ**: ئالیـكو ئـاڵفی ئـاژەڵ ٥ (ك: عُلُفٌ) ٥ ئاژەڵێـكە ئـاڵفی دەرخـوارد دەدرێ بۆئـــەوەی قەڵـــەو بـــێ نـانێردرێ بـۆ پـاوان هـەر لەماڵـەوە لەسەر ئاخور ئالیكی پێ دەدرێ.

**العَلیفُ**: ئەو ئاژەڵەیە ئالیكی دەدرێتـێ بۆئەوەی قەڵـەو بێو نـانێردرێ بـۆ لەوەڕان لە كێو.

**المِعلَـفُ**: شـوێنی ئالیـك دانو ئالیـك خواردن.

**العُلفـوفُ**: پیـاوی وشـك تـەبیاتو بەتەمـەنو قەڵـەو ٥ پیرەمێـردی جەسـتە گـەورەو قـژ درێـژو ڕیش پانو پڕ.

**عَلَقَ** الصَّبـيُّ علوقاً: منداڵەكە قامكی خۆی مژی.

**عَلَقَت** البهیمـة الـشَجَرَ علقـاً: ئاژەڵەكـە گەڵای درەختەكەی خوارد.

**عَلَقَ** فلان فلاناً: فلانكەس بەسـەر فلانـدا باڵادەست بـوو لـەبواری بەدەستهێنانی بەڵـگەی بـەهێز بـۆ خۆهەڵنانـەوە ٥ فلانكـەس جنێـوی بەفلانكـەس دا ٥ دەگـوترێ: (عَلَقَـهُ بلـسانه) بـە زوبـانی شرتو شۆی لێ بڕی.

**عَلِقَـت** البهیمـة علقـاً وعلاقـةً وعلوقـاً: حەیوانەكـە ئـاوی خـواردەوە لەگەڵ ئاوخواردنەوكەیـدا زەروێـك بـەناو قورگی دا نووسا.

**عَلِقَ** الشَّيءُ الـشَّيءَ: شـتەكە لـەناو شـتەكە چەسپاو پێیدا نووسا.

**عَلِقَ** الشوكُ الثوبَ: چقل بەقوماشـەكەوە نووساو لێی نەبۆوە.

**عَلِـقَ** الظبـيُ بالحبالـة: ئاسـكەكە بەداوەكەوەبوو.

**علقـت** الأنثـى بـالجنين: مێینەكـە بەبێچووەكەی هەڵەوگیر بوو.

**عَلِقَ** فلان فلاناً وبـە: خۆشەویستی فلانـی لەدڵدا چەسپا.

**عَلِقَ** أمره: كارەكەی ئەوی زانی.

**عَلِقَ** یفعل كـذا: دەستی بەكارەكە كـرد.

**عَلِقَ** الإنسان وغيره: ئادەمیزاد لەکاتی ئاو خواردنەوەیدا زەرویەك بەقورگیدا نووسا ٥ (فهو معلوق).

**أعلَقَ** الصائِدُ: نێچیروانەکە نێچیرەکەی خستە داوی خۆیەوە.

**أعلَقَ** الرجلُ: پیاوەکە بەهۆی زەرووەوە خوێنی لەخۆی گرت ٥ زەروی خستە سەر جەستەی بۆئەوەی خوێنی بمژێ.

**أعلَقَ** فلان: فلانکەس بڕێکی ماڵو سامانی پڕ نرخو بەهای دۆزیەوە.

**أعلَقَ** ظفرَهُ فیه: نینۆکی تێ هەڵچەقاند.

**أعلَقَ** الشَیْءَ بالشيءِ: شتەکەی بە شتەکەوە نووساند ٥ زەروی بەقورگەوە نووساند.

**أعلَقَ** السیفَ وغیره: قوڵفەو ئەڵقەیەکی بۆ شمشێرەکە دروست کرد پێی هەڵبواسێ.

**عَالَقَهُ**: شانازی بەسەردا کرد بەهۆی هەبوونی شتی بەنرخ لەلای.

**عَلَّقَ** الرجلُ: پیاوەکە هەوساری وڵاخەکەی هاویشتە سەر ملی وڵاخەکە خۆیو لێی دابەزیو بەرەڵای کرد.

**عَلَّقَ** الشَیْءَ بالشيءِ: شتەکەی بەشتەکەدا کرد، پێیدا هەڵواسی ٥ دەگوترێ: (عَلَّق الثوبَ على المشجب) ٥ کراسەکەی بەعەلاگەکەوە هەڵواسی ٥ (علَّق بابا على داره) دەرگای خانوەکەی داناو رێکی خست، دەرگاکەی بۆ خانوەکەی هەڵواسی.

**عَلَّقَ** أمره: کارەکەی ڕاگرت نەوازی لێ هێنا نەئەنجامی دا ٥ دەگوترێ: (عَلَّق القاضي الحكم) دادوەر حوکمەکەی ڕاگرت بڕیاری لەسەر نەدا.

**عَلَّقَ** فلان إمرأةً: فلانکەس خۆشەویستی ئافرەتێك چووە دڵیەوەو شەیدای بوو.

**إعتَلَقَهُ** وبه: زۆری خۆش ویستو شەیدای بوو.

**تَعَلَّقَ** الشوكُ بالثوبِ: چقڵەکە بەکراسەکەوە نووسا.

**تَعَلَّقَ** الوحشُ أو الظبي بالحبالة: ئاژەڵە کێویەکە یان ئاسکەکە بە تەڵەکەوە بوو ٥ کەوتە داوی نێچیرەوە.

**تَعَلَّقَ** الإبلُ: حوشترەکە گەڵای درەختی (عەلق)ی خوارد.

**تَعَلَّقَ** الشَیْءَ: شتەکەی هەڵواسی.

**عَلَّقَ** فلاناً: فلانکەسی خۆش ویست ٥ لەپەنددا هاتووە: (لیس المتعلِّق كالمتأنِّق) کەسێك قنیات بەشتی کەم

بکا وەکوو کەسێك نیە شت هەڵبژێرێ‌و بە ئارەزووی خۆی شت بۆخۆی وەلانێ‌و بخوا.

**الأعالیق**: هەر شتێك هەڵبواسرێ.

**التَّعلیقة**: پەراوێزی کتێب.

**عَلاقِ**: ئیسمی فیعلەو بەمانا (تَعَلَّق)دێ.

**العلاقُ**: ئەو گەلاو لەوەڕیە دەمی ئاژەڵ دەیگاتێ‌و لرفی دەدا ٥ ئەو وردە خواردنانەی پێش نان خواردن دەخرێنە سەر سفرە بۆ خافلاندن‌و ئیشتیها کردنەوە ٥ بەزۆری لەدوا (نەفی) بەکاردێن ٥ دەگوترێ: (ما ذقنا علاقاً).

**العَلاَقَةُ**: پەیوەندی‌و دۆستایەتی ٥ خۆشەویستی ڕاستەقینەو بەدڵ ٥ ئەو گەلاو گۆڵەی ئاژەڵ دەمی دەگاتێ لەدرەخت‌و دەیخوا ٥ گوزەرانی کەم ٥ ئیش‌و کارێك ئادەمیزاد پێیەوە پابەند بێ ٥ لەبواری زانستی بەلاغەدا (علاقة) بریتیە لە جۆرە پەیوەندیەك لە نێوان مانای ئەصڵی‌و مەجازیدا.

**العِلاقَـةُ**: ئەو سینگ‌و ئەڵقەو عەلاگەیەی شمشێری پێدا هەڵدەواسرێ.

**العَلقُ**: درەختی دەباغ.

**العِلقُ**: شتی بەنرخ‌و گرانبەها ٥ هەرشتێك دڵ پێوەی پەیوەست بێ ٥ (ك: أعلاق علوق) ٥ دەگوترێ: (هو عِلقُ عِلم) ئەو خولیای عیلم‌و زانستە.

**العَلَقُ**: هەر شتێك هەڵبواسرێ ٥ ئەو قوڕو قاڵەی بەدەست‌و پلەوە دەمێنێتەوە ٥ ئەو گەلاو گۆڵەی دەمی ئاژەڵ دەیگاتێ بەدرەختەوە ٥ کونێکە لەکراس‌و شتی وا دەگرێ بەسینگەوە، لە ئاڵقەی سینگەکە دەگرێ ٥ بەن‌و تیلمە چەرمێکە کوندەو مەشکەی پێ هەڵدەواسرێ ٥ زوربەی ڕێگا ٥ زەروو، کرمێکی ڕەشە خوێن دەمژێ بەزۆری لەئاوی ڕاوەستاودا دەبێ کە ئاژەڵ ئاوی لێ دەخواتەوە زەروەکە بەقورگی ئاژەڵەکەدا دەنوسێ‌و پاش ماوەیەك قورگی دەگرێ، مرۆڤی لێزان زەروەکە لێ دەکاتەوە ٥ خوێنپارە (خوێنی بەستوو توند بوو) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾.

**العَلقی**: درەختێکە هەمیشە سەوزە بەسەرما تێك ناچێ ٥ لق‌و پۆپی درێژو باریکی هەن گەلای وردی جوانی هەیە.

**العِلقَةُ**: هەر گەلاو گوڵێك ئاژەڵ دەمی بگاتێ بەدرەختەوە ٥ هەر شتێك

ژیانی کوله مەرگی پێ بەسەر ببرێ ٥ هەر زەڵاتەو وردە خواردنێك پێش نان خواردن پێوەی خەریك بی ٥ درەختێکە زستان حوشتر ملّو موشی لێ دەکا چونکە بەزستان گەڵاکەی هەر سەوزە.

**اَلعُلَّيقُ**: ڕوەکێکە بەدرەخت هەڵدەگەڕێو تێی دەئاڵێ.

**اَلعُلَّيقى**: بەمانا (اَلعُلَّيق)دێ.

**العَلوقُ**: تۆوی نێر (تۆماوی حەیوانی نێر بۆ کەڵدانی مێینە) ٥ هەر شتێك پەیوەست بێ بەئادەمیزادەوە ٥ لەوەڕێك وڵاخو ئاژەڵ لێی بلەوەڕێ ٥ ئافرەتێك جگە لەمێردی خۆی کەسی تری خۆش نەوێ ٥ کەمێك شیر.

**اَلعَليقُ**: ئالفی وڵاخ ٥ کاو و جۆ.

**اَلعَوَالِقُ**: گیانلەبەرو ڕوەکی ناو دەریا.

**اَلمِعلاقُ**: زمانی ڕەوانو بەلیغ: هەر شتێك شتی تری پێدا هەڵبواسرێ ٥ گۆشتی هەڵواسراو ترێی هەڵواسراو ٥ پیاوی سەرکەشو کێشەو نیزاع خەرەوە ٥ پیاوێك لە کێشەو نیزاعدا پشت بە بەڵگە ببەستێ.

**اَلمَعلَقَةُ** (رجل ذو مَعلَقَة): پیاوێکە پەیوەندی بەهەموو شتێکەوە هەیە ٥ هەموو کەس خۆی پێوە هەڵدەواسێ.

**اَلمُعَلَّقَةُ**: ئافرەتێك مێردەکەی بەلایەوە نەچێو تەڵاقی نەدا.

**اَلمعلقات**: حەوت چامە شیعری عەرەبین عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام بەدیواری کەعبەوە هەڵیان واسی بوون.

**اَلمَعلوقُ**: ئەوەی شتی لەسەر هەڵدەواسرێ ٥ هەر شتێك هەڵبواسرێ وەکوو گۆشتو هێشوە ترێو شتی تر.

**عَلقَمَ** الطعامَ: شتی تالّی کردە ناو خۆراکەکە.

**اَلعَلقَمُ**: هەر شتێك تالّ بێ ٥ کاڵەکە مارانە.

**اَلعَلقَمَةُ**: پارچەیەك لە شتی تاڵ.

**عَلَكَ** العِلكَ وغيره عَلكاً: بنێشتەکەی جوو.

**عَلَكَ** الدّابة واللجامَ: وڵاخەکە لغاوەکەی لەدەمیدا جوو، لغاوەکەی لەدەمیدا هێناو برد.

**عَلَكَ** نابه: ددانی لە ددانەکەی خشاندو سیرەی لێ هات.

**عَلَكَ** مالَهُ: جوان سەرو کاری ماڵو سامانی خۆی کرد.

**عَلَكَ** يديه على مالِه: دەستی خۆی قوچاندو ڕزدی نواندو هیچی لەماڵی خۆی نەبەخشی.

**عَلَكَ** العجين: هەویرەکەی زۆر شێلا.
**العَالِكُ**: (طعام عالك) خواردنێکی توندەو زۆر بەزەحمەت دەجورێ.
**العَلاكُ**: ئەو شتەی دەجورێ ٥ دەگوترێ: (ما ذقتُ عَلاكاً).
**العُلاكُ**: بەمانا (ألعَلاك) دێ.
**العِلكُ**: بنێشت: کەلە دارەبەن دەردەهێندرێ ٥ (ك: علوك وأعلاك).
**العَلِكُ**: شتی جیڕو لینج ٥ دەگوترێ: (طعام عَلِكٌ) خواردنێکی لینجو جیڕە بەناخۆشی دەجورێ.
**العَلِكَةُ**: زەوی نزیك ئاو.
**العَلاَّكُ**: بنێشت فرۆش.
**عَلَّ** عَلاً وعَلَلاً: جارێکی تر شەرابی خواردەوە، یان بەبێ ڕاوەستانو هەناسەدان شەرابەکەی خواردەوە.
**عَلَّ** فلان عَلاًّ: فلانکەس نەخۆش کەوت.
**عَلَّ** فلاناً عَلاًّ: دووەمجار ئاوی دایەوە بەفلان جارێکی تر شەرابی دایە بیخواتەوە، یان بەبێ هەناسەدان شەرابەکەی پێ خواردەوە.
**عَلَّ** فلاناً ضرباً: بەردەوام لەفلانکەسی داو لێدانەکەی بەردەوام بوو.
**عَلَّ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی نەخۆش خست.
**عُلَّ** الإنسان عُلَّةً: مرۆڤەکە نەخۆش کەوت.
**أعَلَّ** القوم: خەڵکەکە بۆ دووەمجار حوشترەکانیان ئاویان خواردەوە.
**أعَلَّ** الرجلَ: جاری دووەمجار ئاوی دا بەپیاوەکە.
**أعَلَّ** الشَّيْءَ: شتەکەی عیلەتدار کرد.
**أعَلَّ** الإبلَ: حوشترەکانی ڕادان پێش ئەوەی تێراوبن.
**أعَلَّ** الله فلاناً: خودا فلانکەسی نەخۆش خست.
**عَلَّلَ** فلانٌ: فلانکەس جار دواجار ئاوی دایە... ، جاردواجار خورماکانی چنین.
**عَلَّلَ** فلاناً بطعام أو غيره: فلانکەسی خافلاند بەخواردنی زەلاتەو شتی لەو جۆرە.
**عَلَّلَ** الشَّيْءَ: هۆکاری شتەکەی ڕونکردەوەو بەبەڵگەوە شتەکەی چەسپاند.
**عَلَّلَ** الكلمةَ: لەبواری زانستی صەرفدا بریتییە لە باسکردنی شێوەی گۆڕانی وشەکە ٥ ئیعلالی لە وشەکەدا ئەنجامدا.
**عَلَّلَ** فلاناً: چارەسەری نەخۆشی فلانکەسی کرد.
**إعتَلَّ**: شەرابەکەی بەبێ هەناسەدان خواردەوە ٥ یان جاری دووەم شەرابی خواردەوە.

إعتَلّ الرجلُ ونحوه: پیاوەکە نەخۆش کەوت.
إعتَلّ فلانٌ: فلانکەس پابەندی بەڵگە بوو.
إعتَلّ بالأمر: بەکارەکەوە سەرقاڵ بوو، هەڵەوگیر بوو.
إعتَلَت الكلمةُ: وشەکە پیتی عیلەی تێدا بوو.
تعالَت المرأة من نِفَاسِها: ئافرەتەکە لەخوێنی پاش منداڵبون پاك بۆوە.
تَعَالَ الصّبيُّ ثدي أمِهِ: منداڵەکە چی شیر لەمەمکی دایکیدا هەبوو مژی.
تَعالَ فلاناً: فلانکەسی لەکارەکەی گێڕایەوە.
تَعَلَّلَتِ المرأة من نِفَاسِها: ئافرەتەکە لەخوێنی پاش منداڵبون پاك بۆوە.
تَعَلَّلَ الرجلُ: پیاوەکە بەڵگەی خۆی هێنایەوەو پابەند بوو پێیەوە.
تَعلَّلَ بالأمر: خۆی بەکارەکەوە خافڵاند.
التَعِلّةُ: ئەوەی دەکرێتە بەڵگە.
التعليل: بەلای ئەهلی مونازەرەوە ڕونکردنەوەی هۆکاری شتە.
العُلالَةُ: ئەو شتەی خۆی پێ دەخافڵێنی ٥ پاشماوەی شت ٥ کاتی نێوان بەیانیو ئێوارە.
العَلُّ: پێستی چرچ بوو بەهۆی نەخۆشییەوە ٥ کەسێك زۆر هاموشۆی ئافرەتان بکا ٥ بەتەمەنو پیر لەهەر شتێك بن ٥ جەستە لاوازو قەد باریك.
العَلَلُ: وەجبە خواردنەوەی دووەم ٥ دەگوترێ: (شرب عَللاً بعد نهل) دووەمجار شەرابی خواردەوە دوای هەڵقوراندنی پیاڵەی یەکەم.
العَلّةُ: ئەوەی خۆی پێ دەخافڵێنی ٥ هەوێ ٥ (ك: علات) ٥ (بنو العلات) کۆمەڵێك کوڕ باوکیان یەك پیاو بێو دایکیان چەند ئافرەتێك بن ٥ (بنو الأخياف) کۆمەڵێك کوڕ دایکیان یەك بێو باوکیان چەند پیاوێك بن.
العِلّةُ: نەخۆشی ٥ هۆکار ٥ (حروف العلّة) پیتەکانی عیلە (ئەلف- واو- یاء) ٥ (ك: علات، وعِلَلٌ) ٥ دەگوترێ: (جرى هذا الأمر على علاته) ئەمە بەهەموو حاڵو بارێك وابوو.
العَلولُ: ئەو خواردنە کەمو سوکەی دەدرێ بەنەخۆش ٥ (ك: عُلَلٌ).
عَلَمَهُ علماً: نیشانەی کرد بەنیشانەیەك پێی بناسرێتەوە ٥ لەزانیاریدا بەسەری دا زاڵ بوو.
عَلَمَ شَفَتَهُ عَلماً: لێوی قاش کرد.

**عَلِمَ** فلان عَلَماً: فلانكەس لێوی سەروی قلێشا ◊ (فهو اعلم وهي علماء).
**عَلِمَ** الشَّيْءَ عَلماً: شتەکەی زانی، ناسی.
**عَلِمَ** الشَّيْءَ حاصلاً: بڕوایبەشتەکە بوو بەڕاستی زانی.
**أعلَمَ** نفسه وفرسه: نیشانەی بۆ خۆی یان بۆ ئەسپەکەی لەشەڕدا دانا.
**اعلَمَ** الثوبَ: قوماشەکەی کردە ئالآ.
**اعلَمَ** فلاناً الخبر وبه: هەواڵەکەی بە فلانکەس دا.
**اعلَمَ** على كذا من كتاب وغيره: شتەکەی کردە نیشانەی کتێبەکە.
**اعلَمَ** فلاناً الأمر: خەریك بوو ئیشەکە فێری فلانکەس بکا.
**عَلَّمَ** نَفسَهُ: بەنیشانەی شەڕ خۆی نیشانەدار کرد.
**عَلَّمَ** له علامةً: نیشانەیەکی بۆ دانا پێی بناسرێتەوە.
**عَلَّمَ** الشَّيْءَ تعليماً: دەستی کرد بەفێربوونی شتەکە.
**إعتَلَمَ** البرقُ: هەورە بروسکەکە روناکی دا.
**إعتَلَمَ** الشَّيْءَ: شتەکەی زانی.
**تعالَمَ** فلان: فلانکەس زانیاری خۆی نواند.
**تعالَمَ** الجميع الشَّيْءَ: خەڵکەکە هەموویان شتەکەیان زانی.
**تَعَلَّمَ** الأمرَ: شتەکەی زانیو کارەکەی ناسی.
**تَعَلَّمْ**: بە شێوەی فیعلی ئەمر واتە: تۆ بزانە ◊ دوو مەفعولی گەرەکن.بەزۆری لەجیاتی دوو مەفعولەکە (أن)ی مەصدەریو صیلەکەی دادەنرێ.
**إستَعلَمَهُ** الخبرَ: داوای زانینی هەواڵەکەی کرد.
**الأُعلومة**: نیشانەو هۆکاری ناسین ◊ (ك: أعاليم).
**العالَمُ**: بوونەوەر هەمووی ◊ هەرچی لەناو فەلەکدا هەیە ◊ هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی خەڵك وەکوو: (عالم الحيوان) ◊ (عالم النبات) ◊ (عالم الجن) ◊ (عالم الملائكة) ◊ (عالم الإنسان) ◊ (ك: عوالم و عالمون).
**العَلامة**: نیشانە، ئەو شتانەی لەسەر ڕێگادا دادەنرێن بۆشارەزایی ڕێبواران ◊ سنوری نێوان دوو وڵاتو دوو زەوی ◊ لە بواری پزیشکی بەو زانیارو دیاردانە دەگوترێ کە پزیشك لەئاکامی پشکنیندا بەدەستی دێنێ دەربارەی نەخۆشیەکە.
**العُلامِيُّ**: پیاوی زیرەكو لێهاتوو.
**العَلاَّمُ**: زۆر زاناو شارەزا ◊ سەرناسو

نەژادناس ◊ وادەبێ تای خرِی پێوە دەنرێ بۆ زیاتر موبالەغە، دەگوترێ: (ألعلاّمَةُ).

**ألعُلاّمُ**: بۆ زێدەرِۆیی مانایە لەمادەی (علم)دا ◊ هەڵۆ ◊ خەنە.

**العُلاّمةُ**: ئەوەی لەسەر رِێگا دادنرێ بۆ شارەزایی کردنی رِێبوار.

**العَلَمُ**: بەمانا (العالِم)دێ.

**العِلمُ**: زانین ◊ دەرککردنی شت وەکوو خۆی ◊ دڵنیایی ◊ رِوناکییەکە خودا دەیخاتە دڵی هەندێ کەسەوە.

**العَلَمُ**: نیشانەو شوێنکە ◊ نێوانی دوو سنور ◊ دوو وڵات ◊ دانانی شتێکە لە قەراغی رِیگا بۆ شارەزایی رِێبوار ◊ وێنە لەسەر قوماش ◊ گەورەی هۆزو رِیش سپی گەلو نەتەوە ◊ کێو ◊ ئاڵا ◊ (ك: أعلام).

**ألعَلْماني**: بێدینی، لادینی پێچەوانەی ئایینی، دینداری ◊ ئایین زایی.

**العُلمَةُ**: قڵیشاوی لێوی لای سەروی ئادەمیزاد.

**العليم**: زۆرزانو شارەزا ◊ (ك: علماء).

**العيلامُ**: کەمتیاری نێر ◊ بیرێك ئاوی زۆر بێ ◊ (ك: عيالم).

**المَعلَمُ**: بەمانا (العُلاّمة)دێ ◊ شوێن گومانی هەموو شتێك ◊ (ك: مَعالِم) ◊ دەشگوترێ: (خفيت معالم الطريق) نیشانەکانی رِێگا کوێربونەوە.

**ألمُعَلِّمُ**: مامۆستای قوتابی ◊ مامۆستایی ◊ کەسێك مافی ئەوەی هەبێ پیشەیەك لە پیشە پیشەسازیەکان بۆخۆی هەڵبژێرێو کاری تێدا بکاو وەکوو وەستای دارتاشو ئاسنگەرو ئەوشتانە.

**ألمُعَلَّمُ**: کەسێك رِێگای خێرو چاکەی خرابێتە دڵو دەرونیەوە.

**ألعِلماد**: ئەوشتەی ریسی رِێسراوی لەسەر هەڵدەکرێ ◊ (ك: علامِدة وعلاميد).

**عَلَنَ الأمر علوناً**: کارەکە ئاشکرا بوو دەرکەوت ◊ پێچەوانەی گومبون.

**عَلِنَ الأمر علناً وعلانيةً**: بەمانا (عَلَن) دێ.

**أعلَنَهُ وبه**: دەری خستو ئاشکرای کرد.

**أعلَنَتِ المحكمةُ فلاناً**: دادگا داوای ئامادەبوونی فلانی کرد ◊ یان برِیاری دادگای پی رِاگەیاند.

**عالَنَهُ معالنة**: ئاشکرای کرد، بەئاشکرا پێی رِاگەیاند.

**عَلَّنَهُ**: بەمانا (أعلَنَهُ)دێ.

**إعتَلَنَ الأمرُ**: کارەکە ئاشکرابوو، دەرکەوت.

**إستَعَلَنَ الأمرُ**: کارەکە ئاشکرا بوو دەرکەوت، خۆی ئامادە کرد بۆئەوەی جارِ بدا شتەکە ئاشکرا بکا.

**الإعـــلان**: ئاشـــكراكردنی شـــت بـــه بڵاوكردنـــەوەی لـــه ڕۆژنامـــەو شـتی وادا.

**العلانيـة**: ئاشـكرا ○ دەگـوترێ: (رجـل علانية) پیاوێـكه ئیشەكانی دیاره.

**العُلَنَـةُ**: كەسێـك زۆر نهێنـی ئاشـكرا بكاو قسەی تێ نەوەستێ.

**اعلَنبى**: بڕوانه مادەی (عَلَبَ).

**عَلِـهَ عَلـهاً**: سەرسـام بـوو، بەترسـەوە ڕۆیـشت ○ دڵو دەروون پـیس بـوو ○ خـــەمبار بـــوو، كەوتـــه بەرتانـــەو تەشـەر ○ (فهو عِلِـهٌ وعلـهان ○ وهـي علهي).

**العَلـهاء**: دوو جـۆرە پۆشـاكن كوڵـكی حوشتریان تێدا ناواخن دەكرێو لـه ژێـــر زرێـــوە لەبـــەر دەكـــرێن بـــۆ خۆپاراستن لەزەبری بەرامبەر.

**العالِـهُ**: (إمـرأة عالـه) ئافرەتێـكی بـێ عەقڵو هەڵه كارە.

**العَلهُ**: خەفەت، چاوچنۆك.

**علا الشَّيْئُ عُلوّاً**: بەرز بۆوە، سەركەوت.

**عـــلا** فـــلان في الأرض: فلانكـــەس خـــۆی بـــەزلزانیو تەكـــەبوری كـــرد ○ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿إِنَّ فِرْعَـــوْنَ عَلَـــا فِـــي الْأَرْضِ﴾.

**عـــلا** فـــلان بـــالأمر: فلانكـــەس بەكارەكـــه هەڵساو سەربەخۆ ئەنجامی دا.

**علا** بالشيئ: شتەكەی بەرز كردەوە.

**عـــلا** الـــشَّيْئَ: چـووە سـەر شـتەكەو پێیـدا سەركەوت.

**علا** الرجلَ: بەسەر پیاوەكەدا زاڵ بوو.

**عَلا** بالسّيف: به شمشێر لێیدا.

**عـــلا** فـــلان حاجتـــه: فلانكـــەس بەســـەر پێداویستیەكانیدا زاڵ بوو.

**عَلِـــيَ** في الـــشرف عَـــلاءً: لەشـــەرەفو ڕێزداریدا بەرز بۆوە ○ (فهو علي).

**أعلى** عن الشَّيْئ: لـه شـتەكه دابـەزی ○ دەگـــوترێ: (أعلـــى عـــن الدابـــة) لەوڵاخەكه دابەزی.

**أعلى** الشَّيْئَ: شتەكەی بـەرز كـردەوە ○ یان چووە سەری ○ پێیدا سەركەوت.

**عالَى** الـشَّيْئَ: شـتەكەی بـەرز كـردەوە، چـــووە ســـەری، پێیـــدا ســـەركەوت ○ دەگـــوترێ: (عـــالِ عَنّـــا)لێمـــان دووركەوتەوە، لێمان كەنار گیر بوو.

**علَّى** الـشَّيْئَ: شـتەكەی بـەرز كـردەوە، دەگـوترێ: (علاّه علـى ظهـر الدابـة) بـــەرزی كـــردەوە بۆســـەر پـــشتی وڵاخەكه.

**علّى** المتـاعَ عـن ظهـر الدّابـة: كالاكـەی لەسەر پشتی وڵاخەكه هێنایه خوار، دایگرت.

**إعتلـــى** الـــشَّيْئَ: شـــتەكه بـــەرز بـــۆوە ○ دەگوترێ: (إعتلى النهار) خۆر بەرز بۆوە.

**إعتلى الشَّيْءَ**: چووه سەر شتەکە.

**إعتلى فلاناً**: فلانکەسی ژێر بار کردو بەسەریدا زاڵ بوو.

**تعالى فلان**: فلانکەس بەرزبۆوە ◦ خۆی بەزل زانی.

**تعالت** المرأة من نِفاسِهَا او من مرضِها: ئافرەتەکە لەخوێنی نیفاس‌و پاش منداڵبون رزگاری بوو ◦ لە نەخۆشییەکە چاك بۆوەو هەڵسایەوە.

**تعال**: وەرە ◦ (تعالَي) بۆ مێینە بەکار دەهێنرێ ◦ (تعاليا) بۆ دووکەس ◦ (تعالوا) بۆ سێ کەس‌و زیاتر بەکاردەهێنرێن ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ ◦ یان دەفەرموێ: (فتعالَينَ أمَتِعكنّ).

**تَعَلَّي الشَّيْءُ**: شتەکە بەرز بۆوە.

**تَعَلَّتِ** المرأة من نفاسِها أو مرضِها: ئافرەتەکە لەخوێنی پاش منداڵبون رزگاری بوو.یان لە نەخۆشیەکەی رزگاری بوو.

**تَعَلَّى الرجلُ**: پلە بەپلە پیاوەکە سەرکەوت بەرزبۆوە.

**تَعَلَّى عنه**: خۆی لەئەو بەبەرزترو خانەدانتر زانی.

**إستَعلى النهار**: ڕۆژ بەرز بۆوە.

**إستَعلت الكلمةُ لسانَه**: ئەو وشەیەی زۆر بەسەر زمانەوە بوو، زۆری ئەو وشەیە دەگوت.

**إستعلى الشَّيْءَ**: چووە سەر شتەکە، پێیدا سەرکەوت.

**إستعلى فلانا وعليه**: بەسەر فلاندا زاڵ بوو ژێرباری کرد.

**إستعلى حاجَتَه**: بەسەر پێداویستیەکانیدا زاڵ بوو.

**إعلولى الشَّيْءَ**: چووە سەر شتەکە پێیدا سەرکەوت.

**العالي**: بەرز ◦ دەگوترێ: (فلان عالى الكعب) فلانکەس خانەدان‌و وەجاخزادەیە ◦ (أتَيْتُهُ من عالٍ) لەلای سەرەوەوە هاتمە لای.

**العالية من كل شيئ**: بەرزەکەیەتی ◦ لە زور وڵاتی نەجدەوە تا دەگاتە تیهامەو دواشاری مەککە ◦ شیوێك ئاوی پێدا بێتە خوار.

**عَلُ**: سەرەوە ◦ دەگوترێ: (أتَيْتُهُ من عَلُ) لەسەرەوە هاتم بۆلای.

**العُلا**: ڕێزو شکۆمەندی بەرزو پیرۆزی.

**العَلاءُ**: ڕێزو شکۆمەندی.

**العِلاوَةُ**: زێدەی شت ◦ سەربار ◦ ئەوەی دەخرێتە سەر باری حوشتر دوای تەواوبونی بارەکەی وەکوو قۆری‌و

پیالەو کوندە ئاوو ئەو جۆرە تفاقە.

**علاوة الذهب**: زیادبوونی نرخی زێڕ لەئەندازەی خۆی ٥ ئەو زیادەیەی سالآنە دەخرێتە سەر موچەی موچەخۆر کە لەعێراقدا پێی دەگوترێ: (العلاوة السنوية).

**العُلِّيَّةُ**: ژوری سەربان، هەورەبان.

**العِلّيُّ**: بەرزترین شوێنو بەرزترین پلەوپایە ٥ دانیشتوانی بەرزترین شوێن ٥ خاوەنی بەرزترین پلەوپایە ٥ (ك: عِلّيون).

**العُلْوُ** من كل شيئ: لەهەر شتێك بێ مەبەست بەرزەکەیەتی ٥ دەگوترێ: (قعدتُ عُلْوُهُ وفي عُلْوِه) لەبەرزترینی ئەو شوێنە دانیشتم.

**العُلُوُّ**: گەورەیی‌و شکۆمەندی ٥ تەککەبورو خۆ بەزلزانین.

**العُليا**: بەرز، بۆ مێینە (الأعلى) بەکاردێ.

**العَلياءُ**: هەرشتێك بەرز بێ، وەکوو لوتکەی شاخ‌و کێو و شوێنی بەرزە ئاسمان ٥ ڕێزو شکۆمەندی‌و شەرەف.

**العَلِيُّ**: بەرزو شکۆمەند ٥ ڕەق‌و توندو پتەو ٥ بەڕێزو شکۆمەند ٥ (ك: عِلية) ٥ دەگوترێ: (هم علية القوم) ئەوان ڕێزدارترین کەسانی قەومن.

**المَعلاةُ**: ڕێزو شەرەف ٥ (ك: المعالي).

**المُعَلّى**: حەوتەم تیری قومارە.

**المُعَلّي**: ئەوکەسەی دۆلکەی پڕ لەئاو بەرزدەکاتەوە بۆئەوەی ئاو بۆ یەکێکی تر تێ بکا.

**عَلْوَن** الكتابَ عَلونةً: عینوان‌و ناونیشانی بۆ کتێبەکە دانا.

**العِلوانُ**: (عِلوان الكتاب) بەمانا عینوانی کتێب دێ.

**علي** الشَّيْئ وعليه وفيه عَلياً وعُلياً: چووە سەر شتەکە ٥ پێیدا چووەسەر.

**عَلّى** الكتاب: عینوانی بۆ کتێبەکە دانا.

**علي**: حەرفی جەڕە بەمانا (فوق) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾.

**عَمَتَ** فلان عَمتاً: بە گۆچان لەفلانکەسی داو گۆچانی وەشاند، گوێی نەدایە کێ بەردەکەوێ‌و کێ بەرناکەوێ.

**عَمَتَ** الصُوفَ ونحوه: خوریەکەی خڕهەڵدا کردی بە گلۆڵە بۆ ئەوەی بەدەست بیگرێ‌و بیرێسێ.

**عَمَتَ** فلاناً: فلانکەسی ژێربار کرد.

**عَمَّتَ**: بۆ موبالەغەی (عَمَتَ)دێ.

**العَميتُ**: پیاوی پیاوانەو ئازا، چاودێرو زیرەك‌و زاناو وریا.

**العَمِيتَةُ**: گلۆڵە بەن چ درێژ بێ چ خڕ بێ.

**عَمَجَ** عَمجاً: لە ڕۆیشتندا پەلەی کرد خێرا ڕۆیی.
**عَمَجَ** الرجلُ: پیاوەکە لەئاودا مەلەی کرد.
**تَعَمَّجَ**: خۆی باداو نەمبەرو ئەو بەری کرد قۆرتو پێچی کردن ○ دەگوترێ: (تَعَمَّجَت الحيّةُ وتَعَمَّجَ السيل في الوادي).
**عَمَدَ** الشَّيْءَ عَمداً: کۆڵەکەی بەر شتەکە دا.
**عَمَدَ** فلاناً: بەعەمود لە فلانکەسی دا ○ دەشگوترێ: (ما عَمَدَكَ) لەچی عاجز بووی ○ چی زویری کردوی.
**عَمَدَ** الشَّيْءَ واليه: چو بۆ شتەکە، قەصدی شتەکەی کرد.
**عَمَدَ** المرضُ فلاناً: نەخۆشی فلانکەسی کزو کۆڵەوار کرد.
**عَمِدَ** البعيرُ عَمَداً: حوشترەکە دوگی ئاوسا بەهۆی ئەوەی کورتانو رەحلەکە گرتبووی ○ دوگەکەی لەناوەوە خراپ بوو، ڕوی دەرەوەی دوگەکەش ساغ بوو ○ دەشگوترێ:
عَمِدَت أَلْيَتاهُ من الركوب: سمتی حوشترەکە هاوسا.
**عَمِدَ** الثرى: گڵەکە باران تەڕی کردو وێکهاتەوە هەندێکی سواری هەندێکی بوو.
**عَمِدَ** الإنسان: نەخۆشی ئادەمیزادەکەی لەڕو لاواز کرد.
**عَمِدَ** الخُراجُ: دومەڵەکە پێش ئەوەی بگاو ببێتە کێمی رون گوشراو ئاوساو دەرنەکرا هەروا بەکاڵی مایەوە.
**أعمَدَ** البناءَ: کۆڵەکەی بۆ خانوەکە دانا ○ کۆڵەکەی بەرخانوەکەدا.
**عَمَّدَ** الخَيمَةَ: ڕەشماڵەکەی بە کۆڵەکە بەرزکردەوە ○ چادرو خێمەکەی هەڵدا.
**عَمَّدَ** القومُ فلاناً: قەومەکە فلانکەسیان کردە ڕابەرو ڕیش سپی خۆیان، یان بڕوا پێکراوو گەورەی خۆیان.
**عَمَّدَ** السَّيلَ: ڕێڕەوی ئاوەکەی بەگڵ گرت بۆئەوەی ئاوەکە لەشوێنەکە کۆببێتەوە.
**عَمَّدَ** الشوق فلاناً: سۆزو عیشق فلانکەسی لاواز کرد.
**عَمَّدَ** الطفلَ: بەلای مەسیحیەکانەوە ئەوەیە (منداڵەکەی بەئاوی (ألعَمودية) بشۆرێ.
**إعتَمَدَ** الشَّيْءَ وعليه: خۆی بەسەر شتەکەدا دا ○ پشتی پێوەدا خۆی بەسەردا دا.
**إعتمدَ** الشَّيْءَ: قەصدی شتەکەی کرد ○ شتەکەی ئەنجام دا ○ دەگوترێ: (إعتمد الرئيسُ الأمرَ) سەرۆك ڕەزامەندی نیشاندا لەسەرکارەکەی و

فەرمانی دا بەجێ بەجێ کردنی.
**إنعَمَدَ**: بۆ موتاوەعەی (عَمَدَهُ) دێ ٥ لەسەر کۆڵەکەیەك ڕاوەستا.
**تَعَمَّدَ الشَّئَ ولە**: قەصدی شتەکەی کرد.
**العِمادُ**: کۆڵەکەی خێمە ٥ هەر شتێك بخرێتە ژێر شتێك و بەرزی بکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (فلان رفیع العماد) واتە: فلانکەس وەجاخزادەو خانەدانە ٥ سەروکی عەسکەر ٥ شتنی منداڵی مەسیحی لەناوی (العمدیة)دا.
**العِمادَةُ**: بیناو باڵەخانەی بەرز ٥ پلەو پایەی ڕاگری کۆلێج لەزانکۆ.
**العَمدُ**: ئەنقەست، دەگوترێ: (فعله عَمداً) بەئەنقەست ئەو کارەی کرد.
**القَتلُ العَمدُ**: ئەوەیە بکوژ بەئامێری کوشتن بەئەنقەست مرۆڤێك بکوژێ.
**العُمدَةُ**: ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێ ٥ سەرۆکی سەرباز ٥ سەرۆکی گوندو شار ٥ لە زاراوەی نەحوییاندا بریتییە لەو وشانەی کۆڵەکەی کەلامن و نابێ حەزف بکرێن.
**العَمودُ**: گەورەو پیاو ماقوڵ: کە لە ڕاو تەگبیردا پشتی پێ دەبەسترێ و قسەی وەردەگیرێ ٥ ڕوناکایی بەیانی کە لەکەناری ئاسمان دەردەکەوێ ٥ بڕبڕاگەی پشت.
**العَمیدُ**: ڕاگر ٥ گەورەو پیاو ماقوڵ و ڕاو تەگبیر پێ کراو ٥ گوێ لەقسە گیراو ٥ بەڕێوبەری کۆلیج لەزانکۆ ٥ نەخۆش کە نەتوانێ دابنیشێ مەگەر سەرین و شتی وا بخرێتە پاڵی ٥ پلەیەکی سەربازیە لەژوور عەقیدەوەو خوار لیواوە ٥ کەسێك سۆزو عیشق چوبێتە ناو پەڕەی دڵیەوە.
**المعمودیة**: بەلای مەسیحیەکانەوە ئەوەیە قەشە منداڵێك بخاتە ناو ئاوەوەو هەندێك ئینجیلی بەسەردا بخوێنێ: کە بریتیە لەئایەتی (التنصیر)
**عَمَرَ الرجلُ عَمراً**: پیاوەکە تەمەنی درێژ بوو زەمانێکی زۆر ژیا.
**عَمَرَ المالُ**: ماڵ و سامانەکە زۆر بوو.
**عَمَرَ المنزلُ**: مەنزڵەکە ئاوەدان بوو، خانووەکە خەڵکی تێدا نیشتەجێ بوو.
**عَمَرَ اللهُ فلاناً**: خودا تەمەنی فلانکەسی درێژ کردو لەژیاندا زۆر مایەوە.
**عَمَرَ فلان الدارَ**: فلانکەس خانوی بنیات نا.
**عَمَرَ القومُ المکانَ**: قەومەکە لەشوێنەکە نیشتەجێ بوون و ئاوەدانیان کردەوە.

**عَمَرَ** المالَ عموراً: جوان سەرپەرشتی ماڵو سامانەکەی کرد.

**عَمُرَ** المالَ: بەمانا (عَمَرَ)دێ.

**أعمَرَ** فلاناً: پارمەتی فلانکەسی دا بۆ بەجێهێنانی عومرە.

**أعمَرَ** فلاناً داراً: خانوێکی دا بەفلانکەس بەدرێژایی تەمەنی ملکی ئەو بێ، کە مرد ملکایەتی ئەو خانووە بگەڕێتەوە بۆ خۆی.

**أعمَرَ** فلاناً المكانَ: وایکرد فلانکەس شوێنەکە ئاوەدان بکاتەوە.

**عَمَّرَ** اللهُ فلاناً: خودا تەمەنی فلانکەسی درێژ کرد.

**عَمَّرَ** المَنزلَ: مەنزڵەکەی ئاوەدان کردەوە خێزانی خۆی یان کەسانی دی تێدا نیشتەجێ کردن.

**عَمَّرَ** اللهُ بكَ منزلَكَ: خودا مەنزڵت بەخۆتو خێزانت ئاوەدان بکاتەوە.

**عَمَّرَ** الأرضَ: زەویەکەی ئاوەدان کردەوە خانوی تێدا کرد.

**عَمَّرَ** فلاناً داراً: خانوەکەی بۆ فلانکەس ئاوەدان کردەوە.

**إعتَمَرَ**: مێزەری لەسەری نا کڵاوی لەسەر کرد ٥ ئەرکی عومرەی بەجێ هێنا.

**إعتَمَرَ** الأمرَ: قەصدی کارەکەی کرد.

**إستَعمَرَهُ** في المكانِ: دەستی کرد بەئاوەدان کردنەوەی شوێنەکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾.

**إستَعمَرَ** الأرضَ: کەرەستەو هۆکاری پێویستی بۆ زەویەکە دابینکرد بۆئەوەی ئاوەدان بکرێتەوە.

**إستَعمَرَت** دولةٌ دولةً أخرى: دەوڵەتێك فەرمان ڕەوایی‌و دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەوڵەتێکی تردا دا.

**عَومَرَ** القومُ: خەڵکەکە تێکەڵ یەکتری بوونو دەستیان کرد بەهەراو هۆریا.

**عَومَرَ** الناسَ: خەڵکەکەی کۆکردەوەو لەشوێنێك بەندی کردن.

**العَمَارُ**: ڕێحانەیەك بوو کاتی خۆی موبارەکبایی‌یان پێ لەپاشا دەکردو لەگەڵ پێشکەشکردنی ڕێحانەکەدا پێیان دەگوت: (عَمَرَّكَ اللهُ) ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو گوڵو ڕێحانەیەی مەجلیسی پاشای پێ دەڕازێنرایەوەو ڕێز دەکرا کەیەکێك دەچووە ژوری پاشا ڕێحانەکەی هەڵدەگرتو سڵاوی لەپاشا دەکرد ٥ پینەیەکە بۆ جوانی لەچەتر دەدرێ ٥ هەرشتێك بخرێتە سەر سەر، مێزەر بێ، کڵاو بێ، گۆترەو عەگاڵ بێ.

**العَمَارةُ**: هەر شتێك لەسەر بنرێ وەكوو مێزەرو كڵاو و گوڵترەو عەگاڵو شتی وا ٥ پینەیەكە بۆ جوانی بەچەتردا دەدورێ ٥ (ك: عمائر وعمار).

**العُمَارةُ**: كرێی وەستای دیوار.

**العِمَارةُ**: ئاوەدانی، ئاوەدانكرنەوە ٥ پێچەوانەی وێرانیو وێرانكردن ٥ دیوار ٥ هەرشتێك بكرێتە پەرژین بۆ پاراستنی شوێنێك ٥ بەشێك لەهۆزو خێڵ ٥ بینایەكی گەورەو بەرزو فراوانو قاتقات چەند خێزانو دامو دەزگای تێدا بن.

**فن العمارة**: شارەزایی دروستكردنی بینای بەرزو فراوان دەست ڕەنگینی نواندن لە دیكۆرەكانیدا.

**ألعَمرُ**: تەمەن، (ك: أعمار) ٥ ئایین ٥ گۆشتی پوك ٥ دەرختی بەرز ٥ خورمای چاك ٥ هەرشتێك بخرێتە سەرگوێ ٥ دەشگوترێ: (عَمرَكَ الله إفعَلْ كذا).

**ألعُمُرُ**: تەمەن ٥ (ك: أعمار) ٥ گۆشتی پوك ٥ (ك: عُمُور).

**عُمرُ النصف**: لەبارەی زانستی (الطبیعة)دا ئەو ماوەیەیە كە تێیدا ژمارەی گەردیلەكانی عونصورە تیشكدارەكان حەل دەبنو نیوەیان دەمێننەوە.

**ألعَمَرُ**: ئەو پارچە قوماشەیە كەئافرەت سەری خۆی پێ دادەپۆشێ ٥ ئایین.

**العُمَران**: ناوە بۆ ئەبوبەكرو عومەر (بەشێوەی تەغلیب).

**العُمُرُ**: ماوەی ژیان ٥ (ك: أعمار).

**العُمران**: خانو بەرەو باڵەخانە ٥ هەرشتێك ببێتە هۆكاری ئاوەدانكردنەوەی وڵاتو خۆش گوزەرانی وەكو كشتوكاڵو پیشەسازیو بازرگانیو تەندروستی سەركەوتو و بەڕێوەبردنی كاروباری خەڵك بەشێوەی ڕاستو دروست ٥ دەگوترێ: (إستبحر العمران) ئاوەدانی پەرەی سەندو پەلی هاویشت.

**العَمرَةُ**: هەر شتێك لەسەر بنرێ وەكوو مێزەرو كڵاو و سەرپۆشو گوڵترەو عەگاڵو چارۆكە ٥ بۆشایی نێوان دەنكە تەسبیح كە هۆنرابنەوە.

**العُمرَةُ**: بەجێ هێنانی ئەركی عومرە.

**ألعُمَرتان**: دوو ئێسقانی بچوكن لەبنكی زمان دان ٥ دوو شاخی گەورە.

**ألعُمرى**: ئەوەیە خاوەن مڵك بەكابرایەكی تر بڵێ ئەم مڵكەم هی تۆبێ تاماوی: كەمردی بۆخۆم یان بۆ میراتگرەكانم بگەڕێتەوە.

**العُمريُّ من الشجر**: درەختی كۆنە ساڵ

٥ درەختی سیدر کە تەمەنی زۆربێ.

**اَلعَمَّارُ**: کەسێك نوێژو ڕۆژوی زۆربن.

**اَلعُمَّارُ**: جندۆکەی ناوماڵ.

**المستعمَرةُ**: ئیقلیمێك ولاتێك بێگانە فەرمانڕەوایی بکا، جا خۆی تێیدا نیشتەجێ بێ یان لەدوورەوە لەبواری ئابورییەوە یان سەربازییەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکار بێنێ.

**المعماري**: تەلارسازی ٥ ئەو کەسەی پیشەی ئەوەیە باڵەخانەو تەلار دروست بکا.

**اَلمَعمَرُ**: مەنزڵو خانوێك ئاوو خواردنی باشی لێ بێو خێزانیشیان قەرەباڵغ بن ٥ دەگوترێ: (نزل فلان في مَعمَر صدق) فلانکەس لە ماڵێك دابەزی خواردنو خواردنەوەی باشی لێیە.

**اَلمعمورَةُ**: خانی دروستکراو ٥ خانوێك خێزانی تێدا بێ ٥ چۆڵ نەبێ ٥ زەوی ئاوەدانو بەکارهاتوو بۆ کشتوکاڵو شتی وا.

**اَلعَمَرَّدُ**: درێژ لەهەر شتێك بێ ٥ شەڕانیو تەبیات توند ٥ پیسو ڕمۆزنو بەلاو کارەسات.

**اَلعَمَرَّسُ**: پیاوی بەهێزو چوار پەل قەوی ٥ ڕۆیشتنی خێرا ٥ ڕۆژگاری سەخت.

**العُمروسُ**: گەنجی قەڵەوو چوارپەل قەوی ٥ بەرخ ٥ (ك: عماريس).

**عَرَطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وەرگرت ٥ هەڵی گرت.

**العُمرُوطُ**: دزێك هەرچی دەستی بگاتێ بیدزێو هیچ بۆ خاوەن ماڵ نەهێڵێتەوە.

**عَمَسَ** الكتابَ عَمساً: کتێبەکە سڕایەوە، کوژایەوە.

**عَمَسَ** فلان الشَّيْءَ: فلانکەس شتەکەی شاردەوە ٥ دەگوترێ: (عَمَسَ عليهم الخبر) هەواڵەکەی لێ شاردنەوە.

**عَمَسَ** عليه الأمرَ: ئیشەکەی لێ تێکەڵو پێکەڵ کردن.

**عَمِسَ** الكتابُ: بەمانا (عَمَسَ)دێ.

**عَمِسَ** اليومَ: ڕۆژەکە ناخۆشو تاریك بوو.

**عَمُسَ** اليوم: ڕۆژەکە ناخۆشو تاریك بوو.

**أعمَسَ** الشيءَ: شتەکەی شاردەوەو ئاشکرای نەکرد.

**عامَسَهُ**: شاردیەوە ئاشکرای نەکرد.

**عَمَّسَ** عليه الأمرَ: ئیشەکەی لێ شاردەوە.

**تَعَامَسَ** عن الشَّيْءِ: خۆی لە شتەکە بێ ئاگا کرد.

**تعامَسَ عَلَيَّ**: خۆی لێ چەواشە کردمو خستمیە گومانەوە دەربارەی خۆی

نەمزانی چیەو چ دەكاو چی دەوێ.

**العَمَاسُ**: هەر كاروبارێكی گران كە نەزانی بەكێ چارەسەری دەكرێو لەكوێوە بۆی بچی ٥ شەڕی قورسو دژوار.

**العَمُوسُ**: كەسێك نەزانو گێلانە كار بكا ٥ كاری قورسو گران: كە نەزاندرێ چۆن چارەسەری بكرێو لەكوێوە بۆی بچیو دەستی پێ بكرێ ٥ (ك: عُمُس).

**العَميسُ**: شەڕی دژوارو توندو تیژ ٥ كاری قورس كە نەزاندرێ چۆن چارەسەری دەكرێ.

**عَمَشَ** فلاناً عَمَشاً: بەگۆچان لە فلانكەسی دا بەبێ مەبەست.

**عَمِشَ** فلان عَمَشاً: فلانكەس چاوی كزو كەم بینا بوون لەگەڵ ناو هاتنە خوارەوە لێیان زۆربەی كات ٥ (فهو أعمَش وهي عمشاء) ٥ هاتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی.

**عَمِشَ** فيه الكلام: قسە كاری تێ كرد.

**عَمَّشَ** عن الشّيء: خۆی لە شتەكە غافڵ كرد.

**عَمَّشَ** فلاناً: چاوكزی فلانكەسی چارەسەر كرد.

**عَمَّشَ** اللهُ المريضَ: خودا لەشساغی پێشوی دایەوە بە نەخۆشەكەو لەو دەردە ڕزگاری كرد.

**إستَعمَشَهُ**: گێلو ئەحمەقی كرد.

**العَمْشُ**: ئەوەی تەندروستی ببەخشێ بەئادەمیزادو لەشساغی بكا ٥ شتی گونجاو ٥ دەگوترێ: (هذا الطعام عَمشٌ لك) ئەم خۆراكە بۆتۆ گونجاوە.

**عَمُقَتِ** البئرُ عُمقاً وعُمُقاً وعماقةً: بیرەكە قوڵ بوو ٥ دەشگوترێ: (عمقت الفكرة) بیرو بۆچوونی قوڵو ورد بوو، بەباشی چووە بنجو بناوانی شتەكەو زانیویەتی.

**عَمُقَ** المكانُ: شوێنەكە قول بوو یان درێژ بوو ٥ (فهو عَميق وهي عَميقة) ٥ (ك: عُمُق).

**عَمَّقَ** الشّيءَ: شتەكەی قوڵ كرد ٥ دەگوترێ: (عَمَّقَ البئر) (و عَمَّقَ الفكرة)

**تعَمَّقَ** في الأمر: كارەكەی ورد كردەوەو لێكۆڵینەوەی وردی تێدا ئەنجام دا.

**العُمقُ**: قوڵی (دووریی بەرەخوار) دۆڵو شیو ٥ (ك: أعماق).

**أعماق** الأرض: ئەملاو ئەولای زەوی ٥ ئەمسەرو ئەوسەری دەشتو سارا.

**العُمقيُّ**: (رجل عُمقيُّ الكلام) پیاوێكە قسەكانی قوڵو وردن.

**عَمِلَ** عَملاً: بەئەنقەست كارەكەی كرد ٥

پیشەی دۆزیەوە کەوتە پیشەسازی.

**عَمِلَ** فلان علی الصدقة: فلانکەس کاری کۆکردنەوەی زەکاتی خستۆتە ئەستۆی خۆی‌و زەکاتی کۆکردەوە.

**عَمِلَ** للسلطان علی بلد: بوو بەفەرمانڕەوای پاشا لەسەر ولاتێك.

**أعمَلَهُ**: کردی بە لێپرسراو عامیل.

**اعمَلَ** فلاناً: کرێی دا بەفلان.

**أعمَلَ** آلَتَهُ او رأیه: ئامێرەکەی خۆی بەکار هێنا ٥ بەگوێرەی ڕاو بۆچوونی خۆی هەڵس‌وکەوتی کرد.

**أعمَلَ** ذهنه: زەینی خۆی خەریك کردو بیری لەشتەکە کردەوە.

**عامَلَهُ**: مامەڵەی لەگەڵ دا کرد.

**عَمَّلَهُ**: کرێیەکەی دایە، کرێی ئیشکردنەکەی پێدا.

**عَمَّلَهُ** علی البلد: کردی بە عامیل‌و لێپرسراوی ولات.

**عَمَّلَهُ** علی القوم: کردی بە والی‌و لێپرسراو بەسەر خەڵکەکەوە.

**إعتَمَلَ** فلان: فلانکەس ئیشی بۆخۆی کرد.

**تعاملا**: ئەو دووە پێکەوە مامەڵەیان کرد کالایان بەیەکتر فرۆشت.

**تَعَمَّلَ** فلان لکذا: فلانکەس بەناخۆشی‌و هەستکردن بە ئەرك ئیشەکەی کرد.

**تعَمَّلَ** من أجل فلان وله: لەبەر خاتری فلان گرنگی بە شتەکەداو کۆششی کرد.

**إستَعمَلَهُ**: کردی بە عامیل‌و لێپرسراو.

**إستَعمَلَ** فلاناً: داوای لە فلان کرد ئیشی بۆ بکا.

**إستَعمَلَ** الثوبَ: قوماشەکەی بەکارهێنا بۆ ئەو شتەی گونجاوە.

**إستَعمَلَ** رأیه: بەگوێرەی بیرو بۆچونی خۆی کاری کرد.

**العامِل**: کرێکار ٥ ئەو کەسەی لەکارو پیشەیەکدا کار دەکا ٥ ئەو کەسەی سەروکاری ئیشی یەکێکی تردەکا لەماڵ‌و موڵك‌و کردەوەی دا ٥ ئەو کەسەی زەکات لەزەکاتدەران وەردەگرێ ٥ (ك: عمال وعملة) ٥ هۆکار؛ ئەو شتەی کاردەکاتە سەر شتێکی تر دەگوترێ: (كثرة الإنتاج من عوامل الرخاء).

**العامِلة**: ئەو ئاژەڵ‌و ولاخەی بەکاردەهێندرێ بۆ جوت‌و گێرەو ئاو هەڵێنجان‌و شتی وا.

**العِمالَةُ**: کرێی کرێکار ٥ پیشەی کرێکار.

**العُمالَةُ**: بەمانا (العِمالَة)دێ.

**العَمَلُ**: کاروکردەوە ٥ (ك: أعمال).

**العَمَلَةُ**: کردەوەی خراپ وەکوو دزی‌و خیانەت.

١ عُقاب ◆ ٢ باز ◆ ٣ صقر صائد الحيّات ◆ ٤ خَبل ◆ ٥ نسر ◆ ٦ نسر ◆ ٧ ببّغاء ◆ ٨ ديك أميركي ◆ ٩ ببّغاء ◆
١٠ سُنونو ◆ ١١ كوليبري ◆ ١٢ بُلبل ◆ ١٣ شُحرور ◆ ١٤ شُرَقْرَق ◆ ١٥ رَهو ◆ ١٦ كُركيّ ◆ ١٧ هُدهُدة ◆ ١٨ نعامة ◆
١٩ لقلق ◆ ٢٠ غِرغِرة ◆ ٢١ حجَل ◆ ٢٢ بَجَعة

١ كوروكو ( من طيور المكسيك ) ◆ ٢ طاووس ◆ ٣ توكان ( من طيور البرازيل ) ◆ ٤ بوم صغير ◆ ٥ طائر الذهب ◆ ٦ حَشون ◆ ٧ سُمانى ◆ ٨ قُبَّرة ◆ ٩ قرشان ◆ ١٠ وطواط ◆ ١١ مالك الحزين ◆ ٢١ دُرّاج ◆ ١٣ تَدرُج ◆ ١٤ أبو منجل ◆ ١٥ غُراب

العُملَةُ: کرێی کرێکار ٥ پارەو پول.
العَمَّالُ: مرۆڤی پڕ ئیش: کەسێك زۆر ئیش بکا یان هەمیشە کار.
العَمُولُ: ڕاهاتوو بەئیش ٥ کاسبو ئیشکەر.
العُمولةُ: ئەو برە پارەی کە بانق یان نوسینگە وەری دەگرن لەجیاتی ئەنجامدانی مامەڵەیەك.
العَمِيلُ: کەسێك مامەڵە لەگەڵ یەکێکی تر بکا لەبوارێك لە بوارەکانی ئابوری، سیاسی بازرگانی...هتد ٥ (ك: عملاء).
العَمَلِيّة: کۆمەڵە کردەوەو تێکەو لێکەیەکە شوێندەستێکی تایبەتی دەبێ ٥ دەگوترێ: (عملية جراحية) ٥ (عملية حربية) ٥ (عملية إرهابية...هتد)
المستعمل: بەکارهێندراو.
المعاملات: حوکمی شەرعی دەربارەی کڕینو فرۆشتنو ڕەهنو بەکرێدانو سەپانیو کرێکاریو ئەو جۆرە کارانەی پەیوەندن بە کاروباری ژیانەوە.
المَعمَلُ: کارگە ٥ شوێنی بەکارهێنانی ئامێرو دروستکردنی کەرەسە ٥ تاقیگەیەك کە تێیدا شت بەتاقی دەکرێتەوە.
المعمول من الشراب: شەرابێکە شیرو هەنگوینو بەفری تێکەڵ کرابێ.
عَمَلَسَ في سيره: پەلەی کرد لە ڕۆیشتندا.
العَمَلَّسُ: بەتوانا بۆ ڕۆیشتنی خێرا ٥ سەگە خوێڕیو گورگە سیسو پیس.
عَمْلَقَ الماءُ: ئاوەکە کەم بوو، (عَمْلَقَ الماءُ في الحوض) ئاوەکە لە حەوزەکەدا تێکەلاو بە قوڕەلیتە بوو.
عَمْلَقَ: لە قسەکانیدا قوڵ بۆوە.
العِملاقُ من الإنسان والشجر: ئەوەیە لە درێژیو بەرزیدا لە ڕەگەزی خۆی زێدەی هەبێ ٥ دەشگوترێ: (فلان عِملاق في الأدب أو السياسة) فلانکەس بالادەستی تەواوی هەیە لەبواری ئەدەب یان ڕامیاریدا.
العَمالِقةُ: نەتەوەیەك بوون بەڕەگەز دەچنەوە سەر عیملاقی کوڕی لاوزی کوڕی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوح.
عَمَّ الشَّيْءُ عموماً: شتەکە گشتی بوو هەموو لایەکی گرتەوە.
عَمَّ النباتُ: ڕوەکەکە درێژ بوو.
عَمَّ الرجل عُمُومةً: پیاوەکە بوو بەمام.
عَمَّ القومَ بالعطية عموماً: بەخششو پیاوەتیەکەی هەموو نەتەوەکەی گرتەوە

ه دهگوترێ: (عَمَّ المطر الأرض) بارانهكه هەموو زەوی ولاتی گرتەوه.

عَمَّ رأسهُ عَمّاً: سەری خۆی بەمێزەر پێچا.

أعَمَّ الرجلُ: پیاوەكه مامو پسمامەكانی ڕێزدارو زۆرن.

عَمَّ الناسَ بخيره ومعروفه: خێرو چاكەكانی هەموو كەسی گرتەوه.

عَمَّمَ القومُ فلاناً أمرهم: خەڵكەكە كاروبارەكانی خۆیان خستە ئەستۆی فلانكەسو بوو بەپەناگەی گشتی.

عَمَّمَ الشَّيءَ: شتەكەی گشتگیر كردو هەموانی بوو ه پێچەوانەی تایبەتمەندكردن.

عَمَّمَ زيداً: مێزەری خستە سەر سەری فلانكەس ه (زەید).

إعتَمَّ الرجلُ: پیاوەكە مێزەرەكەی بەدەوری سەریدا خڕ هەڵدا.

إعتَمَّ الشابُ: گەنجەكە پێگەیی‌و بالای كرد.

إعتَمَّ النبتُ: ڕوەكەكە درێژی تەواو بوو گوڵی كردو كامڵ بوو.

تَعَمَّمَ الرجلُ: پیاوەكە مێزەری بەدەوری سەریدا خڕ هەڵدا.

تَعَمَّمَ الآكامُ بالنبت: تەپۆڵكەكان بەڕووەك‌و گیاوگژ ڕازانەوه.

تَعَمَّمَ فلاناً: بە فلانكەسی گوت مامە.

الأعَمُّ: كۆمەڵی زۆری ئادەمیزاد ه پێچەوانەی (الأخص).

العامّ: گشتگیر ه پێچەوانەی (الخاص).

العامة من الناس: پێچەوانەی (الخاصة) ه (ك: عَوام) ه دهگوترێ: (جاء القومُ عامَّةً) خەڵكەكە هەموو هاتن.

العاميُّ: پاڵدراو بۆ گشت‌و هەموانی.

العاميَّةُ: زاراوەی عامی‌و ڕەشە خەڵك.

العِمامةُ: مێزەر كەلەسەر دەنرێ.

العَمُّ: مام (برای باوك) ه (ك: أعمام، وعمومة) ه كۆمەڵی زۆری ئادەمیزاد ه گژوگیاو پڵ‌و پوش.

العَمَمُ: كۆبوونەوەو زۆری ه شتی تەواو كامڵ ه پیاوێك خێروبێری بۆ هەموو كەس بێ ه دهگوترێ: (فلان عمم خير).

العُمُمُ: لەشساغی‌و گەنجی‌و دەوڵەمەندی.

العَمَّةُ: پور (خوشكی باوك) ه (ك: عَمّات)

العِمَّةُ: مێزەر شێوەی مێزەر ه دهگوترێ: (فلان حسن العِمة).

العُمومَةُ: چاوگە ه دهگوترێ: (بيني وبين فلان عمومة).

العَميمُ: هەر شتێك كۆببێتەوەو زۆر بێ ه تەواو بەرزو بڵند لەهەر شتێك بێ.

**عَمَنَ** بالمكان عَمناً: له شوێنەكه مايەوه (فهو عامن وعمون).

**عُمَان**: ئیقلیمێكه له باكوری خۆرهەڵاتی وڵاتی عەرەب لەسەر دوورگەی عەرەبیو دەریای هیندی.

**عَمَّان**: پایتەختی دەوڵەتی ئوردنه.

**عَمَهَ** عَمَهاً وعَمهاناً و عموهاً: سەرسام بوو كەوته حاڵەتی ڕاڕایی‌و نەیزانی له كوێوه بڕواو كامەیه ڕێگای ئەو.

**عَمَهَ** في الأمر: نەیزانی كام ڕێگایه حەق‌و ڕاسته.

**عَمِهَ** عَمَهاً وعمهاناً وعموهة: سەری لێ شێوا نازانێ كامه ڕێگای حەق‌و ڕاسته.

**عَمِهَت** الأرضُ: وڵاتێكی بێ ناونیشان‌و ئاڵا بوو.

**عَمَّهَ** في ظلمه: ستەمی كرد بەبێ تاوانێكی ئاشكرا.

**العَمَهُ**: سەرسامی‌و ڕاڕایی بەجۆرێك نەزانێ چی بكاو چی نەكا ٥ لەبواری پزیشكیدا نەبوونی مەلەكەی هەست‌و دەرك كردن ٥ وەكوو عاجزی له جیاوازی خستن له نێوان شێوەی شتەكان‌و كەسەكان‌و سروشتیان.

**عَمِيَ** العَمَاءُ والماءُ وغيره عَمياً: ڕەوان بوو.

**عمى** الموجُ: شەپۆلەكه كەف‌و خشت‌و خاڵ‌و چیلكه‌و چەوێڵی فڕێ دا، وەلای نا.

**عمى** البعيرُ بلعابه: حوشترەكه لیكی چاند.

**عَمِيَ** فلان عمىً: فلانكەس كوێر بوو ٥ ڕوناكایی لەهەردوو چاوی ڕۆیی‌و فزەی لێ بڕا.

**عَمِيَ** القلبُ أو الرجلُ: دڵەكه بەصیرەت‌و ئاوەزی نەماو ڕێگای خێری نەدۆزیەوه ٥ (فهو أعمى)و (هي عمياء).

**عمى** الأخبار والأمور عنه وعليه: هەواڵ‌و ڕوداوەكانی لێ نادیارو گوم بووبوون ئاگای لێیان نەبوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الْأَنبَاء يَوْمَئِذٍ﴾ ٥ دەگوترێ: (عَميَ عليه طريقه) ڕێگای لێ گوم بوو، نەیزانی كامه ڕێبازی ڕاست‌و بەختەوەرییه.

**عمى** فلان عِماية: درێژەی به ڕێبازی بەتاڵ‌و پوچی خۆی داو سوور بوو لەسەر بەردەوامبوون لەسەر ئەو ڕێبازه ناشیرینه.

أعماه: كوێری كرد.

عَمَّاه: كوێری كرد.

عَمَّى عليه الشَّيْءَ: شتەكەی لێ چەواشه كردو لێی شاردەوه ٥ دەگوترێ: (عَمَّى معنى البيت والكلام) مانای شیعرەكه یان قسەكەی چەواشه كرد.

**عَمِّى الْعَمَاءُ الْهِلال**: هەور وای کرد مانگ نەبیندرێ.

**تعامى**: وای خۆنیشاندا کە کوێرەو هیچ نابینێ یان کەودەنو گێلە هیچ نازانێ.

**الأعميان**: لافاو و ئاگر ٥ دەگوترێ: (أعوذ بالله من الأعمين) پەنا بەخودا دەگرم لەو دوو شتە کوێرە بێ ئامانە.

**العامِي**: ئەو کەسەی ڕێگای خۆی نازانێو پێویستی بە شارەزایی کردن هەیە ٥ پیاوی بالآ بەرزو درێژ ٥ چۆڵەوانی کە نیشانەی ئاوەدانی تێدا نەبێ.

**العَماءُ**: هەور.

**ألعَمَاءَةُ**: گومڕاییو ڕۆچوون لە بەتاڵو خراپەکاریدا.

**ألمعمّى**: لەغەزو گرێکوێرکەی وشە سازی ٥ (ك: مُعَمّيات).

**عَنُبَ الكرمُ**: مێوەکە ترێی گرت.

**العانب**: خاوەن ترێ.

**العُنابُ**: کێوی بەرزو بڵندو کەوانەیی.

**ألعِنَبُ**: ترێ ٥ (ك: أعناب).

**عِنَبُ الذِئب**: ڕووەکێکی دەشتەکییە لەگەڵ درەختەلۆکەو شتی وا دەڕوێ بەرێکی ڕەشی هەیە وەکوو ترێ وایە تاڵە.

**العَنبأَ**: عنبە ٥ میوەو بەروبووم ٥ درەختە ڕووەکێکە لە پێڕی قەزوانییە ٥ میوەکەی دەنکەو تامی خۆشە دەخورێ ٥ دەکرێ بەمرەبا ٥ بەکاڵی سرکەی لێ دروست دەکرێ ٥ لە درەختەکانی وڵاتی گەرمەسێرە ٥ لە میصر ڕواندنی زۆرو بڵاوە پێی دەگوترێ (مەنجۆ) یان (مەنجە) وشەکە هیندییە.

**العُنَّابُ**: درەختێکی چقڵاوییە لە پێڕی (ألسدرية)یە بەرزی دەگاتە شەش مەتر هەروا (العُنَّاب) بەمیوەکەشی دەگوترێ ٥ میوەکەی سوورو شیرینو بەتامە لەسەر شێوەی میوەی درەختی نەبقە.

**ألعَنبَرُ**: مادەیەکی ڕەقە تامی نیە، بۆنی نییە مەگەر وردو هاڕ بکرێو بکوترێ ٥ دەڵێن شیاکەی حەیوانی دەریاییە.

**العَنبَرُ**: گیانلەبەرێکە گوانداری بەحریە لە پێڕی (ألقيطسية)یە مادەی عەنبەر دەردەدا ٥ باڵەخانەو خانوێکی گەورەو پانو بەرینە بۆ شت تێدا هەڵگرتن یان بۆ کار تێدا کردن ٥ یان شوێنی حەوانەوەی سەرباز یان نەخۆش ٥ وشەکە کراوە بە عەرەبی ئەگینا بۆخۆی (أنبر) بووە ٥ (ك: عَنابِر).

**عَنِتَ** الشَّئ عنتاً: شتەکە خراپ بوو داوەشا.
**عَنِتَ** فلان: فلانکەس کەوتە مەشەقەتو ناخۆشیەوە.
**عَنِتَ** العَظْمُ: ئێسقانەکە دوا هەڵبەستنەوەی شکایەوە.
**أعنَتَهُ**: خستیە ناو مەشەقەتو ناخۆشیەوە.
**أعنَتَ** المريضَ: زیانی بەنەخۆشەکە گەیاندو تەندروستی تێکدا.
**عَنَّتَهُ**: لێی توند کرد ◦ تەنگی پێ هەڵچنیو کاری قورسو گرانی خستە ئەستۆ.
**أعنَتَ** المريضَ: زیانی بە نەخۆشەکە گەیاندو تەندروستی تێکدا.
**تَعَنَّتَهُ**: ئەزیەتو ناخۆشی پێگەیاند ◦ داوای کرد ئەو ملکەچو شەکەتبار بێ هەوڵی ئەوەی دا نەحەسێتەوە.
**تَعَنَّتَ** الرجلُ: داوای شتێکی لێ کرد بەمەبەستی سەر لێ شێواندنو زیان پێگەیاندن.
**العَنَتُ**: هەڵە ◦ داوێن پیسی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ﴾ ◦ بەرپەرچدانەوەو ئینکەبەری.
**عَنتَرَ** الذّبابُ الأزرق: مێشە شینە ویزە ویزی کرد.
**عَنتَرَ** فلان: فلانکەس لەشەڕدا ئازاو ورە بەرز بوو ◦ خۆی خستە ناوکێشەو هەراوە.
**عنتر** فلاناً: بە شمشێر لە فلانکەسی دا.
**العَنتَرُ**: مێشی شین، مێشەگا.
**عَنَجَ** الشَّئ عَنجاً: شتەکەی کێش کرد ڕای تەکاند ◦ دەگوترێ: (عَنَجَ رأس البعير) هەوساری حوشترەکەی کێش کردو لغاوی گرتەوە.
**عَنَجَ** الدلوَ: دوڵچەکەی بە هەوساری حوشترەکەوە بەست.
**أعنَجَ** فلان: فلانکەس پشتی ژانی کرد ماسولکەکانی ئێشو ئازاریان بوو ◦ کاروباری خۆی تۆکمەو ڕێکو پێک کرد.
**أعنَجَ** البَعيرَ: هەوساری حوشترەکەی بۆلای خۆی کێش کرد جڵەوی گرتەوە.
**العِناجُ**: هەوساری حوشتر ◦ حەبلێکە یان سیرمەیەکە بەژێر دۆڵچەوە دەبەسترێو هەردولای دەهێندرێنەوە بۆلای لێوارەکانیو بەحەبلەکەیەوە شەتەك دەدرێ، بۆئەوەی ئەگەر لەکاتێکدا قوڵفەکانیشی بپچڕێن ئەوسیرمەیە نەهێڵێ دۆڵچەکە بکەوێتە بیرەکەوە ◦ پشتی پیا و چومزگەی ◦ شوێنی ستراتیجی کارو پیشە شتە

سەرەکییەکانی ٥ دەشکوترێ: (هذا قول لا عناج له) ئەمە قسەیەکە بێ سەرو بەرە بەهەوانتە گوتراوە.

**عَنجَدَ العِنَبُ**: ترێیەکە بوو بە مێوژی خراپ.

**العَنجَدُ**: مێوژی خراپ.

**العُنجُهُ**: گوخلێنکە، قالۆنچە.

**العُنجُهِـيُّ**: کەسێـک تەکـەبورو خـۆ بەزلزانی تێدا بێ.

**العُنجهيّة**: تەکـەبورو خـۆ بـەزلزانیو وەشـك تـەبیاتی ٥ زبـری ژیـانو خۆراکی بێ پێخۆرو چەوری.

**عَنَدَ** عنهُ عَنداً وعُنوداً: دوورکەوتـەوە ڕوی وەرگێڕا.

**عَنَدَ** الناقةَ: حوشترەکە لە گاڕان تـەرە بـوو بۆخۆی بەتەنیا لەوەڕا.

**عَنَـدَ** العِـرقُ أو الجـرحُ: ڕەگەکـە یـان برینەکـە خـوێنی لێ ڕەوان بـوو نەگیرسایەوە.

**عَنَدَ** فـلان: فلانکەس تەکـەبوری نوانـدو لەسـنور تێپـەڕیو سەرپێـچی نوانـد ٥ پێچەوانەی حـەقو ڕاستی جولایەوەو بەئەنقەست ئـەو هەلوێستەی نوانـد ٥ (فهو عاند وعنود وعنيد).

**أعنَدَ** العِرقُ أو الجرحُ: دەمارەکە یـان برینەکـە خـوێنی بـەربوو نەگیرسایەوە.

**اعنَـدَ** فلان القيءَ: فلانکەس بـەردەوام ڕشایەوە.

**عانـد** فـلان معانـدةً وعنـاداً: فلانکـەس پێـچەوانەی حـەقو ڕاسـتی جولایـەوەو دەشـی زانـی کـە سەرپێچی حەق دەکا.

**عائدَ** فلاناً: بەرپەرچی فلانـی دایـەوەو دژی کردەوەکەی بوو.

**تعاند** الخصمان: دوو کێشەکارو بەنیزاع هاتووەکان کەوتنە مقۆمقۆو پێـکدا هەلگوتن.

**إستَعنَدَ** الفـرسُ والـبعيرُ: ئەسپەکە یـان حوشـترەکە پـەتیان نـەداو نەیانهێشت هەوسار بکرێن.

**إسـتَعنَدَ** فلانـاً مـن بـين القـوم: لـەناو خەلکەکە قەصدی فلانی کرد.

**إستعند** السقاءَ: گۆزەکەی لار کـردەوەو لەدەمی گۆزەکە ئاوی خواردەوە.

**إستَعنَدَ** القيـءُ أو الـدمُ فلانـاً: ڕشانەوە یان خوێن بـەربوون بەسـەر فلانـدا زالْ بوو، ڕشانەوەو خوێن بـەربوون تەنگیان بە فلان هەلچنی.

**إستَعنَدَ** عَصَاهُ: بەگۆچانەکەی لە فلانی دا

**العِناديـــةُ**: پێڕێـکن لـە سەوفەسـتائییەکانو ئینکـاری حەقائیقی شت دەکەنو پێیـان وایـە

هەموو شتێك وەهەو خەیاڵەو پووچە.

عِنـدَ: زەرفی مەكانە بۆ شتی حازرو غائیبو دورو نزیك.

العِندیّةُ: پێڕێكن لە سەوفەستائییەكان پێیان وایە حەقائیقی شتەكان بەگوێرەی بیروباوەڕە ٥ تەنانەت ئەگەر یەكێك بڕوای وابوو مرۆڤ بێگیانو بێ هەستە ئەوە بەلایانەوە ڕاستو دروستە.

العَنـودُ: سەر ڕەقو ملنەدەر ٥ دەگوترێ: (سحابة عنود) هەورێكی بەبارانەو لەبارین ناوەستێ.

عَنـدَلَ العَنـدَلیب: چۆلەكە (بولبولە چولەكە) باڵندەیەكی پچوكی فرە جەوجۆڵە ٥ بەزۆر جۆر دەخوێنێو لەناو باخو گوڵو گوڵزاردا دەحەوێتەوە، لە ڕۆژانی بەهاردا دەردەكەوێ ٥ (ك: عنادل).

عَنَزَ عَنه عنزاً وعنوزاً: لێی دووركەوتەوە.

عَنَزَ فلاناً عَنزاً: بە دارێك؛ كەلە عەصا درێژترە، لە فلانكەسی دا.

اعنَـزَّهُ: خواری كردەوەو دووری خستەوە.

إعتَنَـزَ: دووركەوتەوە ٥ دەگوترێ: (إعتَنَزَ عن الشَّيء).

تَعَنَّزَ: بەمانا (إعتَنَزَ)دێ.

إستَعنَزَ: بەمانا (إعتنز)دێ.

العَنزُ: بزن ٥ بزنە ئاسك ٥ بەردی ناو ئاو ٥ زەوییەك: نەرمە گڵو لمو چەوەڵانی هەبێ.

العَنَزَةُ: دارێكە لە عەصا درێژترو لە ڕمب كورترە پیرەمێردو پەك كەوتە خۆی بەسەردا دەدات ٥ تیژایی پاچ، نووكە پاچ ٥ (ك: عَنَزٌ و عنَزاتٌ).

العَنَزِيُّ: پیاوێك لەهۆزی عەنەزە، چوو بۆ گزگلكو تاڵ ڕنینو نەگەڕایەوە، لەم ڕووداوە هاتووە كەدەڵێ: (لا أفعل كذا حتى يؤوب القَارِظُ العَنَـزِيُّ) واتە: هەرگیزاو هەرگیز ئەو شتە ناكەم.

اُلمُعَنَّـزُ: سەر بچكۆلە ٥ دەموچاو كرۆسك، دەموچاو رەقەڵە ٥ كەسێك ڕیشی وەكوو ڕیشی نێریەقەرە وابێ.

عنست البنت البِكرُ عنساً وعنوساً: ئافرتەكە زۆر لەماڵی باوكی مایەوەو قەیرە بوو شوی بۆ نەكرا ٥ (فهي عانس) (ك: عُنسٌ و عوانس).

عَنَّسَ الرجلُ: پیاوەكە كەوتە ساڵەوەو ژنی بۆ نەهات ٥ (فهو عانسٌ) بەزۆری وشەی (عانس) بۆ ئافرەت بەكاردێ.

**عَنِسَ عَنَساً**: هەموو سەعاتێك سەیری ئاوێنە دەكا.
**أعنَسَ**: بازرگانی كرد لەئاوێنەدا ○ (أعنَسَ الشَّيْءَ) شتەكەی گۆڕی ○ دەگوترێ: (أعنست السِنُّ وجه فلان) ساڵو ڕۆژگار دەموچاوی فلاّنكەسی گۆڕی ○ (أعنسَ الشيبُ رأسَهُ) پیری تێكەڵ بەسەری بوو (سەری ماشو برنج بوو).
**عَنَّسَت البكرُ**: كچەكە لەماڵی باوكیدا زۆر مایەوەو شوی بۆ نەكرا.
**عَنَّسَ البنتَ البكرَ أهلُها**: كەسوكاری كچەكە نەیان هێشت كچەكە شوبكا تاتەمەنی شوكردنی تێپەڕیو پیر بوو.
**العِناسُ**: ئاوێنە.
**العَنسُ**: بەردی ئاو ئاو ○ دالأش، داڵە كەرخۆرە ○ حوشتری بەهێزو پتەو.
**اعنَصَ الرجلُ**: پیاوەكە هەندی موی بەسەریەوە ماون ○ تاڵتاڵە موی بەسەریەوە ماون.
**العُنصُرُ**: بنەماو حەسەبو ڕەگەز ○ (فلان كريم العُنصُر) فلاّنكەس وەجاغزادەو ڕەسەنە ○ ڕەگەز ○ دەگوترێ: (فلان من العُنصر الآري أو السامي) ○ لەبواری كیمیادا مادەیەكی سەرەتاییە ناتواندرێ شی كردنەوەی كیمیای تێدا بكرێ بۆ مادەیەكی ساكارتر ○ مادەیەكی وەهایە كاریگەری هەیە لە پێكهێنانی فەبارەیەكی تری وەكوو هایدرۆجینو ئۆكسجین كە دەبنە هۆكاری پەیدا بوونی ئاو.
**العناصر الأربعة**: بەلای زانا كۆنە یۆنانیەكانەوە بریتییە لە چوار توخم: (ئاگر، هەوا، ئاو، گڵ).
**العُنصُرية**: دەمارگیریو تایەفەگەریو ناوچە گەریی.
**العُنصُلُ**: پیازە ورچە، ڕوەكێكی بەتەمەنو لە پێڕی (الزنبقية)یە گەڵاكەی وەكوو گەڵای (كرّاث) وایە نێركە گوڵدارەكەی دوای وەرزی زستان لە پێش دەركەوتنی گەڵاكەی دەردەكەوێ، ڕوەكێكی تەڕو تازەو ناسكە، مەترێك بەرز دەبێتەوە، كۆتایی سەرەكەی گۆپكەیەكە پڕە لە گوڵە سپی، بنكەكەی وەكوو سەلكە پیاز وایە بۆ دەرمان بەكاردێ.
**العِنصاة**: هەموو شتی كەم كەمو جوی جویو بڵاو لە ڕوەكو موو شتی تر ○ پاشماوەی هەر شتێك كە زۆرینەی نەمابێ ○ جەڵەبە مەڕو بزن، گارانە حوشتر.

**العُنصُوَةُ**: بەمانا (العِنصاة)دێ.

**العُنظَابُ**: کوللە زەردەی گەورە ◊ (ك: عَنَاظِبُ).

**عَنظَى بـه**: گاڵتـەی پـێ کـرد، قـسەی ناخۆشی پێ گوت.

**العُنظوان**: ڕوەکێکی ترشەتامە، ئەگەر حوشتر زۆری لێ بخوا توشی ژانەسك دێ ◊ پیاوی شەڕانیو جوێن فرۆش.

**عَـنعَنَ فـلان عَنعَنـةً**: فلانکـەس لـە قسەکردندا لەجیاتی پیتـی (عـین) هەمزەی بەکاردەهێنا.

**عَـنعَنَ الـراوي**: حـەدیس گێـڕەوە لـە ڕیوایەتەکەیدا وتـی: (روى فلان عن فلان....).

**عَنُفَ بـه وعليـه عُنفاً وعنافةً**: بـە تونـدو تیـژی یەخـەی گـرتو پـەلاماری دا ◊ سەرزەنـشتی کـردو عـەیبو عـاری لێ دۆزیەوە.

**أعنَفَهُ**: بەمانا (عَنَفَهُ)دێ.

**عَنَّفَهُ**: بەمانا (أعنَفَهُ)دی.

**اعتَنَفَ الأمرَ**: کارەکەی بە توندو تیژی وەرگرت ◊ دەستی بە ئیشەکە کـردو ج زانیارییـەکی لــە بابەتەکــەدا نەبوو.

**اعتَنَفَ الشَّيءَ**: شتەکەی ناخۆش ویست ◊ دەگـوترێ: (اعتَنَــفَ الطعـــام) خۆراکەکـەی بــەدڵ نــەبوو پێــی ناخۆش بوو.

**اعتَنَـفَ فـلان المجلـسَ**: فلانکـەس لـە ئەنجومەنەکە گواستییەوە.

**العَنَفَـــةُ**: ئامێرێـــکە ئـــاو لێـــی دەدا بەخوڕەو دەیسوڕێنێتەوە ◊ وەکوو پەڕی ئاشی ئاوی.

**عنفـــوان الـــشَّيْ**: ســـەرەتای شـــت ◊ دەگوترێ: (هو في عنفوان شبابه) ئەو هێشتا لە هەرەتی لاوەتیدایە.

**العَنَقُ**: کەمی شتی ناومـاڵو سووکیو بێ کێشی.

**العَنفَقَـةُ**: چـەند تاڵـە موویـەکی کـەمن لەنێوان لێوی خوارەوەو چەناگەدا.

**عَنَقَهُ عَنقاً**: لەملی دا، سەری بڕی.

**عَنَقَ الكلبَ**: قلێتەی لەملی سەگەکە کرد.

**عَنِقَ عَنَقاً**: ملی درێـژ بـوو، ملـی ئەسـتوور بـوو ◊ (فهـو أعنـق وهـي عنقـاء) ◊ دەشـگوترێ: (هـضَبَةٌ عنقـاء) بانوێـکی درێژو بەرز ◊ (عَنِـقَ الكلـبُ) سـەگەکە خاڵێـکی سپی لە ملی دا هەبوو.

**أعنَقَ الرجلُ**: پیاوەکە ملی درێـژ بـوو ◊ (اعنـق الـزرعُ) کـشتوکاڵەکە درێـژ بـوو گـوڵی کـرد ◊ (أعنقـت الهـضبة) بانوەکـە درێـژو بـەرز بـوو ◊ (فهـو مُعنق وهي مُعنِقة).

**اعنقت الدّابةُ**: وڵاغەکـە تیـژ تـی پـەڕی خێرا ڕۆیی ◊ (فهو معنق وهي مُعنِقة).

**اعنقــت الثريــا**: ئەســتێرەی ســیوەیل ئاوابوو، لەشیعری فۆلكلۆردا هاتووە دەڵێ:

﴿باڵا بەبەرزی قەد بەباریكی
ئەستێرەی سیوەیل كەوتە تاریكی﴾

**أعنقــت النجــومُ**: ئەســتێرەكان بــەرەو ئاوابوون ڕۆیشتن.

**أعنَقَ الكلبَ**: قلێتــەی لــەملی ســەگەكە كرد.

**أعنَقَ فلانٌ فلاناً شَيْئاً**: فلانكەس شتێكی لەملی فلانكەس كرد.

**عانَقَهُ مُعانَقةً وعناقاً**: ملی لەملی نزیك كــردەوەو ســنگی بەســنگیەوە نــا، چاكو چۆنیو ماچو مۆچیان كرد.

**عَنَّــقَ الطلــعُ النخــلَ**: لــقو چــرۆی دارخورماكە درێژ بوو.

**عَنَّــقَ الْبُــسرَةُ**: بەرســیلە خورماكــە خەریكــە هــەمووی بگــاو ببێتــە روتاب.

**عَنَّقَ فلاناً**: ملی فلانكەسی گرت گوشی دەستی لەبینی نا.

**إعتَنَــقَ الــرجلان**: هەریەكــە لــەو دوو پیــاوە چــنگیان لــە ئەســتۆی یــەكتر هێناو دەستەو یەخەی یەكتر بوونو كەوتنە شەڕو هەراوە.

**إعتَنَــقَ الأمــرَ**: پابەنــدی كارەكــە بــوو خستیە ئەستۆی خۆی.

**إعتنق دينا أو نحلة**: بــاوەڕی بەئایینێــك هێنــاو وەریگــرت ٥ قبــوڵی كــردو بەدڵسۆزی باوەشی پێدا كرد.

**تعانَقــا**: لــە ڕوی خۆشەویســتیەوە ئــەو دوو كەســە دەســتیان لــەملی یــەكتر كرد.

**تَعَنَّقَ اليربــوعُ أو الأرنــبُ**: یەربوعەكــە یــــان كەروێــــشكەكە چــــووە كونەگڵەكەی خۆیەوە.

**العانقــاء**: كونێــكە پــڕە لــە گڵە وردەی نــەرم، یــەربوعو كەروێــشك كــە ترسێكیان لێ پەیدا بوو ملی خۆیان دەخەنە ناو ئەو گڵە نەرمەوە.

**العَنَــاقُ**: كــارو بــەرخ، گیــسكو كــاوڕ، واتــــە: بێــــچوی مــــەڕو بــــزن لەساواییەوە تا ساڵێــك بەســەریاندا تێدەپــەڕێ ٥ (ك: أعنُــقٌ و عُنُــقٌ وعنــوق) ٥ گیانلەبەرێــكە لــە پێــڕی پشیلە، لە پشیلە گەورەترە، ڕەنگی سورە، لــە ژوور گوێچكەیەوە مووی ڕەش هەن ٥ (بڕوانە وشەی (ألتفة))

**العُنُــقُ**: ئەســتۆ ٥ ســەرەتای هــەموو شتێــك ٥ دەگــوترێ: (ولــد في عنــق الصيف) لەسەرەتای هاویندا لــەدایك بــــوو ٥ كۆمــــەڵی ئــــادەمیزاد ٥ دەگــوترێ: (جــاء النــاسُ عنقــاً عنقــاً) خەڵــكەكە پێــڕ پێــڕو تــاقم تــاقم

هاتن ٥ هەروا دەگوترێ: (لفلان عنق في الخير) فلاّنكەس دەست پێشخەری هەیە بۆ خێرو چاكە ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (لا یزال الناس مختلفة أعناقهم في طلب الدنیا) وشەی (أعناق) لێرەدا بەمانا سەرۆك و گەورەو ڕیش سپی ولاّت دێ.

**العَنَقُ**: گورگەلوقە، ڕۆیشتنی ئەسپو حوشتر بەخێرایی.

**العَنقاءُ**: باڵندەیەكی خەیاڵییەو هەبوونی نییە ٥ شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێ:

﴿بێ نیسم هەن بێ موسەمما هەروەكوو ناوی بەقا تەیری عەنقا شاری جابولقا پلاّوی خانەقا﴾.

**العَنیقُ**: دەست لەملكەر ٥ دەگوترێ: (بات خیال طیفك لي عنیقاً).

**المُعانِقةُ**: لە زانستی ڕوەكناسیدا ئەو گەڵا ڕوەكەیە كە دەورەی قەدی ڕوەكەكە دەدا وەكوو ڕوەكی خەشخاش.

**المِعناقُ**: ئەسپی مل قیتو جوان.

**المُعنِقُ**: ئەو تمبارە زەوییەی بەرزەو دەوران دەوری دەشتاییە ٥ (ك: معانیق).

**المِعنَقَةُ**: ملوانكە ٥ (ك: معانق).

**العَنقَدُ**: ماسیەكی ڕەنگ زیوی بریسكەداری بێ ددانە.

**العُنقودُ**: بڕوانە مادەی (عَقَدَ).

**العُنقُرُ**: بنكی ڕوەك و قەفەزاژو بەرەدا بەمەرجێ سپی بن و كۆمەڵبن و ڕەنگی تریان نەگرتبێ ٥ ناوەڕۆكی دارخورما چونكە سپییە.

**عَنقَشَ فلان**: فلاّنكەس خۆی بەشتەكەوە هەڵواسی.

**تَعَنقَشَ**: خۆی خوارو پێچاوپێچ كرد خۆی جەڕاند.

**العِنقاشُ**: بێ عەقڵی بێ ڕەوشت ٥ چەرچی ئەو كەسەی بەگوندو گەڕەك و هۆبەدا دەگەڕێ و شت دەفرۆشێ.

**عَنَكَ الرملُ عَنكاً وعنوكاً**: لمبەلاّنەكە ڕەق بوو بەرز بۆوە ڕێگای نەدا كەس پیا بڕوا.

**عَنَكَ اللبَنُ**: شیرەكە بزركا.

**عَنَكت المرأةُ على زوجها**: ئافرەتەكە لە مێردەكەی ناچیزە بوو.

**عَنَكت المرأة على أبیها**: ئافرەتەكە لە باوكی یاخی بوو.

**أعنَكَ**: بەناو لمبی تەبارە بەستوی بەرزەوەبوودا ڕۆیی ٥ خەریك بوو تێدا بچێ.

**عَنَّكَهُ**: بەتوندو تیژی ڕەفتاری لەگەڵدا كردو خستیە ناڕەحەتی و چورتمەوە.

**إعتَنَكَ**: بەمانا (عَنَكَ)دێ.

تَعَنَّكَ الرملُ: بەمانا (عَنَكَ)دێ.

ألعِنك من كل شيئ: هەرشتێـك گەورە بێ ٥ بەشێك لەشەو.

ألعَنيكُ: لبی تەبارە بەستوی ڕەق بـوو ٥ (ك: عُنُكٌ).

ألعَنكَـبُ: جالجالۆكـە نێـرە ٥ یـان ڕەگەزی جالجالۆكە ٥ (ك: عناكب).

ألعَنكَبَةُ: جالجالۆكەی مێ.

ألعنكبــوت: دەعبایەكـە لــە پلــەی (العنكبيــات) چـوار جـووت قاچـی هـەن، شتێـكی زۆر تـەنك دەچـنێ‌و دەیكاتـە داو بـۆ نێـچیرەكانی ٥ (ك: عنكبوتات و عناكب وعناكيب).

عَنكَشَ العُشبُ: گیاو گژەكە راساو زۆر بوو تێـكهالاّ ٥ دەشگوترێ: (عـنكش الشَعرُ) قژەكە پڕو چڕ بوو تێـكهالاّ.

تَعَنكَشَ: بەمانا (عَنكَشَ)دێ.

ألعَـنكَشُ: كەسێـكە گـوێ ناداتـە خـۆ ڕازاندنەوەو خۆ ئارایشت دان.

عَـنَّمَ البنـانَ: قـامكی بـە گـوڵو بـەری درەختی عەنەم ڕەنگ كرد.

ألعَــنَمُ: ڕوەكێــكی سـفتو هەمیـشە سـەوزە لـق‌و پرژەكـانی ئوسـتوانین گەلاّكـەی لەگـەلاّی زەیتـون دەچـێ وەلێ لــە هــی زەیتــون وردتــرو ســەوزترە، گوڵەكــەی قیرمیزیــە، بۆیـەو ڕەنگـی لێ دەگـیرێ ٥ هـەروا ناوە بۆ تولەو تەرزەی مێو كەوەك‌و ڕێـواس سـپی دەكـرێ‌و دەخـورێ‌و مزرە.

العَنَمَةُ: قەلّشتی لێوی ئادەمیزاد.

عَنَّ لـه الـشَّيْئُ عَنّـاً و عُنونـاً: لەبـەردەمی دەركــەوت، كەوتــە بــەر چــاوی ٥ دەگـوترێ: (لا أفعلـه مـا عـنّ نجـم في السماء).

عَنَّ عن الشَّيْئِ: ڕوی لە شتەكە وەرگێڕاو پشتی لێ هەڵكرد.

عَنَّ الفرسَ عناً: لغاوی بۆ ئەسپەكە كرد ئەسپەكەی لغاو كرد.

عَنَّ الكتـابَ: نـاو ونیـشانی بـۆ كتێبەكە دانا ٥ عینوانی بۆ نووسی.

عُـنَّ الرجـلُ عُنَّـةً: پیاوەكـە لـەپیاوەتی كەوت، نەیتوانی سەرجێی ئـافرەت بكا ٥ (فهو معنون وعنين وعِنِّين) دەشگوترێ: (إمرأةٌ عنينة) ئافرەتێكە حـەزی لەپیاو نییە.

أعنــت الــسماءُ: ئاسمــان بــەرزایی دەركەوت.

أعــنَ الفــرسَ أو اللجــامَ: جلـەوی ئەسپەكەی بـەرز كـردەوە (أعَــنّ الكتابَ لكذا) كتێبەكەی ڕانواند بـۆ فلاّن.

أعِنّ الرجلُ: پیاوەكـە هینەكـەی لەكار كەوت.

عَانَّهُ مُعانَّة وعِناناً: بەرەبەرکانی کرد.

عَـنَّنَ الكتـابَ: عینـوانی کتێبەکـەی نووسی.

عَنّنت المرأة شعرها: ئافرەتەکە قژەکانی خۆی هۆنینەوە.

عَـنَّنَ الفـرسَ او اللجـام: جڵـەوی بـۆ ئەسپەکە یان بۆ لغاوەکە دانا.

إعتَنَّ له الشّيءُ: شتەکەی بۆ دەرکەوت.

إعتَنَّ له ما عند القـوم: هـەواڵی ڕوداوی نەتەوەکەی پێ ڕاگەیەنرا.

تَعَـنَّنَ الرجـلُ: پیاوەکـە وازی لەسـەر جێیی ئـافرەت هێنـا بـەبێ ئـەوەی لەکار کەوتبێ.

الأعنـــانُ: ئـــەم لاو ئـــەولای شـــت ٥ چواردەوری درەخت.

العَنانُ: ئەوەی دیارە لەبەرزایی ئاسمان ٥ هەور ٥ کن هەموو شتێك.

العِنانُ: چەرم یان بەن و دەزبێنی لغاو، هەوســـار ٥ ئـــەوەی ولاخـــی پـــێ دەبەسرێتەوە دووحەبلی وەك یـەك درێـــزو هاوتـــا ٥ دەگـــوترێ: (فـــلان طويل العَنان): فلانکەس وەجاغزادەو شـەریفو رەوشـت بـەرزە ٥ (فـلان قصير العنـان) فلانکـەس کـەم خێـرو بێـرە ٥ (فلان أبيّ العنـان) فلانکـەس داکۆکیکارو ملنـەدەرە بـۆ داواکاریی نـاڕەوا ٥ دەشـگوترێ: (ذلّ عنانـه) ٥ ملکـەچو جڵـەو نـەرم بـوو، (همـا يجريـان في عِنـان) ئـەو دووە هاوتـاو هاوشـانن لەگـەورەیی و زانیاریـدا ٥ (أرخـى مـن عِنانـه) کەمێـك بـاری گرانی لێ سووك کرد ٥ (بينهما شِركة عِنان) لـە نێـوان ئەوانـدا هاوبەشـی و یەکسانی هەیە ٥ لـەم ڕووەوە (ألعِنان) بریتییـە لـەدوو حـەبلی هاوتـاو بەرامبەر بەیەك.

ألعَنُّ: ناحیەو لاو ناوچە ٥ (ك: أعنان).

العَنَنُ: بەمانا (العَنُّ)ی ٥ (ك: أعنان).

العَنّـانُ: بـۆ زێـدە مانـای (عـانٌّ)ی ٥ پێـشبڕکێ ٥ دەگـوترێ: (فـلان عَنّـان عن الخير) فلانکـەس سـستە لـەکاری خێردا.

العُنَّةُ: لەکارکـەوتن و عیجزێـکە توشـی پیـاو دەبـێ و توانـای کـاری سێـکسی نامێنـێ ٥ خێمـەو کەپرێـك کـە لـە لق و پرژی درەخت دروست بکرێ ٥ (ك: عُنَنٌ وعِنان).

المِعَنُّ: کەسێـك خۆ بخاتـە ناوشتێـکەوە کــە پەیوەنــدی بــەوەوە نــەبێ و لەهـەموو دیزەیـەك ئەسکوێ بـێ ٥ وتاربێژی زمان ڕەوان و بەدەم و پل.

عَنْـــونَ الكتـــابَ عنونـــةَ: عینـــوانی کتێبەکەی نووسی.

العُنـوان: ئـەوەی دەکرێتـە نیشانە بـۆ شتی تر.

**عنا** عُنُـوّاً: ملكـەچ بـوو زەلیـل بـوو ٥ دەگوترێ: (عنا فلان للحق) فلانکەس گـەردن کەچـی حـەق‌و ڕاسـتی بـوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَعَنَـتِ الْوُجُـوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ﴾ ٥ بوو بەئەسیرو دیل.

**عنـا** الـدمُ او المـاء: خوێنەکە ڕەوان بـوو ئاوەکە جاری بوو.

**عَنا** الأمر به: کارەکە خرایەسەری.

**عنا** علیه الأمر: کارەکەی لەسەرشان قورس بوو.

**عنا** الأمرُ فلاناً: کارەکە فلانی گرتەوە.

**عنا** الشَّيْءَ عَنوَةً: شتەکەی بەزۆرو تۆبزی وەرگرت.

**عَنى** به الأمرُ عَنياً: کارەکەی بەسـەردا درا، ئیشەکەی خرایە ئەستۆ.

**عَنى** الشَّيْءَ: شتەکەی دەرخست‌و ئاشکرای کرد.

**عَنى** بالقول کذا عنیاً وعنایـةً: بەقسـەکانی مەبەستی فلان بوو ٥ ئەوی مەبەست بوو.

**عَنى** الأمرُ فلاناً عَنیاً وعنیاةً: کارەکە فلانـی گرتەوەو مەبەست بەو ئیشە فلان بوو ٥ لـە حەدیسدا هـاتووە: (مـن حسـن اسلام المرأ ترك مالا یعنیه) ٥ دەشگـوترێ: (عَنـى بـأمر فـلان) گرنگـی دا بـەکاری فلان.

**عَنِـيَ** عَنـاً وعنـاءاً: مانـدوو بـوو، تووشـی نارەحەتی بوو.

**عَنِيَ** الرجلُ: پیاوەکە بـەدیل گیرا، کەوتـە حاڵەتی دیلیەتیەوە.

**عَنِيَ** فلان بـالأمر: فلانکـەس بەکارەکەوە مەشغوڵ بوو ٥ گرنگی پێدا.

**عُنِيَ** بالأمر عَنیاً وعنایةً: گرنگی بەکارەکە داو پێیەوە مەشغوڵ بوو.

**أعنـت** الأرضُ النَّباتَ: زەویەکە ڕوەکی ڕوانـدو گیـاو گـژی دەرخسـت ٥ دەگوترێ: (أعنَى الغیثُ النباتَ) باران ڕوەکـی ڕوانـد ٥ (مـا أعنـت الأرض شیئاً) زەوی هیچی نەڕواند.

**اعنـى** الرجلَ: پیاوەکەی ملکەچ کردو دیلی کرد.

**أعنـى** الأمـرَ فلانـاً: کارەکـە فلانـی مانـدوکرد ٥ بـۆ فلانکـەس گـرنگ بوو.

**عانـاه**: ناخۆشـی چەشـت ملمـلانـێی لەگەڵ چورتەو کێشەدا کرد.

**عانی** فلاناً: شـەڕە قسەو بەربـەرەکانی لەگەڵ فلان کرد ٥ لەگەڵی هەڵکرد.

**عـانى** المـالَ: بـەجوانی سـەروکاری ماڵەکەی کـرد ٥ دەگـوترێ: (هـم مـا یعانون مالهم) ئەوانە باش سەروکاری ماڵ‌و سامانی خۆیان ناکەن.

**عـانى** الهمـومُ فلانـاً: خـەم‌و خەفـەت سواری شانی فلانکەس بوو.

**عَنَّاهُ:** ئەركى قورسى خستە سەرشان.

**عَنّى الكتابَ:** عینوانی بۆ كتێبەكە دانا.

**إعتنى الأمرُ:** كارەكە چەسپا جێگیر بوو.

**إعتنى فلان بالأمر:** فلاَنكەس گرنگی دا بەكارەكەی.

**تعنّى الرجلُ:** پیاوەكە ماندوو بوو ٥ پیسایی حوشتری بەركەوت ٥ تووشی گووگیران بوو.

**تَعَنّى في الأمر:** مامناوەندی لەكارەكەدا بەپڕەو كرد.

**تَعَنّى الأمرَ:** كارەكەی بەناڕەحەتی لەئەستۆ گرت.

**تَعَنّى الحُميُّ فلاناً:** لەرزۆتا فێری فلاَنكەس بوو بەین بەین تووشی دەبێ.

**التَّعنيةُ:** میزو ریخی حوشتر تێكەلاَو دەكرێو حوشتری گروێی پێ چەور دەكرێ ٥ قەبزیەكی ئازاراویە (ناوكۆم) شەرج دەنێشێو مرۆڤەكە حەزی لە گوكردن هەیەو بۆی ناكرێو ناوكۆمی دەچوزێتەوەو تۆزتۆز پیسایی لێ دێتە دەر.

**العانی:** چەوساوەو زەلیل ٥ بەدیل گیراو كۆیلە ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (عودوا المرضى وفكّوا العانی).

**العانیة:** مێینەی (العانی)یە ٥ (ك: عَوَان) ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (أتقوا الله في النساء فانهن عندكم عوان) لەخودا بترسن دەربارەی ئافرەت ئەوان لای ئێوە كۆیلەن ٥ یان وەكوو كۆیلەن.

**العِنا:** ناحیەو تەنیشت ٥ (أعناء السماء)لای ئاسمان.

**ألعِنا:** نەتەوەیەك پێكهاتبێ لەچەند هۆزو تیرەی جیاجیا ٥ (ك: أعناء) ٥ دەگوترێ: (جاءنا أعناء من الناس) كۆمەڵێك خەڵكی تێكەڵ لەتیرەی جیاجیامان هاتنە لا.

**ألعِنایَةُ:** چاودێریو بەڕێوەبردنی خودا بۆ شت.

**العِنوُ:** بەمانا (ألعِنا)دێ.

**ألمَعنی:** مانا، (ك: معانٍ).

**المعانی:** ڕەوشتە جوانەكانی ئامیزاد ٥ دەگوترێ: (فلان حَسَن المعانی) ٥ (علم المعانی) بەشێكە لە زانستی بەلاغەو مەبەست لێی زانینی چۆنیەتی كردنی قسەو وتاردانە بەگوێرەی داخوازی حاڵو مەقام.

**مَعَناةُ الكلام:** مانای كەلام.

**ألمَعنوي:** پێچەوانەی (المادي)یە یان هی (الذاتي)یە.

**عَهِدَ** فلان الى فلان عَهداً: فلانكەس پەیمانو بەڵێنێکی خستە ئەستۆی فلانو داوای لێ کرد بیپارێزێ.
**عَهِدَ** الشَّئَ: شتەکەی ناسی، زانی ٥ دەگوترێ: (الأمر کما عَهِدتَ) کارەکە وەکوو زانیوتە ئاو هایە.
**عَهِدَ** فلاناً: زووزوو چوو بۆلای فلان پەیمانی تازە دەکردەوە.
**عَهِدَ** فلاناً بمکان: لە شوێنێک تووشی فلانکەس بوو.
**عُهِدَ** المکانُ: شوێنەکە بارانی پەلەی لێ درا ٥ بارانی ساڵی تازەی وێ کەوت.
**أعهَدَهُ**: پەیمانی دایە ٥ دەگوترێ: (عاهَدَ الذِمِيَ) بەڵێنی دا بەکابرای ناموسوڵمانی داڵدە دراو یان (ذمي).
**إعتَهَدَهُ**: بەدواداچوونی بۆ کرد لێی گەڕا، زووزوو چوو بۆلایو بەڵێنی تازەکردەوە.
**تعاهدا**: سوێند خۆری یەکتر بوون.
**تعاهَدَ** الشَّئَ: لە شتەکە گەڕاو لێی کۆڵیەوە.
**تَعَهَّد** بالشيء: بەشتەکەوە پابەند بوو.
**تَعَهَّدَ** الشَّئَ: لەشتەکەی کۆڵیەوەو پێوەی خەریک بوو.
**إستَعهَدَ** من صاحبه: بەڵێنی لە هاوەڵەکەی وەرگرت.
**العِهادُ**: بارانی سەرەتای ساڵ.
**العَهدُ**: عیلمو زانست ٥ دەگوترێ: (هو قریب العهد بکذا) ئەو زانیاری تازەیەو شتی زۆری بەسەردا تێنەپەڕیوە ٥ (عَهدی بك مساعداً للضعفاء) زانیاری من دەربارەی تۆ ئەوەیە کە بەڕێزت یارمەتیدەری هەژارو بێنەوایانی ٥ هەروا بەمانا ئامۆژگاریو وەسیەت دێ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا﴾: بەگوێرەی ئامۆژگاریەکانی خودا هەڵسوکەوت بکەن ٥ بەڵێن نامەو پەیمان کە بۆ فەرمانڕەواو پاشاکان دەنووسرێ ٥ سوێندو بەڵێن: دەگوترێ: (علي عهد الله لأفعَلَنَّ کذا) زەمانو ڕۆژگار ٥ دەگوترێ: (کان ذلك علی عهد فلان) ئەوە لە ڕۆژگاری فلانکەسدا بوو ٥ (ك: عهود وعِهاد).
**العهد القدیم**: ئەو ئەسفارو جزمانەی کتێبی پیرۆزن کە لەپێش حەزرەتی مەسیح دا نووسراونەوە.
**العهد الجدید**: ئەو جزمو ئەسفارانەن کەلەدوای حەزرەتی مەسیح نووسراونەوە.
**ولي العهد**: ئەو کەسەی دەستنیشان دەکرێ بۆئەوەی جێنشینی فەرمانڕەوای پێش خۆی بێ.

**العَهِدُ**: ئەو كەسەی بەڵێنی ئەنجامدانی كار دەداو ئیشەكان لەئەستۆ دەگرێ ٥ ئەو كەسەی پەیمان و پلەو پایەی خۆش دەوێن.

**العَهدَةُ**: بارانی دواباران ٥ (ك: عهاد).

**العُهدَةُ**: بەڵێن نامەو قەواڵە ٥ بەرپرسیاریەتی و تاوان ٥ دەگوترێ: (علی فلان عُهدَةُ لا خلاص منها) فلانكەس تاوانێكی لەسەره رزگاربوونی نیە ٥ لەبواری مامەڵەدا بریتییە لە ضەمان و دروستی مامەڵەكەو بێ عەیبی فرۆشراوەكە ٥ زامن بوونی ڕاستی هەواڵە.

**العَهیدُ**: بەڵێن پێدراو پەیمان لەگەڵ بەستراو ٥ قەدیم و كۆنە ساڵ ٥ دەگوترێ: (قریة عهیدة) گوندێكی كۆن و لە مێژینەیە، ڕۆژگارێكی زۆری بەسەردا تێپەڕیوه.

**المُتَعَهِّدُ**: پابەند بوو بە بەڵێن و وادە ٥ كەسێك كارێك لەئەستۆ دەگرێ و خەریكی ئەنجامدانیەتی.

**المُعَاهَدَةُ**: بەڵێن و گرێبەستێكە لەنێوان دووكەس یان دوو تاقم دا ٥ لەبواری یاسای نێودەوڵەتیدا بریتییە لە ڕێكەوتن نامە لەنێوان دوو دەوڵەت یان زیاتردا بۆ ڕێكخستنی پەیوەندییەكانی نێوانیان.

**المَعهَدُ**: شوێنی كۆبوونەوەی خەڵك ٥ شوێنی خوێندن و لێكۆڵینەوە، وەكوو: (معهد الدراسات العلیا).

**عَهَرَ** المرأةَ عَهوراً: زینای لەگەڵ ئافرەتەكە كرد ٥ (فهو عاهر) ٥ (ك: عُهارٌ) (وهي عاهر وعاهرة) ٥ (ك: عاهرات و عواهر).

**عاهَرَها**: بەمانا (عَهَرَها)دێ.

**العَهرُ**: تاوان و بەد ڕەوشتی.

**العِهرُ**: بەمانا (ألعَهرُ)دێ.

**العاهِلُ**: پاشای گەورەو فەرمانڕەوای وڵاتان.

**عَهَنَ** الشّيْءُ عَهناً: شتەكە بەردەوام بوو و چەسپا ٥ دەگوترێ: (مال عاهِنٌ) ماڵێكی بەردەوامە، لەهەموو سەردەمێكدا واریداتی هەیە.

**عَهَنَ**: ئامادە بوو ٥ دەگوترێ: (طعام وشراب عاهن).

**عَهَنَ** في العملِ: دڵسۆزانە كاری كرد.

**عَهَنَ** بالمكان: لەو شوێنە مایەوەو جێگیر بوو.

**عَهَنتِ** النخلةُ: درەختە خورماكە لق و پڕژەكانی وشك بوون.

**عَهَنَ** لە مرادە: مەبەستەكەی بەپەلە بۆهێنایە دی.

**عَهَنَ** القضیب عَهناً وعهوناً: دارەكە دوولا هاتەوە شكایەوە بەبێ ئەوەی دولەت بێ.

**العاهِنُ**: ئامادە ٥ (ك: عواهِن) ٥ دەگوترێ: (ألقى الكلام على عواهِنِهِ) قسەكانی بە ئامادەبوان ڕاگەیاندو بەبێ ئامادەكاری پێش وەخت وتاری بۆدان.

**العِهنُ**: خوری ڕەنگ كراو بەچەند ڕەنگێك ٥ (عِهنة) تیسكە خوری ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾: كێوەكان وەكوو خوری بەشەكراویان لێ دێ ٥ دەگوترێ: (فلان عِهنُ مال) فلانكەس باش ماڵو سامانی خۆی سەروكاریی دەكا.

**عاثَهُ** عن الأمر عَوثاً: لەكارەكە لایداو ژیوانی كردەوە، تاوانی لێ كرد سەرسامو حەیران بوو.

**عَوَّثَهُ** عن الأمر: لەكارەكەی لایداو ژێوانی كردەوە تا گەیاندیە حاڵەتی سەرسام بوون.

**تَعَوَّثَ**: سەرسامو حەیران بوو.

**المَعاثُ**: ڕێبازو مەزهەب.

**عاجَ** عَوجاً: گەڕایەوە.

**عاجَ** عن الأمر: لەكارەكە گەڕایەوەو پشتی لێ هەڵكرد ٥ دەگوترێ: (ما عاجَ بكلام فلان) بەقسەی فلان لەهەڵوێستەكەی نەگەڕایەوە، ﭺ گوێی بەقسەكانی نەدا ٥ (فلان ما يعوجُ عن الشيء) فلانكەس لەشتەكە ناگەڕێتەوە.

**عاجَ** بالمكان وفيه: لەو شوێنە جێگیر بووو مایەوە.

**عاجَ** على المكان: گەڕایەوە بۆ شوێنەكە.

**عاجَ** الشيءَ عَوجاً وعِياجاً: شتەكەی دوولا هێنایەوە خواری كرد ٥ دەگوترێ: (عاجَ رأس البعير بالزمام) بەهۆی هەوسارو لغاوەوە ملی حوشترەكەی خواركردەوە.

**عَوِجَ** العودُ ونحوه عوجاً: دارەكە خوار بوو چەمایەوە.

**عَوِجَ** الأرض: زەویەكە تەخت نەبوو.

**عَوِجَ** الطريق: ڕێگاكە قۆرتو پێچ بوو.

**عَوِجَ** الإنسانُ عِوَجاً: ئادەمیزادەكە ڕەوشتی ناشیرین بوو ٥ ئایینەكەی ناڕاستو دروست بوو ٥ دەشگوترێ: (قول بە عَوِج) قسەیەكە ئامانج ناپێكێ ٥ (قول غير ذي عَوِج) قسەیەكی ڕاستو دروستە بێ عەیبو خەوشە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُرآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ﴾ ٥ (فهو اعوج وهي عوجاء).

**عَوَّجَ** العودَ: دارەكەی چەماندەوە.

**عَوَّجَ** العصا ونحوها: مادەی عاجی لە عەصاكە شەتەك دا.

**عَوَّجَ** فلاناً عن الشيء: فلانكەسی لەشتەكە ژیوان كردەوە ٥ لایدا.

إنعاجَ الشَّيْءُ: شتەکە چەمایەوە، خواربۆوە ٥ دەگوترێ:

إنعاجَ عَليه: بەسەریا چەمایەوە.

تَعَوَّجَ العودُ ونحوه: دارەکە چەمایەوە ٥ داهاتو خوار بۆوە.

تَعَوَّجَ بالمكان وعليه: بۆ شوێنەکە گەڕایەوە، هاتەوە شوێنەکە.

إعوَجَّ الشَّيْءُ: شتەکە چەمایەوە خوار بۆوە.

الأعوجيات: جۆرێکە لەئەسپی ڕەسەن نیسبەت دەدرێن بۆ ئەعوەج ناوێك ٥ جۆرە ئەسپێکی هۆزی بەنی هیلالە.

العاجُ: ددانی فیل.

العَوّاجُ: فرۆشیاری عاج ٥ دروستکاری عاج.

المَعاجُ: ئەو شوێنەی بۆی دەگەڕێتەوەو تێیدا نیشتەجی دەبی.

عادَ اليه وله وعليه عوداً وعودةً: گەڕایەوە، ژیوان بۆوە.

عادَ الرَّجلُ او البعيرُ: پیاوەکە یان حوشترەکە پیر بوو، کەمێك هێزی تێدا مابوو.

عادَ فلان شيخاً: فلانکەس بوو بەپیرە مێرد.

عادَ الشَّيْءَ: جار دواجار هاتەلای شتەکە.

عادَ الشَّيْءُ فلاناً: شتەکە جاردواجار توشی فلان بوو.

عاده الشوقُ أو الحنينُ: شەوقو حەزو ئارەزو بۆی گەڕایەوە، سەر لەنوێ سۆزو خۆشەویستی بۆ هاتەوە.

عادَ الطبيب المريض: پزیشکەکە چووە لای نەخۆشەکە بۆئەوەی چارەسەری بکا.

أعادَهُ: دووبارە هاتەوە بۆلای.

اعاد الشَّيْءَ الى مكانه: شتەکەی گەڕاندەوە بۆ شوێنی خۆی.

عاوده مُعاودةً وعِواداً: دوای واز لێهێنانو دەنگ لێ بڕان گەڕایەوە بۆلای.

عاودته الحمى: لەرزوتاکە بۆی هاتەوە.

عاوده بالمسألة: جاردواجار مەسەلەکەی لێ پرسیار کردەوە.

عاودَ الشَّيْءَ: شتەکەی بۆ پیاوەکە دووبارەو سێ بارە کردەوە تا بۆی بوو بەدابو نەریت.

عَيَّدَ: ئامادەی جەژن بوو ئاهەنگی جەژنی گێڕا.

إعتادَهُ: کردی بەعادەتو دابو نەریتی خۆی.

تَعَوَّدَ الشَّيْءَ: بەشتەکە ڕاهات، کردی بە دابونەریتی خۆی.

إستعادَهُ: داوای لێکرد بگەڕێتەوە.

إستعادَ فلاناً الشَّيْءَ: داوای لێکرد

جارێکی تر ئەو شتەی بۆ دووبارە بکاتەوە.

**الأعـودُ:** بەسودتر ٥ دەگوترێ: (هـذا أعودُ لك).

**العائِـدُ:** ئـەو قـازانج و سـوودەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو کەسـەی هاوبەشە لـە جەمعیـەی تـەعاونی و شتی وادا.

**العائد:** ئەو بڕە پارەیەی ئەنجومەنی شارەوانیەکان و فەرمانگەکانی باج و دەرامـەت سـاڵانە دەیخەنـە سـەر زەوی و زار و خانو و بەرە.

**العائـدة:** یارمـەتی و پیـاوەتی و چاکە لەگەڵ خەڵك ٥ دەگوتری: (ما أکثر عائدة فلان علی قومه) ٥ (ك: عوائد).

**العـادةُ:** داب و نـەریت: هـەر شتێـك ئەوەندە دووبارە بکرێتەوە تا خوی پێوە دەگیرێ و بەبێ ماندوو بوون و وردبوونـــەوە ئـــەنجام دەدرێ ٥ حاڵـەت و وەزعێـك کـە یـەك شێوە دوبـارە دەبێتـەوە ٥ وەکـوو عـادەی مانگانەی ئافرەت.

**العادِيّ:** کۆن و لەمێژ ٥ دەگوتـرێ: (مجد عــاديّ) مەجـدو رەسـەنایەتیەکی کۆن و لـە مێژینەیـە ٥ (بئـر عاديـة): بـیرە ئاوێـکی کۆنـە دەڵێـی بـیری زەمـانی گـەلی عـادە ٥ کاروبارێـك بووبێتە عادەت و خوی پێوە گیرابێ.

**عَـوَادِ:** ئیـسمول فیعلـە مانـای ئـەمر دەگەیەنێ.

**العَوادُ:** چاکەو پیاوەتی کـردن لەگـەل خەڵـك ٥ دەگـوترێ: (عُـد فـان لـك عنـدنا عـواداً حـسناً) بگـەڕێرەوە بۆلامان تۆ پیاوەتیـت بەسـەرمانەوە هەیە دەمانەوێ چاکەت بدەینەوە.

**العَودُ:** دەگوترێ: (رجَعَ عَوداً علی بدء) ٥ (ورجَعَ عوده علی بدئه) واتە: چوو گەڕایـەوە لـەوێ نەوەسـتا ٥ هـەروا دەگوتـرێ: (لـك العـودُ) بـۆت هەیـە بگەڕێیتـەوە لەکارەکـە پەشـیمان ببیتەوە ٥ دەشگوترێ: (العودُ أحمَدُ) پەشـیمان بوونـەوە لـەو کـارە لـەکردنی باشـترە ٥ هـەروا وشـەی (ألعودُ) ناوە بۆ حوشتر و مەڕی پیر و بەساڵا چوو؛ کەهەندی گوڕو تینیان تێدا مابێ ٥ ڕێگای کۆنی ئاسایی ٥

**العُودُ:** دار، باریك بێ یان ئەستور، تەڕ بـێ یـان وشـك ٥ جۆرێـکە لـەبۆنی خـۆش ٥ واتـە: (دار عـود) ٥ ئامێرێـکی مۆسـیقایە ژێـی پێـدا ڕایـەڵ کـراون بـە پەنجـە یـان بەریشەیەك لێی دەدرێ و دەنگی لێ دێ ٥ (ك: أعواد وعیدان).

**العَـوَّادُ:** ئـەو کەسـەی ئـامێر دروست

دەكا ٥ ئەو كەسەی عود لێ دەدا.

**ألعِيادة**: شوێنی تایبەتی پزیشك بۆ پشكنینی نەخۆش.

**ألعيدُ**: خەمو خەفەتی گەڕاوەو تازە بووە ٥ یان سۆزو عیشقی تازەبووە ٥ ڕۆژی جەژن هەر جەژنێك بێ.

**ألمَعادُ**: ڕۆژی قیامەتو گەڕانەوە بۆلای خودا.

**ألمَعادَةُ**: یادەوەری ڕوداوێكی ناخۆشو تازیە بۆ گرتنی.

**ألمُعَاوَدة**: پەیدا بوونەوەی دیاردەی نەخۆشی سەرلەنوێ دوای ئەوەی كە ماوەیەك ئاسەواری نەمابوو.

**ألمُعيدُ**: لێزانو خاوەن ئەزمون ٥ ئەو قوتابیە زیرەكەی سەر لەنوێ دەرس بۆ هاوەڵەكانی شی دەكاتەوەو ئەوی مامۆستاكەیان بۆی شەرح كردوونو تێی نەگەیشتون ئەم بۆیان رون دەكاتەوە ٥ كەسێك پلەیەكی زانستیو فێركاری لەزانكۆ وەردەگرێ پێش ئەوەی ببێتە مامۆستاو دەرس بڵێتەوە.

**عاذَ** به عَوذاً وعياذاً: پەنای بۆ برد، خۆی خستە پەنای بۆ ئەوەی بپارێزرێ ٥ وەكوو دەڵێین: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگرم بەخودا لە شەڕو نەگبەتی شەیتانی نەفرین لێ كراو.

**عاذت الناقة**: حوشترەكە تازە بێچوی بووە ٥ (ك: عُوذٌ وعوذان).

**أعــاذَهُ الله**: خـودا پاراسـتی، خـودا بیپارێزێ.

**عَـوَّذَهُ**: بـەمانا (اعـاذه)ی ٥ نوشـتەو دوعای پێدا كرد.

**تعاوذ القـوم في الحـرب**: خەڵكەكە لە شـەڕدا خۆیـان خـستە پـەنای یـەكترىو یـەكتریان كـرد بـە پارێزەری یەكتری.

**تَعَوَّذَ بـه**: پـەنای بـۆ بـرد ٥ دەگـوترێ: (تعوَّذ بالله).

**إســتعاذ بـــه**: بـــەمانا (تَعَـــوَّذ)ی ٥ دەگوترێ: (إستعاذ بالله).

**ألعوائِـذ**: چـوار ئەسـتێرەن بەشـێوەی چوارگۆشـەیەكی نارێـك، لـە ناویـان ئەستێرەیەك هەیە پێی دەگوترێ: (الرُّبَع).

**ألعَوذُ**: پەناگا ٥ دەگوترێ: (فلان عـوذ لبني فلان) ٥ دەشگوترێ: (عـوذ بـالله منـك) واتـە: پـەنا دەگـرم بـەخودا لەشەڕی تۆ.

**ألعُوذَةُ**: نوشتەو دوعا ٥ كەبەنەخۆشو منداڵدا دەكرێ.

**ألعُـــوَّذُ**: گـــژوگیا كەلـــەبنی داری چـــقڵاویدا دەڕوێ ٥ یـــان لـــەلای بنـــەدرەختی تـــردا دەڕوێ ٥ یـــان لـــەژێر بـــەردو شـــتی وادا دەڕوێ.

**العِيـاذُ**: پەناگە، پەناگرتن بەهێزێك لەترسی شتێكی تر ، وەكوو دەگوترێ: (العِيـاذُ بـالله منـه) پـەنادەگرم بـەخودا لەشـەڕو نەگبەتی ئەو.

**ألمَعاذُ**: دەگوترێ: (معاذ الله ومعاذ وجه الله) واتە: پەنادەگرم بەخودا.

**ألمَعـاذَةُ**: نوشتەو جادو ، دەشگوترێ: (معاذة الله).

**ألمعوذتان**: دوو سورەتی كۆتایی قورئان.

**عَارَ** الإنسان وغيره عَوراً: ئادەمیزاد یان حەیوانەكەی كوێركرد.

**عَارَ** الشَّيْءَ: شتەكەی لەناوبرد.

**عَوِرَت** عينه عَـوَراً: چاوی كوێر بوون چاوی لەدەستدان ، بینایيان نـەما ، دەگوترێ: (عَـوِرَ الرجـلُ) پیاوەكـە چاوێكی لەدەست دا ، (فهـو أعـور وهي عوراء).

**أعـوَرَ** الـشَّيْءُ: شـتەكە دەركـەوت ، دەگـوترێ: (اعـوَرَ لـك الـصَّيدُ) نێچیرەكەت لێ دەركەوت.

**أعـوَرَ** الرجـلُ والمـرأةُ: ژنو پیاوەكـە شەرمگایان دەركەوت.

**أعـوَرَ** منـزلُ فـلان: مـەنزڵی فلاّنكـەس كەلێنێكی تێدا پەیدا بوو ترسی ئەوەی لێ دەكرێ دوژمن لێوەی بێتە ژوور.

**اعـوَرَ** الفـارسُ: جـەنگاوەرە سـوارەكە هەلی لێدانی بۆ هەڵكەوت.

**اعـوَرَ** فلانـاً: چاوێكی فلاّنكەسـی كوێركرد.

**اعـاره** الـشَّيْءَ اعـارةً: بـە ئەمانـەت شتەكەی دایە.

**عـاوره** الـشَّيْءَ: بەئەمانـەت شـتەكەی پێدا.

**عاوَرَ** فلاناً الـشَّيْءَ: ئـەوەی لەگـەڵ كـرد كە لەگەل هەواڵەی كردی.

**عاوَرَ** الشمسَ: چاودێری خۆری كرد.

**عَوَّرَهُ**: كوێری كرد.

**عَـوَّرَ** فلانـاً عـن الأمـر: فلاّنكەسـی لەكارەكە گێڕایەوە.

**عَوَّر** عليه أمرَهُ: كارەكـەی لـەلا ناشیرین كرد.

**إعتَـوروا** الـشَّيْءَ: شـتەكەیان لـەناو خۆیاندا هێناو برد.

**تعاوروا** الشَّيْءَ: بەمانا (إعتوره) دێ.

**تعـاورت** الريـاحُ رسـمَ الـدار: رەشـەبا لەهەموو لایەكەوە لەخانوەكەی داو هـەرجارە لەلایەكـەوە شتێـكی لێ كردۆتەوە.

**تَعَوَّرَ** الكتابُ: كتێبەكە ڕزی.

**تَعَـوَّر** القـومُ الـشَّيْءَ: خەڵـكەكە لـەناو خۆيانـدا شـتەكەیان هێنـاو بـرد ، هەركەسـەيان تاوێـك گرتیـە لای خۆی.

**تَعَوَّرَ فلان العاريـة:** فلانكـەس داوای ئەمانەتەكـەی كـردووە لـەو كەسـەی شتەكەی بەئەمانەت وەرگرتبوو.

**إعوارّتِ العَينُ:** چاوەكە كوێر بـوو ٥ دەشگوترێ: (إعورّ فلان).

**إسْتعَارَ الـشَّئ منـه:** داوای لێـكرد شتەكەی بەئەمانەت بداتێ.

**الإستعارة:** لە بـواری عیلمـی (بـەیان)دا بـەكارهێنانی وشـەیەكە لەشـوێنی وشـەیەكی تـر لەبـەر هـەبوونی پەیوەندییـەك لەنێوانیانـدا لەگـەڵ هەبوونی قەرینەیەك كە چۆنیەتی بەكارهێنانەكە دەگەیـەنێ ٥ وەكـوو بـەكارهێنانی وشـەی (الأسـد) لـە شـوێنی وشـەی (الـشجاع)....هتـد ٥ هەروا وشەی (الإستعارة) بریتیـە لـە خواسـتنی كتێبێـك لـە كتێبخانـە گشتیەكان ٥ ئەو وەرەقەیەی داواكار ناوی خـۆی لەسـەر دەنوسـێو واژوی دەكـا بـەو وەرەقەیـەش دەگـوترێ (الإستعارة).

**الأعوَرُ:** ئەو كەسەی چاوێكی كوێر بێ ٥ هەرشتێـك خـراپ بێ ٥ چاوساغو شـارەزای خـراپ ٥ كەسێـك بـرای باوكیو دایكی نـەبێ ٥ كتێبـی رزیـو وكۆن ٥ قەلە رەش ٥ بەشی یەكەمی ریخۆڵە ئەستوورە.

**العـائِرُ:** هەرشتێـك چاو ئـازار بـدا ٥ تیری لابەلاو بێ مەبەست هاوێـژراو كـە هاوێژەرەكـەی نـەزانێ لـەكوێ دەدرێ ٥ دەگـوترێ: (أصـابه سـهم عـائر) گوللـەی وێـڵ لێیـدا ٥ هەنكاوتی.

**العائِرَةُ:** زۆرو زەبەند ٥ دەگوترێ: (لـه مـن المـال عـائرة عيـنين) مـاڵو سامانێـكی زۆرو زەبەنـدی هەیـە ٥ ئەوەندە زۆرە چاو تێـرو پـڕ دەكا ٥ چاوی پڕو پوشاوی ٥ (ك: عوائر).

**العـوائر مـن الجـراد:** كۆمەڵە كوللـەی جیاجیا.

**العَارَةُ:** ئـەوەی دەیـدەی بەكەسانی تـر بەمەرجی بیگێڕێتەوە ٥ دەگوترێ: (كل عارة مستردة).

**العارِيَـةُ:** بـەمانا (العـارةُ)دێ ٥ (ك: عوار).

**العارِيَّـةُ:** بـەمانا (العـارة)دێ ٥ (ك: عواري).

**العُوارُ:** عەیبو خەوش ٥ كونو دڕاوی كراس.

**العَوَرُ:** عەیبو ناشیرین.

**العَـوِرُ:** رابـردو پـیس ٥ شـتی بـێ چاودێرو خراپ.

**العَوراءُ:** خۆڵ ٥ وشەی ناشیرین كرداری بەد.

**العَـورَةُ:** عـەیبو خەلـەل، كـونو كەلەبـەری شـت ٥ هـەر خـانو و

شوێنێــك ترسـی ئـەوەی لێ بكـرێ دوژمــن لێیـــەوە فرســەت بێنــێ ٥ قورئــان دەفــەرموێ: ﴿يَقُولُــونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيـدُونَ إِلَّا فِـرَارًا﴾ ٥ شەرمگای ئادەمیزاد ٥ هەرشوێنێـكی جەسـتەی ئـادەمیزاد پێی ناخۆش بێ ببینرێ.

**العُـوّارُ**: پوشـكەو چـقڵو پـرژو پـاڵ لەچــاودا ٥ زەعیـــفـو ترســنۆكو خۆڕانـــەگر لەمەیـــدانی شـــەڕدا ٥ كەسێـك شارەزای ڕێـگا نـەبێ ٥ (ك: عواوير).

**اْلمُعَارُ**: ئەسپی قەد باریك.

**اْلمُعوِرُ**: شوێنی ترسناك ٥ پیاوی ڕابردو پیس ٥ شتی فڕێدراو وبێ خـاوەنو چــاودێر ٥ ئەسپێــك مـوی كلكـی هەڵكەندرابێ.

**عــازه الـشّيئُ**: شـتەكەی پێویسـت بـوو دەستی نەكەوت.

**عَــوِرَ الـشّيئُ عَـوَراً**: شـتەكە دەگمـەن بـوو دەسـتی نەكـەوتو زۆریـشی پێویـست بوو.

**عَوِرَ الرجلُ**: پیاوەكە ئاتاج بـوو، كاروبـاری شێوا (فهـو أعـوز وهـي عـوزاء) ٥ (ك: عوز) ٥

**عَـوِزَ الأمـرُ**: كارەكـە قـورسو گـران بـوو كەوتە حاڵەتی چورتمو تەنگانەوە.

**أعَوَزَ الشَّيئُ**: شتەكە ناوازە بـوو دەست نەكەوت.

**اعوَزَ الرجلُ**: پیاوەكە هەژار كەوت.

**أعوَزَ الشَّيئُ فلاناً**: شتەكە لای فلان كەم بوو زۆریشی پێویستە.

**أعـوَزَ الـدهرُ فلانـاً**: ڕۆژگـار فلانكەسـی هەژاركرد.

**أعــوَزَ المطلــوب فلانـــاً**: پێویــستیاتە گرنگــەكان فلانكــسی لەپـــەلوپۆ خست.

**إعوَزٌ فلاناً**: بەمانا (عَوِزَ)دێ.

**العَوزُ**: بۆڵەترێ.

**اْلعَــوَزُ**: پێویـستی گـرنگ كـە دابـین نەكرێ.

**اْلمِعـوَزُ**: كراسـی زیـو ٥ پەڕۆیەكـە لـە منـــداڵی ســـاواوە ببێـــچرێ ٥ (ك: مَعَاوِز).

**المِعــوَزَةُ**: بــەمانا (اْلمِعــوَزُ) دێ ٥ هــەر پۆشاكێـــك پۆشاكێــــكی تـــری داپۆشیبێ ٥ (ك: مَعاوِز و مَعاوزة).

**عاسَ عَوساً و عَوَساناً**: بەشـەو سوڕایەوەو پارێزگاری كرد ٥ (فهو عائس وعَوّاسٌ).

**عــاسَ علــی عیالــه عَوســاً**: مانـدوو بـوو تێـــكۆشا بـــۆ دەســـتەبەركردنی پێداویستی ماڵو منداڵەكانی.

**عاسَ ماله عَوساً وعِياسَةً**: بەڕێـكو پێـكی كاروباری ماڵو سامانی بەڕێوە برد.

**عَوِسَ** عَوساً: لەكاتی پێكەنین و كاتی تریشدا لاشەویلەی چونە ناوەوە ○ (فهو أعوس وهي عَوساء).
**العُواسَةُ**: ماستاو یان شەربەتی میوەو شتی تر.
**العَوسَجُ**: بڕوانە (عَسَجَ).
**عاصَ** الأمر عَوصاً: كارەكە چەواشە بوو خوارو خێچ و گران و ناخۆش بوو.
**عـاصَ** الكـلامُ: كەلامەكە مانای نادیارو چەواشە بوو ○ (فهو أعوص وهي عوصاء).
**اعوَصَ** بخصمه وعلیه: كارەكەی لەسەر دژو ڕكابەرەكەی توندو تۆڵ كرد.
**أعوَصَ** فلان في كلامه: فلانكەس قسەی قوڵ و پڕمانای هێنان.
**عَوَّصَ** فلانٌ: فلانكەس بەردەوام نەبوو لەسەر قسەو كرداری هەردەمە قسەیەك و هەركاتە كارێكی بەلاوە پەسەند بوو ○ فلانكەس وتارێكی پڕمانای دا، ڕستەی مانا قول و پڕ حیكمەتی ناڕاستەی گوێگرەكانی كرد.
**إعتاصَ** علیه الأمرُ: بەمانا (عاصَ) دێ.
**إعتاصَ** في الكلام: بەمانا (عاصَ في الكلام) دێ.
**العَوصاءُ**: تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشی و هەژاری ○ دەگوترێ: (أصابتهم العَوصاءُ) هەژاری و چورتم توشیان بوو ○ ناڕەحەتی كردن ○ وشەی غەریب و نامۆ لەزمانی عەرەبی دا.
**عاضَهُ** بكذا وعنه ومنه عوضاً: لەجیاتی ئەوەی لەكیسی چوبوو بارتەقای پێدا ○ (فهو عائض).
**اعاضَهُ** منه: بەمانا (عاضه منه)دێ.
**عاوَضَهُ**: بەمانا (اعاضَهُ)دێ ○ دەگوترێ: (عاوَضَ فلاناً بِعَوضٍ في البیع والآخذ والعطاء).
**عَوَّضَهُ** منه: بەمانا (أعاضَهُ) دێ ○ دەگوترێ: (عَوَّضهُ من هبته خیراً).
**إعتاضَ** منه: بارتەقای لێ وەرگرت.
**إعتاضَ** فلاناً: داوای بارتەقای لە فلان كرد.
**تعاوَضَ** القومُ: خەڵكەكە وەزع و حاڵیان باش بوو دوای ئەوەی لەوەو پێش وەزع و حاڵیان خراپ بوو.
**تَعَوَّضَ** منه: بارتەقای لێ وەرگرت.
**تَعَوَّضَ** فلاناً: داوای بارتەقای لەفلان كرد.
**إستَعاضَهُ** ومنه: داوای بارتەقای لێ كرد.
**عَوضُ**: زەرفی زەمانی داهاتووە.
**العِوَضُ**: بارتەقاو جێنشین (ك: أعواض).
**المُعَوَّضَةُ**: بەمانا (العِوَضُ)دێ.
**عاطَت** العُنقُ عَوطاً: ملی درێژ بوو

بەشێوەیەکی زۆر ڕێك ٥ دەگوترێ: (عاطت المرأة والناقة) ئافرەتەکە یان حوشترەکە هەرچەند نەزۆك نەبوو بەڵام چەند ساڵێك تێپەڕی ئاوس نەبوو ٥ (ك: عُطٌ وعَوَائِطٌ).

**إعتاطت** المرأة والناقة: ئافرەتەکە یان حوشترەکە بەبێ ئەوەی نەزۆك بن چەند ساڵێك سکیان پڕ نەبوو بێچویان لەزکی نەکەوت.

**عاف** الطائر عَوفاً: باڵندەکە بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە ویستی هەڵ بقۆزێتەوە پەلاماری بدا ٥ دەگوترێ: (عاف الذّبابُ على القَذَر) مێشەکە بەسەر پیسایییەکەدا سوڕایەوە (فهو عائف).

**العُوّافُ**: ئەوەی ئادەمیزاد یان حەیوان بەشەو فرسەتی لێ دەبینێ‌و نێچیری دەکا.

**العُوّافَةُ**: بەمانا (العُوّافُ)دێ.

**ألعُوفُ**: حاڵ‌و چۆنیەتی ٥ دەگوترێ: (نَعِمَ عَوفُه): حاڵ‌و وەزعی خۆش‌و بێ جورتم بوو.

**عاقَهُ** عن الشَّيء عَوقاً: مەنعی کرد لەشتەکەو نەیهێشت دەستی بیگاتێ ٥ (فهو عائق) ٥ (ك: عُوّقٌ) بۆ عاقڵ ٥ بۆ بێ عەقڵ (ك: عوائق).

**عوائق** الدهر: ڕوداو وەمەشغەڵەتی ڕۆژگار.

**عَوَّقَه** عن كذا: لەو شتە مەنعی کرد.

**إعتاقَهُ**: مەنعی کرد، مەشغوڵی کرد، لەیادی بردەوە.

**تَعَوَّقَ**: تەمبەڵی‌و قونگرانی کردو ئەرکی سەرشانی ئەنجام نەدا.

**تَعَوَّقَ** فلاناً: فلانی مەنع کردو لەمپەری لەبەردەم دانا.

**عاق عاقِ**: لاسایی کردنەوەی دەنگی قەلەڕەشە.

**العائق**: هەرشتێك ببێتە لەمپەرو بەربەست لەبەردەم بڵاوبوونەوەی تۆم‌و ڕەگ‌و ڕیشاڵی ڕوەك‌و درەخت‌و پەڵ‌و پۆیان لەڕوی هۆکارە حەیەوی‌و سروشتیەکان ٥ ڕوەکێکە لە پێری (الشقيقية)یە گوڵەکانی جوان‌و ڕەنگاو ڕەنگن‌و سپی‌و سورو شینن.

**العُواقُ**: دەنگێك کە لەگەدەی وڵاخ دێتە دەر لەکاتی ڕۆیشتندا.

**العَوقُ**: لەمپەر ٥ کاری مەشغوڵکەر ٥ هەرشتێك خێرو بێری نەبێ ٥ لێژی‌و تەلانی شیو و دۆڵ ٥ (ك: أعواق).

**العَوِقُ**: بەمانا (العائِق)دێ ٥ ترسنۆك ٥ کەسێك یان شتێك هەمیشە لەمپەر هەبێ لەبەردەم پێویستیەکانیان.

**العِوَقُ**: بەمانا (ألعَوِق)دێ.

**العَوَقَةُ**: ئەو كەسەی ببێتە لەمپەر لەبەردەم خێرو خۆشی ئادەمیزاد.

**العُوَقَةُ**: بۆ موبالەغە لەماناى (العائق)دێ.

**العَيوقُ**: ئەستێرەیەكی سوورە ڕوناكی هەیە لە كەنارێكی مەجەرە (الأيمن) لەدوا ئەستێرەی سیوەیلەو لێی پێش ناكەوێ ٥ پێش ئەستێرەی (جەوزا)هەڵدێ.

**يَعُوقُ**: ناوی بتێكە لەسەردەمی نەزانیدا عەرەبەكان دەیان پەرست.

**عالَ** الميزانُ: تەرازووەكە هەردوولای هاوتا نەبوون ٥ سەنگو سوكی هەبوو ٥ لایەكی لە لایەكی بەرزتر بوو.

**عال** فلان في الميزان: فلانكەس تەرازو بازی كرد، لە كێشاندا خیانەتی كرد.

**عالَ** السَّهمُ: تیرەكە نیشانەی نەپێكاو لایدا

**عال** الحكمُ: دادوەرەكە ستەمی كرد.

**عالَ** أمرُ القوم: كاری گەلو نەتەوە ئەستەم بوو چورتمو لەمپەری تێدا پەیدا بوون.

**عالت** الأنصباءُ: بەشە میراتیەكان عەولیان تێدا پەیدا بوو.

**عالَ** الرجلُ عيالَه: پیاوەكە پێداویستی ماڵو منداڵەكەی دابین كرد.

**عالَ** الأمرُ فلاناً: كارەكە لەسەر فلانكەس زۆر قورس بوو.

**عِيلَ** صَبرُه: ئارامی نەما، ئارامی لێ هەڵگیرا.

**أعالَ** الرجلُ: پیاوەكە ماڵو منداڵی زۆر بوو، باری شانیان گران كرد ٥ دەنگی گریانی لێ بەرز بۆوە ٥ هاواری لێ هەڵسا.

**عَوَّلَ** الرجلُ: پیاوەكە چادری هەڵدا كەپری كرد ٥ دەنگی گریانو هاواری لێ بەرز بۆوە.

**عَوَّلَ** عَليه: پشتی پێ بەست ٥ داوای یارمەتی لێ كرد ٥

**عَوَّلَ** على السُّفر: خۆی بۆ سەفەركردن ڕاهێنا ٥ وای كرد فێری سەفەركردن بێ.

**العائِلُ**: ڕوەكێكە ڕوەكێكی تری مشەخۆری (طوفيل) بژێوی لێ وەربگرێ ٥ وەكوو ڕوەكی (فول) كە ڕوەكی (هالوك) لە ڕەگەكانی بژێوی وەردەگرێ.

**العائلة**: خێزان؛ كۆمەڵێك ئادەمیزاد كە خانو بەرەیەك كۆیان بكاتەوەو پێكهاتبێ لە دایكو باوكو كوڕو كچو خزم.

**العالَةُ**: شتێكە، كەپرێكە وەكوو چادر وایە لەدار دروست دەكرێ بۆ خۆپاراستن لەبارانو شتی وا.

**العَوْلُ**: ئەو كەسەی داوای یارمەتی لێ دەكرێ (جۆرو هۆكاری یارمەتیدانەكەی) ٥ بژێوی خاو وخێزان ٥ بەرزكردنەوەی دەنگی گریانو هاوار ٥ لەبواری میراتدا زیاد بوونی خاوەن بەشەكان لەبەشەكان ئەو كاتە نرخی بەشەكان كەم دەكرێتەوەو ژمارەیان زیاد دەكرێ بۆئەوەی بەسەر میراتگرەكاندا بتوانرێ دابەش بكرێن.

**العِوَلُ**: پشت بەستنو داوای كۆمەكی ٥ كۆڵەكەو پشتو پەنا ٥ دەگوترێ: (فلان عِوَلي من الناس) فلانكەس پشتو پەناو یارمەتیدەرمە لەخەڵكی خراپ دەمپارێزێ.

**العَوْلَةُ**: بەرزكردنەوەی دەنگی هاوارو گریان ٥ خواردنەوەی خەمو خەفەتو خۆشەویستی بەبێ هاوارو دەنگ هەڵبرین ٥ (ك: عِوَل).

**العَوِیلُ**: بەمانا (العَوْلَةُ)دێ.

**العَیِّلُ**: خاو و خێزانی ماڵێكو پیاوێك كە پیاوەكە بەخێویان دەكا ٥ (ك: عِیال وعَیائِل) ٥ دەشگوترێ: (هو عیال علی غیره) ئەو بارە بەسەر خەڵكەوەو بۆخۆی سەربەخۆ نیە.

**المِعوَلُ**: قوڵینگ، پاچی دووسەر ٥ (ك: معاوِل).

**عامَ في الماء عَوماً**: مەلەی كرد لەناو ئاودا ٥ دەگوترێ: (عامت السفینة في البحر): كەشتیەكە بەناو ئاودا ڕۆیی.

**عامت الإبل في البیداء**: حوشتر بەناو سارادا ڕۆیی.

**عامت النجومُ**: ئەستێرە بەناو ئاسماندا ڕۆیی.

**عام الفرسُ**: ئەسپەكە بەهێواشی ڕۆیی دەتگوت لەدەریادا مەلە دەكا.

**أعـوَمَ**: ساڵێكی بەسەردا تێپەڕی ٥ كەوتە سەرەتای ساڵەوە.

**عاومت النخلة**: دارخورماكە ساڵێك بەری گرتو ساڵێك بێ بەر بوو.

**عاوم فلاناً معاومةً وعَواماً**: بەساڵ مامەڵەی كرد.

**عَوَّمَ الكرمُ**: مێوەكە ساڵێك بەری زۆر بوو ساڵێكیش بەری كەم بوو.

**عَوَّمَ فلان**: فلانكەس سواڵە دوراوەكانی خستنە سەر یەكو كردنی بەشاراو گەڵێشە.

**عَوَّمت النّخلة**: دارخورماكە ساڵێك بەری گرتو ساڵێك بێ بەر بوو.

**عَوَّمَ السفینةَ**: كەشتیەكەی خستە ناو دەریاوەو بەناو ئاودا لێی خوڕی.

**العامُ**: ساڵ ٥ (ك: أعوام).

**العامـةُ**: سواڵە دوراوەی گەنموجۆ كە

کۆدەکرێنەوەو دەخرێنە سەر یەكو دەبن بە شاراو گەڵیشە ٥ پردو مەعبەری پچوك بەسەر روباری پچوك ٥ (ك: عام وعَوَّم).

**العُومَة**: خونفوسای پچکۆلەی ناو ئاو کە مەلە دەکەن.

**العَوّامُ**: مەلەوان ٥ ئەسپێك لە رۆشتندا وابڕوا وەکوو مەلە بکا وابێ.

**العَوّامَةُ**: خانوە دارینەیەك لەسەر ئاو ٥ یان قەبارەیەکی مەعدەنی خڕو ناو کلۆر کە سەرئاو دەکەوێ.

**عَومَّ القومُ**: بڕوانە: (عمر).

**عانت المرأة عَوناً**: ئافرەتەکە تەمەنی مام ناوەندیە.

**عانت البَقَرَةُ عؤوناً**: مانگاکە تەمەنی مام ناوەندییە.

**اعانَهُ على الشَّيء**: یارمەتی دا.

**عاونه معاونةً**: یارمەتی دا.

**عَوَّنت المرأة والبقرة**: ئافرەتەکە یان مانگاکە تەمەنی مام ناوەندی بوو.

**عوَّن فلاناً**: یارمەتی فلانکەسی دا.

**تعاون القومُ**: هەندی لە خەڵکەکە یارمەتی هەندێکی تریان دا.

**إستعان فلان فلاناً**: فلانکەس داوای یارمەتی لە فلانکەس کرد.

**التعاون**: لەبواری ئابوریدا ڕێبازێکی ئابورییە شیعارەکەی ئەوەیە: دەڵێ کۆمەڵ لەخزمەتی تاکدا بێ تاك لە خزمەتی کۆمەڵدا بێ ٥ دیاردەکەشی پێکەوەنانی جەمعیەی هاوبەش بۆ بەرژەوەندی ئەندامانی جەمعیەکەو وەلاتانی ناوەندو دەڵاڵ.

**العَانَةُ**: جەڵەبە حەیوان، یان ڕەوە کەرەکێوی ٥ تووکی بەر.

**العَوانُ**: مام ناوەندیی لەتەمەندا نەزۆر گەنجو نەزۆر پیر ٥ بەزۆری بۆ ئافرەتو بۆ مانگا بەکاردەهێندرێ ٥ دەشگوترێ: (حَربٌ عوان) شەڕێك بوو یەك لەدوای یەك خەڵکی تێدا کوژرا.

**العَونُ**: یارمەتیدەرو پارێزەر لەهەموو شتێك ٥ (ك: أعوان).

**المتعاونة**: ئافرەتی بەتەمەنی قەڵەو ٥ پیرە ژنی قەڵەو.

**المعانة**: بەمانا (العونُ)دێ.

**المعاون**: یارمەتیدەر.

**المِعوان**: کەسێك زۆر یارمەتی خەڵك بدا ٥ (ك: معاوي).

**المَعُونُ**: بەمانا (العُونُ)دێ.

**المعونَةُ**: بەمانا (العَونُ)دێ ٥ یارمەتی ٥ دەگوترێ: (لاتبخلوا بمعونتكم) چرۆکی بەیارمەتی خۆتانمان لەگەڵ مەکەن.

**عاهَ** الزرعُ والماشية عَوهاً: کشتوکاڵەکە یان ئاژەڵەکە نەخۆشی تێدا بڵاو بووە ٥ (فهو عائِهٌ).

**أعاهَ** الزرعُ والماشية: بەمانا (عاهَ) دێ.

**أعاهَ** الرجلُ: پیاوەکە نەخۆشی کەوتە کشتوکاڵەکەی یان ئاژەڵەکانیەوە.

**عَوَّهَ** الزرعُ والماشية: بەمانا (أعاهَ)دێ.

**العاهَةُ**: نەخۆشیو ئافات کە توشی کشتوکاڵو ئاژەڵ دەبێ ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (لا یوردنَّ ذو عاهة علی مصحّ) با ئاژەڵی نەخۆش نەبرێتە لای ساغ.

**عَوَى** الكلبُ و إبن آوى والذئبُ عُواءً: سەگو چەقەڵو گورگ لوتی خوارکردەوەو لوڕاندی.

**عَوَى** القومَ: خەڵکەکەی بانگێشی فیتنەو ئاشوب کرد.

**عَوَى** الشَّيْءَ: شتەکەی خوارکردەوە، چەماندیەوە ٥ دەگوترێ: (عَوَى الحَبلَ): حەبلەکەی دوولاکردەوە هەڵیوێزنی ٥ (عَوَى الشعرَ): قژەکانی هەڵپێچان ٥ (عَوَى الكمانَ): کەوانەکەی داهێنا.

**عَوَى** من فلان: داکۆکی لە فلان کردو بوختان بۆ هەڵبەستەکەی بەدرۆ خستەوە.

**عاواهم**: هەرای لێ کردن، دەنگی دان، بەسەریاندا نەڕاندی.

**عَوَى** عن الرجل: لە جیاتی پیاوە غەیبەتکراوەکە کابرای قسە هەڵبەستی بەدرۆ خستەوەو رەتی دایەوە.

**عَوَى** الشَّيْءَ: شتەکەی خوارکردەوەو چەماندی.

**إعتوى** الكلبُ ونحوه: سەگو چەقەڵو شتی وا لوتیان لەحەوا کردو لوڕاندیان.

**إعتوى** الشَّيْءَ: شتەکەی داهێناو چەماندیەوە.

**إنعوى** الشَّيْءُ: شتەکە خوار بۆوە چەمایەوە.

**تعاوت** الكلابُ: سەگەکان لوڕاندیان، وەڕین.

**تعاوى** بنو فلان على فلان: خێڵی فلان گەلە کۆمەکیان لەفلان کرد.

**إستعواهم**: داوای یارمەتیو بەهاناوە هاتنی لێ کردن ٥ بانگی کردن بۆ ئاژاوەو فیتنە.

**إستعوى** الكلاب ونحوه: سەگەکانی هەڵنان بۆ لوڕاندنو وەڕین.

**إستعوى** فلاناً: داوای لە فلان کرد حەبلەکە هەڵوێزنێ ٥ قژەکان خڕ هەڵداو لولیان بکا.

**العَواءُ**: مەنزڵێکە لە مەنزڵەکانی مانگ.

**العَوِيُّ**: گورگ.

**العَوَّةُ**: دەنگو هەراو هۆریا ٥ کەڵەکە بەردی بچوك دەخرێنە سەر یەك بۆ نیشانەی ڕێگاو لە نزیك ڕێگای کوێرە ڕێی ناو دۆڵو کەژو سارا دروست دەکرێن بۆ ئەوەی ڕێبوارەکان شارەزای ئەو جۆرە ڕێگایانەبنو پێیدا بڕۆن.

**المُعاوِیة**: دێڵە سەگ کە داوای گۆڵە سەگ بکا ٥ بێچوە ڕێوی ٥ توتەڵە سەگ.

**عَابَ** الشّیْئُ عَیباً وعاباً: شتەکە عەیبدار بوو.

**عابَ** الشّیئَ: شتەکەی عەیبدار کرد.

**عابَ** فلاناً: فلانکەسی بە عەیبدارو عەیب خواز دانا.

**عَیَّبَهُ**: عەیبداری کرد ٥ نیسبەتی بۆلای عەیب دا.

**عَیَّبَ العَیبَةَ**: قەرتاڵەو سەوی و بەچنەی دروستکرد.

**تَعَیَّبَهُ**: عەیبداری کرد.

**العَابُ**: لەککەو خاڵی ناشیرین.

**العِیابُ**: ئامێری هەلاج کە لۆکەو شتی وا شی دەکاتەوە.

**العَیبُ**: لەککە ٥ (ك: عُیُوب).

**العَیبَةُ**: بەمانا (العَیبُ)دێ ٥ قەرتاڵە، پوشە خورما، صندوق کە لە لقی دارخورما دروست دەکرێن بۆئەوەی میوەی تێدا بگوێزرێتەوە بۆسەر مشتاخو خەرمان ٥ زەرفێکە لە پێست دروست دەکرێ (هەمبانە) شتی پێداویستی سەفەری تێ دەکرێ.

**عَیابُ الوُدّ**: سنگو دڵو دەروون ٥ دەگوترێ: (کادت عیاب الود تصفَرُ) خەریك بوو دڵو دەروونی خۆشەویستیی تێدا نەمێنێ ٥ کەسێك شوێنی نهێنی کەسێکی تربێ و نهێنی لا دابنێ ٥ دەگوترێ: (فلان عیبة فلان) فلانکەس جێگای نهێنی فلانە.

**العُیَبَةُ**: کەسێك زۆر عەیبو ڕەخنە لەخەڵکی بدۆزێتەوە.

**العَیّابُ**: بەمانا (العُیَبَةُ)دێ.

**المَعابُ**: عەیبو لەککە ٥ شوێنی عەیبدار ٥ (ك: معایب).

**المَعَابَةُ**: بەمانا (العَیبُ) دێ ٥ (ك: معایب).

**المَعیبُ**: شوێنی عەیبدار، ڕۆژگاری عەیب پەیدا بوون.

**عاثَ** عَیثاً وعُیوثاً وعَیَثاناً: خراپی کرد تێکی دا لەکەڵکی خست ٥ دەگوترێ: (عاث في ماله) ماڵو سامانەکەی بەفیڕۆ دا ٥ لەشوێنی نەشیاودا خەرجی کرد.

**عاثَ** الذئبُ في الغنم: گورگ کەوتە ناو

مەڕەکانــــەوەو تارومـــاری کـــردن ٥ شڕوبڕی کردن (فهو عَيّثان وهي عيثـى) (ك: عياثی).
عَيَّثَ في الوعاء وغيره: دەستی وەردایە ناو فەردە شتەکەوە دەستی تێگێڕا بۆئەوەی شتێکی لێ دەربێنێ بەبێ ئەوەی چاوی لێی بێ.
تَعَيَّثَــتِ الإبـــلُ: حوشـترەکە ئـاوی خواردەوە بەڵام تێری نەخواردەوە.
ألعَيثمُ: بڕوانە (عَثَمَ).
العَيثوم: بڕوانە (عَثم).
العَيُـــوثُ: کەسێــك زۆر وێرانــەکارو خراپەکار بێ.
العَيَّاثُ: بەمانا (العَيُوثُ)دێ.
عاجَ به عَيجاً: پشتی پێ بەست ٥ گرنگی پێدا ٥ بەزۆری لەبواری (نـەفی)دا بەکاردەهێنرێ ٥ دەگوترێ: (ما عـاجَ بقولـه) ٥ (وماعـاج بالـشيئ) ٥ (شـرب الدواء فما عاج به).
العِيادَةُ: بڕوانە (عَوَدَ).
العيد: بڕوانە (عود).
عَيدَنت النخلةُ: دارخورماکە زۆر بەرز بوو، بوو بە (عەیدانە).
العَيدانَةُ: درێژترین دارخورمایە ٥ (ك: عَيدان).
العَيــدَةُ: کەسێــکە ملکەچـی حـەقو ڕاسـتی نـەبێ خـۆی بـەزلزانو لوتبـەرز بزانـێ ٥ تروتـۆپ زلو نەفس بەرزو وشك تەبیات.
العَيداهُ: بەمانا (العَيدَةُ)دێ.
عارَ عَـيراً وعَيَرانـاً: هـاتو چـوو بـەردەوام بوو.
عارَ الرجـلُ في الأرض: پیاوەکە بەزەویـدا گەڕاو هاتو چوو.
عارت القصيدة: چامە شیعرەکە بەناو خەڵـکدا بـڵاو بـۆوەو خەڵــك قۆستیانەوە.
عــار في القـوم: هەوڵیـدا ئاشوبو فیتنـە بخاتە نێو گەلەکەوە.
عار فلاناً: ڕەخنەی لە فلان گرت.
عارَ الشَّيْئَ: شتەکەی فەوتاند لەناوی برد.
أعاره: وای لێ کرد بێو بچێو هەمیشە لە هاتوچۆدا بێ ٥ قەڵەوی کرد.
أعيَــرَ النَّــصلَ: تیرەکـەی وای کـرد بەدرێژی خەتێکی بەدەرەوە بووی لەسـەربێ واتـە: تەبارێـکی هـێڵ ئاسای لەسەر بێ.
عايَرَ بـين المكيـالين معـايرة وعيـاراً: دوو پێوەرەکەی تاقیکردنـەوە بۆئـەوەی بزانـێ ئـاخۆ ئەندازەکـەیان تـەواوە یان نا.
عَيَّــرَهُ: پـاڵی دا بــەعیبو عــارەوەو کردەوەکــانی بەلەککــەو خراپـــە لەقەڵــەم دان، عەیبــداری کــرد ٥

دەگوترێ: (عَيَّره بالجهل) ڕەوشتی نەزانی پاڵ دا بەنەزانی لەقەڵەم دا.

تَعايَرُوا: هەریەکەیان ئەوی تریانی عەیبدار کردو کاری عەیب ئامێزی پاڵدا.

العَائِرَةُ: مەڕێك لەنێوان دوو مێگەلە مەڕدا نەزانێ دوای کامیان بکەوێ.

العَارُ: هەرشتێك بەعەیب بژمێردرێ ٥ (ك: أعيار).

العِيارُ: پێوەر یان کێشەر، هەرشتێك شتی تری پێ مەزەندە بکرێ چ پێوانەبێ چ کێشانەبێ ٥ هەرشتێك دانرابێ بۆ ئەوەی بەرامبەریی شتی تری پێ بکرێ.

عيار النقود: ئەندازەی ئەو بڕە مەعدەنە خالیسەی لە پارەکەدا هەیە ٥ دەگوترێ: (زێڕی هەژدە عەیار).

العيار الناري: گوللەی دەمانچەو تفەنگ ٥ (ك: عيارات).

العَيْرُ: گوێدرێژ ٥ نێوان بەیەك گەیشتنی دوو قلینچی چاو بەلای لوتەوە ٥ یان قلینچکی چاو بەلای لاجانگەوە ٥ ئەو تەبارە هێڵ ئاسایەی بە درێژایی تیرەکە درێژبۆتەوە ٥ ئەو دەمارە تەبارە بەستوەی بەناو پەڵکی گەلادا درێژبۆتەوە ٥ (ك: أعيار).

الأعيار: ئەو ئەستێرە زوهرییەن لە دامێنی ڕێڕەوی ئەستێرەی سیومیلن.

العِيرُ: ئەو خواردەمەنییەی بەهۆی قافڵەو کاروانەوە لە وڵاتێکەوە دەهێندرێ بۆ وڵاتێکی تر.

العَيَّارُ: کابرایەك زۆر بەناو وڵاتدا بێ‌و بچێ ٥ (تەتەر).

المُعَارُ من الخيل: ئەسپێك لارێ بڕوا.

المَعَايِرُ: عەیبو عار.

المعايرةُ: مەزەندە کردنی شت بەتەحلیلی قیاسی وا هێزیان زاندرابێ.

المِعيارُ: بەمانا (العيار) دێ ٥ لەبواری فەلسەفەدا (المعيار) بریتییە لە نمونەیەکی هەبووی بەرچاو یان بە تەصەور مەزەندەکراو بۆئەوەی بکرێتە پێوەرو تەرازووی شت.

العلوم المعيارية: عیلمی مەنتیق‌و عیلمی جەمال‌و عیلمی ئەخلاق ٥ (ك: معايير).

اعيَسَ الزرعُ: کشت‌وکاڵەکە تەڕایی تێدا نەما ٥ تەڕایی تێدا نەبوو.

تَعَيَّست الإبلُ: حوشترەکە ڕەنگی سپی‌و سوری شڵەیی بوو.

الأعيَسُ: حوشتری ڕەنگ سپی‌و سوری

شـلْهيی ٥ حوشـتری ڕەسـەن ٥ (ك: عيس).

**العَيساءُ:** مێينەی (الأعيس) ٥ (ك: عيس).

**عاشَ عَيشاً وعيشةً ومعاشاً:** ژيا، گيانی تێدا بوو، کەوتە کاروانی ژيانەوە.

**أعاشَهُ:** وای لێ کرد بژی ٥ دەگوترێ: (أعاشه الله عيشة راضية).

**عايَشَهُ:** لەگەڵی ژيا.

**عَيَّشَهُ:** وای لێکرد بژی.

**تعايشوا:** بە خۆشەويستیو پێك ڕازيبوون ژيانيان بەسەر برد.

**تَعَيَّشَ:** هۆکاری ژيانی گرتنە ئەستۆو خەريکی دابينکردنی پێداويستی ژيان بوو

**العائش:** خاوەنی وەزعی باشو بارودۆخی لەبار.

**العائشة:** مێينەی (العائش).

**العَيشُ:** ژيان، ئەو شتانەی ژيانيان پێوە پەيوەستە وەکوو خۆراكو خواردنەوەو پۆشاكو داهات ٥ نان، دەگوترێ: (عيش بني فلان اللبنُ) ژيانی هۆزی فلان شيرو ماستە واتە ژيانيان لەسەر ئەو شتە دەڕوا.

**العِيشَةُ:** حاڵەتی ئادەميزاد لەژياندا ٥ دەگوترێ: (عاش فلان عيشة صدق وعيشة سوء).

**العَيَّاشُ:** بۆزێدە ڕۆيی لەمانای (العائش) دێ ٥ نانەوا، نان فرۆش.

**المُتَعَيِّشُ:** کەسێك ئەندازەيەکی پێداويستی ژيان بۆ دابين بووبێ.

**المَعاشُ:** ئەو شتەی ئادەميزاد پێيان دەژی ٥ لە خواردنو خواردنەوەو ئەو شتانە ٥ کاتو شوێنی وەدەست هێنانی بژێوی ٥ موچەی موچە خۆرو خانەنشين.

**المَعيشَةُ:** بەمانا (المعاش)دێ.

**العيصُ:** شوێنی لێ ڕواندنی درەختی باش ٥ درەختی پڕ گەڵاو چڕو تێکچرژاو ٥ بنەماو ئەصل ٥ دەگوترێ: (فلان من عيص بني هاشم).

**المِعياصُ:** هەرشتێك بەناخۆشیو زەحمەت مرازی خۆتی لێ حاصڵ بکەی.

**المَعيصُ:** جێگای لێ ڕوانی درەختو روەك.

**عاطتِ العُنُقُ عَيطاً:** مل درێژبوو بەنارێکی.

**عاطت المرأةُ والناقةُ عَيطاً وعياطاً:** ئافرەتەکە يان حوشترەکە نەزۆکيش نەبوون کەچی چەند ساڵێك سکيان پڕ نەبوو.

**عَيِطَ عَيطاً:** ملی درێژ بوو (فهو اعيط وهي عيطاء).

**عَيَّط:** جارێك هاواری کرد ٥ گريا.

تَعَيَّطت العُنُقُ: ملی بەنارێك‌و پێكی درێژ ببوو.

تَعَيَّطت المرأة: ئافرەتەكە بەبی ئەوەی نەزۆك بێ چەند ساڵێك منداڵی نەبوو.

تَعَيَّط النباتُ: روەكەكەی گوشی شتێكی وەكوو صمغی لێ هاتە دەر یان ئاوی لێ هات.

تَعَيَّط الرجلُ: پیاوەكە ڕقی هەڵسا.

تَعَيَّط القومُ: خەڵكەكە دەستیان كرد بەهات‌و هاوارو بگرەو بەردە.

العَائِط: هاواركەر، قیژەو هەراكەر.

العِياطُ: هەراو هۆریاو قیڕەو بگرەو بەردە ٥ گریان.

عِيطِ (مبني على الكسرة): دەنگی منداڵ‌و زیقەو چریكەیان.

العِيط: حوشتری ڕەسەن‌و بەبەر.

العَيَّاطُ: هاواركەر، قیژەو هەراكەر.

العَيطَلُ: بڕوانە (عَطَلَ).

عافت الطيرُ عيفاً وعَيَفَةً: باڵندەكە دەوری شتەكەی‌داو ویستی لەسەری بنیشێ.

عاف الطيرَ عيافةً: باڵندەكەی هەڵفڕاند بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ چۆن دەڕواو لەكوی دەنیشێتەوە تا بیكاتە نیشانەی گەش بینی یان ڕەش بینی.

عاف الطعامَ أو الشرابَ: خواردنەكە یان شەرابەكەی بەلاوە ناخۆش بوو خستیە ئەو لاوە یان بەجێی هێشت‌و وازی لێ هێنا، حەزی لێ نەبوو.

أعاف القومُ: خێڵەكە ئاژەڵ‌و ولاخەكانیان ئاوەكەیان نەخواردەوە بەدڵیان نەبوو.

إعْتَافَ: تێشوی ئامادە كرد بۆسەفەر ٥ باڵندە هەڵفڕاندنی كردە پیشەی خۆی بەمەبەستی ڕەشبینی یان گەشبینی.

إعتاف الشَّيْءَ: شتەكەی حەز لێ نەبوو وازی لێ هێنا.

تَعَيَّفَ: باڵندە هەڵفڕاندنی بۆ ڕەشبین‌و گەشبینی كردە پیشەی خۆی ٥ ڕەمڵی هاویشت‌و خۆی بە غەیب زان نیشان دا.

العِيافَةُ: هەڵفڕاندنی باڵندەو دەنگدانیەتی‌و چاودێری كردنیەتی بۆئەوەی بزاندرێ چۆن دەڕواو بۆ كوی دەچێ بیكاتە نیشانەی ڕەشبینی یان گەش بینی ٥ گومان‌و هەست.

العِيفَة: ماڵی چاك‌و باش.

العَيُوفُ: كەسێك زۆر خەریكی باڵندە فڕاندن بێ بۆ مەبەستی ڕەش بینی یان گەش بینی ٥ حوشترێك تینوی بێ‌و بۆن بەئاوەكەوە بكاو نەیخواتەوە.

**عاقَهُ** عَيقاً: مەنعی کرد ٥ نەیهیشت ٥ لەو شتە لایدا.

**عَیَّقَ** في صوته: هاواری کرد، دەنگی بەرز بۆوە.

**العَیقُ**: بەشەئاو، نۆرە ئاو.

**العَیقَةُ**: دەشتاییو چۆڵەوانی ٥ کەنار دەریا ٥ (ك: عَیقات).

**العَیوقُ**: بڕوانە (عَوَق).

**عاكَ** عَیكاناً: ڕۆیی‌و شانی هەڵتەکاند.

**عالَ** فلان عَیلاً: فلانکەس هەژار کەوت ٥ خێزانی زۆر بوون.

**عالَ** في الأرض عَیلاً: بەناو زەویدا ڕۆیو سوڕایەوە.

**عال** في مَشیه: لە ڕۆیشتندا خۆی باداو لەنجەو لاری کرد.

**عال** المیزانُ: تەرازووەکە بەرزو نزمی کرد.

**عالَ** فلان: فلانکەس ستەمی کرد.

**عالَ** الشَّیْءُ فلاناً: شتەکە فلانکەسی دەسەوسان کرد ٥ بڕستی لێ بڕی ٥ ئاتاجی کرد.

**عالَ** الضالَّةَ عَیلاً: شتە ونبووەکە سەرسامی کرد نەیزانی چۆنی لێ بگەڕێو لە کوێ بۆی بچێو هەوڵی بۆبدا.

**عالَ** کلامَهُ: قسەکانی خۆی ئاراستەی کەسێك کردن کە نەیدەویست بیان بیسێ.

**اعالَ** الرجلُ: پیاوەکە خێزانی زۆر بوو.

**اعالَ** الشَّیْءَ: شتەکەی داواکرد ٥ هەوڵی بۆدا ٥ بۆی گەڕا.

**اعالَ** الصائدُ: نێچیرەوانەکە گەڕا بۆ نێچیرو هەوڵی گرتنی دا.

**أعیَلَ**: خێزانی زۆر بوو ٥ (فهو مُعیلٌ).

**عَیَّلَ**: خێزانی زۆر بوو.

**عَیَّلَ** عِیالَهُ: بژێوی بۆ خێزانەکەی دابینکردو ئەرکی بەخێوکردنیانی لە ئەستۆ گرتو نەفەقەی کێشان.

**عَیَّلَ** القومَ: قەومەکەی پاش گوێ خستو بەخەمیانەوە نەبوو.

**تَعَیَّلَ** في مشیه: لە ڕۆیشتنیدا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.

**العائِلة**: بڕوانە (عَوَل).

**العَیْلَةُ**: هەژاری‌و پێداویستی ٥ دەگوترێ: (طالت عیلتي إیاك).

**العَیِّلُ** (عَیِّلُ الرجل): خاو وخێزانی پیاو؛ ئەوانەی ئەرکی بەخێوکردنیان لەئەستۆی دابێ ٥ (ك: عیال).

**المُعَیَّلُ** (رجل مُعَیَّلٌ): پیاوێکی خێزانداره ٥ پاشگوی خراوە.

**عام** الرجلُ عَیماً وعیمةً وعیاماً: پیاوەکە حەزی لەشیر بوو ٥ شیرەکەی کەم بوو ٥ تینوی بوو ٥ (فهو عَیمان وهي عیمی).